# تەفسیری ڕەوان

(بۆتێگەیشتنی قورئان)

نوسینی:

مەلا مەحموودی گەلاڵەیی

بەرگی (شەشەم)

جزمی (١٦، ١٧، ١٨)

# تەفسیری ڕەوان

( بۆ تێگەیشتنی قورئان )

نوسینی:

**مەلا مەحموودی گەڵاڵەیی**

بەرگی ﴿شەشەم﴾

جزمی ﴿١٦، ١٧، ١٨﴾

بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: تەفسیری ڕەوان
- نوسینی: مەلا مەحموودی گەلاڵەیی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٢١٤٠)ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە.
- چاپو دیزاین: (سامان محمد أمین).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

**باقی ماندەی چیرۆکی حەزرەتی موساو حەزرەتی خضر**

﴿ ۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَىْءٍۭ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِى ۖ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّى عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا فَأَبَوْاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِى وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً

وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِي ۚ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە ئاشكراو نومایانە، ئەم ئایەتەش درێژەی سەرگوزشتەی حەزرەتی موسایە لەگەڵ حەزرەتی خضردا، روداوی كوشتنی منداڵە تازە پێگەیشتووەكە، روداوی دووەمی چیرۆكەكەیە پاش روداوی كونكردنی كەشتییەكە، حەزرەتی خضر صەبرو خۆڕاگری حەزرەتی موسای پێ تاقی كردەوە، بەڵام حەزرەتی موسا نەیتوانی دان بەخۆیدا بگرێ، چونكە كردەوەی خضر پێچەوانەی ظاهیری شەریعەت بوو. جاوەكوو لەوەپێش باس كرا: كە حەزرەتی خضر منداڵەكەی كوشت، حەزرەتی موسا رەخنەی گرتو وتی: ئەو منداڵە بێ تاوانەت بەناحەق بۆ كوشت؟ بەراستی تاوانێكی گەورەت ئەنجامدا، ئیتر جارێكی تر حەزرەتی خضر رێككەوتننامەو وادەو بەڵێنو مەرجەكانی نێوان خۆیو حەزرەتی موسا وەبیر دەهێنێتەوە، سەرنجی رادەكێشێ بۆ ئەو وتووێژەی لەسەرەتای گەشتەكەیاندا ئەنجامیان دا ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْراً﴾ حەزرەتی خضر بەحەزرەتی موسای گوت: ئەرێ من بەتۆم نەگوت: ئەتۆ لەگەڵ من هەڵناكەی، ناتوانی لەئاست كردەوەكانی من بێ دەنگ بی!

تێبینی ئەوە دەكرێ، ئەمجارە وشەی (لك)ەی زیاد كرد، چونكە ئەمجارەیان شێوە سەرزەنشتەكەی حەزرەتی موسا توندو تر بوو، بۆ جاری دووەمیشە كە موسا سەرپێچی وادەو بەڵێنەكانی دەكا!!

ئیتر حەزرەتی موسا جارێكی تر بەخۆیدا دەچێتەوە، لێی موعلوومە: كە دووجار مەرجەكانی رێككەوتنی پێشێل كردوە، وادەو بەڵێنی پێشووی لەبیر چوونەوە، ئیتر هەڵێكی تر بەخۆی دەداو خۆی خستە بەردەم دوو رێگاو دوا فرسەتی بەخۆیدا، ﴿قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْراً﴾ وتی: ئەگەر جارێكی تر من پرسیارم دەربارەی هەر شتێك لێ كردی، لەسەر هەر كارو كردەوەیەكت رەخنەم گرت، ئیتر هاوڕێیەتیم مەكە، بێگومان لەلایەن منەوە گەیشتیتە ئاستێك: كە ئیتر بەهانەت بەدەستەوە بێ بۆ دابڕان لێمەو وازم لێ بێنیو هاوڕێیەتیم نەكەی!

ئیبنو جەریر لەئوبەی كوڕی كەعبەوە ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كە باسی یەكێكی دەكرد؛ دوعای بۆ دەكردو خۆی پێش دەخست. رۆژێك فەرمووی: (رحمة الله علينا وعلى موسى، لو لبث مع صاحبه لأبصر العجب ولكنه قال: ﴿إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْراً﴾ رەحمەتی خودا لەسەر ئێمەو لەسەر موساش بێ، ئەگەر لەگەڵ هاوەڵەكەی بمایایەوە شتی سەیرو سەرسوڕهێنەری دەبینی بەڵام ئەو وتی: (ئەگەر لەمەودوا پرسیارم لێ كردیو رەخنەم لێ گرتی ئیتر هاوڕێیەتیم مەكە).

## روداوی سێیەم:

دەفەرموێ: ﴿فَانطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا﴾ واتە: حەزرەتی خضرو حەزرەتی موسا درێژەیان بەگەشتەكەیان داو رۆیشتن تا گەیشتنە گوندێك، برسیان بوو تینویان بوو، پێویستیان بەوە هەبوو یەكێك ببێتە

خانـە خوێیـان، میوانـدارییان بکـا، داوایـان لەدانیـشتوانی گوندەکـە کـرد خـواردنو خواردنەوەیان بدەنێ، برسیيەتیو تینوەتییـان نـەهێڵن، بـەڵام تێکـڕای دانیـشتوانی گوندەکـە داواکـەیانیان ڕەت کردنـەوە، کـەس میوانـدارییانی قبـووڵ نـەکرد، کـەس نەبوە خانەخوێیانو هیچیان پێ نەدان، دەڵێن: ئەو گونده ناوی (ئەنطاکییـە)بـووە. جا لەو کاتەدا: کە ئـەوان بـەناو ئـاوایی دا دەگـەڕانو داوای خۆراکیـان لەدانیـشتوان دەکـردو هیچیان پـێ نـەدان ﴿فَوَجَـدَا فِيهَـا جِـدَاراً يُرِيـدُ أَنْ يَـنقَضَّ فَأَقَامَـهُ﴾ دیـواری خانوێکیان بینی لار بوبوەوە خەریك بـوو بڕوخـێ، حـەزرەتی خـضر بـەبێ ئـەوەی کرێیان لێ وەرگرێ ڕاستی کردەوە، لەفەرمودەی پێغەمبـەردا هـاتووە: کـە حـەزرەتی خضر دەستی بەدیوارەکەدا هێناوەو ئەویش وەکوو کەراماتێك ڕاست بۆتەوە!

ئالێرەدا سەرلەنوێ حـەزرەتی موسـا هەسـت دەکا بـەجۆرە شـتێکی نـەگونجاو لەهـەڵسو کـەوتی دانیـشتوانی گوندەکـەو ڕژدیو بـەخیلیانو لەبەرامبـەر ئـەوەدا پیاوەتیو مەردایەتی حەزرەتی خضر، ئیتر لـەناخیا چـەند پرسـیارێك کۆدەبنـەوە، دەبـێ چـی پـاڵی بەحـەزرەتی خـضرەوە نـابێ خـۆی مانـدو بکـا، دیـواری لارەبـووی خانووی گوندێك ڕاست بکاتەوە: کە هیچ کەسێ لەدانیـشتوانی ئـەو گونـدە پیـاوەتی ئەوەیان تێدا نەبوو تیکە نانێـك بـدەن بـەم دوو ڕێبـوارە برسـییە؟ ئەگـەر هیچکە نەبوایە دەبا داوای کرێی بکردایـەو کرێکەی وەرگرتایـەو بیدایـە بەخواردەمـەنیو بیانخواردایە!!؟ بۆیە ئەمجارەش حەزرەتی موسـا خـۆی پـێ نـەگیراو وەدەنـگ هـاتو ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿لَوْ شِئْـتَ لاَتَّخَذْتَ عَلَيْـهِ أَجْـراً﴾ ئەگـەر بتویـستایە داوای کرێـت بکردایـە لەپاداشـی ئـەم دیـوار چاککردنەوەت! خۆزگـا داوای کرێـی چـاککردنەوەی دیوارەکـەت لێ بکردنایـە؟؟ کـە دانیـشتوانی ئـەم گونـدە ئەوەنـدە ناپیـاوبن کـەمێك خواردەمـەنی نـەدەن بەئێمـە، حـەق وابـوو تـۆش بـەخۆڕایی ئـەو دیـوارە ڕاسـت نەکەیەوە!

بەمــەش كۆتــایی بەهاورێیــەتی حــەزرەتی موســاو حــەزرەتی خــضر دێ، حەزرەتی موسا هیچ عوزرو پاساوی بەدەستەوە نەماوە، هیچ شتێك نـەماوە ئـەمان پێكەوە بهێڵێتـەوە! كـەوابێ دەبـێ لێـك جیاببنـەوە، بۆیـە حـەزرەتی خـضر وەڵامـی موسای دایەوە ﴿قَـالَ هَـذَا فِـرَاقُ بَيْنِـي وَبَيْنِـكَ﴾ ئـەم پرسیارو رەخنەگرتنانـەی تـۆ هۆكاری لێك جیابوونەوەی منو تۆیـە، لەپێشدا پێم گوتیو مـەرجم بـۆ دانـاییو قبوڵت كرد.. كەچی پابەندنەبووی، وادەو بەڵێنەكانی خۆت پێشێل كرد، چەند جار هۆشـیارم كردیـەوەو پـێم گـوتی، بۆخـۆت مـەرجت دانـاو وتـت ئەگـەر جارێكی تـر پرسـیارم لێ كـردی ئـیتر هاورێیـەتیم مەكـە، دەی ئـەوەتا دوای ئـەوەش خـۆت پـێ نەگیراو رەخنەت گرت، كەوابێ ئیتر مـن لێـت جیادەبمـەوەو هاوەڵیـت ناكـەم، بـەڵام پێش ئەوەی لێك جیاببینـەوە ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا﴾ مـن هـەواڵت دەدەمێو ئاگادارت دەكەمـەوە بەسـەر نهێنـی ئـەو كردەوانـەی مـن كە تـۆ نـەتوانی لەئاستیاندا بێدەنگ بیو خۆت بگریو صەبرو ئارامت ببێ!

﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُـمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ دەربارەی ئەو كەشتیەی كە كونم تێ كرد، ئەوە چونكە كەشتییەكە هی چەند كەسێكی بێ دەسەڵاتو بـێ پشـتو پـەنابوو، بـەكرێ ئیشیان پێ دەكردو بژێوی خۆیان لێ وەدەست دەهێنـا، سەرچاوەی ژیـانی كۆمـەڵێك خـەڵك بـوو، ویـستم بـەو كـون تێكردنـە عەیبـداری بكـەم، چـونكە لەپێـشیانەوە پاشـایەك بازگـەی دانـابوو، هـەر كەشـتییەك بـێ عـەیب بوویایـەو بەسـنووری ژێـر دەسـەڵاتی ئەودا تێپەڕ بوویایە داگیری دەكرد بۆ خۆی، منیش ئەو كەشتییەم عەیبـدار كرد بۆ ئەوەی پاساوڵەكانی پاشا كەشتییەكە بەعەیبدار بزانن‌و داگیری نەكەن! كەواتە كون تێكردنەكە زیانێكی بچوك بوو لەچاو داگیر كردنـی كەشـتیەكە، هـەموو كـاتێكیش لەخۆگرتنی زیانی بچوك بۆ رەتكردنەوەی زیانی گەورە كارێكی پیرۆزو پەسندە.

﴿وَأَمَّا الْغُلامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَنْ يُرْهِقَهُمَا طُغْيَاناً وَكُفْراً﴾ ئەو كوڕە بچكۆلەیەش كە كوشتم، ئەوە لەبەر ئەوە بوو، ئەو كوڕە بەسروشت كافر بوو، باوكو دایكیشی خودا پەرستو خاوەن باوەڕ بوون، ئێمەش پەروەردگار ئاگاداری كردین بەسەر دوارۆژی داو ترساین: كە خۆشەویستی ئەو كوڕە لای باوكو دایكی وایان لێ بكا لەكوفرو بێدینی دا شوێنی بكەون. چونكە خۆشەویستی باوك و دایك بۆمندالْ شتێكی سروشتی یە كەم كەس هەیە لەئاستی دا خۆی بۆ بگیرێ.. ئەمە جۆرێكە لە(سد الذرائع) بێگومان هەر شتێك وەسیلەبێ بۆ بەرژەوەندی، بۆ خۆی بەرژەوەندییە.

قەتادە دەڵێ: كاتێ ئەو كوڕە لەدایك بوو باوكو دایكی زۆریان دڵ پێ خۆش بوو، كاتێكیش كوژرا زۆر بۆی نارەحەت بوون، ئەگەر تەمەنی درێژ بویایە دەبوە هۆی لەناوچوونیان، كەوابێ با هەموو ئادەمیزادێك رازی بێ بەقەزاو قەدەری خودا، چونكە قەزاو قەدەری خودا بۆ موسوڵمان لەو شتانەدا: كە پێی ناخۆشە زۆر باشترە لەو شتەی كە پێی خۆشە.

لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە دەفەرموێ: (لایقضي الله لمؤمن قضاءً الا كان خیراً له) پەروەردگار هەر شتێك بۆ موسوڵمان بڕیار بدا بۆی خێرەو بەرژەوەندی ئەوی تێدایە.

لەشوێنێكی تردا قورئان دەفەرموێ: ﴿وَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾(البقرة/٢١٦).

بەكورتی حەزرەتی خضر دەڵێ: پەروەردگار بەسەر ئەو نهێنی یەدا ئاگاداری كردین ئەگەر ئەو كوڕە پێ بگەییشتایە باوكو دایكی بانگهێشت دەكرد بۆ كافر بونو ئەوانیش لەرووی خۆشەویستی كوڕەكەیانەوە شوێنی دەكەوتن. بۆیە پێش وەخت لەناومان برد، ﴿فَأَرَدْنَا أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْراً مِنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْماً﴾

ویستمان پەروەردگار لەشوێنی ئەو كوڕە دوا ڕۆژ شوومە مندالێكی صالحو گوێڕایەلْ بدا بەم دایكو باوكە. زۆر باشتر بێ لەم مندالە ئەحمەقەو جێگای متمانەو خۆشەویستی باوكو دایكی بێ، چاكەیان لەگەلْ بكاو پابەندی فەرمانو نەهیەكانیان بێ.

﴿وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحاً فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ﴾ ئەوەی كە منی هەلْنا بۆ راستكردنەوەی دیوارە لارەوەبووەكە، ئەوە بوو لەژێر دیوارەكەدا گەنجینەیەك هەبوو، ئەو گەنجینە مولْكی دوو هەتیوی شارەكە بوو باوكیان پیاوێكی راستالْو خوداپەرست بوو، پەروەردگار ویستی ئەو گەنجینە زێرو زیوە بهێلێتەوە، دەرنەكەوێ تا هەتیوەكان پێ دەگەن، عەقلْو هۆشیان كاملْ دەبێو دەتوانن سەرپەرشتی مالْو دارایی خۆیان بكەن! ئەو كاتە بۆخۆیان گەنجینەكە هەلْبدەنەوەو دەری بهێننو سوودی لێ وەربگرن، ئەمەش بۆ ئەوەی پارێزگاری مالْەكە بكرێو نەكەوێتە ژێر دەستی خەلْكی خراپو بەفیڕۆ بڕوا، خودا ڕەحمی بەهەتیوەكان كرد هەروەها لەبەر خاتری باوكیان: كە پیاوێكی صالحو خوداپەرست بوو، وەكوو دەلْێن: ئەم باوكە صالحە، باپیری حەوتەمیان بوو، ﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ ئەو كردەوانەی ئەنجامم دان هیچیانم لەخۆمەوە نەكردن، بەلْكوو بەفەرمانی خودا ئەنجامم دان، ﴿ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً﴾ ئەوەی بۆم باس كردی، ئەو پاساوانەی بۆ كارەكانی خۆم هێنایەوە بۆت ئەوە ئاكامو سەرەنجامی ئەو كردەوانە بوو: كە تۆ لەئاستیاندا خۆت بۆ ڕانەگیراو ڕەخنەت لێ گرتمو نەوەستای تا لەكۆتایی دا بۆخۆم هۆكارو بایسی كردەوەكانی خۆمت بۆ ڕوون بكەمەوە.

**تێبینی:**

لەوەپێش ئەوەمان رونکردەوە: کە هەندێ لەزانایانی ئیسلام پێیان وایە حەزرەتی خضر پێغەمبەر بوو، هەندێکیش پێیان وایە: پیاو چاکو وەلی بووە.

**جا لەسەر رای ئەوانە : کە دەفەرموون: حەزرەتی خضر پیاو چاکو وەلی بووە بە پێویستی دەزانم چەند شتێك رون بکەمەوە:**

١- کەراماتی ئەولیا شتێکی چەسپاوەو لەحەدیثی پێغەمبەردا ﷺ چەند جار ئاماژەی بۆ کراوە، لەقورئاندا چەند جار نموونەی بۆ هێندراوەتەوە: هەر کەسێك ئینکاری کەراماتی ئەولیا بکا بیدعەچیو فاسیقو لەرێ دەرچوو بێ بڕوایە. ئەوەتا قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە کە حەزرەتی مەریەم دایکی حەزرەتی عیسا، میوەی کاتی هاوینی لەوەرزی زستاندا لەلا دەبیندراو میوەی زستانی لەکاتی هاویندا لەلابوو، کە حەزرەتی زەکەریا دەچوو بۆ ژوورەکەی ئەم دیاردانەی دەبینین لێی دەپرسی مەریەم! ئەمانەت لەکوێوە بۆ هاتووە؟ کێ بۆی هێناوی؟ دەیفەرموو: رزقەو خودا پێی بەخشیوم.

هەروەها کە فەرمانی بەلقەدار خورمای وشك کرد خورمای بۆ وەبەربێنێ یەکسەر دار خورماکە خورمای گرتو ﴿رُطَبًا جَنِيًّا﴾ی لێ چنیو خواردی، ئەم ئافرەتە پێغەمبەر نەبوە، بەڵکوو وەلیو خۆشەویستی خودا بووە.

هەروەها ئەو روداوانەی لەسەر دەستی خضر رویاندا (کونکردنی کەشتی، کوشتنی منداڵەکە، راستکردنەوەی دیوارە لارەوە بووەکە) هەموویان بەکەرامات دەژمێردرێن.

٢- ئایا دروستەو دەبێ وەلی بۆخۆی بزانێ کە (وەلی)یە؟ زانایانی ئیسلام لەم بارەوە دوو رایان هەیە:

(أ) هەندێك دەفەرموون: دروست نیە وەلی بۆخۆی بزانێ کە وەلی یە، هەر شتێك لەسەر دەستی دەردەکەوێ لەکەراماتو خاریقەی عادە، دەبێ بەوریاییو

حەزرەوە سەیریان بكا، چونكە نابێ دڵنیابێ لەوەی كە ئەوە ئیستیدراج نیە، دەبێ بترسێو ئاگای لەخۆ بێ نەوەكوو ئەوە دانەوكەپك بێ!

هەروەها وەلی ئەگەر بزانێو لێی مەعلووم بێ: كە وەلی یە ترسی خودای نامێنێو دڵنیا دەبێ لەعەزابی خودا! چونكە مەرجی وەلی ئەوەیە تا كاتی مردنو تا فریشتەی گیانكێشان دێتە لای بەردەوام ترسی خودای هەبێ، وەكوو دەفەرموێ: ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا﴾(فصلت/٣٠). هەروەها چونكە وەلیو پیاوچاك ئەوەیە: عاقیبەت خێر بێ، سەرەنجامی ژیانی بەختەوەر بێ، دەی خۆ سەرەنجام نادیارەو كەس ناتوانێ بزانێ ئاكامی چۆن دەبێ، بۆیە ئیبنو عەبباس فەرموودەیەك ریوایەت دەكا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وانما الاعمال بلاواتیمهما).

(ب) هەندێ لەزانایان دەفەرموون: دروستە وەلی بزانێ: كە وەلی یە؛ چونكە كۆڕا هەیە لەسەر ئەوە: كە غەیری خۆی دروستە بزانێ كە ئەو وەلی یە. دەی كەوابێ بۆ خۆشی دروستە. ئەوەتا پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی دا بە(عشرة المبشرة) لەهاوەڵانیو فەرمووی: ئێوە بەهەشتین، دەی خۆ ئەو دە هاوەڵە موژدە پێدراوانە ترسی خودایان لەدڵ دەرنەچوو بەڵكوو زیاتر خودا پەرستیان دەكردو پتر لەخودا دەترسان، دیارە كەسانی دیكەش ئەگەر لێیان مەعلووم بێ كە وەلین زیاتر خوداپەرستی دەكەن.

٣- جەماوەری زانایانی ئیسلام دەفەرموون: حەزرەتی خضر ئێستا لەژیاندا نیەو لەدونیا دەرچووە چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أرأیتكم لیلتكم هذه فانه علی رأس مئة منها لایبقی ممن هو الیوم علی ظهر الارض أحد).[1]

---

(١) رواه مسلم عن عبد الله بن عمر في (فضائل الصحابة) (٢٥٣٧) باب (٥٣) ورواه البخاري في (العلم) (١١٦) باب (٤١) (السمر في العلم).

لەریوایەتێکی تردا هاتووە (مامن نفس منفوسة الیوم یأتي علیها مأة سنة وهي حیة یومئذ).[٢] کۆمەڵێکیش پێیان وایە: حەزرەتی خضر لەژیاندایەو نەمردوە چونکە لەکانی ژینی خواردۆتەوە، ئێستا لەسەر زەوییە! هەموو ساڵێك حەج دەکا! ئیبنو (عطیه) دەڵێ: لەم بارەوە باسو خواس زۆرنو گەلێك نیقاشو دەمەدەمێ هەن، بەڵام هیچیان جێی متمانە نین. بەکەڵکی پشت پێ بەستن نایەن!

بەڵام ئیمامی قورطوبی لەتەفسیرەکەیدا ئەو رایە بەپەسند دەزانێ: کە دەڵێ: حەزرەتی خضر ئێستا لەژیاندایەو نەمردوە، بەڵگەو دەلیلی جۆراو جۆر دەهێنێتەوە بۆ ئەم رایەو دەڵێ: ئەو حەدیثانەی: کە جەماوەری زانایان کردویانن بەبەڵگە بۆ رای خۆیان ناکرێنە بەڵگەو نەص نین، بەڵکوو (عام)نو تەخصیص رویان تێ دەکا!

٤- ئەحکامی شەرعی بەسروش یان بەخەو بینینی پێغەمبەران نەبێ ناچەسپێن. کەوابێ ئەو قسەو بیرو رایە راست نیە: کە دەڵێن: ئەحکامی شەرعی بۆ ئەولیاکان ثابیت دەبێ لەرێگەی نهێنی زانینو ئیلهامی دڵیانەوە، بەم نەوعە خودا ئەو حوکمە شەرعییانە فێری دەداتە دڵیانەوەو زانیاری خودایی فێر دەبنو ئەحکامی جوزئیات دەزاننو، نهێنی بونەوەر شارەزا دەبنو پێویستیان بەئەحکامی کوللی نیە. ئەوەتا حەزرەتی خضر بەهۆی ئەو عیلمە (لەدنی)یەی کە: خودا پێی دابوو پێویستی بەو زانیارییە نەبوو: کە لای حەزرەتی موسا هەبوو! حەدیثەکەی وابیصە کە بوخاری لەتاریخدا ریوایەتی کردوە: دەکەنە بەڵگەی خۆیانو دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (استفت نفسك وان أفتاك المفتون).

ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: مامۆستامان ئەبولعەباسی مالیکی فەرموویەتی: کۆمەڵێك زیندیقو بێدینو نهێنی مەذهەب دەڵێن: ئەم حوکمە شەرعییە گشتی

(٢) رواه مسلم برقم (٢٥٣٨) باب (٢١٨).

یانە بۆ پێغەمبەرانو خەڵكی سادەیە، ئەگینا ئەولییاو ئەهلی تایبەتی پێویستیان بەو جۆرە دەقە ئایینیانە نیە، بەڵكوو ئەوەی دەخرێتە دڵیانەوە بەئیلهام حوكم بەوە دەكەنو پابەندی ئە شتە دەبن: كە دڵیان دێتە سەری! ئەو كۆمەڵە زیندیق و نهێنی خواهانە دەڵێن: ئەولییا بەهۆی مشتوماڵبونی دەروونیانو خاڵی بوونی دڵیان لەئەغیار، عولوومی ئیلاهیو حەقائیقی رەببانییان بۆ دەردەكەوێ، نهێنی بونەوەر دەبینو ئەحكامی جوزئیات دەزانن، پێویستیان بەئەحكام و شەرائیعی كوللیات نیە.

ئەمجار شێخ ئەبولعەبباس دەفەرموێ: ئەم بیرو بۆچونو باوەڕە، كوفرو بێدینییەو هەر كەسێ وا بڵێ كافرو هەڵگەڕاوەیە لەئایینو دەكوژرێ، چونكە ئینكاری شتێكی زانراوی شەریعەتی ئیسلام دەكا، چونكە پەروەردگار قانونو یاسای خۆی داناوە، حیكمەتو دانایی خۆی تێدا بەكار هێناوە، رایگەیاندوە: كە ئەحكامو شەریعەتی خودا بەهۆی پێغەمبەرانیەوە دەزاندرێ، ئەو پێغەمبەرانە سەفیرو ناوەندن لەنێوان خوداو ئادەمیزاداندا، ئەوان دیاری كراون بۆ گەیاندنی شەریعەتی خودا بەبەندەكانی، ئەوان خودا هەڵی بژاردون بۆ ئەوەی ئەحكامو شەریعەتی خودا بگەیەننو روونی بكەنەوە، وەكوو دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلاً وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾(الحج/٧٥). یان دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾(الانعام/١٢٤). یان دەفەرموێ: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾(البقرة/٢١٣).

بەكورتیو پوختی، بەگوێرەی زانیاری قەطعیو یەقینی ضەروری بەكۆڕای زانایانی سەلەفو خەلەف ئەوە چەسپاوەو سەلمێندراوە: كە زانینی ئەحكامی پەروەردگار چ فەرمان بن چ نەهی رەوایەو كارێكی پەسندە، بەڵگەش بەم روداوانە دەهێننەوە كە لەسەر دەستی حەزرەتی خضر رویان دا، دەڵێن: ئەوەتا بەگوێرەی زانیاری حەزرەتی موسا (كە عیلمی ظاهیری هەبوو) كارەكانی حەزرەتی خضر

تاوان بوون. کەچی بەگوێرەی زانیاری حەزرەتی خضر (کە عیلمی باطن)ی هەبوو کارەکانی پەسند بوون!!

هەروەها ئەوەشیان بڵاو کردۆتەوەو فێری هەوا خواهانی خۆیانیان کردوە، دەڵێن شەریعەت هەیە، تەریقەت هەیە حەقیقەت هەیە. شەریعەت بریتییە لەعیلمی ظاهیر، تەریقەتو حەقیقەتیش بریتیین لەعیلمی (باطن). ئەمجار پێیان وایە: تەریقەتو حەقیقەت جیاوازن لەشەریعەت، بەڵكوو هەندێك دەڵێن: شەریعەت وەکوو توێکڵ وایە ئەوەی مەبەستە ناوەرۆکو جەوهەرەکەیە: کە بریتین لەطەریقەتو حەقیقەت! لەم بارەوە قسەو باسو سەرگوزشتەی زۆرو زەبەندە بەشیعرو پەخشان نووسراون.[٣]

شتێکی ئاشکراو لەخۆر رەوشن ترە: کە ئایینی پاکی ئیسلام ئایینێکی تێرو تەسەلەو لەهیچ رویەکەوە کەمو کورِی تێدانیە، هەموو رویەکی ژیانی شی کردۆتەوە، بۆ هەموو کاتو شوێنێك گونجاوو لەبارە، سەرچاوەی ئەم ئایینە بەرزو پیرۆزە دوو سەرچاوەی رونو پاکو بێگەردن، ئەوانەش قورئانی پیرۆزو حەدیثی پێغەمبەر ﷺ بەهەر سێ جۆرەکانیەوە (قول، فعل، تقریر) جا هەر بیرو باوەرِێك، هەر کارو گوفتارێك لەو سەرچاوە پاکو خاوێنانە هەڵقوڵابێ ئەوە پەسندو رەوایە، ئەگەر لەوانەوە سەرچاوە نەگرێ ئەوە سەر لێ شێوانو گومرِایی یە.

بێگومان ئەو تەصەووفەی کە ئیمامی غەزالی پێناسەی کردووەو بانگەوازی بۆ دەکا، ئەو تەصەووفەی لەکتێبی (جمع الجوامع)دا پێناسەی بۆ کراوە، ئەوە

---

(٣) بۆ زێدە زانیاری لەم بارەوە سەیری کتێبی (تأريخ التصوف في الإسلام) دانراوی (د.قاسم غني) وەرگێرِانی (صادق نشأة) بکە، ئەم کتێبە بەنرخە (د.احمد ناجي القيسي)و (د.محمد مصطفى حلمي) پێیداچوونەوە.

کاکڵەی ئایینەو شتێکی راستو رەوایە، رێبازو رەوشتی پیاوچاکانی موسوڵمانە، ئەو تەصەووفە لەشەریعەت جیا نیە، ئەو تەصەووفە بریتییە لەروکردنە خوداو مشتو مـالكردنی دڵو دەروونو ئـیخلاص لـەکردەوەدا، یەکتاپەرسـتیو پابەنـدبوون بەشەریعەتەوە، شوێنکەوتنی پێغەمبەرە ﷺ، خۆروت کردنـە لەهەموو شتێ جگـە لـەخودا، وازهێنانـە لەگاڵتـەو گـەپو جـوانی دونیـاو روکردنـە خودایـە، وازهێنانـە لەهەموو کارو رەوشتێ کە ئایینی ئیسلام یاساغی کردوە. هەڵبەتـە تەصـەووف بـەم جۆرەی باس کرا پوختەی ئایینو شەریعەتە، پێویستە هەموو موسوڵمانێ هەوڵ بدا ئەو جۆرە تەصەووفە لەناخیا رەنگ بداتەوە، بەبێ هەبوونی ئەو جۆرە تەصەووفە ئیمانی هیچ خاوەن باوەڕێ تەواو نیە، بەبێ هەبوونی ئـەو جـۆرە تەصـەووفە هـیچ فەڕو بەرەکەت دەستەبەر نابێ!

بـەڵام بەداخـەوە ئـەو تەصـەووفە پـاکو خاوێنـە بەدرێـژایی مێـژو لەلایـەن نەفامو خەڵکی سافیلکەو دوژمنانی ئایینەوە دەستی تێخراوە، زۆر شتی ناشرینو دژ بـەبیروباوەڕی ئیـسلامی تێکـەڵ بـووە، تەنانـەت زۆر شـتی تەصـەووفو تەریقـەت وەپاڵ ئیسلام دراوە، لەکاتێکدا ئیسلام زۆر لەوە دوورەو شتی وای تێدا نیە!

## چیرۆکی ذیلقەرنەینو یەئجوجو مەئجوج

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ

وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا

﴿قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي ۖ فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾﴾

لەوەپێش لەباسی هۆی نازڵبوونی چیرۆکی ئەصحابولکەهفدا وترا: کە جولەکەکان داوایان لەموشریکەکانی مەککە کرد: کە پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ بکەن دەربارەی چیرۆکی ئەصحابولکەهفو چیرۆکی ذیلقەرنەینو چۆنیەتی (روح)!

مەشهوور وایە: پرسیارکەرەکان موشریکەکانی قورەیش بوون. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەبارەی (سبب نزول)ی ئەم سورەتەوە دەڵێ: پیرێکی میصری پێش چڵو ئەوەندە ساڵە هاتە لامانو لەعیکریمەوە ئەویش لەئیبنو عەبباسەوە بۆیگێڕاینەوە، وتی: قورەیشییەکان نەضری کوڕی حاریثو عوقبەی کوڕی ئەبو (معیط)یان نارد بۆ لای مالە جولەکەکان لەمەدینە، پێیان گوتن بچن دەربارەی موحەممەد پرسیار لەو مالانە بکەن، رەوشتو ئاکارەکانی بۆ ئەوان باس بکەن، قسەکانی کە بەئێمەیان دەڵێ بۆیان بگێڕنەوە، بزانن ئاخۆ ئەوان لەبارەیەوە چی دەڵێن: ئەوان لەکۆنەوە خاوەن نامەی ئاسمانین، هەواڵو باسو خواسی پێغەمبەران دەزانن، شاندەکەی قورەیش هاتنە مەدینەو دەربارەی حاڵو وەزعی پێغەمبەر پرسیاریان لەمالە جولەکەکان کرد، شێوەو رەوشتو کردارو گوفتاریان بۆ باسکردن، وتیان: ئێوە خاوەنی تەوراتنو هاتووین لەبارەی ئەم کابرایەی خۆمانەوە زانیارییەکمان بدەنێ.

مالەکان پێیان وتن: سێ شت هەیە پرسیاری لێ بکەن ئەگەر هەواڵی دانیو بۆی شی کردنەوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە: ئەو کابرایە پێغەمبەرە. ئەگینا پیاوێکی

درۆزنو قسه هەڵبەستە، پرسیاری لێ بکەن دەربارەی کۆمەڵە گەنجێك کە لەرۆژگاری کۆندا رویان لەکێوو کەژ کردوە، کێنو بۆ کوێ چونو چییان بەسەر هات، چونکە سەرگورشتەی ئەوان سەیرو سەمەرەیە، هەروەها پرسیاری لێ بکەن دەربارەی ئەو پیاوەی خۆرهەڵاتو خۆرئاوای پشکنیو گەڕاو داگیری کرد، باسو خواسی چۆنەو چی بەسەر هات، پرسیاری لێ بکەن دەربارەی (روح) چیەو چۆنە! جا ئەگەر هەواڵی پێ دانو بۆی شیکردنەوە ئەوە پێغەمبەرەو بڕوای پێ بکەن، ئەگینا ئەوە پیاوێکی درۆزنو قسه هەڵبەستە.

نەضرو عوقبە گەڕانەوە بۆ مەککەو وتیان: ئەی هۆزو خێڵی قوڕەیش، زانیارییەکمان هێناوە نێوان ئێوەو موحەممەد یەکالا دەکاتەوە، مامە جولەکەکانی مەدینە ئامۆژگارییان کردین: کە پرسیار لەموحەممەد بکەین لەبارەی چەند شتێکەوەو پێیان گوتن. ئەمجار هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئەی موحەممەد! چەند شتێك هەیە بۆمانی رون بکەرەوە، ئەمجارە سێ پرسیارەکەیان ئاراستە کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أخبركم غداً عما سألتم عنه) سبەینێ وەڵامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە، هیچ ئینشائەڵلای نەکرد، قوڕەیشییەکان رۆیشتن، پێغەمبەر ﷺ پانزە رۆژ نیگای بۆ نەهات، جوبرائیل نەدەهاتە سەری، هەتا وای لێهات قوڕەیشییەکان کەوتنە مقۆ مقۆو دەیانگوت: سەیرە موحەممەد وادەی بەیانی پێ داین، کەچی ئەوە پانزە رۆژ تێپەڕی هیچ وەڵامی نەداینەوە، بەمە پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵتەنگ بوو، تانەو تەشەری قوڕەیشییەکانی زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەمجار حەزرەتی جوبرائیل هاتە سەریو بەنیگا سورەتی (الكهف)ی بۆ هێنا، کە عیتابی ئەوەی لەپێغەمبەر گرت. کە بۆچی دڵتەنگ دەبێ بەقسەی قوڕەیشییەکانو چیرۆکی ئەصحابولکەهفو چیرۆکی ذیلقەرنەینو باسی (روح)ی تێدایە.

ڕیوایەتێکی تریش هەیە دەربارەی (سبب نـزول)ی ئایـەتی ﴿قُـلِ الـرُّوحُ...﴾ لەروایەتەكەدا هاتووە، دەڵێ: جولەكەكان بەپێغەمبـەریان گوت: ئـەی موحەممەد! پێمان بڵێ: گیان چیە؟ بەچ شێوەیەك گیان لەناو جەستەدا سـزا دەدرێ!؟ خۆ روح لەخوداوە هاتووە؛ هێشتا پێغەمبەر هیچی لەم بارەوە بـۆ نـەهاتبوو، هیـچ وڵامێکی نەدانەوە، دوایی حەزرەتی جوبرائیل هاتە لایو نیگای بۆ هێنا كە دەفەرموێ: ﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً...﴾.

ئەگـەر سـەیری ئایەتـەكان بكـەین هـیچ شـتێك دەربـارەی كەسـایەتی ذیلقەرنـەینو سـەردەمو شـوێنو جێگای بـاس ناكـا، ئەمـەش دیاردەیـەكی بەرچاوە لەچیرۆكەكانی قورئاندا، چونكە دیاری كردنی مێژوو جێگاو شـوێن مەبەسـت نیـە، بەڵكوو مەبەست پەند وەرگرتنو تەربییەت دادانـە، دەی پەنـد وەرگـرتنو عیـبرەت زۆر جار بەبێ دیاریكردنی زەمانو مەكان دەستەبەر دەبن!

مێژووی نووسراو باسو خواسی پاشایەكی لـەخۆگرتووە، نـاوی ئەسـكەندەری ذیلقەرنەینـە. شـتێكی چەسـپاوو حەقیقەتـە ئـەو ئەسـكەندەرەی لەمێـژودا نـاوی هەیـە، ئـەو ذیلقەرنەینـە نیـە كـە لـەقورئاندا بـاس كـراوە، چـونكە ئەسـكەندەری ئیغریقی بتپەرست بووە، ئەم ذیلقەرنەینەی قورئان باسی لێوە دەكا خـاوەن بـاوەڕ بووە یەكتاپەرست بووە، ئیمانی بەزیندوبوونەوە هەبوە.

ئەبو رەیحانی بێرونی لـەكتێبی بـەناو (الأثـار الباقیـة عـن القـرون الخالیـة)دا دەڵێ: ئەو ذیلقەرنـەینەی لەقورئاندا ناوی هاتووە، لـەخێڵی حیمیـەر بـووە، چـونكە پاشا حیمییەریەكان نازناوی (ذی)یان هەبوە، وەكوو: ذی یەزن، ذی نواس.

ذیلەقەرنـەین ناوی ئەبو بەكری كوڕی ئیفریقش بووە، سوپایەكی بـێ شمـاری بەرەو قـەراخی دەریـای سپی ناوەڕاسـت هێنـا، بـەوڵاتی تـونسو مـەڕاكیشو چـەند

شوێنێکی تردا تێپەڕی، شاری ئیفریقییەی دروست کرد، دوایی هەموو کیشوەری ئەفریقیا بەو ناوەوە ناونرا!

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: وێ دەچێ ئەم رایە راست بێ، بەلاّم ئێمە ناتوانین ئەم مێژووە نووسراوە لەگەوو بێژینگ بدەین، چونکە لێکۆڵینەوە لەمێژووی نووسراودا دەربارەی ئەو ذیلەقەرنەینەی قورئان لایەنێکی ژیانی دەگێڕێتەوە، کارێکی ئەستەمە هەروەکوو چۆن ناتوانین بەدورو درێژی دەربارەی زوربەی ئەو چیرۆکانەی لەقورئاندا هەن وەکوو سەرگورشتەی گەلی نووح، گەلی هودو گەلی صالح....هتد. لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەینو لەچوار چێوەی دەقە قورئانییەکە دەربچین! مێژوو بەنیسبەت تەمەنی ئادەمیزاد تازە لەدایك بووەو منداڵی دوێنێ یە، بێگومان پێش ئەوەی مێژوو بنووسرێتەوە چەندەها رووداوی جۆراو جۆر رویان داوەو ئێمە هیچیان لێ نازانین. مێژوو لێیان بێ خەبەرە!

ئەگەر تەورات گۆڕانکاری تێدا نەکرایەو وەکوو خۆی بمایەوە بێگومان دەبوە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زۆر لەرووداوە کۆنەکانی مێژوو پشتی پێ دەبەسترا. بەلاّم بەداخەوە تەورات ئەفسانەی وا تێهالاّندراوە: کە گومان لەوەدا نیە ئەفسانەیە، هەروا چەند ریوایاتو قسەو باسی تێدا زیادکراوە گومان لەوەدا نیە کە لێی زیاد کراونو بێ ئەصڵو ئەساسن. سروشە خودایی یەکە نیە. کەوابێ ناتوانین تەورات بکەینە سەرچاوەیەکی مێژوویی‌و بتمانە بەو زانیارییانە بکەین: کە تێیدا تۆمار کراون!

بۆیە تاکە سەرچاوەی بڕوا پێکراو بۆ ئەم جۆرە چیرۆکو بەسەرهاتانە قورئانی پیرۆزە: کە پارێزراوە لەهەموو جۆرە گۆڕانکارییەك، پیتێکی لێ زیادو کەم نەکراوە.

ئــەوەشمان لــەیاد نەچــێ هــیچ کــاتێ ناگونجــێو نــابێ قورئــان بەمێــژوو هەڵسەنگێنین، مێژوو بکەینە تەرازووی کێشانەی قورئان، لەبەر دوو هۆی سـەرەکی رونو ئاشکرا:

١- مێژوو تـازە لـەدایك بـووەو زۆر روداو هـەن لەمێـژووی ژیـانی ئـادەمیزاددا، مێژوو هیچیان لێ نازانێو لێیان بێ ئاگایـە، قورئـان هەنـدێ روداو دەگێڕێتـەوە: کە زانیاری مێژو هیچیان لێ نازانێ.

٢- مێژوو هەرچەندە برێ روداوی لەخۆگرتوون کرداری ئادەمیزادە، کردەوەی ئادەمیزادیش بێ کـەمو کورتی نـابێ، ئـەوەتا ئێـستا ئێمـە لـەم رۆژگـارەی خۆمـاندا وێڕای پێشکەوتنی وەسائیلی گەیاندنو زانیاری، بەچاوی خۆمان دەبینین: روداوێك، بەچـەند شـێوەی جـۆراو جـۆر دەگێڕدرێتــەوە جۆرەهـا تەفـسیرو لێکۆڵینـەوەی دژبەیەکی بۆ ئەنجام دەدرێ، مێژووش لەم مەعلوماتە تێکەڵو پێکەڵانە، لەم ریواتە دژبەیەکانـە پەیـدا دەبـێ. دەی چـۆن دەگـونجێ چـیرۆکەکانی قورئـان بەمێـژوو هەڵسەنگێنین!؟!

ئەوەی مەبەستە لێرەدا بزاندرێ ئەوەیە: پرسیار لەپێغەمبـەر کـرا دەربـارەی ذیلەقەرنەین، پەروەردگار نیگای بـۆ نـاردو ئـەم لایەنـەی بەسـەر هـاتی ئـەو زاتـەی روون کردەوە، ئێمەیش جگـە لـەقورئان سەرچـاوەیەکی ترمـان بەدەسـتەوە نیـە بـۆ رونکردنەوەی ژیانی ذیلەقەرنەین، ناتوانین بەبێ زانیاریو سەرچاوەی بڕوا پێکـراو لەچوارچێوەی دەقە قورئانییەکە بڕۆینە دەرێ!

بێگومان قورئان سێ گەشتی بۆ ذیلەقەرنـەین تۆمـار کـردوە گەشـتێك بـەرەو خۆرئاوا، گەشتێك بـەرەو خۆرهـەڵات، گەشـتێکیش بۆناوچـەی نێـوان دوو سـەدەکان (بـین الـسدین)، دەی بـا ئێـستا بکەوینـە شـوێن گەشـتەکانو گـوێ بـۆ گێڕانـەوەی سەرگورشتەکە بگرینو دڵی خۆمانی بۆ بکەینەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُمْ مِنْهُ ذِكْراً﴾ ئەی موحەممەد! جولەکەو قورەیشییەکان پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ذیلەقەرنەین، پرسیاری فێربوونو تێگەیشتن نا، پرسیاری تاقیکردنەوەو ئینکەبەریت لێ دەکەن، لەولامدا پێیان بڵێ، من لەژێر رۆشنایی ئەو نیگایەی لەخوداوە بۆم دێ بەسەرهاتی ئەو زاتەتان بۆ دەگێڕمەوە!!

ئەسکەندەری مەقدۆنی کوڕی فیلبیسی یۆنانی یە، لەدەوروبەری (٣٣٠) پێش زایینداا پاشایەتی هەموو جیهانی بۆ خۆی کۆنترۆڵ کردوە، شاری ئەسکەندەرییەی دروست کردوە، قوتابی ئەرەستۆ بووە، کە بەمامۆستای یەکەمو فەیلەسووف دەژمێردرێ لای ئەم خوێندویەتی.

ئەسکەندەر شەڕی لەگەڵ فارسەکان کردوە مەملەکەتو کیشوەری دارای داگیر کرد، کچەکەشی مارە کرد، ئەمجار روی کردە ولاتی هیندستانو شەڕی لەگەڵ دانیشتواتی کرد، ولاتی میصرو دەوروبەری خستە ژێر رکێفی خۆیەوە، خۆرهەلاتو خۆرئاوای داگیر کرد.

جا وەکوو وتمان ئەم ئەسکەندەرە هەرچەندە نازناوی ذیلەقەرنەینی هەیەو بەو ناوەشەوە ناوبانگی هەیە، بەلام ئەو ناگونجێ ئەو ذیلەقەرنەینە بێ، کە قورئان باسی دەکا، چونکە ئەسکەندەر کافر بووە، بەلام ئەم ذیلەقەرنەینە بەندەیەکی صالحو خوداپەرست بووەو خودا مڵکو سەڵتەنەتێکی بەرفراوانی پێ بەخشی. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَباً﴾ ئێمە مڵکو سەڵتەنەتێکی گەورەمان پێ بەخشی بوو، هەرچی ئەسبابی دەسەلاتو پادشایيو فەرمانڕەوایی هەیە بۆمان دەستەبەر کردبوو، چەکو کەرەسەی شەڕو زانیاری پێویست بۆ هەموو لایەنێکی فەرمانڕەواییمان بۆ دابین کردبوو، هێزو توانای ئەوەمان پێ بەخشیبوو بتوانێ هۆکارەکانی دەسەلات بەئەوپەڕی لێهاتوویی بەکار بێنێ، هەر ولاتێکی بویستایە بەئاسانی دەیخستە ژێر رکێفی خۆیەوە، خۆرهەلاتو

خۆرئـاوای كـۆنتڕۆڵ كـرد، هـەموو جیهـان بـۆی مـل كـەچ بـوو، پاشـایانی عـەرەبـو عەجەم بوونە ژێردەستەی. بەكورتی بۆ گەییشتن بەهەموو مەبەستو ئامانجەكانی هۆكاری كاریگەرمان بـۆ رەخـساندبوو ﴿فَـأَتْبَعَ سَـبَباً ، حَتَّـى إِذَا بَلَـغَ مَغْـرِبَ الـشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَـيْنٍ حَمِئَـةٍ﴾ ویـستی بگاتـە ئەوپـەڕی خۆرئـاوا، ڕێبـازێكی راسـتی گرتە بەرو هۆكارێكی كاریگەری بەكار هێنا بۆ گەییشتن بەمەبەستەكانی، كەوتەڕێ بەرەو ئەو شوێنەی دەیەویست بیگاتێ، هەتا گەییشتە شوێنی ئاوابوونی خۆر، واتە: لەلای خۆرئـاواوە گەیـیشتە ئەوپـەڕی ئـاوەدانیو لـەپێش چـاوی وشـكانی بڕایـەوەو نـەیتوانی زیـاتر بـەرەو پـێش بـچێ، وا دیـارە گەیـیـشتبێتە قـەراغی دەریاڵووشـی ئەتلەسـی (المحیط الاطلسي) ئـەو كاتـە دەریـای تـاریكی (بحـر الظلمـات)یـشیان پـێ گوتووەو خەڵكی پێیان وابـوە ئـیتر وشـكانی دوایـی دێـت، جـا لـەو شـوێنەدا وا هاتـە بەرچاوی: كە خۆر لەكانیاوێكی دەوروبەر قوڕاویدا گووم دەبـوو، وا دیـارە ئـەو بـە وولاتی تونسو جەزائیرو مەڕاكیشدا تێپەڕیوەو گەییشتۆتە دەریاڵووشی ئەتلەسیو لەوێدا واهاتۆتە بەرچاوی كە خۆر لەكانییەكدا ئاوادەبوو كـە دەوروبەرەكـەی قـوڕە ڕەش بوو، واتە: خۆر لەدەریادا گوم دەبوو، دەریاش خـۆی شـین نوانـدوە، دەتگـووت: قـوڕو ئـاو تێكـەڵاوبووە! ئەمـەیش دیاردەیەكـە بـەگوێرەی شـوێنو وڵات دەگـۆڕێ؛ لەوڵاتی شاخو دۆڵو كێودا دەبینی خـۆر لـەكێوو كـەژ ئـاوا دەبـێ، لەشوێنی دەشـتو سـارادا وا دەبینـدرێ: كـە خـۆر بـەناو زەویـدا ڕۆدەچـێ، لەقـەراخ دەریـا وا دێتـە بەرچاو: كە خۆر لەناو ئاوی دەریادا نقووم دەبێ.

مامۆسـتا سـەیید دەفـەرموێ: وا پـێ دەچـێ ئـەو شـوێنە شـوێنی تێڕژانـی ڕووبارێك بووبێ بۆ ناو دەریاڵووش، بەرواڵەتیش لەو جۆرە شوێنانەدا گژوگیاو قوڕە ڕەشەو چاڵو گۆلاو پەیدا دەبنو وەكوو كانی دێتە بەرچاو!..

جـا ئیلەقەرنـەین وا هاتـە بەرچـاوی كـە خـۆر لـەوێ دا ئـاوا دەبـوو، بـەڵام دەستنیـشان كردنـی شـوێنەكە زەحمەتـەو نـاتوانین دیـاری بكـەین، چـونكە دەقـە

قورئانییەکە دیاری ناکا، هیچ سەرچاوەی تری باوەڕپێکراومان بەدەستەوە نیە بتوانین پشتی پێ ببەستین، بۆیە لەم بارەوە هەرچی بڵێین تفەنگەو بەتاریکیەوە دەنێینو ڕەملێ هاویشتنە.

﴿وَوَجَدَ عِنْدَهَا قَوْماً﴾ لەنزیك ئەو شوێنەی وەك كانی دەچوو خۆری تێدا گوم دەبوو، گەلو نەتەوەیەكی بینی ڕێی لێیان كەوت، ئەو نەتەوە كافرو بێ باوەڕبوون، جا پەروەردگار ذولقەرنەینی سەرپشك كرد لەنێوان ئەوەدا بەكوشتن سزایان بدا، یان بانگەوازییان بكا بۆ ئیمان هێنان، بەم جۆرەی كە بۆمان باس دەكا دەفەرموێ: ﴿قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْناً﴾ وتمان: ئەی ذولقەرنەین! سەرپشك بە لەنێوان ئەوەدا بەكوشتن سزایان بدەی ئەگەر سوور بوون لەسەر كوفرو بێدینی خۆیانو دانیان نەنا بەتاكو تەنهایی منداو بەپیر بانگەوازی تۆوە نەهاتن! یان چاكەیان لەگەڵ بكەیو لەگەڵیان بەصەبرو پشوو درێژبی بانگیان بكەی بۆ ڕێگای هیدایەتو بەختەوەریو شەریعەتی خودایان فێر بكەی.

ماوەتەوە ئەوە بزانین ئایا ئەم پێگوتنەی پەروەردگار بەذولقەرنەین بەچ شێوەیەك بووە؟ ئایا ذولقەرنەین پێغەمبەر بووەو خودا بەنیگاو سروش ئەمەی پێ فەرمووە؟ یان ئەمە حیكایەتی حاڵە لەم ڕووەوە: كە خودا زاڵی كرد بەسەریانداو بەناچاریی ملكەچو ژێر دەستەی بوون وەكوو پێی بفەرموێ: بڕۆ سەرپشك بە چییان لەگەڵ دەكەی بیكە؟! عەزابیان دەدەی یان چاكەیان لەگەڵ دەكەی كەیفی خۆتە. هەردوو ماناكان وێ دەچن! هیچ مانعێك نیە دەقەكە ئاوا مانا بكەین یان ئاوا! ئەوەی گرنگە: ئەوەیە: ذولقەرنەین دەستورو قانوونی خۆی ڕاگەیاندو هەڵوێستی خۆی بەرامبەر ئەو وڵاتو كیشوەرانەی كۆنتڕۆڵی كردن ئاشكرا كرد، بڕیاری بۆیان دەركرد ﴿قَالَ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَاباً نُكْراً﴾ ذولقەرنەین بەدارو دەستەو هەندێ لەكاربەدەستە تایبەتیەكانی خۆی فەرموو: ئەو كەسەی ئێمە بانگی دەكەین بۆ خودا پەرستیو ئەو سوورە لەسەر

ستەمو ستەمکاریو شەریك بۆ خودا دادەنێ ئەوە ئێمە سزای کوشتنی بەسەردا دەدەینو قەلاچۆی دەکەین، پاشان دەگەڕێتەوە بۆ لای خودای خۆیو لەقیامەتدا سزای سەختی دەداو بەئاگری بێ ئامانی دۆزەخ دەیسوتێنێ! سزایەکی دەدا کەس نەیدیبێو کەس نەی بیستبێ.

﴿وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُ جَزَاءً الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْراً﴾ وەلێ ئەو کەسەی ئیمانی هێناو کردەوەی چاکی ئەنجام داو بەگوێرەی ئیمانەکەی هەلسو کەوتی کرد، ئەوە پاداشی دەدرێتەوە، لەهەردوو جیهاندا بەختەوەرە، لەوە بەولاوە دەرسی خوداپەرستی فێر دەکەین بۆ ئەوەی زیاتر لەخودا نزیك بێتەوە، پتر دلی نەرم بێ، ئەنجامدانی ئەرکەکانی خوداپەرستی لەسەر شان گران نابن! ئەرکی ئاسانی داوا لێ دەکەین، شتێکی داوا لێ ناکەین لەسەر شانی گران بێ، فەرمانی پێ ناکەین بەئەنجامدانی کارێك نەتوانێ بیکا! ئێمەیش یارمەتی دەدەین، کارەکانی بۆ ئاسان دەکەین!

بەکورتی ئەم پاشا فەرمانڕەوایە رەهایە بڕیاری ئەوەیدا: کە لەگەل خوداپەرستانو چاکەکاراندا چاکەکارو بەحیلەو دلسۆزبێ، لەگەل تاوانکارو خراپە ویستاندا بەزەبرو زەنگ بێو تۆلەیان لێ وەرگرێتەوە... بەراستی ئەمەیە فەرمانڕەوای ناجیحو ولات ئاوەدانکەرەوەو حوکمڕانی راستو دروست ئەوە: ئاسایشو دلنیایی بۆ هاولاتیان بەو جۆرە حوکمە دەستەبەر دەبێ، ولات بەو شێوە دادەمەزرێ کار بەو جۆرە بەرێوە دەچێ!!

هەر کاتێ چاکەکار پاداشی کردەوەی چاکی خۆی وەرگرتەوە، دلسۆزو خەمخۆر پاداشی دلسۆزی خۆیان هاتەوەرێ! ستەمکارانو خراپەکاران سزای تاوانی خۆیان وەرگرتەوە... ئەو کاتە خەلکی هەست بەدلنیاییو یاسا سەروەری دەکەن، لەناخەوە خۆیان هەلدەنێن بۆ چاکەکردنی زیاترو دلسۆزی نواندنی پترو بەرهەمهێنانی زۆر تر..

بەڵام کاتێك تەرازوی حوکمو یاسا تێکچوو دزو جەردەو خوێڕیو چڵکاو خۆری ماستاوکەر بوونە راوێژکاری حاکمو فەرمانڕەوا، ئەوجۆرە کەسانە کاریان کەوتە دەستو پاشا گوێی لێ گرتن ئیشو کاریان رۆییشتو لەپێش بوون، لەبەرامبەریشدا کارمەندی صاڵحو راستاڵ لێدراوو دەرکراو بوون، نەیان دەهێشت کاری گرنگ بگرنە دەستو لێیان نەدەگەڕان رۆڵی خۆیان بگێڕن، نەیان دەهێشت بەدەستی رەنگینی خۆیان وڵات بەرەو پێش بەرن، ئەوە لەو کاتانەدا دەسەڵاتو هێز لەدەستی فەرمانڕەوا دەبێتە قامچی عەزابو سزاو ئامێری روخاندنو داوەشاندن، لەجیاتی یاساو رێساو نیظام پشێوی باو دەبێو فەساد لەئارادا دەبێ. لەجیاتی ئاوەدانی وڵات وێرانی، لەشوێنی یەکیەتیو تەبایی پەرتەوازەییو فرەحیزبی، دژایەتیو دوژمنکاری باو دەبێو ژیانی شیرین تاڵو رۆژی روناك شەوزەنگو زەوی پانو پۆڕ تەنگەبەر دەبێ!!!!

﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَباً ، حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَى قَوْمٍ لَمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْراً﴾ پاشان ذولقەرنەین رێگایەکی تری گرتەبەرو گەشتێکی تری دەست پێ کرد، لەخۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات کەوتەڕێ، هەتا گەییشتە شوێنێك یەکەم شوێن بوو: کە خۆری لێ هەڵبێ لەلای خۆرهەڵاتەوە، یەکەم وڵاتێکی ئاوەدان بوو لەلای سنووری خۆرهەڵات، جا لەو شوێنەدا بینی خۆر هەڵدێ لەسەر نەتەوەیەك روتو پێخاوس، هیچ شتێك نەبوو گەرمایی خۆریان لێ دوور بخاتەوە، نەپۆشاکیان هەبوو بیپۆشن، نەخانوو خێمەو رەشماڵو پەناپاسارو دارو درەختیان هەبوو تا لەسایەیاندا خۆیان لەتیشکی خۆر بشارنەوە، راخەریان زەویو لێفەیان ئاسمان بوو. لەدەشتێکی کاکی بەکاکی دا دەژیانو زوربەی رزقو رۆژی بژێویان لەسەر ماسی بوو.

﴿كَذَلِكَ﴾ ئەوە بوو: کاروباری ذولقەرنەین، بەو جۆرە بوو: کە باس کرا، گەشتەکانی بۆ خۆرئاواو لەوێوە بۆ خۆرهەڵات، هێزو تواناو دەسەڵاتی، لەشکرو

سوپای، زانیاری‌و لێزانی، هەڵوێستی بەرامبەر دانیشتوانی ئەو کیشوەرانەی کەوتوونە ژێر دەسەڵاتیەوە، ئەوە بوو کە بۆمان باس کردن!

﴿وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْراً﴾ ئێمە ئاگادار بووین بەسەر هەموو حاڵ‌و وەزعێکی دا، هیچ شتێکی لەئێمە پەنهان نەبوو، واتە: هەرچەندە لەشکرو سوپای ئەوەندە، زۆرو بێ شمار بوو، سەروەت‌و سامانی هێندە زۆرو بەرفراوان بوو، ئەو کیشوەرانەی کۆنترۆڵی کردبوون لێك دورو بەرفراوان بوون، ئێمە هەموو شتێکی ئەومان دەزانی، بەکورتی دەسەڵات‌و دەوڵەمەندی‌و پاشایەتی گەیشتبوە رادەیەك هەر ئێمە دەمانزانی، کەسی تر نەیدەتوانی سەرژمێری بکاو بەسەریاندا ئاگادار بێ.

﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَباً، حَتَّى إِذَا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ وَجَدَ مِنْ دُونِهِمَا قَوْماً لا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً﴾ پاشان گەشتی سێهەمی دەست پێ کردو رێگایەکی تری گرتەبەر، لەخۆرهەڵاتەوە بەرەو باکور کەوتە رێ، هەتا گەیشتە نێوان دوو کێو لەنێوان ئەرمینیە‌و ئازربایجاندا، لای کێوەکانی ئەو وڵاتە رێی لەگەڵ‌و نەتەوەیەك کەوت، لەوانە نەبوون لەقسەو گفتوگۆ تێ بگەن، لەئاخاوتنی کەس حاڵی نەدەبوون، چونکە زمانی خۆیان زمانێکی زۆر غەریب بوو، بۆ خۆشیان تا بڵێی کەودەن‌و نەفام بوون.

ئەم گەل‌و نەتەوەیە بەشێك بوون لەنەتەوەی صەقالیبە (سلاف)ەکان. ئەوانەی نیشتەجێی خۆرهەڵاتی دەریای رەشن.

جا لەپاش ئەو کێوەوە نەتەوەیەکی زۆر درو شەڕانی هەبوو بەیەئجوج‌و مەئجوج بەناوبانگ بوون، هەمیشە لەکەلێن‌و بۆشایی نێوان دوو کێوەکانەوە هێرشیان دەکردو پەلاماری ئەو قەومە بێ دەسەڵات‌و نەزانەی ئەم دیو کێوەکانیان دەداو تاڵان برۆیان لێ دەکردن، جا کە ذیلقەرنەینیان بینی پاشایەکی بەدەسەڵات‌و

زاناو دادپەروەرە سكالآی خۆیان لەلا كردو ﴿قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ﴾ دانیشتوانی نێوان بەربەستەكان (بین السدین)ی نێوان دوو كێوەكان بەذیلقەرنەینیان گوتو ئەویش بەهۆی ئەو زیرەكیو لێزانیەی كە خودا پێی بەخشیبوو لێیان حاڵی بوو، یان بەهۆی تەرجومانەوە تێیان گەییشت، وتیان: ئەی ذیلقەرنەین! پێت رادەگەیەنین كە یەئجوجو مەئجوج دوو نەتەوەن لەودیو ئەو كێوانەوەن، هێرشمان بۆ دەهێننو فەسادو وێرانبوون لەوڵاتماندا بڵاو دەكەنەوە، دەمانكوژن، ئەو بژێوەی بەئارەقی ناوچەوان پەیدای دەكەین لێمان دەستێنن، ناهێڵن ساتەوەختێك بەئاسایی ژیان بەسەر بەرینو بەبێ ترسو خەم سەربنێینەوە!

﴿فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجاً عَلَى أَنْ تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدّاً ؟!﴾ ئایا بەلاتەوە پەسندە لەلایەن خۆمانەوە هەندێ پارەو پول كۆبكەینەوەو بیخەینە ژێر دەستی جەنابتەوە بۆ ئەوەی لەنێوان ئێمەو یەئجوجو مەئجوجی ئەو دیو كەژانە بەربەستێك دروست بكەیو رێگایان لێ بگیرێ ئیتر نەتوانن ئەم دیوكەون، لەدەست هێرشو پەلاماری ئەوان رزگارمان بێ؟!

### بەكورتی:

ئەوان پێشنیاری ئەوەیان بۆ ذیلقەرنەین كرد: كە لەناوخۆیان پیتاك بكەنو ماڵو سامان گردبكەنەوەو بیدەن بەذیلقەرنەین بۆ ئەوەی ئەویش سەددەكە دروست بكا.

﴿قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ ذیلقەرنەین لەوەلامدا وتی: ئەو هێزو دەسەڵاتەی خودا پێی بەخشیوم، ئەو ماڵو سامانو هۆكارە جیاجیایانەی خودا پێی داوەو بۆی دەستەبەر كردوم زۆر باشترە لەوەی ئێوە دەتانەوەی بمدەنێ، من

پێویستم بەماڵو سامانی ئێوە نیە ... وەکوو چۆن حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَا آتَانِيَ اللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّا آتَاكُم﴾(النمل/٣٦).

جا کە من پێویستم بەپارەو پولی ئێوە نەبێ، بۆ خۆم کەرەستەی پێویست دابین بکەم ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْماً﴾ بەکرێکارو ئیش کردن یارمەتیم بدەن، کرێکارو وەستای پێویستم بۆ دابین بکەن، بۆ ئەوەی لەنێوان ئێوەو یەئجوجو مەئجوجدا بەربەستێك دروست بکەم زۆر لەوە تۆکمەتر بێ کە خۆتان داوای دەکەن.

ئەمجارە شێوەی هێزو تواناو دەسەڵاتی خۆی دیاری دەکاو داوای کەرەستەی پێویست دەکا بۆی ئامادە بکەن دەفەرموێ: ﴿آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ﴾ پارچە ئاسنی جۆراو جۆرم بۆ بێنن، جا کە پارچە ئاسنەکانیان بۆ ئامادە کردنو کرێکارو وەستایان خستنە ژێر فەرمانی یەوە، دەستی کرد بەدروستکردنی بەربەستەکەو پارچە پارچە خستنیە سەر یەكو لێکی بەستن هەتا وای لێهات سەددەکەی لەگەڵ بەرزایی کێوەکان راست کردەوەو گەیاندییە سەر لوتکەکان!

ئەمجار فەرمانی بە وەستاو کرێکارەکان کرد، کە ئاگر لەئاسنەکان بەردەن، لەهەموو لایەکەوە موشەدەمەیان ئامادە کردنو ئاگریان لەناو پارچەئاسنەکان کردەوەو ﴿قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَاراً﴾ بەموشەدەمە موشەدەمەیاندا هەتا هەموو ئاسنەکان بەسەریەکدا توانەوەو بوونە یەك پارچە ئاگری سورەوەبوو، ئەمجار ﴿قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْراً﴾ فەرمووی: مسی تواوەم بۆ بێنن دەیکەم بەسەر ئەو ئاسنە سوورەوەبووەدا، مسی تواوەی بەسەر ئاسنی سورەوەبوودا کردو هەموو کونو کەلەبەری ناو سەدەکەی پڕ کردەوەو سەدەکە بوو بەیەکپارچەی توندو تۆڵو تۆکمە، ئیتر لەوەدوا ﴿فَمَا اسْطَاعُوا أَنْ يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْباً﴾ یەئجوجو مەئجوج نەیانتوانی سەر سەددەکە بکەون لەبەر بەرزیو لووسی، نەشیان

توانی کونی بکەن لەبەر قایمیو تۆکمەیی، پەروەردگار ئەو گەلو نەتەوە هەژارەی خستە ئاسایشو ئارامییەوە.

ئەمجار ذیلقەرنەین دوای تەواو بوونی سەددەکە ﴿قَالَ هَذَا رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي﴾ بەدانیشتوانی ئەو دەڤەرەی گوت: ئەمە نیعمەتو رەحمەتە لەخوداوە بۆ بەندەکانی، چونکە ئەو سەددە بوو بەبەربەستو ناوان لەنێوان ئێوەو یەئجوجو مەئجوجدا. ئیتر ناتوانن ئەم دیوکەونو فیتنەو ئاشووب لەولاتی ئێوەدا بلاوبکەنەوە. جا ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ﴾ ئەگەر وادەی مەزندەکراوی پەروەردگار دەربارەی دەرچوونی یەئجوجو مەئجوج لەپاش سەددەکەوە هات، ئەو کاتە پەروەردگار بەربەستەکە دەروخێنێو وردو خاشی دەکاو لەگەڵ زەویدا تەختی دەکا ﴿وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا﴾ هەرچی خودا وادەی پێدا، دێتەجێو پاشکەوتنو هەڵوەشانەوەی نیەو هەردەبێ ببێ.

ئابەم شێوە ئەم حەلقەیەی ژیانی ذیلقەرنەین کۆتایی هات، بەراستی ئەم زاتە نموونەی فەرمانڕەوای صالحو عادڵ بوو، خودا دەسەلاتو هێزی پێ بەخشی، سوپاو سامانو هۆکاری تری دونیا داگیرکردنی پێدا، توانی هەموو دونیا بەخۆرهەلاتو خۆرئاوایەوە بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. بەلام لەخۆی بایی نەبوو، جەورو ستەمی لەژێر دەستەکانی نەکرد، ئەو هەموو ولاتو کیشوەرانەی خستنە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، لەهیچ شوێنێك هەلسو کەوتی ستەمکارانەی لەگەڵ دانیشتوەکانی نەکرد، بەڵکوو هەر شوێنێکی بگرتایە دادپەروەریو چاکەکاری تێدا بلاو دەکردەوە، یارمەتی دانیشتوانی دەدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی ولاتو بەرپاکردنی ئاسایشو بەرقەرار بوونی یەکیەتیو تەباییو دالدەدانی هەژارو لێقەوماوان دەستی دەست درێژکارانی کۆڵ دەکرد، بوو بەپشتو پەنای داماوان. هەرگیز سەرکەوتنەکانی خۆی نەکردە هۆکاری چەوساندنەوەی گەلو نەتەوەکان، بەڵکوو دەسەلاتو توانای خۆی بەکار هێنا بۆ چەسپاندنی عەدالەتکاریو پێشخستنی ولاتو

گەشەکردنی باری ئابووری، قەڵاچۆکردنی زوڵمو ستەمکاریو نەهێشتنی فیتنەو ئاشوب لەوڵاتدا! هەموو ئەو کارە باشانەشی دەکاتە نیشانەی رەحمەتو نیعمەتی خودا بەسەر بەندەکانی داو دەیانگێڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی خوداو بەهی خۆی لەقەڵەمیان نادا. لەو کاتانەدا کە لەترۆپکی سەرکەوتنو زاڵبووندایە خودای لەبیرەو ئاماژە بەدەسەڵاتی بێ سنووری زاتی پاکی دەکاو هەموو شتێکی باش وەپاڵ پەروەردگاری خۆی دەدا!!

ئەمجار بزانین یەئجوجو مەئجوج کێنو لەکوێ بوونو ئێستا لەکوێنو چییان بەسەر هاتو چییان بەسەردێ؟

هەموو ئەمانە پرسیارنو خۆیان دەنوێننو وڵامیان زەحمەتو دژوارەو ناتواندرێ بەدڵنیایی وڵامیان بدەینەوە. چونکە ئێمە چییان لێ نازانینو زیاد لەوەی قورئان ئاماژەیان بۆ دەکاو فەرموودەی صەحیح باسیان دەکا، چ سەرچاوەی بڕواپێکراوی ترمان لەژێر دەستدا نیە، قورئان هەرئەوەندە ئاماژە دەکا: کە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا﴾ ئەم دەقەش کاتو زەمان دیاری ناکا! وادەی پەروەردگار بەوردو خاشکردنی سەددەکە، دەگونجێ هاتبێو رابوردبێ، وێ دەچێ ئەو وادەیە بەهاتنی تەتەرو پەلاماردانیان بۆ هەموو دونیاو خاپورکردنی هەموو ئەو شارو گوندانەی کەوتە ژێر دەستیان هاتبێتە جێ، ئەوان بەسەر هەر شوێنێك دا گوزەریان کردبێ وێرانیان کردوە، هەر شارو گوندێك کەوتبێتە ژێر رکێفیان خاپوریان کردوەو دانیشتوانیان کوشتو بڕ کردوە!!

لەشوێنێکی تردا لەسورەتی (الانبياء/٩٦-٩٧) دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ، وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ...﴾ ئەم دەقە قورئانییەش دووبارە کاتێکی دیاریکراو ئاماژ پێ ناکا بۆ هاتنەدەرەوەی یەئجوجو مەئجوج. نزیك بوونەوەی وەعدی حەق: کە بەمانا نزیکربوونەوەی قیامەتە، ئەوە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هاتۆتەجێ ... واتە: لەسەردەمی پێغەمبەرەوە

هاتنی ڕۆژی قیامەت بەنزیك دادەنرێ، بەڵكوو ڕەوانەكردنی پێغەمبەر ﷺ كراوەتە نیشانەی نزیكبوونەوەی هاتنی ڕۆژی قیامەت، ئەوەتا لەشوێنێكی تردا قورئان دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ ئەوەشمان لەیاد نەچێ كەچەرخ و كات لەحیسابی خودادا زۆر جوداوازە لەچەرخ و كاتی حیسابی ئادەمیزاد؛ وێ دەچێ ملیونەها ساڵ تێپەڕببێ لەنێوان نزیكبوونەوەی هاتنی قیامەتو ڕابوونی دا، بەحیسابی ئادەمیزاد بەدورو درێژ بزانرێو وەلێ لای خودا ماوەیەكی كورتو كەمە! كەوابێ پێدەچێ ڕولانی ئەو سەددە لەنێوان نزیكبوونەوەی قیامەت: كە سەردەمی پێغەمبەرە ﷺو ڕۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەدا رووی دابێ، بەم جۆرە هەڵمەتو هێرشی مەغۆڵو تەتەرەكان كە هەموو وڵاتانی خۆرهەڵاتی گرتەوە بریتی بێ لەدەرچوونو بەرەڵڵا بوونی یاجوج و ماجوج!

فەرموودەیەكی صەحیح و ڕاست هەیە، ئیمامی ئەحمەدو لەسوفیانی ئەورییەوە لەعورڕوەوە لەزەینەبی كچی ئەبو سەلەمەوە، لەحەبیبەی كچی ئوممو حەبیبەی كچی ئەبو سەفیان، ئەویش لەدایكیەوە (خاتوحەبیبە)، ئەویش لەزەینەبی كچی جەحشەوە (خێزانی پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ لەخەو ڕابوو، دەمو چاوی سوور هەڵگەڕابوو، لەو حاڵو وەزعەدا دەیفەرموو: (ویل للعرب من شر قد اقترب. فتح من ردم يأجوج ومأجوج مثل هذا) بەقامكە گەورەو قامكی شایەتومان حەلقەیەكی دروست كرد، دایكی موسوڵمانان؛ (زەینەب) دەفەرموێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە بەهیلاك دەبرێین لەكاتێكدا پیاوچاكمان تێدابن؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نعم إذا كثر الخبث) بەڵێ: ئەگەر خراپەكاری زۆر بوو.

ئەم خەونەی پێغەمبەر ﷺ پێش چواردە سەدە بووە، دوایی هێرشی تەتارو مەغۆل بۆ سەر عالەمی ئیسلامی ڕوی داوە، وڵاتی موسوڵمانانیان وێرانو خاپور كرد، تەنانەت مەركەزی خەلافەو فەرمانڕەوایی موسوڵمانان: كە بەغدا بوو لەسەر

دەسـتی لەشـكری هۆلاكـۆ ویـران كـراو دواخەلیفـەی عەبباسـی: كـە خەلیفـە موستەعصیم بوو كوژراو، دانیشتوانی بەغداد قەتڵو عام كران. دەی لەوانەیە ئەم هێرشە وێرانكارییانەی مەغۆڵو تەتار بۆ سەر عالەمی ئیسلامی مانای خەونەكەی پێغەمبەر ﷺ بێ، پاش شەش سەدو ئەوەندە ساڵە هاتبێتە دی!!

ئەمجار بەشوێن باسو سەرگورشتەی ذیلقەرنەیندا دیمەنێكی رۆژی قیامەت رادەنوێنێو دەفـەرموێ: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾ لـەو رۆژەدا: كە وادەی خودا دێتە دی، خەڵكی سەرگەردان دەبن، هەموویان لەحەیبەتانو لەترسان تێكەوە دەهاوێنو سەریان لێ دەشێوێ هەموویان تێكەڵو پێكەڵ دەبن، دەكەونە گەردوشو گەران، وەكوو دەریا شەپۆل دەدەن، كۆیان دەكەینەوە بەكۆكردنەوە. جا ئەم وەدی هاتنەی وادەی خودا پێش زیندوبوونەوە بێو بریتی بێ لەهاتنی رۆژی قیامەتو دوایی هاتنی جیهان، یان پاش زیندو بوونەوە بێ: كە بەجارێ هەموو مەخلوقات زیندو دەكرێنەوەو لەگۆڕەكانیان راست دەبنەوەو تێكەوە دەهاوێن، بەهەردووبار دەگونجێ!

یان مانای ئایەتەكە بەم جۆرەیە: ئەو رۆژەی سەددەكە دەڕوخێ ئەو ئاجوجو ماجوجانە لەدوا كێوەكەوە دێنە دەرەوەو پەلاماری خەڵكی دەدەنو دەست دەكەن بەئاشوب نانەوەو گەردش بەرپاكردنو وێران كردنی وڵاتان. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفـەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾(الانبیاء/٩٦). ئـەو كاتـە ئـاجوجو مـاجوج لەهـەموو بـەرزاییو قـەڵاو پەناگایانـەوە بەهەڵەداوان دێنـە خـوارێو وەكـوو ئـاگر لـەپووش بـەربێ دەكەونـە وڵاتو هەر شوێنێ پێیدا بـڕۆن وێرانـی دەكەن! دەق ئـەم وەصفە دەسـەپێ بەسـەر گەلو نەتەوەی جەنگیزخاندا، ئەوەبوو: ئەوان لەتەپۆلكەو توركەتوركەی كیشوەری ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتنە خوارێو ئەوەیان بەسەر عالەم هێنا كە هێنایان!! هەموو

ئەم رووداوانە بەماوەیەکی نادیار پێش فووکردن بەکەرِەنای دونیا ویَران بوونَدا رویان داوە!

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعاً﴾ كە كاتی رابوونی قیامەت هات فودەکریَ بەکەرِەنای صورداو هەموو مەخلووقات زیندو دەکەینەوەو راپێچی سارای مەحشەریان دەکەینو کۆیان دەکەینەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوەو وەرگرتنەوەی پاداشو سزا.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمویَ: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ، لَمَجْمُوعُونَ إِلَى مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾(الواقعة/٤٩-٥٠). یان ﴿وَحَشَرْنَاهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَداً﴾(الكهف/٤٧).

ئایەتەکە دیمەنێکی جمو جوڵی ئادەمیزادەکان رادەنوێنیَ، وێنەی جمو جوڵی هەموو ئادەمیزاد دەکێشیَ لەهەموو رەنگو رەگەزو کیشوەرو وڵاتەکاندا، لەهەموو چینو توێژو سەردەمو رۆژگارێکدا هەر لەیەکەم رۆژی دونیاوە تا کۆتایی دونیا، ئەو هەموو ئادەمیزادانە زیندو دەکرێنەوە تێکەوە دەهاونو دێنو دەچن، هەموویان دەڵێی سەرخۆشو مەستن، وەڵیَ لەراستی دا سەرخۆشو مەست نین بەڵام سزای خودا سەختو دژوارە، ترسی ئەو عەزابو سزایە وای لیَ کردون وەکوو شەپۆلی دەریا بێنو بچن.

## سزادانی کافران

﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَافِرِينَ عَرْضًا (١٠٠) الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَن ذِكْرِي وَكَانُوا لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا (١٠١) أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِن دُونِي أَوْلِيَاءَ إِنَّا

أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَرُسُلِى هُزُوًا ﴿١٠٦﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی ئەوەی کرد: کە هەر کاتێ وەختی رابوونی قیامەت هات، فو دەکرێ بەکەرِنای صوردا، ئادەمیزادەکان لەگۆڕەکانیاندا راست دەکرێنەوە، ئەمجار هەموویان لەسارای مەحشەردا کۆدەکرێنەوە بۆ حیسابو لێکۆڵینەوە.

ئەمجار ئەوە باس دەکا: کە ئەوکاتەی دۆزەخ نیشانی کافرەکان دەدرێ، رادەنوێنرێ بۆیان باش باش دەیبینن؛ گوێیان لەگرمەو لرفەو نێڵە نێڵەی دەبێ‌و ناتوانن خۆیانی لێ گێل بکەن، ئەو کافرانە لەدونیادا رویان لەبانگەوازی خودا وەردەگێرا، خۆیان لەدیتنی رێگای هیدایەت کوێر دەکرد، گوێیان لەبیستنی حەق کەڕ دەکردو بەهیچ جۆرێ شوێن حەق‌و راستی نەدەکەوتن، پێیان وابوو ئەو خودا درۆزنانەی دەیانپەرستن لەعەزابی خودا رزگاریان دەکەن، شەفاعەتیان بۆ دەکەن!

دەفەرموێ: ﴿وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِلْكَافِرِينَ عَرْضًا﴾ ئەو رۆژە واتە رۆژی قیامەت، دۆزەخ بەباشی نیشانی کافرەکان دەدەین راستەو خۆ چاویان پێ دەکەوێ، نارەحەتی‌و ناخۆشی هەست پێ دەکەن، گوێیان لەلرفەو نالەیەتی، ئەمەش بۆ

ئـەوەی زوو بكەونــە عــەزابـو ئەندێـشەوەو بــزانن: كـە ئـەوێ جێگایانــەو نـاتوانن خۆیانی لێ رزگار بكەن!!

ئەمجار رەوشـتو نیـشانەی ئـەو كافرانـەی: كـە شـیاوی ئـەو سـزادۆزەخییە دەردەكەون رون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِي غِطَاءٍ عَنْ ذِكْرِي وَكَانُوا لا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعاً﴾ واتە: عەزابی سەختی دۆزەخ بۆ ئەو كافرانەیـە: كـە لـەدونیادا خۆیـان گێـل كردبـوو لــەوەرگرتنی هیدایــەتو دۆزینــەوەی رێگــای حــەق، ســەیری نیــشانەو ئایاتەكانی خودایـان نـەدەكرد، لێیـان ورد نەدەبوونـەوە، بـەجۆرێك بگەنـە یـەقینو دەست بكەن بەیەكتاپەرستی. خۆیان لەبانگەوازی پێغەمبـەرو بـانگخوازانی ئـایینی ئیـسلام كـەڕ كردبـوو، تاقـەتیان نـەبوو گوێ لەنەصیحەتو ئامۆژگـاری مامۆسـتاو رێبەرانی ئیسلام بگـرن، گاڵتـەیان بەزیندوبوونـەوەو هـاتنی رۆژی قیامـەت دەهـات. شـوێن رێبـازی شـەیتان كـەوتبوونو لـەتاوانو گـومڕایی دا رۆچـوو بـوون، شـەیتان مامۆستاو رێ پیشاندەریان بوو وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَعْشُ عَـن ذِكْرِ الرَّحْمَنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَاناً فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾(الزخرف/٣٦).

### بەكورتی:

ئەوان لەدونیادا خۆیان لەبینینی نیشانەكانی هەبوونی خوداو تـاكو تـەنهایی زاتی پاكی كوێر كردبـوو، روویـان لەبەڵگـەو نیـشانەو ئایەتـە بیـستراوەكانی قورئـان وەردەگێڕاو گوێی خۆیانیان لێ دەهاخنی وەكوو لەشوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَـا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾(الحج/٤٦).

ئەمجار ئەوە روون دەكاتەوە: كە ئـەو كافرانـە بەهەڵەچون: كـە پێیـان وایـە: ئەو خـودا درۆزنانـە یارمـەتییان دەدەنو لەچـنگ عـەزابی خـودا رزگاریـان دەكـەن؛ دەفـەرموێ: ﴿أَفَحَسِبَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنْ يَتَّخِذُوا عِبَادِي مِنْ دُونِي أَوْلِيَاءَ﴾ ئایـا ئەوانـەی كافرنو بڕوایان بـەتاكو تـەنهایی خـودا نیـەو بەندایـەتی بـۆ مـن ناكـەن، سـەرباری

ئەوەش هاتوون ئەو بەندانەی من: کە لەژێر دەسەڵاتی خۆمدان: وەکوو فریشتەو عیساو ئەمثالی ئەوان، کردویانن بەپەرستراوی خۆیانو بەندایەتییان بۆ ئەنجام دەدەن، پێیان وایە: ئەو بەندایەتیکردنە بۆ ئەوان سوود بەخشەو عەزابیان لێ دوور دەخاتەوە؟ دەتوانن بەرهەڵستی خودا بکەنو نەهێڵن خودا تۆڵەیان لێ بسێنێ! جا کە مادام ئەوان بیرو باوەڕیان وەهایە دەبا سەرەنجامی ئەو بێ عەقڵیو نەفامییەیان وەربگرنەوە، با کاڵەك بەئەژنۆی خۆیان بشکێنن چونکە ﴿إِنَّا أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ نُزُلاً﴾ ئێمە دۆزەخمان بۆ کافرو تاوانباران ئامادەکردووەو بۆمان کردون بەمەنزڵو شوێنی مانەوەو حەوانەوە، ئای لەو مەنزڵو شوێنە؟؟ ئای لەو مەسکەنو شوێنی حەوانەوەیەی چاوەڕوانیانە، بۆیان دەردەکەوێ چۆن مەنزڵێکەو چۆن بۆیان ئامادە کراوە، بەراستی ئەو دۆزەخەی بۆ ئەوان ئامادەکراوەو چاوەڕوانیانە خراپ شوێنێکەو جێگایەکی دژوارو پڕ ئازارو ئەشکەنجەیە! (خودایە بەنسیبمان نەکەیو لێمانی دوور خەیەوە!)

ئەمجار پەروەردگار ئادەمیزادان لەبێ عەقڵیو نەفامی کافرەکان ئاگادار دەکاتەوە، کردەوەو هەڵوێستو بیرو باوەڕەکان کێشانە دەکاو لەسەنگی مەحەکیان دەداو دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً﴾ ئەی موحەممەد! بەو کافرە سەر رەقانە بڵێ: ئایا من هەواڵتان ئەدەمێ بەخەسارەتمەندترین کەسانێك لەکردەوەکانیاندا؟ ئەڵێم: کێ لەهەموو کەس زیاتر بەهەڵەچووە؟ ئەو کەسانەتان بۆ دەست نیشان ئەکەم: کە خۆیان ماندو کردوە لەکارو کردەوەیەکداو بەهیوای پاداشو جەزا وەرگرتنەوەن کەچی بەهیلاك چونو ئاکام بەپێچەوانەی مەبەستو هیوایان بوو. پێتان بڵێم: ئەو کەسانە کێن؟ ﴿الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً﴾ ئەوانە کۆمەڵێکن بەهەڵەچون، هەڵخەڵەتاونو رێگایان لێ تێك چووەو گومڕابونو کردوکۆیان بێهودەیەو مایە پوچن، لەحاڵێکدا بۆ خۆیان وا دەزانن کردەوەکانیان باشەو سودبەخشە بۆیان! چونکە ئەوان

لەگومڕایی دا دەژینو هەست بەسەر لێ شێواوی و هەڵخەڵەتاوی خۆیان ناکەن، رۆچون لەگومڕایی داو لەم کردەوەو کۆششە بێهودەیە واز ناهێنن! لەوە بەو خوە بۆیان دەردەکەوێ چەند خەسارەت مەنـدنو چەند مالۆێرانو بەد بەختو نەگبەتن!!

هۆی ئەو خەسارەتمەندیو بەد بەختییەیان ئەوەیە: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ﴾ واتە: ئەوانەی خەسارەتمەندو بەدبەختن، ئەو کەسانەن: کە ئینکاری ئایاتی پەروەردگار دەکەن، بڕوایان بەبەڵگەی تەکوینیو ئایاتی قورئان نیە: کە تاکو تەنهایی خودا دەچەسپێنن، بڕوایان بەزیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەو گەیشتن بەزاتی پەروەردگارو روداوەکانی تری قیامەت نیە.

ئەوانە کردەوەکانیان پووچ کراوەتەوە، کردەوەکانیان بێ سوودو بێ ئاکامە، ﴿فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً﴾ کردەوەکانیان هیچ نرخو رێزو گرانیەکیان لەتەرازووی ئەعمالدا نیە، هیچ ئەهمیەتیان پێ نادەین، پاداشو پاساوی کردەوەکانیان نیە، چونکە کردەوەکانیان بێ خێرن!

ئیتر ئەو کاتە جەزای دادوەرانە بۆیان لەسەر کردەوەکانیان دۆزەخە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُواً﴾ واتە: ئەو هەموو هەڕەشەو سزاو عەزابە لەسەر کردەوە بەتاڵەکانیان لەئاگری دۆزەخدا بەهۆی کوفرو بێدینیو گاڵتەکردنیان بەئایاتی خوداو قەشمەری کردنیان بەپێغەمبەرانو بەموعجیزەکانیانە، هەر بەوەندە نەوەستان بڕوا بەپەیامی پێغەمبەرەکان نەکەن، بەڵکوو ئەو جۆرە ئەحمەقیو نەفامییەشیان نواندن!!

## پاداشی موسوڵمانانو بەرفراوانی زانیاری خوداو تاكو تەنهایی

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی ئەو سزاو عەزابەی كرد: كە بۆ كافرەكانی ئامادە كردوە، هەروەها باسی ئەو نازو نیعمەتەیشی كرد: كە بۆ خوداپەرستانی داناوە، كۆتایی سورەتەكە بەوە دێنێ: كە زانیاری خودا بەرفراوانو بێ سەروبنەو هەرگیز كۆتایی نایە، ئەمجار ئەوەش روون دەكاتەوە: كە موحەممەد ئادەمیزادێكە وەكوو باقی ئادەمیزادانی ترو خودا هەڵی بژاردوە بۆ رابەریو كردویەتی بەپێغەمبەرو نیگاو سروشی بۆ ناردوە! ئەوەشمان پێ رادەگەیەنێ: كە رزگاربوونو سەرفرازی لەدونیاو قیامەتدا بەوە دەبێ ئینسان یەكتاپەرست بێو كرداری چاك بكاو كەس نەكاتە هاوەڵی خودا.

دەربارەی هۆكاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (١٠٩) ﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ...﴾ حاكمو هی تریش لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان كردوە؛ فەرموویەتی:

قورەیشییەکان بەجولەکەکانیان گوت پرسیارێکمان پێ بڵێن با لەو کابرایەی بکەین (مەبەستییان پێغەمبەر بوو ﷺ) ئەوانیش وتیان: پرسیاری لێ بکەن دەربارەی (روح) بڵێن: پێمان بڵێ: روح چیەو چۆنە؟؟ ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، ئیتر ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ نازڵ بوو، جولەکەکان وتیان: ئێمە زانیاری زۆرمان دراوەتێ، ئەوە نیە تەوراتمان دراوەتێ! کەسێك تەوراتی پێ درابێ زانیاریو خێرو بێرێکی زۆری دراوەتێ! ئەمجار ئایەتی ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِكَلِمَاتِ رَبِّي...﴾ نازڵ بوو.

دەربارەی هۆکاری نازڵبووی ئایەتی ژمارە(١١٠) ئیبنو ئەبی حاتەم لەموجاهیدەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پیاوێکی موسوڵمان لەدژی کافران دەجەنگاو شوێنەکەی ترسناك بوو، پێی خۆش بوو خەڵکی شوێنەکەی ببینن‌و چاویان لێ بێ لەچ شوێنێکی خەتەرە. ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا....﴾ی نازڵ کرد.

ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنو ئەبی دونیا لەکتێبی (الأخلاص)دا لەطاووسەوە ریوایەت دەکەن دەڵێن: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من لەغەزادا سەنگەر دەگرم‌و رادەوەستم مەبەستم رەزامەندیی خودایە، بەڵام لەهەمان کاتدا پێم خۆشە خەڵکەکە لەو شوێنە بم ببینن‌و بزانن لەچ شوێنێکی خەتەرم، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە هەتا ئایەتی ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾ نازڵ بوو. هەندێك دەڵێن: ئەم حەدیسە مورسەلە، حاکم لە(المستدرك)دا دەفەرموێ: مەوصوولەو طاووس لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتی کردوەو لەسەر مەرجی پیرانی فەرمووده (موسلیم‌و بوخاری) تەصحیحی کردوە.

ئێستاش بابزانین پاداش‌و سەرەنجامی خوداپەرستان چۆنەو چیە؟ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً﴾ خۆشبەخت‌و کامەران ئەو کەسانەن بروایان بەخودا کردوە، شوێن پەیمی

پێغەمبەرەکانی کەوتوون، کارو کردەوەی باشیان ئەنجام داوە، بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە یەکتاپەرستیان کردوە، پەیامی پێغەمبەریان کردوە بەمەنهەجو رێبازی خۆیان، کردەوەی باشو بەسوودیان ئەنجام داوە، پارێزگاری ئەرکەکانی سەرشانیان کردوە، هیوای رەزامەندیی خودایان هەیە، هەرچی دەیکەن مەبەستیان خودایەو خالص بۆ ئەوی دەکەن، ئەوانە باغەکانی فیردەوس شوێنو جێگای حەوانەوەو رابواردنیانە. ئەو باغانەی فیردەوس لای زورووی بەهەشتەو فراوانترینو باشترین شوێنی بەهەشتی رازاوەیە، ئامادەکراوە بۆ خوداپەرستانو بەجوانترین شێوەو شێواز رازێندراوەتەوەو ئامادە کراوە. (خودایە بەنسیبمانی بکەی!).

لەصەحیحی بوخاریو موسلیمدا لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت کراوە؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا سألتم الله الجنة، فأسألوه الفردوس، فانه أعلى الجنة، وأوسط الجنة، ومنه تفجر أنهار الجنة).

بەڵێ بەدەقی ئایەتەکە خوداپەرستان لەباغەکانی فیردەوسدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، وەڵێ نەفسی ئادەمیزاد حولحولییەو حەزی لەگۆڕانکاری هەیە، پێی ناخۆشە بۆ هەتا هەتایە لەشوێنێك بمێنێتەوە، دەیەوێ حاڵو گۆڕانی بەسەردا بێ، جاکە دڵنیابوو لەبەردەوامی نیعمەتو خۆشی لەوانەیە وەڕز بێو بیەوێ باری لێ بگۆڕێ، جا بۆ لابردنی ئەو خەیاڵەو رەواندنەوەی ئەو جۆرە بۆچونە، فەرمووی: ﴿خَالِدِينَ فِيهَا لا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلاً﴾ بۆ هەتا هەتایە لەو بەهەشتە خۆشو رازاوەدا دەمێننەوەو هەرگیز نایانەوێ لێی دەرچنو هەوڵی ئەوە نادەن ئەو حاڵەیان لێ بگۆڕێ و بکەونە بارو دۆخێکی ترو بگوێزرێنەوە بۆ جێگایەکی تر!

بەراستی ئەمە لەفتەیەکی وردو سەرنج راکێشە، قوڵو کاریگەرە لەدەروونی ئادەمیزاددا، پێویستی بەڵێ وردبوونەوەو تێرامانو هەڵوێستە هەیە بەو رستە کورتە پڕ مانایە سەرباری ئەوە: کە گومانی ئەوە دەرەوێنێتەوە کە بەهەشتیەکان

لەبەهەشت وەرزبن، ئەوپەڕی خۆشیو دڵگیری بەهەشتیشی تێدا رانوێنراوە! كوردی وتەنی: هێندە خۆشو دڵگیرە كەس دڵی نایەڵێی بگوێزێتەوە، كەس تێیدا بێ تاقەت نابێ، كەس لێی وەڕز نابێ، دەم لەدوای دەمو سات لەدوای سات زیاتر دڵیان پێدا دەچێو لەدڵیان شیرین تر دەبێو پتر وەگری دەبن!

سروشتی ئادەمیزاد كە لەدونیادا بەو شێوە داڕێژراوە حیكمەتێكی خودایی یەو بۆ ئەوەیە لەگەڵ ژیانی سەر زەوی بگونجێو بتوانێ رۆڵی خۆی تێدا بگێڕێ، ئەركی جێنیشینی خۆی لەسەر زەوی ئەنجام بدا، ئادەمیزاد لەژیانی دونیادا پێویستی بەگۆڕینو گەشە كردنو پێش خستنی ژیانی خۆی هەیە، تا دەگاتە ئەو ئەندازەیەی لەعیلمی خودادا بۆی دیاریكراوە. بۆیە خۆشەویستی گۆڕینو گۆڕانكاری لەسروشتی دا داڕێژراوەو حەزی لەپشكنینو فێربونو ئاڵو گۆڕی حاڵو وەزعی خۆی و دەورو بەری هەیە، ئارەزوی گۆڕینی بارودۆخو شوێنو جێگای خانوو بەرەی هەیە، دەیەوێ دیمەنەكانی پێش چاوی بگۆڕێنو یاساو رێساكانی ژیانی گۆڕانكاریان تێدا بێتە جێ! هەموو ئەم دیاردەو حەزو ئارەزۆ ویستەمەنیانەی ئادەمیزاد بۆ ئەوەیە: گۆڕانكاری لەواقیعی ژیاندا ئەنجام بداو رۆڵی كاریگەر لەسروشتدا بگێڕێو نهێنییەكانی بوونەوەر ئاشكرا بكا، داهێنانو دەست رەنگینی لەیاسای كۆمەڵدا بنوێنێ، شان بەشانی ئەم گۆڕانكارییانە زانستو زانیاری بەرەو پێش بچێو پلە بەپلە بگاتە ئەو پلە بەرزەی خودا بۆی دیاری كردوەو بتوانێ سروشت بخاتە گەڕ بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیو مرۆڤایەتیش بەكار بێنێ بۆ ئەنجامدانی بەندایەتی كردنی راستاڵانە بۆ بەدیهێنەری بونەوەرو بەم جۆرە بەختەوەریی هەردوو جیهان دەستەبەر بكا.

جا كە لەژیانی دونیادا ئەم سروشتە ئادەمیزادییە گونجاو بێ بۆ جێنیشینی ئادەمیزاد لەزەویدا، ئەوە بێگومان لەبەهەشتدا سروشتە ئادەمیزادییەكە رۆڵی نامێنێو لەگەڵ ژیانی بەهەشتدا ناگونجێ، چونكە بەهەشت بۆ خۆی مەنزڵگایەكی

تێرو تەسەلو رازاوەو بێ کەمو کوریە، لەهەموو رویەکەوە کەمالی موطلەقی هەیەو تەماعی ئەوە ناکرێ بەرەو پێشترو رازاوەتر بێ، بەڵکوو تەصەوریش ناکرێ.

کەوابێ ئەم سروشتە ئادەمیزادییەی دونیا لەقیامەتدا چ رۆڵێکی نامێنێو لەکار دەکەوێ. خۆ ئەگەر نەفسی ئادەمیزاد بەم سروشتە دونیایی یەی خۆی بمێنێتەوەو لەقیامەتیشدا هەمان رۆڵی کاریگەری هەبێ، ئەمجار لەو نازو نیعمەتە نەبڕاوەدا ژیان بەسەر بەرێ، پاش ماوەیەك ئەم نازو نیعمەتە دەبێتە دۆزەخ بۆ ئەو نەفسە سروشت حولحولییە. بەڵکوو هەموو بەهەشت دەبێتە بەندینخانە بۆ بەهەشتیانو حەزیان لەوە دەبێ ماوەیەك لێی بڕۆنە دەرێ تەبدیل هەوایەك ئەنجام بدەن!

وەڵێ خودای زاناو داناو بەدیهێنەر، خۆی ئەم نەفسەی ئادەمیزادی بەدی هێناوەو خۆیشی لەهەموو کەس باشتر دەزانێ چۆنەو چیە، بەقودرەتو زانایی خۆی ئەو سروشتە دونیایی یەی لێ دادەڕنێو وای رام دەکا؛ کە هەرگیزاو هەرگیز بەخەیاڵیش وەڕز بوونی لەو بەهەشتە بەسەر دڵدا رانەبوورێو بۆ هەتا هەتایە لێی تێر نەبێو کات دوا کات لەدڵی شیرینتر بێ!

ئەمجار باسی گەورەییو فەڕی قورئان دێنێتە پێشەوەو تەصەووری زانیاری ئادەمیزاد دەکا، کە لەبەرامبەر زانیاری خودادا وەکوو نەبوو وایە. زانیاری پەروەردگار لەزەینی ئادەمیزاد نزیك دەکاتەوە بەوە کە دەیخاتە چوار چێوەی نموونەیەکی ماددی بینراوەو، دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئەگەر وشەو رستەکانی زانیاری خودا بنووسرێتەوە، هەموو ئاوی دەریاکان ببنە مەرەکەبی ئەو قەڵەمو پێنووسەی وشەو زانیاری پەروەردگاری پێ دەنووسرێتەوە، بێگومان ئاوی دەریاکان کۆتایی دێت پێش ئەوەی وشەو رستەکانی زانیاری خودا تەواو ببێ، ئەگەر دەریایەکی تریش بخەینە پاڵیو دەریایەکی ترو

یەکی تـریش بخەینـە پـاڵی‌و بکرێنـە مەرەکەب دەریاکـان دەبڕێنـەوە هێشتا وشـەو ڕستەکانی خودا بەکۆتا نایەن! چونکە زانیاری خـودا بـێ پایانـەو سـەرو بنـی نیـە، بـەڵام دەریاکـان سـەرو بنیـان هەیـەو کۆتاییـان دێ، ئایەتەکـە ئاماژەیـە بـەزۆری‌و بـەفراوانی زانیـاری خـوداو نەبڕانـەوەی بـەجۆرێك کـە قەڵـەم‌و کتێـب‌و نووسـین کۆنترۆڵی ناکەن‌و دەرەقەتی نایەن!

تەنانــەت ئەگــەر هەرچـی چـیلکەو داری سـەر زەوی هەیـە ببنـە قەڵـەمی نووسین‌و دەریاببێتە مەرەکەب‌و حەوت دەریای تریش بێنە پاڵی‌و زانیاری خودایان پـێ بنووسـرێ دەریاکـان تـەواو دەبـن‌و کـەلیماتی خـودا کۆتاییـان نایـە، وەکـوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (لقمان/٢٧).

ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵـێ: زانیـاری هـەموو ئـادەمیزاد لەبەرامبـەر زانیـاری خودا وەکوو دڵۆپە ئاوێك وایە لەبەرامبەر ئاوی دەریاکان هەموویان!

دەگێڕنـەوە دەڵێن: حویەی کوڕی ئەخطەبی جولەکە بەموسوڵمانەکانی گوت: من سەیرم لێ دێ، ئێوە لەقورئانەکەتاندا هاتووە ﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً﴾ کەچی لەهەمان کاتدا ئایەتێکی تـر دەخوێننـەوە کـە دەڵێ ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ ئەمـە چـەندی بەچـەندە؟ واتـە: بەخـەیاڵی خۆی دژایەتی لەنێوان ئایەتەکاندا دۆزیبووەوە! ئیتر ئەم ئایەتە نـازڵ بـوو ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً...الآية﴾ بۆ دەم کوتکردنی ئەم جۆرە هەڵەوەڕانە! بێگومان زانیاری تازە ئەوەی چەسپاندوە: کە لە زەوی‌و ئاسمانەکان دا هێندە نیعمـەت زۆرن لـەژمارە نایەن‌و سەر ژمێر ناکرێن!

خـاوەنی تەفسیری مـەراغی لەتەفسیرەکەیدا وتەیـەکی مامۆسـتا (جیـنس)ی ئینگلیزی تۆمار کردوە: کە مامۆستای زانیاری ڕیاضیاتـی تـەطبیقـیـە لەدانیـشگای

(بنسلفانیا)ی ئەمریکاو لەرۆژی (١٩٢٧/٢/٧) رای گەیاندوە، ئەمەش تازە ترین لێکۆڵینەوەی زانستییە دەربارەی بونەوەر. دەڵێ:

١- تەمەنی زەوی نزیکەی دوو ملیون ساڵە.

٢- ئادەمیزاد نزیکەی سێ سەد هەزار ساڵێك دەبێ لەسەر زەوی پەیدا بووە.

٣- خۆر لەسەر ئەم حاڵەتەی خۆی دەمێنێتەوە بۆ ماوەی هەزار ملیون ساڵی ترو بەدەوری زەویدا دەسورێتەوە وەکوو ئێستا.

٤- ئادەمیزاد لەداهاتوودا بەتواناتر دەبێ، بەرێژەی سێ ملیون هێندەی ئێستاو ژیانی خۆی بەگوێرەی بارودۆڵای کورەی زەوی ئەو کاتە دەگونجێنێ.

٥- لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ ئادەمیزاد تازە پەیدا بووە لەسەر زەوی‌و تەمەنی ئەو لەبەرامبەر زەویدا زۆر کەمو کورتە بەمنداڵێکی تازە لەدایکبوو دەژمێردرێ، رێژەی زانیاریشی لەهی منداڵ تێپەڕ ناکا. هەموو هەوڵو تەقەلاّیەکی بۆ دەستەبەر کردنی خۆراکو پۆشاکو خانوو بەرمیە! ئێستا لەزۆر کونو قوژبنی بوونەوەر بێ ئاگایە، بەلاّم وا خەریکە هەندێ زانیاری دەربارەی هەندێ لەجیهانەکانی بوونەوەر پەیدا بکا، بەلاّم زانیارییەکی سەرەتایی‌و کەمو بێ بایەخ..

وێ دەچێ لەمەدوا ئادەمیزاد دوو هەزار ملیون ساڵی تر لەسەر زەوی بژی!

٦- ئەو قەبارانەی بەدەوری ئێمەوەن ئەم سەرو ئەوسەریان هەیە، بەلاّم بۆشایی دوا ئەوان ئەمسەرو ئەو سەری نیە، خۆرو مانگو مەجەرەکان سەرو بنیان هەیە، بەلاّم بۆشایی پشت ئەوان بێ کۆتایی‌و سەرو بنە!

٧- ئەو قەبارە بەرزانەی ئێمە دەیان بینین‌و ئەوانەی نایان بینین هەموویان قەبارەی خڕن وەکوو خۆرو مانگو زەوی..

٨- ئەو ئیشاراتە خسلكییانەی لەئامێری لاسلكی گەورەوە دەردەچن لەماوەی كەمتر لەحەوت چركەدا بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوەو خولێكی تەواو دەكاو دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو خاڵەی لێوەی دەرچووە!

٩- ئەگەر دووربینێكی پێشكەوتوو گەورە دروست بكەین‌و پێی بڕوانینە قەبارەكانی بەرزایی ئەستێرەكان دەبینین ئێستاش لەسەر ئەو حاڵەن: كە پێش ملیونەها ساڵ روناكییان بۆ ناردوین.

١٠- ئەمڕۆ ئادەمیزاد لەبارەی زانیاری‌و زانستەوە بەساوا دەژمێردرێ، لەوانەیە لەداهاتوودا زانیاری وا بەدەست بێنێ: كە ئێستا بەخەیاڵیش پەی پێ نابەین!

١١- خێرایی ڕێگا بڕینی روناكی لەچركەیەكدا (١٨٦) هەزار میلە، كارەبای (لاسلكی)یش هەمان خێرایی هەیە، چونكە لەجەوهەردا یەكن. وا مەزندە كراوە: كە روناكی بەدەوری بۆشایی كورەویدا سەد هەزار ملیون ساڵ ڕێگا دەبڕێ، واتە: روناكی بۆ ئەنجامدانی خولێك بەدەوری هەموو قەبارە بەرزەكان دا كە هەموویان كۆمەڵە قەبارەیكی خڕ پێك دەهێنن ماوەی سەد هەزار ملیون ساڵی گەرەكە!! ئەمە لەكاتێكدا كە لەماوەی حەوت چركەدا بەدەوری زەویدا خولێك ئەنجام دەدا! دەی جا بۆ خۆت تەصەوری بەرفراوانی قەبارەكان بكە. حەوت چركە لەبەرامبەر سەد هەزار ملیون ساڵدا دابنێ. وەڵێ ژمارەو رەقەم ناتوانن مەسافەی نێوان هیچ دوو خاڵێكی سەر موحیطی بۆشایی كورەوی دیاری بكەن!

١٢- قەبارەی خۆر ملیۆنێك‌و سێ سەد هەزار جار لەقەبارەی زەوی گەورەترە، لەكاتێكا خۆر بەبەردەوردەیەكی ناو بۆشایی كورەوی دەژمێردرێ‌و لەچاو بەرفراوانی بونەوەردا هەر هیچ نمودی نیە! خۆر یەكێكە لەكۆمەڵێك لەكۆمەڵانی ئەو كائناتانەی ناو بۆشایی كورەوی: كە زانای بەناو بانگ (سیرز) بەسی ملیون

کۆمەڵـە مەزنـدەی کـردون، خـۆرو ئـەو ئەسـتێرانەی سـەر بەکۆمەڵـەی (خـۆری) بەردوچکەیەکن لەکۆمەڵێك لەو سی هەزار کۆمەڵەیە!

١٣- بچوکترین ئەستێرە ئەستێرەی (فان ماتن)ە، قەبارەی بەئەندازی قەبارەی زەوییە. گەورەترین ئەستێرە ئەستێرەی جەوزایـە: کـە بیـستو پێـنج ملیـون جـار قەبارەی لەقەبارەی خۆر گەورە ترە.

١٤- خۆر هەموو دەقیقەیەك بـەهۆی بەخـشینی تیـشکەکەی دوو سـەدو پـەنجا ملیون طەن مادە صەرف دەکا، واتە: لەرۆژێکدا سێ سەدو شەست هەزار ملیون طن وزە دەبەخشێ!

١٥- وا گومان دەبـرێ: ئێـستا تەمـەنی خـۆر دە هـەزار ملیـون سـاڵ بـێ! وا پـێ دەچێ کە ملیون ملیون ساڵی تر نەکوژێتەوە.!

ئەمە برێ لەراو بۆچونی زانایانی فەلەکە، لەسەردەمی تازەدا بەلێکۆڵینـەوەو مەزنـدە کـردن بەیدەسـتیان کـردوە. کـە دەکـرێ بکرێنـە رێخۆشـکەرەو راڤـەکردنی ئایەتی ﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِكَلِمَاتِ رَبِّي...الآية﴾.

ئـا ئەمەیـە کـەلیماتی خـوداو ئـەو مانایـە لەئایەتەکـەدا مەبەسـتە، ئـەو کەلیماتانەیە کە هەرگیز لەبڕانەوە نایەنو، عەقڵو هۆشی ئادەمیزاد تێیاندا کـۆڵو کۆڵەوارە. زۆر کـەس تەمـەنی خـۆیـان لەلێکۆڵینـەوەی ئـەم بوارانـەدا خـەرج کـردوە نەگەییـشتونە هـیچو بـەردەوامیش زانایـان خـەریکی لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەنو زانیاریەکی کەم نەبێ بەدەستیان نەهێناوە.

﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ ئەی موحەممەد! بـەو موشـریکانە بڵـێ: مـن تـەنها ئـادەمیزادێکم وەکـوو ئێـوە، لەئادەمیزادیەتیـدا هیـچم لەئێوە زیاتر نیە، هەرگیز لافی ئـەوە لێ نـادەم: کـە مـن زانیـاری هـەموو کـەلیماتی خودام بەدەست هێناوە! مـن تـەنها ئـەو زانیارییـەم هەیـە کـە خـودا فێـری کـردوم.

پەروەردگار نیگام بۆ دەکا بەوە: کە خودای ئێوە خودایەکی تاکو تەنهایە، شیاوی ئەوەیە بەندایەتی بۆ بکرێو تەنها هەر ئەو مافی ئەوەی هەیە بپەرسترێ! خودایەکی تاکو تەنهاو بێ شەریکو بێ نەظیرە.

ئەمن ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە، تەنها ئەوەم لەئێوە جوداوازە کە خودا نیگای بۆ ناردووەو کردومی بەپێغەمبەر بۆ سەر ئێوەی ئادەمیزاد رەوانەی کردوم! ئادەمیزادێکم زانیاریم بۆ دێ لەو سەرچاوە لەبن نەهاتوە لەو زانیارییە بێ سەرو بنەی: کە ئەگەر دەریاکان ببنە مەرەکەبو ئەو زانیارییەیان پێ بنووسرێتەوە دەریاکان کۆتاییان دێو زانستی خودا بەکۆتا نایە.

من ئادەمیزادێکم شوێن هیدایەتی خودا کەوتومو لێی لانادەم جا ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً﴾ کەسێك بەتەمای پاداشی خودایەو دەیەوێ بەر رێژنەی رەحمەتی خودا بکەوێ، با دڵسۆزانە طاعەتی خودا بکا، تەنها پەرستشو بەندایەتی بۆ خودا ئەنجام بداو کەس نەکاتە هاوەڵو هاوشانی خودا، وریابێ خۆی لەشیرکی ئاشکراو نهێنی بپارێزێ! شیرکی ئاشکرا وەکوو بتپەرستیو گەردنکەچی بۆ ملهوڕانو طاغوتو پەیڕەوی کردنی فەرمانو نەهییەکانیان....هتد.

شیرکی نهێنی وەکوو کردنی کاری چاکو بەسوود بەمەستی ناوو شۆرەت دەرکردنو ریا بازی: کە ئەم جۆرە کردەوەو هەڵوێستانە پێشیان دەگوترێ (الشرك الأصغر).

ئیمامی ئەحمەد لەمەحموودی کوڕی لەبیدەوە فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان أخوف ما أخاف عليكم الشرك الأصغر، قالوا: وما الشرك الأصغر يا رسول الله؟ قال الرياء، يقول الله يوم القيامة، إذا

جزی الناس بأعمالهم: اذهبوا إلى الذين كنتم تراؤون في الدنيا، فانظروا هل تجدون عندهم جزاء؟).

واتە: ئەوەی من ترسم هەیە لەسەر ئێوە هاوەڵدانانی بچوکە، هاوەڵان وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! هاوەڵدانانی بچوك چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ریابازییە، رۆژی قیامەت کە ئادەمیزادەکان پاداشی کردارەکانی دونیایان وەرگرتەوە پەروەردگار بەریابازەکان دەفەرموێ: ئێوە بڕۆن پاداشی خۆتان لای ئەوانە وەربگرنەوە کە لەدونیادا ریابازیتان بۆ دەرکردن، بزانن ئاخۆ هیچ پاداشیان لایە بتاندەنێ؟؟

ئەحمەدو موسلیمو هی تریش لەئەبو هورەیرەوە ئەویش لەپێغەمبەرەوە فەرموودەیەکی قودسی ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پەروەردگار دەفەرموێ: (أنا خير الشركاء، فمن عمل عملا أشرك فيه غيري فانا بريئ منه وهو للذي أشرك)

ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: پەروەردگار لەکۆتایی ئەم سورەتەدا لەسێ ئایەتدا ئاماژە بەوە دەکا: کە لەقیامەتدا خودا دەبینرێ!

یەکەم: ئایەتی ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ﴾

دووەم: ئایەتی ﴿كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلاً﴾

سێیەم: ئایەتی ﴿فَمَنْ كَانَ يَرْجُوا لِقَاءَ رَبِّهِ﴾.(٤)

بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (الكهف) تەواو بوو

خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...

(٤) تفسير الرازی ج٢١/١٧٧.

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی مەریەم

ناونـانی ئـەم سـورەتە بەسـورەتی مەریـەم لـەم ڕووەوەیـە: کـە نـاوی خـاتو (مەریەم)و چیرۆکی سك پڕ بوونی بەحـەزرەتی عیـسا بـەبێ ئـەوەی شـووی کردبـێ لەخۆگرتووە. باسی لەدایکبوونی عیساو هەندێ لەموعجیزەکانی تێدا تۆمار کراوە.

پەیوەندی ئـەم سورەتە بەسـورەتی (الکهـف)ەوە لـەم ڕووەوەیـە: کـە هـەردوو سـورەتەکە (الکهــف، مــریم) چـیرۆکی سـەرەنج ڕاکێـشیان لـەخۆگرتوون. ئـەوەتا سورەتی (الکهف) چیرۆکی ئەصحابولکەهفـو چیرۆکی حـەزرەتی موسـاو حـەزرەتی خضرو چیرۆکی ذیلقەرنەینی تێدا بوو.

سورەتی (مریم)یش دوو چیرۆکی سەرسوڕهێنەری تێدان: یـەکێکیان: چـیرۆکی لەدایکبوونی حەزرەتی یەحیای کوڕی زەکەرییا. لەحاڵێکدا زەکەریيا پیرو کەنـەفت بـوو، خێزانەکەشـی نـەزۆك بـوو، واتــە: حــەزرەتی یــەحیا لـەباوکێکی کەنــەفتو دایکێکی نەزۆك بەوەلەد بووە. ئەمـەش خـۆی لـەخۆیدا مـوعجیزە بـووە. هـەروەها چیرۆکی لەدایکبوونی عیسا ﷺ بەبێ ئەوەی باوکی هەبێ.

**ئەو سەرەباسە گرنگانەی سورەتـەکە لەخۆی گرتوون ئەمانەن:**

١- یەکتاپەرسـتی: جەمــسەری ئــەم سـورەتە باســی یەکتاپەرسـتییە دوور خستنەوەی خودا لەوەی: کە منداڵو هاوەڵو خێزانی هەبێ.

٢- گرنگییەکی زۆر دەدا: بەمەوزوعی زیندوو بوونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت: کە ئەمیش پابەندە بەمەوزوعی یەکتاپەرستییەوە، ئـەم دوو مەوزوعـە جەمـسەری سـورەتەکەنو ئایەتـەکان بـەدەوری ئـەم دوو سەرەباسـەدا دەخولێنـەوەو شـییان

دەکەنـەوە. هـەروەکوو بـاقی سـورەتە مەکییـەکانی تـر: کـە زۆر گرنگـی بـەم دوو مەوزوعە دەدەن!

هەڵبەتـە چـیرۆكو سەرگورشـتە روبـەرێکی زۆری سـورەتەکەیان گرتۆتـەوە. بەشێکی زۆری سورەتەکە لەم چیرۆك و سەرگوزەشتانە پێك هاتووە، سەرەتا دەست دەکـا بەچـیرۆکی زەکـەرییاو یـەحیا، ئـەمجار سەرگورشـتەی خـاتوو مەریـەمو لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا، ئەمجار لایەنێکی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیمو گفتو گـۆی لەگـەڵ بـاوکی دا رادەنــوێنێ، ئـەمجار هەنـدێ ئامـاژەو تیـل نیـشان بـۆ پێغەمبـەرانی وەکـوو: ئیـسحاقو یـەعقوبو موسـاو هـارونو ئیـسماعیلو ئیـدریسو ئادەمو نـوح دەکـا، ئـەم چیرۆکانە نزیکـەی دووبـەش لەسێ بەشـی سـورەتەکە پێـك دەهێنن. مەبەسـتی سـەرەکیش لـەم چـیرۆکانە چەسپاندنی یەکتاپەرستیو هـاتنی رۆژی قیامـەتو زیندووبوونـەوەو تـاكو تـەنهایی پـەروەردگارو بـێ هـاوەڵیو بـێ منداڵیو بێ خێزانی زاتی پاکیەتی.

هەروەها جودا کردنەوەی پەیڕەوو پڕۆگرامی هیدایەتدراوان لەهی گومڕایان، بۆیە لەسورەتەکەدا هەندێ دیمەنی قیامەت رادەنوێنێو برێ جەدەلو کێشە لەگەڵ بێ بڕوایان ساز دەکا، بەشێوەیەکی گشتی سیاقی سورەتەکە سەرەباسەکانی لەسێ قۆناغدا نمایش دەکا:

## قۆناغی یەکەم:

چیرۆکی حەزرەتی زەکەرییاو یەحیاو چیرۆکی حەزرەتی عیساو توێژینـەوەو تەعقیب لەسەر چیرۆکەکانو ئەو کێشەو نیزاعەی دەربارەی حـەزرەتی عیـسا لـەناو جولەکەو مەسیحی یەکاندا پەیدا بووە، رادەنوێنێ!

## قۆناغی دووەم:

لایەنێك لەچیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ باوكیو گەلەكەداو گۆشەگیربوونی حەزرەتی ئیبراهیم لێیانو قەرەبوو كردنەوەی پەروەردگار بۆی، بەوە: كە لەجیاتی لەدەستدانی گەلو نەتەوەكەی وەچەو نەوەیەكی پیرۆزو خواپەرستی پێ بەخشیو چەندەها پێغەمبەر لەوەچەو نەوەی ئەو ڕەوانە كراون، ئەمجار ئاماژە دەكا بۆ چیرۆكو سەرگورشتەی پێغەمبەرانو ئاكامو سەرەنجامی شوێنكەوتوانیانو دژو بەرهەڵستكارانیان! كۆتایی ئەم قۆناغە دێنێ بەراگەیاندنی سەلماندنو چەسپاندنی پەروەردگاریەتی بۆ خوداو تاكو تەنهاییو بێ هاوەڵی، دەفەرموێ: ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِهِ هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيّاً ؟؟﴾.

## قۆناغی سێیەم و كۆتایی:

بریتییە لەكێشەو نیزاعی بەرپابوو دەربارەی زیندووبوونەوەو هاتنی قیامەتو هەندێ دیمەنی ئەو ڕۆژە سامناكە رادەنوێنێ، وێنەیەكی نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بەوانەی هاوەڵ بۆ خودا قەرار دەدەن رادەگەیەنێو دیمەنێكی كاریگەری لەناوچوونی گەلە پێشینەكان رادەنوێنێ دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزاً﴾.

سورەتەكە هەمووی مەككەییە، جگە لەئایەتی ژمارە (٥٨)و ئایەتی (٧١) ئەوان مەدینەیین.

لەفەضلو ڕێزی ئەم سورەتەدا موحەممەدی كوڕی ئیسحاق لەسیرەكەیدا حەدیثێك لەئوممو سەلەمەوە ریوایەت دەكا، هەروەها ئەحمەدی كوڕی حەنبەل لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەت دەكا دەفەرموێ: جەعفەری كوڕی ئەبو طالیب كە

لەگەڵ هاوەڵاندا سەرەتا کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو چوونە لای نەجاشی داوای لەجەعفەر کرد بزانێ ئاخۆ قورئانی پیرۆز چۆن باسی حەزرەتی عیسای کردوە؟ جەعفەر لەسەرەتای سورەتی مەریەم هەندێکی قورئان بۆ خوێندەوە.

## پاڕانەوەی حەزرەتی زەکەریاو داوا کردنی لەخودا بۆ ئەوەی منداڵی پێ بداو، مزگێنی پێدانی بە(یەحیا)

﴿ كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّى خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِىَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ

رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً ۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾

لەقورئانی پیرۆزدا زەکەریا هەشت جار ناوی هاتووە. بەم جۆرە لەسورەتی (آل‌عمران)دا ئایەتی (٣٧-٣٨)، لەسورەتی (الأنعام)دا ئایەتی (٨٥)، لەسورەتی (مريم)دا ئایەتی (٢و٩) لەسورەتی (الأنبياء)دا ئایەتی (٨٩).

حەزرەتی زەکەریا: کە باوکی حەزرەتی یەحیایە بەش‌و بەرپرسیارییەکی لەخزمەتکردنی هەیکەلدا هەبوو. حەزرەتی مەریەم: کە دایکی نەزری کردبوو بۆ خزمەتکردنی هەیکەل، دەبوو سەرپەرشتیارێکی هەبێ، حەزرەتی زەکەریا بوو بەسەر پەرشتیاری، زەکەریا بەخزمایەتی دەبوە مێردی پوری مەریەم.

جا کە حەزرەتی زەکەریا بەچاوی خۆی هەڵس‌و کەوتی خاتو مەریەمی دەبینی‌و دەیزانی خودا رێزو قەدری لێ دەگرێ‌و رزق‌و رۆزی تایبەتی لەغەیبەوە بۆ فەراهەم دەهێنێ، ئەویش حەزی چووە ئەوەی خودا منداڵێکی ئاوا صالحی پێ بدا، وەکوو قورئان ئاماژەی پێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾(آل‌عمران/٣٨). ئیتر پەروەردگار دوعاکەی گیرا کردو فریشتەی ناردە خوارێ مۆژدەی یەحیایان پێ دا، ئەو کاتە حەزرەتی زەکەریا لەتەمەنی پیری دا بوو، خێزانەکەشی نەزۆك بوو! باوکی زەکەریا ناوی (بەرخیا) بوو. پێویستە ئاماژەی ئەوەش بکەین: کە کابرایەکی تر هەیە بەناوی

(زەکەرییای کوڕی بەرخیا) کتێبێکی قانوونی داناوە، هاوچەرخی (داریوس) بووە نزیکەی سێ سەدە پێش حەزرەتی عیسا بووە.[1]

﴿كهيعص﴾ ئەم وشەیە بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: (کاف، ها، یا، عین، صاد.) بەڵام دەبێ لەخوێندنەوەدا نوونی (عین)ەکە لە(صاد)دا دەغم بکەین!

وەکوو لەوەپێش چەند جارێك ئاماژەمان پێ کردوە، مەبەست بەهێنانی ئەم جۆرە پیتانە بەدابڕاوی‌و پچڕ پچڕی لەسەرەتای هەندێ سورەتدا بۆ تەحەددا کردنی عەرەب‌و غەیری عەرەبە، تەحەددایان دەکاو پێیان دەڵێ: ئەم قورئانە لەم جۆرە پیت‌و وشانە پێك هاتووە. دەی کە ئێوە ئازان‌و بەخۆتان رادەپەرمون: وێنەی ئەم قورئانە یان وێنەی (دە) سورەت یان وێنەی سوڕەتێکی ئەم قورئانە با کورترین سوڕەتیشی بێ بخەنە بەردەست! ئەوە عەرزو ئەوە گەز! هەڵبەتە ئەوە هەزارو چوارسەدو بیست ساڵە قورئان ئەم تەحەددایەی کردوەو تا ئێستا بەمەلایین نووسەرو شاعیرو رەوانبێژی عەرەب‌و غەیری عەرەب هاتوون‌و رۆییشتوون، ئەگەر بۆیان بکرایە ئەم تەحەداو بۆڕدانەیان قبوول نەدەکردو بەرەنگارییان دەکردەوە، بەڵام دیارە کەس ناتوانێ‌و کەس نەیتوانیوە ئەو تەحەددایە رەت بکاتەوە! چونکە قورئان شاکاری یەزدانەو هەر کەسێ بەرەنگاری بکا سەری خۆی لەبەرد دەداو ناماقوڵی دەکاو دەبێتە گاڵتەچی زەمانە!

هەندێك پێیان وایە: ئەم پیتانە بێ مانان، یان ئیشارە دەکەن بۆ نهێنی یەکی تایبەتی، یان ناوە بۆ فلان، یان ئاوەڵناوە بۆ فیسار! بەڵام ئیمامی ڕازی دەفەرموێ: دروست نیە، پەروەردگار شتێك بخاتە ناو کتێبی خۆیەوە: کە لۆغەت هەڵی نەگرێ. بەحەقیقەت‌و بەمەجاز مانا نەگەیەنێ! چونکە ئەگەر ئێمە ئەم دەرگایە بکەینەوە، ئەو کاتە ڕێگا بۆ ئەوانە دەکەینەوە: کە دەڵێن: هەموو وشەو رستەیەك مانایەکی

[1] قصص الأنبياء للنجار (ص٣٦٨).

(ظاهير)و مانايەكی (باطنی) هەيە، ئەمجار ئەوانە بەئارەزۆی خۆيان بەبێ بەلگە مانا (باطن)يەكە دەستنيشان دەكەن! ئەگينا چ بەلگەيەك هەيە پيتی (كاف) بسەپێنێ بەسەر (الكريم) يان (الكبير) كەناوی خودان، يان ناوێكی پێغەمبەر ﷺ يان ئاوەڵناوێكی، يان ئاماژە بێ بۆ فريشتە يان بەهەشت يان دۆزەخ يان بۆ شتێكی تر؟؟ بێگومان دابڕينی ئەم پيتە بەسەر يەكێ لەم مانايانەدا سەپاندنی شتی بێ بەلگەيە بەسەر شتدا!!

﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا﴾ ئەمە يادو بير خستنەوەی رەحمەتو نيعمەتی خودای تۆيە ئەی موحەممەد! بۆ بەندەی راستاڵو خودا ناسی خۆی؛ كەزەكەرييايە، بۆ تۆی دەگێڕينەوە بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگری، پێی بەهرەوەر ببی، زەكەرييا پێغەمبەرێكی رێزدار بوو لەپێغەمبەرە بەرێزەكانی نەتەوەی ئيسرائيل. خێزانەكەی پوری حەزرەتی عيسا بووە (هەندێك دەڵێن: پوری مەريەم بووە).

حەزرەتی زەكەرييا دارتاش بووە، بەدارتاشی خۆی ژياندوە.

﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾ ئەو كاتەی بەنهێنیو پەنامەكی لەخودا پاڕايەوە، وا لەخودا پاڕايەوە كەس ئاگای لێ نەبێ، لەريياباڒيی دوور بێ، گۆشەگيربوو لەخەڵكو ئەمجار لەبەر خودا پاڕايەوەو لالايەوەو دەستی نزای بەرز كردەوە، شكوای حاڵی خۆی كردو چی غەمو پەژارەی لەدڵی دابوو خستيە ڕو (هەرچەندە خودا بەبێ ئەوەش دەيزانی چ لەدڵی دايە). وەڵێ غەمبارو پەژموردە بەپاڕانەوەو غەم هەڵڕشتن دڵی ئارام دەگریو پێی خۆشە پێداويستی خۆی رابگەيەنێ! پەروەردگاريش: كە خاوەنی رەحمو بەزەييە بۆ بەندەكانی ئاگاداری سروشتی ئادەميزادە پێی خۆشە هاواری لێ بكەن، هانای بۆ بەرن، دڵتەنگی خۆيانی بۆ لا بەرز بكەنەوە، ئەوەتا فەرمانی پێ كردون بانگی لێ بكەن، دوعاو پاڕانەوەی ئاراستە بكەن بۆ ئەوەی ئەعصابيان خاو ببنەوە، قورسايی و ناڕەحەتييان لەسەر سوك

ببێ، هەست بکەن کە داوای یارمەتیو لابردنی غەمو پەژارەیان لەکەسێك کردوە خاوەنی هێزو توانایە، کەریمی کارسازەو فریاد رەسە. هەست بکەن: کە پەیوەندییان بەزاتێکەوە هەیە هەر کەسێك بەدڵو ئیخلاص پەنای بۆ بەرێ ناهومێد نابێ، هەر کەسێ پشتی پێ ببەستێ رەنج بەخەسار نیە!

ئەمجار شێوەی دوعاو نزاکە شی دەکاتەوە ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾ ئەی خودایە! ئەمن ئێسقانەکانم پۆڵکاون، هێزم تێدا نەماوە، پیرو کەنەفت بووم، چونکە: ئێسقان راگرو جیسرو کۆڵەکەی جەستەیە، کە ئەو پۆڵکا ئیتر هەموو جەستە دەپۆڵکێ، هیچ ئەندامێکی لەش هێزو توانای تێدا نامێنێو ئەرکی خۆیان نەنجام نادەن هەروەها ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً﴾ موی سەرم دەڵێی گڕی تێبەر بووە، زۆر بەخێرای رەشی مووی سەرم سپی هەڵدەگەرێو هەر دەڵێی ئاگر بەربوومتە بۆشو پەخشو پێوە دەچێ رەشایی لەسەرم نەهێڵێ.

حاجی وتەنی:

کوێستانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ! یارم تۆراوەو ئاشتی نابێتۆ!

پەروەردگارا! ئەمە حاڵی منە لەپیریو کەنەفتەییو پەککەوتەیی دا هانات بۆ دێنم لێت دەپارێمەوە، بەفریام کەوەو ناهومێدم مەکە. ﴿وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً﴾ خودایە! من هیچ کاتێ لەئاکامی پارانەوەو دوعا کردنمدا بۆلای تۆ ناهومێد نەبووم، هەرگیز رەنجەڕۆ نەبووم، من لەوەپێش لەکاتی گەنجیو بەهێزو تواناییمدا کە هانام بۆ هێناوی فریام کەوتووی، کاری گرانم بۆ ئاسان بووە، لەتەنگو چەڵەمە رزگارت کردوم. ئێستا کە پیرم بومو ئێسقانم پۆڵکاون، هێزو توانام نەماوە، زیاتر جێگای بەزەییمو پتر بەهیوای فریارەسی تۆم، زۆرتر پێویستیم بەرەحمەتو یارمەتی تۆ هەیە، هیوادارم بەهانامەوە بێیو نیعمەتو رەحمەتی خۆتم بەسەردا برێژی!!

ئـەمجار ئـەوەی مەترسـی لێ پەیـدا کـردوە رایدەگەیـەنێو عـەرزی بارەگـای پەروەردگاری دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَإِنِّـي خِفْـتُ الْمَـوَالِيَ مِـنْ وَرَائِـي وَكَانَـتْ امْرَأَتِـي عَاقِراً﴾ ئەمن ترسـی ئـەوەم هەیـە ئـامۆزاو خزمـەکانم لـەدواخۆم کاروبـاری ئـایینی بەباشی ئەنجام نەدەن، پاش مردنم واز لەبانگەوازیی بۆ ئایینو خوداپەرستی بێنن، سەرباری ئەوەی بۆخۆم پـیرو کەنـەفت بـوم خێزانەکەشـم نەزۆکـە، منـداڵمان نیـەو وەجـاخ کوێرم، کـەس نیـە جـێ نـشینم بـێ، خـزمو کـەسو کارەکانیـشم زۆر رویـان لەئایین نیەو خەریکن روبکەنە شەڕو فەساد، ﴿فَهَبْ لِي مِنْ لَـدُنْكَ وَلِيّـاً﴾ خودایـە! لەلایەن خۆتەوە بـەلوطفـو رەحمـەتی خـۆت لەپـشتی خـۆم کـوڕێکم پـێ ببەخـشە، ﴿يَرِثُـنِي﴾ میراتـی پێغەمبەرایـەتیو رابـەری ئـایینی لـەمن بگـرێ ﴿وَيَـرِثُ مِـنْ آلِ يَعْقُوبَ﴾ میراتو کەلەپوری بنەماڵەی یـەعقووبی کـوڕی (مـاثـان)یـش وەرگـرێ کـە ریش سپێتیو پیاوماقووڵیو فرمانڕەواییو زانستو زانیارییە.

کولەبی دەڵێ: لەو رۆژگارەدا بنەماڵەی (ماثـان) پاشـاو فـەمانڕەوای نەتـەوەی ئیسرائیل بوون. حەزرەتی زەکەریاش سەرۆکی ئەحبارەکان بوو.

﴿وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيّاً﴾ خودایـە! ئـەو کـوڕەی پـێم دەبەخـشی منـداڵێکی ساڵحو راستاڵ بێ، تەقواکارو هەڵبژاردە بێ، خۆت لەکردارو گوفتاری رازی بـی، بەنـدەکانت لێی رازی بنو خۆشیان بوێ، شیاوی ئەوە بێ پەیامی دین هەڵگرێو بڵاوی بکاتەوەو فێری خەڵکی بکا، رابەری ئایینیو کاروباری دونیایی خزمو نەتەوەکەم بـێ! وەکـوو وتمان: حەزرەتی زەکەریا مێردی. خوشکی خاتو مەریەم یان مێردی پووری بـووە. خـاتو مەریـەمو پـووری لەوەچـەی یـەعقووب بـوونو دەچـنەوە سـەر حـەزرەتی سولەیمانی کوڕی حەزرەتی داود، ئەمیش کوڕی یەهوزای کوڕی یەعقووبە.

حەزرەتی زەکەرییا کوڕی حەزرەتی هاروونە؛ کە برای حەزرەتی موسا بووە. حەزرەتی هاروونو حەزرەتی موسا کوڕی (لاوی) کوڕی یەعقووبن، پێغەمبەرایەتی لەوەچەو نەوەی یەعقووبی کوڕی ئیسحاق بووە.(٦)

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ (آل‌عمران/٣٨). یان ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْداً وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾(الأنبياء/٨٩).

پەروەردگار دوعاو نزاکەی گیرا کردو وەڵامی دایەوەو نیگای بۆ ناردو فەرمووی: ﴿يَا زَكَرِيَّا إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلامٍ اسْمُهُ يَحْيَى لَمْ نَجْعَلْ لَهُ مِنْ قَبْلُ سَمِيّاً﴾ ئەی زەکەرییا! ئێمە موژدەت دەدەینێ بەکوڕێك؛ کە ناوی یەحیای لێ دەنێی. لەوەپێش کەس بەو ناوە ناونەنراوە، یان لەوەپیش وێنەی نەبوە، هیچ منداڵێك لەباوكو دایکی نەزۆك پەیدا نەبوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: (لم تلد العواقر قبله مثله) لەپێش ئەودا نەزۆك منداڵی ئاوایان نەبوە.

ئەمە ئاماژەیەبەوە: کە زەکەرییاو ژنەکەی هەردوکیان نەزۆك بوونو بەشێوەیەکی عادەتی هی ئەوە نەبوون منداڵیان ببێ! بەپێچەوانەوەی حەزرەتی ئیبراهیمو خاتو سارای خێزانی ئەوان کە مزگێنیان پێ درا بەئیسحاقو سەریان سوڕما، سەرسوڕمانەکەیان لەبەر پیرییان بوو نەك لەبەر نەزۆکییان چونکە ئەوان سێزدە ساڵ پێش ئەوە حەزرەتی ئیسماعیلیان بوبوو.

جا کە حەزرەتی زەکەرییا ئەم موژدە خۆشەی بیست، سەرسوڕمانێك روی تێکردو ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَكَانَتْ امْرَأَتِي عَاقِراً وَقَدْ بَلَغْتُ مِنْ الْكِبَرِ عِتِيّاً﴾ لەخۆشی گیرابوونی دوعاکەی شاگەشکە بوو، حەبەسا، وتی: خودایە! من چۆن

(٦) تەفسیری مونیر ج١٦/٥٤-٥٥.

منداڵم دەبێ، خێزانەکەم لەتەمەنی گەنجیشی دا نەزۆك بووە، ئێستا کە بۆتە پیرەژن چۆن منداڵی دەبێ؟ بۆ خۆشم هێندە پیرو کەنەفت بووم پۆلکاوم لاشەم پیرەڵۆك بووە، ئێسقانم ناسك بوونەوە، توانای چوونە لای ئافرەتیشم نەماوە، تەڕاییم تێدا نەماوە...!

پرسیارو سەرسوڕمانەکەی لەوەیە: کە بەگوێرەی عادەتو هۆکاری رواڵەتی ئەوان منداڵیان نابێ. نەك لەوە سەری سوڕمابێ کە خودا دەسەڵاتی ئەوەی نیە. حاشا! چونکە زەکەریبا بۆ خۆی داوای لەخودا کرد کە بەلوطفو کەرەمی خۆی، بەدەسەڵاتو قودرەتی خۆی کوڕێکی پێ بدا. واتە: دەفەرموێ: خودایە! ئەمن لەکاتی گەنجیو هەڕەتی پیاوەتی دا منداڵم نەبوە. لەبەر ئەوە خێزانەکەم نەزۆك بووە، جا ئێستا: کە منیش پیر بووم بەڕواڵەت لەوە تێپەڕبوم منداڵم ببێو خێزانەکەشم وێڕای نەزۆکی پیر بووە، چۆن منداڵم دەبێ؟؟

﴿قَالَ كَذَلِكَ﴾ پەروەردگار فەرمووی؛ یان ئەو فریشتەی نیگاکەی هێنا پێی راگەیاند: کار ئەوەیە: کە پێت راگەیاندراوە، ئەوەی موژدەت پێ دراوە دێتە جێ، وێڕای ئەوەی بۆ خۆت کەنەفتو پیریو خێزانەکەشت پیرو نەزۆکە، کوڕێکتان پێ دەبەخشین.

﴿قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ خودای تۆ کە لەوەپێش فەضلو ئیحسانی لەگەڵدا کردوی، بەلایەوە ئاسانە کە بەو حاڵەی خۆتو خێزانت تێیدان منداڵتان بداتێ، چونکە خودای تۆ کەویستی شتێك ببێ جاری وا دەبێ بەبێ هۆکاری رواڵەتیش ئەنجامی دەدا. هەر شتێك ویستی ببێ دەبێو دواکەوتنی نیە!!!

ئەمجار شتێکی بۆ باس دەکا: کە لەوەش سەرسوڕهێنەرترە. دەفەرموێ: ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئاً﴾ دروستکردنی ئەو کوڕەی موژدەمان پێداوی هەرچەندە بۆ خۆت پیری خێزانت نەزۆکە، لەدروستکردنی ئادەمیزاد لەنەبوەوە

گرانترو سەرسوڕهێنەرتر نیە. بێگومان من تۆم دروستکردوە ئەی ئادەمیزاد نەبوەوە، دروستکردنی ئادەم نموونەی هەموو ئەوەی ئادەمە، دەی کەوابوو دەستڕەنگینی لەدروستکردنی ئادەمدا دەستڕەنگینی یە لەهەموو ئادەمیزاددا. یان هەر مەبەست خودی زەکەرییایەو دەفەرموێ: من لەهیچەوە تۆم دروستکردوە. کەوابێ هیچ سەرت سوڕنەمێنێ لەو موژدەیەی پێت دراوە... چونکە کەسێك بتوانێ زاتو صیفاتی شتێك لەنەبوەوە بێنێتە دی، باشتر دەسەڵاتی بەسەر گۆڕینی زاتو صیفاتەکاندا هەیە! ئەمە بەڵگەیە لەسەر قودرەتو بەتوانایی پەروەردگار بەنەوپەڕی رەهایی یەوە. چونکە خودا هەموو کارێکی لا ئاسانە، بەڵکوو بەنسیبەت خوداوە کارێك نیە ئاسان بێو کارێك گران بێ! هەموو کارێك بۆ خودا چوون یەکەو ئاسایی‌و ئاسانە، دروستکردنی ئادەم لەنەبوەوەو دروستکردنی ئادەمیزادێکی تر لەرێگەی زاوو زێوە یەکسانە، کەسێك بتوانێ زات دروست بکا ئاڵو گۆڕکردنی رەوشتەکانی بەلاوە ئاسان تر دەبێ، کەوابێ زۆر شتێکی ئاسایی‌و ئاسانە: کە خودا توانـاو ئامادەباشی منداڵبوون بۆ زەکەرییاو خێزانەکەی بگێڕێتەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ﴾(الأنبياء/٩٠).

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان پێ دەدا: کە حەزرەتی زەکەرییا بەتاسولا بوو بۆ ئەوەی بزانێ کەی موژدەکە دێتە جێ.

﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً﴾ حەزرەتی زەکەرییا وتی: خودایە! نیشانەو بەڵگەیەکم پێ بفەرموو: بزانم: کە موژدەکە هاتۆتە دی! پێم خۆشە بزانم کەی ژنەکەم منداڵی لەسکی دەکەوێ. بۆ ئەوە دڵم ئارامی تێ بکەوێ، چونکە منداڵ لەسك کەوتن لەسەرەتادا شتێکی نادیارەو پەنامەکییە، بەتایبەتی لەئافرەتێکدا کە لەعادەتی ژنانە وەستابێتەوە.

ئیتر پەروەردگار بەهۆی فریشتەی نیگاوە وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاثَ لَيَالٍ سَوِيّاً﴾ فەرمووی: نیشانەی سك پڕ بوونی خێزانت ئەوەیە: کە ناتوانی سێ شەوو سێ ڕۆژ ئاخاوتن لەگەڵ ئادەمیزاددا بکەی، ئەتۆ ساغیو هیچ نەخۆشیت تێدا نابێ، بەڵام ناتوانی قسە بکەی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّيَ آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلاَّ تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ رَمْزاً﴾ (آل‌عمران/٤١).

﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنْ الْمِحْرَابِ﴾ ئەوکاتەی زەکەریا مژدەی پێ درا لەناو میحرابەکەیدا بوو: میحرابەکەی بریتی بوو: لەژوورێکی پچکۆلە بەبەرزییەوە دروست کرابوو، لەبەردەم عیبادەتخانە گشتی یەکەدابوو، میحرابەکە قاپییەکی تێدا بوو بەچەند پلیکانەیەك بۆی سەردەکەوت، ئەو کەسەی لەناو هۆدەکەدابوایە خەڵکی ناو عیبادەتخانەکە نەیاندەبینی.

جا لەگەڵ موژدەکەی پێ درا ئیتر زەکەریا لەمیحرابەکەی هاتە دەرەوەو چووە ناو گەلو نەتەوەکەیەوە، لەوەپێشیش زەکەریا هەواڵی ئەو موژدەیەی پێی دا بوون.

﴿فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيّاً﴾ ئیشارەی بۆ کردنو تێی گەیاندن: کە نوێژو تەسبیحات بۆ خودا ئەنجام بدەن بەیانیو ئێوارە، هاوەڵو هاوشانی بۆ بەرەوا مەزانن. لەهەموو لەککەو عەیبو خەوشێك بەدووری بگرن! داوای لێ کردن: کە سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو نیعمەتەی کە بەخشی بەخۆیو ئەوانیش... ئەم ئیشارە بۆ کردنو تێگەیاندنە یان بەدەست بووە یان بەنووسین بووە. چونکە زەکەریا زمانی بۆ قسە کردن لەگەڵ ئەواندا بەسترابوو، تەنیا بۆ ذیکرو یادی خودا زمانی دەگەڕا.

## حەزرەتی یەحیا لەدایك دەبیّو دەكریّ بەپیّغەمبەرو شەریعەتو یاسای پیّ دەدریّ

﴿ يَٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَٰبَ بِقُوَّةٍ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَيْهِ وَلَمْ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴿١٥﴾ ﴾

### چیرۆكی حەزرەتی یەحیا:

لەقورئانی پیرۆزدا پیّنج جار ناوی حەزرەتی یەحیا هاتووە: لە(آل‌عمران/٣٩، الأنعام/٨٥، مريم/٧و١٢، الأنبياء/٩٠) حەزرەتی یەحیا پیاویّكی تەقواكارو راستاڵ بووە، خوداپەرستی بەشیرەوە فرچك كردوە. زاناو شارەزابوو لەرونكردنەوەی شەریعەتی تەوراتدا، بەمنداڵی كراوە بەپیّغەمبەر! هەمیشە بانگەوازی ئادەمیزادانی دەكرد: بۆ تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خودا، تۆبەكارانی لەچەمی ئەردەندا دەشوشتن‌و لەگوناه پاكی دەكردنەوە. ئیّستا كە مەسیحی‌یەكان غوسلی پاكردنەومیان لەناودا باوە لەمە وەریان گرتووە. پیّی دەڵیّن: (یوحنا المعمدان).

لەسەردەمی حەزرەتی یەحیادا، لەفەلەستین فەرمانڕەوایەك هەبوە، ناوی (هیرودس) بووە. برازایەكی هەبوە ناوی (هیرودیا) بووە، زۆر جوان‌و شۆخ‌و شەنگ بووە، هیروسی مامی حەزی لیّ كردوە، كچەكەو دایكی كچەكە پیّیان خۆش بووە

شوی پێ بکا: کە پرسیان بەحەزرەتی یەحیا کرد بۆ مارە کردنو شوپێکردنی، حەزرەتی یەحیا فتوای بۆ نەدان، وتی: شوکردنی کچ بەمامی خۆی حەرامەو نابێ. رۆژێك کچەکە لەبەردەم مامی لەنجەیەکی کردو مامی ئاگری بۆ تێبەربوو، وتی: چت دەوێ بۆت دەکەم هەر ئەوەندە رازی ببە شووم پێ بکە، کچەکەش بەتەگبیری دایکی وتی: سەری یەحیای کوڕی زەکەرییام بۆ ببڕە شوت پێ دەکەم، ئەویش ناردی حەزرەتی یەحیایان شەهید کردو سەریان بڕی. کە هەواڵی شەهید بوونی یەحیا بەحەزرەتی عیسا گەییشت، حەزرەتی عیسا دەستی کرد بەبلاو کردنەوەی پەیامی یەحیا. ئەمە کورتەیەك بوو لەژیانی حەزرەتی یەحیا.

ئەمجار بابێینەوە سەر راڤەکردنی ئایەتەکان، دەفەرموێ: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ﴾ ئەی یەحیا! تەورات بەگرنگی بگرەو بەباشی وەربگرەو بەجوانی بەخەڵکی رابگەیەنە. تەورات نیعمەتو رەحمەتە بەسەر نەتەوەی ئیسرائیلدا.

هەڵبەتە لەکەلامەکەدا چەند وشەیەك مەزندە کراوە، بەقەرینە دەزاندرێ. ئەویش ئەوەیە: (حەزرەتی زەکەرییا کوڕە موژدە پێدراوەکەی پێ درا، ناوی یەحیایان لێ نا، کاتێك گەییشتە ئەو تەمەنەی نیگای بۆ بکرێ نیگامان بۆ کردو پێمان گوت: ئەی یەحیا! گرنگی بەتەورات بدەو بەهێزو تواناوە وەری بگرە.

ئەمجار پەروەردگار باسی ئەو نیعەتانە دەکا: کە بەیەحیاو باوکو دایکی بەخشی دەفەرموێ:

١- ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيًّا﴾ هێشتا منداڵ بوو تەمەنی لەلاوار حەوت ساڵیەوە بوو تێگەییشتنو لێزانیو شەرعزانیمان فێر کرد، روی کردە خێرو چاکەو ئامۆژگاریکردنی خەڵکو ئایین پەروەری.

هەندێ دەڵێن: حیکمەت واتە: پێغەمبەرایەتی، چونکە پەروەردگار بەمنداڵی حەزرەتی یەحیاو حەزرەتی عیسای کردونە پێغەمبەر ﷺ دروودی خودایان لەسەربێ.

٢- ﴿وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا﴾ دڵنەرمیو بەزەییمان لەلایەن خۆمانەوە پێ بەخشیبوو لێی بووبوو بەخۆو لەگەڵ سروشتی تێکەڵاو بووبوو. حەنانو دڵنەرمی رەوشتێکە بۆ ئەرکی پێغەمبەرایەتی زۆر پێویستە، دڵو دەروون مشتو ماڵ دەکا، هەڵیان دەنێ بۆ خێرو چاکەو هێدیو هێمنییان تێدا دەڕسکێنێ، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرێ.

٣- ﴿وَزَكَاةً﴾ پاکو خاوێنی دڵو دەروونمان پێ بەخشیبوو بەو دڵو دەروونە پاکەوە ئامۆژگاری خەڵکی دەکردو چڵکو پیسی دەروونیانی پاک دەکردەوە.

٤- ﴿وَكَانَ تَقِيًّا﴾ هەمیشە لەخوداترسو تەقواکار بوو، خۆی لەتاوان دەپاراست دڵی پەیوەست بوو بەخوداوە، بەئاشکراو نهێنی لەخودا دەترساو موراقەبەی دەکرد، وای دەزانی چاوی لەخودایە، یان خودا چاوی لەئەوە.

٥- ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَيْهِ﴾ زۆر گوێڕایەڵی فەرمانی باوکو دایکی بوو، خۆی لەئەزیەتدانیان دەپاراست، بەکردارو گوفتار شتێکی وای نەدەکرد دایکو باوکی دڵیان گەرد بگرێ، فەرمانبەرداری خوداو باوکو دایکی بوو!

٦-٧- ﴿وَلَمْ يَكُنْ جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ فیزو تەکەببوری نەبوو بەسەر خەڵکی، بەڵکوو خۆی بەئادەمیزادێکی سادە دەهاتە بەرچاوو خۆی بەکەم دەگرت.

هەروەها سەرپێچی فەرمانی خودای نەدەکرد، بێ تاوانو گوناه سەری نایەوە.

(عبدالرزاق) لەسەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مامن أحد يلقى الله يوم القيامة إلا ذا ذنب إلا يحيى بن ذكريا)

هەر کەسێك رۆژی قیامەت لەگەڵ خودادا روبەڕو دەبێتەوە خاوەن گوناهە جگە لەیەحیای کوڕی زەکەریيا. ئەو هیچ تاوانێکی نیە.

ئەمجار دوای باسکردنو رانواندنی ئەم رەوشتە جوانانە بۆ حەزرەتی یەحیا. پاداشتەکەشی بۆ دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَسَلَامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا﴾ سەلامو ئاشتی لەخوداوە لەسەر ئەو بێ لەو سێ حاڵەتەدا: لەو کاتەدا: کە یەکەمجار دونیای بینیوە، لەو کاتەدا کە دونیا جێ دێڵێو دەچێتە قۆناغی قیامەتەوە. لەو کاتەدا: کە زیندو دەکرێتەوەو بەهەشت و دۆزەخ دەبینێ!

ئەمانی خودای لەسەر لەو کاتەدا لەدایك دەبێ، بێگومان لەو کاتەدا لەچنگی شەیتان پارێزراوە، لەو کاتەدا: کە دەمرێ لەعەزابی گۆڕ پارێزراوە لەو رۆژەدا: کە زیندو دەکرێتەوە لەناڕەحەتیو تەنگ و چەڵەمەی رۆژی قیامەت بەدوور دەبێ.

سوفیانی کوڕی عویەینە دەفەرموێ: ناخۆشترین کات بۆ ئادەمیزاد سێ کاتە: ئەو کاتەی لەدایك دەبێ، خۆی دەبینێ لەشوێنی خۆی هاتۆتە دەرەوە. لەو کاتەدا: کە دەمرێ کەسانێك دەبینێ لەوەپێش نەیدیون، لەو کاتەدا: کە زیندو دەکرێتەوە، خۆی لەسارای مەحشەردا دەبینێو نازانێ چی لێ بەسەر دێ. خودای مەزن لەو سێ حاڵەدا حەزرەتی یەحیای خستۆتە ژێر رێژنەی سەلامو ئەمانی خۆی..

ئیتر ئەمجار پەروەردگار پەردە بەسەر چیرۆکی حەزرەتی یەحیادا دادەداتەوە، وەکوو چۆن لەوەپێش پەردەی بەسەر چیرۆکی حەزرەتی زەکەریيادا دادایەوە. چونکە هێڵە سەرەکیەکانی ژیانی کێشان، پەیڕەوو پرۆگرامی دیاری کردن، پەندو عیبرەتی وەرگیراو لەچیرۆکەکانیانی دەست نیشان کردن، ئەوەی گرنگ بوو گەیاندی..

ئێستا دێته سەر رانواندنی چیرۆکێکی سەرسوڕهێنەرترو سەرنج ڕاکێشتر، زۆر عەجایەبترە لەچیرۆکی لەدایکبوونی حەزرەتی یەحیا. ئەویش سەرگوزشتەی خاتوو مەریەم و حەزرەتی عیسایە.

## چیرۆکی خاتو مەریەمو سك پڕبوونی بەعیسا

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا ﴿٢٢﴾ ﴾

پەیوەنـــدی ئـــەم کۆمەڵـــە ئایەتـــە بـــەهی پێـــشەوە، پەیوەنـــدی لێکـــچون و تەدەروجــە، چــونکە دوای ئــەوەی پــەروەردگار چــیرۆکی حــەزرەتی زەکــەریای گێڕایــەوە، ئــەوەی بــاس کــرد کــە وێــڕای پــیری و کەنــەفتی زەکــەریاو نــەزۆکی خێزانەکــەی خــودا کــوڕێکی زیــرەك و موبــارەك و بەهرەمەنــدی پێــدان، ئــەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆکی خاتو مەریەمی هێنایە کایەو ئەوەی ڕاگەیانـد: کـە بـەبێ ئەوەی خاتو مەریـەم مێـردی کردبێ و پیاو چوبێتە لای سکی بەعیسا پڕ بووە، لـەنێوان هـەردوو چـیرۆکەکەدا لێکـچونێکی ئاشـکرا هەیـە، هـەر بۆیـە هـەردوو چیرۆکەکە لەسورەتی (آل‌عمران)و ئێرەو سورەتی (الأنبیـاء)دا بەیەکـەوە هێنـراون، چونکە لـەماناوا لێك نـزیکن، هەردوکیان نیـشانەی بەدەسـەڵاتی خـودا دەگەیـەنن و گەواهی ئەوەن: کە پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو باڵادەستە. هەروەها تـەدەروج و گواسـتنەوەی تێدایـە لـەبارەی فێـر کـردن و تێگەیانـدنـەوە لەسوکەوە بـۆ گـران و لـەڕوداوی سەرسـوڕهێنەرەوە دەگوێزێتــەوە بـۆ ڕوداوی سەرسـوڕهێنەرتر، ئەوەتا لەپێشەوە چیرۆکی حەزرەتی یەحیای باس کرد: کە لەباوك و دایکێکی پیرو کەنــەفت و نــەزۆك پەیــدا بــووە. بەڕواڵــەت بــڕوا کــردن بــەم ڕوداوە ئاســانترە لەپەیـدابوونی حـەزرەتی عیـسا کـە بـەبێ بـاوك لـەدایك بووە، بێگومـان چـیرۆکی لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا لەچیرۆکی حەزرەتی یەحیا سەرسوڕهێنەر ترە.

مامۆستا سەیید لێرەدا دەفەرموێ: ئێستا سەرەنج بدەینە چیرۆکێکی تـر: کـە لەچیرۆکی لـەدایکبوونی حـەزرەتی یـەحیا سەرسـوڕهێنەر تـرە، ئـەویش چـیرۆکی لـەدایکبوونی حـەزرەتی عیـسایە. بێگومـان سـیياقی قورئانەکـە پـێ هەڵداچـوون و تەدەروجی بەکار هێناوە، لەچیرۆکی یەکەم کە پەیـدابوونی منداڵە لـەباوکی پیرو کەنەفتو دایکی نەزۆك دەگوازێتەوە بۆ چیرۆکی دووەم کە ڕوداوی سەرسوڕهێنەر تـری تێدایـە! ئـەویش سـك پـڕ بـوونی کـچۆڵەیەکی دەسـت لێ نـەدراوو منـداڵ لێ بوونیەتی بەبێ ئەوەی مێرد چوبێتە لای. بێگومـان ئـەم ڕوداوە: کـە پەیـدا بـوونی

حەزرەتی عیسایە بەبێ ئەوەی باوکی هەبێ، زۆر لەروداوی لەدایکبوونی حەزرەتی یەحیا سەرەنج راکێشترو سەرسوڕهێنەرترە.

خۆ بێگومان ئەگەر ئێمە بەسەر روداوی دروستبوونی باوە ئادەمدا تێپەڕینو خۆمانی لێ بپارێزینو نەیخەینەوە بەرچاوی خۆمان و بیری لێ نەکەینەوە: کە خودا بەبێ باوك و دایك دروستی کردوە، ئەوە لەراستیدا روداوی لەدایکبوونی عیسای کوڕی مەریەم عەجایەبترین روداوی مێژووە، روداوێکی تاقانەی مێژووی ئادەمیزادەو لەوەپێش و لەوپاشیش بێ وێنەو بێ نەظیرەو دووبارە نەبۆتەوە!

ئادەمیزاد ئاگای لەدروستبوونی خۆی نەبوە. ئاگای پەیدابوونی ئادەمیزادی یەکەم نەبوە: کە بەبێ باوكو دایك خودا فەراهەمی هێناوە دوای ئەوەی: کە پەروەردگار ئادەمی لەقوڕ دروستکرد، بەبێ هەبوونی باوك دایك هێنایە وجوود هەزاران ساڵ تێپەڕین، ئەمجار حیکمەتی ئیلاهی داخوازی ئەوە بوو: کە روداوێکی تر. شتێکی تری سەرسوڕهێنەر بخاتە ڕو، ئەویش لەدایکبوونی حەزرەتی عیسا بوو، بەبێ ئەوەی باوکی هەبێ. کە بەگوێرەی عادەت و سوننەتی بوونەوەرو لەو کاتەوە ئادەمیزاد لەسەر زەوی پەیدا بووە، روداوێکی تاقانەو بێ وێنەبوو؛ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بۆ خۆیان ئاگاداری ئەو روداوە بن؛ ئەمجار لەتۆمارگای ژیانی ئادەمیزاددا خاڵێکی بەرچاوو نەمر بێ، ئادەمیزادان سەرەنجی بدەن و تێی بفکرن، چونکە بۆیان نەگونجاوە سەرەنجی بەدیهاتنی روداوە سەرسوڕهێنەرەکەی هەوەڵجار بدەن کە دروستکردنی باوە ئادەمە.

بێگومان بەگوێرەی ئەو سوننەت و داب و نەریتەی پەروەردگار لەبوونەوەردا دایناوە بۆ درێژەپێدانی ژیانی زیندەوەران، بێچوو زارۆك لەئاکامی بەیەکگەییشتنی نێرو مێ پەیدا دەبن، ئەمە یاسای پەیدابوونی منداڵ و بێچوو زارۆکە لەهەموو چینو رەگەزو جۆرەکانی زیندەوەردا. تەنانەت لەو گیانلەبەرانەی کە نێرومێیان

تێدانیەو نێرەموکن، واتە: جوت توخمن ئەوانەش دەبێ لەهەموو یەکێکیان دا رەچەڵەك و گەرای نێرو مێ هەبێ ئەمجار زاوو زێ دەکەن!

ئەم دابو نەریتە چەند هەزاران ساڵ بەرقەرار بوو، هەتا لەبیرو بۆچونی ئادەمیزاددا ئەوە چەسپا: کە ئیتر ئەم ڕێگایە تاقە ڕێگایە بۆ پەیدا بوونی منداڵ، روداوی دروستکردنی باوە ئادەمیان هەر لەبیر چوبوەوە، بەڵکوو هەر نەیان دیبوو، بۆیە پەروەردگار ویستی جارێکی تر قودرەتی خۆی نیشان ئادەمیزاد بدا، لەدایکبوونی حەزرەتی عیسایان بۆ بکاتە نیشانەو بەڵگە لەسەر رەهایی دەسەڵاتی خۆی. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ﴾ وەلێ دوای روداوی لەدایکبوونی عیسا ئیتر وێنەی دووبارە نەبۆتەوە، چونکە ئەم روداوە بۆ خۆی بەسە بۆ گەواهی لەسەر رەهایی دەسەڵاتی خودا... هەروەها چونکە بنچینەی یاسای خودا ئەوەیە: منداڵ بەو شێوە لەدایك بێ: کە باوەو لەئاکامی بەیەك گەیشتنی نێرو مێ دێتە کایە.

جا لەبەرئەوەی روداوی لەدایکبوونی عیسا زۆر سەرسوڕهێنەرو غەریب و سەرنج راکێش بوو، بەشێکی زۆر لەلاەڵك نەیانتوانی رووداوەکە لەقاڵبی خۆیدا بهێڵنەوەو پەی بەحیکمەتی روداوەکە بەرن، حەقیقەتەکەی بزانن. بۆیە هاتن حەزرەتی عیسایان لەچوار چێوەی ئادەمیزاد بردە دەرەوەو لەپلەو پایەی ئادەمی یەوە بەرزیان کردەوە بۆ پلەو پایەی خودایەتی! هەندێك وتیان و تا ئێستاش دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە یان خودایە، یان بەشێکە لەخودا!

ئەمجار قورئانی پیرۆز روداوەکە بەرێك و رەوانی دەگێڕێتەوە، واقیعەکە وەکوو خۆی نمایش دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذْ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِيّاً﴾ ئەی موحەممەد! لەم سورەتەدا چیرۆکی مەریەم بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، بەسەرهات و سەرکورشتەی خاتو مەریەم: کە کچی عیمران و لەنەوەی داود بوو، لەخانەوادەیەکی داوێنپاك و خاوەن پلەو پایە بوو. ئەوەیان بۆ بگێڕەوە:

کە بۆ کارێکی تایبەتی خۆی کە دەبوایە لەکەس و کاری نەدیو بێ (کەمێك بۆ لای خۆر هەڵاتی بەیتولمەقدیس دوور کەوتەوە)، قورئان هۆی دوورکەوتنەوەکە دیاری ناکا، لەوانەیە بۆ خوداپەرستیو طاعەتکردن خۆی دزی بێتەوە، وێ دەچێ بۆ کارێکی تایبەتی زۆر تایبەتی خۆی دوور کەوتبێتەوە.

﴿فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُونِهِمْ حِجَاباً﴾ ئەمجار پەردەیەکی لەنێوان خۆی و کەس و کارەکەی داگرتەوە، واتە: خۆی لێ نەدیو کردن، بۆ ئەوەی لەکاتی عیبادەتکردندا چاویان لێ نەبێ، یان بۆ ئەوەی لەکاتی ئەنجامدانی کارە تایبەتیەکەیدا کەسیان نەی بینێ، ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾ ئەمجار جوبرائیلمان بۆلا نارد، لەشێوەی پیاوێك دا خۆی نیشان دا، بۆ ئەوەی نەترسێ و نەحەپەسێ و بتوانێ ئاخاوتنی لەگەڵ بکا، چونکە جوبرائیل لەشێوەی فریشتەیی خۆیدا سامناکەو رەنگە کەس نەتوانێ لەئاستیدا خۆ رابگرێ، جا: کە جوبرائیل لەشێوەی پیاوێك دا خۆی نیشانی خاتو مەریەم دا، مەریەم وای زانی دەیەوێ دەستدرێژی بکاتە سەرو خەیاڵی خراپی هەیە.

روداوەکە سەرەنج راکێشە: خاتو مەریەم کە نارگیر بووە، دڵنیاو ئارامە، دەیەوێ کارێکی تایبەتی خۆی بەتەنیاییو دوور لەئاگاداری خزم و کەس و کارەکەی ئەنجام بدا، بەڵام ئەوەتا لەنکاوێك تووشی ئەوموفاجەئە سەرسوڕهێنەرە دەبێ...! ئەوەتا لەپشت ئەوپەردەیەوە: کە بەخەیاڵی خۆی هیچ کەس چاوی لێ نیە، پیاوێکی رێکو پێك لێی نزیك بۆتەوە. قسەی لەگەڵ دەکا، ئای لەم مەوقیفە حەریجەی تێی کەوتووە، بیری لێ بکەرەوە؛ کچۆڵەیەکی سرکی بەشەرمو حەیاو ترسنۆك، پیاوێك لەو شوێنە چۆڵەدا لەبەردەمی قووت بۆتەوە! ئارامیو دڵنیایی لێ تێك داو هێدیەتی شێواند، بەڵام چی بکا؟ مەوقیفەو تێی کەوتووە، ئا لەو کاتەدا هیچیکەی پێ نەکرێ، پەنا بۆ خودا دەبا، داوای رزگاربوون لەخودا دەکا، دەیەوێ هەستی پیاوەکە بوروژێنێ، ترسی خودای دەخاتە دڵەوە، ناوی خودای بەگژدا دەکا،

بۆ ئەوەی ئەگەر پیاو خراپە بەخۆیدا بچێتەوە، شەهوەتو ئارەزۆی نەفسانی بەپاشەوە بچێتەوە پێ لەکەللەی شەیتان بنێتە خواری.

﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنكَ إِنْ كُنتَ تَقِيّاً﴾ وتی: من پەنا دەگرم بەخودا لەتۆ ئەگەر تۆ لەخودا ترسو خۆپارێزی بەتاوان، تکات لێ دەکەم لێم دوور بکەوەرەوەو لەپەردە ئەو دیوکەوە!.

﴿قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لأَهَبَ لَكِ غُلاماً زَكِيّاً﴾ حەزرەتی جوبرائیل ویستی ترسی لێ برەوێنێتەوە بیهێنێتەوە سەر حاڵی ئاسایی‌و هێواشی بکاتەوە. پێی گوت: مەترسە من لەو کەسانە نیم کە خەیاڵی خراپم هەبێ لەگەڵ تۆدا، من رەوانەکراوی خودای تۆم بۆ ئەوەی بەفەرمانی خودا کوڕێکی پاك و خاوێن و بێ گوناهت پێ ببەخشم، بێتە مایەی رەحمەت و فەڕ بۆ ئادەمیزادان!

دەی تۆ بەخەیاڵ ئەو مەوقیفە بێنەرە پێش چاوی خۆت و ئەندازەی ترس و خەجاڵەتی‌و شەرم و حەیای خاتو مەریەم تەصەوور بکە. بزانە چەند خەیاڵی بەملاو ئەولادا رۆییشتووە: وێ دەچێ بڕوای نەکردبێ ئەم پیاوە نێرراوی خودابێ، وای زانیبێ ئەمە فێڵەو ئەم پیاوە لێی دەکا، لەوانەیە هەڵی خەڵەتێنێ، لەوانەیە مەبەستی شتێکی تر بێ!

ئەمجار خاتو مەریەم تۆزێك ورە بەخۆی دەداو، ئازایەتی مێینەیەکی ناموس لەخەتەرکەوتووی بۆ پەیدا دەبێ، کارەو تووشی بووە، ریشەو بووە بەریشەوە دەبێ شانەی بۆ هەڵبگری، بۆیە ئەمجار بەصەراحەت و رەپەوڕو ئاخاوتنی لەگەڵ کرد، ﴿قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلامٌ؟ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُنْ بَغِيّاً﴾ هەڵاتن ناکرێ، پیاوەکەش بەئاشکرا پێی گوتووە من دەمەوێ: کوڕێکت پێ ببەخشم! ئەویش تا ئێستا نازانی چۆن ئەم کوڕەی پێ دەبەخشێ، کە دەشڵێ: من رەوانەکراوی خودای تۆم، بڕوا ناکا دەڵێ لەوانەیە فێڵ بێ‌و لێم بکا. کەوابێ منجە منجی ناوێ خودا راستەو راستی خۆش لێ دێ، شەرمو حەیا لێرەدا کەڵکی ناگرێ، بەراشکاوی‌و

صەراحەت وەڵامی بداتـەوەو پـێی بڵـێ: بۆیـە: روی تێکـردو وتـی: مـن چۆن کـوڕم دەبێ؟ خۆ من کچم بوخچەی نەکراوەم، شوم نـەکردوەو پیاوێـك نـزیکم نەبۆتـەوە، داوێـن پیـسیش نـیم، پیـاوان بـەکرێ کـاری ئـاوام لەگـەڵ بکـەن، شـتی وا لـەمن و بنەماڵەی ئێمە ناوەشێتەوە، ئەدی چۆن تۆ کوڕم پێ دەبەخشی؟!

لەپرسیارەکەی ئەوە دەردەکەوێ: کە تا ئەو دەمە پـێی وانەبوە هۆکارێکی تـر هەبێ بۆ پەیدابوونی منداڵ جگە لەهۆکاری جوتبوونی نێوان نێـرو مـێ. هەڵبەتـە وەڵامـی خـاتو مەریـەم لـەوەوە سـەری هەڵنـەداوە: کـە شـتی ئـاوا لـەقودرەتی خـودا بەدوور بزانێ نەخەیر ئەوەی مەبەست نەبوە. بـەڵکوو بـەگوێرەی عـادەتو ئاسایی وای زانیـوە: کـە پەیـدابوونی منـداڵ بـەهۆی بەیەکگەیـشتنی (نێـرو مـێ)وە دەبـێ ئەمەش مافی خۆیەتیو شتێکی ئاسایـیـە هەرچـەندە بـڕوای بـەوە هـەبوە کـە بـۆ قودرەتی خودا دوور نیە بەشێوەی تریش منداڵ پەیدا ببێ!

چونکە، گومان لەوەدا نیە خاتو مەریەم ئەوەی زانیـوە: کـە پـەروەردگار بـاوە ئادەمی بەبێ دایکو باوك دروست کردوە کەوابێ پرسیارەکەی لەم روەوە بووە: ئایـا ئەم کوڕەی کـە پـێی دەبەخـشرێ، پـەروەردگار بەشـێوەی دروسـتکردنی بـاوە ئـادەم دروستی دەکا، یان لەرێگەی مێردێکەوە کە ئەم لەداهاتوودا شوی پێ دەکا!!؟

حەزرەتی جوبرائیل وەڵامی دایەوە ﴿قَـالَ كَـذَٰلِكِ﴾ جوبرائیـل وتـی: کارەکـە بەو شێوەیە: کە پێت ڕاگەیانـدرا، ئـەوەی پـێم گـوتی: هـەواڵێکی راسـتەو خـۆت بـۆ ئاکامی ئەو رووداوە ئامادە بکە.

﴿قَالَ رَبُّكِ:﴾ خودای تۆ فەرمووی: ﴿هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ﴾ بەخشینی کوڕێکی پاك و خاوێن و رەوشت بەرزو بێ گوناه لەلای من کارێکی ئاسانەو ماندوبوونی تێدا نیە.

ئەم کارە نائاساییە: کـە خـاتو مەریـەم لێـی سەرسـام بـووە بەلایـەوە قورسـەو تەصەوری ناکا، لای خودا زۆر ئاسانەو چ ماندو بوونێکی تێدا نیە، پەروەردگار هەر

کاتێ ویستی شتێك ببێ، پی ی دەفەرموێ: ببە، دەبێ، دەی خودایەك دەسەڵاتی بەو جۆرە بێ!! بەخشینی کوڕێك بەخاتو مەریەم لەلای ئەو چ گرانیەکی تێدا نیە.؟؟

﴿وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْراً مَقْضِيّاً﴾ ئێمە ئەم کوڕەبەم شێوەیە، بەخاتو مەریەم دەبەخشین، بۆ ئەوەی بیکەینە نیشانە بۆ ئادەمیزاد، بزانن: خودا چەند بەدەسەڵات و توانایە، چەند موڵتارو ئازادە، چۆن هەرچی بیەوێ دەیکاو کەس نیە بتوانێ بەرهەڵستی بێ، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو کوڕە ببێتە مایەی رەحمەت بۆ نەتەوەی ئیسرائیل بەتایبەتیو بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتی. چونکە هەڵیان دەنێ بۆ زێدە ناسینی خوداو عیبادەت بۆ کردنیو هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی رەزامەندی ئەو! بۆ ئەوەی ئادەمیزادان بزانن پەروەردگاریان بەسەر هەموو شتێکدا بەتواناو دەسەڵاتە، ئەوەتا باوە ئادەمی دروست کردوە بەبێ ئەوەی باوك و دایکی هەبن، دایە حەووای دروست کرد بەبێ ئەوەی دایکی هەبێ، عیساشی دروست کرد بەبێ ئەوەی باوکی هەبێ. باقی ئادەمیزادانی تریشی لەنێرو مێ دروست کردون.

ئیتر گفتو گۆی نێوان روحەلئەمین و خاتو مەریەم کۆتایی هات و سییاقی قورئان لێرەدا چی دی لەم بارەوە باس ناکا. تەنیا ئەوە جەخت دەکاتەوە: کە بەخشینی کوڕێکی پاك و خاوێن و رەوشت بەرز بەخاتو مەریەم هەرچەندە نێرینەی لێ نزیك نەبووبێتەوە کارێکە بڕیار دراوەو بڕاوەتەوە!

ئەمجار چیرۆکەکە دەکەوێتە بارێکی دیکەو دیمەنێکی تر نمایش دەکا لەم دیمەنە تازەیەدا، دەبینن خاتو مەریەمی کچۆڵەو دەست لێ نەدراو کەوتۆتە مەوقیفێکی تری زۆر ناخۆشەوە، مەوقیفێکی وا زۆر لەمەوقیفی پێشوو قورسترە، سکی پڕبووە. نۆ مانگ و نۆ رۆژی خۆیەتی و ژان دەیگرێ و منداڵی دەبێ. منداڵ دەکەوێتە قسەو ئامۆژگاری دایکی دەکا!!!

بەڵێ: وا قورئان دیمەنێکی تری چیرۆکەکە نمایش دەکاو با گوێ رابگرین و دڵمان بکەینەوە: بزانین خەزێنەی غەیب چی رادەنوێنێ!؟

بەڵێ ئەوا خاتو مەریەم دڵنیا بوو لەوەی: کە فریشتەکە پێی فەرموو: ئیتر فریشتە لەنزیکەوە یان لەدوورەوە فوی کرد بەبەرۆکی کراسەکەیداو لەبەرچاوی ون بوو. فووەکە هاتە خوارێ بۆ ناوگەڵی‌و چووە ناو هێلکەدانیەوەو ﴿فَحَمَلَتْهُ﴾ بەهۆی ئەو فووەوە مەریەم کۆرپەلەی هەڵپێچا سکی پڕ بوو، ﴿فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَاناً قَصِيّاً﴾ ئەمجار مەریەم بەسکەکەیەوە پاش تێپەڕ بوونی ماوەی سکی ئاسایی، یان هەر لەعەینی کاتدا وەکوو لەهەندێ ریوایەتدا هەیە. لەشوێن‌و جێگای خۆی بۆ شوێنێکی دوور دوورکەوتەوە، چونکە زۆر دڵتەنگ بوو زۆر بیری لەوە دەکردەوە، ئاخۆ دوایی نەتەوەکەی چی پێ دەڵێن: پێی ناخۆش بوو بەسك پڕی بیبینن.

قورئانی پیرۆز باسی ئەوە ناکا مەریەم چۆن سکی پڕ بوو، ماوەی سك پڕ بوونەکەی چەندەی خایاند؟ ئایا سك پڕبوونەکەی و ماوەی سکەکەی ئاسایی بوو، وەکوو هی ئافرەتی تر تێپەڕبوو؟ ئایا فووی فریشتەکە گیانی خستە هێلکۆکەی هێلکەدانی مەریەم و هێلکۆکە بوو بەزاڕۆڵەو پاشان بوو بەگۆشتیپارەو ئەمجار ئێسقان پاشان ئێسقان بەگۆشت داپۆشران و کۆرپەلە پێك هات و ماوەی عادەتی سك کە نۆ مانگ و نۆ رۆژە تێپەڕی؟؟ یان ئەم ماوانە نەبوون و کۆرپەلە لەماوەیەکی کورتدا پێگەییشت؟؟

لەراستی‌دا ئایەتەکە شتێك نیشان نادا کە بتوانین لەم دوو حاڵەتە لایەکیان دیاری بکەین. پێویستیش ناکا بەبێ بەڵگەی بڕوا پێکراو خۆمان بەوەوە خەریك بکەین. ئەگەر سودێك لەو یەکالاکردنەوەیەدا هەبوایە قورئان لێی بێدەنگ نەدەبوو!!!

بەراستی ئێستا خاتو مەریەم لەمەوقیفێکی زۆر حەریج‌و ناخۆشدایە. دڵی بەهێزی دەوێ خۆی لەبەردا بگرێ. ئافرەتێکی گەنجی کچۆڵەو دەست لێ نەدراو،

خوداپەرست و رەوشت بەرز، پەروەردە بووی خانـەوادەی پێغەمبـەران، بەگـەنجیو بەكچی سكی پـڕ ببـێو لـەو كاتـەشدا هـیچ بەڵگـەو نیـشانە نـەبن لەسـەر پـاكیو داوێنپاكی، ئایا چۆن خۆی بۆ راگیراو پـەنای بـۆ خـۆ كوشـتن و خۆسـوتان نـەبرد؟؟ ئەگەر ئەو لەسـەرەتادا پـشت ئەسـتوربوو بـەوەی: كـە داوێنپـاك و خـاوەن رەوشـتە. دڵنەوایی خـۆی دەكـرد. ئـەوا ئێـستا سـكی بـەرز بۆتـەوەو نزیكـە روبـەڕوی كۆمـەڵ ببێتەوە بەم حاڵ و وەزعەی تێیدایە، گومـانی لـەوەدا نیـە كـە جۆرەهـا تـاوانی پـاڵ دەدەن و چـەندان گومـانی لێ پەیـدا دەكـەن (كـوردی وتـەنی: دەمـی خـەڵك دەسـتی خـۆت نیـە بیقوچێنی) وێـڕای ئـەم ئـازارە دەروونیانـە، ئـازاری جەستەییـشی بـۆ پەیـدابوو، رۆژ بـەرۆژ سـكی گـەورە دەبـێو منـداڵبوونی نزیـك دەبێتـەوەو ئـەوەی ترسی لێیەتی خەریكە پەیدا ببێ، نەخـەیر! كار بەمەشـەوە نەوەسـتا، وا دیـاردەی منداڵبوونەكـەی سـەری هەڵدا، وا وردە وردە ژانـی منـداڵ بـوون دەیگـرێ، ئـای لـەم مەوقیفەو لەم حەیاچونو ریسوا بوونە؟!!

دەی با بزانین كار بەچی دەگاو ئاكام چۆن دەبێ؟

## لەدایكبوونی حەزرەتی عیسا و دیاردەكانی

﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَـٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَـٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَـٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِى وَٱشْرَبِى وَقَرِّى

عَيۡنٗاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا ﴿٢٦﴾

ئـێش و ئـازاری سـك پـڕی و بـەرەژان تـەنگیان بـەخاتو مەریـەم هەڵچنی و حەجمینیان لێ هەڵگرت. ﴿فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ﴾ دوای ئەوەی لـەماڵ و مەنزڵی خۆی دوور کەوتەوە، ژانی منداڵبوون تینیان بۆ هێناو ناچاریان کرد بڕوات بۆ باخێکی نزیك ئەو شوێنەو لەباخەکەدا چووە پاڵ دار خورمایـەك و دەسـتی لێ گیر کرد، بۆ ئەوەی بەئاسانی منداڵەکەی لێ ببێتەوە، لەبەر شەرمی خۆیو لەترسی ئەوەی خەڵکی گومانی خراپی لێ بکەن، لەبەر تەنیاییو زۆر هێنانی ئێش و ئـازاری منداڵبوون ﴿قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْياً مَنْسِيّاً﴾ وتی: کاشکێ، خۆزگە من پێش ئەم روداوە بمردمایـەو لـەبیر بچومایەوە کـەس نـاوی نەبردمایـەو بەخـەیاڵی کەسدا نەهاتمایە. یان خۆزگە هەر نەبوومایەو دروست نەکرابام.

بۆخۆی دەیزانی: بەهۆی ئەم منداڵەوە تووشی چ تەنگ و چەڵەمەو گێـژاوێك دەبـێ، دەیزانـی: کـەس بـڕوای پـێ ناکـاو هـەموو کـەس داوێـن پیـسی پـاڵ دەدەن و بوختـانی بـۆ هەڵدەبەسـتن، پـاش ئـەوەی: کـە بەتـەقواکارو خوداپەرسـت و دونیـا نەویست لەناو خەڵك دا ناسرابوو بەزیناکارو داوێن پیس لەقەڵەم دەدرێ!!

ئەمجار خـودای خـاوەن بـەزەییو فریـاد رەس بەهانایـەوە هـات و چارەسـەری هەموو غەم و پەژارەو ئێش و ئـازارێکی بـۆ کـرد ﴿فَنَادَاهَـا مِـنْ تَحْتِهَـا﴾ جوبرائیـل لەژێردار خورماکەوە بانگی لێ کرد، یان پەروەردگار ئـەم منداڵـە تـازە لـەدایکبووەی هێنایە قسەو لـەژێر داوێنیـەوە بـانگی لێ کـردو دڵخۆشـی دایـەوەو پـێی گـوت: ﴿أَلاَّ تَحْزَنِي﴾ غەمو خەفەت مەخۆ، دڵت تەنگ نەبێ، ئارام بگرە ﴿قَدْ جَعَلَ رَبُّـكِ تَحْتَـكِ سَرِيّاً﴾ بێگومان خودای مەزن لەژێر داوێنی تۆوە ئادەمیزادێکی خاوەن پلـەو پایـەی

دروست کردوە: مەبەستی خۆیەتی. یان خودای تۆ لەلای خوارۆتەوە جۆگەلە ئاوێکی بۆ فەراهەم هێناوی بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخۆیەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست بە(من تحتها) واتە: ئەوەی لەخوارەوە بانگی لێ کرد حەزرەتی جوبرائیل بووە، حەزرەتی عیسا نەکەوتۆتە قسە تا ئەو کاتەی دایکی هێنایەوە بۆ ناو قەومەکەی.

﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ﴾ لقی دارخورماکە بۆ لای خۆت راوەشێنە ﴿تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً﴾ خورمای تەڕو تازەو پێگەییشتوت بەسەردا بەردەداتەوە: کە شایانی ئەوەیە بچنرێنەوە، ئەمە بۆ خواردنت و ئاوەکەش بۆ خواردنەوە.

خواردنی شیرین و بەتایبەتی خورمای تەڕو تازە باشترین خواردەمەنییە بۆ ئافرەتی زەییستان: کە تازە منداڵەکەی لێ بووبێتەوە.

﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي﴾ لەو خورمایە بخۆو لەو جۆگە ئاوەش بخۆرەوە عافێتت بێو نەوشی گیانت بێ، دڵت ئارام بگرێ و بەهێدی و لەسەرەخۆبە ﴿وَقَرِّي عَيْناً﴾ چاوو دڵت رۆشەن بەو منداڵە جوانەی بووتە، غەم و پەژارە لەخۆت دوور بخەرەوە، دڵتەنگ مەبە، چونکە پەروەردگار دەتوانێ پاك دامێنی تۆ بچەسپێنێو قسەو قسەلۆکی گومڕایانت بۆ بەرپەرج بداتەوە، راستی رووداوەکە بۆ خەڵکی دەربکەوێ، پاکیو بێ تاوانی تۆ بۆ خەڵکی ئاشکرا ببێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم فەرموودەیەکی لەعەلی کوڕی ئەبو طالیبەوە ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اکرموا عمتکم النخلة، فانها خلقت من الطين الذي خلق منه آدم ﷺ وليس من الشجر شيء يلقح غيرها). واتە: رێزی پورتان بگرن کەدارخورمایە، چونکە دارخورما لەو گڵە دروست کراوە: کە باوەئادەمی بێ دروستکراوە، جگە لەدارخورما هیچ درەختێکی تر تەلقیح و موتوربە ناکرێ.

﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَداً﴾ هەر كەسێكت لەئادەمیزاد بینیو روبەڕووی بوویەوەو پرسیاری لێ كردی دەربارەی ئەم منداڵەو چۆنیەتی لەدایكبوونی ﴿فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيّاً﴾ ئیشارەتیان بۆ بكە، بەقسە نا بەڵكوو بەشێوەیەك لەشێوەكانی تێگەیاندن و فێر بوون تێیان بگەیەنە: كە من بۆ خودا بەرۆژوەو بڕیارم داوە لەگەڵ هیچ كەسدا قسە نەكەم.

لەشەریعەت و یاسای ئەوان دا كەسێك بەرۆژو بوایە، خواردن و خواردنەوەو قسە كردنی لێ یاساغ دەبوو!! شایانی باسە: كە واز هێنان لەقسەكردن لەئیسلامدا ڕەوا نیە، ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر لەحاریثەوە ریوایەت دەكەن، دەڵێ: لای ئیبنو مەسعوود بووم، دوو پیاو هاتن بۆ لای، یەكێكیان سەلامی كردو ئەوی تریان متەقی نەكرد، ئیبنو مەسعوود پرسیاری كرد: ئەو كابرایە بۆ وا بێدەنگە؟ هاوەڵەكانی وتیان: سوێندی خواردوە: كە ئەمڕۆ لەگەڵ كەس قسە نەكا. ئیبنو مەسعوود فەرمووی: براله! قسە لەگەڵ خەڵك بكە، سڵاویان لێ بكە، ئەوە ئافرەتێك بوو دڵنیابوو لەوەی كەس بڕوای پێ ناكا كە بەبێ مێرد سكی پڕ بووە (مەبەستی خاتو مەریەم بوو) خۆ لەقسە گرتنەوەی بۆ ڕەوا بوو تا ببێتە بیانوو بۆی: كە پرسیاریان لێ كرد، تێیان بگەیەنێ: كە بەرۆژوە.

وەلێ لەشەریعەتی ئیسلامدا كەسێك بەرۆژو بوو زیاتر پێویستە خۆی لەقسەی پڕوپوچ بگرێتەوە. لەصەحیحەیندا فەرموودەیەك لەئەبو هورەیرەوە هاتووە بەمەرفوعی دەفەرموێ: (إذا كان أحدكم صائماً فلا يرفث ولا يجهل، فان امرؤ قاتله أو شاتمه، فليقل إني صائم) هەروەها بوخاریو ئەبو داودو تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو ماجە لەئەبوهورەیرەوە فەرموودەیەكیان ریوایەت كردوە دەفەرموێ: (من لم يدع قول الزور والعمل به، فليس لله حاجة في أن يدع طعامه).

## پێغەمبەرێتی عیساو قسەکردنی لەلانکەدا

﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾﴾

ئەمەش دیمەنێکی ترە لەچیرۆکی سەرسوڕهێنەری خاتو مەریەمو منداڵەکەی. حەڵقەیەکی تری ئەو سەرگوزشتەیەیە. وەکوو لەوەپێش زانیمان خاتو مەریەم بەو نیشانانە بەو ئاو خواردنەوەی بۆی فەراهەم هێنرا، منداڵی لێ بووەوە، ئازاری زانو منداڵبوونی لێ کەم بووەوە، خۆی تەسلیمی قەزاو قەدەری خودا کردو دڵنیابوو لەوە، کە ئەمە فەرمانی خودایەو قەزاو قەدەری یەزدان بڕیاری داوە. ئیتر پاش ماوەیەك بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ لای کەسو کارەکەی! ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ﴾ منداڵی ساوای لەباوەش گرت و هێنایەوە بۆ لای گەل و نەتەوەکەی. کە

چاویان بەم وەزعە کەوت، مەلۆتکەیان بەباوەشی خاتو مەریەمەوە بینی، هەمویان سەرسام بوون، جۆش دامان، بەشتێکی گەورەیان زانی، پێیان ناخۆش بوو، سەرزەنشتی مەریەمیان کرد؛ ﴿قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئاً فَرِيّاً﴾ وتیان: ئەی مەریەم بەراستی شتێکی خراپت کردوە، ئەمە چیەو چ باسە؟ ئەم منداڵەت لەکوێ بوو؟ چۆن بووت؟ ئەمەی تۆ کردوتە کەس نەیکردووە سەرسوڕهێنەرە، چۆن روت دێ چاو هەڵبڕی؟

ئەمجار زیاتر جەختیان لەسەر لۆمەکردن و سەرزەنشتکردنی کردو بەتەوسەوە پێیان گوت: ﴿يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً﴾ ئەی خوشکی هارونی برای موسا لەعیبادەت و خوداپەرستی دا، ئەی ئەو کەسەی وەکوو هارون دەچی لەخوداپەرستیو خزمەتکردنی هەیکەل دا، یان ئەی ئەو کەسەی وەچەو زرۆێتی هارونی... یان هارون: پیاوێکی صالحی ئەو رۆژگارە بووەو کەسێك زۆر بەدین بووبێ شوبهاندویانە بەئەو.

لەزمانی عەرەبیدا ئەم جۆرە زاراوە باوە، بۆ نموونە بەکابرایەکی تەمیمی دەگوترێ: (يا أخا تميم) بەکابرایەکی میصری دەگوترێ: (يا أخا مصر)...هتد.

وتیان: ئەی مەریەم! ئای شتێکی ناشیرینت ئەنجام داوە، خۆ لای خۆت لەخانەوادەیەکی پاکو پاك داوێنو ناسراو بەخوداپەرست و لەخودا ترس پەیدا بووی!! چۆن تۆ کاری وا دەکەی و رێگەت بەخۆت دا ئەم ریسوایی یە بەسەر خۆت دا بێنی و حەیای خۆتو بنەماڵەت بەری؟! کچێ تۆ لەکوێ و ئەم کارە ناشیرینە لەکوێ؟ کەی شتی وا لەتۆ دەوەشێتەوە؟ خۆ تۆ باوکت پیاوێکی فاسق و تاوانکار نەبوو، دایکت داوێن پیس و بێ رەوشت نەبوو، ئەدی تۆ ئەم منداڵەت لەکوێ هێنا؟ جا کە تۆ لەو بنەماڵەو خێزانەدا پەروەردە بووبیو منداڵی ئەو باوك و دایکە لەخودا ترسە بی دیارە تاوانەکەت زۆر گەورەترەو شیاوی سزای سەخت ترو شاربەدەر کردنی!

﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ﴾ خاتو مەریەم ئیشارەی کرد بۆ لای عیسا، واتە: تێی گەیاندن: کە وتوویژ لەگەڵ ئەودا بکەن، بەمە خەڵکەکە شێلگیر بوون و بەتەواوی رقیان هەڵسا، لەدڵی خۆیان دا وتیان: سەیری ئەم ئافرەتە ناکەن بەکچۆڵەیی، بێ ئەوەی مێردی کردبێ مەلۆتکەیەکی لەباوەش گرتووە، وێرای ئەوەش قەشمەریمان پێ دەکا دەڵێ قسە لەگەڵ ئەم منداڵە بکەن، با ئەو نهێنی روداوەکەتان بۆ بگێڕێتەوە. ئیشەکەشی کردوەو گاڵتەشمان پێ دەکا!

﴿قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا﴾ وتیان: کچێ ئەوە دەڵێی چی؟ ئێمە چۆن گفت و گۆ لەگەڵ منداڵێك دا بکەین: کە ئێستا لەلانکەدایەو عەقڵ و هۆشی پەیدا نەکردوە.؟!؟

ئێستا موعجیزە دووبارە دەبێتەوە، شتێك: کە چاوەڕوان نەکراوە رو دەدا. ریوایەت کراوە: کە حەزرەتی عیسا ئەم قسانەی خەڵکەکەی بیست، دەمی لەمەمکی دایکی بەرداو روی تێکردن و بەدەستی راستی ئاماژەی بۆ کردن نۆ صیفاتی جوانی بۆ خۆی بەیان کردن: کە ئەمانەن:

أ- ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ﴾ عیسا وتی: من بەندەیەکی راستاڵی خودام، ئەوپەڕی بەندایەتی بۆ دەکەم، عیبادەت بۆ کەسی تر ناکەم، سەیر بکەن: یەکەم قسەی کە کردی دان نانی بوو بەبەندایەتی کردن بۆ خوداو تەبریئە کردنی خۆی لەوەی کە کوڕی خودابێ، بۆ ئەوەی مەسیحیەکان ئاگادار بکاتەوە: کە ئەوان بەهەڵەچوون لەوەدا کە عیسا بەخودا دەزانن.

ب- ﴿آتَانِيَ الْكِتَابَ﴾ لەوەدوا ئینجیلم بۆ دەنێرێ لەئەزەلدا بڕیاری داوەو مەزندەی کردوە: کە ببمە پێغەمبەرێکی خاوەن نامە، هەرچەندە هێشتا نامەی بۆ سەر نازڵ نەکردوم.

ج- ﴿وَجَعَلَنِي نَبِيّاً﴾ تەقدیری ئەوەی کردوە: کە ببمە پێغەمبەر بەمەش هەموو ئەو قسەو تۆمەتانەی رەتکردنەوە: کە وەپاڵ دایکیان دابوو، چونکە هەرگیز پەروەردگار پێغەمبەر لەئادەمیزادی لەزینا پەیدا بوو نانێرێ، بەڵکوو پێغەمبەران بنێرێکی پاك و خاوێن و رەچەڵەك و گەرا بێ خەوشن.

د- ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكاً أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ پەروەردگار وای لێ کردوم کە سوود بەخش بم بۆ ئادەمیزاد، فێری چاکەو شتی بەسوودیان بکەم، شارەزایان بکەم بۆ رێبازی نەجات و سەرفرازی لەهەر شوێنێك بم. پەروەردگار بۆ چەسپاندنی ئەم صیفاتانە صیغەی فیعلی ماضی بەکار هێنا، تا ئاماژە بێ کە ئەو کردەوانە لەداهاتوودا دێنە جێو گومان لەپەیدابوونیاندا نیە.

هـ- ﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيّاً﴾ خودای خۆم فەرمانی پێ کردوم بەبەجێهێنانی نوێژ: کە پەیوەندی قایم و پتەوی نێوان بەندەو خودایەو پاککەرەوەی دڵ و دەروونە. ناهێڵێ خراپەکاری‌و کاری فەحشائامێز ئەنجام بدا.

هەروەها فەرمانی پێ کردوم بەدەرکردنی زەکات لەماڵ‌و سامان: کە دەبێتە هۆی پاکبوونەوەی ماڵەکەو یارمەتیدانی فەقیرو هەژار، فەرمانی پێ کردوم کە پابەندی بەجێهێنانی ئەم ئەرکانە بم تا گیانم تێدابێ!

و- ﴿وَبَرّاً بِوَالِدَتِي﴾ وای لێ کردوم کە چاکەکاربم لەگەڵ دایکمدا، فەرمانی پێ کردوم کە چاکەی لەگەڵدا بکەم و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بم دوای بەندایەتیکردن بۆ خودا چاکە لەگەڵ دایکم بکەم، بەمەش جارێکی تر جەخت لەسەر داوێنپاکی دایکی دەکاتەوە، چونکە ئەگەر خاتو مەریەم زیناکەر بوایە پێغەمبەرێکی وەکوو عیسا فەرمانی پێ نەدەکرا کە چاکەی لەگەڵدا بکا.

ز-ح- ﴿وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّاراً شَقِيّاً﴾ پەروەردگار وای لێ نەکردوم کە خۆبەزلزان بم و یاخی بم و لوتبەرزی بکەم لەئاست طاعەت و خواپەرستی دا، لوتبەرزی بکەم لەچاکەکاری لەگەڵ دایکمداو بەوە تووشی بەدبەختی و نەگبەتی بم.

ط- ﴿وَالسَّلامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيّاً﴾ ئاشتیو سەلامەتی لەسەرم بێ لەهەموو خراپیو ناخۆشییەك لەو رۆژەی لەدایك بووم شەیتان فرسەتم لێ نەهێنێو نەتوانێ زیانم پێ بگەیەنێ. هەروەها لەکاتی مردنم دا گومڕام نەکا، لەکاتی زیندوبوونەوەشدا دڵ ئارام و لەسەلامەتیدا بم، کەس نەتوانێ لەم سێ کاتانەدا زیانم پێ بگەیەنێ.

ئەمەش داننانە لەعیساوە بەبەندایەتی خۆی بۆ پەروەردگاری. راگەیاندنی ئەوەیە: کە ئەو دروستکراوێکی خودایە، ئەو خودایەی کە مردن و ژیان بەدەست خۆیەتی.. ئەمیش دەژیاو دەمرێ و زیندو دەکرێتەوە وەکوو باقی ئادەمیزادانی تر.. وەلێ لەم سێ حاڵەتەدا لەئەماندایەو کەس ناتوانێ فرسەتی لێ بێنێ. بەتایبەتی: کە ئەم سێ حاڵە ناخۆشترین کاتە بەسەر ئادەمیزاددا تێپەڕ دەکا..

ئا بەو جۆرە حەزرەتی عیسا بەندایەتی خۆی بۆ خودا رادەگەیەنێ کەوابوو ئەو کوڕی خودا نیە، وەکوو هەندێك لەمەسیحیەکان بڕوایان وایە، خوداش نیە وەکوو هەندێکی تریان دەڵێن: سێیەمی سێ خوداش نیە وەکوو هەندێکی تریان دەڵێن، ئیعلانی ئەوە دەکا کە خودا کردویەتی بەپێغەمبەری خۆی (نەك منداڵی خودابێ یان هاوەڵی خودا بێ) خودا پیرۆزی کردوە، فەرمانی پێ کردوە: کە نوێژ بکا، زەکات بدا، چاکە لەگەڵ دایکی بکا، لوتبەرزی بەسەر دایکی و خزم و کەس و کاریدا نەکا.

ئیتر قورئان باسی ئەوە ناکا خەڵکەکە چۆن پێشوازییان لەم خاریقە کردوە، هەروەها باسی ئەوەش ناکا لەگەڵ خاتو مەریەم و کوڕەکەی هەڵوێستیان چۆن

بووە. باسی ئەوەش ناکا کەی کرا بەپێغەمبەرو پەیامی بۆ نێردراو بانگەوازی خۆی راگەیاند! لەئەم شتانە بێ دەنگە.

## کێشەو نیزاعی نەصارا دەربارەی حەزرەتی عیسا ﷺ

﴿ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ ۖ سُبْحَٰنَهُۥٓ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا ۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾

سەرەتا بەپێویستی دەزانین سورێکی خامە بەدەوری حەزرەتی عیسادا بدەین.

لەروانگەی ئیسلامەوە حەزرەتی عیسا بەندەو پێغەمبەری خودایە، کەلیمەی خودایە بۆ خاتو مەریەمی هاویشتووە، گیانێکە لەخوداوە، دوا پێغەمبەری نەتەوەی

ئیسرائیله، لەقورئاندا بەنازناوی (المسیح)و بەناوی (عیسا)و بەکونیەی (ابن مـریـم) باس کراوه.

باسـی حـەزرەتی عیـسا لەسـێنزه سـورەتی قورئـان دا: کەسـیو سـێ ئایـەتی گرتۆتـەوه نـاوی هێنـراوه، لەسـورەتی (البقـرة)دا ئایـەتی (٨٧، ١٣٦، ٢٥٢) لەسـورەتی (آل‌عمران)دا ئایەتی (٤٥، ٥٢، ٥٥، ٥٩، ٨٤) لەسورەتی (النساء)دا ئایەتی (١٥٧، ١٦٣، ١٧١، ١٧٢) لەسـورەتی (الأنعـام)دا ئایـەتی (٨٥) لەسـورەتی (التوبـة)دا ئایـەتی (٣٠، ٣١) لەسورەتی (مـریم)دا ئایـەتی (٣٤) لەسـورەتی (المؤمنـون)دا ئایـەتی (٥٠) لەسـورەتی (الأحزاب)دا ئایەتی (٧) لەسورەتی (الشوری)دا ئایەتی (١٣) لەسورەتی (الزخـرف)دا ئایەتی (٥٧، ٦٣) لەسورەتی (الحدید)دا ئایەتی (٢٧) لەسـورەتی (الصف)دا ئایـەتی (٦، ١٤).

لەروانگەی دیدو بۆچونی مەسیحیەکانەوە عیسا کوڕی یوسفی نەججارە، ئـەم یوسـفه یەکێکـه لەگەنجـه صـالّحو خوداپەرسـتەکانی یـەهودو لـەهۆزو عەشـیرەی مەریەم بووه.

دایکی حـەزرەتی عیـسا کچی عیمرانـه: کـه پیـاوێکی گـەورەو بـەناو بـانگ و زانای نەتەوەی ئیسرائیل بووه.

خێزانی عیمران سکی پڕ بوو، هێشتا منداڵەکه لەسکی دا بـوو لەسـەر خـۆی نەذر کرد ئەوەی لەسکی دایه بیکاته مجێورو خزمەتکاری هەیکەل، کە منداڵەکەی بوو کچۆڵەی بوو، ناوی نا مەریەم. عیمران لەدونیا دەرچوو، مەریەم هێشتا منـداڵ بوو، پێویستی بەسـەر پەرشـتیار هـەبوو، ماڵـه لێپرسـراوەکانی هەیکـەل قورعـەیان لـەناو خۆیـاندا ئـەنجام دا بـۆ ئـەوەی سەرپەرشـتیاریکردنی مەریـەمیان بەرکـەوێ بەشێوەی قورعه بەخێوکردنی مەریەم بەر حەزرەتی زەکەریا کەوت.

حەزرەتی زەکەرییا مێردی پوری مەریەم بوو، ئیتر خاتو مەریەم لەسەر پاك ناوێنیو خوداپەرستیو ئەخلاق بەرزی پەروەردە بوو.

کە پێگەییشت و دەست و دووی خۆی ناسی، جوبرائیل لەشێوەی پیاوێکی رێك و پێکدا هاتە لای و پێی راگەیاند: کە لەخوداوە نێردراوە بۆ ئەوەی بەفەرمانی خودا منداڵێکی پاك و خاوێن و پیرۆزی بداتێ، فوی بەبەرۆکی دا کردو حامیلە بوو، ماوەی سك پڕ بوونەکەی بەشێوەی ئاسایی بەسەر بردو وا پێدەچێ (٩) مانگو نۆ رۆژی تەواو کردبێ.. ئەم سك پڕ بوونەی خاتو مەریەم بەشێوەیەکی تایبەتیو خاریقەی عادەت بووە، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە لەسەر بەتوانایی خودا: کە دەتوانێ ئادەمیزاد بەبێ باوك دروست بکا. وەکوو چۆن توانی ئادەم بەبێ باوك و دایك دروست بکا. خاتو مەریەم ماوەی سك پڕی خۆی بەسەر بردو منداڵی لێ بووەوە، دوای تێپەڕبوونی هەشت رۆژ بەسەر لەدایکبوونی، حەزرەتی عیسا خەتەنە کرا.

هەر بەگوێرەی مێژووی نووسراوی مەسیحیەکان کاتێ هیرۆدس کە حامی فەلەستین بوو، فەرمانی دەرکرد بەکوشتنی هەموو منداڵێك کە لەبەیتەلەحەمدا بوو، یوسفی نەججارِ لەخەودا فەرمانی پێ کرا کە عیساو دایکی بەرێ بۆ وڵاتی میصر، ئەویش هەر کە لەلاوەکەی راست بووە خێرا حەزرەتی عیساو خاتومەریەمی لەبەیتەلەحەم دەربازکردن و بردنی بۆ وڵاتی میصر، لەوێ مانەوە تا هیرودس لەدونیا دەرچوو.

ئەمجار گەڕانەوە بۆ فەلەستین: ئەو کاتە تەمەنی حەزرەتی عیسا حەوت ساڵانە بوو، ئیتر لەشاری (الناصرة) پەروەردە بوو، کە تەمەنی گەییشتە (١٢) ساڵی لەگەڵ دایکی و یوسف دا هاتن بۆ ئورشەلیم بۆ ئەوەی بەگوێرەی شەریعەتی موسا نوێژ بکەن، لەوێ حەزرەتی عیسا تووشی کێشەو نیزاع بوو لەگەڵ مالەکانی جولەکەدا. پاشان لەگەڵ دایکی دا گەڕانەوە بۆ (الناصرة).

کە تەمەنی گەیيشتە سی ساڵی لەگەڵ دایکی دا چون بۆ سەر کێوی زەیتون بۆ زەیتون چنین، لەکاتێك دا: کە عیسا خەریکی ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ بوو حەزرەتی جوبرائیل ئینجیلی بۆ هێنا، شایانی باسە حەزرەتی یەحیاش وەکوو حەزرەتی عیسا لەتەمەنی سی ساڵی دا بووە بەپێغەمبەر.

ئینجیل: واتە: مزگێنی کە بریتییە لەپەڕاوێکی ئاسمانی هیدایەت و نووری تێدایە بۆ ئادەمیزادان. وەڵێ ئەو ئینجیلەی بۆ عیسا هاتووەو ئەویش بەقوتابیەکانی ڕاگەیاندوەو فەرمانی پێ کردوون کە بڵاوبکەنەوەو بەخەڵکی ڕابگەیەنن ئێستا نەماوە!.

ئەوەی: کە ئێستا بەئینجیلی ناو دەبەن چەند چیرۆكو سەرگورشتەیەکی ژیانی حەزرەتی عیسان، قوتابیەکانی دایانناوە، هەندێ پەندو ئامۆژگاری و نەصیحەتی تێدان کە لەحەزرەتی مەسیحەوە وەرگیراون!!

ئینجیلەکان زۆرن؛ سەدو ئەوەندە ئینجیلە هەن، هەرچی ڕاست بۆتەوە ئینجیلێکی نووسیوەو پاڵ حەزرەتی عیسای داوە، کەنیشتەی مەسیحی تەنیا چوار ئینجیل بەڕاست دەزانێو بڕوای پێ دەکا، ئەوانەش ئینجیلی مەتێو ئینجیلی مەرقس و ئینجیلی لوقاو ئینجیلی یوحەننایە. هیچ کامێ لەو چوار ئینجیلانەش لەسەردەمی حەزرەتی عیسادا نەنووسراونەوە.

### ئینجیلی مەتتا یان مەتێ:

یەکەم ئینجیلو کۆنترین ئینجیلە، بەڵام بەتەنکید ئەو ئینجیلە نیە کەحەزرەتی عیسا هێناویەتی، بەڵکوو ئینجیلە ئەصڵی یەکە لەناو چووە، ئەوەی: کە ئێستا هەیە دەست لێ دراوو گۆڕدراوە. زانا مەسیحیە کۆنەکان بۆ خۆیان دان بەم ڕاستییەدا دەنێن. بێگومان سەرەتا ئینجیل بەزمانی عیبرانی نووسراوە، پاشان

وەرگێـڕدراوە بـۆ سـەر زمـانی یۆنـانی، کەسـیش نـازانێ چـۆن و کـەی و کـێ ئـەم وەرگێڕانەی ئەنجام داوە!!

بـەگوێرەی راو بۆچـونی ئیرونیمـووس مـەتتا سـاڵی (٣٩)ی زایینـی ئینجیلـی خۆی نووسیوە.

**مەرقس:**

جولەکەیـەکی خـوی بـوو، واتـە: خزمـەتکارو مجێوری هەیکـەل بـوو، قوتـابی بوطرس بوو، یەکێك بوو لەوانەی دژی ئەو بیرو باوەڕانە بوو: کە عیسایان بـەخودا دەزانــی، ســاڵی (٦١)ی زاینــی ئینجیلــی نووســیوەتەوە، ســاڵی (٦٨)ی زاینــی لەبەندینخانەی ئەسکەندەرییەدا کوژراوە.

**لۆقا:**

کابرایەکی پزیشك بوو، خەڵکی ئەنطاکییە بوو، چاوی بەمەسیح نەکـەوتووە، بـیرو بـاوەڕی نەصـرانی لەکابرایـەك وەرگرتـووە نـاوی بـۆڵس بـووە. ئـەم بۆڵـسە کابرایەکی جولەکە بووەو زۆری رق لەئایینی مەسیحی بووە. بـەهیچ جۆرێ چـاوی بەمەسیح نەکەوتووە زۆر دژی نەصرانیەکان بـوو، گـەلێك ئـازارو ئەشکەنجەی دان، بەڵام دوایی: کە زانی چەوساندنەوەو زەخت کردن بێ سوودە، ئەمجار بـەدووڕوویی چووە ناو ئایینی مەسیحی یـەوە، بەڕواڵـەت خـۆی بەپابەنـدو پـەیڕەوکاری ئـایینی مەسـیحی نیـشان دەدا، پاشـان هـەوڵو تەقـەلای دا بـۆ بوچـەڵ کردنـەوەی ئـایینی مەسـیحی، تـوانی وا بکـا زۆر لەمەسـیحیەکان واز لەئـەحکامی تـەورات بهێـنن و پابەندی شەریعەتی مەسیح نەبن.

شایانی باسە: کە لۆقـا ئینجیلـی خـۆی پـاش ئینجیـل نووسـینەوەی مـەرقس و مردنی بوطرس و بۆڵس نووسیوەتەوە.

**یۆحەننا:**

یەکێکە لەدوازدە قوتابیەکانی حەزرەتی مەسیح، کە قورئان بە(حواریون) ناوی بردون. یۆحەننا خەڵکی شاری صەیدایە لەناوچەی (جەلیل). حەزرەتی عیسا زۆری خۆش ویستووە. یوحەننا ئینجیلی خۆی ساڵی (٩٦) یان (٩٨)ی زاینی نووسیوەتەوە، ئەو بڕوای وا بوو: کە حەزرەتی مەسیح جگە لەئادەمیزاد هیچی تر نەبوە.. بێگومان زۆر لەزانایانی نەصرانی پێیان وایە: ئەم ئینجیلە پاڵ یوحەننا دراوە، یوحەننا نەینووسیوەتەوە، بەڵکوو یەکێك لەقوتابیەکانی لەسەدەی دووەمی زایینی دا نووسیویەتیەوەو پاڵ یوحەنانای داوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێ هەڵخەڵەتێنێو مەبەستێکی تایبەتی هەبوە ئەویش باوەڕی عیسا خودایی و عیسا بەخودا زانین بووەو بەر پەرچدانەوەی ئەو تەعالیم و بیرو باوەڕانە بووە: کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە عیسا ئادەمیزاد بووە.

**ئینجیلی بەرنابا:**

یەکێکە لەو ئینجیلانەی تایبەتە بەچیرۆك و بەسەرهاتی مەسیح. بەرنابا بۆ خۆی یەکێکە لەشوێنکەوتوانی حەزرەتی مەسیحو تێکۆشەرو لەخۆبردوو بووە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی مەسیح. ئینجیلی بەرنابا لەدوو شتی جەوهەریو سەرەکی دا لەئینجیلەکانی تر جیایە.

١- دانان بەوەدا: کە عیسا ئادەمیزادەو خودا نیە.

٢- دانان بەوەدا: کە عیسا موژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی داوەو لەزۆر شوێن ئاماژەی ئەوەی کردوە: کە نزیکە پێغەمبەری ئاخرزەمان: کە ناوی موحەممەدە پەیدا ببێ.

**پەیامی حەزرەتی عیسا:**

**پەیامی حەزرەتی عیسا لەم چەند خاڵانەدا خۆی دەنوێنێ:**

١- کەمکردنەوەی خۆبەزلزانینی جولەکەکان و هەوڵدان بۆ ئەوەی وازبێنن لەهەڵس و کەوتی شەکلیو بێ گیان: کە ئەم هەڵس و کەوتە رواڵەتیانە سەر دەکێشێ بۆ قەڵاچۆکردنی خێرو بەرەکەتی رۆژی شەممە کە لەلای جولەکە رۆژێکی پیرۆزە. هەروا هەڵنان و شارەزایی کردنیان بۆ پوڵاتەی ئایین و حەقیقەتی خوداپەرستی. تێکۆشان بۆ ئەوەی لەمادەپەرستییان دوور بخەنەوەو واز بێنن لە دونیاپەرستیو ماڵ خۆشەوویستیو سامان کۆکرنەوە بەشێوەیەکی زیاد لەپێویست.

٢- گێڕانەوەی ئەو جولەکانەی بە(الصديقين) بەناوبانگن و بۆ بیرو باوەڕی راستەقینەو ئیمانهێنان بەزیندوبوونەوەو چەسپاندنی بیرو باوەڕی راست لەدڵ و دەروونیاندا.

٣- راستکردنەوەو هێنانەوەی سەرجادەڕێی ئەو جولەکانەی بە(الفريسين) بەناوبانگن. ئەمانە پێڕو تاقمێك بوون لێبڕابوون بۆ خوداپەرستیو دونیایان بەلاوە نابوو وەلێ لەسەردەمی مەسیحدا بەرواڵەت صوفیلکە بوون و ئایین و دینداری خۆیان کردبوە پەردە بۆ ماڵ کۆکردنەوە. تاقەو پێڕێکی تری جولەکە هەبوون خوێندەوارو میرزا بوون، ئەمانە فتواو شەرعیان بۆ خەڵکی دەنووسیەوە. ئەمانیش وەکوو (فريسيين)ەکان وا بوون بۆ ماڵ کۆکردنەوە. هەروەها کاهین و ماڵم و مجیورەکانی هەیکەلیش رویان کردبوە دونیاویستیو ماڵ کۆکردنەوە. بەئارەزۆی خۆیان بەپارە دەقەکانی شەریعەتی خودایان دەگۆڕی.

ئەم هەموو نەخۆشیو ئافاتانە لەناو نەتەوەی ئیسرائیلدا بڵاوبوبوونەوەو تەشەنەیان کردبوو، بۆیە پێویست بوو حەزرەتی مەسیح پەیدا ببێو بانگەوازی خۆی هەڵبدا بۆ دەرمانکردنی ئەم دەردانە شیفا بەخش بێ.

٤- مزگێنـی دان بەنزیکبوونـەوەی ڕەوانـەکردنی پێغەمبـەرێکی نەخوێنـدەوار بـۆ سـەر ئـادەمیزاد بەگشتی ئـەویش حـەزرەتی موحەممـەدە ﷺ وەکوو لەبڕگـەی ژمارە (١٥)و بڕگەکانی دواییش لەئیصحاحی (١٨) (سفر التثنية)دا هاتووە.

هەروەکوو چۆن زۆر پێغەمبـەری تـریش لەپەیامـەکانیاندا ئـەم موژدەیـەیان داوە.

وەلێ پـەیامی عیـسا جگـە لەکۆمـەڵێك پەنـدو ئامۆژگـاری بەمەبەسـتی بەندایـەتیکردنی ڕاسـتەقینە بـۆ خـوداو کەمکردنـەوەی گرنگـی دان بـەمادەو مادەپەرستی؛ کە خەڵکی تابینەقاقایان تێیدا سەرگەردان بوون، هەروەها وازهێنـان لەرییابازیو دووڕوویو گرنگی دان بەپوختەو کاکڵەی ئایین کە لەئایینی تەوراتەوە بۆیان مابوەوە، هیچی تری تێدا نەبوو!

**الحواريين:**

بریتین لەهاوەڵانی حەزرەتی عیسا (١٢) پیاو بوون زوو ئیمانیان بەحـەزرەتی عیـسا هێنـاو بوونـە قوتـابیو لەلازمـەتیا مانـەوە فێـری، ئـەحکامی ئـایینی بـوون، ئینجیلەکان بەقوتابی (التلاميذ) ناویان دەبەن. حەزرەتی عیسا دەیناردن بۆ گوندو شارەکانی جولەکەنشین، بۆ ئەوەی دانیشتوان بانگ بکەن بـۆ ئیمانهێنـان بەپـەیامی عیسا.

**موعجیزاتی حەزرەتی عیسا:**

حەزرەتی عیسا وەکوو پێغەمبەرانی تر مـوعجیزەی جۆراو جـۆری نوانـدون، بۆ ئەوەی ببنە بەڵگە لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبەرایـەتی یەکـەی. وەکوو ئـەوە لـەقوڕ شێوەی باڵندەی دروست کردومو فووی پێـدا کـردوە، بەفـەرمانی خـودا باڵنـدەگیانی بەبەردا کراوەو فڕیـوە؛ هـەروەها بەفـەرمانی خـودا بەڵـەك و گـول و کوێری چاك

کردونەوە، مردووی زیندو کردوونـەوە، هـەواڵی پێـداون جولەکـەکان لەماڵـەوە چـی دەخۆن و چی پەزمەندە دەکەن....هتد.

**لەدونیا دەرچوونی مەسیح:**

بانگەوازی حەزرەتی عیسا پەردەی لەسەر پۆخلاواتی کاهینو (فریسین)ەکان هەڵدایەوە، دونیا خۆری و ماڵ کۆکردنەوەیان بـەناوی ئایینـەوە بـۆ خـەڵکی ئاشکرا بوو. ئیتر دونیاخۆرەکان ترسیان لێ پەیـدابوو زانییـان: کە ئەگـەر بانگەوازی عیـسا بــەردەوام بــێ لەبەرژەوەنــدییان دەدرێو نــاتوانن بــەئارەزۆی خۆیــان خــەڵکی بروتێننەوە! بۆیە پروپاگەندەی جۆراو جۆریان دژی حەزرەتی عیسا بلاو کـردەوە، چوونە لای فەرمانڕەوای ئەو رۆژگارە شکایەتیان لێ کـردو وتیـان: عیـسا دەڵـێ: مـن پاشـای جولـەکانم. بـەبڕوای فـەرمانڕەوای ئـەو هەرێمـەش جگـە لەقەیـسەری رۆم کەسی تر شیاوی ئەوە نیە ببێتـە پاشای جولەکە. ئـیتر فـەرمانڕەوا مەفرەزەیـەکی بەسەرۆکایەتی (يهوذا الأسخر يوطي) نارد بۆ گرتن و قۆڵبەستکردنی عیـسا، کاتێـك مەفرەزەکە هات بۆ ئەو شوێنە حەزرەتی عیسای لێ بوو، (يهوذا) چووە ژوورەوە بـۆ گرتنی، حەزرەتی عیسا لەدەرگایـەکی تـرەوە دەرچـوو، پـەروەردگار شـێوەی عیـسای خـستە سـەر یهـوذا ئەسـخر یـوطیو بردیـان هـەڵیان واسـیو ئیعـدام کـرا! ئـەمجار جولەکەکان کەوتنە شكو گومانەوە وتیان: ئەگەر ئەم کابرایە ئیعدام کراوە عیسایە ئەدی يهوذا کوا؟ ئەگـەر یهـوذایـە کـوا عیـسا؟؟ بـەم جـۆرە خـودا حـەزرەتی عیـسای رزگـار کـرد، بۆیـان نـەگیراو نـەیان کوشـتووەو هـەڵیان نەواسـیوە. چـونکە قورئـان دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾(النساء/١٥٧).

پـەروەردگار لـەدونیای دەرچـواندو بـەرزی کـردەوە بـۆ لای خـۆی بـەگیانو جەســتە، یـان هـەر تـەنیا بـەگیان. خـودا بـۆ خـۆی دەزانـێ چـۆنیەتی لـەدونیا دەرچوونەکەیی‌و بەرزکردنەوەکەی چوونە. قورئـان دەفـەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ اللَّـهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾(آل‌عمران/٥٥).

**(ثالووث) لەلای مەسیحیەکان:**

بەگوێرەی تەعلیماتی کەنیسەی کاثۆ لیکی و کەنیسەی خۆرهەڵاتی‌و بیرو باوەڕی زوربەی پرۆتستانتەکان سێ ئوقنوم هەن بۆ پێکهێنانی خودا، واتە: خودا لەسێ ئوقنوم پێك هاتووە (باوك، کوڕ، روحولقودس) هەرچەندە زاراوەی سێ ئوقنوم لەکتێبی پیرۆزدا وجوودی نیە بەڵکوو ئەم بیرو باوەڕە لەکۆڕو کۆبوونەوەی مەسیحیەکاندا بڕیاری لەسەر دراوە کۆڕی (النیقاوی) ساڵی (٣٢٥)ی زایینی‌و کۆڕی قوستەنطەنیەی ساڵی (٣٨١)ی‌ز بڕیاری ئەوەیاندا کە (کوڕ)و (روحولقودس) وەکوو (باوك) وان لەخودایەتی دا، ئەم سێیانە لاهوت پێك دەهێنن. بڕیاریان لەسەر ئەوەدا کە (عیسا) لەئەزەلدا باوك بووە واتە: لەخودا بووەو کوڕی خودایە (روحولقودس)یش لەباوك کەوتۆتەوە.

کۆڕی (طولە یطیلە) ساڵی (٥٨٩)ی زایینی بڕیاری لەسەر ئەوەدا: کە (روحولقودس) لەعیسا پەیدا بووە نەك لەخودا!!!

هەڵبەتە قورئانی پیرۆز لەوەپێش چۆنیەتی پەیدابوونی حەزرەتی عیساو شێوەی لەدایکبوونی‌و بەندایەتیکردنی بۆ خوداو پێغەمبەرایەتی ئەو زاتەو رەوشتەکانی راگەیاند: ئەمجار دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ ئەو کەسەی باس کراو رەوشتەکانی دیاری کران و چۆنیەتی پەیدابوون و لەدایکبوونیمان بۆ گێڕانەوە ئەوەیە: عیسای کوڕی مەریەم و ئەوەیە قسەی راست و حەقەو هیچ شك و گومانی تێدا نیە. کەوابێ بەو جۆرە بیناسن و پلەو پایەی شیاوی خۆی بدەنێ، نەك وەکوو جولەکە سەرباری ئەوەی بڕوایان پێ‌ی نیە بەحەرامزادەو جادووبازیشی دەزانن! نەوەکوو گاورەکانیش: کە زیادەڕەوی لەپلەو پایەی‌دا دەکەن و بەرزی دەکەنەوە بۆ پلەو پایەی خودایەتی؛ دەڵێن: کوڕی خودایە، یان هەر خۆی خودایە، یان بەشێکە لەخودا. (وەکوو ئێستا لەپێشەکی ئینجیلی تازەدا نووسیویانە).

قسەی حەق و راست ئەوەیە: کە ئێمە پێمان راگەیاندن: عیسا کوڕی مەریەمە نەك کوڕی خودایە، بەفەرمانی خودا هاتۆتە وجوودو خەڵقندەی پەروەردگارە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ، الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ﴾(آل‌عمران/٥٩-٦٠).

ئەو جولەکەگومڕایانەو ئەو گاورە سەرلێ شێواوانەی کە شیاوی خەشم و قاری پەروەردگارن، گومانیان هەیە دەربارەی عیسا هەر پێڕو تاقمەیان بیرو بۆچوونێکی جوداوازی هەیە، هیچ لایەکیان حەق نین هەردولایان بەهەڵەچوون!

ئەمجار پەروەردگار ئەوە لەخۆی دوور دەخاتەوە کە منداڵی هەبێ، دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِلَّهِ أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ سُبْحَانَهُ﴾ راست نیەو ناگونجێ بۆ خودا: کە منداڵ بۆ خۆی دابنێ، خودا پاك و مونەزهە لەوەی پێویستی بەمنداڵ ببێ، چونکە منداڵ بۆ کەسێکە مردنی بەسەردا بێ‌و منداڵەکەی جێگای بگرێتەوە، منداڵ بۆ کەسێك پێویستە ناتاجی یارمەتی‌و کۆمەکی پێ کردن بێ! دیارە خودا هەمیشە زیندوو خاوەن دەسەڵات و هێزو توانایە، ناتاجی کەس نیەو پێویستی بەکۆمەکی‌و یارمەتیدانی کەس نیە، ئەگەر وانەبێ دەبێ خودا ناتەواو بێ، ناتەواویش بۆ خودا ناگونجێ، خودا بەرزو پیرۆزە، دوورە لەهەموو عەیبو ناتەواوی یەك ﴿إِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ هەر کاتێ خودا ویستی کارێك بێتە جێ‌و بڕیاری هەر شتێ بدا هەر ئەوەندە پێی دەفەرموێ: ببە ئیتر دەسبەجێ‌و بێ دواکەوتن چۆنی بوێ ئاوا دێتە جێ‌و پەیدا دەبێ، جا کەسێك ئەمە دەسەڵات و توانای بێ، چۆن خەیاڵی ئەوەی لێ دەکرێ منداڵی هەبێ‌و پێویستی بەیارمەتی‌و کۆمەکی پێ کردن بێ!؟

ئەمجار حەزرەتی عیسا کۆتایی بەوتووێژ کردن لەگەڵ گەلەکەیدا بەجاڕدانی پەروەردگاریەتی خودا دەهێنی‌و ئەوە رادەگەیەنێ: کە خۆیش و ئەوانیش بەندەی

خودان، وەکوو قورئان لەزمانی حەزرەتی عیساوە بۆمان دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ﴾ زاتی (الله) خودای من و خودای ئێوەشە، هەموومان بەندەی بێ دەسەڵاتو دروستکراوی ئەوین، ﴿فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ کەواتە هەمووتان ئەو بپەرستن‌و بەندایەتی خۆتان بۆ زاتی پاکی رابگەیێنن، ئەم پەیامەی من بۆم هێناون لەخوداوە رێگای راست و پەیامی حەق و پەسندە، تاکە رێگایە بۆ سەرفرازی‌و بەختەوەری دونیاو قیامەت!

وێڕای حەقیقەت و راستی عیسای کوڕی مەریەم لەوەدا: کە بەندەی خودایە، پێغەمبەری خودایە، کەچی ﴿فَاخْتَلَفَ الأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ﴾ دوای عیسا گەل و ئۆمەتەکەی لەناوخۆیاندا کەوتنە کێشەو نیزاعەوە، بەشبەش بوون و بوون بەچەند تاقم و پێڕو کۆمەڵ. جولەکە دەڵێن: حەرامزادەیەو لەرێگای داوێن پیسی یەوە پەیدا بووە، سیحربازو جادوکار بووە، پەیامەکەشی سیحر بووە. دەڵێن: کوڕی یوسفی نەجارە، مەسیحیەکانیش تێیدا کەوتوونە کێشەوە، نەسطوریەکانیان دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە، مەلکانیەکان یان مەلەکییەکانیان دەڵێن: عیسا سێیەمی سێ خودایەکانە. یەعقوبییەکانیان دەڵێن: عیسا بۆخۆی خودایە!!

ئیمپراتۆری رۆمانی قوسطەنطین کۆمەڵێکی زۆری لەئوسقوفەکان کۆکردەوە ژمارەیان دوو هەزارو سەدو حەفتا ئەندام بوو، داوای لێ کردن دەربارەی عیسا رایەکی پەسەند دەربڕن و رای خۆیان یەکالا بکەنەوە. کەچی وەندەی تر کێشەیان تێکەوت و هەر کۆمەڵ و تاقمێکیان رایەکی دەربڕی و دژی ئەوی تریان وەستا، هەندێکیان وتیان: عیسا خودی خودایەو دابەزیوە بۆ سەر زەوی، ژیانی بەهەندێ ئادەمیزاد بەخشی‌و هەندێکی مراندن، ئەمجار بەرز بووە بۆ ئاسمان، هەندێکیان وتیان: کوڕی خودایە، تاقمێکی تریان وتیان: عیسا ئوقنومێکە لەسێ ئوقنومەکان (باوك + کوڕ+ روحولقودس) واتە: بەهەرسێکانیان خودایان پێك هێناوە. کۆمەڵێکی

تریان وتیان: عیسا سێیەمی سێ خوداکانە (ثالث الثلاثـة)یـە. (الله) خودایـە، عیـسا خودایە، دایکی خودایە!!

هەندێکی تریان وتیان: عیسا بەندەو رەوانـەکراوی خودایـە، روح و کەلیمـەی خودایـە. هەنـدێ تـاقم و کۆمـەڵی تریـان بـیرو بۆچـونی تریـان دەرکانـد، سـێ سـەدو هەشت ئوسقوفیان نەبێ لەسەر رایەك گردبونەوە ئەگینا ئـەوانی تـر هـەر تاقمـەو رایـەکیان دەربـڕی! ئـیتر ئیمپـراطـۆر قـوسـطەنــطـین رای سـێ سـەدو هەشـت ئوسقوفەکەی وەرگرت و ئەوانی تری دەرکردو لێیان تورە بـوو بەتایبـەتی ئەوانـەی کـە وتیـان: عیـسا بەنـدەو رەوانـەکراوی خودایـە بەتونـدی کەوتنـە بـەر هێـرش و خەشم و قینی ئیمپراطۆر!![1]

تەفسیری مـەراغی دەڵێ: رای مەلکانیـەکان (کـە پـاڵ مـەلیك قـوسـطەنطـین ئەدرێـن) ئـەوە بـوو: کـە عیـسا بەنـدەی خودایـەو وەکـوو بـاقی دروسـتکراوانی تـر دروستکراوی خودایە. ئەمجار دەڵێ: مەلیك قوسطەنطین ئـەم رایـەی پەسـند کـردو کۆمەگی پێ کرد، رایەکانی تری رەتکردەوە..[2]

ئەمجار قورئـان هەڕەشـە لەوانـە دەکـا: کـە لـەرێگای یەکتاپەرسـتی لادەدەن و ئەدیمەنی سامناکی رۆژی قیامەت دەیانترسێنێ دەفـەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِـنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ شیوی وەیل یان هاوار بـۆ کـافرو بـێ بـاوەڕان لەدیمـەنی عـەزابی سامناکی رۆژی قیامەت. ئای چەند ترسناك و بەئێشە، لەو رۆژەدا دەست و قـاچ و زوبان دەبنە شایەدو گەواهیدەر لەسەر ئادەمیزادو چ تاوانێکیـان پـێ کرابـێ راسـتی ئەخاوەنەکەیان دەڵێن. ئەمجار بەگوێرەی تاوانەکانیان سزا دەدرێن. خـودای خـاوەن حیلم و بەتوانا مۆڵەتی داون تا ئـەو رۆژە، ئـیتر ئـەمجار بەسـەر قافێیانـەوە ناچـێ،

[1] في ظلال القرآن ج٥/٤٣٦.

[2] تەفسیری مەراغی ج١٦/٥٠.

ئیهمالیان ناکاو ناهێڵێ چیدی بەسەریانەوەی بچێو وەکوو بەرزەکی بانان بۆی دەرچن. بەڵێ پەروەردگار تاوانبار مۆڵەت دەدا بەڵام پاشگوێی ناخا!

لەصەحیحەیندا فەرموودەیەك هاتووە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله ليملي للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته) بێگومان پەروەردگار مۆڵەتی ستەمکار دەدا تا ماوەیەك هەتا: کە گرتی ئیتر لەچنگی عەزابی خودا رزگاربوونی نیە! ئەمجار قورئان گاڵتەیان پێ دەکا بەلاقرتێوە باسیان دەکا، چونکە ئەوان لەدونیادا پشتیان لەبانگەوازی هیدایەت هەڵکردبوو، وەلێ لەو رۆژەدا لەهەمموو کەس زیاتر گوێ سوك و چاو تیژن!.

﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾ حالی ئەو کافرو گومرایانە چەند سەیرو سەمەرەیە؟ لەدونیادا: کە بیستنو دیتن هۆکارە بۆ هیدایەت و رزگاربوون ئەوان نابیسن و نابینن، پشت هەڵدەکەن و رو لەحەق وەردەگێرن، کەچی لەرۆژی قیامەتدا کە بیستنو دیتن هۆکارە بۆ ریسوابوون لەهەموو کەس چاو تیژترو گوێ سوك ترن!

﴿لَكِنِ الظَّالِمُونَ الْيَوْمَ فِي ضَلالٍ مُبِينٍ﴾ وەلێ ئەو کافرو ستەمکارانە: کە لەقیامەت دا حەق و راستی دەزانن، لەدونیادا بەهۆی ستەمکاری خۆیان دا، کەرو کوێرن، لەئاستی حەقدا رێیان لێ گوم بووە!!

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەری خۆی دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! هەموو ئادەمیزاد بەموشریك و موسوڵمانیەوە بترسێنە لەرۆژی خەفەتخواردن و ئاخو ئۆف، بیانترسێنەلەرۆژێك هەموو ئادەمیزاد خەفەت دەخۆن؛ خراپەکار خەفەت لەخراپەکاریەکەی دەخواو پەشیمانە لەکردەوەکانی، موسوڵمان و

چـاکەکارانیش پەشـیمانن لـەوەی کـە زۆر تریـان نـەکردووە، دەسـتی خۆیـان دەشکێننەوە کە بۆچی زیاتر کردەوەی باشیان ئەنجام نەدا.

ئەم خەفەت و پەشیمانبوونەوەیان کاتێك دەبێ: کە حیساب و لێکۆڵینەوە تەواو دەبێ، نامەو دەفتەری کردەوەکان دەپێچرێنەوە، ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ لێك جیا دەکرێنەوە، بەهەشتییەکان بەرەو بەهەشت بەرێ دەکرێن و دۆزەخییەکان دەخرێنە دۆزەخەوە! ئەوان ئێستا لەدونیادا بێ ئاگان لەوەی کە رۆژی حەسرەت و پەشیمانی تووشیان دەبێ، بێ ئاگان لەوەی: کە لەو رۆژەدا لەگەڵیان دەکرێ و ئەو نارەحەتیەی تێی دەکەون، ئەوان ئێستا لەدونیادا بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت و حیساب و لێکۆڵینەوە نیە، کەواتە: بیانترسێنەو هەڕەشەی عەزابی سەختی ئەو رۆژەیان لێ بکە، با بەخۆیاندا بچنەوە، واز لەکوفرو بێدینی بهێنن، بڕوا بەپەیامەکەت بکەن و شوێنت بکەون.

ئیمام ئەحمەدو موسلیم و بوخاری و تیرمیذی لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەتیان کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إذا دخل أهل الجنة الجنة وأهل النار النار، يجاء بالموت كأنه كبش أملح (ابيض وأسود) فيوقف بين الجنة والنار، فيقال يأهل الجنة هل تعرفون هذا؟ قال: فيشرئبون وينظرون ويقولون: نعم هذا الموت، فيؤمر به فيذبح، ويقال ياأهل الجنة خلود ولا موت، وياأهل النار! خلود ولا موت) ئەمجار پێغەمبەر ﷺ ئایەتی ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ﴾ی خوێندەوەو بەدەست ئیشارەی کردو فەرمووی: ئەهلی دونیا سەرگەرمی دونیان و بەدونیاوە هەڵەوگیرن!

﴿إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر! ئەوەیان پێ رابگەیەنەو فێریان بکە: کەئێمەی پەروەردگار زەوی و چی لەسەر زەوی هەیەو چی تێدایە، بەمیرات وەری دەگرینەوە، هەمووی دەبێتە هینی ئێمەو کەس نامێنێ میرات لەمردوان بگرێ، تاکە میراتگری زەوی خۆمانین‌و جگە لەئێمە کەس نیە

بمێنــێ، هــەموو زینــدوێك نــامێنێ، ئــەمجار هــەموتان زینــدو دەكرێنــەوەو دەگەڕێندرێنـەوە بـۆ لای خـودا، هـەر كەسـە بـەگوێرەی كردەوەكانی سزاو پاداشی دەدرێتەوە چاكە بەچاكەو خراپە بەخراپە!!

## چیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ و دەمە دەمێی لەگەڵ باوكیدا دەربارەی بتپەرستی

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن

دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّى عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾

ئەمە سێیەم چیرۆکە لەم سورەتەدا... پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: پەروەردگار دوای ئەوەی گومرایی و سەرلێ شێواوی مەسیحیەکانی رونکردەوە، ئەمجار گومرایی بتپەرستەکان رون دەکاتەوە هەر دوو کۆمەڵەکە (گاورو بتپەرست) هەرچەندە لەگومرایی دا چون یەکن وەلێ گومرایی بتپەرستەکان ئاشکرا ترە. چونکە مەبەستی سورەتەکە چەسپاندنی تاك و تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی و هاتنی رۆژی قیامەتە. ئەمجار ئەوانەی ئینکاری تاك و تەنهایی خودا دەکەن دوو پێرن پێرێکیان کە نەصرانییەکانن ئادەمیزادێکی عاقڵ و رێکوپێکیان کردوە بەهاوەڵی خودا!! پێرەکەی تریان بەردوداری بێ گیانیان کردوە بەهاوەڵی خودا هەر دوو پێر گومڕاو سەر لێ شێواون؛ بەڵام پێری بتپەرستەکان زیاتر.

هێنانی چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم لێرەدا لەم روەوەیە: کە تەشریفی بەباوکی عەرەب دەژمێردرێ، عەرەبەکان بۆ خۆیان دانیان بەپێغەمبەرایەتی و ئایینی ئیبراهیم دا دەنا، دەیانزانی کەعبەی پیرۆز دروستکراوی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕیەتی، ئەمجار لێرەدا پەروەردگار سەرنجی عەرەبەکان رادەکێشێ بۆ پەیڕەوو پرۆگرامی حەزرەتی ئیبرهیم و بۆیان رون دەکاتەوە کە ئەو زاتە دژی

بتپەرستی بووە، مەنهەجی ئەو یەکتاپەرستیو بەندایەتی کردنی خالصانە بووە بۆ خودا، هەرگیز هاوەڵی بۆ خودا بەڕەوا نەزانیوە.

حەزرەتی ئیبراهیم بەباوکی پێغەمبەران دەژمێردرێ و لەوەوە پێغەمبەر کەوتوونەوە، ئەم زاتە (١٧٥) سەدو حەفتاو پێنج ساڵ ژیاوە، نێوان ئەوو حەزرەتی ئادەم دوو هەزار ساڵ بووە، نێوان ئیبراهیم و نووح هەزار ساڵ بووە.

جا با ئێستا دڵ و گیانی خۆمان بکەینەوە بۆ چیرۆك و بەسەرهاتی ئەم زاتە پیرۆزە بزانین قورئان چۆنی نمایش دەکا؟. دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقاً نَبِيّاً﴾ ئەی پێغەمبەر! لەقورئاندا باسی ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە بکە، سەرگورشتەو گفتوگۆ کردنی لەگەڵ باوکی دا، دڵفراوانی و نەرم و نیانی لەقسە کردنیدا بۆ موشریکەکان بگێڕەوە، بێگومان ئەو زاتە راستگۆ بوو، باوەڕی بەراستی هەبوو پێغەمبەرو رەوانە کراوی خودا بوو، باوکی پێغەمبەران و خۆشەویستی خودا بوو! بانگەوازی گەل و نەتەوەکەی کرد بۆ یەکتاپەرستیو واز هێنان لەبتپەرستی، دڵسۆزانە بانگی کردن و زۆری خۆ پێوە ماندو کردن، ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لا يَسْمَعُ وَلا يُبْصِرُ﴾ باسی ئەوەیان بۆ بکە: کاتێك ئیبراهیم بەباوکی گوت: ئەی باوکی خۆشەویستم! باوەگیان! ئەوە تۆ بەچ بیرو باوەڕێك عیبادەت بۆ شتێك دەکەی نابیسێ و نابینێ؟ هەرچی هاواری لێ بکەی و لێی بپاڕێ پەوە گوێی لێت نیە، چەندێك کڕنووشی بۆ بەری و گەردنکەچی بۆ بکەی چاوی لێت نیە، ئەوەی تۆ دەیپەرستی بێ گیان و هەستەو ئاگای لەهیچ نیە ﴿وَلا يُغْنِي عَنْكَ شَيْئاً﴾ هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنێ، نەقازانجت بۆ کێش دەکا، نەبەرگری زیانت لێ دەکا، ئەوانەی تۆ بەخودایان دەزانیو بەندایەتییان بۆ دەکەی دارو بەردێکی بێ گیانن، ئەدی تۆ چۆن رێگە بەخۆت دەدەی دارو بەردی بێ گیان بپەرستی؟ قاعیدەو یاسا لەعیبادەت کردن ئەوەیە: ئادەمیزاد رو بکاتە شتێك لەخۆی بەرزترو بەرێز تر بێ،

زاناترو بەهێز تربێ، نەك روبكاتە شتێك لەخۆی پەست تر بێ، پلەی لەخوار پلەی ئاژەڵ و پەلەوەرەوە بێ، بیستن و دیتنی لێ چاوەڕوان نەكرێ..

سەیر بكە بەچ جۆرە ئاخاوتنێك بانگەوازی باوكی كردو چەند بەشێوەیەكی ناسك و هەست بزوێن سەرەتای وتووێژی لەگەڵ دەست پێكرد، چەند بەدڵسۆزی هەوڵ و تەقەلای لەگەڵ دا بۆ ئەوەی بیخاتە سەر رێگای هیدایەت و خێرو فەڕ! وشەی شیرین بەكار دێنێ و خۆی لەلا خۆشەویست دەكا بۆ ئەوەی دڵی نەرم بكاو بەخۆیدا بچێتەوەو ئیمان بێنێ!

﴿يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءَنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ﴾ ئەی باوكی خۆشەوستم! هەرچەندە من بەتەمەن لەتۆ بچوكترم، ئەزمونی ژیانم لەتۆ كەمترە، بەلام لەخوداوە زانیاری و هیدایەتم بۆ هاتووە، تێگەیشتن و حەقناسیو شەریعەتم پێ بەخشراوە، زانیاری و شەریعەتێكم بۆ هاتووە بۆ تۆ نەهاتووە، ﴿فَاتَّبِعْنِي﴾ دەوەرە شوێنم بكەوە، گوێم بۆ رابگرەودڵتم بۆ بكەرەوە ﴿أَهْدِكَ صِرَاطاً سَوِيّاً﴾ شارەزاییت دەكەم بۆ رێگایەكی راست و حەق، رێگایەكت پێ دەڵێم بتگەیەنێ بەمەبەست و سەرفرازی دونیاو قیامەت بێ، لەهەموو تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشی یەك رزگارت ببێ!

﴿يَا أَبَتِ لا تَعْبُدْ الشَّيْطَانَ﴾ ئەی باوكی خۆم! نەكەی بەندایەتی شەیتان بكەی، نەچی شوێنی بكەوی و گوێڕایەڵی فەرمان و ختوكەو دەنە دەنەی ئەو نەفرین لێكراوە بی، ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيّاً﴾ بێگومان شەیتان هەر لەكۆنەوە لەخودای خاوەن رەحم و بەبەزەیی یاخی بووە، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری كردوەو، هەمیشە لەیاخی بوونو سەرپێچی كردندایە. شەیتان ئادەمیزاد هەڵدەنێ بۆ لەخودا یاخی بوون، بۆ بتپەرستیو هاوەڵدانان بۆ خودا. جا كەسێك بت پەرستبێ، ئەوە بەگوێی شەیتانی كردوەو لەراستیدا شەیتانی پەرستووە، شەیتان دوژمنی سەرسەختی ئادەمیزادە، هەمیشە لەهەوڵ و تەقەلای ئەوەدایە، ئادەمیزاد

لەلاشتە بمرێ، کەوابێ ئەی باوکی خۆشەویستم! زۆر نارەوایە تۆ گوێڕایەڵی شەیتان بی و بەویستی ئەو هەڵس و کەوت بکەی!!

﴿يَا أَبَتِ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَانِ وَلِيًّا﴾ ئەی باوکی خۆشەویستم! ئەمن ترسی ئەوەم هەیە: کە لەخوداوە سزایەکی سەختت لێ بکەوێ، مەترسی ئەوەت لێ دەکەم لەسەر ئەم بتپەرستییەت خودای خاوەن رەحم و بەزەیی تووشی سزایەکی سەختت بکا، ببیە دەستەوهاوەڵی شەیتانی نەفرین لێکراو؛ لەدونیادا نەفرینت لێ بکرێ و لەقیامەت دا بەعەزابی دۆزەخ سزا بدرێ و لەئاگردا هاونشینی شەیتان بی.

حەزرەتی ئیبراهیم بەم شێوە جوان و گوفتار شیرین و رێك و پێکە دڵسۆزانە هەوڵی لەگەڵ باوکی دا، بانگەوازی کرد بۆ خوداپەرستیو رێبازی سەرفرازی، بەڵام ئەم گوفتوگۆ شیرین و بانگ کردنە نەرم و نیانە هیچ کاریان لەدڵی ئەو موشریکە چەقاوەسوە نەکرد، دڵەرەقەکەی نەرم نەبوو، بەشێوەیەکی رەق و ناشیرین وەڵامی ئیبراهیمی دایەوە ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنْتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْرَاهِيمُ!﴾ وتی: ئایا ئەی ئیبراهیم! تۆ خوداکانی منت ناوێن؟ رویان لێ وەردەگێڕی و بێزاری خۆت لەپەرستنیان دەردەبڕی؟ تۆ وات لێ هات بەئاشکرا دژی خوداکانی مـن هەڵوێست بنوێنی؟ گەییشتیتە ئەو رادەیە من و خەڵکی لەپەرستنیان ژێوان بکەیەوە!! سوێندم وا بێ شەرت و قەرار بێ ﴿لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ﴾ ئەگەر واز لەو بیرو باوەڕە نەهێنی: کە ئێستا پەیڕەوی دەکەی، لەو هەڵوێستە نالەبارەی خۆت پەشیمان نەبیتەوە، بەردە بارانت دەکەم دەتکوژم، ناهێڵم بەسەرتەوە بچێ ﴿وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾ بڕۆ بەرۆکم بەردە، لێم دوور بکەوەرەوە جارێکی تر نەتبینمەوە!! ئەگەر دەتەوێ خۆت بەکوشت نەدەی کە نارگیربەو لەپێش چاوم لاچۆ.

ئا بەم نەزانیو کەللەرقییە ئەم کابرا لەلاوبایی بووە بەپیر بانگەوازی یەکەوە چوو، بەم شێوە توندو تیژە وەڵامی ئەو وتارە پڕ لەئەدەب و رێزەی

ئیبراهیمی دایەوە، ئەوە حاڵی ئیمانە لەگەڵ کوفردا، ئەوە هەڵوێست و رەوشتی دڵێکە ئیمان ئاوەدانی کردبێتەوە لەبەرامبەر دڵێکی کوفر وێرانی کردبێ!!

وەڵێ وێڕای ئەو هەڵس و کەوتە ناشیرینەی باوکی دڵرەق و گومڕاو چەقاوەسو، حەزرەتی ئیبراهیم رقی هەڵنەساو سەرخۆی نەهێناو سۆزو چاکەکاری و ئەدەبی خۆی لەدەست نەدا ﴿قَالَ سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيّاً﴾ وتی: سلاوت لێ بێ، دڵنیابە کارێك ناکەم زیانت پێ بگا، بەدوعا بەجێت دەهێڵم، کێشەو نیزاعت لەگەڵ دا ناکەم، هەڕەشەو گوڕەشەت لێ ناکەم، لەوە بەولاوە دوعات بۆ دەکەم و لەخودا دەپاڕێمەوە: کە لەسەر گومڕایی نەتهێڵێتەوە: تووشی سزاو عەزابی سەخت نەبی، بەڵکوو هیدایەتت بدا! بێگومان خودای من لوطف و رەحمەتی هەیە بۆم و لەوەپێش رێزی لێ ناوم بەوە: کە دوعاکانمی گیرا کردوە، جا ئەگەر هەبوونی من لەنزیکتەوە نارەحەتت دەکاو پێت ناخۆشە بانگەوازیت بکەم بۆ رێبازی حەقو سەرفرازی، ئەوە ناچارم هەڵوێستێکی تر وەربگرم و رێگاچارەیەك بۆخۆم بدۆزمەوە ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ کەنارگیر دەبم لەخۆتانو لەخوداکانتان، جگە لەخودای تاکو تەنها کەسی تر ناپەرستم. لێتان دوور دەکەومەوەو چی تر لەناوتاندا نامێنمەوە، سەری خۆم هەڵدەگرمو ئەم ولاتە جێ دێڵم، ﴿وَأَدْعُو رَبِّي عَسَى أَلاَّ أَكُونَ بِدُعَاءِ رَبِّي شَقِيّاً﴾ خودای خۆم دەپەرستم، بەندایەتی هەر بۆ ئەو دەکەم، هومێدەوارم لەعیبادەت کردنمدا بۆ خودای خۆم رەنج بەخەسارنەبم، وەکوو ئێوە کۆششو عیبادەتم بێ سوود نەبێ.

ئای لەم ئەدەبو ئەخلاقە؟! فەرمووی: ئومێدم وایەو چاوەڕوانی دەکەم، بەشێوەی دڵنیاییو مسۆگەری نەیگوت، بۆ ئەوەی نەفسی خۆی بشکێنێ، لەهەمان کاتدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کە وەرگرتنی کرداری چاکو پاداشتدانەوە لەسەری شتێك نیە لەسەر خودا واجب بێ، بەڵکوو عائیدە بەلوطفو بەزەیی خوداوە، حەزی لێ بوو وەری دەگرێو حەزی لێ بوو رەتی دەکاتەوە.

هەروەها هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بەستراوە بەکۆتایی ژیانیەوە، ئەگەر ئاخری خێر بێ کۆتایی تەمەنی لەسەر خێرو چاکە بێ ئەوە خودا چاکەکەی لێ وەردەگرێ، خۆ ئەگەر ئەو کاتەی بەخراپی لەسەر تێپەڕی ئەوە رەنجەڕۆ دەبێو هەر کردەوەیەکی باشی کردبێ بێ سودەو با دەیبا، چۆنیەتی ئاخرو ئۆخری تەمەنیش شتێکی پەنامەکیو غەیبی یە، هەر خودا دەزانێ چۆن دەبێ. پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکیدا دەفەرموێ: ئادەمیزادی وا هەیە لەدونیادا هەر کردەوەی چاك دەکا، هەتا وای لێ دێ لەبەهەشت نزیك دەبێتەوە تەنیا بستێکی دەمێنێ بچێتە بەهەشتەوە، بەڵام لەعیلمی خودادا بەدۆزەخی تۆمار کراوە ئیتر کۆتایی تەمەنی بەکردەوەی خراپ بەسەر دەباو دەچێتە دۆزەخەوە. هی وایش هەیە بەدرێژایی ژیانی کردەوەی خراپ ئەنجام دەدا تا وای لێ دێ بستێکی دەمێنێ بکەوێتە دۆزەخەوە، بەڵام لەزانیاری خودادا بەبەهەشتی نووسراوە، ئیتر کۆتایی ژیانی بەکرداری باش بەسەر دەباو دەچێتە ناو بەهەشتەوە. کەواتە: دەبێ هەر بڵێین: هومێدەوارین خودا بمان باتە بەهەشتەوە، بەلوطفو کەرەمی خۆی کردەوەکانمان لێ وەرگرێ، نابێ بڵێین: دڵنیاین نابێ دڵنیابین لەوەرگرتنی کردەوە باشەکانمان. وەرگرتنی کرداری چاكو پاداشت دانەوەیان بەدەست خودایە.

بەڵێ حەزرەتی ئیبراهیم بڕیاری گۆشەگیریی خۆی لەخزمو کەسو کاری دا، وڵاتو نیشتمانی بەجێ هێشت، خۆی تەسلیم بەخودا کردو لەپێناو ئایینداسەری خۆی هەڵگرت، پەروەردگاریش بەتەنیایی نەیهێشتەوە، بەڵکوو باشتر کەلینی خزمو کەسو کارو وڵاتو نیشتمانی بۆ پڕ کردەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا اعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ﴾ کە حەزرەتی ئیبراهیم لەباوكو خزمو کەسو کاری گۆشەگیربوو، وازی لەوڵاتو نیشتمانی هێنا، ئەو شوێنەی بەجێ هێشت: کە عیبادەتی غەیری خودای تێدا دەکرا، بەردەوام بوو لەسەر رەتکردنەوەی بەندایەتیکردن بۆ بتەکانیان. لەپێناو ئایینی خودارا هیجرەتی کردو بەرەو ئالای

بەیتولمەقدیس کەوتەڕێ: چونکە لەوێ دەیتوانی بەڕاشکاوی ئایینی خۆی بڵاو بکاتەوە، پەروەردگار کەلێنی کەسو کاری بەجێ هێشتووی بۆ پڕ کردەوە، سارا خاتوونی خێزانی، حەزرەتی ئیسحاقی بوو، حەزرەتی ئیسحاقیش پێگەیی خودا یەعقووبی پێدا، ﴿وَكُلاًّ جَعَلْنَا نَبِيّاً﴾ هەموویانمان کردن بەپێغەمبەر بۆ ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم چاوی پێ روون ببنەوە، هەموو پێغەمبەرانی بەنوئیسرائیل لەوەچەو نەوەی ئەم دوو پێغەمبەرە بەرێزەن!

هەموو خاوەن ئایینێك حەزرەتی ئیبراهیمی خۆش دەوێ، حەزرەتی ئیسحاقو حەزرەتی یەعقووبیان بەلاوە بەرێزە، حەزرەتی ئیبراهیم پێش ئەوەی ئیسحاقی ببێ، وەجاخ کوێر بوو، حەزرەتی یەعقووب هەرچەندە کوڕی ئیسحاقە بەڵام بەکوڕی ئیبراهیم حسێب دەکرێ چونکە لەژیانی حەزرەتی ئیبراهیمدا بەوەلەد بوو، لەباوەشی ئەوداو لەژێر چاودێری ئەودا لەخزمەت ئەودا پەروەردە بوو، فێری ئایین بوو، کەوابێ هەروەکوو کوڕی خۆی بێ وایە.

﴿وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا﴾ بەخشیمان بەئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب، لەفەضل بەخششی خۆمان پێغەمبەرایەتیو ماڵو سامانو ژنو منداڵو نامەی ئاسمانیمان پێدان. ﴿وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيّاً﴾ مەدحو پەسنی ئەوانمان خستە سەر زوبانی ئادەمیزاد، هەموو کەس سوپاسگوزاریانە، ئەهلی هەموو ئاینەکان رێزیان لێ دەگرن! صەڵاتو سەلامی خودایان لەسەر بێ.

جا چونکە عەرەبەکان خۆیان بەوەچەو رەچەڵەکی حەزرەتی ئیبراهیم دەزانیو لافی ئەوەیان لێ دەدا: کە لە سەر ئایینی ئەون، پەروەردگار چیرۆکی ئەوی بۆ گێڕانەوە بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو پەند وەربگرن!

## چیرۆکی حەزرەتی موسا ﷺ

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾﴾

ئەمە چیرۆکی چوارەمە بۆ تێگەیاندنی عەرەبو عەجەم بەوە: کە حەزرەتی موساش وەکوو حەزرەتی ئیبراهیم پیاوێکی راستاڵ بوو، دڵسۆزانە بەندایەتی بۆ خودا ئەنجام دا، هاوەڵی بۆ خودا بەروا نەزانیوە، ریابازی نەکردوە.

هەروا ئاماژە بۆ ئەوەش دەکا: کە حەزرەتی موساو هارون وەچەو زورپەتی حەزرەتی ئیبراهیمنو لەبەرەبابی حەزرەتی ئیسحاقی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمن. دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى﴾ ئەی موحەممەد! رەوشتو سەرگورشتەی موسا بۆ قەومەکەت بگێڕەوە، ئەوەی ئێمە بەنیگا لێرەدا بۆت نازڵ دەکەین بۆ ئوممەتەکەتی باس بکە: کە پێنج رەوشتی بەرزی موسایە، لێرەدا بۆت باس دەکەین:

١- ﴿إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصاً﴾ بێگومان ئەو زاتە هەڵبژاردەبوو، خودا پاڵفتەی کردبوو بۆ پێغەمبەرایەتی، لەهەموو تاوانێك پاکمان کردبوەوە، وەکوو لەشوێنێکی تر دەفەرموێ: ﴿إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاَتِي وَبِكَلاَمِي﴾(الأعراف/١٤٤).

ئەگەر وشەی (مُخْلَصاً) لەئایەتەکەدا بەشێوەی ئیسمی فاعیل بلاوێنینەوە ئەو کاتە مانای بەم جۆرە دەبێ، موسا راستاڵانە بەندایەتی خودای کرد لەیەکتاپەرستیو طاعەتکردندا دڵسۆز بوو، طاعەتو بەندایەتی هەر بۆ خودا بوو، هیچ ریابازی نەدەکرد.

٢- ﴿وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾ پەروەردگار دوو سیفەتی گەلێك بەرزی بەو زاتە دابوو؛ هەم رەوانەکراو بوو هەم خاوەن شەریعەت بوو، یەکێك بوو لەپێنج پێغەمبەرە خاوەن عەزیمەتەکانو شەریعەتو یاساشی بۆ نەتەوەکەی هێنابوو.. واتە: صیفەتی رەسولو نەبییەتی هەبوو:

رەسوول کەسێکە بەنیگا شەریعەتێکی بۆ هاتبێو فەرمانیشی پێ کرابێ بەگەیاندنی بەخەڵك، واتە: نامەیەکی ئاسمانی بۆ هاتبێ شەریعەتی تێدابێو فەرمانی پێ کرابێ بەگەیاندنی. وەکوو حەزرەتی موسا ﷺ جا یان کتێبێکی سەربەخۆی بۆ نێردرابێ، یان کار بەکتێبی پێغەمبەری پێش خۆی بکا.

نەبی: کەسێکە نیگای بۆ کرابێ بەشەریعەتێك لەخوداوە، جا فەرمانی پێ کرابێ ئەو شەریعەتە بگەیەنێ بەخەڵك یان نا، بەڵام بۆ خۆی نامەی سەر بەخۆی بۆ نەهاتبێ وەکوو حەزرەتی یوشع.

٣- ﴿وَنَادَيْنَاهُ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ الأَيْمَنِ﴾ لەلای راستی کێوی طورەوە بانگمان لەموسا کردو ئاخاوتنمان لەگەڵدا ئەنجامدا، واتە: لەو شوێنەوە: کە کەوتبوە دەستە راستی مووسا لەو کاتەدا کە لە(مەدیەن)وە دەگەڕایەوە بۆ میصر ئێمە نیگامان بۆ کردو هەواڵمان پێ دا: کە کردوومانە بەپێغەمبەرو رابەری نەتەوەی ئیسرائیل. لەو کاتەوە بوومتە (کلیم الله)و فروستادە ئەمجار دوای خنکانی فیرعەونو دارو دەستەکەی وادەمان پێدا بۆ سەرکێوی طوورو لەوێ تەوراتمان بۆ نارده خوارێ.

٤- ﴿وَقَرَّبْنَاهُ نَجِيّاً﴾ پلەو پایەی ئەومان لەخۆ نزیك کردەوە، رێزو شکۆمەندیمان پێدا، لەکاتێکدا راستەوخۆو بێ ناوەند بەنهێنی گوفتو گۆی لەگەڵ کردین، واتە: رێزو شەرەفێکمان پێ بەخشی گەییشتە ئەو پلەو پایە: کە ئاخاوتنمان لەگەڵدا کردو کردمانە قسە لەگەڵ کراوی خۆمان، لەعالەمی ئەرواحدا

پلەو پایەمان ئەوەندە بەرز کردەوە، وەکووئەوە قسە لەگەڵ کەسێکی نزیکدا بکا بەشێوەی چپە کردن!

ماموستا سەیید دەفەرموێ: پەروەردگار پلەو پایەی حەزرەتی موسای ئەوەندە بەرز کردەوەو لەخۆی نزیك کردەوە بۆ رادەی قسە لەگەڵ کردن لەشێوەی چپەکردنو سرتە سرتدا، ئیتر ئێمە نازانین ئەم چپە کردنە چۆن بووە، موسا چۆن لێی حاڵی بووە، نازانین ئایا ئاخاوتنەکە دەنگێك بووە بەگوێچکە بیستویەتی، یان (کییانە ئادەمیزادیەکەی موسا بەگشتی) ئەو ئاخاوتنەی وەرگرتووە؟ نازانین پەروەردگار چۆن کیانی ئادەمیزادی موسای بۆ ئەو ئاخاوتنە خودایی یە ئامادەباش کردوە، ئێمە بڕوامان وایە: ئاخاوتنەکە بووەو بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین. بێگومان بۆ خودا زۆر ئاسانە: کە بەشێوەیەك لەشێوەکان مەخلوقێکی خۆی بگەیەنێتە رادەی ئەوەی کەلامی ئەزەلی خودا ببیسێ. هەروەکوو چۆن لەسەرەتادا ئادەمیزاد بەنەفخەیەك لەگیانی خودایی هاتۆتە وجوود!!

٥- ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا﴾ بەفەضلو رەحمەتو بەزەیی خۆمان، هارون: کە برای موسا بوو کردمان بەپێغەمبەر لەبەر خاتری ئەوو بۆ یارمەتیدانیو پشتگیری کردنی، ئەمە لەو کاتەدا: کە موسا لەخودا پاڕایەوەو وتی: ﴿وَاجْعَل لِّي وَزِيراً مِّنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي، اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾(طه/٢٩-٣٢). دوعاکەی گیرابوو داخوازییەکەی هاتە دی ﴿قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى﴾(طه/٣٦). هەروا کە دەفەرموێ: ﴿سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾(القصص/٣٥). شایانی باسە پلەو پایەی (ئولولعەزمیەتی) پلەو پایەیەکی بەرزو شکۆمەندە، پێویستی بەدەستەبەربوونی چەند رەوشتێکی تایبەتی هەیە، ئەو پێنج صیفەتانەی قورئان بۆ حەزرەتی موسای تۆمار کردوون بەشێکن لەو رەوشتە بەرزە پێویستانەی ئەو پلەو پایە شکۆمەندییە کە: لەزنجیرەی

پێغەمبەراندا تەنیا پێنج پێغەمبەر ئەم پلەو پایەیان دەست کەوتووە. نیعمەتێکی تر: کە بەخشراوە بەموسا ئەوەیە: کە لەسەر داوای خۆی بۆ پشتگیریکردنی پەیامەکەی هارونی براشی کراوە بەپێغەمبەر ئەمەش نیعمەتێکی گەورە بووە بەسەر هەردو جوتە برادا کەبوونە پشتو پەنای یەکتریو بەیەکەوە پەیامی خودایان گەیاندوە..

## چیرۆکی حەزرەتی ئیسماعیل ﷺ

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ ﴾

ئەمە پێنجەم چیرۆکە: کە لەسورەتی مەریەمدا تۆمار کراوە، ئەویش چیرۆکی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیمە دروودی خودایان لێ بێ حەزرەتی ئیسماعیل بەگوێرەی شەریعەتی باوکی پەیڕەوی کردوە، لەیەکتاپەرستیو دژایەتیکردنی بتپەرستیدا چاوی لەباوکی کردوە، حەزرەتی ئیبراهیم وەکوو زانیمان باوکی عەرەبەکانە بەیەمەنیو موضەرییەوە، کەواتە ئەو عەرەبانەی لەنەوەی ئیبراهیم کەوتوونەوە عەرەبی عاریبە نین بەڵکوو موستەعرەبن. بۆیە (طە حسین) لەنوسراوێکیدا دەڵێ: عەرەب نەتەوەیەکی عاطفین و هەستو شعوریان بەهێزە وەندەی لایەنی عاطیفەو خەیاڵیان بەهێزە، لایەنی فیکرەو مەنطیقیان خوازە، بۆیە هەرگیز فەیلەسوفیان تێدا هەڵنەکەوتووە، ئەمجار دەڵێ: ئەگەر بگوترێ: ئەدی ئەوە نیە پێغەمبەریان تێدا هەڵکەوتووە، خۆ لەهەموو

فەیلەسوفێك فەیلەسوف تره؟ (دکتۆر طه حسين) هەر بۆخۆی وەڵامی خۆی دەداتەوە دەڵێ: موحەممەد عەرەبی عاریبە نیە، بەڵکوو موستەعرەبە!!

**سورێکی خامە بەدەوری چیرۆکو سەرگورشتەی حەزرەتی ئیسماعیلدا. کە بە زەبیح مەشهورە:**

حەزرەتی ئیبراهیم خەوی بینی (خەوی پێغەمبەرانیش حەقو راستە) لەخەودا بینی کوڕەکەی خۆی دەکردە قوربانی، بەلای زوربەی زانایانی ئیسلامەوە ئەو کوڕە حەزرەتی ئیسماعیل بووە. جا کەبەیانی لەخەو هەڵسا روداوی خەوەکەی بۆ ئیسماعیل گێڕایەوە، ئەویش یەکسەر رەزامەندی بەسەربڕینی خۆی راگەیاندو ﴿قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾(الصافات/١٠٢).

جا کە حەزرەتی ئیبراهیم دەستی کرد بەسەربڕینی ئیسماعیلو کێردەکەی خستە سەر گەردنی کوڕە تاقانەکەی پەروەردگار نیگای بۆ ناردو بانگی لێ کرد، کە ئیتر تۆ خەوەکەی خۆت بەجێ هێناو ئەو فەرمانبەرداریەی تۆ نیشانەی ئەوەیە: کە خەوەکەت بەراست گێڕا، ئیتر لەو کاتەدا حەزرەتی ئیبراهیم بەرانێکی گەورەو قەڵەوی لەنزیك خۆیەوە بینی، ئەوی سەربڕی لەجیاتی کوڕەکەی خۆی، قورئان ئەو کوڕەی دیاری نەکردوە: کە حەزرەتی ئیبراهیم قەصدی سەربڕینی کرد، بەلام سیاقی ئایەتەکانو دوای موژدەدان بەئیبراهیم بەبەخشینی ئیسحاق پێی گەواهی ئەوەن: کە ئەو کوڕەی فەرمان کرا بەئیبراهیم بەسەربڕینی حەزرەتی ئیسماعیل بووە. کە لەسورەتی (الصافات)دا دوای چیرۆکی سەربڕینەکە دەفەرموێ: ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيّاً مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾(الصافات/١١٢) ئاماژەیە بەوە: کە ئیسحاق ئەو کوڕە نیە فەرمان بەباوکی کرابێ بەسەر بڕینی!

جولەکەکان: پێیان وایە ئەو کوڕەی ئیبراهیم ویستی سەری ببڕێ ئیسحاق بووە، ئەمەش بۆ خۆهەڵنانەوەو فەخر کردن بەوە کە باوکیان گیانی خۆی بەخشی لەپێناو رەزامەندی خودادا.

بەڵگە زۆرن لەسەر ئەوە: کە ئیسماعیل ئەو کوڕەبووە: کە حەزرەتی ئیبراهیم ویستی سەری ببڕێ.

١- تەورات خۆی دان بەوەدا دەنێ: کە ئیبراهیم پڕکێشی تاقە کوڕەکەی کرد بۆ سەربڕین، دیارە پەنابردن بۆ سەربڕینی تاقانە ئەوپەڕی پابەندیو گەردنکەچی بۆ خودا تێدایە، ئاشکراشە هیچ کاتێ ئیسحاق تاقانە نەبوە، چونکە ئەو کاتەی ئیسحاق هاتۆتە دونیاوە تەمەنی حەزرەتی ئیسماعیل چوارده ساڵان بووە. لەژیانیشدا ماوە، تا حەزرەتی ئیبراهیم کۆچی دوایی کردوەو سەرپەرشتی کفنی کردوە. کەوابوو پێش لەدایکبوونی حەزرەتی ئیسحاق حەزرەتی ئیسماعیل تاقانە بووە. هەروەها روداوی هەوڵدانی سەربڕینی کوڕەکە لەمەککە رووی داوە، دەی حەزرەتی ئیبراهیم ئیسماعیلی بەشیرەخۆری بردوە بۆ مەککە نەك ئیسحاق!

**سەرگوزەشتەی ئیسماعیل و دایکی لەمەککە :**

پاش دروستکردنی کەعبە لەمەککە هیچ خانوو بەرەیەك بنیات نەنراوە هەتا سەدەی دووەمی پێش هاتنی ئیسلام کە سەردەمی قوصەی کوڕی کیلاب بووە. ئەو لەرۆژگاری خۆیدا (دار الندوة)ی دروست کرد، ئەمجار قوڕەیشییەکان لەدەورو بەری کەعبە خانوبەرەیان بنیات نان.

فەرموودەیەك هەیە لەبوخاریدا ئیبنو عەبباس ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر فەرمووی: یەکەم ئافرەت: کە پشتێنی بەست دایکی ئیسماعیل بوو پشتێنی بەست بۆ ئەوەی دیاردەی سکەکەی لەسارا خاتون بشارێتەوە. ئەمجار حەزرەتی ئیبراهیم (هاجرە)و (ئیسماعیلی) کوڕی هێنان لای کەعبە نیشتەجێی کردن، ئەو کاتە ئیسماعیل شیرەخۆرە بوو لەژوور مزگەوتەوەو لەپشت زمزمەوە دای نان، ئەو سەردەمە مەککە هیچ کەسی تێدا نەبوو، ئاویشی لێ دەست نەدەکەوت، لەوێ داینانو هەمبانەیەك خورماو گۆزە ئاوێکی لەلا بەجێ هێشتنو بۆ خۆی گەڕایەوە بەرەو وڵاتی فەلەستین، دایکی ئیسماعیل دوای کەوت، وتی: ئەی

ئیبراهیم! بۆ کوێ دەڕۆیو چۆن ئێمە لەم شوێنە چۆڵو هۆڵەدا بەجێ دێڵی؟ چەند جارێك ئەم پرسیارەی لێ دووبارە کردەوە، بەڵام ئیبراهیم هیچ وەڵامی نەدایەوەو ئاوڕی لێ نەدایەوە، ئەمجار پێی گوت: ئەی ئیبراهیم! ئایا خودا فەرمانی پێ کردوی بەوە ئێمە لێرە جێ بێڵی؟ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بەڵێ: وتی: کەوابێ خەمم نیە، خودا هەرگیز لێمان غافڵ نابێو ئاگای لیمانە ئیتر گەڕایەوە بەدواوە.

ئیبراهیم رۆیی تا لێیان نەدیوبوو گەیشتە (الثنية) لەوێ رووی کردە کەعبەو دوو دەستی بەرز کردنەوەو لەخودا پاڕایەوە وتی: ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ...﴾ تا دەگاتە ﴿يَشْكُرُونَ﴾.

ئیتر (هاجەرە) دایکی ئیسماعیل جێ نشین بوو خەریکی بەخێوکردنی کوڕەکەی بوو، شیری دەدا بەرۆڵەکەی، هەتا ئاوەکەی لێ بڕایەوە، تینوایەتی تینی بۆ هێنا، خۆیو کوڕەکەی زۆریان تینوو بوو، بەچاوی خۆی بینی رۆڵەکەی لەتینوان جینگڵی دەدا، ئیتر چاوی بەرایی نەدا بڕوانێتە رۆڵەکەی، بۆیە کەوتە هەوڵدانو هاتوچۆ بۆ رزگار کردنی خۆیو رۆڵەکەی، کێوی صەفا نزیکترین بەرزایی یەك بوو لێیەوە، چووە سەر ئەو کێوە، ئەمجار سەیری شیوەکەی کردو روانی بەڵکوو یەکێك ببینێ فریایان بکەوێ، کەسی نەبینی، لەسەر تەپۆلکەی صەفاوە هاتە خوارێ بۆ ناو دۆڵەکە، ئەمجار لایەکی داوێنی کراسەکەی هەڵکردو کەوتە خێرا رۆییشتنو گورگەلۆقە، هەتا دۆڵەکەی بڕیو چووە سەر (مەروە) لەوێوە روانی ئاخۆ کەس نابینێ، کەسی بەرچاو نەکەوت حەوت جار ئەم هاتووچۆو گورگە لۆقەیەی ئەنجامدا.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەمەیە بناغەی هاتوچۆی حاجیان لەنێوان صەفاو مەروەدا، جا کە جاری حەوتەم سەرکەوتە سەر (مەڕوە) دەنگێکی بیست، خۆی بەخۆی گوت: بێدەنگ بە! پاشان دووبارە گوێی خۆی هەڵخست، هەمان دەنگی گوێ لێ بوو، ئەمجار وتی: گوێم لێ بوو، ئەگەر کۆمەکی و

یارمەتیەکت لایە فریامان بکەوە! کاتێك کە روانی ئەوا فریشتەیەك لەشوێنی بیری زەمزەمی ئێستا بەباڵی زەوی هەڵدایەوە هەتا ئاو دەرکەوت، ئەمجار (هاجەرە) چووە ناو بیرەکەوەو بەلوێچ ئاوی هەڵدەهێنجاو دەیکردە گۆزەکەیەوە، چەندێکی لێ هەڵ بهێنجایە دەهاتەوە شوێنی.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خودا رەحم بەدایکی ئیسماعیل بکا، ئەگەر وازی لەزمزم بهێنایە، یان فەرمووی ئاوی لێ هەڵ نەهێنجایە زمزم دەبوە کانیاوو ئاوی لەبەر دەڕۆیی!

ئەمجار خاتو (هاجەرە) شیریدا بەمنداڵەکەی، فریشتە پێی گوت: لەفەوتان مەترسن، ئا لەم شوێنە خاتوی کابە دروست دەکرێ، ئەم منداڵەو باوکی بنیاتی دەنێن، پەروەردگار خۆشەویستانی خۆی زائیع ناکا.

## دروستکردنی کابە:

حەزرەتی ئیبراهیم بەینا بەین سەردانی ئیسماعیلی کوڕی دەکرد، لەسەردانێکیدا بۆ ماڵی هاجەرەو ئیسماعیل پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی ئیبراهیمو حەزرەتی ئیسماعیل کرد: کە کابە بنیات بنێن، فەرمانبەردار بوونو کەعبەیان دروست کرد. کە تەواویان کرد، پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی ئیبراهیم کرد، بەخەڵکی رابگەیەنێ کە کابەی دروست کردوە بۆ خوداپەرستی، پێویستە لەسەر بەتواناکانیان ساڵانە حەجی ماڵی خودا بکەن، ئەمجار ئیبراهیمو ئیسماعیل لەخودا پاڕانەوە؛ کە مەناسیکی حەجیان فێر بکاو نیشانیان بدا، کەعبە یەکەم خانوێکە لەسەر زەوی بۆ خوداپەرستی دانراوە، حەزرەتی ئیسماعیل دوانزە کوڕی بوون لەهەر کوڕێکی وەچەو نەوەیەکی زۆر کەوتنەوە، کوڕەکانی هەموویان بوون بەسەرۆك هۆزو ریش سپی خێڵ. حەزرەتی ئیسماعیل سەدو حەفتاو سێ ساڵ ژیا، لەمەککە کۆچی دوایی کردوە، لەپەنا کابە لەو شوێنەی ئێستا بەحیجری ئیسماعیل مەشهوورە لەپەنا دایکی بەخاك سپێردراوە.

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! لەقورئاندا سەرگورشتەو رەوشتی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم ﷺ بۆ ئەو مەردومگەلە باس بکە، ئەو زاتە باوە گەورەی هەموو وڵاتی حیجازە. ئەمەش صیفەتو رەوشتی ئیسماعیلە: کە لەم سورەتەدا تۆمار کراون:

١- ﴿إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ﴾ بێگومان ئیسماعیل زۆر وادە راست و پابەندی بەڵێنی خۆی بوو. هەروادەو بەڵێنێکی دابێ بەجێی هێناوە، هەر شتێك دەربارەی خوداپەرستی فەرمانی پێ کرابێ، گەردنکەچ بووە بۆیو ئەنجامی داوە، کیفایەتە بۆ وادە دروستیو بەڵێن راستی ئەو زاتە؛ وادەی بەباوکی دا کە ئامادەباش بێ بۆ سەربڕینو پابەندی وادەکەی بوو، تا سەر چەقۆکە ئارامی گرتو رازی بوو بەقەزای خودا! وەکوو دەفەرموێ: ﴿سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾(الصافات/١٠٢).

راستگۆیی لەوادەدا یەکێکە لەرەوشتە پەسندەکانی ئادەمیزاد لەهەموو کاتو شوێنێك، وادە بەجێ نەهێنان رەوشتێکی ناشیرینەو پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین! قورئان سەرزەنشتی ئەوانەی کردوە: کە وادە دەدەنو پابەندی وادەی خۆیان نابن، وەکوو دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ، كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾(الصف/٢-٣).

بوخاریو مەسلیمو تیرمیذیو نەسائی لەئەبو هوریرەوە ریوایەتیان کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف وإذا ائتمن خان) نیشانەی ئادەمیزادی دوو ڕوو سێ شتن: کە قسەی کرد درۆ بکا، کە وادەی دا نەیباتە سەر، ئەگەر سپاردەیەکی پێ سپێردرا خییانەتی تێدا بکا. جا کە ئەم رەوشتانە دزێوو ناشیرین بن، ئەوە پێچەوانەکانیان دەبنە رەوشتی خودا ناسان. کەوابوو راستگۆییو پابەند بوون بەوادەو پارێزگاری کردنی ئەمانەت تەرازوی موسوڵمانەتیو راستاڵییە، هەر کەسێك لافی موسوڵمانەتی لێ بدا با لەخۆی بفکرێ ئاخۆ تا چ ئەندازەیەك ئەم رەوشتە پەسندانەی تێدان..!

هەڵبەتە راستگۆیی‌و راست وادەیی رەوشتی هەموو پیاوچاکو پێغەمبەرێکن، بەڵام وا دیارە ئەم رەوشتانە لەحەزرەتی ئیسماعیل‌دا زۆر بەرچاوو بەدەرەوە بوون بەرادەیەك: کە شیاوی ئەوەن ئاماژەیان پێ بکرێ.

٢- ﴿وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾ ئەو زاتە هەم رەوانە کراوو هەم نەبی بووە، رەوشتی ریسالەتو نبوەتی تێدا بوون، رەوانە کراوە بۆ سەر هۆزی جورهەم لەمەککە، بۆ ئەوەی شەریعەتی حەزرەتی ئیبراهیمیان بۆ شی بکاتەوەو پێیان رابگەیەنێ، کەواتە رەسول مەرج نیە نامەی ئاسمانی سەر بەخۆی بۆ بنێردرێ، بەڵکوو جاری وا دەبێ شەریعەتی پێغەمبەرێکی پێش خۆی بەخەڵك رادەگەیەنێ.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر رێزداریی حەزرەتی ئیسماعیل بەسەر ئیسحاقی برایدا، چونکە ئیسحاق تەنیا وەصفی نبوەتی بۆ هێندراوە، بەڵام بۆ ئیسماعیل فەرمووی: ﴿وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾ تیرمیذیش لەپێغەمبەرەوە فەرموودەیەك ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله اصطفى من ولد ابراهيم اسماعيل).

٣- ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلاةِ وَالزَّكَاةِ﴾ فەرمانی بەئۆمەتو هۆزو خێزانی خۆی دەکرد بەئەنجامدانی نوێژو زەکات دەرکردنی ماڵو سامان. بەصەبرو پشو درێژ بوو لەسەر خوداپەرستی ﴿وَكَانَ عِنْدَ رَبِّهِ مَرْضِيّاً﴾ لەلای خودای خۆی پلەی رەزامەندیی بەدەست هێنابوو، خودا لێی رازی بوو، جا کەسێك بگاتە ئەو پلەو پایە خودا لێی رازی بێ ئیتر چی دەوێ؟؟ کەوابێ تۆش ئەی پێغەمبەر بەتایبەتی و ئەی ئادەمیزاد بەگشتی چاو لەئەو بکەن‌و ئیقتیدای پێ بکەن!

## چیرۆکی حەزرەتی ئیدریس ﷺ

﴿ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ٥٦ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ٥٧ ﴾

ئەمە چیرۆکی حەزرەتی ئیدریسە، شەشەم چیرۆکی سورەتی مەریەمە، مەبەست لەهێنانی ئەم چیرۆکە پەندو عیبرەت وەرگرتنە، چونکە ئەمیش بانگەوازی ئادەمیزادی کردوە بۆ خوداپەرستیو یەکتاپەرستیو رزگارکردنی خودی خۆیان لەسزای دۆزەخ، بەهۆی ئەنجامدانی کرداری چاکو بەسوود، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ دونیا ویستیو عەداڵەتکاریو جیهاد کردنی دژی دوژمنان. فەرمانی بەئەنجامدانی نوێژو بەرۆژو بوونی چەند رۆژێك لەهەموو مانگێك کردوە، فەرمانی کردوە بەزەکاتدانو یارمەتیدانی هەژارو زەبوونەکان، دوای حەزرەتی ئادەمو حەزرەتی شیث کراوە بە پێغەمبەر لەوەچەو نەوەی ئادەمە، چونکە رۆژگاری لەرۆژگاریّ حەزرەتی ئادەم نزیکە. بەباپیری حەزرەتی نووح دادەنریّ.

زۆر لەپێش رۆژگاری حەزرەتی ئیبراهیم بووە، چونکە بەگوێرەی قورئان حەزرەتی ئیبراهیم لەوەچەو نەوەی ئەوانەیە: کە لەگەڵ حەزرەتی نوحدا لەکەشتییەکەدا بوون.

حەزرەتی ئیدریس یەکەم کەس بووە: کە بەقەڵەم نووسیویەتی، فێری زانینی ژمارەو ئەستێرەناسی بووە، یەکەم کەس بووە پۆشاکی دووراوی لەبەر کردوە، یەکەم کەس بووە چەکی بەکار هێناوە.

لەصەحیحی موسلیمدا لەباسی ئیسراو میعراجدا هاتووە: کە پێغەمبەر ﷺ لەشەوی میعراجدا لەئاسمانی چوارەمدا بەلای حەزرەتی ئیدریسدا تێپەریوە.

هەنـدێك لەمێـژوو نووسـانی كۆنینـە دەڵـێن: لـەوڵاتی میـصر لـەدایك بـووە، هەندێكیش پێیان وایە لەوڵاتی بابل لەدایك بووە. لەسەرەتای تەمەنیدا بـەگوێرەی زانیـاری حـەزرەتی ئـادەمو شـیث كـاری كـردوە، حـەزرەتی شـیث بـاپیری بـاوكی ئیدریسە.

قورئانی پـیرۆز بەشێوەیەكی كورت لێرەدا باسی حـەزرەتی ئیـدریس دەكـاو دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ﴾ ئەی پێغەمبەر! لەقورئاندا باسی ئیـدریس بۆ ئۆمەتەكەت بگێڕەوە، سێ رەوشتی ئەم زاتە بۆ ئادەمیزاد رون بكەرەوە.

١- ﴿إِنَّهُ كَانَ صِـدِّيقاً﴾ بێگومـان ئیـدریس زۆر راسـتگۆ بـوو لـەگفتارو كـرداردا هەرگیز درۆی نەكردوە..

٢- ﴿نَبِيّاً﴾ پێغەمبەر بووەو شەریعەتی بۆ نێردراوە، فـەرمانی پـێ كـراوە ئـەو شـەریعەتە بەئوممەتەكـەی رابگەیـەنێ، پـەروەردگار سـێ صـەحیفەی بـەنیگا بـۆ ناردوە.

٣- ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً﴾ بەرزمان كردۆتەوە بۆ پلـەو پایـەو مـەقامێكی بـەرز، رێزدارمان كرد بەوە: كە پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیمان پێ بەخشی.

هـۆی بەرزكردنـەوەی مەكانـەتی ئیـدریس بـەهۆی ئـەوەوە بـوو: كـە زۆر خواپەرست بووە. بەرۆژ بەرۆژو بووە. بەشەو خواپەرستی كردوە.

خاوەنی ئەم جۆرە رەوشتانە قودوەو رابەرن، پێویـستە موسـوڵمان چـاویان لێ بكـاو بەرەوشـتی ئـەوان خـۆی ئـارایش بـدا، قورئـانی پـیرۆز سەرگورشـتەی ئـەو پێغەمبەرانەی بۆ گێڕاینەوە رەوشتی شیرینی ئەوانی بۆ دیـاری كـردین، بـۆ ئـەوەی بـەراوردێ بكـەین لـەنێوان ئـەو كۆمەڵـە بـەرزو پـاكو راسـتاڵە لەگـەڵ ئـەو هـەموو چینو تاقمـە خراپەكارانـەی: كـە دوای ئـەوان هـاتوون، هـەڵسو كـەوتی ئـەو تاقمـە خواپەرسـتە نموونەییانـە بەهـەڵسو كـەوتی ئـەو تاوانبارانـە بەرامبـەر بكـەینو

بەیەکیان بگرینو ئەمجار بۆ خۆمان حوکم بدەینو چاکو خراپ لێك جیا بکەینەوە، پەیڕەوی چاکەکاران بکەینو لەرەوشتی خراپەکاران بەدووربینو خۆمان بپارێزین. خوداش پشتیوان بێ!

## بڕێ لەرەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەران (دروودی خودایان لەسەر بێ)

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ۩ ٥٨﴾

لەوەپێش پەروەردگار ناوو وەصفو پەسنی دە پێغەمبەری خۆی راگەیاند، هەر پێغەمبەرەو بڕێ لەرەوشتی جوانی تۆمار کردن، لەکۆتاییدا لەژێر چەتری رەوشتێکی فرە مەزندا کۆی کردنەوە، ئەویش بەخشینی پلەی پێغەمبەرایەتی یە پێیانو شارەزایی کردنیانە بۆ رێگای هیدایەتو هەڵبژاردنیانە لەناو مەخلووقاتی خۆیدا بەسەر مەخلوقاتدا.

هەڵبەتە ئاماژە بۆ کراو بەوشەی (أولئك) هەر ئەو (دە) پێغەمبەرە نین: کە لەم سورەتەدا باس کراون، بەڵکوو مەبەست جینسی پێغەمبەرانە. ذیکری ئەشخاصەو مەبەست جینسە. دەفەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ النَّبِيِّينَ﴾ ئەو زاتانەی لەسەرەتای سورەتەکەوە تا ئێرە باس کراون هەر لەزەکەریاوە تا ئیدریس، بەڵکوو هەموو پێغەمبەران بەگشتی، ئەوانەن: کە خودا نیعمەتی

پێغەمبەرێتی پێ بەخشیونو لەخۆی نزیك كردونەوەو پلەی بەرزو شكۆمەندی پێداون. لەناو بەندەكانیدا هەڵی بژاردوون، هیدایەتی داونو شارەزای كردون بۆ ئەوەی ببنە نموونەی مرۆڤایەتیو رابەری ئادەمیزاد لەخواپەرستیو بەندایەتی كردندا، بۆ ئەوەی خەڵك چاویان لێ بكەنو لەڕەوشتو خواپەرستیدا شوێنیان بكەون، ئەم زاتانە هەندێكیان ﴿مِنْ ذُرِّيَّةِ آدَمَ﴾ بریتین لەو پێغەمبەرانەی لەوەچەی ئادەمن: وەكوو ئیدریس، ﴿وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ هەندێكی تریان وەكوو لەنەوەی ئادەمنو ئادەم بەباوەگەورەیان حسێب دەكرێ، لەوەچەو نەوەی ئەوانەشن كە لەگەڵ نووحدا لەكەشتی یەكەدا هەڵمان گرتن، ئەوەش وەكوو ئیبراهیم كە لەنەوەی (سام)ی كوڕی (نووح)ە، هەشتەكەی تریشیان ﴿وَمِنْ ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ﴾ لەنەوەی ئیبراهیمن وەكوو ئیسماعیلو ئیسحاقو یعقوب ﴿وَإِسْرَائِيلَ﴾ هەندێكی تر لەو پێغەمبەرانە لەنەوەو وەچەی ئیسرائیلن؛ واتە: لەیەعقووب كەوتوونەوە: وەكوو موساو هارونو عیساو زەكەریاو یەحیا (دروودی خودا لەسەر هەموویان بێ) ﴿وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا﴾ ئەوانە لەكۆمەڵی ئەو پێغەمبەرانە بوون: كە هیدایەتمان دان بۆ ئایینی ئیسلام؛ ئەو ئایینەی: كە بەرنامەو دەستووری هەموو پێغەمبەران بووە، هەموو پێغەمبەرەكان بانگەوازییان بۆ كردوە، لەكۆمەڵی ئەو زاتانە بوون: كە هەڵمان بژاردون بۆ پلەو پایەی پێغەمبەرایەتیو رێزلێنانو شكۆمەندیمان پێدان.

ئەو زاتانە: ﴿إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُ الرَّحْمَنِ خَرُّوا سُجَّداً وَبُكِيّاً﴾ هەر كاتێ ئایەتەكانی خودای خاوەن بەزەییو رەحم بخوێندرایەوە بەسەریاندا، بەرەو ڕو بەدەمدا دەكەوتنو بەگریانەوە سوژدەیان بۆ خودا دەبرد، گەردنكەچیو بەندایەتی خۆیان بەئەوپەڕی شێوەی زەلیلی نیشان دەدا، حەمدو سوپاسی خودایان ئەنجام دەدا، لەسەر نیعمەتو بەخششەكانی، ترسی سزاو تۆڵەی خودای خاوەن دەسەڵاتیان لەدڵابوو!.

واتە: ئەو زاتە هەڵبژێراوانە رەوشتو نیشانەی ئاشکرایان ئەمە بوو لەخودا ترس بوون، ترسو بیمی خودایان لەدڵدا جێگیر بوو، دڵو دەرونو هەستو شعووریان وا پاڵفتەو مشتو ماڵ کرابوو هەر کاتێ ئایەتەکانی خودایان ببیستایە، بەڵگەو دەلیلی هەبوونو تاکو تەنهایی خودایان بەگوێدا بدرایە، یاساو شەریعەتی خودایان بۆ شی بکرایەوە دەست بەجێ دەکەوتنە سوژدەو دەستیان دەکردە گریانو لەرزینو فرمێسك باران لەترسی خودا.

ئایەتەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە پێویستە ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ یان گوێی لێ دەگرێ بیر لەمانای ئایەتەکان بکاتەوە، هەوڵ بدا کار لەدڵو دەروونی بکاو گریانی بێ، خۆ ئەگەر گریانی نەهات خۆی بگریەنێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (أتلوا القرآن وابكوا فان لم تبكوا فتباكوا) قورئان بلاوێنن‌و بیری لێ بکەنەوە بۆ ئەوەی ترسو بیمی عەزابی خودا بەگریانتان بێنێ، ئەگەر گریانی راستیو سروشتیتان نەهات، بەئارەزۆ خۆتان بگریەنن.

(صالح المرّبى) دەڵێ لەخەودا قورئانم بۆ پێغەمبەر ﷺ خوێند، پاشان پێی فەرمووم: ئەی صالح! ئەمە خوێندنی قورئان بوو ئەی کوا گریان؟

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: هەر کاتێ ئایەتی سوجدەی (سبحان)متان خوێند خێرا سوجدەکە مەبەن هەتا کوڵی گریانی خۆتان هەڵنەستێنن، خۆ ئەگەر چاوتان فرمێسکی نەهات با دڵتان بگری!!

هەروەها لەئایەتەکە ئەوەش وەردەگیرێ: کە هەموو پێغەمبەران (قدوة)ی راستاڵن‌و رابەری راستەقینەی مرۆڤایەتین، نموونەی بیرو باوەڕ دروستیو عیبادەتکردنی زۆرو باشو ئایینی راستو رەچەڵەکی پاکو نەسەبو خانەوادەی بەرزو پاکو خاوێن لەرەوشتو سروشت دان.

ئایەتەکانی (٨٣-٩٠)ی سورەتی (الأنعام) بەڵگەن لەسەر ئەوە: کە مەبەست بەم ئایەتەی ئێرە هەر ئەو دە پێغەمبەرە نین کە لەم سورەتەدا باس کراون، بەڵکوو مەبەست تێکڕای پێغەمبەرانن بەگشتی..

## صیفاتو ڕەوشتی وەچەو چینی دوای پێغەمبەرەکان ڕەوشتی تۆبەکارانو ئەوانەی شیاوی چوونە ناو بەهەشتن

﴿ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار وەصفو پەسنی ئەو پێغەمبەرانەو شوێنکەوتوانیانی تۆمار کرد، بەوە ناساندنی کە لەخوداترسو ڕاستاڵن، پەیڕەوی فەرمانی دین دەکەنو خۆیان لەو شتانە دەپارێزن: کە خودا نەی لێ کردوە، ئادەمیزادانی هەڵنان بۆ چاو لێ کردنو شوێنکەوتنیان، باسی صیفاتو ڕەوشتی ئەوانە دەکا کە لەرۆژگاری دوا ئەوان دێنە کۆڕی ژیانەوە، ڕوو لەئایین وەردەگێڕن، ئەرکی ئایینی پاش گوێ دەخەن، سەرگەرمی ڕابواردنو ئارەزۆبازی دەبن، ئەمجار

سزاو تۆڵە لێ ستاندنیان لەرۆژی قیامەت دا دیاری دەکاو ناهێڵێ هەروا بەسەریانەوە بچێ، مەگەر ئەوانەیان نەبێ: کە تۆبە دەکەن، ئەوانە خودا تۆبەیان لێ وەردەگرێو بەهەشتی جوانو رازاوەیان بەخەڵات پێ دەبەخشێ!

ئیمامی رازی دەفەرموێ: ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە مەبەست بەو پاشماوەو وەچەو نەوانە وەچەو نەوەی پێغەمبەرەکان بن.

موجاهید دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی گەلو نەتەوەیەك نازڵ بووە لەئوممەتی پێغەمبەرن، لەسەر رێگەوبان سواری یەکتری دەبن وەکو چۆن ئاژەڵ سواری یەکتر دەبن، شەرم لەخەڵکی ناکەنو لەخواش ناترسن.

ئەڵڵاهونەکبەر! ئەو پێغەمبەرە هەست ناسکو دڵو دەروون پاکو خاوێنانە: کە هەمیشە دڵیان بەخوداوە پەیوەستەو چاویان پڕ لەفرمێسکە، هەر کە یادی خودا دەکەن دڵیان وەلەرزدێو دەکەونە سوجدەو دڵیان وەکوو مەنجەڵ دەکوڵێو لەترسی خودا حەجمینیان نیە، لەپاش خۆیان وەچەو نەوەیەك جێ دێڵن دوور لەخوداو خوداناسی، واز لەنوێژ کردن دەهێنن، بڕوایان پێی نیە، سەرگەرمی رابواردنو هەواو هەوەس دەبن! ئای لەم جوداوازییەو لەم موفارەقەیە.؟

دەفەرموێ: ﴿فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيّاً﴾ پاش لەدونیا دەرچوونی ئەوزاتانە، دوای ئەو بەهرەمەندو بەختەوەرانەو شوێنکەوتوانیان، وەچەو نەوەو چینو توێژێك هاتنە کۆڕی ژیانەوەو بەرواڵەت جێگای ئەوانیان گرتەوە، بەڵام نوێژەکانیان زایەکردنو وازیان لێ هێناو پاشگوێیان خستن، بەڵکوو هەر بڕوایان پێ نەبوو. وازیان لەخوداپەرستی هێناو دەستیان کرد بەخراپەو خراپەکاری، رۆچون لەگومڕاییو ئارەزۆبازیدا، دەستیان دایە زینا کردنو سەرپێچی فەرمانی خودا لەهەموو رویەکەوە، سەرگەرمی دونیا خواردنو لەبیرچوونەوەی رۆژی قیامەت بوون، ئەوانە سزاو تۆڵەیان لێ دەستێندرێو لەوەبەولاوە تووشی عەزابو مەینەتی دەبن، لەرۆژی قیامەت دا

نائومێدو خەسارەتمەند دەبن، دوچاری تۆڵەی سەختو دژواری گومڕایی یەکەیان دەبن لەدۆزەخدا. چونکە لەدونیادا تاوانیان ئەنجام داوەو ئەرکی سەرشانی خۆیان پاشگوێ خستووە!

ئیمامی شەوکانی دەفەرموێ: هەر کەسێك نوێژ لەکاتی خۆیدا نەکا، ئەرکێك لەئەرکەکانی سەرشانی بەجێ نەهێنێ، یان مەرجێك لەمەرجەکانی نوێژ یان روکنێك لەروکنەکانی پاشگوێ بخا بێگومان ئەوە نوێژی زایە کردوە.

بۆیە کۆمەڵێك لەزانایانی سەلەفو خەلەفو برێك لەشەرعزانو موجتەهیدەکان پێیان وایە نوێژنەکەر کافرە، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرمویەتی: (بين الرجل وبين الكفر ترك الصخة) نێوان ئادەمیزادو کوفر بریتییە لەوازهێنان لەنوێژ. یان ئەو فەرمودەیەی؛ کە ئیمام ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائیو ئیبنو ماجە لەبورەیدەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (العهد الذي بيننا وبينهم الصخة، فمن تركها فقد كفر) ئەو پەیمانو بەڵێنەی لەنێوان ئێمەو ئەهلی کوفردایە بریتییە لەنوێژ، کەسێك نوێژی نەکرد بێگومان بەکافر حسێبە.

ئەمجار پەروەردگار لەدوچاربوونی ئەو سزا دژوارە هەندێ لەئادەمیزادان وەلادەنێو لەو حوکمە چەرتیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلا يُظْلَمُونَ شَيْئاً﴾ وەلێ کەسێك تۆبە بکا لەتاوانی نوێژ نەکردنو لەشوێنکەوتنی هەوەسو ئارەزووبازی، بگەڕێتەوە بۆ خوداپەرستی، وێڕای ئەوەش باوەڕی بەخودا قایمو پتەو بکا، کرداری چاکو بەسوود ئەنجام بدا، ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتی رازاوەو قەشەنگەوە، خودا لەتاوانیان خۆش دەبێ، چونکە تۆبەی راستەقینەو راستاڵانە تاوانی لەوەپێش دەسڕێتەوە وەکوو لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە ئیبنو ماجە لەئیبنو مەسعوودەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (التائب

من ذنب كمن لا ذنب لە) کەسێك تۆبەی راستاڵانە بکاو لەتاوانەکانی پەشیمان بوبێتەوە وەکوو ئەوە وایە تاوانی نەبێ، تاوانی نەکردبێ.

ئەم وەلانانو ئیستیثناکردنەی ئێرە وەکوو چەرتکردنو ئیستیثنای ئایەتی ژمارە (٦٨-٧٠)ی سورەتی (الفرقان) وایە: کە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾ پاشان دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحاً فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً﴾.

ئەمجار پەروەردگار وەصفو پەسنی ئەو باغانەی بەهەشت دەکا: کە تۆبەکاران دەچنە ناویان، سێ وەصف بۆ ئەو باغانە تۆمار دەکا: کە دەبنە مایەی خۆشگوزەرانی ئەوانەی دەچنە ناویانو تێیاندا دەمێننەوە.

١- ﴿جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدَ الرَّحْمَنُ عِبَادَهُ بِالْغَيْبِ﴾ ئەو بەهەشتە بریتییە لەچەند باغو باغاتێك کە باغاتی (عدن)یان ناوە، بەشێکە لەقاتو تەبەقەی ناو بەهەشت، یان شوێنی نیشتەجێ بوونو مانەوەی هەتا هەتایین، پەروەردگار وادەی ئەو بەهەشتە خۆشو رازاوەیەداوە بەبەندە باشەکانی: کە بەنەدیدەیی بڕوایان بەهەبوونی هەیەو کاری بۆ دەکەن، چاویان پێ نەکەوتووە ئیمانیان پێ هێناوە، بەهۆی بەهێزی بیرو باوەڕیانەوە، دڵنیان لەوەی وادەی خودا هەردێو پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە ﴿إِنَّهُ كَانَ وَعْدُهُ مَأْتِيّاً﴾ بێگومان خودا وادەی بەدی دێو هەرچی بەڵێنی پێ دابێ دەبێ بێتەجێو بەڵێن پێدراوەکان بەمرازی خۆیان دەگەنو هەموویان دەچنە ناو ئەو بەهەشتانەوە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَانَ وَعْدُهُ مَفْعُولاً﴾(المزمل/١٨).

٢- ﴿لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً إِلاَّ سَلاماً﴾ ئەهلی بەهەشت؛ ئەو پیاوچاکانەی خودا دەیانخاتە بەهەشتەوە، لەوێدا قسەی پڕوپووچ نابیسن، کەس قسەی ناشیرینو بێ

سوودیان ئاراستە ناکا، بەڵکوو ئەوەی دەیبیسن هەر سەلامکردن لەیەکتری و سەلامکردنی فریشتەیە لێیان، دڵنیایی و ئارامییان پێ دەبەخشرێ بۆ ئەوەی هێندەی تر بکەونە خۆشی و لەززەتەوە، هیچ شتێك نەبێ زەوقیان تێك بداو دڵیان گەرد بگرێ! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلَا تَأْثِيماً، إِلَّا قِيلاً سَلَاماً سَلَاماً﴾(الواقعة/٢٥-٢٦).

٣- ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيّاً﴾ هەیە بۆ ئەو بەهەشتییانە لەبەهەشتدا رزق و رۆژی خۆیان بەیانی و ئێوارە، واتە: ئەوەی حەزیان لێ بێ لەخواردن و خواردنەوە لەئەندازەی کاتی بەیانی و ئێوارەدا بۆیان دێ بەبێ ماندوبوون، بێگومان لەبەهەشتدا شەو و رۆژ نیە، بەڵکوو هەموو کاتێ لەنوورو روناکیدان، تێپەڕبوونی کاتەکان بەهۆی هاتووچۆی روناکیەکان و کشانی چۆمەکان دەزانن. کەواتە دەبێ بڵێین: مەبەست ئەوەیە: بەئەندازەی کاتی نێوان بەیانی و ئێوارەی ئەم جیهانە خواردن و خواردنەوەیان بۆ دێ، نێوان قاوەڵتی و نانخواردنی ئێوارەیان بەئەندازەی نێوان قاوەڵتی و نانخواردنی ئێوارەی ئەم دونیایەیە!

ئیمام ئەحمەدو بوخاری و موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أول زمرة تلج الجنة صورهم على صورة القمر ليلة البدر، لايبصقون فيها، ولا يتملطون فيها، ولا يتغوطون آنيتهم وأمشاطهم الذهب والفضة، ومجامرهم اللؤلوءة، ورشحهم المسك ولكل واحد منهم زوجتان، يرى مل ساقها من وراء اللحم من الحسن، لا إختلاف بينهم، ولا تباغض، قلوبهم على قلب رجل واحد، يسبحون الله بكرة وعشيا).

﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيّاً﴾ ئەو بەهەشتە جوان و رازاوەیەی: کە بەو شێوە وەصف کرا بەمیرات دەیدەین بەبەندە تەقواکارەکانمان، ئەوانەی حەمدو سوپاسی خودا دەکەن لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا، لەهەموو

حاڵێکدا فەرمانبەرداری خودای خۆیانن، ئێمەش بەهەشت دەکەینە ملکی راستەقینەی ئەوانو وەکوو میرات پێیان دەبەخشین.

## هاتنی سروش و هێنانی نیگا بەفەرمانی خودایە

﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٦٤) ئیمام ئەحمەدو بوخاری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ بەجوبرائیلی فەرموو: بۆچی زیاتر سەردانمان ناکەی؟ ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ هاتە خوارێ!

ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەکرەمەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ: چل رۆژ جوبرائیل نیگای بۆ پێغەمبەر نەهێنا. کە پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی بۆچی وەندە دواکەوتی؟ جوبرائیل هەمان وەڵامی دایەوە.

ئیبنو ئیسحاق لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەکا؛ دەڵێ کاتێك قورەیشییەکان پرسیاریان لەپێغەمبەر کرد دەربارەی ئەصحابولکەهف، پانزە شەو نیگای بۆ نەهات، جا پاشان کە جوبرائیل هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زۆر دواکەوتوی! ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە.

لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتکراوە دەفەرموێ: کاتێك پرسیار لەپێغەمبەر کرا دەربارەی ئەصحابولکەهفو ذیلقەرنەینو چۆنیەتی گیان، پێغەمبەر ﷺ نەیزانی چی وەڵام بداتەوە، چەند رۆژێکیش جوبرائیل نەهات بۆ لای پێغەمبەرو پەی لێ دابڕی، ئیتر پێغەمبەر زۆر دڵتەنگ بوو، غەمو پەژارە دایگرت. موشریکەکان وتیان: خوداکەی موحەممەد وازی لەموحەممەد هێناوەو تڕۆی کردوە، جا: کە جوبرائیل هات بۆ لای: پەی فەرموو: ئەی جوبرائیل خۆت لێ وون کردم، هەتا وام لێ هات گومانی خراپ بەرم، حەزم زۆر بەهاتنت کردو پێم خۆش بوو بێی. ئەویش فەرمووی: من زیاتر بەتاسوخەوەم بۆ دیدەنیت وەلێ من بەندەیەکی فەرمان پێ کراوم، هەر کاتێ فەرمانم پێ کرا بەهاتن دێم، کە فەرمانم پێ نەکرێ نایەم. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد، چ مانعێکیش نیە روداوەکان زۆربنو ئەسبابی نزولیش زۆر بن!

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: پەروەردگار لەوەپێش چیرۆکی پێغەمبەرانی وەکوو زەکەریاو ئیبراهیمو موساو ئیسماعیلو ئیدریس باس کرد بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو دامەزراندنی دڵو دەروونی لەسەر پەیامەکەی. هەروەها باسی ئەو نازو نیعمەتەنای کرد؛ کە خودا بەپێغەمبەرانو نەوەکانیانی بەخشی بوو،چۆنیەتی هەڵسو کەوتی ناشیرینی نەوەکانی دوا ئەوانی دیاری کردو پاداشی هەردوولایەنی رون کردەوە، بۆ ئەوەی ئاماژە بکا کە قورەیشییەکانو جولەکە لەو وەچەو نەوە پاشینانەن: کە نوێژیان زایە کردوەو شوێن هەواو هەوەسی خۆیان کەوتوون، هەروەها بۆ ئەوەی ئەم ئاخاوتنو کورتە چیرۆکەی ئێرەی سەرداری پێغەمبەران (حەزرەتی موحەممەد ﷺ) بکاتە کۆتایی چیرۆکەکانی سورەتەکە، دەفەرموێ:

﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلاَّ بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾ واتە: پەروەردگار فەرمانی بەجوبرائیل کرد: کە بەپێغەمبەر رابگەیەنێ: کە ئێمەی فریشتە دانابەزین بەمەبەستی نیگا هێنان بۆ

سەر پێغەمبەران کات دوای کاتو بەیناو بەین مەگەر بەفەرمانی خوداو بەگوێرەی داخوازی حیکمەتو زانایی زاتی پاکیو بەگوێرەی بەرژەوەندی بەندەکانیو بەجۆرێك خێری دینیو دونیایی ئەوانی تێدابێ، هەرکاتێ خودا فەرمانمان پێ بکا دادەبەزین.

﴿لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ﴾ هەر بۆ خودایە ئەنجامدانی هەموو کارو بارێك، کاری دونیاو قیامەتمان رابوردوو ئێستاو داهاتوومان لەهەموو کاتو شوێنێکدا بەدەست خودایەو بەویستی ئەو ئەنجام دەدرێ، رەخنەی لێ ناگیرێو کەس رایەی ناکەوێ بلێ ئەوەت بۆ واکردو بۆ وات نەکرد! ئێمەی فریشتە بەندەی فەرمانبەرداری ئەوینو بەبێ ئیزنو فەرمانی ئەو لەجێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر ناچین.

﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾ هەرگیز خودای تۆ ئەی موحەممەد! تۆی لەیاد نەکردوەو لێت بێ ئاگا نەبووە، هەرچەندە بۆ ماوەیەکیش نیگاو سروشت لێ دواکەوتووە، چونکە پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەملْكو مەلەکووتی بوونەوەرو هەرگیزاو هەرگیز بێ ئاگاییو لەبیرچوونەوەی بەسەردا نایە، کەوابێ لەتۆ غافڵ نەبووەو لەبیری نەکردوی، بەڵکوو دواکەوتنی نیگا بۆ ماوەیەك لەبەر حیکمەتێك بووە: کە هەرخۆی دەیزانێ!!

ئیبنو مونذیرو ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو مەردەویەیو طەبەرانی لەئەبو دەرداوە بەمەرفووعی فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (ماأحل الله في كتابه فهو حلال وما حرمه فهو حرام، وما سكت عنه فهو عافية فاقبلوا من الله عافيته فان الله لم يكن لينسى شيئا) ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾.

ئــەمجار پــەروەردگار بەلگــە لەســەر ئــەو راســتییانەی پێــشەوە دەهێنێتــەوەو دەفەرموێ: ﴿رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ خـودا بەدیهێنــەری ئاسمانــەکانو زەویـو ئــەوەی تێیـان دایــە، هەرچی لەئاسمانــەکانو زەویدا هەیــە ملکی خودایــەو خەلّقنــدەی ئــەوە، جــا کەســێك خــاوەنی هــەموو بوونــەوەر بــێ، بەدیهێنــەری ئاسمانــەکانو زەوی بــێ، چـۆن تەصــەوور دەکـرێ بــێ ئاگـایی‌و لــەبیر چـوونەوەی بەسەردا بێ!؟

کەوابێ ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە ئەی پێغەمبەر! ﴿فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَادَتِـهِ﴾ بــەردەوام بــە لەســەر عیبـادەکردن بـۆ خـودای خـۆتـو ئـارام بگـرە لەسـەر عیبـادەت کردنو گوێڕایەڵی بـۆ خـودا، ئـەرکـو ناخۆشـی خوداپەرسـتی‌و بانگـەوازی بـۆ ئـایین لەئەستۆ بگرە، بەهۆی دواکـەوتنی نیگـاو سـروش بـۆ ماوەیـەك واز لەخوداپەرسـتی خۆت مەهێنـە، ﴿هَلْ تَعْلَمُ لَهُ سَمِيّاً﴾ ئایا تۆ پێت وایە وێنــەو نموونــەی خـودا هەیـە؟ ئیستیفهامەکە ئیستیفهامی ئینکارییە، بەمانا نەفیە. واتـە کـەس نیـە وەکـوو خـودا شیاوی پەرستش‌و بەندایەتی بۆ کـردن بـێ، هـەر خـودا بەدیهێنـەرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، رزقو رۆژیدەرە، هەموو شتێك بەویستی ئەو هاتۆتە وجوود، ئـادەمیزاد بەجەســتەو گیــانی‌و بەعــەقڵو زانیــاری‌و هــەموو پێویــستیاتێکی ژیــانی هــەمووی خەلّقندەی پەروەردگارە، کەوابێ بـەخودا زانـین‌و پەرسـتش بـۆ کـردن هـەر شیاوی ئەوە، دان بەخودایەتی ئەو زاتەدا بنێ‌و گەردنکەچی دەسەلاتو فەرمانی بە!

## بیرو بۆچونی موشریکەکان دەربارەی هاتنی رۆژی قیامەت

﴿ وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾

﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَاطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کەئادەمیزاد بەعیبادەتو خوداپەرستی لەتەنگو چەڵەمەی رۆژی حەشر رزگاری دەبێ هەروا رۆژی قیامەت هەردێو گومانی تێدا نیە، زیندو کردنەوەی ئادەمیزادن ئاسانترە لەدروستکردنی هەوەڵجاری، کەسێك بتوانێ لەنەبوەوە ئادەمیزاد بێنێتە گۆڕەپانی ژیانەوە، جارێکی دی زیندو کردنەوەی زۆر ئاسانترە، هەرچەندە بۆ خودا کاری ئاسانو گران نیە هەموو کارێك بۆ خودا ئاسانو بێ ئەرکەو ماندووبونی تێدا نیە.

جا لەبەر ئەوەی هەدەفی سورەتەکە چەسپاندنی دەسەڵاتی خودایە لەسەر ژیانبەخشینو مراندن، لەسەر بەدیهێنانو لەناوبردن، لەسەر راستی هاتنی رۆژی دوایی، بۆیە هەندێ بیرو بۆچونی موشریکەکانی باس کرد: کە بڕوایان بەرۆژی قیامەتو زیندوبوونەوە نیە، بەبەڵگەی بەهێز رەددی دانەوەو بۆڕی دان.

هەروەها هەندێ لەئەو ناخۆشیو تەنگو چەڵەمانە باس دەکا: کە رۆژی قیامەت تووشی موشریکەکان دێ ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەوە روون دەکاتەوە: کە

هەموو ئادەمیزاد بەسەر ئاگردا رادەنوێندرێن‌و کەس لەئاگر رزگاری نابێ، مەگەر ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو تەقوای خودا دەکەن‌و کرداری باش ئەنجام دەدەن.

کولەبی دەڵێ: ئایەتی ﴿وَيَقُولُ الإِنسَانُ...الآيـة﴾ دەربارەی نوبەی کوڕی خەلەف نازڵ بووە، ئەوە بوو ئێسقە رزیوێکی بەدەستەوە گرتو هەڵیگلۆفت‌و وردی کردو بەربایدا ئەمجار وتی: موحەممەد پێی وایە ئێمە دوای مردن‌و رزینی جەستەمان جارێکی دی زیندو دەکرێینەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: دەرحەق بەوەلیدی کوڕی موغەیرەو هاوەڵانی نازڵ بووە.

ئێستاش با بزانین دیمەنی ئێرە بەچی دەست پێ دەکا؟ دیمەنەکە بەو وتەیە دەست پێ دەکا: کە هەر لەکۆنەوە بێ بڕوایان دەیڵێن‌و دەیڵێنەوە، وتەیەك: کەچەندەها تاقمو گرۆ بەدرێژایی مێژوو گوتویانەو ئێستاش هەلگرانی بیرو باوەڕی ماددی کاوێژی دەکەنەوە. ﴿وَيَقُولُ الإِنسَانُ أَئِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيّاً﴾ ئادەمیزادی دڵ بێ باوەڕو دڵرەق دەڵێ ئایا کاتێ من مردەو لاشەم ڕزی‌و بووم بەخاك‌و خۆڵ، جارێکی تر زیندو دەبمەوەو لەگۆڕ راست دەکرێمەوە؟ واتە: بەلایەوە شتێکی سەیرەو زۆر بەدووری دادەنێ‌و پێی وا نیە شتی وا راست بێ، هەڵبەتە وتنی ئەم قسەیە پاڵ هەموو کافرو موشریکێك دراوە، هەرچەندە هەموویان ئەم وتەیان نەگوتووە وەلێ چونکە هەموویان پێی رازی بوون بۆیە پاڵ هەموانیان دراوە.

بێگومان ئەم وتەو رەخنەیەی کافرو بێ بڕوایان رەخنەیەکی زۆر نابەجێ یە، لەنەفامی‌و بێ ئاگایی خۆیان دەربارەی پەیدابوونی خودی خۆیان لەسەرەتادا سەرچاوەی گرتووە، هۆی سەرسوڕمانیان بیرنەکردنەوەو تێنەفکرینە لەچۆنیەتی پەیدابوونی ئادەمیزاد لەسەرەتادا، ﴿أَوَلَا يَذْكُرُ الإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُنْ

شَيْئًا﴾ بۆچی ئادەمیزاد بیر ناکاتەوە لەچۆنیەتی پەیدابوونی خۆی؟ بۆ بیر لەوە ناکاتەوە: کە ئێمە ئەومان لەنەبووەوە دروست کردوە، کاتێك ئەو هەر نەبوە، لەنەبوونەوە هێناومانەتە وجوود، بۆ بیر لەوە ناکاتەوە لەکوێوە هاتووە، چۆن هاتووە؟ دەبا بیر بکاتەوەو پەیدابوونی خۆی لەیەکەمجاردا بکاتە نیشانەو بەلگە لەسەر گونجاوی دووبارە بوونەوەو دروستکردنەوەی. خۆ ئاشکراشە دروستکردنی شت لەسەرەتادا قورسترە لەدووبارە کردنەوە، زیندوکردنەوەو دروستکردنەوەی ئادەمیزاد لەجاری دووەمدا زۆر ئاسانترە وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾(الروم/٢٧).

ئەمجار پەروەردگار بەشوێن ئەم ئینکاری کردنەی کافرەکان دا سوێندێکی هەڕەشەئامێز بەزاتی خۆی دەخوا، ئەمەش گەورەترین سوێندو سامناکترین هەڕەشەیە لەموشریکەکانو دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ﴾ سوێند بەخودای تۆ ئەی موحەممەد ئێمە ئەو موشریكو بێ بڕوایانە پاش زیندوکردنەوە لەسارای مەحشەردا کۆیان دەکەینەوە، بەتەنیا ئەوان کۆناکەینەوە، بەلکوو ﴿وَالشَّيَاطِينَ﴾ لەگەڵ ئەو شەیاتینیانەی کە لەدونیادا هاوڕاو هاو ڕەوشت بوونو گومڕایان کردن ئەوانیشیان لەگەڵ تێکەوە دەپێچینو راپێچی سارای مەحشەریان دەکەین بۆ لێکۆڵینەوەو لێ پرسینەوەو تۆڵە لێ ستاندن. ئەمەش بۆ زێدە سزاو ئازاردانی دەروونی بۆیان، بۆ ئەوەی پەنجەی پەشیمانی بگەزن، بزانن چەندە نەفامو هەڵخەڵەتاو بوون، بیر بکەنەوە: کە بۆچی ئەومندە نەفام بوون شوێنی ئەم شەیتانانە کەوتن.

ئەمجار قورئان دیمەنێکی سامناك رادەنوێنێو وێنەیەکی زیندوو هەست هەژێن دەکێشێو دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا﴾ لەپاش زیندو کردنەوەو کۆکردنەوەیان لەدەشتی مەحشەردا ئەمجار هەموو ئەو کافرو موشریکانە لەدەوری دۆزەخ حازر دەکەین لەشێوەیەکی سەرنج راکێشدا، هەموویان بەسەر

ئـەژنۆدا كـەوتوون، لەبـەر ئـەوە كـەس خـۆ بـەپێوە نـاگرێ، نـاتوانێ لەسـەر قاچى بوەستێ!

خوێنـەرى هێـژا! بـۆ خـۆت بەخـەيالْ ئـەو ديمەنـە بێنـە پـێش چاوى خـۆت، ديمەنى ئەو هەموو موشريكو كافرانەى: كە هەر خودا ژمارەيان دەزانێ، هەموويان لەدەورى دۆزەخ لەترسانو لەسەرمان لەقاچ كەوتونو خۆيان بـەپێوە بـۆ نـاگيرێ، بەسەر ئـەژنۆدا كەوتوونو تـرسو لـەرز دايگرتـونو ئـارەقى شـەرمەزارى دەرێـژنو بەچاوى خۆيان ديمەنى سامناكى دۆزەخ دەبينن، هاڵاوو بڵێسەى بۆيان دێت، هەست بەگەرمىو ئازارى دەكەن، چاوەڕوانن ئێستا ئائێستا لەپيلى رۆ دێنو فڕێى دەدەنـە نـاو ئـەو ئـاگرە بـێ ئامـانو سـوتماكە. بێگومـان قەڵـەم كـولو زمـان كۆڵـە لەئاسـت روونكردنــەوەى ئــەو بەســەرهاتەدا هــاتووە، خــەياڵيش پــەى پــێ نابــاو هــەموو تەصـەورێكى ئـادەمى لەئاسـتيا كـورت دێنـێ، بـەبير لێ كردنـەوەى دڵ وەلـەرز دێو هەست دەحەبەسێو پێست گـرژ دەبـێ، هەرچـەندە تارمايـەكى ئـەو ديمەنـە بـەناو خەياڵدا رادەبرێ، قەترە بەدەريايەكى لێ تەصەوور دەكرێ!

﴿ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِنْ كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَنِ عِتِيّاً﴾ پاشـان بەتەئكيـد ئێمـە لەهــەموو نەتــەوەو كۆمــەڵ گرۆيــەكى فەســادو گــومڕا، ســەررەقترينو زۆر يــاخى بووەكانيان بڕ دەدەين، كێيان زيـاتر سـەررەقو خۆبـەزلزانو تـەجاوزكار تـر بـوون بەرامبەر خـوداى بـەرەحمو بـەزەيى دەيانهێنينـە ريـزى پێشەوەو لـەدەورى دۆزەخ مۆڵيـان دەدەيـن، واتـە: سـەرانى كـوفرو رابـەرانى گـومڕايى لەكۆمـەڵى موشـريكو گومڕايان دابڕ دەكەينو راكێشى سەر لێوارى دۆزەخيـان دەكـەين بـۆ ئـەوەى پێشتر فڕێيان بدەينە ناو دۆزەخەوە.

واتـە: لەسـەرتاوە هـەموو تاوانكـاران لـەدەورى دۆزەخ لەسـەر ئـەژنۆيان مـۆڵ دەدەين، ئەمجار هەر كەس تاوانبارترو ياخى تـر بـووبێ لـەخوداو زيـاتر سەرپێچى كردبێ لەپێشەوە ئەوانە تورِ دەدەينەناو دۆزەخەوە.

﴿ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَى بِهَا صِلِيّاً﴾ ئەمجار ئێمە بێگومان زۆر باش دەزانینو لەهەموو کەس شارەزاترین بەوانەی شایانترن بەدۆزەخو چونە ناوی‌و سوتان بەئاگرە بێ ئامانەکەی، دەزانین کێ شیاوی ئەوەیە فرێی بدەینە ناو دۆزەخەوەو بۆ هەتا هەتایە تێیدا بمێنێتەوەو سزای دوچەندانەو زیاد بچێژێ! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَكِن لاَّ تَعْلَمُونَ﴾(الأعراف/٣٨).

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان پێ دەدا: کە هەموو ئادەمیزاد دەچنە ناو دۆزەخەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْماً مَقْضِيّاً﴾ هیچ کەس نیە لەنێوەی ئادەمیزاد ئیللا لەرۆژی قیامەتدا دەچێتە سەر لێواری دۆزەخو بەسەر پردی صیراطدا تێدەپەڕێ، ئەم لێ نزیکبوونەوەو تێپەڕینە بەسەر دۆزەخدا کارێکی حەتمی‌و بڕیار لەسەر دراوە، پەروەردگار حوکمی پێ کردوەو بڕاوەتەوە، هەر دەبێ بێتە جێ‌و پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە.

هەندێك پێیان وایە (وارد) بوونی دۆزەخ بەمانا نزیکبوونەوەیە لێی. بەم جۆرە لەدەورو بەری دۆزەخ کۆبکرێنەوە.

هەندێکی تر دەڵێن: (وارد) بوونی دۆزەخ بەمانا چوونە ناویەتی هەرچی ئادەمیزاد هەیە بەچاكو خراپیانەوە دەبێ بچنە ناو دۆزەخ، جا بەلام بۆ موسوڵمانان ساردو سەلامەتەو نایانسووتێنێ وەکوو چۆن بەفەرمانی خودا ئاگر ئیبراهیمی نەسوتاندو بۆی ساردو سەلامەت بوو.

وەڵێ رای صەحیح ئەوەیە کە (وارد) بوون لێرەدا بەمانا تێپەڕبوونە بەلایدا یان بەسەریدا. بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی: کە ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (یرد الناس جمیعاً الصراط وورودهم قیامهم حول النار، ثم یصدرون عن الصراط بأعمالهم، فمنهم من یمر مثل البرق، ومنهم من یمر مثل الریح، ومنهم من یمر مثل الطیر، ومنهم من یمر كأجود الخیل،

ومنهم من يمر كأجود الأبل، ومنهم من يمـر كعـدو الرجـل حتـى أخـرهم مـرأ رجـل نوره على موضع ابهامي قدميـه، يمـر فيتكفـأ بـه الـصراط، والـصراط دحـض مزلـة، عليـه حـسك كحـسك التقـاد، حافتـاه ملائكـة معهـم كلاليـب مـن نـار، يختطفـون بهـا الناس). ئەم فەرموودە ئیبنو مەسعوود لەپێغەمبەری ژنەوتووە.

ئیبنو جەریر لەئیبنو مەسعودەوە ریوایـەت دەکا دەفـەرموێ: (الـصراط علـى جهنم مثل حد السيف فتمر الطبقة الأولى كالبرق، والثانيـة كـالريح، والثالثـة كـأجود الخيل، والرابعة كأجود البهائم، ثم يمر والملائكة يقولون: اللهم سلم سلم).(٩)

مامۆسـتا سـەیید ئـەو مانایـەی بـەلاوە پەسـندە: کـە بگـوترێ (واردهـا) لەئایەتەکـەدا بـەمانا نزیکبوونـەوەو تێپەڕبوونـە بـەلای دۆزەخـدا، دەفـەرموێ: موسـوڵمانان ئـەم دیمەنـە سـامناکە دەبیـنـنو لـەدۆزەخ نزیـک دەبنـەوەو بـەلای دا تێدەپـەڕن، دەبیـنـن دۆزەخ لەکڵەودایـەو لرفـەی دێ، دەبیـنـن دیکتـاتۆرو سـەرڕەقو گومڕاکانی دونیا یەکە یەکە فڕێ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَواْ﴾ پـاش ئـەوەی هـەموو ئـادەمیزاد لـەدەوری دۆزەخ کۆکرانـەوە، ئـەوەی کەوتـە نـاو دۆزەخەوە کەوتە ناوی لەکافرو یاخی بوان، ئـەمجار تـەقواکارو خۆپـارێزان لـەتاوان بـەگوێرەی کردەوەکانیـان رزگـار دەکـەین داڵـدەیان دەدەیـنو نـاهێڵین بکەونـە نـاو دۆزەخـەوە، بـەهۆی ئیمـانو کردەوەیانـەوە بەسـەر پـردی صـیراطدا تێپـەڕ دەبـن، ﴿وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾ کافرو ستەمکارو یاخی بووەکان لەدۆزەخـدا دەهێڵینـەوە بەشێوەی بەچۆکاهاتوویی، لەسەر ئەو شێوەی کە لەدەوری دۆزەخ گـرد کرابوونـەوە ئاوا لێیان دەگەڕێین با لەناو دۆزەخدا بسوتێن، هاتنە دەرەوەیان نیە، توانـای رزگـار بوونیان نیە.

(٩) ئـەم دوو فەرموودەیـە لەصـەحیحی مـسلمدا هـەن بـەڵام بەهەنـدێ جیـاوازی لەوشـەو رستەیاندا. صەحیحی موسلیم لە(الإيمان)دا (١٨٣) بـاب(٨١) مانـای (دحـض مزلـة) شوێنێکە کـە قاچ لەسەری ناوەستێ.

هەڵبەتە ئەوانە لەدۆزەخدا دەمێننەوە کە خودا بڕیاری مانەوەی هەتا هەتایی بۆ دابن. بەڵام تاوانبارانی موسوڵمان دوای تۆڵە لێ ستاندنیان بەگوێرەی تاوانەکانیان لەئاگر رزگاریان دەبێ، هەر کەسێك جارێك بەراستی (لا إله إلا الله)ی گوتبێ با کردەوەی چاکیشی نەکردبێ پاش تۆڵە لێ وەرگرتنەوە لەسەر تاوانەکانی لەدۆزەخ رزگار دەکرێ.

بێگومان بینینو نزیکبوونەوەی هەموو ئادەمیزاد لەدۆزەخو تێپەڕبوون بەسەریدا کارێکی واقیعو شتێکە هەر دەبێو نەبوونی محاڵە! دەبێ هەموو ئادەمیزاد بەموسوڵمانو نامۆسوڵمانەوە دۆزەخ ببینن‌و لێی نزیك ببنەوە جا خودا پەرستان لێی رزگار دەبن‌و ستەمکاران تێی دەکەون.

ئیبنو عەبباس‌و ئیبنو مەسعودو کەعبولئەحبارو (السدی)و حەسەنی بەصری وشەی (وارد) لەئایەتەکەدا کە لەچاوگەی (ورود) وەرگیراوە بەمانا رۆییشتن بەسەر پردی صیراطدا تەفسیریان کردوە.

حەسەن بەراشکاوی دەڵێ: (ورود) لەئایەتەکەدا بەمانا چونە ناو نیە. ئەوەتا لەزمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (وردت البصرة ولم أدخلها) کەوابوو (واردها) بەمانا رۆییشتن بەسەر پردی صیراطدایە، ئەمجار دەڵێ: ئەوەتا خودا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾(الأنبياء/١٠١). واتە: ئەوانەی تۆفیقمان داون بۆ کاری خێر بڕیاری ئەوەمان داوە چاکەیان لەگەڵ بکەین ئەوانە لەدۆزەخ دوور دەخرێنەوە.. دەی کەسێك خودا بۆی بەرعۆدە بووبێ لەدۆزەخ دووری بخاتەوە چۆن تەصەوری ئەوە دەکرێ بچێتە ناو دۆزەخەوە؟!

هەروەها پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (١٠٢)ی هەمان سورەتدا دەربارەی ئەو خوداپێداوانە دەفەرموێ: ﴿لایسمعون حسیسها﴾ دەنگی بڵێسەی ئاگری دۆزەخ نابیسن، دەی ئەگەر ئەوانە بچنە ناو دۆزەخەوە دەنگی بڵێسەی ئاگرەکە دەبیسن.

لەلایەکی ترەوە قورئان لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ آمِنُونَ﴾(النمل/٨٩).

هەندێکی تر لەموفەسسرین دەفەرموون: راناوی (منكم) لەئایەتەکەدا تایبەتە بەکافرەکانەوە. واتە: ئەی موحەممەد! بەکافرەکان بڵێ: هەر یەکێ لەئێوە دەبێ بچێتە ناو دۆزەخەوە.

وەڵێ زوربەی زانایانی تەفسیر دەفەرموون: راناوی (منكم) لەئایەتەکەدا دەگەرێتەوە بۆ هەموو ئادەمیزاد بەکافرو موسوڵمانیەوە، وەڵێ ئاگرەکە بۆ موسوڵمانان ساردو سەلامەت دەبێ‌و بەسەلامەتی لێی رزگار دەبن.

خالیدی کوری میعدان دەڵێ: کە ئەهلی بەهەشت چوونە ناو بەهەشتەوە لەناو خۆیاندا دەڵێن: ئەرێ خودای ئێمە نەیفەرموو ئێمە دەچینە ناو دۆزەخەوە؟ ولامیان دەدرێتەوە، بەڵێ چوونە ناوی وەڵێ ئاگرەکە بۆتان بوو بەخۆڵەمێش.

قورطوبی دەفەرموێ: ئەم رایە هەموو رایەکان کۆ دەکاتەوە چونکە کەسێك چووە ناو دۆزەخەوەو بەگەرمایی‌و بڵێسەی ئاگرەکە ئەزیەتی نەبینی مانای وایە لەئاگرەکە دوور خراوەتەوەو لێی رزگار بووە!!

## هەڵخەڵەتانی موشریکەکان بەخۆشگوزەرانی‌و لەشساغی‌و ساماندارییان لەدونیادا

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا بَيِّنَـٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا

قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هُمۡ أَحۡسَنُ أَثَٰثٗا وَرِءۡيٗا ﴿٧٤﴾ قُلۡ مَن كَانَ فِي ٱلضَّلَٰلَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ مَدًّاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوۡاْ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلۡعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضۡعَفُ جُندٗا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار بەلگـەی لەسـەر موشـریکە قورەیـشییەکان راسـت کردەوە، بەبەلگە ئەوانـەی بۆڕدان کـە ئینکاری زینـدو بوونـەوەیان دەکـرد ئـەمجار وێـرای هەڕەشـەکردن لێیـان شـوبهەو بـیرو بۆچـونێکی هەڵـەی تریـان رادەنـوێنێ ئـەویش ئـەوە بـوو بەموسـوڵمانەکانیان دەگوت: ئەگـەر راسـت دەکـەن ئێـوە لەسـەر حەقنو ئێمە لەسەر بەتاڵین، دەبوایە حاڵو گوزەرانی دونیاتان لەهی ئێمـە خۆشـتر بوایە، چونکە ناگونجێ خودای حـەکیمو دانـا خۆشەویـستانی خـۆی بخاتـە عـەزابـو زەلیلیـیـەوە، دوژمنەکانیـشی بخاتـە خۆشـیو شکۆمەندییەوە، جـا کـە واقیـع ئێـستا بەپێچەوانەوەیە مەنای وایە ئێمە لەسەر حەقینو ئێوە لەسەر بەتاڵن، ئەوەتا ئێمە لەخۆشـگوزەرانیو روفاهیەتـداین لەشـساغو سـامانداریـنو لەسـەر حـەقین، ئێـوە لەتەنگـو چەڵەمەو ناخۆشیـدان فەقیرو لەش بەبارن کەوابێ ئێوە لەسەر بەتاڵن!

ئـیتر پـەروەردگار رەددی دانـەوە، فـەرمووی: کـافرو بتپەرسـتە پێـشینەکان لەئێوە خۆشگوزەرانترو ساماندارتربوون کەچی خودا بەعـەزابی ریـشەکەر لـەناوی بردن، کەوابێ پێدانی نازو نیعمەتی دونیا بەکەسێك نابێتە نیشانەی خۆشەویـستی

خودا بۆ ئەو کەسە، هەروەکوو ناردنی نەخۆشیو هەژاریو تەنگو چەڵەمە بۆ سەر کەسێکی تر نابنە نیشانەی ئەوە کە خودا ئەو کەسەی ناخۆش دەوێ.

دەگێڕنەوە دەڵێن: بێژەری ئەم قسە نابەجێیە (النضر)ی کوڕی (الحارث)و هەواخواهانی بوون، کاتێک کە بینیان هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پۆشاکیان شڕو ژیانیان زبرو کولەمەرگییە، بۆخۆشیان لەرابواردنو خۆشیدا بوون ئیتر ئەو بیرو بۆچوونەیان لەلا گەڵاڵەبوو.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ هەر کاتێ ئایاتی قورئان بەسەر ئەو موشریکە سەررەقانەدا بخوێندرێتەوە، بەڵگەو نیشانەی ئاشکراو روون لەسەر تاکو تەنهایی خودا بەگوێیاندا بدرێ، رووی خۆیان وەردەگێڕنو پشت هەڵدەکەن، بەفیزەوە خۆیان هەڵدەنێنەوە، فەخرو شانازی بەسەر موسوڵمانەکاندا دەکەن، لەشساغیو سامانداریی خۆیان دەکەنە بەڵگەی راستی ئایینو بیرو باوەڕیان، رو دەکەنە موسوڵمانەکانو پێیان دەڵێن: ﴿أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَقَاماً وَأَحْسَنُ نَدِيّاً﴾ کام لا لەئێمەو لەئێوە شوێنو مەنزڵی خۆشترە، خانوو بەرەی پەرداخو رازاوە ترە؟ کێمان لەشساغ ترو پۆشتەو پەرداخ ترین؟ کێمان یارمەتیدەرو لایەنگیرمان زۆرە؟ کێمان دیوەخانو کۆڕو مەجلیسی قەرەباڵغ ترو رازاوە ترە؟؟ چۆن ئێمە بەو هەموو دونیا بەیدەست بوونە بۆمان لەسەر بەتاڵینو ئێوە بەو هەژاریو کەم دەرامەتیەوە لەسەر حەقن؟؟ هەرگیز ئەمە راست ناياتەوەو ناچێتەوە عەقڵەوە! چۆن دەبێ ئەو روتو رەجاڵانەی لەماڵی (الأرقم)دا خۆیان شاردۆتەوە لەسەر حەق بنو ئێمە بەو هەموو شکۆمەندیو دەسەڵاتو سامانداریەوە لەسەر بەتاڵ بین؟؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا لَوْ كَانَ خَيْراً مَّا سَبَقُونَا إِلَيْهِ﴾(الأحقاف/١١).

بەڵێ ئەو نەفامە لەخۆبایی بوانە بەڕواڵەتی حاڵو وەزعی جیهانیان لەلاۆبایی بوونو پێیان وایە: هەر کەسێ سامانداڕو دونیا پێدراو بێ لەسەر حەقەو

ڕێبازی ڕاستی گرتووە! هەر کەسێکیش هەژارو نەدار بێ لەسەر ئایینی بەتاڵو پووچە!

ئای کە پێوەرێکی هەڵەیان داناوەو بەتەرازوێکی لار شتەکان دەکێشن! قیاسو مەنطیقێکی خوارو خێچیان داناوە! چەن بەهەڵەچوونو چۆن بیرو بۆچونیان لارو نارێکە!

ئیتر خودای مەزن ڕەددی شوبهەو بیرو بۆچونەکەیانی دانەوەو فەرمووی: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثاً وَرِئْياً﴾ زۆر لەگەلو نەتەوە ڕابوردوەکانمان بەهیلاك بردون لەوانەی پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستونەوە، بەردەوام بوون لەسەر کوفرو بێدینی خۆیان، ئێمە ڕیشەکێشمان کردن، وەلحال ئەوانە زۆر لەئەمان شۆخو شەنگترو پۆشتەو پەرداخترو پتر خاوەن ماڵو سامانو کەلو پەلو ئامێربوون، دەی شۆخو شەنگیو دەوڵەمەندییان نەبوە لەمپەر لەبەردەم ویستی خودادا، کاتێ ویستی لەناویان بەرێ.

## بەکورتی :

دیاردەی دەوڵەمەندیو دەست ڕۆیشتویی پۆشتەو پەرداڵایو شۆخو شەنگی نیشانەی ئەوە نیە کە لای خودا ئەوانە خۆشەویستن، ئەوە مێژوو شاهیدە پەروەردگار زۆر گەلو نەتەوەی خۆشگوزەرانی لەناوبردنو هەژارو بێ نەوای صاڵحو ڕاستاڵی ڕزگار کردون.

بێگومان ئەمە هەڕەشەیە لەو دەوڵەمەندە موسوڵمانە گێلانەی پێیان وایە گوزرانخۆشییان لەجیهاندا نیشانەی ئەوەیە خودا لێیان ڕازییەو حاڵی قیامەتیشیان خۆش دەبێ!

ئەمجار پەروەردگار جەخت لەسەر هەڕەشەکانی دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ فِي الضَّلَالَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَنُ مَدّاً﴾ ئەی موحەممەد! بەو موشریکە بێ

باوەڕانە بڵێ: کە لافی ئەوە لێ دەدەن ئەوانە لەسەر حەقن‌و ئەتۆ و شوێنکەوتوانت لەسەر بەتاڵن، پێیان بڵێ: لەئێمەو لەئێوە هەر لایەکمان لەسەر ڕێبازی گومڕایی بین، ئەوە پەروەردگار سزای دەدا بەوە مۆڵەتی دەدا لەگومڕاییدا بمێنێتەوەو زیاتر گومڕاببێ هەتا کاتی ئەوەی دێ گیانی بکێشرێ‌و تەمەنی تەواو ببێ، ئەمجار بیخاتە ناو دۆزەخەوەو بەتوندترین سزا تۆڵەی خراپەکارییەکانی لێ بستێنێ!

ئەمەش دابو نەریتی خودایە، پشی پشی ستەمکارانو یاخی بووان بکا، لێیان بگەڕێ لەگومڕایی خۆیاندا بمێننەوە، بەڵکوو زیاتر نازو نیعمەتی دونیایان پێ دەدا بۆ ئەوەی زیاتر لەگومڕاییدا ڕۆبچن‌و شیاوی عەزابو تۆڵە لێ ستاندن بن. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُواْ إِثْماً﴾(آل‌عمران/١٧٨). یان دەفەرموێ: ﴿وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾(الانعام/١١٠).

بەکورتی پەروەردگار ئەوانە ئیستیدراج دەکاو بەپشی پشی کێشیان دەکا ﴿حَتَّى إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَكَاناً وَأَضْعَفُ جُنداً﴾ هەتا بەچاوی خۆیان ئەوەی وادەیان پێدراوەو هەڕەشەیان پێ لێ کراوە دەیبینن: جا ئەوعەزابە عەزابی دونیایە بەگرتن‌و شەڕ لەگەڵ کردن‌و ترساندن‌و کوشتن‌و بڕین‌و تالانکردن: وەکوو لەجەنگی بەدردا ڕوی دا، یان هاتنی ڕۆژی قیامەت‌و زیندوبوونەوەیانە بەناگەهانی‌و لەنکاو دووچار بوونیان بەو هەموو عەزابو تەنگو چەڵەمەیەی تێی دەکەون، ئیتر ئەو کاتە بۆیان دەردەکەوێ کێ شوێنی ناخۆش‌و خەسارەتمەندە، کێ بێ پشتیوان‌و بێ دەسەڵاتو مایە پوچە؟ دەزانن کێ بەختەوەرو خودا پێداوە، بەپێچەوانەی بیرو بۆچوونی دونیایان: کە بەدیوەخان‌و لەشساغی‌و ساماندداری خۆیان هەڵخەتابوون‌و پێیان وا بوو لەقیامەتیشدا هەمان تاسو حەمامە!

ئەو کاتە حەقیقەتیان بۆ دەردەکەوێ‌و بۆیان ئاشکرا دەبێ: کە ئەوان بێ هێزو بێ دەسەڵاتن، خواردنیان کێم‌و زوخاوو قەترانو ئاوی کوڵاتووە، پۆشاکیان

لیباسی ئاگرینە، دەمو چاو هەڵقرچاوو هەڵپروزاوە، ئەو کاتە بۆیان دەردەکەوێ: کە لەگومڕایی دا بوونو پەشیمانن، بەڵام پەشیمان بوونەوە چ سوودیان پێ نابەخشێ.. شاعیری عەرەب دەڵێ:

**ندم البغاة ولآت ساعة مندم والبغي مرتع مبتغيه ولايم!**

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کە مۆڵەتدانی تاوانباران، خۆشیو رابواردنی جەبباران، دەوڵەمەندی ستەمکاران، نیشانەی فەزڵو هونەرو کەماڵی ئەوان نیە، بەڵکوو مەبەستی شەڕی پێیانەو ئیستیدراجکردنیانە بۆ بەتەڵەوە بوونو چوونە ناو دۆزەخ.

لەهەمان کاتدا ئاماژە بەوەش دەکا: کە هەر ناخۆشیو ناڕەحەتیەکی تووشی موسوڵمانان دێ، هەر کەمو کوڕیەکی خودا بەسەر خۆشەویستانی خۆیدا دەهێنێ بۆ سودو قازانجی ئەوانەو بۆ زێدە پاڵفتەکردنو قاڵبونو لەبۆتەدانیانە، بۆ ئەوەیە شتی باشتریان بداتێ. دەفەرموێ: ﴿وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى﴾ ئەوانە شوێن پەیامی پێغەمبەر دەکەونو ڕێگای هیدایەت دەگرنە بەر، خودا زیاتر هیدایەتیان دەدا بۆ ئیمانهێنانو ئیمان پتەو بوون، پتر شارەزایان دەکا بۆ خێرو چاکە، چونکە چاکە چاکەی لەدوایە. ﴿وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَاباً وَخَيْرٌ مَّرَدّاً﴾ ئەو بیروباوەڕە راستو پەسندەی ئەو چاکانە هەیانە، ئەو کردارو هەڵوێستە باشانەیان کە لەدونیادا هەیانەو پابەندن پێوەی بۆیان پاشەکەوتو پەزمەندە دەبێو دەچێتە سەر ڕەصیدی کردەوەکانیان، ئەو خوداپەرستیو کردەوە باشانەی ئەنجامی دەدەن، ئەوە لای خودای تۆ زۆر باشترو بەسودترە لەبارەی پاداشو بەرهەمەوە بۆ پاشەڕۆژ لەو نازو نیعمەتە کاتیانەی دراوە بەکافرەکانو کەشخەی پێوە دەکەنو خۆی پێوە بادەدەن بەسەر موسوڵماناندا.

ئەو طاعەتو خوداپەرستیەی موسوڵمانان سەردەکێشێ بۆ خۆشبەختیو کامەرانی هەتا هەتایی، پاداشو ئاکامی زۆر باشترە لەماڵو سامانو دیوەخانی

کافرەکان، زۆر بەسوود تـره بـۆ خاوەنـەکانیان! پاشـەڕۆژی ئەوانـە چاکە چـونکە دەچـنە نـاو بەهەشـتی رازاوەوە، ئـەو نـازو نیعمەتـە نەبڕاوانـەیان بەنـسیب دەبـێ، بەراستی لێرەداقورئان موقابەلەو بەرامبەرییـەکی ئاشـکراو نومایـانی لـەخۆگرتووە لـەنێوان کـافرو موسـوڵماندا، ئـەوەتا پـەروەردگار پاداشـی خوداپەرسـتان بـەوە دەداتەوە: کە بیرو باوەڕیان پتەو دەکاو ئیمانیان زیاد دەکا، لەهەمان کـاتدا پاداشـی کافرەکان بەوە دەداتەوە کە زیاتر پشی پشییان دەکا بۆ زێـدە گومڕابـونو ڕۆچوون لەگومڕاییدا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـذِهِ إِيمَاناً فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ، وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْساً إِلَى رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَافِرُونَ﴾(التوبة/١٢٤-١٢٥).

## قسە نابەجێیەکانی موشریکەکان دەربارەی زیندوبوونەوەو حەشر

﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی پـەروەردگار چـەند بەڵگەیـەکی هێنایـەوە لەسـەر راسـتی هـاتنی رۆژی قیامـەت، ئـەمجار گومـانو بـیرو بۆچوونی ئەوانـەی بـاس کـرد: کـە ئینکـاری زیندو بوونەوە دەکەن. پاشان دێتەسـەر گێڕانـەوەی هەنـدێ قـسەی نابـەجێیان کـە

بـەلافرتێوە ئاراسـتەی موسـوڵمانانی دەکـەن بەمەبەسـتی گاڵتـەپێکردنو تانـەو تەشەردان لەئایینو هاتنی رۆژی قیامەتو حەشر.

ئیمامـانی فـەرمووده ئەحمـەدو بوخـاریو موسـلیمو تـیرمیـذیو طـەبـەرانیو ئیبنو حەببانو هی تریش لەخەبابی کوڕی ئەرەتـەوە ریوایـەت دەکـەن، دەڵێ: مـن کابرایەکی ئاسنگەربوم، قەرزم لەسەر (العاص)ی کوڕی وائیـل بـوو، چوومە لای بـۆ ئـەوەی قەرزەکـەمی لێ وەربگرمـەوە. وتـی: سـوێندم وابـێو وابـێ هـەتا لـەئایینی موحەممەد زێوان نەبیەوە ناتدەمەوە، دەڵێ: منـیش پـێم گوت: وەڵلا هـەرگیز مـن لەو ئایینـەی موحەممـەد هێناویـەتی زێـوان نابمـەوە، هـەتا دەمـریو پاشـان زینـدو دەبیەوە لـەوێ مـافی خۆمـت لێ دەستێنم، (العـاص) وتـی: باشـە: کـە مـردمو دوایـی زیندو کرامەوە وەرە بۆ لام ئەو کاتە ماڵو منداڵو سامانم زۆر دەبـێ ئەوسا حـەقی خۆتت دەدەمێ، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کردو فەرمووی:

﴿أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَـرَ بِآيَاتِنَـا وَقَـالَ لأُوتَـيَنَّ مَـالاً وَوَلَـداً﴾ ئایـا هـەواڵت نـەدەمێ بەسـەر گورشـتەی ئـەو کـافرەی کـە سنورشـکێنی دەکـاو رێگـە بـەخۆی دەدا بەربەرەکانی خودا بکا، جورئەت بەرامبەر خودا بنوێنێ وەندە بێ شەرمو حەیا بێ بڵێ من لەقیامەتدا ماڵو منداڵو سامانم پێ دەدرێ؟!!

ئیتر پەروەردگار بیرو بۆچوونی ئەم جۆرە کەسانە پوچەڵ دەکاتـەوە، چونکە قـسەیەکی بـێ بەڵگـەو بـیرو بۆچـونێکی پـوچو بـێ بناغەیـە، پـشتی نەبەسـتووە بەبەڵگەیەکی غەیبیو وادەو بەڵێنێکی خودایی. بەسەرسامیو تەعەجوبەوە وێـڕای دەربڕینی بێزاری لەو وتـە نابەجێیـەیان دەفـەرموێ: ﴿أَاطَّلَـعَ الْغَيْـبَ أَمْ اتَّخَـذَ عِنْـدَ الرَّحْمَنِ عَهْداً﴾ ئایا ئاگاداریی بەسەر غەیبدا هەیە؟ یان لـەخوداوە وادەو بـەڵێنێکی لەو بارەوە وەرگرتووە؟ واتە: ئەوەی ئەو کافرە سـەررەقە دەیڵـێ: بەیـەکێ لـەو دوو رێگایـە نـەبێ نـازانرێ، دەی خـۆ ئـەو هـیچ کـامێ لـەم دوو رێگایـەی بـۆ دەسـتەبەر نەبووە.. کە دەفەرموێ: (أطلع الغيب) ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە ئاگـادار بـوون بەسـەر

زانیاری غەیبیدا کارێکی زەحمەتو گرانە، بۆ هەموو کەس نابێ، چونکە خودا کەس بەسەر غەیبدا ئاگادار ناکا مەگەر کەسانێك کە لێیان رازییە لەپێغەمبەران.

ئەمجار پەروەردگار هەرەشەی توونديان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾ ئەوەی ئەو بەتەمایەتی وا نیەو نایەتەدی، بەهەڵەچووە ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾ ئەوەی دەیڵێ: بۆی دەنووسینو بۆی پەزمەندە دەکەینو لەقیامەتدا سزای دەدەینەوە، ناهێڵین بەسەریەوە بچێ، ﴿وَنَمُدُّ لَهُ مِنْ الْعَذَابِ مَدّاً﴾ سزاو عەزابی بۆ زیاد دەکەین لەسەر ئەو قسە ناشیرینو نابەجێیانەی‌و کافربوونی بەخوداو بڕوا نەکردنی بەپێغەمبەری خوداو گاڵتەکردنی بەئایینی خودا، لەباتی ئەوەی لەقیامەتدا ماڵو سامانو منداڵی بدەینێ عەزابی بۆ زیاد دەکەین، ﴿وَنَرِثُهُ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْداً﴾ لەدونیا دەیمرێنینو ئەو ماڵو سامانەی هەیەتی بەمیرات دەدری بەیەکێکی ترو هەمووی لێ دەستێنین، رۆژی قیامەت دێ بۆ لای ئێمە بەروتو قوتی نەماڵی لەگەڵە نە منداڵی پێیە، هەرچی لەدونیادا هەی بووە هەموویان لێ ستاندۆتەوە، دەی چۆن بەتەما ئەوەیە لەقیامەتدا ماڵ و سامانی بدەنێ؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ﴾(الأنعام/٩٤).

## ڕەتدانەوەی بتپەرستەکان لەلایەن بتەکانیانەوە

﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُواْ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا

تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدّٗا ﴿٨٤﴾ يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٨٧﴾

پەروەردگار لەوەپێش باسی حەشرو نەشرو زیندو بوونەوەی کرد، ئەمجار رەددی بتپەرستەکان دەداتەوە، بیربۆچونی ئەوانە پوچ دەکاتەوە: کە بتەکانیان کردونە خودای خۆیان بەهومێدی ئەوە رۆژی قیامەت بۆیان ببنە پشتو پەناو شەفاعەتیان بۆ بکەنو لەتەنگو چەڵەمەو بەهیلاکچوون رزگاریان بکەن! ئەوە روون دەکاتەوە: کە ئەو پەرستراوانە رۆژی قیامەت دەبنە دوژمنیان نەك پشتیوان بۆیان، ئەوەش رون دەکاتەوە: کە هۆی گومڕابوونەکەیان وەسوەسەو ختوکەی شەیاتینی‌یەکانە، فەرمانیشی بەپێغەمبەر ﷺ کرد: کە پەلە لەهاتنی عەزابی ئەو موشریکانە نەکا، تەمەنو مانەوەیان لەدونیادا ماوەیەکەو بەسەر دەچێ.

ئەمجار بەرامبەری‌و پێك گرتنێك لەنێوان دیمەنی چوونی موسوڵمانان بۆ بەهەشتو راپێچکردنی کافرەکان بۆ دۆزەخدا ئەنجام دەدا.

دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا﴾ سەیرە! ئەو کافرو موشریکانەی ئایاتی خودا رەتدەکەنەوە، جگە لەخودا چەند شتێکیان کردوە بەپەرستشی خۆیانو بەندایەتییان بۆ دەکەن، بەتەمای ئەوەن لەلای خودا پشتگیرییان لێ بکەنو نەهێڵن خودا عەزابیان بدا، بەهومێدی ئەوەن بۆیان ببنە شەفاعەتکارو لەخودایان نزیك بکەنەوە، هەڵبەتە موشریکەکان هەیان بوو

فریشتەی دەپەرست، هەیانبوو جندۆکەی دەپەرست، هەیانبوو بەردو داری دەتاشی‌و دەیپەرست، بەخەیاڵی خۆیان ئەم پەرستراوانە دەبنە شەفاعەتکارو کۆمەکیکار بۆیان. جا پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿كَلاًّ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدّاً﴾ کار بەو شێوە نیە: کە ئەوان تێی گەییشتونو بەتەمان، نەخەیر بەهەڵەچونو ئاواتو هومێدیان نایەتە جێ، بەڵکوو پەرستراوەکانیان تەنانەت ئەوانەشیان کە بێ گیانن خودا وەزمانیان دێنێ‌و بەدرۆیان دەخەنەوە، ئینکاری عیبادەتو پەرستشی ئەوان دەکەن، خۆیانیان لێ دوور دەخەنەوە، پەخەی خۆیانیان لێ دادەڕنن، لەجیاتی ئەوە شەفاعەتیان بۆ بکەن دەبنە دژو دوژمن بۆیان، بەپێچەوانەی ئەوەی لێیان چاوەڕوان دەکەن، بەدرۆیان دەخەنەوەو دەڵێن: درۆ دەکەن ئێوە عیبادەتی ئێمەتان نەکردوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأى الَّذِينَ أَشْرَكُواْ شُرَكَاءهُمْ قَالُواْ رَبَّنَا هَـؤُلاء شُرَكَآؤُنَا الَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوْ مِن دُونِكَ فَألْقَوْا إِلَيْهِمُ الْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَاذِبُونَ﴾(النحل/٨٦). یان دەڵێن: ﴿مَا كَانُوا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ﴾(القصص/٦٣). یان دەفەرموێ: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُواْ مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ﴾(البقرة/١٦٦).

ئەوە حاڵو وەزعییانە لەگەڵ بتو پەرستراوەکانیان لەڕۆژی قیامەتدا بەو جۆرە ڕەد دەدرێنەوەو بەدرۆ دەخرێنەوە، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کافرانە لەگەڵ شەیاتینی‌یەکان لەدونیادا چۆن بێ؟ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّا أَرْسَلْنَا الشَّيَاطِينَ عَلَى الْكَافِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزّاً﴾ ئەتۆ نەتزانیوە ئەی موحەممەد! کە ئێمە شەیاتینیمان بەسەر کافرەکاندا زاڵ کردون، جێگیرمان کردوون بۆ گومڕا کردنیان، دەنە دەنەیان دەدەن، هەڵیان دەنێن بۆ ئەنجامدانی تاوانو ڕۆچوون لەگومڕاییدا. هەڵیان دەخلێنن بۆ ئەوەی بکەونە ناو زلکاوی تاوانەوە، ڕێگای کوفرو بێدینییان بۆ جوان دەکەن، ئیزن دراون بۆ گومڕاکردنی ئادەمیزاد، لەو کاتەوە شەیتان داوای لەخودا کرد: کە ڕێگەی بدا ئادەمیزاد گومڕا بکا، ئەم ئیزنەیان وەرگرتووە، وەکوو لەشوێنێکی تردا

دەفەرمویٚ: ﴿وَاسْتَفْزِزْ مَنِ اسْتَطَعْتَ مِنْهُمْ بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِي الأَمْوَالِ وَالأَوْلادِ﴾(الإسراء/٦٤).

کەوابو ئەی پێغەمبەر! ئەتۆ دڵتەنگ مەبە، هۆی ئیمان نەهێنانەکەیان ئەومیە: شەیاتینی دەنووکیان لەسەریانەو بەرەو گومڕایی رایان دەدەنو ناهێڵن روو لەرێبازی هیدایەتو بەختەوەری بکەن، هۆی کەمتەرخەمی تۆ نیە لەبانگەوازیو هەوڵو تێکۆشانتدا. ئەتۆ ئەرکی خۆت ئەنجام داوەو پەیامی خۆت گەیاندوە، ئیمان نەهێنانەکەیان بەهەند مەگرەو پێی دڵتەنگ مەبە ﴿فَلا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ﴾ ئەی موحەممەد! پەلەی ئەوەیان لێ مەکە زوو لەناو بچن، داوای هاتنی عەزابی ریشەکێشکەرو کۆکوژیان لێ مەکە، داخوازی ئەوە مەبە بەهۆی سوور بوونیان لەسەر کوفرو بێدینی هەموانیان لەناو بەرین، چونکە ماوەی ژیانیان کورتەو کاتی لەناو بردنیان نزیکە، ﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ چەند رۆژو کاتێکیان لەدونیادا ماوە، رۆژو سەعاتیان لێ دەژمێرین، هەتا سەروکارو کردەوەیانمان کۆنترۆڵ کردوە، لێیان دەگەڕێین بۆ کاتو ساتێکی دیاریکراو کە کۆتایی تەمەنیانە، ئەو کاتە حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ دەکەین سزای شیاوی خۆیان وەردەگرن، ئەوان بەرەو عەزابەکە دەچنو عەزابەکەش بەرەو رویان دێ ماوەی نێوان ئەوانو عەزابی سەخت چەند رۆژو ساتێکەو بەم زوانە یەخەیان دەگرێ، هەموو شتێکی چاوەڕوانکراوو لەمەدوا هاتوو نزیکە، هاکا پەیدابوو، هاکا یەخەی گرتن ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ﴾(ابراهيم/٤٢). یان دەفەرموێ: ﴿فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْداً﴾(الطارق/١٧). یان دەفەرموێ: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلاً ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾(لقمان/٢٤).

ئەمجار پەروەردگار دیمەنێکی رۆژی قیامەت رادەنوێنێ، وێنەی سەرەنجامی حیسابو لێکۆڵینەوە دەکێشێو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْداً﴾ ئەی پێغەمبەر! باسی ئەو رۆژە بۆ گەلەکەت بکە: کە ئێمە کۆمەڵی خوداناسان کۆ

دەكەینەوە بۆ لای خۆمان؛ بۆ لای خودای خاوەن رەحمو بەزەیی بەشێوەی رێزو حورمەت، دەیان بەین بۆ ناو بەهەشت بەسواری‌و رێزەوە، ئیمامی عەلی دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: سوێندم بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە خوداپەرستان بەپیادە ناڕۆن بۆ بەهەشت، بەڵكوو وڵاغی سواریان بۆ دەهێنن: كە هیچ كەس نەی بینیون، بەزینی ئاڵتونو جڵەوی زوبەرجەدەوە ئامادەكراون، بەسواری ئەو وڵاغانە دەچن بۆ بەهەشت. ئەمجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە.

﴿وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَى جَهَنَّمَ وِرْداً﴾ تاوانباران بەپیادەیی راپێچ دەكەین بۆ لای دۆزەخ، ماندوو شەكەتن تینوو برسین. بەو حاڵە دەیاندەینە بەرو راپێچیان دەكەین وەكوو چۆن گەلە حوشترو گاران: كە راپێچی دوێڵی ئاو دەكرێن!

كەس لەهانایان نایەو ﴿لا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلاَّ مَنْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْداً﴾ هیچ كەسێك لای خودا مافی ئەوەی نیە شەفاعەت بۆیەكێكی تر بكا، مەگەر كەسێك لەخوداوە وادەو بەڵێنێكی وەرگرتبێ، كە شایەتیدانە بەتاكو تەنهایی خوداو راستی پێغەمبەرایەتی‌و هاتنی رۆژی قیامەت.

شایەتی (أشهد أن لا إله إلا الله وأنّ محمداً رسول الله) ئەم شایەتیەی دابێ‌و مافی خۆیشی دابێ بەشایەتیەكەی، ئەركی سەرشانی خۆی ئەنجام دابێ، عەقیدەی راست بوبێ، لەكردارو گوفتاردا راستاڵ بووبێ، لەژیانی دونیایدا هادی‌و موصلیح بووبێ، ئەوە لەقیامەتدا شەفاعەت بۆ كراو دەبێ، وەڵێ شەفاعەتكردنی بتو صەنەم بۆ پەرستشكارانیان ئەوە خەیاڵ پڵاوەو هیچی بەسەر هیچەوە نیە، چونكە زیانو قازانجیان بۆ خودی خۆیان نیە چ جایی بۆ غەیر!

ئیبنو ئەبی حاتەم لە(الأسود)ی كوڕی زەیدەوە ریوایەت دەكا؛ دەڵێ: عەبدوڵلای كوڕی مەسعوود ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿إِلاَّ مَنْ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْداً﴾ ئەمجار فەرمووی: خەڵكینە! لەلای خودا وادەو بەڵێن وەربگرن، چونكە

خـودا رۆژی قیامـەت دەفـەرموێ: هـەر کەسـێ لای خـودا وادەو بـەڵێنی هەیـە بـا هەڵسێ، هاوەڵان وتیـان: ئـەی ئـەبو عەبـدورڕەحمان فێرمـان بکـە چۆن وادەو بـەڵێن لـەخودا وەربگـرین: فـەرمووی: بڵـێن: (اللـهم فـاطر الـسموات والأرض، عـالم الغيب والشهادة، اني أعهد إليك في هذه الحيـاة الـدنيا الا تكلـني إلى عمـل يقـربني مـن الشر ويباعدني من الخير، واني لا أثق الا برحمتك، فاجعل لي عندك عهداً تؤديه إليَ يوم القيامة، انك لاتخلف الميعاد). پەروەردگارا! ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی، ئـەی زانـاو ئاگـادار بەسـەر هـەموو نهێنـیو ئاشـکرایەك، ئـەمن تکـات لێ دەکـەم کـە نەمخەیە سەر کارێك لەشەڕ نـزیکم بخاتـەوە، لـەخێر دوورم بخاتـەوە، بێگومـان مـن بتمانە بەرەحمەتی تۆ دەکەمو بەس! خودایە عەهـدو پـەیمانێکم لێ وەربگـرە رۆژی قیامەت سوودی لێ وەربگرم، بێگومان وادەی تۆ پاشگەزبوونەوەی تێدا نیە.

مەبەسـت بـە(عهـد) لێـرەدا شـایەتیدانی ئـادەمیزاد بـەتاكو تـەنهایی خـوداو هەڵسو کەوت کردن بەگوێرەی ئـەو شـەهادەتە، چـونکە ریوایـەت زۆر هـەن لەسـەر ئەوە: کـە ئـەهلی فـەضلـو عـیلمو پیاوچاکان رۆژی قیامـەت شـەفاعەت دەکـەن بـۆ تاوانبارانو شەفاعەتەکەشیان لێ قبووڵ دەکرێ.

ئیبنـو مەسـعوود دەفـەرموێ: لەپێغەمبـەرم زنـەوت بـەهاوەڵانی دەفـەرموو: (أيعجز أحدكم أن يتخذ كل صباح ومساء عند الله عهداً؟ قيـل: يارسـول الله ومـاذاك؟ قال: يقول: كل صباح ومساء: اللهم فاطر السموات والأرض عالم الغيب والـشهادة، إنـي أعهد إليك في هذه الحياة الدنيا بأني اشهد أن لا الـه الا أنـت وحـدك لاشـريك لـك وأن محمداً عبدك ورسولك، فلا تكلني إلى نفسي، فانك، ان تكلني إلى نفـسي تباعـدني مـن الخير وتقربني من الشرّ، واني لأثق الا برحمتك، فاجعل لي عندك عهداً توفنيه يـوم القيامة، انك لأتخلف الميعاد، فاذا قال ذلك طبع الله عليها طابعاً ووضعها تحت العرش، فاذا كان يوم القيامة نادى منـاد: أين الذين لهم عند الله عهد؟ فيقول فيدخل الجنة).

## ڕەتدانەوەى ئەوانەى منداڵ وەپاڵ خودا دەدەن

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ السَّمَوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ڕەدى بتپەرستەكانى دايەوە، ئەمجار لێرەدا ڕەدى ئەوانە دەداتەوە كە دەڵێن: خودا منداڵى هەيە، ڕەدى موشريكەكانى عەرەب دەداتەوە: كە دەڵێن: فريشتەكان كچى خودان، ڕەدى موشريكەكانى جولەكە دەداتەوە: كە دەڵێن: عوزەير كوڕى خودايە، ڕەدى موشريكەكانى مەسيحى دەداتەوە: كە دەڵێن: عيسا كوڕى خودايە. دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً، لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئاً إِدّاً﴾ كافرەكانى قوڕەيشو جولەكەو نەصارا دەڵێن: خودا منداڵى بۆ خۆى داناوە، منداڵى هەيە؛ موشريكەكانى قوڕەيش دەڵێن: فريشتە كچى خودان، جولەكەكان دەڵێن: عوزەير كوڕى خودايە، مەسيحييەكان دەڵێن: عيسا كوڕى خودايە! بەڕاستى ئەو كافرە نەفامانە بەم قسەو بيرو بۆچوونانەيان هەڵوێستێكى ناشيرين دەنوێنن، قسەيەكى زۆر ناشيرينو بەعەقڵدا نەچوو دەڵێن. تاوانێكى گەورەو بەڵايەكى سامناك بۆ خۆيان دێننە دى! ئاى كە بوختانێكى گەورە دەكەن!

بوختانەکەیان هێندە سامناکە ﴿تَكَادُ السَّمَوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً﴾ نزیکە ئاسمانەکان شەق بەرن، شەقار شەقار ببن! زەوی بقەڵشێو رۆچێ، کێوەکان تێك روخێنو وردو خاش ببن! خەریکە کەون وەلەرز بێ، قەبارە زلەکانی بوونەوەر بەئەرزو ئاسمانەوە هەرچەندە بێ گیانن بکەونە لەرزەو حەجمینیان لێ هەڵگیرێ، تاوانەکە هێندە گەورەیە بێ زمان وەزمان دێنێو بێ گیان دەلەرزێنێ، ئەم رەتدانەوەو پێ ناخۆشبونو نارەزایی دەربرینە ئاسمانەکانو زەویو کێوەکان بەشداری تێدا دەکەن، هەموویان وەکوو شەقشەقە دەکەونە لەرزەو رادەچڵەکێن ﴿أَنْ دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً﴾ لەبەر ئەوەی ئەو نەفامانە منداڵ وەپاڵ خودا دەدەن، دەڵێن: خودا کوڕی هەیە کچی هەیە. بونەوەر تێکڕا نۆقرەی لێ هەڵدەگیرێ، وەکوو مێژوڵك دەلەرزێ، لەبەر بەگەورەگرتنی خوداو بەدوور گرتنی لەهەموو عەیبو نەنگییەك، چونکە خودا تاكو تەنهایەو بێ هاوەڵو بێ وێنەو بێ خێزانو منداڵە، ئەنجامدانی ئەو بوختانە گەورە هێندە سامناکە بونەوەر دەهەژێنێ.

ئیبنو عەبباسو کەعب دەفەرموون: ئاسمانەکانو زەویو کێوەکان ترسانو لەرزیان لێ هات بەڵکوو هەموو مەخلووقات جگە لەئادەمیزادو جنۆکە کەوتنە لەرزەو نزیکبوو لەبەریەك دەربچن، فریشتە رەقیان هەڵسا، دۆزەخ زیاتر هەڵگیرساو گەرم بوو، درەختەکان شکاتیان کرد، زەوی گرژ بوو، کاتێك ئەو کافرانە وتیان خودا منداڵی هەیە!

موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێ: نزیك بوو دوژمنانی خودا قیامەت لەسەرخۆیان هەڵسێنن، پێش وەخت دونیا وێران بکەن! بێگومان ئەمە ترس بەرنانێکی زۆر گەورەو سامناکە! وەلێ ئەگەر حیکمەتو حیلمی خودا نەبوایە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: کە خودا بێ باکەو موبالات بەکوفرو بێدینی موشریکەکان نادا، قیامەت رادەبوو بوونەوەر تێك دەچوو، بەڵام خودا حەکیمەو

حەلیمـە، حیکمـەتو دانـایی داخـوازی ئـەوە بـوو: کـە مۆڵـەتیان بـداو دەمو دەسـت تۆڵەیان لێ نەستێنیێ! هەڵیان بگرێ بۆ کاتێکی تر!

﴿وَمَا يَنْبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَـداً﴾ هـەرگیز نـەگونجاوەو نـابێ خـودا منـداڵی هەبێ، لایەق نیە بۆ خـودا، چونکە هـەبوونی منـداڵ نیـشانەی ئیحتیـاجیو کـەمو کورییە، پەروەردگار لەشتی ئاوا دوورەو پێویستی پێ نیە ﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ إِلاَّ آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾ هەموو یـەکێ لەمـەخلووقات، لەفریـشتەو ئـادەمیو جندۆکـە ناچـارن ئـیللا دەبـێ رۆژی قیامـەت لەبـەردەم خـودادا دان بەبەنـدایـەتی خۆیاندا بنێنن بۆ خودا، دەبێ هەموویان ملکەچیو زەلیلی خۆیان رابگەیەنن، ئیتر چۆن دەبێ هەندێ لـەو مەخلووقانـەی ببنـە منـداڵیو بـەکوڕو کـچی خـودا حـسێب بکرێن؟؟

﴿لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدّاً﴾ بێگومـان پـەروەردگار هـەموو بەنـدەکانی خـۆی، هـەموو دروسـتکراوانی خـۆی سـەرژمێر کـردونو دەوری داون، هـەموویان لـەژێر فەرمانو تەگبیری ئـەودان، ئاگاداری هەموو هـەڵسو کەوتێکیانـە، هیـچی لێ نادیـار نیەو لێی گوم نابێ، هەموو بەنـدەکانی خـۆی سـەر زمێـر کـردون، کـردارو گوفتـارو هەناسەو جمو جوڵیـانی کـۆنترۆڵ کـردوە، هـەموو شـتێك لای خـودای زانـاو ئاگـادار بەئەندازەو مەزەندەیە.

﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾ هەریـەکێ لەبەنـدەکانی رۆژی قیامـەت دێنـە خزمەت پەروەردگاریان بەتەنیاو بێ کەسو بێ یارمەتیدەر، هانـا بـۆ خـودا دێنـێو ئاتاجی بـەزەییو ڕەحمـی خودایـە. هـەموو هەڵوێـستو کارو گوفتـارێکی لای خـودا تۆمار کراوە، بەتەنیاو بێ کەسو بێدەر دێتـە بـەردەم دادگـایی خـودا، کـەس گیـانی کۆمەکیو هەمئاهەنگی تێدا نـەماوە، هـەموویان لـە شـعور بەکۆمـەك هەمئاهـەنگی روت کراونـەوە روتـو قـوتو تـەنیاو بـێ کـەس لەبـەردەم دادگـای خـودادا خۆیـان دەبیننەوە!

## خۆشەويستى خودا بۆ موسوڵمانانو ئاسانكردنى تێگەيشتن لەقورئانو لەناوبردنى تلوانباران

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾ ﴾

پاش ئەوەى پەروەردگار رەدى كافرەكانى دايەوە حاڵو وەزعى دونياو قيامەتى رونكردنەوە، ئەمجار حاڵو چۆنيەتى موسوڵمانان ديارى دەكا، ئەوە رون دەكاتەوە: كە خۆشەويستى ئەوان دەخاتە دڵى بەندەكانيەوە، ئەوەش رادەگەيەنێ: كە قورئانى بەزوبانى پێغەمبەر بۆ ناردونو لێ تێگەيشتنى بۆ ئاسان كردون.

ئەمجار كۆتايى سورەتەكە بەپەندو ئامۆژگاريەكى كاريگەر دەهێنێو هەڕەشە لەموشريكەكان دەكا بەلەناوچونو ريشەكێش كردنيان وەكوو چۆن گەلە پێشينەكانى لەناو بردوە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ بێگومان ئەوانەى بروايان بەتاكو تەنهايى خوداو پێغەمبەرێتى پێغەمبەر هێناوە، كردەوەى باشو بەسووديان ئەنجام داوە، ئەركى سەرشانيان بەگوێرەى توانا بەجێ هێناوە، ئەوەى ئايين بەحەلاڵى دانابێ بەحەلاڵى بزانن ئەوەى ئايين بەحەرامى دانابێ لايان حەرامە. پەروەردگار لاى بەندە صالحەكانى

خۆشەویستیان دەکا، ئەحمەدو بوخاریو موسلیمو تیرمیذی لەئەبو هورەیرەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر فەرمووی: (هەر کاتێ خودا بەندەکانی خۆی خۆش ویست بانگی جوبرائیل دەکاو دەفەرموێ: من فلانکەسم خۆش دەوێ ئەتۆش خۆشت بوێ. ئەویش خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو کابرایە بەئاسمانەکاندا بلاو دەکاتەوە ئەمجار خوشەویستی‌یەکەی بۆ ئەو بەندەیە دەخاتە نێو دڵی دانیشتوانی سەرزەوی. ئەگەر خودا بەندەیەکی خۆی ناخۆش ویست، ئەوە بەجوبرائیل رادەگەیەنێو دەفەرموێ: من فلانکەسم ناخۆش دەوێ، ئەویش ئەم هەواڵە بەئاسمانەکاندا بلاو دەکاتەوە، پاشان ئەو رق لێ بوونەوەیە دەخاتە نێو دڵی دانیشتوانی سەر زەوی).

ئەم خۆشەویستی‌یە لەڕوی خزمایەتی‌و هاوەڵی‌یەوە دەستەبەر نابێ، بەڵکوو خودا ئەو خۆشەویستی‌یەیان بۆ لەدڵی بەندەکانی‌دا دەخولقێنێ! بەخششو نیعمەتێکی خودایە بۆ موسوڵمانان.

شتێکی ئاشکراو نومایانە قورئان مزگێنی یە بۆ موسوڵمانانی لەخواترسو هەڕەشەیە لەموشریکەکانی سەر رەق ئەو دوو شتە کاری گرنگی قورئانن دوو مەبەستی سەرەکی ئەو کەلامە ئاسمانییەنو خودا بەزمانی عەرەبی نازڵی کردوە بۆ ئەوەی بیخوێننەوەو لێی حاڵی ببن.

بێگومان خودای خاوەن رەحمو بەزەیی هەر پێغەمبەرێکی رەوانە کردبێ بۆ سەر هەر گەلو نەتەوەیەکو هەر کتێبێکی ناردبێتە خوارێ بەزمانی ئەو گەلو نەتەوە بووە: کە یەکەمجار بانگەوازییان ئاراستە کراوە بۆ ئیماهێنان، چونکە ئەگەر وا نەبوایە تێی نەدەگەیشتن، بانگکردنەکە بێ سود دەبوو، خەڵکەکە بیانوویان دەبوو لەوەدا: کە شوێنی نەکەون، بەڵام: کە پێغەمبەر لەرەگەزی خۆیان بوو، شەریعەتو یاساکەی بەزمانی ئەوان بوو بیانوویان نامێنێو ئامادەباشی ئەوەیان تێدا دەبێ وەری بگرن، ئەوانەی خاوەن فامو دڵی زیندوون زوو وەری

دەگرنو پەيڕەوى دەكەن، ئەوانەى دڵيان مردووە بيانوويان نامێنىو بەهانەيان دەبڕێ. ئەوسا كە ئايينەكە جێگير بوو، خەڵكى لێ كۆ بووەوە ئيتر رونكردنەوەو راڤەكردنى ئەو شەريعەتە بەزمانى ترو بۆ خەڵكى تر ئاسانەو سود بەخش دەبێ، جا چونكە ئەو گەلەى يەكەمجار ئەم قورئانەى پێ راگەيەندراوە عەرەبى زمان بوون حيكمەتى خودا وا داخواز بووە پێغەمبەرەكە لەخۆيان بێو قورئانەكەشى بەزمانى ئەوان بێ، بۆ ئەوەى وردە وردە ئەو گەلە بڕواى پێ بكەنو بكەونە ژێر بەيداخەكەيەوەو پاشان لە رێگەى ئەوانەوە بەهەموو جيهاندا بڵاو بكرێتەوە گەلو نەتەوەكانى تريش وردە وردە لێى حاڵى بنو بەزمانى خۆيان راڤەو لێكۆڵينەوەى تێدا ئەنجام بدەن. پەروەردگار لەچەند ئايەتێكدا ئەم مەبەستە روون دەكاتەوە، يەكێ لەو ئايەتانە ئەم ئايەتەيە كە لەكۆتايى ئەم سورتەدا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ الْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِ قَوْماً لُدّاً﴾ ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان كردوە بەوە كە بەزمانى تۆ نازڵمان كردووە بۆ ئەوەى مژدە بدەى بەوانەى تەقواكارو لەخودا ترسن، ئامادەباشييان تێدايە بۆ ئەوەى بچنە ريزى خوداناسانەوە، موژدە بدەى بەوانەى بەپير بانگەوازىيەكەتەوە دێن خودا بەتاكو تەنيا دەناسن، بڕوا بەپێغەمبەرايەتى تۆ دەكەن، موژدەى بەهەشتيان پێ بدەى، لەهەمان كاتدا بەم قورئانە كۆمەڵو كەسانێكى تر بترسێنى: كە سەررەقو دڵڕەقن، دەمدرێژو چەقە چەناون، حەزيان لەكێشەو جەدەلە بەناحەق، لەحەق لايان داوەو رويان لەبەتاڵ كردوە، هەڕەشەيان لێ بكەى بەئاگرى دۆزەخ لەتۆڵەى ئەو خراپەكاريەى ئەنجامى دەدەنو ئەو بيرو باوەڕەى سوورن لەسەرى!

ئەمجار كۆتايى سورتەكە بەهەڕەشەيەكى سامناك دەهێنىو دەفەرموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُمْ مِنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزاً﴾ لەپێش ئەو عەرەبە موشريكانەوە زۆر گەلو نەتەوەو تاقمو كۆمەڵمان لەناوبردون، خستومانن توونى نەمانەوە، بەهۆى كوفرو بێدينىيەوە بەهۆى بەدرۆخستنەوەى

پێغەمبەرەکانیانەوە، ئایا ئێستا کەسیان لێ دەبینی، هەست بەهیچ جمو جوڵو هاتوچۆی ئەوانە دەکەی؟ ئایا هیچ سرکەو پرتەو دەنگو صەدایەکیان لێ دەبیسی؟ واتە: پێش ئەم عەرەبە موشریکانە زۆر گەلو نەتەوە هەبوون وەکوو ئەمانە سەرکێشو دڵرەقو سەرپێچی کەر بوون، نەهاتنە سەر رێبازی حەقو بڕوایان بەپێغەمبەرەکانیان نەکردو خودا ئاسەواری بڕینەوەو لەناوی بردن، دەی با ئەم گەلەی تۆش بترسن تەمێ خواردوو ببنو پەند لەو گەلو نەتەوە پێشینانە وەربگرن کە خودا لەسەر کوفرو بێدینی لەناوی بردون!

**بەیارمەتی خودا لێرەدا سورەتی (مریم) تەواو بوو**

**خودا یارمەتیمان بدا بۆ تەواو کردنی سورەتەکانی تر...**

بسم الله الرحمن الرحيم

## سورەتی (طـه)

بۆیە ناونراوە سورەتی (طه) چونکە سورەتەکە بەبانگ کردن لەو ناوە دەست پێ دەکا، دەفەرموێ: ﴿طـه! مَـا أَنزَلْنَـا عَلَيْـكَ الْقُـرْآنَ لِتَـشْقَى﴾. (طاها) ناوێکە لەناوەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمەش خۆی لەخۆیدا رێز لێنانە لەپێغەمبەرو تەسەللا دانەوەیەتی لە بارەی ئەو ئەزیەتونارەحەتیەی تووشی دەبوو لەلایەن گەلەکەیەوە.

**موناسەبەو پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند روویەکەوەیە:**

١- سورەتی (طه) لە روی مێژوویی یەوە، وەکو ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: لە دوای سورەتی(مریم) نازڵ بووە.

٢- سورەتی (مریم) چیرۆکی (٢٥) پێغەمبەری تێدابوو وەکو: زەکەریا- یەحیا - عیسا - ئیبراهیم - موسا. چیرۆکی حەزرەتی موسا لەسورەتی (مریم) دا بەکورتی باس کراوە لەم سورەتەدا بەدورو درێژی ڕونکراوەتەوە ، لە سورەتی (مریم) دا دەربارەی چیرۆکی حەزرەتی ئادەم تەنها ناوەکەی هێناوە لەم سورەتە دا چیرۆکەکە بەتەواوی ڕون کراوەتەوە.

٣ـ لە کۆتای سورەتی (مریم)دا ئەوەی ڕاگەیاند: کە قورئان بە زوبانی عەرەبی نێردراوەتە خوارێ وئاسان کراوە بۆ ئەوەی لێی حاڵی بن. سەرەتای ئەم سورەتەش تەئکیدی کۆتایی سورەتی پێشوو دەکاتەوە.

ئەم سورەتە مەککەیی یە جگە لە ئایەتی ژمارە(١٣٠ ـ ١٣١) ئەو دوو ئایەتە مەدینەیین. ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سورەتە سەدو سی‌و پێنج ئایەتە.

باسە گرنگەکانی ئەم سورەتە وەکوو باقی سورەتەکانی تری مەککی چەسپاندنی بنەمای ئایینن لەبارەی یەکتاپەرستی و پێغەمبەرایەتی و زیندوو بونەوە. سەرەتای سورەتەکە کاریگەریەکی تایبەتی هەیە، جەرەس‌و ئیحایەکی داچڵەکێنەری هەیە، بۆیەکە: حەزرەتی عومەری کوڕی خەططاب کاتێک لەسەرەتای ئیسلام بوونیدا گوێی لەسەرەتای ئەم سورەتە بوو، یەکسەر داچڵەکی‌و دڵی گۆڕا. وەکوو لە چیرۆکی موسوڵمان بوونیدا تۆمارکراوە.

**ئەم سوروتە ئەم خاڵانەی لە خۆگرتون:**

١- قورئانی پیرۆز یادخەرەوەیە بۆکەسێک لەخوای باڵادەست بترسێ، دەرخستنی کەسایەتی پێغەمبەرو ئەنجامدانی ئەرکی سەر شانی و لەهەموو بوارەکاندا بەتەواویی تێدا روون کراوەتەوە.

٢- ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی سەر گوزشتەی حەزرەتی موسا هەرلە ڕۆژی لەدایک بوونی‌یەوە تاکۆتایی ژیانی.

٣- ئامـاژە کـردن بەفائیـدەو سـوودی چـیرۆکی قورئـانو دیـاریکردنی سـزای ئەوانەی ڕوو لەقورئان وەردەگێڕن.

٤- وێنە کێشانی دیمەنی ترسناکی حەشرو وردو خاشکردنی کێوەکانوحاڵو چۆنیەتی تاوانباران لەڕۆژی قیامەت دا.

٥- قورئان بەزمانی عەرەبیەو پێغەمبەرﷺ هیچی لەیاد نەچۆتەوە.

٦- ڕانواندنی چیرۆکی حەزرەتی ئادەم و هەڵسو کەوتی شەیتان لەگەڵیدا.

٧- نمونـــە هێنانـــەوەو پەنـــد وەرگـــرتن لەبـــەهیلاکبردنی گـــەلو نەتـــەوە پێشینەکانو مۆڵەتدانی عەرەبە موشریکەکان تارۆژی قیامەت.

٨- ڕێنمویی کردنی خودا بۆ پێغەمبەرﷺ و گەلەکەی، بۆئەوەی بـەردەوام بـێ لەسەر خودا پەرستیو بەجوانیو ڕازاوەیـی دونیـا هەڵنەخـەڵتێو فـەرمان بـەخاوو خێزانی بکا بۆ ئەنجامدانی نوێژ.

٩- باسـی داواکردنـی موشـریکەکان: کـە خـودا نیـشانەی مادییـان نیـشان بـدا، هـەروابیانوو بڕانـی کافرەکـان دوای نـاردنی پێغەمبـەر ﷺ ونـازلکردنی قورئـانو هەڕەشەکردن لێیان بەناردنی عەزاب.

## قورئانی پیرۆز هۆی بەختەوەرییە

﴿ طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ

﴿وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ۝٦ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ۝٧ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۝٨﴾

سەرەتاو کۆتای ئەم سورەتە پیرۆزە خیطابە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و بەیانکردنو ڕونکردنەوەی ئەرکی سەر شانیەتی، ئەوە ڕون دەکاتەوە: کە نازڵکردنی قورئان بۆ سەری مایەی نەگبەتیو ئەزیەت دان نیە، بەڵکوو بانگەوازیو بیر خستنەوەیە، موژدە پێدانو هەڕەشە لێکردنە، فەرمانکردنە بەئادەمیزادکە بەئاگا بێنەوەو بزانن: کەخودای ئەوان خودایەکی تاكو تەنیاو بێ هاوەڵو نەزیرە. باڵادەستە بە سەر بونەوەردا، ئاگادارە بەسەر هەموو کونو کەلەبەرێکیدا، ئاگاداری پەنامەکیو نهێنی ناو دڵانە، لەکۆتاییدا هەموو کەسێك بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە، پاداشتو سزای هەموو کەسێك بە گوێرەی کردەوە کانیان دەداتەوەدەفەرموێ: (طه) ئەم پیتە بڕ بڕانە: کە لەسەرەتای هەندێ سورەت دا چەسپاون بۆ بەئاگا هێنانەوەو ئاگادار کردنەوەی موخاطەبە کە: خۆی ئامادە باش بکا بۆ ئەو نیگایەی بۆی دەکرێ، بۆ ئەوپەیامەی پێی ڕادەگەیەنرێ:

هەروەها بۆ تەحەدا کردنی عەرەبو ناعەرەبە: کە ناتوانن وێنەی قورئان بخەنە ڕوو، پێیان دەفەرموێ: قورئان لەم جۆرە پیتانە پێك هاتووە، دە ئەگەر ئێوە ئازانو درۆ ناکەن، ئەمە عەرزو ئەمە گەز، وێنەی ئەم کەلامە بخەنەڕو! بەڵکو دە سورەتێ تەنانەت وێنەی سورەتێکیشی ! هەندێکیش لە ڕاڤەکەرانی قورئان لێرەدا فەرمویانە: ﴿طه﴾ ناوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ماناکەی ئەوەیە: ئەی موحەممەد! خۆت بخە سەر زەویو ئیسراحەت بکە، پاڵدەرەوە! ئیبنوئەنباری دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ

زۆری نوێژ دەکردو لە نوێژدا بە پێوە ڕادەوەستا هەتا قاچەکانی هاوسان پێویستی بە ئیسراحەتو پشوو دان هەبوو؛ ئیتر بەم پەیامە فەرمانی پێ کرا کە: ئەوەندە لەنوێژدا خۆی ماندو نەکا ئازار بەقاچەکانی بگا.

﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى! إِلاَّ تَذْكِرَةً لِمَنْ يَخْشَى﴾ ئێمە قورئانمان بۆیە بۆسەر نازڵ نەکردوی؛ کەئەوەندە خۆت ماندو بکەی‌و ئەوەندە خەم‌و خەفەت بخۆی کە: ئەوانە ئیمان ناهێنن، ئیمانهێنانی ئەوان بەدەست تۆ نیە، تۆ لەوە بەرپرسیار نی، بەڵکوو ئێمە قورئانمان کە: بۆ ناردوی بۆ ئەوەیە بەمەردومی ڕابگەیەنی‌و تێیان بگەیەنی، ئەتۆ هەر ڕاگەیاندن‌و تێگەیاندنت لەسەرە، لەوەبەولاوە گوێ بە سەرپێچی‌و ڕو وەرگێڕانی ئەوانە مەدەئەوەندە زەحمت لەخۆت مەکە زیان بەدڵ‌ودەرون و جەستەت بگا، ئەوەی لەخودا دەترسێ کە: خودای بیر دەکەوێتەوە پەند ئامێز دەبێ، تەقوای خودا دەکاو داوای لێ خۆشبوون‌و بەمراز گەیشتنی لێ دەکا، بەمەش ئەرکی پێغەمبەر ﷺ کۆتایی دێ، چونکە ئەرکی سەر شانی پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندنی پەیام‌و موژدە دان‌و ترساندنە!

جووەیبیر لە ضەحاک‌و موقاتیلەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: کە قورئان بەنیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، خۆی‌و هاوەڵانی پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی بوون، موشریکە قوڕەیشییەکان وتیان: خودا کەئەم قورئانەی بۆ سەر موحەممەد ناردوە بۆ ئەوە ناردویەتی موحەممەد توشی نەگبەتی بکا.. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد، فەرمووی: ئەوانە بەهەڵە چون، وەکو ئەوان دەڵێن کار وانیە، بەڵکوو کەسێك پەروەردگار نیگای بۆ بنێرێ‌و فێری دینی بکات بەختەوەرە، سەرفرازە، خێر لەخۆ دیوە لە فەرمودەیەکدا: کەموعاویە لێی ڕیوایەت دەکاو لەصەحیحەیندا هاتوە دەفەرموێ: (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين) هەرکەسێ خودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکا.

زۆری نوێژ دەکردو لە نوێژدا بە پێوە ڕادەوەستا هەتا قاچەکانی هاوسان پێویستی بە ئیسراحەتو پشوو دان هەبوو؛ ئیتر بەم پەیامە فەرمانی پێ کرا کە: ئەوەندە لەنوێژدا خۆی ماندو نەکا ئازار بەقاچەکانی بگا.

﴿مَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَى! إِلاَّ تَذْكِرَةً لِمَنْ يَخْشَى﴾ ئێمە قورئانمان بۆیە بۆسەر نازڵ نەکردوی: کەئەوەندە خۆت ماندو بکەیو ئەوەندە خەمو خەفەت بخۆی کە: ئەوانە ئیمان ناهێنن، ئیمانهێنانی ئەوان بەدەست تۆ نیە، تۆ لەوە بەرپرسیار نی، بەڵکوو ئێمە قورئانمان کە: بۆ ناردوی بۆ ئەوەیە بەمەردومی ڕابگەیەنیو تێیان بگەیەنی، ئەتۆ هەر ڕاگەیاندنو تێگەیاندنت لەسەرە، لەوەبەولاوە گوێ بە سەرپێچیو ڕو وەرگێڕانی ئەوانە مەدەئەوەندە زەحمەت لەخۆت مەکە زیان بەدڵودەرون و جەستەت بگا، ئەوەی لەخودا دەترسێ کە: خودای بیر دەکەوێتەوە پەند ئامێز دەبێ، تەقوای خودا دەکاو داوای لێ خۆشبوونو بەمراز گەیشتنی لێ دەکا، بەمەش ئەرکی پێغەمبەر ﷺ کۆتایی دێ، چونکە ئەرکی سەر شانی پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاندنی پەیامو موژدە دانو ترساندنە!

جووەیبیر لە ضەحاکو موقاتیلەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: کە قورئان بەنیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، خۆیو هاوەڵانی پاپەندی فەرمانو نەهیەکانی بوون، موشریکە قوڕەیشییەکان وتیان: خودا کەئەم قورئانەی بۆ سەر موحەممەد ناردوە بۆ ئەوە ناردویەتی موحەممەد توشی نەگبەتی بکا.. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد، فەرمووی: ئەوانە بەهەڵە چون، وەکو ئەوان دەڵێن کار وانیە، بەڵکوو کەسێك پەروەردگار نیگای بۆ بنێرێو فێری دینی بکات بەختەوەرە، سەرفرازە، خێر لەخۆ دیوە لە فەرمودەیەکدا: کەموعاویە لێی ڕیوایەت دەکاو لەصەحیحەیندا هاتوە دەفەرموێ: (من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين) هەرکەسێ خودا بیەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکا.

﴿تَنزِيلاً مِمَّنْ خَلَقَ الأَرْضَ وَالسَّمَوَاتِ الْعُلا﴾ ئەم قورئانەی بۆ تۆ هاتووە ئەی موحەممەد! وەحیە وەحیە بەسروش بەرەبەرە بۆت نازڵ کراوە لەلایەن خودای خۆتەوە: کە بەدیهێنەری زەوی‌و ئاسمانە بەرزەکانە، واتە: هەرچی هەیە لەقەبارە نزمەکان‌و قەبارە بەرزەکان‌و لەزەوی‌و بەرزاییدا، هەروا هەموو ئەو شتانەی نامادین‌و قەبارمیان نیەو خودا بۆ خۆی پێیان دەزانێ‌و لەئێمە نهێنین. هەموو دروست کراوی خوای پەروەردگارن، ئەو خودایەی قورئانی نازڵ کردووە، کەوابێ ڕێزی ئەو قورئانە بگرن‌و بیکەنە بەرنامەی ژیانتان، بەگوێرەی فەرمان‌و نەهییەکانی پەیڕەو بکەن.

﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ ئەو کەسەی قورئانی ناردۆتە خوارێ خودای بەڕەحم‌و بەزەییە، خاوەن نیعمەت‌و فەزڵە بەسەر بەندەکانیدا، هەموو نیعمەتێ لەئەوەومیەو ئەو خاوەنیەتی.. ئەو خودایە: کە بەسەر عەرشدا باڵادەستەو کۆنترۆڵی کردوە. هەموو بارێکی بوونەوەر بە دەست ئەوەو ئەو هەڵیدەسوڕێنێ.

* عەرش لەزمانی عەرەبی دا ناوە بۆ تەخت‌و کورسی ڕازاوەی پاشایان. لە شەرعدا ناوەبۆ مەخلوقێکی پەروەردگار کەلە ژوورهەموو ئاسمانەکانەوەیەو هەر خودا دەزانێ چەند گەورەو بەر فراوانە، هەشت فریشتە یان هەشت کۆمەڵ فریشتە هەڵیان گرتوە. لەدەوروبەری فریشتەی زۆر هەن: هەر خودا دەزانێ ژمارەیان چەندەو چۆنن هەر یەکەیان کاری تایبەتی پێ سپێردراوە! بە گوێرەی زاهیری قورئان هەموو فەرمان‌و بڕیارێکی خودای پەروەردگار دەربارەی هەموو بوونەوەر لەعەرشەوە دەردەچن.

هەڵبەتە عەرش عالەمێکی غەیبی یەو لەئێمە نهێنی یەو نازانین چۆنەو چی‌یە؛ بۆیە واچاکە لێی نەدوێین‌و حەواڵەی عیلمی خودای بکەین.

★ ووشـەی (اسـتوی) لـەزمانی عـەرەبی دا بـەمانا جێگیربـوون‌و نیـشتە جـێ بوونی شتێك لە سەر شتێك هاتوە. دەگوترێ: (زیـد اسـتوی علـی الـسطح) (الفـارس اسـتوی علـى الفـرس)... دەی ئـەم وشـەیە بـەو مانایـە نـاگونجێ بـۆ خـودا بـەکار بهێنـدرێ‌و دەچـێتە پێـڕی ئایـاتی (موتەشـابیهاتەوە) کەواتـە دەبـێ (اسـتوی) بەشێوەیەك مانا بکرێ: کە بۆخودا بگونجێ‌و لایەنی مادییەت بە بەر چاو نـەگیرێ. بۆیە زانایانی ئیسلام بوون بە دوو تاقم‌و هەر تاقمەیان مانایەکی بۆ داناوە.

## ١- زانایانی سەلەفی صالح:

ئەوانەی ئیمانیان بەصیفاتی خودا هەیە بەو جۆرەی خودا بۆخۆی پاڵ خـۆی داون، هیچ گۆڕان‌و تـەئویل‌و لێکچواندن بڕیار نـادەن، ئەمانـە دەڵێن: پـەروەردگار ئیستیوای بەسەر عەرش دا کردوە بەوجۆرەی لەگەڵ گەورەی‌و شکۆمەندی خۆیدا دەگونجێ، ئیتر چ پێویست بەتەئویل‌و مانا گۆڕین هەیـە؟ خـودا بۆخـۆی (استوی)ی بۆ زاتی خۆی بەکار هێناوە ئێمە بۆچی بەبێ بەڵگە لەسەر مانای خۆی لای بـدەین. ئـەم کۆمەڵـە سـەلەفە سـاڵحە دەڵـێن: خـودا زات‌و صـیفاتی هـەن، زات‌و صـیفاتی لەدروست کراوانی جوداوازن، خودا عیلمی هەیەو ئادەمیزادیش عیلمی هەیـە بـەڵام عیلمی خودا جـوداوازە لـەعیلمی ئـادەمیزاد، خـودا صـیفەتی بیـستن‌و دیتنـی هەیـە وەلێ بیستن‌و دیتنی خودا لەبیستن‌و دیتنی ئادەمیزاد جیایە. کـەوابوو هـەموو ئـەو وشـانەی کـە لـە قورئـان دا بـۆ خـودا بـەکار هێنـراون وەکـوو (وجـە، یـد ،قـدم ، استوی...هتد) لەسەر مانای خۆیان دەیانهێڵینەوە، بەڵام بەتەئکید چۆنیەتی مانـای ئەم وشانە کە بۆ خودایان بەکاربهێنین جودا وازە لەوەی کە بۆ مەخلوقاتیان بەکار بهێنین.

**٢- زانایانی خەلەف:**

ئەمان بۆ ئەو جۆرە وشانە تەئویل دەکەن‌و مانای تایبەتی دیاریی دەکەن، بۆ نمونە وشەی (ید) کەلە قورئان دا بەکار هێنراوە هەندێ جار بەمانای هێزو تواناو هەندێ جار بەمانای چاکەو نیعمەت تەئویلی دەکەن. (استوی) بەمانا زاڵبوون‌و باڵادەستی‌و کۆنترۆڵ کردنی عەرش مانا دەکەن.. بەهەر حاڵ پابەند بوون بە یەکێ لەم دوو رایە بەبێ زێدە رەوی کردن تیان دا چ زیانێکی تێدانیە، هەردوو رایەکان بیرو بۆ چوونی تاقم‌و پێرێکی زانایانی تێکۆشەری ئیسلامن وەجهە نەظەرو بەلگەی خۆیان هەیە. رەحمەتی خودا لەهەموانیان بێ‌و خودا پاداشتی هەوڵ‌و تێکۆشانیان بداتەوە.

هەڵبەتە تەئویلی ئەوانەی کە زێدەرەوی دەکەن‌و دەڵێن: هەموو وشەیەکی قورئان دوو مانای هەیە؛ مانایەکی ظاهیرو مانایەکی باطن، ناچێتە بازنەی رای خەلەف‌و دژی رای سەلەفیشە بەڵکو ئەمە بیرو بۆچونێکی ناپەسەندەو لەگەڵ رۆحی قورئان ناگونجێ، ئەو جۆرە تەفسیرانە عەرەب وتەنی (المعنى فی بطن الشاعر!)ە: خودا رەحمیان پێ بکا.

﴿لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى﴾ واتە: ئەو خودایەی قورئانی بۆ نازڵکردوی خاوەنیەتی‌و مڵکایەتی ناو ئاسمانەکان‌و سەر زەوی‌و هەرچی لە ئاسمان‌و زەویدا هەیە، تەنانەت ئەوەی لەژێرگڵ‌و خۆڵیشدایە بەڵکوو هەموو شتێکی ناو بوونەوەر هی خودایەو ئەو تەصەروفی تێدا دەکاو بەویستی خۆی هەڵیدەسورێنێ !

﴿وَإِنْ تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر تۆ بە دەنگی بەرز لەخودا بپارێیەوەو ذیکری خودا بە ئاشکرا بکەی یان بەنهێنی‌و لەسەرە خۆ ئەنجامی بدەی، ئەوە تۆ باش بزانە: کە خودا زاناو ئاگادارە بە سەر

هەموو نهێنی یەك و شاراوەتر لەنهێنی، ئاگای لە چیەو شاراوەتر لە چیە هەیە، وەکوو نیازو خەتەرەی دڵ، نهێنی وەکو نیازو خەتەرەی دڵ: کە ئێستا بە دڵ دا دێن، شاراوە تریش لەو نهێنییە وەکو ئەو نیازو خەتەرانەی لەداهاتودا بە دڵ دا دێن.

زانیاری بەو شتانەو ئاگاداریی بەسەریان دا بەهەموو ئاشکراو نهێنیو شاراوەتر لە (نهێنی) یش بۆ خودا چون یەکە!!

سەیر بکە قورئان چۆن تەنسیق دەخاتە نێوان دیمەنی ئاشکراو بەر چاو لە کەون داو هەروا ئەو دیمەنانەی کەلەبەر دووریو گەورەیی ئێمە نایان بینین. هەموویان دێنیو لەگەڵ قسەو گفتو گۆی ئاشکراو چیەو شتی نهێنیو شاراوەی ژێر گڵ لێکیان دەداو دەیان کاتە تابلۆیەکی سەرنج ڕاکێشو هەست بزوێنو دڵ وەخورپەهێن بۆ ئەوەی تەسەللای پێغەمبەر ﷺ بداتەوەو دڵنیای بکا: کە خودای ئەو، هەموو شتێك دەبیسێو ئاگای لێیەتیو بەرەڵلای ناکا توشی نەگبەتیو ناخۆشی ببێو بەبێ پشتیوان بکەوێتە ژێر دەستی کافرەکان، ئەگەر بە ئاشکراو دەنگی بەرز هاواری بکاتێ ئەوە گوێی لێ یەو گومانی تێدا نییە، تەنانەت ئەگەر بە چیەو نهێنی تریش لەچیە ڕوی تێ بکا ئەو هەر دەیبیستێ. ناهێڵێ بە تەنها بێت لەهەڵسانو ئەنجامدانی ئەرکی ئەم قورئانە لە بەرەنگاری کردنی موشریکەکاندا.

ئاشکراشە هەر کاتێ دڵ هەستی کرد بە نزیکی لەخواوە زانی: کە خودا ئاگای لە ئاشکراو نهێنیو شاراوە تریش هەیە. ئارام دەگرێو هەست بە تەنیایو بێ کەسی ناکا. لەناو ئەو کۆمەڵگایە سەر ڕەقو نەفامو بێ ویژدانەدا. ئەو کۆمەڵگایەی دژی عەقیدەو بیروباوەڕی بوون...

شایانی باسە دوعاو پاڕانەوە لە خودا: کەبە زمان ئەنجام دەدرێ بۆ ئەوەیە: زیاتر دڵو دەروون تەرکیز بخەنە سەر ذیکرو یادەکەو پتر ئیخلاصی تێدا بێو هەستەکان تەرخان بکرێن بۆ زیکرو یادەکە، فیکرو هۆش بەملاو ئەولادا نەڕوا،

وەکو لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَاذْكُر رَّبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ (الأعراف/٢٠٥).

ئەمجار ئامـاژە بـە تـاكو تـەنهای خـوداو صـیفەتەکانی کـەماڵی دەکـاو دەفەرمووێ: ﴿ اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى﴾ پەرسـتراوی بەحـەقو تـاكو تەنیا (الله) یە، هیچ خودای تر نین جگە لەئەو، هەر ئـەو پـەروەردگارەو شـەریكو هاوەڵی نیە، جوانترین ناوو جوانترین صیفاتی هەیە: کەنیـشانەی کـەماڵو جـەماڵی زاتی بێ وێنەیین، زاتی پاکی نەوەدو نۆ ناوی لە قورئانو حەدیث دا هاتوە، لە ڕاڤە کردنی ئایەتی ژمارە (١١٠) ی سورەتی (الأعـراف) دا بـە دورو درێـژی ئـەم باسـەمان ڕونكردۆتەوە. پێویست ناکا جارێکی تر لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

تا ئێرە ئایەتەکان وەسفی پەروەردگار دەکەن بـەوە: کـە بەدیهێنـەری زەوی و ئاسمانەکانە، خاوەن نیعمـەتو بەخششە بـە سـەر بەندەکانیـدا، کۆنترۆڵی عەرشـی کـردوەو بەویـستی خـۆی بونـەوەر هەڵدەسـوڕێنێ، هـەموو بونـەوەر بەملکایـەتیو بـەڕێوە بـردنو گۆڕانکاری تێیـدا هـی ئـەوە، زانـاو ئاگـادارە بەسـەر هـەموو شـتێکی ئاشکراو نهێنیو شاراوە تریش دا، خودایەکی بێ وێنەو بێ شـەریکە، هەرچـی نـاوی جوانو صیفاتی بەرز هەیـە هـی ئـەوە.جـا خودایـەك ئـەوە توانـاو دەسـەڵاتو نـاوو صیفاتی بێ، ئایا دەگونجێ خەیاڵی ئەوە بکـرێ: کـە قورئـان لـە لایـەن غـەیری ئـەو خودایەوە هاتبێ. ئایا عەقڵ دەیگرێ بتێکی داتاشراو لە بەرد یان لە دار یان لەهـەر مەعدەنێکی تر بکرێتە هاوەڵی خوداو بپەرسترێ.؟؟

بۆیە حەزرەتی عومەر ﷺ لە سەرەتای ئیسلام بوونیدا هێشتا ئیمانی نـەهێنا بوو، کە ئەم ئایەتەی سورەتی (طـه)ی گوێ لێ بـوو داچڵەکیو سـەر لەبـەر گیـانی وەلەرزە هاتو بیروباوەڕی گۆڕاو وازی لە بت پەرستی هێناو موسوڵمان بوو!

★ موسـوڵمان بـوونی ئیمـامی عومـەر ﷺ: عومـەری کـوڕی خـەتتـاب پـێش موسـوڵمان بـوونی زۆری ڕق لـە موسـوڵمانان بـوو، بـە تایبـەتی بـە خـوێنی سـەری پێغەمبـەر ﷺ تینـوو بـوو، ڕۆژێـك شمـشێری هـەڵگرتو خـۆی ئامـادە کـرد لـەماڵی خـۆی دەر کـەوت دەیەویـست زیـان بـە پێغەمبـەر ﷺ بگەیـەنێ، لـە ڕێگـا نوعـەیمی کوڕی عەبدوڵڵای توش بوو، وتی: ئەی عومەر! بۆ کوێ دەچی ؟ وتی: دەمەوێ بـچم ئەو شێتە واتە(محمد) لەناو بەرم، چونکە دوو بەرەکی لەناو قـوڕەیش دا ناوەتـەوە، ڕەخنە لەئایینی قوڕەیش دەگرێ، جوێن بە بتـەکانیان دەدا، بڕیـارم داوە بـچم بـەم شمشێرە بیکوژم !

نوعەیم پێی گوت: سوێند بەخودا تێك چووی و لە سەر خـۆت نـەماوی ئـەی عومەر! پێت وایە: کە تۆ موحەممەدت کوشت بەنو عەبدو مەناف لێت دەگەڕێن بە سـەر زەویـدا بـڕۆی‌و ناتکوژنـەوە؟! کـوڕە مـاڵ وێـران ئـەوە تـۆ دەڵێـی چی‌و چی دەکەیت ؟! ئەتۆ بڕۆ ئاگاداری ماڵ‌و منداڵ‌و خزم وکەس وکاری خۆت بـەو مەهێڵە ئەوان ڕێگایان لێ گوم بێ، وتی: بۆ ماڵ‌و منداڵی خـۆم چیانە؟ وتـی: کـوڕە زاواکـەت مێـردی خوشـکەکەت؟ کـوڕی مامـت: سـەعدی کـوڕی زەیـدو فـاطمـەی خوشـکت موسوڵمان بوون: ئەتۆ ئاگات لـە چیـیە؟ دە ئەگـەر ئـازای بـڕۆ ئـەوان تـەمبێ بکە، حەقی موحەممەدت نەبێ. ئیتر عومـەر ﷺ بـەتوڕەیی گەڕایـەوەو ڕوی کـردە مـاڵی زاواکەی‌و خوشکەکەی، لەو کاتەدا خەبابی کوڕی ئەرەت ﷺ لایـان بـوو بەشـێکی لـە قورئـان بـە دەسـتەوە بـوو سـەرەتای سـورەتی (طاهـا)ی تێدانوسـرا بـۆوە پـێ‌ی دەخوێنـدنـەوە. کـاتێ هەسـتی عومـەر یـان کـرد ترسـان، خـەباب خـۆی خـستە نـاو کەژاوە کۆنێکەوە، فاطیمەش پارچە قورئانەکەی خستە ژێر ڕانیەوە، بـەڵام عومـەر پێش ئەوەی هەستی پێ بکەن گوێی لە قورئان خوێنـدنی خـەباب بـوو بۆیـان، ئـیتر کە چوە ژور وتی: ئەوە چی بوو دەتان خوێندەوە؟؟ گوێم لێ بوو، پێم بڵێن خۆتانم لێ هەڵە مەکەن.

زاواکەی‌و فاتیمەی خوشکی ﵂ وتیان: کوا هیچت نەبیستوە. وتی: بەڵێ گوێم لێ بوو، بیستوشمە ئێوە هەر دوکتان ئیمانتان هێناوەو شوێن موحەممەد کەوتوون، ئیتر پەلاماری سەعیدی زاوای دا، فاتیمەی خوشکی هەڵسا نەهێڵێ لە مێردەکەی بدا دوو سێ پلارو مستەکۆڵەی لەویشدا خوێنی لێ هات ، ئیتر سەعیدو فاتیمە ﵂ ڕقیان هەستاو وتیان: بەڵێ ئیمانمان هێناوەو چیت لە دەست دێ منەتت نەبێ.

کاتێ عومەر ﵁ ئەوەی بینی خوشکی خوێنی پێدا دەهاتە خوارێ پەشیمان بووە وە بە خوشکی گوت ئەو پارچە کتێبەم بدەنێ: کە گوێم لێ بوو دەتانخوێندەوە بزانم موحەممەد ﷺ ئەمە چییە هێناویەتی؟ خوشکەکەی وتی: بە خودا ترسمان هەیە لێت ناوێرین پیشانتی بدەین وتی: نە خەیر ترستان نەبێ، سوێندی بۆخواردن‌و پەیمانی پێدان: کە پیشانی بدەن دەیخوێنێتەوەو دوایی دەیان داتەوەوە، کەوای پێ گوتن خۆشکەکەی هومێدی ئەوەی لێ کرد، کە موسوڵمان ببێ، وتی: برای خۆشەویستم ئەتۆ بەهۆی بتپەرستیەوە پیسی، ئەمەش قورئانە کەسێك پاك نەبێ، نابێ دەستی بکاتێ.

ئیتر عومەر چوو خۆی شتو هاتەوە، فاطیمە قورئانەکەی پێدا سورەتی (طه)ی تێدا بوو ئیتر کەسەرەتای سورەتەکەی خوێندەوە، پێی سەرسام بوو وتی: ئای لەم کەلامە جوان و پڕمەعناو سەرنج ڕاکێشە؟! بە ڕاستی کەلامێکی عەجایەبە: کە خەباب ﵁ گوێی لەم قسەیەی عومەر بوو هاتە پێشەوە و پێی گوت: ئەی عومەر! هومێدەوارم خوای گەورە دڵی تۆی نەرم کردبێ‌و دوعای پێغەمبەرت ﷺ بۆ گیرا بوو بێ، گوێم لێ بوو تەشریفی دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (اللهم ايد الأسخم بابی الحکم بن هشام، او بعمر بن خطاب) ئای خەنێ لە خۆت ئەی عومەر!

عومەر ﵁ وتی: ئەی خەباب! پێم بڵێ موحەممەد لەکوێیە دەچمە خزمەتی‌و ئیمان دەهێنم. ئیتر چووە خزمەت پێغەمبەرو ﷺ ئیمانی هێنا!!

## چیرۆکی حەزرەتی موسا عليه السلام

### ئاخاوتنی موسا عليه السلام لەگەڵ خوداو نیگا بۆ کردنی

﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَـٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾

لە پاش ڕاگەیاندنی ئەم پێشەکییە سەرنج ڕاکێش و داچڵەکێنەرە، پاش ئەوەی پەروەردگار گەورەیی قورئانی باس کرد، حاڵ و وەزعی پێغەمبەری ﷺ دەربارەی ڕاگەیاندنی پەیامەکەی و ئەرکی سەر شانی ڕوون کردەوە، سەرگورشتەیەك دێنێتە کایەوە بۆئەوەی دڵی پێغەمبەر ﷺ دامەزرێ و پتر لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامەکەی سوور بێ، چیرۆکی حەزرەتی موسا عليه السلام بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر دڵنیا بێ لە کۆمەکی و چاودێری خودا

بۆ ئەو کەسانەی هەلگری پەیامی حەقن، هەموو کاتێ کە لەقورئان دا چیرۆکی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران دەگێڕێتەوە مەبەستێکی سەرەکی لە چیرۆکەکە بۆ زیاتر دڵ دامەزراندنی پێغەمبەرە ﷺ لە سەر پەیامەکەی.

وەکو لە شوێنێکی تردا ئاماژە بە ئەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ﴾(هود/١٢٠)

لێرەدا بە چیرۆکی حەزرەتی موسا ﷺ دەست پێ دەکا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ چاو لە ئەو بکا لەبارەی هەلگرتنی ئەرك و قورسایی پێغەمبەرایەتی و ڕاگەیاندنی پەیامەکەی خۆگری و پشوو درێژبێ لە سەر ئەزیەتدان و کوێرەوەری و ڕووبەڕوو بوونەوەی تەنگ و چەڵەمەو بەرەنگاری کردنی کۆمەڵانی کوفرو بتپەرستەکان. چونکە حەزرەتی موسا ﷺ نمونەی خۆگری و پشوو درێژی بووە لە بەرامبەر ئەزیەتدان و سەرپێچیکردنی گەلەکەیەوە.

لەقورئاندا چیرۆك و بەسەرهاتی حەزرەتی موسا ﷺ لە سەر گورشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەرەکانی تر زیاترو فراوانتر هاتووە. بەچەند زنجیرەو دیمەنێك لەچەندسورەتێکدا پیشان دراوە، لە هەموو سورەتێکدا بە شێوەیەك زنجیرەکە هێنراوە: کە گونجاو بێ لەگەڵ ناوەرۆك و مەوزوعی سورەتەکە.

هەتا ئێستا چەند زنجیرەیەك لەم چیرۆکە گرنگ و پیرۆزە لەسورەتی(البقرة، سورة المائدة، سورة الأعراف، سورة یونس، سورة الإسراء، سورة الکهف) دا ڕانوێنراوە، ئەمە جگە لەوەی لە چەند سورەتێکی تردا ئاماژەی بۆ کراوە.

ئەوەی لەسورەتی (المائدة) و (الکهف) دا هاتووە هەر یەکەی زنجیرەیەکی تایبەتین لەو دوو سورەتەدا هەن و لەهیچ سورەتی تردا دووبارە نەکراونەتەوە، بەلام ئەوەی لەسورەتی (البقرة) و (الأعراف) و (یونس) و (طه) دا هاتووە هەریەکەی چەند جارێك دووبارە بوونەوەیان پێوە دیارە، بەلام لە هەموو

سـورەتەکاندا زنجیرەکـان جوداوازیـان هەیـەو هـەر زنجیرەیـەك لەگـەڵ نـاوەڕۆكو مەبەسـتەکانی سـورەتەکەدا گونجـاوەو بـۆ مەبەسـتێکی تایبـەتی هێنـراونو وەکـوو دووبارەوەبوو حسێب ناکرێن.

سەرەتای سورەتەکە بەباسی بەبەزەیی‌و چاودێری خودا بۆ هەڵگرانی پەیامی حـەق دەسـت پـێ دەکـا، ئـەمجارە دوابـەدوای ئـەوە، سەرگوزشـتەی حـەزرەتی موسـا دێنێ، چەند بارو رووبەکی چیرۆکەکە نیـشان دەدا ، هـەمووی چـاودێری و رەحـم و بەزەیی خودا رون دەکاتەوە، ئاوێنەیەکی باڵانومایە بۆ ژیانی حـەزرەتی موسـا هـەر لە رۆژی لە دایکبوونیەوە هەتا کۆتایی ژیانی!

لە یەکەمجارەوە بە شێوەیەکی سەرنج راکێش سۆزو ئـارەزۆ دەخاتـە نـاو دڵو دەروونەوە بۆ ئەوەی بەتاسوخەوە گوێ لە چیرۆکەکە بگرین و دڵمانی بۆ بکەینەوە و کوێـچکەمان بـۆ دەنـگو باسـەکە هەڵخـەین ، بەرسـتەیەکی کاریگـەر دەسـت بـە گێڕانـەوەی چـیرۆکەکە دەکـا و دەفـەرمووێ: ﴿وَهَـلْ أَتَـاكَ حَـدِيثُ مُوسَـى﴾ ئـەی موحەممـەد ئایـا تـۆ سەرگوزشـتەو بەسـەرهاتی موسـات بـۆ هـاتووە؟ دەزانـی چـی بەسەرهات بە دەست فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە؟ دەزانی سەرەتا چۆن نیگامـان بۆ کردو ئاخاوتنمان لەگەڵ ئەنجام دا؟ وشـەی (هل)کـە بـۆ ئیـستفهامە چەسـپاندن دەگەیـەنێ ، هەواڵەکـە لـە دڵـی موخـاطـەبـدا جـێگیر دەکـا، ئـەم شـێوەیە واتـە (ئیستفهامی تەقریری) ئوسولوبێکی کاریگەرە بۆ ئاڕاستەکردنی کەلامی عەرەبی بۆ ناو زەینی بیسەر.

راڤەکـەرانی قورئـان دەفـەرموون: حـەزرەتی موسـا مۆڵـەتی لـە حـەزرەتی شوعەیب خواست بـۆ ئـەوەی بگەڕێتـەوە بـۆلای دایکی، ئـەویش روخـصەتی پێـدا و بەرەو میصر لەگەڵ خێزانـیدا کەوتنـە رێ، لـە گەڕانـەوەیان دا بـۆ میـصر شـەوێك رێگایان لێ تێکچوو شەوێکی زستان و سەرما وتاریك و ئەنگوستە چاو رێگـەیان لـێ هەڵەبوو ، حەزرەتی موسا ویستی ئاگر بکاتەوە و ئاگرەکەی بۆ هـەڵ نـەبوو، چـەند

جارێـك هـەوڵی دا بـەڵام بێهودە بـوو، لەوکاتـەدا ئـاگرێكی دووری دی لـەلای چەپی رێگاكەیانەوە ، گومانی ئەوەی برد ئاگری شوان و كاروانچییان بێ.

وا پـێ دەچـێ پیـاوێکی تریـان لەگـەڵ بـوو بـێ، چـونكە حـەزرەتی موسا كـە: ئاگرەكەی بینی بە خێزانەكەی فەرموو ﴿امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَاراً﴾ ئـەم ڕانـاوە كۆیـە ئاماژە بەوە دەكا لەگـەڵ حـەزرەتی موسـا و خێزانەكـەیدا پیـاوی تریـشیان لەگـەڵ بـووە جـاوەكوو بـاوەو بـاوبووە گوندنـشین و مەرزنـشینەكان لەسـەر بـەرزایی و تەپۆلكـەكان ئاگردەكەنـەوە بـۆ ئـەوەی رێبـوارانی سـارا ئاگرەكـە ببیـنن رێگـای پـێ بدۆزنەوە، ئەگەر برسیو تینوویـان بـێ رویـان تێبكـەن و میوانـدارییان بكـەن، یـان شارەزای رێگایان بكەن.

بێگومان حەزرەتی موسا لەو سارایەدا ئاگرێكی دووری بینـی، دڵـی پـێ خـۆش بوو، هیـوای خێـرو خۆشـی لێ كـرد، پـێی وابـوو لـەو تـەنگ و چـەڵەمەیە رزگاریـان دەبێ، دەفەرمووێ:

ئایا تۆ هەواڵو سەرگوزشتەی موسات بۆ هاتووە، واتە بە تەئكید تۆ چیرۆكی موسات بیستووەو بە نیگا بـۆت هـاتووە: ﴿إِذْ رَأَى نَـاراً﴾ كاتێـك لـە دەشـتێكی كـاكی بەكاكیدا، لە شەوێكی سارد و تاریكی زستاندا، ئاگرێكی بینی و دڵی پێ خۆش كرد.

﴿فَقَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا﴾ بە خێزانەكەی گوت: ئێـوە لێـرە بمێننـەوە دانیـشن بـە شوێنی من دا مەیەن ﴿إِنِّي آنَسْتُ نَاراً﴾ بێگومـان مـن ئـاگرێكم بینـی دەچـم بـۆلای ئەو ئاگرە بزانم چیەو چۆنە ﴿لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَـا بِقَـبَسٍ﴾ بـەڵكوو لـەو ئـاگرە سـەرە بزوتێك سەرە چلورە ئاگرێكتان بۆ بێنم خۆتانی پێ گەرم بكەنەوە، یان بـۆ ئـەوەی بیكەینە رووناكی بۆخۆمانو رێگای پێ دەركەین ﴿أَوْ أَجِـدُ عَلَـى النَّـارِ هُـدًى﴾ یـان بەڵكو لەلای ئاگرەكە كەسانێكم دەست بكەوێ رێگامان پیشان بـدا، وەكو ئاماژەمـان پێ كرد دانیشتوانی لادێو مەرز نشینو كۆچەریەكان دابو نەریتیان وابـوو لەسـەر

تەپۆلکەو شوێنی بەرزدا ئاگریان دەکردەوە، بۆ ئەوەی ڕێبوارانی دەشتو بیابانەکان ڕێگای پێ دەربکەن، یان بچن بۆلای ئاگرەکەو میوان دارییان بکرێ.

بەڵێ حەزرەتی موسا ﷺ بەرێ کەوت بۆ ئەوە بچێ سەرە بزوتێك بێنێ، یان شارەزا بکرێ بۆ ڕێگاکە، وەڵێ کە لەئاگرەکە نزیك بووەوە موفاجەئەیەکی سەیری توش بوو، ڕووداوێکی بێنی تاقانە ڕووداو بوو لە ژیانی موسادا ﷺ ، ئاگری بینی بەڵام چ ئاگر؟ ئاگرێك: کەگەرم کەرەوەی گیان بوو نەك هی جەستە، ئاگرێك شارەزای کەر نەك بۆ ڕێگای عادەتی بەڵکوو شارەزایی کەر بۆ کۆچی گەورە، ئاگرێك بوو بوو بەهۆی بەختەوەری دونیاو قیامەتی حەزرەتی موسا ﷺ خاوو خێزانیو گەلو نەتەوەی. ئاگرێك بووە وەرچەرخانی مێژووی نەتەوەی ئیسرائیلی لە خۆ گرتبوو، ﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَى﴾ کاتێك هاتە لای ئاگرەکە بانگی لێ کرا: ئەی موسا! گوێ بگرە، ﴿إِنِّي أَنَا رَبُّكَ﴾ من: کە بانگت لێ دەکەم پەروەردگاری تۆم، ئەو شوێنەی تۆ لێی وەستاوی شوێنێکی پیرۆزە، پاكو خاوێنەو بەرەکەتی تێخراوە، کەوابێ ﴿فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ﴾ لەبەر ڕێزگرتنی شوێنەکە پێڵاوەکانت داکەنە، چونکە پێخواسی نیشانەی خۆ بەکەم زانینو بەندایەتی کردنە بۆ خودا ڕێزنانە لەو کەسەی قسەت لەگەڵ دەکا، نیشانەی ئەدەبو ڕەوشتی بەرزە بەرامبەر خودای بەدیهێنەر! ﴿إِنَّكَ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ بێگومان ئێستا تۆ وای لەشیوو دۆڵێکی پاكو خاوێن دا پێی دەگوترێ (طوی) لەلای سینادایە، وەکو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿نُودِيَ مِن شَاطِئِ الْوَادِي الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَن يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ (القصص/٣٠) بەڵێ حەزرەتی موسا ﷺ گەیشتە لای ئاگرەکەو تەماشای کرد ئاگرێکی سپی یە، نورێکی سپی یە ئەدرەوشێتەوەو ئاگرێکە لەدرەختێکی سەوزەوە دەردەچێ!

بە ڕاستی دڵ وەلەرزە دێو موچورکە بەجەستەدا دێ ، گیانی ئادەمیزاد دەهەژێ ، تەنها بە تەصەورکردنی ئەو دیمەنە، موسایەکی تاقە کەس لەو

چۆڵەوانیو دەشتە کاکی بەکاکی یەدا، لە شەوێکی زستانی سارد داو بە تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاو، هەوڵ و تەقەلای سەلکە بزوتێکیەتی دەیەوێ دەستە چیلە ئاگرێکی دەست بکەوێ بیهێنێ بۆلای خێزانی سەرما بردووی، لە پڕێکا نیدای غەیبی لێ بکرێ، ئادەمیزادێکی بێ هێزو برسیو سەرما بردوو بەو شێوە ئاخاوتنی لەگەڵدا بکرێ، یەکسەر پەیام لەکەسێکەوە وەربگرێ لەوانەیە ئاسمانەکانو زەویو بوونەوەر هەمووی لەعەیبەتانو لەئاستی شکۆمەندیو گەورەیی ئەو کەسە بتوێنەوە، هەڵبەتە ئەو دیمەنە هێندە گەورەو سامناکە، هێندە بەرزو شکۆمەندە، زمانو پێنوس لەئاستی ڕوونکردنەوەی کۆڵو کۆڵەوارن! خەیاڵیش بەڕاشکاوی بەو فەزا بەر فراوانەدا هەوا پەرواز نابێ ، دیمەنێکە هەر خودادەزانێ چۆنەو چۆن بووە. ئەمە ڕەحمو لوتفی خودایە ، ئەگینا ئادەمیزادێکی بێ هێزو خواز لەکوێو ئەو ڕێز لێنانە لەکوێ؟ ئەم ساتە وەختانە ساتو کاتێکن ئادەمیزاد تێیدا بەرز دەکرێتەوە، دە گاتە ئەو ڕادەیەی ئاخاوتن لەگەڵ پەروەردگاری بکا! بە ڕاستی بەرزی یەکە بەرزی لەوە بەرز تر نیە کە: ئادەمیزاد ئەو توانایەی پێ ببەخشرێ لەخوداوە ڕاستەو خۆ پەیام وەربگرێ، بەسە بۆ ئادەمیزاد: کەئامادە باشی ئەم پەیوەندیەی بەشێوەیەك لە شێوەکان تێدابێ! ئەم پەیوەندی کردنە چۆن ئەنجام درا، ئەم کیانە بەشەریە چۆن ئەونیدایەی بیستو چۆن وەریگرت؟ نازانین چۆن بووە، عەقڵی ئادەمیزاد ناگاتە ئەو ئاستە ئەوە بزانێ، ئەو پەڕی توانای عەقڵی ئادەمیزاد ئەوەیە: لە بەرامبەر ئەو ڕووداوانەدا دۆش دابمێنێو دەستە وەسان ببێو ئیمان بێنێو مل کەچ بێ!!

حەزرەتی موسا ﷺ بانگی لێ کرا، بەجۆرێك نەیتوانی تەحدیدی مەصدەری بانگ لێ کردنەکە بزانێ، نەیتوانی شێوەی بانگکەرو چۆنیەتی بزانێ. بانگی لێکرا بە شێوەیەك لە شێوەکانی بانگ کردن، ئەویش بەشێوەیەکی تایبەتی ئەو پەیامەی وەرگرت، بەڵام ئێمە نازانین چۆن بووە، ئەوە شتێکە لە ئەمری پەروەردگار،

بڕوامـان بـەڕودانی هەیـەو پرسـیار لەچـۆنیەتیەکەی ناکـەین، چـونکە زانینـی چۆنیەتیەکەی لەژوورتوانای ئادەمیزادەو ناتوانێ تەصەوری بکا.

﴿وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى﴾ ئـەمن ئـەو خودایـەم تـۆم هەڵبـژادووە بـۆ پێغەمبەرێتی ئـەرکی ڕابـەری‌و پێشەوایەتیت خراوەتـە سـەر شان. فـەرمانی ئێمـە ببیسەو وەری بگرە، ئەو پەیامەی بۆت دێ، لێی حاڵی ببـەو کاری پـێ بکـە، وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالَاتِي وَبِكَلَامِي﴾ (الأعراف/١٤٤) واتە: من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر هەموو ئـادەمیزادانی سـەردەمی خۆت دا...

ئەمجارە ناوەڕۆکی نیگاکەی پێ ڕادەگەیەنێ‌و دەفەرمووێ: ﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ بێگومان ئەو کەسەی بانگت دەکا پـەروەردگارە، خـودای خۆتـە، ئەمـە دووبـارە بوونـەوەو تەئکیـدی ڕسـتەی ﴿إِنِّي أَنَا رَبُّكَ﴾ەی پێشەوەیە.

ئەمە ئەرك‌و واجبێکە پێویستە بیزانـی‌و ددانـی پیابنێی، بـەدڵ بـڕوات پێـی هەبێ‌و بەزمان بیدرکێنێ: کـەهیچ خـودا نـین جگـە لـەزاتی (الله) خودایـەکی تـاك‌و تەنیایـەو کـەس هـاوەڵ‌و شـەریکی نیـە. تـەنها بەندایـەتی بـۆ مـن بکـە مـن بـە خودایەکی تاك‌و تەنیا بناسە، چونکە هەر من خودام‌و هەر مـن شیاوی پەرسـتش‌و بەندایەتی بۆ کردنم‌و کەسی تر شیاوی ئەوە نیە. پارێزگاری نوێژەکانت بکە، چۆن فەرمانت پـێ دەکـرێ ئـاوا بـەرپێك‌و پێکـی ئـەنجامیان بـدە، ئـەرکان‌و مەرجـەکانیان بەجێ بێنـە بۆئـەوەی لەنوێـژەکانتایادی مـن بکەیەوەبـە دڵسۆزی لێم بپاڕێیـەوەو خالیصانە من بپەرستی‌بە لێبڕاوی بەندایەتیم بکەی. بەتایبەتی باسی نوێژی کرد، چونکە نوێژ گەورەترین تاعەت‌و خـودا پەرسـتی یـە. ئەمـە ئەگـەر لامـی (لـذکری) لامی تەعلیل‌و بایبس بێ. ئەگەر لامی تەوقیت بێ ئەو کاتە ماناکەی بەم جۆرەیـە، نوێژەکانت بەجێ بهێنە لەکاتی وەبیر هاتنەوەو یاد کردنی من. ئەمەش بـەگوێرەی

ئەو فەرموودەیەی ئیمام ئەحمەد لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ لەپێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە دەفەرمووێ: (اذا رقد احدکم عن الصلاة او غفل عنها فليصلها اذا ذكرها، فان الله تعالى) قال: ﴿وَأَقِمْ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾ هەر کاتێ یەکێ لەئێوە خەوی لێکەوتو نوێژی نەکرد بوو یان لەنوێژەکەی بێ ئاگابوو، هەر کاتێ بیری هاتەوە بانوێژەکەی بکا، چونکە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَأَقِمْ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾. دووبارە لەئەنەسەوە لەصەحیحەین دا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من نام عن صلاة او نسيها، فكفارتها ان يصليها اذا ذكرها، لا كفارة لها الا ذلك).

تیرمیزیو ئیبنوماجە لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکەن: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من نسي عن صلاة فليصلها اذا ذكرها، فان الله قال: واقم الصلاة لذكرى).

فەرموودەکە دوو حاڵەتی دیاری کردوە: نوستنو لەبیر چونەوە. چونکە حەق وایە موسوڵمان کەمتەرخەمی نەکا لەئەنجامدانی نوێژ، جا ئەگەر بەئەنقەست نوێژەکەی نەکرد ئەوە گێڕانەوەو ئەنجامدانی بە قەزا کارێکی پێویست ترە، دەبێ چی زووە نوێژە فەوتاوەکەی بگێڕێتەوە. چونکە چواندنی نوێژ جگە لە گێڕانەوەی هیچ ئەرکێکی تری تێدا نیە!!

ئەمجارە باسی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەکا، سەرەنجامی مەخلوقات دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى﴾ بێگومان قیامەت هەر دێو گومان لەهاتنیدا نیە، ڕووداوێکە هەر دەبێ ڕوو بداو نەهاتنی محاڵە. ئەمن دەمەوێ لەخۆشمی بشارمەوە، جاچۆن کەسانی دیکە پێی دەزانن؟ ئەم جۆرە ئاخاوتنە لە زمانی عەرەبیدا باوە. ئەگەر یەکێك زێدەڕەوی بکا لەنهێنی کارێکی دا دەڵێ: (كتمت سرى من نفسي) ئەمن نهێنیەکەم لەخۆشم شاردەوە مەبەستی ئەوەیە: کەنهێنیەکەی بەوپەڕی تواناوە شاردۆتەوە. سوودی نهێنی کردنی هاتنی قیامەتو دیاری نەکردنی کاتەکەی بۆ ترساندنو هەڕەشەکردنە

لەئادەمیزاد، بۆئەوەی هەموو کاتێ لە ترسو ئامادە باشیدا بن بۆ خودا پەرستی، هەر بۆ یەشە خوداکاتێ مردنی هەموو ئادەمیزادێکی لە خۆیان نهێنی کردووە. چونکە ئینسان ئەگەر بیزانیایە کەی دەمرێ، هەتا پێش مردنی سەرگەرمی گوناهوبێ ئەمری خودا دەبوو، ئەمجارە بە ماوەیەك پێش مردنی تەوبەی دەکردو دەستی دەکرد بەکردەوەی باش، ئەمەش دەبوو بەهۆی هەڵنانی ئادەمیزادەکان بۆ تاوانکاری، وەلێ پەروەردگار زانینی کاتێ مردنی لە ئادەمیزادەکان شاردۆتەوە. بۆ ئەوەی هەموو کاتێ لە حەزەرو ئامادەباشیدا بن بۆ خودا پەرستیو هەموو کات ترسی مەرگیان هەبێ، وازلەگوناهو سەرپێچی فەرمانی خودا بهێننو تۆ بە بکەن بە ئەوپەڕی لێبڕانو لێبوردووی‌و دڵسۆزیی خەریکی خوداپەرستی بنو تۆبە دوانەخەنو هەموو کات چاوەڕوانی هاتنی مردن بن.

وشەی (أكاد) زیادەیەو بۆ جوانی مانا هێنراوە، واتە: ﴿إِنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾ بێ گومان قیامەت ڕادەبێ ، کاتی هاتنەکەیم شاردۆتەوە. هاتنەکەی هیچ شك‌و گومانی تێدا نیە: ﴿لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى﴾ بۆئەوەی هەموو کەسێك پاداشتی کردەوەکانی خۆی بدرێتەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الطور/١٦) یان دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ، وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ (الزلزلة/٧-٨).

ئەمجار پەروەردگار حەزرەتی موسا عليه السلام دەترسێنێ لەکەمتەرخەمی کردن لەقیامەت‌و خۆ بۆ ئامادەنەکردنی. دەفەرموێ: ﴿فَلا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَنْ لا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَى﴾ باتۆ بێ ئاگانەکا لەهاتنی قیامەت‌و لات نەدا لەبڕوا بوون بەقیامەت‌و ڕووداوەکانی کەسێك کە: بڕوای بەهاتنی نیەو چاوەڕوانی پاداشت‌و سزای ئەو ڕۆژە نیە، لە سزاو عیقابی خوای گەورە ناترسێ‌و بێ پەروا سەرپێچی فەرمانی خوا دەکاو گوێ بە نەهیەکانی نادا، شوێن هەواو هەوەسی خۆی دەکەوێ! ئەتۆ ئەگەر وابکەی بەهیلاك دەچی‌و خەسارەتمەند دەبێ، خیتابەکە بە تەنیا بۆ

حەزرەتی موسا‌ﷺ نیە بەڵکوو هەموو کەس دەگرێتەوە، خیتابەکە ئاڕاستەی حەزرەتی موسا‌ﷺ کراوە وەڵێ ئادەمیزادانی تر مەبەستن.

ئەمە لە نموونەی ئەو پەندە کوردیەیە کە دەڵێ: (بوکێ لەگەڵ تۆمە خەسوو گوێت لێ بێ) بەکورتی: ئێوە ئەی ئادەمیزادینە! شوێن ڕێبازو بیروباوەڕی ئەوانە مەکەون:کە: بڕوایان بەهاتنی قیامەت نیە، هەردەم خەریکی ڕابواردنو سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگارن! هەرکەسێك شوێن بەرنامەی ئەوان بکەوێ خەسارەتمەندو ماڵوێرانە.

## تێبینی:

بەجێهێنانی نوێژ لەکاتی بۆدیاری کراودا پێویستەو دەبێ ئەنجام بدرێ. ئەگەر لەکاتی خۆیدا بەهۆی خەوەوە یان هەر بیانویەکی تر ئەنجامی نەدا دەبێ بیگێڕێتەوە. ئەگەر کەسێك بەئەنقەست نوێژەکەی نەکردئەوە جەماوەری زانایان کۆن لەسەر ئەوە کە پێویستە قەزای بکاتەوە، هەرچەندە بە دواخستنی نوێژەکە گوناهبار بووبێ. کەسێك بەهۆی خەو یان لەبیرچوونەوە نوێژەکەی دواکەوت تاوانبار نابێ، وەڵێ ئەگەر بەئەنقەست دوای خست تاوانبار دەبێ.

بەڵگەی جەماوەری زانایان ئەوەیە: دەڵێن: پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ﴾ (البقرة/٤٣) ئیتر دەست نیشانی ئەوەی نەکردووە کردنی نوێژەکە لەکاتی خۆیدا بێ یان دوای تێپەڕبوونی کاتەکەی. خۆ ئاشکراشە وشەی (اقیموا) فەرمانەو وجوب دەگەیەنێ. ئەوەش چەسپاوە کەسێك خەوی لێ کەوت یان لەبیری چوو نوێژەکەی لە کاتی خۆیدا ئەنجام نەدا دەبێ دوایی بیگێڕێتەوە، هەرچەندە بە دواخستنەکەشی گوناهبار نەبووە، دەی کەسێك بەئەنقەست نوێژەکەی لەکاتی خۆی ئەنجام نەداو دوای بخا باشتر دەبێ گەڕانەوەی لەسەر پێویست بێ. هەروەها خواردنی ڕۆژوێك بەئەنقەستو بەبێ عوزرو بیانوی شەرعی داخوازی ئەوەیە بگێڕێتەوە نوێژیش کەچوو دەبێ قەزا بکرێتەوە.

ئەگەر وارێکەوت کاتی نوێژێك هاتبوو کابرا خۆی ئامادە دەکرد بۆبەجێهێنانی لەو کاتەداومبیری هاتەوە کەنوێژێکی لەوە پێشی یازیاتری چواندوە، بەگوێرەی ڕێبازی مالیکیەکان دەبێ دەست بکا بە نوێژە چوواوەکە، بەمەرجێ نوێژە فەوتاوەکە پێنج یان کەم تر بن، تەنانەت ئەگەر گێڕانەوەی نوێژە چواوەکان ببێتە هۆی دواکەوتنی نوێژە حازرەکە لەکاتی خۆی هەردەبێ نوێژە ڕابردووەکە بگێڕێتەوە. بەلام ئەگەر نوێژە چواوەکان زیاد لە پێنج نوێژ بوون ئەوە دەبێ نوێژە حازرەکە ئەنجام بدا. مەزهەبی حەنەفیەکانیش هەروەهایە بەلام وەندە هەیە ئەوان دەڵێن تەرتیب بۆ گێڕانەوەی نوێژە چواوەکان پێویستە لەشەو ڕۆژەکەدا. بەمەرجێ ماوەکە بەشی نوێژە چواوەکانو نوێژە حازرەکەش بکا.

خۆ ئەگەر بەشی نەکرد دەبێ جارێ نوێژە حازرەکە بکا ئەمجا دەست بکا بەگێڕانەوەی فەوتاوەکان، ئەمجار ئەگەر نوێژە فەوتاوەکان لەنوێژی شەوو ڕۆژێك زیاتر بوون ئەوە تەرتیب لە گێڕانەوەکەیاندا واجب نیە..

شافعی دەفەرمووێ: وا باشە لەپێشەوە نوێژە فەوتاوەکە بگێڕێتەوە بەمەرجێ نوێژە حازرەکەشی نەفەوتێ، خۆ ئەگەر وای نەکردوو لەپێشەوە نوێژە حازرەکەی کرد، ئەوە چ قەیدی نیە نوێژەکەی دروستە.

ئیمامی (الأثرم) لەئەحمەدەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: تەرتیب پێویستە، تەنانەت ئەگەر نوێژە فەوتاوەکان هی شەست ساڵو زیاتریش بن. فەرموویەتی: دروست نیە کابرا نوێژی فەوتاوی لەسەر بێو لەیادی بێ نوێژی تر بکا.

بەلگەی ئەوانەی دەڵێن: دەبێ نوێژی فەوتاو پێش نوێژی حازر بخرێ ئەو فەرموودەیە لەصەحیحدا هاتووە و جابری کوڕی عەبدوللا ﷺ ڕیوایەتی دەکا: دەڵێ: ڕۆژی خەندەق پێغەمبەرﷺ نوێژی عەسری بۆ نەکرا تاخۆر ئاوابوو، کاتی نوێژی مەغریب هات، ئیتر پێغەمبەر ﷺ لەپێش دا نوێژی عەصری قەضاکردەوە ئەمجار نوێژی مەغریبی کرد، تیرمیزی لە ئیبنو مەسعودەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ:

لەڕۆژی خەندەقدا موشریکەکان پێغەمبەریان ﷺ مەشغوڵ کرد چوار نوێژی بۆ نەکران، شەو بە سەردا هاتو هەندێکی لێ ڕۆی، ئیتر فەرمانی بەبیلال کرد بانگی داو قامەتی کردوو نوێژی نیوەڕۆی کردوو پاشان قامەتی کردو نوێژی عەصری ئەنجامدا، پاشان قامەتی کرد نوێژی مەغریبی کردئەمجار قامەتی کردو نوێژی عیشای کرد.

زانایان ڕاجیاییان هەیە لەوەدا: کەکابرا بەبیری بێتەوە: کەنوێژێکی لەوە پێشی نەکردووە، نوێژە حازرەکەشی کاتێکی کەمی ماوە لەم مەوزوعەدا سێ ڕایان هەیە:

١- ئیمامی مالیكو (الليث)و (الزهرى) فەرموویانە دەبێ جارێ لەپێشدا نوێژە فەوتاوەکە بکا هەرچەندە سەربکێشێ بۆ نەمانی کاتی نوێژە حازرەکە.

٢- حەسەنی بەصریو شافیعیو زانایانی عیلمی حەدیث و(المحاسيبى) و ئیبنو وەهەب لەزانایانی مالیکی دەفەرموون: دەبێ جارێ نوێژە حازرەکەی بکا.

٣- ئەشهەب دەفەرمووێ: کابرا سەرپشکە بەئارەزووی خۆی کامیان پێش بخا کەیفی خۆیەتی. وەلێ ئەگەر کەسێك لەنوێژدا بوو وەبیری هاتەوە: کەنوێژێکی لەوە پێشی نەکردووە، ئەوەئەگەر لەدوا ئیمامەوە نوێژی دەکرد، ئەوەئەوانەی دەڵێن تەرتیب واجبەو ئەوانەی دەڵێن: واجب نیە، کۆکن لەسەر ئەوە کەلەگەڵ ئیمامدا درێژە بەنوێژەکەی بدا هەتا تەواو دەبێ، ئەمجا لەوەو دووا کێشەیان تێکەوتووە:

(أ) ئیمامی ئەحمەدو ئەبو حەنیفە دەفەرموون: دەبێ ئەونوێژە بکا کەبیری کەوتۆتەوە پاشان ئەو نوێژە بکا کە لەگەڵ ئیمام کردوویەتی، مەگەر لەنێوان نوێژە فەوتاوەکەو نوێژە حازرەکەی کە لەگەڵ ئیمامدا دەیکا زیاد لەپێنج نوێژ هەبێ.

(ب) ئیمام مالیك دەفەرموێ: کەسێك لەنوێژی حازردا نوێژی فەوتاوی وەبیر هاتەوە، بادوو ڕکات بکاو سلاو بداتەوە. جا ئەگەر ئەو کەسە پێش نوێژ خوێن بوو،

نوێژی خۆی مەئموومەکانی بەتاڵ دەبێتەوە،ئەگەر نوێژە حازرەکە چوار ڕکاتی بوو لەڕکاتی سێیەمدا بیری هاتەوە کە لەوەپێش نوێژێکی نەکردووە با ڕکاتی چوارەم تەواو بکا ئەمجار سلاو بداتەوە، نوێژەکەشی بۆ دەبێتە نوێژی سوونەت و بەتاڵ نابێتەوە.

## عەصای موسا ﷵ دەبێتە ئەژدیها

﴿ وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەگەڵ موسادا ﷵ ئاخاوتنی ئەنجام دا، ئیتر موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرایەتیەکەی باس دەکا بۆڕاستی پەیامەکەی. یەکەم نیشانەو موعجیزەشی گۆڕانی عەصاکەیەتی بە ئەژدیها، هەروا بەپێچەوانەوەشە..!

موعجیزەی گۆڕانی عەصا بەئەژدیها موعجیزەی یەکەمی حەزرەتی موسا ﷵ بووە. موعجیزەیەکی وابووە جگە لە خودا کەسی تر ئەوەی بۆپێك نایەو لەسەر دەستی پێغەمبەر نەبێ بەدی نایە.

واپێدەچێ حەزرەتی موسا ﷵ بەم بانگ لێ کردن و پەیام پێدانە، بەبیستنی ئەم نیدا ئاسمانییە بەرزو پیرۆزە خۆی لەبیر چوبێتەوە، ئەوەشی لەبیر چوبێتەوە

بۆچی چووە بۆئەو شوێنە، بەتەواوی هەستو هۆشو شعوری کردبنەوە بۆ بیستنو تێگەیشتنی ئەو بانگە ئاسمانییە.بەدوادا چوونی ئەو پەیامەی ئاراستەی دەکرێ، جا لەو کاتەدا: کەئەو نقوومی ئەم حاڵەتە تایبەتییە بووە: کەتێی کەوتووەو میثقالە زەرەیەك نییە لەکیانی ئەودا ئاوڕ لەشتی تر داتەوەو بیر لەشتی تر بکاتەوە ، پرسیارێکی ئاراستە دەکرێ پێویستی بەوەڵام نیە، پرسیارێکە بۆ بەئاگا هێنانەوەو وەسەر خۆ هاتنەوەیە، بۆسەرنج ڕاکێشانیەتی بۆلای عەصای دەستی، بۆ ئەوەی بەئاگادارییەوە موعجیزەی بوونی عەصا بەئەژدیها ببینێ، لەبەرئەوە بەو شێوە پرسیاری ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى﴾ ئەی موسا ئەوە چییە بەدەستی ڕاستەوەیە؟

بێگومان خودا ئاگاداری هەموو شتە، هیچ نیە لەئەو پەنهان بێ، کەواتە هەر پرسیارێ لەخوداوە ئاراستە بکرێ مەبەست زانا کردنی خودانیە بەو شتەی پرسیاری لێ کردووە، بەڵکوو مەبەستی تری تێدایەو بەگوێرەی شوێنو جێگا دەزانرێ. کەواتە لێرەدا پرسیارەکە بۆ بەئاگا هێنانەوەی حەزرەتی موسایەو بۆ سەرنج ڕاکێشانیەتی بۆ بینینی موعجیزەو دابڕانی لەو حاڵەی کەتێیدا نقووم بووە.

ئیتر بەو پرسیارە هاتەوە سەرخۆ، ترسو بیمی لەوە پێشی نەما، بەدەمی خۆی دانی بەوەدا نا: کەئەوەی لەدەستی ئەودایە عەصایە، دارێکی ڕەقو تەقو بێ گیانە، ئەمجار بەچاوی خۆی ببینێ بەفەرمانی خودا دەبێتە مارێکی زیندوو پاشان دەبێتەوە بەعەصاکەی پێشوو!

حەزرەتی موسا ﷺ لەوەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئاراستەی کرابوو: ﴿قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى﴾ وتی: ئەوە عەصاکەمە، لەکاتی ڕۆیشتن دا خۆمی سەردەدەم، گەڵای درەختەکانی پێ هەڵدەوەرێنم بۆ ئەوەی ئاژەڵەکانم بیخۆن. چەند مەبەستو بەرژەوەندی ترم

تێیدا هەیەو بۆ زۆر شتی تر بەکاری دەهێنم، تێشووی پێ هەڵدەگرم، مەتارە ئاوی پێ هەڵدەگرم، مارو دوو پشکی پێ دەکوژم درندەی پێ لەخۆم دوور دەخەمەوە. ئەمە هەموو ئەو زانیاریانە بوون: کەحەزرەتی موسا‌ﷺ دەربارەی عەصاکەی دەیزانی، بەعەمەلی گۆچانەکەی بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکار هێنابوو، چوونکە دە ساڵ شوانی بۆ حەزرەتی شوعەیب ﷺ کردبوو، دەشڵێن لەکاتی گەڕانەوەشیدا جەڵەبێك مەڕو بزنی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوەو بەتەما بوو بیانباتەوە بەخێویان بکا.

بەڵام ئەوەتا قودرەت و ویستی خودا لەو عەصا دارەی بەدەستی موسا ﷺ وەیە شتێکی لێ پەیدا دەکا: کەهەر بەخەیاڵی موسا ﷺ دا گوزەری نەکردبوو، خاریقولعادەیەکی لێ پەیدادەبێ دەبێتە ڕێخۆشکەرەو سەرەتا بۆ پێغەمبەرایەتی‌و کاری گەورە. خودا فەرمانی پێ کرد بەوە عەصاکەی فڕێ بدا بۆ ئەوەی موعجیزەی گەورە دەربکەوێ ﴿قَالَ﴾ پەروەردگار پێی فەرموو: ﴿ أَلْقِهَا يَا مُوسَى﴾ ئەی موسا! ئەو عەصایەی بەدەستی ڕاستەوەیە فڕێی بدە، بیهاوێژە سەر زەوی، حەزرەتی موسا یەکسەر ﴿فَأَلْقَاهَا﴾ عەصاکەی فڕێدا ﴿فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى﴾ هەر لەگەڵ فڕێی دا ڕوانی کتوپڕ عەصاکەی مارێکەو دەخشێ‌و دەکشێ بەسەر زەوی دا، دەست بەجێ عەصای بێ گیان بوو بە مارێکی درێژی گورج‌و گۆڵ. لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِراً وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ (النمل: ١٠) واتە: کاتێك بینی عەصاکەی مارێکی گەورەیە بەڵام لەبەر گورج‌و گۆڵی بەبچوکی دەهاتە بەرچاو، دیمەنەکە سەرنج ڕاکێش بوو، موسا ﷺ پاشەو پاش کشایەوە ولێی ترسا، ناحەقی نەبوو، کێ هەیە لەڕوداوی ئاوادا نەشڵەژێ‌و نەترسێ. عەصای بێ گیان بوو بەماری گیاندار، ئەو موعجیزە گەورەیە بەکتو پڕی لە پێش چاوی موسا‌ﷺ ڕووی دا!! موعجیزەی گیان بەبەردا کردنی شتی بێ گیان، هەرچەندە ئەم جۆرە موعجیزە لەهەموو ئان‌و ساتێك دا ڕوودەدا، وەلی خەڵکی بێ ئاگان لێی. وێنەی ئەو موعجیزە

لەهــەموو چــرکەیەك دا بەفــەرمانی خــودا ڕوودەدا، لەهــەموو ســاتو کاتێــك دا بەملوێنەها خانه بێ گیانەکان دەبنە خانـەی گیانـدار: بـەڵام خـەڵکی پێـی سەرسام نـابن وەکـوو بـەبوونی عەصـای مووسـا ﷺ بـەمار سەرسـام دەبـن، هـۆی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوە: کـەئادەمیزاد دیلـی هەسـتەکانیەتی، دیلـی ئـەزمونو تاقیکردەوەکانیـەتی، لـە بـیرو بۆچـوونی دا زۆر لەمـەودای هەسـتەکانی تێناپـەڕێ، وەرگـەڕانی عەصـابە مـارێکی گـورجو گـۆڵو تـیـژ ڕەوو دیاردەیـەکی حیسـسی یـە بەرەنگاری هەستەکانی دەبێتەوەو لێك دەکەون!

بەڵام دیاردە شاردراوەکانی سەرەتای ژیـان، کـە گەردیلـە بـێ گیانـەکان دەبنـە خەلیەی زیندوو، ئەوە ناکەونە بـەر مـەودای هەسـتەکانو ئـادەمیزاد هەسـتیان پـێ ناکا، بەتایبەتی بار پێوە گرتنو زۆر دووبارە بوونەوەیان کاریگەریان لەسەر هەست کەم دەکاتەوەو بەشتێکی ئاسایی دێنە بەرچاوی! کە عەصاکە بـوو بـە مـارو کەوتـە جمو جوڵ بـەخێرایی دەکشا، حـەزرەتی موسا ﷺ ترساو پاشـەو پـاش کشایەوە، ﴿قَـالَ:﴾ پـەروەردگار پێـی فـەرموو: ﴿خُـذْهَا وَلَا تَخَـفْ﴾ بەدەسـتت بیگـرەو لێـی مـەترسە، ﴿سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَى﴾ هەر کەدەستت پێی گەییشتەوە دەیگێڕینەوە بۆ شێوەکەی یەکەمجاریو دەیکەینەوە بەدار عەصاکەی پێشوو.

حەزرەتی موسا ﷺ دڵنیا بووە و، دەستی بـۆ مارەکـە بـردوو خـودا کردیـەوە بەدار عەصاکەی پێشوو نەگیانی تێدا ما نـە جمو جووڵ، ئەمـەش موعجیزەیـەکی تر بوو، خودا نیشانیدا.

## موعجیزەی دووەم بۆ موسا ﷺ (یەدی بیضا) بوو

﴿ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار موعجیزەی عەصای باس کرد: کەنیشانەی پێغەمبەرێتی حەزرەتی موسایەو موعجیزەی یەکەمیەتی.

ئەمجار باسی موعجیزەی دووەمی دەکا، ئەویش موعجیزەی دەست درەوشانەوەیە: کەبەفەرمانی خودادەستی دەبوەشتێکی پرشنگدار وەکوو خۆر دەدرەوشایەوەو چاوی لەبەر هەڵنەدەهات. ئەمجار دوای نیشاندانی ئەو دوو موعجیزانە، فەرمانی پێ کرد کەبچێ بۆ سەر فیرعەون و پەیامی خودای پێ بگەیەنێ و بانگەوازی بکا بۆ خودا پەرستی. ئیتر حەزرەتی موسا ﷺ لە خودا پاڕایەوەو چوار شتی داوا لێکرد دڵ فراوان کردنی و کار ئاسانی بۆی. زمانی بکرێتەوەو لاڵی نەمێنێ. هارونی براشی لەگەڵ دا بکرێ بە پێغەمبەرو پشتیوانی

بێ، جارێکی تر فەرمانی خودای تەعالا بۆ موسا ﷺ دەرچوو فەرمانی پێ کرا بەم چەشنە پێی گوترا: ﴿وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ﴾ دەستی ڕاستت بەرە بۆبن هەنگڵت بیلکێنە بەژێر باڵتەوە، ﴿تَخْرُجْ بَيْضَاءَ﴾ دێتە دەرەوە بەدرەوشاوەیی ڕووناکی‌یەکی زۆر دەبەخشێ.. بەشەوو بەڕۆژ ڕووناکاییەکەی دیارە وەکوو ڕووناکی خۆرو مانگ وایە.﴿ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ﴾ سپیەتیەکەی ڕووناکی‌و درەوشانەوەیە، نەخۆشی‌و دەردی بەڵەکی نیە، نیشانەی عەیب‌و نەنگی نیە پێتەوە.دوایی ئەو دەستە بخەرەوە باخەڵتەوە، وەکوو پێشووی لێ دێتەوە، ڕەنگی گەنم ڕەنگی بەخۆوە دەبینێتەوە!

ئەگەر جادووبازەکانی فیرعەون هەوڵی ئەوەیان دابێ: کە موعجیزەی عەصا بەتاڵ بکەنەوەو بەربەرەکانی بکەن، کەچی یەکێکیان هەوڵی ئەوەی نەداوە موعجیزەی یەدی بەیضا پووچەڵ بکاتەوە. ئەم دەست درەوشانەوەشت ﴿آيَةً أُخْرَى﴾ موعجیزەیەکی ترەو نیشانەیەکی کەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتیت، ئەوەمان بۆیە کرد ﴿لِنُرِيَكَ مِنْ آيَاتِنَا الْكُبْرَى﴾ بۆ ئەوەی برێك لەنیشانەی گەورەیی خۆمانت نیشان بدەین، پێت بزانێنین: کەئێمە باڵا دەستین بەسەر هەموو شتێك لەناو بوونەوەردا.

لێرەدا پرسیارێك هاتە پێشەوە، دەگوترێ: بۆچی موعجیزەکانی حەزرەتی موسا ﷺ لەو جۆرە موعجیزانە بووە؟.

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەگوترێ: پەروەدگار بۆخۆی زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك، لەهەموو چەرخ‌و ڕۆژ گارێکدا بەپێی بارو دۆخ‌و دڵ‌و دەروونی خەڵکی ئەو سەردەمە موعجیزەی داوە بە پێغەمبەرانی، جا چونکە لەچاخ‌و سەردەمی حەزرەتی موسا ﷺ دا جادوبازی باوبووە. خەڵکەکە چاویان بڕیبووە شتی سەر سووڕهێنەری جادو بازی، بۆیە موعجیزەی حەزرەتی موسا ﷺ لەو جۆرە موعجیزانە بووە کە جادوبازیەکەیان پوچەڵ بکاتەوە. ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار ئەم دوو جۆرە موعجیزە گەورەیەی بەخشی بەحەزرەتی موسا ﷺ،

فەرمانی پێ کرد: کە بچێ بۆسەر فیرعەونو پێی فەرموو: ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى﴾ بە پێغەمبەری بچۆ بۆلای فیرعەون: کە پاشای میصرەو تۆ لەترسی ئەو هەڵهاتبووی. بچۆرە سەری ئەوە موعجیزەی گەورەو خاریقول عادەمان پێداوی، بانگەوازی بکە بۆ خودا پەرستیو بەندایەتی بۆکردنی، فەرمانی پێ بکە: کەچیتر نەتەوەی ئیسرائیل نەچەوسێنێتەوە، لەگومراییو ملهوڕی خۆی وازبێنێ ، بچۆرەلای فیرعەونو ئەم جۆرە پەیامەی بەگوێچکەدا بدە، چونکە بێگومان ئەو لەخۆی بایی بووە، کافرو سەرکەش بووە، سنووری ئادەمیزادێتی خۆی شکاندووە، باوەشی بەدونیادا کردووەو قیامەتی لەبیر خۆی بردۆتەوەو لافی خودایەتی لێ دەداو بەنەتەوەو گەلە ژێردەستەکانی خۆی دەڵێ: من خودای هەرە گەورەو بەرزی ئێوەم، لەمن زیاتر خودای ترتان نیە!!

جاکە پەروەردگار ئەم فەرمانەی ئاراستەی حەزرەتی موسا ﷺ کردو ڕەوانەی سەر فیرعەونی کرد، کە لەراستیدا تابڵێی ئەرکێکی گرانو ترسناك بوو، ئەو لەترسی فیرعەون هەڵاتووە، ئێستا بچێتە سەری داوای ئیمان هێنانی لێ بکاو پێی بڵێ شوێنم بکەوە: ئەو بۆخۆی فیرعەونی باش دەناسی، دەیزانی چ ملهوڕو ستەمکارێکە، بۆیە حەزرەتی موسا ﷺ لەخودا پاڕایەوە هەشت شتی بۆ فەراهەم بێنێ:

١- ﴿قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي﴾ موسا ﷺ وتی: خودایە: سینگم فراوان بکە دڵو دەروونم بەهێزکە بۆ وەرگرتنو هەڵگرتنو گەیاندنی ئەو پەیامە، بە دڵێکی فراوانەوە بە بڕوایەکی پتەوەوە بتوانم ئەو پەیامو سروشە بگەیەنم. بێگومان ئەو ئەرکە ئەرکێکی قورسو کارێکی گەورەیە پێویستی بەیارمەتی تۆ هەیە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي﴾ (الشعراء/١٣) داوای لەخودا کرد: کەئەو دڵتەنگیەی لابەرێو دڵ فراوانی بکا بۆ ئەوەی پشوو

درێژ بێو بتوانێ ئەزیەتدانو سەرپێچی کردنی خەڵکی پێ قبوڵ بکرێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی پێ هەڵبگیرێ.

٢- ﴿وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي﴾ کارو فرمانم بۆ ئاسان بکە، ئەگەر تۆ یارمەتی دەرم نەبی ئەمن کەی تواناو هێزی ئەو ئەرکە گرانەم هەیە: هەرچەند ئەم دوو داوایەی هەموو پێداویستیەکانی دەگرێتەوە، بەڵام چونکە ئەم مەبەستانەی کە لەمەدوا دێن زۆرلای گرنگ بوون بۆیە بەتایبەتی ناویان دەهێنێ:

٣- ﴿وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسَانِي، يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾ زمانم ڕەهابکە گرێی سەر زمانم لابەرە، لاڵیو تورەیم مەهێڵە، بتوانم بەبێ گیرو گرفت قسەبکەم: بۆئەوەی لەکاتی ڕاگەیاندنی پەیامەکەم دا لە قسەو ئاخاوتنم تێ بگەن، چونکە ڕاگەیاندنی پەیامو ئامۆژگاریی لەلایەن ڕەوان بێژو قسە ڕەوانەوە کاریگەرترەو زیاتر خەڵکی دڵو گوێچکەیانی بۆ دەکەنەوە.

وەکوو دەگێڕنەوە، دەڵێن: حەزرەتی موسا عليه السلام گیرییەك لە زمانیدا بوو، ئەویش لەوەوە بووە بەمندالی لەباوەشی فیرعەون دا بووە ڕیشی ڕنیوەتەوە، فیرعەون ڕقی لێی هەڵساوە، ویستویە لەناوی بەرێ، خێزانی فیرعەون بەرگری لێ دەکاو دەڵێ مندالەو هێشتا عەقڵی پەیدا نەکردوە.

ئەمجار فیرعەون دەڵێ: بەتاقی دەکەمەوە، دێنێ چەند دەنکە خورمایەكو چەند پشکۆ ئاگرێك دەخاتە بەر دەستی بۆ ئەوەی بزانێ کامیان هەڵدەگرێ، ئیتر موسا عليه السلام دەست دەبا بۆ پشکۆ ئاگرەکەو دەیخاتە سەر زمانی بەوە تۆزێك زوبانی توور بووە گیریی تێدا پەیدا بووە.

٤- ﴿وَاجْعَلْ لِي وَزِيراً مِنْ أَهْلِي، هَارُونَ أَخِي﴾ خودایە! یارمەتیدەرو پشتیوانێکم بۆ دابنێی لەبڕێ کاردا یارمەتیم بدا، ئەوکەسە لەخزمی خۆم بێ بۆ ئەوەی لەگەڵ من ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرێ، ئەو زمانی شیرینو ڕەوانە، دڵ

دامەزراو بار قوڵو لە سەرە خۆیـە.حـەزرەتی موسـا بـۆ خـۆی پیـاوێکی توندوتیـژو ئینفیعالی بـوو، بۆیـە داوای لەپـەروەردگاری خـۆی کـرد: کەپـشت ئەسـتوری بکا بـە براکەی، بۆ ئەوەی دووبە دوو ئەوکارە گرنگەی پێیان سپێردراوە ئەنجامی بدەن.

٥-٦﴿اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي، وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي﴾ خودایە! بە براکـەم پـشت ئەسـتوورم بکـە، بیکـەرە هاوبەشـم لەپێغەمبـەرێتیدا، بـۆ ئـەوەی ئـەرکی سـەر شـانی خۆمـان بەشێوەیەکی پێویست ئەنجام بدەین.

٧-٨ ﴿كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيراً، وَنَذْكُرَكَ كَثِيراً﴾ بۆئەوەی بتـوانین تەسـبیحاتی زاتـی پاکت بکەین، بە دوورت بگرین لەو شتانەی شیاوی زاتو صیفاتی تـۆ نیـە، بتـوانین بەزۆری یادت بکەینو بەتاکو تەنها بتناسینو کەس نەکەینە هاوەڵو هاوبەشت لە هەموو عەیبو خەوشێك بتپارێزین.

حـەزرەتی موسـا ئـەو هـەموو داوایانـەی پێـشنیار کـردن، داوای کـرد سـنگی فـراوان بـێ کـاری بـۆ ئاسـان بکـرێ، گرێـی زمـانی بکرێتـە وەهـارونی بـرای بکرێتـە پێغەمبـەرو یارمەتیـدەر... هـەموو ئەمانـە بـۆ ئـەوەی ببنـە یارمەتیـدەر بـۆ تەسبیحاتی زۆرو یاد کردنی خودا بە زۆری. وەرگرتنو بیستنی زۆرلە خودای بیناو شنەوا. موجاهید دەڵێ: بەندە (بەذاکر)ی تەواو حـسێب نـاکرێ هـەتا وای لـێ نەیـە بەهەموو شێوەیەك یادی خودا بکا، بەپێوە بەدانیشتنەوە بەڕاکشانەوە.

﴿إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيراً﴾ خودایە! بێگومان زاتی پاکت لـە حـاڵو وەزعـی ئێمـە ئاگادارە، دەزانی بۆچی ئێمەت هەڵبژاردووەو پلەو پایـەی پێغەمبـەریت پـێ داویـن، دەزانـی بۆچـی دەمـان نێـری بـۆلای فیرعـەونی ملهوڕو سـتەمکار، ئـەو فیرعەونـەی داوای خوایـەتی دەکـا، ئێمـە پابەنـدو ملکەچـی تـۆینو سـوپاس گـوزارین، ئـەتۆش بۆخۆت پێویستی ئێمە دەزانی، ئاگاداری بەوەی: کەئێمە ئاتاجی یارمەتیو کۆمەگی تۆین!

بێگومـان حـەزرەتی موسا ﷺ درێـژەی بەپاڕانـەوەو پێـشنیارەکانی دا داوای یارمەتیو کار ئاسانی کرد، خودای بـەرزو بـاڵا دەست گوێی لێـەو دەبیـسێ، ئـەو میوانی خوای پەروەردگارە، ئاخاوتنی لەگەڵ ئەنجام دەدا، پـەروەردگاری خـاوەن فـە ضل و کەرەم میوانی خۆی نائومێد ناکاو داواکارییەکانی دوا ناخا.

## پەروەردگار هەشت نیعمەتی جۆراو جۆری بەخشیون بەحەزرەتی موسا ﷺ پێش پێغەمبەرێتی

﴿ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ﴾

دوای ئـەوەی حـەزرەتی موسا ﷺ هەشت پێشنیاری ئاراستەی پـەروەردگار کردن، لێرەدا پەروەردگار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کە سەرجەم داواکارییەکانی جێبەجێ کـران، ﴿قَـالَ قَـدْ أُوتِيـتَ سُـؤْلَكَ يَـا مُوسَـى!﴾ پـەروەردگار فـەرمووی: هـەموو داواکاریـەکانت پـێ دران، هەرچـی داوات کـرد ئـەوا دەسـت بـەجێ پـێم بەخـشی، خۆشـیو بەختـەوەریی حـەزرەتی موسـا ﷺ لەوەدایـە وێـڕای جـێ بـەجێ بـوونی داواکاریەکانی خودا ڕێزێکی تریشی لێ نا بەوە: کەبەناوی خۆی بـانگی لێ کـرد، جا چ ڕێـز لێنانێـك لـەوە گـەورەترو بـەنرخ تـرە کـە پـەروەردگاری باڵادەسـت بـانگی بەندەیەك لەبەندەکانی خۆی بکا بەناوی صەریحی خۆی!!!

﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى﴾ بێگومـان جارێکی تـریش چاکەمان لەگـەڵ تـۆ کـرد، منـەتو نیعمـەتی خۆمانمـان بەسـەردا ڕشـتی، پـێش ئـەوەی پلـەو پایـەی پێغەمبەرایەتیت پێ ببەخشین چەند نیعمەتو فە ضلی خۆمانمان پێ داوی.

١- ﴿إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَـى أُمِّـكَ مَـا يُـوحَى﴾ ئەوکاتـەی نیگامـان کـرد بـۆلای دایکتو ئەوەی پێویست بوو تێی بگەیەنین تێمان گەیاند، شتێکمان تێگەیانـد هـەر بەنێمـە دەکـرا تێـی بگەیـەنین، وەکـوو چەسـپاوەو زانـراوە، فیرعـەونی سـتەمکار بڕیـاری دەرکردبـوو بـە لـەناو بـردنو کوشـتنی هـەر منـداڵێکی نێرینـەی بـەنو ئیـسرائیلی کەلەو سـاڵەدا لـەدایك دەبـێ، جا کەموسا ﷺ لـەدایك بـوو، دایکیو کـەسو کـاری تینیـان لێ پەیـدا بـوو، نەیانـدەزانی چـۆن لەچـنگ یاسـاوڵەکانی فیرعـەون ڕزگـاری بکەنو چۆنی بشارنەوەو نەهێڵن پێی بزانن.

پەروەردگار ویستی وابوو موسا ﷺ لەو کوشـتنو بڕینـە ڕزگـار بکـا، کـارێکی وابکا فیرعەون خۆیشی پـەروەردەی بکـاو پێـی بگەیـەنێ: بۆیـە پـەروەردگار ئـەوەی خستە دڵی دایکییەوە.

دەفەرمووێ: نیگامان کردە دایکتو خستمانە دڵیەوە، کە ﴿أَنْ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ﴾ کوڕە تازە لەدایك بوومکەت بخەرە ناو صندوقە دارێکەوە ﴿فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ﴾ ئەمجار فڕێی دە ناو دەریاوە، واتە: دەریای نیلەوە. ﴿فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ﴾ ئەمجار دەریاکەش وەلای بخاو فڕێی بداتە قەراخەوە، تا لەئاکام دا ﴿يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ﴾ کەسێك بیگرێتەوە: کە دوژمنی منو دوژمنی ئەویشە. واتە: فیرعەون صندوقەکە بگرێتەوەو بیباتە لای خۆی.

وەکوو دەگێڕنەوە لە چەمی نیلەوە جۆگایەك وەرگێڕابوو بۆلای باخەکەی فیرعەون، جا لەکاتێك دا فیرعەون لەگەڵ خێزانەکەیدا لەسەر حەوزێك دانیشتبوون ڕوانیان ئەواصندوقێك بەسەر ئاوەوەیە. ئەویش فەرمانی کرد بە گرتنەوەی صندوقەکەو هەڵیچڕینی، هەر خێرا دەستو پێوەندەکانی صندوقیان کردەوەو هەڵیان پچڕیو بینیان مندالێکی تابلێی جوانو خنجیلەی تێدایە، فیرعەون بەچاوپێکەوتنی زۆری خۆشویستو خێزانیشی هەر زۆر لەدڵی شیرین بوو!

٢- ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾ لەلایەن خۆمەوە خۆشەویستیەکی زۆرم خستە سەرت! لەدڵی خەڵکیدا شیرینم کردی. خۆم خۆشم ویستیو بەو هۆیەوە کەسانی دیکەش خۆشیان ویستی، یان لەدڵی ئادەمیزادان دا خۆشەویستم کردیو فیرعەونیش خۆشی ویستیو کردیتی بەکوڕی خۆیو پەروەردەی کردی.

خۆشەویستییەك وای لەفیرعەون کرد: کەخیاڵی ئەوەندەکا بتکوژێ، بەڵکو بڕیار بدا بتکەنە کوڕی خۆیان، وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرمووێ: خێزانی فیرعەون زۆر خۆشی ویستیو زۆر بەدڵیدا چووی تەنانەت بەفیرعەونی گوت: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ (القصص/٩).

٣- ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ خۆشەویستیم بەسەردا ڕشتی بۆئەوەی کەسانی دیکەش خۆشیان بوێی، پەروەردە بکرێی لەژێر چاودێری ئێمەدا، دەبێ چ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەك بتوانێ شتێك زیاد بکا لەو مانایەی ئەم ڕستە قورئانیە گەیاندوویەتی؟

بێگومان هیچ شەرحو ڕاڤەکردنێك ناتوانێ شتێکی دی بخاتە سەر ئەو مانا ناسكو شیرینەی ئەم تەعبیرە قورئانییە دەیگەیەنێ. دەبێ زوبانی ئادەمیزاد چ بڵێ بەرامبەر کەسێك لەژێر چاودێری پەروەردگاردا پەروەردە بووبێ؟؟

بێگومان ساتەوەختێکی چاودێری پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد ئەو پەڕی پلەو پایەیە ئەی دەبێ کەسێك هەمیشە لەژێر چاودێری خودادا پەروەردە بووبێ چ پلەو پایەیەکی هەبێ؟؟

منداڵی تازە لەدایك بوو هەرچەندە شوێنو جێگای باشی بۆسازدرا بوو، لەباڵەخانەی فیرعەون دا بڕیار بوو پەروەردە بکرێ، بەڵام دایکی دڵی بۆ هەڵدەچۆڤێو لەتاوانی هەراسانی لێ هەڵگیراوەو ئۆقرە ناگرێ. لەم خشەوە پەروەردە کردنی لەباوەشی دایکیداو شیر پێدانی لەلایەن ئەوەوە زۆر گرنگەو هیچ خۆراكو بژێوێك جێگای شیری دایك ناگرێتەوەو هیچ شوێنێك بۆمنداڵی ساوا هێندەی باوەشی دایك خۆش نیە. بۆیە خودا کارێکی وای کرد، کە دایكو فرزەندی شیرە خۆرە یەکتری بگرنەوە، زارۆکی تازە لەدایك بوو بگەڕێتەوە بۆ باوەشی دایکی خاوەن سۆز. بەم جۆرە خودا وای کرد ئەو منداڵە مەمکی هیچ ئافرەتێك نەگرێ، چەند ئافرەتیان هێنا بیکەن بەدایەنی بەڵام مەمکی هیچیانی نەگرت. بۆیە ناچار بوون هەوڵ بدەن ئافرەتێکی شارەزا بدۆزنەوە بتوانێ شیر بدا بە موسا ﷵ.

لەم لاشەوە خوشکی موسا ﷵ بەڕێنمویی دایکی خۆی گەیاند بووە ماڵی پاشاو بەنهێنی سەیری هەڵسو کەوتیان دەکاو گوێ لە تەگبیرو ڕاو بۆ چوونیان دەگرێ، ئیتر دەم دەباتە پێشەوەو پێیان دەڵێ: من ئافرەتێکتان پیشان دەدەم هەموو

منداڵێك مەمكی دەگرێ، ئەگەر حەزتان لێیە پێتان دەڵێم‌و ناونیشانیتان دەدەمێ! دارو دەستەی فیرعەونیش بێ ئاگان لەوەی ئەو ئافرەتە دایکی خۆیەتی، بەم شێوە موسا ﷺ مان گێڕایەوە بۆ باوەشی دایکی، سەیر لەوەدایە دایکی موسا ﷺ بە ڕواڵەت کوڕی پاشا بەخێو دەکاو دایەنی ئەوە ماڵی پاشای لە موشکیلەیەکی گەورە ڕزگار کردووە، کەوابێ بەم بۆنەشەوە دەبێ ماڵی پاشا نازو نیعمەتی خۆیانیان بەسەر ماڵی دایەندا ڕشتبێ‌و لەهەمان کاتیشدا کوڕی خۆیان بە خێو دەکەن!! بەڕاستی هەر خودا دەتوانێ کاری ئاوا بسازێنێ‌و ئیشی ئاوا ڕێك بخا، ئەمەیە پەروەردەبوون لەژێر چاودێری خودا!!

٤- ﴿ إِذْ تَمْشِي أُخْتُكَ﴾ واتە: لەلایەن خۆمەوە خۆشەویستیم بەسەردا ڕشتی، لەو کاتەدا: خوشکەکەت بەشوێنتەوە بوو بەقەراغ دەریادا ڕۆییشت، بۆ ئەوەی بزانی صندوقەکە لە کوێ دەوەستێتەوە. دەیەویست هەواڵت بزانێ، هەتا لە ماڵی فیرعەون دا تۆی دۆزییەوە لەحاڵەتێك دا بوون: کە دەگەڕان دایەنێکیان دەست بکەوێ شیرت پێ بدا.

﴿فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَنْ يَكْفُلُهُ﴾ ئەویش وتی: ئایە ڕێنمونیتان نەکەم بۆ ئافرەتێك بتوانێ ببێتە دایەنی‌و شیری بداتێ ئەوەندە کاراما بێ وابکا ئەم منداڵە مەمکی بگرێ، بەجوانی بەرعۆدەی بەخێو کردنی بێ؟؟ ئەوانیش ڕازی بوون‌و چوو دایکی هێناو یەکسەر مەمکی ئەوی گرت‌بەم شێوە ﴿فَرَجَعْنَاكَ إِلَى أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ ئاوا بەو جۆرە گێڕامانیەوە بۆلای دایکت بۆئەوەی بە تۆ چاوی فێنك ببنەوە، دڵی ئارام بگرێ، غەم‌و پەژارەی لەدەست دانی ڕۆڵەی جگەر گۆشەی نەمێنێ.

٥- ﴿ وَقَتَلْتَ نَفْساً فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ﴾ پیاوێکت کوشت لە تاقمی فیرعەون ئەو کاتەی کابرای قیبطی لەگەڵ کابرایەکی بەنوو ئیسرائیلی شەڕیان بوو، کابرای بەنو ئیسرائیلی هانای بۆ هێنای‌و داوای یارمەتی لێ کردی ، ئەتۆش زللەیەکت لێ داو

کابرا گیانی دەرچوو، بەمە کەوتیتە غەم و پەژارەوەو ترسی تۆڵەو سزای فیرعەونت بۆ پەیدا بوو ﴿فَنَجَّيْنَاكَ مِنَ الْغَمِّ﴾ ئێمە لەو ترس و بیمەی بۆت پەیدا بوو بوو رزگارمان کردی، بەهۆی تۆبە کردنتەوە لەگوناهی پیاو کوشتنەکەت خۆش بووین و تاوانەکەتمان سڕیەوە، ڕێگامان نیشان دای کەهەڵ بێی بڕۆی بۆ وڵاتی مەدیەن بەمەش لەچنگ تۆڵەی فیرعەون رزگارت بوو.

٦- ﴿وَفَتَنَّاكَ فُتُوناً﴾ بەچەند شێوەی جۆراو جۆر بە تاقیمان کردیتەوە، پێش ئەوەی هەڵت بژێرین بۆ پێغەمبەریی، دوچاری چەند تەنگ و چەڵەمەو بەڵاو ناخۆشیمان کردی، لەبۆتەی تاقیکردنەوەمان دای، لەهەموو ئەو تاقیکردنەوانە رزگارمان کردی، هەتا وات لێهات بەکەڵکی ئەوە بێی ئەرکی پێغەمبەرایەتیت پێ بسپێردرێ.

٧- ﴿فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ﴾ چەند ساڵێك لەناو دانیشتوانی وڵاتی مەدیەندا مایتەوە؛ کەنزیکەی هەشت قۆناغ لەمیصر دوور بوو، دەربەدەری و هەژاریت چەشت، بووی بەرەنجبەرو شوانی شوعەیب ﷺ لەپاساوی مارەیی خێزانت.

﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى﴾ پاشان کە دە ساڵ شوانیت تەواو کرد، هاتیت بۆ ئەم شوێنە کەلەوە پێش بڕیارم لەسەر دابوو بۆ قسە لەگەڵ کردنت، بۆئەوەی بتکەمە پێغەمبەرو بۆسەر فیرعەون و نەتەوەی ئیسرائیل رەوانەت بکەم.

٨- ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ تۆم هەڵبژاردووەو تایبەتم کردووی بەپێغەمبەرایەتی و قسە لەگەڵ کردن دا، بۆئەوەی بانگی ئادەمیزاد بکەی بۆئاپینی من، کردوومی بەفرستادەو رەوانەکراو بۆسەر بەندەکانم بۆئەوەی ئایینیان پێ رابگەیەنی، شارەزایان بکەی بۆ ڕێبازی خودا پەرستی و شەریعەتی حەق.

## ڕێنموونی پەروەردگار بۆ حەزرەتی موساو ﷺ هارون ﷺ دەربارەی بانگەوازیکردنیان بۆ فیرعەون

﴿ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار هەشت نیعمەتی خۆی: کەدا بوونی بەحەزرەتی موسا ﷺ باس کردن، ئەمجارلێرەدا فەرمان‌و ڕێنموویی خۆی بۆ حەزرەتی موساو هارون باس دەکا. تەوجیهات‌و تەعلیماتی پێویستیان دەداتێ بۆئەوەی لەئەنجامدانی ئەرکەکانیان دا سەرکەوتوو بن، بتوانن پەیامی خۆیان بگەیەنن‌و بانگەوازیی فیرعەون بکەن بۆ ئیمان هێنان.

ئەمەش فەرمان‌و نەهیەکانن کەلە خوداوە ئاراستەی حەزرەتی موساو هارونی برای کراوە. دەفەرموێ: ﴿اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي﴾ ئەی موسا! لەگەڵ براکەتدا بڕۆنە سەر فیرعەون‌و قەومەکەی، بڕۆن بانگەوازی فیرعەون‌و دارو

دەستەکەی بکەن بەو بەڵگەو موعجیزانەی پێم داون‌و کـردومن بەنیـشانەی ڕاسـتی پێغەمبەرایەتیتان، نۆ موعجیزەو نیشانەن بەمێوەم بەخشیون ﴿وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي﴾ سستی‌و کەمتەرخەمی مەکەن لەگەیاندنی پەیامی من دا، لەیاد کردن‌و ناو هێنـانی من، هەموو کاتێ منتان لەیاد بێ، چونکە یادو زیکری خـودا هێـزو توانـا دەبەخـشێ بەدڵ‌و دەروون.

﴿اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ﴾ بڕۆن بۆلای فیرعەون بانگەوازیی لێ بکەن بۆئیمانهێنـان ﴿إِنَّـهُ طَغَـى﴾ بێگومـان ئـەو لەسـنوور دەرچـووە، زێـدە ڕەوی کـردووە لـەتاوان‌و گومڕاییدا، بەبەڵگەو نیشانەی گورچکبڕ لەداوای لافی خودایـەتی ژێـوانی بکەنـەوە، با بەخۆیدا بچێتەوە، لەملهوڕی‌و کەللەڕەقی خۆی دابەزێ.

ئەمجا ڕێنموویان دەکا بۆبانگەوازی کردنـی‌و ڕووبـەڕوو بوونـەوە لەگـەڵیدا. دەفـەرموێ: ﴿فَقُولَا لَهُ قَـوْلًا لَيِّنـاً﴾ بەنـەرم‌و نیـانی قسەی لەگەڵدا بکـەن، بەتونـدو تیژی لەگەڵی مەجوڵێنەوە، ﴿لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى﴾ بەڵکوو بیر بکاتـەوەو لەپەنـدو ئامۆژگاری ئێوە ورد بێتەوە، قسەتان لێ وەربگـرێ‌و بـۆی دەربکـەوێ: کـەئێوە ڕاسـت دەکەن! یان هیچکە نەبێ گومانی ڕاستیتان لێ بکـاو بـەهۆی ئـەوەوە بترسـێ لەسـزاو تۆڵەی خودا، بانگی بکەن بۆ خوداپەرستی، ئومێدی ئەوەشـتان هـەبێ کەبانگـەوازی کردنەکـەتان سـوود بـەخش دەبـێ، چـونکە هەرکەسـێك بـەکارێك هەڵـسا دەبـێ بەئومێدەوە هەوڵ بدا، ئەگـەر بەنائومێـدی خـەریك بـوو، خەریکبونەکـەی گـەرم و گوڕنابێ.

هەڵبەتـە پـەروەردگار دەیزانـی: کەفیرعـەون ئیمـان نـاهێنێ، کەچـی ئـاوا بەجەختەوە فەرمانیدا بۆ بانگ کردنی‌و هەوڵدان لەگەڵی بۆ ئەوەی ئیمـان بهێنـێ، ئەمەش بـۆ ئـەوەی بەڕواڵەت قـسەی نـەمێنێ‌و بەهانـەی بـبڕێ، لەهـەمان کاتـدا تـا ئاماژەبێ کەپەیڕەو کردنـی هۆکارەکـان بـۆ گەیـشتن بەمەبەسـت شـتێکی پێویـستەو دەبـێ گرنگیـان پـێ بـدرێ. جگەلـەوەش بڕیـاری خـودا وایـە کەتۆڵـەو سـزاو پـاداش

لەسەر کردەوەی بەندەکان خۆیان بێ. لەهەمان کاتدا ڕێ نیشاندان بێ. بۆ ڕابەران‌و بانگخوازانی ئایین: کەبەگوێرەی توانا هەوڵ‌و تێکۆشانی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ گەییشتن بەئامانجەکانیان جا ئاواتەکەیان بێتە دی یان نەیەتە دی ئەوە ئەوان بەرپرسیار نین‌و ئەجرو پاداشتی خۆیان دەست دەکەوێ.

هەتا ئێرە ئاخاوتنی پەروەردگارە لەگەڵ حەزرەتی موسادا ﷺ.. دیمەنەکە دیمەنی گفتوگۆی نێوان پەروەردگارو حەزرەتی موسایە ﷺ لەو سارایەدا. نزاو پاڕانەوەی موسا ﷺ لەکاردایە وەڵێ ئەوا لێرەدا سیاقی قورئان مەسافەو کاتەکان دەپێچێتەوە، هارونیش دەهێنێ لەگەڵ موسادا شان بەشانی یەك نزا دەکەن‌و پەروەردگار ئاخاوتنیان لەگەڵ دا دەکا. کەوابوو دەتوانین بڵێین: ئەمە جارێکی ترەو جودایە لە یەکەمجار: کەموسا ﷺ بەتەنیا بوو، ئەمجار هەر خودا دەزانێ لەنێوان ئەم دوو جارەدا چەند ڕووداو ڕوویان دابێ. بەم جۆرە دوای ئەوەی: کەیەکەمجار پەروەردگار سروشی بۆ موسا ﷺ کرد ئەمجار بە هاوبەشی سروشی بۆکردبن، ئەمجار لەگەڵ موسادا یەکیان گرتبێ‌و بەیەکەوە دەستیان کردبێ بەنزاو پاڕانەوەو خودا ئاخاوتنی لەگەڵ کردبن. بەڵام قورئانی پیرۆز هەموو ئەمانەی پێچایەوەو باسی نەکردن، چوونکە باسکردنەکەیان چ گرنگییەکی بۆ سەرگورشتەکە نیە.

جگە لەوەش ئەوەی کە وتراوە ئاماژە بۆ نەوتراوەکە دەکاو لێی وەردەگیرێ. ئەمەش ئوسلوبێکە لەقورئان دا زۆر جار بەکار هاتووە.

﴿قَالا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَنْ يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَنْ يَطْغَى﴾ حەزرەتی موساو هارون بەیەکەوە وتیان: ئەی خودای ئێمە! زۆر لەوە دەترسین ئەگەر فیرعەون بانگ بکەین بۆ خودا پەرستی‌و یەکتاپەرستی گۆزوگومەمەت پەلامارمان بداو بمانخاتە بەر حەملەی یاساوڵەکانی‌و تووشی چەرمە سەریمان بکاو گیرۆدەی سزاو تۆڵەی

دژواری ستەمکارانەی ببین، چونکە فیرعەون ملهوڕو ستەمکارە، کۆ لەهیچ شتێك ناکاتەوەو ئێمەش بێ دەسەڵاتو بێ پشتو پەنایندو کەسمان لەگەڵ نیە.

﴿قَالَ لا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ پەروەردگار پێی فەرموون: نانا لەفیرعەون مەترسێن، ئەمن پشتیوانیتان دەکەم، دڵنیا بن دەتان پارێزم، کۆمەکیتان پێ دەکەم، هەرچی ڕوو بدا لەنێوان فیرعەونو ئێوەدا ئەمن دەیبیسمو دەیبینم، لێتان بێ ئاگا نابم، شەڕو ئەزیەت دانی ئەوتان لێ دوور دەخەمەوە، حەزرەتی موساو هارون بەمە زۆر دڵنیا بوون ، چ ترسو بیمێکیان نەما، چونکە خودایان لەگەڵەو ئیتر دەبێ فیرعەون چ نرخێکی هەبێ. ئەمجار وێڕای کۆمەکیو دڵ ئارام کردنیان ڕێنموویيشی کردن بۆشێوەی بانگ کردنو پێ ڕاگەیاندنی پەیامی خوداو چۆنیەتی ووتو وێژ کردن لەگەڵیدا.

﴿فَأْتِيَاهُ فَقُولا إِنَّا رَسُولا رَبِّكَ﴾ بچنە لایو لەمەجلیسی خۆیدا بەڕاشکاوی پێی بڵێن: ئێمە فرستادەو ڕەوانە کراوی خودای تۆین. بۆ ئەوەی لەسەرەتاوە بزانێ: کەخودایەك هەیە خودای ئەوو ئادەمیزادە بەگشتی خودای هەموو بوونەوەرە، هەر خودای موساو هارون نیە، هەر خودای بەنوئیسرائیل نیە، بۆ ئەوەی لەیەکەمجارەوە ئەو خەرافاتو بیرو بۆچوونەی ئەو ڕۆژگارە قەڵاچۆ بکا: کەپێیان وابوو بۆ هەر هۆزو خێڵێك یان بۆهەر گەلو نەتەوەیەك خودایەك یان چەند خودایەك هەیە.. یان ئەو بیرو باوەڕە بڕەوێتەوە کەلەهەندێ چەرخو سەردەمدا باو بوو دەیانگوت: فیرعەون لەنەوەی خوداکانەو دەبێ لەمیصردا بپەرسترێ!!

ئەمجار دوای ڕوونکردنەوەی پەیامی خۆتانو خۆناساندنتان پێی، پێی بڵێن: ئێمە لەلاوەوە نێردراوین بۆلای تۆ، باش بزانە خودای حەقو ڕاست(اللە)یە، ئەتۆ: کە بۆخۆت لافی خودایەتی لێ دەدەی بوختانێکی گەورەو ئیدیعایەکی بێ مانایە.

کەواتـە: ﴿فَأَرْسِـلْ مَعَنَـا بَنِـي إِسْـرَائِيلَ وَلا تُعَـذِّبْهُمْ﴾ دەست لەچەوسـانەوەی نەتەوەی ئیسرائیل هەڵبگرە، چیتر عەزابیان مەدە، واز لەسەر بڕینی نێرینـەکانیان بهێنە، ئەرکێك مەخە سەر شانیان: کەنەتوانن پێی هەڵسن، ئـەومبوو فیرعـەون وای بڕیار دابوو هەر منداڵێکی نێرینەیان بێ بەساوایی لەناوی بـەرێ، مێینەکانیـشیانی دەهێـشتەوە، پیاوەکانیـانی بەسـوخرە دەگـرتن‌و بـەبێگار کـاری بینـاو گواسـتنەوەی کەرەسەی خانوو بەرەو هـەموو ئیـشێکی کرێکـاری قورسـی پـێ دەکـردن. حـەزرەتی موساو هـارون لەسـەرەتاوە داوای ئیمـان هێنانیـان لەفیرعـەون نـەکرد. بـەڵکو داوای ئـازاد کردنـی گەلەکـەیانیان لێ کـرد، چـونکە ئـەوە لەسـەر دڵ‌و دەرونـی فیرعـەون سـووکتر بـوو، لـەوەی داوای ئیمـان هێنـان‌و بـیرو بـاوەڕی لێ بکـەن، لەلایـەکی تـرەوە نەتـەوەی ئیـسرائیل لەناخـەوە بیروباوەڕێکیـان بـەخوداو بەپێغەمبـەر هـەبوو، کەوابوو ڕزگار کردنـی ئـەوان مەبەسـتێکی گـرنگتر بـوو لـەبانگکردنی فیرعـەون بـۆ ئیمان هێنان.

﴿قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكَ﴾ ئێمە کە ڕەوانە کراوین لەلایەن خودای خۆتەوە بۆ سەر تۆو گەلەکەت موعجیزەو بەڵگەی بەهێزمان هێناون گەواهی ئەوەن: کـە ئێمـە بەڕاستی پێغەمبەرین.﴿ وَالسَّلامُ عَلَى مَنْ اتَّبَعَ الْهُدَى﴾ ڕزگار بوون‌و ئەمینی لەقارو غـەزەبی خـودا لەسـەر کەسـێك بـێ شـوێن هیدایـەتی خـودا دەکـەوێ، بـڕوا بەپێغەمبەرەکانی دەکا، واز لەستەم‌و گومڕایی دێنێ!

شایانی باسە ئەم ڕستەیە زۆر جار لەنامەکانی پێغەمبەرداﷺ بۆلای پاشاکانی ڕۆم‌و فارس‌و سەرەك هۆزو خێڵەکانی دەوروبەر دەنووسرا!

ئـەمجار سـووکە هەڕەشـەیەکیان لێ کـرد بـەڵام ڕاسـتەوخۆو ڕەپـەو ڕونـا، بـۆ ئەوەی زۆر ڕقی هەڵنەستێ‌و لەسنوور دەرنەچێ هەم دڵنەواییان کردو هەم ترسیان خستە بەر، بەمە پێیان فـەرموو: ﴿إِنَّا قَـدْ أُوحِـيَ إِلَيْنَـا أَنَّ الْعَـذَابَ عَلَـى مَـنْ كَـذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ بێگومان ئێمە نیگامان لە خوداوە بۆ هـاتووە: کـە عـەزابی دونیـاو قیامـەت

لەسەر کەسێکە پەیامی خودا بەدرۆ بخاتەوەو پشت لەئاینی حەق وەرگێڕێ.
هەرکەسێك بڕوا بەنێمە نەکاو بەدرۆمان بخاتەوەو پشت لەخوداپەرستی هەڵبکا ئەوە دۆزەخ جێگایەتی‌و بەئاگر دەسوتێندرێ.

وەکو لەئایەتێکی تردادەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَى، وَآثَرَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، فَإِنَّ الْجَحِيمَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ (النازعات/٣٧-٣٩) یان دەفەرموێ: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَاراً تَلَظَّى، لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى﴾ (الیل/١٤-١٥)

## تێبینی:

لەئایەتی ﴿إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَى﴾ ئەوە وەردەگیرێ: کەترسان لەدەست درێژی کردنی ستەمکارو ملهوڕانی وەکوو فیرعەون شتێکی سروشتیەو لەناخی ئادەمیزاد هەیە.

کەوابوو هیچ غەریبو نامۆ نەبوو، کەموساو هارون بڵێن: ﴿إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَى﴾.

زانایانی ئیسلام فەرموویانە: کاتێك ترس‌و بیم توشی حەزرەتی موساو هارون بوو، پەروەردگار دڵنیای کردن، کەدەستی فیرعەون نایان گاتێ. ئەم ئایەتە بەرپەرچ دانەوەی ئەوانەیە: کەدەڵێن: خودا پەرست نابێ بترسێ. ترسان لەدوژمنی ملهوڕ ڕێبازی پێغەمبەران‌و خودا پەرستانە، هەرچەندە ئەوان بتمانەیان بەخوداو یارمەتی دانی هەیە.

قورئانی پیرۆز لەچەند ئایەتێك دا ترسانی حەزرەتی موسا ﷺ لەدوژمنانی باس دەکاو بەشتێکی سروشتی دادەنێ، خۆ ئەگەر ئەو جۆرە ترسانە ڕەوشتێکی ناشرین بوایە، نەدەبوو لەحەزرەتی موسا و هارون دا وجوودی هەبوایە. چوونکە پێغەمبەران لەڕەوشتی ناشرین‌و نەنگی بەدوورن:

ئەوەتا قورئان دەربارەی حەزرەتی موسا ﷺ دەفەرمووێ:

﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفاً يَتَرَقَّبُ﴾ (القصص/٢١) یان دەفەرمووێ: ﴿فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفاً يَتَرَقَّبُ﴾ (القصص/١٨) یان ئەوکاتەی: کەجادوبازەکان گوریسەکانیان فرێدا موسا ﷺ ترسا وەکوو دەفەرمووێ: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى، قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى﴾ (طه/٦٧-٦٨).

لەم سورەتەش دا(طه/٢١) لەبارەی عەصاکەیەوە دەفەرمووێ: ﴿قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَى﴾.

ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام لەترسی دوژمنان، بەدەوری مەدینەدا خەندەقی لێ دا، بۆ ئەوەی ماڵو گیانی موسوڵمانان بپارێزێ، خۆ ئاشکراشە هیچ کەسێك بەئەندازەی پێغەمبەری ئیسلام؛ حەزرەتی موحەممەد ﷺ پشت بەستوو نەبوە بەخوداو، لەهەموو کەس زیاتر بتمانەی بەپارێزگاریو یارمەتی خودا هەبووە.

هەر لەترسی کافرەکان جارێك هاوەڵانی کۆچیان کرد بۆحەبەشەو دوا جاریش بۆمەدینە بەخۆیو هاوەڵانیەوە شاری مەککەیان بەجێ هێشت.

## گوفتوگۆی نێوانی حەزرەتی موسا ﷺ و فیرعەون دەربارەی خودایەتی

﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ

ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَـٰمَكُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾

لەوە پێش زانیمان: کەحەزرەتی موساو هارون بەفەرمانی خودا ڕۆیشتن بۆلای فیرعەون و گەیشتنە شوێنی فەرمانڕەوایی فیرعەون، ڕێگایان پێ درا بچنە لای. جا چۆن گەیشتنە لای، بەئاسانی بەناخۆشی، زوو درەنگ قورئان باسی ناکا! بەکورتی بەهەر جۆرێك بوو، چوونە لای. ئەمجار قورئان چۆنیەتی گوفتوگۆی نێوان فیرعەون و ئەوان باس دەکا. فیرعەونی خۆ بەزلزان و تەکەبورکەرو خۆ بەخودا زان پرسیاری لە حەزرەتی موساو هارون کرد: خودای ئێوە کێیە کەئێوە بەناویەوە قسە دەکەن؟.

ئەوەتا کەهاتنە لای فیرعەون و پەیامی پەروەردگاریان پێ ڕاگەیاند، فیرعەون فسقەڵ بوو، بەشێوەی تورەیی و لاقرتێ کردن ڕووی کردە حەزرەتی موساو هارون ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى ؟﴾ دەی ئەگەر ئێوە پێغەمبەری خودان و خودا ئێوەی ناردوە، پێم بڵێن ئەو خودایەی ئێوە کێیە؟ تێبینی دەکرێ: کەفیرعەون لەپرسیارەکەی دا دانی بەوەدا نەنا: کە خودای موساو هارون خودای ئەویشە. چونکە خۆی بەخودا دەزانی و موساو هارونی بەدرۆزن دەزانین.. هەروەها خیتابەکەی ئاڕاستەی موسا ﷺ کرد، چوونکە ئەو پێغەمبەرەو بەرپرسیاری یەکەمە، لەپەیامەکە، هارون پشتیوان و یارمەتیدەرە. بەکورتی دەیەوێ بڵێ: ئەو خودایە کێیە ئەی موسا: کەتۆی کردووە بەپێغەمبەرو ڕەوانەی کردوی؟ ئەمن نایناسم چونکە من پێم وانیە جگە لەمن خودای ترتان هەبێ!!

حەزرەتی موسا ﷺ وەڵامی دەداتەوەو خودای پێ دەناسێنێ بەم ڕەنگە صیفەتی بەدی هێنان و دەست ڕەنگینی و کار سازیی بۆ خودا دەچەسپێنێ و دەڵێ خودای ئێمە خاوەنی ئەو جۆرە صیفەتانەیە. ﴿قَالَ﴾ موسا ﷺ وتی: ﴿رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ خودای ئێمە ئەو خودایەیە: کە وجودی بەخشیوە بەهەموو شتێك و لەنەبووە هێناویەتیە جیهانی بوونەوە، هەرشتێکی دروست کردبێ ئەو شێوەو سەرو سیمایەی شیاوی حاڵ و وەزعیەتی پێی داوە، بۆ ئەوەی هەر شتەو کاری سروشتی خۆی پێ بکرێ، بۆ نموونە دەست بۆ هەڵمەت و وەرگرتن و هاویشتن.. قاچ بۆ ڕۆیشتن و زمان بۆ ئاخاوتن و چاو بۆ بینین و گوێچکە بۆ بیستن...هتد.

ئەمجار شارەزای کردون بۆ شێوەی سود بینین بەو شێوە سروشتیەی پێی بەخشیون، بۆ ئەوەی هەموو شتێك لەبواری خۆیدا بەکار بێنن، بۆچی دروست کراوە بۆئەوە بەکار بێ.

بەڕاستی ئەم وەصفەی پەروەردگار: کە قورئانی پیرۆز لەزمان موساوە ﷺ دەیگێڕێتەوە، پوختەی دیاردەو نیشانەو دەسەڵاتی خودایە، ئەو خودایەی ئەم بوونەوەرە هەڵدە سوورێنێ، بەخشینی وجود بۆ هەموو شتێك لەسەر شێوەو باری شیاوی خۆی، ڕێنموویی کردنیان بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی بۆی دروست کراون! هەر کاتێ ئادەمیزاد بەچاوی سەر لە خۆی بڕوانێ و بەچاوی دڵ لەدەوروبەری خۆی ورد بێتەوە، بەگوێرەی توانا سەرنج لەبونەوەر بدا، دیاردەو شوێنەوارو جێ دەستی ئەو شوێنەوارە ڕەهایە لەهەموو گەردیلەیەکی ئەم بوونەرە فراوانەدا دەردەکەوێ. هەر لەزەڕڕە تا مەجەڕە، لەبچووکترین خانەوە هەتا پێشکەوتوو ترین شێوەی ئادەمیزاد هەموویان دیاردەو نیشانەی قودرەتی خودای پەروەردگارن!

ئەم بوونەوەرە گەورەو فراوانەی کەپێك هاتووە لەگەردیلەو خانە، لەهەموو قەبارەو زیندەوەرێکدا، هەموو زەڕڕەیەك لەم بوونەوەرەدا دەماری زیندوی لێ

دەداو، هەموو خانەیەکی بەجۆرێك لەجۆران زیندووە، هەموو زیندویەکی جولانەوەو بزوتنەوەی هەیە، هەموو کائینێکی تێدا پێکەوە گونجاوو هاریکارن، هەموو گەردیلەو قەبارەو پارچەکانی بوونەوەر بەتاك و بەکۆ لەچوارچێوەی ئەو یاسایەی لەسروشتیدا دانراوەو لەگەڵ پێکهاتەی شێلراوە، تێکڕا لەگەڕدان و بەبێ وەستان و پشوو دان، بەبێ ئەوەی ساتە وەختێك لەکار بکەون لەهەڵسوڕان و ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانی خۆیاندان، ئای لەم کەون و کائیناتە سەیرو سەر سوڕهێنەرە، ئای لەو قودرەت و دەسەڵاتەی ئەم بوونەوەرەی پێك هێناوە؟!

هەموو کائینێکی ئەم بوونەوەرە بۆخۆی عالەمێکی سەربەخۆیە، لەناو ئەم عالەمەدا زەڕڕەو خانەو پارچەو کەرەستەکانی بەگوێرەی ئەو سروشتەی تێیدا دانراوەو لەسەری دروست کراوە بەرێك و پێکی کاری خۆیان ئەنجام دەدەن، بەگوێرەی یاسای خۆیان فەرمان بەردارن!

زانیاری ئادەمیزاد چەندێك پێش بکەوێ و چەندێك زانایان هەوڵ بدەن ناتوانن زانیاری تەواوو توێژینەوەی هەمەلایەن لەکائینێکی بوونەوەردا بکەن و حەقیقەتی عیلمی تێدا بەدەست بهێنن، زانیاری ئادەمیزادو هەوڵ و تەقەللای سنوور دارەو ناتوانێ بگاتە بنج و بناوانی ناسینی ئەو شتەو زانیاری و کۆششی کول و کۆڵەوارە، تازانیاری وەدەست بێنێ باشتر بۆی ئاشکرا دەبێ کەنازانێ و دەسە پاچەو داماوە.

کە وابوو پاك و موونەززەهە ئەو خودایەی بۆهەموو شتێك شێوەو ڕوخساری خۆی داوەتێ؛ بەڕاستی ئەو کەسە خودایە کە هەموو شتێکی لە نەبوونەوە بەدی هێناوەو شێوەو سەرو سیمای شیاوی خۆی پێ بەخشیوە، شارەزاشی کردووە کەچۆن هەڵس و کەوت بکاو سوود وەربگرێ و سوود بەخش بێ.

وابێ دەچێ وەڵامەکەی حەزرەتی موسا ﷺ زۆر کاریگەرو گورچك بڕبووەو فیرعەونی بۆڕ داوە، بۆیە فیرعەون چیدی لەسەری نەڕۆییشت و باری قسەکانی

گۆڕی‌و پرسیارێکی تری قوت کردەوە ﴿قَالَ﴾ وتی: ﴿فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الأُولَى﴾ دەی باشە ئەوەی تۆ دەیڵێی ئەگەر ڕاست بێ؟ ئەی وەزع‌و حاڵی گەل‌و نەتەوە پێشینەکانی وەکوو گەلی عادو ثەمود چۆنەو چۆن بووە؟ بۆکوێ چوون؟ کێ خودایان بووە؟ خۆ ئەوان فەوتاون‌و ئەو خودایەیان نەپەرستووە کەتۆ باسی دەکەی‌و بەخودای دەزانی؟

حەزرەتی موسا وەڵامی دایەوە ﴿قَالَ﴾ فەرمووی: ﴿ عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لا يَضِلُّ رَبِّي وَلا يَنسَى﴾ زانیاری لەو بارەوە لای خودای منە، خودای من هیچی لێ گوم نابێ‌و هیچی لەبیر ناچێتەوە. بێگومان بیرو باوەڕو کردەوەی هەموو ئەو مەخلوقاتانە لای خودا تۆمار کراوەو لە لەوحولمەحفوظدا نووسراوەو سەر ژمێر کراوە، نەگەورەو نەبچووک نەکەم‌و نەزۆر هیچی لێ نەفەوتاوەو هیچی لێ لەیاد ناکرێ، ڕۆژی قیامەت هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشت‌و سزای خۆی پڕاو پڕو عادیلانە وەردەگرێتەوە.

بەم جۆرە حەزرەتی موسا ﷺ ئەو ڕۆژگارە کۆنینەو ڕابردووە غەیبیە نەدیارەی حەواڵەی خودا کردو پێی ڕاگەیاند: کەزانیاری پەروەردگار وەکوو زانیاری ئادەمیزاد نیە شتی لێ تێك بچێ یان لێی گوم ببێ یان لەبیری بچێ.!!

هەڵبەتە فیرعەون مەبەستی بەم پرسیارە ئەوە بوو ویستی حەزرەتی موسا ﷺ لەزنجیرەی قسەکانی لابداو نەهێڵێ چیدی نیشانەی دەسەڵاتی خودا ڕابنوێنێ‌و بەڵگە کوتی بکا؛ نەوەکوو لەئاکاما ڕاستی پێغەمبەرایەتی‌و بەڵگەکانی بۆ خەڵکەکە دەربکەوێ‌و ئیمانی پێ بهێنن، ویستی بیخاتە ناو جەنگەڵی مێژووی کۆنەوەو بەگێڕانەوەی حیکایات‌و سەرگورشتەی گەلە پێشینەکان مەشغوولی بکا، بەڵام حەزرەتی موسا ﷺ زوو تێی گەییشت‌و خۆی لەو جەنگەڵە پڕ کون‌و کەلەبەرە ڕزگار کردو بەکورترین وەڵام‌و جوانترین مانا وەڵامی دایەوەو زانیاری ئەو شتانەی

حەواڵەی خودای غەیب زان کردو خۆی بەشیکردنەوەی ئەو بوارە هەڵەو گیر نەکرد!

دوای ئەوەی حەزرەتی موسا ﷺ بەشێوەیەکی گشتی فە ضل‌و بەخشندەیی خودای بۆ هەموو بوونەوەر رانواند، چەندبەڵگەیەکی هێنایەوە ئەمجار بەشێوەیەکی تایبەتی نیشانەی دەسەڵات‌و تاك‌و تەنهایی‌و بەخشندەی پەروەردگار بۆ ئادەمیزاد ڕادەنوێنێ‌و دەفەرموێ:

١- ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ الأَرْضَ مَهْداً﴾ خودای من خودایەکی وەهایە زەوی بۆ ئێوە وەکوو فەرش ڕاخستووە، باوی خۆش کردووەو گونجاندویەتی بۆئەوەی بتوانن بەئاسانی بەسەریدا بێن‌و بچن، بتوانن لەسەری جێگیر بن‌و تێیدا بحەوێنەوە. یان زەوی کردووە بەشوێنی حەوانەوەو ئارام گرتنتان تێیدا وەکوو چۆن لەبێشکەدا منداڵ ئارام دەگرێ.

٢- ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً﴾ لەسەر زەوی بۆئێوەی ڕەخساندوە چەند ڕێگاو بانێك بۆهاتوو چۆی خۆتان‌و کەل‌و پەل‌و کاڵاتان لە شوێنێکەوە بۆشوێنێکی تر وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجاً سُبُلاً لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ (الأنبياء ٣١) یان دەفەرموێ: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ (ازخرف/١٠) یان دەفەرمووێ: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطاً ، لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجاً﴾ (نوح/١٩-٢٠).

٣-﴿وَأَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى﴾ پەروەردگار لە بەرزاییەوە لەهەورەوە بارانی باراندووەو دەبارێنێ، بەو بارانە جۆرەها ڕووەك دەروێنین دانەوێڵەو بەرو بوومی جۆراو جۆرو ڕەنگاو ڕەنگ لەتام‌و بۆن‌و شێوەو ڕەنگ‌و ڕوخسارو سود بەخشیدا دەرەخسێنین، بڕێکیان بەکەڵکی ئادەمیزاد دێ‌و هەندێکی بۆ ئاژەڵ باشە. بۆیە دوابەدوای ئەوە فەرموێ: ﴿كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ﴾

واته: ئێمەجۆرەها ڕووەكمان لەزەویدا ڕەخساندووە، هەندێكی بۆئێوەی ئادەمیزاد باشەو سوودی لێ وەردەگرێ، هەندێكی بۆ ئاڵفی ئاژەڵ باشە، ئەوی بۆخۆتان باشەو لەگەڵ سروشتان دەگونجێ لێی بخۆن‌و بیكەنە خۆراك‌و میوەی خۆتان، ئەمجار ئاژەڵەكانتانی لێ بلەوەڕێنن، بەوشكی‌و تەڕی بیكەنە ئالفو خۆراكی مەڕو بزن‌و ڕەشە ولاخ‌و حوشترو گیانلەبەرە ماڵیەكانی ترتان‌و بەئارەزووی خۆتان بەرەڵایان بكەن بالێی بلەوەڕێن. ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى﴾ بێگومان لەوەی بۆمان باس كردن، نیشانەو بەڵگەی جۆراو جۆر هەن لەسەر تاك‌و تەنهایی خودا بۆكەسانێك عەقڵ‌و هۆشیان تەواوەو سروشتیان ڕێك‌و پێكە، ئەگەر بیریان لێ بكەنەوەو تێیان بفكرن دەزانن: كەجگە لەخودای تاك‌و تەنها خودای تر نین، هەركەسێ لافی خودایەتی لێ بدا یان شتی تر بەخودا بزانێ ئەوە سەر لێ شێواوو گومڕایە، بوختان دەكاو زێدە ڕۆیەو خۆی تووشی سزای سەخت دەكا.

ئەمجا پەروەردگار دوای ئەوەی: كەباسی زەوی‌و ئاسمانی كرد، سوودو قازانجی بوونەوەری بۆ ئادەمیزاد ڕوون كردەوە ئەوە ڕادەگەیەنێ: كەهەبوونی خێرو بێری ئاسمان‌و زەوی‌و مەبەستی سەرەكی لەم ژیانەدا قیامەتە، بەڵكو پێویستە بكرێن بەهۆكاری بەختەوەریی ژیانی دوایی‌و نازو نیعمەتی بەهەشتیان پێ دەستە بەر بكرێ!

دەفەرموێ: ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾ ئێوەمان لەزەوی دروست كردووە، هەموو جەستەی ئادەمیزاد لەزەوی دروست بووە، بژێوی زەوی دەخواو ئاوی زەوی دەخواتەوە، هەوای سەر زەوی هەڵدەمژێ، باوە ئادەمیشتان لەگڵی زەوی دروست كراوە، ئەو دڵۆپە تۆمەی ئێوەی لێ پەیدا بووە لەخۆراك پەیدا بووە، خۆراكیش لەزەوی فەراهەم هێندراوە. ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾ دووبارە دەتانگێڕینەوە بۆناو زەوی، كەمردن لەناو زەویدا دەنێژرێن‌و جەستەتان دەڕزێ‌و دەبنەوە خاك‌و خۆڵ.

﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ لەوە بەولاوە زیندوتان دەکەینەوە لەگۆڕەکانتان دەرتان دەهێنینە دەرێو ڕاپێچی حیساب و لێکۆڵینەوەی سارای مەحشەرتان دەکەین.

مەبەستی ئایەتەکە پاك و موونەزەهی خودایە لەهەموو نەنگیو ناتەواوییەك و وەبیر خستنەوەیە بۆ فیرعەون بەبناغەو ئەصلی خۆیو سەرەنجام و ئاکامی ژیانی، مردن و زیندوو بوونەوەی، پێی دەزانێنێ: کەرۆژێکی سەخت لەپێشیەوەیەتیو پرسیاری هەموو کارو کردەوەیەکی جیهانی لێ دەکرێو سزاو عیقابی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە. وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾ (الأعراف/٢٥).

## تۆمەتبارکردنی حەزرەتی موسا ﷺ بەجادوبازیی

﴿ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ ﴾

دوای ئەوەی فیرعەون پرسیاری ئاڕاستەی موساو هارون کردو وتی: خودای ئێوە کێیە ئەی موسا ﷺ ؟!

حەزرەتی موسا وەڵامی دایەوەو بەڵگەو نیشانەی بەهێزی هێنانەوە. ئەمجار حەزرەتی موسای تۆمەتبار کرد بەجادو بازیی‌و داوای بەرامبەری‌و پێشبڕکێی کرد لەگەڵ جادو بازەکانی خۆی‌داو ڕۆژی پێشبڕکێیان دیاری کرد. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَاهُ آيَاتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَى﴾ بێگومان ئێمە چەند نیشانەو بەڵگەیەکی کەونیمان نیشانی فیرعەون دان، زۆر موعجیزەی گەورەو بەڵگەی جۆراو جۆر کەهەموویان نیشانەی تاک‌و تەنهایی‌و خودایەتی ئێمەو پێغەمبەرایەتی موسا ﵇ بوون نیشانی فیرعەونمان دان، هەر نۆ موعجیزەکەی موسای بەچاوی خۆی بینین: بەڵام بەهۆی کوفرو عینادی خۆی بەدرۆی خستەوەو بڕوای پێ نەکردن، هیدایەتی وەرنەگرت‌و ئیمانی نەهێنا، زۆر بەسەر ڕەقی جولایەوە، لەموعجیزەکان وورد نەبووە، خۆی لەبەردەم بەڵگەو نیشانەکانی حەزرەتی موسادا ڕانەگرت‌و نەیتوانی پەرە بە وتووێژی هێمنانە بدا، فسقەڵ بوو، هەڵچوو، شێلگیر بوو: ﴿قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَا مُوسَى!﴾ بەتوڕەییەوە وتی: ئەرێ موسا! ئەتۆ لەخاکی مەدیەنەوە هاتووی بۆخمان بۆخۆت لێکردوین بە پێغەمبەرو، خەریکی بەم دەست‌و عەصا جادوبازیەت لەزێدو نیشتمانی خۆمان دەرمان بکەی.

فیرعەون بۆیە باسی بەزۆردەرکردنی خۆیانی کردو ئەم لایەنەی ووروژاند، بۆ ئەوەی بوو؛ گەل‌و نەتەوەکەی لەدژی حەزرەتی موسا ﵇ و پەیامەکەی گاڵ بداو هەڵیان بنێ بۆ ڕاپەڕین‌و بەگژدا چوونەوەی‌و وەدەرنانی لەلاکی میصر.

**فیرعەون ویستی بەدوو جۆر بەرەنگاری حەزرەتی موسا ﵇ وپەیامەکەی بکا:**

١- بەچاوڕاوو پروپاگەندە ڕق‌و کینەی خەڵکەکە هەڵسێنێ‌و پڕیان بکاو لەدژی موسا ﵇ بیانوروژێنێ، ویستی ئەوەیان لەدڵ دا بچەسپێنێ: کە موسا ﵇ نیازی خراپی هەیەو دەیەوێ بەناوی پێغەمبەرایەتی‌و بانگ خوازییەوە لەوڵاتی خۆیان دەریان بکاو خۆی ببێتە فەرمانڕەوا بەسەر وڵاتی میصردا! هەڵبەتە ئەمە پیشەو هەڵس‌و کەوتی هەموو ملهوڕو ستەمکارێکە لەهەموو چەرخ‌و ڕۆژگارێک دا،

هەر کە زانییان یەکێك پەیامی ڕاستیو خودا پەرسی پێیە، بانگەوازیی دەکا بۆ عەدالەتکاریو چەسپانی ئایینی خودا لەسەر زەوی، ئەو جۆرە پڕو پاگەندانەیان ئاراستە دەکەنو خەڵکی واتێدەگەیەنن: کەئەمانە مەبەستی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەمانە بەکرێ گیراوی بێگانەنو تابوری پێنجەمن. لەژێرەوە کار بۆ فلان تاقمو فلان وڵاتو فلان پێڕ دەکەن!!!

من بۆ خۆم چەند جار کەوتومە ناو گێژاوی دەمەدەمێی بەرپەرچدانەوەی خەڵکی سافیلکەو تێ نەگەیەندراو: کەحیزبە بانگ خوازەئیسلامییەکانی کوردستانی عێراق بەکرێ گیراون!!! سەیرە کوڕی گەنج ڕیشی هێشتۆتەوەو سیواکی لەباخەڵدایەو چەکی جیهادی بەشانەوەیەو (٥)دیناری لەباخەڵدا نیە. هەموو سەرو سیماو ڕەوشتی لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەکا کەچی بەفیتی کەسانی چڵکاو خۆر ملهوڕ خەڵکی سافیلکە بوختانی جۆراو جۆریان بۆ دەکەن.

کوڕی گەنجی موسوڵمان بەشێوەی لە سەرە خۆیو ئاشتی خوازانە خزمەتی بێ نەوایان دەکەن، لەکاتی برسێتیدا خواردن بەسەر هەزاران دا دابەش دەکەن، مزگەوتو خەستەخانەو پرۆژەی خێرخوازیی جۆراو جۆر بۆکوردستان دروست دەکەن، لەهەندەران سواڵو صەدەقە دەکەنو دەیهێنن بۆلێقەوماوانی کوردستان، کەچی بوختانی بەکرێ گیراوییان بۆ دەکەن، شتی وایان بۆ هەڵدەبەستن لەقوتوی هیچ عەتارێك دا نیە.!!! مەلایەك لەمزگەوتدا دوو قسەی حەق دەکا، دەڵێن ئەوە بەدۆلار مووچە وەردەگرێ !!!

٢- فیرعەون ویستی موسا ﷺ بە سیحربازو جادوگەر پیشانی گەلەکەی بدا، بۆئەوەی خەڵکی بەپێغەمبەری نەزانن. موعجیزەکانی بەسیحرو جادو لەقەڵەم بدەن. چوونکە لەو ڕۆژگارەدا سیحرو جادو باو بووە، ساحیرو جادوباز زۆر هەبوون، بەخەیاڵی فیرعەون ئەگەر بچەسپێ: کەموسا سیحری کردووە ئیتر بەر

پەرچدانەوەی ئاسانەو دەزانـدرێ: کەموعجیزەکـەی لـەخوداوە نـەهاتووەو ئـەویش یەکێکە وەکوو هەموو ساحیرو جادو بازەکانی ئەو ڕۆژگارە.

بۆیە یەکسەر ئەوەی ڕاگەیاندو وتی: ﴿فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِثْلِهِ﴾ سوێندم وابێ، بەوێنـەی ئـەو سیحرەی تـۆ ئێمـەیش سیحرێك دەخەینـە ڕوو، زۆر لامـان ئاسانە بەرپەرچی سیحرەکەت بدەینەوە، چونکە لەو جۆرە سیحرەمان زۆر لایە!!

کەواتە بەو سیحرە لەخۆت بـایی مەبـەو وامەزانـە هـەر تـۆ دەتـوانی سیحری ئاوا بکەی!!

ئەمجار فیرعەون وتی: ﴿فَاجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِداً لا نُخْلِفُهُ نَحْنُ وَلا أَنْتَ﴾ ئـەی موسـا! ڕۆژێکـی دیـاریکراو دابنـێ، ئێمـەو ئـەتۆ تێیـدا کـۆ دەبینـەوە، هیـچمان دوانەکەوین بۆ ئەوەی لەپێش چاوی خەڵکی بەو سیحرەی هەمانە، سیحرەکەت بەر پەرچ بدەینەوە، بیسەلمێنین: کەئێمەش وەکو تـۆ خـاوەن سیحرینو تـۆش یـەکێکی وەکوو ئەو هەموو سیحربازانەی ئێمـە.فیرعـەون بۆیـە ئـەم پێشنیارەی کـردو ئـەم قسەی ئاراستەی حەزرەتی موسا کـردو ئـەوی سەرپـشك کـرد ڕۆژەکـە دیـاری بکـا. تـادەری بخـا: کـە بـەخۆی ڕادەپـەرموێو لـەهێزو توانـای خـۆی دڵنیایـەو دەتـوانێ بەرەنگاری موعجیزەکەی حەزرەتی موسا ﷺ بکـا، هـەرکاتێ موسـا حـازر بـێ ئـەو ئامادەیە.

﴿مَكَاناً سُوًى﴾ بائـەو شوێنەی تێیـدا کۆدەبینـەوە دەشـتێکی پـانو پـۆڕبێ، چاڵو کەندو تەپۆڵکەی تێدا نـەبن، هـەموو کـەس چـاوی لێ بـێو بزانـێ: کـەبۆڕت دەدەینو بەر پەرچت دەدەینەوە.

حـەزرەتی موسـا ﷺ تەحەدداکـەی فیرعـەونی قبـوڵکردو ڕۆژی بـەرنگار بوونەوەی دیاری کردو: ﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ الزِّينَةِ﴾ وتـی باشـە: مەوعیـدو ڕۆژی دیـاریکراو بۆتـان ڕۆژی خۆڕازاندنـەوەتان بـێ، ڕۆژی پـشوودانی ئـادەمیزادان بـێ،

ئەوڕۆژە بێ کەخەڵکی میصر هەموویان کۆدەبنەوەو خەریکی ڕابواردنن دەڵێن؛ ئەو ڕۆژە دیاری کراوە ڕۆژی جەژنی نەورۆز بووە.

بۆئەوەی زۆرترین کەس لەهاوڵاتیان ئامادە بن و حازری کێبەرکێکە بن. ﴿وَأَنْ يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحًى﴾ باکۆبوونەوەکە کاتی چێشتەنگاو بێ، کاتێك بێ خەڵك لە ئەوپەڕی نیشات دا بن و دونیا تەواو ڕووناك بێ، بەم جۆرە حەزرەتی موسا ﷺ بەرامبەری و تەحەدداکەی فیرعەونی کردو، بێ باکی خۆی لە کێبەرکێکە ڕاگەیاندو ڕۆژو کاتێکی هەڵبژارد؛ کەزۆرترین خەڵکی تێدا کۆببێتەوە، ڕووناکترین و گونجاو ترین کات بێ بۆ بینینی بەرامبەرییەکە، بەیانی زووی هەڵنەبژارد چونکە ئەو کاتە زووە هەموو کەس لەماڵ نایەتە دەرێ. نیوەڕۆشی هەڵنەبژارد چونکە لەوانەیە گەرما بێ، ئێوارەشی دانەنا چونکە لەوانەیە تاریك بێ و خەڵکی ڕووداوەکە نەبینن.

## فیرعەون ساحیرەکان کۆدەکاتەوە حەزرەتی موسا ﷺ لەعەزابی خودا دەیان ترسێنێ

﴿ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ

أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾

حەزرەتی موسا ﷺ و فیرعەون لەدیاری کردنی ڕۆژی کێبڕکێکە ڕێککەوتن ڕۆژی جەژنیان دانا بۆئەو ڕووبەڕو بوونەوەیە.

هەڵبەتە لێرەدا سیاقی قورئان بەکورتی باسی هەوڵو تەقەڵلای فیرعەون دەکا، چۆن ساحیرەکانی کۆکردنەوە، چۆن ئامۆژگاری کردنو وادەو بەڵێنی جۆراو جۆری پێدان، هەڵێنان، بەڵێنی بەخشیشو دیاریی پێدان ئەگەر سەرکەوتوو بوون، دەفەرمووێ:﴿ فَتَوَلَّى فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُ ثُمَّ أَتَى﴾ ئیتر فیرعەون لەخۆ کەوتو کەوتە هەوڵو تێکۆشانو دەستی کرد بەکۆ کردنەوەی ساحیرو جادوبازی ناو وڵات، ساحیرو جادوباز کۆبوونەوە خۆیان ئامادە کرد و چاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی دیاریکراو بوون، پێش هاتنی ڕۆژی بڕیار دراو فیرعەون کۆبوونەوەی بەساحیرەکان کردو گەورەپیاوانی دەرباروو کاربەدەستە گەورەکانی ئامادەی ئەو کۆبوونەوە بوونو وادەو بەڵێنی زۆرو جەوری پێدان، ڕۆژی دیاریکراو هاتو خۆر هەڵات، فیرعەونو کاربەدەستەکانی بەرەو گۆڕەپانی دیاریکراو ڕۆیشتنو لە شوێنێکی بەرچاو جێگەیان گرت، حەزرەتی موساو حەزرەتی هارون، گەیشتنە گۆڕەپان، ساحیرەکانی فیرعەون بەکۆمەڵ هاتنە شوێنی دیاریکراو بەڕیز وەستان، فیرعەون دووبارە هەڵێنان، تەماعی بەرنان، هەڕەشەی لێ کردن، ترساندنی، ساحیرەکان ویستیان بزانن، ئاخۆ ئەگەر سەر کەوتوو بوون خەڵاتو بەخششیان چیە؟، فیرعەون کرێیان دەداتێ، ﴿قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْراً إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ ؟ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذاً لَّمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ (الشعراء/٤١-٤٢).

فیرعەون وادەی بەخشیشی ماددی‌و ئەدەبی پێدان وتی: بەڵێ: ئەگەر سەرکەوتن پاداشتان دەدەمەوەدیاری‌و بەخششی باشتان دەدەمێ لەخۆمتان نزیك دەکەمەوە قسەتان دەڕوا ڕێزتان لێ دەگرم.

حەزرەتی موسا ﷺ وای بەباش زانی - پێش ئەوەی موباراتەکە دەست پێ بکا ئامۆژگاری ساحیرەکان بکا، بیانترسێنێ لەئاکامی درۆو بوختان‌و بەربەرەکانی موعجیزەی ڕاست‌و حەق، ﴿قَالَ لَهُمْ مُوسَى﴾ حەزرەتی موسا ﷺ بەساحیرەکانی وت: ﴿وَيْلَكُمْ﴾ کوڕە هاوار بۆئێوە، ماڵ وێران خۆتان، بیرێك لەخۆتان بکەنەوە ﴿لا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِباً فَيُسْحِتَكُمْ بِعَذَابٍ﴾ لەسەر خودا درۆ هەڵمەبەستن!! ئەگەر درۆ هەڵبەستن خودا بەسزای ڕیشە کێش لەناوتان دەباو دەتانفەوتێنێ. نەکەن وابزانن: کەئەو موعجیزە من دەینوێنم حەق نیەو سیحرو چاو بەستەکیەو جۆرێکە لەو سیحرەی ئیوە ئەنجامی دەدەن ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ افْتَرَى﴾ بێگومان بەهیلاکچوو کەسێکە: کە درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەستێ!! قسەی ڕاست‌و هەڵقولاو لەدڵی پاکەوە ڕۆڵی خۆی هەیە، جاری واهەیە دەچێتە ناو دڵەوەو کاریگەری دەبێ. واپێدەچێ ئەم ئامۆژگاریانەی حەزرەتی موسا ﷺ لەدڵی ساحیرەکاندا جێگیر بوون، برێك لەساحیرەکان بەئامۆژگاری موسا ﷺ کەوتنە دوودڵیەوە، لەبەرامبەری کردن‌و دژایەتی حەزرەتی موسا ﷺ زێوان بوونەوە هەندێکیشیان سوور بوون لەسەر دژایەتی کردن‌و ڕوبەڕوو بوونەوەی حەزرەتی موسا ﷺ ، ئیتر ﴿فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى﴾ ساحیرەکان لەناو خۆیاندا کێشەیان تێ کەوت، کەوتنە دەمە دەمێ‌و چپە کردن، دەیانەویست حەزرەتی موسا ﷺ گوێی لەناخاوتنەکەیان نەبێ.هەندێکیان هەندێکیانیان هەڵدەنا بۆ سوور بوون لەسەر ڕوبەڕو بوونەوە، هەوڵیان دەدا ئەوانەی دڵیان سارد بۆتەوە بیانهێننەوە سەر بیرو باوەڕی پێشوویان‌و نەهێڵن پاشە کشە بکەن. چاوو ڕاویان لەزێوان بووە کان دەکردو دەیانترساندن لەسەرکەوتنی حەزرەتی موساو هارون، قسەکانی فیرعەونیان بۆشی دەکردنەوە،

دەیانگوت ئەمانە مەبەستی تایبەتی خۆیان هەیەو دەیانەوێ ببنە فەرمانڕەوای میصرو بیرو باوەڕی دانیشتوان تێك بدەن، پێویستە هەموومان یەك هەڵوێست بین‌و بەرامبەریان بوەستین. ئەمڕۆ ڕۆژی ڕووبەڕوو بوونەوەی یەكالا كەرەوەیەو نابێ وابكەین بهێڵین ئەم دوو پیاوە بالا دەست ببن. ئیتر بەئاشكرا قسەكانی فیرعەونیان كاوێژ كردەوە ﴿قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَنْ يُخْرِجَاكُمْ مِنْ أَرْضِكُمْ بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ الْمُثْلَى﴾. ئەوانەیان: كەسوور بوون لەسەر بەر بەرەكانی كردنی حەزرەتی موساو هارون، بەوانەیان دەگوت: كەدوو دڵ بوون‌و ناموژگاریەكانی حەزرەتی موسا ﷺ كاری تێ كردبوون. دەیانگوت: بەڕاستی ئەم دووانە: كەلافی پێغەمبەرایەتی لێ دەدەن، دوو جادو گەرن، دەیانەوێ بەهۆی سیحرەكەیانەوە لەخاك‌و زێدی خۆتان دەرتان پەڕێنن، وڵاتتان داگیر بكەن‌و خۆیان ببنە پاشاو فەرمانڕەوای میصرو بیروباوەڕو یاساو ڕێسای ژیانتان لەناو بەرن، ئەو ئایینە جوانەی هەتانە نەمێنێ. ئەو ئازادی‌و سەربەستیەی بۆتان دەستە بەر بووە لێتان بستێننەوە!

ئاشكرایە: كەقسەكانیان دووبارە كردنەوەی وتەكانی فیرعەونە، ئەمانیش هەمان پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسە دەڵێنەوە. ئەمەش داب و نەریتی چڵكاو خۆرانی دەرباری ملهوڕو ستەمكارانن لەهەموو ڕۆژگارێك دا باوەو پەیڕەو دەكرێ.

﴿فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ﴾ كەوابێ پێویستە لەسەرمان هەموومان بەیەكڕیز لەبەردەم خەتەری ئەمانە ڕابوەستین، دەی چیتان لەدەست دێ لەبەرگری كردن، چ فێڵ‌و جادوێك دەزانن بۆبەر پەچدانەوەی ئەم دووانە بیخەنە گەڕو ﴿ثُمَّ ائْتُوا صَفًّا﴾ پاشان هەمووتان بەیەك ڕیز بوەستن‌و بەیەكجار ئەوەی لاتانە پیشانی بدەن با بینەران هەموویان سەر سام بن‌ولێهاتووی‌و زاناییمان ئاشكرا ببێ‌و بەسەر ئەم پیاوە نیاز خراپانەدا زاڵ ببین ﴿وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَى﴾ بێگومان ئەمڕۆ ئەو كەسە بەمراز گەیشتووە لەئێمەو لەئەو دووانە كە لەبەربەرەكانیدا زاڵ بێ‌و بەسەر

بەرامبەرەکەی دا سەرکەوتوو بێ، ئەمڕۆ ڕۆژی تەنگانەیەو ڕۆژی یەکالا کەرەوەیە، پێویستە کوڕی تەنگانە بین لەئاستی ئەو بەرپرسیاریەدا بین: کە فیرعەون خستویەتە ئەستۆمان.

خوێنەری هێژا بۆخۆت هەڵوێستەیەك بکەو سەرنج بدە، بڕوانە هێزی ئیمان‌و باوەڕ بەخودا چەند کاریگەرە؟ دوژمنان چەند لێی دەترسن، چۆن حیسابی بۆدەکەن، چ ترس‌و بیمێك دەخاتە ناو دڵی کۆمەڵی کوفرو بێدینەوە، چۆن وەلەرزیان دێنێ، حەجمینیان لێ هەڵدەگرێ، ئەگینا حەزرەتی موساو حەزرەتی هاڕوون دوو کەسن، دوو هەژارن لەگەڵ‌و نەتەوەیەکی ژێر دەستە، چەند ساڵە گەلەکەیان دەچەوسێندرێتەوە، کوڕەکانیان بەزارۆکەیی سەر دەبڕێن‌و مێینەیان دەهێڵرێنەوە بۆکارەکەری، ئەمان دوو کەسن‌و کەسیان لەپشتەوە نیە، ساحیرەکان زۆرن‌و لە پشتیانەوە فیرعەون‌و دەسەڵات‌و لەشکرو جەبەروتی ماڵ‌و سامانی بێ شمارو دارو دەستەی گوێ لەمست! بەڵام موساو هاڕوون خودایان لەپشتەو بەهێزو توانای ئەوەوە ئاوا پشت ئەستورو چاو نەترسن.

ئەوە هەیبەت‌و شکۆمەندیە، هێزی ئیمان بەخودا خستویەتیە سەر موساو هاڕوون ئاوا فیرعەونی ستەمکارو ملهوڕی هێناوەتە عامێلکە، پیاوانی دەربارو ڕاوێژکارانی کەوتونە جم‌و جوڵ‌و پیلان دانان، ساحیرو جادوبازانی وڵاتیان کۆکردۆتەوەو ئەم هەموو حەشاماتە چوونە بەرەنگاری دوو کەس بەڵێ دوو کەس.

کەواتە: دەبێ موسوڵمان هەمیشە لەگەڵ خودا بێ، پشت بەخودا ببەستێ، بڕوای وابێ کەسێك خودای لەپشت بێ هەر ئەو سەرکەوتوو بەمراز گەیشتووە.

بەڵێ بەرواڵەت پلان سەری گرت، ساحیرەکان هەموویان هاتنە پێشەوەو ڕیزیان بەست لەبەرامبەر دووکەس.

## دەست پێکردنی موبارەزە لەنێوان حەزرەتی موسا ﷺ و ساحیرەکانداو پاشان ئیمان هێنانیان

﴿ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَـٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَـٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَـٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَـٰيَـٰنَا

﴿وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾﴾

**دوای ئەوەی ساحیرەکان هاتنە گۆڕەپان و ڕیزیان بەست و بەرامبەری دەستی پێ کرد، ساحیرەکان حەزرەتی موسا یان سەر پشك کرد، ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ئەی موسا! ﴿يَا مُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى﴾ بۆخۆت سەر پشك بە، یان تۆلەپێشدا عەصاکەت بهاوێژەو توانای خۆت نیشان بدە، یان ئێمە یەکەم کەس دەبین بۆهاویشتنی گوریسەکانمان.**

**ئەم سەر پشك کردنەیان جۆرە ئەدەبێکی تێدا بوو لەلایەن ساحیرەکانەوە بەرامبەر حەزرەتی موسا ﷺ، ئاماژەی ئەوەشی تێدایە: کەئەوان ویژدانیان بەخەرج داو جۆرە تەوازوعێکیان نواند،هەر دەڵێی خودا ئەوەی خستنە دڵەوە.**

**حەزرەتی موسا ﷺ وای بەباش زانی: کەئەوان یەکەمجار سیحری خۆیان ئەنجام بدەن، چونکە ئەگەر ئەوان توانای خۆیان بەخەرج داو ئەوەی لایان بوو خستیانە ڕوو، دوایی خودا دەسەڵاتی ئەو سەر دەخاو بەحەق بەتاڵ دەپووچێنێتەوە، موعجیزە بەسەر سیحردا سەردەخاو دەبێتە نیشانەی بەر چاوو ئاشکرا بۆ تەماشا کەران و پەندو ئامۆژگاری بۆهەرکەسێك تێ بفکرێ.**

﴿قَالَ﴾ حەزرەتی موسا پێی وتن: ﴿بَلْ أَلْقُوا﴾ بەڵکو ئێوە لەپێشدا سیحری خۆتان بهاوێژن، باسەرەتا سیحرەکەی ئێوە ببینینو ناوەڕۆکی کاری ئێوە دەر بکەوێ، جا کە ساحیرەکان سیحری خۆیان نواند، سیحرێکی سەرنج ڕاکێش بوو، جموجۆڵێکیان بەگوریسەکانیان کرد گۆڕەپانەکەیان هەژاند تەنانەت موساشیان ترساند.﴿ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى﴾ ئەوە بوو: کاتێک گوریسو گۆچانەکانیان هەڵدا بۆناو گۆڕەپانەکە، موسا ﷺ وخەڵکەکە تێکڕا وایان زانی: کەبەڕاستی ئەو حەبلو گۆچانانە گیانیان بە بەردا کراوەو ماریی ڕاستین.

وشەی ﴿اذا﴾ بەلای زومەخشەرییەوە ﴿اذا﴾ی موفاجەئەیە ئیمامی ڕازی دەڵێ ئەم ﴿إذا﴾ یە بەمانا کاتە واتە ظەرفە.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا أَلْقَوْا سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾ (الأعراف/١١٦) ئەوە بوو ساحیرەکان جیوەیان بەکار هێنابوو، خستبویانە ناو بۆشایی حەبلو گوریسەکانیانو بەگەرمای خۆر دەکەوتنە (هەلەکە سەما) هەرکەسێ چاوی پێیان بکەوتایە وایدەزانی ئەو گوریسانە بەویستی خۆیان وەجمو جوڵ هاتون، وایدەزانی گۆڕەپانەکە پڕبووە لەماری ڕاستی.

بۆیە ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى﴾ موسا لە دڵی خۆیدا ترسی لێ نیشت، فیرعەونو دارو دەستەکەی کەیفو خۆش بوون وایان زانی ئیتر ساحیرەکان براوەنو بەسەر موساو هارون دا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. ﴿قُلْنَا لا تَخَفْ إِنَّكَ أَنْتَ الأَعْلَى﴾ وتمان مەترسە بێگومان تۆسەرکەوتوی. ئەتۆ حەقت لەگەڵدایەو ئەوان لەسەر بەتاڵن، ئەتۆ بیرو باوەڕت لەگەڵدایەو ئەوان چاوبەستەکێو دەست سووکی، ئەتۆ خودات لەگەڵدایەو ئەوان فیرعەونی ملهوڕی ستەمکار لەپشتیانە!

﴿وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾ ئەی موسا! هیچ مەترسە ئەو عەصایە کەوابەدەستەوەیە بیهاوێژە یەکسەر دەبێتە ئەژدیهاو هەموو عەصاو گوریسەکانی ئەوان قووت دەدا، ئەوەی ئەوان چاوبەستەکیان پێ لەو خەڵکە کردوە فرتو فێڵی سیحر بازانە، جادو بازیو خەیاڵەو حەقیقەتی نیەو بەردەوام نابێ، هەرگیز سیحرباز سەرکەوتوو نابێ، هەرچی بیکاو لەهەر شوێنێکەوە بێ بەمراز ناگا.

حەزرەتی موسا ﷺ عەصاکەی خۆی هاویشتو کارەسات ڕووی دا، موعجیزەی گەورە هاتە دیو بەڵگە ئاشکرابوو حەق دەرکەوت، بینەران هەموو سەرسام بوون، چونکە بینیان عەصاکەی موسا ﷺ بووبە ئەژدیهاو هەموو مارە درۆزنەکانی ئەوانی قووت دا، ساحیرەکان هەستیان کرد: کەئەوە جادو بازیو سیحر نیە، ئەوە کاری خودایە، موعجیزەی پێغەمبەرە.﴿ فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّداً قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى﴾ ساحیرەکان کەوتنە سوژدەو هەموو بەیەك دەم هاواریان کردو وتیان: ئیمانمان هێنا بەخودای موساو هارون، قیامەتیان بەسەر دونیادا هەڵبژارد، بەتاڵیان واز لێ هێناو باوەشیان بەحەق داکرد.

ئیبنو عەبباسو عوبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێن: ئەوانە چێشتەنگاو ساحیرو جادوباز بوون، کەچی بۆ ئێوارە بوون بەشەهیدی خودا پێداو.

عیکریمە لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: ساحیرەکان حەفتا کەس بوون بەیانی ساحیرو ئێوارە بوونە شەهید.

ئیمامی ئەوزاعی: دەفەرمووێ: کەساحیرەکان کەوتنە سوژدە بەهەشتیان نیشان دراو باش باش بینیان.

زومەشخەری دەفەرموێ: بەڕاستی ڕووداوی ئەمانە سەیر بوو: حەبلو عەصای خۆیان هاویشتن لەبەر کوفرو ئینکاریکردن، پاش سەعاتێك سەریان خستە

سەر زەوی بۆ سوپاس گوزاری‌و سوژدە بردن. سوبحانەڵڵا! ئەم دووهەڵوێستە چەند لێك جوداوازن.

تێبینی دەکرێ؛ ساحیرەکان کەکەوتنە سوژدە وتیان: ئیمانمان هێنا بەخودای موساو هارون. نەیان گوت ئیمانمان هێنا بەخودای بوونەوەر.... چونکە فیرعەون لافی خودایەتی لێ دەداو خۆی بەخودای هەرە باڵا حسێب دەکرد. ئەوە بوو گوتی ﴿أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (النازعات/٢٤) یان گوتبووی ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾ (القصص/٣٨) جائەگەر ساحیرەکان بیانگوتایە (آمنا برب العالمین) فیرعەون دەیگوت: ئەوە ئیمانیان بەمن هێنا. دەزانن من خودای ئەوانم‌و بەندایەتی هەر بۆمن دەکەن.

ئەوجۆرە تەعبیرەیان دەربڕی بۆئەوەی یەکسەر خودایەتی فیرعەون ڕەت بکەنەوە. بەڵگەمان لەسەر ئەم بۆچوونە پێشخستنی ناوی هاروونە بەسەر ناوی موسادا، چونکە ئەگەر بیانگوتایە ﴿آمَنَّا بِرَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾ ئەوکاتە فیرعەون دەیگوت: مەبەستیان منە، چونکە من موسام پێگەیاندووەو بەمندالّی بەخێوم کردووە من ڕەببی موسام. وەکوو قورئان لەزمان فیرعەونەوە دەگێڕێتەوە. دەڵێ: ﴿أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا﴾ (الشعراء/١٨) جا فیرعەون: کەئەم حاڵەی بینی، ئەوەی بەتەمابوو بێتەدی بەپێچەوانەوە هاتەدی، کوردی گوتەنی (چوو شاڵ بکا گوێشی دانان) تینی بۆهات‌و کەوتە مەوقیفێکی حەرێجەوە. ترسا لەوەی مەردومگەلەکە تێکڕا بکەونە سوژدەو چاو لەساحیرەکان بکەن‌و ئیمان بەخودای بەرزو باڵادەست بهێنن، بۆیە خێرا مەوقیفەکەی قۆزتەوەو گومانێکی تری هاویشتە سەر پەیامی حەزرەتی موساو هارون. ﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾ وتی: ئەرێ ئەوە ئیمانتان هێناو باوەڕتان بەموسا کرد پێش ئەوەی من مۆڵەتتان بدەم؟؟

بێگومان ئیمان هێنانەکەتان بەموسا لەتێفکرینو ورد بوونەوە نیە، بەڵکو ئێوە لەموساوە فێری سیحر بوونو ئەو مامۆستاو ڕابەرتانە، ئێوە قوتابی ئەونو لەپێشەوە ڕێك کەوتوونو لەناو خۆتان دا، لەگەڵ موسا ئەم پیلانەتان دارشتووەو دژی منو گەلەکەمو دەتانەوێ موسا بەسەر من دا زاڵ بێ!! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَـذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَا أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف/١٢٣).

فیرعەون ویستی بەم قسانەی گومان بخاتە دڵی بینەرانەوە بۆئەوەی ئەوانیش وەکوو ساحیرەکان ئیمان نەهێنن نەگینا فیرعەون بۆخۆی باشباش دەیزانی: کەساحیرەکان لەموساوە ﷺ فێری سیحر نەبوون، لەنێوان حەزرەتی موساو ئەواندا هەرگیز پەیوەندی نەبووە.

ئەمجار فیرعەون پەنای بۆهەڕەشەو چاو سوورکردنەوە برد، ئەمەش پیشەی هەموو ملهوڕو دەرەبەگێکە، هەرکاتێ نەیان توانی دڵەکان داگیر بکەن، گیانەکان بەیدەست بکەن، پەنا دەبەنە بەر سزادانو ئەشکەنجەدان، چاوو سوور کردنەوەو هەڕەشەکردن، سەیر بکە فیرعەون چۆن ساحیرەکان دەترسێنێ، چ هەڕەشەیەکیان لێ دەکا؟ هەڕەشەی کوشتنو بڕین، هەڕەشەی هەڵواسینو دەستو قاچ بڕینەوە!!

﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ النَّخْلِ﴾ سوێند بێ، شەرتو قەرار بێ، من دەبێ کەلەپارچەتان بکەم، دەستو قاچتان ڕاستو چەپ دەبڕم (دەستی ڕاستو قاچی چەپ یان بەپێچەوانەوە) ئیبنو عەبباس دەفەرمووێ: فیرعەون یەکەم ستەمکارێکە کەئەو جۆرە سزایەی داهێنا. بەمەش ئادەمیزاد بەتەواوی لەگڵو گۆ دەکەوێ.

هەروەها سوێندم وابێ بەسەر دارخورمای بەرزەوە هەڵتان دەواسم، بۆئەوەی هەموو کەس بزانێ چیتان بەسەر هاتووەوببنە پەندو عیبرەتی ڕۆژگار!!

﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَا أَشَدُّ عَذَاباً وَأَبْقَى﴾ بەتەئکید دەزانن‌و بۆتان دەردەکەوێ لـەمن‌و خـودای موسا کامـەمان سـزای تونـدترو هەمیـشەترە!! ئەمـەش تەحـەددا کردنـی دەسـەڵاتی خودایـەو بەسـوك زانینـی موسـایەو ئامـاژە بەدەسـەڵات‌و هێـزو توانـای خۆیەتی! بەڵام تازە کار لـەکار ترازابـوو، ئیمـان‌و بـاوەڕ کـاری خـۆی کردبـوو، بیرو باوەڕی ڕاستەقینە گەیشتبووە نـاو دڵیـان‌و جیگێـر بـوو بـوو، جگـە لـەخودا لـەهیچ نەدەترسـان، باکیـان لەهەڕەشـەو ژیـان‌و کـاڵای دونیـا نـەبوو، تەنانـەت ئـەو کاتـەش کەفیرعەون پەلاماری دان، ئەوان هەر سوور بوون لەسەر هەڵوێستی خۆیان‌و گیـانی خۆیان بەلاوە مەبەست نەبوو، بەئاشکراو لەو تەنگانەیـەدا ﴿قَالُوا لَنْ نُؤْثِرَكَ عَلَى مَا جَاءَنَا مِنْ الْبَيِّنَاتِ وَالَّذِي فَطَرَنَا﴾ وتیـان: ئێمـە تـۆ هەڵنابـژێرین بەسـەر ئـەو پـەیام‌و هیدایەتەی حەزرەتی موسا ﷺ لەخواوە بۆی هێناوین، ئەوەتا مـوعجیزەی جـۆراو جـۆرو ئاشـکراو نومایـانی نیـشان داویـن، بـڕواو یـەقینمان بـۆ پەیـدا بـووە: کەئـەو پێغەمبەرەو لەخوداوە نێردراوە.

ئێمە تۆ هەڵنابژێرین بەسەر دروسکەرو بەدیهێنەرمان لەنەبووەوە، هەر ئـەو خودایەو ئەو شیاوی عیبادەت‌و بەندایەتی بۆکردنە نەك تۆ.

﴿فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ﴾ چـیت لەدەسـت دێ تەقـصیری مەکـە: بـێ منـەت بـە ﴿فَاقْضِ مَا أَنْتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِي هَذِهِ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ ئـەوەی تۆئـەنجامی بـدەی لـەم ژیانی دونیایەدایە، هەر ئەوەنـدە دەتوانی بمانکوژی لەناومان بەری، خۆ لەوە زیـاتر ناتوانی چی تـر بکـەی، لـەپاش مردنمـان هیـچی تـرت بۆلەگـەڵ نـاکرێن. دەی ئێمـە ئێستا پێمان خۆشە لەم ژیانە ڕزگارمان بێ‌و بکەوینە ژیانی نەبڕاوەی قیامەتەوە.

﴿إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا﴾ ئێمە ئیمانمان بە خودای خۆمان هێناوە، ئەو خودایـەی خـاوەن بەخشـشە. ئیمانمـان هێنـا بۆئـەوەی تاوانـەکانمان بـسڕێتەوە، لەگوناهمان خۆش بێ، بەتایبـەتی ﴿وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنْ السِّحْرِ﴾ ئـەو تاوانـەی

بەزۆر پێت کردین لەسیحرو جادوبازیی. بۆئەوەی بەرمنگاری موعجیزەی حەق بکەین.

(الحسن) دەفەرمووێ: ساحیرەکان بۆیە کۆکرابوونەوە بەرنگاری موسا ﷺ ببنەوە، بەتۆپزی کۆکرابوونەوە بەزۆر سیحریان پێ ئەنجام دان، سەرۆکەکانیان حەفتاو دوو کەس بوون، دووکەسیان قیبطی بوون، ئەوانی تر لەنەتەوەی ئیسرائیل بوون، فیرعەون زۆری لێ کردبوون؛ کە فێری سیحر ببن.

﴿وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ خودا زۆر لەتۆ باشترە لەبارەی پاداش دانەوەو بەردەوامی پاداشی، عەزابو سزای زۆر لەعەزابو تۆڵەی تۆ بەردەوام ترە.

کەواتە: گوێڕایەڵو ملکەچی پەروەردگاری خۆمانینو باکمان لەهەڕەشەو تۆقاندنی تۆ نیە.

ئەمجار ساحیرەکان خودا خستیە دڵیانەوە: کە ئامۆژگاری فیرعەون بکەنو لەسزای تۆڵەی دۆزەخ بیترسێننو تەماعی خۆشیو ڕازاوەیی بەهەشتی بخەنە بەر چاو، وتیان: ﴿إِنَّهُ مَنْ يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِماً﴾ بێگومان شەئنو حاڵ وایە: هەرکەسێ ڕۆژی قیامەت بەتاوانباری بێتە خزمەت خودا، واتە: بەکافریی بمرێ، ئەوە ﴿فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ﴾ بێگومان بۆهەتا هەتایە دۆزەخ جێگایەتیو بەئاگری بێ ئامان عەزاب دەدرێ ﴿لا يَمُوتُ فِيهَا وَلا يَحْيَا﴾ لەدۆزەخدا نامرێ هەتا ڕزگاری ببێو لەکۆڵ بێتەوە، ناژی بەژیانێك کەسودی هەبێ، ئەو کەسە ئازار دەچێژێ تادەگاتە حاڵەتی مردن وەلێ وای لێ نایە هەست کردنی ئازاری نەمێنێ، بەکوردی نەژیانی ژیانەو نەدەمرێ.

صەخر کابرایەکی عەرەب بوو نەخۆش بوو، لەخێزانەکەیان پرسی صەخر چۆنە؟ وتی: نەوایە بژیو بەتەمای بین، نەوەیە بمرێو بۆی بگرین.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿لَا يُقْضَى عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾ (فاطر/ ٣٦)

﴿وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِناً قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُوْلَئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَا﴾ کەسێکیش بەخزمەت خودای خۆی بگاتەوە بەموسوڵمانی بمرێ، ئیمانی بەخوداو بە پێغەمبەری خوداو بەموعجیزەی پێغەمبەرانی هەبێ: کەهەندێ لەموعجیزەی پێغەمبەران ئەم موعجیزانە بوون: کەئێمە بینیمانن. وێڕای ئەو ئیمانە کردەوەی باشی هەبێ، کردەوەکانی نیشانەی ڕاستی ئیمانەکەی بن، ئەوە ئەوانە بەهۆی ئیمانی ڕاستیانو کردەوەی باشیانەوە بەفەضلو ڕەحمەتی خودا بەهەشتی ڕازاوەیان بۆهەیە، لەبەهەشتی جوانو ڕازاوەدا پلەی بەرزیان دەدرێتێ، دەخرێنەلای ژورووی بەهەشتەوە.

لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا هاتووە دەفەرموێ: (أن اهل عليين ليرون من فوقهم كما ترون كوكب الغابر في أفق السماء لتفاضل مابينهم، قالوا يارسول الله تلك منازل الأنبياء، قال بلى والذى نفسي بيده رجال امنوا بالله وصدقوا المرسلين) لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێ: ئەبو بەکرو عومەر ئەو شوێنەیان بەنسیب دەبێ.

ئەمجار قورئان پلە بەرزەکانی بەهەشت ڕوون دەکاتەوە. دەفەرموێ: ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوپلە بەرزانەی بەهەشت بریتین لەچەند باخ و باخاتێکی وەها: کەشوێنی تێدا مانەوەو تێدا ڕابواردنن، بەژێر باڵەخانەو ژوورەکانیان دا چۆمو جۆگای ئاوی جوان دەکشێن، بۆهەتا هەتایە لەوباخو باڵە خانانەدا دەمێننەوەولێی دەرناچن!

﴿وَذَلِكَ جَزَاءُ مَنْ تَزَكَّى﴾ بەخشینی ئەو بەهەشتە پێیان پاداشی کەسێکە خۆی لەتاوان پاك کردبێتەوە.

خودا پەرستی کردبێ، شوێن پەیامی پێغەمبەرانی خودا کەوتبێ! جا ئەگەر فیرعەون هەرِەشە لەوانە دەکا بەعەزابی بەردەوامو سەخت، ئەوەتا: کەسێك بەتاوانباریی بێتە لای خودا عەزابی هەمیشەیی دەدرێ لەکۆڵی نابێتەوە لەناو ئەو عەزابەدا نەژیانی ژیانە نەمردنی مردنە، لەلایەکی ترەوە بۆخودا پەرستان ئەو دەرەجە بەرزانەی بەهەشت ئامادە کراونو دەچنە ناوی بۆیە تێکڕا ئەوانەی ئیمانیان هێنا گاڵتەیان بەهەڕەشەکانی فیرعەون هاتو بەئیمانی پتەوەوە بەرەنگاریان کرد.

## خنکانی فیرعەونو لەشکرەکەی لە دەریاداو نیعمەتی خودا بەسەر بەنی ئیسرائیلدا

﴿ وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ

غَضَبِيٓۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾

پەردەی بەسەر دیمەنی پێشوودا دایەوە، دیمەنی سەرکەوتنی حەق‌و ئیمانی لەواقیعی مەشهووددا بەسەر کوفرو ئیلحاددا ڕانواند، بیرو باوەڕ لەدڵی ساحیرەکاندا ڕسکاو وەبەرهات‌و بەسەر دەست سووکی‌و کارامایی دا زاڵ بوو، ئیمان لەدڵ‌و دەروندا بەسەر هەڕەشەو تۆقاندندا سەرکەوت، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: چۆن حەق‌و ڕاستی بەسەر بەتاڵدا سەرکەوتوو دەبێ، هیدایەت بەسەر گومراییدا، ئیمان بەسەر یاخی بووندا چۆن لەکاردایەو چۆن زاڵ دەبێ. زاڵ بوون‌و سەرکەوتن لەعالەمی واقیع دا کاتێ دەستەبەر دەبێ کەلەعالەمی دەروونندا باش ڕەگی داکوتا بێ، هەرکاتێ ئیمان لەدڵاندا کامڵ بوو دیاردەکانی لەکردەوەدا: لەعالەمی واقیع‌و ظاهیردا دیارو بەرچاوە!

ئەوەتا چونکە ئیمان لەدڵی موساو هاروونندا ڕەگی داکوتابوو چ باکیان لەسیحری ساحیرەکان نەبوو، دواییش چونکە ئیمانی ساحیرەکان لەناخەوە جێگیر بوو چ گرنگیان بەهەڕەشەو گوڕەشەی فیرعەون نەدا، لەئاکامیش دا لەعالەمی واقیع دا حەق بەسەر بەتاڵدا سەرکەوت‌و فیرعەون‌و تاقمەکەی لەناو چوون‌و دونیایان لەدەست چوو، لەدەست چوونی قیامەتیشیان هەر باس ناکرێ، خەسارەتمەندی دونیایان لەچاو هی قیامەتیان هەر هیچ نیەو قەپان نایخوێنێتەوە. دەی بابزانین قورئانی پیرۆز چۆن دیمەنی فەوتانی فیرعەون‌و تاقمەکەی ڕادەنوێنێ‌و چۆن نیعمەتەکانی خودا بەسەر بەنو ئیسرائیلدا باس دەکا؟

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي﴾ بێگومان ئێمە نیگامان بۆ موسا ﵇ کرد، فەرمانمان پێ کرد: کەشەوڕەوی بەنەتەوەی ئیسرائیل بکا،

بەشەو بەنهێنی نەتەوەی ئیسرائیل لەمیصر بباتە دەرێ، چوونە دەرەوەکەیان زۆر بە لەسەرە خۆیی‌و نهێنی بێ، کەس لەکۆمەڵی فیرعەون پێیان نەزانێ، فەرمانمان پێ کرد: کەهەر کاتێ گەیشتنە دەریای (قولزوم) یان دەریای (سوور) بەم شێوەیە هەڵس‌و کەوت بکەن: ﴿فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقاً فِي الْبَحْرِ يَبَساً﴾ بەعەصاکەت لەدەریا بدە، ڕێگای وشك‌و برینگیان لەناو دەریادا بۆ فەراهەم بێنە. عەصاکەت ئاراستەی دەریا بکە ئەوکاتە دوانزە ڕێگای ووشك لەناو دەریا پەیدا دەبن، بۆ ئەوەی هەر تاقم‌و تایەفەیەکی بەنو ئیسرائیلی بەڕێگایەکی تایبەتی دا بپەڕنەوە، لەهەمان کاتدا ﴿لا تَخَافُ دَرَكاً وَلا تَخْشَى﴾ مەترسە لەوەی فیرعەون‌و لەشکرەکەی پێتان بگات‌و زیانتان پێ بگەیەنن. لەوەش مەترسن لەناو دەریادا گەلەکەت بخنکێن، ئەو خودایەی یاسای بۆئاو داناوە دەتوانێ بەگوێرەی پێویست بۆماوەیەك لەسروشتی خۆی لایداو بەسەلامەتی لێی ڕزگار ببن!

حەزرەتی موسا ﷺ چۆنی فەرمان پێ کرا ئاواهەڵس‌و کەوتی کرد، ئەوەی پێی سپێردرابوو ئەنجامی دا، کاتێ گەیشتە قەراخ دەریا عەصاکەی لیدا دوانزە ڕێگای وشك لەناو دەریادا دروست بوو، بەسەلامەتی بەنوئیسرائیلی لەدەریا پەڕینەوە ﴿فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ﴾ فیرعەون بەخۆی‌و سوپایەوە شوێنیان کەوت، لەو کاتەدا: کەهێشتا پاشەتای کۆڕەوی نەتەوی ئیسرائیل خەریك بوو لەوبەر دەریا بچنە دەرێ، لەمبەر فیرعەون‌و لەشکریی هەر بەڕێگاکانی نەتەوەی ئیسرائیل دا ڕۆیشتن‌و کەوتنە ناو دەریاوە. کاتێك پێشەتای لەشکری فیرعەون هێشتا نەگەیشتبووە ئەوبەرو پاشەتاشیان هاتبووە ناو دەریاوە، ئالەو کاتەدا بەقودرەتی خودای باڵا دەست دەریا وێك هاتەوە: ﴿فَغَشِيَهُمْ مِنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾ ئیتر دایپۆشین لەو دەریایە ئەوەی دایپۆشین!! واتە دایپۆشینەکەو وێکهاتنەوەی دەریا هێندە سامناك بوو، هێندە گرنگ‌و ناهەموار بوو هەر باس ناکرێ، ئەگەر باسیش بکرێ عەقڵی ئادەمیزاد تەصەوری ناکا. بەوجۆرە فیرعەون گەلەگەی بەرەو گومڕایی برد،

لەژیاندا گومڕایی نیشان دانو لەناو دەریادا گیانیان دەرچوو. فیرعەون گەلەکەی بەڕێبازێکدا برد دوچاری زیانی دنیاو قیامەتی کردن. بەڕاستی ڕابەرێکی نەگبەت بوو.

﴿وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُ وَمَا هَدَى﴾ فیرعەون گەلو نەتەوەی خۆی گومڕا کردو لە ڕێبازی ڕاستو حەق لایدانو شارەزای ڕێبازی سەرفرازییو ڕزگاریی نەکردن. ئەمەش قەشمەریو لاقرتێ کردنە بەفیرعەون، چونکە ئەو وادەی کەبەگەلەکەی دابوو؛ کەجگە لەڕێگای نەجاتو ڕزگاریی هیچ ڕێگای تریان نیشان نادا وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان لێوەی دەگێڕێتەوە.کەگوتی: ﴿وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾....!

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: نامانەوێ لێرەدا بچینە ناو تەفاصیلی ڕووداوەکەو کونو کەلەبەری بپشکنین، چونکە دەمانەوێ بەشوێن سیاقەکەدا بڕۆینو حیکمەتی ئەوە: کەقورئان باسی ئەم ڕوداوە بەکورتی دەکا بەرچاو بگرین.

وەلێ پێمان خۆشە لێرەدا پەندو عیبرەتێك لەو دیمەنە وەربگرینو هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەین.

بێگومان دەستی قودرەت سەرپەرشتی نێوان جەنگی ئیمانو طوغیانی دەکرد، ئەرکی سەرشانی ئیمانداران تەنیا ئەوە بوو پابەندی نیگای خودایی بنو بەشەو بەنهێنی کۆڕەو بکەن، چونکە بەنو ئیسرائیلیو لەشکری فیرعەون دوو هێزی بەرامبەر بەیەك لەعالەمی واقیع دا هاوتا نەبوونو لێکیشەوە نزیك نەبوون. حەزرەتی موسا ﷺ و گەلەکەی بێ هێزو بێ چەكو سوپا، گەلێکی ژێر دەستەو چەوساوەی چەند ساڵە. فیرعەونو سوپاکەی خاوەن هێزو دەسەڵات. کەوابێ ڕووبەڕوو بوونەوەو بەرەنگاری ناکرێ، ئالەم کاتەدا دەستی قودرەت سەرپەرشتی جەنگەکەی کردو کەوتە خۆ. بەڵام کەی؟ دوای ئەوەی ئیمانی بێ دەسەڵاتەکان جێگیر بوو، دوای ئەوەی ئیمان خۆی دەرخستو لەبەرامبەر طوغیان دا ڕاوەستا،

بـڕواداران گوێیـان بەهەڕەشـەو گوڕەشـەی خـاوەن هێـز نـەداو بەسـامانو دارایـی فیرعەون هەڵنەخەڵەتان، فیرعەون هەڕەشەی لێ کردن بەوە ڕاستو چەپیان ببڕێو دوایی بۆ ترساندنی خـەڵکی دیکەو ڕیسوا بـوونی ئـەمان هـەڵیان واسـێ، خـاوەن باوەڕان پێیان وت چت لەدەست دێ بیکەو بێ منەت بە.. جاکاتێ کار گەیشتە ئـەم ئەنـدازە، طوغیـانی فیرعـەونو ئیمـانی شـوێن کـەوتوانی موسـا ﷺ بـەم پلەیـە گەیـشت، ئـیتر دەسـتی قـودرەت هاتـە مەیـدانو ئـەوەی بەسـەر فیرعـەون هێنـا کەهێنای!!!

ئـەمجار پـەروەردگار نیعمەتـە جۆراو جۆرەکـانی: کەبەخـشیونی بەنەتـەوەی ئیـسرائیل دەیـان ژمێـرێ، سـەرەتا باسـی نیعمـەتی لابردنـی زیـان لەسـەریان دەکـا، ئەمجار باسی بەخشینی نیعمەتی سوود بەخش دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ قَدْ أَنجَيْنَاكُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ﴾ دوای ئەوەی نەتەوەی ئیسرائیلمان ڕزگار کرد، نیگامـان بـۆ پێغەمبەرەکەیان کرد کەپێیان بڵێ: ئەی نەتەوەی ئیسرائیل! ئەوە ئێمە لە دوژمنی سەر سەختتان ؛ کە فیرعـەون بـوو ڕزگارمـان کـردن. ئـەو فیرعەونـەی نێرینـەکانی سـەر دەبـڕینو مێینـەکانی دەهێشتنەوە بـۆ کارەکـەریو خزمـەت کـرن، بەچـاوی خۆتان بینیتان فیرعەونو لەشکرەکەی چۆن خنکـان، بەتایبـەتیش دوای خنکـانیش فیرعەونتان بەخنکاوی بینی بۆئەوەی زیاتر دڵنیا بن لەمردنی. وەکوو لەشـوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ (البقرة/٥٠) ئەمەیان نیعمـەتی لابردنی زیان بوو.

﴿وَوَاعَدْنَاكُمْ جَانِبَ الطُّورِ الأَيْمَنَ﴾ ئەمجار وادەمان پێ دان؛ کاتێکمان بۆدیاری کردن، بۆئەوەی بـەئاگاداری ئێـوە قـسە لەگـەڵ موسـا ﷺ دا بکـەین، تـەورات نـازڵ بکەین: کەشەریعەتێکی دوورو درێژی تێدا بـوو بـۆ ئێـوە بـەهۆی پێغەمبەرەکـەتان فێری ببنو بیکەنە بەرنامەی ژیانی خۆتانو ڕفتاری پێ بکەن.

یان بەڵێن‌و وادەمان دانێ: کە لەگەڵ موسادا ﷺ بێن بۆ لای ڕاستی شاخی طور کەکێوێکە لەسینا لەو شوێنە ئامادەبن‌و بەدیارەوە بن: کەپەروەردگار قسە لەگەڵ موسادا ﷺ دەکاو ئێوەش ببینن.

﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى﴾ ناردومانەتە خوارێ بۆتان گەزۆو گۆشتی پەلەوەری شەلاقە، ئەمە لەحاڵێك دا ئێوە لەبیابانەکەدا دەسووڕانەوە سەرتان لێ تێك چوو بوو.

ڕۆژانە لەبەرە بەیانەوە تاخۆر هەڵات گەزۆ دەبارییە سەر بەردو دارو ئێوەش کۆتان دەکردەوە، هەروا پەلەوەری شەلاقە باڵندەی(السمانی) بای باشور ڕای دەدان‌و دەیهێنان بۆئەو شوێنەو هەریەکەتان بەگوێرەی پێویستی خۆتان لێتان دەگرتن.

ئەمجار پێمان گوتن: ﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ﴾ لەم نیعمەتە پاك‌و خاوێنانەی ئێمە بخۆن‌و لەزەت وەربگرن.

﴿وَلَا تَطْغَوْا فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِي﴾ لەسنور دەرمەچن، زیاد لەپێویست مەخۆن، نەچن لەشتێکەوە کەبۆتان حەڵاڵە بگوێزنەوە بۆشتێکی تر بۆتان حەڵاڵ نیە. سپڵە مەبن، کوفرانی نیعمەتی خودا مەکەن، بەنازو فیزەوە دەستی بۆ مەبەن، خۆتان لێ نەگۆڕێ، لەگوناهو شتی بێ سوودا نیعمەتەکانی بەکار مەهێنن، ئەو ئەرك‌و مافانەی دەکەوێتە سەر شانتان بەهۆی ئەو نیعمەتانەوە ئەنجامی بدەن، پابەندی ئەم فەرمان‌و نەهیانەی ئێمە بن، ئەگینا قارو غەزەبی ئێمەتان دێتە سەرو موستەحەقی سزای ئێمە دەبن.

خۆ ﴿وَمَنْ يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِي فَقَدْ هَوَى﴾ کەسێك قارو غەزەب‌و عەزابی ئێمەی بۆسەر نازڵ بێ‌و پێیەوە بنووسێ ئەوە کەوتۆتە ناو چاڵی بەهیلاك چوون‌و فەوتان!!

﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً ثُمَّ اهْتَدَى﴾ بێگومـان مـن سـڕپۆش‌و خاوەن لێ خۆش بوونی تەواوم بۆکەسێك لەتاوان پەشیمان بێتەوە تۆبە بکا، ئیمانی بـەخوداو بەپێغەمبـەران‌و نامـە کانیـان‌و بەفریـشتەو ڕۆژی زیندوبوونـەوە هـەبێ، کردەوەی چاك بکاو بەردەوام بـێ لەسـەر چاکە کاریی. تاکۆتـایی ژیـانی بـەو شـێوە ژیان بەسەر بەرێ‌و هەڵس‌و کەوتی وەهابێ.

## قسە کردنی پەروەردگار لەگەڵ موسا ﷺدا لەکات‌و شوێنـی دیاریکراوداو فیتنە نانەوەی سامیری

﴿ ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ

﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾﴾

لەوە پێش ئەو نیعمەتانەی بەخشیبوونی بەنەتەوەی ئیسرائیل ژماردنی، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا چیرۆکی گفتو گۆی نێوان باری تەعالاو موسامان بۆ باس دەکا، کەلە(میقات) کاتو شوێنی دیاریکراو دا ئەنجام درا، پاشان دێتە سەر باسی چۆنیەتی ئەو فیتنەیەی سامیری بەرپای کرد: بەم جۆرە کەهات لەخشڵو ئاڵتونێ کەپێیان بوو پەیکەری گوێرەکەیەکی دروست کرد، بەشێوەیەك ناوەکەی کلۆر بوو کەبەرەو بایەکی تایبەتی دادەنرا، دەنگی لێوە دەهاتو ئەو گڵو خۆڵەی کەلەدەمیابوو وەلەرزەی دەهێنا، ئیتر سامیری وتی: ئەمە خودای موسایەو لێی گوم بووە!

نەتەوەی ئیسرائیلیش بۆخۆیان ئامادە باشی بتپەرستیان تێدا بوو، ئاماژە بەوە: کەلەو کاتەدا لەچنگی فیرعەون ڕزگاریان بوو، بەلای نەتەوەیەکی بتپەرست دا تێپەڕین، بینیان ئەو گەلە بت دەپەرستن. بەنو ئیسرائیلی یەکانیش داوایان لەموسا ﷺ کرد کەپەیکەرێکیان بۆ دروست بکا بۆئەوەی بیپەرستن. وەکو لەسورەتی (الأعراف/١٣٨) دا بەدرێژی باسمان کردووە.

ئەمجار دوای ڕودانی ئەوەی باس کرا، پەروەردگار بەڵێنی بەحەزرەتی موسا ﷺ دابوو: کەلەسەر کێوی (طور) دوای چل ڕۆژ ئاخاوتنی لەگەڵ بکاو ئەرکو ئورکی بخاتە سەر شان !

حەزرەتی موسا بەپەلەو بەهەڵەداوان ڕۆیی بۆسەر کێوەکەو گەلەکەی لەخوار کێوەکە بەجێ هێشتو حەزرەتی هارونی ﷺ کردە جێنشینی خۆیو چاودێر بەسەریانەوە.

بێگومـان حـەزو خۆشەویـستی حـەزرەتی موسـای ﷺ کـێش کـرد بۆپەلـە کـردن‌و زوو گەیـشتن بەشـوێنی دیـاری کـراو ڕاوەسـتان لەخزمـەت پـەروەردگاردا، چونکە لەوەپێش تام‌و خۆشی ئـەوجۆرە ئاخاوتنـەی کردبـوو، بۆیـە بەپەلـە وەسـەر کێـوی طـور کـەوت‌و زوو گەیـشتە شـوێنی مەبەسـت‌و لەخزمـەت پـەروەردگاردا ڕاوەسـتا. ئـیتر ئاگـای لـەحاڵ‌و وەزعـی گەلەکـەی نـەمابوو، دوا ئـەو چـیان بەسـەر هـاتووە. ئـیتر لێـرەدا پـەروەردگار هـەواڵی گوێرەکـە پەرسـتیەکەی گەلەکـەی پـێ ڕادەگەیەنێ‌و دەفـەرموێ: ﴿وَمَا أَعْجَلَكَ عَنْ قَوْمِكَ يَا مُوسَى﴾ ئـەوە چـی تـۆی هـەڵنا ئەی موسا! کەوا پەلە بکەی‌و گەلەکەت جێ بێڵی؟! مەبەست بەقەوم لێـرەدا حـەفتا نەقیبەکانی بەنو ئیسرائیلی یە واتە: چی پاڵی بەتۆوە نا کەنەقیبەکان جێ بێڵی‌و بۆخۆت بەتەنیا لێرەدا ئامادەبی.

ئیستیفهامەکە بۆ ئینکارە، واتـە: نـەدەبوو حـەزرەتی موسا ﷺ نەقیبـەکان جێ بێڵـی‌و بۆخـۆی پـێش ئـەوان بگاتـە جـێ، چـونکە ئـەوە پێـشێل کردنـی مـافی هاوەڵایەتییە، حەزرەتی موسا ﷺ فەرمانی پێ کرابوو وێڕای ئـەو حـەفتا نەقیبـە بچێ بۆسەرکێوی (طور) و لەگەڵ خۆی حازریان بکا، کەوابێ ئەم ئیستیفهامە ئـەوە دەگەیـەنێ: کـەخودی پەلـە کردنەکـە کـارێکی بـاش نـەبوە، بەتایبـەتی نـەدەبوو کردارێکی ئاوا لەپێغەمبەرێکی خاوەن عەزیمەتەوە سەر هەڵ بدا.

ئـەوە بـوو دوای لـەناو بردنـی فیرعـەون، حـەزرەتی موسـا ﷺ داوای لـەخودا کـرد: کەلەسـەر کێـوی (طـور) ئاخـاوتنی لەگـەڵ بکـا. بۆئـەوەی ئـەو لـەو حانـە وەربگرێ: کەئامۆژگاریی دەستوورییان تێدایـە بۆگەلەکـەی..! جـا:کەفیرعـەون خنکـا، پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی موسا ﷺ کرد سی ڕۆژ بەڕۆژو بێ ، دوایـی، ئـەو ماوەیە کرا بەچل ڕۆژ؛ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاَثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً وَقَالَ مُوسَى لأَخِيهِ هَارُونَ اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلاَ تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (الأعراف/١٤٢).

وادە وابـوو حـەزرەتی موسـا ﷺ (٧٠) کـەس لەگەلەکـەی هەڵبـژێرێ‌و بـچن بۆسەر کێوی (طور) ﴿وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا﴾ (الأعراف/١٥٥) جا حەزرەتی موسا ﷺ ئەو حەفتا نەقیبەی هەڵبـژاردو بردنـی بۆسـەر کێـوی (طـور) کاتێـك نزیـك شـوێنی دیـاری کـراو کەوتنـەوە حـەزرەتی موسـا ﷺ بەمەبەسـتی زووتربیستنی کەلامی خـودا پەلـەی کـردو زوو گەیـشتە شـوێنی دیـاریکراو، ئـەمجار پەروەردگار بەشێوەی پرسیاری ئینکارئامێز پـێی فـەرموو: ئـەی موسـا! چـی وای لێ کردی پەلە بکەی‌و هاوەڵانت جێ بێڵی!!

﴿قَالَ هُـمْ أُولاءِ عَلَـى أَثَـرِي﴾ موسـا ﷺ وەڵامـی پـەروەردگاری دایـەوە وتـی: ئـەوانیش وادەگـەن، کـەمێك لـەدوای منـەوەن، ئـەمن چـەند هـەنگاوێك پێـشیان کەوتووم.

﴿وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَى﴾ ئەمن بۆخۆم پەلەم کردوو ویستم زوتر بگەمـە شـوێنی وادەو لەخزمـەت دا ڕابوەسـتم بۆئـەوەی ڕەزامەنـدیی تـۆ بەدەسـت بێـنم، ویستم فەرمانی تۆ بەجێ بێنم‌و پابەندی بەڵێنی خۆم بم.

بـەکورتی: حـەزرەتی موسـا ﷺ عـوزر بـۆ پەلـە کـردن‌و جـێ هێـشتنی هاوەڵەکانی دەهێنێتەوە، دەڵێ: خودایە! مـن وام بـەباش زانـی: کەچـەند هـەنگاوێك پـێش قەومەکـەم (نەقیبـەکان) بکـەوم، زوتـر لـەوان بگەمـە جـێ، پـێم وابـوو ئەوەکارێکی باشە، بەڵام وادیارە بەهەڵە چووم‌و ئیجتیهادەکەم نـەی پێکاوە، ئـەوەی پاڵی بەمنەوە نا بۆ پەلە کردن بەدەست هێنانی ڕەزامەندی تۆ بـوو!! چونکە پەلـە کردن لەگوێڕایەڵی‌و فەرمان بەرداریدا هۆی ڕەزامەندی خاوەن فەرمانە!

﴿قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِنْ بَعْـدِكَ وَأَضَـلَّهُمُ الـسَّامِرِيُّ﴾ پـەروەردگار فـەرموی: ئێمـە لـەدوای خـۆت: کەگەلەکـەت بـەجێ هێـشت‌و هـارونی بـرات کـردە چاودێریان بەتاقیمان کردنەوە، لەتاقیکردنەوەکە دەرنەچوون، سـامیری گـومڕای کـردن، بـانگی

کردن بۆ گوێرەکە پەرستی‌و هەڵینان بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ناپەسەندە. سامیری: لەهۆزی (السامرة) بوو، یان لەخێڵێکی گا پەرست بوو، زۆربەی زۆری زانایان پێیان وایە: سامیری یەکێك بوو لەپیاو ماقوڵانی نەتەوەی ئیسرائیل‌و لەهۆزی (السامرة) بوو. بەو بەنوئیسرائیلیانەی گوت کەلەگەڵی بوون، موسا ﷺ بۆیە ئەو دە ڕۆژە لەوادەی دواخرا چونکە ئێوە ئەو خشڵە حەرامەتان لەگەڵ خۆتان هێناوە، ئەوە بۆ ئێوە حەرامەو نابێ چیدی لەلای خۆتان بیهێڵنەوە، فەرمانی پێ کردن بیخەنە ناو ئاگرەوە. ئیتر لەو خشڵە پەیکەری گوێرەکەیەکی دروست کرد، هەندێ کون‌و درزی تێدا بوون بەجۆرێك بوو کەبەر بای دەدا دەنگی لێوە دەهات.

﴿فَرَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفاً﴾ حەزرەتی موسا ﷺ دوای تێپەڕ بوونی چل شەوەکەو وەرگرتنی تەورات، گەڕایەوە بۆلای گەلەکەی بەرق هەڵساوی، بەغەم‌و پەژارەی زۆرەوە. بەهۆی هەڵوێست‌و کردەوەی نالەباری گەلەکەیەوە. بەهۆی ئەو تاوانە گەورەی گەلەکەی کردبوویان.

﴿قَالَ يَا قَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْداً حَسَناً﴾ حەزرەتی موسا ﷺ کەهاتەوە ناو گەلەکەی ڕوی تێکردن‌و پێی گوتن: ئەرێ قەوم‌و خوێشەکەم! ئەوە پەروەردگارتان وادەی ڕاست‌و باشی پێ نەدان؟ لەسەر زوبانی من بەڵێنی نەدانێ کەچاکەو خێری دونیاو قیامەتتان بداتێ؛ کتێبی ئاسمانیتان بۆ بنێرێ، شەریعەت‌و یاساتان فێر بکا، زەوی‌و زارو مڵك‌و ماڵی جەبابیرەکانی میصرتان بداتێ، لەقیامەتیش دا پاداشی باش‌و لێخۆشبوونتان خەڵات بکا؟ لەسەر زوبانی من پێی نەگوتن: ئەمن سڕ پۆش‌و لێخۆش بووم لە تاوان بۆکەسێك تۆبە بکاو بڕوای بەخوداو بەپێغەمبەران‌و بەزیندوو بوونەوە هەبێ‌و پاشان پابەندی ئەو بیرو باوەڕە بێ‌و بەردەوام بێ لەسەر هەڵوێستی خۆی.؟

﴿أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ﴾ ئایا ماوەی زۆرتان پێ چوو لەچاوەڕوانی کردنی وادەی خوداو بەسەر بەڵێنەکەی پێی دابوون ماوەی زۆر تێپەڕی‌و بەو هۆیەوە

نیعمەتەکانی خوداتان لەبیر چوو؟؟ خۆ هێشتا مانگێكو چەند ڕۆژێکە. ﴿أَمْ أَرَدْتُمْ أَنْ يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّكُمْ﴾ یان ویستان بەم کردەوەیەتان ڕقو غەزەبی خودای خۆتان بێتە سەرتان!

پیتی (أم) لێرەدا بەمانا(بل)ە واتە یان لەبیرتان بوو وەلێ ویستتان بەدەستی ئەنقەست کردەوەیی ئەنجام بدەن ببێتە هۆی هاتنی خەشمو قاری خودا بۆسەرتان!

﴿فَأَخْلَفْتُمْ مَوْعِدِي﴾ بەهۆی ئەوەوە ئەو بەڵێنە داتان بەمن پابەندی نەبوون، وادەتان دابەمن: کەبەردەوام بن لەسەر تاعەتی خودا تامن لەکێوی (طور) دەگەڕێمەوە لاتان. بەڵام وادەی خۆتان نەبردە سەر!

ئەمجار ئەوانیش کەوتنە عوزر هێنانەوەو بیانوو دۆزینەوە. ﴿قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا﴾ وتیان: ئێمە بەڵێنەکانی خۆمان بەویستو ئیرادەی خۆمان نەشکاندو دەسەڵاتی ئێمەی تێدا نەبوو، بەڵکو بەزۆرە ملێ پێمان کراو ناچار بووین بیکەین. سامیری تینی بۆ هێناین‌و عەقڵ‌و هۆشی لێ ستاندین‌و بەچاوو ڕاو سەری لێ تێکداین هەڵیخەڵەتاندین.

﴿وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَاراً مِنْ زِينَةِ الْقَوْمِ فَقَذَفْنَاهَا﴾ بەڵکو ئێمە چەند کۆڵ‌و کۆڵبارێکمان لە خشڵی قیبطییەکان درا بوو بەکۆڵماندا، کاتێ ویستمان لەمیصر دەربچین بەبیانووی ئەوەی کەوا بەیانی جەژنمانە بەئەمانەت لێمان وەرگرتبوون، سامیری لێی کردین بەچاوو ڕاوو وتی: لەخۆگرتنی ئەو زێڕو زیوە شومەو حەرامە، موسا بۆیە دواکەوتووە سوچی هەبوونی ئەو خشڵ‌و گەواهێرەیە لاتان، ئەمجار فەرمانی پێ کردین: کەچاڵێك هەڵکەنین‌و پڕی بکەین لەئاگرو دوایی زێڕو زیوەکەی تێ فڕێ بدەین.

﴿فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ﴾ وەكوو چۆن ئێمە خشڵەكانی لای خۆمان فڕێ دایە ناو ئاگرەكە، سامیریش بەهەمان شێوە لەو خشڵە پەیكەری گوێرەكەیەكی دروست كردو كەمێ لەو گڵو خۆڵەی كەلەژێر پێی جوبرائیل هەڵی گرتبوو بەسەر پەیكەرەكەدا پژانی، ئیتر﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَداً لَهُ خُوَارٌ﴾ سامیری گوێرەكەیەكی لەو خشڵو زێڕو زیوە بۆ بەنو ئیسرائیلییەكان دەرهێنا جەستەیەكی بێ گیان بوو بۆڕە بۆڕێكی لێ دەهات وەكو بۆڕەی گوێرەكەی زیندو. چونكە بەشێوەیەكی كارامایانە دروستی كردبوو، درزو كونو كەلەبەری تێ كردبوون: كە (با) لێی دەدا دەنگێكی لێ دەهات وەكوو دەنگی گوێرەكە.

جا كەسامیری ئەو پەیكەرەی بەو شێوەیە دروست كرد ﴿فَقَالُوا﴾ سامیری‌و هاوبیرانی وتیان: ﴿هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ﴾ ئەمە خودای ئێوەو خودای موسایە، وەلێ موسا لەبیری چوو ئەوەتان پێ ڕابگەیەنێ كەئەمە خودای ئێوەو ئەویشە. ڕەنگە موسا: كەئێستا چووە بۆكێوی (طور)و ئەوە ماوەیەكە نەگەڕایەوە بەدوایدا بگەڕێ‌و نایدۆزێتەوە.!!

سەیری نەفامی‌و گەوجی ئەم گەل‌و نەتەوەیە بكە، لەپاش ئەو هەموو موعجیزانەی لەحەزرەتی موسا ﷺ یان دی، سەر باری ئەوەی لەو ژێر دەستەیی‌و چەوساندنەوە ڕزگاری كردن‌و لەژێر چنگی فیرعەونی ستەمكار دەری هێنان.

كەچی ئەوەتا بەرامبەر بەو پێغەمبەرە گەورەیە گومانی ئاوا بەدو ناشیرین دەبەن‌و بەو شێوەو خێرا هەڵخەڵەتان‌و كەوتنە ناوئەو تاوانە گەورەیەوە.

ئەمجار خودا ڕەدیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَلا يَرَوْنَ أَلاَّ يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلاً وَلا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرّاً وَلا نَفْعاً﴾ ئایا ئەو نەفامانە نەیانزانی: كەئەو شتەی سامیری دروستی كرد: هیچ قسەو ئاخاوتنێكیان ئاڕاستە ناكاو وەڵامیان ناداتەوە، ناتوانێ زیانیان لێ دوور بخاتەوە، هیچ سوودێكیشیان بۆ كێش ناكا.

دەی بۆچی ئەوانە ئەوەندە نەفامو نەزان بوون، ئەو لاشە بێ گیانـەیان کـردە خودای خۆیان.؟؟!

ڕیوایـەت کـراوە: کەحـەزرەتی موسـا عليه السلام گەڕایـەوە بۆنـاو قەومەکـەی گـوێی لەغەڵبەو هەراو هۆریا بـوو، دیتـی بـەنو ئیسرائیلیـەکان بـەدەوری گوێرەکەکـەدا سـەمایان دەکـردو سـووڕیان دەداو کەوتبوونـە هەلەکـە سـەماو حـاڵ گرتبـوونی. حەزرەتی موسا عليه السلام بەحەفتا نەقیبەکەی لەگـەڵیا بـوون فـەرمووی ئـەوە دیـاردەی فیتنەو گومڕا بوونە [1]

ئیمامی قورطوبی دەفەرموێ: پرسیار لەئیمامی ئەبوبەکری طورطوشی کـرا، عەرزیان کرد ئێوەی شەرعزانو زانا چی دەفـەرموون: دەربـارەی ڕێبـازی صـوفیان؟ ئەمجار بۆیان باس کرد وتیان: کۆمەڵێك پیاو کۆدەبنەوە: زۆر زیکری خودا دەکـەن، زۆر یادی پێغەمبەر دەکـەنو صەلەواتی لەدیـدار لێ دەدەن، ئـەمجار دێـن چـەرمێك لەشـتێك دەبەسـتنو بـەدارە قوڵمیـەك لێـی دەدەن: (واتـە: تـەپڵ دێـننو بـەدار دەیکوتن) ئـەمجار هەنـدێکیان دەسـت دەکـەن بـەڕەقصو حـاڵ دەیـانگرێ هـەتا بـێ هۆش دەکەون، شتێك ئامادە دەکەنو دەیخۆن ئایا کۆبوونەوەو تێکـەڵ بـوون لەگـەڵ ئەمانەدا دروستە؟

فتوامان بۆ بدەن لەم بارەوە ڕەحمەتی خوداتان لێ بێ، ئـیتر شـێخ بـۆ وەڵامـی ئەم جۆرە پرسیارە فەرموی:

خـودا ڕەحـم بەئێمـەو ئێـوەش بکـا، ڕێبـازی ئـەو جـۆرە صـۆفیانە بەتاڵـە، نەزانییە، گومڕایی یە، ئیسلام بریتیە لەقورئان خوێندنو سوونـنەتی پێغەمبـەری خودا، ڕەقصو سـەماو حـاڵ لێ هـاتن لەئیـسلام دا نیـە، یەکـەم کـەس کەئـەم دابـەی داهێنا شوێن کەوتوانی سامیری بوون، کاتێـك ئـەو ئەگبەتـە گوێرەکەی بـۆ دروسـت

---

[1] تەفسیری مەراغی ج١٦/٢٣٩.

کردنو بۆرە بۆڕی لێ هات خەڵکەکە هەڵسانو کەوتنە سەماو ڕەقص کردنو حاڵیان لێ هات وەجد گرتنی! ئەو جۆرە کردەوانە لەئاینی ئیسلامدا نیە، ئایینی کافرو گوێرەکە پەرستانە، ئەو تەپڵ کوتانەش ناشەرعییەو یەکەم کەسێك دای هێنا زیندیقەکان بوون بۆئەوەی موسوڵمانان لەقورئان بێ ئاگا بکەن: ئەگینا کەی لەکۆڕو مەجلیسی پێغەمبەردا ﷺ شتی واهەبووە.؟

پێغەمبەر ﷺ: کەلەگەڵ هاوەڵانی کۆدەبووەوە مەجلیسەکەیان لەبەر ڕێزو ئەدەب بێ دەنگو کڕو مات بوو دەتگوت: باڵندەیان بەسەرەوەیە، کەوابوو پێویستە لەسەر کاربەدەستی موسوڵمانی لەخوا ترس نەهێڵێ ئەو جۆرە رەقصو سەما کەرو تەپڵ کوتانە توخنی مزگەوتەکان بکەون نابێ بهێڵدرێ ئەو جۆرە کارانە لەهیچ شوێنێك بکرێن هەرکەسێك ئیمانی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە نابێ لەگەڵ ئەوانە کۆ ببێتەوە، نابێ یارمەتییان بدا بۆپەرە پێدانی ئەو باطڵەی لەسەری دەڕۆن ئەمە ڕێبازی ئیمامی مالیكو ئەبوحەنیفەو ئیمامی شافیعیوئیمامی ئەحمەدە،هەروا فتوای ئیمامانی تری موسوڵمانە.[1]

---

[1] تەفسیری قورطوبی ج٦/١٢٤ - ١٢٥ طبعة دار الفكر ساڵی ١٤١٩هـ - ١٩٩٩م/ تەفسیری مونیر ج١٦/٢٧٥. بەڵام من پێم وایە ئەمە زیادە ڕەوییە ئەدەبوو شێخ طەرطووشی ئەو حوکمە گشتی یە بێ چەرتکردنە بەسەر کۆمەڵی صۆفی بدا وێدەچێ هەڵسو کەوتی کەسانێکی دونیا خۆرو نەفام: کەبەناوی تەصەوفەوە کردویانە کاری کردبێتە سەر شێخو ئەم فتوا توندەی دژی هەموو صۆفی بەگشتی دابێ! (محمود).

## سەر زەنشتکردنی حەزرەتی موسا ﷺ بۆ هارونی برایو، وردو خاشکردنی گوێرەکەکەو، چەسپاندنی یەکتاپەرستی

﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ ۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا ۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى

ﭐلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی ڕاگەیاند: کەهەڵوێستی گوێرەکە پەرستەکان پێچەوانەی سەرەتایی ترین مەبادیئی عەقڵو هۆشە، چونکە ئەو گوێرەکە جەستەیەکی بێ گیان بوو وەڵامی پرسیاری نەدەدایەوە زیانی لەکەس دوور نەدەخستەوە، سوودی بەکەس نەدەبەخشی. ئەمجار ئەوەمان بۆدەگێڕێتەوە کەنەتەوەی ئیسرائیل سەرپێچی ئامۆژگاریەکانی موسایان کرد ﷺ ئەمجار باسی سەر زەنشتکردنی حەزرەتی موسا بۆ هارونی برای دەکاو دوایی دێتە سەر موناقەشە کردنی حەزرەتی موسا ﷺ لەگەڵ سامیریدا، ئەمجار تاكو تەنهایی خودا دووپات دەکاتەوە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِنْ قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُمْ بِهِ﴾ بێگومان حەزرەتی هارون ﷺ پێش ئەوەی حەزرەتی موسا ﷺ لەکێوی (طور) بگەڕێتەوە بەوانەی گوت: کەپرکێشی گوێرەکە پەرستیان کرد لەنەتەوەی ئیسرائیل پێی وتن: ئەی قەومەکەم ئێوە توشی فیتنە کراون، هەرچەند: کەتێدە فکرمو بیردەکەمەوە جگە لەوەی کە: بەهۆی ئەم گوێرەکە پەرستیە بەتاقی دەکرێنەوە هیچی تر نیە، بەتاقی کرانەوە بۆئەوەی دەربکەوێ کێتان لەسەر ئایینی حەق بەردەوام دەبێو کێ لەدین وەردەگەڕێ کەواتە: ووریا بن خۆتان گومڕا مەکەن!

﴿وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَنُ﴾ بێگومان خودای بەحەقو ڕاستی ئێوە ئەو خودایەیە کە: ئێوەی بەدی هێناوە، هەموو شتێکی لەنەبووەوە هێناوەتە وجودو خاوەن ڕەحمو بەزەییە ئەو خودایەیە ئێوەی لەدەست فیرعەون ڕزگار کرد، کەوابێ ﴿فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي﴾ شوێن نەصیحەتو ئامۆژگاری من بکەون، گوێڕایەڵی

فەرمانی من بن، بەردەوام بن لەسەر ئایینی حەق‌و یەکتاپەرستی ئەنجام بدەن، هەڵبەتە لەوەپێش بەنوو ئیسرائیل یەکان پەیمانیان دابوو کە: گوێڕایەڵی حەزرەتی هارون ﷺ بن‌و لەفەرمان‌و نەهیەکانی دەرنەچن. بەلام پابەندی بەڵێنەکانی خۆیان نەبوون، هەرچەندە حەزرەتی هارون ﷺ ئاموژگاری کردن هیچیان بەگوێدا نەچوو، ﴿قَالُوا لَنْ نَبْرَحَ عَلَيْهِ عَاكِفِينَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَى﴾ وتیان: نەخەیر بەگوێی تۆ ناکەین، لەسەر ئەم گوێرەکە پەرستیە دەمێنینەوە دەبێ لەدەمی موسا ﷺ خۆیەوە ببیسین ئاخۆ ئەمە باشە یان خراپە!

هەڵبەتە مەبەستیان بڕو بیانووی بێ جێ‌و ڕێ بوو، ئەگینا شتەکە ئاشکرا بوو، دەبوایە بەگوێی حەزرەتی هارون ﷺ بکەن‌و یەکسەر تۆبە بکەن پەشیمان ببنەوە!

بەلام ئەوانە سروشتی ئادەمێتیان نەمابوو، عەقڵ‌و ژیرییان لەدەست دابوو (کوردی گوتەنی حیسابیان بیتی بوو).

جاکەحەزرەتی موسا ﷺ بەو داخ‌و جەخارەتەوە گەڕایەوە، ئەوی لەریشی هارون‌و سەرو گوێلاکی گرت‌و بۆلای خۆی ڕایکێشا، ﴿قَالَ يَا هَارُونُ﴾ وتی ئەی هارون! کاتێك ئەتۆ دیت ئەمانە ئاوا لەئایین وەرگەڕان ﴿مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوا، أَلاَّ تَتَّبِعَنِي أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي﴾ ئەوە چی تۆی مەنع کرد شوێن من بکەوتیتایە لەگەڵ ئەوانەی لەسەر ئاینی حەق مابوونەوە؟ بۆنەهاتن بۆسەر کێوی (طور) دەبوایە کەوەزعەکە ئاوای لێ هات ئەوانە بەگوێیان نەکردی یەکسەر سامیری‌و ئەوانەی دەستیان کرد بەگوێرەکە پەرستن بەجێت بهێشتنایە، بهاتیتایە بۆلام‌و زوو ئەو هەواڵەت پێ بدامایە، لەهەمان کاتدا بەجێ هێشتنەکەت دەبوە نیشانەی ئەوەی کەتۆ زۆر لەهەڵوێستەکەیان ناڕازی‌و بێزاری لەکردەوەکەیان ! ئەوکاتە لەوانە بوو تۆبەیان بکردایە‌و پەشیمان ببونایەوە.

یان چی وای لەتۆ کرد، کەبێ دەنگ بی لەکردەوەکەیان و بۆ: کەبەو حاڵە بینیتن پەیڕەوی منت نەکردو لەبەر خاتری خودا نەجەنگای لەگەڵ ئەوانەدا کەگوێرەکەیان بەخودا زانی و دەستیان کرد بەگوێرکە پەرستی. ئەی من پێم نەگوتی ﴿اخْلُفْنِي فِي قَوْمِي وَأَصْلِحْ وَلاَ تَتَّبِعْ سَبِيلَ الْمُفْسِدِينَ﴾(الأعراف/١٤٢) بۆپابەندی فەرمانی من نەبووی؟؟ ﴿أَفَعَصَيْتَ أَمْرِي﴾ ئایا سەرپێچی فەرمانی منت کرد، خۆمن کە: ڕۆیشتم داوام لێ کردی تامن دێمەوە هیچ نەقەومێ، نەهێڵی هیچ کەس سەرپێچی فەرمانی خودا بکا، من فەرمانم پێ کردی: کەلەئاست ئاینی خودادا زۆر توندو ڕەق بێ، من پێم وتی: تۆ جێنشینی من بە، وەکوو من هەڵس و کەوت بکە، دەی تۆ چۆن وابێ دەنگ بووی و لەبەرامبەر ئەم تاوانە گەورەیەو هەڵگەڕانەوە بەکۆمەڵە دەستە ئەژنۆ دانیشتی و نقەت لێ نەهات؟؟

حەزرەتی هارون ﷺ بەنەرمی وەڵامی دایەوەو عوزری بۆخۆی هێنایەوە، بەسۆزی برایەتی بانگی لێ کردو ﴿قَالَ﴾ بەحەزرەتی موسای ﷺ گوت: ﴿يَبْنَؤُمَّ﴾ ئەی کوڕی دایکم! ﴿لا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلا بِرَأْسِي﴾ سەرم بامەدەو ڕیشم مەگرە، یان مەنەوە ڕیشم و قژم بامەدە، من هیچ سەرپێچیەکم نەکردوە، تاوانێکم نیە بەبڕوای من ئەوەی من کردومە جێگای ڕەزامەندی تۆیە.

ئەمن عوزری خۆم هەیەو ماوەم بدە سکاڵای خۆم بکەم ﴿إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِي﴾ لەڕاستی دا من ترسام لەوەی ئەگەر لەگەڵ ئیماندارەکاندا بچوومایە بەگژ گوێرەکە پەرستەکان دا شەڕو جەنگم بەرپا بکردایە. یان من لەگەڵ ئیماندارەکان سامیری و گوێرەکە پەرستەکانمان جێ بهێشتایەو بهاتینایە بۆلای تۆ، ئەوکاتە نەتەوەی ئیسرائیل دەبوونە دوو تاقم، ئیتر ترسام لەوەی ئەگەر تۆ هاتبایەوە بتگوتایە: ئەی هارون! تۆ دووبەرەکیت خستۆتە نێوان نەتەوەی ئیسرائیلی یەوە. گوێڕایەڵی فەرمانی من نەبووی!! ترسام لەوەی پێم بڵێ ی من تۆم لەناو نەتەوەکەم دا جێ هێشت بۆ ئەوەی یەکیان بخەیی و بە

یـەکریزی بییـان هێڵیـەوە، بۆچـی لێکـت پـچڕینو دوو بـەرەکیت خـستە ناویانـەوە، کەوابێ بەبڕوای خۆم گوێڕایەڵی فەرمانی تۆ بووم، بەخەیاڵی خۆم گوێ ڕایەڵی من لەوەدا بوو: کەئەنجامم داوە. لەلایەکی تـرەوە ئـەوان منیـان بـەبێ دەسـەڵات زانـیو کەس پـشتیوانی لێ نـەکردم بـۆ بەرپـەرچ دانـەوەیان، تەنانـەت خـەریك بـوون هـەر لەناوم بـەرن وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ الْقَـوْمَ اسْتَـضْعَفُونِي وَكَـادُواْ يَقْتُلُونَنِي﴾ (الأعراف/١٥٠).

ئەمجار: کەحەزرەتی موسا ﷺ عوزرەکـانی هـارونی ﷺبـرای بیـستن ڕووی کردە سامیری گومڕاو تاوانبار ﴿قَالَ﴾ پـێی فـەرموو: ﴿فَمَا خَطْبُكَ يَا سَامِرِيُّ﴾ ئـەرێ سامیری! تۆ بۆ ئەم کارە ناشرینەت کرد؟ چی هەڵی نای بۆئەوەی کەوا ئەمان گومڕا بکەیو ئەم فیتنەو ناشوبە بخەیەوە؟ بەم جۆرە پرسیاری ئاڕاستەی سامیری کرد بۆ ئـەوەی فـرتو فێڵـەکانی سـامیریی بۆخـەڵکەکە دەربکـەویو بۆخـۆی ددان بـەتاوانی خۆیدا بنێ.

﴿قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا بِهِ﴾ سامیری وتی: من شتێکم بینی خەڵکەکە نەی بینی، ئەتۆش هەستت پـێ نـەکرد واتـە: تەماشـای ئـەو وڵاخـەم کـرد: کـەجوبرائیل سواری بوو بوو، دەمبینی پێی لەهەر شوێنێك دادەنا خاکی ژێر پێی سـەوز دەبـوو، یانی گیای لێ دەڕوا، ئیـتر من زانیم کە جێ پێی ئەو وڵاخە نهێنیەکی ژیانی تێدایـە ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِنْ أَثَرِ الرَّسُولِ فَنَبَـذْتُهَا﴾ ئـەوە بـوو ئـەو کاتـەی جوبرائیـل هـات بـۆ لەناو بردنی فیرعەون سواری ئەسپێك بوو منیش مشتێکم لەشوێن پێی وڵاغەکەی یان جێی پێی جوبرائیل خۆی هەڵگرت، ئەمجار ئەو مشتە گڵەم فڕێ دایـە نـاو ئـەو زێڕو زیوە تواوەی کردبوومە پەیکـەری گوێرەکەکـە، ئـیتر لاشـەکە دەسـتی کـرد بـە بۆڕە بۆڕ.

موجاهید دەفەرموێ: مانای ﴿فَنَبَذْتُهَا﴾ بەم جۆرەیە: سامیری ئەو خشڵەی لەدەستی دا بوو فڕێی دایە ناو ئەو خشڵو زێڕو زیوەی بەنو ئیسرائیلیەکان فڕێیان دابوو.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: ڕیوایەتی جۆراو جۆر هەن دەربارەی قسەی سامیری کە وتی: ﴿بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا بِهِ......﴾ چی بینی؟ ئەو ڕەسولەی سامیری لەجێی پێی خۆی یان جێ پێی وڵاغەکەی مشتە گڵەکەی هەڵگرت کێ بوو؟ پەیوەندی ئەم مشتە گڵەیە بەگوێرەکە لەزێڕ دروستکراوەکەوە چی بوو؟ کاریگەریی ئەو مشتە گڵە چی بوو لەسەر خشەی گوێرەکەکە؟ ئەو ڕیوایەتەی زۆر باوەو زۆر دەگوترێو دەهێندرێ ئەوەیە دەڵێن: سامیری حەزرەتی جوبرائیلی لەو شێوەدا بینی کەتێیدا دێتە سەر زەوی، ئیتر مشتێکی گڵ لەژێر قاچی جوبرائیل یان قاچی ئەسپەکەی هەڵگرت، دوایی لەجەستەی گوێرەکە لەزێڕ دروستکراوەی دا ئەو بۆڕە بۆڕەی لێ پەیدا بوو، یان کە مشتە گڵەکەی بەزێڕو خشڵەکەدا دا گوێرەکەیەکی بۆڕە بۆڕ کەری لێ پەیدا بوو. ئەمە نمونەیەکی ڕیوایەتەکان بوو.

ئەمجار سەیید دەفەرموێ: قورئانی پیرۆز لێرەدا حەقیقەتی ڕوداوەکە ناچەسپێنێ، بەڵکوو تەنها وتەکانی سامیری دەگێڕێتەوە، ئێمە پێمان وایە: سامیری ویستی بەم قسانەی بیانو بۆ ئیشەکەی بدۆزێتەوە، ویستی بەم قسانە خۆی لەناکامی تاوانەکە ڕزگار بکا. واپێدەچێ سامیری جەستەی گوێرەکەکەی لەو خشڵو زێڕە دروست کردبێ کەبەنو ئیسرائیلیەکان لە قیبتیەکانیان وەرگرتبوو، ئەو فێڵبازە گوێرەکەکەی بەشێوەیەك دروست کردبوو کلۆرایی‌و درزو کونو کەلەبەری تێدا بوون، کە (با) لێی دەدا دەنگێکی وەکو بۆڕەی گوێرەکەی لێوە دەهات، ئەمە واقیعەکە بووە. حیکایەتی شوێن پێی جوبرائیل یان جێ پێی ئەسپەکەی بۆ تەبریر هێنایەوە، وای پیشان دا: کەئەو زیرەك بووەو زێدە لەهەمووان، ئەوەی

بینی کەلەجێ پێی جوبرائیل خۆی یان ولاخەکەی یەکسەر گیا شین دەبوو، ئەمیش ئەوەی بەشتێکی نائاسایی زانیو مشتێکی لەو جێ پێیە هەڵگرت.

﴿وَكَذَلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي﴾ بەو جۆرە نەفسم ئەو کارەی بۆ جوان کردمو لەدڵم دا شیرین بوو، واتە: بەئارەزوی خۆمو هەواو هەوەس ئەوەم بەسەر ئەو خەڵکە هێناو ئەو ئیشەم ئەنجام دا، ئیگای خودام بۆ نەهاتوەو بەڵگەی ئەقڵیو ئەقڵیم بەدەستەوە نیە.

ئەمجار حەزرەتی موسا ﷺ بڕیاری دەرکردنی سامیریی داو لەپێری ئەتەوەی ئیسرائیل دەری هاویشتو خوێڕی کرد، سزای تاوانەکەشی حەواڵەی خودا کردو زۆر بەتوندو تیژیی بەرامبەر خودا درۆزنەکەی سامیری واتە: (گوێرەکەکە)ی جولایەوە: ئەوە بوو لەپێش چاوی خەڵکەکە ووردو خاشی کردو سوتاندیو خۆڵو تۆزەکەی هەڵدایە ناو دەریاوە.

ئەوە بوو حەزرەتی موسا ﷺ رووی کردە سامیریو ﴿قَالَ:﴾ پێی گوت: ﴿فَاذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِي الْحَيَاةِ أَنْ تَقُولَ لَا مِسَاسَ﴾ ماتوڵ ئەم تاوانەت ئەنجام داو، ئەم خەڵکەت سەرگەردان کرد، بڕۆ دەرەوە لە ناومان داو خوێڕی بە! ئەوا خوێڕیم کردی! تێکەڵی کەس نەبیو کەس تێکەڵت نەبێ.

تا لە ژیاندا ماوی ئەمە ویردی سەر دەمت بێ، هەر بڵێی لەکەس نەکەوەو کەسم لێ نەکەوێ، ئەمە تۆڵەتە لەدونیادا. ئەم جۆرە سزایە لەدیانەتی موسا ﷺ دا باو بوو، سزای خوێڕی کردن، جاڕدانی پیسیو گولی بەناو خەڵك دا بۆئەوەی کەس هاوەڵی نەکا.

حەزرەتی موسا ﷺ فەرمانی بەبەنو ئیسرائیلییەکانیش کرد: کەتێکەڵی نەبنو قسەی لەگەڵ نەکەن.

﴿وَإِنَّ لَـكَ مَوْعِـداً لَـنْ تُخْلَفَـهُ﴾ بێگومـان شـوێنو کاتێـك هەیـە بـۆ عـەزابی قیامـەتت، بـەڵێنت پـێ دراوەو بـەهیچ جـۆرێ لێـی دواناکـەوێو هـەر توشت دێ، نەهاتنی نیە!

﴿وَانظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفاً﴾ سەیری خودا درۆزنەکەشت بکەو بڕوانـە چـی لێ دەکـەم! ئـەو خودایـەی لـە جیـاتی خـودا پەرسـتـشت بـۆ دەکـردو بـەردەوامی لەسـەر پەرسـتنی! ﴿لَنُحَرِّقَنَّـهُ﴾ سـوێند بـە خـودا بـە ئـاگر باشـباش دەیسوتێنم تا دەبێتە خۆڵەمێش.

﴿ثُـمَّ لَنَنسِـفَنَّهُ فِـي الْـيَمِّ نَـسْفاً﴾ پاشـان خۆڵـە مێـشەکەی بـەدەریادا دەدەیـنو ناسەواری ناهێڵین. بۆئەوەی تەپوتۆزەکەشی دەست کەس نەکەوێ.

بێگومان ئەمە هەڵوێستێکی حازیمو مەبدەئیانە بوو لەحەزرەتی موسا ﷺ ، دیارە پێغەمبەری خاوەن عەزم هەر دەبێ هەڵوێستی ئاوا بنوێنێ بەرامبەر خودا درۆزنەیەکی ئاوا، بۆئەوەی سامیریو هەوا خواهانیشی بەچاوی خۆیان ببینن ئـەو شتەی ئەوان بەخودایان داناوە، خودا نیە، بێ دەسەڵاتە، هیچی پێ ناکرێ، تەنانـەت ناتوانێ زیان لەخودی خۆیشی دوور بخاتەوە.

﴿إِنَّمَا إِلَهُكُمْ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلاَّ هُـوَ وَسِـعَ كُـلَّ شَـيْءٍ عِلْمـاً﴾ ئـەو گوێرەکەی سامیری ئێوەی پێ هەڵخەڵەتاندوە خودا نیە، خودای بەحەقو ڕاست بۆ ئێـوە تـەنها (الله)یـە، جگـە لەئـەو خـودای تـر نـین، هـەر (الله) شـیاوی خودایـەتیو عیبـادەت بۆکردنە، هەموو کەس ئاتاجی ئەو خودایەیەو ئەو پێویستی بەکـەس نیـە، هـەموو کـەس بەنـدەی ئـەون، زانایـە بەهـەموو شـتێکو بەسـەر هـەموو شـتێك دا ئاگادارە، هـەموو شـتێك لای ئـەو سـەر ژمێـر کـراوە، لەبوونـەوەردا لـەئاسمانو زەویدا گەردیلەیەکی لێ نادیار نیە، پەلکە گەڵایـەك لـە درەختێـك لێ نابێتـەوە ئـیللا خـودا ئاگاداریەتی، دەنکە تۆمێك لەناو تاریکایی ناو زەویدا، چیلکە تـەڕێك، لقـە دارێکی

وشـك كـەمو زۆر هەرچـی بەخەیاڵـدا بـێو هەرچـی بەخەیاڵـدا نەیـە. لـەزانیاری خودادا تۆمار كراوە. هەموو پێڕۆیەك هـەموو گیانلەبـەرێك ڕزقو ڕۆژیـی بەدەسـت خودایەو خودا ئاگاداری هەموو هەڵسو كەوتو شوێن كارێكیەتی..

## پەند وەرگرتن لەقورئانو سزای ئەوانەی ڕوو لەقورئان وەردەگێڕن

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا (٩٩) مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْرًا (١٠٠) خَالِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلًا (١٠١) يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا (١٠٢) يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا (١٠٣) نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا (١٠٤)﴾

دوای گێڕانـــەوەی سەرگورشـــتەی حـــەزرەتی موســـا ﷺ و قەومەكـــەی. پەروەردگار ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕوون دەكاتەوە، كەگێڕانەوەی بەسـەرهاتی گەلـە پێشینەكانی وەكوو عادو ئەمودو قە ومـی لوط و ئەصـحابولئەیكەو سـەرەنجامیان، ئـەوە جۆرێكـە لـەموعجیزە بـۆ تـۆو، دڵدانـەوەو پەنـد وەرگـرتنو تـەمێ خواردنی هەڵگرانی ئایینە. ئەمجار دوا بـەدوای ئـەوە موناسـیبە، كەباسـی سـزای ئەوانـە بكـا، كەپشت لەبانگەوازی قورئان هەڵدەكەن. دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ مَا

قَدْ سَبَقَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد! هەروەکوو چۆن بەوشێوە جوانو سەرنج ڕاکێشە چیرۆکی موسا ﷺ مان بۆ گێڕایتەوە: باسی ئەوەمان بۆ کردی چۆن کرا بەفروستادەو نێردرا بۆسەر فیرعەونو گەلەکەی؟چیٚ بەسەرهات لەگەڵ نەتەوەی ئیسرائیلو ئاکامی ستەمکاران بەچی گەییشت؟! ئاوا بەو جۆرە هەواڵی هەندیٚ لەڕووداوی گەلە پێشینەکانت بۆ باس دەکەین.چیرۆکی هەندیٚ لەپێغەمبەرانی پێش تۆ لەگەڵ گەلەکانیان داو ئەو ڕوداوانەی بەسەر گەلەکان داهات بۆتی دەگێڕینەوە، بۆئەوەی دڵت دابمەزریٚو تەسەللات بیٚ، چاو لەهەڵسوکەوتی ئەو پێغەمبەرانە بکەیو بزانی چ ئازارو ناخۆشیەکیان تووش هات بەدەست گەلە ستەمکارو نەفامو سەرڕەقەکانیانەوە. بێگومان گێڕانەوەی ڕوداوی گەلە پێشینەکان پەندو عیبرەتی لیٚ وەردەگیریٚ، چاوو دڵی خودا پەرستانی پیٚ ڕون دەبێتەوە زانینو ئاگاداریی بەسەر ئەو ڕووداوانەدا دەبێتە موعجیزەیەکی تایبەتی بۆ پێغەمبەرو ئامۆژگاریو نەصیحەتە بۆ هەڵگرانی پەیامی خودا لە هەموو شوێنو کاتێك دا.﴿ قَدْ آتَيْنَاكَ مِنْ لَدُنَّا ذِكْراً﴾ بێگومان ئێمە لەلایەن خۆمانەوە (ذیکر) مان پیٚ بەخشیوی: کەبریتیە لەقورئانی گەورە، بۆ ئەوەی هەموو کاتیٚ یادی خودای پیٚ بکەیەوە، قورئان شیاوی ئەوەیە یاد خەرەوەبیٚ، چونکە لەهیچ ڕویەکەوە بەتاڵ ڕوی تیٚ ناکا، لەپێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی تر کتێبی ئاوای نەدراوەتیٚ، لە خودای زانا و داناوە نازڵ کراوە، هەواڵو بەسەرهاتی ڕابوردوانی تێدایە، هەواڵی داهاتووی لەخۆ گرتووە. هیچ نامەیەکی تر ئاوا هەواڵی ڕاستو واقیعی ڕابردوو داهاتووی لەخۆنەگرتووە، هەرچی ئەحکامو یاسای ژیانەو پێویستە بۆ ژیان تێی دایە. هەرچی بەرژەوەندی ئادەمیزادی تێدا بیٚ بۆ ئایینو دونیاو قیامەت ئەو شی کردۆتەوە، هەرچی ڕەوشتی بەرزە تیٚ یدایە. هەرکەسیٚ ئەو نامە پیرۆزە بکاتە یاسای ژیانی بەختەوەرە سەرفرازی دونیاو قیامەتە ﴿مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْراً﴾ هەرکەسیٚ قورئانی پیٚ گەییشتبیٚ لەعەرەبو نا عەرەب لەخاوەن

نامەکان‌و لەغەیری ئەوان، پشتی لێ هەڵکردبێ‌و ئیمانی پێ نەهێنابێ‌و کاری پێ نەکردبێ، بڕوای پێ نەبێ‌و نەیکاتە یاسای ژیانی، هەوڵ بدات مەنهەج‌و پرۆگرامی تر پەیڕەو بکا، ئەوە بابزانی ڕۆژی قیامەت کۆڵی گرانە، بەڵکوو پشتی پێ دەشکێ‌و دەخرێتە ناو دۆزەخەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ﴾ (هود/١٧).

هەرکەسێ قورئانی پێ گەیبێشتبێ لەهەر چین‌و توێژێك بێ، دەبێ شوێنی بکەوێ، پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی بێ، قورئان کەتەلۆکی بوونەوەرەو یاسای ژیانە، نامەی هیدایەت‌و بەختەوەرییە. هەر کەسێك شوێنی بکەوێ سەر فرازو بەختەوەرە، کەسێك پشتی لێ هەڵکا بەدبەخت‌و ماڵ وێرانە، دۆزەخ شوێنی مانەوەی قیامەتیەتی. ﴿خَالِدِينَ فِيهِ﴾ بۆ هەتایە هەتایە لەتۆڵەی تاوانەکانی لەناو دۆزەخ دا دەمێنێتەوەو ساتە وەختێك لێی دەرناچن!

﴿وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلاً﴾ خراپ کۆڵێکە ئەو کۆڵەی ئەوان هەڵیان گرتووە، خراپ سزایەکیان دەدرێ لەڕۆژی قیامەت دا.

﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ﴾ ڕۆژی قیامەت ئەو ڕۆژەیە: کەجاری دووەم فوو دەکرێ بەشاخی سوردا بۆ زیندو بوونەوەو ئەمجار حیساب‌و لێکۆڵینەوە.

﴿وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقاً﴾ لەو ڕۆژەدا بەتایبەتی تاوانباران ڕاپێچی سارای مەحشەر دەکەین ڕەنگ دێزو شین هەڵگەڕاو، لەترسان‌و لەعەیبەتان دەم‌و چاویان شین دەبێ. خەفەتبارو پەشیمان بەڵام پەشیمانی چ سوود!؟

﴿يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلاَّ عَشْراً﴾ لەناو خۆیاندا چپەو سرتەیانە، هەندێکیان بەگوێچکەی هەندێکیان دا دەچپێنن: دەڵێن مانەوەمان لەدونیادا لە دە ڕۆژ زیاترنەبوە، هەر ڕەنگە دە شەوێك لەدونیادا بووبین. واتە کاتێك ئەوان ئەو دیمەنە سامناکانەی قیامەت دەبینن، ژیانی دونیایان لەبیر دەچێتەوە بەکورت‌و کەم

ماوەیی دێتەوە یادیان.. دیارە ئینسان لەکاتی تەنگانەو ناخۆشی دا دیارترین‌و ناشکرا ترین شتی لەیاد نامێنێ. ئەوان لەژێر کاریگەری تەنگانەو ترس‌و نارەحەتی مەحشەردا ژیانی دونیایان لەپێش چاو دەبێتە تاوێک‌و هەر چەند دەکەن‌و دەکروێنن ناتوانن لە دە ڕۆژێک زیاتر بیخەملێنن.

﴿نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ يَوْماً﴾ ئێمە زاناترین چی دەڵێن، دەربارەی مانەوەیان لەدونیادا، لەوکاتەدا بەلای خۆیانەوە ڕاستگۆ تریان‌و عاقڵتریان دێتە ناخاوتن‌و گوایە هەڵەیان بۆڕاست دەکاتەوە دەڵێ ئێمە تەنها ڕۆژێک ماوینەوەو بەس! ئاواو بەو جۆرە ئەو تەمەنە دورو درێژەی بەسەری بردووە لەدونیادا (٥٠) ساڵە سەد ساڵە کەمترە یان زیاترە لێی دەبێتە تاقە ڕۆژێک‌و هەر چەند دەکات زات ناکا بەمزۆر تری دابنێ، لەوانەیە ئامادەبێ کورت تری بکاتەوە، بەڵام بۆ زیاد کردن ئامادە نیە!! مەبەستیشان ئەوەیە: بیانو بدۆزنەوە کەژیانی دونیایان هێندە کورت‌و کەم ماوە بوو ماوەیان نەبوە لەئاینی ڕاست حاڵی بن‌و پەیڕەوی بکەن. بۆیە هەر هەوڵی ئەوەیانە ژیانی دونیایان بەکورت لەقەڵەم بدەن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ﴾ (الروم/٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ، قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ﴾ (المؤمنون/١١٢-١١٣).

## ڕۆژی قیامەت زەوی‌و کێوەکان‌و ئادەمیزادەکان حاڵ‌و وەزعیان چۆن دەبێ

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا

﴿يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی حاڵو چۆنیەتی ڕۆژی قیامەتو تەنگو چەڵەمە ناسکەکانی کرد، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا باسی پرسیار کردنی ئەوانە دەکا کە: بڕوایان بەحەشر نیە، پرسیار دەکەن دەڵێن: ڕۆژی قیامەت خودا چی بەکێوەکان دەکا، وەکوو خۆیان دەمێننەوە یان نا؟ لەگەڵ وەڵامی پرسیارەکەدا هەندێ شتی تریش ڕوون دەکاتەوە. ئەوە ئاشکرا دەکا: کەلەو ڕۆژەدا زەوی تەخت دەکرێو هیچ بەرزاییو تەپۆڵکەو چاڵو چوێڵی تێدا نامێنێ، خەڵکی بەپەلەو بەڕاکردن بەدەم بانگەوازی کۆبوونەوە دەچنو ئامادە دەبن. بۆحیسابو لێکۆڵینەوە لەترسان هەستو خوستیان لێ دەبڕێ، دەنگەدەنگو هەراو هۆریایان نامێنێ، شەفاعەت کردن بۆ تاوانباران بێ سوودە، مەگەر یەکێك خودا بیەوێ شەفاعەتی لێ وەربگرێ، خودا بۆخۆی ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکیانە، جالەو ڕۆژەدا هەموو سەرێك بۆ خودا نەوی دەکرێ، هەموو کەسێك بەناچاریی گەردنکەچی خۆی بۆخودای باڵا دەستو خاوەنی بوونەوەر ڕادەگەیەنێ، خەسارەتمەند ئەو کەسەیە لەدونیادا

ستەمی لەخۆی کردبێ هاوەڵی بۆ خودا دانابێ، سەرپێچی فەرمانو نەهیەکانی خودای کردبێ.

بەلاّم خوداپەرستان چاوەڕوانی ڕەحمەتی یەزدانن ترسی ئەوەیان نیە لەخراپەکانیان زیاد بکرێو لەچاکەیان کەم بکرێتەوە.

ئیبنو مونذیر لەئیبنو جورەیجەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: قورەیشییەکان پرسیاریان لەپێغەمبەر ﷺ کرد وتیان: ئەی موحەممەد! ڕۆژی قیامەت خودای تۆ چی لەم کێوانە دەکا.؟ ئیتر پەروەردگار بۆ وەلاّمی ئەوان ئەم ئایەتەی نازڵ کرد: کەدەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْجِبَالِ﴾ واتە: ئەی موحەممەد! موشریکەکان پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حاڵو وەزعی کێوەکان ئاخۆ وەکو خۆیان دەمێننەوە، یان لادەچن؟ ﴿فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّي نَسْفاً﴾ بلێ خودای من کێوەکان ووردو خاش دەکاو هیچیان لەشوێنی خۆیان وەکوو خۆیان نامێنن دەبنە تەپو تۆزو بەهەوادا بلاّو دەبنەوە ﴿فَيَذَرُهَا قَاعاً صَفْصَفاً، لا تَرَى فِيهَا عِوَجاً وَلا أَمْتاً﴾ دوای ئەوە کێوەکان ئاوا دەکاتە تەپوتۆز، ئەمجار زەوی هەمووی دەکاتە دەشتێکی کاکی بەکاکی ڕووت و دەرەختو شینایی تێدا نیە، بەرزاییو تەپۆڵکەو چاڵو چوێڵی تێدانابینی.

﴿يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ الدَّاعِيَ لا عِوَجَ لَهُ﴾ جالەو ڕۆژەدا ئادەمیزادەکان بەپەلەو بێ دواکەوتن کەبانگکەر بانگیان دەکا بۆ دەشتی مەحشەر، چۆنیان فەرمان پێ بکا بەدەنگییەوە دێنو کەسیان خۆلانادا، ناتوانن خۆ بشێرنەوە، بەڵکوو بەپەلەو بەهەڵەداوان شوێنی دەکەون، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مُهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ﴾ (القمر/٨) بەڕاستی دیمەنێکی سامناکەو هەتا بیری لێ بکەینەوە زیاتر ترسناك دەبێ، سەر سوڕمانو حەبەسانمان توش دێ. ئەو هەموو کەژو کێوە داکوتراوانە ئەو هەموو شاخە سەختو سەر کەشانە هەموویان وردو هاڕ بکرێن. ئەمجار ئەو هەموو ئادەمیزادە: کەهەر خودا ژمارەیان دەزانێو دەزانێ چەندو چۆنن؛ هەموویان کۆ بکرێنەوەو ڕاپێچی سارای مەحشەر بکرێن، بێ ئەوەی کەس

بتوانێ سەرپێچی بکا، خۆپاش بدا، منجە منجو لادانێکی هەبێ، هەموویان ملکەچو سەر شۆڕ ڕێز دەبەستنو بەرەو دەشتی مەحشەر دەکەونە ڕێ. بەپێچەوانەی جیهانەوە کەسەرپێچی بانگخوازانی ئیسلام دەکەن، بەرویاندا دەچنەوە، بەرەنگارییان دەبنەوە چەنە بازو دەم درێژو چەقاوەسووا لەوێ هیچ سەرپێچیو فرتو فێڵێکیان نامێنێ.

﴿وَخَشَعَتْ الأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَنِ فَلا تَسْمَعُ إِلاَّ هَمْساً﴾ بێ دەنگیەکی سامناك باڵی خۆی بەسەر مەحشەردا دەکێشێو هیچ کەس دەنگی لێوە نایە، زاوە زاوو قیڕەو هەرا هەرا نامێنێ، مەگەر لە ژێر لێوەوە چپەیەك بکەن ئەویش نابیسترێ دیمەنێکی ترسناکەو تابڵێی سامناکە، دەشتی مەحشەر پڕ بووە لەئادەمیزاد چاو هەرچەند دوور بین بێ، ئەمسەرو سەری نابینێ، هەموو ئەو مەخلوقاتە کشو مات، بێ دەنگو خشپە، قسە کردنیان چپەو سرتەیە پرسیارلێکردنیان لەژێر لێوەوە ئەنجام دەدرێ، ترس ئەو جیهانەی داپۆشیوە. هەموویان سەر کزو داماوو گەردنکەچی خودای خاوەن دەسەڵاتو دادپەروەرن!

﴿يَوْمَئِذٍ لا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلاَّ مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ﴾ لەو ڕۆژەدا شەفاعەتو تکاکردنی کەس سوود بەکەس ناگەیەنێ مەگەر خودا لەوە پێش ئیزن بدا بەشەفاعەت بۆ کردنیو ﴿وَرَضِيَ لَهُ قَوْلاً﴾ لەوە پێش ڕازی بووبێ لە قسەو ئاخاوتنی شایەتومانو گوفتارەکانی پەسەند بووبنو خودا لێی وەرگرتبن، هەر شەفاعەتو تکا کردنێك خودا وەری نەگرێو ئیزنی پێ نەدا ناکرێو جێ ناگرێ، چونکە بۆ خۆی خاوەنەو دەسەڵاتی موطلەقی هەیە لەبوونەوەردا چی بوێو چۆنی بوێ هەر ئەوە دێتە جێ!.وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ (البقرة/٢٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾ (النجم/٢٦) یان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ (الأنبياء/٢٨) یان دەفەرموێ:

﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفّاً لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَقَالَ صَوَاباً﴾ (النبأ/٣٨).

عیللەتو هۆکاری ئەوە: کەدەبێ شەفاعەتو تکا کردن ڕەزامەندیی خودای لەسەر بێ، بەبێ ئیزنی خودا شەفاعەت نابێ. ئەوەیە: چونکە خودا بۆخۆی ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلا يُحِيطُونَ بِهِ عِلْماً﴾ دەزانێ چی لەپێش بەندەکانیدایەو چییان تووش دێ لە ڕوداوی قیامەتو ئەوەی لەپاش خۆیان جێ هێشتووەو ئەنجامیان داوە لەدونیادا..

یان ماناکەی بەپێچەوانەوەیە، واتە: خودا ئاگادارە بەسەر ئەوەی لەپێش دەستیا بووەو ئەنجامیان داوە لەکارو باری دونیاو هەروا ئەوەی لەدوایانەوە دێ لەپاداش و سزای ڕۆژی قیامەت.

بەکورتی خودا ئاگادارە بەمەخلوقاتی خۆی لەهەموو بارێکەوە، بەڵام زانیاری بەندەکانی پەی بەزاتو صیفاتو زانیاری خودا نابا. بەباشی خودا ناناسن‌و ئاگاداری زانستو زانیاری خودا نین.

﴿وَعَنَتْ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ﴾ هەموو ڕوخسارو سەرو ملێك زەلیل‌و کزو داماوە، هەموو کەس سەر شۆڕو ملکەچو بێ دەسەڵاتە لەئاست ئەو خودایەی هەمیشە زیندوەو مردنی بەسەردا نایە، ڕاگری هەموو شتێکەو هەموو بونەوەر بە ویستو ئیرادەو پلانی ئەو هەڵدەسوڕێ‌و کار دەکا.

﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْماً﴾ خەسارەتمەندو ماڵوێرانە کەسێك کەمێکی لەستەمکاری‌و شیرك تێدابێ. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (اياكم والظلم فان الظلم ظلمات يوم القيامة، والخيبة كل الخيبة وهو به مشرك، فان الله يقول: ﴿ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾)(لقمان/١٣).

ئـەمجار دوا بـەدوای باسـی سـتەمکاران و هەڕەشـەکردن لێیـان باسـی خـودا پەرستان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ مِنْ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلا يَخَافُ ظُلْماً وَلا هَضْماً﴾ هەرکەسێك ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێبکاو وێـڕای کـردەوەی باشـی ئیمـانی دامـەزراوی هـەبێ؛ بـڕوای بـەتاك و تـەنهایی خـوداو، ڕاسـتی پێغەمبـەران و نامـەکانیان و هـاتنی پێغەمبـەران و نـاوەڕۆکی نامـەکانیان و هـاتنی ڕۆژی قیامـەت هەبێ، ئەوە ترسی ئەوەی نیە هیچ جەورو ستەمێکی لێ بکرێ بەم جۆرە لە خراپـە کاریـەکانی زیـاد بکـرێ، یـان بـەبێ تـاوان سـزا بـدرێ. هـەروا ترسـی ئەوەشـی نیـە: کەلەکردەوە باشەکانی کەم بکرێتەوە، مافی پێشێل بکرێ!

## قورئان بە زوبانی عەرەبی نازڵ بووە، دەبێ پێغەمبەر ﷺ تا کۆتایی سروش گوێ ڕابگرێ و قورئانەکە نەڵێتەوە

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی (١١٤) ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ﴾ ئیبنو ئـەبی حاتەم لە(السدی) ڕیوایەت دەکا، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کە: جوبرائیـل نیگای بـۆ دەهێنـا زۆر هـەوڵی دەدا خێـرا لەبـەری بکـا، تەنانـەت خـۆی زۆر مانـدو دەکرد نەوەکوو جوبرائیل لەلای بڕواو هێشتا لەبەری نەکردبێ.

ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ﴾ ی نازڵ کرد.. لەفەرموودەی صەحیح دا لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت کراوە: دەفەرموێ: هەر کاتێک جوبرائیل قورئانی بۆ دەهێنا، هەر کەئایەتێکی بۆ دەخوێندەوە خێرا خێرا ئەویش لەگەڵی دەگوتەوە بۆئەوەی زوو فێری ببێ‌و لەبەری بکا.

ئیتر خودای تەعالا فەرمانی پێ کرد کە: ئەو عادەتە واز لێ بێنێ‌و ڕێگایەکی ئاسانتر بگرێتە بەر.

جاوەکوو لەوە پێش باسی ئەوەی کرد: کەچۆن دونیا خراپ دەبێ‌و سیستەمی زەوی تێک دەچێ، هەڕەشەی ئەو ڕۆژە سامناکەی لەئادەمیزاد کرد: ئەمجار ئەوەدەچەسپێنێ کە: قورئان بەزوبانی عەرەبی ئاشکراو ڕوون نازڵ کراوە، ئەوەش دوپات دەکاتەوە: کەئەم قورئانە نامەیەکی بەسودە بۆ ئادەمیزادو گەلێک شتیان بۆ ڕوون دەکاتەوە، داوایان لێ دەکا پەند لەگەل‌و نەتەوەکانی ڕابردوو وەربگرن، ئەمجار تاك و تەنهایی خودا دەچەسپێنێ‌و ئەوەش ڕادەگەیەنێ کە: خودای خاوەن فەضل قورئان لەدڵ‌و مێشکی پێغەمبەردا ﷺ جێگیر دەکاو ناهێڵێ لێی تێک بچێ یان لەبیری بچێتەوە. دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً﴾ وەکوو چۆن ئایاتی هەڕەشەو گوڕەشەمان نازڵ کردون، هەر بەو جۆرەو لەسەر ئەم بارو شێوە قورئانمان نازڵ کردوە، قورئانێکە بەزوبانی عەرەبی نێردراوە بۆئەوەی لێی حاڵی ببن‌و فێری خوێندنەوەی ببن.

﴿وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنْ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْراً﴾ بەشێوەی جۆراو جۆر لەم قورئانەدا هەڕەشەمان لەئادەمیزاد کردوە ترساندومانن هەڕەشەو ترساندنەکانمان دوبارە سێ بارە کردۆتەوە بۆ ئەوەی لەخودا بترسن‌و خۆیان لەسەرپێچیکردنی بپارێزن! ئەو هەڕەشەو ترساندنە کار لەدڵیان بکاو پەندو عیبرەت وەربگرن‌و بەخۆیاندا بچنەوەو ڕووبکەنە خودا پەرستی‌و طاعەتکردن.

ئـەمجار دوای تـە عظـیم وپەسـنی قورئـان پـەروەردگار باسـی گـەورەیی‌و شکۆمەندیی خۆی دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ گەورەو شکۆمەندە، بـەرزو پـاك‌و بڵنـدە ئـەو خودایـەی نـاوی (الله) یـەو قورئـانی نـازڵ کـردوە، پادشـاو مـەلیکێکی حـەق‌و ڕاسـتە، خـاوەن بڕیـارو کاربەدەسـتێکی ڕەهایـە، فـەرمان‌و نەهیـەکانی دروسـت‌و ڕەوان، خودایـەکی باڵادەسـت‌و بـەرزو پـیرۆزە، جێگـرو دامەزراوە، بەکەس لەخودایەتی ناکەوێ، شایانی ئەومیەچاوەڕوانی بەڵێن‌و مەترسی لەهەڕەشـەکانی بکـرێ. خودایەکە عیقـاب‌و پـاداش بـەدەس خۆیـەتی، عەداڵـەتکارە هـەتا پێغەمبـەر نـەنێرێ‌و پـەیامی خـۆی بـە خـەڵکی نەگەیـەنێ، کـەس سـزا نـادا، ئاشـکرایە ئەمـە هـەڵنانی موسـوڵمانانە بـۆ ئـەوەی خوبدەنـە خوێنـدنی قورئـان‌و لێکۆڵینەوەو ورد بوونەوە تێیدا. ئاماژەیـە بـەوە: کەفـەرمان‌و نەهیـەکانی لـەدونیاو قیامەتدا بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادن، هەرکەسێك سەر پێچییان بکا خـودا ڕیـسوای دەکا، ئـادەمیزادی عاقـڵ‌و هۆشمەنـد کەسـێکە بـە دڵ‌و بـەگیان ڕوو بکاتـە قورئـان‌و بەتـەواوی بیکاتـە بەرنامـەی ژیـانی خـۆی‌ا بـەموو لێـی لانـەدا. ئـەمجار فـەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُقْضَى إِلَيْكَ وَحْيُهُ﴾ پەلە مەکە لەخوێندنەوەی قورئان، بەم جۆرە لەگەڵ جوبرائیل دا بیڵێیـەوە. هـەتا جوبرائیـل لەگەیانـدنی سـروش بـۆلای تـۆ نەبێتـەوە، تـۆ خوێندنەوەکـەی دووبـارە مەکەوە.

ئـەوە بـوو پێغەمبـەر ﷺ هـەر کـاتێ جوبرائیـل سروشـی بـۆ دەهێنـاو بـۆی دەخوێنـدەوە لەگـەڵ خوێندنەوەکـەی جوبرائیـل دا وشـە بەوشـە ئـەویش لەبـەر خۆیەوە دەیخوێندەوە. دەترسا لەوەی جوبرائیل لەلای بڕوا، ئەم بەتەواویی لەبەری نەکردبێ، ئیتر بەم ئایەتە جڵەو گیری لەو کارە لێ کرا، چوونکە وێ دەچـێ خـەریك بوون بەوتنی وشەیەك لەبیستنی وشەی دوای ئەو مەشغوڵی بکا. فەرمانی پـێ کـرا: کەلەکاتی گەیاندنی سروش بۆی لەلایەن جوبرائیلەوە ئەو تەشریفی بێ دەنگ بێ‌و

گوێچکەو دڵی خۆی بۆ بکاتەوە. ئەم بۆخۆی بیخوێنێتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ، ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ (القيامة/١٦-١٩).

بەکورتی: دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! لەکاتی نازڵبوونی نیگا بۆسەرت ئەتۆ بێدەنگ بە: کەفریشتە لە خوێندنی سروشەکە تەواو بوو ئەمجار تۆ بیخوێنەوە. لەوە مەترسە کەلەبیرت بچێتەوە چونکە ئێمە قورئانمان بۆ ناردویە خواری‌و ناهێڵین لەبیرت بچێتەوە.

کەواتە لەجیاتی ئەوەی پەلەبکەی داوا لەخودا بکەو لێی بپاڕێرەوە ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْماً﴾ بڵێ: خودایە! زانیاریم بۆ زیاد بکە.

تیرمیذی‌و ئیبنو ماجەو بەزار لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکەن: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (اللهم انفعنی بما علمتنی، وعلمنی ما ینفعنی، وزدنی علماً، والحمد لله علی کل حال، واعوذ بالله من حال اهل النار).

ئیبنو مەسعوود کەئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ئەم دوعایەی دەکرد (اللهم: زدنی ایماناً وفقهاً ویقیناً وعلماً) خودایە: بڕواو تێگەیشتن‌و دڵنیایی‌و زانیاریم زیاد بکە.

## چیرۆکی ئادەم عليه السلام لەناو بەهەشتداو دەرکردنی لەوێ

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ

لَكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ
أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا
تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ
أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا
فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ
ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ
وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ
فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ
وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ
ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ
حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا

فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾

ئەمە جاری شەشەمە قورئان چیرۆکی ئادەممان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە، لەوە پێش پێنج جاری ترلە سورەتی (البقرة، الأعراف، الحجر، الإسراء، الكهف)دا سەر گورشتەی باوە ئادەمی گێڕاوەتەوە. ئەمە شەشەم سورەتەو شەشەم جارە قورئان ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە، هەر جارەش ئوسلوبو شێوەی چیرۆکەکە دەگۆڕێ.

چیرۆکەکانی قورئان لەشوێنی خۆیاندا دەهێندرێنو لەگەڵ پێشەوەو پاشەوەی چیرۆکەکەدا گونجاوەو جۆشی خواردووە.

بۆ نمونە: کەلێرەدا چیرۆکی ئادەم ﷺ دێنێ، لەپێشیەوە باسی پەلەکردنی پێغەمبەری ﷺ کردووە کە: لەکاتی وەرگرتنی سروش دا خێرا خێرا لەگەڵ جوبرائیل دا پیت بەپیتو وشە بەوشە لەبەر خۆیەوە دەیخوێندەوە نەوەکوو لەبیری بچێتەوە، وەلە چیرۆکی باوە (ئادەم) یش دا خاڵی لەبیر چونەوەی بەزەقی هێناوە.. هەروەها لەوە پێش لە سورەتەکەدا باسی ڕەحمەتو ڕیعایەتی خودای کردوە بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی، لێرەش دا لە چیرۆکی ئادەم دا ئەوە ئاشکرا دەکا کە: پەروەردگار ئادەمی هەڵبژاردوەو تۆبەی لێ وەرگرتوەو هیدایەتی داوە. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا دیمەنێکی قیامەت نیشان دەدا: کەوێنەی سەرەنجامی هەردوو کۆمەڵی خودا پەرستانو یاخی بوان دەکێشێ!!

بەشێوەیەکی گشتیش ئاماژە بەوە دەکا: کەبەگوێ کردنی ئادەمیزاد بۆ شەیتان شتێکی کۆنەو تازە داهاتوو نیە، سروشتی ئادەمی وادارێژراوە کە: فەرمانو نەهیەکانی خودایان لەیاد دەچێ، وەکوو چۆن باوە ئادەمیان کاتێ فەرمانی پێ کرا کە: لە داری گەنم نەخوا، نەهیەکەی لەبیر چوو لەداری گەنمی خواردو توشی ئەو

هەموو کوێرەوەری‌و دەردی سەرییە هات. ئەمجا پاداشتی خودا پەرستان‌و سزای سەرپێچیکاران دیاری دەکاو دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِنْ قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا﴾ سوێند بەخودا ئێمە لەوە پێش‌و لەکاتی خۆیدا ئامۆژگاری ئادەممان کرد: کەلە ئەو درەختە نەخوا، کەچی فەرمانی خودای لەبیر چوو، بەگوێرەی فەرمان‌و نەهیەکانی خودا هەڵس‌و کەوتی نەکرد، لە دارەکەی خواردو گوێی بە ئامۆژگاریەکانی خودا نەدا. بەمەرجێك لەوەپێش عەزم‌و بڕیاری نەدابوو ئەو کارە ئەنجام بدا، چونکە بڕیاری دا کەلەو دارە نەخوا بەڵام پاشان لەبیری چوو. کەشەیتان دەنە دەنەی دا. خۆی بۆنەگیراو لەدارەکەی خوارد ئێمە هێزو توانای پابەند بوون بەبەڵێنەکانیمان تێدا نەدی.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا دەفەرموێ: بۆیە ئەم پێڕە مەخلوقاتە ناونراوە (ئینسان) چونکە ئامۆژگاری کراو لەبیری چوو. مەبەست بە (عەهد) لەئایەتەکەدا فەرمان‌و نەهی پەروەردگارە، ئادەم ئامۆژگاری کرا لەدارەکە نەخواو نزیکی نەکەوێتەوە، بەڵام پاشان شەیتان فرسەتی لێ هێناو هەڵی خەڵەتاندو لەبەردەم چاوو ڕاوی شەیتاندا خۆی بۆی ڕانەگیرا. ئادەم ڕێگای پێ درابوو کە: لەبەرو بوومی هەموو درەختەکانی بەهەشت بڵاوا جگە لەبەری درەختێك، ئەوەش بۆ تاقیکردنەوە بوو، شتێکی پێویست بوو بۆ پەروەردە کردن‌و پێگەیاندن، بۆئەوەی بەر بەرەکانی نەفس‌و شەیتان بکا، کەسایەتی خۆی بچەسپێنێ، هەر کاتێ ویستی بتوانێ خۆی لەکۆت‌و قەیدی هەوا ڕزگار بکا، ورە بەرزو خۆڕاگربێ ئارەزووەکانی نەیکەنە بەندەی زەلیلی خۆیان!

چونکە هەتا ئادەمیزاد بتوانێ بەر بەرەکانی نەفس‌و شەیتان بکا، بتوانێ ئارەزووەکانی بپێچێتەوەو بەسەریاندا زاڵ ببێ پلەی ئادەمیزادی بەرز دەبێتەوە،

هەتا دەستە وەسانو خوازو پەککەوتە بێ بەرامبەر ئارەزووەکانی ئەوە لە پلەو پایەی ئادەمییەتی نزم دەبێتەوەو ڕادەی ئاژەڵێتی تێدا باڵا دەبێ!

جا لەبەر ئەوە حیکمەتی پەروەردگار داخوازی ئەوە بوو: بەو جۆرە چاودێری ئادەمیزاد بکا، بەتاقی بکاتەوەو لەبۆتەی تاقیکردنەوەدا قاڵی بکا، بۆئەوەی ئامادەی بکا بۆ جێنشینی لەسەر زەوی‌و ئەو کارە گرنگەی پێ بسپێری‌و ئەویش بەلێهاتوویی ئەنجامی بدا، هێزی بەرگری‌و خۆڕاگری تێدا بوروژێنێ‌و گەشەی پێ بکا، چاوی بکاتەوە بەسەر ئەو هەموو کێ بڕکێ‌و بێنەو بەرەیەدا: کەچاوەڕوانی دەکا لەداهاتوودا. ئامادەی بکا بۆ بەر بەرەکانی کردنو بەگژدا چوونەوەی بەتاڵ‌و بەتاڵ خوازانو چەسپاندنی حەق‌و ڕاستی لە سەر ئەو زەوییەی کە: دەبێتە جێ نشین تێیدا. هەڵوێستی خۆی دیاریی بکا لەنێوان ئەو ئارەزوو مەبەستانەی شەیتان لەپێش چاوی دەیان ڕازێنێتەوە، لەبەرامبەر ویستو ئیرادەی مرۆڤانەی خۆی‌و ئەو عەهدو پەیمانەی بە پەروەردگاری داون!

بەکورتی پەروەردگار بەو جۆرە ئادەمی بەتاقی کردەوەو وەسیەتی خۆی پێ ڕاگەیاند، بەڵام لەم تاقیکردنەوەو بەرامبەریکردنەدا وەکوو پێویست دەر نەچوو. وەسیەتو فەرمانەکەی بەگرنگ نەگرت‌و پێیەوە پابەند نەبوو، واتە لەبەری درەختە قەدەغە لێکراوەکەی خوارد!

ئەمجار پەروەردگار تەفصیلاتی پابەند نەبوونەکەی ئادەم ﷺ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ﴾ ئەی پێغەمبەر باسی ئەوە بۆ گەلەکەت بکەو ئەومیان بۆ بگێڕەوە: کەفەرمانمان بە فریشتەکان کرد کەسوژدەی ڕێزو تەقدیر بۆ ئادەم بەرن. ﴿فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى﴾ ئیتر هەموو فریشتەکان سوژدەیان بۆ ئادەم بردو ڕێزیان لێ نا، جگە لەشەیتان ئەو سوژدەی نەبرد، خۆی بەزل زانی‌و هاوبەشی فریشتەکانی نەکرد لەسوژدە بردن دا، چونکە حەسودی بەئادەم بردو پێی ناخۆش بوو کە: پەروەردگار ئەو هەموو نیعمەتانەی

بە ئادەم ﷺ بەخشی. هەڵبەتە لە شوێنی تردا بەدرێـژی باسی ئـەم بەسـەرهاتەی کردوە، بەگوێرەی پێویست لەشوێنی تـردا لایەنـەکانی شی کردونـەوە، وەلێ لێرەدا ئاوا بەکورتی باسی دەفەرموێ چونکە شوێنەکە شـوێنی باسـکردنی چاکەیەو باسـی چاودێری پەروەردگارە بـۆ ئـادەم ﷺ ، بۆیـە دیـاردەی نیعمەتـەکانی خـودا بەسـەر ئادەم دا ﷺ دەخاتە ڕوو.

جا کە شەیتان سەرپێچی فەرمانی ئێمەی کردو سوژدەی بۆ ئادەم ﷺ نەبرد ﴿فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ﴾ ئێمەیش وتمـان: ئـەی ئـادەم! بـاش بزانـەو دڵنیا بە، ئـەم شـەیتانە کـەوا فـەرمانی ئێمـەی شـکاندو خـۆی بـەزل زانـی، دوژمنـی خۆت‌و هاوسەرەکەتە، هەرگیز کامەرانی ئێوەی ناوێ، حەز ناکا ئێوە لەخۆشیدا بن، کـەوابێ ئاگاتـان لـەلاۆتان بـێ‌و وریـا بـن نەکەونـە داوەکانیـەوە، لـەهیچ شـتێك دا گوێڕایەڵی مەبن، ﴿فَلا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنْ الْجَنَّةِ﴾ کارێك مەکەن شەیتان ببێتـە هۆکاری دەرکردنتان لەبەهەشت ﴿فَتَـشْقَى﴾ ئـیتر لـەناکامی دەرکردنتـان لەبەهەشـت توشـی دەردی سەری‌و کولەمەرگی ببن‌و بکەونە ناو تەنگ‌و چەڵەمەی ژیانەوە.

بەکورتی زۆر وریا بەو نەهێڵی شەیتان فرسەتت لێ بێنێ‌و بتخاتە ناو تەنگ‌و چـەڵەمەی ژیانــەوە، لەبەهەشـت خـۆت‌و هاوسـەرت وەدەرنـێ‌و بکەونـە هەوڵـدانی فەراهەم هێنانی بژێو، ئێوە ئێستا لەبەهەشـت دا بـێ مانـدو بـوون‌و دەردی سـەریی بژێویتان بۆ دابین کراوە..

﴿إِنَّ لَكَ أَلاَّ تَجُوعَ فِيهَا وَلا تَعْرَى﴾ بێگومان بۆ تـۆو هاوسـەرت هـەموو شـتێك دابین کراوە، تێیدا برسی نابێ‌و روت‌و قوت نابێ، ﴿وَأَنَّكَ لا تَظْمَأُ فِيهَا وَلا تَـضْحَى﴾ هەروەها تۆ لەوێدا تینوت نابێ، گەرمات نابێ، واتە: گـەرمای خـۆر ئـازاری دەرونـت نادا هەتا تینو بێ، ئازاری جەستەشت نادا، ئایەتەکە برسێتی‌و رووتی خستنە پـەنا یـەکترەوە: چـونکە برسـێتی ئـازاری نـاوەوەی جەسـتەیەو رووتـی ئـازاری دەرەوەی

جەستەيە. هەروا تونيەتىو گەرما بوونى جەستەشى خستە پەنايەكەوە. لەبەر هەمان هۆ.

لە بەرامبەر برسێتىو ڕوتيدا تينوايەتىو وەبەرخۆر كەوتنى هێنا، نەبونى ئەم چوار شتە، يان دەستەبەر بوونى تێرىو پۆشتەيىو تێراوىو ژێر سێبەرى هۆكارى خۆشى ژيانن. ئادەميزاد هەميشە لەهەوڵو تەقەلّلادايە بۆ دابينكردنيانو لەپێناو دەستەبەر كردنيان دا زۆر زەحمەتوماندوو بوون دەكێشێ.

ئەمجار دواى ئەوەى بەوشێوە ڕێزى لەئادەمو حەوا گرتو نيعمەتى خۆى بەسەردا ڕشتنو لەپيلانى شەيتان ترساندنى، باسى هەڵخەڵەتاندنى ئادەم عليه السلام دەكاو گيرۆدە بوونى بەوەسوەسەى شەيتان ڕون دەكاتەوە، دەفەرموێ: ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ﴾ شەيتان ختوكەو دەنەدەنەى ئادەمىدا هەڵيفريواند، ﴿قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لا يَبْلَى﴾ ئەى ئادەم! شارەزاييت بكەم بۆ خواردن لەبەروبومى درەختێك كەمايەى خۆشى هەتا هەتايى يە، ئائەو دارە هەركەسێ لێى بخوا قەت نامرێ، شەوكەتو شانو شكۆمەندى لەكيس ناچێ مڵكو دارايى نابڕێتەوە، واتە: ئەگەر لەم درەختە بخۆن هەرگيز نامرنو لەناو ئەم خۆشىو سەڵتەنەتەدا دەمێننەوە. سوێندى زۆرى بۆ ئادەمو حەوا خواردو جەختى بۆ كردنەوە كە ئەو ڕاستە لەگەڵيان داو بەدڵێكى خاوێنەوە ئامۆژگاريان دەكا، وەكوو لەئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ﴾ (الأعراف/٢١).. بەڵێ هەڵى خەڵەتاندنو لەلاشتەى بردن وەكوولە شوێنێكى تردا دەفەرموێ: ﴿فَدَلاَّهُمَا بِغُرُورٍ﴾(الأعراف/٢٢).

دەربارەى ﴿شَجَرَةِ الْخُلْدِ﴾ پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەيەكيدا كە: ئيمام ئەحمەدو ئەبو داودى طەياليسى لەئەبو هورەيرەوە ڕيوايەتيان كردوە، دەفەرموێ: (ان فى الجنة شجرة يسير الراكب فى ظلها مئة عام مايقطعها، وهى شجرة الخلد)

بێگومان لەبەهەشت دا درەختێك هەیە سوار سەد ساڵ بەژێر سێبەرەکەیدا دەڕوا لێی دەرناچێ ئەوە درەختی خولدە.

بێگومان سروشتی ئادەمیزاد واهاتووەو واداڕێژراوە حەزی لەتەمەنی درێژو دەسەڵاتی نەبڕاوەیەو هەمیشە ئاواتە خوازە بۆی. بۆیە ئادەم عەهدو پەیمانو ئامۆژگاری پەروەردگاری لەیاد نەماو لەبیری چووەوە. ئیتر لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کەوتنە سەر رێبازی تاوانکردنو ﴿فَأَكَلا مِنْهَا﴾ سەرەنجام لەبەری دارەکەیان خوارد، سەرپێچی فەرمانی خودایان کردو گوێڕایەڵی شەیتانیان کرد، ﴿فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا﴾ شەرمگایان دەرکەوت، پۆشاکیان لەبەر داڕندرا، لەوە پێش شەرمگای خۆیان نەدەبینی، دوای خواردنیان لەبەرو بوومی دارەکە شەرمگای خۆیان بینی.

﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ ئیتر دەستیان کرد بەداپۆشینی شەرمگای خۆیان بەگەڵای درەختەکانی بەهەشت، دەڵێن: گەڵای دار هەنجیریان بەجەستەی خۆیانەوە دەلکاندو عەورەتی خۆیانیان پێ دادەپۆشی، ﴿وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى﴾ بەو خواردنە ئادەم عليه السلام سەرپێچی فەرمانی خودای کردو رێگای راستی لێ گوم بوو، ژیانی لەخۆیو هاوسەرەکەی تاڵ کرد.

بێگومان سەرپێچی فەرمانی واجب تاوانە، سزادانیش لەسەر تاوان حەقو عەدالەتە، وەلێ تاوانی ئادەم عليه السلام تاوانێکی تایبەتییەو بەتەرتیبو تەدبیری خودای زاناو دانا ئەنجام دراوە.

بوخاریو موسلیم لەم بارەوە فەرمودەیەکیان لە ئەبوهورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (احتج أدم وموسى، فقال موسى: يا أدم: انت ابونا اخرجتنا من الجنه، فقال يا موسى اصطفاك الله عزوجل بكلامه ولاط لك بيده ياموسى، اتلومني على امر قدره الله عليّ من قبل ان يخلقني باربعين

سـنة فحـج ادم موسـى ثلاثـا)[1]. بێگومـان ئـەم تاوانـەی ئـادەم ﷺ هەرچـەندە بـچوکیش بـووبێ، بـەڵام پـەروەردگار بـە گـەورەی لەقەڵـەم داو جـاری سەرپێـچی کردنو یاخی بوونی لێ دا، چونکە ئادەم ﷺ لای خودا پایە بەرزو خاوەن ڕێز بوو. بائەو کاتە پێغەمبەریش نەبووبێ. چونکە بەندە تالای خودا خاوەن پلەو پایـە بێ تاوانی لێ ناشیرین تـرە، دەگوترێ: (حـسنات الأبـرار سيئات المقـربين) چاکەی پیـاو چاکان وادەبێ بۆ نزیکانی خودا دەبێتە تـاوان بۆیـە دەبێ ئـەو جـۆرە بەندانـە زۆر وریا بن! چونکە کەمترین هەڵە بۆ ئەوان بـەتاوان حلێبـە. هـەر کـارێکی نـاڕەوا: بـۆ کەسـانی دیکـە تـاوان نـەبێ بۆئـەوان بـەگوناه دەژمێـردرێ، لەلایـەکی تـرەوە ئـەم تاوانەی ئادەم ﷺ بۆ ئەوەیە رۆڵەکانی تەمێ خواردو ببنو بترسێن لـەفرتو فێڵـی شەیتان.

﴿ثُـمَّ اجْتَبَـاهُ رَبُّـهُ فَتَـابَ عَلَيْـهِ وَهَـدَى﴾ پاشـان پـەروەردگار ئـادەمی ﷺ بەهەڵبژاردە داناو کەپەشیمان بۆوە لەتاوانەکانی لـەخۆی نزیـك کـردەوە، تۆبـەی لێ وەرگـرت، ڕێنمـونی کـرد بۆسـەر ڕێبـازی راسـتو لەسـەر ڕێبـازی پەسـەندی خـۆی دایمەزراند، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِـن رَّبِّـهِ كَلِمَـاتٍ فَتَـابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ (البقرة/٣٧) لەشوێنێکی تریش دا شێوەی پاڕانەوەکەی ئادەمو حەوامان بۆ دەگێڕێتەوە دەفـەرموێ: ﴿رَبَّنَـا ظَلَمْنَـا أَنفُـسَنَا وَإِن لَّـمْ تَغْفِـرْ لَنَـا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (الأعراف/٢٣)

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی دا بەدەرکردنی ئادەمو حـەوا ﴿قَـالَ اهْبِطَـا مِنْهَـا جَمِيعـاً﴾ فـەرموی: لەبەهەشـت دەرچـنو هـەمووتان بڕۆنـە خـوارێ بۆسـەر زەوی،

[1] روه البخاری في احاديث الانبياء (٣٤٠٩) بـاب (٣١) وفـاه موسـى عليـه السلام ورواه مـسلم فـی كتاب القدر(٢٦٥٢) باب(٢) حجاج ادم وموسى عليهما السلام. کەلەکۆتای فەرمودەکەدا دەفـەرموێ (ثلاثا) واتە: پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرموی.

﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن؛ ئێوە دوژمنی شەیتانو نەوەكانني، شەیتانیش دوژمنی ئێومو نەوەكانتانە. ئێوەش ئەی كۆمەڵی ئادەمیزاد لەجیهان دا هەندێكتان لەدژی هەندێكتان كار دەكەنو لەسەر بژێوو پلەو پایە كێشەو نیزاعتان لەناودا دەبێ‌و جنگ تێك وەردێنن:

جا ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى﴾ ئەی ئادەمیزادینە: ئەگەر لەمنەوە بە هۆی پێغەمبەرانی خۆمەوە، لە ڕێگەی نامەی ئاسمانی كەپێیان دا دەنێرم ڕێنمونیتان بۆ هات، پەیامی منتان پێ گەیی ئەوە، ﴿ فَمَنْ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى﴾ هەركەس شوێن ڕێنموونی من بكەوێ و كاری پێ بكا، ئەوە لەدونیادا ڕێگای ڕاستی لێ گوم نابێ، لە قیامەتیشدا دووچاری نەگبەتی نابێ‌و لە سزای دۆزەخ دەپارێزرێ.

ئیبنو ئەبی شەیبەو حاكیم‌و بەیهەقی لەئیبنو عەباسەوە ریوایەت دەكەن دەفەرموێ: كەسێك شوێن قورئان بكەوێ خودا لەدونیادا لەگومڕایی دەیپارێزێ، لەقیامەتیشدا توشی سزاو مەینەتی ناكا.

هەر لەئیبنو عەباسەوە بەمەرفووعی فەرموودەیەكی تر هاتووە دەفەرموێ: (كەسێك شوێن قورئان بكەوێ لەدونیادا خودا شارەزای دەكا بۆ ڕێبازی سەرفرازی‌و لەگومڕایی دەیپارێزێ، لەڕۆژی دواییش دا لەتوندوتیژی حیساب لەگەڵ كردن دەیپارێزێ) ئەمجار ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەی خوێندەوە...﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً﴾ كەسێك پشت لەئایینی من هەڵبكا، واز لەخوێندن‌و تێفكرین لەكتێبی من - كەقورئانی پیرۆزە - بهێنێ‌و كاری پێ نەكاو پابەندی فەرمان‌و نەهیەكانی نەبێ، ئەوە لەدونیادا ژیانێكی پڕ تەنگ‌و چەڵەمەی دەبێ، جایان لەڕوی مادیەوە هەژاری دەكەین، یان تووشی نەخۆشی‌و دڵەڕاوكێ‌و چەرمەسەری دەكەین. بێگومان ژیان‌و گوزەرانی خۆش بریتی نیە لەدەوڵەمەندی‌و هەبوونی كاڵای زۆرو پۆشاكی باش‌و خۆراكی بەلەززەت، بەڵكوو ژیانی خۆش‌و كامەران بریتییە لەدڵ ئارامی‌و دەروون دامەزراوی‌و قنیات كردن بەوەی كەخودا

پیّی داوی، شتێکی ئاشکراو نمایانە هەرکەسیّ پشت لەخودا بکا، واز لەبەرنامەو ئایینی خودا بێنیّ، هەموو ئامانج و مەبەستی، هەموو خەیاڵ و بیرو هەوڵ و تێکۆشانی بۆ رابواردن و کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی و بەدەست هێنانی پلەو پایەی دنیایی دەبیّ، ئیتر ئەو کاتە دڵ و دەروونی حەراسانی لیّ هەڵدەگیریّ، دڵنیایی و ئارامی نامێنیّ، خەمی کۆکردنەوەی ماڵ و سامانیەتی، ترسی لەدەستدانی ماڵ و سامان و پلەو پایەیەتی، هەمیشە لەناو ئاخ و ئۆف و ترس و بیم دایە، خەفەت دەخوا بۆ ئەو شتانەی دەستی نەکەوتوون، ترسی هەیە ئەوەی هەیەتی لەکیسی بچیّ.

هەمیشە هەڵپەیەتی بۆ وەدەست هێنانی ئاواتەکانی و پەلامار دەدا، خۆ دەخاتە ناو خەتەرو رێگای مان و نەمانەوە بۆ وەدەستهێنانی رەزامەندیی ملهوڕێك، کەبەدەستیشی دەهێنیّ ئەمجار لەدڵە راوکێی ئەوەدایە لێی نەستێنێتەوە.

چەند کوڕی گەنج و شۆخ و شەنگ لەپێناو ئافەرینێکی ئەم و ئەو، بۆ دەستکەوتێکی دونیایی لەملهوڕێکەوە گیانی خۆی خستۆتە خەتەرەوەو بەرەو رووی مەرگ بۆتەوە، بەڵکو زۆر جار لەو پێناوەدا گوڵی ژیانی تازە پشکوتوی خۆی هەڵپروزاندوەو گیانی خۆی بەخت کردوە. خۆی کردوە بەقوربانی ویستی طاغوتیك و خۆی ماڵوێرانی دونیاو قیامەت کردوە.

بەپێچەوانەی ئەم جۆرە کەسانەوە هەرکەسێك ئیماندار بیّ و دڵ و دەروونی بەیادی خودا ئاوەدان بیّ و بڕوا دامەزراو بیّ، شوێن پەیامی خودا کەوتبیّ ئەوە ژیانی هەردوو جیهانی کامەرانی و خۆشبەختییە، چونکە دڵ دامەزراوو بڕوا پتەوە، لەختۆکەو دڵە راوکێی ئەملاو ئەولا دوورە، بەبەشی خۆی قنیات دەکا، کەسێکیش خاوەن قەناعەت بیّ، دڵ پڕ لەئیمان بیّ، ژیانی بەختەوەرییە.. بەدەوڵەمەندی لەخۆی بایی نابیّ و بەلەکیس چونی شتیش خەفەتبار نابیّ.

﴿وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ ئەو کەسەی روو لەقورئانی ئێمە وەردەگێڕیّ، ئێمە رۆژی قیامەت بەکوێری حەشری دەکەین، چاوی سەرو چاوی دڵی کوێر

دەکەین، ڕێگای ڕزگاری‌و سەرفرازی‌و بەهەشتی نیشان نادەین، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْياً وَبُكْماً وَصُمّاً مَّأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ﴾ (الإسراء/٩٧) چونکە ئەو لەدونیادا چاوی خۆی لەناستی ئایەتەکانی قورئان کوێرکردوە، تێیان نەفکریوە.

﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيراً﴾ کابرای پشت هەڵکردوو لەئایینی خودا دێتە قسەو دەڵێ: خودایە! ئەوە بۆ بەکوێری حەشرت کردم! خۆمن لەجیهاندا چاو ساغ‌و بینا بووم! پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە وەڵامێکی جەرگبڕو هیوا بڕ ﴿قَالَ كَذَلِكَ﴾ پەروەردگار دەفەرموێ ئەتۆش ئاوات کرد هەڵوێستت بەم جۆرە بوو ﴿أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا﴾ ئایاتی ئێمەت بۆ هات، بەڵگەی جۆراو جۆری تاک‌و تەنهایی ئێمەت بۆ خوێندرایەوە، نیشانت درا، ئەتۆ ڕووت لێ وەرگێڕا، تێیان نەفکری ﴿وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى﴾ هەر بەو شێوە ئەمڕۆ بەکوێری دەهێڵدرێیتەوە، لەئاگری دۆزەخدا دەمێنیەوە، مامەڵەی کەسێکت لەگەڵ دەکەین: کەشت لەبیر خۆی بەرێتەوە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَـذَا﴾ (الأعراف/٥١) داب‌و نەرێتی پەروەردگارە وای داناوە: پاداش‌و سزا بەگوێرەی کردەوەیە.

﴿وَكَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى﴾ ئاوا بەو جۆرە تۆڵە لە سنوور شکێنان‌و بەدرۆ خەرەوەکان دەسێنینەوە، هەرکەسێك لەخودا یاخی بێ‌و پێغەمبەرەکانی بەدرۆ بخاتەوە، شوێن پەیام‌و نامە ئاسمانییەکانی نەکەوێ ئەوە ژیانی ناخۆشی دەدەمێنێ لەدونیادا خۆشی لەخۆی نابینێ‌و دڵ‌و دەروونی ئارام ناگرێ.

﴿وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى﴾ سزای ڕۆژی قیامەتی بەئێش ترو بەردەوام ترە، هەر نابڕێتەوە، بۆ هەتا هەتایە لەناو ئاگری دۆزەخ دا دەمێننەوە. وەکوو

لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الآخِرَةِ أَشَقُّ وَمَا لَهُم مِّنَ اللّهِ مِن وَاقٍ﴾ (الرعد/٣٤).

## پەند وەرگرتن لە بەسەرهاتی گەلە پێشینەکانو خۆگریی لەسەر نەزیەتدانی گەلە موشریکەکان، گوێ نەدان بە لەززەتو خۆشییان، فەرمان بەخاوو خێزان بەنوێژکردن

﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّأُو۟لِي ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار حاڵو وەزعی ئەوانەی روو لەقورئان وەردەگێڕن، رون کردەوە، بەشوێن ئەوەدا شتێك دەهێنێ: کەپەندو عیبرەتە بۆ ئادەمیزاد ئەو شتەش سەرگوزەشتەی قەومی عادو ئەموودە:

ئەوانەی پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوەو سەرپێچی فەرمانو نەهیەکانیان کردن، بۆ ئەوەی خەڵکی پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرنو بەخۆیاندا بچنەوە، ئەمجار فەضلو گەورەیی خودا رادەگەیەنێ بەوە کەعەزابی کافرو یاخی بوانی دواخستوە بۆ رۆژی قیامەت. دوایی فەرمان دەکا بەپێغەمبەر ﷺ: کە لەبەرامبەر ئەزیەتی موشریکەکاندا، پشوو درێژو خۆ راگربێ، بەردەوام بێ لەسەر ئەنجامدانی نوێژو تەسبیحات لەشەوو رۆژدا، نەهیشی لێ کرد لەوەی چاو ببڕێتە ئەو لەززەتو وەسائیلە مادییانەی کافرەکان هەیانە بۆ ژیانی دونیا، ئەمجار فەرمان دەکا بە پێغەمبەر ﷺ کەفەرمان بکا بەخاوو خێزانو شوێنکەوتوانی ئوممەتی: کەپارێزگاریی نوێژەکانیان بکەن. تەنانەت ریوایەت کراوە، پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێ یەکێك لەهاوەڵانی، لەخزمو کەسو کاری تووشی زیانێك بوایە فەرمانی پێ دەکردن کە نوێژ بکەنو ئەم ئایەتەشی دەخوێندەوە. کە: دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ﴾ ئایا دەرنەکەوتووەو روون نەبۆتەوە بۆ موشریکەکانی مەککەو دەوروبەری، بەهۆی ئەو قورئانەی بۆت هێناون، چۆنو چەندمان لەگەلو نەتەوەکانی پێشوو بەهیلاك بردوە؟ نازانن چەندمان لەو گەلو نەتەوانەی پێشوو: کەپێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە ریشە کێش کردونو لەناومان بردونو ئاسەواریان نەماوە، چەندان گەلی وەکوو عادو ئەمودو قەومی لوطء ئەصحابول حیجرمان لەناو بردونو تاقە کەسێکیان لێ رزگار نەبوە، ئێستا قورەیشیەکان لەسەر زەویو زارو زێدو نیشتمانی ئەوان دێنو دەچنو شوێنەوارو شارو گوندی وێرانبوویان بەچاوی خۆیان دەبینن!!

جا لەکاتێکدا چاوو دڵ لەشوێنەوار گەل‌و نەتەوەی چاخەکانی رابوردو ورد دەبنەوە، کاتێك چاو لە پاشماوەو شوێنەواریان وورد دەبێتەوە، کاتێك خەیاڵ قوت دەبێتەوەو سەرنجی خۆی دەداو دەبینێ کەسێك لەو ئادەمیزادانە هەست‌و خوستی نەماوە، بەخەیاڵ تارماییان دێنێتە بەرچاوو بیر لەشەبەحەکانیان دەکاتەوە، هەڵس‌و کەوتیان ویست‌و ئاوات‌و داخوازییان، خەم‌و پەژارەو خۆشی‌و پێکەنینیان، دەبدەو شایی‌و زەماوەندیان، راکردن‌و رۆیشتن‌و دانیشتن‌و کۆڕو مەجلیسیان دەداتە بەر نیگای خەیاڵ‌و بیر لەم هەموو حەشاماتە خاوەن حەرەکاتە دەکاتەوە، ئەو هەموو ئادەمیزادە خاوەن هەست‌و شعورو ئینفیعالات‌و حەزو ئاواتە رۆژگارێك لەم سەر زەمینە ژیاوەو ئێستا نەماوە! ئەمجار کەچاو هەڵدێنێ‌و هیچ شتێ لەو حەشاماتە بەدی ناکا، وڵات بەتاڵ‌و هەوار خاڵی! ئالەو کاتەدا لەناخەوە ئینسان هەست دەکاو لێی مەعلووم دەبێ ئەوەی رابووردووی قووتداوە، دەمی داپچڕیوە داهاتووش ئاودیو بکا! هەست دەکا: ئەو دەستی قودرەتەی نەتەوە پێشینەکانی پێچاوەتەوە دەتوانێ داهاتووش تێکەوە پێچێ.

بەڵێ لەو کاتەدا مانای ئینذارو ئاگادار کردنەوە تێ دەگا، پەند لەرابردوو وەردەگرێ‌و بەخۆیدا دەچێتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَىٰ﴾ بێگومان لەورد بوونەوەو تێفکرین لەسەرەنجامی گەل‌و نەتەوە پێشینەکان نیشانەو پەندو عیبرەت هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی عەقڵ‌و هۆشن، دەفامێن‌و پەند ئامێز دەبن‌و عیبرەت وەردەگرن!

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ (الحج/٤٦) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ (السجدة/٢٦).

ئـەمجار پـەروەردگار هۆکاری دواخـستنی عەزابـدانی کافرەکـان دیـاری دەکـاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ لَكَـانَ لِزَاماً وَأَجَـلٌ مُـسَمًّى﴾ ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبوایـە: خـودای تـۆ ئـەی موحەممـەد! بڕیـاری پـێش وەخـتو ئـەزەلی داوە، لەپێشدا خودا بەڵێنی داوە عەزاب دانو سزای کۆ کوژیو ریشە کێش کـردن لەسـەر ئوممەتی تۆ هەڵبگریو سزایان دوا بخا بۆ رۆژی دوایی، ئەگەر لەبەر ئـەوە نەبوایـە سـزای سەرپێـچیکردنەکەیانو تۆڵـەی گوناهـەکانیان پێـوە دەلکـاو وەکـوو گەلـە پێشینەکان دوابەدوای گوناهەکانیانو بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر ﷺ یەکسەر سـزا دەدران.

دەی ماتوڵ خودا سزای ئەو سەرپێچیکارانە دوادەخـا بـۆ قیامـەت، ئـەتۆ ئـەی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر سەر رەقیو ئیمان نـەهێنانی ئەوانـەدا ﴿فَاصْـبِرْ عَلَـى مَـا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الـشَّمْسِ وَقَبْـلَ غُرُوبِهَـا وَمِـنْ آنَـاءِ اللَّيْـلِ فَـسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾ بەصەبرو ئارام بە لەبەرامبـەر پـشت هـەڵکردنو گـوێ پێ نەدانی ئەوان بە پەیامەکەتو بـەدرۆ خـستنەوەی ئایاتی خوداو گاڵتـە کـردنو بوختـان کردنیـان بـەتۆ: کـەپێت دەیـەژن سـاحیرو درۆزنـە، یـان شـێتو دەسـت لێ وەشـاوە، یـان شـاعیرە، یـان قوتـابی فـلان کـاهینو فـلان جندوکەیـە....هتـد. گـوێ مەدەرێ گرنگیان پێ مـەدە، چونکە بـۆ عـەزابو سزایان کـاتێکی دیـاریکراو هەیـە، پاشو پـێش ناکـا... ئـەو نوێژانـەی فـەرضـو ئـەرکی سەرشـانتە لـەکاتی خۆیانـدا ئـەنجامیان بـدە، نوێـژی بـەیانی لـەکاتی پـێش خۆرهـەڵاتن دا، نوێـژی نیـوەڕۆ عەصریش لەپێش خۆرئاوا بوون دا، لەکاتەکانی شەودا نوێژی شێوانو عیشاو لەدوا کاتەکانی شەودا شەو نوێژو لەسەرەتاو کۆتایی رۆژدا نوێژی بەیانیو نوێژی شـێوان ئـەنجام بـدە، بـۆ زێـدە گرنگـی پێـدان نوێـژی بـەیانیو نوێـژی شـێوانی دووبـارە کردۆتـەوە، وەکـوو چۆن لەشـوێنێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿حَـافِظُواْ عَلَـى الـصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى﴾ مەبەسـت ئەوەیـە لەهـەموو کاتێکـدا خـودات لـەبیر بـێو نوێـژی

تێدا بکە، بەتایبەتی پێش خۆرهەڵاتن‌و پێش خۆرئاوا بوون ئاگاداری نوێژ کردنبەو، زێدە گرنگیان پێ بدە.

ئیمامی ئەحمەدو موسلیم لە عەممارەی کوڕی (رؤبە) وە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: (لن یلج النار احد صلی قبل طلوع الشمس وقبل غروبها) ناچێتە ناو دۆزەخەوە کەسێك پێش خۆرهەڵاتن‌و خۆرئاوابوون سەرگەرمی نوێژ کردن بووبێ.

لەصەحیحی موسلیم‌و بوخاریدا فەرمودەیەك هەیە جەریری کوڕی عەبدوڵلا ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إانکم سترون ربکم کما ترون هذا القمر، لاتضامون فی رؤیته، فان استطعتم الا تغلبوا عن صلاة قبل طلوع الشمس وقبل غروبها، فافعلوا) ئەم ئایەتەی ئێرەی خوێندەوە.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کەرێگا چارە بۆ سەرکەوتن بەسەر کافرو سەر رەق‌و دوژمناندا صەبرو خۆراگرییە، چونکە صەبر ئیرادە بەهێز دەکا، ویڕای صەبرو پشوو درێژی تەسبیحات‌و حەمدو ثەنا کردن‌و نوێژ کردن پارێزگاری کردنە لەسەر ئەنجامدانیان چونکە ئەمانە دەبنە هۆی بەهێز بوونی گیان، ئیتر کفت‌و کۆی ئازاری جەستەو دڵ‌و دەروون نامێنێ.

گیان بەرزی‌و نەفس بەرزی وا لەئادەمیزاد دەکا: کەزۆر گوێ بەلەززەت‌و خۆشی جیهان نەدا، بۆیە پەروەردگار دوابەدوای فەرمان بەصەبرو خۆڕاگری فەرمانێکی تر ئاڕاستەی پێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾ چاو مەبڕە ئەوەی لەلای موشریکەکان هەیە لەنیعمەت‌و خۆشگوزەرانی، لەماڵ‌و سامان‌و کاڵای جۆراو جۆر، لەشساغی‌و تەندروستی، ئەوە گوڵێکەو زوو سیس دەبێ‌و هەڵدەوەرێ، خۆشیەکی کاتیەو پایەدار نیە، ئەوە بۆ بەتاقی کردنەوەو هەڵسەنگاندنیانە، تا دەربکەوێ هەڵوێستیان چۆنەو کرداریان چیە.

ماتولّ وایە ئـەتۆ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ چـاو بـبڕە لـەوەی لای خودایـە، دڵنیابـە ئـەوەی لای خـودا هەیـەو خـودا پێـی بەخـشیوی زۆر باشـترە لـەوەی داویـەتی بـە موشـریکەکان، لـەدونیادا رزق‌و رۆزی پـێ بەخـشیوی، ئـەوەی لـە قیامـەت دا بـۆی داناوی‌و بۆی پەزمەندە کردوی زۆر لەو رزق‌و رۆزییەی بەوانی داوە باشترە، وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ، لاَ تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَاخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (الحجر/٨٧-٨٨).

مەبەست بـەم جۆرە ئایەتانـە ئـەوە نیـە ئـادەمیزاد لەهـەولّ دان بـۆ رزق‌و رۆزی‌و دابـین کردنـی پێویـستیاتی ژیـان تەمبـەڵی بکـا، بـەڵکوو مەبەست ئەوەیـە: ئادەمیزاد تەمەنناى ئەو ماڵ‌و سامانە نەکا کەلـە ژێـر دەسـتی کـافرو موشـریکەکان دایەو ئاواتە خوازی ئەوە نەبێ وەکوو ئەوان بێ‌و دڵ‌و دەروونی خۆی بـەو ئـاوات‌و داخوازییانـە مەشغولّ بکـا، واز لـەکارکردن بـۆ قیامـەت بهێنـێ، بـەڵکوو موسـوڵمان دەبێ کار بۆ دونیاو قیامەت بکا لایەکیان بـۆ ئـەوی تریـان فـەرامۆش نـەکا، بـەڵکوو دونیا بکاتە کێڵگە بۆ قیامەت، واکار بۆ دونیا بکا کەهەر نامرێ، واخۆ ئامادە بکا بۆ قیامەت کەسبەینێ دەمرێ..

ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبـەر ﷺ فـەرموو؛ کەفـەرمان بـە خـاوو خێزانی بکا بەئەنجامدانی نوێژ. دەفەرموێ: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ ! فەرمان بەخاوو خێزانت یان بەهەموو ئوممەتت بکـە بەنوێـژ، لەسزاو عەزابی خودا رزگاریان بکە بەوەی وایان لێ بکەی نوێژەکانیان ئەنجام بدەن، بەردەوامبە لەسەر کردنیان‌و واز لەنوێژ کردن مەهێنە، بـا خـاوو خێزانـت چـاو لـە تـۆ بکـەن، کەمتەرخـەمی نەکـەن لـە نوێـژەکانیان. یەکـەم ئـەرک لەسـەر شـانی موسوڵمان ئەوەیە: ماڵی خۆی واڵێ بکا وەکوو مـاڵی موسـوڵمان بـچێ، خـاوو خێزانـی خۆی هەڵنێ بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی پەیوەستیان دەکا بە خوداوە. ئیتتیجاهی

سەرەکییان بکا بەیەک: ﴿لا نَسْأَلُكَ رِزْقاً﴾ ئێمە داوای بژێویت لێ ناکەین، رزق‌و ڕۆژیمان لەشوێن کەوتوانت ناوێ، وەکوو پاشاو ملهوڕەکانی جیهان داوا لەژێر دەستەو ڕەعیەتەکانیان دەکەن کە خەرجی بدەن‌و پارەو پولیان بۆ پەیدا بکەن.

﴿نَحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ ئێمە رزق‌و ڕۆژیتان دەدەینێ، بژێوی تۆو هەموو گیانلەبەران لەسەر خودایە. وەکوو دەفەرمووێ: ﴿هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ (الذاريات/٥٨) کەواتە: گرنگی بدە بەکاروباری ڕۆژی دوایی ﴿وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى﴾ سەرەنجامی باش‌و بەختەوەر بۆ کەسێکە تەقوای خودای کردبێ، پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی پەروەردگار ببێ، بەگوێرەی ئایین ڕێنمونی بکا.

جا کەتۆو شوێن کەوتوانت پابەندی بەرنامەی خودا بوون، پارێزگاری نوێژەکانتان کرد، خودا رزق‌و ڕۆژیتان بۆ فەراهەم دەهێنێ، ڕێگای هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی بژێویتان فێر دەکا، هێزو توانای رزق‌و ڕۆژی پەیدا کردنتان پێ دەبەخشێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً، وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ (الطلاق/٢-٣) هەروا لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات/٥٦)

ئیمامی مالیک‌و بەیهەقی لەئەسلەمەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: عومەری کوڕی خەتتاب چەندی بۆ بکرایە شەو نوێژی دەکرد، هەتا شەو رادەکشاو واتە: بەرەو کۆتایی دەڕۆیی ئەوکاتە خاوو خێزانی خۆی بەخەبەر دەهێنان‌و پێی دەفەرموون: هەستن نوێژ بکەن، ئەمجار ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم‌و ئیبنولونزیرو طەبەرانی‌و ئەبو نەعیم لەحولیەتولئەولیادا لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە ریوایەت دەکەن دەڵێ:

پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێک کەسێکی نزیکی تووشی بەڵاو کارەساتێکی جەرگبڕ ببوایە، ناخۆشیو تەنگو چەڵەمەیەکیان تووش بوایە، فەرمانی پێ دەکردن بەنوێژ کردنو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا.....الخ﴾.

## پێشنیاری موشریکەکانو پەلپ گرتنیان بۆ نواندنو هێنانی موعجیزەی جیاجیا، هەڕەشە کردن لەموشریکەکان بەدوارۆژ

﴿ وَقَالُوا لَوْلَا يَأْتِينَا بِآيَةٍ مِّن رَّبِّهِ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ (١٣٣) وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ (١٣٤) قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَابُ الصِّرَاطِ السَّوِيِّ وَمَنِ اهْتَدَىٰ (١٣٥) ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد: کەخۆڕاگربێ بەرامبەر ئەزیەتی موشریکەکانو چاو نەبڕێتە کاڵاو گوزەرانێك کەپێیان دراوەو کاتییە.

ئەمجار هەندێ قسەو پێشنیاری نامەعقوولو پڕوپوچی ئەو موشریکانە دەخاتەڕو، هەندێکیش لەو قسە پڕوپوچانەیان ئەوە بوو: دەیانگوت: قورئان موعجیزە نیەو نابێتە بەڵگە لەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ... ئەوەش

ڕادەگەیەنێ: کەرۆژی قیامەت ددان دەنێن بەوەدا: کەقورئان نیشانەیەکی نومایانە بەڵام ئەو کاتە چ سوود؟!

ئەوە بوو: موشریکەکان پێشنیاری جۆراو جۆریان دەکردن و پەڵپی زۆریان لە پێغەمبەر دەگرت بەمەبەستی سەر رەقی و تەنگ هەڵچنین بە پێغەمبەرو بەربەرەکانی کردنی، بڕوایان بەو موعجیزانە نەبوو: کەلێیان دەبینی، جا پەروەردگار باسی ئەورەقی و سەرپێچیکردنەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا يَأْتِينَا بِآيَةٍ مِنْ رَبِّهِ﴾ موشریکەکان گوتیان: ئەوە بۆچی موحەممەد موعجیزەو نیشانەیەکمان لەخودای خۆیەوە بۆ ناهێنێ ببێتە نیشانەی پێغەمبەرایەتیەکەی و وامان لێ بکا بڕوای پێ بکەین، وەکوو چۆن پێغەمبەرانی پێشوو موعجیزەی لەو جۆرانەی ئێمە پێشنیاریان دەکەین دەیاننواندن.؟؟ ئەوەتا دەڵێن: صالح پێغەمبەر ﷺ موعجیزەکەی ئەو حوشترە بووە: کەسەر سووڕهێنەر بووە. موسا ﷺ موعجیزەی عەصاو یەدی بە یضای هەبوە، عیسا ﷺ مردوی زیندو کردۆتەوە. کوێرو بەڵەکی چاك کردونەوە. پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿أَوَلَمْ تَأْتِهِمْ بَيِّنَةُ مَا فِي الصُّحُفِ الْأُولَى ؟﴾ ئایا ئەوان نامەیەکیان بۆ نەهاتووە: کەموعجیزەیەکی بەردەوام و نەمرەو بەڵگەو نیشانەو شایەدە لەسەر راستی ئەوەی لەنامە ئاسمانییەکانی پێشوودا هەیە، وەکوو تەورات و ئینجیل و باقی صوحوفە نازڵکراوەکانی تر: کەعەقیدەو ئەحکام و یاسای ژیانیان تێدایە، لەو کتێبانەدا راستی پێغەمبەرایەتی موحەممەد چەسپاوەو پێش وەخت ئامازەیان پێ کردوەو مژدەی هاتنی ئەویان داوە، لەو نامە ئاسمانییانەدا بەڵگەی واهەن ئینکاریکردنی ئەوان دەپووچێنێتەوە. نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ، أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (العنكبوت/ ٥٠-٥١)

بەکورتی: دەفەرموێ: ئەو نەفامانە پێشنیاری موعجیزەی چی دەکەن؟ ئەی ئەوە نیە قورئانیان بۆ هاتووە: کە گەورەترین موعجزەیەو شاهیدی راستی ناوەرۆکی نامە ئاسمانیەکانی پێشووشە، ئیتر وێڕای هەبوونی ئەم موعجیزە گەورەیە؛ پێغەمبەر لەکوێ پێویستی بە موعجیزەی ترە؟!

ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە: کەموشریکەکان رۆژی قیامەت دان دەنێن بەوەدا: کەقورئان موعجیزەیەو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُمْ بِعَذَابٍ مِنْ قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولاً فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَذِلَّ وَنَخْزَى﴾ واتە: ئەگەر ئێمە بەبێ ئینزار ئەو موشریکانە بکوژین‌و پێش ئەوەی قورئانیان بۆ بنێرین بەعەزابی کۆکوژو ریشەکێشکەر لەناویان بەرین، رۆژی قیامەت بیانوویان بەدەستەوە دەبێ‌و دەڵێن: پەروەردگارا! ئەوە بۆ لەدونیادا پێغەمبەرت بۆ سەر رەوانە نەکردین‌و موعجیزەی بەهێزت لەسەر دەستی ئەو نەخستە روو؟؟هەتا ئێمەش شوێنی بکەوتینایەو ئیمانمان پێ بهێنایە. پێش ئەوەی بەعەزابی سامناکی خۆت ریسوامان بکەی!

واتە ئێمە پێش وەخت لەناومان نەبردون‌و پێغەمبەرمان بۆ ناردوون‌و ترساندویانن‌و رەهنومایان کردون، کەوابێ بیانویان براوە، عوزریان نەماوە. قسەی حەق‌و راست ئەوەیە: ئەو موشریکە سەرڕەق‌و پشت هەڵکردوانە سەرڕەق‌و بێ باوەرن، ئەگەر پەیتا پەیتا نیشانەو موعجیزەیان بۆبێ، ئەوان هەرئیمان ناهێنن وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءتْهُمْ آيَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا قُلْ إِنَّمَا الآيَاتُ عِندَ اللّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءتْ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (الأنعام/ ١٠٩-١١٠)

جاکە سیاقەکە دەگاتە ئەم ئاکامە ترسناکەی چاوە ڕێیانە، پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکا: کە دەستیان لێ بشواو بەئیمان نەهێنانیان نارەحەت

نەبێ، ئەوەتا پەیامیان پێ ڕاگەیەندراوەو عوزرو بیانوویان بڕاوە، ئەوانە بەویستی خۆیان پشت لەو پەیامە هەڵدەکەن‌و بەدەستی ئەنقەست ئیمان ناهێنن. دەفەرموێ: ﴿قُلْ كُلٌّ مُتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا﴾ ئەی موحەمەد: بەو ئادەمیزادانە بڵێ: کە بەدرۆت دەخەنەوە، سەرپێچی دەکەن، سوورن لەسەر کوفرو عەنادی خۆیان پێیان بڵێ: هەریەکێ لەئێمەو لەئێوە چاوەڕوانی ئاکامین.

چاوەڕوان بن ﴿فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَابُ الصِّرَاطِ السَّوِيِّ وَمَنِ اهْتَدَى﴾ لەوە بەولاوە زۆری پێ ناچێ بۆتان مەعلوم دەبێ کێ لەسەر ڕێگای ڕاستە، ئێمە یان ئێوە؟

لەوەبەولاوە دەزانن: کێ هیدایەتدراوە، کێ گومڕایە کێ بەختەوەرەو کێ چارە ڕەشە؟

ئابەو جۆرە کۆتایی بەو سورەتە هێنا: کەسەرەتاکەی ئەوەی لەخۆگرتوە: پێغەمبەر ﷺ هێندە ئازاری جەستەی خۆی دەدا بەتاعەتکردن، خەریکبوو زیانی پێ بگا! پەیامی خۆی ڕاگەیاندو بەلێبڕاوی ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجام دا، جا ئەوانەی پەیامی پێغەمبەریان پێ گەیی، ئەگەر پابەندی پەیامەکەی بووبن ئەوە رزگاریان بووە، ئەگەر ڕوویان لێ وەرگێڕابێ ئەوە تێدا چوون‌و فەوتاون. لەوە بەولاوە حەق‌و بەتاڵیان بۆ دەردەکەوێ.

## بەیارمەتی خودا لەراڤە کردن و پێداچوونەوەی جزمی (١٦) بوومەوە کە کۆتایی سورەتی (طه)یە

لەکاتێکدا سوپای زەبەللاحی روسیای کافری زلهێز بەهەموو ئەو چەکە جۆراو جۆرانەی کەساڵەهای ساڵ بوو دروستی کردبوو بۆ بەربەرەکانی خۆرئاوا، هەڵی کوتایە سەر جمهوریەتی چیچان بۆ قەلاچۆ کردنی موسوڵمانانی چیچان،

ئەوە ماوەی دومانگو نیوە لەشەڕێکی نابەرامبەریدا، لەجەنگێکی نارەوای بێ ویژدانانەدا جەنگاوەرانی چیچان بەرەنگاری ئەو سوپایە خاوەن تۆپو تانكو تەیارەو زرێپۆشو جۆرەها چەکی قورسی یاساغ کراوی نێودەوڵەتی بوونەتەوە، بەچەکێکی نابەرامبەرو تەقلیدی بەکلاشینکۆف شەڕ لەگەڵ تۆپی زرێبەللاحو تەیارەی مێکی تازە دروستکراو دەکەن، لەپێش چاوی عالەمی ساڵی (۲۰۰۰)و چەرخی بیستو یەکەم. لەسەردەمی مافی بەناو مرۆڤو حورییەتو ئازادیدا، لەپێش چاوی ئومەمی (متحده)و سەردەمی مافی چارەی خۆ نووسیندا ئەو گەلە موسوڵمانە هەزارە بێ چەكو دەرەتانە روبەرِوی چ شەرێکی سامناك بۆتەوە، چۆن ئەو گەلە بێ کەسە ئاوا قەلاچۆ دەکرێو چەکی کۆکوژیو جینوسایدی تێدا بەتاقی دەکرێتەوە، شاری گرۆزنی: کەپایتەختی چیچانە، سەر لەبەر بەسەر دانیشتوانیدا خاپورکرا دوای گرتنی شارەکە بەپێش چاوی دونیاوە ژنو منداڵو پیرو جوان دەستو قاچیان دەبەسترێو قەمەکوژو سوژن هاژن دەکرێن، لوتو لێویان دەبڕدرێن. کەس نقەیەکی لێوە نەهات!

بەچاوی خۆم شەوی ۲٦-۲۰۰۰/۲/۲۷ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دیم موسوڵمانی چیچانی بەدوا تانکەوە ڕادەکێشرا، حەبلێکی لەقاچی خرابوو دەهێندرا بۆسەر چاڵێکی گەورە: کە کردبوویانە گۆڕی بەکۆمەڵ.. هەر ئەو شەوە تەلەفزیۆن چەند گۆڕێکی بەکۆمەڵی نیشان دا: کەرۆژنامە نووسەکان فرسەتیان هێنابوو بەفلیم گرتبوویان بەدزیەوە دابوویانە ئاژانسی دەنگو باسەکان.

بەلام کاکە ئێمە چیمان دیوە (شنیدن کی بود مانندیدە) کێ دەتوانێ ئەو قەلاچۆکردنە وێنە بکێشێ؛ کێ دەتوانێ بینووسێ: کێ دەتوانێ باسی بکا قەڵەمو زوبان کۆڵو کولن لەئاستی ئەورِوداوانەدا.

عالەم بەئیسلامیو نائیسلامیەوە زۆر بەداخەوە نقەیان لێ نەهات بۆ؟ چونکە دەوڵەتە زلهێزەکان نەیاندەویست ئەو چرایە: ئەو حکومەتۆکە موسوڵمانە،

لـه‌ولاتی قـه‌وقازدا گه‌شـه‌بكا؛ ده‌وڵه‌تـه موسـوڵمانه‌كانیش هه‌ریه‌كـه‌یان سـه‌ر به‌ولاتێكی زلهێزه‌و نه‌یه‌ویست ئاغاكه‌ی له‌خۆی برنجێنێ!!

به‌ڵێ خودا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لاَ يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلاًّ وَلاَ ذِمَّةً﴾.

**مه‌لا مه‌حمود**

**شه‌وی ٢٠٠٠/٢/٢٦**

# سوره‌تی (الأنبياء)

ئه‌م سوره‌ته نـاونراوه (الانبیاء) چونكه سه‌رگورشـته‌و چیرۆكی پێغه‌مبـه‌رانی تێدایه، باسی جیهادو تێكۆشانی پێغه‌مبه‌ران ده‌كا له‌گـه‌ڵ نه‌تـه‌وه بتپه‌رسـته‌كانیان، سه‌ره‌تا به‌درێژی چیرۆكی باوكی پێغه‌مبه‌ران؛ حه‌زره‌تی ئیبراهیم ﷺ راده‌نوێنێ‌و ئه‌مجار ده‌ست ده‌كا به‌سه‌رگورشـته‌ی حـه‌زره‌تی ئیسحاق‌و یـه‌عقوب‌و لوطو نـوح‌و داوودو سلێمان‌و ئه‌ییوب‌و ئیسماعیل‌و ئیدریس‌و ذیلكیفل‌و یونس‌و زه‌كه‌ریاو عیـسا تاده‌گاته سه‌رداری پێغه‌مبه‌ران موحه‌ممه‌د (دروودی خودا) له‌هه‌موانیان بێ.

چیرۆك‌و به‌سه‌رهاتی ئه‌م زاتانه راده‌نوێنێ‌و به‌شـێوه‌یه‌كی كورتبڕی تێكۆشـان‌و هه‌وڵ‌و ته‌قه‌ڵلایان نمایش ده‌كا.

ئه‌زییه‌ت‌و كوێره‌وه‌رییان ده‌خاته روو!

سوره‌ته‌كه مه‌ككییـه، واتـه: له‌مه‌ككـه نـازڵ بـووه، باسـه سه‌ره‌كییه‌كانیـشی ئـه‌و باسـانه‌ن كه‌سـووره‌ته مه‌ككییـه‌كان لـه‌خۆیان گرتـوون! باسـی یه‌كتاپه‌رسـتی‌و پێغه‌مبه‌رایـه‌تی‌و زینـدوو بوونـه‌وه ده‌كـا، به‌شـێوه‌یه‌كی گـشتی سـوره‌ته‌كه ئـه‌و مه‌وزوعانه چاره‌سه‌ر ده‌كا له‌چوار چێوه‌ی رانوانـدنی یاساكه‌ونییه‌كان‌و په‌یوه‌ست كردنـی بیروبـاوه‌ڕ پێیانـه‌وه، كـه‌وابوو عه‌قیـده به‌شـێكه له‌پێكهاتـه‌ی بوونـه‌وه‌رو به‌گوێره‌ی یاساكانی كار ده‌كا.

عەقیدە دروست دەبێ لەسەر ئەو حەق‌و راستییەی ئاسمان‌و زەوی لەسەر پێکهاتووە، ئەو جیدییەت‌و گرنگیەی ئاسمان‌و زەوی لەسەر دروست کراوە، بیرو باوەڕی راستەقینەشی لێوە سەرهەڵداوە. بەکورتی عەقیدە گاڵتەو گەپ نیە، وەکوو چۆن بونەوەر بەگاڵتە نەهاتۆتە دی.

بۆیە قورئانی پیرۆز سەرنجی ئادەمیزادان رادەکێشێ، دڵ‌و هۆش‌و بیرو فکریان دەهێنێ‌و دەبا، دەیانخاتە هەوا پەرواز لەنێوان ئاسمان‌و زەویدا، لەنێوان کێوو شێوو دۆڵ‌و شەوو رۆژو خۆرو مانگ دا، سەرنجیان رادەکێشێ بۆ یەکیەتی یاساکان، ئەو یاسایانەی بوونەوەر هەڵدەسوڕێنن‌و کاریگەرن تێیدا، لەروانگەی یەکێتی یاساکانەوە دەگاتە تاک‌و تەنهایی خودای زاناو داناو بەدیهێنەر، خودای بێ هاوتا لەموڵک‌و خاوەنیەتی‌دا بێ وێنە لەدروست کردن‌و بەدیهێنان دا. خودای تاک‌و تەنها لەزات‌و لەصیفاتدا، بێ شەریک‌و بێ نەظیرو بێ وەزیر.! ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّـهُ لَفَسَدَتَا﴾.

ئەمجار سەرنجی ئادەمیزاد رادەکێشێ بۆ یەکیەتی ئەو یاسایانەی کاریگەرن لەژیانی سەرزەوی، بۆ یەکیەتی سەرچاوەی ژیان ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ بۆ یەکێتی سەرەنجام‌و ئاکامی هەموو گیانلەبەرێك کەمردنە ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ بۆ یەکیەتی سەرەنجامی کۆتایی: کەگەڕانەوەیە بۆلای خودا ﴿ثم الينا ترجعون﴾ بیرو باوەڕی راست هەر یەکێکەو نابێ بەدوو، هەموو پێغەمبەران بەدرێژایی مێژوو بانگەوازییان بۆ یەك ئایین کردوە ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَـٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ سورەتەکەش جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە: کەداب‌و نەریتی خودا لەبوونەوەردا گۆڕانی بەسەردا نایە، دەی یاسای خودا واهاتووە: کەدوارۆژ بۆ حەق‌و راستی بێ، سەرکەوتن بۆ حەق بێ‌و باطل دۆڕاوبێ، چونکە حەق یاسایەکی بوونەوەرەو سەرکەوتنی داب‌و نەرێتێکی خودایییە ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ دوارۆژ بۆ

موسوڵمانانه ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾.

پەیوەندیو موناسەبەی سورەتی (الانبیاء) بەسورەتی پێشوو لەدوو بارەوەیە:

١- لەکۆتایی سورەتی پێشوودا فەرمووی ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَاماً وَأَجَلٌ مُسَمًّى﴾ هەروەها فەرمووی: ﴿قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا﴾ لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا فەرمووی: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ﴾.

٢- لەسوورەتی پێشوودا، ئادەمیزادانی ترساند لەوەی بەکاڵاو ماڵو سامانی جیهان هەڵنەخەڵەتێن. ئەوە بوو لەکۆتایی سورەتی (طه) دا فەرمووی ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَى مَا مَتَّعْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِّنْهُمْ زَهْرَةَ الْحَيَاةِ الدُّنيَا﴾

لێرەش دا: کەدەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ...﴾ دیارە نزیکی رابوونی قیامەت داخوازی ئەوەیە: کەئادەمیزاد هێندە کۆڵ بەدونیاوە هەڵنەگرن، چونکە ژیانی جیهان بێ بەقایەو ساتە وەختێکەو بەسەر دەچێ!

دەربارەی فەضلو گەورەیی ئەم سورەتە زۆر فەرموودەی صەحیحو چەسپاو ریوایەت کراون.

ئیمامی بوخاری لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعوودەوە ریوایەتی کردوە: دەفەرموێ: سورەتی (ئیسراء، الكهف، مريم، طه، الانبياء) لەسورەتە پێشینەکانی قورئانن‌و زوو خوێندراونەوەو لەبەرکراون.

دەڵێن: کەئەم سورەتە نازڵ بوو، بەعامیری کوڕی رەبیعەیان گوت: بۆچی دەربارەی هەندێ شوێنی ئەم سورەتە پرسیارت لەپێغەمبەر ﷺ نەکرد؟ لەوەڵامدا عامیر گوتی: ئەمڕۆ سورەتێك نازڵ بوو، بەتەواوی دونیای پێش چاو خستین.

هەڵبەتە سەرەتای سورەتەکە ترسناك‌و ترسێنەرە، پڕ سامو هەیبەتە، ئادەمیزادان دەترسێنێ لەنزیك بوونەوەی رابوونی قیامەت، لەکاتێکدا خەڵکی بێ ئاگان‌و ج باکیان لەهاتنی نیە، هەست بەخەتەرو تەنگو چەڵەمەکانی ناکەن، گوێ

بـۆ قورئـان نـاگرن، بایـه‌خ به‌بانگـه‌وازی پێغه‌مبـه‌ر ﷺ نـاده‌ن، له‌لـه‌زه‌ت و خۆشـی دونیادا ڕۆچوون. ئه‌مجار هۆی سه‌رپێچی کردنـی موشـریکه‌کان دیـاریی ده‌کاو ئـه‌وه ڕوون ده‌کاتـه‌وه: که‌موشـریکه‌کان پـه‌لپی ئیمـان نـه‌هێنانیان ئه‌وه‌یـه، ده‌ڵـێن: موحه‌ممه‌د ئاده‌میزاده، موعجیزه‌ی مـاددی به‌رچاومان بـۆ نـاهێنێ، وه‌کوو موسـاو عیـسا بـۆ گه‌لـه‌کانیان هێنایـان! جاقورئـان ڕه‌دی دانـه‌وه بـه‌وه: که‌پێغه‌مبـه‌ران هه‌موویان ئاده‌میزاد بوون، خۆراکیان خواردووه‌و خواردنه‌ویان بووه، به‌ناو بازاڕو کۆچه‌و کۆڵانه‌کانی وڵاتدا هاتوو چۆیان کردوه .

ئه‌مجار موناقه‌شه له‌گه‌ڵ موشریکه‌کان ده‌کاو به‌ڵگه له‌سه‌ر تاک و ته‌نهایی خـۆی ده‌هێنێته‌وه. ئه‌وه ڕون ده‌کاته‌وه: که‌نابێ له‌بوونـه‌وه‌ردا زیـاد له‌یـه‌ك خـودا هـه‌بێ، چونکه ئه‌گه‌ر زیـاد له‌یـه‌ك خـودا هـه‌بێ زه‌وی‌و ئاسمـان تێکده‌چـن. هـه‌روا ئـه‌وه‌ش ڕوون ده‌کاتـه‌وه: که‌له‌سـه‌ره‌تادا ئاسمانـه‌کان‌و زه‌وی یـه‌ك پارچـه بـوون‌و دوایـی ته‌قیونـه‌وه‌و لێـك جـودا بوونـه‌وه، کێوه‌کـانی بـه‌ناخی زه‌ویدا داکوتـاون بـۆ ئـه‌وه‌ی جوڵه جوڵ نه‌کا، شه‌و ڕۆژو مـانگ‌و خـۆرو ئه‌سـتێره‌کانی بـه‌دیهێناون. سـه‌ره‌نجامی دونیا، وێرانبوونه، مردنی گیانله‌به‌رانـه، ته‌نانـه‌ت فریـشته‌و پێغه‌مبـه‌رانیش ده‌بـێ بمرن، ته‌نها زاتی خـودا ده‌مێنێتـه‌وه.، دوایـی زینـدو بوونـه‌وه هه‌یـه، هـه‌موو کـه‌س ڕاپێچی ده‌شتی مه‌حشه‌ر ده‌کـرێن‌و حیـساب‌و لێکۆڵینـه‌وه‌یان له‌گـه‌ڵ ده‌کـرێ‌و هـیچ که‌س به‌ئه‌ندازه‌ی گه‌ردیله‌یه‌کیش سته‌می لێ ناکرێ، هـه‌ر که‌سـه‌و بـه‌پێی کـرده‌وه‌ی خۆی پاداشتی ده‌درێته‌وه.

عـه‌زابی ترسـناك بـۆ کـافرو بـێ دینه‌کانـه، موشـریکه‌کان بـه‌خۆیان‌و په‌رستراوه‌کانیانه‌وه ده‌بنه سوته‌مه‌نی دۆزه‌خ، له‌ڕۆژی قیامه‌ت دا دیمه‌نی بوونـه‌وه‌ر ده‌گۆڕێ، زه‌وی به‌شێوه‌یه‌کی تـر دێتـه به‌رچـاوو ئاسمانـه‌کان لـوول ده‌کـرێن، خـودا په‌رسـتان ده‌که‌ونـه نـاو نـازو نیعمـه‌تی به‌هه‌شـته‌وه ((خودایـه! بـۆ خـاتری زات‌و صـیفاتت بۆخـاتری نـاوه جوانـه‌کانت ریـسوای ئـه‌و ڕۆژه‌مـان نه‌کـه‌ی)).

## بێ ئاگایی خه‌ڵك له‌حیساب‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی رۆژی قیامه‌ت

﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ١ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ٢ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ٣ قَالَ رَبِّي يَعۡلَمُ ٱلۡقَوۡلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٤ بَلۡ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ٥ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآۖ أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ ٦﴾

﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ﴾. رۆژگاری حیساب‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی ئاده‌میزادان نزیك بۆته‌وه، وانزیكه قیامه‌ت رابێ‌و خه‌ڵكی به‌گوێره‌ی كرده‌وه‌كانیان سزا بدرێن‌و پاداش وه‌ربگرنه‌وه، به‌ڵام ئاده‌میزاد بێ ئاگاو بێ خه‌به‌رن، خه‌ریكی خۆئاماده‌كردن نین بۆ ئه‌و رۆژه، هیچ یادی قیامه‌ت ناكه‌نه‌وه‌و په‌له ناكه‌ن له‌ئیمانهێنان.

نیشانەی بێ ئاگاییەکەیان ئەوەیە: ﴿مَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنْ رَبِّهِمْ مُحْدَثٍ إِلاَّ اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ، لاهِيَةً قُلُوبُهُمْ﴾ ئایەتە خوارێ بۆ سەریان هیچ بەشێك لەقورئان نیللا کەدەیبیستن گاڵتەی پێ دەکەن! هەتا پەیتا پەیتا سروشیان پێ رابگەیەندرێو ئایاتی قورئانیان بۆ بێ، هەتا ئاگادار کردنەوەو پەندو ئامۆژگاریان ئاراستە بکرێ بۆ ئەوەی پەند ئامێز ببنو بەخۆیاندا بچنەوە، ئەوان شێلگیر تر دەبنو زیاتر پشت لەبانگەوازی راست هەڵدەکەن، پتر گاڵتەیان پێ دێو قەشمەریو لاقرتێیان پێ دەکەن!

ئەوانە: کەنیگای خودایان بۆ دەخوێندرێتەوەو گوێیان لێ دەبێ، دڵی نادەنێو ئابۆیان بکرێ خۆیانی لێ گێل دەکەن.

ئایەتەکە هەڵنانی ئادەمیزادانی تێدایە: بۆ ئەوەی روبکەنە ئیمانو خودا پەرستی، چونکە کەسێك بزانێ قیامەت نزیکە رابێ، خێرا لەتاوانەکانی پەشیمان دەبێتەوە، تۆبە دەکا، گرنگی بەدونیا نادا، هەموو شتێك کەهاتنەکەی تەئکید بێ بەنزیك دادەنرێ، مردن دێو گومانی تێدا نیە، مردنی هەموو ئادەمیزادێکیش رابوونی قیامەتە بۆی. هەرکەسێك بمرێ ئەوە قیامەتی لێ هەڵساوە، زیاد لەوەش قیامەت بەبەراوردکردنی لەگەڵ رابردودا نزیکە ..

ریوایەتکراوە یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خەریکی دیوار رابەستن بوو، یەکێکی تر بەلایدا تێپەڕی لەو رۆژەدا کەئەم سورەتە نازڵ ببوو، کابرای: کەخەریکی دروست کردنی دیوارەکە بوو بەوی تری گوت: ئەمڕۆ چی لەقورئان نازڵ بوو؟ کابرا وتی ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ....﴾ ئیتر کابرا دەستی لەدیوار کردن هەڵگرتو وتی: سوێند بەخودا ئەم دیوارە ناکەم، چۆن من خانوو بکەمو قیامەت بێو بکەومە بەر حیسابو لێکۆڵینەوە؟!

ئایەتە کەسەر زەنشتو زەمی موشریکەکانی تێدایە، لەهەمان کاتدا جڵەوگیریی لەخەڵکی تریش دەکا: کەبەو جۆرە نەبن، چونکە سوود بینین لەبیستن کاتێك

ده‌ستــه‌به‌ر ده‌بــێ دڵ‌و ده‌روون به‌بیــستنه‌که‌ی بــه‌ئاگابێن‌و بــیر بکه‌نــه‌وه‌، ئــه‌گینا بیستنی ته‌نیا چ سوودی نیه‌و فه‌رقی بیستنی ئاده‌میزادو ئاژه‌ڵ نابێ.

که‌ده‌فه‌رموێ: (محدث) ئاماژه‌ نیه‌ بۆ ئه‌وه‌ قورئان دروستکراوو تازه‌ داهاتووبێ، چونکه‌ وشه‌ نوسراوو گوتراوو بینراوو بیستراوه‌کان (حادث)ن‌و گومـان لـه‌وه‌دا نیـه‌، وه‌ڵێ ئه‌صلی قورئان: که‌که‌لامی نه‌فسیـیه‌ هـی خودایـه‌، ئـه‌وه‌ وه‌کوو زات‌و صیفاتی په‌روه‌ردگار ئه‌زه‌لی یه‌و کاتێك نه‌بوه‌ نه‌بووبێ:

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار وه‌صفی هه‌ڵوێستی کافره‌کان ده‌کا له‌کاتی نازڵبوونی قورئان دا، ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئه‌وانه‌ی کافرو سته‌مکارو غافڵ‌و بێ ئاگان له‌په‌یامی قورئان‌و قیامه‌تیان لێ نزیك بۆته‌وه‌، به‌چپه‌وه‌ قسه‌ ده‌که‌ن‌و لـه‌ناو خۆیاندا به‌سرته‌وه‌ به‌یه‌کتری ده‌ڵێن: ﴿هَلْ هَـٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ ئایـا موحه‌ممـه‌د ئاده‌میزادێـك نیـه‌ وه‌کـوو ئـاده‌میزادی تـر؟؟ ئـه‌م کابرایـه‌ی لافـی پێغه‌مبـه‌رێتی لێ ده‌داو ده‌ڵێ قورئانم بۆ هاتووه‌ ئاده‌میزادێك نیه‌ وه‌کـوو ئێـوه‌؟ ئـه‌ویش وه‌کـوو ئێـوه‌ خواردن‌و خواردنـه‌وه‌ی نیـه‌؟ وه‌کوو ئێـوه‌ بـه‌دووقاچ نایـه‌و ناچـێ؟ ئـه‌ویش وه‌کـوو ئێوه‌ نامرێ؟ ده‌ی باشه‌ چۆن له‌ناو ئێوه‌دا ته‌نیا ئـه‌و ده‌کرێتـه‌ پێغه‌مبـه‌رو نیگا بـۆ ئه‌ودێ؟

هه‌ڵبه‌تـه‌ ئـه‌م بۆچـوونه‌یان لـه‌وه‌وه‌ سـه‌ری هه‌ڵـدا بـوو: کـه‌بڕوایان وابـوو: پێغه‌مبه‌ر ده‌بێ فریشته‌بێ‌و به‌هیچ جۆرێ ئاده‌میزاد به‌که‌ڵکی پێغه‌مبـه‌رێتی نایـه‌، وایان ده‌زانی هه‌ر ئاده‌میزادێك بڵێ: من پێغه‌مبه‌رم‌و مـوعجیزه‌ بخاتـه‌ روو بۆخـۆی ساحیره‌و موعجیزه‌که‌شی سیحره‌. بۆیه‌ به‌ئوسلوبێکی ئینکار ئـامێز لـه‌ناو خۆیانـدا به‌یـه‌کتریان ده‌گوت: ﴿أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ؟﴾ ئایـا ئێـوه‌ چـۆن شـوێن موحه‌ممـه‌د ده‌کـه‌ون، لـه‌کاتێك دا ده‌زانـن: کـه‌ ئـه‌وه‌ی هێناویـه‌تی‌و ده‌ڵـێ: نیگـای خودایـه‌، سـیحرو جـادو بازییـه‌. چـۆن ئێـوه‌ بـڕوای پـێ ده‌کـه‌ن؟ لـه‌کاتێك دا لێتـان عه‌یانه‌ که‌ ئه‌وه‌ی ئه‌و به‌موعجیزه‌ی ناو ده‌با، سیحرێکی په‌تییه‌.

**بەکورتی ئەوان دەیانویست ئانە لە پێغەمبەرایەتیەکەی بدەن:-**

١- دەیانگوت: پێغەمبەر نابێ ئادەمیزاد بێ.

٢- ئەوەی لەسەر دەستی ئەو دەردەکەوێو دەڵێ موعجیزەیە سیحرو جادوە.!!

بۆیەش بەچپەو سرتە ئەم وتو وێژەیان لەناو خۆیاندا ئەنجام دەدا، دەیانەویست رێگا چارەیەکی باش‌و سەرکەوتوو بدۆزنەوە، بۆ بەرگری‌و روخاندنی پەیامی پێغەمبەر ﷺ نەیاندەویست دوژمنەکانیان ئاگاداری پلان‌و نەخشەی بەرهەڵستییەکەیان بن.

بەخەیاڵی خۆیان: لەککەدارکردنی پەیامی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە رێگا چارەیەکی سەرکەوتوەو دەتوانن بەوە نوری درەخشانی ئیسلام بکوژێننەوە.

داب‌و نەریتی قورەیشیەکان وابوو بۆ ئەو جۆرە شتانە وتو وێژی نهێنیان ئەنجام دەدا، لەپەندو حیکمەتی ئەواندا هاتووە دەڵێ: ((أستعينوا على قضاء حوائجكم بالكتمان)) ئەمجار پەروەردگار فەرمانی بەپێغەمبەر ﷺ کرد: کەوڵامیان بداتەوە: ئەویش وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ فەرمووی: ئەوەی دەیڵێن‌و دەتانەوێ بیڵێن: بەسرتەو چپە مەییەژن، بێگومان ئەڵڵا خودای منیش‌و ئێوەشە، ئاگاداری هەموو نهێنی‌و ئاشکرایەکە، لەزەوی‌و ئاسمانەکان دا هیچی لێ گوم نابێ، هەرچی بگوترێ‌و بکرێ، هەرچی رووبدا لەبوونەوەردا لای خودا ئاشکرایە، هەر خودا قورئانی نازڵ کردوە، ئەو قورئانە هەواڵی ئەوەڵ‌و ئاخری لەخۆگرتووە، هەرچی پێویست بێ بۆ دونیاو قیامەت ئاماژەی پێ کردوە. ئەو خودایە شنەوایە بە وتەو چپەو سرتە سرتان، زاناو ئاگادارە بەحاڵ‌و وەزع‌و هەڵس‌و کەوتتان. هیچی لێ هون نابێ، رۆژی قیامەت تۆڵەتان لێ دەستێنێ‌و ناهێڵێ بەسەرتانەوە بچێ.

لەئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ الْقَوْلَ﴾ نەیفەرموو (يعلم السر) هەرچەندە لەپێشەوە فەرمووی: ﴿وَأَسَرُّوا النَّجْوَى﴾. کە بەرواڵەت شوێنەکە شوێنی (يعلم

السر)یە بەلام: کەوای نەفەرمووە. ئاماژەیە بۆ ئەوە: کەوشەی (قول) ئاشکراو نهێنی دەگرێتەوە، زانیاری خودا بەهەردوکیان چوون یەکەو جودا وازی نیە، بەپێچەوانەی زانیاری ئادەمیزاد! کەوابێ تەعبیرەکە شامیلە بۆ زانیاریی نهێنیو ئاشکراو بەزیادیشەوە.

بەکورتی دەفەرموێ: خودا ئەو جۆرە ئاخاوتنەو ئاشکراترو نهێنی تریش دەزانێ.

ئەمجار پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ: کەکافرەکان سەر سام بوون، نەیاندەزانی بەرامبەر قورئان چی بلێن: هەردەمە شتێکیان دەگوت، لەسەر رایەك نەدەمانەوە. هەروا بەرامبەر پێغەمبەریش هەمان هەلۆێستیان هەبوو؛ دەمێك دەیانگوت شاعیرە، چەلێك دەیانگوت: ساحیرە، کاتی واش هەبوو دەیانگوت: شێتە...هتد.

ئەوەتا ئەوان لەسەرەتادا وەصفی پێغەمبەریان بەوە کرد: کەساحیرەو ئەوەی دەیلێ سیحرو جادوە، پاشان وازیان لەوە هێناو بیروبۆچونێکی تریان لەلا گەلالە بوو، وەکوو پەروەردگار لێیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ بَلْ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ﴾ واتە: وازبێنە لەوەی دەیانگوت: ساحیرو جادو بازە. بەلکوو بەوەش نەوەستان وتیان: قورئان پێکهاتەیە لەپرو پوچو شتی تێکەلو پێکەل، خەونۆچکەو خەیالٚ پلاوو وڕێنەیە موحەممەد بەزڕە خەون دیتوونی.

ئەمجار بەوەشەوە نەوەستان: وتیان ئەم قورئانە دەست هەلبەستی موحەممەد خۆیەتی بەدەم خوداوە هەلی بەستووە، پاشان لەوەش گواستیانەوە: وتیان: موحەممەد شاعیرەو ئەوی دەیلێ: شیعرە، ئەم راڕاییو سەر لێ تێکچونەیان بەلگەیە لەسەر ئەوەی: بیرو باوەڕەکەیان پووچو بێ بناغەیە. حەقو راستی دەشێوێنن!!

جائەوان یان نازانن حەقیقەتی موحەممەد ﷺ چیەو چۆنە، یان دەزانن‌و خۆگێل دەکەن‌و بەدەستی ئەنقەست خۆیان نەزان دەکەن‌و تەسلیم نابن هەرچۆنێك بێ ئەوان تاوانبارن.

هەروەها ئەم بیرو بۆچوون و ڕاڕایی یە لەلایەن هەموانەوە بووبێ، یان لەلایەن دەستەو تاقمێکەوە بووبێ نیشانەی ئەوەیە: کەئەوانە دەستەپاچەو داماو بوون لەبەرامبەر قورئان و نەیاندەزانی چی بکەن!

جاکەئەم ئیحتیمالاتانەیان خستنە روو ئەم بیرو بۆچوونەیان دووبارە کردنەوە، ئەمجار ویستیان خۆیان لەدەست قورئان رزگار بکەن و وتیان: ﴿فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ﴾ ئەگەر موحەممەد راست دەکا لەوەدا: کەپێغەمبەرە و لەخواوە رەوانەکراوە، قورئان کەلامی خودایەو بەنیگا بۆی نێردراوە، دەبا بەلگەیەکمان بۆ بێنێ داواکەی بچەسپێنێ، باموعجیزەیەکی ترمان نیشان بدا جگە لەقورئان، باموعجیزەیەکی وەکوو موعجیزەی موسا، یان موعجیزەی صالح یان موعجیزەی عیسامان بۆبێنێ! ئەگەر موعجیزەیەکی وەکوو دار دەستەکەی موسا یان وەکوو حوشترەکەی صالح یان وەکوو زیندوکردنەوەی مردوو لەلایەن عیساوەمان بۆ بێنێ ئەوە بڕوای پێ دەکەین و ئیمانی پێ دەهێنین!

ئەمجار پەروەردگار بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ ئەگەر موعجیزەی ناواشیان نیشان بدرێ هەر ئیمان ناهێنن، چونکە ئەوان لەکوفرو گومڕاییدا رۆچوون.

﴿مَا آمَنَتْ قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ؟﴾ ئەو گەل و نەتەوە پێشینانەی لەناومان بردون هێندەی ئەو موشریکە قوڕەیشیانە گومڕاو یاخی نەبوون، دەی ئەو گەل و نەتەوانە کاتێ ئەو جۆرە موعجیزانە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکانیان نیشان درا، ئیمانیان نەهێنا، بەڵکوو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستنەوە، ئێمەیش لەناومان بردن، ئایا ئەو قوڕەیشیانە - کەزۆر لەو گەلانە سەر ڕەق ترن - ئەگەر لەو جۆرە موعجیزانەیان بۆ بێ ئیمان دەهێنن؟ نەخەیر ئەو قوڕەیشیانە ئەگەر لەفەرزێك دا لەو جۆرە موعجیزانەشیان نیشان بدرێ، هەر ئیمان ناهێنن.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ، وَلَوْ

جَـاءتْهُمْ كُـلُّ آيَـةٍ حَتَّـى يَـرَوُاْ الْعَـذَابَ الأَلِـيمَ﴾ (يـونس/٩٦-٩٧) كـەوابێ جێبەجێنـەکردنی پـەڵپو بیانووەکانیـان لەبەرژەوەنـدیی ئەوانـە، چـونکە ئەگـەر پـەڵپو بیانووەکانیـان بێنـە جێو ئیمـان نـەهێنن، بـەگوێرەی دابو نـەریتی خـودا لەبوونـەوەردا یەکسەر ڕیـشە کـێش دەکرێن. وەڵێ حیکمـەتی خـودا داخـوازی ئـەوە بووە کە: گەلو نەتەوەی حـەزرەتی موحەممـەد ﷺ بەعـەزابی ڕیشەکێشکەر لـەناو نەبا، مۆڵەتیان بدا بۆ ڕۆژی دیاری کراوکە؛ ڕۆژی قیامەتە. بۆیەش حیکمەتی خودا واداخوازە کە: قوڕەیشییەکان کۆکوژ نـەکاو وەکـوو گـەلی فیرعـەونو عـادو ثـەموود ڕیشە کێشیان نەکا، چونکە خودا بۆخۆی دەزانێ لەپشتی ئەمانە گەلو نەتەوەیـەك دەکەوێتەوە ئیمان دەهێنن. مێژووش ئەو ڕاسـتیو حەقیقەتـەی چەسپاند، ئـەوەتا پاش ماوەیەك کوڕوو کچی ئـەو قوڕەیـشیە سـەر ڕەقانـە موسـوڵمان بـوونو بوونـە هەڵگرو بانگخوازیی ئیسلام!!

## پێغەمبەر ﷺ ئادەمیزادە، وادەی خودا پاشگەز بوونەوەی تێدا نیە، قورئان نەصیحەتە

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ۝٧ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ ۝٨ ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ ۝٩ لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا فِيهِ ذِكۡرُكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ۝١٠ ﴾

ئەم كۆمەڵە ئایەتە وەڵامی قورەیشییەكان دەداتەوە كە دەیانگوت: ﴿هَلْ هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ؟﴾ ئەو راستییە روون دەكەنەوە: كەهەموو پێغەمبەرانی پێش حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئادەمیزاد بوون. ناگونجێ پێغەمبەر بۆ ئادەمیزاد ئادەمیزاد نەبێ، كەوابێ رەخنەكەیان: كە دەڵێن: پێغەمبەر نابێ ئادەمیزاد بێ لەجێی خۆی نیە.

دەفەرموێ: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ ئەی موحەممەد! ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكمان نەناردووە بۆسەر گەل‌و نەتەوەیەك لەسەرجەم گەل‌و نەتەوەكانی پێشوو، ئیللا كە: ناردومانە پیاوێكمان ناردووە وەكوو خۆیان بووە، لەشێوەو ئاكاری ئادەمیزادیانەیدا، هیچ كاتێ ئێمە فریشتەمان نەكردۆتە پێغەمبەری ئادەمیزاد، بەڵكوو پیاوێكمان هەڵبژاردوە، نیگامان بۆ كردوە، فەرمان‌و جڵەو گیرییەكانی خۆمانمان بەهۆی جوبرائیلەوە پێ گەیاندوە، ئەویش بەگەل‌و نەتەوەكەی خۆی راگەیاندوە. ئەوە ئەو موشریكانە چییانە؟ بۆ واخۆیان گێل دەكەن؟.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلاَّ رِجَالاً نُّوحِي إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ الْقُرَى﴾ (یوسف/١٠٩) دەی بۆچی ئەو موشریكە قورەیشیانە بیر ناكەنەوە؟ بۆچی لەوە حاڵی نابن كە: تۆ پێغەمبەرێكی ئادەمیزادی وەكوو باقی پێغەمبەرانی پێش خۆت؟ بۆتێناگەن كە: تۆ داب‌و نەریتت لەپێغەمبەرانی تر جوداواز نیە؟ وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِّنْ الرُّسُلِ﴾.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەقورەیشییەكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ ئێوەی موشریك‌و بتپەرست ئەگەر بۆ خۆتان ئەو راستییە نازانن‌و گومانتان هەیە لەوەدا كە: پێغەمبەر هەردەبێ ئادەمیزاد بێ، دەپرسیار لەخاوەن نامەكان بكەن، پرسیار لەزانایانی جولەكەو نەصرانییەكان

بکەن، لەوانە پرسیار بکەن؛ کەئاگاداری تەورات‌و ئینجیلن، با ئەوەتان بۆ روون بکەنەوە!!

موشریکەکانی قورەیش پرس‌و رایان بەئەهلی کیتاب دەکردو لەبارەی پێغەمبەرەوە باوەڕیان بەقسەیان هەبوو، لە دژایەتی پێغەمبەردا یەکانگیر بوون لەگەڵیاندا.

لەلایەکی ترەوە جولەکەو مەسیحی، دوو کۆمەڵ‌و تاقمی گەورە بوون، هەموویان باوەڕیان وابوو کە پێغەمبەر دەبێ ئادەمیزاد بێ کەواتە: بەم فەرموودەیە بتپەرستەکان دەمیان بەستراو هیچ قسەو بیانویەکیان بۆ نەمایەوە.

قەتادە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: دانیشتوانی مەککە بەپێغەمبەریان گوت: ئەگەر راست دەکەیت تۆ پێغەمبەری‌و دەتەوێ ئێمە ئیمانت پێ بهێنین، دەکێوی صەفامان بۆ بکە بەزێڕ. جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ ئەوەی گەلەکەت کردویانە بە بیانوو داوات لێ دەکەن بۆت جێبەجێ دەبێ، بەلام ئەگەر ئەو شتەی ئەوان داوای دەکەن هاتەدی‌و ئیمانیان نەهێنا، ئیتر مۆڵەت نادرێن‌و یەکسەر ریشە کێش دەکرێن، ئەگەر حەزیشت لێیە لەگەڵ قەومەمەکەت بەصەبرو ئارام بە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکوو لەگەڵ قەومەکەم بەهێدی‌و لەسەرە خۆ دەبم. ئیتر ئایەتی ﴿مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم...الاية﴾ نازڵ بوو.

بۆیە پێویستە پێغەمبەر ئادەمیزاد بێ، هەتا ئادەمیزادان بتوانن نیگایان لێ وەربگرن‌و بتوانن کاروباری ئایینی‌و پێویستیاتی دونیاو دینیان لێوە فێر بن‌و بەئاسانی ئەوەی لەخوداوە نازڵ دەبێ بەوان بگا...ئەم ئایەتە دەقێکی ئاشکراو نومایانە لەوەدا: کەپێغەمبەر دەبێ پیاو بێ‌و نابێ مێینە بێ.

﴿وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَداً لا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ﴾ داب‌و نەریتی ئێمە وانەهاتووە کە: پێغەمبەران جەستە بن خواردن‌و خواردنەوەیان نەبێ، بەڵکوو پێغەمبەران هەموویان جەستەیان هەبوەو خواردن‌و خواردنەوەیان پێویست بووە. هەروەها داب‌و نەرێتمان وانەهاتوە ئەو پێغەمبەرانە نەمرێنین‌و بۆ هەتا هەتایە

لەدونیادا بیانهێڵینەوە، ئەوانە هەموو رەوشتێکی ئادەمیزادییان تێدا بووە، خواردنو خواردنەوەیان هەبووە، بەخەبەریو نووستنو ماندو بوونو حەسانەوەیان هەبوە، نەخۆشیو سەر ئێشەو مردنو ژیانیان هەبوە.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ (الفرقان/٧) یان دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ﴾ (الفرقان/٢٠).

﴿ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ﴾ ئیتر ئێمە لەتیرەی ئادەمیزاد پێغەمبەرمان هەڵبژاردنو رەوانەمان کردن بۆسەر ئادەمیزاد، وادەو بەڵێنمان پێدانو بەڵێنەکانی خۆمان هێنانەدی!

پارێزگاریمان لێ کردن، بەسەر دوژمنانیاندا سەرمان خستن، هەروا هەرکەسێ ویستبێتمان رزگاری بکەینو سەری بخەین ویستی خۆمان هێناوەتەدی ﴿وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ﴾ ستەمکارو ملهورو یاخی بوانمان بەرباد کردوە، هەموو ئەوانەمان لەناو بردن کە: زیادەرەویان لەکوفرو بێدینی دا کرد.

ئەمجار دوای چەسپاندنی ئادەمییزادیەتی هەموو پێغەمبەرانو رەتدانەوەی کافرەکان کەپێیان وابوو: دەبێ پێغەمبەر لەرەگەزی فریشتە بێ! فە ضل و رێزداریی قورئان رادەگەیەنێو گرنگیو سوودی بۆ ئادەمیزادان شی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَاباً فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾ ئەی موشریکانی مەککە! بێگومان ئێمە ئەو قورئانە گەورەو گرنگەمان بۆ ناردوونە خوارێ کە: بەرنامەی ژیانی ئادەمیزادی لەخۆ گرتووە، ئەو قورئانە گەورەو گرنگە شکۆمەندی ئێوەی لەخۆ گرتووە، ئامۆژگاریو هیدایەتی ئێوەی تێدایە، شیاوی ئەوەیە: ئێوە خۆتانی پێ هەڵنێنەوە بیکەنەرەمزی پیاوەتیو خۆناسینی خۆتان!

قورئان موعجیزەیەو موعجیزەیەکی ناوازەیە، موعجیزەیە بۆ هەموو چینو توێژێکی داهاتوی ئادەمیزاد، خاریقەیەکی ماددی نیە ئەمڕۆ ڕوبداو سبەینێ

نەمێنێ، یان جیلی سەردەم بیبینێو بۆ چینی دوایی نەبێ، تەنها ئەوانەی مرۆڤی سەردەمو هاوچەرخی موعجیزەکەن پێی (متأثر) بنو بەس! بەڵکوو موعجیزەیەکە بۆ هەموو کاتو شوێنێك، بۆهەموو چینو توێژێك، بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك، بۆ هەموو ئادەمیزاد تادونیا دونیایە. ئێوە فێری رەوشتو پیاوەتی دەکا. ئەگەر شوێنی بکەون سەربەرزیی دونیاو قیامەتتان پێ دەبەخشێ، شکۆمەندیی جیهانو کامەرانی قیامەتتان بۆ دەستەبەر دەبێ، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ﴾ (الزخرف/٤٤) ناوو ناوبانگی خۆتو گەلەکەتی تێدایە.

﴿أَفَلا تَعْقِلُونَ ؟﴾ ئەرێ ئێوەی موشریكو بتپەرست! بۆچی بیر لەخۆتان ناکەنەوە، بۆبەخۆتاندا ناچنەوە؟ بۆچی رێزی ئەم نیعمەتە گەورەو گرنگە ناگرن، بۆ بەپیر بانگەوازییەکەوە نایەن؟؟ بۆ بەئاگا نایەنەوەو ئەم پەیامە پیرۆزە ناقۆزنەوە؟

بێگومان قورئان نیعمەتێکی گەورەو لەنرخ نەهاتووە بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتیو بۆ عەرەبەکان بەتایبەتی. چونکە عەرەبەکان پێش هاتنی ئیسلام ژێر دەستەو بەش خوراو بوون، والی کیسرا لەیەمەنەوە حوکمی بەسەردا دەکردن، لەناو خۆیان دا شەرە خێڵو شەڕە گەڕەکیان بوو، نەخوێندەوارو شوانکارە بوون، بتپەرستو گومڕا بوون، قورئان پیاوەتیو ناوو شورەتی بۆ پەیدا کردن، کاتێك بوون بەهەڵگری ئاڵای ئیسلامو بەرەو خۆرهەڵاتو خۆر ئاوا راجمین پیاوەتیان دەست کەوت، پێش ئەوەی قورئان نازڵ بێ کەس بەهیچی نەدەزانین، هیچیان نەبوو پێشکەشی مرۆڤایەتی بکەن، کەس نەیدەناسین، بەڵام کەبوون بەهەڵگری قورئان سەروەرییان بەدەست هێنا، جیهان ناسینی، چەند رۆژگارێك ئادەمیزاد بەرێزەوە باسی دەکردن، هەتا ئەوان پابەندی قورئان بوون، مرۆڤایەتی بەچاوی شکۆمەندییەوە لێی دەڕوانین، بەو قورئانە پێشەوایەتی ئادەمیزادیان کرد، خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بۆ خۆیانو خەڵکی دەستەبەر کرد؛ بەڵام کاتێ پشتیان لەقورئان کرد؛ هەموو جیهان پشتی لەوان کرد، ناویان لەناو ناوان دا نەما،

شکۆمەندیی‌و پیاوەتیان لەدەست دا، وردە وردە کەوتنە پەراوێزەوەو بای بەختیان رۆیی، جولەکەو فەلە بەسەریاندا زاڵ بوون‌و پەرتەوازە بوون‌و بوونە گرۆ گرۆو دەوڵەتۆکەی بێ دەسەڵات‌و بێ ڕێزو لاواز، تەنانەت کار گەیشتە ئەوە دەوڵەتۆکەی ئیسرائیل بەسەریاندا زاڵ بووە، بیست‌و دوو دەوڵەتی عەرەب نزیکەی (٢٠٠)و ئەوەندە ملیۆن عەرەب دەرەقەتی ئیسرائیل نایەن. ئەمە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە عەرەب وازیان لەقورئان هێناوە، پشتیان تێ کردوە.

لەڕاستیدا عەرەب چ فەلسەفەو حە ضارەتێکیان پێ نیە پێشکەشی مرۆڤایەتی بکەن، جگە لەم تێشوە فکرەو تیۆرێکیان نیە بەمرۆڤایەتی رابگەیەنن جگە لەم فکرو تیۆرە. جا ئەگەر ناوەرۆکی ئەم قورئانەیان بەخەڵکی ڕاگەیاندو بۆخۆشیان پابەندی بوون‌و بەدڵسۆزی هەڵگری بوون: ئەوە هەموو جیهان دەیانناسێ‌و باسیان دەکەن‌و ڕێزیان لێ دەگرن! چونکە ئەوکاتە ئەتوانن بەئەم قورئانە سوود بەخەڵکی بگەیەنن، دەبنە هۆی بەختەوەری بۆ ئادەمیزاد.

وەلێ ئەگەر بەناوی (عروبة) وە خۆیان پێشکەش بەئادەمیزاد بکەن، شانازیی بەنەتەوەی عەرەبەوە بکەن‌و قورئان پاش گوێ بخەن، دەبێ عەرەب چی بن؟ (عروبة) چیەو قیمەتی چیە؟ نرخی عەرەب بەبێ قورئان چیە؟

بێگومان مرۆڤایەتی چ نرخێك بۆ عەرەب دانانێ بەبێ ئەوەی ئیمانی هەبێ‌و پابەندی قورئان بێ، هەر کاتێ نەتەوەی عەرەب یاسای ژیانی قورئان نەبوو، عەقلەڤی بوو، جەمالی بوو، ئیشتیراکی بوو، قەززافی بوو بۆ ڕقێبەیی بوو...هتد. کەس نایانناسێ، چونکە ئەوکاتە عەرەبن‌و بەس! پێ پەتین‌و خێڵەکین، چ بەهایەکیان لەمێژووی ئادەمیزاددا نیە، هیچ سەروەریەکیان لەقامووسی حەضارەتدا نیە. ئەوان بەئیسلام ناسراون، کاتێك ڕێزیان هەیە هەڵگری فیکرەی ئیسلامی بن، هەرکاتێ وانەبوون هیچ نین!!

## هەڕەشە کردن بەعەزابی ڕیشە کێشکەر

﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّآ أَحَسُّوا۟ بَأْسَنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا۟ وَٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَآ أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَىٰهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَٰهُمْ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّٱتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُۥ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾﴾

ئـەم ئایەتانـە هەڕەشـەن لـەکافرەکان‌و ترسـاندن‌و ترسـانیانـە لـەئاکامی کـوفرو بێدینی، دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە کە: ستـەمکارو یـاخی بـوانی

ڕیشه کێش کردون، تۆڵه‌ی به‌درۆخستنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ران‌و کافر بوونیان به‌خودا به‌شێوه‌ی عه‌داڵه‌تکاریی لێ ستاندوون، پێغه‌مبه‌رانی به‌سه‌ردا زاڵ کردون‌و ویستی خۆی هێناوه‌ته دی.

بێگومان په‌روه‌ردگار ڕه‌حم‌و به‌زه‌یی خۆی به‌سه‌ر ئوممه‌تی پێغه‌مبه‌ری ئاخیر زه‌مان دا ڕشت ره‌حم‌و، شه‌فه‌قه‌تی خۆی له‌گه‌ڵ یه‌که‌م تاقم‌و پێڕی ئه‌م ئوممه‌ته به‌کار هێنا که: مۆڵه‌تی دان‌و په‌ڵپ‌و بیانوه‌کانی بۆ نه‌هێنانه دی، چونکه ئه‌گه‌ر بیانوه‌کانیان بهاتایه‌ته‌دی، ئه‌وه ئه‌وان ئیمانیان نه‌ده‌هێنا، ئیتر ئه‌وکاته خودا به‌پێی داب‌و نه‌ریتی خۆی له‌بوونه‌وه‌ردا به‌ربادی ده‌کردن، وه‌کوو چۆن له‌وه پێش ئه‌و هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وانه‌ی پاش نواندنی ئه‌و موعجیزه‌و وه‌دی هاتنی ئه‌و په‌ڵپ‌و بیانوانه‌ی داوایان کردو ئیمانیان نه‌هێنا، ڕیشه کێشی کردن. وه‌کوو ده‌رباره‌ی ئه‌و عه‌زاب‌و به‌لایه‌ی ناردنی بۆسه‌ر ئه‌و گه‌ل‌و نه‌ته‌وه چاره‌ڕه‌شانه ده‌فه‌رموێ: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِنْ قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْماً آخَرِينَ﴾. واته: زۆرمان له‌ناو بردن له‌دانیشتوانی شارو گوند. زۆرمان شارو وڵات وێران کردن‌و دانیشتوانه‌کانیمان ڕیشه کێش کرد، ئه‌و دانیشتوانه سته‌مکارو ملهوڕو بێ باوه‌ڕ بوون، بڕوایان به‌تاك‌و ته‌نهایی خودا نه‌بوو، پێغه‌مبه‌رانیان به‌درۆ خسته‌وه. داوای موعجیزه‌و خاریقه‌ی جیاجیایان کرد، جا که‌له‌سه‌ر ده‌ستی پێغه‌مبه‌ره‌کان په‌ڵپ‌و بیانووه‌کانیان هاته دی، ئه‌وان زیاتر یاخی بوون‌و پشتیان هه‌ڵکرد، ئێمه‌ش تێکمان شکاندن‌و بنه بڕمان کردن، له‌شوێنی ئه‌وان له‌سه‌ر خاك‌و نیشتمانی ئه‌وان گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌ی ترمان هێنانه دی‌و له‌زێدو جێگای ئه‌وان دا نیشته‌جێمان کردن. وه‌کوو له‌ئایه‌تێکی تردا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ﴾ (الاسـراء/١٧) یان ده‌فه‌رموێ: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا﴾ (الحج/٤٥).

ئیمامی قورطوبی ده‌فه‌رموێ: مه‌به‌ست به (قریة) لێره‌دا: وڵاتی مه‌دائینی یه‌مه‌نه. ڕاڤه‌که‌رانی قورئان ده‌فه‌رموون: مه‌به‌ست دانیشتوانی (حه ضوره)

لەحیجازکـە: کەوتۆتـە نزیـك سـنووری شـام. ئـەم گـەل‌و نەتـەوە پێغەمبـەرێکیان بۆسەر ڕەوانە کرا ناوی شوعەیبی کوڕی ذی مەهدەم بوو: گۆڕی ئـەم زاتـە لەچیای (ضنن) لەولاتی یەمەنەو ئەو شوعەیبە نیە کەپێغەمبـەری (أصحاب مـدین) بـووە. چونکە چیرۆکی (حه ضور) پێش حەزرەتی موسا ﷺ بووە، بەسەدان سالیش پاش حەزرەتی سلێمان بـووە، کەوابێ نـاگونجێ ئـەو پێغەمبـەرەی نـاوی شـوعەیب بـووە، پێغەمبەری دانیشتوانی (حه ضور) بوو، ئەو شوعەیبە بێ کە: خـەزوری حـەزرەتی موسا ﷺ بووەو پێغەمبەری (اصحاب مدین) بووە.!!

دانیشتوانی (حەضور) پێغەمبەرەکەی خۆیان شەهید کرد.[١٣]

ئـەمجار پـەروەردگار وێنـەو دیمـەنی ئـەو غـەزەب لێگیراوانـەمان نیـشان دەدا لەکاتی هاتنی عەزابەکە بۆ سەریان‌و دەفەرمووێ: ﴿فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُمْ مِنْهَا يَرْكُضُونَ﴾ کەهەسـتیان کردعـەزاب دێتـە سـەریان‌و ڕزگاربوونیـان نیـەو هەڕەشـەی پێغەمبەرەکەیان دێتە جێ، ئیتر بەهەڵەداوان هەی لەوەی هەڵێ‌و گوندو شار بەجێ بێڵـێ، سـەرەتای عـەزاب لێیـان نزیـك بۆوەوئـەوان قوچانـدیان، بـەغاردان لەشـار دەرچوون، بـەڵام تـازە چ سـوود؟! حالـەو کاتـە سـامناکەدا: کەئـەوان لەترسـان کونـە مشکیان لێ بوونە قەیصەریی‌و خەریکە زەندەقیان بچێ‌و جگە لەراکردن هیچ ڕێگا چارەیان نەماوە. لەلایەن فریشتەوە یان لەلایەن ئیماندارەکانـەوە بـەلاقرتێ‌و گاڵتـە پـێ کردنـەوە تێیـان ڕاخوڕێنـدراو پێیـان گـوترا: ﴿لَا تَرْكُضُوا﴾ ڕامەکـەن، بۆکـوێ دەردەچن؟ ﴿وَارْجِعُوا إِلَى مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ﴾ بگەڕێنـەوە بـۆ نـاو ئـەو نـازو نیعمەتەی تێیدا دەتلانەوەو بەلێشاو بەسەرتان دا ڕژابوو، بگەڕێنەوە بۆ ناو خـانوو باڵەخانەی خۆش‌و دلگیرتان، ئـەوە چۆنە دڵتـان بـەرایی دەدا ئـەو ژیـان‌و گوزەرانـە خۆشەی خۆتان جێ دێڵن!!؟

(١٣) تەفسیری قورطوبی ج/٦ ط دار الفکر ل ٣٣١٨ لـەوێ دا چـیرۆکەکە دوورودرێـژە ، وەلێ وەکـوو لەپەراوێزی هەمان لاپەڕەدا نووسراوە چیرۆکێکی ئیسرائیلی یە.

بگەڕێنەوە بۆ ناو نازو نیعمەتو خانووبەرەتان ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ﴾ بەڵكوو پرسو ڕاتان پێ بکرێ، راوێژتان پێ بکرێ، یان بەڵکوو داوای بەخششو یارمەتیتان لێ بکرێ، ئاتاجان بێنە بەر دەرگاو ماڵتان داوای شتتان لێ بکەن. یان پرسیارتان لێ بکرێ ئەو هەموو نازو نیعمەتەی پێتان درابوو لەچیدا سەرفتان کرد، یان لێتان پرسیار بکرێ ئاخۆ ئەم عەزابە چیەو بۆچی هاتووەو کێ ناردویەتی. بەهەر جۆرێك مانای بکەین مەبەست گاڵتە پێکردنو لاقرتێ بووە پێیانو بۆ زێدە سزادان بووە، واتە: لەو کاتە تەنگانەیەدا سەرباریی ترسو لەرزو زەندەق چوونیان لاقرتێشیان پێ کراوە تازیاتر سزا بخۆنو پتر نارەحەت بن.

جاگەزانیان غاردانو ڕاکردن فوتاریان ناکا، پەنایەك نەماوە خۆیانی تێدا حەشار بدەن، ئەودا نەماوەو کاریان تەواوە، بەعەزابی خودا دەورەیان دراوە، ئەمجار دانیان بەتاوانکاری خۆیاندا ناو هاواریان لێ هەڵسا ﴿قَالُوا﴾ وتیان: ﴿يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ ئای هاوار بۆ خۆمان، بەراستی ئێمە ستەمکار بووین، تاوانبارین، کافر و بێ بڕوا بووین، سپڵەو پێنەزان بووین، کەواتە ئەم سزایەحەقی خۆمانە شیاوی ئەوەین و سوچی خۆمانە.

ئەوانە پەشیمان بوونەوە بەڵام پەشیمانی تازە سودی نیە، چونکە پەشیمانبوونەوەکەیان پەشیمانبوونەوەی نائومێدیو ترسانە، گەڕانەوەکەیان لە ویست و ئیختیارەوە نەهاتووە، هەر شتێکیش وانەبێ خودا نایەوێ، ئیتر ئەوان هەر ئەو قسەو تۆبەو پەشیمان بوونەوەی خۆیانیان دەگوتەوەو فاڕەبڕ بوون!

وەکو دەفەرموێ: ﴿فَمَا زَالَتْ تِلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّى جَعَلْنَاهُمْ حَصِيداً خَامِدِينَ﴾ واتە: ئەوان هەر درێژەیان بەو قسەو پەشیمانبوونەوەیەی خۆیان داو دەیانگوتو دەیانگووتەوە هەتا سەر لەبەر دروێنەمان کردن وەکوو چۆن گژوگیاو دروێنە دەکرێ، بنە بڕمان کردنو هەستو خوستو جمەوجوڵمان لێ بڕین. دەنگو صەدامان کپ کردن، وەکوو ئاگرێك کوژاندمانەوە. سلاربوونەوە!

ئای لەو دروێنەی ئادەمیزادی تێدا دروێنە دەکرێ، پێش تاوێك جمو‌جوڵیان بوو، هەناسەیان دەهاتو دەچوو، لەنکاوێك کشوماتو بێ هەستوخوست بوونو لاڵوپاڵ کەوتن.

بەراستی عیقابەکەیان عەداڵەت بوو، تۆڵەیەکی پڕاوپڕی ستەمکاریو بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیان بوو، سزای ئەوەبوو موعجیزەی پێغەمبەریان بەگاڵتەو عەبەث لەقەڵەم دا!

جائەگەر موشریکەکانی مەککەو هی تریش بەگاڵتەو عەبەثەوە پێشوازی لەقورئان دەکەنو بێئاگان لە حەقیقەتی حاڵو واقیعی ئیش، ئەگەر بێ ئاگان لەڕۆژی قیامەتو حەقوحیسابێ: کەلێیان نزیك بۆتەوە، بێ ئاگان لەو عەزابەی چاوەڕوانی گاڵتەکەرو بەدرۆ خەرەوەکان دەکا. ئەوە بەهەڵە چونو زۆر خەڵەفاون، پێویستە باش بزانن‌و دڵنیابن دابو نەریتی خودا نەگۆڕەو حەقو ڕاستو جدییە، پەیوەستە بەحەقەوەو لەوەوە سەرچاوە دەگرێ، کار بەهەند گرتن‌و جدییەتو حەققانی دابو نەریتی خودایەو هەموو کارێکی پڕە لەحیکمەتو هیچ شتێکی بێ حیکمەت نیە.

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاعِبِينَ﴾ ئاسمان‌و زەویو ئەوەی تێیان دایە بێهودە دروستمان نەکردوە، بەحەق هێناومانن کایە، بەعەداڵەتو ڕاستی خستومانن گەڕ، بەدانایی‌و لێزانی خۆمان بەرجەستەمان کردون، ئاسمان‌و زەویمان بەدی هێناون بۆ ئەوەی ئادەمیزاد تێیان دا بیر بکاتەوە، بیانکاتە بەڵگە لەسەرتاكو تەنهایی خودا، لەسەر دانایی‌و زانایی‌و بەتوانایی خودا بۆ بەرژەوەندی ئادەمیزاد لەدونیاو قیامەت دا بۆئەوەی خراپەکاران سزای خۆیان وەرگرن‌و چاکەکاران پاداشتی کردەوەکانیان بدرێتەوە.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴾ (ص/٢٧).

هەر بەو بەهەند گرتن‌و گرنگی پێدانەی ئاسمان‌و زەوی پێ بەدی هێناون، نامەی ئاسمانی بۆ ناردونە خوارێ، ئەرکی خستۆتە سەر ئادەمیزادو فەرزو واجبی بۆ دیاری کردوون. کەوابوو جدییەت‌و بەهەند گرتن کاری خودایە، یاسایەکی بنەڕەتی بوونەوەرەو لەسروشتی بوونەوەردا بەرچاو گیراوە. کوردی گوتەنی خودا راستەو راستی لێ خۆش دێ.

﴿لَوْ أَرَدْنَا أَنْ نَتَّخِذَ لَهْواً﴾ ئەگەر ـ لەفەرزی مەحاڵ دا ـ ئێمە بمانویستایە بەشتی گاڵتەو ڕابواردن شت فەراهەم بێنین‌و بۆخۆمانی دەستەبەر بکەین، وەکوو چۆن ئادەمیزاد هەوڵ دەدا بۆ بۆ پەیدا کردنی خێزان‌و منداڵ‌و هۆکاری رابواردن‌و گاڵتەو گەپ، ئەوە ﴿لاتَّخَذْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا إِنْ كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ئەوە بێگومان ئەو شتانەمان فەراهەم دەهێنا لەوەی کەلای خۆمانەو لەشتێك؛ کە شایانی ئێمە بوایە، نەك پەیوەندی بەئاسمان‌و زەوی‌و جۆری دروست کراوانەوە بێ، چونکە ئەمانە هەموویان تازە دروستکراون‌و کاتێك بووە نەبوون، هەرشتێ بۆ زاتی خودا بێ دەبێ، وەکوو خۆی ئەزەلی بێ‌و ئەبەدیی بێ. یان ئەگەر ئێمە ـ لەفە رضی محاڵ دا ـ بمانویستایە خێزان‌و منداڵمان هەبوونایە، ئەوە لەحۆری‌و فریشتە فەراهەممان دەهێنان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَتَّخِذَ وَلَداً لَاصْطَفَى مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ (الزمر/٤) ئایەتەکە دەبێتە رەتدانەوەی ئەوانەی دەڵێن: عیسا کوڕی خودایە یان عوزێر کوڕی خودایە.

بەهەر حاڵ ئەمە فە رضیکی جەدەلی‌و موناقەشەیە، چونکە وشەی (لو) وەکوو نەحوییەکان دەڵێن (حرف امتناع لامتناع) واتە: (لو) پیتێکە ئەوە دەچەسپێنێ کەفیعلی ولامەکە یاساغە ببێ، چونکە فیعلی شەرتەکە بوونی یاساغە. پەروەردگار بەهیچ کلۆجێ نەیوستوە گاڵتەو گەپ لەکاریدا روبدا، خێزان‌و منداڵی بۆخۆی نیرادەنەکردوە.. کەوابێ لەبنەڕەتدا خێزان‌و منداڵی نیە، بەهیچ شێوەیەك گاڵتەو گەپ‌و بێ هودەیی لەلای خودا نەبوەو نابێ!

بەڵکوو یاسای چەسپاوو بەرقەرار لای خودا، دابو نەریتی چەسپاوو نەگۆڕ لەلای خودا ئەوەیە: لەهولەعب نەبێ. بەڵکوو هەموو شتێکی جدییەو حەق و عەدالەت و حیکمەتە.

ئەمجار لەم باسە دەگوێزێتەوە بۆ باسێکی تر کە: دابو نەریتی خودا شی دەکاتەوە. ئەویش سەرخستنی حەقە بەسەر بەتاڵ دا، دەفەرموێ: ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ﴾ تۆ واز لەوە بێنە، ئێمە شتی بێ هودەو گاڵتە فەراهەم ناهێنین، ئەوە کاری ئێمە نیە، دابو نەریتی ئێمە وانەهاتووە. بەڵکوو ئێمە حەق روون دەکەینەوە، حەق بالادەست دەکەین و زاڵی دەکەین بەسەر بەتاڵ داو ﴿فَيَدْمَغُهُ﴾ دەیپوچێنێتەوەو بەربادی دەکا، حەق دەهێڵێنەوەو بەتاڵ لەناو دەبەین، چۆن؟ بەم رەنگە حەق و راستی دەهاوێژین و دەیمالین بەبەتاڵداو مێشکی دەپژێ و لەناو دەچێ ﴿فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ دەست بەجێ بەتاڵ دەفەوتێ و ئاسەواری نامێنێ و دوابڕاو دەبێ.

بەڕاستی ئەم رستەیە بەلاغەتێکی بەهێزو سەرنج راکێشی تێدایە؛ وای نیشان دەدا کە: حەق و راستی وەکوو شتێکی قورس وابێ، وەکوو بەردێکی خۆش لەدەست و لەبار وابێ، بەدەستی قودرەتی خوداوە بێ و لەدورەوە بیماڵێ بەسەر بەتاڵ داو مێشکی بپژێنێ و لەناوی بەرێ، بەتاڵیشی لەشێوەی قەبارەیەکی بێ هێزی قرپۆک دا نیشان داوە هەر لەگەڵ زەبرەکەی پێ داماڵدرا مێشکی دەپژێندرێ و دەفەوتێ.

لە ئایەتەکەدا (قەذف و دەمغی) ئیستیعارە کردوە بۆ فەوتانی بەتاڵ و لەناو چوونی و بەشێوەیەکی حیسسی و کاریگەر راینواندوە، لەدیمەنەکەدا بێ هێزی بەتاڵ نمایان دەبێ بەجۆرێك: کەبەتاڵ هەر وجوودی نامێنێ.

جا کەدابو نەریتی ئێمە ئاوابێ و بەوجۆرە بێ!؟ ئەدی چۆن حەق بڵاو ناکەینەوەو خەڵکی لەدۆزەخ ناترسێنن! ئەگەر وانەکەین دەبێ گاڵتە خواز بین، بێهودە پەسەند بکەین:

بەڵێ باوی خودا ناگۆڕێو نەگۆڕەو هەروا بووە، هەموو کاتێ حەق بەسەر بەتاڵ دا زاڵ دەکا، سەرکەوتن هەر بۆ حەقو راستییە، چونکە حەق شتێکی بنەڕەتییەو چەسپاوەو لەشتی بوونەوەردا کاریگەرە، بەتاڵ نامۆو لاوازە، هیچ رۆڵێکی نیە لەبوونەوەردا، خودا تڕۆی کردوەو تاراندویەتی. شتێك خودا تڕۆی کردبێو تاراندبێتی دەبێ چ نرخێکی هەبێو چی بێ؟!

بێگومان بەخەیاڵی ئادەمیزاددا دێ کە: واقیعی ژیان پێچەوانەی ئەم حەقیقەتو راستییەیە، تەنانەت زۆر جار خاوەن باوەڕانیش ئەم بیرۆکەیان لەلا گەڵاڵە دەبێو ئەو خەتەرەیەیان دەچێتە ناو دەروونەوە، چونکە لەرووداوەکانی ژیاندا پێچەوانەی ئەو نەریتە دەبینن کە: خودای زاناو دانا کردویەتی بەباوی خۆی. ئەمەش لەو کاتو رۆژگارانەدا کە: بەتاڵ خۆی فش کردۆتەوەو بەرواڵەت بالادەستەو حەق نەدەنگی هەیەو نەڕەنگ. بەو جۆرە ماوەیەکی دوورو درێژ لەپێش چاوی ئادەمیزاد تێپەڕ دەکا. بەڵام بابزانرێ ئەوەی بەپێچەوانەوە دەبینرێ، شتێکی کاتییەو درێژ خایەن نیە، پەروەردگار بۆ لەبۆتەدانو تاقیکردنەوەی موسوڵمانان درێژی دەکاتەوە. پاشان دابو نەریتی خوداو سوننەتە ئەزەلی یەکە بەرقەرار دەبێ، حەقە بنەڕەتیو سروشتییەکە جێگیر دەبێو بالادەست دەبێ. ئەو حەقەی ئاسمانو زەوی لەسەر بنیات نراوە، بیرو باوەڕو بانگەوازییەکانی لەسەر دامەزراون.

ئەوانەی بڕوایان بەخودا هەیە گومانیان لەوەدا نیە کە: وادەی خودا دێتە دی. بڕوایان بەوە هەیە کە: حەق بنەڕەتییەو حەق سەرکەوتووەو بەتاڵ پووچاوەیە.

جائەگەر خودا لەرۆژگارێك دا بەسەرکەوتنی بەتاڵ بەسەر حەق دا خاوەن باوەڕانی بەتاقیکردنەوە دەزانن: کەئەوە بەتاقیکردنەوەیە، دەزانن کەئەوە زللەی میهرەبانیە. چونکە کەمو کوڕیو کەمتەرخەمییان تێدا بووەو خودا توشی ئەو تەنگانەی کردن بۆئەوەی خۆیان ئامادەبکەن بۆ پێشوازی کردن لەحەقو راستی سەرکەوتوو، هەڵەکانی خۆیان پڕ بکەنەوە، هەتا زوتر بۆلای خودا بگەڕێنەوەو

پەلە بکەن لەچارەسەرکردنی کەمتەرخەمی‌و پڕکردنەوەی کەم‌و کوڕیەکانیان.
ماوەی باڵادەستی بەتاڵ کورت تر دەبێ‌و زوتر حەق‌و راستی سەردەکەونەوەو خودا لەسەر دەستی حەق رادەنوێنێ‌و سەرەنجام هەر بۆ حەق‌و راستی قۆرغ کراوەو بڕیارە لەخوداوە دراوە پاشگەز بوونەوەی تێدا نیە، پێویستە ئێمە تێبینی ئەو راستییە بکەین‌و هەمیشە بەرچاوی بگرین، ئەویش ئەوەیە: حەق یەکێکەو نابێ بەدوو، رێگای راست رێگایەکەو جگە لەو حەقە یان لەو رێگا راستە ئەوانی تر بەتاڵن‌و پووچ.

حەق یەکێکەو بەتاڵ زۆرو هەمەجۆر، رێبازی راست ریگایەکەو رێگا گومراییەکان زۆرو زەبەندە. بۆنمونە ئایینی حەق‌و راست هەر لەیەکەم پێغەمبەرەوە تادوا پێغەمبەر تەنها یەك ئایین بووە، هەموو پێغەمبەران یەك لەدوایەك راستی ئایینی پێش خۆیان دووپات کردۆتەوە، هەموو پێغەمبەران لەیەك سەرچاوەوە نیگاو سروشیان بۆ هاتووە، هەموویان یەکتاپەرستی‌و راستی پێغەمبەرایەتی‌و هاتنی رۆژی دواییان دووبارە کردۆتەوەو جەختیان لەسەر کردۆتەوە. ئیتر جگە لەو ئایینە راستە حەقە بەولاوە هەموو بیرو باوەڕو تیورو فەلسەفەکانی تر بەتاڵن‌و بێ بنەمان، چەندەها بیرو باوەڕی جیاجیای بەتاڵ هاتن‌و رۆیشتن، چەند تیورو فەلسەفە هاتنە کایەوەو بەسەر چوون، وەلێ بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد تەنها ئایینی خودا بەرێك‌و پێکی ماوەتەوەو لەناو نەچووە رێك‌و پێکی خۆی لەدەست نەداوە..

بەدرێژایی مێژوو لەهەرکات‌و رۆژگارێك دا کەم و کوڕییەك روی کردبێتە ئایین‌و لەوانە بووبێ لەبیر بچێتەوە خودا لەسەر دەستی بەندەیەکی هەڵبژاردەی خۆی تازەی کردۆتەوە. پێغەمبەرێك موصلیحێك پیاو چاکێکی راست کردۆتەوە کاری ئایینی خۆی وەگەڕ خستۆتەوە، تاگە ییشتە دواتری هەموو پێغەمبەران؛ حەزرەتی موحەممەد ﷺ لەسەر دەستی ئەو خودا ئایینی خۆی تازە کردەوەو بەجوانترین شێوەو بەتێرو تەسەلی تازە کرایەوەو بوو بەو ئایینە گشتییە عالەمییە

کە: قورئان بەرنامەو پرۆگرامیەتی. ئیتر ئەمجارە ئایینی خودا لەترۆپکی جوانیو بەرزیو ڕێكو پێکی دا تازە کرایەوە. بەرنامەی خودا لەقورئان دا بۆ ئەو ئایینە ڕەنگی دایەوە، خودا بۆخۆی پارێزگارو چاودێریەتی، بەنەگۆڕاویو دەست لێ نەدراویی لەگۆڕپانی صیراعی حەقو بەتاڵ دا دەست بەکارەو بەرنامەی حەقخوازانو خودا پەرستانە، هەتا موسوڵمانان پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی بنو بەڕاستی بیکەنە بەرنامەی خۆیان ئەوە سەرکەوتوو دەبن،

مێژو شاهیدەو شتێك هاتە دی دەشێی جارێکی تر دووبارە ببێتەوە، ئەوەتا ئەمجارە کەئایینی خودا لەسەر دەستی حەزرەتی موحەممەد ﷺ تازە بووەوە، لەهەموو ڕوێیکەوە زاڵ بوو، لەهەموو شتێك دا جڵەوی ژیانی بەدەستەوە گرتو حەق باڵادەست بوو، ژیان ئاسودەو بەیدەست بوو، خەڵکی تێرو ئەمین بوون. چونکە هەر یاساو نیزامێك توانی ئەم دوو فاکتەرە دەستە بەر بکا بۆ دانیشتوان؛ ژیان خۆش دەبێو لەززەتی لێ دەبینرێ. هەڵبەتە ئایینی خوداو یاسای خودا کاری هەرە گرنگی دەستەبەر کردنی ژیانی بەختەوەرییە لەهەردوو جیهان دا.

بەڵام کاتێك موسوڵمانان سستیو لاوازیان تێکەوت پشتیان لەقورئان هەڵکردو لێی دوور کەوتنەوە، هەیبەتیان نەما، بای بەختییان ڕۆییشت، دوژمنی دەرەکیو ناوخۆ لێیان وەدەست هاتنو جڵەوی ڕامیاریو پێشەنگییان لێ سێندراو خرانە پەراوێزی ژیانەوە.

بەڵام وەنەبێ بەوەش قورئان دەسەپاچە بووبێ، بەڵکوو لەبوارەکانی دیدا دەست بەکارەو باڵادەستە. ئەوەتا وێڕای ئەم هەموو کوشتنو بڕینە، سەرباری ئەو هەموو دوژمنایەتییەی دژی قورئانو پەیڕەوکارانی ئەنجام دەدرێ، قورئان کاریگەریی لەدڵی پەیڕەوکارانی دا لەدەست نەداوە، باڵادەستە بەسەر هەموو ئایینو تیۆرو بیرو باوەڕێکی تردا، هیچ کامێ لەفەلسەفەو ڕێبازو بەرنامەکانی تر لەکۆنو نوێ دا ناتوانن بەرەنگاری بوەستن ڕوبەڕوی ببنەوە. نەیانتوانیوەو ناتوانن لەبواری ژیریو زانینەوە، لەبواری داڕشتنو بەلاغەتو فەصاحەتەوە لەککەیەکی تێدا

بدۆزنـەوە، مانایـەکی بەزانـستیانە رەت بکەنـەوە. هـەتا زانـستو زانیـاریی پـێش بکـەوێ، راسـتی قورئـان زیـاتر رون دەبێتـەوەو پەرەدەسـتێنێ، بەدرێـژایی مێـژوو ئایینی خودا بەرێکی ماوەتەوەو زیندوە، بەڵام ئەو هەموو بیرو باوەڕانەی تـر، ئـەو هەموو تیورو بیرو بۆچوونانەی تر بۆ ماوەیەك خەڵکی شوێنیان کـەوتووەو دوایـی وازیان لێ هێنـدراوە تـاكو تەرایـەکیان نـەبێ دروشمیـشیان نەماوەتـەوە، ئـەو تـاكو تەرایـەی ماویـشەتەوە هێنـدەی گۆڕانکـاری تێـدا کـراوە بـەهیچ کلۆجێ وەکوو هـی یەکەمجار ناچێ. کەوابوو راستو بەجێیە کەبڵێین: حەق باڵادەسـتەو بـەتاڵ پـووچو ژێر کەوتووە حەق زیندوە بەتاڵ مردوە.

لەلایەکی ترەوە دابو نەرێتی خودا وانە هاتووە کە: بەزۆرو توانای خۆی حەق سـەربخاو ناحـەق ژێـر بخـا، بـەڵکوو فـەرمانی بـە موسـوڵمانان کـردوە کەهـەوڵو تێکۆشانی خۆیان بخەنـە گـەڕو لـەپێناوی سەرخـستنی راسـتیو حـەق دا تێبکۆشـن، ئـیتر ئـەو کاتـە خـودا یارمـەتی خـۆی دەنێـرێ بـۆ حـەقخوازانو حـەقو راسـتی دەچەسـپێنێو بـەتاڵ دەپرووێنـێ، لەهـەر کـاتو شـوێنێکیش دا بەرواڵـەت بـەتاڵ باڵادەسـت بـێو حـەق کـەنار گـیر کرابـێ، ئـەوە سـووچ لەموسـوڵمانەکانەوەیە، کەمتەرخـەمییان کـردوەو کـەمو کـوڕی لەهـەوڵو تێکۆشـانیاندا رووی داوە، وەکـوو پێویـست لێ نـەبڕاونو بـەدڵسۆزی نەجـەنگاون، ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان ئـەنجام نەداوە، خۆنەگەر هەوڵو تێکۆشانێکیشی بووبێ لاواز بووەو کەمو کوڕی تێدا بـووە، کەواتە موسوڵمانی راستو بـڕوا پتـەو هـەرگیز دودڵـی روی تـێ ناکـاو دڵنیایـە کـە: وادەو بـەڵێنی خـودا دێنـە جـێو پاشـگەز بوونـەوەیان تێـدا نیـەو هـەر دەبـێ حـەق سەرکەوێو بەتاڵ تەفرو تونا ببێ!

ئەمجار پاش راگەیاندنی ئەم بەڵێنە گرنگە کـە: موژدەیـە بـۆ خـودا پەرسـتانو هەڕەشەیە لەبێ باوەڕان، هەڕەشـەیەکی تـر ئاراسـتەی ئەوانـە دەکـا کـە: دەمدرێـژو چەقاوەسوون، چەنەبازو بێ شەرمو بێ ئابڕون، بـێ ویـژدانو گێـلو گـەوجن، شـتی ناڕەوا پاڵ خودا دەدەن، دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾ ئـەی بـێ بڕوایـان!

ئەی ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا بەڕەوا دەزانن، کوڕو کچو خێزان بۆ خودا دادەنێن. شتی واپاڵ خودا دەدەن؛ کەشایانی ئەو نیە، سزای بەتینو شیوی دۆزەخ هەیە بۆ ئێوە لەسەر ئەو بیرو باوەڕو هەڵوێستو کردەوانەتان.

بەچ عەقڵو هۆشێك ئێوە هاوەڵ بۆ خودا بەڕەوا دەزانن؟؟ ﴿وَلَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ هەر بۆ خودایە هەرچی لەئاسمانو زەوی دا هەیە، چۆن ئێوە سەرپێچی طاعەت بۆ کردنو بەندایەتی کردنی دەکەن لەکاتێك دا هەرچی لەبوونەوەردا هەیە هەموویان موڵكو بەندەی زاتی پەروەردگارنو دروستکراوی ئەون، ﴿وَمَنْ عِنْدَهُ لا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلا يَسْتَحْسِرُونَ﴾ هەموو ئەو فریشتانە کە: لای خودا خاوەن پلەو پایەی بەرزن لەئاست بەندایەتی کردن بۆ خودا لووتبەرزیی نانوێننو لەخودا پەرستیو تەقدیسو تەسبیح ماندو نابن، سستی ناکەنو ﴿يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لا يَفْتُرُونَ﴾ شەو رۆژ هەمیشە خودا بەگەورە دەگرنو باسی پاكو بێگەردیو بەرزو پیرۆزیی دەکەن، بەردەوامن لەسەر خودا پەرستی بەنیازو کردەوە سەرگەرمی طاعەت کردننو ساتە وەختێك خودایان لەیاد ناچێو فەرامۆشی ناکەن.

بێگومان ئەوانەی لەئاسمانەکانو زەویدا هەن. جگە لەخودا کەس ژمارەیان نازانێ. چۆنییەتیان بۆ ئێمە مەعلووم نیە، ئێمە باوەڕمان بەهەبوونی فریشتەو جندۆکە هەیە، چونکە لەقورئاندا ئاماژەیان پێ کراوە، ئەمجا وێ دەچێ چەندەها گیانلەبەری تری خاوەن عەقڵو ژیریی هەبن لەسەر زەوی یان لەهەسارەکانی تردا ژیان بەسەر بەرنو خەریکی خودا پەرستی بن، شێوەو سروشتیان وادروست کرابن کە: کەلەگەڵ بارودۆخی ئەو ژینگانەدا بگونجێن. ئێمە هیچیان لێ نازانین!!

**سه‌رزه‌نشتکردنی موشریکه‌کان‌و چه‌سپاندنی تاک‌و ته‌نهایی خودا**

﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَـٰنَكُمْ ۖ هَـٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِىَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِى ۗ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْحَقَّ ۖ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَـٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَـٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

لەسەرەتای سورەتەکەوە تائێرە ئایەتەکان لەتەوەرەی باسی پێغەمبەرایەتی دا دەسووڕانەوە، ئەو شتانەیان شی کردەوە کە: پەیوەندییان بەپێغەمبەرایەتیەوە هەیە، ئەمجار لێرەدا دێتە چەسپاندنو شیکردنەوەی یەکتاپەرستیو ڕەتکردنەوەی هەبوونی هاوەڵ بۆ خودا! ئەوەتا دوابەدوای ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەی کە: فریشتەو ئەوانەی پلەو پایەیان لای خودا بەرزو ڕێزدارن، هەمیشە سەرگەرمی تەسبیحاتو خودا پەرستینو ساتێك لەو تەسبیحاتە دانابڕێن، دوابەدوای ئەوە سەرزەنشتکردنی موشریکەکان دێ، دەعواو بیرو بۆچوونیان ڕەت دەکاتەوە، یەکتاپەرستی دەچەسپێنێو ئەوە ڕادەگەیەنێ کە: بونەوەر بۆ خۆی گەواهی ئەوە دەدا کە: خودا تاكو تەنهایەو بێ شەریكو بێ باك نائاتاجە. پێویستی بەکەس نیەو هەموو کەس پێویستیان بەئەو هەیە دەفەرموێ: ﴿أَمْ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِنْ الأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ﴾ واتە: بەڵکوو ئەوانە چەند خودایەکیان لەمادەکانی پێکهاتەی زەوی بڕیار داوەو دەیانپەرستنو پێیان وایە: ئەو خودا درۆزنانە مردوی ناو گۆڕیان بۆ زیندو دەکەنەوە؟؟ واتە ئەوانە هیچیان لەدەس نایەو مردویان بۆ زیندو ناکرێنەوە دەی کەوابێ چۆنو بەچ عەقڵێك ئەو نەفامانە ئەو شتانەیان بۆ خودا داناونو کردویانن بەهاوەڵی خوداو بەندایەتیان بۆ دەکەن؟

زومەخشەری دەفەرموێ: وشەی (ام) لێرەدا (منقطعه) یەو بەمانا (بل)ەو بۆ (اضراب)ە. هەمزەکە ئاماژە بەوە دەکا کە: واز لەهی پێشەوەی بێنێو چی دی لەسەری نەڕۆیو ئینکاری دواوەشی بکەی! بێگومان بتپەرستەکان دەیانزانی کە: بتەکانیان مردوو زیندو ناکەنەوەو هەرگیز ئیدیعای ئەوەیان نەکردوە، بەڵام بەخودا زانینی ئەو بتانەو بڕیار دانەکەیان ئەوە دەگەیەنێ، چونکە کەسێك خودایەو شایانی پەرستنە کە: توانای بەسەر هەموو شتێك دا هەبێو صیفەتی خودایەتی تێدا بێ، یەکێکیش لەتایبەتمەندییەکانی خودایەتی مردوو زیندو کردنەوەیە بۆ ئەوەی هەموو کەس پاداشو سزای کردەوەکانیان وەربگرنەوە.

ئایەتەکە گاڵتەو لاقرتێ پێکردنە، بێ نرخی و کەم بایەخی و نەفامی و گێلی ئەوانە دەر دەخا کە: بەدەستی خۆیان لەماددەو کەرەستەی زەوی شتێك دادەتاشن و بەندایەتی بۆ دەکەن!

ئەمجار پەروەردگار تاك و تەنهایی خۆی رادەگەیەنێ و خودایەتی خۆی دەسەلمێنێ و جگە لەخۆی خودایەتی بۆ هیچ شتێك بڕیار نادا. بەڵگەی بەپێز دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾ ئەگەر لەئاسمانەکان و زەویدا جگە لەخودای گەورەو مەزن و پیرۆز خودای تر هەبوونایە، کارو باری بوونەوەر تێك دەچوو، یاساو رێسایان تێك دەگیران و تارو مار دەبوون!

چونکە ئەگەر لەبوونەوەردا چەند خودایەك هەبن، ئەگەر خوداکان لەناو خۆیاندا کێشەیان تێ بکەوێ بوونەوەر وێران دەبێ، خۆ ئەگەر تەبا بوون لەهەڵسوڕاندنی بوونەوەردا، ئەو کاتە یان بەهەموویان شتێك بەدی دێنن و کارێك ئەنجام دەدەن و پێویستیان بەیارمەتی یەکتری هەیە، ئەو کاتە مانای وەهایە خوداکان دەستەوەستان و عاجزن، خۆئەگەر هەریەکەیان سەربەخۆ بتوانێ تەصەروف بکا، ئەوکاتە پێویست بەفرە خودایی ناکا، ئەمە مانای وایە دوو خودای خاوەن دەسەڵات و توانا دروستکراوێکیان هێناوەتەدی ئەمەش محاڵە، لەم رووەوە کە: دروستکراوەکە بەویستی هەردوکیان هاتۆتە دی و ویستی یەکیان نیە بەتەنها.

بەڕاستی ئەمە بەڵگەیەکی راست و روون و بەهێزە لەسەر تاك و تەنهایی خودا، واقیعی ژیان شایەتە. ئەوەتا ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین: هەر وڵاتێ هەر شارێ لەژێر دەستی دوو فەرمانڕەوای کاریگەردا بێ و هەریەکەیان بتوانێ سەربەخۆ کار بکا، هەمیشە وێران و نائارامە، جەمسەری تێك چووەو کارو باری وەستاوە.

بەکورتی ئەگەر لەبوونەوەردا چەند خودایەك هەبن هەریەکەیان زات و صیفاتی خۆی هەبێ، جوداوازیی سەرەکی هەبێ لەناویان دا، لەزات و صیفات دا، ئەوکاتە دەبێ هەر یەکەیان ویست و ئیرادەی خۆی هەبێ، ئەگینا دەبێ یەك خودا بن، هەرکاتێکیش خوداکان لەزات و صیفات دا جوداوازییان تێدا بوو، بەهیچ جۆرێ

ناگونجێ لەهەموو ئیش‌و کارێك دا یەك بگرن‌و کۆك بن‌و کێشەیان تێنەکەوێ، هەرکاتێکیش کێشەیان تێکەوت بەگژدا یەکدا دەچن‌و دەبێ لێك بدەن، کەئەوش رووی‌دا ئەوکاتە ئاسمانەکان‌و زەوی سیستەمیان تێك دەچێ‌و تەفرو تونا دەبن.

دەی ئەوەتا ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین ئەم بوونەوەرە گەورەو فراوانە بەئەوپەڕی رێك‌و پێکی بەڕێوە دەچێ، کەواتە دەبێ ئەم بوونەوەرە تەنیا یەك خودای هەبێ‌و بەس!

کەوابوو بوونەوەر تێکڕا بەخوارو ژوورییەوە هەمووی بەڵگەیە لەسەر هەبوونی خودایەکی تاك‌و تەنیاو زاناو داناو باڵادەست.

﴿فَسُبْحَانَ اللَّـهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاك‌و مونەززەهە پەروەردگار لەو شتانەی پاڵی دەدرێن، ئەو خاوەنی عەرشە، خودای بوونەوەرە خێزان‌و کوڕو کچ‌و هاوەڵی نیە، پێویستی پێیان نیە، تاك‌و تەنهاو بێ شەریکە.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذاً لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّـهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾. (المؤمنون/٩١).

﴿لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ بەهیچ شێوەیەك خودا پرسیاری لەسەر کردەوەکانی لێ ناکرێ، چی بکا رەخنەی لێ ناگیرێ، چونکە خودایەکی شکۆمەندو زاناو داناو عادڵ‌و خاوەن لوطف و رەحمەت‌و نیعمەتە، دەی کەسێ ئەوە بڕێ لەصیفەتەکانی بن چۆن رەخنەی لێ دەگیرێ؟ کێ رەخنەی لێ بگرێ؟ بەڵکوو بەندەکانی پرسیاریان لێ دەکرێ، ئەوان دەربارەی هەموو کردارو گوفتارو هەڵوێستێکیان دەخرێنە بەر پرسیارو لێکۆڵینەوەیان لێ دەکرێ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾. (الحجر/٩٢-٩٣)

ئەمجار بۆ زێدە سەرزەنشت‌و دووبارە کردنەوەی دەربڕینی نارەزایی‌و بەگەورە زانینی کوفرو بێ دینیەکانیان دەفەرموێ: ﴿أَمْ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً قُلْ هَاتُوا

بُرْهَانَكُمْ﴾ ئایا دوای ئـەو هـەموو بەڵگەو نیشانە هێنانـەوە لەسـەر تـاك‌و تـەنهایی خـودا ڕەوایـەو دروسـتە ئـەو نەفامانـە چـەند پەرسـتراوێكی تـر جگـە لـە خـودا بـۆ خۆیان بڕیار بدەن بیانپەرستن؟ وەصفی خودا بەوە بكەن كـە: هاوەڵی هەیـە؟ دەی ئەگـەر ئێـوە كـافرو یـاخی بـوو نـەفام نـەبن چـۆن بڕیـاری ئـەوە دەدەن كـە: خـودا هاوەڵی هەیە، دەبەڵگەو چەسپێنەری داواكانتـان بخەنـە ڕوو! كـوا بەڵگەیـەكی نـەقڵی لەنیگاو سروشتەوە پشتگیریتان لێ بكا؟ كوا بەڵگەیەكی عەقڵی لەسەر داواكەتان؟

بێگومان ئێوە نامەیەكی ئاسمانیتـان دەسـت ناكـەوێ ئـەوەی تێـدابێ كـە: خـودا هاوەڵی هەیە، بچن سەیری كتێبە ئاسمانییەكانی وەكوو تەورات‌و ئینجیل‌و زەبـوور بكەن، ئاخۆ هیچتان لەوبارەوە وەدەست دەكەوێ؟ بێگومان لـەو نامـە ئاسمانییانـەدا تاك‌و تەنهایی خوداو بـێ هـاوەڵی چەسـپاوەو هـیچ دەقێكـی بـڕوا پێكراوتـان دەسـت ناكەوێ بڕیاری هەبوونی هاوەڵی بۆ خودا تێدا بێ. هەروەكوو چۆن عەقڵ‌و ژیریش هـەبوونی فرەخـودایی ڕەت دەكاتـەوە، بـەهیچ جـۆرێ عـەقڵ‌و ژیریـی ڕێگـا نـاداو بڕیاری دوو خودایی‌و فرە خودایی بەرەوا نازانێ وەكوو لەپێشەوە ئاماژەی پێ كراو فەرمووی: (لو كان فیهما...الایة) ئەمجار ئاماژە بەبەڵگەی نەقڵی دەكاو دەفەرموێ: ﴿هَذَا ذِكْرُ مَنْ مَعِي وَذِكْرُ مَنْ قَبْلِي﴾ ئـەو نیگایـەی دەربـارەی تـاك‌و تـەنهایی خـوداو نەگونجانی هـەبوونی هـاوەڵ بـۆی، بـۆ مـن هـاتووە، بـۆ هـەموو پێغەمبـەرانی پـێش منیش نازڵ بووە، هـەموو نامـە ئاسمانییـەكان، هـەموو نیگـاو سروشـی پێغەمبـەران تـاك‌و تـەنهایی پـەروەردگاریان دوبـارە كردۆتـەوە، كـەوابوو قورئـان یادخـستنەوەو ئامۆژگارییە بۆ ئوممەتەكەم، ئەم ڕاستییە لەكتێبە ئاسمانییەكانی تـریش دا هەیـە، وەرن تەماشایان بكەن‌و سەرنجیان بدەنێ، ئایا لەهیچ لەو نامانەدا شەریك بۆ خـودا بـەڕەوا بینـراوە؟ بێگومـان لەهـەموو كتێبـە ئاسمانییـەكان دا ئـایینی خـودا لەسـەر بنـەمای تـاك‌و تـەنهایی خـودا داڕێـژراوەو چەسـپاوە هـەموو نامـە ئاسمانییـەكان، هەموو پەیام‌و سروشی پێغەمبەران ئـەو حەقیقەتـەیان چەسـپاندوە، كـەوابوو ئـەو بیرو بۆچونەی كافرەكان بانگەشەی بـۆ دەكـەن، هـیچ بنەمایـەكی نیـەو لەنـەفامی‌و

کەودەنی خۆیانەوە سەری هەڵداوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ﴾ بەڵکوو زۆربەی ئەو موشریکانە نازانن حەق و راستی چیەو چۆنە، حەق و ناحەق لێك جیاناکەنەوە، بەڵگەو نیشانە سوودیان پێ ناگەیەنن ﴿فَهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ ئەوان لەبەر نەزانیو کەودەنییان روو لەحەق وەردەگێڕن و تاك و تەنهایی خودا رەت دەکەنەوە!

بەکورتی موشریکەکان هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە بیرو بۆچوونەکەیان بچەسپێنێ، هەرشتێك دەهێننەوەو بەخەیاڵی خۆیان دەیکەنە بەڵگە لەسەر بیرو باوەڕەکەیان، پوچاوەو بێ هێزو پێزە. چونکە بوونەوەر شایەتە لەسەر تاك و تەنهایی خودا، سروشت تاك و تەنهایی خودا دەسەلمێنێ، عەقڵ و ژیریی، پەیامی پێغەمبەران هەموویان کۆکن لەسەر رەتکردنەوەی هەبوونی هاوەڵ بۆ خودا لەسەر چەسپاندنی تاك و تەنهایی زاتی پاکی. ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾ هیچ پێغەمبەرێکمان پێش تۆ نەناردوە ئیللا کە: ناردومانە نیگامان بۆ کردوە: کەهیچ خودا نین شایانی پەرستن بن جگە لەمن، هەر من خودام و هەر من شیاوی خودایەتیم دەی کەوابێ هەر عیبادەت بۆ من بکەن.

ئەمجار بۆ سەلماندنی تاك و تەنهایی خوداو رەتکردنەوەی بیرۆکەی هەبوونی فرەخودایی، نەفی ئەوەش دەکا کە: خودا منداڵی هەبێ، سەرزەنشتی ئەوانە دەکا کەئەم جۆرە بیرو باوەڕەیان هەیە.. دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً﴾ واتە: هەندێ لەخێڵە عەرەبەکان: کەهۆزی خوزاعەو جوهەینەو بەنوسەلەمە بوون، دەیانگوت: خودا منداڵی هەن، بڕوایان وابوو فریشتە کچی خودان! هەندێ لە نەصرانیەکانیش دەیانگوت مەسیح کوڕی خودایە، هەندێ لە جولەکەش پێیان وابوو عوزەیر کوڕی خودایە. ئیتر پەروەردگار فەرمووی: ﴿سُبْحَانَهُ﴾ پاکی و بەرزیو دوورە پەرێزی بۆ خودا لەوەی منداڵی هەبێ، هەرگیز شتی وانەبوەو نیەو

نابێ، چونکە منداڵ لەشتێك دا دەشوبهێتە باوکیو لەچەند شتێکی تردا لەو ناچێ، جا ئەگەر لەفەرزی محاڵ دا خودا منداڵی هەبێ، دەبێ لەهەندێ رەوشت دا ئەو منداڵە لەخودا بچێو لەهەندێ رەوشت دا جیابێ، ئەو کاتە لازم دێ زاتی خودا لەچەند شتێك پێك هاتبێ، دەی خۆ بەبەڵگەو دەلیل چەسپاوە؛ خودا بەهیچ کلۆجێ لەهیچ شتێك دا ناشوبهێتە شتی مادیو تازە پەیدا بوو، رەگەزایەتی لەنێوان بەدیهێنەرو دروست کراواندا نیە..

﴿بَلْ عِبَادٌ مُكْرَمُونَ﴾ واتە: فریشتە کچی خودا نین، بەڵکوو ئەوان بەندەی رێزداری خودان ، خودا بۆخۆی بەدی هێناون، لای خودا رێزو نرخیان هەیە. ئەوان بەندەو خەڵقندەی خودان، منداڵی خودا نین. بەسەر باقی دروست کراواندا پاساویان هەیەو جگە لەپێغەمبەران لەهەمموو دروستکراوانی تر رێزدار ترن، صیفەتو رەوشتیان بەم جۆرەیە:

١- ﴿لا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ﴾ بەهیچ قسەو گفتو گۆیەك پێش خودا ناکەون، هەتا خودا فەرمانیان پێ نەکا هیچ ناڵێن؛ هەرچی فەرمانیشیان پێ بکا سەرپێچی فەرمانەکانی ناکەن، بەڵکوو لەگەڵ فەرمانی پێکردن یەکسەر فەرمانەکە جێبەجێدەکەن، پەروەردگار زانایەو زانیارییەکەی کۆنترۆڵی هەمموو شتێکی کردوە. هیچی لێ گوم نابێ. دەفەرموێ:

٢- ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ خودا زاناو ئاگادارە دەزانێ لەوە پێش چییت کردوە، لەداهاتوودا چی دەکەن، واتە وەکوو چۆن گوفتاریان بەپێی فەرمانی خودایە، کرداریشیان بەگوێرەی فەرمانی ئەوە: هیچ کارێك ئەنجام نادەن هەتا فەرمانیان پێ نەکرێ. هەرچی دەیکەنو نایکەن لەزانیاریی خودادا دیارەو کۆنترۆڵ کراوە، بەردەوام ئەوانە موراقەبەی خودا دەکەن لەهەمموو حاڵو وەزعێکیان دا، خۆیان دەگرنەوە لەهەمموو سەرپێچییەکی فەرمانی ئەو..

٣- ﴿وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنْ ارْتَضَى﴾ جەسارەتی ئەوە ناکەن شەفاعەت بۆ هیچ کەس بکەن مەگەر بۆ کەسێك خودا لێی رازی بێ‌و بەشیاوی دانابێ بۆ ئەوەی شەفاعەتی بۆ بکرێ.

٤- ﴿وَهُمْ مِنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ﴾ ئەو فریشتانە وێڕای خودا پەرستی‌و ڕۆچوون لەطاعەتدا لەترسی خودا حەجمینیان نیە، هەمیشە بەئاگاو سەرگەرمی بەندایەتی کردنن، دڵە لەرزەیانە لەبەر سامناکی پەروەردگارو هەمیشە خودایان لەیادەو ساتێکیش لەبیری ناکەن، ترسی عەزابی خودایان هەیەو خۆیان دەپارێزن لەسنوور بەزێنی.

ئەمجار دوای وەصف کردنی فریشتەو ئاماژە بەرێزدارییان لای خودا، هەڕەشەیەکی توندو تیژی ئاراستەی ئەوانە کرد کە: هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِنْ دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ﴾ هەرکەسێ لەوفریشتانە لەفەرزی محاڵ دا لافی خودایەتی لێ بداو بڵێ: من خودام من هاوەڵی خودام، وەکوو ئەوەی شەیتان لافی خودایەتی بۆخۆی لێ دەداو بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ پەیڕەوکردنی فەرمان‌و نەهیەکانی‌و داوای لێ کردن بیپەرستن، ئەوە بابزانێ لەسەر ئەو هەڵوێستە سزای دۆزەخ دەدرێ‌و تۆڵەی لێ دەستێنرێ، هەڵبەتە هیچ کەسێ لەفریشتە لافی خودایەتی لێ نەداوەو نەیگوتوە من خودام.

﴿كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾ هەر بەوجۆرە سزای ستەمکاران‌و ئەوانی کوڕو کچ وەپاڵ خودا دەدەن، دەدەین‌و تۆڵەیان لێ دەستێنینەوەو بەئاگری دۆزەخ عەزابیان دەدەین.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: لەئایەتەکەدا: کەدەفەرموێ ﴿وَمَنْ يَقُلْ مِنْهُمْ...﴾ ئەمە شەرطە، شەرطیش پێویست ناکا ببێ. واتە مەرج نیە هەندێ لەفریشتە ئەو کوفرە بکەن، نموونەی ئەوەش زۆرە وەکوو ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِن كَانَ

لِلرَّحْمَنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾ (الزخرف/٨١) یان دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (الزمر/٦٥).

## سەرزەنشکردنێکی تر بۆ موشریکەکان لەسەر ئەوەی کە لەئایەتی بوونەوەر وورد نابنەوە

﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ (٣٠) وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ (٣١) وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ (٣٢) وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ (٣٣) ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار سەرزەنشتی موشریکەکانی کرد: چ ئەوانەی لەتەك خودادا شتی تریش دەپەرستن‌و ئەوانەش کە دەڵێن: خودا منداڵی بۆخۆی بڕیار داوە لەفریشتە، ئەمجار لێرەدا سەرزەنشتی کردن لەسەر ئەوە لەئایەتی بوونەوەر ورد نابنەوە، تا تاك‌و تەنهایی خودایان بۆ ئاشکرا ببێ، چونکە هەموو شتێکی بوونەوەر نیشانەی تاك‌و تەنهایی خودایە، بەڵگەیە لەسەر کار دروستی‌و کارامەیی‌و دانایی‌و زانایی زاتی کردگار.

پــەروەردگار لــەم ئایەتانــەدا شــەش بەڵگــە دەهێنێتــەوە لەســەر هــەبوونی خودایەکی تاکو تەنهاو خاوەن دەسەڵاتو بەتوانا لەدروستکردنی هەموو شتێك داو گەردنکەچی هەموو شتێك بۆ دەسەڵاتی بەرفراوانی.. ئایەتەکان جەولەیەکی ناو بوونەوەرن و رادەنوێندرێن بۆ تێفکرین و ورد بوونەوە، بۆ بەئاگا هاتنەوەی دڵە بێ ئاگاکان، دیمەنی وای تێدا دەبینرێ سەر سوور دەمێنێ و عەقڵ مەدهۆش دەبێ: ئایەتەکانیش ئەمانەن:

**١- دەربارەی تەقینەوەو لێك جودا بوونەوەی ئاسمانەکان و زەوی و هەسارەکان دەفەرموێ:**

﴿أَوَلَمْ يَرَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ ئایا ئەو موشریکانەی ئینکاری خودایەتی خودا دەکەن و لەگەڵ خودادا شتی تر دەپەرستن! نەیانزانیوەو نازانن کە: ئاسمانەکان و زەوی لەسەرەتادا یەکپارچە بوون و هەندێکیان بەهەندێکیانەوە نووسا بوون و یەك کیتلە بوون، دوایی لێکمان جودا کردنەوەو لەنێوان ئاسمان و زەویدا چینێکمان هەوا دانا، هەروەها هەر کۆمەڵە ئەستێرەو شارە ئەستێرەیەکمان خستە سەر جەمسەرو تەوەرەی خۆیان و رێکمان خستن؟!

تیۆری باوی ئەمڕۆ تیوری (السديم)ە کەدەڵێن: کۆمەڵە ئەستێرەکان هەموویان، بۆ نموونە کۆمەڵەی خۆریی: کەپێکهاتووە لەخۆرو مانگ و زەوی و ئەستێرەکانی تری ناو کۆمەڵەکەی هەموویان مادەی (السديم) بوون و دوایی تەقینەوەیان تێدا دروست بووەو شکڵی کورەوییان وەرگرتووە، دەگوترێ: زەوی پارچەیەك بووە لەخۆرو لێی جیابۆتەوەو پاش ماوەیێك سارد بۆتەوە. بەم جۆرە دەڵێن: خۆر کوورەیەکی ئاگرین بووە، لەکاتی رۆیشتنی خێرایدا زەوی و هەسارە گەڕۆکەکانی تری لێ بوونەوە: کەبەگوێرەی نزیکیان بەم جۆرە ریز بەند دەکرێن عەطار، زوهرە، زەوی، مەریخ، موشتەری، زوحەل، ئۆرانۆس، نیبتۆن، بلۆتۆ. بۆ هەریەکە لەم هەسارە گەڕۆکانە بەگوێرەی هێزی کێشندەیان خولگەیەکی تایبەتی هەیەو

تێیـدا دێـتو دەچـێ، وەکـوو دەڵـێن: نـۆ فەلـەك هـەن لـەخوار ئـەو ئاسمانانــەوە کەشوێنو جێگای فریشتەیە. فەلـەك بریتییـە لەکەوانەیـەك کـە: هەسـارەکە تێیـدا دەخولێتەوە، یان رێگای رۆیشتنو گورجی رۆیشتنەکەیەتی.

ئەم پێشەنگە زانیارییەی کە: قورئـان رایگەیانـدوە، ئـەم راگەیاندنـە عیلمـیـە کە: قورئان پێش هەزارو چوارسەدو بیـست سـاڵ رایگەیانـدوە، بەڵگەیـەکی ئاشـکراو نومایانـە: کـەقورئان کـەلامی خودایـەو بـەنیگا ناردویـەتی بۆسـەر دڵـی حـەزرەتی موحەممەد ﷺ ئـەو پێغەمبـەرەی کـە: نەخوێنـدەوار بـووە، محاڵـە نەخوێنـدەوارێك شتی ئاوای لێ دەربکەوێ ئەگەر مەوزوعەکە نیگای خودایی نەبێ.

بەڵام وێـرای ئـەوەی کـە: ئـەم تیـۆرە زانـستییە تـا ئـەمڕۆ بـاوی هەیـەو لەگـەڵ مانای رواڵـەتی ئایەتەکەدا دەگـونجێ وەلێ نـابێ ئـەوە لـەبیر بکـەین کـە ئـەم تیـۆرە تیـۆرێکی فەلەکییـەو تائـەمڕۆ بـاوی هەیـە، دوورنیـە سـبەینێ هەڵبوەشـێتەوەو تیۆرێکی تر جێگای بگرێتەوەو بگونجێ بۆ شیکردنەوەی دیاردەکانی بوونەوەر.

ئێمەی موسوڵمان کە: خاوەنی بیرو بـاوەڕی ئیـسلامینو هـەڵگری ئـەو عەقیـدە پیرۆزەیـن، نـابێ هـەوڵ بـدەین بـۆ ئـەوەی دەقـەکانی قورئـان خاضـیع بکـەین بـۆ تیۆرێکی وەها کە نەبۆتە حەقیقەتی عیلمیو راستی نەچەسپاوە.

بەکورتی دەبێ ئێمە جوداوازی بخەین لەنێوان (النظريـات العلميـە) (والحقائق العلميـة) کەدەسـت نـادەن بـۆ گـۆڕانو هەڵوەشـاندنەوە، وەکـوو زانیـاری گـۆڕانی ئـاو بەهـەڵم لەپلـەی گـەرمیدا، یـان بـوون بەسـەهۆڵی لەپلـەی سـفری سـەدیدا، یـان پێکهاتنی هەورو بەفرو تەرزەو بارانو چۆنیەتی پەیدا بوونیان!

ئـەم جـۆرە شـتانە حەقیقـەتی عـیلمینو دەتـوانین ئایەتـەکانی قورئانیـان پـێ تەفسیر بکەینو پێکیان بگرین، بەڵام بەهیچ جۆرێ نابێ ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ ئەو تیۆرانـەی پێیـان دەگـوترێ تیـۆری زانـستی یـەك بخـەینو بیانکەینـە تەفـسیرو بەڵگە بۆ ئایەتـەکان، چونکە ئەگـەر وامـان کـردو سـبەینێ تیۆرەکـە هەڵوەشـایەوە، دەبێ مانای ئایەتەکەش بەهەڵە دابنـێین. ئەمـەش کـارێکی نـەگونجاوو نادروسـتە..

دەبێ موسوڵمان خۆی لێ بپارێزێ. بێگومان قورئان کتێبی تیۆری زانستی نیە، بۆیە نازڵ نەکراوە کتێبی زانست بێو وەکوو سەرچاوەیەکی تاقیکردنەوە سەیری بکرێ! بەڵکوو قورئان بەرنامەی ژیانە بەگشتی، کتێبی هیدایەتو ئامۆژگارییە، بەرنامەیە بۆ راست کردنەوەی عەقڵ، بۆ ئەوەی بەگوێرەی خۆی پەل رابهاوێ، کۆمەڵ راست بکاتەوەو رێگا بکا عەقڵ کار بکاو پەل بهاوێ، هەندێ جار قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکا بۆ بڕی حەقائیقی کەونی، وەکوو ئەم حەقیقەتەی کە لەم ئایەتەدا دەیچەسپێنێ، دەفەرموێ: ﴿أَنَّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ ئاسمانەکانو زەوی لەسەرەتادا یەك پارچە بوونو دوایی لێکمان جیا کردنەوە. ئێمە بڕوامان بەم حەقیقەتە هەیە لەبەر ئەوەی لەقورئان دا هاتووە، هەرچەندە نازانین چۆنیەتی جیا بوونەوەکە چۆنەو چۆن نیە. ئێمە ئەم تیۆرە فەلەکییە وەردەگرین چوونکە دژایەتی ئەو حەقیقەتە ناکا کە قورئان چەسپاندویەتی، هەروەها هەموو تیۆرێکمان لاپەسەندە بەمەرجێ دژایەتی لەگەڵ مانای قورئان نەکا، بەڵام ناچین دەقە قورئانیەکان بکەینە خزمەتکاریی تیۆرە زانستییەکانو بەگوێرەی ئەوان ئایەتەکان مانا بکەین. نامانەوێ بەهۆی تیۆرە زانستییەکانەوە: کەزادەی بیرو بۆچونی ئادەمیزادن قورئان بەڕاست بگێڕین، چونکە قورئان حەقیقەتێکی زانستی بێ چەندو چوونەو پێویستی بەتیۆری زانستی نیە راستی ئەو بچەسپێنن! ئەوەی پێویستە بگوترێ: ئەوەیە تیۆری فەلەکی کەئەمڕۆ باون دژایەتی مانای ئایەتەکە ناکەن. ئایەتەکەش بەسەدان ساڵ پێش سەرهەڵدانی ئەم جۆرە تیۆرانە ئەو حەقیقەتەی راگەیاندوە.

٢- دانانی ئاو بەبناخەی ژیان:

دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ هەموو گیانلەبەرێکمان لەئاو دروست کردوە، هەرشتێك گیانی تێدا بێ لەئاو دروستمان کردوە، قورئانی پیرۆز لەم نیوە ئایەتەدا حەقیقەتێکی زانستی سەر سوڕهێنەر نمایش دەکا، زانایانو لێکۆڵەرەوانی زانستی، دەرخستنو کەشفکردنی ئەم حەقیقەتە بەکارێکی گەورە

حسێب دەکەن و پێیان وایە پێشکەوتنێکی زانستییەو بەشان و باڵی داروین دا هەڵدەدەن و بەرێزەوە ناوی دێنن!! گوایە ئەم واتە: داروین رابەری دۆزینەوەی ئەم تیۆرە زانستییە یەو چەسپاندویەتی و وەکوو حەقیقەتێکی عیلمی راینواندوە. وتویەتی ئاو بنەمای ژیانەو سەرەتا ژیان لەئاوەوە پەیدا بووە. بەڵام لەراستیدا رابەری ئەم حەقیقەتە زانستییە قورئانە نەك داروین، صەدان ساڵ پێش ئەوەی داروین ئەو تیۆرە زانستییە رابگەیەنێ و باسی گەشەو پەرەسەندن (نشوو ئو ئیرتیقا) بێنێتە کایەوە، قورئان لەسەر دەستی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار وەکوو حەقیقەتێکی عیلمی چەسپاندویەتی و رایگەیاندوە.

بەڵکوو حەق وایە داروین دادگایی بکرێ و لەدادگای زانست دا بەتاوانبار بدرێتە قەڵەم، چونکە حەقیقەتێکی عیلمی ئیعلان کراوی چەواشە کردوە، بەناوی تیۆری (گەش و نما) وە قووتی کردوٚتەوەو بەناوی خۆیەوە بڵاوی کردوٚتەوە!

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کەدەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّـاءٍ﴾ (النور/٤٥) ئاشکراشە هەموو گیانلەبەرێك لە (نوطفە) پەیدا دەبێ، نوطفەش لەئاو پەیدا دەبێ. هیچ روەکێکیش بێ ئاو ناڕسکێ و پێ ناگا. کەوابوو هەموو نەش و نمایەك لەئاو پەیدا دەبێ و بەئاو پەیدادەبێ.

بۆ ڕاستی ئەم حەقیقەتە زانستییە کەدەڵێن: هەموو گیانلەبەرێك لەئاو دروست بووە، حەقیقەتێکی سەرنج راکێش و سەر سووڕهێنەرە، هەرچەندە سەر سەر سووڕمان لەئێمەدا دروست ناکاو بەوجۆرە تیۆرانە بڕوای ئێمەی موسوڵمان بەقورئان زیاد نابێ، چونکە ئێمە بڕوای موطلەقمان بەراستی قورئان هەیە، دەزانین کەلەخوداوە هاتووەو لەقورئان بیرو باوەڕی خۆمان وەردەگرین چونکە لەخوداوە هاتووە، نەك لەبەر ئەوە بڕامان بەقورئان هەیە چونکە موافیقی تیۆرو کوشوفاتی عیلمییە.

ئێمە هەرئەوەندە دەڵێین: تیۆری (نشوء وارتقا)ی کەداروین‌و تاقمەکەی خۆیانی پێوە بادەدەن دژی مەفهومی ئایەتەکەی قورئان نیە لەم خاڵەدا.

ئەوە چواردە سەدەو ئەوەندە ساڵەیە قورئانی پیرۆز سەرنجی کافرو بێ بڕوایان رادەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لەعەجایەباتی بوونەوەر، بۆ تێفکرین لەدروستکراوانی خودا: کەلەناو بوونەوەردا بڵاو بوونەوە!

﴿أَفَلا يُؤْمِنُونَ ؟﴾ ئەرێ ئەوە بۆچی ئیمان ناهێنن؟

خۆهەرچی لەبوونەوەردایە نیشانەی هەبوونی خودایە، نیشانەی تاك‌و تەنهایی خودایە، ئەگەر بیر لەدروستکراوانی خودا بکەنەوە، بێگومان بیر کردنەوەکەتان سەر دەکێشێ بۆ ئیمان هێنان.

**٣- کێوەکان کراون بەمێخ بۆ زەوی:**

دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ﴾ ئێمە لەزەویدا کێومان بەدی هێناون‌و کردومانن بەسنگ‌و مێخ‌و زەویمان پێ راگرتوون، بۆ ئەوەی لەرە نەکاو جم‌و جوڵی وای لێ پەیدا نەبێ ئادەمیزادەکان لەسەر خۆی فڕێ بدا، یان ژیانیان لێ ناخۆش بکا، نەهێڵی بەئارامی ژیانی تێدا بەسەر بەرن.

زەوی دوو جۆر سووڕانەوە ئەنجام دەدا، سووڕانەوەیەك بەدەوری خۆیداو سووڕانەوەیەکیش بەدەوری خۆردا. زانایان گەیشتوونە ئەو تیۆرە زانستی یە کە زەوی لەسەرەتادا بڵێسە ئاگرێك بووە دوایی بەرگی دەرەوەی سارد بۆتەوەو، رەق بووە، بەڵگە لەسەر ئەوە هەبوون‌و دەرکەوتنی ئەو گڕو بڵێسە ئاگرو دوکەڵ‌و پریشك‌و دیاردە سامناکەیە کە لەکاتی بومەلەرزەو بورکان‌و تەقینەوەی زەویدا دەر دەکەون.

ئایەتەکە ئەوە دەچەسپێنێ کە ئەم کێوە مێخ ئاسایانە تەوازونی زەوی رادەگرن، ناهێڵن بەملاو بەولادا مەیەلان بکاو دانیشتوانی سەری بهەژێنێ، هەڵبەتە راگرتنی تەوازونی زەوی بەچەند شێوەیەك فەراهەم دێ: وادەبێ تەوازن‌و لەنگەر

راگرتنەکە لەنێوان پەستانی دەرەکی (الضغط الخارجی) پەستانی ناوەوەی زەویدا دەستەبەر دەبێ، بۆ موعالەجەو تەوازونی چاڵو نشێوی شوێنێکی دیکەیە..

بەهەر حاڵ ئەم دەقە قورئانییە ئەوە دەچەسپێنێ کە هەبوونی کێوەکان پەیوەندییان بەتەوازونی زەوی یەوە هەیەو هۆکاری راوەستانو ئارامی زەوین. بائەم باسە بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زانستی جێ بێڵین ئەرکی قورئان نیە. وەکوو وتمان: قورئان کتێبی هیدایەتو ئیرشادە، کتێبی تیۆری زانستی نیە!

**٤- فەراهەم هێنانی رێگاویان بەناو کێوەکاندا:**

دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجاً سُبُلاً لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ لەنێوان کێوەکاندا رێبازو کەلەبەرمان دروست کردون بۆ ئەوەی ئادەمیزاد لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەئاسانی رەو بکەن، لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر شتو مەك بگوێزنەوە، بتوانن بەئاواتو مەبەستەکانیان بگەنو بژێوی خۆیان بەدەست بێنن، ئاوا کار ئاسانیمان بۆ کردونو دەربەندو رێبازمان لەنێو کێوەکاندا فەراهەم هێناوە بۆ ئەوەی ئەوان هیدایەت ئامێزبنو خودا بناسنو یەکتا پەرستی بکەن، شكو گومانیان لەتاكو تەنهایی خودادا نەمێنێ!

﴿فِجَاجاً﴾ کۆی (فج)ەو بریتییە لەرێگای پانو پۆڕ. لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سُبُلاً﴾ کۆی (سبیل) ەو بریتیە لە رێبازێك رێڕەوی ئادەمیزاد بێ.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجاً﴾ (نوح/٢٠) لەئایەتی سورەتی (نوح) دا (سبلا فجاجا) لەئایەتی ئێرەدا ﴿فِجَاجاً سُبُلاً﴾ جوداوازییەکەیان لەبارەی ماناوەیە.

کە (فجاج) پێش دەخا دەبێتە (صیفەت) واتە خودا: کەرێبازی دروست کردون بەوشێوە فەراهەمی هێناون. بەڵام کە(فجاج) دەخاتە دوا (سبلا)وە ئەو کاتە (فجاج) دەبێتە حاڵ. یاسایەکی نەحویشە صیفەت پێش مەوصوف دەکەوێ، بەڵام حاڵ پێش ذیلحال ناکەوێ.

**٥- كردنی ئاسمان به‌سه‌قف و هه‌لاشی زه‌وی:**

ده‌فه‌رموێ: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفاً مَحْفُوظاً﴾ واته‌ ئاسمانمان وا دروست كردوه‌ ده‌لێی سه‌قفه‌ بۆ زه‌وی، واته‌: وادێته‌ به‌رچاوو ئاوا ده‌بیندرێ. ئه‌و سه‌قف و هه‌لاشه‌مان له‌ناڕێك و پێكی، له‌كه‌وتن و روخان، له‌وه‌ی شه‌یاتینی بتوانن لێی نزیك ببنه‌وه‌و قسه‌و باس بدزن پاراستووه‌، هیچ له‌كه‌و عه‌یبێكی تێدا نابیندرێ، له‌هه‌موو پیسی و ناڕێك و پێكییه‌ك پارێزراوه‌. له‌م روه‌وه‌ كه‌ ئاسمان ره‌مزی شكۆمه‌ندی و به‌رزو پیرۆزییه‌و ئایاتی هیدایه‌ت له‌وێوه‌ دێنه‌ خوارێ. كه‌چی وێڕای ئه‌وه‌ ﴿وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ ئه‌وان له‌نیشانه‌كانی خودا، له‌ئایه‌ته‌كانی روو وه‌رده‌گێڕن، پشت هه‌لده‌كه‌ن، بێ ئاگاو بێ بیرو هۆشن، هیچ بیر ناكه‌نه‌وه‌ له‌ده‌ست ره‌نگینی خودا ورد نابنه‌وه‌، به‌تێفكرینه‌وه‌ سه‌یری بوونه‌وه‌ر ناكه‌ن!!

ئه‌وانه‌ هیچ بیر ناكه‌نه‌وه‌ له‌بوونه‌وه‌ر، هیچ ورد نابنه‌وه‌ له‌و به‌لگه‌و دیاردانه‌ی نیشانه‌ی تاك و ته‌نهایی خودان، نیشانه‌ی گه‌وره‌یی و به‌توانایی و زانایی و كار دروستی په‌روه‌ردگارن. سه‌رنج ناده‌نه‌ مانگ و خۆرو ئه‌ستێره‌ گه‌ڕۆكه‌كانی ترو شاره‌ ئه‌ستێره‌كان و هاتنی شه‌وو رۆژو په‌یدا بوونی وه‌رزه‌كانی سال و گۆڕانی ئاوو هه‌واو گه‌رمی و ساردی و ده‌سته‌به‌ر بوونی هۆكاری ژیان له‌سه‌ر زه‌وی و جۆره‌ها دیارده‌و نیشانه‌ی تر: كه‌هه‌ر خودا ده‌زانێ چۆنن و چین!! وه‌كوو له‌ئایه‌تێكی تردا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّن آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ (يوسف/١٠٥).

**٦- دروستكردنی شه‌وو رۆژو خۆرو مانگ:**

ده‌فه‌رموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ خودا خودایه‌كی وه‌هایه‌ شه‌وو رۆژی دروست كردوه‌، خۆرو مانگی به‌دیهێناون، شه‌وو رۆژ دوو دیارده‌ی بونه‌وه‌رن، خۆرو مانگ دوو قه‌باره‌ی گه‌وره‌و زه‌به‌لاحن، په‌یوه‌ندییه‌كی پته‌ویان به‌ژیانی ئاده‌میزاده‌وه‌ هه‌یه‌، به‌لكوو به‌ژیانه‌وه‌

بەگشتی هەیە، تێفکرین لەبەشوێن یەکدی داهاتنی شەوو رۆژو هاتۆ چۆی خۆرو مانگو هەموو دیاردەکانی تری بوونەوەر بەو شێوە رێكو پێکە بەم وردیی‌و پتەوی‌و تۆکمەیی‌یە: کەبەبێ راوەستان‌و تێکچوون، بەم شێوەو نیظامە: کەچاو تروکانێك راوەستانیان نیە، بەراستی جێگای ئەوەیە دڵەکان هیدایەت بدەن‌و شارەزایان بکەن بۆ خودا پەرستی‌و تاك‌و تەنهایی زاتی پەروەردگار. ئەم هەموو قەبارە زەبەللاحانە، ئەو شارە ئەستێرەو کاکەشانە لەبۆشایی فەضادا، لەجیهانی ئەثیریی‌دا: کەهەموو بۆشایی پڕ کردوە، دێن‌و دەچن بەبێ وچان لەهاتو چۆدان، وەکوو چۆن ماسی بەناو ئاودا دێت‌و دەچێ! بەڵێ ئێستا زانیاریی تازە هەڵسوڕانی خۆرو مانگ‌و زەوی سەلماندوەو بووەتە حەقیقەتێکی عیلمی.

## مردنی هەموو گیانلەبەرێك‌و هاتنی قیامەت بەناگەهانی

﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِى فَلَا

تَسْتَعْجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤١﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ...﴾ هاتووە دەڵێ: کاتێ کافرەکان وتیان: بێگومان موحەممەد دەمرێو لەکۆڵمان دەبێتەوە، دەیانگوت: ﴿نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ﴾ (الطور/٣٠). ئەم ئایەتە نازڵ بووە. ئیبنولمونذیر لەئیبنو جورەیجەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هەواڵی مردنی خۆی پێ راگەیەندرا، وتی: خودایە! ئەی کێ رابەری ئوممەتەکەم بێ؟ ئیتر ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ﴾ نازڵ بوو.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَإِذَا رَآكَ الَّذِينَ كَفَرُوا...﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لە (السدی) یەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای ئەبوجەهلو ئەبو سوفیاندا تێپەڕی سەرگەرمی قسە بوون. کاتێ ئەبوجەهل پێغەمبەری بینی پێکەنیو بەئەبو سوفیانی گوت: ئەمە پێغەمبەرەکەی بەنو عەبدو لمەنافە، ئەبو سوفیان بەم قسەیە قەڵس بوو وتی: جا بەلاتەوە سەیرە لەناو خێڵی عەبدو مەناف دا پێغەمبەر هەڵبکەوێ؟؟؟

پێغه‌مبه‌ر ﷺ گوێی لێ بوو، گه‌رایه‌وه بۆلای ئه‌بو جه‌هل‌و لێی توڕه بوو هه‌ڕه‌شه‌ی لێ کردو فه‌رمووی: ئه‌وه چیته وات لێ هاتووه ده‌ڵێی ره‌وشتی مامی خۆت (الولید) کوڕی موغه‌یره‌ت گرتووه؟ به‌ئه‌بوو سوفیانیشی فه‌رمووی تۆیش که ئه‌و قسانه‌ت کرد ده‌ماری تایه‌فه گه‌ریی پاڵی پێوه‌ناوی ئیتر ئایه‌تی ﴿وَإِذَا رَآكَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُواً﴾ نازڵ بوو.

په‌یوه‌ندیی ئه‌م کۆمه‌ڵه ئایه‌ته به‌هی پێشه‌وه له‌م ره‌وه‌وه‌یه: له‌وه‌پێش شه‌ش به‌ڵگه‌ی هێنانه‌وه له‌سه‌ر هه‌بوون‌و تاک‌و ته‌نهایی خودا، ئه‌مجار لێره‌دا موناسیبه که بفه‌رموێ: سه‌رئه‌نجامی دونیا وێران بوونه، ئه‌م جیهانه بۆ تاقیکردنه‌وه‌و تێدا تاقیکردنه‌وه دروست کراوه، پردێکه بۆ قیامه‌ت، ژیانی دونیا کێڵگه‌ی قیامه‌ته‌و سه‌رئه‌نجامی هه‌موو مه‌خلوقات بۆلای خودایه، په‌روه‌ردگار حیساب‌و لێکۆڵینه‌وه‌یان له‌گه‌ڵ ده‌کا، هه‌موو که‌س پاداشی سزاو کرده‌وه‌کانی وه‌رده‌گرێته‌وه. ئه‌مجار ئه‌وه راده‌گه‌یه‌نێ: که‌عه‌زابی قیامه‌ت دێ‌و گومانی تێدا نیه، باکه‌س به‌دونیا هه‌ڵنه‌خه‌ڵه‌تێ، که‌س به‌ده‌ست رۆیشتویی‌و ساماندارییی نه‌نازێ، که‌س جه‌سارەتی ئه‌وه نه‌کا گاڵته به‌پێغه‌مبه‌ری خودا بکا، چونکه له‌سه‌ر گاڵته کردن‌و قه‌شمه‌رکردنیان به‌پێغه‌مبه‌ری خوداو په‌یامی خودا، تۆڵه‌یان لێ ده‌ستێنرێ‌و سزا ده‌درێن.

به‌م جۆره سیاقه‌که قانون‌و یاسای بوونه‌وه‌ر له‌دروستکردن‌و پێکهاته‌یدا په‌یوه‌ست ده‌کا به‌یاسای ژیانی ئاده‌میزاده‌وه له‌سروشت‌و ئاکام‌و سه‌رئه‌نجامیدا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ﴾ ئێمه ئاده‌میزادێکی پێش تۆ بڕیارمان نه‌داوه بۆ هه‌تا هه‌تایه له‌ژیاندا بێ، نه ئه‌تۆو ئه‌ی موحه‌ممه‌د هه‌روه‌ها هه‌موو ئه‌وانه‌ی له‌پێش تۆوه رۆییشتون‌و ئه‌وانه‌ی دوا تۆ دێن هه‌ر هه‌موویان گیای مردن‌و مردن یه‌خه‌ی پێ گرتوون‌و پێیان ده‌گرێ‌و که‌س له‌چنگ مردن رزگاری نه‌بوه‌و نابێ.. ئه‌ی موحه‌ممه‌د! خودای تۆ بڕیاری داوه: که‌تۆیش وه‌کوو باقی

پێغەمبەرانی پێش خۆت مردن یەخەت بگرێو بمری. ﴿أَفَإِيْنْ مِتَّ فَهُمْ الْخَالِدُونَ﴾ ئایا کەتۆ مردی ئەی موحەممەد! ئەو موشریکانە نەمردەبن؟ نەخەیر هەموو کەس دەمرێو کەس بەزیندویی نامێنێتەوە. هیچ کەس بەتەما نەبێ بۆ هەتا هەتایە لەدونیادا بژیو مردن یەخەی پێ نەگرێ.

ئەمە رەتدانەوەی موشریکەکانە: کەئاواتە خوازیی مردنی پێغەمبەرﷺ بوون، وایان مەزەندە دەکرد: کەپێغەمبەر ﷺ دەمرێو بەمردنەکەی کەیف خۆش دەبن، جاپەرومردگار پێخۆشبونەکەیانی پوچاندەوە.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کەدەفەرموێ: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ، وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ (الرحمن/٢٦-٢٧) بەیهەقیو هی تریش لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن؛ کە دەفەرموێ: لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ گیانی دەرچوو بوو، حەزرەتی ئەبو بەکر هاتە سەر جەستەی پیرۆزیو ماچی کردو وتی: ئای بۆ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەم! ئای بۆ دۆستەکەم! ئای بۆ پیاوە هەڵبژاردەکەم! ئەمجار ئایەتی ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِنْ قَبْلِكَ الْخُلْدَ ....الأية﴾ی خوێندەوە. هەندێ لەزانایان ئەم ئایەتەیان کردوە بەبەڵگە لەسەر ئەوە کە: حەزرەتی خضر لەژیاندا نەماوەو ئێستا زیندو نیە. چونکە ئادەمیزادەو ئادەمیزادیش گیانی مردنە، بۆ روونکردنەوەی مانای ئایەتەکە چەند فەرمودەیەك هەیە لەشوێنی خۆیاندا لەباسی چیرۆکی حەزرەتی موساو عليه السلام حەزرەتی خضردا ئاماژەیان پێ کراوە، لێرەدا دووبارە کردنەوەیان پێویست نەبوو!

ئەمجار بۆ دووبارە کردنەوەی مردنی هەموو ئادەمیزاد فەرموی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ واتە هەموو خاوەن گیانێك دەبێ پیاڵە ژەهری مردن بچێژێ، هەموو گیانێك دەبێ لەجەستە جیابێتەوە. واتە پێش جیابونەوەی جەستە لەگیان دەبێ تاڵاوی مردن بچێژێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((ان للموت لسكرات)) بێگومان مردن ئازاری زۆرە ((اللهم اعنى على سكرات الموت)) خودایە! یارمەتیم بدە لەسەر ئازاری مردن.

دەی باکەس بەمردنی کەس دڵخۆش نەبێ، کەس بەمردنی کەس بیرۆشی نەیە. چونکە هەموو کەس پیاڵەی مردن دەچێژێ:

مردن سەرەنجامی هەموو زیندویەکە، مردن کۆتایی هەموو گیانلەبەرێکە لەسەر زەوی. هەموو کەس بۆلای خودا دەگەڕێنەوە، جا ئەوەی لەماوەی گەشتی کەمخایەنی تەمەنی کورتی ئادەمیزاددا دێتە کایەوە لەخێرو شەڕ ئەوە بۆ تاقیکردنەوەیە ﴿وَنَبْلُوكُمْ بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ ئێمە بە بەڵاو نیعمەت، بەنەخۆشیو لەشساغی، بەهەژار کردنو سامان پێدانتان بەتاقیتان دەکەینەوە، تا دەری بخەین چەند خۆگرو پشوو درێژن، تاچ ئەندازەیەك بەصەبرو ئارامن، سوپاسگوزارو شوکرانە بژێرن!

تاقیکردنەوە بەبەڵاو موصیبەت مەعلوومو مەفهومە، بۆ ئەوە ئەندازەی خۆگری بەتاقیکراوەکە دەربکەوێ، بۆخۆی بزانێ تاچ رادەیەك بەصەبرو ئارام دەبێ لەسەر زیانو نەخۆشیو هەژاریو چەند بتمانەی بەخودا هەیە!!

بەڵام تاقیکردنەوە بەخێرو خۆشی، بەنازو نیعمەت ئەوە پێویستی بەبڕێك لەسەر وەستان هەیە.

بێگومان تاقیکردنەوە بەخێرو خۆشیو نازو نیعمەت کاریگەر ترە، کەم کەس هەیە خۆی تێدا رابگرێ. زۆر کەس هەن لەبەرامبەر بەڵاو موصیبەت دا خۆگرو بەصەبرو ئارامن، بەڵام کەمینەیەکی کەم هەیە، لەتاقیکردنەوە بەنازو نیعمەت دا سەرکەوتوو بێ، زۆر کەس هەیە، لەسەر نەخۆشیو ئازار بەصەبرو پشوو درێژە، بەڵام کەم کەس هەیە لەتاقیکردنەوەی لەشساغیو بەتوانایی دا سەرکەوتوو بێ، زۆر زەحمەتە بتوانێ لغاوی نەفسی بگرێو نەهێڵێ سنوور بەزێنی بکا.

زۆر که‌س هه‌ن به‌صه‌برن له‌سه‌ر هه‌ژاری‌و نه‌بوونی، عیزه‌ت‌و شكۆمه‌ندیی خۆیان له‌ده‌ست نادەن، به‌لام كه‌م که‌س هه‌ن بتوانن له‌كاتی ده‌وله‌مه‌ندی‌و هه‌بوویی دا خۆیان بگرن‌و له‌خۆیان بایی نه‌بن.

زۆر که‌س هه‌یه له‌ژێر ئازارو ئه‌شکه‌نجه‌دا خۆگرەو ناترسێ‌و ته‌سلیم نابێ، به‌لام زۆر كه‌من ئه‌وانه‌ی له‌به‌رامبه‌ر مه‌نصه‌ب‌و له‌ززه‌ت‌و خۆشی‌و ده‌وله‌مه‌ندی خۆ بگرێ هه‌لنه‌خلیسكێ!

زۆر که‌س هه‌ن له‌تێكۆشان‌و ماندووبوون دا پشوو درێژن، خۆگرو به‌صه‌برو ئارامن له‌سه‌ر بریندارییی، به‌لام ئه‌وانه‌ی له‌به‌رامبه‌ر له‌ززه‌ت‌و خۆشیدا خۆگرن زۆر كه‌م‌و ده‌گمه‌نن: زۆر كه‌من ئه‌وانه‌ی سه‌ری به‌رزیان بۆ بۆ ته‌ماع‌و پاره‌و پوول نه‌وی ناكه‌ن. زۆر ده‌گمه‌نن ئه‌وانه‌ی تووشی ده‌ردی خۆپه‌رستی‌و دونیا ویستی نابن‌و گیانی خۆیان به‌ته‌ماع نزم ناكه‌نه‌وه.

بێگومان تاقیكردنه‌وه به‌به‌لاو موصیبه‌ت، جه‌سارەت‌و شكۆمه‌ندی‌و پیاوه‌تییه‌ك له‌ئاده‌میزاددا فه‌راهه‌م ده‌هێنێ، گیانی به‌رگری تێدا به‌هێز ده‌كا، ئه‌عصابی قایم‌و پته‌و ده‌كا، هه‌موو هێزو تواناكانی ئاماده‌باش ده‌بن بۆ به‌ره‌نگار بوونه‌وه‌ی ئه‌و به‌لاو ناخۆشیه‌و به‌توندی ڕو به‌ڕوبه‌ڕوی ده‌بێته‌وه. به‌لام خێرو خۆشی ئینسان وا لێ ده‌كا خۆی بۆ داگیر نه‌كرێ‌و نه‌توانێ خۆی بگرێ. بۆیه زۆر كه‌س هه‌یه قۆناغی به‌لاو موصیبه‌ت به‌سه‌ركه‌وتوویی ده‌بڕێ، كه‌چی كه نازو نیعمه‌تی به‌سه‌ردا ڕژا، له‌تاقیكردنه‌وه‌كه ده‌رناچن! مه‌گه‌ر كه‌سێ خودا بیپارێزێ‌و فریای بكه‌وێ، ئه‌و كه‌سه‌ی له‌و تاقیكردنه‌وه ده‌ربچێ له‌وانه‌یه: كه‌پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌رباره‌یان فه‌رموویه‌تی: ((عجباً لأمر المؤمن ان امره كله خير، وليس ذاك لأحد الا لمؤمن، ان اصابته سراء شكر فكان خيراً له، وان اصابته ضراء صبر فكان خيراً له)). (١٤)

(١٤) رواه مسلم بسنده في كتاب الزهد والرقائق.

(ئیشی موسوڵمان سه‌یره، هه‌موو کاره‌کانی خێرو چاکه‌یه، ئه‌م به‌هرانه‌ش بۆ که‌س نین جگه له‌موسوڵمان، ئه‌گه‌ر خۆشی تووش بوو سوپاسگوزار بوو ده‌بێته خێر بۆی ئه‌گه‌ر ناخۆشی تووشی هات‌و صه‌بری گرت، ده‌بێته خێرو چاکه بۆی) جا به‌راستی ئه‌م جۆره موسوڵمانانه زۆر که‌من، وریایی ئاده‌میزاد له‌کاتی تاقیکردنه‌وه به‌خێرو به‌شه‌ڕ، هه‌روا په‌یوه‌ندی به‌خوداوه له‌هه‌ردو حاڵه‌که‌دا پێویسته‌و گرنگه.

که ده‌فه‌رموێ: ﴿وَنَبْلُوكُمْ﴾ مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه ئێمه واتان مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ ده‌که‌ین وه‌کوو مامه‌ڵه‌ی که‌سێك به‌تاقیتان بکاته‌وه، ئه‌گینا خۆ به‌بێ تاقیکردنه‌وه ده‌زانێ ئاکام چۆنه‌و کێ له‌ناخۆشی دا سوپاسگوزاره.

﴿وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ سه‌رئه‌نجام‌و گه‌ڕانه‌وه‌تان بۆلای ئێمه‌یه‌و دێنه به‌رده‌ستی ئێمه بۆ موحاسه‌به‌و پاداش‌و سزا. به‌گوێره‌ی کرده‌وه‌کانتان پاداش وه‌رده‌گرنه‌وه‌و سزا ده‌درێن.

﴿وَإِذَا رَآكَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَتَّخِذُونَكَ إِلاَّ هُزُواً﴾ هه‌رکاتێ کافره‌کانی وه‌کوو ئه‌بو جه‌هل‌و هه‌وا خواهانی تۆ ده‌بینن ئه‌ی موحه‌ممه‌د! هه‌موو هه‌وڵ‌و ته‌قه‌لایه‌کیان ئه‌وه‌یه قه‌شمه‌ریت پێ بکه‌ن، ته‌نیا ده‌تکه‌نه هۆکاری گاڵته پێکردن‌و عه‌یب‌و عارت لێ ده‌دۆزنه‌وه! له‌کاتێك دا ده‌بوو ئه‌وان بیر له‌هه‌ڵس‌و که‌وت‌و ئه‌خلاق‌و ره‌وشتت بکه‌نه‌وه، بیر له‌و په‌یامه بکه‌نه‌وه که‌بۆت هاتووه.

له‌ئایه‌ته‌کانی قورئان وورد ببنه‌وه که: مایه‌ی کامه‌رانی هه‌ردوو جیهانه، یاد خه‌ره‌وه‌و رێ نیشانده‌ره بۆ که‌سانێك عه‌قڵ‌و هۆشیان هه‌بێ.

ئه‌و کافرانه بوون: که‌به‌لافرتێوه ئاماژه‌یان بۆ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌کردو ده‌یانگوت: ﴿أَهَذَا الَّذِي يَذْكُرُ آلِهَتَكُمْ﴾ ؟ ئائه‌مه‌یه: که‌عه‌یب‌و عار له‌خوداکانتان ده‌گرێ‌و ئێوه به‌نه‌فام‌و بێ عه‌قڵ داده‌نێ که‌ده‌یانپه‌رستن؟؟

﴿وَهُمْ بِذِكْرِ الرَّحْمَنِ هُمْ كَـافِرُونَ﴾ وه‌لحالّ ئـه‌و كافرانـه‌ بڕوایـان بـه‌و خودایـه‌ نـه‌بوو كـه‌ ئـه‌وانی دروسـت كـردوه‌، بـژێوی بـۆ فه‌راهـه‌م هێنـاون، نـازو نیعمـه‌تی به‌سـه‌ردا رشـتوون، واتـه‌: چۆن ئـه‌وان پێیـان سـه‌یره‌: كـه‌تۆ ره‌خنـه‌ لـه‌خوداكانیان ده‌گرێ به‌مه‌رجێ خوداكانیان شیاوی په‌رستش نین، خۆ بۆخۆیان بڕوایان به‌خودای بالاّده‌ستو به‌دیهێنـه‌ری بوونـه‌وه‌ر نیـه‌!؟ هه‌لۆێـستو بـیرو بـاوه‌ڕی ئـه‌وان جێگـای سه‌رسووڕمانه‌، نه‌ك هی تۆ! وێنه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌ ئایه‌تێكی تره‌: كه‌ده‌فه‌رموێ:

﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُواً أَهَذَا الَّذِي بَعَثَ اللَّهُ رَسُولاً، إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَـنْ آلِهَتِنَا لَوْلَا أَن صَـبَرْنَا عَلَيْهَـا وَسَـوْفَ يَعْلَمُـونَ حِـينَ يَـرَوْنَ الْعَـذَابَ مَـنْ أَضَـلُّ سَـبِيلاً﴾ (الفرقان/٤١-٤٢).

به‌كورتی ئه‌وان ره‌خنـه‌ له‌پێغه‌مبـه‌ر ﷺ ده‌گـرن له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ باسـی بتـه‌كانیان ده‌كـا: لـه‌كاتێك دا ئـه‌و بتانه‌سـوودو زیانیـان نیـه‌، به‌كـه‌ڵكی هـیچ نایـه‌نو هیـچیان له‌ده‌ست نایه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌وان بڕوایان بـه‌خودای به‌خـشنده‌و میهره‌بـان نیـه‌، باوه‌ڕیان به‌خاوه‌نی بوونه‌ور نیه‌. ئه‌وان جێگای ئـه‌وه‌ن گالّتـه‌یان پـێ بكرێ، ئـه‌وان شـیاوی ئـه‌وه‌ن ره‌خنـه‌یان لێ بگـیرێ چـونكه‌ كـاری نابـه‌جێ ده‌كـه‌نو هه‌ڵوێـستی ناشیرین ده‌نوێنن!! سه‌رباری ئه‌وه‌ش تابلّیی نه‌فامو ئه‌حمه‌قن وه‌كوو كه‌ری دێـز وان به‌تۆپینی خۆیانو زه‌ره‌ری خاوه‌نیان دلّخۆشن.

﴿خُلِقَ الإِنسَانُ مِنْ عَجَلٍ﴾ سروشتی ئاده‌میزاد له‌سه‌ر په‌له‌كردن داڕێژراوه‌، هـه‌ر ده‌ڵێـی په‌لـه‌كردن به‌شـێكه‌ له‌پێكهاتـه‌ی ئـاده‌میزاد، وه‌كـوو له‌ئایـه‌تێكی تـردا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ عَجُـولاً﴾ (الأسـراء/١١) ئـه‌وه‌تا موشـریكه‌كان به‌په‌لـه‌ بوون بۆ هاتنی عه‌زابی خودا، ده‌یانگوت: كوا ئه‌و عه‌زابه‌ی كـه‌ تـۆ هه‌ڕه‌شـه‌مان پـێ لێ ده‌كه‌ی بۆ نایه‌؟ كه‌ی دێ؟ بابێ.

﴿سَأُرِيكُمْ آيَاتِي﴾ له‌وه‌ بـه‌ولاوه‌ ئایـه‌تی خۆمتـان نیـشان ده‌ده‌م، نیـشانه‌ی واتـان نیشان ده‌ده‌م دان به‌خودایـه‌تی مـن دا بنـێن، بـڕوا به‌پـه‌یامی پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌م بكـه‌ن

﴿فَلا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ پەلەم لێ مەکەن، هەموو شتێك كاتی دیاری كراوی خۆی هەیە پێش و پاش ناكا، عەزابی بەپەلە پەخەتان دەگرێ و قوتارتان نابێ، لەگەڵ كاتی خۆی هات دواكەوتن و نەهاتنی نیە.

ئەو موشریكانە پەلە لەهاتنی عەزاب دەكەن و پرسیار دەكەن ﴿وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ ؟﴾ بەپێغەمبەرو ئیمانداران دەڵێن: ئەو هەڕەشەیەی لێمان دەكەن بەهاتنی عەزاب لەدونیاو قیامەت دا كەی دێ! ﴿إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ ئەگەر راست دەكەن دەی زوو بیهێنن، دەبابێ و بێ منەت بن.

پەروەردگار لەجیاتی وەڵامدانەوەیان دیمەنێكی رۆژی دوایان دەخاتە پێش چاوو دەفەرموێ: ﴿لَوْ يَعْلَمُ الَّذِينَ كَفَرُوا حِينَ لا يَكُفُّونَ عَنْ وُجُوهِهِمْ النَّارَ وَلا عَنْ ظُهُورِهِمْ وَلا هُمْ يُنْصَرُونَ﴾ ئەگەر ئەوان دڵنیا بوونایە لەوەی كە عەزابیان بۆ دێ و سزای سامناك دەیانگرێتەوە پەلەیان نەدەكرد، ئەگەر چۆنیەتی ئەو عەزابە سامناكەی دەوریان دەداو لەهەموو لایەكەوە تەنگیان پێ هەڵدەچنێ و ناتوانن لەخۆیانی دوور بخەنەوە لەبەری رابكەن، كەسیان دەست ناكەوێ یارمەتیان بداو رزگاریان بكا، وەڵامی (لو) حەزف كراوە واتە: ئەگەر عەقڵیان بەمە بشكایەو ئەم شتانەیان بزانیایە، لەسەر كوفرو بێدینی بەردەوام نەدەبوون، پەلەیان لەهاتنی عەزاب نەدەكرد!

بۆیە بەتایبەتی باسی دەم و چاوو پشتی كرد، چونكە ئازاری عەزاب لەم دوو شوێنەدا كاریگەر ترە.

نموونەی ئەم ئایەتە چەند ئایەتێكی ترە: كەدەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ (الزمر/١٦) یان دەفەرموێ: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ (الاعراف/٤١) یان دەفەرموێ: ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَى وُجُوهَهُمْ النَّارُ﴾ (ابراهیم/٥٠) ئاگرەكە لەهەموو لایەكەوە هێرشیان بۆ دێنێ و لەخۆیان دەگرێ.

ئەو نەفامانە نازانن ئەم سزا هەڕەشە پێ لێکراوەیان کەی بۆ دێ، نەکاتی هاتنەکەی دەزانن نەچۆنیەتەکەی دەزانن. ﴿بَلْ تَأْتِيهِمْ بَغْتَةً﴾ بەڵکوو لەناکاوو کوتو پڕ ئەو عەزابەیان بۆ دێو تێکیانەوە دەپێچێ، ﴿فَتَبْهَتُهُمْ﴾ سەرسامیان دەکاو سەرگەردانو واق وڕماو دەبن ﴿فَلا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا﴾ ناتوانن ئاگرەکە لەخۆیان دووربخەنەوە بیگێڕنەوە نەهێڵن بیانسوتێنێ ﴿وَلا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ نەمۆڵەتیش دەدرێن، تازە هەلیان لەکیس چووە، بەهیچ جۆرێ عەزابەکە دواناخرێ بۆ ئەوەی تەوبە بکەن، عوزر بێننەوە، ئەوەتا لەدونیادا مۆڵەتی داون، پێغەمبەری بۆ ناردون، ڕێگای ڕاستو ناراستی بۆ لێك جیاکردونەوە، هەڕەشەی لێ کردون، تەماعی بەرناون، ماوەی داون! جا کەئەوانە بەئەنقەست ئەم هەلەیان لەکیس خۆیان دا، ئیتر شیاوی بەزەیی نینو ئەو عەزابە لەناکاوە سزای پەلە کردنیانە بۆ عەزابەکە!

ئەمجار دڵنەوایی پێغەمبەری ﷺ کردو تەسەللای دایەوەو فەرمووی: ﴿وَلَقَدْ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ﴾ واتە: بێگومان گاڵتەو لاقرتێ بەپێغەمبەرانی پێش تۆ کراوە، ﴿فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ ئیتر ئەو سزایەی گاڵتەیان پێ دەهاتو بەقەشمەریان دەزانی، دەورەی دانو تێکیەوە پێچانو دوا بڕاوی کردن، ئەتۆش خەفەت مەخۆو دڵتەنگو تەنگاو مەبە بەگاڵتە کردنەکەیان، ئەوانیش سزای خۆیان وەردەگرنو بەسەریانەوە ناچێ. مۆڵەت دەدرێن، بەلام پاش گوێیان ناخەین! نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَى مَا كُذِّبُواْ وَأُوذُواْ حَتَّى أَتَاهُمْ نَصْرُنَا وَلاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ وَلَقَدْ جَاءكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ﴾ (الانعام/٣٤).

عەزابی ناگەهان هاتو عەقڵو هۆشی بردن، ویستو ئیرادەی پەك خستن، بیر کردنەوەو هەوڵدان بۆ ڕزگار بوونی لەبیر بردنەوە، مۆڵەتیشی نەدان بەخۆیاندا بچنەوەو تۆبە بکەنو عوزر بهێنەوە.

ئەوە عەزابی قیامەتەو عـەزابی دونیـاش تووشـی گاڵتەکـەرەکانی پێـشوو بـووە، جائەگەر بڕیاری خودا واهاتووە: کەئومەتی پێغەمبەری ئیسلام ریـشە کـێش نـەکاو بەعەزابی کۆکوژ لەناویان نەبا، ئەوە سـزای کوشـتن‌و بـەدیل گـرتن‌و نـاردنی بـەلاو موصیبەتی جۆراو جۆر بـۆ سـەریان بـەدوور نازانـدرێ! دەی بائەوانـە واز لەگاڵتـە کـردن بێـنن، بترسـن لـەئاکام‌و تۆڵـەی گاڵتـە کـردن، چـونکە ئاکـامی گاڵتەکـەران بەپێغەمبەران ئاشکرایەو نومایانـە، داب‌و نـەریتی خـودای لەسـەرەو خـاپور بـوون‌و لەناوچونی گاڵتەکەران بەخۆیان‌و ولاتیانەوە لەڕابووردودا باشترین بەڵگەیە لەسـەر ئەو راستییە.

## پارێزگاریی خودا بۆ ئادەمیزادو عەدالەتکاریی لەحیسابدا

﴿ قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ۗ بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا ۚ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۗ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ۚ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾

وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی رونکردەوە: کەکافرەکان لەدۆزەخ دا ناتوانن ئاگر لەدەمو چاویانو پشتیان دووربخەنەوە، توانای ئەوەیان نیە کە خۆیان لەشالآوی ئاگر قوتار بکەن، ئەوە رون دەکاتەوە کە لەژیانی دونیاش دا ئەوان بێ دەسەلآتو دەسەوەسانن، ناتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن. ئەگەر خودا پارێزگاریان نەکا بەسەلامەتیو بێوەیی نەدەمانەوەو نامێننەوە. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا ئەوە روون دەکاتەوە؛ کەئەو کافرانە بیر لەو بەلگەو دەلیلانە ناکەنەوە: کەشارەزاییان دەکا بۆ ئیمانهێنانو وازهێنان لەبتپەرستی. هەروەکوو چۆن دیاردەو ئاثاری قودرەتی خودا لەزەویو بوونەوەردا نابینن، هەروەکوو چۆن بیر لەوە ناکەنەوە: کەوا وردە وردە ولآتانی کوفر رزگار دەکرێ، خەلکی پۆل پۆل دێن بەرەو پیری ئایینو شارو شارۆچکەکان لەژێر چنگی کوفر دەردەهێنرێن، دەی ئەمەش پالپێوەنەرو هاندەرە بۆئەوەی زوو موسولمان ببن.

ئەمجار ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەرکی پێغەمبەر ﷺ راگەیاندنو ترساندنو موژدەدانە، زۆرە ملێو زەختکردن نیە. هەرچی بەسەر کافرو بێ بڕوایان دێ لەرۆژی قیامەت دا عەدالەتەو ستەمی تێدا نیە، تەرازووی خودا تەرازووی عەدالەتەو خوارو خێچی تێدا نیەو وردبینو ورد خوێندنەوەیە.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَنْ يَكْلَؤُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مِنَ الرَّحْمَنِ!﴾ ئەی موحەممەدا! بەوانە بڵێ: کێ شەو پارێزگاری ئێوە دەکا، کاتێ کەدەخەون کێ دەتانپارێزێ، یان بەرۆژ لەکاتی ئیش کردن دا کێ دەتانپارێزێ لەعەزابی خودا. ئەگەر خودا ویستی عەزابتان بۆ بنێرێ کێ فریاتان دەکەوێ.

کە دەفەرموێ ﴿مِنَ الرَّحْمَنِ﴾ ئاماژە بەئەوە دەکا کە دواکەوتنی عەزاب لەکافرو یاخی بووان رەحمەتو بەزەیی خودایە، بۆ ئەوەیە ئادەمیزاد بەخۆی دا بچێتەوەو تۆبە بکا.

﴿بَلْ هُمْ عَنْ ذِكْرِ رَبِّهِمْ مُعْرِضُونَ﴾. بەڵکوو ئەو کافرانە وێڕای ئەو هەموو بەڵگە عەقڵییانەی کە لەقورئان دا هەنو نیشانەی فەضلو نیعمەتی خودانو ئاماژە دەکەن بەپارێزگاریی خودا بۆ بەندەکان بەشەوو بەڕۆژ، کەچی ئەوان رویان وەرگێڕاوەو بیر لەنیعمەتەکانی خودا ناکەنەوە، ددان بەفەضل و گەورەیی بەدیهێنەرو پەروەردگاری خۆیان دانانێن.

ئەمجار بەشێوەیەکی تر پرسیارەکەیان ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ آلِهَةٌ تَمْنَعُهُمْ مِنْ دُونِنَا لا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ﴾ یان ئەوان چەند خودایەکیان هەیە جگە لەئێمە ئەوان پارێزگارییان دەکەن؟ نەخەیر وانیە، حاشا ئەو شتانەی ئەوان بەخودایان دەزانن، توانای ئەوەیان نیە یارمەتی خۆیان بدەن، چ جای یارمەتی کەسانی تر، ﴿وَلا هُمْ مِنَّا يُصْحَبُونَ﴾ لەلایەن ئێمەیشەوە کۆمەگی ناکرێن، هاوکاریی ناکرێن بەیارمەتیدان، وەکوو یارمەتی حەزرەتی موساو هارونی دا فەرمووی ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾.

ئەو خودا درۆزنانەی ئەوان بێ هێزو بێ دەسەلاتن، نەخۆیان دارای هێزن نەلەخوداوە یارمەتیان دەدرێ، کەواتە دەستە پاچەو پەك کەوتوون.

دوای ئەم لێکۆڵینەوەو موناقەشە کردنە لەگەڵ بتپەرستەکان کەپڕو پووچی بیرو باوەڕەکەیانی خستە رو، ئاشکرا بوو کە هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیو نەقلیان

بەدەستەوە نیە، سیاقی قورئانەکە واز لەموناقەشەو دەمە دەمێ دێنێ لەگەڵیان‌و باسی ئیمان نەهێنانەکەیان رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿بَلْ مَتَّعْنَا هَؤُلاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى طَالَ عَلَيْهِمُ الْعُمُرُ﴾ نەخەیر پێتان وانەبێ ئەوانە خودای وایان هەبێ بەشەوو بەرۆژ بیانپارێزێ، بەوە لەخۆیان بایی بووبن‌و لەخودا یاخی بووبن. بەڵکوو ئەوەی ئەوانی والێکردوە یاخی ببن‌و لەخۆیان بایی بن‌و هەڵیناون بۆ گومرابوون ئەوەیە ئێمە ئەو کۆمەڵەو باوک‌و باپیرانیانمان خستونە لەمزەت‌و خۆشییەوە، نازو نیعمەتیان بەسەردا رژاوەو ماوەیەکی دوورو درێژ بەم حاڵە ژیانیان بەسەر بردوە، بەو تەمەن درێژییە وادەزانن مردن‌و ژیانیان بەدەست خۆیانەو خۆیان رەخسێنەری ئەو بارو دۆخەن‌و ئەو خۆشی‌و کامەرانیەی وان تێ یدا بەهۆی ئەو بیرو باوەڕەوەیە کە: پەیڕەوی دەکەن کەوابێ نابێ ئەوان وازی لێ بێنن !!

بێگومان نازو نیعمەتی جۆراو جۆرو درێژ خایەن، تەمەنی درێژو لەشساغی، بەتایبەتی کەبە میرات لەباوک‌و باپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە سروشتی تێک داون، دڵ‌و دەروونی بێ ئاگا کردون لەیادی خودا، عەقڵ‌و هۆشی لەسەرنج دان‌و بیر کردنەوە لەئایاتی خودا لاداون، نوقمی خەوی غەفڵەت بوون جا وابێداریان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿أَفَلا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ ئایا نابینن کەئێمە دێین خاک‌و زێدی بێ بڕوایان لەهەر چوارلاوە کەم دەکەینەوە رۆژ بەرۆژ موسوڵمانان پەل دەهاون‌و بەرەبەرە خەڵکی موسوڵمان دەبن‌و وڵاتی کوفر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی خودا پەرستانەوە. ئەوەتا پاش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینەو دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی، خاک‌و وڵاتی کوفر بەرەبەرە تەسک دەبێتەوە خاکی ئیسلام فراوان دەبێ، موسوڵمانەکان زاڵ دەکەین‌و وڵاتی ئەوانیان دەخەینە ژێر دەست. ﴿أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ ؟﴾ ئایا هێشتا ئەوان خۆیان بە بالادەست‌و سەرکەوتوو دەزانن، ئایا ئێمە بالا دەستین یان ئەوان؟ ئەدی چۆن خۆیان

بەسەرکەوتوو دەزانن؟ پرسیارەکە بۆ چەسپاندنو سەرکۆنەکردنە. واتە: با وانەزانن دان بەواقیع دا بنێنو چی دی سەرکێشی نەکەن.

هەندێ لەزانایانی سەردەم پێیان وایە: ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کەئەملاو ئەولای گۆی زەوی لەباکوورو باشورییەوە بەردەوام لێی کەم دەبێتەوەو دەچێتەوەیەك.

ئەمجار دوای ئەوەی پەروەردگار لەقورئان دا بەڵگەی جۆراو جۆری هێنانەوە، لەسەر تاكو تەنهاییو باڵادەستی خۆیو جەختی کردەوە، بەشوێن ئەوەدا فەرموی: ﴿قُلْ إِنَّمَا أُنذِرُكُمْ بِالْوَحْيِ﴾ ئەی پێغەمبەر! بەو موشریکانە بڵێ: ئەوەکوو دەتانترسێنم ئیللا کە دەتانترسێنم بە قورئان دەتان ترسێنم کەنامەی خودایەو من تەنها راگەیاندنم لەسەرە، من لەخوداوە دەتانترسێنم لەسزاو عەزابی قیامەت، وامەزانن: من دەتوانم عەزابتان بۆ بێنم، بەڵکوو خودا بۆتان دەهێنێو فەرمانی بەمن کردوە: کەبەو عەزابە هەڕەشەتان لێ بکەمو لەو سزایە بتان ترسێنم، کاری من تەنها پێراگەیاندنە، نەك سەپاندنو مل پێ کەچ کردن، جانەگەر بەپیر بانگەوازییەکەمەوە نەیەن ئەوە خۆتان بەر پرسیارنو ئۆباڵی خۆتان بەئەستۆی خۆتان.

﴿وَلَا يَسْمَعُ الصُّمُّ الدُّعَاءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ﴾ ئەم نیگاو سروشە سوودی نیە بۆ کەسانێك چاوی دڵیان کوێر بووبێو دڵیان مۆرکراوە گوێچکەیان هاخندراوە، ئەوانە وەکوو کەڕو لاڵێك وەهان کە هیچ نەبیسێو تێ نەگا، چونکە مەبەست بەترساندنو هەڕەشەکە خودی بیستنەکە نیە، بەڵکوو کارپێکردنو پەیڕەو کردنیەتیو پابەند بوونە بەناوەڕۆکی بیستراوەکەو ئەنجامدانی ئەرکی پێویستو ناسینی حەق، خۆپاراستن لەشتی یاساغ، جاکەئەم مەبەستانە نەهاتنەدی ئیتر خودی بیستنەکە چ سوودێکی تێدا نیە. ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کەلەوە بەولاوە حاڵو وەزعیان دەگۆڕێو وایان لێ دێ ئەو عەزابەی هەڕەشەیان پێ لێدەکرێ کاریگەر دەبێ تێیانداو دان بەو شتانەدا دەنێن کەسوودیان لێ وەرناگیرێ!! دەفەرموێ: ﴿وَلَئِنْ

مَسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ ئەگەر کەمێك لەعەزابی خودای تۆ رۆژی قیامەت بکەوێتە سەرئەوانەی ئێستا تۆ بەدرۆ دەخەنەوە، یەکسەر دان بەتاوانی خۆیاندا دەنێن‌و دەڵێن: هاوار بۆ خۆمان‌و ماڵوێران خۆمان، ئێمە لەدونیادا ستەممان لەخۆمان کرد، پەنجەی پەشیمانی دەگەزن‌و هاواریی قوڕبەسەریی خۆیان دەکەن بەڵام چ سوودا!؟

ئەمجار پەروەردگار ئەوە روون دەکاتەوە کە هەرچی لەقیامەت دا بەسەریان دێ، هەر سزاو تۆڵەیەکی لێیان دەسەندرێ عەداڵەتکاری‌و دادپەروەرییە دەفەرموێ: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا﴾ رۆژی قیامەت تەرازووی عەداڵەتکاریی دادەنێین، ئەو تەرازوەی نامەی ئەعمالی پێ دەکێشرێ، چاکەو خراپەی هەموو ئادەمیزادێك کێشانە دەکرێ، کەس ستەمی لێ ناکرێ، هەرچەندە ئەوان بۆخۆیان لەدونیادا ستەمیان لەخۆیان کردوە، وەلێ لەرۆژی قیامەت دا کەس هیچ ستەمێکی لێ ناکرێ، هەموو کەس بەگوێرەی کردەوەکانی سزای دەدرێ‌و پاداش وەردەگرێتەوە.

زۆربەی زۆری زانایان پێیان وایە ئەو ئامێرەی نامەی ئەعمالی پێ کێشانە دەکرێ یەك ئامێرە، کەبەکۆ هێنراوە لەم رووەوەیە: کەئەو شتانەی کێشانە دەکرێن زۆرو هەمە جۆرن!

مەبەست بەدانانی مەوازین تاوتوێ کردنی حیسابە، دیاریکردنی کاری چاکەو کاری خراپەیە، سزادانەوەو پاداشدانەوە بەگوێرەی کردەوەکان بەشێوەی عەداڵەتکاری‌و بەویژدانانە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك بەئەندازەی گەردیلەیەك ستەمی لێ بکرێ، کەوابێ مەبەست لە کێشانە کردن، عەداڵەتکارییە لەحیساب‌و لێکۆڵینەوەو سزادان‌و پاداش وەرگرتنەوەدا. دیمەنی ئەوکارەی لەدانانی تەراوزوی کێشانە کردن دا نیشان داوە.

هەندێ لەزانایانی سەلەف پێیان وایە مەبەست بە (موازن) تەرازووی حەقیقییەو کردەوەکانی تریشی پێ دەکێشرێ حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئەو

ئامێره تەرازویەکە دوو باڵو زمانێکی هەیە، هەرکەسێك لای چاکەی قورس تر بێ لەلای خراپەی ئەو رزگار بووە، کەسێکیش لای خراپەی بەسەر لای چاکەی پاساوی هەبێ، بەهیلاکچووەو ماڵوێرانە.. ئەو تەرازووە خوارو ژووری تێدا نیەو گزیو دزی تێدا ناکرێ، وەکوو تەرازووەکانی دونیا نیە فێڵی تێدا بکرێ.

﴿وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا﴾ ئەگەر ئەو کردەوەی ئادەمیزاد ئەنجامی داوە بەئەندازەی دەنکە خەردەلەیەك بێ ئامادەی دەکەینو دەیخەینە ناو حیسابو بەتەرازوی عەداڵەتکاری خۆمان کێشانەی دەکەین. بەعەداڵەتو ویژدانەوە پاداشو سزای لەسەر دەدەینەوە.

﴿وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ کیفایەتە کە ئێمە ژمێریاری کردەوەی بەندەکان بین، کەس لەخودا زاناترو ئاگادارتر نیە بەکردەوەی بەندەکانی، کەس لەخودا دادپەروەر ترنیە بەتۆڵە لێ ستاندنەوەو پاداشدانەوەیان، ئەمەش هەڕەشەیەکی توندو تیژە لەکافرو یاخی بوو گاڵتەکەرو سەرپێچیکارانی دەکا.

دەی باهەموو ئادەمیزادێك بڕوانێ چی بۆ رۆژی قیامەت بەتێشوو ناردوە، بەدڵ گوێ بۆ ترسێنەر بگرێو بێ ئاگاو پشت هەڵکەرانوگاڵتەکەران پەلە بکەن بۆ تۆبە کردنو ئیمانهێنان، پێش ئەوەی عەزابی هەڕەشە پێ لێکراو بێتەدی، جا لەدونیادابێ یان لەقیامەت دا بێ، خۆئەگەر ئەوان لەعەزابی دونیا رزگاریان بێ، ئەوە عەزابی قیامەت لەپێشیانەو تەرازووی عەداڵەتکاری ئامادە کراوە، کردارو گوفتاری ئادەمیزادەکان کێشانە دەکرێو بەگوێرەی کردەوەکانیان سزایان لێ دەسەندرێو پاداشیان دەدرێتەوە.

ئاوا قورئانی پیرۆز ئامێری کێشانەی رۆژی قیامەت کەزۆر وورد خوێنەرەوەیە پەیوەست دەکا بەقانونو یاسا وردەکانی بوونەوەرەوە، بەدابو نەریتی دەعوەو بانگخوازییەوە، بەسروشتو ژیانی ئادەمیزادەوە، هەموویان پێکەوە دەبەستێتەوە، پێکەوەو بەیەکرێزیو گونجاوی لەدەستی قودرەتی خودادا نمایش دەکرێنو دەبنە

نیشانەی قەضیەی تاكو تەنهایی خودا، ئەمجار دێتەسەر سەرگورشتەو چیرۆكی پێغەمبەران و بەسەرهاتی ژمارەیەك لەفروستادەكانی دەگێڕێتەوە:

## چیرۆكی حەزرەتی موسا ﵇

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَـٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَـٰهُ ۚ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار لەئایەتەكانی پێشوودا فەرمانی بەحەزرەتی موحوممەد ﷺ كرد: كەبەگەلەكەی بلێ: ﴿إِنَّمَا أُنذِرُكُم بِالْوَحْيِ﴾ بەشوێن ئەوەدا ئەوە روون دەكاتەوە كە ئەركی بانگخوازیو پەیام گەیاندن دابو نەریتی خودایە لەناو پێغەمبەرانیدا، بێگومان ئەوانیش نیگایان بۆ هاتووە، بۆئەوەی ناوەرۆكی شەریعەتەكەیان ببێتە هۆكاری هیدایەتی ئادەمیزاد.

ئیتر پاش ئەوەی بەڵگەی تاكو تەنهایی خوداو راستی پیغەمبەرایەتیو هاتنی رۆژی قیامەتی رانواندن، دەست دەكا بەگێڕانەوەی چیرۆكی پێغەمبەران (درودی خودایان لەسەر بێ) بۆ دڵدانەوەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ تاخۆڕاگر بێ لەبەرامبەر ئەزیەتدانی گەلەكەیو بۆ بەهێز كردنی دڵو دەروونی لەسەر ئەنجامدانی پەیامەكەیو پشوودرێژی لەسەری. یەكەم چیرۆكیش لەو چیرۆكانە چیرۆكی حەزرەتی موساو هاروونە (دروودی خوایان لەسەر بێ) زۆر جار قورئانی پیرۆز بەرامبەریو پێك گرتن دەخاتە نێوان پەیامی حەزرەتی موسا﵇ و پەیامی

حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ﷺ موقارەنه دەکا لەنێوان تەورات‌و قورئان دا، بۆ ئەوەی ئەو راستییه دووپات بکاتـەوه کـه پەیوەنـدیی پێغەمبەرایـەتی‌و سـروش‌و نیگا لـەنێوان پێغەمبەران دا بنەڕەتییەو لێکچوونێکی ئاشکرا لـەنێوان تـەوراتی دەسـت لێ نـەدراوو نەگۆڕدراوو قورئان دا هەیە لەبواری شەریعەت‌و عەقیدەو عیبادەت دا، دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْراً لِلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: سوێند بـەزاتی (الله) ئێمـە نامەیـەکی ئاسمـانی تێـرو تەسـەل‌و گشتیمان داوە بەموسـاو هـارون (علیهمـا السلام) ، ئەو نامە ئاسمانییە بریتییە لە تەورات: کەنامەیەکە حـەق‌و بـەتاڵی لێـك جیاکردۆتەوە، حەڵاڵ‌و حەرامی ئاشکرا کردوە، هەروەها تـەورات چـرایەکە رونـاکی دەبەخـشی لـەتاریکی نـەزانی‌و سـەر لێ شـێواویدا بـۆ ئـەوەی ئـادەمیزاد بگەیەنێتـە رێبـازی هیدایـەت‌و رزگـار بـوون. هـەروەها تـەورات نامـەی پەنـدو ئامۆژگارییـە، تەقواکاران پێی پەند ئامێز دەبن‌و خودای خۆیان دەناسـن‌و بەندایـەتی دڵسۆزانەی بۆ دەکەن. ئەمجار رەوشتی تەقوا کاران نمایش دەکاو یەکەیەکە رایانـدەنوێنێ.

**١- ترسان لەخودا بەنهێنی‌و پەنامەکی:**

﴿الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ﴾ واتـە: تـەقواکاران ئەوانـەن بـەنهێنی لـەخودای خۆیـان دەترسـن، بـەگوێرەی فـەرمان‌و نەهیـەکانی خـودا هـەڵس‌و کـەوت دەکـەن، لەحاڵەتی نهێنی‌و لەخەڵوەتخانەی تەنهاییدا، لەوکاتەدا کە کەس چاوی لێیان نیـەو دیاردەی ریابازیی لەگۆڕێ نیە ئـەوان بەدڵسۆزیی خـودا پەرسـتی خۆیـان دەکـەن‌و ترسی خودایان لەدڵدایە.

بێگومـان چـەند جارێـك لـەقورئان دا جـەخت لەسـەر بـەنهێنی لـەخوا ترسـان کراوەتەوە، ئەومانایە دووبارەو سێ بارە بۆتەوە.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَن بِالْغَيْبِ وَجَاء بِقَلْبٍ مُنِيبٍ﴾ (ق/٣٣) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾ (الملك/١٢).

**٢- دووەم رەوشتی تەقواكاران، ترسانیانە لەرۆژی قیامەت:**

وەكوو دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ مِنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ﴾ ئەوان لەقیامەتو تەنگو چەڵەمەكانی دەترسن، لەحیسابو راگرتنو پرسیارو لێكۆڵینەوەی ئەو رۆژە دەترسن، دڵە لەرزمیانەو هەمیشە لەیادیانە..

جا ئەگەر تەورات نامەیەكی واپەسنو بەسوود بووبێ بێگومان قورئانیش لەهەمان سەرچاوەوە هاتووەو هەمان تایبەتمەندی تێدایە، ﴿وَهَذَا ذِكْرٌ مُبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ﴾ ئەم قورئانە بۆسەر تۆ نازڵ كراوە، پەندو ئامۆژگاری لەخۆ گرتووە، یاد خەرەوەیە بۆتان، نامەیەكی بەرزو پیرۆزە، پڕ خێرو فەڕو بەرەكەتە، رێبازی راستو رەوانتان نیشان دەدا، ﴿أَفَأَنْتُمْ لَهُ مُنكِرُونَ﴾ ئایا ئێوە چۆن ئینكاری ئەم كتێبە بەسوودە دەكەن، بەچ عەقڵێك دژایەتی دەكەنو نایەنە ژێر ركێفیەوە، چۆن پشت لەم نامە ئاشكراو رەوانە هەڵدەكەن؟ ئەم قورئانە پیرۆزەی: كەموعجیزەو سەرئاسایە لەرووی رەوانبێژیو داڕشتنیەوە، لەبارەی لەخۆگرتنی بەڵگەی عەقڵیو رونكردنەوەی یاساو شەریعەتەوە، لەهەموو رویەكەوە كتێبێكی ناوازەو بێ وێنەیە، دەی كەوابێ ئێوە چۆن ئینكاری ئەوە دەكەن: كەئەم قورئانە لەخوداوە هاتووە؟ خۆئێوە لە هەموو كەس باشتر شارەزای رەوانبێژیو زمانڕەوانیو نوسلوبی تۆكمەو داڕشتنی بەهێزو پێزن !!

## چیرۆكی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ

### ١- دژایەتیكردنی بەتپەرستیو بانگەوازیكردنی بۆ یەكتاپەرستی

﴿ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ

لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّواْ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾

ئەمە چیرۆکی دووەمی ئەم سورەتە پیرۆزەیە، پەروەردگار بۆ پێغەمبەری ﷺ دەگێڕێتەوە: بەمەبەستی تەسەللا هاتنی پێغەمبەر ﷺ و هەموو بانگەوازکارێکی ئایینی، بۆئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بکەنە مامۆستاو نموونەی خۆڕاگری‌و پشوو درێژی لەپێناو ئایینی خوداداو بانگەوازیکردن بۆ ئایینی حەق‌و دژایەتی موشریك‌و بێ بڕوایان. دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِنْ قَبْلُ﴾ واتە: سوێند بە(الله) بێگومان ئێمە زۆر پێش موساو هارون ئیبراهیممان شارەزاکرد بۆ ڕێبازی حەق‌و خێرو خۆشی، تەوفیقمان دا بۆ پابەند بوون بە یەکتاپەرستی‌و دژایەتی کردنی بتپەرستی، ڕێبازی ڕاستمان بۆ ڕون کردەوەو، لەناو نەتەوەکەیدا لەبتپەرستی ڕزگارمان کرد، ﴿وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ﴾ ئێمە زانابووین بەچۆنیەتی ئەوو دەمانزانی: کەشیاوی پێغەمبەرێتییە، دەمانزانی خاوەنی بیرو باوەڕی تەواوو

لێبڕاوە بۆ خودا پەرستی، دەمانزانی خاوەنی ڕەوشتی بەرزو پیاوێکی بەرزو دامەزراوە.

(الفراء) دەفەرموێ: مانای (من قبل) واتە: پێش بوونی بەپێغەمبەر، نەك پێش موساو هارون. کەواتە: دەبێ ئایەتەکە ئاوا مانا بکەین: بێگومان ئێمە لەپێش پێغەمبەرێتیدا ئیبراهیممان هیدایەت دا بۆ تێفکرین و بەڵگە هێنانەوە، وەکوو ئەوە: کەشەوی بەسەردا هات ئەستێرەو مانگ و دوایی خۆری بینی و لەتێفکرین لەوانەوە گەییشتە خودا ناسین و یەکتاپەرستی.. زۆربەی زۆری ڕاڤەکەرانی قورئان تەفسیری یەکەمیان بەلاوە پەسندە.

﴿إِذْ قَالَ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ ؟﴾ وشەی (اذ) یان موتەعەلیقەبە (آياتنا) یان بە (رشده) یان بەوشەیەکی مەزندەکراو واتە: ژیریمان پێ بەخشی کاتێك ناڕەزامەندیی خۆی دەربڕی بەرامبەر بەندایەتی کردن بۆ بت و صەنەم، وتی: ئەم پەیکەرە بێ گیانانە چین ئێوە خۆتان بەسەردا کوشمەڵە کردوون؟ لێیان کۆبوونەوەو پەرستشیان بۆ دەکەن؟؟

هەڵبەتە حەزرەتی ئیبراهیم ویستی بەم پرسیارە بەهۆش خۆیان بێنێتەوە، بەهەست و شعورەوە تێیان بفکرن، لەهەمان کات دا بەبێ ڕێزی زانین و پرسیارەکەی واکرد: کەخۆی نەزان کردوە لەناسین و حەقیقەتیان، ئاماژە بەوەش دەکا: کەئەمان ئەگەر تۆزێك لێیان ورد ببنەوە دەزانن: کەئەم بەردو دارە بێ گیانانە هیچیان لەدەست نایەو بەکەڵکی هیچ نایەن، بەڵام ئەوان سوور بوون لەسەر لاسایی کردنەوەو شوێنکەوتنی کوێرانە بۆ پێشینانیان ﴿قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ﴾ ئازەرو گەلەکەی تێکڕا وتیان: بێگومان ئێمە هیچ بەڵگەو دەلیلێکمان لەم بارەوەنیە جگە لەوەی باوك و باپیری خۆمانمان دیوە ئەم شتانەیان پەرستوەو بەندایەتیان بۆ کردون، ئێمەش لاسایی ئەوان دەکەینەوە.

بەڕاستی ئەوە وڵامێکی نەفامانەیەو نیشانەی مێشك وشکیو گێلییە، خۆیان پێوەندی زنجیری لاسایی کردنەوە دەکەن، سەربەستی ئیمانو باوەڕیان وەلا ناوە، وازیان لەتێفکرینو وردبوونەوەی ڕەها هێناوە، نەهاتوون شتەکان نرخی خۆیان بدەنێو واز لەلاسایی کردنەوەی کوێرانە بهێنن، چونکە بڕوا بەخودا رزگار بوونە لەو شتانەی بەخەیاڵ بەپیرۆزیان دادەنێنو بێ بەڵگەو نیشانە قودسیەتیان داوەنێ.

حەزرەتی ئیبراهیم بێ پەروا ناشیرینی بیرو باوەڕو کردەوەیانی ڕاگەیاندو سەرزەنشتی کردن ﴿قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ وتی: ئێوەو باوكو باپیرانتان لەگومڕایی ئاشکرادا بوونو لەڕێبازی حەق لاتان داوەو ستەمتان لە خۆتان کردوە، مەنهەجو ڕێبازتان ناحەقەو ناراستو نارەوایە، بەندایەتیکردنی باوكو باپیرانتان بۆ ئەو بتانە ئەوە ناگەیەنێ کەئەوبتانە شیاوی پەرستن بنو قودسییەتیان پێ بدرێ.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەڕای پروپوچو بیرو باوەڕی هەڵەو نادروست بەکۆنیو تێپەڕ بوونی ڕۆژگار بەسەریدا بەراست ناگەڕێ، شت: کەهەڵە بوو هەمووکاتێ هەڵەیە، مێژوو ناتوانێ شتی غەڵەت بەهۆی کۆنیو تێپەڕ بوونی ڕۆژگاری دوورو درێژ بخاتە قاڵبی ڕاستی یەوە..

جا کەحەزرەتی ئیبراهیم بەم شێوە ڕاشکاویو ئاشکراییە بەرەو ڕویان بووەوە، ئاوا بڕیاری خۆی بەرامبەر بتەکانیانو بەندایەتی بۆکردنیان دەربڕی، بتپەرستەکان سەریان سوورماو پرسیاری خۆیان ئاراستەی حەزرەتی ئیبراهیم کردو ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ؟﴾ وتیان: ئەم قسانە چین دەیانکەی ئیبراهیم؟؟ ئایا بەگاڵتە وادەڵێ ی: یان بەراستتە، ئێمە لەوە پێش قسەی لەم جۆرەمان نەبیستوون، یەکەمجارە شتی ئاوامان بەرگوێ بکەوێ!

ئەمە پرسیاری کەسێکە بیرو باوەڕی دامەزراوی نەبێ، دڵنیا نەبێ لەمەنهەجو ڕێبازی خۆی. لەکارخستنی فیکرو گیان بەهۆی کاریگەریی لاسایی لەسەریان نازانن چ بیرو باوەڕێك ڕاستەو شیاوە. عیبادەت دەبێ لەسەر یەقینو دڵنیایی خۆی

دابمه‌زرێنێ نه‌ك له‌سه‌ر وه‌هه‌و خه‌یاڵ پلاو. بۆیه راڕاو گومڕاو سه‌ر لێ شێواون. له‌وه‌ڵامی ئه‌و پرسیاره‌یدا حه‌زره‌تی ئیبراهیم به‌دڵنیایی‌و دڵ پڕ له‌ئیمانه‌وه پێی گوتن: ﴿قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ﴾ به‌ڵكوو خودای من‌و ئێوه‌ش خودای ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه، خودای ئێوه ئه‌و خودایه‌یه به‌دیهێنه‌ری ئاسمانه‌كان‌و زه‌وییه، خودای هه‌موو بوونه‌وه‌ره، به‌دیهێنه‌ری هه‌موو شتێكه، له‌نه‌بووه‌وه بوونه‌وه‌ری به‌دهێناوه. هه‌ر ئه‌و خودایه‌و كه‌سی تر شیاوی خودایه‌تی نیه ﴿وَأَنَا عَلَى ذَلِكُمْ مِنْ الشَّاهِدِينَ﴾ واته: من شایه‌تی ده‌ده‌م: كه‌جگه له‌خودا هیچ خودای تر نین... شتێكی ئاشكرایه شایه‌تی له‌سه‌ر شتێك ده‌درێ كه‌شایه‌ته‌كه ئاگاداری بێ، ده‌ی خۆ حه‌زره‌تی ئیبراهیم ﷺ دروستكردنی ئاسمانه‌كان‌و زه‌وی‌و خۆی‌و گه‌له‌كه‌ی به‌چاو نه‌دیوه، وه‌ڵێ شته‌كه ئه‌وه‌نده ئاشكراو نمایان‌و راست‌و دروسته، ئه‌وه‌نده به‌ڵگه‌ی به‌هێزو ئاشكرای له‌سه‌ر هه‌ن، وای لێ هاتووه، خاوه‌ن باوه‌ڕان به‌دڵنیاییه‌وه ده‌توانن شایه‌تی له‌سه‌ر بده‌ن، حه‌زره‌تی ئیبراهیمیش دڵنیایی له‌وباره‌وه گه‌یشتبوه راده‌یه‌ك وه‌كوو ئه‌وه به‌چاوی خۆی دروستكردنه‌كه‌ی بینیبێ وابوو. بۆیه به‌دڵنیایی خۆی برده ریزی شایه‌تیده‌رانی ئه‌و واقیعه.

بێگومان بوونه‌وه‌ر به‌گشتی تێكڕا دان ده‌نێ به‌تاك‌و ته‌نهایی خودای به‌دیهێنه‌رو هه‌ڵسوڕێنه‌ردا، هه‌رچی له‌كیانی ئاده‌میزاددا هه‌یه هوتاف هه‌ڵده‌داو ئیعتراف به‌تاك‌و ته‌نهایی به‌دیهێنه‌ر ده‌كاو یه‌كیه‌تی یاساو رێسای بوونه‌وه‌ر راده‌گه‌یه‌نێ.

به‌كورتی حه‌زره‌تی ئیبراهیم ﷺ ئه‌وه‌ی راگه‌یاند كه: ئه‌و جیدییه له‌راگه‌یاندنی حه‌ق‌و راستی‌داو به‌گوفتار تاك‌و ته‌نهایی خودای به‌گوێی گه‌له‌كه‌ی دا داو بێ په‌روا بانگی یه‌كتاپه‌رستی هه‌ڵداو بته‌كانی به‌بێ بایه‌خ دانان‌و به‌بێ گیان‌و سوودو هه‌ستی نرخاندن.

ئه‌مجار ویستی به‌كرده‌وه‌ش بێ نرخی بته‌كانیان به‌رجه‌سته بكا، بریاری دا ئابڕوی بته‌كانیان به‌رێ‌و له‌هه‌ل‌و فرسه‌تێكی گونجاودا ووردو خاشیان بكا، بۆیه

له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی ئه‌و كاره سوێندی خواردو بڕیارو نیازی خۆی به‌و سوێنده جه‌خت كردەوه، هەندێك لەنەتەوەكەی ئەم سوێند خواردنەی ئیبراهیمیان گوێ لێ بوو، بەڵام بەهەندیان نەگرتو پێیان وانەبوو ئیبراهیم ﷺ بەتاقە سواره جەسارەتی ئەوه بكا. هەڵبەتە نەدەكرا حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ لەپێشچاوی نەتەوەكەی ئەتكی بتەكان بكا، بۆیە چاوەڕوانی هەلی گونجاوی كرد كە بریتی بوو لەهاتنی جەژنی نەورۆز؛ بۆئەنجامدانی ئەو كارە گرنگە جەژنی نەورۆزی هەڵبژارد، چونكە لەو رۆژەدا ئەو نەتەوە باویان وابوو هەمویان بەخاوو خێزانەوە بەكۆمەڵ لەشار دوور دەكەوتنەوەو دەچوونە سەیرانو رابواردنو دوور لەبتەكانیان ماوەیەك كاتیان بەسەر دەبرد، دوایی دەگەڕانەوە بۆلای بتەكانیانو سوژدەیان بۆ دەبردن! بۆیە حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ پێش هاتنی ئەو رۆژە بڕیاری كۆتایی داو فەرمووی: ﴿وَتَاللَّهِ لأَكِيدَنَّ أَصْنَامَكُمْ بَعْدَ أَنْ تُوَلُّوا مُدْبِرِينَ﴾ سوێندم بەخودا دەبێ ئەوپەڕی هێزو توانای خۆم بەكار بێنم بۆ تێكشكاندنی بتەكان.

سوێندو بڕیارم وابێ دەبێ دوای ئەوەی ئێوە بتەكانتان بەجێ هێشتنو پشتان تێ كردنو رۆیشتن بۆ ئەنجامدانی جەژنی ساڵانەتان، دەبێ شتی خراپ بەسەر بتەكانتان بهێنمو پەنیان پێ بدەم!

دەڵێن: هەندێكیان گوێیان لەم سوێندەی ئیبراهیم بوو، دوایی خەبەریان لێدا، وەكوو لەشوێنێكی تردا قورئان ئاماژەی پێ دەكاو دەفەرموێ: ﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ﴾ (الأنبياء/٦٠).

بەهەرحاڵ نەورۆز هاتو هەلی زێڕین بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ نزیك بۆوە، خەڵكەكە هەموو بەتێكڕا بەپێی دابو نەریتی خۆیان بەرەو شوێنی سەیرانگا كەوتنە ڕێو شاریان بەجێ هێشت، حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بەبیانوی نەخۆشیەوە خۆی پاش داو لەگەڵیان نەچوە دەرو لەناو شاردا مایەوە بۆ ئەنجامدانی كاری سوێند لەسەر خوراوی. ویستی پیلانی داڕێژراوی بەعەمەلی بێنێتەجێ، بەڵكوو گەلەكەی واز لەبتپەرستی بهێنن، كاتێك بەچاوی خۆیان ببینن

بتەکانیان تارو مارکراونو نەیانتوانیوە بەرگری لەخۆیان بکەن، چونکە بەڵگەی عەمەڵی کاریگەرترە لەدڵو دەروون داو سەرنج راکێش ترە بۆ تێفکرینو وورد بوونەوە.

ئیتر هەرلەگەڵ شار چۆڵ بوو حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ تاوی دایە تەورێكو کەوتە تێکشکاندنی بتەکانو ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَاذاً إِلاَّ كَبِيراً لَهُمْ﴾ جگە لەبتە گەورەکەیان ئەوانی تری هەموو پارە پارە کردنو کردنیە پارچە پارچەی بێ سەروبەر بتەڤەبارە گەورەکەیانی هێشتەوەو تەورەکەی خستەسەرشانی ئەو ﴿لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ﴾ بەڵکوو ئەو گومڕایانە بگەڕێنەوە بۆلای ئەو بتەگەورەو لێی بپرسن ئەو رووداوە چۆن رویداو بۆچی بەرگری لەبتە بچوکەکان نەکرد! ئەمجار لەم رووەوە بەخۆیاندا بچنەوەو هەست بەنەفامیو بێ عەقڵی خۆیان بکەنو بزانن: پەرستنی ئەم بتانە چەند کارێکی پوچەو ئەگەر شتێکیان پێ بکرایە دەبوو بەرگری لەخۆیان بکەن!

یان راناوی (الیه) دەگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم ﷺ . واتە بەڵکوو کەهاتنەوە بگەڕێنەوە بۆلای ئیبراهیمو تارو مارکردنی بتەکانیان پاڵ ئەو بدەنو ئەویش بۆلافرتێو گاڵتە پێکردن بیبڕێ بەسەر بتە زلحۆرتەکەدا، بەڵکوو

بەم هۆیەوە بەخۆیاندا بچنەوەو بۆیان دەربکەوێ کەئەو بتانە بەکاری هیچ نایەنو بەرگری لەخۆشیان ناکەنو سەرەنجام ئیمان بهێنن.

یان راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ خودا. واتە: بەڵکوو بۆ یەکتاپەرستی خودا بگەڕێنەوە، کاتێ لێیان مەعلووم بوو خودا درۆزنەکانیان هیچیان بۆناکرێ، بەخۆیاندا بچنەوەو ئیمان بهێنن.

## ٢- دەمەدەمێو موجادەلە لەنێوان حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ و گەلەکەیدا دوای رووداوی شکاندنی بتەکانیان

﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٥٩ قَالُواْ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۝٦٠ قَالُواْ فَأْتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ۝٦١ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۝٦٢ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ۝٦٣ فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٦٤ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ۝٦٥ ﴾

دوای تەواو بوونی ئاهەنگ، گەلەکە گەڕانەوە بۆلای خوداکانیان، بۆئەوەی سوژدەیان بۆ بەرن‌و قوربانی‌و جەژنە پیرۆزەیان پێشکەش بکەن! کەهاتنەوە چ ببینن؟ بتخانە شێواوە، جگە لەبتە زلحۆرتەکەیان ئەوانی دی هەموویان تارو مار کراون! بەڵام نەهاتن پرسیار لەبتە گەورەکە بکەن‌و هەواڵی رووداوەکەی لێ وەربگرن، لەخۆشیان پرسیار نەکرد بڵێن: باشە ئەگەر ئەمانە خودان‌و ئێمە دەیانپەرستین‌و بەتەماین لەتەنگانە رزگارمان بکەن، ئەدی بۆچی بەرگرییان لەخۆیان نەکرد! ئەم جۆرە پرسیارەیان لەخۆیان نەکرد، چونکە بیرو باوەڕی پووچ عەقڵ‌و هۆشی لەکار خستبوون، لاسایی کردنەوە فکری زنجیر کردبوون، بۆیە

بـەجۆرێکی تـر پرسـیاریان کـردو ویـستیان بـزانن کـێ ئـەم پەنـدەی بـەخودا درۆزنەکانیان داوە، بۆئەوەی تۆڵەی لێ بکەنـەوە. ﴿قَالُوا مَنْ فَعَلَ هَذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّـهُ لَمِـنَ الظَّـالِمِينَ﴾ بەشـێوەی تـووڕەیی‌و بەهەڕەشـەوە وتیـان: ئـەوە دەبـێ کـێ ئـەو کـارەی بەسەر خوداکانمان هێنابێ، چۆن جەسارەتی دەستدرێژیی ئاوای کـردوە؟ بێگومـان ئەوەی ئەم کارەی ئەنجام داوە لەستەمکارانەو دەست درێژییـەکی گـەورەی کـردوەو شیاوی سزاو تۆڵـە لێ ستاندنە، جـا یـان لەبەرئـەوە رێگـەی بـەخۆی داوە پـەرژینی قودسـییەتی خوداکانیـانی بەزانـدوەو ئـەو جەسـارەتەی کـردوە، یـان لەبـەر ئـەوە زیادەڕەوی کردوە لەشکاندنی بتەکانداو وردوخاشی کردون.

ئـیتر ئەوکاتـە ئەوانـەی گوێیـان لەهەڕەشـەکەی ئیـبراهیم ﷺ بـوو کـە وتبـوی سوێندم بەخودا دەبێ ئەو بتانەتان تارو مار بکەم کەبەجێتان هێشتن!

﴿قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَـالُ لَـهُ إِبْـرَاهِيمُ﴾ هـاتن شـایەتیان داو وتیـان: ئێمـە گوێمان لێ بوو گـەنجێك هەڕەشـەی تـارو مـارکردنی خوداکانمـانی دەکـردو دەیگوت: سوێندم وابێ دەبێ پەنێکتان بەسەر بێنم‌و ئەوپەڕی هێزو توانای خـۆم بخەمەگـەڕ بۆ وردوهارکردنی ئەم بتانەتان، ئەو گەنجـەش نـاوی ئیبراهیمـە، دڵنیـاین ئـەو ئـەم کارەساتەی قەوماندوە!!

ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئەوکاتـەی خـودا شـارەزایی‌و روشـدی بـەئیبراهیم بەخـشیوە گـەنج‌و تـازە پێگەیـشتوو بـووە، دژی بتپەرسـتی بـووەو بۆیـە بـەم شـێوە وردوخاشـی کـردون. بـەڵام ئایـا ئەوکاتـە نیگـای پێغەمبـەرێتی بـۆ رەوانـە کـراوەو پێغەمبــەر بــووە؟ یــان ئیلـهامێك بــووە خــودا خــستویەتیە دڵیــەوە لــەپێش پێغەمبەرێتیـدا ئـەم کارەسـاتەی قەومانـدوە؟ واپێدەچـێ ئـەم رووداوە پـێش ئـەوە بووە بکرێ بەپێغەمبەر.

ئیبنو عەبباس دەفـەرموێ: ﴿مابعث الله نبياً الا شاباً ولاأوتي العلـم عـالم الا وهـو شـاب﴾ ئـەمجار ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە ﴿قَـالُوا سَـمِعْنَا فَتًـى﴾. کـەوابوو بـەپێی

قسەکەی ئیبنو عەبباس بێ، دەبێ ئەوکاتە حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ پێغەمبەر بووبێ. وەڵێ ڕافەکەرانی قورئان پێیان وایە پێش پێغەمبەرێتی بووە؛

ئەمجار نەمرودو پیاو ماقوڵانی نەتەوەکە بڕیاریان دا ئیبراهیم ڕاکێشێ لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوەی بکەن ﴿قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَى أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ﴾ وتیان: بەبەرچاوی خەڵکەوە، بەئامادەیی جەماوەرێکی زۆرەوە ئیبراهیم ڕاکێشێ لێکۆڵینەوەو پرسیار بکەن و بیهێنن باجەماوەر ئاگای لێ بێ و ببنە شایەت لەسەری، بەبێ شایەت لەسەر گرتن هیچ سزاو تۆڵەیەکی لێ مەکەنەوە، خەڵکەکە ئامادە بکەن باناگادار بن: کەدان بەتاوانی خۆیدا دەنێ و ئاگاداریش بن چ سزایەکی بەسەردا دەدرێ و ببێتە پەندو عیبرەت بۆ کەسانی دیکە.

ئەمەش خۆی لەخۆی دا مەبەستی سەرەکی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بوو، دەیەویست لەناو ڤیستیڤاڵ و کۆبوونەوەیەکی ئاوا جەماوەری دا نەفامی و نەزانی ئەو نەتەوەیە بخاتە ڕوو! بێ دەسەڵاتی و هیچ و پووچی بتەکانیان رابنوێنێ!! حەزرەتی ئیبراهیمیان هێنایە شوێنی دیاریکراوو ﴿قَالُوا أَأَنْتَ فَعَلْتَ هَذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ﴾ وتیان: ئەرێ تۆ ئەم کارەساتەت بەسەر خوداکانی ئێمە هێناوە ئەی ئیبراهیم! ئەم بت شکاندنە کاری تۆیە؟!

سەیرە بتەکانیان وردو خاش کراون و پارەپارە بوون کەچی هێشتا ئەوان هەر بەخودا ناویان دەبەن؟!

حەزرەتی ئیبراهیم هەرچەندە بەتاقی تەنهایەو ئەوان زۆرن، بەڵام ئیمانی پتەوی، بتمانە بەبیرو باوەڕی خۆی وای لێکردبوو: کەچ نرخێکیان بۆ دانەنێ و لاقرتێ و قەشمەرییان پێ بکاو وەڵامێکیان بداتەوە بگونجێ لەگەڵ عەقڵی پەستییان، ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا﴾ وتی: نەخەیر من وام لێ نەکردون، ئائەم بتە گەورەیان بەو دەردەی بردون. بێگومان حەزرەتی ئیبراهیم کاتێ بینی خەڵکەکە ڕێز لەو بتەگەورە دەگرن، کردەوەکەی پاڵ ئەودا لەم ڕووەوە: کە ئەو هۆکارمیان هەڵئەرە

بۆئەوەی وایان لێ بێ، لەروی زمانەوە کردار وەکوو چۆن پاڵ بکەرەکەی دەدرێ، پاڵ هۆکارەکەشی دەدرێ!

یـان دەتـوانین بڵـێین: حـەزرەتی ئیـبراهیم بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ دانـی بەکردەوەکەی خۆی دانـا، بۆئـەوەی بەڵگـەیان لەسـەر راسـت بکاتـەوەو بۆڕیـان بـدا. وەکـوو وەسـتای کارامـاو خۆشنووسـی بـەناوبانگ ئەگـەر یـەکێك لێـی بپرسـێ کـێ ئەوشـتەی دروسـتکردوە یـان کـێ ئـەو نووسـینە جوانـەی نووسـیوە دەڵـێ ئـەوە تـۆ ئەنجامت داوە تۆ نووسیوتە، مەبەستیش بەم وڵامە ئەوەیە پرسیارکەرەکە واڵ بکا ددان بەوەدا بنێو بزانێ کەئەمە کاری ئەمەو دەست رەنگینی خۆیەتیو لەهـەمان کاتیش دا گاڵتەشی پێ دەکا.

﴿فَاسْـأَلُوهُمْ إِنْ كَـانُوا يَنطِقُـونَ﴾ دەئەگـەر راسـتە ئەوانـە خـودانو شـیاوی خودایەتینو قسەو گفتو گۆیـان هەیـە پرسـیاریان لێ بکـەن: باوەڵامتـان بدەنـەوەو پێتان بڵێن: کێ وای لێ کردون.

بێگومان بەم وڵامە سەرنجی راکێشانو ئاگاداری کردنـەوە کەپەرسـتنی بـت بـێ سوودە هیچی لێ شین نابێ. دەیەویست بۆخۆیـان بـەدەمی خۆیـان دان بـەوەدا بنـێن کەئەمانە بەردو دارنو ئاخاوتنیان نیەو بێ گیانن تالەبواری بەڵگە هێنانەوەدا بۆڕ بخۆنو هیچیان بەدەستەوە نەمێنێو ئەم داشی سوار بێ.

وادەردەکەوێ ئەم قەشمەری پێکردنـەی حـەزرەتی ئیـبراهیم ﷺ هەژانـدونیو تۆزێـك وەئاگای هێناونـەوە ﴿فَرَجَعُـوا إِلَـى أَنفُـسِهِمْ فَقَـالُوا إِنَّكُـمْ أَنـتُمْ الظَّـالِمُونَ﴾ بەخۆیانـدا چـونەوەو هەسـتیان بەهەڵەی خۆیـان کـرد، کەمتەرخـەمیو تەقـصیری خۆیان راگەیاند، ئەوە بوو: هەندێکیان بەهەندێکیانیان گوت: ئێـوە سـتەمکارن لـەم روەوە: کـەخوداکانتان بـەبێ چاودێرو حـەرەس بـەجێ هێـشتووە، یـان لـەم روەوە: ستەمکارن: کەبەندایـەتی بـۆ پەیکـەرو دارو بـەردێك دەکـەن: کەقـسەو ئاخاوتنیـان نیـە، ئـەو شـتە بـێ باپاخانـەتان کـردوە بـەخودا. هەڵبەتـە ئەمـە ئاوڕدانـەوەو هەڵوێـستەیەکی بـاش بـوو: کەهەسـتیان کـرد بـە گـومڕایی خۆیـانو زانییـان:

که‌په‌رستنی ئه‌م دارو به‌ردانه سته‌مه، بۆیه‌که‌م جار له‌ژیانی خۆیاندا له‌وه‌زع‌و حاڵی ئێستاو رابردوویان وورد بوونه‌وه‌و سه‌رزه‌نشتی خۆیان کرد. به‌ڵام ئه‌مه رووناکیه‌ك بوو هێنده‌ی ده‌وام نه‌کرد به‌شوێنیدا تاریکایی کوفرو لاسایی کردنه‌وه باڵی کێشایه‌وه به‌سه‌ریان داو دڵیان تاریك بووه‌وه.

وه‌کو ده‌فه‌رموێ: ﴿ثُمَّ نُكِسُوا عَلَى رُءُوسِهِمْ﴾ پاشان چاویان له‌زه‌وی بڕیه‌وه‌و سه‌ریان داخست وه‌کوو ئه‌وه بیانه‌وێ بیر بکه‌نه‌وه. یان ماناکه‌ی به‌م جۆره‌یه: پاشان گه‌ڕانه‌وه بۆ ده‌مه‌ده‌می‌و موجاده‌له‌و به‌ره‌نگار بوونه‌وه‌ی حه‌زره‌تی ئیبراهیم‌و له‌هه‌ڵوێستی ته‌مه‌نکورتی پێشویان پاشگه‌ز بوونه‌وه‌و رویان له‌ئیبراهیم عليه السلام کردو پێیان گوت: ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَؤُلاءِ يَنطِقُونَ﴾ بێگومان تۆ ده‌زانی ئه‌مانه زمانیان نیه‌و قسه ناکه‌ن. ئه‌تۆش ده‌زانی‌و ئێمه‌ش ده‌زانین ئه‌م خودایانه‌ی ئێمه قسه‌یان نیه! ئه‌دی چۆن تۆ داوا له‌ئێمه ده‌که‌ی پرسیاریان ئاڕاسته بکه‌ین؟؟

به‌کورتی ئه‌وان له‌په‌شۆکاوی خۆیان به‌ڵگه‌یان له‌سه‌ر ئیبراهیم عليه السلام به‌شتێك ده‌هێنایه‌وه که‌ده‌بوه به‌ڵگه بۆ ئیبراهیم نه‌ك بۆ ئه‌وان!!

### ٣- حه‌زره‌تی ئیبراهیم عليه السلام بۆڕی‌دان‌و له‌ئاگریش رزگاری بوو

﴿ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ

إِبۡرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ ﴿٧٠﴾

ئه‌مه حه‌لقه‌ی سێیه‌م‌و كۆتایی چیرۆكی حه‌زره‌تی ئیبراهیمه له‌گه‌ڵ قه‌ومه‌كه‌یدا ئه‌وه بوو: به‌زوبانی خۆیان دانیان به‌وه‌دا نا كه هیچ سوودو قازانجێكیان له‌په‌رستنی بته‌كانیان ده‌ست ناكه‌وێ، حه‌زره‌تی ئیبراهیم به‌به‌ڵگه‌و موناقه‌شه بۆڕی دان‌و قسه‌یان بڕاو ده‌مكوت بوون. ئیتر ئه‌مجار حه‌زره‌تی ئیبراهیم عليه السلام كه‌وته سه‌رزه‌نشت كردنیان‌و وه‌كوو لافاو یه‌ك به‌دوای یه‌كدا به‌ڵگه‌ی گورچكبڕی بۆ ده‌هێنانه‌وه‌و داوای لێكردن كه‌ئیتر چی دی له‌سه‌ر ئه‌و نه‌فامییه نه‌مێننه‌وه‌و واز له‌په‌رستنی دارو به‌رد بێنن‌و روبكه‌نه خودا. ﴿قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنفَعُكُمْ شَيْئاً وَلا يَضُرُّكُمْ ؟﴾ واته: ئیبراهیم عليه السلام دوای ئه‌وه‌ی گه‌له‌كه‌ی دانیان به‌وه‌دا نا: كه‌ئه‌و بتانه بێ زوبانن، وتی: ده‌ی كه‌وایه ئێوه به‌چ عه‌قڵێك له‌جیاتی خودای مه‌زن به‌ندایه‌تی بۆئه‌و په‌یكه‌رانه ده‌كه‌ن: كه‌ئه‌گه‌ر به‌ته‌مای سوود بن لێیان هیچیان له‌ده‌ست نایه، ئه‌گه‌ر دژایه‌تیشیان بكه‌ن زیانتان پێ ناگه‌یه‌نن‌و جێگای مه‌ترسی نین. ﴿أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ ماڵوێرانی‌و به‌هیلاكچون بۆ خۆتان‌و خوداكانتان: كه‌له‌جیاتی خودا به‌ندایه‌تییان بۆ ده‌كه‌ن. داوه‌شێن‌و سه‌ر شۆڕی بۆ خۆتان‌و په‌رستراوانتان. ﴿أَفَلا تَعْقِلُونَ ؟﴾ ئه‌وه بۆ بیر له‌خۆتان ناكه‌نه‌وه؟ بۆچی به‌خۆتاندا ناچنه‌وه؟ له‌كوفرو بێدینی خۆتان ورد نابنه‌وه؟ تابۆتان ده‌ربكه‌وێ چه‌ند خه‌سارمه‌ندو گومڕاو سه‌رلێشێواون؟!

جا كه حه‌زره‌تی ئیبراهیم عليه السلام به‌سه‌ریان دا زاڵ بوو باطل بۆڕی خوارد، هیچكه‌یان به‌ده‌سته‌وه نه‌ما جگه له‌وه‌ی په‌نا بۆ ئه‌زیه‌تدان‌و له‌ناوبردنی حه‌زره‌تی ئیبراهیم به‌رن. ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ هه‌ندێكیان به‌هه‌ندێكیان گوت: واباوه ئه‌و بێژه‌ره نه‌مرودی كوڕی كه‌نعانی كوڕی سه‌نحاریب

کوڕی نەمروذ کوڕی کۆڕش کوڕی حام کوڕی نوح بووە. هەندێك پێیان وایە: ئەو بێژمرە کابرایەکی کورد بووە. وتیان: ئیبراهیم بسووتێنن، تۆڵەی ئەم کارەی بەئاگر لێ بکەنەوە، یارمەتی خوداکانی خۆتان بدەن ئەگەر ئێوە راست دەکەن یارمەتی خوداکانتان دەدەن و ناتانەوێ وازلەعیبادەتکردنیان بهێنن. دارو لێرەوارێکی زۆریان گرد کردەوەو ئاگریان تێ بەرداو بەمەنجەنیق ئیبراهیمیان هەڵدایە ناو ئاگرەکە. بەخەیاڵی خۆیان ئیتر ئیبراهیم ﷺ لەماوەیەکی کورت دا کوڵوکۆی دادەمرێ!

﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ پەروەردگار فەرموی: ئێمە وتمان ئەی ئاگر سارد ببەرەوەو بەشێوەیەك زیانبەخش نەبێ، ئەوەندە گەرم مەبەبسوتێنی، وەند ساردەمەبەرەوە سەرما پەیدا بکەی.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەگەر پەروەردگار ئاوای پێ نەفەرمویایە لەسەرمان رەق دەبۆوە.

(ابوالعاليە) دەڵێ: ئەگەر خودا نەیفەرموایە: ﴿بَرْداً وَسَلاماً﴾ ساردیەکەی لەگەرمییەکەی کوشندەتر دەبوو. سارد بوونەوەکەی بەو شێوەیە بووە: پەروەردگار سروشتی گەرمی و سووتاندنی لێ دارنی و هەڵگیرسان و روناکایی بۆ هێشتەوە وەکوو پێشووی.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: پێویستە پرسیار نەکەین بۆچی ئاگرەکە ئیبراهیمی ﷺ نەسووتاند؟ نابێ بگوترێ: ئاگر جەستەی زیندو دەسوتێنێ ئەدی بۆچی ئیبراهیمی نەسووتاند؟. چونکە ئەوکەسەی بەئاگری فەرموو: سوتێنەر بە، هەر ئەویش پێی فەرموو: ﴿كُونِي بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ وشەی (کن - ببە) وشەیەکە لەگەڵ لەلایەن خوداوە گوترا یەکسەر ماناکەی هاتۆتەجێ و دواناکەوێ. چۆنی بوێ و چۆنی پێ بفەرموێ، بێ چەندو چون و بێ دواکەوتن دێتەجێ، جا ئادەمیزاد پێوەی راهاتبن یان پێوەی رانەهاتبن!

بێگومـان ئەوانـەی کـاری خـودا بـەکاری بەشـەر بەرامبـەر دەکـەن‌و قیاسـی کـردەوەی خـودا لـەکردەوەی ئـادەمیزاد دەکـەن، ئەوانـەن ئـەم جۆرە پرسـیارە بـێ جێیانە ئاراستە دەکەن‌و دەڵێن: ئەمە چۆن بووەو چۆن دەبێ؟

بەڵام ئەوانەی جوداوازیی نێوان کاری خوداو کـاری بەنـدەکانی دەزانـن‌و هێـزی خوداو هێزی ئادەمیزاد لێك جیادەکەنەوە، هـەرگیز ئـەم جۆرە پرسـیارانە ناکـەن‌و هەرگیزاو هەرگیز نایانەوێ باییس بهێننـەوەو تـەعلیلی عیلمـی‌و نـاعیلمی بـۆ ئـەم جۆرە کارانەی خودا بخوڵقێنن، مەسئەلەکە لـەم بوارانـەدا نیـەو نـاکرێ بـەپێوەری ئادەمیزاد تەحلیل‌و تەعلیلی بۆ بدۆزرێتەوە. هـەر یاسـاو قانونێـك، هـەر مەنهـەج‌و رێـسایەك بیـەوێ ئـەم جـۆرە موعجیزانـە کێـشانە بکـاو بـێ قەیـدو مـەرج نەیانگەڕێنێتـەوە بـۆ دەسـەڵاتی رەهـای خـودا مەنهـەجێکی فاسـیدەو لەبناغـەوە هەڵەیە، چونکە کردەوەی خـودا ملکەچی پێـوەری ئـادەمیزادو زانـستی سـنووورداری ئەو نیە.

ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە: دەبێ ئیمانمـان هـەبێ کەئـەو روداوە روی داوە: حەزرەتی ئیبراهیم خراوەتە نـاو ئـاگری حـەقیقی‌یـەوەو نەسووتاوە، چونکە خودا ویستی وابووە نەسووتی، ئەمجار ئەمە چۆن بووەو خودا سروشـتی ئاگرەکەی چ لێکردوە ساردو سەلامەت بووە لەسەر ئیبراهیم، یان چی لەئیبراهیم کـردوە ئـاگر نەیـسووتاندوە.... هـەروا گـەلێك پرسـیاری لـەم جۆرە، ئـەوە قورئـان لێـی بێـدەنگ بووە، پێویستە ئێمـەش لێـی بێدەنگ بـین، چـونکە عـەقڵی ئـادەمیزاد سـنووردارەو نـاتوانێ ئـەو جـۆرە شـتانە دەرك بکـا. جگـە لـەقورئانیش سەرچـاوەی ترمـان بەدەستەوە نیە.

بوخـاری لـەئیبنو عەبباسـەوە ریوایـەت دەکـا: دەفـەرموێ: حـەزرەتی ئیـبراهیم کاتێـك هەڵیاندایـە نـاو ئاگرەکـە وتـی: ﴿حَسْبُنَا اللّـهُ وَنِعْـمَ الْوَكِيـلُ﴾ حـەزرەتی موحەممەدیش ﷺ کاتێك پێیان گوت: ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (ال عمـران/١٧٣) ئـەبو یـەعلا لەئـەبوو

هورەیرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کاتێك ئیبراهیم خرایە ناو ئاگرەکە وتی خودایە! تۆ لەئاسمان خودایەکی تاك و تەنهای، ئەمنیش لەسەر زەوی تاقە کەسم بەندایەتی تۆ دەکەم.

ئوبەی کوڕی کەعب لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: ئیبراهیم ﷺ کاتێك هەڵیاندایە ناو ئاگر وتی: ﴿لا اله الا أنت سبحانك رب العالمين، لك الحمد ولك الملك لاشريك لك﴾ هەروا ریوایەتکراوە: کە بەمەنجەنیق لەشوێنێکی بەرزەوە هەڵیاندایە ناو ئاگرەکە، جوبرائیل پێشوازیی لێ کردو وتی: ئەی ئیبراهیم! چ کارت بەمن هەیە؟ ئیبراهیم فەرموی: داوا لەخودا بکە حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: ﴿حسبي من سؤالي علمه بحالي﴾ ئەمجار پەروەردگار فەرموی: ﴿يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾.

﴿وَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمْ الأَخْسَرِينَ﴾ گەلەکەی ئیبراهیم پیلانیان بۆ ئیبراهیم دارشت و ویستیان سزای بدەن و لەناوی بەرن لەتۆڵەی ئەوەدا کە بتەکانی وردو هارکردوون بەئاگر بیسوتێنن، بەڵام ئێمە رەنج بەخەسارمان کردن و کارەکەیانمان بێهودە کردو ئیبراهیممان لەئاگرەکە رزگار کرد.

ریوایەت کراوە ئەو مەلیکەی هاوچەرخی حەزرەتی ئیبراهیم بووە ناوی (نەمروذ) بووە پاشای ئارامیەکان بووە لەعێراق.

پاشان خۆیان و پیاوماقوڵانی بەعەزابی خودا لەناو چون. ئیبنو ئەبی حاتەم لەعائیشەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: کاتێك ئیبراهیم هەڵدرایە ناو ئاگرەکە هەرچی پێرۆی سەر زەوی هەن هەموویان کەوتنە هەوڵ و تەقەلادان بۆ کوژاندنەوەی ئاگرەکە جگە لە(قومقومە) [١٥] ئەو فوی لەئاگرەکە کرد بۆئەوەی باش بلێسە بسێنێ.

---

([١٥]) قومقومە: دەعبایەکە کەپێغەمبەر ﷺ ناوی ناوە (فویسقە)و فەرمانی داوە بکوژرێ، شایانی باسە ئێستا لەدەڤەری بارزان کوشتنی ئەم دەعبایە باوەو بەخێرێکی گەورەی دەزانن.

**٤- چەند نیعمەتێکی تر بۆ حەزرەتی ئیبراهیم و ﷺ رزگار بوونی لەگەڵ (لوط)داو چونیان بۆ خاکی شام**

﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾

دوای ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ لەئاگر رزگاری بوو، پەروەردگار باسی چەند نیعمەتێك دەکا: کەبە ئیبراهیمو (لوط) ی برازای بەخشیون. حەزرەتی لوط ﷺ خراوەتە پاڵ حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ و بەیەکەوە ناویان هێنراوە، چونکە مامو برازای یەکتر بوون، هەردوکیان پێغەمبەر بوون ، برێ لەونیعمەتانەی پێیان بەخشرابوون دەرچونیان لەوڵاتی عێراق بۆ وڵاتی شام بووە، هەردوکیان رابەرو پێشەوا بوون، نیگایان بۆ هاتوە بۆ ئەوەی کاری چاکە ئەنجام بدەنو نوێژ بکەنو زەکات بدەن، هەندێکیش لەو نیعمەتانە: کەتایبەت بووە بەحەزرەتی ئیبراهیمەوە ﷺ ئەوە بوو خودا ئیسحاقی پێداوە ئینجا ئیسحاق یەعقوبی بووە، حەزرەتی ئیبراهیم بەم کورو کورەزایانەی زۆر دڵخۆش بووە.

دەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطاً إِلَى الأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ﴾ واتە: لەو نیعمەتو بەخششانەی خودا دابوونی بەئیبراهیم ﷺ ئەوە بوو لەگەڵ (لوط) ی برازای لەعێراق رزگاری کردنو کۆچی پێکردن بۆ خاکی پیرۆز بۆ وڵاتی شام، بۆ

ئەو وڵاتەی خودا خێروبەرەکەتی تێدا زۆر کردوە، بەوەی زۆری پێغەمبەر تێدا ناردوون، شەریعەتو یاسای ئەو پێغەمبەرانە بەناو جیهاندا بڵاوبۆتەوە. خاکەکەی بەپیتو بەرەکەتە، کشتوکاڵو دارو درەختی تێدایە، سەرچاوەو چۆمی زۆری تێدان، بەروبوومو میوەی زۆرو هەمەجۆرە، خێرو بەرەکەتی دینو دونیای تێدا کۆبۆتەوە!!

حەزرەتی ئیبراهیم لەشاری (کوثی) کە لەهەرێمی (فدان ئارام) لەوڵاتی عێراق بووە، لەگەڵ (لوط) ی برازایو ساراخاتونی خێزانیدا لەچنگی شیرکو بتپەرستی سەری خۆیان هەلگرتو رویان کردە وڵاتی شام بۆئەوەی بتوانن بەتەواوی یەکتاپەرستی بکەن سەرەتا چوونە شاری (حەرران) پاشان رۆیشتن بۆ وڵاتی میصر ، ئەمجار گەرانەوە بۆشامو لە (فلسطين) نیشتەجێ بوون، حەزرەتی (لوط) یش لەگوندەکانی (المؤتفكة): کەشەوو رۆژرێیەك لەفەلەستین دوور بووە نیشتەجێ بووە.

ئەمجار چەند نیعمەتێکی تر باس دەکات کە خودا بەخشیونی بەئیبراهیم جگە لە رزگاربوون لەئاگرو کۆچ پێکردن بۆ خاکی پیرۆز، دەفەرموێ: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾ بەخشیمان بەئیبراهیم ئیسحاقو یەعقوب، وەچەو نەوەیەکی باش بوون، بەفەضڵو رەحمەتی خۆمان پێمان بەخشین، یائیسحاقمان پێ بەخشی لەسەر داواو پاڕانەوەی خۆی ئەوە بوو: ئیبراهیم لەخودا پاڕایەوەو وتی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (الصافات/١٠٠) زیاد لەوەی خۆی داوای کردبوو یەعقوبیشمان بەزێدە پێدا.

﴿وَكُلاًّ جَعَلْنَا صَالِحِينَ﴾ هەموویانمان گێران بەخاوەنی خێرو کاری باش. واتە: لوطو ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوب یان هەریەکێ لەئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوبمان کردن بەپیاوی صالحو لەخوا ترس، فەرمانی خودایان بەجێ هێنا، خۆیان لەحەرامو حەرامخۆریی پاراست. هەموویانمان کردن بەپێغەمبەرو رابەری

ئادەمیزاد. ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا﴾ کردمانن بەئیمامو پێشەوا، بانگەوازیی ئادەمیزادانیان کرد بۆ ئایینی خودا، بەفەرمانی ئێمە ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام دان. چۆنمان فەرمان پێکردن ئاوا هەڵسو کەوتیان کرد. ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ﴾ نیگاو سروشمان بۆ ناردن: کەکاری چاك ئەنجام بدەنو واز لەشتە حەرامەکان بێنن، ﴿وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ﴾ نیگامان بۆ کردن: کەنوێژەکانیان بکەنو زەکاتی ماڵو سامانیان دەرکەن. ﴿وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ﴾ هەموویان تەقواکارو خودا پەرستو فەرمانبەردار بوون، لەئاستی خودا پەرستی دا هەرگیز لوتبەرزییان نەنواند. حەزرەتی ئیبراهیم لەبەرخاتری خودا گەلو نەتەوەو خاوو خێزانی خۆی بەجێ هێشت، پەروەردگار کەلینی بۆ پڕکردەوەو شتەلەدەست چوەکانی بۆ قەرەبوو کردەوە، خاكو وڵاتی باشتری پێدا، ئیسحاقی پێ بەخشی، ئیسحاقیش یەعقووبی بوو، بۆ ئیبراهیم ﷺ بوونە چاو رۆشن کەرەوە. گەلو نەتەوەیەك لەوەچەو نەوەی ئەو کەوتنەوە، زۆر باشتر بوون لەو نەتەوەی بەجێی هێشتن. هەر لەوەچەو نەوەی چەند پێغەمبەرو پێشەوای ئایین پەیدا بوونو بەفەرمانی خودا هەڵسو کەوتیان کرد. خودا نیگای بۆکردن: کەکاری چاکە بکەن بەتایبەتی ئاگاداری نوێژەکانیان بنو زەکاتی ماڵو سامانی خۆیان بدەن. ئەوانیش زۆر بەدڵسۆزیو لێبڕانەوە فەرمانی خودایان بەجێ هێناو فەرمانبەرداربوون، بەراستی خودا باش تەعویضی حەزرەتی ئیبراهیمی دایەوەو قەرەبووی نیشتمانو نەتەوەو خزمو کەسو کاری بۆ پڕکردەوە.

## چیرۆکی حه‌زره‌تی (لووط) عليه السلام

﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِي رَحْمَتِنَآ ۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾

دوای ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار باسی ئه‌و نیعمه‌تانه‌ی کرد که به‌خشیونی به‌حه‌زره‌تی ئیبراهیم عليه السلام ، ئه‌مجار باسی ئه‌و نیعمه‌تانه ده‌کا: که‌به‌خشیونی به‌حه‌زره‌تی لووط عليه السلام، چونکه په‌یوه‌ندیی خزمایه‌تی‌و هاوشانی له‌پێغه‌مبه‌رایه‌تیان له‌ناوان دا هه‌بوه.

لووط: کوڕی هارانی کوڕی ئازه‌ره. هه‌رزوو ئیمانی به‌حه‌زره‌تی ئیبراهیم عليه السلام هێناو شوێنی که‌وت‌و له‌ته‌کیا کۆچی کرد بۆ خاکی پیرۆز... وه‌کوو له‌شوێنێکی تردا قورئان ئاماژه‌ی بۆ ده‌کات‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿فَآمَنَ لَهُ لُوطٌ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَى رَبِّي﴾ (العنكبوت/٢٦).

بێگومان له‌وه پێش چیرۆکی حه‌زره‌تی لووط باس کراوه، لێره‌دا به‌سه‌ر پێ پیه‌که‌وه ئاماژه‌ی بۆ ده‌کاو ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلُوطاً آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً﴾ په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: به‌خشیمان به‌لووط پێغه‌مبه‌رایه‌تی‌و لێزانی له‌حه‌لکردنی کێشه‌ی ناو کۆمه‌ڵ‌و دانایی له‌به‌رێوه‌بردنی ئه‌رکی رابه‌ری‌و پێشه‌وایه‌تی دا. زانیاری‌و هه‌موو شتێك که‌په‌یوه‌ندی هه‌بێ به‌بیرو باوه‌ڕو خودا په‌رستییه‌وه پێی درابوو. بۆئه‌وه‌ی بتوانێ ئه‌رکی پێغه‌مبه‌رایه‌تی هه‌ڵبگرێ، که‌کرا به‌پێغه‌مبه‌ر ره‌وانه کرا بۆ دانیشتوانی (سدوم)و ده‌وروبه‌ری: که‌حه‌وت گوند بوون بانگه‌وازیی کردن‌و پشتیان لێ هه‌ڵکرد، ئه‌م گه‌ل‌و نه‌ته‌وه گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌کی بێ ره‌وشت بوون، وازیان له‌ئافره‌ت هێنابوو نێربازیان ده‌کرد به‌بێ‌شه‌رمانه‌و به‌ئاشکرا نێر سواری نێر

دەبـوو، پـەروەردگار غـەزەبی لێگـرتن‌و شـارو دانیـشتوانی لـەناو بـردن، وەكـوو دەفەرموێ: ﴿وَنَجَّيْنَاهُ مِنْ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ تَعْمَلُ الْخَبَائِثَ﴾ واتـە (لـووط) مـان رزگـار كرد لەو عەزابەی رشتمان بەسەر دانیشتوانی ئەو شارەی كاری ناشـیرینیان دەكـردو نێربازیان تێدا باو بوو، هۆی ئەم رەوشتە ناشرینەیان ئەوە بـوو ﴿إِنَّهُـمْ كَـانُوا قَـوْمَ سَوْءٍ فَاسِقِينَ﴾ بێگومان ئـەوان گـەل‌و نەتەوەیـەكی لـەڕێ دەرچووبوون، لـەطاعـەت كردن بۆ خودا لایان دابـوو، سـەرگەرمی گومڕایی‌و سنوورشـكێنی بـوون. قەومەكـە ریشە كێش كران‌و لووط و شوێنكەوتوانی رزگاریـان بـوو، ﴿وَأَدْخَلْنَـاهُ فِـي رَحْمَتِنَـا﴾ وێـڕای رزگـار بـوونی لەدەسـت ئـەو كۆمەڵـە رەوشـت ناشـرینە، خستیـشمانە نـاو رەحمەتی خۆمان‌و دڵنیاو دڵ ئارام بـوو ﴿إِنَّـهُ مِـنْ الـصَّالِحِينَ﴾ بێگومـان لـووط لـە بەنـدە صالحەكانی ئێمە بوو، لەوكەسانە بوو، كەكردەوەی باشـیان دەكـردو فـەرمانی خودایان بەجێ دەهێناو خۆیان لەنەهیەكانی دەپاراست ..

## سەرگوزشتەی چیرۆكی حەزرەتی نووح عليه السلام

﴿ وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾

پاش گێرانـەوەی سەرگورشـتەی بـاوكی پێغەمبـەران؛ حـەزرەتی ئیـبراهیم عليه السلام چیرۆكی حەزرەتی نـووح رادەنـوێنێ كە بـەباوكی دووەمـی ئـادەمیزاد دەژمێـردرێ،

چـوونکه هـەموو ئـادەمیزاد دوای تۆفـان لـەزڕوێتو نەتـەوەی ئـەون. بـەڵام بـۆ سەرگورشـتەی ئـەمیش هەربـەخێرایی بەسـەریدا دەڕواو بـەکورتی باسـی دەکـاو دەفەرموێ:

﴿وَنُوحاً إِذْ نَادَى مِنْ قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنْ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ واتە: ئـەی موحەممەد! سەرگورشتەی نوح بۆ گەلەکەت بگێـڕەوە؛ کاتێـك گەلەکـەی بـەدرۆیان خستەوەو ئیمانیان پێ نەهێنا، لەرۆژگارێکی پێش رۆژگـاری ئیـبراهیمو تـۆش بـوو، بانگی لێ کردینو پەنای بۆ هێناین لێمـان پاڕایـەوە، بـێ دەسـەڵاتی خـۆی راگەیانـد، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ﴾ (القمر/١٠) یـان دەفـەرموێ: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾ (نـوح/٢٦) ئـیتر ئێمـەیش دوعاکـەیمان وەرگـرتو بەهانایـەوە چـوینو فریـای کـەوتین، نـووحو شـوێنکەوتوانیمان رزگـار کـرد، رزگارمـان کـردن لـەخنکانو ئەزیەتـدانیان لەلایـەن گەلەکەیانەوەو خەمو نارەحەتی بەدرۆخستنەوەی پەیامەکەی!

ریوایـەت کـراوە: کەحـەزرەتی نـووح لەتەمـەنی چـل ساڵیدا بۆتـە پێغەمبـەرو نۆسەدو پەنجا ساڵ بانگەوازیی گەلەکەی کرد، کەچی کەمێکیان نەبێ ئیمانیـان پـێ نەهێنا.

﴿وَنَصَرْنَاهُ مِنْ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمَ سَـوْءٍ فَأَغْرَقْنَـاهُمْ أَجْمَعِـينَ﴾ ئێمـەیش یارمـەتیمان داو لەچـنگی ئـەو گـەلو نەتـەوە رزگارمـان کـرد: کەئایـەتی ئێمەیان بەدرۆخستەوە، لەتۆڵەی ئـەو سەرڕەقیو خراپـەکاریو ستەمکارییەیان دا بـــەتۆفان خنکانـــدمانن، بەگـــەورەو بـــچوکیانەوە لـــەناومان بـــردن کـــەسمان لێ نەهێشتنەوە.

## سەرگورشتەی چیرۆکی داوودو سولەیمان ﷺ

﴿ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾

ئەم چیرۆکەش وەکوو چیرۆکەکانی تر پەروەردگار تێیایدا نیعمەتە گەورەکانی خۆی باس دەکا کە: بەخشیبوونی بە حەزرەتی داودو سولەیمان، هەر دوکیان هاوبەشن تێ یدا، وەکوو نیعمەتی زانیاریو تێگەیشتن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەنیعمەتی عیلم گەورەترین نیعمەتە. بۆیە پێش نیعمەتەکانی تری خستووە. ئەمجار دوای ئەوە ئەو نیعمەتانە باس دەکا کەتایبەتە بەهەر یەکێکیانەوە.

ده‌رباره‌ی حه‌زره‌تی داود باسی ئه‌وه ده‌کا که کێوه‌کان‌و باڵنده‌کان له‌گه‌ڵی دا ته‌سبیحاتیان ده‌کرد، هه‌روه‌ها فێری دروستکردنی زرێ بوو بوو.

ده‌رباره‌ی حه‌زره‌تی سوله‌یمانیش ﷺ ده‌فه‌رموێ: که‌با بۆی موسه‌خه‌ر بوو هه‌روا شه‌یاتینی بۆی گه‌ردنکه‌چ بوون به‌فه‌رمانی ئه‌و ده‌چوونه بنکی ده‌ریاکانه‌وه لوئلوئو مه‌رجانیان ده‌رده‌هێنا، هه‌روه‌ها کاری تریشیان بۆ ئه‌نجام ده‌دا، قه‌صرو باڵه‌خانه‌و پردو شارو شارۆچکه‌ی پێ دروست ده‌کردن، هه‌روا گه‌لێ میحراب‌و په‌یکه‌رو شتی ناوازه‌یان بۆ دروست ده‌کرد.. ده‌فه‌رموێ: ﴿وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ﴾ واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د! سه‌رگورشته‌ی داودو سوله‌یمان بۆ گه‌له‌که‌ت بگێڕه‌وه، باسی ئه‌و حوکم‌و بڕیاره بکه: که‌ده‌رباره‌ی خاوه‌ن کشتوکاڵێك‌و شوانێك ده‌ریان کرد چیرۆکه‌که وه‌کوو زۆربه‌ی راڤه‌که‌رانی قورئان ده‌فه‌رموون به‌م شێوه‌یه بووه.

شوانێك له‌کشت‌و کاڵی دا شه‌وێك ئاژه‌ڵه‌کانی شه‌وێن ده‌واو، به‌یانی کابرای کشتیار ده‌چێ شکات ده‌کاو بۆ مه‌حکه‌مه ده‌چنه‌لای داود بڕیار ده‌دا ئاژه‌ڵه‌کانی بدرێن به‌کابرای که‌شتیار له‌جیاتی زیانی کشت‌و کاڵه‌که‌ی. ئه‌مجار کابرای شوان ده‌چێ بۆلای حه‌زره‌تی سوله‌یمان ﷺ و روداوه‌که‌ی بۆ باس ده‌کاو حوکمی حه‌زره‌تی داودیشی بۆ ده‌گێڕێته‌وه. حه‌زره‌تی سوله‌یمان ﷺ که‌ئه‌وکاته ته‌مه‌نی یانزه‌ساڵانه ده‌بێ ده‌ڵێ له‌م حوکمه باشتر ئه‌وه‌یه: ئاژه‌ڵه‌کان بدرێن به‌کابرای خاوه‌ن کشت‌و کاڵ سوود له‌به‌رو بوومیان ببینێ، کشت‌و کاڵه‌که‌ش بدرێ به‌خاوه‌ن ئاژه‌ڵه‌که به‌خێوی بکا تاوه‌کوو خۆی لێ دێته‌وه، ئه‌مجار هه‌ریه‌که‌یان شتی خۆی وه‌ربگرێته‌وه. ﴿إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ﴾ کاتێك حوکمیان ده‌رکرد ده‌رباره‌ی زیانی: که‌له‌و کشت‌وکاڵه‌که که‌وتبوو، خوداش ئاگادارو زانا بوو به‌وحوکمه‌ی داوودو سوله‌یمان ده‌ریان کردو هیچی لێ گوم نابێ. حه‌زره‌تی داود واحوکمی ده‌رکرد کابرای شوان ئاژه‌ڵه‌کانی بدا به‌کابرای خاوه‌ن کشت‌وکاڵ.

به‌لام په‌روه‌ردگار راستی حوکم‌و فتواکه‌ی خسته دلی حه‌زره‌تی سوله‌یمانه‌وه: فتوای‌دا ئاژه‌له‌کان بدرێن به‌خاوه‌نی کشتوکاله‌که بۆ قه‌ره‌بوو کردنه‌وه‌ی ئه‌و زیانه‌ی لێی که‌وتووه، زه‌وی‌و زاره‌که‌شی ته‌سلیم به‌کابرای شوان بکرێ خزمه‌تی بکا تاوه‌کوو خۆی لێ دێته‌وه. ئه‌مجار کابرای شوان ئاژه‌له‌کانی وه‌ربگرێته‌وه، کابرای کشتیاریش زه‌وی‌و زاری خۆی وه‌ربگرێته‌وه.

هه‌لبه‌ته حوکمه‌که‌ی حه‌زره‌تی سوله‌یمان ﷺ په‌سه‌ند تر بوو، هه‌رچه‌نده هه‌ردوکیان پێغه‌مبه‌ر بوون، زانیاری‌و لێزانی‌و زانینی حه‌ل کردنی نیزاع‌و کێشه‌یان درابویه، به‌شێوه‌یه‌کی وه‌ها هه‌ردوحوکمه‌که صه‌حیح بوون، به‌لام حوکمه په‌سنده‌که ئه‌وه بوو که: حه‌زره‌تی سوله‌یمان ده‌ری کرد ده‌فه‌رموێ: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ﴾ دوایی سوله‌یمانمان تێگه‌یاند، راستی فتواکه‌مان به‌و شێوه‌ی راست بوو له‌هه‌موو رویه‌که‌وه، خسته‌دلی سوله‌یمانه‌وه‌و ئه‌ویش به‌و شێوه په‌سنده‌یه حوکمی کرد.

عیله‌ت بایی‌سی حوکمه‌که‌یان له‌م روه‌وه بووه: حه‌زره‌تی داود ﷺ زیانی کشتوکاله‌که‌ی مه‌زنده کردوه، یه‌کسان بوه له‌گه‌ل به‌های ئاژه‌له‌کان، بۆیه ئاژه‌له‌کانی داوه به‌کابرای زیان لێ که‌وتوو. حه‌زره‌تی سوله‌یمانیش به‌روبومی ئاژه‌له‌کانی مه‌زنده کردوه، وای بۆ ده‌رکه‌وتوه یه‌کسانه له‌گه‌ل به‌روبوومی کشتوکاله‌که‌و ئه‌و حوکمه‌ی داوه. هه‌ردوکیشیان به‌ئیجتیهاد ئه‌م بڕیارمیان ده‌رکردوه نه‌ك به‌نیگاو سروش، چونکه ئه‌گه‌ر به‌نیگا بوایه سوله‌یمان نه‌یده‌توانی هه‌لیوه‌شێنێته‌وه.

## حوکمی روداوی له‌و جۆره له‌شه‌ریعه‌تی ئیسلامدا به‌م جۆره‌یه:

به‌لای ئیمامی شافعیه‌وه ئه‌گه‌ر به‌شه‌و ئاژه‌ل زیانی له بێستان‌وکشت‌وکال دا پێویسته کابرای خاوه‌ن ئاژه‌ل قه‌ره‌بووی زیانه‌که بکاته‌وه، چونکه واباوه خاوه‌ن ئاژه‌ل شه‌وانه‌ئاژه‌له‌کانی چاودێری ده‌کاو ناهێلێ به‌ملاو به‌ولادا بڕۆن، به‌لام ئه‌گه‌ر به‌رۆژ بوو خاوه‌ن ئاژه‌ل نابێته به‌رپرسی، چونکه پێویسته به‌رۆژ خاوه‌ن زه‌رعات‌و

باخو بێستان پارێزگاریی کشتوکاڵی خۆی بکا، پێغەمبەر ﷺ کاتێك وشترەکەی (البراء) چوبوە ناو باخو بێستانی کابرایەکەوەو زیانی بەباخەکە گەیاندبوو بەم شێوە حوکمی کردو فەرموی: ﴿علی اهل الأموال حفظها بالنهار، وعلی أهل الماشية حفظها بالليل﴾ [١٦] خاوەن کشتوکاڵ دەبێ بەرۆژ چاودێری ماڵی خۆی بکا، خاوەن ئاژەڵیش دەبێ بەشەو ئاگای لەئاژەڵەکانی خۆی بێ.

بەلای ئەبو حەنیفەوە، خاوەن ئاژەڵ قەرەبوو کردنەوەی لەسەر نیە مەگەر شوانی لەگەڵ دا بێ. چونکە پێغەمبەر ﷺ ((جرح العجماء جبار))[١٧] واتە: ئەوەی حەیوانات زیانی پێ دەگەیەنێ بەفیڕۆ دەڕواو قەرەبوو کردنەوەی تێدا نیە.

ئەمجار دێتە سەرباسکردنی ئەو نیعمەتە تایبەتیانەی بەحەزرەتی داود ﷺ بەخشرابوون، دەفەرموێ: ﴿وَكُلاًّ آتَيْنَا حُكْماً وَعِلْماً وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُودَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ﴾ کێوەکانو باڵندەکانمانو گەردنکەچ کردن بۆئەوەی لەتەك داود ﷺ دا تەسبیحاتی خودا بکەن، هەرکاتێ حەزرەتی داود ﷺ بەدەنگ زەبووری بخوێندایە باڵندەکان لەحەوادا رادەوەستانو لەنگەریان دەگرت، کێوەکانیش بۆیان رەت دەکردەوەو تەسبیحاتیان لەگەڵ دەکرد، ئەمە زیاتر حەزرەتی داودی ﷺ هەڵدەنا بۆ بەردەوام بوون لەسەر ذیکرو خوداپەرستیو لەهەستو شعوریدا کاریگەری دەنواند، پێغەمبەر ﷺ دەنگو ئاوازی ئەبوموسای ئەشعەری بۆ قورئان خوێندن شوبهاندوە بەدەنگی داود ﷺ. لەفەرمودەیەکدا کەئەحمەدو نەسائیو ئیبنوماجە لەئەبوهورەیرەو نەسائی لەعائیشەوە ڕیوایەتیان کردوە، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی دەنگخۆشی ئەبو موساوە فەرمویەتی: ((لقد أوتی مزماراً من مزامیر آل داود)).

---

([١٦]) ئەم فەرمودەیە ئیمام ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنوماجە لەحیراص کوری موحەییصەوە ریوایەتیان کردوە.

([١٧]) دەقی فەرمودەکە بەم جۆرەیە: ((العجماء جرحها الجبار)) ئەحمەدو خاوەنانی شەش کتێبە حەدیثە کان (اصحاب الكتب الستة) لەئەبو هورەیرەوە ریایەتیان کردوە.

لەئايەتەکەدا کێوەکان پێش باڵندە خراون، چونکە رام بوونو تەسبیحاتی کێوەکان سەرسوڕهێنەر ترەو زیاتر دەسەڵاتو قودرەتی خودا دەردەخەنو، موعجیزە کە گەورەترە، چونکە کێوەکان جەمادو بێ گیانن، باڵندەکان گیاندارن.

وەزوبان هاتنی کێوەکانو باڵندەکان بەم جۆرە بووە خودا توانای قسەکردنی تێدا رەخساندبنو وەزوبانی هێنابوبن، وەکوو چۆن خودا هێزی قسەکردنی لەودارەدا دروست کرد: کەلەگەڵ حەزرەتی موسادا ﷺ ئاخاوتنی ئەنجام دا. بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَكُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ئێمە دەتوانینو توانیومانە ئەو جۆرە شتانە بکەین، وەزوبانهێنانی بێ زوبانو بێ گیان لای ئێمە ئاسانە هەرچەندە ئێوە بەلاتانەوە گران بێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَـكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الاسراء/٤٤)

﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ﴾ واتە: داودمان فێری زرێ دروستکردن کردبوو، بۆئەوەی بیکەنە پۆشاکی خۆتان، حەزرەتی داود ﷺ پیشەی زرێ دروستکردنی داهێنا، لەپێش ئەودا: کەزرێیان دروست دەکرد بەشێوەیەکی سەرەتایی دروستیان دەکردن، حەزرەتی داود ﷺ شێوەی حەلقە حەلقەی تێدا هێنانەدی.

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ، أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾ (سبأ/١٠-١١) واتە: ئاسنمان بۆ نەرم کرد، پێمان گوت: زرێ دروست بکە بەشێوەیەك: کەئەڵقەکانی فراوان نەبن.

فێری دروستکردنی زرێو تاسکڵاومان کرد: کەئێوە سوودی لێ وەردەگرن، واتە: ئەو پێشە سازییە وردە وردە پەرەی سەندو پێشکەوتنی بەخۆوە بینی، لەدوای ئەو خەڵك فێری بوون تاگەییشتە سەردەمی ئێوە، ئێوە ئێستا بەکاری دەهێنن بۆئەوە لەرمو سزای دوژمن بتانپارێزێ، کەواتە: ئەو بەهرەو دەستڕەنگینی یەی بەداودمان بەخشی، بوو بەبەهرەو ئێوەش سوودی لێ دەبینن، نیعمەتی

خودایە بەسەر ئێوەشەوە ﴿فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ ؟﴾ ئایا ئێوە ئەی ئادەمیزادانی سەردەمی پێغەمبەرو چەرخەکانی دوایش! سوپاسی خودا دەکەن لەسەر ئەو نیعمەتەی داویەتی بەئێوە: کەبۆ بەرژەوەندیی ئێوە داوودی فێری زرێ دروستکردن کرد؟!

هەڵبەتە ئەم ئیستفهامە بۆ موبالەغەو تەقریعە، واتە سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەم پیشەسازییەی فێری داودی کردو ئێوەش سوودی لێ وەردەگرن! ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کەحەزرەتی داود ﷺ یەکەم کەس بووە، زرێو کڵاو خوذەی دروستکردوە، دوایی خەڵك لەوەوە فێر بوونو برەویان پێ دا. پێش ئەوەی خودا داود ﷺ فێری ئەو پیشەیە بکا ئادەمیزاد نەیاندەزانی شتی وافەراهەم بێنن، نەیاندەزانی زرێ وادروست بکەن لەبەرکردنیشی ئاسان بێو لەزەبری دوژمنیش بیانپارێزێ، بەڵکوو جەنگاوەرەکان لەترسان ئاسنیان تەنك دەکردو وەکوو پارچە پلێت بەخۆیانەوە شەتەکیان دەدا، دیارە ئەمەش نەدەگونجا لەگەڵ هەڵمەت بردنو راکردنو گەلێ جمو جوڵی تر کەلەجەنگا پێویست دەبێ!

ئەمە ئەو رێزو شکۆمەندییە بوو: کەبە حەزرەتی داود ﷺ بەخشرا بوو، ئەوەی کەبە حەزرەتی سولەیمان ﷺ بەخشرا بوو زۆر لەوە گەورەتر بوو.

قەتادە دەفەرموێ: پەروەردگار سولەیمانی ﷺ کردە جێگری داودو ﷺ فەرمانڕوایی‌و پێغەمبەرێتی بەمیرات بۆ مایەوە زیاد لەوەش خودا (بای) بۆ مەرەخەس کرد بەویستی ئەو دەهاتو دەچو، هەروا شەیاتینی بۆ ملکەچ کردن، پابەندی فەرمانەکانی بوون. دەفەرموێ: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ﴾ واتە: بای بەهێزو تەوژمان بۆ سولەیمان ﷺ مەرەخەس کرد، ملکەچو فەرمانبەرداری بوو، بەپێی ویستو حەزی حەزرەتی سولەیمان ﷺ با دەهاتو دەچوو، خۆی‌و دارو دەستەکەی بەهۆی باوە دەگوازرانەوە بۆ خاکی پیرۆز، ئێمە زانایین بەهەمووشتێك ودەزانین کارەکان چۆن هەڵدەسوڕێن. هەرکاتێ بیویستایە خۆی‌و هاوەڵانی بەیانی سواری بادەبوونو بەرەو

وڵاتی شام دەکەوتنەڕێو لەرۆژێکا دەیتوانی بەهۆی ئەو بایەی بۆی مەرەخەس بوبو مانگەڕێیەك ببڕن‌و دوایی بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان. واتە: هەرچەندە بایەکە خۆی لەخۆیدا نەرم‌و نیان بوو بەڵام لەکارکردن دا توندو بەهێزو بەتەوژم بوو.

مامۆستا سەیید دەفەرموێ: لەبارەی چۆنیەتی هەڵس‌و کەوتی سولەیمان‌و موسەخەر بوونی بابۆی ریوایات‌و قسەو باس زۆر کراون‌و نوسراون، زوربەی زۆریان مۆرکی ئیسرائیلیاتیان پێوە دیارەو وەهم‌و خەیاڵ دروستی کردون، بەڵام ئێمە ناچینە ناو ئەم جەنگەڵە بێ سەرو بنەو خۆمان ناخەینە ناو ئەم دەریا قوراوەوە، لەسنووری دەقەکانی قورئان دەرناچین، چونکە جگە لەقورئان سەرچاوەیەکی ترمان بەدەستەوە نیە، بەتایبەتی لەبارەی سولەیمانەوە ﷺ هەواڵی راستیمان بداتێ.

دەقە قورئانیەکە لێرەدا ئەوە دەچەسپێنێ کە(با) بۆ سولەیمان ژێر بار بووەو رام بووە بەتین‌و تەوژم بووە بۆ جێبەجێ کردنی داخوازییەکانی سولەیمان ﷺ.بەفەرمانی ئەو بەرەو خاکی پیرۆز ـ کە وادیارە وڵاتی شام بووە ـ بەیانی رۆیشتوەو ئێوارە گەڕاوەتەوە.. قسەو باسی زۆر لەسەر فەرشەکەی سولەیمان نوسراوە، کتێبەکانی تەفسیر لەخۆیان گرتووە، پوختەکەی ئەوەیە: دەڵێن حەزرەتی سولەیمان ﷺ لەتەختەودار جێگاو شوێنێکی گەورەو فراوانی دروست کردوە. هەرکاتێ بیویستایە گەشت‌و گوزارێ بۆ وڵاتێك بکا، بەخۆی‌و لەشکرو دارو دەستەیەوە دەچوونە سەر ئەو تەختە گەورەیەو بەسەریەوە دادەنیشتن، ئەمجار فەرمانی بە (با) دەکرد کەهەڵیان بگرێ بۆ ئەوشوێنەی مەبەستیانە، یەکسەر باهەڵی دەگرتن‌و دەیبردن‌و دەیگەیاندنە شوێنی مەبەست! ئەو بایە ئەوەندە بەهێزو تەوژم بوو لەتاقی بەیانی دا رێگای مانگە رێیەکی بەرۆیشتنی کاروانی حوشتر دەبرێ‌و تاقی ئێوارە دەگەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی: کەتاقی بەیانی لێی بەڕێ کەوتبوون، وێڕای ئەم خێرایی رۆیشتنەش تەختەکە تاسەو لەنگەریی پێ

نـەدەكردن، بـەڵكوو زۆر بـەرێك و پێكـی دەگەیـشتنە جێگـای مەبەسـت. تەنانـەت ریوایەت كراوە: كە هەركاتێ با تەختەكـەی بـەرز دەكـردەوە باڵنـدەكانیش صـەفیان دەبەست بەسەریانەوەو سێبەریان لێ دەكردن بۆ ئەوەی لەگەرمی خـۆر بیانپـارێزن. لەشـوێنێكی تـردا قورئـان ئامـاژە بـۆ فەرمانبـەرداریی بـا دەكـا بـۆ ئەنجامـدانی داخوازییەكانی حەزرەتی سولەیمان ﷺ دەفـەرموێ: ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ (ص/٣٦)

دەربـارەی خێـرا رۆیـشتنەكەشی دەفـەرموێ: ﴿غُـدُوُّهَا شَـهْرٌ وَرَوَاحُهَـا شَـهْرٌ﴾ (سبأ/١٢).

هەڵبەتە قورئانی پیرۆز هیچی لەبارەی چۆنیەتی تەختەكـەی سولەیمانەوە بـۆ باس نـەكردوین، هـەروەها لەفـەرموده صـەحیحەكانی پێغەمبـەریش دا لـەم بـارەوە هەواڵێكی راستە ڤینەمان بەدەستەوە نیە، بۆیە پێویستە لەراسـتە مانـای ئایەتەكـە لانـەدەین و تەفـسیرو شـیكردنەوەی بـێ سەرچـاوەی بـڕوا پێكـراو نەكـەین. بـەڵكوو هەرئەوەندە بڵێین پـەروەردگار بـای موسـەخەر كـرد كـە: بـەپێی فـەرمان و ویـستی حەزرەتی سولەیمان ﷺ دەهات و دەچـو، بـەرۆژێك رێگـای مانگەرێیـەك بـەكاروانی حوشتری دەبڕی و دەشگەڕایەوە بۆ شـوێنی خـۆی. ئـەمجار ئەمـە چـۆن بـووەو چـۆن نەبوە؟ ئەوە عائید بەزانیاری خودایەو پێویست ناكا ئێمە بێ هەبوونی سەرچاوەی راست و بڕواپێكراو دەمی لێ بكوتین، هەرشتێ قورئـان و فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ بەڕەوای بزانن و هەواڵمان بدەنێ لەبارەیەوە، ئێمە بـڕوامان پێیەتی، ئەمجار چۆنەو چۆن دەگونجێ ئەوە وابێ،؟ لەراستی دا ئەوە كاری موسـوڵمان نیـەو نـابێ ئێمـە ئـەم جۆرە پرسیارانە ئاڕاستە بكەین، چونكە دەسەڵات و توانای خـودا رەهـاو مـوطلەقـە، هەڵسوڕان و یاساو رێساداناں بۆ كـەون بەدەسـت خـودا خۆیـەتی، مـەرج نیـە ئێمـەی ئـادەمیزاد ئاگـاداری یاسـای بوونـەوەر بـین. بـەڵكوو ئـەوەی ئێمـە لـەبارەی یاسـای بوونەوەرەوە دەیزانین زۆر كەمە، هیچ دوریش نیە چەند یاسایەك هەبن ئادەمیزاد

پێیان نەزانیٚ، ئەو یاسایانە لەگەڕدا بن‌و لەبڕێ کات دا خودا بیەوێ ئاثاریی ئەو یاسایانە دەربکەوێ‌و زوربەی کاتیش نهێنی بن. ﴿وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ﴾ ئێمە بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارین، حەقیقەت‌و چۆنیەتی هەموو کارێك دەزانین‌و ئاگامان لێیەتی.

نیعمەتێکی تر کە: خودا بەسولەیمانی ﷺ بەخشیبوو ژێرباربوونی شەیاتینی بوو بۆی دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ الشَّيَاطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ﴾ واتە: کۆمەڵێکمان شەیاتینی بۆ سولەیمان ﷺ موسەخەر کردبوو بەفەرمانی ئەو دەچوونە بنکی دەریاکان‌و ناوزکی زەوی‌و گەنج‌و جەواهیرات‌و لوئلوئو مەرجانیان بۆ دەردەهێنا. ﴿وَيَعْمَلُونَ عَمَلاً دُونَ ذَلِكَ﴾ هەروەها کاری تریشیان بۆ ئەنجام دەدان وەکوو بنیاتنانی شارو کۆشك‌و تەلارو باڵەخانەو میحراب‌و پەیکەرو، قاپ‌و قاچاخی ناومال‌و حەوزی ئاوو قازانی دامەزراو لەسەر سێ کوچکە...هتد.

وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاء وَغَوَّاصٍ ، وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ (ص/٣٧-٣٨) یان دەفەرموی: ﴿يَعْمَلُونَ لَهُ مَا يَشَاءُ مِن مَّحَارِيبَ وَتَمَاثِيلَ وَجِفَانٍ﴾ (سبأ/١٣) پیشەسازی تریشیان بۆ دادەهێنا دەڵێن: حەمام‌و ئاشی ئاوو شوشەو صابونیش لەبەرهەم‌و کردەوەی ئەوانە. ﴿وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ﴾ ئێمە چاودێرو یاریدەریان بووین، نەمان دەهێشت ئەو شەیاتینانە سەرپێچی بکەن‌و فەرمانی سولەیمان ﷺ جێبەجێ نەکەن.. هەروا نەماندەهێشت زیان بەسولەیمان ﷺ بگەیەنن. دەسەڵات‌و توانایەکی رەهامان دابوو بەسولەیمان ﷺ بەسەریان دا، ئەگەر بیویستایە بەندی دەکردن‌و دەست‌و پێی بەزنجیرو کەلەپچە دەبەستن، وەکوو لەسورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾ بەڵکوو توانیویەتی جۆرەها سزاو ئەرك‌و نارەحەتی تریان بەسەردا بدا.

جن یان بەکوردی جندۆکە عالەمێکی نادیارن لەئێمە، لەچەند شوێنێکی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە دەکا: کەعالەمێك هەیە پێیان دەوترێ (جن)و لەئێمە

نادیـارن جـاری واهەیـە بەشـەیاتین ناویـان دێنـێ. هەڵبەتـە شـەیاتینیو جـن هەردوکیان ناون بۆ یەك تیرە، بەڵام شەیاتینی تایبەتـە بەوانـەوە: کـەکافرن (جـن) نـاوە بـۆ ئـەوان بـەکافرو موسـوڵمانیانەوە. جاکـەلێرەدا بەشـەیاتینی ناویـان دێنـێ ئاماژەیە بەوە کەئەو ژێر بارخراوانە کافر بوون کەلەسورەتی (سبأ) دا دەفـەرموێ: ﴿ومن الجن﴾ هەر مەبەستی ئەو تاقمە کافرانەیانە.

**تێبینی:**

ئایەتەکـە بەڵگەیـەکی بـەهێزە کـە: پـیشەسازیی کـارێکی پـیرۆزەو وەسـتاییو دەستڕەنگینی بەهرەنو کارکردن شەرەفەو لای خودا پەسەندە، پەروەردگار هـەواڵی پێـداوین: کـەداود ﷺ زرێو کـڵاو خـودەی دروسـت کـردوە. پێغەمبـەریش ﷺ فەرمویەتی: داود ﷺ لەبەروبوومی دەستی خۆی بژێوی فەراهەم هێناوە، کارکردن گـەورەترین کاسـبیـیە، حـەزرەتی ئـادەم ﷺ جووتیـار بووە،حـەزرەتی نـوح ﷺ کەشتی دروست کردوەو دارتـاش بـووە، طـالووت دەباغـچی بـووە، یـان ئـاودێر بـووە، حەزرەتی موسا ﷺ شوان بووە.. حـەزرەتی ئیـدریس ﷺ و لوقمـان ﷺ خـەیات بـوون، ئەمانـە هـەموو بەڵگـەن لەسـەر ئـەوە کـە: کـارکردن مەنهـەجو بەرنامـەی پێغەمبـەرانو پیاوچـاکان بـووە، خوداپەرسـتانو دڵسـۆزانی ئـایین بـەڕەنجی شـانی خۆیان بژێویان بۆ ماڵو منداڵیان فەراهەم هێناوە.

بێگومـان ئـایینی ئیـسلام کـارکردنی بـەلاوە پەسـەندەو بەئـەرکێکی پێویـستی دانـاوە، هەرکەسـێ بتـوانێ کاربکـا پێویـستە لەسـەری کارێـك بۆخـۆی رەچـاو بکـاو بژێوی خۆیو ماڵو منداڵی لێ دەستەبەر بکا. دژی بێکاریو تەمبەڵیو تەوەزەلییـە، پـەروەردگار بێکـارەو تەمبـەڵی خـۆش نـاوێن: بوخـاریو موسـلیمو نەسـائی لەئـەبو هورەیرەوە فەرمودەیەکیان ڕیوایەت کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویـەتی: ﴿لأن يأخذ احدكم حبله ثم يغدوا الى الجبل فيحتطب فيبيع، فيأكـل وتـصدق خـير لـه مـن ان

يسأل الناس﴾ ئەگەر یەکێ لەمێوە تاوداتە تەورو گوریسەکەی بەیانی رووبکاتە کێوو کەژو بەکۆڵ داربێنێو بیفرۆشێو بژێوی خۆی لێ دەستەبەر بکاو لێی ببەخشێ، ئەوە زۆر لەوە باشترە بچێ دەست لەخەڵك پان بکاتەوەو سواڵ بکا!!

## سەرگورشتەی چیرۆکی حەزرەتی ئەیوب ﷺ

﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾

لەوە پێش پەروەردگار چیرۆکی پێنج پێغەمبەری بۆ گێڕاینەوە (ئیبراهیم‌و لوط و داودو سولەیمان) ئاماژەی کرد بەبڕێ لەناخۆش‌و تەنگ‌و چەڵەمەی کە توشیان بووە لەپێناو بانگەوازیەکەیان دا، بەو بەڵاو ناخۆشیانە خودا بەتاقی کردونەوەو لەبۆتەی داون. لێرەشدا بەسەرهاتی حەزرەتی ئەیوبمان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە: کەپەروەردگار بەچەند بەڵاو موصیبەتێك لەخودی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی دا بەتاقیکردنەوەو لەبۆتەی دا. حەزرەتی ئەیوب ﷺ یەکێکە لەپێغەمبەرەکانی نەتەوەی ئیسرائیل، ناوی ئەیوبە کوڕی ئەنوصە. دەچێتەوە سەر ئیسحاقی کوڕی یەعقوب ﷺ دایکی لەنەتەوەی حەزرەتی لووطە. لەوڵاتی (عوص) لەکێوەکانی سەعیر یان وڵاتی سەدوم بووە. هەندێك پێیان وایە زۆر پێش حەزرەتی موسی ﷺ بووە. هەندێکی تر دەڵێن: سەدساڵێك پێش حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بووە.

خودا دەسەلات و ماڵ و منداڵی زۆری پێ بەخشین، ماوەیەك لەناو ئەو نازو نیعمەتەدا ژیانی بەسەر برد، پاشان خودا ئەمانەی هەموو لێ سەندەوەو دوچاری نەخۆشیشی کردو ماوەیەکی زۆر بەم نەخۆشیەوە تلایەوە، هەندێك دەڵێن: هەژدەساڵ درێژەی کێشا،هەندێك دەڵێن: سیانزە ساڵ بووە، هەندێکی تر دەڵێن: حەوت ساڵ و نیو نەخۆش بووە، بەلام نەخۆشیەکەی وانەبووە خەڵك بێزی لێ بکاتەوە، چونکە پێغەمبەران لەوجۆرە نەخۆشییە قێز لێکراوانە پارێزراون! کەوابوو ئەو قسەو باسانەی کەدەڵێن: گوایە تووشی نەخۆشی گولی بووەو کرم لێیداوە بێ ئەصڵ و ئەساسەو هیچ پاڵپشتێکی بڕوا پێکراوی نیە.

سەرباری نەخۆشیە درێژخایەنەکەی، خودا منداڵەکانیشی لێ ستاندەوە، خانویان بەسەردا روخاو هەموویان مردن، ماڵ و سامانیشی هەموو تێداچوو، هەژار کەوت! بەمجۆرە خودا بەتاقی کردەوەو لەبۆتەی دا، لەتاقیکردنەوەکە دەرچوو، نەخۆشی جەستەو مردنی منداڵ و فەوتانی ماڵ و سامان نەیانتوانی لەیادو ذیکری خودا بێ ئاگای بکەن لەخودا پەرستیدا سستی بێنێ، یان ناشوکرێ بکاو بەکاری خودا نارازی بێ.

هەڵبەتە لێرەدا قورئان زۆر بەکورتی دەستنیشانی ئەو ناخۆشیو بەلایانە دەکا: کەتووشی ئەیوب عليه السلام بوو، ئەوەی زۆر بەگرنگی نیشانی دەدا، هاوارو پاڕانەوەکەیەتی لەخوداو بەهانا هاتنی پەروەردگار بۆی و رزگارکردنی لەو بەلاو موصیبەتانەیە.

دەفەرموێ: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بۆ پەندو ئامۆژگاری و عیبرەت وەرگرتن و تەسەللا هاتنەوەی خۆت و شوێنکەوتوانت سەرگوزشتەی ئەییوب یادبکەرەوەو بگێڕەوە: کەتووشی بەلای نەخۆشی جەستە بوو، منداڵەکانی بەکۆمەڵ لەناو چوون، ماڵ و دارایی هەموو فەوتا، لەوکاتەدا: کەلەخودا پاڕایەوەو هاواری بۆ پەروەردگاری خۆی برد وتی: خودایە! من تووشی زیان و ناخۆشی بووم، وام لێ هاتووە شیاوی بەزەیی پێدا

هاتنـەوەم، چـاوەڕێی بەفریاکـەوتن‌و ڕەحمـەتی بـەرفراوانی تـۆم. ﴿وَأَنْـتَ أَرْحَـمُ الـرَّاحِمِينَ﴾ تـۆیش لەهـەموو کـەس بـەڕەحم تـری! ئـیتر کـەیفی خۆتـەو مـن بـێ دەسەڵاتم! بێگومان لەپێشەوە ئاماژەمان پێ کرد نەخۆشییەکەی درێژ خایـەن بـوو، وەڵێ وانەبوو خـەڵك بێـزی لێ بکەنـەوە چونکە پێغەمبـەران لـەوجۆرە نەخۆشـیانە پارێزراون‌و بەدوورن. بەدرێـژایی نەخۆشـیەکەی خێزانەکـەی داڵـدەی دا، خزمـەتی کـردو دڵخۆشـی دایـەوە، بەڕاسـتی نموونـەی خێزانـی بـەوەفاو ئـافرەتی خـۆڕاگرو خزمەتگوزار بوو، ئافرەتێکی میثالی و شەکرە ژن بوو، بەتـەواوی مانـا ڕەوشـتەکانی (المرأة الصالحة) ی تێدا بوون، بەوەفاو عەطف‌و حەنانی خـۆی زۆری ئـێش‌و ئـازاری لەحەزرەتی ئەییوب عليه السلام کەم کردبوەوە.

پێغەمبـەر ﷺ لەفەرموودەیـەکی‌دا کـە ئیمـام ئەحمـەدو بوخـاری‌و تیرمیـذی‌و ئیبنو ماجە لەسەعدەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: ((أشد الناس بلاءً الأنبياء ثم الصالحون ثم الامثل فالأمثل يبتلى الرجل على حسب دينه، فان كان فى دينـه صلباً اشتد بلاؤه)).

حەزرەتی ئەیوب عليه السلام لەپاڕانەوەکەیدا هەر ئەوەندە دەڵێ: خودایە! من تووشی زیان‌و نـەخۆشی بـووم. وەصـفی پـەروەردگاریش بەصـیفەتێك دەکا: کەتایبـەت هـی خۆیەتی‌و دەفەرموێ تۆلەهەموو خاوەن ڕەحمێك بەرەحم تری. ئیتر داوای گۆڕانی حاڵی خۆی ناکاو خۆگرە لەبەرامبەر ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی تێیان کـەوتووە، لەبـەر ئەدەب‌و حیشمەتی لەبەردەم پەروەردگاریدا پێشنیاری لابردنی نەخۆشیەکانی ناکا. بەڕاستی حەزرەتی ئەیوب عليه السلام نموونەی بەنـدەی خـۆگرو پـشوو درێـژو بەهیمـەت بووە، ئەو هەموو بەڵایەی لێ کۆبووبوونەوە، دڵی تەنگ نەبوو نـاڕەزایی دەرنـەبڕی، ناشوکری نەکرد! بۆیە بۆتە سەرمەشق‌و خاوەن صەبری میثالی‌و بەدرێژایی مێـژوو نموونەی خۆڕاگرانە! لەبواری خاوەن صەبرو پشوو درێژی دا بەنموونـەی دەگمـەن‌و ناوازە دەست نیشان دەکرێ، سوبحانەڵلا شەرم دەکا لەوەی داوا لەخودا بکـا بەڵاکەی

لەسەر لابەرێ، ئیشەکە حەوالەی پەروەردگار دەکاو دڵنیایە لەوەی کە پەروەردگار ئاگاداری حاڵو وەزعیەتی، ئیتر بەپێویستی نازانێ داوای لابردنی ناخۆشیەکانی لێ بکا.

﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ﴾ بەهانایەو هاتینو دوعاو پاڕانەوەکەیمان وەرگرتو دەردو بەڵاکانیمان لەسەر لابردو جەستەو لەشو لاری لەنەخۆشی چاك بۆوە.

﴿وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ﴾ ئەو ماڵو منداڵەی نەمابوون پێمان بەخشییەوە، بەم رەنگە زیندوو کرانەوە بۆی. یان قەرەبووی ماڵو منداڵەکانیمان بۆ کردەوە، بەئەندازەی منداڵە مردوەکانی منداڵی ترمان پێ دایەوە، ئەوەندەی تریشمان بۆ زیاد کردن، لەخێزانەکەی دوو هێندەی جاران منداڵی بوون، یان بەئەندازەی پێشوو منداڵمان پێ دانەوە، ئەوانیش منداڵیان بوون بەمنداڵی خۆیو نەوەکانیەوە دوو هێندەی جارانیان لێ هات.

﴿رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ﴾ قەرەبووی ماڵو منداڵی پێشوومان بۆ کردەوە، لەڕوی رەحمەتو بەخششی خۆمانەوە، ئەوانەمان پێدایەوە، نەخۆشیمان لەسەر لابرد، بۆئەوەی خودا پەرستان بیکەنە نموونەو چاوی لێ بکەن، وەکوو ئەو بەصەبرو ئارام بن، بۆئەوەی وەکوو ئەو پاداش وەربگرنەوە، هەروەها بۆئەوەی هیچ کەس لە لێخۆشبوونو رەحمەتو بەخششی خودا نائومێد نەبێ، هەروەها موسوڵمانان پێیان وانەبێ چونکە خوداپەرستن نابێ تووشی بەڵاو ناخۆشی بن. بێگومان دونیا خانووی بەتاقیکردنەوەو لەبۆتەدانە. پەروەردگار بەندەکانی خۆی تێدا بەتاقی دەکاتەوە.

## چیرۆکی حه‌زره‌تی ئیسماعیل‌و ئیدریس‌و ذولکیفل دروودی خودایان له‌سه‌ر بێ

﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ (٨٥) وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُم مِّنَ الصَّالِحِينَ (٨٦)﴾

دوای گێڕانه‌وه‌ی سه‌رگورشته‌ی حه‌زره‌تی ئه‌یوب ﷺ و رانواندنی ره‌وشتی خۆڕاگری تێیدا، باسی سێ پێغه‌مبه‌ری خاوه‌ن صه‌برو پشوو درێژی تر ده‌کا که له‌به‌رامبه‌ر ته‌نگ‌و چه‌ڵه‌مه‌دا خۆیان راگرت‌و به‌رده‌وام بوون له‌سه‌ر طاعه‌ت‌و عیباده‌ت.

ده‌فه‌رموێ: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست! سه‌رگورشته‌ی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم‌و ئیدریس‌و ذولکیفل بۆ گه‌له‌که‌ت بگێڕه‌وه‌، هه‌ر یه‌کێ له‌م زاتانه له‌پێڕی خاوه‌ن صه‌برو ئارامه‌کان بوون.

یه‌که‌میان: که ئیسماعیله‌، صه‌برو خۆڕاگرییه‌که‌ی گه‌یشته راده‌یه‌ك بێ دوو دڵی ئاماده بوو بۆ سه‌ربڕین، خودا به‌تاقی کردوه‌و له‌تاقیکردنه‌وه‌که ده‌رچوو، بۆته نموونه‌ی کوڕی گوێ ڕایه‌ڵ‌و ملکه‌چ بۆ قه‌زاو قه‌ده‌ری خوداو فه‌رمانی باوکی.

به‌ڵام ئیدریس‌و ذولکیفل کات‌و شوێن‌و به‌سه‌رهاتیان نادیاره‌، ئێمه‌ چ له‌هه‌واڵ‌و سه‌رگورشته‌یان نازانین، هه‌رچه‌نده به‌نیسبه‌ت حه‌زره‌تی ئیدریس ﷺ قسه‌یه‌ك هه‌یه‌: ده‌ڵێ: حه‌زره‌تی ئیدریس ﷺ ، ئه‌و ئۆزوریسه‌یه که‌پاش مردنی میسرییه‌کان په‌رستویانه‌و گه‌ڵێ حیکایه‌ت‌و ئوسطوره‌ی جیا یان پێوه ناوه‌.

بەماموستای یەکەمی ئادەمیزادی دەژمێردرێ، ئەو کشتوکاڵو پیشەسازی داهێناوەو هەڵی گرتووە. بەڵام ئەمانە هەموو قسەنو بەلگەیەکی بەهێزمان بەدەستەوە نیە دەربارەیان.

ماموستا سەید دەفەرموێ: بائێمە بزانین کە ئیدریس ﷺ لەوخاوەن صەبرانەیە کە شیاوی ئەوەیە ناوی لەکتێبی پەروەردگاردا تۆمار بکرێ.

دەربارەی حەزرەتی ذولکیفل هیچ زانیاریەکمان نیە، ناتوانین بەدڵنیاییەوە سەردەمو شوێنی دیاری بکەین، زۆر لەزانایان پێیان وایە: پێغەمبەرێك بووە لەپێغەمبەرانی نەتەوەی ئیسرئیل. هەندێك پێیان وایە پیاوچاکێکی بەنو ئیسرائیسلی بووە. لەپێش مردنی یەکێك لەپێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل بەرعۆدە بووە: کەپاش مردنی سێ کار ئەنجام بدا، شەو نوێژ بکا، بەڕۆژ بەڕۆژو بێ، دادوەری بکاو، توڕەنەبێ، ذولکیفل پابەندی قسەی خۆی بوو، بەرێكو پێکی ئەو ئەرکانەی ئەنجام دان، بۆیە ناوی ذولکیفلی بۆخۆی تەرخان کردوە. بەڵام ئەمەش هەر قسەو باسە بەلگەیەکی بەهێز پاڵپشتی ناکا. وەلێ ئەوەی قورئان فەرمویەتی بەسەو زیاد لەوە پێویست نیە، ئەگەر پێویست بوایە قورئان لێی بێدەنگ نەدەبوو. قورئانی پیرۆز لەبارەی ئەم سێ پێغەمبەرە ڕێزدارەوە فەرمووی: ئەوانە لەپێری خاوەن صەبرەکان بوون. وێڕای ئەو رەوشتە بەرزەیان ﴿وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُمْ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ خستمانە ژێر رەحمەتی خۆمانەوە، لەو کەسانە بوون: کەرەحمەتی ئێمەیان بەسەردا رژا، پلەو پایەی پێغەمبەرێتیان پێ برا، لەپێری بەهەشتیانن، بەرەزامەندیو پاداشتی ئێمە بەهرەمەند بوون، لەکۆمەڵی تەواو راستاڵانن، چونکە پێغەمبەر مەعصومو بێ گوناهن. لەلایەن ئێمەوە بریاری پیاوچاکیو راستاڵییان بۆ دراوە.

## سەرگورشتەی چیرۆکی حەزرەتی (یونس) ﷺ

﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَـٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَـٰتِ أَن لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَـٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَـٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾

ئەمەش چیرۆکی حەزرەتی (یونس)ە، روداوی سەرسووڕهێنەری تێدا نمایش دەکرێ، یەکێکە لەخاوەن پێغەمبەرانی پلەو پایە، خودا فەضل و نیعمەتی خۆی بەسەردا رشت، وەکوو چۆن رەحمەتی خۆی بەسەر پێغەمبەرەکانی پێشوودا رژاندو لەتەنگ و چەڵەمە رزگاری کردن.

بەسەرهات و سەرگورشتەی ئەم زاتە لەسورەتی (الصافات) دا بەدورو درێژی باس کراوە.

لێرەدا زۆر بەخێرایی بەسەر چیرۆکەکەدا تێدەپەرێ، ئەمەش بەهۆی لەبەرچاوگرتنی مەبەستی سورەتەکەو بۆ تەناسوقی سیاقەکەیە. مەبەستەکەش زەق کردنەوەی لایەنی چاودێری خودا بۆ پێغەمبەران و فریاکەوتنیەتی بۆیان، دەفەرموێ: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِباً﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست چیرۆکی پێغەمبەرێکی تر بۆ قەومەکەت بگێڕەوە؛ چیرۆکی (یونس)ی کوڕی مەتا، کاتێک خودا کردی بەپێغەمبەرو ناردی بۆ سەردانیشتوانی نەینەوا لەوڵاتی موصل، ناوی پاشاکەیان (حزقیا) بوو.. حەزرەتی یونس بانگەوازی کردن بۆ خودا پەرستی و یەکتاپەرستی، کەس ئیمانی پێ نەهێناو سوور بوون لەسەر کوفرو بێ باوەڕی

خۆیان، ئەویش ڕقی هەڵساو بەتوڕەیی جێی هێشتن، هەڕەشەی هاتنی عەزابی لێ کردن، وتی: خودا پاش سێ ڕۆژی تر عەزابی سامناکتان بەسەردا دەدا.

جاکە حەزرەتی یونس جێی هێشتن، گەلەکەی ترسیان لێ نیشتو بەخۆیاندا چوونەوەو بۆیان مەعلووم بوو: کەپێغەمبەر درۆ ناکەن، هەموو دانیشتوانەکە لەشار چوونە دەرێ، منداڵو پیرو ئافرەتو ئاژەڵیشیان لەگەڵ خۆیان بردنەدەر، دایكو رۆڵەی ساوایان لێك جیاکردنەوە، هەموویان تێکڕا دەستی نزایان بۆلای خودا بەرز کردەوە کردیانە شینو زاریو هاوارو فوغان، وشتر بۆ بێچوەکەی دەیبۆڕاندو مانگا بۆ گۆلکەڵەکەی دەیهوڕاندو بزنو مەڕ بۆ کاریلەو بەرخۆلەکانیان دەیانباڕاند، ئیتر خودا عەزابی بۆ نەناردنو هەڕەشەکەی حەزرەتی یونس ﷺ نەهاتەدی، هەموویان ئیمانیان هێناو وازیان لەکوفرو بێدینی هێنا، وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلاَ كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلاَّ قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الخِزْيِ فِي الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ (یونس/٩٨)

لەم لایشەوە حەزرەتی یونس ﷺ سەری خۆی هەڵگرتو رۆیی تاگەیشتە سەر دەریاو لەگەڵ کۆمەڵێك ڕێبواردا سواری کەشتی بوون، پاش ماوەیەك کەشتی کەوتە تاسەکردنو لەرەلەر، سەرنشینەکانی ترسی مردنیان لێ نیشت، دوایی بڕیاریان دا: کەبەقورعە یەکێکیان بخەنە ناو دەریاوە، بۆ ئەوەی باری کەشتیەکە سووك ببێو هەموویان تێدا نەچن. قورعەیان ئەنجامداو لەسەر یونس ﷺ نیشتەوە، سەرنشینەکان نەیان ویست فڕێی دەنە دەریاوە، ویستیان بکەوێتە سەر یەکێکی تر پشکەکەیان هاویشتەوە هەر کەوتەوە سەر یونس ﷺ ! وەکوو لەشوێنێکی تردا قورئان ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنْ الْمُدْحَضِينَ﴾ (الصافات/١٤١) واتە: قورعەکە بەر ئەو کەوت!! ئیتر حەزرەتی یونس ﷺ بەناچاری پۆشاکەکانی لەبەر خۆی داکەند خۆی فڕێ دایە ناو دەریاوە، یان فڕێیان

دایە نـاو دەریـاوە، پـەروەردگار نەهـەنگێکی بـۆ نـاردو یەکـسەر هـەڵی لووشـی! کەدەفەرموێ: ﴿وَذَا النُّونِ﴾ واتە: خاوەنی ماسی: نازناوی (ذالنون) کەبۆ حەزرەتی یونس دانراوە لەم روەوە بووە.

کـە دەفـەرموێ: ﴿مُغَاضِـباً﴾ واتـە: رق هەڵساو لەگەلەکـەی چونکە بـەدرۆیان خـستەوەو بڕوایـان پـێ نـەکرد. هـەروا پێـی نـاخۆش بـوو کـەدوای سـێ رۆژەکـە هەڕەشەکەی نەهاتەدیو عەزابەکە نەهات.

﴿فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ پێی وابوو: ئێمـە تووشـی تەنگانـەو ناخۆشـی ناکـەین، لەسکی ماسیدا تەنگی پێ هەڵناچنین! سزای بەسەردا نادەین؟! بـەکورتی دەرچـونی لەشار دەشوبهایە حاڵەتی بەنـدەو کۆیلـەی هـەڵاتوو. ئـیتر کەنەهەنگەکـە قوتیدا کەوتە ناو تاریکی سکی ماسییەکەو تـاریکی دەریـاو تـاریکی شـەویش بەسـەریا هات ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ﴾ لەناو ئەو تاریکییانە هاواری لێ هەڵساو هانای بۆ خـودا بـردو کەوتە نزاو پاڕانـەوە ﴿أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّـي كُنـتُ مِـنْ الظَّـالِمِينَ﴾ دڵنیـام: کەهیچ خودا نین جگە لەتۆ ئەی پەروەردگار! باوڕم هەیەو بەزوبان ئیقرار دەکـەم: کەتۆ خودایەکی پاكوبێگەردی، لەهـەموو عـەیبو نـەنگیـەك دووریو دەسـەڵاتو توانـات رەهایـەو هەمیـشەیـیـە: هـیچ شـتێکت لێ عاسـێ نـابێو هەرچـی بتـەوێ ئەنجامی بدەی دێتـەدیو رەتبوونـەوەی نیـە. ئـەتۆ کاری بـێ جـێ ناکـەیو هـەموو ئیشێکت حیکمەتەو من ستەمم لەخۆم کرد، کە بەبێ فـەرمانی خـودا کۆچـم کـردو گەلو وولاتم جێ هێشت ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ﴾ ئێمەیش نـزاو پاڕانەوەکـەیمان لێ وەرگـرت، تۆبـەو گەڕانـەوەی قبـوڵ بـوو ﴿وَنَجَّيْنَـاهُ مِـنْ الْغَـمِّ وَكَـذَلِكَ نُنْجِـي الْمُـؤْمِنِينَ﴾ لـەو ناخۆشیو تەنگەبەرییـە دەرمـان هێنـا، لەغـەمو تـاریکی نـاو سـکی ماسی رزگارمـان کرد، فـەرمانمان بەنەهـەنگ کـرد لەقـەراخ دەریـا دەری هاویـشتەوە! چۆن (یـونس) مـان لـەو تـاریکیو تەنگانەیـە رزگـار کـرد، هـەر بـەو جـۆرە موسـوڵمانانی راسـتاڵ لەغەمو تەنگانـەرزگار دەکـەین ئەگـەر بەدڵسۆزی بگەڕێنـەوە بـۆلای ئێمـەو دوعـاو

پاڕانەوە ئاڕاستەی بارەگای ئێمە بکەن! مامۆستا سەیید دەفەرموێ: بێگومان ئەم بەشەی سەرگوزشتەی حەزرەتی یونس ﷺ جێگای سەرنج دان‌و لێ وورد بوونەوەیە، پێویستە کەمێك لەسەری بوەستین.

١- حەزرەتی یونس ﷺ نەیتوانی لەسەر ئەرکی راگەیاندن‌و پێغەمبەرێتیەکەی پشوودرێژ بێ‌و صەبرو ئارامی هەبێ. هەرکەقەومەکەی بانگەوازیەکەیان رەتکردەوە رقی هەڵساو تووڕە بوو، ئۆمەتەکەی بەجێ هێشت‌و وازی لەئەرکی پێغەمبەرێتی‌و بانگەوازیی هێناو سەری خۆی هەڵگرت، دڵتەنگ‌و سینە پڕ غەم‌و پەژارە ولاتی جێ هێشت، لەبەر ئەوە خودا خستیە تەنگانەیەکەوە سزاو تەنگ پێ هەڵچنینی بێ باوەڕەکان بۆی لەچاوی ڕا شایی‌و سەیران بوو، خۆئەگەر زوو پەشیمان نەبوایەوە بۆلای خودا نەگەڕایەوەو دانی بەستەمکاری خۆیدا نەنایە، هەرگیز خودا دەرووی لێ نەدەکردەوە، تارۆژی قیامەت لەو تەنگانەدا دەمایەوە، بەڵام قودرەتی خودا پاراستی‌و لەوتەنگانەیە رزگاری کرد!

٢- بانگخوازانی ئایینی رێگای خودا پێویستە پشوو درێژ بن، لەبەرامبەر بەدرۆخستنەوەو رەتکردنەوەی پەیامەکەیان‌و سزادانیان لەسەر بانگەوازیەکەیان پێویستە بار قوڵ بن. راستە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەری راستگۆو دڵنیا لە راستی پەیامەکەی لەسەر نەفسی گرانەو تاڵە! بەڵام دەڵێی چی، ئەوە برێکە لەئەرکی بانگەوازیی. پێویستە ئەوانەی ئەرکی بانگەوازیی دەخرێتە سەرشانیان‌و پێی هەڵدەستن خۆگرو پشوودرێژ بن بارقوڵ‌و دڵ فراوان‌و بەصەبرو ئارام بن، لەبانگ کردن‌و دووبارە بوونەوەی بانگەوازییەکەیان ماندو نەبن، بەبێ گوێیی‌و سەر رەقی بانگکراوان فسقەڵ نەبن.

٣- دەبێ بانگەوازی کەرانی رێگای خودا نائومێد نەبن لەئیمانهێنان‌و چاکبوونی بانگکراوانیان، چەندێك بێ گوێییان بەرامبەر بنوێنرێ‌و بەگژیاندا بێنەوە نابێ لەکاریگەریی پەیامەکەیان نائومێد بن، تەنانەت ئەگەر بۆجاری سەدەم بانگەوازییەکەی نەی پێکا باچاوەڕوان بێ بۆ جاری سەدو یەك، بانگەوازییەکەی

کاری خۆی بکا. تەنانەت ئەگەر هەزارجار بانگەوازیی دووبارە کردەوەو بێ سوود بوو بانائومێد نەبێ.

٤- بێگومان ئەرکی بانگەوازیکاران قورس‌و ئەستەمە، ڕێبازەکەیان پڕە لەکۆسپ‌و تەگەرە، دڵ نەرم کردن‌و بەپیرەوە هاتنی نەفسەکان هەروا کارێکی ئاسان نیە، گۆڕینی بیرو باوەڕو داب‌و نەرێت بەسوك‌و ئاسانی فەراهەم نایە، بەخۆشی دەستەبەر نابێ. چونکە تەم‌و مژو چڵك‌و ژەنگی گومڕایی‌و داب‌و نەریتی بەتاڵ‌و پووچ دڵ‌و دەروونی داگیر کردوون، پێویستە ئەو چڵك‌و ژەنگە، ئەو دارو پەردوە، ئەو چقڵ‌و چاڵە رابماڵدرێ، تاریکی گومڕایی بڕەوێنێتەوە، دڵ‌و دەرونەکان ئامادە بکرێن بۆ وەرگرتنی پەیام، هەموو هۆکارێك بخرێتە گەڕ بۆ زیندو کردنەوەی دڵەکان، پێویستە هەموو شێوەیەکی گونجاو بەتاقی بکرێتەوە. هەموو ڕێبازێکی لەبار رەچاو بکرێ، هەموو مەرکەزە هەستیارەکان دەستیان لێ بدرێ‌و بشکێندرێن بەڵکوو دەروازەیەك بدرۆزێتەوە بۆ ئەوەی پەیامی خودا بچێتە ناو دڵەکانەوە، بانگەوازییەکە مەبەستی خۆی بپێکێ.

بێگومان زۆر ئاسانە بۆ خاوەن دەعوە: کەفسقەڵ ببێ لەبەر ئەوەی کەخەڵکەکە بەپیر بانگەوازییەکەیەوە نایەن، بەئاسانی دەتوانێ لەخەڵکەکە دابڕێ‌و لەماڵی خۆی دانیشێ، ئەمە کارێکی ئاسانەو هەموو کەس دەتوانێ ئەو هەڵوێستە بنوێنێ، پاش ماوەیەك وردە وردە رقەکەی دەنیشێتەوەو ئەعصابی خاو دەبنەوە، بەڵام کوا ئەوە بانگەوازییە؟ کەی ئەوە بانگەوازیکارە؟ دەتوانێ بەدوورە پەرێزی چ ئەنجام بداو کێ بخاتە سەر ڕێگای راست؟!

بێگومان بانگخوازی‌و ڕێنمویی کردن مەبەستی سەرەکییەو ئەو بنەمایە، نەك بانگکەرەکە خۆی. کەوابێ بادڵتەنگ بێ‌و مەراق بخواو پیش بخواتەوەو ئازار بچێژێ بەڵام نابێ واز لەپەیامەکەی بێنێ‌و پالی لێ بداتەوە، باش وایەو پێویستە بەردەوام بێ لەسەر پەرەدان بەپەیامەکەی‌و گوێ نەدا بەهەڵوێستی بێ باوەڕان. بانگەوازیکەر ئامێرێکە لەدەستی قودرەتی خودادایە، خودا چاودێرو پارێزگاریەتی،

دەی با لەهەموو بارودۆخێك دا ئەركی خۆی ئەنجام بدا، هەر مەجالێكی دۆزیەوە هەل لەكیس نەدا.

بێگومان لەچیرۆكی حەزرەتی یونس دا ﷺ پەندو عیبرەت هەیە بۆ بانگەوازیكەران، پێویستە لێی وورد ببنەوە.

لەگەڕانەوەو بەخۆدا چونەوەی حەزرەتی یونس دا، لەئیعترافو دانانیدا بەوەی ستەمكارەو ستەمی لەخۆی كردوە پەندو عیبرەت هەیە بۆ خاوەن پەیامەكان، پێویستە تێی بفكرن لەرەحمەتو بەزەیی هاتنەوەی خودا بۆ حەزرەتی یونسو دوعاو پاڕانەوە گیرا كردنەكەیو رزگاركردنی لەتاریكایی ناو سكی نەهەنگ. موژدە هەیە بۆ خاوەن باوەڕان.

## سەرگورشتەی چیرۆكی حەزرەتی زەكەریاو حەزرەتی یەحیایە (سەلامی خوایان لێ بێت)

﴿ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾ وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩١﴾ ﴾

دوای رونکردنەوەی نیعمەتی تایبەتی هەر پێغەمبەرێك لەوانەی لەوە پێش باسی کردن، ئەمجار دێتە سەرباسی ئەو نیعمەتەی کە بەخشی بە حەزرەتی زەکەریا ﷺ بەوە: کەلەتەمەنی پیری‌و کەنەفتی خۆی‌و ژنەکەی دا خودا کوڕێکی پێ بەخشین، دوای ئەوەی زۆر خەفەتبار بوو کە وەجاخ کوێرەو بێ ئەولادە. ئەومبوو لەخودا پاڕایەوە کە منداڵێکی پێ ببەخشێ خەمڕەوێن بێ بۆی، پاڵپشت‌و هاریکاری بێ بۆ بەجێهێنانی ئەرکی دین‌و دونیای. دوای مردنیشی جێ نشینی بێ!

دوعاو پاڕانەوەکەی دڵسۆزانەو لەناخەوە بوو، بڕوای وابوو خودا دەتوانێ هەموو کارێك ئەنجام بدا، ئەگەر مەیلی لێ بێ، هەرچەندە خۆی‌و خێزانی گەیشتونە تەمەنی نائومێد بوون لەمنداڵ بوون، دەتوانێ منداڵیان پێ ببەخشێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەو کاتە حەزرەتی زەکەریا تەمەنی سەد ساڵ بوو خێزانەکەشی نەوەدو نۆ ساڵ بوو.

ئەمجار پەروەردگار چیرۆکی مەریەم‌و بەوەلەدبوونی عیسا ﷺ لەمەریەم باس دەکا.. چونکە دیاردەی لەدایك بوونی حەزرەتی عیساو ﷺ حەزرەتی یەحیا ﷺ وەکوو یەك سەرسووڕهێنەرن‌و موعجیزەن.

دەفەرموێ: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لا تَذَرْنِي فَرْداً وَأَنْتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! باسی ئەوکاتە بکە: کەزەکەریا ﷺ لەپەروەردگاری خۆی پاڕایەوە: کەکوڕێکی بداتێ بۆئەوەی دوای خۆی ببێتە پێغەمبەر، بەگۆشەگیری لەگەلەکەی نزای لەخودا کردو وتی: خودایە! چیدی بەتەنیا مەمهێڵەوە، باچیدی بەوەجاخکوێری‌و بێ میراتگر نەبم، منداڵێکم پێ ببەخشە دوای خۆم لەشوێنم دانیشێ بۆ بانگەوازیکردن‌و پەیام گەیاندن‌و پێغەمبەرێتی، کەلەپوری زانین‌و پێغەمبەرایەتیم لێ وەرگرێ، بێگومان دوای لەناوچونی دروستکراوانت خۆت دەمێنی‌و بەس! کەوابوو ئەگەر منداڵێکیشم پێ نەبەخشی ببێتە جێ نشینم ئەوە گوێ نادەمێ، چونکە تۆ خۆت میراتگری، ئەتۆ باشترین جێ نشینی‌و خۆت پارێزگاریی ئایینی خۆت دەکەی، وەلێ پێم خۆشە رۆڵەیەکم پێ

ببەخشێ گوێ ڕایەڵم بێ ئەو کارە خێرانەی: کەبەمنت سپاردوە دوای خۆم بەئەوی بسپێرمو فەرو بەرەکەتی بانگەوازیو پێغەمبەرێتی لەبنەماڵەکەم دا بەردەوام بێ.

﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَى وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ﴾ پاڕانەوەکەیمان وەرگرتو وەڵامی هاوارەکەیمان دایەوە، ئاواتەکەمان بۆ هێنایە دی، کوڕێکمان پێ بەخشی ناوی نا یەحیا ، نەخۆشی نەزۆکیو منداڵ نەبوونمان لەسەر خۆیو خێزانەکەی لابرد، دوای نەزۆکیو وەجاخکوێریو پیریو کەنەفتی منداڵی بوو.

چیرۆکی لەدایك بوونی یەحیا لەو دایكو باوکە پیرو نەزۆکە بەدورو درێژی لەسورەتی (ال عمران)و سورەتی (مریم) دا باسکراوە، لێرەدا بەکورتی باسی دەکاتو وای دەهێنێ کەلەگەڵ سیاقەکەدا بگونجێ، ڕەحمەتو بەزەیی خودا بگەیەنێ، ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ بێگومان ئەوانەی لەپێغەمبەرانن بەزەکەریياو خێزانەکە شیەوە، لەو بەندە دڵسۆزو ڕاستاڵانەبوون: گورجو گۆڵ بوون بۆ ئەنجامدانی طاعەتی ئێمە بەخێرایی ئەنجامیان دەداو تەمبەڵییان تێدا نە دەکرد. پەروەردگاریش خێرا وەڵامی داواکەی دانەوەو دوعاکەی گیرا کردن.

﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَباً وَرَهَباً﴾ نزاو پاڕانەوەی خۆیان ئاڕاستە دەکردین، هیوایان بەرەحمەتو فەضلی خودای خۆیان هەبوو.

واتە: هانایان بۆ خودا برد بەتەمای پاداشو لەترسی عەزاب.

﴿وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ ئەوان وێڕای هەبوونی هیوایان بەرەحمەتی ئێمەو ترسیان لەعەزاب، گەردنکەچو دڵ ترساون بوون، ترسی خودا لەدڵیاندا جێگیر بووبوو. ساتەوەختێك لەخودا غافڵ نەبوون.

ئەمجار دێتە سەر باسکردنی خاتومەریەمو حەزرەتی عیسا . لەسێ شوێنی قورئاندا چیرۆکی حەزرەتی زەکەریياو یەحیای کوڕی (سەلامی خودایان لەسەر بێ) باس دەکا. لەگەڵ چیرۆکی خاتو مەریەمو عیسای کوڕی دا خراونەتە پاڵ یەك: لەسورەتی (ال عمران)و سورەتی (مەریەم)و سورەتی (الانبیاء) دا واتە: ئێرە.

سەرەتا چیرۆکی زەکەریا ﷺ دێنێو ئەمجار بەشوێنیدا چیرۆکی (مریم) دەهێنێ، چونکە هەردوو چیرۆکەکە پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، چونکە پەیدا بوونی منداڵ لەپیرەمێردێکی کۆنەساڵی کەنەفتو پیرەنەزۆك کەلەگەنجیدا منداڵی نەبووبێ، هەروا چیرۆکی منداڵ بوونی مەریەم کەبەبێ مێرد بێ ئەوەی پیاو چووبێتەلای منداڵی بووە، ئەم دوو چیرۆکە وەکوو یەك سەرسوورهێنەرن، بەڵام چیرۆکی دووەم واتە: منداڵبوونی مەریەم سەرسوورهێنەرترە!

دەفەرموێ: ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ چیرۆکی مەریەم بۆ گەلەکەت بگێڕەوە، ئەو مەریەمەی خۆی لەهەموو پیاوێك پاراست، نەبەحەڵاڵیو نەبەحەرامی نەیهێشت پیاو لێی نزیك ببێتەوە، وەکوو قورئان لەسەر زمانی خۆی دەفەرموێ: ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ (مريم/٢٠) لەشوێنێکی تردا لەپەسنی خاتوو مەریەمدا دەفەرموێ: ﴿الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾ (التحريم/١٢).

﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا﴾ لەگیانی خۆمان گیانمان بەبەر عیسادا کرد لەناو سکی دایکی دا. واتە لەو گیانەی: کەتەنیا بەفەرمانی ئێمە پەیدا بووەو لەناو دروستکراوەکانماندا زیاتر تایبەتمەندیو پەیوەندی بەئێمەوە هەیە.

راناو لە (فيها) دا لێرە دەگەڕێتەوە بۆ مەریەم، بەڵام مەبەست گیان بەبەرا کردنی مەریەم نیە، بەڵکوو گیان بەبەراکردنی حەزرەتی عیسایە ﷺ لەسکی مەریەمدا. لەسورەتی (التحريم) دا فەرموی: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا﴾ راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ شەرمگای، واتە: فومان بەناو لەشیا کرد. قیرائەتێکیش هەیە لەسورەتی (التحريم) یش دا هەر بە(فيها) خوێندراوەتەوە ئەوکاتە راناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ مەریەم یان بۆ سکەکەی واتە: عیسا!

کە دەفەرموێ: ﴿مِنْ رُوحِنَا﴾ لەسورەتی (التحريم)و لێرەش دا بەمانا ئەوەیە: عیسامان دروست کرد لەگیانێك: کەتایبەتە بەخۆمانەوە، بەفەرمانی ئێمە بێ ناوەند دروست بووە، وەپاڵدانی گیانەکە بۆلای خودا بۆ رێز لێنانو تەشریفە.

﴿وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ ئێمە خاتو مەریەمو عیسای کوڕیمان کرد بەموعجیزەو نیشانەی بەدەسەلاتی بۆ هەموو عاقڵمەندانی بوونەوەر. نیشانەی ئەوەیە: کەخودا دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە: هەرچی بیەوێ ببێ دەبێ، هیچی لێ عاسێ نابێ. دیاردەو نیشانەکانی بۆ خودا چارانی خاتوو مریەم زۆرن لەوانە:-

١- ئەوە بوو رزقو رۆژی لەخواوە بۆ دەهات فریشتە لەبەهەشتەوە بۆیان دەهێنا..

٢- بەبێ ئەوەی پیاو لێی نزیك ببێتەوە منداڵی بوو.

٣- وەکوو حەسەنی بەصری دەفەرموێ: شیری مەمکی کەسی نەخوادوە.

٤- هەروەها حەسەنی بەصری دەفەرموێ: بەمنداڵی قسەی کردوە. [١٨]

نیشانەو موعجیزەکانی حەزرەتی عیسا ﷺ لەسورەتی (ال عمران) دا بەدرێژی باس کراون.

حەزرەتی عیسا ﷺ موعجیزەیەکی تاقانەی رۆژگارە نەلەپێش داو نەلەدوایی‌دا نموونەی دووبارە نەبۆتەوە، بەلام بەکەڵکی ئەوە دێ لەهەموو سەردەمو رۆژگارێك دا ئادەمیزاد تێی بفکرێو کەڵکی لێ وەربگرێو بیکاتە نیشانەی ئەوە: کەخودا هەرچی بیەوێ بیکا دەیکا.

(١٨) تەفسیری رازی ج٢٢ /٢١٨.

## يه‌كيه‌تى داب‌و نه‌ريته ئاسمانيه‌كان و نه‌گۆڕانى داب‌و نه‌ريتى خودا له‌بوونه‌وه‌ردا

﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾

دوای رانواندنی چیرۆكی ئه‌و پێغه‌مبه‌رانه (دروودی خوایان له‌سه‌ر بێ)و نموونه‌ی به‌تاقیكردنه‌وه‌و له‌بۆته‌دانیان‌و نموونه‌ی ره‌حمه‌تی خودا بۆیان، مه‌به‌ستی سه‌ره‌كی له‌م رانواندن‌و به‌سه‌ركردنه‌وه‌یه راده‌گه‌یه‌نێ‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ﴾ بێگومان گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌ی یه‌كتاپه‌رست یه‌ك گه‌ل‌و

نەتەوەیـە، یـەك شـەریعەتیان هەیـەو هـەموو پێغەمبـەران لەسـەر ئـەوە کـۆکن. جوداوازیی لەنێوان گەلە خودا پەرستەکاندا نیـە مەگـەر لەهەنـدێ داب‌و نـەریت‌و دیاردەو شێوەو شێوازدا: کەبەگوێرەی گۆڕانی ڕۆژگارو شوێن‌و بـاری ڕۆشـنبیری ئـەو گەلانـە هەنـدێ جـوداوازیی ڕواڵـەتییان تێدایـە. ئـەگینا لەبنەڕەتـدا یـەك ئایینـەو لەیەك سەرچاوەوە هاتووەو بۆ یەك مەبەستە ئەویش (یەکتاپەرستی)یە.

ئەم ئایینانەی ئەو پێغەمبەرانـە بانگەوازییان بـۆ کـردوەو پـەیڕەوییان کـردوە ئایینی ئێوەیە؛ ئایینی ئیسلامە، ئایینی یەکتاپەرستییە، ئاینێکی بێ جـوداوازی یـە لـەنێوان هـەموو پێغەمبـەرەکان دا، ئـاینێکی تـاك‌و تەنهایـە، تاقـە ئایینێکـە: کـە پێویستە پابەنـدی بـن‌و پـەیڕەوی بکـەن، مـن خوداتـانم‌و بـەس! کەسـی تـر شیاوی خودایـەتی نیـەو رایـەی ناکـەوێ لافـی خودایـەتی لێ بـدا. کەواتـە: مـن بپەرسـتن پەرستش‌و بەندایەتی هەر بۆمن ئەنجام بدەن، کەس مەکەن بەهاوبـەش‌و شـەریکم لەخودایەتی دا، ئەمەیـە ڕێبـازی حـەق‌و ئەوەیـە ئـایینی پەسـند! لەشـوێنێکی تـردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ (المؤمنون/٥٢).

بوخـاری‌و موسـلیم‌و ئـەبوداودو ئەحمـەد، فەرمودەیـەکیان ڕیوایـەت کـردوە: کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ((نحن معاشر الانبياء اولاد علاّت ديننا واحد)) ئێمـەی کۆمەڵی ئێغەمبەران منداڵی پیاوێکی فرەژنین‌و ئایینەکەمان یەکە. واتـە مەبەسـت بەشـەریعەتی پێغەمبـەرەکان یەکتاپەرسـتی‌و خـودا پەرسـتی یـە، هـەمومان بەرنامەکـەمان یەکـەو لەیـەك سەرچـاوە هـەڵقوڵاوە، جـوداوازیی لەبنـەماکانی عەقیـدەو ڕەوشـت‌و بـەها پیرۆزەکـان‌و بەندایـەتیکردنمان بـۆ خـودادا نیـە، ئەگـەر جوداوازی هەبێ لەهەندێ فروعيات‌و جوزئيات دایە: کەبەگوێرەی گۆڕانی ڕۆژگارو باری کۆمەڵایەتی گەلەکان پێویست بووە.

﴿وَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ﴾ دوایـی گـەل‌و نەتـەوەکان کاروبـاری ئـایینی خۆیـان بەشبەش کردو بوون بەتاقم‌و گروی جیا جیا.

گەلو نەتەوەکان پاش ماوەیەك ویڕای یەکیەتی ئایینو تاكو تەنیایی خودای هەموانیانو یەکیەتی یاسای بوونەوەرو یەکیەتی پەیامی پێغەمبەرانیان لەبنەما سەرەکییەکانی ئایین دا، زۆر لەشوێنکەوتوانی پێغەمبەرەکان لەراستە ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان لایان داو، دابو نەریتی جیاجیایان داهێنان، هەرتاقمەو لەبارێکەوە بۆ ئایین چوون، ئایینی راستەقینەی خۆیان وەلاناو پارچەپارچەیان کردو هەر کۆمەڵەو سوچێکی ئایینی گرتو بۆخۆی هەندێکی وەسەرنا، ئایینی خوداو بیروبۆچونی خۆیان تێکەڵاو کرد بەناوی ئایینەوە بلاویان کردەوە، ئەمجار هەر تاقمە بانگەوازی بۆ ڕێبازەکەی خۆی کردو ئاژاوەو بەربەرەکانییان لەنێوان دا بەرپا بوو، هەر تاقمەو دژی ئەویتر تێکۆشاو بانگەوازی بۆ ڕێبازەکەی خۆی کردو ئاژاوەو بەربەرەکانی لەنێوان دا بەرپا بوو، هەر تاقمەو دژی ئەوی تر تێکۆشاو بانگەشەی بۆ بیروباوەڕی ناڕاستی خۆی کرد. تەنانەت شوێن کەوتوی پێغەمبەرێك لەناو خۆیاندا بڕ بڕ بوونو بوون بەچەند تاقمو گرۆو کۆمەڵو دوژمنایەتیو ئاژاوەیان تێکەوتو سەرەنجام شیرو تیریان لێك دەست دایەو جەنگو کوشتاریان لەناودا بەرپا بوو ... وەکوو رانەمەڕی بێ شوانیان لێ هات.

ئەوەتا لەپێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە فەرمویەتی: ((تفرقت بنو اسرائيل على احدى وسبعين فرقة فهلكت سبعون وخلصت فرقة، وان امتى ستفترق على اثنتين وسبعين فرقة فهلكت احدى وسبعون فرقة وتخلص فرقة واحدة، قالوا يارسول الله من تلك الفرقة الناجية؟ قال: الجماعة، الجماعة، الجماعة)).

نەتەوەی ئیسرائیل دابەش بوون بەسەر حەفتاویەك تاقمو گرۆداو حەفتا حیزبو گرۆیان گومڕابوونو بەهیلاك چوون، تاقمێکیان لەرزگاربوانن. ئومەتی من دەبنە حەفتاو دوو تاقم حەفتاو یەك تاقمیان لەهیلاکچوەکانن، تەنها کۆمەڵێکیان لەرزگار بوانن. هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو کۆمەڵە رزگار بووە کێن؟ فەرمووی ئەوانە کۆمەڵی پابەند بەڕێبازی قورئانو سوننەتن،

فەرمودەکە کەخاوەنی سونەنەکان (ئەبوداود، نەسائی، ئیبنو ماجە، تیرمیذی) لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە، دەقی ریوایەتەکەی ئەبوهورەیرە بەم جۆرەیە: ((تفرقت اليهود على احدى وسبعين فرقة، وتفرقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وتفرقت امتى على ثلاث وسبعين فرقة)). هەڵبەتە بەش بەشکردنی ئایینو دووبەرەکی تێدا خستنەوە کارێکی ناپەسەندو ناشرینە، بۆیە خودا هەڕەشەی لەوانە کرد: کەبەوکارە هەڵدەستنو دەبنە هۆکاری، فەرموی: ﴿كُلٌّ إِلَيْنَا رَاجِعُونَ﴾ هەموو تاقمو گرۆیەك لەوانە بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوەو رۆژی قیامەت دێنەوە ژێر دەستی ئێمە، هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشو سزاوەردەگرێتەوە کەس ستەمی لێ ناکرێ: قانوونی کردەوەو پاداشتی خودا بەم جۆرەیە: کەدەفەرموێ: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِ وَإِنَّا لَهُ كَاتِبُونَ﴾ هەرکەسێ لەکردەوەی چاکە بەگوێرەی توانا ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بێنێو کارەکانی موافیقی شەریعەتی خودا بن، بەدڵ بڕوای بەخوداو پێغەمبەر ﷺ هەبێو بەزوبان دانی پێدا بنێ، یان کەسێك بڕێ کاری چاکە بکاو یەکتاپەرستیش بێ، ئەوە بادڵنیا بێ: کەکۆششو هەوڵەکانی بەزایە ناچنو پاداشی کردەوەکانی پوچ نابنەوەو رەنج بەخەسار نابێ، بەڵکوو پاداشتی دەدرێتەوەو بەئەندازەی گەردیلەیەك مافی نافەوتێ. ئێمە هەموو کردەوەکانی بۆ دەنووسینو بۆی هەڵدەگرینو لەنامەی عەمەلیدا بۆی دەپارێزن. هیچی لێ زایە نابێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً﴾ (الكهف/٣٠) یان دەفەرموێ ﴿وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ وَسَعَى لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُوراً﴾ (الاسراء/١٩).

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کەئەساسو بنەمای کردەوەی پەسندو خودا ویست، ئەوەیە: ئادەمیزاد بەدڵ بڕوای هەبێو کردەوەی چاك بێو بەزوبانیش ئیقرار بەئیمانی ناو دڵی بکا. بەدڵ بڕوای بەتاكو تەنیایی خوداو پێغەمبەرو

زیندوبوونـەوەی رۆژی قیامـەت هـەبیّو بـەزوبان دان بـەوەدا بنـیّ، لەروانگـەی ئـەو ئیمانــەوە کــردەوەی چــاك بکـا. بـەکردەوەی باشـی راسـتی بڕواکـەی بـچەسپێنیّ.. عەمەلی صالّح بریتییـە لەئەنجامـدانی ئەرکە پێویـستەکانی سەرشـانی ئـادەمیزادو خۆپاراستن لەوەی ئایین نەهی لیّ کردوە.

﴿وَحَرَامٌ عَلَى قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا أَنَّهُمْ لا يَرْجِعُـونَ﴾ یاسـاغە لەسـەر دانیـشتوانی هـەر شارو گوندو نەتەوەیەك بڕیاری لەناوبردنو ریشەکێش کردنیانمان دابیّو لەناومان بردبن، نابیّو ناگونجیّ رۆژی قیامەت زینـدو نەکرێنـەوەو نەیەنـەوە ژێـر دەسـتمان بـۆ تۆڵـە لیّ سـتاندنەوەی تـەواو. واتـە: دەبـیّ هـەموو ئـادەمیزاد زیندوبکرێنـەوەو بیانخەینـە ژێـر حیـسابو لێکۆڵینـەوەو ئـەمجار تۆڵـە لیّ سـتاندنی پڕاوپـڕی تـاوانو سەرپێچی کردنی ژیانی دونیایان. ئەمـە ئەگـەر (لا) لـە(لایرجعـون) دا زیـاد نـەبیّ. بەلاّم ئەگەر (لا) زیاد بـیّو تەئکیـد بگەیـەنیّ ئەوکاتـە مانـای ئایەتەکـە بـەم جـۆرە دەبیّ.

یاساغە بۆ دانیشتوانی هەر شـارو گونـدێك ئێمـە بڕیـاری ڕیـشەکێش کردنیمـان دابیّو لەناومان بردبن یاساغەو ناگونجیّ پێش هاتنی رۆژی قیامـەت ئەوانـە زینـدو بکرێنەوەو بگەڕێندرێنەوە بۆ ژیانی دونیا، یان بۆ تەوبـە کـردن. واتـە: هـەر گـەلو نەتەوەیـەك لەناوبـەرین ئـیتر تـارۆژی قیامـەت زینـدویان ناکەینـەوەو جارێکی دی بەتـەما ژیـانی دونیـا نـەبنو هـەولّو فرسـەتی تۆبـە کردنیـشیان نـامێنیّ. وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرمویّ: ﴿فَلَـا يَـسْتَطِيعُونَ تَوْصِـيَةً وَلَـا إِلَـى أَهْلِهِـمْ يَرْجِعُـونَ﴾ (يس/٥٠).

هەر گەلو نەتەوەیەك لەناو بەرین زیندو ناکرێنەوە ﴿حَتَّى إِذَا فُتِحَـتْ يَـأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ هەتا رۆژی قیامەتو دەرکەوتنی نیشانەکانی، کەنیــشانەیەك لەنیــشانەکانی هــاتنی قیامــەت کردنــەوەی بەربەســتی یــەئجوجو مەئجوجـە: کەلەهـەموو تەپۆڵکـەو بـەرزایی یەکـەوە دادەپەڕنـە خـوارو بـەگورجی

هێرش دێنن، مەبەستی ئایەتەکە رەددانەوەی ئەو موشریکانەیە کەبڕوایان بەزیندوبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت نەبوو!

لەوە پێش لەسورەتی (الکهف) دا لەباسی یاجوج‌و ماجوج دا وتمان: دەگونجێ ئەم بەرهەڵدابوونەی یاجوج‌و ماجوج‌و روخانی بەربەستەکەیان بریتی بێ لەهاتنی تەتارو مەغۆل‌و هێرش کردنیان بۆسەر خۆرهەڵات‌و خۆرئاوای جیهانی ئیسلامی‌و روخاندنی ویلایەتە ئیسلامیەکان‌و لەناوبردنی فەرمانڕەواکان، چونکە قورئانی پیرۆز لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾ (القمر /۱) دەی جاکەلەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ قیامەت نزیك بووبێ، دیارە لەسەردەمی هاتنی تەتەرو مەغۆلەکان نزیکتر بۆتەوە. چونکە شەشسەدو ئەوەندە ساڵ دوای پێغەمبەر ﷺ بووە. وەڵێ پێویستە هەموو کاتێ ئێمە ئەوە لەبەرچاو بگرین کەمەزەندە کردنی زەمان لای خودا جودایە لەمەزندە کردنی لای ئادەمیزاد، وێدەچێ زەمانێکی زۆر دورو درێژی لای ئێمەی ئادەمیزاد، لای خودا چرکەیەك بێ ﴿وَإِنَّ يَوْماً عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾.

﴿وَاقْتَرَبَ الْوَعْدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْصَارُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ رۆژی قیامەت نزیك بۆوە. واتە: کەئەو بەڵاو کارەساتانە رویان دا ئەوە نیشانەی نزیك بوونەوەی رۆژی قیامەتە، هەرکاتێکیش قیامەت رابێ، ئادەمیزادە کافرەکان چاویان بەملۆق دەوەستێ‌و پێلوی چاویان وێك نایەتەوە، لەترسان‌و لەعەیبەتان چاویان بۆ ناقوچێندرێن. دەکەونە هاوارو فیغان‌و دەڵێن: ﴿يَا وَيْلَنَا! قَدْ كُنَّا فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا بَلْ كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ ئەی هاوار بۆ خۆمان، ماڵوێران‌و تێدا چوو خۆمان، بێگومان ئێمە لەدونیادا ئەم رۆژەمان لەبیر نەبوو، نەمانزانی: کەئەم رۆژە حەقەو زیندوبوونەوە هەیەو دەخرێینە ژێر حیساب‌و لێکۆڵینەوە! بەڵکوو ئێمە لەواقیع دا ستەمکار بووین‌و ستەممان لەخودی خۆمان کردو بەدەستی خۆمان خۆمان خستە ناو ئەم عەزابە سامناکە.

دەربارەی ﴿وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ قیرائەتێك هەیە شاذە دەفەرموێ: ﴿وَهُمْ مِنْ كُلِّ جَدَثٍ يَنسِلُونَ﴾ ئایەتێکی تر هەیە پاڵپشتی ئەم قیرائەتە دەکا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ (یس/٥١) مەهدەوی ئەم قیرائەتەی لەئیبنو مەسعودو ئەعلەبی لەموجاهیدو ئەبوو صەهباوە. ریوایەتیان کردوە.[١٩]

## حاڵو وەزعی کافرو موسوڵمانەکان لەقیامەتداو گۆڕانی ئاسمان لەورۆژەدا

﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا

(١٩) قورطوبی ج٦ /٣٣٦٩ .

يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِى هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾

دوای بەیانکردنو حاڵو چۆنیەتی دۆزەخیو بەهەشتیو راگەیاندنی ئەوە کە: قیامەت نزیك بۆتەوە، پەروەردگار حاڵو وەزعی موشریكو خودا درۆزنەکانیان بەیان دەکابەوە کەدەبنە: سوتەمەنی دۆزەخو دەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنْتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾ بێگومان ئێوە ئەی موشریکەکان! خۆتانو خودا درۆزنەکانتان ئەوانەی جگە لەخودا دەیانپەرستن، دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ! ئێوە هەمووتان دەچنە ناو ئەو ئاگرە بێ ئامانەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ (البقرة/٢٤).

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَعْبُدُونَ﴾ وشەی ﴿ما﴾ بتەکانو شەیتانو دارو دەستەکەی دەگرێتەوە، چونکە گومراکان لەم روەوە: کەبەگوێی شەیتانو دارو دەستەکەی دەکەنو شوێنیان کەوتوون، وەکوو ئەوە وایە بیانپەرستنو بەبەندەی شەیتان دەژمێردرێن. ئایەتەکە حەزرەتی عیسا (عليه السلام)و حەزرەتی عوزەیرو فریشتەکان ناگرێتەوە، چونکە: کەدەفەرموێ: ﴿إِنَّكُمْ﴾ خیطابەکە لەگەڵ موشریکەکانی قورەیشە، ئەوانیش تەنیا بت پەرست بوون! هەروەها قورئان فەرمووی: ﴿وما

تعبدون﴾ نه‌یفه‌رمووه: (ومن تعبـدون) بـه‌گوێره‌ی لۆغـه‌ت (مـا) بـۆ بـێ عاقـڵ بـه‌کار ده‌هێنـرێ.

به‌ڵگه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی که: شه‌یاتینی له‌پێری په‌رستراوه‌کانن ئه‌و ریوایه‌ته‌یـه کـه موحه‌ممه‌دی کوڕی ئیسحاق له‌سیره‌که‌ی دا ده‌گێڕێتـه‌وه: ده‌ڵێ: پێغه‌مبـه‌ر ﷺ چووه ناو (کابه) وه، له‌وکاته‌دا پیاوماقولانی قوڕه‌یش لـه (الحطیم) بـوون له‌ده‌وروبـه‌ری حیجـری شـیماله‌وه. له‌ده‌وروبـه‌ری مـاڵی خـودا سـێ سـه‌دو شه‌صـت بتـی لێ بـوو، پێغه‌مبــه‌ر ﷺ لایـان دانیـشت. (النـضر) ی کـوڕی (الحـارث) پێـشنیارێکی دایــه، پێغه‌مبه‌ر ﷺ به‌به‌ڵگه بۆڕی دان، ئه‌مجار ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾ تاکۆتایی ئایه‌ته‌که. عه‌بدوڵڵای کوڕی (بـصري) هـات بـۆ ئـه شـوێنه‌و بینینـی خـه‌ریکی سـرته‌و وتووێـژی نهێنـی بـوون‌و ده‌میـان ده‌بـرده بـن گوێـچکه‌ی یه‌کتری. وتی: ئه‌وه سه‌رگه‌رمی چ وتووێـژێکن؟ وه‌لیـدی کـوڕی موغـه‌یره، قـسه‌کانی پێغه‌مبه‌ری ﷺ بۆ گێڕایه‌وه. عه‌بدوڵڵا وتـی: بـه‌خودا: کـه‌لێره بوومایـه بـۆڕم ده‌دا، بانگی پێغه‌مبه‌ریان ﷺ کردوه‌، عه‌بدوڵڵا پێی گوت: ئه‌وه تۆ ئه‌و قسانه‌ت کـردون؟ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی به‌ڵێ من وام گووتووه..

عه‌بـدوڵڵا وتـی: بـه‌خودای (کابـه) ئـه‌وه ئێـستا له‌گـه‌ڵت ده‌که‌ومـه موناقه‌شـه‌و رێگات لێ ده‌بڕمه‌وه. ئایا جوله‌که عوزه‌یریان نه‌په‌رستووه؟ نه‌صـرانیه‌کان عیـسایان ﷺ نه‌په‌رستووه؟به‌نو مولەیح فریشته‌یان نه‌په‌رستوون، جائه‌گه‌ر به‌قسه‌ی تۆ بـێ عوزه‌یرو عیساو فریشته‌کان ده‌خرێنه دۆزه‌خه‌وه، پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌وه‌ڵامدا فه‌رموی: به‌ڵکوو ئه‌وانه به‌ندایه‌تییان بۆ ئـه‌و شـه‌یاتینیانه کـردوه که‌فه‌رمانیان پـێ کـردون عوزه‌یر، یان عیسا، یان فریشته بپه‌رسـتن. ئـیتر خـودای مـه‌زن ئایـه‌تی ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى﴾ تاکۆتـایی ئایه‌ته‌کـه‌ی نـازڵ کـرد، دیـاره مه‌به‌سـتی به‌وانـه حه‌زره‌تی عوزه‌یرو عیساو فریشته‌کانن.

هۆی ئەوەی کە خودا ئەو خودا درۆزنانەی ئەوان دەخاتە ناو دۆزەخەوە، بۆ زێدە ئەزیەتدانو سزادانی کافرەکانە زومەخشەری دەفەرموێ: بۆیە پەرستراوەکانیان لەگەڵ دا دەخرێنە دۆزەخەوە تازیاتر پەرستشکارەکان خەفەت بخۆنو نارەحەت بن، بۆئەوەی ئەو شتانەی لەژیانی دونیایان دا دەیانپەرستنو پێیان وابوو شەفاعەتیان بۆ دەکەن زیاتر ببنە دوژمنیان رقیان لێ ببنەوە. هەمیشە ئەو خودا درۆزنانەی کەبوونە هۆی بەدبەختیان لەپێش چاویان بن.

ڕاستە کە دەڵێن: بینینو تەماشاکردنی دوژمن جۆرێکە لەعەزابو دڵتەنگ بوون.

ئەمجار پەروەردگار بەڵگەیەکی تر دەهێنێتەوە: کەئەو بەخودا زانراوانە خودا نین دەفەرموێ: ﴿لَوْ كَانَ هَؤُلاءِ آلِهَةً مَا وَرَدُوهَا﴾ ئەگەر ئەو بتو هاو وێنانەیان بەراستی خودا بونایەو سوودو زیانیان هەبوایە وەکوو سەرپەرشتکارەکانیان بەتەما بوون . نەدەخرانە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەگەر دەسەڵاتیان هەبوایە زیانیان لەخودی خۆیان دوور دەخستەوە، ئاوا سوکایەتیان پێ نەدەکرا! کەواتە: ئەوانە خودا نین، شیاوی خودایەتی نین ﴿وَكُلٌّ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ هەموو بتو بتپەرستەکان لەدۆزەخ دا بۆ هەتا هەتایەدەمێننەوەو رزگار بوونیان نابێ،

﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لا يَسْمَعُونَ﴾ بۆ ئەوان هەیە لەناو ئاگردا لەبەر سەختی عەزاب نرکەو ناڵەو دادو فوغانو تەنگەنەفەسیو لرخەو لرفە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ﴾ ئەوان لەناو دۆزەخ دا شتێك نابیسن دڵیان خۆش بکا، سودیان پێ بگەیەنێ، بەڵکوو دەنگی ئەوانە دەبیسن کەلێپرسراوی سزادانیانن واتە: دەنگی ترسناکی زەبانیەکانی دۆزەخ دەبیسن.

ئەمجار دوای بەیانکردنی حاڵو وەزعی دۆزەخییەکان، دێتە سەرباسکردنی بەختەوەرە موسوڵمانەکانو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُمْ مِنَّا الْحُسْنَى أُولَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی لەئێمەوە پێش وەخت چاکەیان بۆ بڕیار دراوە،

ئەوانەی لەزانیاری خودادا لەوەپێش تەوفیقو هیدایەتیان بۆ فەراهەم هێنراوە، لەژیانی دونیایان دا ملکەچی فەرمانی خودا بوونو هەمیشە ترسی خودایان لەدڵدا بوە، بەدڵسۆزی بەندایەتی خۆیان بۆ خودا ئەنجام داوە، ئەوانە ناچنە ناو دۆزەخەوەو لەو ئاگرە ترسناکە کوشندەیە دوورن، ئێشو ئازاری دۆزەخ ناچێژن! ئەوانە بەختەوەرو بەمراز گەیشتوو مژدە پێدراون، حاڵو چۆنیەتی بەختەوەریەکەیان بەم جۆرەیە:-

١- ﴿لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا﴾ ئەوانە گوێیان لەگرمە گرمی ئاگری دۆزەخ نیە لرفە لرفی ئاگرو قرچە قرچی سووتانی شت نابیستن، پرپشکو تینی ئاگریان ناگاتێ.

٢- ﴿وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ﴾ ئەوانە دەخرێنە ناو بەهەشتەوەو بۆ هەتا هەتایە لە نیعمەتو لەززەتەکانی بەهەشت دا دەمێننەوە، ساتەوەختێک ئەو نیعمەتانەیان لێ قەدەغە ناکرێ!

٣- ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ﴾ ترسو بیمی روداوی هەرە گەورەی قیامەت ئەوان ناترسێنێو دایان ناچڵەکێنێ، ﴿الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ﴾ فوکردنە بەشاخی صوردا بۆ جاری دووەمو بۆ زیندو بوونەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ﴾ (النمل/٨٧).

هەندێ پێیان وایە ئەم ترسانە گەورەو داچڵەکانە لەکاتی فوکردنی جاری یەکەمە بەشاخی صوردا.

هەندێ دەڵێن: ئەمە کاتی داخستنی دۆزەخە لەسەر دۆزەخیەکان. یان کاتی سەربڕینی مردنە لەپێش چاوی خەڵکەکە. یان کاتی بەڕێ کردنی دۆزەخیەکانە بۆ دۆزەخ.

٤- ﴿وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ فریشتەکان بەرویەکی خۆشەوە پێشوازییان لێ دەکەنو موژدەیان پێ دەدەن، لەرۆژی زیندوو بونەوەو رابون لەگۆڕ پێیان دەڵێن: ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە: کەلەژیانی دونیادا وادەتان پێ دراوە،

ئەمرۆ بۆ ئێوە رۆژی کامەرانیو بەختەوەریو رێز لێنانو پاداشدانەوەیە، رۆژی بەمراز گەیشتنو خۆشییە! لەهەموو شتێکی ناخۆش رزگاریان دەبێو هەرچی حەزیان لێیەتی پێی دەگەنو بەڵکوو پێی گەیشتوون. ئەمجار ئەو باسە کۆتایی پێ دەهێنێو دیمەنێکی سامناکتر رادەنوێنێ، روداوی پێچانەوەی ئاسمان دەخاتە روو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ واتە: ئەو بەختەوەرو بەمراز گەیشتوانە ترسو سام دایان ناگرێو داناچڵەکێن لەو رۆژەدا؛ کەئێمە ئاسمان دەپێچینەوە وەکوو پێچانەوەو هەڵگێڕانەوەی پەڕەی کتێب. لەپڕێکا بەقودرەتی خودا ئاسمان وەکوو کاغەزی تۆمار لوول کراوەو پێچراوەتەوە، ئەو بوونەوەرەی کەئادەمیزاد خوی پێوە گرتوە، لەئارادا نەما، کار هەموو سەریان گرتو ئیش جێبەجێ بوو، بوونەوەرێکی دی هێنرایە کایەوە. بەراستی دیمەنێکی پڕ سامو ترسو سەرسووڕمانە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الزمر/٦٧) بەکورتی ئەو خودا پێداوانە ترسو سام دایان ناچڵەکێنێ لەوکاتەدا: کەدیاردەکانی ئاسمان مەحف دەکرێنەوەو ئەستێرەو مانگو خۆرو دیمەنەکانی تری لەناو دەبرێنو زەوی ئاسمانو مانگو خۆرو ئەستێرەی تر بەدی دەهێندرێن. ﴿كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ﴾ ئەوەی لەیەکەمجاردا نەبووە دروستمان کرد، دەیکەینەوە بەنەبوو نایهێڵینەوە.

پێچانەوەی ئاسمانو گۆڕینی بوونەوەر شتێکە هەر دێو نەهاتنی نیە، لەرۆژی قیامەت دا جارێکی تر ئێمە ئێوە دروست دەکەینەوە بۆ حەشرو حیساب، ئادەمیزاد گیانیان بەبەردا دەکرێتەوە، سەرلەنوێ دروست دەکرێنەوەو زەویو ئاسمانو خۆرو مانگو ئەستێرەکان بەشێوەیەکی تر دەگۆڕێن.

﴿وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ ئەو دروستکردنەوەو گۆڕانکارییە بڕیارێکە داومانەو هەر دەبێ بێتە دیو ئێمە زۆر بەئاسانی دەتوانین ئەنجامی بدەین.

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (الانعام/٩٤) یان ئایەتی ﴿وَعُرِضُوا عَلَى رَبِّكَ صَفّاً لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (الكهف/٤٨).

ئنجا لەم مەشهەدە سەرنج راکێشەوە: کەوێنەی کۆتایی هاتنی ئەم بوونەوەرە دەکێشێو حاڵو وەزعی بوونەوەرو زیندو کراوەکان رادەنوێنێ، سیاقەکە دەگەرێتەوە بۆ سەر بەیانکردنی دابو نەریتی خودا لەبوونەوەردا، دەربارەی بەمیراتگرتنی زەوی بۆ بەندە صالحەکانی لەژیانی دونیادا! لەنێوان دیمەنی پێشوو ئەم دیمەنەدا پەیوەندییەکی خەستو خۆڵ هەیە.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ بێگومان ئێمە بریارمان داوەو لەزەبوردا دوای تەورات یان دوای قورئان. نوسیومانە: کەزەوی بەمیرات دەدرێ بەبەندە صالحەکانمانو تێیدا جێگیر دەبن.

مەبەست بە(الذكر) لەئایەتەکەدا تەوراتە. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مەبەست قورئانە، هەندێکی تر دەفەرموون: لەوحول مەحفوظە، کەسەرچاوەی هەموو کتێبە ئاسمانییەکانە.

مەبەست بە (الأرض) بەگوێرەی مانای ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاء فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ﴾ (الزمر/٧٤) ئەرزی بەهەشتە.

یان مەبەست زەوی دونیایە مەبەست بە (عبادی الصالحون) ئەوانەن کەلەتوانایان دا هەیە زەوی ئاوەدانی بکەنەوە. بەگوێرەی مانای ئەم ئایەتە: کەدەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾ (النور/٥٥) هەروەها ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُواْ إِنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (الاعراف/١٢٨).

یان مەبەست خاكی پیرۆز: (الارض المقدسة)یە كە ولاتی شامو فەلەستینە. بەگوێرەی مانای ئەم ئایەتە كەدەفەرموێ: ﴿وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا﴾ (الاعراف/١٣٧).

مامۆستا سەيید پێی وایە: مەبەست بە ﴿الأَرْضَ﴾ لە ﴿أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ زەوی دونیایە، ئەم زەوییە كە: ئادەمیزاد ژیانی تێدا بەسەردەبا.

دەفەرموێ: پەروەردگار حەزرەتی ئادەمی ﷺ كردوە بەجێنشینی خۆی لەسەر زەوی بۆ ئەوەی ئاوەدانی بكاتەوە، بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكاری بێنێ، گەشەی پێ بكاو گۆڕانكاریی تێدا بكا، گەنجینەو شاراوەی ناوی دەربهێنێو سوودی لێ وەربگرێ. بەروبوومی شێردراوەو ئاشكرای بۆخۆی كۆنترۆڵ بكاو ئادەمیزاد بگاتە ئەو ئاستەی كە: خودا لەزانستی خۆی دا مەزندەی كردوە.

بێگومان پەروەردگار یاسایەكی چڕو پڕی بۆ ئادەمیزاد داناوە، پەیڕەوو پڕۆگرامێكی كاركردنی بۆ داناوە بۆ ئەوەی بەگوێرەی ئەو مەنهەجە هەڵسو كەوت بكا لەگەڵ زەویدا، مەنهەجێكی بۆ داناوە دوولایەنەیە یان بڵێین: لەسەر دوپایە: ئیمانو كردەوەی چاك، لەدوا بەرنامەی پەروەردگاردا بۆ ئادەمیزاد: كەقورئانی پیرۆزە، ئەو مەنهەجە شیكراوەتەوە، یاساو نیظامی تەواوی بۆ داناوە، لەمەنهەجی ئیسلامی دا هەر تەنها ئاوەدانكردنەوەی زەویو ئیستیغلال كردنی بەرو بوومەكانی مەبەست نیە، بەڵكوو وێڕای ئەوە گرنگی دەدا بەویژدانی مرۆڤو پاڵفتەكردنی دڵو دەروونیو گەشەكردنو بەهێز كردنی ئیمانی. بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بگاتە پلەی بەرزو شكۆمەندیی مەزندە بۆ كراوی بۆئەوەی نەبێتە ئاژەڵێكی دوو قاچ لەناو ژیاری ماددی دا، مرۆڤایەتی خۆی نزم نەكاتەوە بۆ پلەی پەستی لەكاتێكدا ئەو خەریكە بگاتە ترۆپكی پێشكەوتنو بەرز بوونەوە لەبواری دەستەبەركردنی سامانو دارایی ئاشكراو نهێنی.

لەهەوڵدانو بەرێ چوون بۆ دەستەبەر کردنی ئەو هاوکێشەییو پێکەوە گرێ دانەی ئیمانو کردەوە جاری وادەبێ ئەم تای تەرازوو یان ئەو تای تری خوارو ژووریان تێدا پەیدا دەبێ.

جاری وادەبێ ستەمکارو ملهورو چەوسێنەرەوە بالا دەست دەبنو زەوی بۆ خۆیان کۆنترۆڵ دەکەن، وادەبێ نەفامو تالانچیو هەرچیو پەرچیو جاشو خوێڕی بالا دەست دەبن. وادەبێ فاسیقو لێزان کۆنترۆڵی زەوی دەکەنو بەباشی بەرو بومو سامانی فەراهەم دێننو لەبارە مادییەکەوە سەرکەوتوو دەبن! بەلام ئەمانە هەموو تاقیکردنەوەنو ئاکام نین، بەمیراتگرتنی کۆتایی بۆ بەندە صالحەکانە ئەوانەی بڕوای راستو کردەوەی باش ئاوێتەی یەکتر دەکەنو هەرگیز ئیمانو کردەوەی باش لێك دانابڕن.

هەرکاتێ ئیمانی ناو دڵو چاکی کردەوە لەگەڵو نەتەوەدا کۆبوونەوە، ئەو گەلە دەبێتە میراتگری زەوی. بەلام هەرکاتێ ئیمانو کردەوەی باش لێك دابڕین، ئەوە تەرازوەکە خوارو ژوور دەکا: وادەبێ بالادەستی بۆ ئەوانە دەبێ: کەهۆکاری مادی پەیڕەو دەکەن، ئەوان کۆنترۆڵی زەوی دەکەن، ئەوانەی بەڕواڵەت موسوڵمانن هۆکارە مادییەکان پاشگۆی دەخەنو ژێر دەکەون. هەرکاتێ ئیمانی راستەقینەو هاندەر بۆ کردەوەی باش سست بێ لەکاربکەوێ دیارە ئەوانەی هۆکارە مادییەکان دەگرنە بەرچاو ئەوان بالادەست دەبن.

کەوابێ ئەرکی سەرشانی موسوڵمانانە: کەبەگوێرەی ئیمانەکەیان هەڵسو کەوت بکەن، چونکە ئیمانی راستەقینە هاندەرە بۆ کردەوەی چاكو ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان.

﴿إِنَّ فِي هَـٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ﴾ بێگومان لەو هەموو نەصیحەتو ئامۆژگارییەی لەم سورەتەدا ئاڕاستەی ئێوەمان کرد، ئەو هەموو هەواڵو وادەو هەڕەشانەی لەم سورەتەدا بۆ ئێوەمان گێڕایەوەو ئاڕاستەمان کردن کیفایەتە بۆ گەلی خواپەرست.

نه‌وه‌نده‌مان ئاراسته‌ کردن: که‌به‌س بێ بۆ گه‌لو‌نه‌ته‌وه‌یه‌ك که‌گوێڕایه‌ڵو فه‌رمانبه‌ر دارو طاعه‌تکاری په‌روه‌ردگار بن.

## حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ﷺ پێغه‌مبه‌ری ڕه‌حمه‌ته‌ بۆ هه‌موو جیهان

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٖۖ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٞ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنۡ أَدۡرِي لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿١١١﴾ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾

دوای گێڕانه‌وه‌ی چیرۆکی پێغه‌مبه‌رانی پێشوو، هه‌روا دوای ڕاگه‌یاندنی ئه‌وه‌ که: قورئان گه‌یه‌نه‌رێکی به‌سوودو کیفایه‌ته‌ بۆ خوداپه‌رستان، ئه‌مجار په‌روه‌ردگار هه‌واڵی ئه‌وه‌مان پێ ده‌دا: که: ناردنی حه‌زره‌تی مه‌حه‌ممه‌د ﷺ فه‌ڕو ره‌حمه‌تو پیرۆزییه‌ بۆ هه‌موو ئاده‌میزاد له‌باره‌ی دینو دونیاوه‌، له‌باره‌ی ئایینه‌وه‌؛ ره‌حمه‌ته‌ چونکه‌ له‌گومڕایی‌و نه‌فامی ڕزگاری کردون.. له‌باره‌ی دونیاوه‌ ره‌حمه‌ته‌ بۆیان چونکه‌ له‌زه‌لیلی‌و ژێرده‌سته‌یی ڕزگاری کردون، به‌هۆی پیرۆزی ئایینی ئیسلامه‌وه‌

موسوڵمانان به‌سه‌ر دوژمنه‌كانیاندا زاڵ بوونو پیرۆزییان به‌ده‌ست هێنا.هه‌ركاتێ موسوڵمانان ژێر بكه‌ونو دوژمن به‌سه‌ریان دا زاڵ ببێ، ئه‌وه خه‌له‌له‌كه له‌خۆیاندایه‌و نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه: وه‌كوو پێویست پابه‌ندی ئایینو فه‌رمانی خوداو پێغه‌مبه‌ر ﷺ نه‌بوون..

ده‌فه‌رموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ ئێمه تۆمان كردوه به‌پێغه‌مبه‌رو ره‌وانه‌مان كردوی كه‌ره‌حمه‌تو فه‌رو به‌ره‌كه‌ت بێ بۆ ئاده‌میزادو جندۆكه، شه‌ریعه‌تو به‌رنامه‌و رێنمونیت مایه‌ی ره‌حمه‌تو فه‌ره بۆ هه‌موو عاله‌م، هه‌ركه‌سێ شوێن په‌یامه‌كه‌ت بكه‌وێو ئیمانت پێ بێنێو ئه‌و ره‌حمه‌ته‌ی قبوڵ كردبێو سوپاسی ئه‌و نیعمه‌ته پیرۆزه‌ی كردبێ، له‌دونیاو قیامه‌ت دا كامه‌رانه، خۆشنوودو به‌خته‌وه‌ره، هه‌ركه‌سێكیش ره‌دی كردبێته‌وه‌و ئینكاری ئه‌م قورئانه پیرۆزه بكا خه‌سارته‌مه‌ندی دونیاو قیامه‌ته، خه‌تا له‌خۆیه‌وه‌یه‌تی كه‌به‌و ره‌حمه‌ته به‌خته‌وه‌ر نه‌بوون. وه‌كوو له‌ئایه‌تێكی تردا له‌م باره‌وه ده‌فه‌رموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَةَ اللّهِ كُفْراً وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ (ابراهيم/۲۸-۲۹) ده‌رباره‌ی صیفه‌تی قورئانیش ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾ (فصلت/٤٤) ئیمامی موسیلم له‌م باره‌وه فه‌رموده‌یه‌كی له‌ئه‌بو هوره‌یره‌وه ریوایه‌ت كردوه: كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: ((انی لم ابعث لعاناً، وانما بعثت رحمة)).

(الحاكم) ئه‌م فه‌رموده‌ی به‌م شێوه ریوایه‌ت كردوه: ((انما أنا رحمة مهداة)).

بێگومان په‌روه‌ردگار پێغه‌مبه‌ری ئیسلامی ناردوه بۆئه‌وه‌ی ره‌حمه‌تو به‌ره‌كه‌ت بێ بۆ هه‌موو عاله‌م. بۆ ئه‌وه‌ی ئاده‌میزاد هیدایه‌ت بداو به‌ره‌و سه‌رفرازیو ژیانی كامه‌رانی به‌رێیان بخا. ئه‌و مه‌نهه‌جو یاسایه‌ی حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ﷺ هێناویه‌تی مه‌نهه‌جێكه بۆ كامه‌رانی ئاده‌میزاد هاتووه‌و ده‌یه‌وێ

ئادەمیزاد بگەیەنێتە ترۆپکی بەختەوەریی ژیان و ئەو قۆناغەی لەزانستی خودادا بۆی مەزندە کراوە.

ئـەم مەنهەجو پەیامەی بۆ سەرجەمی ئادەمیزاد نارد لەسەردەمێك دا: کەچاوەڕوانی لێ دەکرائەم پەیامە قبوڵ بکرێ! ئادەمیزاد گەیشتبوە پلەو قۆناغێك گونجاو بوو ئەو جۆرە پەیامە نموونەیی یەی بۆ بنێردرێ.

ئەم پەیامەی بۆ هات و وەکوو کتێبێکی کراوە بۆ هەموو عەقڵ و هۆشەکان لەهەموو چین و توێژێك و لەهەموو چەرخ و رۆژگارێك دا، هەموو بنەمایەکی ژیانی لەخۆ گرتووە.

مەنهەجێکی گشتی گونجاو بۆ هەموو بارودۆخێك، مەنهەجێکی نەگۆڕاوی ئامادەباش بۆ وڵامدانەوەی هەموو روداوێك. بەڵێ ئەم نامەیە بنەمای هەمیشەیی بۆ ژیانی ئادەمیزاد دانـاوە، رێگەی داوە ئادەمیزاد بۆ خۆی بڕیارو حوکمە جوزئیەکانی لەو بنەماگشتییانەوە وەربگرێ و بەگوێرەی رۆژگارو ژیاری میللەتان ئەو مەنهەجە لەژیانی خۆیاندا پەیڕەو بکەن و بەجوانترین شێوە تەنفیذیان بکەن و نەهێڵن لەگەڵ بنەما سەرەکییەکان دا ڕووبەڕوو ببنەوە! لەهەمان کات دا رێگای داوە عەقڵی ئادەمیزاد بەویستی خۆی پەل بهاوێ و بیر بکاتەوەو کۆمەڵگا نەتوانێ رێگەی لێ بگرێ، ئازادی داوە بەئادەمیزاد: کەلەچوار چێوەی ئەو بنەما مەنهەجییانەی دانراون بۆ ژیانی ئەو کاربکاو چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکانی بدۆزێتەوە. بێگومان تاقیکردنەوەی ئادەمیزاد لەرابوردوداو تائێستاش ئەوەی چەسپاندوە: کەپەیڕەوو پرۆگرامی ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی پێش هەنگاوەکانی ئادەمیزاد کەوتووەو بۆ ساتەوەختێکیش رابەرایەتی خۆی لەدەست نەداوە، تاعەقڵ و زانست و بیرو بۆچونی ئادەمیزاد زیاتر گەشەبکاو پێش بکەوێ بەرنامەی ئیسلام بەچەند قۆناغێك-لەپێشەوەیەو وەکوو چرایەکی پرشنگدار رێگای ژیان رون دەکاتەوەو باشتر دەدرەوشێتەوەو روناکی زیاتر پەخش دەکا. هەتا ژیان پێش

بکەوێ، ئیسلام باشتر دەگونجێ ببێتە بەرنامەی ژیان‌و خەڵکی یاسای خۆیانی لێ هەڵێنجن.

هەر ئایینی ئیسلام‌و مەنهەجی ئیسلامە: کەوەڵامی داخوازییەکانی ئادەمیزاد دەداتەوەو لەگەڵ پێشکەوتن‌و گەشەکردنی ژیانیدا دەگونجێ، هێزو تواناکانی کەبت ناکا، لەززەت‌و خۆشی ژیان‌و بەروبوومی هەوڵدانی قەدەغە نەکا!

بەرزو پیرۆزی ئەم مەنهەج‌و ئایینە لەوەدا خۆدەنوێنێ‌و رەنگ دەداتەوە: کەگیان‌و جەستە پێکەوە پەروەردە دەکا، هاوسەنگی هاوتاییان تێدا رەچاو دەکا.

جەستە ئەزیەت نادا بۆ ئەوەی گیان بەرز بکاتەوە؛ وەکوو دێر نشین‌و چلەگرەوەکان دەیکەن. لایەنی گیان پاشگوێ ناخا بۆئەوەی جەستە لەززەت وەربگرێ وەکوو هەوەسبازەکان پەیڕەوی دەکەن. هێزو تواناکانی کۆت‌و زنجیر ناکاو داخوازییە سروشتییەکانی کپ ناکاتەوە لەبەر خاتری بەرژەوەندی کۆمەڵ، لەهەمان کات لغاوی تاکیش بەرنادا نەبادا بەدابین کردنی ئارەزۆو هەوەسبازیی لاسارانەی خۆی زیان بەکۆمەڵ بگەیەنێ، یان کۆمەڵ بۆخۆی ملکەچ بکا!

هەر ئەرکێك بخاتە سەرشانی ئادەمیزاد بەرژەوەندی خۆی‌و کۆمەڵی تێدا بەرچاو گیراوەو بەجۆرێکە بتوانێ ئەنجامی بداو لەوزەو توانای دا هەبێ پێی هەڵسێ، لەهەمان کات دا ئامادە باشی‌و هێزو توانای ئەوەی پێدراوە ئەو ئەرکە بەجێ بێنێ، ئەرکەکەشی والا خۆشەویست دەکا کەگوێ نەدا بەو نارەحەتی‌و ناخۆشیانەی لەپێناویدا دێنە سەر رێی! چونکە داخوازییەك لەداخوازییەکانی دابین دەکا، یان برێ لە طاقەو وزەی سەرف دەکاو جەستەی ئارام دەگرێ.

بێگومان پەیامی حەزرەتی موحەممەد ﷺ رەحمەتە بۆ گەل‌و نەتەوەکەی‌و بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتی! هەرچەندە ئەو مەبدەئو داخوازییانەی ئەو بانگەوازی بۆ دەکردن‌و لەخۆی گرتبوون لەسەرەتاوە لەبیرو بۆچوونی مرۆڤایەتی ئەو سەردەمە نامۆ بۆن لەبەر دووریی مەسافەی نێوان واقیعی ژیانی جەستەیی‌و گیانی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە. بەڵام وردە وردە ئادەمیزاد لەم مەبدەئانە نزیك بۆوە،

نـامۆیی ئـەو مەبدەئانـە لەهەسـتو شـعوریاندا نـەماو لێـی نزیـك بوونـەوەو پێـی راهاتنو هەوڵیان دا پەیڕەوی بکەن بالەژێر ناوو نیشانی تریش دابێ.

بۆ نموونە ئایینی ئیسلام هات بانگەوازیی یەکیـەتی ئـادەمیزادی کـردو ویـستی دیاردەی جودایی رەگەزایەتیو جوگرافی بتوێنێتـەوە، ئـادەمیزاد هـەموویان لـەژێر دروشمو یاسای ئیسلام دا کۆ بکاتـەوە. ئـەم بانگـەوازیی یەکبوونـە لـەبیرو بۆچـونی ئادەمیزادی ئەو سەردەمەدا زۆر نامۆ بوو، لەواقیعی حاڵی کۆمەڵگای ئەوکاتـەدا تـار بـوو، دەرەبـەگو قەیـصەرو کیـسراو سـەرەك خێڵـەکان خۆیـان بەرەگـەزێکی جیـا لەرەگەزی ژێردەستەکانی خۆیان دەزانـیو پێیـان وابـوو پێکهاتـەی جەسـتەو گیـانی ئەوان جوداوازەو زۆر بەرز ترە لەهی خەڵکی تر!!

دەی ئەوەتا ئادەمیزاد دوای چواردەسەدەو لەوە پێشیش دەیـەوێو ویـستویەتی پـەیڕەوی ئـەو سیـستەمە بکـا بـەڵام لـەژێر ناوونیـشانی (سۆشیالیـستیو شـیوعیو دیموقراطی و....هتـد) لـەرێگا لـەقوڕ چەقیوەو توانـای بـەرەو پـێش چـوونی نیـە، چونکە بەپەیڕەوی کردنی ئیسلام هەڵسو کەوت ناکەنو بەوپەیامە رەفتار ناکـەن. هەرچەندە بەقسەو دیعایە پێیان وایە هەندێ مەبەسـتیان بەدەسـت هێنـاوە. بـەڵام کوا؟؟

بێگومان ئیسلام هات بـۆ ئـەوەی یەکسانی بخاتـە نێـوان هـەموو ئـادەمیزادەوەو لەبەرامبـەر حـوکمو یاسـادا هـەمویان چـون یـەکبن، ئەمـە لـەکاتێك دا ئـادەمیزاد بووبوونە چـەند چینو توێـژێك، هـەر چینەو یاسایەکی تایبـەتی هـەبوو، بـەڵکوو لەسەردەمی کۆیلایـەتیو دەرەبەگایـەتی دا ویـستی ئاغـا قـانوون بـوو، ئـیتر لەدیـدو بۆچـونی ئـادەمیزادی ئـەو سـەردەمەدا بـانگی یەکـسانی لەبـەردەم قـانوونو یاسـادا لەنێوان ئەمو ئەودا شـتێکی نـامۆ بـوو... بـەڵام وائـادەمیزادی پێشکەوتووی ئـەمڕۆ هەوڵ دەدا با بەنەظەریو دوور لەواقیعی حاڵیش بێ بەشێك لەو یاسـاو نیظامـەی پێش هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵە، ئیسلام تەطبیقي کرد، دەیەوێ دەسـتەبەری بکاو خۆی پێ هەڵنێتەوە.

کەوابوو نابێ گومان هەبێ کە پەیامی پێغەمبەر ﷺ رەحمەت بوو بۆ هەموو ئادەمیزاد بەگشتی: بۆ ئەوانەی بڕوایان پێ کردووەوبۆ ئەوانەیش ئیمانیان پێ نەهێناوە. چونکە پەیامی ئیسلام لەهەموو کۆمەڵگاکانی سەر زەویدا - بالەژێر ناونیشانی تریشدا بێ - رەنگی داوەتەوەو کاریگەر بووە تێیان دا. هەموو عالەم لەوەوە فێری ژیارو زانستو پێشکەوتنو یاساو نیظام بووە. هەرلایەنێکی باش بێ لەیاسا دەستکردەکانی زەوی لەئیسلام دا بنەمای هەیەو لەوەوە فێری بوون. هەر دیاردەیەکی خراپیش هەبێ لەناو کۆمەڵگای موسوڵمانان دا ئەوە لەدابو نەرێتی هەلگرانی ئەو یاسا دەستکردانە وەرگیراوە. بەراستی ئاڵو گۆڕێکی سەیرو سەمەرەیە. باشیان لێ وەرگرتووینو خراپیان پێ داوین، مامەڵەیەکی خەسارەتمەند نامێزمان کردوە. بۆیە ئەوە حاڵو گوزەرانمانە، ئەوە وڵاتو ژیارمانە!! بێگومان مرۆڤایەتی ئێستا لەهەموو کاتێك زیاتر پێویستی بەوە هەیە خۆبخاتە ژێر ئەو رەحمەتەولەو سەرچاوە زوڵاڵە خۆی تێر ئاو بکا.

ئەمجار پەروەردگار فەرمان بەپێغەمبەر دەکا: کەبەموشریکەکان بڵێ: ئەوە پوختەی پەیامی منەو ئەو سەرچاوە زوڵاڵەیە: کەرەحمەتی لێوە دەبارێیو دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَهَلْ أَنتُمْ مُسْلِمُونَ ؟﴾ ئەی موحەممەد! بەموشریکەکانی مەککەو هەموو ئادەمیزادێك رابگەیەنەو پێیان بڵێ: ئەوەی بەنیگا بۆ من هاتووە ئەوەیە: کەخودای ئێوە خودایەکی تاكو تەنهایە، کەس هاوەڵی نیە، هیچ کەس رایەی ناکەوێ ببێتە هاوشانی، ئێوەش بەتاكو تەنهای بزانن‌و هاوەڵی بۆ دامەنێن، بەتەواوی گەردنکەچی بنو شوێن من بکەونو ئیطاعەم بکەن، یەکتاپەرست بن، چونکە یەکتاپەرستی بەدڵسۆزانە ئادەمیزاد لەخەیاڵی پوچو نەزانی رزگار دەکا، باری گرانی بتپەرستیو خەرافی لەسەر ئادەمیزاد لادەبا، یەکتاپەرستی ژیان لەسەر بنەمایەکی پتەو دادەمەزرێنێو بەگوێرەی قانونو یاسای چەسپاوی خودا پەیوەستی دەکا بەبوونەوەرەوەو سەربەرزیی بۆ هەموو ئادەمیزادێك دەستەبەر دەکاو ناهێڵێ جگە لەخودا سەر بۆ

هیچ شتێکی تر نەوی بکا. پێیان بڵێ: ئەوە ڕێبازی ڕەحمەتەو ڕێگای سەرفرازییە! ئایا ئێوە خۆتان بەخودا سپارد؟ موسوڵمان بوون؟ گەردنکەچ بوونو هاتنە سەر ڕێبازی حەق؟؟

جا ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنْتُكُمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ ئەگەر پشتیان هەڵکردو وازیان لەبانگەوازیەکەت هێنا، گوێیان بۆ نەگرتی، بەدرۆیان خستیەوە، ئەوە پێیان بڵێ: ئەوەی لام بوو پێم ڕاگەیاندن، ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ هێنا، دەستم لێ شتنو وام لێ کردون بزانن ئاگامتان چۆنەو چیتان لێ دێو لەسەرەنجامی خۆتان ترساندمن، لەوەبەلاوە ئیتر عوزرتان نەماوە. من لەئێوە نیمو ئێوە لەمن نین، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (یونس/٤١) یان کەدەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ (الانفال/٥٨) بەکورتی من بەرائەتی خۆم لەئێوە پێڕاگەیاندن، هەروەها بەرائەتی ئێوەش لەخۆم!

﴿وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَمْ بَعِيدٌ مَا تُوعَدُونَ﴾ واتە: من نازانم ئەو سزایەی هەڕەشەم پێ لێ کردون دێتە سەرتانو یەخەتان دەگرێ، هاتنی عەزاب بۆ سەرتانو بالادەستی خودا پەرستان بەسەرتاندا شتێکە هەر دێو نەهاتنی نیە، بەڵام نازانم ئایا نزیکە یان دوورە..

﴿إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ﴾ بێگومان خودای مەزن هەموو نهێنیو پەنامەکیەك دەزانێو هیچی لێ گوم نابێ.دەزانێ بەندەکانی چی ئاشکرا دەکەنو چی لەناو دڵی خۆیان دەشێرنەوە. ئاگای لەو تانەو تەشەرانە هەیە: کەبێ بڕواکان ئاڕاستەی ئایینی ئیسلامی دەکەن، هەروا ئاگای لەو فرتو فێڵو ڕقو کینەیە هەیەکەلەدژی ئیسلام لەناو دڵی خۆیان دا حەشاریان داوەو نایدرکێنن، لەوە بەولاوە بەگوێرەی کردەوەکانتان پاداشو سزا دەدرێنەوە.

﴿وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾ ئه‌من نازانم‌و ئاگادار نیم، له‌وانه‌یه دواكه‌وتنی هاتنی عه‌زاب بۆ سه‌رتان، به‌تاقیكردنه‌وه‌ی ئێوه بێ، تادەربكه‌وێ بۆ خه‌ڵكی هه‌ڵس‌و كه‌وت‌و كردارتان چۆنه، ڕێگه‌تان پێ ده‌دا تاماوه‌یه‌ك رابوێرن‌و له‌زه‌تی ژیان وه‌ربگرن‌و له‌نازو نیعمه‌ت دا بتلێنه‌وه، تاكاتی دیاریكراوو بڕیار دراو.

بێگومان دیاریی نه‌كردنی كاتی سزا كاریگه‌ریه‌كی زۆر به‌تینی هه‌یه بۆ بێداركردنه‌وه‌ی‌دڵه نووستوه‌كان، هه‌ر دڵێك كوێر نه‌بوبێته‌وه‌و دانه‌خرا بێ، ترس‌و بیمی سزای ناگه‌هان كاری لێ ده‌كاو به‌ئاگادێته‌وه. دڵی ئاده‌میزاد بێ ئاگایه‌و ژیان‌و رابواردنی پڕ نازو نیعمه‌تیش ئاده‌میزاد ده‌خه‌ڵه‌تێنن، كه‌واته پێویسته وه‌ئاگا بهێنرێته‌وه‌و دابچڵه‌كێندرێ، بۆیه قورئان ئه‌م هه‌ڕه‌شه‌و ترساندنانه ئاراسته ده‌كاو هه‌رجاره به‌شێوه‌و شێوازێك ده‌یدركێنێ. ئه‌مجار پێغه‌مبه‌ر ﷺ روی كرده بارەگای په‌روه‌ردگارو ئه‌م نزایه‌ی كرد، كه‌قورئان بۆمان ده‌گێڕێته‌وه. ﴿قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ﴾ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموی: خودایه! به‌عه‌داڵه‌تكاریی خۆت؛ ئه‌و حه‌قه‌ی: كه‌هه‌موو كارێكت له‌سه‌ر دامه‌زراندوه له‌نێوان من‌و ئه‌م خه‌ڵكه سه‌ر ڕه‌قانه‌دا بڕیار بده‌وخۆت حوكم بده! بێگومان قسه‌و بڕیارو واده‌و به‌ڵێن‌و كارت هه‌موویان حه‌قن، تۆ هه‌ر حه‌قت خۆش ده‌وێ، جگه له‌حه‌ق هیچی ترت ناوێ. دادو حه‌ق له‌وه‌دایه سزای به‌تین بنێری بۆ موشریكه‌كان‌و موسوڵمانان‌و ئاینه‌كه‌یان زاڵ بكه‌ی به‌سه‌ر كوفرو بێ بڕوایان دا.

قه‌تاده ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ران هه‌موویان ئه‌م نزایه‌یان كردوه‌و وتویانه ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾ (الاعراف/٨٩) فه‌رمان به‌پێغه‌مبه‌ری ئێمه‌ش كراوه وابڵێ.

ئیمامی مالیك له‌زه‌یدی كوڕی ئه‌سله‌مه‌وه ریوایه‌ت ده‌كا ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری ئیسلام هه‌ركاتێ ده‌چوو بۆ غه‌زاو دوژمنی ده‌دی ده‌یفه‌رموو ((ربي احكم بالحق)) هه‌ڵبه‌ته زۆری پێ نه‌چوو ئه‌م نزایه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ وه‌رگیراو كافرو ملهوڕه‌كانی

قورەیش لەناو چوون، لەغەزای بەدردا زۆربەی زۆری سەرانی قورەیش کوژران‌و سوپێی کوفر تێك شکا، لەدوای سزای دونیا کەوتنە ناو عەزابی نەبڕاوەی سزای پاش مردن‌و خودا ئایینی پیرۆزی ئیسلامی باڵادەست کرد.

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەم نزایەی کردو ئەمجار ئەم رستەیەی ئاراستەکردن ﴿وَرَبُّنَا الرَّحْمَنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ هەر پەروەدگاری ئێمە خاوەنی رەحم‌و بەزەیی یە، هەر ئەو داوای یارمەتی لێ دەکرێ، ئێمە هەر داوا لەئەو دەکەین؛ کەیارمەتیمان بدا لەسەر ئەو هەڵوێست‌و گوفتارو کردارەتان کەلەدژیی ئاینی خودا دەینوێنن‌و دەیڵێن‌و دەیکەن. پەنا بەخودا دەگرین لەسەر ئەوەی کەهاوەڵ‌و منداڵ‌و خێزان بۆ خودا دادەنێن، لەسەرئەوەی کەمن بەجادوباز دەزانن، بەشاعیرم لەقەڵەم دەدەن‌و دەڵێن؛ قورئان شیعرە.

پەنا بەخودا دەگرین لەسەرئەوەی کەبەتەمان باڵادەستی‌و سەرکەوتن بەسەر موسوڵمانان دا بۆ ئێوە بێ.

**بەیارمەتی خودا سورەتی (الأنبياء) تەواوبوو**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی (الحج)

ئـەم سـورەتە نـاونراوە سـورەتی (الحـج) چـونکە فـەرز بـوونی حـەجی تێـدا ڕاگەیەنـدراوە بەسـەر ئـادەمیزاددا، دوای ئـەوەی حـەزرەتی ئیـبراهیم ﷺ کەعبـەی بنیات نـا، پـەروەردگار فـەرمانی بـە حـەزرەتی ئیـبراهیم ﷺ کـردو پێـی فـەرموو: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ....﴾ ئەویش بانگی ڕاهێشتو دەنگی بەهەموو سەر زەویدا بڵاوبـۆوە زرویێتـی ئـادەمیزاد لەپـشتی باوکییـان دا لـەناو ڕەحمـی دایکیـان دا ئـەم بانگەوازییەی گوێ لێ بوو وڵامیان دایەوە بە ((لبیك اللهم لبیك)).

**موناسەبەی سورەتی حەج بەسورەتی پێشەوەی لەچەند ڕوەیەکەوەیە:**

١- لـەکۆتایی سـورەتی (الانبیـاء) دا پـەروەردگار باسـی نزیکبوونـەوەی قیامـەتی کردوە، هەندێ تەنگانەو ناخۆشییەکانی بەیان کردون، فەرمووی: ﴿وَاقْتَـرَبَ الْوَعْـدُ الْحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَاخِصَةٌ أَبْـصَارُ الَّـذِينَ كَفَـرُوا....الايـة﴾ (الانبیـاء/٩٧). سـەرەتای ئـەم سورەتەشی بەهەمان باس دەستی پێ کـردوە، دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ زَلْزَلَـةَ الـسَّاعَةِ شَـيْءٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ...﴾

٢- لەسـورەتی پێـشوودا چـیرۆکو بەسـەرهاتی زیـاد لـە (دە) پێغەمبـەری بـەیان کــردوە: کـەناوەرۆکی چـیرۆکەکان لەچـوار چـێوەی یەکتاپەرسـتیو واز هێنــان لەبتپەرستیو ئیمان هێنان بەهاتنی ڕۆژی قیامەت دا دەسووڕێنەوە. لەم سورەتەش دا پەروەدگار چۆنیەتی دروست بـوونی ئـادەمیزادو گۆڕانی قۆناغـەکانی سـەرەتای پەیدا بوونیو بەدیهێنانی ئاسمانو زەوی بەوشێوە سـەرنج ڕاکێـشە دەکاتـە بەڵگـەو نیشانە لەسـەر قـودرەتو بـەتوانایی خۆیو هـاتنی ڕۆژی قیامـەتو تـاکو تـەنهایی زاتی پاکی.

**پوختەی ئەو مانایانەی سورەتەکە لەخۆی گرتوون:**

هەرچەندە ئەم سورەتە مەدەنییەو باسی فەرز بوونی حەج و مەناسیکەکانی دەکا، رەوایی شەڕو هۆکارەکانی سەرکەوتن شی دەکاتەوە، کەچی لەهەمان کات دا باسی چەند شتێك دەکا: کەدەشوبهێنە ئەوباس و خواسانەی سورەتە مەکییەکان لەخۆیان گرتوون، وەکوو باسی بڕوا بەخوداو یەکتاپەرستی و زیندوبوونەوەو بەلگەهێنانەوە لەسەری، پاداشدانەوەو سزادانەوە لەسەر کردەوە.

سورەتەکە بەباسی قیامەت و تەنگ و چەلەمەکانی دەست پێ دەکا بەجۆرێك هەست و شعور دەهەژێنێ و ترس و بیم دەخاتە دڵ و دەروونەوە.

ئەمجار دەگوێزێتەوە بۆ بەیانکردنی بەلگەو نیشانەکانی زیندووبوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت و بەیانکردنی بڕێ دیمەنی ئەو رۆژەو چوونە ناوبەهەشت بۆ چاکان و راپێچکردنی تاوانباران بۆ ناو دۆزەخ و راگەیاندنی خەسارەتمەندیی موونافیقەکان و سەر لێ تێکچوونیان! ئەمجا پیرۆزی و رێزداری مەسجیدول حەرام رادەنوێنێ و فەرضبوونی حەج و سوودە ماددی و مەعنەویەکانی رادەگەیەنێ (حرمات)و بەستەکانی، شەعائیرو مەناسیك و شوێنەکانی رون دەکاتەوە.

ئەمجار بەشوێن ئەوەدا هۆکارەکانی پێویست بوونی جەنگ و جیهادو هۆکاری سەرکەوتن بەسەر دوژمن داو دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو ئەزیەت و ناڕەحەتیەی لەموشریکەکانەوە تووشی دێ باس دەکا.

هەروا باس و سەرگورشتەی دانیشتوانی ئەو گوندانە دەکا کەلەسەر ستەمکاری و سەر رەقی خۆیان خودا لەناوی بردون، ئەرکی سەرەکی سەرشانی پێغەمبەر ﷺ: کەبریتییە لەترساندن و موژدەدان، ترساندنی بەدرۆ خەرەوەکانی پەیامی قورئان و مزگێنی دان بەوانەی بڕوایان پێ هێناوە بەبەهەشت و رێزەی فەضل و رەحمەتی خودا بەسەر کۆچکاران و پاداشدانەوەیان رادەنوێنێ و باسیان لێوە دەکا.

ئەمجار دێتە سەرباسی قودرەتو بەتوانایی خودا دەربارەی دروستکردنی شەوو ڕۆژو ئاسمانو زەویو ژیان پێدانو مراندنو زانیاریی تەواوو یەکانگیر بۆ هەموو بونەوەرو تاکو تەنهایی خودا لەبڕیارو حوکمو یەکالاکردنەوە لەنێوان ئادەمیزاددا.

هەروا ڕونکردنەوەی ئەوە: کە خودا درۆزنەکانی ئەوان هیچیان لەبارا نیەو ناتوانن مێشوولەیەك دروست بکەنو مێشێك لەخۆیان دوور بخەنەوە.

ئەمجار دێتەوە سەر بەیانکردنی ئەحکامی شەریعەتو یاسای ئیسلامو ئەرکە جەوهەریەکانی کە: بریتین لەئەنجامدانی نوێژو زەکاتدانو جیهاد کردن لەپێناو ئایینی خودادا. پاشان بەشوێن ئەوەدا لێبوردەیی ئیسلامو ئاسانکاری میانڕەوی ئایین ڕون دەکاتەوە، ئەمجار فەرمان دەکا بەموسوڵمانان کە پابەندی ئایینی ئیسلام بنو شوێن قورئان بکەون. ئەوەش ڕون دەکاتەوە: کەپێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی شایەتن بەسەر گەلەکانی پێشوودا. گەواهی دەدەن کەپێغەمبەرەکانیان پەیامی خودایان پێڕاگەیاندون، ئەمەش ڕێزو شەرەفێکە دراوە بەئوممەتی پێغەمبەری ئیسلام.

دەربارەیی گەورەیی ئەم سورەتە عەزیزی دەفەرموێ: ئەم سورەتە هەمە بابەتە، لەشەویشدا نازڵ بووەو لەڕۆژیش دا، سەفەریشەو حەضەریشە، مەککەییشەو مەدینەیشە، باسی شەڕیشی تێدایەو باسی ئاشتیش، هەندێ ئایەتی موتەشابیهنو هەندێکی موحکەم.

## فەرمان بەتەقوا کردنی پەروەردگار

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ

عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾

دەربارەی ئایەتی ژمارە (١-٢) ریوایەتکراوە کە: ئەم دوو ئایەتە لەشەودا لەغەزای (بنی المصطلق)دا نازڵ بوون، پێغەمبەر ﷺ بەسەر خەڵکەکەدا خوێندنیەوە، زۆر گریا، تەنانەت هیچ کاتێکی تر نەبینراوە ئەوەندە بگری، خەڵکەکەش تا رۆژ بۆوە یان خەریکی گریان بوون یان دانیشتبوونو بیریان لەخۆیان دەکردەوە..

هەر لەسەرەتای سورەتەکەوە پەروەردگار فەرمان بەبەندەکانی دەکا: کەلێی بترسن، خۆیان لەسزاو عەزابی بەئێشی بپارێزنو هەواڵیان دەداتێ لەداهاتوودا چیان بەسەردێو تەنگو چەڵەمەی قیامەت چەند سامناکنو چۆن خەڵکی هەموویان دەکەونە ئەو ترسو بیمەوە. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾ ئەی خەڵکینە ئێوە هەمووتان، ئادەمیزاد بەتێکڕایی! بترسن لەعەزابی خودای خۆتان، خۆتان بپارێزن لەعەزابو سزای خودا، بەطاعەتو بەندایەتی بۆ کردنی، بەگوێڕایەڵیو فەرمانبەرداری بۆ فەرمانو نەهیەکانی، چونکە بێگومان بوومەلەرزەو راشڵەقاندنی زەوی لەو رۆژەدا یان پێش ئەوەی خەڵك لەگۆڕەکانیان رابن، رووداوێکی ترسناکە، تاخەیاڵ بکەی بەسامو هەیبەتە،

کەس خۆی بۆ ناگیرێ‌و کەس نیە لەترسان واقی ورنەمێنێ! قورئانی پیرۆز لەچەند ئایەتێك دا وێنەی ئەو روداوە سامناکەی کێشاوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ، وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾ (الزلزلة/١-٢) یان دەفەرموێ: ﴿وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً، فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ﴾ (الحاقة/١٤-١٥) یان دەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجّاً، وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسّاً، فَكَانَتْ هَبَاء مُّنبَثّاً﴾ (الواقعة/٤-٦).

بەڕاستی روداوێکی سامناك‌و ترسناکە بەبیستنی پێستی ئادەمیزاد گرژ دەبێ‌و موچورکەی پێدا دێن، روداوێکە بەبینینی دیمەکانی‌و دەنگ‌و گرمەی بەبیستنی هیچ کەس هیچی لەبیر نامێنێ، کەس کەس ناناسێتەوە.

روداوێکە پێناسە ناکرێ، پێناسەش بکرێ ئادەمیزاد بۆی هەزم ناکرێ، بیرو بۆچونی حەوسەڵەی ئەوەی نیە بتوانێ لەخۆی بگرێ! تەنیا ئەوەندە دەگوترێ: بومەلەرزەیەو بوومەلەرزەش شتێکە زۆر گەورەیەو ترسناکە، لەبەر گرنگی‌و گەورەیی تەعریف ناکرێ!

ئەمجار دەست دەکا بەشیکردنەوەی ئەو رۆژە سامناکەو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ﴾ لەو رۆژەدا: کەئەو بوومەلەرزە دەبینن، روداوەکانی دیمەنەکانی هێندە بەسام‌و هەیبەتن، هێندە سەرسوڕهێنەرو کاریگەرن، کار دەگاتە ئەوە هەموو ئافرەتێکی شیردەرو خاوەن منداڵی ساوا هۆشی بەسەر زاڕۆکەکەی خۆیەوە نامێنێ‌و لێی بێ ئاگا دەبێ، خۆشەویست‌ترین شت لای دایك منداڵی شیرەخۆرەیە، ترس‌و لەرزەکە هێندە زۆرە ئەو دایکە رۆڵە خۆشەویستە، لەمنداڵە ساواکەی بێ ئاگا دەبێ، ئەی دەبێ بۆ شتی تر چۆن بێ؟

﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾ هەموو سك پڕێك سکەکەی لەبار دەچێ‌و کۆرپەلەی ناو منداڵانی فڕێ دەدا لەترسا زندەقی دەچێ‌و سکی بۆ راناوەستێ!

حەســەن دەفــەرموێ: ئــافرەتی شــیر دەر لەمنــداڵی شــیرەخۆرەی غافــڵ دەبــێ، لــە منداڵێك غافڵ دەبێ: كە هێشتا كاتی لێبڕینەوەی نەهاتووە!

﴿وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾ تۆ ئەوكاتە ئەی بینەر! ئەگەر توانای بینینت هەبێ، ئەو ئادەمیزادانـە دەبینـی هـەموویان دەڵێ ی سەرخۆشن، لەترسان كەس ئاگای لەهیچ نیە، لەراستیشدا سەرخۆشی مەیو شەراب نین، بەڵكوو سامناكی عەزابو هەیبەتی روداوەكان عەقڵو هۆشی بـردون، ئـای لـەم دیمەنە سامناكە!! شیردەر لەشیرە خۆرە بێ ئاگا بووە، سكپڕ سكەكەی لەبەرچووەو هیچ مەناعەیەكی نەماوە! خەڵكی وەكوو سـەرخۆش چاویان لێـڵو پێـڵ، رۆیـشتنو هاتوچـۆیان شـپرێو لارە لار، بـێ هێـزو بـێ تـەوازون كـەس سەركەسـی نـاپرژێ، دیمەنێكە پـڕە لـەم هـەموو تێكـەڵیو پێكـەڵی یـەك، جیهانێكـە شـەپۆل دەداو ئـەو حەشاماتەی تێدا كۆكراوەتەوە. تێكەوە دەهاونو دێنو دەچن!

وێڕای هاتنی ئـەو رۆژەو ئـەم هەڕەشـە تونـدە بـەروداوەكانی ئـەم رۆژە، كەچی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ برێك لەئادەمیزادەكان كێشەو دەمە دەمێ دەكەن دەربارەی تواناو دەسەڵاتی خودا لەسەر زینـدو كردنـەوەو شـتی تـریش، ئـەم موجادە لـەو دەمەدەمێیـەیان لـەڕوی زانـستیو عـەقڵو فامـەوە نیـە، بەڵكوو بـەبێ عـیلمو زانینـی راسـتو دروسـتە ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَرِيدٍ﴾ لـەم كێـشەو دەمەدەمییەیانـدا شـوێن هـەنگاوی شـەیتانی یـاخی بـوو كـەوتوون، لـەڕوی حـەقو راسـتییەوە موناقەشـە ناكـەن، بـەڵكوو جیـدالو كێشەكانیان بەناحەقییـەو لەسـەر بەتاڵە.

ریوایەت كراوە: كەئەم ئایەتە دەربارەی (النضر) ی كوڕی (الحارث) نـازڵ بـووە، ئـەم سەركەشـە موجادەلـە چییەكی زۆر درێـژ دادڕ بـوو، دەیگـوت: فریـشتە كـچی خـودان، قورئـان چـیرۆكە كـۆنی پێـشینەكانە، خـودا نـاتوانێ ئێـسقانە رزیـو زیندوبكاتەوە.

زومەخشەری دەفەرموێ: ئایەتەکە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە: کەکێشەو جیدال بەرپادەکەن لەشتێك دا کەبۆ خودا نابێ‌و ناگونجێ، هەرکەسێك بەناحەق شت وەپاڵ خودا بدا، کردارو صیفەتێك وەپاڵ خودا بدا: کەبۆ خودا نەبێ‌و نەگونجێ، بیەوێ بەزۆرە ملێ‌و دەمدرێژی بیچەسپێنێ، هیچ بەڵگەی حەق‌و راستی بەدەستەوە نەبن‌و جوداوازیی حەق‌و بەتاڵ نەکا ئایەتەکە دەیگرێتەوە.

لەهەمان کات دا ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەرئەوە: کەموجادەلە کردن لەروی حەق‌و راستییەوەو بۆ چەسپاندنی شتی حەق‌و راست کارێکی پیرۆزەو خودا فەرمانی پێ کردوە ودەفەرموێ ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (النحل/١٢٥).

﴿كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَنْ تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُ يُضِلُّهُ وَيَهْدِيهِ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ﴾ پەروەردگار بڕیاری داوە: هەرکەسێك شوێن ئەو شەیتانە یاخی بووە بکەوێ، بیکاتە سەرپەرشتیاری خۆی‌و پابەندی فەرمان‌و ویستەکانی بێ، ئەوە خودا لەدونیاگومڕای دەکاو سەری لێ دەشێوێنێ‌و رێگای حەق‌و سەرفرازیی نادۆزێتەوە، بەڵکوو شارەزای دەکا بۆ رێبازێك: کەبەرەو دۆزەخ کێشی دەکا.

بەڵێ موناقەشەو دەمەدەمێ لەزاتی خودادا، لەهەبوونیدا لەصیفەتەکانی دا، لەتاك‌و تەنهایی دا ، لەتواناو دەسەڵاتی دا... موناقەشە کردن لەم بوارانەدا لەژێر تارمایی ئەو بوومەلەرزەی: کەچاوەڕوان دەکرێ‌و گومان لەهاتنی دا نیەو بەتەقوای خودا نەبێ لێ قوتار بوونی لێ ناکرێ، ئائەو موناقەشە کردنە کاری خاوەن عەقڵ نیەو هەرکەسێك فامی ببێ خۆی لێ نادا!

خۆزگە موناقەشەو جەدەلەکەیان لەروی زانستی‌و زانیاریەوە بوایە، لەزانین‌و دڵنیایی‌یەوە سەری هەڵدایە! نەخەیر ئەوان موناقەشەکەیان نەزانی‌یەو، کێشەی بێ هودەو بێ دەلیل‌و بێ بنەما ئەنجام دەدەن، کێشەی گومڕابوون‌و سەرلێشێوان بەرپادەکەن، کێشەنانەوەکەیان لەروی شوێنکەوتنی شەیتانی یاخی بووەوە سەری هەڵداوە، بەهەواو ئارەزۆ بازی بەرپێی دەکەن، کەوابێ گومانی تێدا نیە: کە ئاکامەکەی گومڕابوون‌و سەرلێشێوانە لەژیانی دونیادا، لادانە لەرێبازی چونە

بەهەشتو بەمراز گەییشتن، گرتنە بەری ڕێبازی دۆزەخو بەدبەختی هەتا هەتایی یە!!

## دروستکردنی ئادەمیزادو گژوگیا بەڵگەیە لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٧﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار باسی موشریکەکانی کرد: کەبەنەزانیو بێ بەڵگە ئینکاری زیندوبوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوە دەکەن، سەرزەنشتی کردن لەسەر ئەو جۆرە بیرو باوەڕانەیان، ئەمجار دروستکردنی ئادەمیزادو گژوگیا دەکاتە بەڵگە لەسەر راستی زیندوبوونەوە، دروستبوونی ئادەمیزاد سەرەتا لەگڵو ئەمجار لەدڵۆپە ئاوێكو تێپەڕبوونی بەچەند قۆناغێك دا دەکاتە بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوەی ئەو خودایەی توانیویەتی لەسەرەتادا ئاوا دروستی بکا، دەشتوانێ جارێکی تر زیندوی بکاتەوە. لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ﴾ لەشوێنی تریشدا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (یس/٧٩) یان دەفەرموێ: ﴿فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (الاسراء/٥١).

جاکەلەوەپێش ئینکاری کردنو هەڵوێستو بیرو بۆچوونی کافرەکانی دەربارەی زیندوو بوونەوە باس کرد، ئیتر لێرەدا بەڵگە لەسەر قوردرەتی رەهای خۆی دەربارەی زیندوبوونەوە دێنێتەوە، بەشتێك کە ئادەمیزادەکان خۆیان رۆژانەو بەردەوام دەیبینن، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ﴾ ئەی خەڵکینە! ئەی ئەوانەی ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، ئەگەر گومانتان هەیە دەربارەی زیندو بوونەوەو هاتنی رۆژی قیامەت، ئەوە بیر لەدروست بوونی خۆتان بکەنەوە، سەیری پەیدا بوونی خۆتان بکەن، ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ﴾ بێگومان ئێمە ئێوەمان سەرەتا لەگڵ دروست کردوە، جاکەسێك بتوانێ سەرەتا شتێك دروست بکا، ئەوە جارێکی تر دروستکردنەوەی ئەو شتەی زۆر لەلا ئاسانترە: زیندوبوونەوەی قیامەت دوبارە کردنەوەیە بۆ گیانو جەستەیەك کەلەوەپێش بووە، ئەمەش لەدیدو تێڕوانینی ئادەمیزادەوە زۆر ئاسانترە لەدروستکردنی سەرەتا، هەرچەندە بەنیسبەت قوردەتی خوداوە هیچ شتێك گران نیە، لای خودا شتێك نیە ئاسان بێو شتێك گران بێ. هەموو کارێك بۆ خودا چون یەکە، دروستکردنی سەرەتاییو سەرلەنوێ دروستکردنەوە هەردوکیان ئاثاری ئیرادەن، هەرشتێك

ئیرادەی خودا داخوازی بوو ویستی ببێ یەکسەر دەبێ، چونکە خودا بۆخۆی دەربارەی ئەم یاسایە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ (یس/٨٢).

وەلێ قورئـان ئادەمیزادەکـان والێ دەکـا بـەپێوەری خۆیـان بـڕوانن‌و بـەبیرو بۆچوونی خۆیان بیر بکەنەوە، سەرەنجیان رادەکێشێ بۆ تێفکرین‌و وورد بوونـەوە لـەخودی خۆیـان‌و دروسـتبوونی خۆیـان: کەهـەموو ئـان‌و سـاتێك دەیبیـنن‌و بەسـەریاندا تێپـەڕ دەبـێ، هەڵبەتـە خولقانـدنی خۆیـان‌و لـەدایکبوونیان شـتێکی گرنگ‌و سەر سووڕهێنەرە، ئەگەر بەچاوی دڵ تێی بڕوانن، بەهەست‌و شعورەوە لێی وورد ببنـەوە. بـەڵام ئـەوان بـەبێ ئاگایی بەسـەریان دا تێپـەر دەبێ‌و بەلایدا تێپەڕ دەکەن!

بیرناکەنەوە: ئەم ئادەمیزادانە چین‌و کێن؟ لەکوێوە هاتوون؟ چۆن هاتوون؟ بەچ قۆناغێك دا تێپەڕیان کردوە؟؟ بۆیە پـەروەردگار ئـەم حەقیقەتـەیان بەگوێدا دەداو دەفەرموێ: ئـەی ئادەمیزادینـە! ئەگـەر ئێـوە بڕواتـان بەزیندوبوونـەوە نیـەو دەڵێن: کێ دەتوانێ دوای مردن‌و رزین‌و پۆلکانی جەستە جارێکی تـر ئـەو جەسـتە رزیوە دروست بکاتەوە!! ئەوە باش بـزانن: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ﴾ ئێمـە ئێوەمـان سەرەتا لەگڵ دروسـت کـردوە!! ئـادەمیزاد کـوڕی ئـەم خاکەیـەو لـەگڵی ئـەم زەوییـە پەیـدا بـووە. بـەگڵی ئـەم خاکـە پـەروەردە بـووەو ژیـاوە، عونـصورە مادییـەکانی جەسـتەی لـەم خاکەیـە، جگـە لـەو شـوعلە نهێنییـەی: کـەخودا خـستویەتیە نـاو جەستەیەوەو لەو گیانە جاویدانیـە فـوی پێدا کـردوەو ئـەو مادەیـەی کردۆتـە ئـەم ئادەمیزادە بیرکەرەوە خاوەن هەستە سەرسوڕهێنەرە.

بەڵێ ئادەمیزاد لەڕەگەزی خاکە، پەیکەرو قەڵافـەتی لەخاکە، بـژێوی لەخاکـە. بەڵام گڵ لەکوێ‌و ئادەمیزاد لەکوێ!!

بێگومان بەهۆی ئەو گیانـەی خراوەتـە نـاو جەسـتەیەوە هێنـدە بـەرز بۆتـەوە، نێوانیان ئاسمان‌و رێسمانە!

به‌هۆی ئه‌و گیانه‌وه‌یه بۆته كاریگه‌رو كار لێكراو، بۆته خاوه‌ن عه‌قڵ‌و فام‌و بیرو هۆش، قاچی له‌سه‌ر زه‌وییه‌و روو له‌ئاسمانه، بیر له‌بوونه‌وه‌ر ده‌كاته‌وه، له‌شته ناماددییه‌كان ورد ده‌بێته‌وه، په‌یوه‌سته به‌عاله‌می بالآوه.

﴿ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ﴾ پاشان یه‌كه یه‌كه‌ی ئێوه‌مان به‌شێوه‌ی په‌یدابوون له (مه‌نی) تۆماو دروست كردوه. ئاشكراشه تۆماو له‌خۆراك په‌یدا ده‌بێ‌و ئه‌ویش له‌خاك.

﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾ پاشان ئه‌و دڵۆپه تۆماوه به‌فه‌رمانی خودا دوای چل رۆژ ده‌بێته خوێنپاره، خوێنێكی خه‌ستی مه‌ییو له‌شێوه‌ی زه‌روو دایه.

﴿ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ پاشان ئه‌و خوێنپاره‌یه ده‌بێته گۆشتپاره، ئه‌مجار شكڵ وشێوه‌ی ئاده‌میزادی لێ ده‌خوڵقێندرێ‌و ده‌بێته كۆرپه‌له‌یه‌كی جه‌سته داڕێژراوو كامڵ‌و ته‌واو، یان به‌ناكاملی دایكه‌كه‌ی فڕێی ده‌داو له‌باری ده‌چێ، یان هه‌ر به‌كه‌م ئه‌ندامی له‌دایك ده‌بێ‌و كه‌م‌و كوڕی هه‌یه.

به‌كورتی ده‌توانرێ ﴿مُخَلَّقَةٍ﴾ به‌كورپه‌ڵه‌یه‌ك بگوترێ: كه‌بێ عه‌یب‌و كه‌م‌و كوڕی بێ، ﴿وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ یش به‌كۆرپه‌له‌یه‌ك ده‌گوترێ: كه‌كه‌م‌و كوڕی له‌جه‌سته‌یدا هه‌بێ.

ئه‌ی ئاده‌میزادینه! ئێمه ئێوه‌مان به‌و شێوه‌یه خوڵقاندوه‌و به‌و قۆناغانه‌دا تێپه‌ڕیون و تێ ده‌په‌ڕن ﴿لِنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾ بۆئه‌وه‌ی تواناو ده‌سه‌لآتی خۆمانتان بۆ ده‌ربخه‌ین، بۆئه‌وه‌ی بزانن: ئه‌و خودایه‌ی بتوانێ له‌سه‌ره‌تاوه ئێوه به‌و شێوه‌یه دروست بكا، به‌ئاسانی ده‌توانێ جارێكی تر سه‌رله‌نوێ دروستان بكاته‌وه!

بێگومان مه‌ودای نێوان عونصوره خاكییه سه‌ره‌تاییه‌كان‌و ئه‌و تۆماوه‌ی پێك هاتووه له‌خانه مه‌نه‌وییه‌كان مه‌ودایه‌كه زۆر دوورو درێژه، فه‌رقی نێوانیان ئاسمان‌و رێسمانه! چونكه له‌و خاكه بێ گیانه ئه‌و تۆماوه په‌یدا ده‌بێ: كه‌نهێنییه‌كی گه‌وره‌ی له‌خۆ گرتووه، نهێنی گیان كه‌تا ئێستا ئاده‌میزاد شتێكی ئه‌وتۆی لێ نازانێ، دوای ملوێنه‌ها ساڵ‌و دوای ئه‌وه‌ی: كه‌هه‌موو نان‌و ساتێك ملیۆنه‌ها عونصووره

خاکییه‌کان ده‌بنه خانه‌ی مه‌نه‌وی! ئاده‌میزاد له‌به‌رامبه‌ر ئه‌م گۆڕانکارییانه‌دا ده‌سته‌وه‌سانه‌و هیچی لێ حاڵی نابێ‌و ناگاته هیچ!

ئه‌و تۆماوه چیه؟ ئه‌وه ئاوی پیاوه، هه‌ر دڵۆپێك له‌و ئاوه هه‌زاران گیانداری مه‌نه‌وه‌ی تیایه، له‌ناو ئه‌و هه‌زاران كرۆمۆسۆمانه گیانداره ته‌نیا یه‌کێکیان په‌یوه‌ست ده‌بێ به هێلکۆکه‌ی ئافره‌ته‌وه‌و پێکه‌وه ته‌لقیح ده‌بن به دیواری منداڵدانه‌وه ده‌نوسێ، ئیتر به قودره‌تی خودای باڵا ده‌ست‌و به‌توانا له‌و نوخته پچکۆله زۆر پچکۆله‌ی که به‌دیواری منداڵدانه‌وه نووساوه، ئه‌م ئاده‌میزاده سه‌ر سوڕهێنه‌ره دروست ده‌بێ‌و ئه‌و هه‌موو شێوه‌و شکڵ‌و ڕه‌وشتانه‌ی تێدا په‌یداده‌بن. ئه‌م هه‌موو صیفاته جیاجیاو جۆراو جۆرانه‌ی تێدا حه‌شاردراون! کێ ته‌صه‌ور ده‌کا کێ بڕوا ده‌کا: که ئه‌م هه‌موو صیفاته جه‌سته‌ی و نه‌فسیانه له‌و خاڵه پچکۆله تۆماوه نووساوه‌دا: که به‌دیواری منداڵدانه‌وه نووساوه خۆیان حه‌شارداوه!! کێ ته‌صه‌ور ده‌کا: که ئه‌م ئاده‌میزاده سه‌ر سوڕهێنه‌ره وێڕای ئه‌و هه‌موو ڕه‌وشت و دیاردانه‌ی تێ یدان‌و سه‌رباری ئه‌وه‌ی: که‌هیچ کاتێك دوو ئاده‌میزاد لێك نه‌چن‌و له‌هه‌موو شتێکدا جوداوازییان هه‌یه له‌و تۆزه تۆماوه تێکه‌ڵاوه به گه‌رای ئافره‌ته‌وه په‌یدابێ!!!

به‌ڵێ ئه‌و تۆزه تۆماوه‌ی پیاو به‌گه‌رای ئافره‌ته‌وه ده‌لکێ‌و ده‌بێته خوێنپاره‌و گۆشتپاره‌و کۆرپه‌له‌و گه‌شه‌ده‌کاو ورده ورده کامڵ ده‌بێ. ﴿وَنُقِرُّ فِي الأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ ئه‌و کۆرپه‌لانه‌ی له‌بار ناچن‌و ده‌یانهێڵینه‌وه له منداڵانه‌کاندا تاماوه‌یه‌کی دیاریکراوو مه‌زنده کراو لای خودا، ﴿ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً﴾ پاشان به‌قودره‌تی خۆمان له‌سکی دایکتان ده‌رتان دێنین‌و ده‌تانخه‌ینه سه‌ر زه‌وی، ساواو بێ هێزو بێ عه‌قڵ‌و فام‌و هه‌ستی ته‌واو! ئه‌مجار ورده ورده ئه‌و زاڕۆکه گه‌شه ده‌کاو پێ ده‌گاو فام ده‌کاته‌وه‌و فێری شت ده‌بێ!

﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ پاشان هێزو توانای عەقڵی‌و جەستەییتان گەشە دەکاو پێ دەگا تادەگەنە ئەندازەی کەماڵ‌و پێ گەییشتن لەهەرەتی لاویەتی دا.

﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ هی واتـان هەیـە پـێش پلـەی لاوەتی یان لەهەرەتی کامڵی‌و پێگەیشتوییدا دەمرێ ، هی واشـتان هەیـە تەمـەنی درێژ دەبێتەوە تادەگاتە تەمەنی پیری‌و پۆلکان، هێزو پێـزی تێـدا نـامێنێ، عـەقڵ‌و هۆشی کەم دەبێ، لاواز دەبێ، وەکوو منداڵی ساوای لێ دێتەوە لـەبێ هێـزی دا، لـەدڵ ناسکی‌و هەڵچوون‌و تورە بـوون دا، لەتێگەییـشتن‌و فێـر بـوون دا لەنەخـشەو پـیلان‌و بیرو بۆچون دا، بەکەمترین شت رازیـی دەبـێ، بەکـەمترین شـت تـورە دەبـێ‌و ئاشـت دەبێتەوە، وەکوو منـداڵی ساوای لێ دێتەوە لـەوەدا کەهەسـتی وەرگـرتن‌و حـافیظەی شت گل ناداتەوە، شتی وەبیر ناکەوێتـەوە، وەکـوو منـداڵی ساوای لێ دێتـەوە لـەوەدا تێڕوانینـی بـۆ روداوەکـان بەسـادەیی‌و تاکـە تاکەیـە، پێکیـان نـاگرێ‌و لێکیـان نـاداو ئاکام‌و نەتیجەیان لێ هەڵناهێنجێ، روداوو بەسەرهاتەکان لەهەست‌و هۆشیدا جێگیر نـابن، پـێش ئـەوەی بگاتـە کۆتـایی تـاوو تـوێ کردنـی روداوێـك سـەرەتاکەی لـەبیر دەچێتەوە، ئاوا بەو جۆرە دەگاتە تەمەنی پیری‌و کەنـەفتی ﴿لِكَيْلا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئاً﴾ هەتا وای لێ دێ دوای زانین‌و وشیاری هیچی لەبیر نامێنێ‌و هیچ نـازانێ، ئـەو زانیاری‌و زانستەی خۆی پێوە بادەداو موجادەلەو موناقەشەی پـێ دەکـرد، هـەمووی لەکیس چووە، هیچی پێ نەماوە دۆست‌و کەس‌و کـاری خـۆی ناناسـێتەوە، تەنانـەت رێگای ماڵی خۆی لێ تێك دەچێ، رودەکاتە ماڵی خەڵکی تر! رێ ناباتـەوە بـۆ خانـەو لانەی خۆی، سەری لەرزۆك‌و موی سپی‌و پێستی چـرچ‌و عـەقڵی خـەرەفاو!! وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَمَـنْ نُعَمِّـرْهُ نُنَكِّـسْهُ فِـي الْخَلْـقِ﴾ (یـس/٦٨) یـان دەفـەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْـدِ قُوَّةٍ ضَعْفاً وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَـدِيرُ﴾ (الـروم/٥٤) ئـەمجار پـەروەردگار بەڵگەیەکی تر دێنێتەوە لەسەر رابوونی قیامەت‌و زیندوبوونـەوەی ئـادەمیزاد سـەر

لەنوێ. شین بوونەوەی گژوگیا دەکاتە بەڵگە لەسەر راستی هاتنی قیامەت، چونکە لێکچوونی بەهێز هەیە لەنێوان شین بوونەوەو سەردەرهێنانی گژو گیا لەپاش باران بارین بەزیندوبوونەوەی ئادەمیزاد دوای مردنو هاتنی رۆژی قیامەت! دەفەرموێ: ﴿وَتَرَى الأَرْضَ هَامِدَةً﴾ ئەتۆ دەبینی ئەی بینەر! ئەی ئادەمیزاد زەوی دەبینی وشكو برینگە،گژوگیای تێدا نیە، ﴿فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ جاكەبارانمان بەسەردا باراندو تێر ئاو بوو، زەوییەكە فشۆڵ دەبێو لەخۆدەكەوێ، رەگو ریشاڵی گژوگیاكەی بەباران‌و ئاو گەشەدەكاو رادەسێو دەشتو دەر دەرازێنێتەوە، جۆرەها گژوگیاو گوڵو گوڵزار ئارایشی دیمەنەكانی دەدەن! جۆرەها بۆن‌و بەرامو تامو چێژیان لێ پەیدا دەبێ، جاكەسێك بتوانێ زەوی وشكو برینگو مردو ئاوا زیندو بكاتەوەو ئارایشتی بدا، زۆر بەئاسانی دەتوانێ مردوەكان سەرلەنوێ زیندو بكاتەوە، بەڵگەیەكی بەهێزەو لێكچواندنێكی ئاشكراو نومایانە، ساڵانەو وەرزانە بەبەرچاوی خۆمانەوە زەوی وشكو برینگ بەهۆی ئاوەوە وەخۆ دەكەوێتەوەو گژوگیای پەرپوی پاری تێدا شین دەبێتەوە.!

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی باس كرا: لەدروستبوونی ئادەمیزاد لەگڵو تاوو توێ كردنی كۆرپەڵە لەمنداڵدان داو گۆڕانی قۆناغەكانی دروستبوونیو گەشەكردنی ژیانی سەرزەوی بەو شێوەی باسكرا ئەمانە هەموو ﴿بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە: كەخودا حەقەو هەیەو هیچ شكو گومانی تێدا نیە، هەمیشە هەیەو هەر بووەو هەر دەبێو نەمانی بەسەردا نایە.

بەدیهێنەرەو چی بوێ دەیكاو چۆنی بوێ ئاوا بەدی دەهێنێ، جگە لەخودا هەموو مەخلوقات زەبوون‌و لاوازن هیچ كامێ لەو كارانەیان بۆ ناكرێ كەباس كران!

﴿وَأَنَّهُ يُحْيِ الْمَوْتَىٰ﴾ بەهۆی ئەوەوەیە خودا مردو زیندو دەكاتەوە، توانای زیندو كردنەوەی مردوانی هەیە، چونكە ئەگەر خودا دەسەڵاتی زیندو كردنەوەی

مردوانی نەبوایە هەرگیز نەیدەتوانی لەخاکی مردو ئادەمی زیندو دروست بکا، نەیدەتوانی لەخۆڵی مردوو وشكو برینگ ئەو هەموو گژوگیایەو روەكو دارو درەختە فەراهەم بێنێ، کەسێك توانیبیەتی لەگڵ ئادەمی دروست بکا، گژو گیا فەراهەم بێنێ، چۆن توانای زیندو کردنەوی مردوانی نیە؟! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (فصلت/٣٩) بەڵێ ئەو خودایەی سەرەتا گیانی دروست کردوە، هەر ئەو دەتوانێ جارێکی تر گیان بەبەرجەستە کان دا بکاتەوەو سەرلەنوێ ئادەمیزادەکان لەگۆڕەکانیان راست بکاتەوە، پاداشو سزای کردەوەکانی جیهانیان بداتەوە.

﴿وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ پەروەردگار ئەم کارانەی دەیانکا بەهۆی ئەوەوەیە: کەخودا بەسەر هەموو شتێك دا خاوەن دەسەڵاتەو توانای زیندو کردنەوەی جەستە رزیوەکانی هەیەو هەموو زانیاریەکی دەربارەیان هەیەو هیچی لێ گوم نابێ، هەرکاتێ ویستی زیندویان بکاتەوە بەئاسانیو چۆنی بوێ ئاوا زیندویان دەکاتەوە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (یس/٧٩). هەروەها بەهۆی ئەوەوەیە: کە ﴿وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لا رَيْبَ فِيهَا﴾ ئێوە بزانن: کەسێك بتوانێ مردوان زیندو بکاتەوە، دەشتوانێ قیامەت هەڵسێنێ: کەوابوو قیامەت رادەبێو شكو گومان لەهاتنیدا نیە، چونکە خودا بڕیاری رابوونی قیامەتی داوە، شتێکیش خودا بڕیاری دابێ هەردەبێ بێتە جێو نەهاتنەدی مەحاڵە.

دەبێ ئادەمیزاد بزانو دڵنیابن: کەقیامەت دێو ﴿وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ﴾ دڵنیا بن: کەخودا هەموو ئادەمیزاد دوای مردنیان سەرلەنوێ زیندویان دەکاتەوە، جەستەکانیان رێك دەخاتەوەو گیانیان بەبەردا دەکاتەوەو راپێچی گۆڕەپانی حەشریان دەکاو حیسابو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەنجام دەداو پاداشو سزای خۆیان وەردەگرنەوە!

بەکورتی قۆناغەکانی دروست بوونی ئادەمیزادو گیانلەبەرانی ترو گژوگیا بەلگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی: کەخودا توانای بەسەر هەموو شتێکی مومکیندا هەیەو هەموو زانیاریەك دەزانیٚ، رابوونی قیامەت مومکینەو خودا دەسەلاٚتی بەسەردا هەیە.

**تێبینی:**

وەکوو چەند جارێك ئاماژەمان پیٚ کردوە، مەبەستی سەرەکی قورئانی پیرۆز سیٚ شتی سەرەکیە لەبواری عەقیدەو باوەڕدا.

١- تاكو تەنهایی پەروەردگار وەصفدار کردنی بەهەموو صیفەتێکی کەمالٚو بەدوور گرتنی لەهەموو عەیبو خەوشێك.

٢- چەسپاندنی هاتنی قیامەتو هەبوونی ژیانی جاویدانی ئەو دونیاو زیندوبوونەوەی قیامەت.

٣- چەسپاندنی نیگاو سروشی خودا بۆ پێغەمبەرانو رەوانە کردنیان بۆ سەر کۆمەلاٚنی ئادەمیزاد بەگوێرەی پێویستو پشتگیری کردنیان بەموعجیزەو رووداوی سەرئاساو موعجیزە، بۆیە زۆر جار لەقورئان دا پیٚ لەسەر ئەم بنەمایانە دادەگریٚو جەختیان لەسەر دەکاتەوە.

لەلایەکی ترەوە چەند جارێك ئاماژەمان پیٚ کردوەو لەکتێبە ئوصولیەکاندا چەسپاوە: کەفەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ رونکەرەوەو تەفسیرو راڤەکەری ئایەتەکانی قورئانن. جا بابزانین پێغەمبەر ﷺ چۆن قۆناغەکانی دروستبوونی ئادەمیزادی رون کردۆتەوە؟ لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا فەرمودەیەك هەیە، عەبدولاٚی کوڕی مەسعود دەفەرمویٚ: پێغەمبەر ﷺ بۆی باس کردین فەرموی: ((ان احدکم یجمع خلقه فی بطن امه اربعین یوماً، ثم یکون علقة مثل ذلك، ثم یرسل

الله الملك فينفخ فيه الروح ويؤمر باربع كلمات بكتب رزقه واجله وعمله شقى او سعيد)).[٢٠]

واته: هەر یەکێك لەئێوه لەسکی دایکیدا چل رۆژ بەنوتفەیی دەمێنێتەوە، پاشان چل رۆژ بەخوێنپارەیی دەمێنێتەوە، پاشان چل رۆژ بەگۆشتپارەیی دەمێنێتەوە، ئەمجار پەروەردگار فریشته دەنێرێ گیانی بەبەردا دەکاو فەرمانی پێ دەکرێ بەنوسینی چوار شت: رزق و رۆزیی، تەمەنی، کاروکردەوەی، باشە یان خراپە.

ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: دوای تێپەڕبوونی چوار مانگ لە (دە) رۆژی یەکەمی پاش چوار مانگەکە گیانی بەبەردا دەکرێ، هەر ئەم ئەندازەیەش دەبێتە عیددەی ئافرەتی مێرد مردوو، واته: چوارمانگ و دەرۆژ.

بێگومان فو پێدا کردنەکە هۆکارێکە خودا دەیرەخسێنێ بۆ گیان بەبەردا کردنی کۆرپەلە، بەدیهێناون و شێوه کێشانەکەی بە قودرەتی خودا ئەنجام دەدرێ: وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ﴾ (الاعراف/١١) یان دەفەرموێ: ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ (غافر/٦٤) یان دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ....﴾ (الحج/٥) ئەو گیانەی کەلە مادە مەنەویەکەدایە پێش تێپەڕ بوونی چوار مانگەکە گیانێکی روەکی یەو گیانی حەقیقی نیە. زانایانی ئیسلام گومانیان لەوەدا نیە: کەبەبەردا کردنی گیانی حەقیقی و جم و جوڵ پەیداکەر لەکۆرپەلە دوای تێپەڕبوونی چوار مانگەکە پەیدا دەبێ!

قورطوبی دەفەرموێ: ئەگەر ئافرەتێك مەنی پیاوەکەی دەرهاویشتەوە، حوکمی وەزعی حەملی بۆ بڕیار ناداریٚ و هیچ حیسابێکی بۆ ناکرێ، بەلام ئەگەر بەخوێن

---

([٢٠]) بوخاری لەسەرەتای کتێبی (القدر) (٦٥٩٤) دا هەروەها موسلیم لەسەرەتای کیتابی (القدر) (٢٦٤٣) ریوایەتیان کردوه.

پارەیی فڕێی دایەوە، یان بەگۆشتپارەیی ئەوە حیسابی حەملی بۆ دەگرێو رەحەمی پێی پاك دەبێتەوەو عیددەی پێ دەڕوا، ئەمە مەزهەبی ئیمام مالیکە!

شافیعی دەفەرموێ: فڕێ دانی گۆشتپارە هیچ ئیعتیبارێکی بۆ نیە، کاتێك ئیعتباری بۆ دەکرێ ئەگەر شکڵو شێوەی کێشرابێ. ئەگەر هەر گۆشتپارە بوو شکڵی نەکێشرابوو ئەوە دوو راهەیە: رای دەق لەسەر هاتوو ئەوەیە: کەعیدەی پێ دەڕوا، بەڵام نابێتە ئافرەتی منالّ بوو، بەدایك دانانرێ، چونکە عیددە بەخوێنی رەوان‌و جاری تێپەڕ دەبێ، کەوابوو بەگۆشتپارە باشتر رۆییشتنی عیددەی پێ دەڕوا. [٢١]

ئیمام مالیك دەفەرموێ: ئەگەر ئافرەتێك زەبرێکی بەر سکی کەوت، کۆرپەڵەکەی بەخوێنپارەیی یان بەگۆشتپارەیی فڕێ دا، ئەوا خوێنی کۆرپەڵە وەردەگرێ: کەبریتییە لەنیوەی دەیەکی خوێن..

شافیعی دەفەرموێ: ئەگەر کۆرپەڵەکە شکڵو شێوەی نەکێشرابوو هیچ خوێنێکی لەسەر نیە.

ئیمام مالیك دەفەرموێ: ئەگەر ئافرەتێك سکی لەبار چوو کۆرپەڵەیەکی فڕێ دا، دەنگی لێوە نەهات ئەوە نیوەی دەیەکی خوێنی لەسەرە. ئەگەر دەنگی لێوە هات؛ ئەوە لەگەڵ شافیعی دا رایان وایە خوێنی تەواو وەردەگرێ.

## حاڵو وەزعی نادەمیزادان" کێشەو نیزاعو دەمە دەمێی بڕوا شێواوەکان‌و پاداشتی خاوەن باوەڕان

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ٨ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا

(٢١) تەفسیری قورطوبی ج ٦ /٣٣٨٨.

خِزْيٌ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَـٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُوا۟ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴿١٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾

زۆربەی راڤەكەرانی قورئان لەسەر ئەوەن: كەئایەتی ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ...﴾ دەربارەی ئەبوجەهل، نازڵ بووە، خودا هەڕەشەی لێ كرد بەڕیسوا كردن لەدونیادا، هەڕەشەكە هاتە جێو لەغەزای بەدردا كوژرا. یان دەڵێن: دەربارەی (النضر)ی كوڕی (حارث) نازڵ بووە: كەئەویش لەغەزای بەدردا كوژرا.

دەربارەی ئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ...﴾ ئیمامی بوخاری لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەت دەكا، دەفەرموێ: پیاوی واهەبوو كۆچی دەكرد بۆ مەدینەو

موسوڵمان دەبوو: جائەگەر ژیانی خۆش بوایە: ژنی کوڕی ببوایە، ئاژەڵەکانی باش زاوو زێیان بکردایە دەیگوت: بەخودا ئاینێکی باشە، ئەگەر وانەبووایە دەیانگوت: بەخودا ئاینێکی شومە ئیتر خودا ئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ....﴾ ی نازڵ کرد.

ئیبنو مەردەوەیهی لەرێگای (عطیە)وە لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پیاوێکی جولەکە موسوڵمان بوو، دوایی کوێر بوو، ماڵو منداڵی فەوتان، رەشبینی بەئیسلام کردو وتی: لەم ئایینە تازەیەم خێرم نەدی، هەر کەموسوڵمان بووم کوێر بووم ماڵم فەوتا، منداڵەکانم مردن. ئیترئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ....﴾ نازڵ بوو.

ئەم کۆمەڵە ئایەتەی ئێرە باسی حاڵو وەزعی سێ پێڕ لە ئادەمیزاد دەکا، ئەمەش دوای بەیانکردنی حاڵو وەزعی کۆمەڵێك لەگومڕاو نەزانە چاو لێکەرەکان، کەلەوە پێش بەئایەتی ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَّرِيدٍ﴾ باسی کردن.

١- کۆمەڵی یەکەم ئەوانەن بانگەوازی خەڵکی دەکەن بۆ گومڕایی‌و بۆخۆشیان سەرانی کوفرو سەرپێچیکارانن. دەفەرموێ ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ برێ ئادەمیزاد هەن، کێشەو دەمە دەمێ دەکەن دەربارەی تاك‌و تەنهایی خوداو زات‌و صیفاتی، لەم جیداڵو کێشەیەدا چ بەڵگەیەکی عەقڵی‌و نەقڵی راست‌و دروستیان بەدەستەوە نیە، بەڵکوو هەر بەهەوانتەو ئارەزۆ بازییەو بەس!

نەبەڵگەی عەقڵی بەهێزیان لایە، نەلەخوداوە نیگاو سروشیان بۆ هاتووە بۆئەوەی ئەوانە پشتی پێ ببەستن.

﴿ثَانِيَ عِطْفِهِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾ کێشەو جیدال دەکا خۆبەزل دەزانێ‌و پشت لەحەق هەڵ دەکا، حەق‌و راستی بەگوێدا ناچێ‌و چەندێك بانگ بکرێ بۆ حەق

ئەو مل نادا. بەفیزەوە لا دەکاتەوەو خۆی لەخەڵکی بەرزتر دەزانێ. مەبەستی خۆبەزلزانیو فیزکردنەکەی ئەوەیە: لەئاکام دا بڕواداران لەئایینی خودا دوور بکەونەوە واز لەخودا پەرستی بێنن. هەر بەوەندە رازی نابێ خۆی گومڕایە، دەیەوێ خەڵکی تریش گومڕا بکا.

لامی (لیضل) یان (لام)ی تەعلیلو بایسە، یان (لام) عاقیبەتە. زومەخشەری دەفەرموێ: (لام)ی تەعلیلە واتەك کێشەو جەدەل بەرپادەکا بۆئەوەی خەڵکی گومڕا بکا.

ئەم زلحۆرتە گومڕاو گومڕاکەرە، هەروا بەسەریەوە ناچێ پێویستە ریشەکێش بکرێو لەناو ببرێ ﴿لَهُ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ لەدونیادا ریسواییو سەرشۆڕی بەشیەتی!! وەکوو لەوە پێش ئاماژەمان بۆ کرد، راڤەکەران دەڵێن: مەبەستی ئەبو جەهلو هاوەڵانیەتی ئەوە بوو: لەغەزای بەدردا هەموو ئەوانە کوژرانو ریسوا بوون ﴿وَنُذِيقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ لەرۆژی قیامەتیش دا عەزابی ئاگری دۆزەخی پێ دەچێژین، تورێ دەدەینە ناو دۆزەخەوەو بەئاگر دەیسوتێنین.

﴿ذَلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ﴾ جائەو کاتە پێی دەگوترێ: ئەم بەئاگر سووتانو عەزابە بەئێشەت سزای ئەو کردەوانەیە کەلەدونیادا ئەنجامت داوە، بەهۆی تاوانی خۆتەوەیەو سزایەکە پڕاو پڕی تاوانەکانتە. ﴿وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾ ئەمەش لەم روەوەیە: کەخودا ستەم لەبەندەکانی ناکاو کەس بەبێ تاوان سزا نادا.

یان ئەمەی لەڕوی سەرزەنشتو لۆمە کردنو لاقرتێ پێکردنەوە پێ دەگوترێ: وەکوو ئەوە: کەلەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ ﴿خُذُوهُ فَاعْتِلُوهُ إِلَى سَوَاءِ الْجَحِيمِ، ثُمَّ صُبُّوا فَوْقَ رَأْسِهِ مِنْ عَذَابِ الْحَمِيمِ، ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ، إِنَّ هَذَا مَا كُنتُم بِهِ تَمْتَرُونَ﴾ (الدخان/٤٧-٥٠).

٢- کۆمەڵی دووەم: گومڕاو شەقاوەو دڵ کرمێو دوڕوو بەرژەوەند پەرستو ماددین. دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ﴾ برێ لەئادەمیزاد خودا

پەرستی دەکەن لەکەنارەوەو بەڕواڵەت، خودا پەرستییەکەیان بەدڵ نیەو لەناخەوەو بەدڵسۆزی عیبادەتەکەیان ئەنجام نادەن، وەکوو کەسێك وان لەکەناری سوپاوە دەوەستێ، هەرکاتێ هەستی بەخەتەر کرد دەقوچێنێو هەڵدێ، ئەگەر سوپاکەش سەرکەوتنی بەدەست هێنا، ئەوە سنگ دەردەپەڕێنێو خۆ دەباتە پێشەوە. ئەو جۆرە کەسانە بڕوا شێواوو ڕاڕان، دڵ دامەزراو نین، دڵیان لەسەر ئایین دانەمەزراوە، عیبادەتەکەیان بەدڵسۆزیی ناکەنو کۆمەڵێکی دوو ڕوون.

جا ئەو جۆرە کەسانە، ﴿فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ﴾ ئەگەر لەدوای ئیمانهێنانەکەیو لەژێر سایەی ئایین دا قازانجێکی مادی دەست کەوت، ماڵو سامانی زۆر بوو، منداڵی بوون، لەشساغو تەندروست بوو، ئەوە دڵی بەئایین خۆش دەبێو دەڵێ: بەخودا باش بوو موسوڵمان بوومو ئەم ئایینە ئاینێکی چاکە.

﴿وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ﴾ خۆ ئەگەر لەژێر سایەی ئایین دا توشی نەخۆشی بوو، منداڵی مرد، ماڵو سامانی کەم بۆوە، خێزانی منداڵی نەبوو، ئاژەڵەکانی پەرەیان نەسەندو زۆر نەبوون، خێرا لەئایین هەڵدەگەڕێتەوەو کافر دەبێتەوە!!

﴿خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾ خەسارەتمەندی دونیاو قیامەت بووە، لەدونیادا هیچی دەست ناکەوێ، هیچ پیاوەتیو شکۆمەندی بۆ دەستەبەر نابێ، پاداشتی قیامەتیشی دەفەوتێ، چونکە باوەڕی بەخودا نیە، لەوپەڕی بەدبەختیو سوکایەتیدا دەژێیو هیچ خەسارەتمەندییەکی ناگاتێ!

خەسارەتمەندی دونیا بووە بەهۆی ئەو بەڵایەی بەسەری هاتووە، خەسارەتمەندی قیامەتیش بووە بەهۆی هەڵگەڕانەوەی لەبیرو باوەڕی خۆیو پشت هەڵکردنی لەهیدایەتو ڕۆشنایی ئایین.

بێگومان لەبەرچاو گرتنی قازانجو زیان شتێکە لەگەڵ بازرگانیدا دەگونجێو پێوەری ئەوەیە، وەلێ بۆ پێوەری عەقیدەو بیرو باوەڕ ناگونجێ، عەقیدەو باوەڕ

وەردەگێریّ‌و پەسەند دەكرێ، حەق‌و راستییەكە لەبەر خودی خۆی وەردەگیریّ‌و ئینفیعال‌و ئامادەباشییەكە لەدڵ‌و دەرووندا دەبێ بۆ قبوڵ كردنی نوری هیدایەت‌و حاڵەتێكە بەو نوورە نەبێ ئەو ئینفیعالە پەیدا نابێ، بیرو باوەڕ دەبێ دامەزراوو نەگۆڕ بێ، هیچ شتێك نەتوانێ لەجێگای خۆی بیجوڵێنێ!

موسوڵمانی راست نابێ خودا بەتاقی بكاتەوە، چونكە خاوەن باوەڕی راست هەر لەسەرەتاوە رازییە بەهەموو شتێك كەخودا بۆی داناوە، لەسەر نیعمەت‌و خۆشی سوپاسگوزارە، لەسەر بەڵاو ناخۆشی بەصەبرو ئارامە، بیرو باوەڕ كاڵایەكی بازاڕ نیە لەنێوان فرۆشیارو كڕیار دا، بەڵكوو خۆتەسلیم كردنی موسوڵمانە بەخودای خۆی كەخاوەنی هەموو شتێكیەتی. بەدیهێنەرو خاوەن‌و رزق‌و رۆزیدەریەتی.

ئەو كەسەی لەكاتی ناخۆشیدا روو لەئایین وەردەگێڕێ‌و وادەزانێ هۆی تووش بوونی بەو بەڵایە موسوڵمان بوونیەتی، خەسارەتمەندەو هیچ گومان لەخەسارەمەندییەكەی دا نیە، چونكە ویڕای خەسارەتمەندی ماڵ‌و سامان‌و لەدەستدانی منداڵ‌و تەندروستی، دڵنیایی‌و بتمانەو صەبرو ئارامیش لەدەست دەدا!

ئەو كەسەی روو لەخودا وەردەگێڕێ روو لەكوێ دەكا؟ كێ دەپەرستێ؟ بێگومان ئەو بەدبەختە ماڵ وێرانە ﴿يَدْعُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُ وَمَا لا يَنْفَعُهُ﴾ جگە لە خودا عیبادەت دەكا بۆ بت‌و صەنەمێك: كەبەهیچ جۆرێ ئەو عیبادەت بۆ كراوە ناتوانێ زیانی لێ بدا، یان سوودی پێ بگەیەنێ، هاواری لێ دەكاو لێی دەپاڕێتەوە، وادەزانێ سوودی پێ دەگەیەنێ‌و زیانی لێ دوور دەخاتەوە، بەڵام عیبادەت بۆ كراوەكەی دارای هیچ شتێكی نیە، ئەگەر بەندایەتی بۆ نەكا زیانی پێ ناگەیەنێ، ئەگەر عیبادەتیشی بۆ بكا سوودی پێ نادا. ﴿ذَلِكَ هُوَ الضَّلالُ الْبَعِيدُ﴾ بەڕاستی ئەو هەڵگەڕانەوەو بتپەرستییە گومڕاییەكی زۆر دوورە لەحەق‌و لادانە لەڕێبازی حەق‌و دووركەوتنەوەیە لەشەقامە ڕێ.

﴿يَدْعُوا لَمَنْ ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ لَبِئْسَ الْمَوْلَى وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ﴾ ئەو گومڕاو بەدبەختە عیبادەت دەکا بۆ شتێك کەلە دونیادا زیانی لەسوودی نزیکترە، بەلام هیچی پێ ناکرێ. لەقیامەتیشدا زیانگەیاندنەکەی ئاشکرایەو بەهۆی ئەو عیبادەت بۆ کردنەی تورِ دەدرێتە ناو دۆزەخەوەو بۆ هەتا هەتایە سزای سەخت دەچێژێ: بەراستی یارمەتی دەرێکی زۆر خراپو یاوەرێکی زۆر ناپەسەندە. یان ئەمە ئاخاوتنی بتپەرستەکەیە، لەوکاتەدا: کەبۆی مەعلوم دەبێ: کەبەهۆی ئەو پەرستنو عیبادەت بۆ کردنەوە دەخرێتە دۆزەخەوە ئەو قسەیە دەکا!

٣- کۆمەڵی سێیەم: کۆمەڵی بەختەوەرانن: ئەوانەن: کەبەدڵ ئیمانیان هێناوەو بەکردەوەش راستی ئیمانەکەیان چەسپاندوە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ﴾ بێگومان پەروەردگار پاداشتی ئەوانە دەداتەوە: کەئیمانی راست لەدڵو دەرونیان دا جێگیر بووەو کرداری باشیش ئەنجام دەدەن بەوە: کەدەیانخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە: باغو شوێنێك بەژێر درەختەکانی دا جۆگاو جۆبار دەکشێنو هێندەی تر باغەکان جوانو هەوا ساز دەبن!

﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ بێگومان خودا چی بوێ بیکا دەیکا، رێز لەخاوەن باوەڕان دەگرێو پاداشی باشیان دەداتەوە، ئەهلی کوفرو تاوانباران ریسوا دەکاو لەفەضلو رەحمەتی خۆی بێ بەشیان دەکا. کەس نیە بتوانێ بریارو قەضای رەت بکاتەوەو حوکمەکانی هەڵبوەشێنێتەوە.

## حاڵی ئەوانەی کە لەکۆمەکی کردنی خودا بۆ پێغەمبەر ﷺ ناهومێدن

﴿ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾

دوای بەیانکردنی حاڵو وەزعی موشریکە جیدال خوازەکانو دوو روەکانو موسوڵمانە خاوەن باوەڕەکان، پەروەردگار دوو شتی سەرەکیو گرنگ رادەگەیەنێ، یەکەمیان یارمەتیدانی پێغەمبەر ﷺ لەدونیاو لەقیامەت دا بۆئەوەی کافرەکان لەسەرکەوتنی خۆیان نائومێد بن. دووەمیان نازڵ کردنی ئایەتی قورئانە: کەشارەزایی کەرە بۆ رێبازی حەقو راست! دەفەرموێ: ﴿مَنْ كَانَ يَظُنُّ أَنْ لَنْ يَنصُرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى السَّمَاءِ﴾ واتە: هەرکەسێك گومانی وایە: خودا یارمەتی پێغەمبەری خۆی: (محمد) ﷺ نادا لەدونیاو قیامەت و زاڵی ناکا بەسەر دوژمنانی دا، بابەحەبلێك خۆی لەقەناره بدا بەهەلاشی خانوی خۆیەوە، خۆی هەڵاوسێ بەگوریسێك بەبن میچی خانوەکەی خۆی دا ﴿ثُمَّ لِيَقْطَعْ﴾ پاشان حەبلەکە ببڕیو بکەوێتە خوارەوە، یان پێش بخواتەوەو هەناسە لەخۆی ببڕێ تادەخنکێ، ﴿فَلْيَنظُرْ﴾ ئەمجار باهەر لەئێستەوە بیر لەو رووداوە بکاتەوەو لەدڵی خۆی دا لێکی بداتەوەو بڕوانێ ﴿هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُ مَا يَغِيظُ ؟﴾ ئایا ئەو کردەوەیە داخی دڵی لادەبا؟ نەخەیر هەرچی بکا بێ سوودە، بابزانرێ: کەهیچ رێگا چارەیەك نیە بۆ خۆگرتن لەژێر باری گرانی بەڵاو ناخۆشیدا جگە لەپشت بەستن بەخوداو چاوەڕوانی یارمەتی ئەو. هیچ رێگایەك نیە بۆ رزگار بوون لەبەڵاو موصیبەت جگە

لەروکردنـە خـوداو پاڕانـەوە لێـی. بـەبێ روکردنـە خـوداو پـشت بەسـتن بـەهێزو دەسەڵاتی پـەروەردگار هـەموو هـەوڵو تەقەلاّیـەك بـێ سـوودە، هـیچ بەرهـەمێکی نابێ، بەڵکوو پتر تەنگە تاو دەبێ، کەواتە: باکابرای لێقـەوماو ئـەم دەروازە لـەخۆی دانەخاو ئەو رووناکییە لەخۆی نەکوژێنێتەوە، خۆی لـەو هـەوا سـازگارە بـێ بـەش نەکاو هەناسە لەخۆی نەبڕێ. ئیمام ئەبو جەعفەری (النحاس) دەفەرموێ باشـترین تەفسیر بۆ ئەم ئایەتە ئەوەیە: بگوترێ: (کەسێك پێی وایە: خودا پێغەمبەری خۆی حەزرەتی موحەممەد ﷺ سەرناخاو زاڵـی ناکـا، پێـی وایـە دەتـوانێ ئـەو کۆمەکییـە یەزدانییـەی بـۆ پێغەمبـەر دێ ئـەو دەتـوانێ بیـبڕێ، بافێڵێـك بدۆزێتـەوەو بتـوانێ بەوهۆیەوە بگاتە ئاسمان، ئەمجار ئەو کۆمەکییـە بـبڕێ ئەگـەر بـۆی دەکـرێ، پاشـان برواو تێبفکرێ: ئاخۆ فرتو فێڵەکانی توانیویانە ئەو کۆمەکییەی کـەپێی ناخۆشـە بۆ پێغەمبەر ﷺ بێ، بیبڕێو نەهێڵێ خودا یارمـەتی پێغەمبـەر ﷺ بـدا؟؟ بـەکورتی ئەگەر نەتوانێ ئەو کۆمەکییە قەطع بکـا بەتـەنکیدیش نـاتوانێ، بادڵنیـا بـێ خـودا یارمەتی پێغەمبەری خۆی دەدا).

بـەکورتی: خـودا یارمەتیـدەری ئـایینی خۆیـەتی، پێغەمبـەری خـۆی زاڵ دەکـاو پارێزگاریی ئایینی خۆی دەکا. دەی باداخ لەدلاّن شەق بەرن!

﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ هەر وەکوو ئەم رونکردنەوەیەمان بۆ هیدایـەتو گومڕابوون، هەروەکوو ئەم ئایەتانەمان بۆ ناردووی بۆ ترساندنی ئادەمیزاد لەسزای قیامەتو پـۆلێن کردنیـان بـەو پێـڕو تاقمانـەو راگەیانـدنی ئـەو راسـتییە: کەکـەس سەرناکەوێ ئەگەر خاوەنی ئیمـانی سـاغ نـەبێ. هـەر بەوشـێوە لەمەوبـەر ئایـەتمان ناردونە خوارێ، هەروایش دەینێرینـە خـوارێ، هـەموو ئایەتـەکان نیـشانەی ئـەوەن کەلەخوداوە نێردراون، ماناکەیان ئاشکراو نومایانـەو بـۆ پێغەمبـەر ﷺ نێـردراونو ئـەو کەسـەی قورئـانی بـۆ نێـردراوە پێغەمبـەرە ﷺ ئەمـەش بۆئـەوەی ئـادەمیزاد پەندئامێز ببنو سوودی لێ وەربگرن.

﴿وَأَنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يُرِيدُ﴾ چونکە بێگومان خودا خواستی لەسەر هیدایەتدانی هەرکەسێك بێ هیدایەتی دەدا تۆفیقی ئەوانە دەدا؛ کەدەزانێ ئیمان دەهێننو ئامادەباشی ئەوەیان تێدایە بڕوا بەپەیامی خودا بکەن.

## پەروەردگار هەموو گەلو نەتەوەکانی لێك هەڵدەهاوێژێ، هەرچی لەبوونەوەردایە گەردنکەچی فەرمانی خودایە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ (١٧) أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ (١٨) ﴾

لەوەپێش پەروەردگار حاڵو وەزعی موشریكو دوڕوو موسوڵمانەکانی بەیان کرد، لێرەشدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە؛ کەڕۆژی قیامەت پەروەردگار داداگایی هەموو ئەوانە دەکاو لێکیان هەڵدەهاوێژێو حەقو بەتاڵ لێك جیا دەکاتەوە. دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّـهَ

﴿يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیمانیان بەخوداو بەپێغەمبەری خودا هێناوە، هەروەها ئەوانەی جولەکەن‌و پەیڕەوی ئایینی یەهوودی دەکەن، ئەوانەیش؛ کە (صابیئەن) (کۆمەڵێکن لەنێوان جولەکەو مەسیحی یان تاقمێکن فریشتە پەرستن‌و زەبوور دەخوێننەوە).

هەروەها نەصرانییەکان‌و ئەوانەی بەناوی ئایینەوە پێیان دەگوترێ (مەجوس) خۆرو مانگ‌و ئاگر دەپەرستن‌و بڕیاری دوو خودا دەدەن؛ دەڵێن: خودای خێرو خودای شەڕ هەیە.

هەروەها ئەوانەی هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن‌و لەتەك خودادا شتی تر دەپەرستن، خودا ڕۆژی قیامەت دادگایی هەلگرانی ئەم ئایینانە دەکاو بەعەدالەت لێکیان هەڵدەهاوێرێ: ئەوانەی ئیمانیان ساغ‌و پەسندە دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە، ئەوانی تر دەخاتە ناو دۆزەخەوە، هەرکەسە بەگوێرەی ئیمان‌و کردەوەی پاداش‌و سزای خۆی وەردەگرێتەوە.

﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ بێگومان خودا شایەدو ئاگادارە بەسەر کردەوەکانیان داو کردارو گوفتاریان لای خودا تۆمارکراوەو هیچی لێ گوم نابێ، هەموو نهێنی‌و ئاشکرایەکیان دەزانێ ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ﴾ ئەی ئەو کەسەی شایانی ئەوەی خیطابت لەگەڵ دا بکرێ! ئایا تۆ نازانی هەرچی لەئاسمانەکان‌و زەویدایە گەردنکەچی فەرمانی خودایە، هەموو شتێك خۆشییان بێ‌و ترشییان بێ، دەبێ ملکەچی ویست‌و ئیرادەی خودا بن، فریشتە لەئاسمانەکان‌و ئادەمیزادو جندۆکە لەزەوی هەروا مانگ‌و خۆرو ئەستێرەکان‌و شاخ‌و کێوەکان درەخت‌و گیانلەبەران بەهەموو جۆرو بڕێکیانەوە، هەر شتە بەگوێرەی خۆی‌و بەشێوەی تایبەتی خۆی‌و سوژدە بۆ خودا دەباو هەموویان بەندایەتی خۆیان بۆ ئەو ڕادەگەیەنن. ﴿وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ﴾ زۆر لەئادەمیزاد پاداشی خۆی هەیەو بۆی

دیاری کراوە، یان زۆر لەئادەمیزادەکان سوژدە بۆ خودا دەبەن‌و بەویستی خۆیان عیبادەتی خودا دەکەن فەرمانبەرداری زاتی کردگارن. ئەمە شتێکی چەسپاوەو حەقە ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ﴾ زۆریشیان سزای خودایان لەسەر بڕیار دراوەو سوژدە بۆ خودا نابەن‌و سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن، بێگومان ئەو نەفامانە خودا سووکی کردوون ﴿وَمَنْ يُهِنْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ﴾ کەسێکیش خودا سووکی بکا ئیتر کەسێك نیە بتوانێ رێزی بداتێ‌و سەری بەرز بکاتەوە.

کەسێك سووکی بکاو نەگبەتی تووش بکا، یان کەسێك خودا بەدبەخت‌و کافری بکا بەهۆی ئەوە: کەئامادەباشی تێدا نیە بۆ ئیمانهێنان، ئیتر کەس ناتوانێ سووکایەتی لەسەر لابەرێ، کەس ناتوانێ بیخاتە سەر کامەرانی‌و خۆشبەختی. چونکە هەموو کارێك بەدەست خودا خۆیەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ﴾ بێگومان پەروەردگار هەرچی بیەوێ لەرێزلێنان‌و رێز شکاندن ئەنجامی دەداو کەس نیە بتوانێ بڕیاری خودا هەڵبوەشێنێتەوەو رەخنە لەحوکمی ئەو بگرێ.

نموونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە کەدەفەرموێ: ﴿أَوَ لَمْ يَرَوْا إِلَى مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلاَلُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالْشَّمَآئِلِ سُجَّداً لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ﴾ (النحل/٤٨) یان کەدەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ (الاسراء/٤٤) ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکاکە حەشاماتێکی زۆر لەقەبارە بەرزاییەکان (العوالم العلويه) لەمانگ‌و خۆرو مەجەرەو ئەستێرەکان بەزانراوو نەزانراوەوە، هەروا حەشاماتێکی زۆر لەکێوو دۆڵ‌و چۆم‌و ساراو درەخت‌و پیرۆو خشۆك بەگیانلەبەرو بێ گیانەوە، هەموو ئەم حەشاماتە تێکڕا لەمەوکیبێکی سەر سوڕهێنەردا بەملکەچی سوژدە بۆ خودا دەبەن‌و تەسبیحات‌و ذیکری خودا دەکەن، یەکتاپەرستی ئەنجام دەدەن، جگە لەبەشێك لەئادەمیزاد کەلەو حەشاماتە دابڕاون‌و بەئەنقەست لەخودا یاخی بوون‌و عەزابی ریسواکەریان بۆ بڕیار دراوە...!

## پاداشی کافرو خودا ناسان لەرۆژی قیامەتدا

﴿ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ....﴾ موسلیمو بوخاریو هی تریش لەئەبو ذەڕەوە ریوایەتیان کردوە: دەفەرموێ دەربارەی حەمزەو عوبەیدەو عەلی کوڕی ئەبوطالیب ﷺ لەموسوڵمانانو عوتبەو شەیبەو وەلیدی کوڕی عوتبە لەموشریکەکان نازڵ بوو: کەلەرۆژی غەزای بەدردا موبارەزەیان ئەنجام دا.

ئیمامی عه‌لی ﷺ ده‌فه‌رموێ: ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا....﴾ تاده‌گاته وشه‌ی (الحريق) ده‌رباره‌ی روبه‌روبوونه‌وه‌ی ئێمه له‌گه‌ڵ موشریکه‌کان نازڵ بووه.

حاکم له‌رێگایه‌کی تره‌وه له‌ئیمامی عه‌لیه‌وه ﷺ ریوایه‌ت ده‌کا ده‌فه‌رموێ: (ده‌رباره‌ی ئه‌وانه نازڵ بووه که‌رۆژی به‌در روبه‌ڕوی موشریکه‌کان وه‌ستان: حه‌مزه‌و عه‌لی ئه‌بوعوبه‌یده‌ی کوڕی ره‌بیعه‌و ﷺ له موسوڵمانه‌کان‌و وه‌لیدی کوڕی عوتبه‌و هاوه‌ڵانی له‌موشریکه‌کان).

ئیبنوجه‌ریر له‌عه‌بباسه‌وه ریوایه‌ت ده‌کا ده‌فه‌رموێ: ده‌رباره‌ی ئه‌هلی کیتاب نازڵ بووه: که‌به موسوڵمانه‌کانیان گوت. ئێمه لای خودا له‌ئێوه له‌پێشترین، نامه ئاسمانییه‌که‌مان له‌هی ئێوه کۆنتره، ئێغه‌مبه‌رمان له‌پێش پێغه‌مبه‌ری ئێوه‌وه بووه، موسوڵمانه‌کانیش ولآمیان دانه‌وه‌و وتیان: ئێمه له‌ئێوه باشترین: ئێمه بڕوامان به‌پێغه‌مبه‌ری خۆمان‌و پێغه‌مبه‌ری ئێوه‌ش هه‌یه، هه‌روا بڕوامان به‌نامه ئاسمانییه‌کان هه‌یه به‌تێکڕا. ئه‌مجار دوای به‌یانکردنی حاڵ‌و وه‌زعی ئه‌و شه‌ش تاقم‌و پێڕانه‌ی باسی کردون‌و بڕیارو حوکمی خودای ده‌رباره‌یان روون کردوه، لێره‌دا پۆلێنیان ده‌کا بۆ دوو کۆمه‌ڵ؛ کۆمه‌ڵی خاوه‌ن بڕوا، کۆمه‌ڵی کوفرو بێدینی، پاشان کێشه‌و نیزاعی نێوانیان راده‌نوێنێ، له‌ئاکام دا سه‌ره‌نجامی هه‌ردولا راده‌گه‌یه‌نێ، یان بۆ به‌هه‌شت یان بۆ دۆزه‌خ. ده‌فه‌رموێ: ﴿هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾ واته: خاوه‌ن ئایینه جیاجیاکان که‌له‌وه‌پێش ده‌ست نیشان کراون‌و شه‌ش تاقم بوون، دوو کۆمه‌ڵی له‌یه‌کتر جودان؛ کۆمه‌ڵی موسوڵمانان‌و کۆمه‌ڵی کافران: که‌بریتین له‌پێنج پێره‌که‌ی پێشوو.. ئه‌م دوو کۆمه‌ڵه کێشه‌یان تێکه‌وتووه که‌وتوونه ده‌مه ده‌مێوه ده‌رباره‌ی خودای خۆیان؛ هه‌ر تاقمه له‌وانه پێی وایه: خۆی له‌سه‌ر حه‌قه‌و به‌رامبه‌ره‌که‌ی له‌سه‌ر به‌تاڵه. دژایه‌تییان که‌وتۆته نێوانه‌وه: موسوڵمانان بڕوایان وایه: خودای تاك‌و ته‌نیا خاوه‌نی صیفاتی که‌ماڵه (واجب الوجود)ه ئه‌زه‌له‌یی‌یه‌و ئه‌به‌دییه، بێ وێنه‌و بێ نیازه، هه‌رچی صیفاتی به‌رزو

پیرۆز هەیەو شیاوی خودایەتییە هەیەتی. ئایینی پەسەند لای ئەو ئەو ئایینەیە کەپێ ی دەگوترێ: ئیسلام‌و بەفریشتەی تایبەت دا نێردراوە بۆ حەزرەتی موحەممەد ﷺ ئەویش بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گەیاندویەتی!

پێنج تاقمەکەی تر دژی ئەم بیروباوەڕەن‌و هەریەکەیان بۆخۆی لەبوارێك دەداو بیروباوەڕێکی هەیە هیچی بەسەر هیچەوە نیە.

١- موشریك: ئەوانەی بڕوایان بەهەبوونی خودا هەیە، بەڵام هاوەڵ‌و شەریکی بۆ دادەنێن: وەکوو ئەوانەی بتپەرستن یان ئەستێرەپەرستن، رۆژ پەرستن گا پەرستن...هتد.

٢- موشریك هەندێکیان پێیان وایە: خوداو بەدیهێنەر دووانن: دەڵێن، خودای خێرو خودای شەڕ هەیە، خودای تاریکی‌و خودای رووناکی هەیە، خودای خێریان ناو ناوە یەزدان یان خالیقی نوور، خودای شەڕ ناو دەنێن ئەهریمەن یان خودای تاریکی. ئەمجار ئاگریان داناوە بەنیشانەی نورو رووناکی. ئەمانە پێیان دەگوترێ (مەجوس)و رۆڵێکی کاریگەریان هەبووە لەگومراکردنی خەڵکی دا بۆیە قورئان بەتایبەتی ناوی هێناون، ئەگینا لەحەقیقەت دا ئەمانەش موشریك‌و بتپەرستن‌و گومڕاو سەرگەردان ترن.

٣- ئەگەر گەل‌و نەتەوەیەك بڕوایان بەخودای تاك‌و تەنها هەبوو بڕوایان بەئایینی ئاسمانی هەبوو، ئەوانە بەخاوەن ئایین دەناسرێن‌و ئەهلی کیتابیان پێ پێ دەگوترێ، جا ئەمانە لەپاش رۆژگاری حەزرەتی (نووح) عليه السلام شوێن صوحوفی حەزرەتی ئیبراهیم عليه السلام کەوتوون، لەپاش ئەو شوێن: تەورات کەوتوون‌و بەیەهود (جوولەکە) دەناسرێن‌و بەهاتنی ئیسلام ئایینەکەیان نەسخ کراوەتەوە.

٤- نەصارا یان نەصرانی، ئەوانەن پەیڕەوی حەزرەتی عیسا عليه السلام دەکەن شوێن پەیامی ئینجیل کەوتوون. بەهاتنی ئیسلام ئایینەکەیان هەڵوەشاوەتەوە.

٥- صابیئە: کۆمەڵێك ئادەمیزادن لەرۆژگاری حەزرەتی نوح‌و ئیبراهیمەوە ئەستێرە پەرست بوون، لەکتێبە تایبەتییەکانی عەقائیدو میلەل دا پێیان

دەگوترێ: (صابیئە)و (صوبی)، ئایینو باوەڕیان هێندە کۆنە بۆخۆشیان لێیان تێك چووە دەمێك ئیدیعای ئەوە دەکەن: کەشوێنکەوتووی ئایینی حەزرەتی مەسیحن، دەمێکیش خۆیان لەنەصرانییەکان جیادەکەنەوە، جائەگەر نەصرانیەکان ئیعترافیان پێ بکەن دەبنە بەشێك لەمەسیحییەکان! هەڵبەتە زۆر ئایینو شتی جیاجیای تر هەن، هەموویان لەم پێنج بیرو باوەڕە سەرەکییەوە سەرچاوەیان گرتووەو کتێبەکانی (الملل والنحل)و (الادیان والمذاهب) تۆماریان کردوونو هەموویان جگە لەئیسلام ئێستا پوچو بەتاڵنو پەیڕەوکارانیان گومڕاو سەر لێ شێواون، لەدوای هاتنی ئایینی ئیسلامو بڵاوبوونەوەی بەهەموو جیهان دا هەموو بیرو باوەڕێك جگە لەئایینی ئیسلام بەتاڵەو پەیڕەوکارانی کافرن، لەرۆژی قیامەت دا پەروەردگار سزای توندیان دەداو رزگار بوونیان نیە، بۆیە قورئان ئاکامو سەرەنجامی پەیڕەوکارانی ئایینی ئیسلامو کافرەکان دیاریی دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِنْ نَارٍ﴾ ئەوانەی کافرن بەخوداو حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەپێغەمبەر نازانن، ئاگری دۆزەخ لەخۆیان دەگرێو وەکوو ئەوە بەرگو پۆشاکیان لەئاگر بۆ ببڕدرێ وایە، ﴿يُصَبُّ مِنْ فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ﴾ لەناو ئاگری دۆزەخ دا ئاوی کوڵاتویان بەسەردا دەرژێندرێ، ﴿يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ﴾ بەو ئاوەگەرمو کوڵاتوە ریخۆڵەو جەرگو دڵو هەناویان دەتوێتەوە، پێستیان هەڵدەقرچێو دادەپڵۆخێ، بەهەموو شێوەیەك سزا دەدرێنو تۆڵەی کوفرو بێ دینییان لێ دەسەندرێو بۆ هەتا هەتایە لەم سزایەدا دەمێننەوە. ئیبنو جەریرو تیرمیذیو ئیبنو ئەبی حاتەمو عەبدی کوڕی حەمید لەئەبو هورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ان الحميم ليصب على رؤوسهم، فينفذ الجمجمة، حتى يخلص على جوفه فيسلب ما فى جوفه، حتى يبلغ قدميه وهو الصهر، ثم يعاد كما كان)).

﴿وَلَهُمْ مَقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾ بۆ ئەوان هەیە چەند چەکوچی لەئاسن دروست کراو، بەو چەکوچانە لێیان دەدرێ، دەماڵدرێ بەدەم‌و چاوو شوێنی تری جەستەیان.

ئیمام ئەحمەد لەئەبو سەعیدی خودریەوە ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لو ان مقمعاً من حديد وضع في الارض فاجتمع له الثقلان ما اقاموه من الأرض)) هەر دووبارە لەئەبو سەعیدەوە ریوایەت کراوە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لو ضرب الجبل بمقمع من حديد لتفتت، ثم عاد كما كان، ولو ان دلوا من غساق يهراق في الدنيا لانتن اهل الدنيا)).

﴿كُلَّمَا أَرَادُوا أَنْ يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا﴾ هەرکاتێ هەوڵ بدەن‌و بیانەوێ خۆیان لەو ناخۆشییە رزگار بکەن لەدۆزەخ بێنە دەرێ‌و ئەو غەم‌و نارەحەتیانەیان لەکۆڵ بکەون، دەیانگێڕنەوە شوێنی خۆیان‌و دەخرێنەوە هەمان عەزاب‌و نارەحەتی‌و پێیان دەگوترێ: ﴿وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ﴾ بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر!

فەضیلی کوڕی عەیاض دەڵێ: سوێندم بەخودا ئەوان تەماعی چوونەدەر ناکەن قاچیان پێوەند کراوە دەستیان کەلەپچەی تێدایە، ئیتر چۆن هەوڵی دەرچوون بدەن؟ وەڵێ بڵێسەی ئاگر بەرزیان دەکاتەوەو چەکوچی عەزاب دەیانخاتەوە خوار!

دوای رونکردنەوەی حاڵ‌و وەزعی کافرەکان لەقیامەت دا. بەیانکردنی ئەو سزاو عەزابەی لەدۆزەخ دا توشیان دێ، دێتە سەر باس کردنی بەختەوەریی بەهەشتییەکان‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ بێگومان پەروەدگار پاداشی گەورەو باشی بۆ خودا پەرستان داناوە؛ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش‌و بەسوودیان ئەنجام داوە، خۆیان لەتاوان‌و خراپەکاریی پاراستووە خودا دەیانخاتە ناو چەند باغ‌و باغاتی بەهەشتەوە، باغ‌و باغاتی بەرزو رازاوەو جوان‌و قەشەنگ، بەژێر

درەختەکانیانـدا جۆگـاو جۆبـار دەکـشێن‌و هێنـدەی تـر رازاوەیـی‌و دیمـەنی جـوان بەباغەکان دەبەخشن‌و هەوا سازگارو دیمەنەکان جوان دەکەن! قەصرو باڵەخانەکان دەرازێننەوە! سەرباری ئەو خۆشی‌و رازاوەیی یە ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَـاوِرَ مِـنْ ذَهَـبٍ وَلُؤْلُؤاً﴾ جەستەیان دەرازێنرێتـەوە بـەوە: کەبازنـەی ئـاڵتون لەدەسـتو مەچەکیان دەکـەن‌و بازنـەکانیان بـەدرو مـرواری دەنەخـشێندرێن، هـەروەها بـەمرواری تـر ناوچەوان‌و سەریان دەرازێنرێتەوەو بەوێنەی تاجی شاهانە پێیانەوە دیارە!

دڕو مـرواری نایـابترین ماددەیـە: کـە لـەبنکی دەریاکـان دا لـەناو صـەدەف دا دەردەهێنـدرێ.

﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ پۆشاکیان لەبەهەشدا ئاوریشمە: لەئایـەتێکی تـردا ئەمـە تەئکید دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ (فاطر/٣٣) بەڵێ: لـەکاتیك دا: کەدۆزەخییەکان پۆشاکی ئاگرینیان لەبەر دەکرێ، بەهەشـتی یـە خـودا پێـداوەکان پۆشاکی حەریریان لەبەر دەکرێ، سەرباریی ئەوەش خشڵی زێڕو دڕو مرواریان پێ دەبەخشرێ.

﴿وَهُـدُوا إِلَـى الطَّيِّـبِ مِـنْ الْقَـوْلِ﴾ شـارەزا دەکـرێن بـۆ وتنـی قـسەی بـاش‌و دڵنیاکەرەوەو دڵخۆشکەر، بۆ تەقدیس‌و دانان بە فەضل‌و گەورەیی خودادا.

﴿وَهُـدُوا إِلَـى صِـرَاطِ الْحَمِيـدِ﴾ شـارەزا دەکـرێن بـۆ رێبازێـك‌و دەخرێنـە شوێنێکەوە: کەسوپاسـی خـودای لەسـەر دەکـەن. یـان شـارەزا دەکـرێن بـۆ رێبازێـك: کەبەهۆیەوە رەوشت‌و هەڵس‌و کەوتیان وادەبێ خودا لێیان رازیی بێ.

قسەی راست‌و پەسند ئەوەیە: کـەرێبازی خـوداو رێبـازی سـوپاس لەسـەر کـراو: بریتییـە لەبەهەشـت. واتـە: رێبازێـك: کەئاکامەکـەی موسـوڵمانان دەگەیەنێتـە بەهەشت.

هیدایەتدان بۆ ڕێبازی خودا؛ بۆ ڕێبازی سوپاس لەسەر کراو نیعمەتێکە لەنیعمەتەکانی خوداو فەضلو بەخششی خودایە بۆ بەندەکانیو شیاوی ئەومیە خودا لەکاتی ڕانواندنی نیعمەتەکانی دەست نیشانی بکا.

ئەمەی باس کرا ئاکامی کێشەو دەمە دەمێی دوو پێڕەو تاقم بوو لە ئادەمیزادەکان؛ پێڕی موسوڵمانانو پێڕی کافران ئەوانەی بەهەشتینو ئەوانەی دۆزەخین!

بۆیە پێویستە ئادەمیزاد بیر لەو ئاکامانە بکاتەوەو بەخۆی دا بچێتەوەو هەوڵ بدا لەپێڕو تاقمی خودا پەرستان بێ...

## پاساغکردنی کەعبە لەئادەمیزاد

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبو سەفیانی کوڕی حەربو هاوەڵانی نازڵ بووە، کەساڵی حودەیبیە نەیان هێشت پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی ﷺ عەمرەو حەجیماڵی خودا بکەن، پێغەمبەر ﷺ نەیەویست شەڕیان لەگەڵ بکا، پاشان ڕێك کەوتن: ساڵی دوایی بێنەوە بۆ حەجو عومرە.

دەربارەی ڕستەی ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ..... الآية﴾ ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ عەبدوڵلای کوڕی ئونەیسی لەگەڵ پیاوێکی موهاجیرو پیاوێکی ئەنصاردا نارد بۆ کارێك، لەڕێگا لەناو خۆیان لێیان بوو بەدەمە دەمێو هەریەکەیان بەخۆیدا هەڵگوتو شانازی بەخۆی دەکرد، ئیتر عەبدوڵلا ڕقی هەڵساو

کابرای ئەنصاری کوشتو لەئایین هەڵگەڕایەوەو گەڕایەوە بۆ مەککە! ئیتر ئایەتی ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ.....﴾ دەربارەی ئەو نازڵ بوو!

پەیوەندیو موناسەبەی ئەم ئایەتە بەپێشەوە لەم ڕووەوەیە: لەوەپێش سەرەنجامی ئەوانەی دەربارەی خوداو ئایینی خودا کێشەیان تێکەوت روون کردەوە، دیمەنی حاڵی کافرانی ناو دۆزەخو موسوڵمانانی خودا پێداوی رانواند.

دیمەنی دۆزەخی سووتێنەرو بەهەشتی هەوا سازو خۆشو رازاوەی خستەڕو. ئەمجار بەم بۆنەوە دەربارەی ئەو کافرانە دەدوێ: کەناهێڵن خودا پەرستان دیدەنی ماڵی خودا بکەن دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بێگومان ئەوانەی کافرن بەخوداو بەپێغەمبەری خودا ﴿وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ویڕای کافر بوونەکەیان ناهێڵن موسوڵمانان بچنە ناو کەعبەوەو شەعائیری حەجو عومرە ئەنجام بدەن، بەرەنگاریی بانگەوازی ئیسلامی دەبنەوەو دەبنەکۆسپو تەگەرە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی دا، مەسجیدولحەرامیان لەموسوڵمانان یاساغ کردوە، لەکاتێك دا ئەو موسوڵمانانە لەهەموو کەس شیاوترن بەو ماڵە پیرۆزە، ﴿الَّذِي جَعَلْنَاهُ لِلنَّاسِ سَوَاءً الْعَاكِفُ فِيهِ وَالْبَادِي﴾ موسوڵمانان دەگێڕنەوە لەدیدەنی ئەو ماڵەی: کەخودا بۆ ئادەمیزادانی داناوە، دانیشتوانی ناو مەککەو حەرەمو دەوروبەریو شوێنەکانی تریش تێیدا چون یەکن، خانەی خودایە بۆ هەموو کەسو کەس مافی ئەوەی نیە ئەو شوێنە پیرۆزە بۆ خۆی قۆرغ بکاو نەهێڵێ خودا پەرستان دیدەنی بکەن.

بێگومان ئەمە دابو نەریتی موشریکەکانی مەککە بوو خەڵکیان لەئایین دەگێڕایەوە، بەربەرەکانی بانگەوازی پێغەمبەریان دەکرد، تەنگیان بەوانە هەڵدەچنی: کەخودا پەرستییان دەکرد، ساڵی حودەیبیە نەیانهێشت پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسوڵمانەکان حەجو عەمرە ئەنجام بدەن، ئەو ناوچەیەی خودا دانیشتوانی هەموو شوێنێکی (مەککەو دەرەوەی مەککە)ی تێدا چون یەك لێ کردوە، بۆ هەموو

کەس وەکوو یەك وایەو ماڵی هەموو کەسە، ئەو موشریکە قوڕەیشییە ملهوڕانە ستەم دەکەن‌و موسوڵمانان لەدیدەنی ئەو ماڵە پیرۆزە مەنع دەکەن !

﴿وَمَنْ يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ هەرکەسێك نیازی وابێ لەو ماڵە پیرۆزەدا روبکاتە جەورو ستەم‌و لەخودا یاخی ببێ‌و سەرپێچی فەرمانی خودا بکا ئەوە ئێمە لەتۆڵەی ئەو تاوانانەی دا عەزابی بەئێش‌و ئازاری پێ دەچێژین‌و رۆژی قیامەت توڕی دەدەینە ناو دۆزەخەوە.

بێگومان ئەم مەنهەجەی خودا لەبارەی ناوچەی ئارام‌و وڵاتی ئاشتیەوە دایناوە، پێش ئەو هەموو هەوڵ‌و تێکۆشانانە کەوتووە: کەئادەمیزادان داویانە بۆ دانانی ناوچەیەکی ئارام‌و دوورە شەڕو داڕنـدراو لەچەك، ناوچەیەك چەکی تێدا فڕێ درێ‌و دوژمن لەگەڵ دوژمن شەڕ نەکا، خوێنی تێدا نەڕژێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەفەرموێ: ئەمە تایبەتی ناو حەرەمە: هەرکەسێك نیازی شتی خراپ بکا بابەفیعلیش نەیکا، سزا بدرێ.

هەر ئیبنو ئەبی حاتەم لەیەعلای کوڕی ئومەمیەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((احتكار الطعام بمكة الحاد)) ئەمەش بەشێکە لەستەم‌و نموونەیەکی تاوانە، ئیلحادو ستەم هەموو تاوانێکی گەورەو پچوك دەگرنەوە، چونکە شوێنەکە پیرۆزەو لای خودا رێزدارە، پەروەردگار تەنانەت هەڕەشەی لەوانە کردوە: کەنیازی خراپەیان هەیە تێ یدا با ئەنجامیشی نەدەن. کەسێك نیازی خراپەیەکی کردو ئەنجامی نەدا لەمەککەدا نەبێ سزاو عیقابی لەسەر نیە.

**ئایەتەکە ئەم حوکمانەی لێ وەردەگیرێ:**

١- ئازادیی عیبادەت لەحەرەمی مەککی دا بۆ هەموو کەسە: دانیشتووی مەککە بێ یان دەرەوەی مەککە بێ، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ: هەرکەسێك ببێتە کۆسپ‌و تەگەرەو نەهێڵێ موسوڵمانان حەج بکەن کافر دەبێ‌و لەپێزی کافران دەژمێردرێ.

٢- هەرکەسێك لەمەککەدا تاوانێك بکا، سەرپێچییەك ئەنجام بدا، یان نیازی تاوانکردنی ببێ بائەنجامیشی نەدا رۆژی قیامەت سزای بەنێشی دەدرێ. واتە: ئادەمیزاد سزای دەدرێ. لەسەر نیاز کردنی تاوان ئەگەر لەمەککەدا بوو. بابەفیعلی نەشی کا!

ئیمام ئەحمەد دەفەرموێ: عەبدوڵلای کوڕی عومەر هاتەلای عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو پیێ ی فەرموو: ((یاا ابن الزبیر ایاك والالحاد فی حرم الله، فانی سمعت رسول الله ﷺ یقول: انه سیلحد فیه رجل من قریش لو توزن ذنوبه بذنوب الثقیلین لرجحت)).

حەنەفییەکان لەم ئایەتە ئەوەیان وەرگرتووە: کەخانوو باڵەخانەی مەککە نەدەفرۆشرێن نەبەکرێ دەدرێن. دەڵێن: مەبەست بە مەسجیدولحەرام مەککەیە، ئەو فەرموودە دەکەنە پاڵپشتی رایەکەی خۆیان: کەئیبنو ماجەو طەبەرانی لە عەلقەمەی کوڕی نەضلە ریوایەتی دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەدونیا دەرچوو هەروەها حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەر ﷺ وەفاتیان کرد خانوو بەرەی مەککە بەبەرەڵلا دادەنران ... واتە ملکی گشتی بوون، کەسێك پێویستی بوایە تێیان دا نیشتەجێ دەبوو، کەسێك پێویستی نەبوایە هیتری تێدا نیشتەجێ دەکرد.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر بەگوێرەی ئەو ریوایەتەی (عبدالرزاق) لێی دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: (لایحل بیع دور مکة ولاکرؤها) ئەمجا دەفەرموێ: (من اکل من اجر بیوت مکة شیئا فأنما یأکل النار) هەر (عبدالرزاق) لەئیبنو جورەیجەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عەطا: خانوو بەکرێ دانی ناو مەککەی یاساغ کردبوو.

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: خانوو بەرەی مەککە تەملیك دەکرێ بەمیرات وەردەگیرێن و بەکرێ دەدرێن، بەڵگەش ئەو فەرموودەیە: کە ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ ریوایەتی کردوەو لەصەحیحەین دا چەسپاوە، دەفەرموێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەیانی لەمەککە دەچیەوە ناو خانوەکەی خۆت؟ پێغەمبەر ﷺ

فەرموی: ((وهل ترك لنا عقیل من رباع؟)) لەلایەکی ترەوە ئەوە چەسپاوە: کەعومەری کوڕی خەتتاب ﷺ خانویەکی لەمەککە لەصەفوانی کوڕی ئومەییە کڕی بۆ بەندیخانە بەچوار هەزار درهەم.

ئیمام ئەحمەد ڕێبازێکی مام ناوەندیی گرتووە دەفەرموێ: خانوو بەرەی مەککە تەملیك دەکرێن‌و دەشبنە میراتی، بەڵام بەکرێ نادرێن.

بناغەی خیلافەکە لەمەوە هەڵساوە: کەئایا رزگار کردنی مەککە بەزۆر بووەو شارەکە بووەتە غەنیمەت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دابەشی نەکردو داینا‌وە بۆ دانیشتوانەکان‌و ئەوانەی دوای ئەوان دێن! وەکوو چۆن عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەربارەی رەشە خاکی عێراق (سواد العراق) بڕیاری دا بۆ دانیشتوانەکانی بێ؟! ئیتر لەمەوە بڕیار دراوە کەخانوو بەرەی مەککە نافرۆشرێن‌و بەکرێش نادرێن. ئەمە رای ئەبوحەنیفەو مالیك‌و ئەوزاعی‌یە!!

یان رزگارکردنی مەکە بەصوڵح‌و رێك کەوتن بووە.؟ شافیعی ئەم رایەی پەسەند کردوە: کەوابێ خانووبەرەیان بەدەست خۆیانەوە دەمێننەوەو ملکی خۆیانە چۆن تەصەروف تێدا دەکەن بیکەن. شافیعی بەلگەی ئەم ئایەتەیە: کەدەفەرموێ ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ﴾ (الحج/٤٠) ئەوەتا خانوەکانی مەککە ئیضافە کراون بۆلای خاوەنەکانیان. هەروا ئەو فەرمودەیەی ئەحمەدو موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: رۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من اغلق بابه فهو آمن من دخل دار ابی سفیان فهو آمن)).

## دیاری کردنی شوێنی کەعبەو فەرمان بەحەج کردن

﴿ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۖ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار هەڵوێستی موشریکەکانی دەربارەی مەنع کردنی کەعبە لەخەڵك رون کردەوە، ئەمجار شوێنی مەسجیدولحەرام دیاری دەکاو سەرزەنشتی موشریکەکان دەکا لەسەر کردەوە ناشرینەکەیان، چونکە بابە گەورەیان: کە حەزرەتی ئیبراهیمە ﷺ ئەوماڵەی بنیات ناوە، بەفەرمانی خودا لەو شوێنەدا دروستی کرد، فەرمانی پێ کرا؛ کەئەو ماڵە پاك بکاتەوە بۆ تەوافکەران و نوێژکەران، بانگی خەڵك بکا بۆ حەج و دیدەنی کردنی ئەو ماڵە پیرۆزە، بۆئەوەی سوودی دین و دونیایان بۆ دەستەبەر ببێ.

دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ﴾ ئەی موحەممەد! بۆ خەڵك باسی ئەوە بکە: ئەو کاتەی شوێنی کەعبەمان بۆ ئیبراهیم دیاریی کرد، کەعبەمان کرد بەشوێنی ئەوەی خەڵك تێیدا کۆببنەوە بۆ خوداپەرستی، شوێنەکەمان بۆ ئیبراهیم (عليه السلام) دیاری کردو ئیزنمان دا: کەکەعبە دروست بکا. مەبەست بەباس کردنی ئەو رووداوە گرنگەیە: کەلەوێ دا روی داوە، بۆئەوەی موشریکەکان بەخۆیان دا بچنەوەو واز لەهاوەڵ دانان بۆ خودا بێنن، روبکەنە خودا پەرستی!

ئەمەش سەرزەنشتو لۆمە کردنی تێدایە بۆ ئەوانەی بتپەرستی دەکەن لەشوێنێك کەلەیەکەم رۆژەوە بۆ یەکتاپەرستی بنیات نراوە.

ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کە حەزرەتی ئیبراهیم (عليه السلام) ، یەکەم کەسە بنیاتی کەعبەی ناوە ، هەڵبەتە زۆر لەوە پێش لەسەر دەستی حەزرەتی ئادەم (عليه السلام) کەعبە دروست کراوە، بەڵام بەهۆی طوفانی سەردەمی (نوح)ەوە (عليه السلام) شوێنەواری نەمابوو، جا کەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم (عليه السلام) هات پەروەردگار فەرمانی پێ کرد بەبنیاتنانی کەعبەو هاتە ئەو شوێنەی کەئێستا کەعبەی لێ دروست کراوە، ویستی شوێنەوارەکەی بدۆزێتەوە، ئیتر خودا بایەکی نارد شوێنەوارەکەی دەرخستەوە. لەسەر ئەو کانگەو بناغەیەی حەزرەتی ئادەم (عليه السلام) دروستی کردەوە.

لەصەحیحەین دا فەرمودەیەك هەیە، ئەبوزەڕ دەیگێڕێتەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چ مزگەوتێك یەکەم جار بنیات نراوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((المسجد الحرام)) دەڵێ: وتم: پاش ئەوە؟ فەرمووی: (بيت المقدس) دەڵێ: ماوەی نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: چل ساڵ. لەشوێنێکی تریشدا قورئان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا....﴾ (الأيتين من سورة ال عمران/٩٦-٩٧).

شوێنی کەعبەمان بۆ ئیبراهیم (عليه السلام) دیاری کردو پێمان گوت: ﴿أَنْ لَا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا﴾ بەناوی من کەعبە دروست بکەو هیچ کەس لەمەخلووقات نەکەیە هاوەڵو هاوشانم، رێگە نەدەی کەس هاوەڵم بۆ دابنێ، لەعیبادەت دا کەس مەکەنە هاوەڵم.

﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ﴾ ئه‌و ماڵه‌ی دروستی ده‌كه‌ی ماڵی منه، بۆ یه‌كتاپه‌رستی‌و خودا په‌رستی دروست بكه، به‌پاكی رابگره له‌هه‌موو پیسی‌یه‌ك، له‌بتپه‌رستی‌و له‌وه‌ی پیسی‌و پۆخڵی نزیك بكه‌وێته‌وه، تایبه‌ته بۆ ئه‌وانه‌ی خودا په‌رستی تێدا ده‌كه‌ن‌و یه‌كتاپه‌رستن، به‌پاك‌و خاوێنی رابگره بۆ ئه‌وانه‌ی دڵسۆزانه‌و خالیصانه ته‌وافی ده‌كه‌ن‌و به‌ده‌وری‌دا ده‌سوڕێنه‌وه، ئه‌و كه‌سه‌ی ته‌وافی كه‌عبه ده‌كا عیباده‌تێكی تایبه‌تی ئه‌نجام ده‌داو له‌به‌رخاتری فه‌رمانی خودا ئه‌م سوڕانه‌وه‌یه ده‌كا، طه‌واف ته‌نها له‌و بسته خاكه دروسته‌و به‌عیبادەت ده‌ژمێردرێ، له‌هیچ جێگایه‌كی تر دروست نیه ﴿وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾ هه‌روا بۆ ئه‌وانه‌ی به‌پێوه ده‌وه‌ستن بۆ نوێژو پاڕانه‌وه‌و ئه‌وانه‌ی ده‌چنه روكووع‌و سوژده له‌نوێژه‌كانیان دا.

شایانی ئاماژه پێكردنه لێره‌دا قورئان طه‌واف‌و نوێژی خستوونه په‌نا یه‌كه‌وه، چونكه هه‌ردوكیان تایبه‌تن به‌كه‌عبه‌وه، طه‌واف له‌ده‌وری كه‌عبه‌دا ده‌كرێ‌و له‌نوێژیشدا بۆلای كه‌عبه روتێده‌كرێ.

كه‌وابوو مه‌به‌ست به ﴿وَالْقَائِمِينَ﴾ لێره‌دا نوێژكه‌ره‌كانن، په‌روه‌ردگار روكنه گرنگه‌كانی نوێژ: كه‌راوه‌ستان‌و روكوع‌و سوژده بردنه به‌یانی كردوه.

﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ﴾ پێمان گوت: ئه‌ی ئیبراهیم! بانگی ئاده‌میزاد بكه بۆ حه‌ج كردن: بانگیان بكه بۆ زیاره‌تكردنی ئه‌و خانوه‌ی فه‌رمانی پێ كردی بنیاتی بنێ ی. دێن به‌پیاده‌یی به‌سواریی وشتری كزو له‌ڕ، ئاده‌میزادان له‌رێگای دووره‌وه خۆی بۆ ده‌كوتن‌و ده‌كشێن، پۆل پۆل‌و كۆمه‌ڵ كۆمه‌ڵ ساڵانه دێن بۆ ئه‌نجامدانی شاعائیرو مه‌ناسیكی حه‌ج، به‌كورتی بانگ راهێڵه بڵێ: خه‌ڵكینه! خودا حه‌جی ئه‌م ماڵه پیرۆزه‌ی له‌سه‌ر پێویست كردون‌و وه‌رن ئه‌نجامی بده‌ن.

ریوایه‌ت كراوه: كه‌په‌روه‌ردگار فه‌رمانی به‌ئیبراهیم عليه السلام كرد به‌بانگ راهێشتن‌و هاتن بۆ حه‌ج، عه‌رزی بارەگای یه‌زدانی كرد: وتی: خودایه! چی ده‌نگی

من دەگەیەنێتە ئەو هەموو ئادەمیزادانە؟ پەروەردگار پێی فەرمو: ئەتۆ بانگ راهێڵەو گەیاندنی لەسەر من، ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ چووە سەر كێوی ئەقوبەیس و بانگی راهێشت و فەرمووی: ئەی ئادەمیزاد ینە، بێگومان خودا فەرمانی پێ كردون بەدیدەنی كردنی ئەم خانوە پیرۆزە، وەرن حەجی ئەم ماڵە بكەن، بۆ ئەوەی خودا لەپاداشیدا بەهەشتتان پێ ببەخشێ و لەسزای دۆزەخ بتان پارێزێ، دەی وەرن حەجی ماڵی خودا بكەن! ئیتر ذرۆێتی ئادەمیزاد؛ ئەوەی لەپشتی پیاوان دا بوون و ئەوەی لەرەحمی ئافرەتان دا بوون وەڵامی بانگەكەیان دایەوە وتیان: ﴿لبيك اللهم لبيك﴾ [22] ئەمە موعجیزەیەكی فرە مەزن بوو بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ. بێگومان پەروەردگار توانای ئەوەی هەیەو هەبوە: كەدەنگی بانگی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بگەیەنێتە هەموو كون و قوژبنێكی زەوی و ئاسمانەكان!

لەورۆژەوە بەبەردەوامی وادەی پەروەردگار دێتە جێ و ساڵانە كۆمەڵێكی زۆر لەموسوڵمانان وەڵامی ئەو بانگەوازیە دەدەنەوە، بەردەوام دڵی كۆمەڵێكی زۆر لەموسوڵمانان شەوق و خۆشەویستی ئەو شوێنە پیرۆزە رایان دەكێشێ و دڵیان بۆ بینین و دیدەنی كردنی كەعبە لێ دەداو دەكوڵێ! خەڵكی بەتواناو خاوەن دەسەڵات ئەوانەی دارای دابین كردنی ئامێری سوارییان هەیە بەهەموو جۆرەكانیەوە، هەروەها ئەوانەی جگە لەدوو قاچی خۆیان هیچی تریان دەست ناكەوێ ئاگری عیشق و سۆزی ئەو بستە خاكە هەڵیان دەنێ بۆ ئەوەی روبكەنە ئەو وڵاتەو زیارەتی ماڵی خودا ئەنجام بدەن، لەهەموو كون و قوژبنێكی زەوییەوە لەشوێنی دوورو نزیكەوە، بەپیر بانگەوازییەكەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە دەچن، پاڕانەوەكەی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ تێیان دا بەرجەستە بووە. كەپاڕایەوەو فەرمووی: ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾ (ئیبراهیم/٣٧) هیچ موسوڵمانێك نیە شەوقی بینین و

---

(٢٢) تەفسیری قورطوبی ج ٦/ ٣٠٤٩

زیارەتی کەعبەی لەدڵدا نەبێ. ﴿يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ لەهەموو لایەکەوە لەدوورو نزیکەوە خودا پەرستان بەرەو ئەو شوێنە دەکشێن‌و دێن بۆ زیارەتی!

﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ﴾ بانگیان بکە بۆئەوەی ئامادەی دەستەبەر بوونی گەلێ سوودو قازانجی دونیایی ببن بۆ خۆیان، سوودی ئایین وەکوو ئەنجامدانی شەعائیرو مەناسیکی حەج وەکوو بەستنی ئیحرام‌و راوەستان لەئاخی عەرەفەو هەڵڕژانە خوار بۆ موزدەلیفەو سەرتاشین‌و سووڕانەوە بەدەوری کەعبەداو هاتوو چۆی نێوان صەفاو مەروە بەو جۆرەی کەلەکتێبە شەرعیەکاندا رون کراوەتەوە ـ قازانجی دونیاییش وەکوو بازرگانی کردن‌و ناسینی خەڵکی وڵاتان....هتد.

﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ بۆ ئەوەی ناوی خواد ببەن‌و شوکروسوپاسی پەروەردگار بکەن لەچەند رۆژێکی دیاری کراودا، وەکوو رۆژی جەژنی قوربان‌و سێ رۆژی دوای جەژن. کەلەو رۆژانەدا قوربانی سەربڕن‌و سوپاسی خودا بکەن لەسەرئەوەی دەسەڵاتی سەربڕینی گیانلەبەری چوار پێ؛ لەبزن‌و مەڕو ڕەشە وڵاخ‌و حوشتری پێ داون، جاکاتێ ئەو ئاژەڵانەتان سەر بڕین بەشێوەی قوربانی یان بەشێوەی (هدی)و دیاری ﴿فَكُلُوا مِنْهَا﴾ بۆخۆتان لێیان بخۆن ﴿وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ﴾ هەروا دەرخواردی ئەوانەشی بدەن: کەگیرۆدەی تەنگ‌و چەڵەمەی برسێتی‌و هەژاریی بوون، شایانی باسە قوربانی واجب وەکوو (فیدیە) نابێ خاوەنەکەی لێی بخوا.

بەلای مالیک‌و هاوەڵانی ئەبو حەنیفە؛ (محمد ئەبو یوسف)ەوە (ایام معلومات) بریتییە لەسێ رۆژە یان چوار رۆژەی جەژنی قوربان.

ئەبو حەنیفەو شافیعی پێیان وایە دە رۆژی مانگی ذیلحجە یە.

جائەگەر مەبەست بە ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ﴾ حەمدو سوپاس بێ، وشەی ﴿عَلَى﴾ لە ﴿عَلَى مَا رَزَقَهُمْ﴾ دا بۆ تەعلیل‌و بایيسە. زومەخشەری دەفەرموێ: مەبەست بە ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ﴾ قوربانی سەرپڕینە، چونکە موسوڵمانان هەمیشە ذیکری

خودایان لەسەر زوبانەو نیکر کردنەکەیان تایبەت نیە بەم رۆژەوە. کەوابێ وشەی (علی) بۆ مانای (استعلاء) بەکار هێنراوە. ئەمەش ئامازەی ئەوەی تێدایە: کەمەبەستی سەرەکیو ئەصلی بەقوربانی سەر برین ئەوەیە: ناوی خودا ببرێو ناوی خودایان لەسەر بهێندرێ، ئامازەیە بۆ ئەوە کەناو هێنانی خودا بەبێ ئەوەی هاوەڵی بۆ دابنرێو بەیەکناسینی مەبەستی سەرەکییە، باسکردنی رزقو رۆزیی لەتەکیا بۆ هەڵنانی موسوڵمانانە بۆ سوپاسگوزاریو خۆ نزیك کردنەوەیە لەخودا.

بۆیەش فەرمانی کرد بە لێخواردن لەقوربانیو کوشتییەکان، چونکە لەسەردەمی نەفامی دا عەرەبەکان: کەحەجیان دەکردو قوربانیان سەردەبڕی، لەکوشتی یەکانیان نەدەخوارد!

زومەخشەری دەفەرموێ: دەتوانین بڵێین لێ خواردنەکەیان سوننەت بێ، لەم روەوە کەهاوکاری هەژارانی تێدایەو دڵدانەوەی ئەوانی لێ وەردەگیرێو نیشانەی تەواضوعو خۆبەکەم زانینی دەوڵەمەندەکانە! بۆیە شەرع زانان بەشیان داناوە: کەخاوەن قوربانی سێ یەکی گۆشتی قوربانی یەکەی بخوا.

ئەوەش چەسپاوە: کەپێغەمبەر ﷺ کە (هدی) کوشتیەکەی خۆی سەربڕێ، فەرمانی کرد لەهەموو حوشترە سەربڕاوەکان پارچە گۆشتێکی بۆ بکوڵێنن لێی خواردو شۆرباوەکەی خواردەوە.

لەمەذهەبی شافیعیدا لێخواردن لەقوربانی سوونەتەو دەرخواردانی هەژران واجبە. ئەگەر هەمویشی دەر خواردی هەژاران داو بۆخۆی لێی نەخوارد دروستە!

ئەمجار فەرمان دەکا بەپاكو خاوێنیو ئەنجامدانی ئەو نەزرو ئەرکانەی لەسەریانن دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ پاشان چڵكو پۆخڵی سەر جەستەیان لابەرن، نینوکی دەستو قاچیان بکەن، مووی خۆیان بتاشنو کورتیان بکەنەوە، ئەو نەذرانەی شەر شانیان جێبەجێبکەن، بەم

کارو کردەوانەیان خۆیان لەخودا نزیك بکەنەوە، (طواف الرکن) یان (طواف الأفاضة) یان (طواف الوداع) طەوافی خودا حافیزی ئەنجام بدەن.

**تێبینی:**

**ئایەتەکان ئەم حوکمەیان لێ وەردەگیرێن:**

١- بنیاتنانی کەعبە لەسەردەستی حەزرەتی ئیبراهیم‌‌ﷺ: دوو مەبەستی سەرەکی تێدان:

یەکەم: ڕاگەیاندنی تاك‌و تەنهایی خوداو بەدوور گرتنی لەهەموو عەیب‌و نەنگیەك.

دووەم: پاککردنەوەی کەعبە لەهەموو بت‌و صەنەمێك‌و هەروەها لە پیسی‌و پۆخڵی‌و بیدعەت‌و ناشیرینی یەك.

هەڵبەتە ئەم خیطابە بۆ ئیبراهیمەو ئاراستەی ئەو کراوە.

٢- کەدەفەرموێ: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ﴾ ڕاگەیاندنی فەرزبوونی حەجە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ: کەحەج لەزەمانی ئیبراهیم دا واجب بووە. جائەگەر واجب بوونی لەسەردەمی پێغەمبەرانی دوایی دا نەسخ نەکرابێتەوە، ئەوە واجب بوونی حەج لەسەر ئوممەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ بەئایەتی ﴿وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ (ال عمران/٩٧)ە کەلەساڵی نۆیەمی کۆچی دا نازڵبووە.

ئایەتی ﴿وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ﴾ کەساڵی شەشەم نازڵ بووە. نابێتە بەڵگەی واجب بوونی عومرە، دەق نیە لە واجب بوون دا چونکە وێ دەچێ مەبەست بەواجب بوونی تەواو کردنەکەیان بێ دوای چوونە ناو ئەعمالەکانیان، دەست پێ کردنیان واجب نەبێ.

پێغەمبەر ﷺ پێش کۆچ کردنی دووجار حەجی سوننەتی ئەنجام داوە لەسەر ئایینی ئیبراهیم. پاش کۆچ کردن ساڵی دەیەمی کۆچی حەجی خوداحافیزی ئەنجام دا. ئەمەیان حەجی فەرز بوو.

دەی بۆچی پێغەمبەر ﷺ ساڵی نۆیەمی کۆچی هەوڵی نەدا حەج بکا؟ هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە: کەئەو ساڵە کاتی حەج کەوتە کاتی (النسیء) دواخستنی کاتی مانگەکانی حەج بوو، کاتی حەقیقی حەج هێشتا جێگیر نەبووبوو. ڕۆژی دەیەمی ذیلحجة نەهاتبوە شوێنی خۆی.

پێغەمبەر ﷺ دەیزانی: کەساڵی داهاتوو، واتە: ساڵی دەیەمی کۆچی ڕۆژی دەیەمی ذیلحجة دێتەوە جەقی حەقیقی خۆی. بۆیە ئەنجامدانی حەجی خۆی دواخست تالە ساڵی دەیەم داو لەوکاتی خۆی‌داو لەو کاتەدا: کەحەج لەسەر موسوڵمانان فەرضە ئەنجامی بدا.

حەزرەتی ئەبوبەکرو ئەوانەی لەگەڵی دا ساڵی نۆیەم حەجیان ئەنجام دا چ خراپەیەکیان لەسەر نیە چونکە ماوەکە تێکەڵو پێکەڵ بوو.

٣- بانگ ڕاهێشتنی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ بەحەج لەسەر کێوی ئەبوقوبەیس‌و گەیشتنی دەنگەکەی بۆ هەموو شوێنێك موعجیزە بووە. بێگومان خودا دەتوانێ دەنگی ئیبراهیم ﷺ بگەیەنێتە هەموو شوێنێك!

ئیبنوئەبی شەیبەو ئیبنوجەریرو ئیبنولمونذیرو حاکیم تەصحیحی کردوە هەروا (بەیهەقی) یش لەسوننەنەکەیدا لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکا: دەڵێ: کەحەزرەتی ئیبراهیم ﷺ لەبنیاتنانی کەعبە بووەوە، فەرموی: خودایە! وامن لەبنیاتنانی کەعبە بوومەوە، پەروەردگار فەرمانی پێ کرد بانگ ڕاهێڵە بۆ حەج کردن. وتی: خودایە! چی دەنگی من دەگەیەنێتە ئەو هەموو حەشاماتە؟ پەروەردگار فەرموی: ئەتۆ بانگ ڕاهێڵەو گەیاندنی لەسەر من، وتی: خودایە چۆن بانگ ڕاهێڵم‌و بڵێم چی؟ پەروەردگار فەرمووی: بڵێ: ئەی خەڵکینە! حەجی ماڵی خوداتان لەسەر نووسراوە، وەرن دیدەنی ماڵی خودا بکەن، ئیتر هەموو ئەهلی

ئاسمانەکانو زەوی گوێیان لێ بوو! ئەی ئەوە نیە هەموو ساڵێ لەهەموو لایەکەوە ئادەمیزادان وەڵامی ئەم بانگەوازییەی ئیبراهیم عليه السلام دەدەنەوەو دێنە زیارەتی ماڵی خودا.

٤- کەدەفەرموێ: ﴿يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ﴾ زانایان ئەوەیان لێ وەرگرتووە: کەدروستە بەپیادەیی‌و بەسواری خەڵك حەج بکا، ئەمە هیچ راجیایی یەکی تێدا نیە، بەڵام ئاخۆ حەجکردن بەپیادەیی خێرترە یان بەسواری؟!

مالیکییەکان دەڵێن: بەپیادەیی بچی بۆ حەج باشترە چونکە نارەحەتی زۆرترە، هەروەها فەرمودەیەکیش هەیە ئیبنوماجە لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی ﷺ بەپیادەیی لەمەدینەوە چون بۆ مەککە!!

ئیبنو عەبباسیش دەفەرموێ: خەفەتی هیچ شتێك ناخۆم لەکیسم چووبێ، جگەلەوەی: کەحەزم دەکرد بەپیادەیی حەج بکەمو بۆم نەکرا، چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿يَأْتُوكَ رِجَالاً﴾.[٣٣]

جەماوەری زانایان بەئیمام مالیکیشەوە دەفەرموون: حەج کردن بەسواریی خێرترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەسواریی حەجی کرد، هەروەها چونکە ئەنجامدانی شەعائیری حەج بەدەستەبەر کردنی پێداویستی یەکانی شکۆمەندییەك بەحەج کردنەکە دەبەخشێ!

باوا گومان نەبرێ: کەپێش خستنی وشەی (رجالا) بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەحەجکردن بەپیادەیی خێرترە، چونکە عەطف بە (واو) تەرتیب ناگەیەنێ‌و بۆ کۆکردنەوەیەو بەس! دەگونجێ پێش خستنی (پیادە) لەسەر (سوار) ئاماژە بێ بۆ ئەوە: کەخەڵکی خێرا بەپیر بانگەوازییەکەوە دێن، تەنانەت لەوانەیە (پیادە) پێش سوار بکەوێ.

(٣٣) رواة ابن سعيد وابن ابى شيبة والبيهقى.

٥- کەدەفەرموێ: ﴿لیشهدوا منافع لهم﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوە: کەبازرگانی کردن لەحەج دا دروستە.

موجاهید دەفەرموێ (منافع) واتە: بازرگانی‌و هەر شتێکی تر لەکاروباری دین‌و دونیا کەرەزامەندی خودای تێدا بێ، فوقەهای ئیسلام پێیان وایە: کەبازرگانی کردنی حاجیەکان دروستەو هیچ خراپیەکی تێدا نیە بەمەرجێ مەبەستی سەرەکی سەفەرەکە نەبێ!.

چونکە خودا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلاً مِّن رَّبِّكُمْ﴾ (البقرة/١٩٨) ئاشکراشە وشەی (فضل) لێرەدا بەمانا بازرگانی‌یە.

٦- کەدەفەرموێ: ﴿مَنَافِعَ﴾ بەشێوەی نەکیرەناماژەیە بۆئەوە: کەلەحەج دا زۆر قازانجی گەورەو بەنرخی دینی‌و دونیایی هەن، بەجێهێنانی کارو شەعائیرەکانی حەج گەورەترین دیاردەی ترسان لەخوداو ئیخلاص بۆ خودای تێدایە، بەذیکرو پاڕانەوەو عیبادەتەوە.

حەجکردن نیشانەی خۆ دوورخستنەوەیە لەهەموو جوانی‌و کاڵایەکی دونیایی! نیشانەی دابڕانە لەزەرق‌و بەرەقی ژیانی جیهان‌و خۆپەیوەست کردنە بەژیانی قیامەتەوە، لەهەمان کات دا ئادەمیزادەکان هەڵدەنێ بۆ بەرەحم‌و بەزەیی‌و چاکەکاریی‌و عەداڵەتکاریی، یەکسانی‌و هاوکاری نێوان خۆیان. کۆبوونەوەیەکی گەورەو بەرفراوانی موسوڵمانانە، جوان‌و ناشیرین‌و سپی‌و رەش، دەوڵەمەندو هەژارو مسکین‌و ئاغاو فەرمانڕەوا لەکاتی دیاریکراودا لەیەك جۆرە پۆشاك دا هاوار دەکەنە بارەگای خودای پەروەردگارو نیشانەی یەکیەتی موسوڵمانانەو دیاردەیەکی دەشتی مەحشەرە!

٧- مالیکییەکان پێیان وایە سەربڕینی گوشتی (قوربانی) نابێ بەشەو بێ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ﴾ کاتی سەربڕینەکەی بەڕۆژ دەست نیشان کردوە نەك شەو.

وەلێ قسەی حەق‌و ڕاست ئەوەیە: (یوم) بەمانا ڕۆژە، جاری وایش هەیە بۆ تێکڕایی شەوو ڕۆژ بەکار دەهێندرێ.

جگە لەمالیکیەکان بەلایانەوە مەکروهە بەشەو کوشتی سەر ببڕدرێ. چونکە وێدەچێ لەبەر تاریکی هەڵە لەسەر بڕینەکەدا بکرێ.

٨- ﴿أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ﴾ بەلای ئیمام مالیك‌و ئەبویوسف‌و موحەممەد، ڕۆژانی کوشتی سەربڕینەکە: ڕۆژی جەژن‌و دوو ڕۆژی دوای جەژنن.

بەلای ئەبو حەنیفەو شافعی یەوە (دە) ڕۆژی یەکەمی مانگی ذیلحجەن.

ڕۆژانی کوشتی سەربڕین بەلای حەنەفییەکان‌و مالیکییەکانەوە سێ ڕۆژن: ڕۆژی دەیەم‌و یانزەو دوانزەی ذیلحەجەن. ئەم ڕایە لەکۆمەڵێکی زۆری هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ریوایەت کراوە بەلای شافیعی‌یەوە چوار ڕۆژن: ڕۆژی دەیەم‌و سێ ڕۆژی دوایین، بەڵگەی شافیعی ئەو فەرمودەیە: کەبەیهەقی لەجوبەیری کوڕی موطعیمەوە ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((وكل أيام التشريق ذبح)) ئاشکراشە (ایام التشريق) سێ ڕۆژی دوای جەژنی قوربانن، وەلێ ئیمام ئەحمەد ئەم حەدیثەی بەزەعیف داناوە.

کاتی سەربڕین بەلای ئیمام مالیکەوە دوای نوێژ کردن‌و قوربانی سەربڕینی ئیمامە، بەلای ئەبو حەنیفەوە دوای تەواو بوونی نوێژی جەژنە نەك دوای قوربانیکردنی ئیمام.

بەلای شافیعی‌یەوە دوای هاتنی کاتی نوێژی جەژن‌و خوتبەکانیەتی.

ئیبنو عەبدولبەڕ دەفەرموێ: زانایانی ئیسلام کۆڕایان هەیە: کەسێك پێش نوێژی جەژن حەیوان سەر ببڕێ‌و دانیشتووی شاربێ حەیوان سەر بڕینەکەی قوربانی نیە، چوونکە فەرموودەیەك هەیە بوخاری‌و موسلیم لە (البراء)ی کوڕی عازیبەوە ریوایەتیان کردوە: کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((من ذبح قبل الصلاة فتلك شاة لحم)).

بەڵام دانیشتوانی لادێو شار نشینەکانو ئەوانەی پێشەوایان لەناودا نیە، قسەی مەشهوری مەذهەبی ئیمامی مالیك ئەومیە: کەهەوڵ بدا بزانێ: کەی ئیمامی موسوڵمانان، یان ئیمامی نزیکترین وڵات لەناوچەکەیانەوە قوربانی سەر دەبڕێ ئەمجار ئەوان قوربانی سەربڕن!

٩- سوننەتە موسوڵمان لەدیاریو قوربانی خۆی بخوا، زۆربەی زوریشی بکا بەخێرو صەدەقە. دەشتوانێ هەمووی ببەخشێ، یان هەمووی دەرخواردی خۆی ماڵو منداڵی بدا بەلای مالیکییەکانەوە، ئەمەش بەپێچەوانەی دابونەرێتی سەردەمی نەفامی: کەلەقوربانیو کوشتی خۆیان نەدەخوارد.

بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین: کەلەهەموو قوربانییەك ناخورێ، چونکە بەکۆڕای زانایان خوێنی فیدیەو جەزا نابێ خاوەن کوشتیەکە لێی بخوا، کوشتی تەطەوع لێخواردنی دروستە.

حەیوان سەربڕین بۆ حەجێك کەبەشێوەی (تمتع) یان (قران) ئەنجام بدرێ شافیعیـیەکان دەڵێن: ئەو خوێنە فیدیەو پڕکردنەوەی نەقصە نابێ خاوەن کوشتیـیەکە لێی بخوا.

حەنەفییەکان دەڵێن: ئەوە خوێنی شوکرو سوپاسە خاوەنەکەی دەتوانێ لێی بخوا، ئەمەش پەیڕەوی کردنی ظاهیری ئایەتەکەیە، چونکە قورئان دوای حەیوان سەربڕینو تەواف، لابردنی چڵكو پیسیو تەپو تۆزی دەست نیشان کردوە، دەی ئەو کوشتیەی ئەم کارانەی بەدوادا دێ خوێنی تەمەتوعو قیرانە.

چونکە باقی خوێنەکانی تر پێش ئەم کارانەو دوای کارەکانیش دروستە ئەنجام بدرێن.

ئەوەش چەسپاوە: کەپێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی ئەو وشترەی خوارد کەلەحەجی ماڵ ئاواییدا سەری بڕی، قسەی راستیش ئەومیە: کەپێغەمبەر ﷺ حەجی بەشێوەی قیران کردوە!

١٠- دروست نیە لەقوربانی و کوشتی دیاری بفرۆشرێ، چونکە ئایەتەکە بەنەص (اکل) و (طعام)ی دەست نیشان کردوە.

هەروەها ئەو فەرمودەیەی بوخاریو موسلیم لەعەلی کوڕی ئەبو طالیبیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردم کەسەروکاری حوشترە قوربانیەکەی بکەم، فەرمووی: پێستو گۆپانەکەشی دابەش بکەو هیچی لێ مەدە بەقەصابەکە؛ دەی کەوابێ لێ فرۆشتنی دروست نیە!!

## بەگەورە دانانو رێزگرتن لەپاوانەکانی خوداو شەعائیرەکانی

﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾

﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا ۗ وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَالصَّابِرِينَ عَلَىٰ مَا أَصَابَهُمْ وَالْمُقِيمِي الصَّلَاةِ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار فـەرمانی بەحـەزرەتی ئیـبراهیم ﷺ کـرد: کـەبانگ راهێڵێ بۆ حەج، پاداشی ڕێزگرانی ئەحکامی خوداو شەریعەتی خودا دیـاریی دەکـا: کەمەناسیکی حەج‌و حەڵاڵکردنی سەربڕینی کوشتی‌و لێخواردنیەتی جگە لەهەندێ حاڵەت کەچەرت کراون، ئەمجار بەشوێن ئەوەدا جڵەوگیری لەبتپەرستی‌و ڕێزگرتنی بت‌و صەنەم دەکا، سەرزەنشتی ئەوانـە دەکـا: کەبـەدەم خـوداوە شت هەڵدەبەستن، لەشـایەتیدانـدا درۆ دەکـەن، ئـەمجار ئـەوە ڕون دەکاتـەوە، کـەڕێزگرتن لەشـاعائیری خـودا نیـشانەی تـەقواو خـودا پەرسـتی یـە، ڕێـز گـرتن لەشـەعائیری خـودا ئەومیـە کەعبە بنیات بنێ‌و لەبت‌و بتپەرستی پاکی بکاتەوە. ﴿ذَٰلِكَ﴾: فەرمانی ئێمە، ئەوە بوو کەپێتان ڕاگەیەندراو بیـستتان ﴿وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ﴾ کەسێك ڕێز لەحوکم‌و بڕیارەکانی خودا بگرێ، زانیـاری هـەبێ بـەواجبی‌و پێویـست بوونیـان‌و کاریـان پـێ بکـاو پـەیڕەوییان بکـا، خـۆ لـەتاوان‌و سـتەمکاری بپـارێزێ، پابەندی فەرمانی خودا بێ، ئەوە بۆی باشەو پاداشی باشی لەسـەر دەسـت دەکـەوێ، هەرکەسـێ ڕێـز لەفەرمانـەکانی خـودا بگـرێ‌و دەسـتدرێژی نەکاتەسـەر گیانـدارو بەئەدەبەوە لەناخی حەرەم دا بمێنێتەوە، دەست درێژی نەکاتـە سـەرگیاندارو گیـاو

درەخت، ئەوە بۆئەو زۆر بەسوودەو دەبێتە مایەی پایە بڵندیو سەرفرازیی لە لای خودا.

جاوامەزانن: هەموو شتێكو هەموو گیانلەبەرێ لەسەر ئێوە حەرامو یاساغە، بەڵكوو ﴿وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الْأَنْعَامُ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ حەڵاڵ كراوە بۆ ئێوە ئەی ئادەمیزادینە! سەربڕینی ئاژەڵەكانو خواردنی گۆشتەكەیانو سوود بینین لەپێستو كوڵكو خوریو مووی مەڕەزو بەرگنیان، جگەلەمندارەوەبوو خوێنی ڕەوانو گۆشتی بەرازو هەر كوشتیو خواردنێك: كەناوی غەیری خودای لەسەر هێنرابێ. بزانن ئەوەی عەرەبەكان لەسەردەمی نەفامیدا لەسەر خۆیان حەرام كردبوو، حەرام نیەو بۆتان حەڵاڵە، ئەوان بەبێ بەڵگەو دەلیل ئەو چوار جۆرە حوشترەیان لەسەر خۆیان حەرام كردبوو: كەپێیان دەگوترا: ((بەحیرە، سائیبە، وصیلە، حام)).

ئەمجار بەسۆنگەی حەڵاڵكردنی ئەو چوار جۆرە ئاژەڵانەوە كەحوشترو ورشەولاخو مەڕو بزنن، فەرمان دەكا كەئادەمیزاد لەو بتانە دوور بكەونەوە: كەبەدەستی خۆیان دەیانتاشنو ڕێكیان دەخەنو دەیانپەرستنو كوشتیو قوربانیان بۆ سەر دەبڕن، بەهیوای ئەوە كەلەخودایان نزیك بكەنەوە، دەفەرموێ: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ﴾ خۆتان بپارێزن لەپیسیو قێزەونێك كەبتەكانتانن، خۆتان لەوكارە ناشیرینە دووربخەنەوە، توخن بتپەرستی مەكەون چونكە بتپەرستیو هاوەڵ بۆ خودا بڕیاردان سەردەستەی هەموو تاوانێكەو هەرگیز خودا لەو كارە خۆش نابێ، ماتوڵ ڕێزگرتن لەپاوانو شەعائیرەكانی خودا قازانجو سوودی ئێوەی تێدایەو ڕەزامەندیی خودای پێ دەستەبەر دەبێ، دەنێتر واز لەبتپەرستی بێننو ڕێزیان لێ مەگرنو كوشتیو قوربانییان بۆسەر مەبڕن!

﴿وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ هەروەها خۆتان لەدرۆو شایەتی درۆ بپارێزن، شتێك حەق نەبێ مەیڵێن: ﴿حُنَفَاءَ لِلَّهِ﴾ لەبەرخاتری خودا لەهەموو ڕێبازێك لابدەن

جگه له‌ڕێبازی خودا په‌سند، ته‌نها ڕێگای خودا بگرنه‌به‌رو به‌س ﴿غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ﴾ هاوه‌ڵ بۆ خودا دامه‌نێن، که‌س مه‌که‌ن به‌هاوشانی!

به‌کورتی ئه‌و فه‌رمانانه‌ی ئاڕاسته‌تان کران پێیانه‌وه پابه‌ند بن‌و سه‌رپێچییان مه‌که‌ن، به‌دڵسۆزی‌و لێبڕاوانه‌وه خوداپه‌رستی بکه‌ن، واز له‌هه‌موو ئایین‌و ڕێبازێکی به‌تاڵ بێنن. هاوه‌ڵ بۆ خودا دامه‌نێن‌و خۆتان له‌قسه‌ی درۆو شایه‌تی درۆ بپارێزن.

ئایه‌ته‌که درۆو بوختانی خستۆته ریزی هاوه‌ڵ دانان بۆ خوداو به‌تاوانێکی زۆر گه‌وره‌ی داناوه.

ئیمام ئه‌حمه‌د له‌فاتیکی (الاسدی) یه‌وه ریوایه‌ت ده‌کا ده‌فه‌رموێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ نوێژی به‌یانی کردو که‌ڵ بووه‌وه هه‌ستایه سه‌رپێ‌و فه‌رمووی: ﴿عدلت شهادة الزور الاشراك بالله عزوجل﴾ شایه‌تیدانی به‌درۆو هاوه‌ڵدانان بۆ خودا هاو ته‌رازون‌و به‌ئه‌ندازه‌ی یه‌کتر تاوانن. پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه..

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار نموونه‌یه‌کی تێدا چون‌و به‌فتاره‌چوونی موشریکه‌کان‌و دوورکه‌وتنه‌ومیان له‌ڕێبازی هیدایه‌ت ده‌خاته‌ڕو، ده‌فه‌رموێ: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ﴾ که‌سێك هاوه‌ڵ بۆ خودا دابنێ‌و به‌ندایه‌تی بۆ غه‌یری خودا بکا، ئه‌وه به‌ته‌واوه‌تی خه‌سارته‌مه‌ند بووه، به‌فتاره چووه، ئه‌و کابرایه له‌هاوه‌ڵ دانان‌و په‌رستش کردنی بۆ غه‌یری خودا ده‌شوبهێته که‌سێك که‌له‌به‌رزایی ئاسمانه‌وه بکه‌وێته خوارێ‌و باڵنده گۆشت خۆره‌کان خێرا په‌لاماری بده‌ن‌و نه‌هێڵن بکه‌وێته سه‌ر زه‌وی پارچه پارچه‌ی بکه‌ن‌و هه‌ر له‌حه‌وادا پچڕ پچڕی بکه‌ن! هه‌ر کوتێکی به‌ده‌ندوکی باڵنده‌یه‌که‌وه بێ!

﴿أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ یان ئه‌و که‌سه ده‌شوبهێته که‌سێك ره‌شه‌باو زریان ڕایفڕێنێ‌و بیخاته شیوو دۆڵ‌و شاخ‌و داخێکی وا که‌رزگار بوونی نه‌بێ‌و بکه‌وێته ناو شیوی قوڵ‌و دڕکه‌شاخی شندڕ شندڕو ترسناکه‌وه.

تەشــبیهەکە بەقوومتــەو لێکــچوانەکە نمونەیــەکی راســتگۆیانەی حاڵــەو ئاوێنەیەکی باڵانەمایە، چونکە ئەو کەسەی هاوەڵ بۆ خودا بەرەوا دەزانیّو بڕیاری ئەوە دەدا، لەئاسۆی بیروباوەڕی بەختەوەر ئامێزەوە دەکەوێتە خوارێ بۆ ناو چاڵی لـەناو چـونو تێداچـوون، بنـەما چەسـپاوە ئایینیەکـەی لـەکیس دەچـیّو هـەواو هەوەسو بیروباوەڕی پڕوپوچ بەملاو بەولایدا دەدەنو وەکوو قانگە لاشـک ڕەشـەبا دەیهێنیّو دەیبا.

مەبەستی لەم دوو لێکچواندنە تەمثیلیانە ناشیرینکردنی حاڵو وەزعی شیرکو قێز لێکردنەوەیەتی!

ئـەمجار پـەروەردگار هۆکـاری ڕێزگـرتن لەشـەعائیری خـودا روون دەکاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَنْ يُعَظِّـمْ شَـعَائِرَ اللَّـهِ فَإِنَّهَـا مِـنْ تَقْـوَى الْقُلُـوبِ﴾ کار ئەوەیـە: کەگوتراو بەیان کرا، هەرکەسیّ ڕێز لەشـەعائیری خـودا بگـریّو گرنگیـان پـیّ بـدا، ئـاژەڵی ساغی قەڵـەوی بـەنرخ هەڵبـژێریّو بـۆ کەعبـەو دیـاریی بکـا، یـان کەسـێك فەرمانی خوداو مەناسیکی حەج بەگەورەو ڕێزدار بزانیّ؛ کەبەشێك لەو مەناسیكو شـەعائیرانە دیـاریو قوربـانی مـاڵی خودایـە ئـەوە بێگومـان ڕێزلێگـرتنو گرنگـی پێدانەکـەیان بەشـێکە لـەکارو کـردەوەی لـەخودا ترسـان، نیـشانەی تـەقوای دڵو دەروونەکانیانە.

ریوایەت کراوە: پێغەمبەر ﷺ سـەد وشـتری کـردە قوربـانی، وشـترێکیان لـەناودا بوو هی ئەبو جەهل بوبوو ئاڵقەیەکی زێڕی بەلوتیەوە بوو!

ئیمـام ئەحمـەدو ئـەبووداود لەعەبـدوڵلای کـوڕی عومـەیرەوە ریوایـەت دەکـەن دەفەرموێ: ئیمامی عومەر ﷺ وشترێکی ڕەسـەنی کـردە دیـاریی، سێـصەد دینـاریـان دابوویـە نەیفرۆشـت، هاتـەلای پێغەمبـەر ﷺ وتـی: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ خـودا! مـن وشترێکی ڕەسـەنم کـردوە بـەدیاریی سێـسەد دینـاریـان داومـیّ بیفرۆشـم! ئایـا دەبـیّ بیـدەم بەسێـسەد دینـارو وشـترێکی گـەورەتری پـیّ بکـرم؟ پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی:

نەخەیر، ئەو سەر ببڕە.[٢٤] ئیبنو عومەریش وشتری گەورەی دەکردە دیاریو جلی بەنرخی لەپشتێ دەکردو سەری دەبڕێو گۆشتو پێستو جلەکەشی دەبەخشیەوە.

﴿لَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ﴾ بۆ ئێوە هەیە لەو حەیوانەی دەیکەنە دیاریی چەند سوودو قازانجێك؛ دەتوانن سوود لەشیرو کوڵكو موو مەرمزو خورییەکەی وەربگرن، کەڵکی لێ وەربگرن بۆ سواریو هەڵگرتنی کاڵاکانتان، تائەو کاتەی کاتی سەربڕینی دێو سەری دەبڕنو گۆشتەکەی دەبەشنەوەو لێی دەخۆن، سوار بوونو بارلێ بارکردنی دروستە، تەنانەت دوای ئەوەیش کەناوی دیاریی لێ دەنرێو دەست نیشان دەکرێ، چونکە لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا فەرمودەیەك هەیە ئەنەس ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پیاوێك حوشترێکی پەت کردبوو بۆ قوربانی، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی ((ارکبها ویحك)) سواری ببە، ماڵوێران، ماڵوێران سواری ببە...

﴿إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ پاشان شوێنی سەربڕینو سەرەنجامی ئەو حەیوانە لەبەستی کەعبەدایەو لەوێ سەردەبڕدرێ.

﴿الْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ کەعبەیە، بەستی مەککەیە چونکە حەرەم هەمووی بەکەعبە حیسابە، بۆیەش پێی دەگوترێ: (عەتیق) ئازاد کراو، چونکە خودای مەزن لەملهوڕو ستەمکاران پاراستوویەتیو دەیپارێزێ، بوخاری لەتاریخەکەیداو تیرمیذیو حاکمو ئیبنو ماجە ئیبنو جەریرو هی تریش لەعەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە ریوایەت دەکەن: دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((انما سمی الله البیت العتیق؛ لأنه أعتقه من الجبابرة فلم یظهر علیه جبار قط)).

ئەمجار پەروەردگار خەبەری ئەوەمان دەداتێ: کەئاژەڵ سەربڕینو خوێن رشتنی ئاژەڵ لەهەموو ئایینەکان دا رەوابووە بەمەرجێ بۆ خودا بوبێو ناوی خودای لەسەر هێنرابێ. دەفەرموێ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾ بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك، بۆ هەموو خاوەن ئایینەکان ئێمە کوشتیو قوربانیمان داناوە، بۆ

---

([٢٤])(فی ظلال/ج ٥/ ٥٨٩).

خۆنزیك كردنەوە لەخودا ئاژەڵیان سەربڕیوە، ئاژەڵ سەربڕین و قوربانی كردن تایبەت نەبووە بەئوممەتی موحەممەدەوە ﷺ ، بەڵكوو لەناو هەموو گەل و نەتەوەیەكدا باو بووە.

﴿لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأَنْعَامِ﴾ ئێمە یاساو داب و نەریتی ئاژەڵ سەربڕینمان داناوە بۆ ئەوەی لەكاتی سەربڕینی قوربانی و دیارییەكانتان دا ذیكری خودا بكەن شوكری خودا بكەن لەسەر ئەوەی خودا ئەو هەموو نیعمەتانەی پێ داون و ئەو ئاژەڵانەی بۆ موسەخەر كردون كەڵكیان لێ وەردەگرن!

لەصەحیحی بوخاری دا فەرمودەیەك لەئەنەسەوە ریوایەت كراوە دەفەرموێ: دووبەرانی شاخ داری چاو رێژراویان بۆ پێغەمبەر هێنان، ئەویش ناوی خودای هێناو (الله اكبر) ی كرد، قاچی لەسەر لاملیان داناو بەدەستی خۆی سەری بڕین.

ئیمام ئەحمەدو ئیبن ماجە لەزەیدی كوڕی ئەرقەمەوە ریوایەت دەكەن دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم قوربانییانە چین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوە سوننەتی حەزرەتی ئیبراهیمی ﷺ بابە گەورەتانە. هاوەڵانی وتیان: ئێمە لەو قوربانیانە چیمان پێ دەگا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەهەموو تاڵە موویەك چاكەیەك هەیە.

ئایینی ئیسلام هەموو هەست و شعورەكان یەك دەخاو رویان پێ دەكاتە پەروەردگارو وایان لێ دەكا یەك خودا بپەرستن و روبكەنە یەك رۆگەو یەك مەنهەج پەیڕەوی بكەن و هەڵس و كەوت و هەست و شعوورو كارو گوفتارو داب و نەریت و جم و جوڵیان یەكتاپەرستی تێدا رەنگ بداتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە هەر قوربانی و كوشتیەك ناوی غەیری خودای لەسەر ببرێ و بۆ غەیری ئەو سەرببڕێ یاساغی كردووەو بەحەرامی داناوە. بەپێویستی داناوە كەلەسەر هەموو كوشتی و بۆ هەموو بڕیارو كارێك ناوی خودا ببرێ. بەجۆرێك ئاماژە بەوە بكا: كەناوهێنانی خودا مەبەستی سەرەكییەو قوربانیەكە بۆ ئەو مەبەستە ئەنجام دەدرێ. دەفەرموێ: ﴿فَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ هەرچەندە شەریعەتی

پێغەمبەران جوداوازی لەلق و پۆپەکانیاندا هەیەو هەندێ شەریعەت هەندێکی تریانی نەسخ کردۆتەوە بەڵام لەبنەمادا یەك سەرچاوەن و هەموو لەلایەن خودای تاك و تەنیاوە هاتوون.[٢٥]

﴿الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَالصَّابِرِينَ عَلَى مَا أَصَابَهُمْ﴾ ئەوانەی لەسەر ئازارو تەنگ و چەڵەمە بەصەبرو ئارامن، ڕەخنە لەقەزاو قەدەری خودا ناگرن، هەروا خۆراگرو پشوو درێژن لەسەر ئەرك و ماندوو بوونی تاعەت و خودا پەرستی.

﴿وَالْمُقِيمِ الصَّلَاةِ﴾ ئەوانەی نوێژەکانیان بەخشووعەوە لەکاتی خۆیان داو بەتەواوی و دڵسۆزی ئەنجام دەدەن.

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون هەندێکی لێ دەبەخشن بەسەر خزم و کەس و کاری هەژاریان، چاکە لەگەڵ خاوەن ئاتاجان دەکەن و پابەندی پاوان و سنوورەکانی خودان و سنور بەزێنی ناکەن!

بەوجۆرە ئیسلام بیرو باوەڕو شەعائیر پێکەوە گرێ دەدا، شەعائیر لەعەقیدەو باوەڕەوە پەیدا بوون و لەسەر عەقیدەو باوەڕ دادەمەزرێن. شەعائیر ڕەنگدانەوەی عەقیدەو ڕەمزی عەقیدەن.

(٢٥) ڕستەی ﴿فالهكم اله واحد﴾ وەکوو عیلەت و بایس وایە بۆ ڕستەی پێشەوە: کەفەرمان دەکا بەوە تەنیا ناوی خودا لەسەر کوشتی‌یەکانیان بهێنن، ناوی غەیری خودا نەهێنن، چونکە تاك و تەنهایی لەئولوهییەت دا داخوازی ئەوەیە جگەلە ناوی ئەو ناوی هیچ شتێکی تر لەسەر کوشتی‌یەکەیان نەبرێ.

کەدەفەرموێ﴿اله واحد﴾و نەیفەرموو (الهكم واحد) بۆئەوەیە ئاماژە بەوە بکا: کەپەروەردگار تاك و تەنهایە لەزات و خودایەتی دا.

## ناوهێنانی خودا لەکاتی سەربڕینی قوربانی‌داو لێ خواردن‌و لێ بەخشینی

﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُم مِّن شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ۖ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ ۖ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَاهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٣٦) لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ التَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ ۗ وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ (٣٧)﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار موسوڵمانانی بۆ خۆنزیك کردنەوە لەخودا بەسەربڕینی ئاژەڵ‌و قوربانی کردن، ئەمجار بەتایبەتی ناوی حوشتری هێنا بۆ سەر بڕین‌و کردن بەقوربانی، چونکە جەستەی گەورەیەو سوودو قازانجی هەمە جۆری تێدا هەن؛ دەفەرموێ: ﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَعَائِرِ اللَّـهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ ئێمە حوشترمان کردوە بەنیشانەی ئایینی خوداو بەڵگەی بەندایەتی کردن بۆ پەروەردگار، سەربڕینی ئەو ئاژەڵە بەنرخە لەحەرەم دا خێرو پاداشێکی زۆری قیامەتی تێدایە بۆتان، هەزارو ئاتاجانیش لەدونیادا سودێکی زۆر لەگۆشتەکەی وەردەگرن، پێش سەربڕینشیی سوودی هەمە جۆری هەیە دەیکەنە وڵاغی سواری، شیری دەدۆشن سوود لەکوڵك‌و بێچوەکانی وەردەگرن!

وشەی (بدن) بەلای ئەبو حەنیفەو برێك لەهاوەڵانی پێغەمبەرو ﷺ کۆمەڵێك لەتابعینەکان بەحوشترو رەشە وڵاغ دەگوترێو ناوە بۆ هەردوکیان.

ئیمامی موسلیم لەجابیرەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: ئێمە بۆ حەوت کەس (البدنة) ئاژەڵە زەبەلاحێکمان سەربڕی. وتیان: رەشە وڵاغیش بەکەڵکی قوربانی حەوت کەس دێ؟ جابیر دەفەرموێ بۆ رەشە وڵاغ جەستە گەورە نیە؟.

ئیبنوعومەر دەفەرموێ: بەلای ئێمەوە (بدن) بریتییە لەحوشترو رەشە وڵاغ.

بەلای شافیعیەوە (البدن) تەنها بەحوشتر دەگوترێ بەمەجاز نەبێ بۆ رەشە وڵاغ ناگوترێ. تەنانەت ئەگەر کابرایەك (بدنة)میەك لەسەر خۆی نەزر بکا بیکاتە قوربانی، ئەگەر رەشە وڵاغێك بکاتە قوربانی بەکەڵك نایەو نەزرەکەی لەسەر لاناچێ. چوونکە قورئان دوو دیاردەی بەیان کردون دەفەرموێ: (صواف) دەفەرموێ ﴿وَجَبَتْ جُنُوبُهَا﴾ ئەم دوو دیاردانە تایبەتن بەحوشترەوەو تەنها حوشتر بەحەواوە سەردەبڕردرێ، هەروەها ئەبوداودو هی تریش لەجابیرەوە فەرمودەیەك ریوایەت دەکەن دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((البدنة عن سبعة والبقرة عن سبعة)) عەطف بەواو نیشانەی جوداوازی نێوان (بدنة) و (بقرة) یە.

قسەکانی جابیرو ئیبنو عومەریش تەئویل دەکرێن بەوە: کەحوکمەکەیان یەکەو هەردووکیان بەکەڵك دێن لەجیاتی حەوت کەس سەر ببڕێن

﴿فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ﴾ لەکاتی سەربڕینی ئەو ئاژەڵە زەبەلاحەداو لەو کاتەدا کەسێ قاچەکانی راست دەوەستێندرێنو قاچێکی هەڵدەبەسترێو دەتانەوێ سەری ببڕن ناوی خودای لەسەر بهێنن بڵێن: ((بسم الله والله أكبر)) بەناوی خوداو هەر خودا گەورەو بەرێزە، خودایە لەتۆوەیەو بۆ تۆیە.

﴿فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ﴾ جا کەکەوتە سەرزەویو گیانی دەرچوو سارد بۆوە لێی بخۆن. واتە: حەڵاڵە بۆتان لێی بخۆن. هەروەها گۆشتەکەی دەرخواردی هەژارو سواڵکەر بدەن: بەشی ئەوانەی لێ بدەن:

کەهەژارن‌و رویان نایە سوالّ بکەن، هەروا ئەوانەش کەداوا دەکەن‌و دەست پان دەکەنەوە.

کەدەفەرموێ: ﴿فَكُلُوا مِنْهَا﴾ فەرمانەکە بۆ وجوب نیە بەلّکوو بۆ ئیباحەیە. ئیمامی مالیك دەفەرموێ: سوننەتە لێی بخۆن. هەندێ لەزانایان دەفەرموون فەرمانەکە بۆ وجووبەو پێویستە لێی بخۆن.

وەلێ پێشینە صالّحەکان کۆڕایان هەیە لەسەر ئەوە: کەلێخواردن لەقوربانی‌و کوشتی واجب نیە، بەلّکوو لێخواردنەکەی ئەوەیە ئەو دابو نەرێتەی سەردەمی نەفامی لابەرێ: کە لەکوشتی‌یەکانیان نەدەخوارد. کەدەفەرموێ: ﴿وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ﴾ ظاهیری ئایەتەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کەپێویستە لەگۆشتی قوربانی بەشی هەژاران بدرێ، ئەو ئاژەڵە دیاریکراوە بەدیاری بردراوەی سەردەبڕێ گۆشتەکەی لێی بدرێ بەناتاجان ئەمە رای شافیعی‌یە.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: دەرخواردانی گۆشتی کوشتیەکە بەهەژاران سوننەتەو واجب نیە، چونکە خوێن رژاندنەکە خوێنی نوسوکەو نزیکبونەوە لەخودا مەبەستەو ئەوەیش بەسەربڕینەکە دێتەجێ. ئیتر دەرخواردانی گۆشتەکە بەهەژاران لەسەر حوکمە گشتی‌یەکەی ماوەتەوەو مەندوبە.

﴿كَذَلِكَ سَخَّرْنَاهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ ئابەو جۆرە ئەو ئاژەڵە بەهێزو توانایەمان بۆ ئێوە ژێربار کردوە، بەئارەزوی خۆتان دەیاندۆشن، باریان لێ باردەکەن دەیانکەنە ولاّغی سواری، دەیانکەنە دیاری‌و قوربانی سەریان دەبڕن لێیان دەخۆن‌و بەشی هەژارانی لێ دەدەن. بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خودای لەسەر بکەن، شوکرانە ژمێری نیعمەتەکانی بن، بەطاعەت‌و بەندایەتی خۆی لێ نزیك بکەنەوە، دلّسۆز بن لەخودا پەرستیەکەتان دا. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ، وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ (یس/٧١-٧٣) هەرگیز نەگۆشتی

ئەو سەربڕاوانە نەخوێنەکەیان بەخودا ناگا، وامەزانن ئەوکارمتان سود بەخودا دەگەیەنێ ئەمجار پەروەردگار مەبەست لەئاژەڵ سەربڕینەکە رون دەکاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا﴾ دەفەرموێ: ﴿وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ﴾ بەڵکوو تەقواو دڵسۆزیو فەرمانبەرداریی ئێوە بەخودا دەگا، کردەوە باشەکانتان بۆلای خودا بەرز دەبێتەوە..! ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنوجورەیجەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: عەرەبەکان لەسەردەمی پێش ئیسلام دا: کەقوربانییان سەردەبڕی گۆشتەکەیان بەدیواری کەعبەدا دەداو خوێنەکەیان تێ هەڵدەسوو هەروەها هەندێ لەگۆشتەکەیان دەخستە سەر بتەکانیان‌و بەخوێنەکەی رەنگیان دەکردن، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وتیان: ئێمە شیاوترین بەوەی گۆشت‌و خوێنی قوربانییەکانمان لەدیواری کەعبە هەڵسووین. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

ئەمجا پەوەردگار جارێکی دی نیعمەتی ژێربارکردنی ئەو ئاژەڵانە بۆ ئادەمیزاد دووبارە دەکاتەوە چونکە لەدووبارە کردنەوەکەدا یادخستنەوەی نیعمەتەکانی خودا هەیە بەسەر بەندەکانی داو هەڵنانی تێدایە بۆ زێدە سوپاسکردن‌و شوکرانە بژێری بەندەکانی‌و دەفەرموێ: ﴿كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ﴾ هەر بەو جۆرە ئەو ئاژەڵانەی بۆ ئێوە ژێربار کردوە، دەتوانن بەچەند جۆرێك سوودیان لێ وەربگرن، بۆئەوەی تەعظیم‌و تەقدیسی خودا بکەن‌و شوکرو سوپاسی بکەن، لەسەرئەوەی خودا هیدایەتی داون بۆ ئایین‌و شەریعەتی پیرۆزی، جڵەوگیری لێ کردون لەوشتانەی پێی ناخۆشەو زیانی ئێوەی تێدایە!

﴿وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەی موحەممەد! مژدە بدە بەوانەی کاری چاك دەکەن‌و لەسنوورو پاوانی خودا دەرناچن‌و شوێن یاساو شەریعەتی خودا دەکەون‌و پابەندی جڵەوگیری‌و فەرمانەکانی خودان‌و بڕوایان بەپەیامی پێغەمبەر ﷺ کردوە.

ئاوا بەو جۆرە موسوڵمان هەموو کاتێ دەبێ بەخوداوە پەیوەست بێ، هەنگاوێك ناهاوێ لەژیانیا، لەشەوو ڕۆژدا هەڵس‌و کەوتێك نانوێنێ، جەو جوڵێك ئەنجام نادا ئیللا دەبێ مەبەستی خودا بێ، ڕەزامەندی خودای تێدا ڕەچاو بکاو دڵی بەتەقوای خوداوە خەریك بێ! ئیتر ئەوکاتە ژیانی هەمووی خودا پەرستی دەبێ‌و ژیانەکەی گونجاو دەبێ بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بکاتەوە. لەسەر زەوی دەژی‌و دڵی پەیوەستە بەئاسمانەوە.

**دەربارەی قوربانی، شەرعزانان ڕاجیاییان هەیە:**

١- ئەبو حەنیفەو (الثوری)و ئیمام مالیك پێیان وایە: هەرکەسێك سامانی ئەوەندە هەبوو زەکاتی لێ بکەوێ قوربانی لەسەر واجبە، بەڵام ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: بەمەرجێك جێ نشین بێ‌و سەفەریی نەبێ، بەلگەشیان ئەو فەرمودەیەیە: کەئەحمەدو ئیبنوماجە لەئەبو هورەیرەوە ریوایەتیان کردوە بەمەرفووعی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((من وجد سعة فلم يضح، فلا يقربن مصلانا)).

تیرمیذی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەساڵ لەمەدینە بوو، هەموو ساڵێ قوربانی دەکرد.

٢- جەماوەری زانایان رای مەشهوری مالیکیەکانیش بۆ غەیری حاجی لەمینا دەفەرمون: قوربانی واجب نیەو سوننەتە. بەلگەیان ئەو حەدیثەی پێغەمبەرە ﷺ کەدەفەرموێ: ((ليس في المال حق سوى الزكات)).

هەروەها چونکە پێغەمبەر ﷺ لەجیاتی ئوممەتەکەی قوربانی کردوەو (واجب)یەتەکەی لەسەر لابردون. فەرموشیەتی: قوربانی سوننەتی بابە گەورەتان حەزرەتی ئیبراهیمە عليه السلام.

ئەبوسورەیحە دەفەرموێ: من هاوسێی حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەر بووم رضي الله عنهما قوربانیان نەدەکرد نەوەکوو خەڵکی چاویان لێ بکەن.

ئیمام ئەحمەدو (الحاکم)و داره قوطنی لەئیبنو عەبباسەوه ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: لەپێغەمبەرم ﷺ ژنەوت دەیفەرموو: ((ثلاث عليّ فرائض وهن لكم تطوع الوتر والنحر والصلاة الضحى)) تیرمیذی فەرمودەیەکی تری ریوایەت کردوه؛ دەفەرموێ؛ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی فەرمانم پێ کراوه قوربانی بکەم، قوربانی کردن بۆ ئێوه سوننەتە.

## پارێزگاری کردنی خودا لەموسوڵمانانو هۆکارەکانی رەوابوونی شەڕ

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ

﴿ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾

بۆ سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٣٨) ریوایەت كراوە كەموسوڵمانەكان لەمەككەدا زۆر بوونو كافرەكان دەستیان كرد بەئەزیەتدانیانو هەندێكیان كۆچیان كرد بۆ وڵاتی حەبەشە، ئیتر هەندێ لەموسوڵمانەكانی مەككە ویستیان بەدزیەوە دەست بوەشێننو هەندێ لەكافرەكان تیرۆر بكەن، ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو..!

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٣٩) ئەحمەدو تیرمیذیو بەجوانیشی داناوە، هەروا نەسائیو حاكم (بەصەحیحیشی داناوە)و ئیبنو سەعد لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان كردوە فەرموی: پێغەمبەر ﷺ لەمەككە دەرچوو، ئەبوبەكر فەرموی: ئەمانە پێغەمبەرەكەی خۆیان دەركردوە ﴿إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّـا إِلَيْهِ رَاجِعونَ﴾ سوێندم وابێ دەفەوتێن. ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ كرد: كەدەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّـذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾.

**پەیوەندیی نێوان ئەم كۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم بارەوەیە:**

كەپەروەردگار لەوە پێش ئەوەی رون كردوە: كەكافرەكان موسوڵمانانیان لەئایینی خودا مەنع كرد، نەیانهێشت لەناو مەككەدا دانیشن، هەروەها باسی مەناسیكی حەجی كردو سوودو قازانجی ئایینیو دونیایی رون كردوە، ئەمجار باسی ئەو شتانە دەكا: كەكۆسپو تەگەرەكان رادەماڵێو رێگای خودا پەرستی ئاچوغ دەكا.

بەڵێ: ئەو شەعائیرو عیبادەتانە پێویستیان بەپارێزگاریی لێ كردن هەیە، دەبێ هێزێك هەبێ ئەو لەمپەرو كۆسپو تەگەرانە لەبەردەم خودا پەرستان دا لابەرێ، نەهێڵێ دەستدرێژی بكرێتە سەر ئازادیی بیرو باوەڕو عیبادەتیان؛ نەهێڵێ:

پیرۆزیـی مزگـەوتو پەرسـتگاو شـەعائیری موسـوڵمانان پێـشێل بکـرێ. پێویـستە بارودۆخ والێ بکرێ موسوڵمانان بتوانن بەرنامـەی ژیـانی خۆیـان کەلەسـەر بنـەمای بیرو باوەڕ دامەزراوە دەستەبەر بکەنو ئایینی خودا لەسەر زەوی جێگیر بکەن.

بـۆ ئـەم مەبەسـتانە ئیزنـی موسـوڵمانان درا ـ دوای کۆچکردنیان بـۆ مەدینـە ـ کـەدژی موشـریکەکان بجـەنگێن، بــۆ ئــەوەی بــەرگری لــەخۆیانو لەعەقیــدەو بەرژەوەنـدی دیـنو دونیـای خۆیـان بکـەنو دەسـتی دەسـتدرێژکاران ببڕنــەوە. بـۆ خۆیانو بۆغەیری خۆیان ئازادیی ئایینیو بیروباوەڕ دەستەبەر بکەن.

دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنْ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ بێگومـان پـەروەردگار شـەڕی شـەڕ خـوازان لـەو بەنـدە خـاوەن باوەڕانـەی خـۆی دوور دەخاتـەوە: کەپـشتیان بـەخودا بەسـتووەو بـۆلای ئـەو گەڕاونــەوە، پارێزگارییـان دەکـاو یارمـەتییان دەدا، بەسـەر دوژمنانی خۆیو ئەوان دا سەریان دەخا. وەکوو لەشوێنێکی تـردا دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾ (غافر/٥١).

یان دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ﴾ بێگومـان پـەروەردگار هـیچ کاتێ خائینو کافرو سپڵەو پێ نەزانی خۆش ناوێن. مەبەست ئەوەیـە: موسـوڵمانان خۆشەویستی خودان. وەخودا دوژمنانیان سـزا دەدا.یـان دەفـەرموێ: ﴿وَمَـن يَتَوَكَّـلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَـدْ جَعَـلَ اللَّـهُ لِكُـلِّ شَـيْءٍ قَـدْراً﴾ (الطـلاق/٣) بێگومان هێزی شەڕو گومڕا هەمیشە لەکردو کۆدانو خـەریکی نانـەوەی ئاشـووبو بەرپاکردنی شەڕو فیتنەیین، جەنگی نێوان خێرو شەڕ بەردەوامەو درێژەی هەیـە. شەڕ سەرکەشو ملهوڕو چەکدارو پەلاماردەرە، خاوەن هێـزو توانـای هەمـە جـۆرە!! بۆیــە پێویــستە بۆئیمــانو خێــرو حــەقو راسـتی، هێزێـك هـەبێ بیانپـارێزێو پشتیوانیان لێ بکاو فیتنـەییو شـەڕو شـوڵیان لێ دوور بخاتـەوە. ئیرادەو مەشیئەتی خـودا وانــەبووەو وانــەهاتووە: کــەواز لــەئیمانو خێــرو حــەق بهێنــێ بەتــەنیا بەرەنگاریی هێزی شەڕو طوغیان ببێتەوە، چونکە ئەو هێزو توانـا مادییـەی بـەتاڵ

هەیەتی لەوانەیە تەنگ بەو بیرو باوەڕە چەسپاوەی ناو دڵان هەڵچنێو لەسەر سروشتی خۆیان لایان بدا، هێزو توانای ئادەمیزاد ئەندازەیەکی هەیەو بەکۆتا دێ، خوداش بۆخۆی لەهەموو کەس ئاگادارترە بەناوەرۆکی ناو دڵانو ئەندازەی وزەو توانایان. بۆیە نەیویستوەو نایەوێ موسوڵمانان بخاتە سەنگەری روبەروبوونەوەی کوفرو بێدینیو فیتنە ئیللا پاش ئامادەبوونیان بۆ بەرەنگاریی بوونەوە. کەهێزو توانای بەرەنگار بوونەوەیان تێدا پەیدا بوو، چەکی پێویستو جەنگاوەری تەواوو زەمینەی سەرکەوتن رەخسا، ئەو کاتە رێگا دەدا موسوڵمانان شەڕ بکەنو دەستی دەستدرێژکەر بقرتێنن.

ئەم ئایەتەیان هەڕەشەی لەخۆ گرتووەو سەرەنجامی رێگرانی مەسجیدولحەرام روون دەکاتەوە، ئەوانەی پێش ئایەتەکانی حەج باس کردن. کەوابێ ئەم ئایەتە پەیوەستە بەئایەتی ژمارە (٢٥) وە کەدەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ.....﴾ یان وادەو بەڵێنە بەو موسوڵمانانەی تینووی بینینی حەرەمی پیرۆز بوون، کەکافرەکان مەککەیان لێ قەدەغە کردبوون. ئیتر ئەوکاتە ئایەتەکە پەیوەست دەبێ بەپێش خۆیەوە. بێگومان کافرەکان پێغەمبەریان ﷺ لەمەککە دەرکردبوو لەزێدو نیشتمانی خۆی وەدەریان نابوو، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا: کە مەککەی جێ هێشتو لێی چوەدەر ئاوڕی لێ دایەوە فەرموی: ((واللە انك لأحب ارض اللە الیَ، وانك لأحب ارض اللە الی اللە، ولولا ان اهلك اخرجونی منك ماخرجت)) سوێند بەخودا ئەی مەککە! ئەتۆ خۆشەویسترین خاکی لای من، لەلای خوداش رێزدار ترین وڵاتی، ئەگەر دانیشتوانەکانت دەریان نەپەڕاندمایە بەجێم نەدەهێشتی.

وادیارە ئایەتەکە وادەو بەڵێنو موژدەیە بۆ موسوڵمانەکان بەوە کەخودا بەسەر دوژمنانیاندا سەریان دەخا، لەهەمان کات دا هەڕەشەی لەکافرەکان لەخۆ گرتووەو رێخۆشکەرەو پێشەتایە بۆ رێگە پێدان بۆ جیهاد!

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا﴾ ڕێگە دراوە بەو موسوڵمانانەی دەستدرێژییان کراوەتە سەرو ستەمکاران ستەمیان لێ کردون، لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەریان ناون، ماڵو سامانیان داگیر کردون، ئەزیەتیان داون، بەلێدانو قسە پێگوتنو هەڕەشە لێ کردن، ژیانیان لێ تاڵ کردون، جا لەوکاتەدا کەموسوڵمانەکان لەم بارو دۆخە ناخۆشەدا دەژیان، دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرو شکایەتی وەزعی خۆیان لای پێغەمبەر ﷺ دەکرد ئەویش فەرمانی پێ دەکردن: کە خۆڕاگر بنو بەئارام بنو پێی دەفەرموون: مـن ڕێگای شەڕ لەگەڵ کردنیانم نیە. جا کەپێغەمبەرو هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ مەدینە ساڵی دووەمی کۆچی ئەم ئایەتە نازڵ بوو.

بەڕای زوربەی زانایانی سەلەفی وەکوو ئیبنوعەبباسو عائیشەو موجاهیدو ضەحاكو عوروەی کوڕی زوبەیرو زەیدی کوڕی ئەسلەمو موقاتیلو قەتادەو زوهری ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتە دەربارەی شەڕو جیهاد نازڵ بووە، پێش ئەم ئایەتە لەحەفتاو ئەوەندە ئایەتەدا نەهی لەشەڕ کردوە.

ئیبنوجەریر لەئەبولعالیەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: یەکەم ئایەتی شەڕ ئایەتی ﴿وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ (البقرة/ ١٩٠).

لە (الاكليل)ی حاکمدا هاتووە دەفەرموێ: یەکەم ئایەتێك کە دەربارەی شەڕ نازڵ بووە، ئایەتی ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ﴾ (التوبة/١١١) بووە.

بەکورتی مەبەست بەئایەتی ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ......﴾ ڕونکردنەوەی ئەو هۆکارانەیە: کەبوونە هۆکاری ڕێگە پێدانی موسوڵمانان بۆ شەڕ کردنو بەگژدا چوونەوەی ستەمکارانو بەرگری لەخۆ کردن. چونکە بێگومان موشریکەکانی مەککە زۆریان ئەزیەتی پێغەمبەر ﷺ دا، بەهەموجۆرو شێوەیەك تەنگیان پێ هەڵچنی، ئازاری ئەدەبی جەستەییان پێ گەیاند، وتیان: شاعیرە، ساحیرە خۆڵو زبڵیان بەسەر سەریدا کرد.

له‌كاتێك دا سوژده‌ی بۆ خودا بردو ریخۆڵه‌ی ئاژه‌ڵو پیساییان خسته سه‌رشانو ملی پیرۆزی، هۆزی ثه‌قیف هانی نه‌فامو گه‌نجه‌كانی خۆیان دا بـه‌ردبارانی بكه‌ن، جه‌سته‌یان له‌خوێن دا شه‌لاڵ كرد، هه‌روا ئه‌زیه‌تی هاوه‌ڵانی پێغه‌مبه‌ریان ﷺ دا، به‌لێدانو كوشتنو بڕین، به‌سووكایه‌تی پێكردنو هه‌ڕه‌شه لێكردنو ترساندنو ده‌نگ لێ دابڕین؛ هه‌ندێكیان له لبه‌لانی مه‌ككه‌دا به‌گه‌رمای هاوین خستنه به‌ر ئازارو ئه‌شكه‌نجه، له‌ناو ئه‌و لبه گه‌رمه‌دا رایان ده‌كێشانو به‌ردی گه‌وره‌یان ده‌خستنه سه‌رسنگ بۆئه‌وه‌ی له‌ئایین پاشگه‌ز ببنه‌وه. به‌لام ئازارو ئه‌شكه‌نجه دادی نه‌دانو خودا په‌رستان ئیمانیان به‌هێزتر بوو، هه‌ردیانگوت: (احد، احد، احد) !!

ئه‌مجار په‌روه‌ردگار واده به‌و موسوڵمانه سته‌م لێكراوانه ده‌داو ده‌فه‌رموێ: ﴿وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ بێگومان په‌روه‌ردگار هه‌ر ئه‌وه ده‌توانێ یارمه‌تی به‌نده‌كانی بدا، ده‌توانێ به‌بێ شه‌ڕیش به‌نده‌كانی به‌سه‌ر دوژمنانیان دا سه‌ربخا.

لێره‌دا پرسیارێك له‌لایه‌ن هه‌ندێ كه‌سی دڵ كرمێو تێنه‌گه‌یشتووه‌وه دێته ئاراوه‌و ده‌گوترێ: په‌روه‌ردگار له‌وه‌پێش فه‌رمووی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا....﴾ ده‌ی كه‌سێك خودا دیفاعی لێ بكا كێ ده‌توانێ سته‌می لێ بكا؟ كه‌سێك خودا یارمه‌تیده‌رو پارێزه‌ری بێ سه‌ركه‌وتنی به‌سه‌ر دوژمنانی دا مسۆگه‌ره، كه‌وابێ له‌پێی چی شه‌ڕبكه‌نو بریندار بنو بكوژرێن؟ بۆچی برسیو تینوو ببنو زه‌حمه‌تو ناڕه‌حه‌تی بچێژن... بۆ بۆ؟

خۆ سه‌رئه‌نجام ئاشكرایه‌و خودا ده‌توانێ ئاكامی باشو سه‌روه‌ریی بۆ به‌نده‌كانی ده‌سته‌به‌ر بكا به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ ماندو بوونێكیان توش ببێ. وه‌لامی ئه‌م پرسیاره سافیلكانه‌یه، ئه‌وه‌یه ده‌ڵێن: حیكمه‌تی خودا بالادسته‌و خودا بۆ خۆی زاناو بینایه، ده‌زانێ چی له‌به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌وان دایه، ئه‌وه‌ی: كه‌ئێمه‌ی ئاده‌میزاد په‌ی پێ ده‌به‌ینو دێته ناو كه‌مه‌ندیی هه‌ستو شعوورمانه‌وه ئه‌وه‌یه: په‌روه‌ردگار خواستی وانه‌بووه‌و نابێ كه‌هه‌ڵگرانی په‌یامه‌كه‌ی كۆمه‌ڵێك كه‌سانی ته‌نبه‌ڵو ته‌وه‌زه‌ل بنو پاڵی لێ بده‌نه‌وه‌و سه‌ركه‌وتن به‌سه‌ریان دا بباریو به‌ئاسانی بالادست ببن، هه‌ر

لەبەر ئەوەندە نوێژ دەکەنو قورئان دەخوێننو رودەکەنە خوداو کەتوشی نارەحەتیو ئەشکەنجەدان هاتن لێی بپاڕێنەوە..؟

بەڵێ نوێژ کردن واجبەو قورئان خوێندن پێویستە، روکردنە خوداو پاڕانەوە لێی لەکاتی خۆشیو ناخۆشی دا ئەرکی سەرشانی موسەڵمانە، وەڵێ ئەم عیبادەتانە بەتەنیا نایانگەیەنێتە پلەو پایەی ئەوەی شیاوی ئەوە بن ببن بەهەڵگری بانگەوازیی ئایینی خوداو پاراستنی!

نوێژو روکردنە خوداو پاڕانەوە لێی تێشووی گیانن بۆ شەڕی بەرامبەریو روبەروبوونەوە. زەخیرەو تێشووە بۆ جەنگەکە، چەکی بەکاری موسوڵمانانە بۆ هەر شەڕو ئاژاوەیەك: کەلەدژی بەرپای دەکەن!

دەبێ چەکی بەرامبەریان هەبێو بەچەكو ئامێری بەرامبەر بەرەنگاریی دوژمن ببنەوە، لەهەمان کات دەبێ چەکی خودا پەرستیو سیلاحی تەقواو ئیمان بەخودایان هەبێ بۆ بۆڕدانی دوژمن.

بێگومان ویستی خودا واهاتووەو وای داناوە: کەدیفاع کردنی موسوڵمانان دەبێ لەڕێگەی خۆیانەوە ئەنجام بدرێ، بۆئەوەی لەناوجەرگەی روبەرووبوونەوەو لێکدانو کێ بەرکێ کەدا کامڵ ببنو قاڵ ببن. چونکە بوونیەی ئادەمیزادی هەموو هێزو وزەیەکی خۆی ناخاتە کارو بەخەبەر نایە، مەگەر کاتێك: کەتووشی خەتەر دەبێو روبەروی دوژمن دەبێتەوە، ئەوکاتە هەموو خانەیەکی لەشی، هەموو دەمارو هەستو هێزو وزەیەکی رۆڵی خۆیان دەبینن، هەموو هێزو توانایەکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دوژمن.

ئەو تاقمو کۆمەڵو گەلانەی بانگەوازی ئیسلامی ئەنجام دەدەن پێویستیان بەوەگەڕخستنی هەموو خانەو هێزو وزەیەکە، دەبێ هێزو توانایان کۆ بکەنەوەو هەموو ئامادەباشی خۆیان بۆ ڕوبەڕوبوونەوەکە بەکاربهێنن.

دەی سەرکەوتنی خێراو بێ ماندو بوون، سەرکەوتنێك کەبەئاسانی نازڵ ببێ بۆسەر گەلو نەتەوەیەکی پاڵ کەوتوو خۆلێسەوە، هێزو تواناکان ماتەڵ دەکا دەیانپوکێنێتەوەو خۆیان نانوێنن‌و گەشە ناکەن.

سەرباری ئەوەش سەرکەوتنی سەریع‌و ئاسان‌و بێ ماندوو بوون‌و بێ قوربانی دان، بەئاسانی لەدەست دەچێ! یەکەم چوونکە سەرکەوتنەکە بەئاسانی دەست کەوتووەو قوربانی تێدا نەدراوە. دووەم چونکە ئەوانەی ئەو جۆرە سەرکەوتنەیان دەست کەوتووە هێزو تواناکانیان رام نەکردون بۆ پارێزگاری لێ کردنی. کوردی گوتەنی (کەرێك بەپارەی بەفر بکردرێ ئاو دەیبا!).

شتێکی تری گرنگ هەیە، ئەویش تەربییەی ویژدانی‌و رام کردنی عەمەلی یە، کەلەسەرکەوتن‌و تێکشکانەوە سەر هەڵدەدا، ئەو ئەزمون‌و تاقیکردنەوانەی تووشی موسوڵمانان دەبن لەئاکامی هێرش بردن‌و کشانەوە، پێشرەوی کردن‌و گیر خواردن‌و تێکشکان‌و ئەو هەست‌و شعورەی لەم شتانەوە سەر هەڵدەدەن.. هەروا ئەو هیواو ئاوات‌و ئێش‌و ئازارانەی دێنە سەر رێیان، خۆشی‌و ناخۆشی‌و ئارامی‌و دڵەڕاوکێ هەست کردن بەهێزو بێ هێزی لێ ووردبوونەوە لێیان‌و کەشف کردنی خاڵی زەعیف‌و بەهێز، پڕکردنەوەی خاڵە لاوازەکان‌و رێکخستنی کارەکان لەهەموو حاڵەتەکان دا هەموویان، دەبنە هۆکاری قاڵ کردنی موسوڵمانان‌و لەبۆتە دانیان!

لەبەر ئەم هۆیانەو چەند هۆیەکی تر کەخودا بۆخۆی دەیانزانێ، خودا وای داناوە کەدیفاعکردنی خۆی لەبەندەکانی لەرێگەی خۆیانەوە ئەنجام بدرێ، دەبێ لەئاکامی تێکۆشان‌و قوربانیدانی خۆیانەوە دەستەبەر بێ.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ: کە ئیسلام هەرگیز شەڕ بەئامانج‌و مەبەست نازانێ، رێگەی شەڕ نادا مەگەر بۆ مەبەستێکی گەورەترو پیرۆزتر لەهودنەو ئارامی بێ.

چونکە گومان لەوەدا نیە ئاشتی‌و تەبایی و ئارامی راستەقینە هەدەفی ئیسلامەو بۆی تێدەکۆشێ وەکوو چەندجار لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێ کراوە، وەڵێ ئاشتی‌و ئارامییەك ستەم‌و دەستدرێژی کردنی تێدا نەبێ، کەس

ماف کەس پێشێل نەکا، بەڵام هەرکاتێ دەستدرێژی کرایە سەر موقەددەسات‌و (مقومات) ی ئادەمیزاد: ئازادی بیرو باوەڕو ئازادی خودا پەرستی‌و عەداڵەتکاری لەبڕیارو تۆڵە ساندنەوەو دابەشکردنی مافو ئەرك دا، ئەوە ئیسلام ڕێگەی داوە، بەڵکوو بەپێویستی داناوە: کەشەڕ بەرپا بکرێ بۆ گێڕانەوەی ئازادی‌و هەموو مافە زەوت کراوەکانی ئادەمیزاد. بەکورتی‌و پوختی دونیا شوێنی تاقیکردنەوەو لەبۆتەدانە، موسوڵمانان دەبێ جیهاد بکەن‌و تێبکۆشن‌و لێهاتوویی خۆیان بچەسپێنن، چونکە پاداش پەیوەستە بە کردەوەوە، چی دەچێنی ئەوە دەدرویەوە. نابێ چاوەڕوانی ئەوە بن بۆ خۆیان پاڵی لێ بدەنەوەو خودا سەرکەوتن‌و شکۆمەندییان بەسەردا ببارێنێ! زوربەی زۆری موفەسیرین پێیان وایە: ئەم ئایەتە وادە پێدانی موسوڵمانانە بەسەرکەوتن‌و جەخت کردنەوەی مانای ئایەتی پێشووە کەوادەی دیفاع کردن‌و پارێزگاری کردنی لەموسوڵمانان دا، ئەوە روون دەکاتەوە: کەئەو وادەیەی لەئایەتی پێشوودا داویەتی بەموسوڵمانەکان هەر ئەوەندە نیە لەچنگی دوژمنەکانیان رزگاریان بکاو بەس، بەڵکوو بەسەر ناحەزانیشیان دا سەریان دەخا. جاری وادەبێ ئەم سەرخستن‌و یارمەتیدانەی خودا بۆ بەندە موسوڵمانەکانی دوا دەکەوێ لەبەر حیکمەتێك کەخودا خۆی دەیزانێ.

یارمەتیدان‌و سەرخستن دوا دەخا چونکە هێشتا موسوڵمانەکان قاڵ نەبوون‌و لەبۆتەدانیان تەواو نەبوە. یارمەتی دانی خۆی دوا دەخا بۆئەوەی موسوڵمانان چی هێزو توانایان هەیە بەکاری بێنن‌و دوا وزەی خۆیان بخەنە گەڕ.. هیچ شتێك نەمێنێ لەڕێگەی خودا ئیللا صەرفی بکەن!

خودا نەصری خۆی دوا دەخا تا موسوڵمانان دوا هێزی خۆیان خەرج بکەن دڵنیا بن: کەبەهێزو توانای خۆیان، بەبێ پاڵپشتی خودا سەرکەوتن بەدەست ناهێنن: سەرخستن‌و یارمەتیدان دوا دەکەوێ بۆ ئەوەی موسوڵمانان زیاتر پەیوەندییان بەخوداوە بەهێز ببێ، چونکە ئازارو ئەشکەنجە دەچێژن‌و جگە

لەخودا پشتیوانێکیان دەست ناکەوێ. بۆئەوەی بگەنە ئاستێك تەنها روو لەخودا بکەنو پشت بەئەو ببەستن!

لەبەر ئەم هۆیانەو چەندەها هۆی تریش: کەئێمە پەییان پێ نابەین، خودا یارمەتیدانی خۆی دوادەخا ئیتر قوربانیو خۆ بەخت کردنیان دوو چەندانە دەبێتەوە، ئازارو ئەشکەنجەکانیان زۆرترو بەتین تر دەبن، هەتا لەئاکام دا خودا سەریان دەخاو لەکاتی گونجاودا سەروەریی بەدەست دەهێنن، گیانو جەستەو ویژدانیان ئامادەباشی لەخۆگرتنی ئەو سەرکەوتنەیان تێدا دەبێو لەززەتو خۆشی لەو سەرکەوتنە دەبینن هەڵبەتە سەرکەوتنو پیرۆزی، تەکالیفو ماندووبوونی خۆی دەوێ، دەبێ زەمینەی بۆ خۆش بکرێو دڵو دەروونەکان رام کرابن بۆ لەخۆ گرتنی ئەو سەروەریو پیرۆزییەی کەبەدەستیان هێناوە.

بێگومان خودا یارمەتی ئەو کەسانە دەدا کەشیاوی یارمەتی دانن، خودا بەهێزو توانایەو بالادەستە بەیارمەتیدانی بەندەکانی ماندو نابێ. بەلام پێویستە بزانرێ ئەوانە کێن: کەخودا یارمەتییان دەداو سەریان دەخا؟

بۆ دیاری کردنی حالی ئەو موسولمانانەی کە خودا کۆمەکییان پێ دەکا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلاَّ أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ﴾ واتە: ئەو موسولمانانەی ستەمیان لێ کراوە، ئەوانەی موشریکەکان لەمەککە دەریان پەڕاندن بۆ مەدینە بەبێ حەقو عەدالەت. ئەوانە حەزرەتی موحەممەدﷺ و هاوەلانی بوون، هیچ خراپەیەکیان نەبوو جگە لەوەی خودا پەرستیان دەکردو یەکتاپەرست بوون، دەیانگوت خودای ئێمە (الله) یە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يُخْرِجُونَ الرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ أَن تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ رَبِّكُمْ﴾ (الممتحنة/١) یان دەربارەی (اصحاب الاخدود) دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَقَمُوا مِنْهُمْ إِلَّا أَن يُؤْمِنُوا بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (البروج/٨) دەرکردن لەزێدو نیشتمان بەناحەق، یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکیانەی لەپێناویدا موسولمانان شەڕ دەکەنو گیانی خۆیان لەو رێبازەدا بەخت دەکەن!

ئـەمجار پـەروەردگار هۆكـارێكی دی لەوهۆكارانـەی شـەڕیان لـەپێناودا دەكـرێ دیاری دەكا، ئەویش ئازادی عیبـادەتو خـودا ناسـیو پاراسـتنی شـوێنە پیرۆزەكانـە: دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّـاسَ بَعْـضَهُمْ بِـبَعْضٍ لَهُـدِّمَتْ صَـوَامِعُ وَبِيَـعٌ وَصَـلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً﴾ ئەمە یاسای كێبەركێو دانو سانە، بەمەبەسـتی لەنگەر راگرتنی نێوان ئـادەمیزادو راگەیانـدنی ئـەو یاسایەیە: كەشـەڕو خۆبـەخت كردن لەپێناو چەسپاندنو دەستەبەركردنی ئازادیی عیبادەت كردن بەڕەوا دادەنـێ، دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە: كەخودا بـەرگری لەهەنـدێ ئـادەمیزاد دەكا بەهەندێكی تریان بەم رەنگـە خـاوەن بـاوەڕانی زاڵ دەكا بەسـەر بـێ باوەڕەكان دا، شـەڕو شـۆڕی هەنـدێكیان لەهەنـدێكیان دوور دەخاتـەوە، هـەروەها ئەگـەر خـودا شـەڕكردنی لـەپێناو پارێزگـاری لەنـەفسو شـوێنە پیرۆزەكـان دا بـەڕەوا دانـەنایاو لەسەر موسوڵمانانی پێویست نەكردایە، هەموو پەرستگاو شـوێنە پیرۆزەكـان وێـران دەكـران، پەرسـتگا تایبەتیـەكانی رەبەنـەكانو پەرسـتگا گـشتیەكانی نەصـاراو پەرستگاكانی جولەكەو مزگەوتەكانی موسوڵمانان وێران دەكرانو چۆڵ دەبوون.

(صوامع) كۆی (صومعة) یە خەڵوەتخانەی راهیبەكانە. (بیـع) كـۆی (بیعـة) یـە پەرستگای گشتی نەصارایە (صلوات) كڵێسەی جولەكەكانـە بـەزمانی عیـبری پێـی دەڵێن: (صلوتا) ئیتر وشەكە تەعریب كراوە.

(مساجد) كۆی (مسجد)ە واتە مزگـەوتی موسـوڵمانان. ئەگـەر پارێزگـاری خـودا نەبێ ئەم شوێنە پیرۆزانە هەموویان لەوانەیە بڕوخێنرێنو وێران بن، بێ بڕوایـان كۆ لـەوە ناكەنـەوە ئـەم شـوێنانە پەرسـتگای خـودای مـەزننو نـاوی خودایـان تێـدا دەهێنـدرێ، ئەگـەر بـەرگری كردنـی پـارێزەرانی عەقیـدە نەبوایـە بـەتاڵخوازان پیرۆزیی ئەم شوێنە پیرۆزانـەیان پێشێل دەكـردنو دەسـت درێـژییان دەكـردە سـەر ئەوانەی ئەهلی ئەو شـوێنانەنو هـاموو شـۆیان دەكـەن، بـەتاڵخوازان سەركەشـن واز لەدەست درێـژی كـردن نـاهێنن مەگـەر هێزێكـی هاوشـانی خۆیـان رەدیـان بداتـەوە، حەق دەبێ هێـز پارێزگـاری لێ بكاو بیپـارێزێ. ئـەگینا هەربەوەنـدەی كـەوا حەقـە

لەدەست بەتاڵ رزگاری نابێ، هەتا ئادەمیزاد ئادەمیزادەو دونیا دونیایە ئەم قاعیدە ناگۆڕێ.

﴿وَلَيَنصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنصُرُهُ﴾ بێگومان خودا پشتگیری لەوانە دەکا: کەلەپێناو بەرزکردنەوەی وشەی تەوحید دا جیهاد دەکەن‌و هەوڵ دەدەن وشەی (لا اله الا الله) بالآدەست بێ‌و ئالآی (لا اله الا الله) بەرز بشەکێتەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ، وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْساً لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ﴾ (محمد/٧-٨).

ئەمە هەواڵدانە لەخوداوە، خەبەری داوە لەنهێنی داهاتوو هەڵس‌و کەوت‌و حاڵ‌و وەزعی موسوڵمانانی موهاجیرو ئەنصار ئەگەر سەربکەون‌و دونیایان بێتە ژێر دەست، ئاماژەیە بەچۆنیەتی ئایینداری‌و خودا پەرستییان، ﴿إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ بێگومان هەر خودا دەتوانێ یارمەتی موجاهیدانی رێبازی خۆی بدا، هەر ئەو دەتوانێ پشتگیری خۆی بدا بەجەنگاوەرانی رێگای پیرۆزی خۆی‌و زاڵیان بکا بەسەر ناحەزاندا. وەکوو لەئایەتێکی تراد دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ، إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ، وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ﴾ (الصافات/١٧١-١٧٣) یان دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (المجادلة/٢١) ئەمجار پەروەردگار وەصفی ئەو کۆچکارە موسوڵمانانە دەکا: کەشیاوی یارمەتیدان‌و سەرخستنن دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ﴾ واتە: ئەو موسوڵمانانەی لەزێدو نیشتمانی خۆیان دەرکراون، ئەوانە ئەگەر لەوڵات دا جێگیریان بکەین‌و بەسەر موشریکەکان دا زاڵیان بکەین پابەندی فەرمان‌و نەهیەکانی خودا دەبن، نوێژەکانیان بەرێك‌و پێکی ئەنجام دەدەن ﴿وَآتَوُا الزَّكَاةَ﴾ زەکاتی ماڵ‌و سامانیان دەدەن، هەژاران لەماڵ‌و سامانی خۆیان بێ بەش ناکەن! ﴿وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ﴾ فەرمان دەکەن بەچاکە ﴿وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ﴾ جڵەوگیری لەخراپە دەکەن، بەدڵسۆزی خودا پەرستی ئەنجام دەدەن دوورە پەرێز دەبن‌و

دژایـەتی هـەموو ئەوانـە دەكـەن: كەپابەنـدی شـەریعەتی خـودا نـابن. وەكـوو لەئایـەتێكی تـردا دەفـەرموێ: ﴿وَعَـدَ اللَّـهُ الَّـذِينَ آمَنُـوا مِـنكُمْ وَعَمِلُـوا الـصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ﴾ (النور/٥٥).

ئەمجار جەخت لەسەر یارمەتیدان و كۆمەكی كردنـی خـودا پەرستان دەكاتـەوە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ﴾ سـەرەنجامی هـەموو كارەكـان بـۆلای خودایـە، هـەر ئەو مەزنەی پاداش و سزای كردەوەی بەندەكان دەكا، لەدونیاو قیامـەت هەركەسـە شیاوی چییە ئەوەی پێ دەداو ئەوەی بۆ دەرەخسێنێ!

بەكورتی و پوختی ئێمە شەڕكردنمان بۆ بەڕەوادانان چونكە ستەمیان لێ كـرا، هـەروەها ئەوانـە ئەگـەر لەسـەر زەوی بالادەسـت بـن پابەنـدی فـەرمان و جڵەوگیریەكانی خودا دەبن.

## پەند وەرگرتن لەڕوداوی لەناوچونی گەلە پێشینەكان

﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَابُ مَدْيَنَ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَافِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ

يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥۚ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ ثُمَّ أَخَذۡتُهَا وَإِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٨﴾

لەوەپێش ئەوەی روون کردەوە: کەموشریکەکان بەناحەقو ستەمکاری موسوڵمانەکانیان لەزێدو نیشتمانی خۆیان وەدەرناون، بۆیە خودا رێگەی داوە کە لەپێناو وجودی خۆیانو دەستەبەرکردنی ئازادی عیبادەت شەڕ بکەن. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا جۆرە دڵدانەوەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ﴾ ئەی موحەممەد! ئەگەر ئەوانە تۆ بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامەکەت رەتدەکەنەوە، ئەوە بزانە تۆ تاقە پێغەمبەرنیت کەبەدرۆ خرابیتەوە، بەڵکوو ئەوە دابو نەرێتی گەلە پێشینەکانە، پێغەمبەرانی پێش تۆش لەلایەن گەلەکانیانەوە بەدرۆ خراونەوە، ئەوەتا پێش ئەوەی موشریکەکانی مەککە پەیامی تۆ رەت بکەنەوە، گەلی نووح ﷺ پێغەمبەری خۆیان بەدرۆ خستەوە، قەومی عاد پێغەمبەری خۆیان کە (هود) بوو ﷺ بەدرۆیان خستەوە، هەروەها گەلی ثەمود پێغەمبەری خۆیان: کەصالح بوو ﷺ بەدرۆ خستەوە ﴿وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ﴾ هەروەها گەلی ئیبراهیم ﷺ، ئیبراهیمیان بەدرۆ خستەوە ﴿وَقَوْمُ لُوطٍ﴾ گەلی (لوط)یش لوطیان بەدرۆ خستەوە ﴿وَأَصْحَابُ مَدْيَنَ﴾ دانیشتوانی مەدیەن شوعەیبیان ﷺ بەدرۆزن داناو پەیامەکەیان رەت کردەوە

﴿وَكُذِّبَ مُوسَى﴾ موساش لەلایەن قیبطی‌یەکانەوە بەدرۆ خرایەوە فیرعەون‌و دارو دەستەکەی ئیمانیان پێنەهێنا.

هەرچەندە هەموو پێغەمبەرەکان موعجیزەو نیشانەی بەهێزو راستییان پێ بوو، لەسەر راستی پەیامەکەیان، جا هەریەك لەو پێغەمبەرانە پەیامی خۆیان گەیاندو ﴿فَأَمْلَيْتُ لِلْكَافِرِينَ﴾ ئێمەیش ماوەیەك مۆڵەتی کافرەکانمان داو چاوەڕوانی هەڵس‌و کەوتیان بووین، تادەری بخەین: کەنەوانە چی دەکەن‌و چ هەڵوێستێك دەنوێنن ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ﴾ پاشان بەسزای سەخت‌و ریشەکێشکەر گرتمن‌و لەناوم بردن ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ بڕوانە نارەزامەندی من لێیان چۆن بوو بۆیان‌و چۆن لەناوم بردن؟؟

تێبینی ئەوە دەکرێ: ئایەتەکە نەیفەرمووە ﴿وقوم موسى﴾ چونکە حەزرەتی موسا ﷺ لەلایەن نەتەوەکەی خۆیەوە بەدرۆ نەخرایەوە، بەڵکوو لەلایەن دارو دەستەی فیرعەونەوە پەیامەکەی رەتکرایەوە.

جا پێویستە ئەوە بزانرێ: ئەوەی بەسەر گەلە پێشینەکان هاتووە دوور نیە بەسەر هەموو گەل‌و نەتەوەیەك بێ. کەوابێ ئەی موحەممەد! ئەمن هەمان هەڵس‌و کەوت لەگەڵ موشریکەکانی مەککەو دەوروبەریشی دەکەم، هەرچەندە بۆ ماوەیەك مۆڵەتیان بدەم، بەڵام دوایی: کەگرتمن ئیتر رزگار بوونیان نیە، بێگومان وادەو هەڕەشەی خۆمیان دەرهەق دێنمەدی‌و بڕیاری ئێمە پاشگەز بوونەوەی تێدانیە گرتن‌و هێرشی من زۆر بەهێزو سامناکە، کەس نیە بتوانێ خۆی لەبەر بگرێ. وەکوو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ (البروج/١٢) کەوابێ پەلەی هاتنی عەزاب بۆ ئەوان مەکە، باوەختی بێ‌و بگاتە کاتی دیاریکراو.

هەندێ لەزانایانی سەلەف فەرموویانە: ماوەی نێوان قسەی فیرعەون: کەگوتی (انا ربکم الأعلى)و کاتی لەناو بردنی چل ساڵ بووە. لەصەحیحەیندا ئەبو موسا

ﷺ لەپێغەمبەرەوە ﷺدەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أن الله ليملى للظالم حتى أذا أخذه لم يفلته)).

ئائەوەیە داب‌و نەریتی خودا بەرامبەر بەدرۆ خەرەوەکان. هیچ کاتێکیش داب‌و نەرێتی خودا گۆڕانی بەسەردا نایە ئەمجار دوای رانواندنی خەبەری سەرنج راکێش بۆ ریشە کێش کردنی ئەو گەل‌و نەتەوە پێشینانە، رانواندنی لەناو بردنەکە فراوانتر دەکاو بەشێوەیەکی گشتی تر نمایشی دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾ زۆرن ئەو شارو گوندانەی وێرانمان کردون دانیشتوانەکەیانمان لەناو بردون بەهۆی ستەمکاری‌و بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەرەکانیانەوە، خۆیان بەدەستی خۆیان‌و بەئەنقەست بوونە هۆکاری لەناوچوونی خۆیان‌و وێرانبوونی وڵاتیان. پێغەمبەرمان بۆ ناردن بۆ ئەوەی شوێنیان بکەون‌و خۆیان لەگومڕایی‌و تێداچوون رزگار بکەن، کەچی لەجیاتی ئەوە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکانیان بن‌و شوێنیان بکەون پێغەمبەرەکانیان بەدرۆخستەوە، سەرپێچی فەرمانی خودایان زیاتر کردو سوورتر بوون لەسەر گومڕابوون! ئێمەیش شارو گوندەکانیانمان خاپوور کردن. ﴿فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا﴾ خانوو باڵەخانەکانیان واخاپوور بوون لەپێشدا سەقفەکانیان تەپیون ئەمجار دیوارەکانیانیان بەسەردا رمباون!

تەعبیرەکە زۆر سەرنج راکێشە، چونکە لەکاتی خۆیدا سەقفەکە لەسەر دیوارەکان وەستاوە، ئێستا روخانەکەیان بەشێوەیەکە بانەکانیان تەپیون‌و دیوارەکانیان بەسەر هەڵاشەکەیان دا رمباون، کەسیان لەژێردا بەزیندویی نەماوەو دیمەنەکە سامناکەو کاریگەرە، پێویستی بەڵێ وورد بوونەوەو سەرنجدان هەیە، شوێنەواری وێران بوو بەو شێوە جێگای سەرنج دان‌و پەند لێ وەرگرتنە ﴿وَبِئْرٍ مُعَطَّلَةٍ﴾ لەپاڵ ئەو شارو گوندە کاول بووانەدا تۆ دەبینی چەندەها بیری وێرانبوو لەکارکەوتوو، کەس نایەتە سەریان‌و کەس ئاویان لێ هەڵناهێنجێ، کەس ئاژەڵ‌و

ئەسپو هێسترو بارگیر ئاو نادا، دەوروبەریان چۆڵو هۆڵە ﴿وَقَصْرٍ مَشِيدٍ﴾ لەپاڵ ئەو شارو گوندو بیرە کاول بووانەدا چەندەها باڵەخانەی بەرزو بەگەچ سپیکراومان تێك روخاندون‌و کەسیان تێدا نەماوە.

سیاقەکە ئەم دیمەنانە رادەنوێنی‌و پاشان پرسیارێکی ئینکار ئامێز ئاراستە دەکا: کەبۆچی ئەم دیمەنانەکار لەدڵو دەروونی ئەو موشریکانە ناکەن؟ بۆچی بەبینینی ئەم شوێنەوارانەو بیستنی ئەم هەواڵانە پەند ئامێز نابن؟! دەفەرموێ:

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ؟﴾

بێگومان شوێنەواری نەتەوە لەناوچووەکان بەر چاوو سەرنج راکێشە، پەندی لێ وەردەگیرێ! دەی بۆچی ئەوانە سەفەر ناکەن؟ بۆ بەناو ئەو شوێنە وارانەدا گەشت‌و گوزار ناکەن لەو شوێنەوارانە وردببنەوە، بیر لەحاڵو وەزعی دانیشتوانیان بکەنەوە، گوێ رابگرن بۆ ئەو پاشماوەو کەلاوانە، بەزمانی حاڵ سەرگورشتەی خۆیان‌و دانیشتوانیانیان دەگێڕنەوە، حاڵو بەسەرهاتی خۆیانیان بۆ باس دەکەن، هەروەها دەربارەی ئەو خانوە وێرانبووانەو بیرە لەکار کەوتووانە بەسەرهات‌و رابووردوویان بۆ بگێڕنەوە. بەزمانی حاڵ پێیان بڵێن: کاتی خۆی چۆن بوون‌و ئێستا چۆن‌و چییان بەسەر هاتووە؟! نائومێدی لەئیمان هێنانیان رادەگەیەنی‌و دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّهَا لا تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ بەڵام ئەوانە پەندئامێز نابن، چونکە ئەوانە خۆ چاوی بینینی رواڵەتییان کوێر نیە، چاوی دیتنیان ساغو بینایە، بەڵام چاوی دڵیان کوێر بۆتەوە، گرنگیش چاوی دڵە نەك چاوی سەر، ئەوان دەبینن تێناگەن، دەبیستن پەند ئامێز نابن.

ئایەتەکە جۆرە تەهویل‌و ترسێکی تێدایەو هەڕەشەیە لەهەموو کەسێك: کە سەرپێچی فەرمانی خودا بکا، لەوەش دا: کە وەصفی دڵەکانی کردوەبەوە: کەلەناو سنگ دان زێدە تەئکید کردنێکی تێدایە، چونکە بەرواڵەت شوێنی کوێری‌و ئەوەی کەوەصفدار دەکرێ بەکوێر بوون چاوە، بەم جۆرە بیلبیلەکەی تووشی زیانێك ببێ‌و روناکایی نەمێنێ، جا کاتێك ئەو کوێرییە پاڵ غەیری چاو درا پێویستی

بەزێدە دیاریکردنو تەعین هەیە بۆ ئەوە بزاندری: کەشوێنی کوێرییەکە چاو نیە، بەڵکوو دڵە.

ئەگەر دڵەکانیان بینا بونایە، بەیادی خودا دەهەژانو پەند ئامێز دەبوونو پەنایان بۆ ئیمان هێنان دەبرد ئەوەکوو بەدەردی گەلەپێشینەکان بچن!!

وەڵێ ئەوانە سەیرو سەمەرەن، لەجیاتی تێفکرین لەشوێنەوارو پاشماوەی گەلە پێشینەکان، داوای هاتنی عەزاب دەکەن، گاڵتە بەهاتنی عەزابی خودا دەکەن، دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ﴾ پەلە لەهاتنی ئەو عەزابە دەکەن: کەتۆ هەڕەشەیان پێ لێ دەکەی. ئەوانە کافرو مولحیدو بەدرۆخەرەوەن، بڕوایان بەخوداو پێغەمبەری خوداو رۆژی دوایی نیە!

بەڕاستی سەیرەو جێگای سەرسوڕمانە لەهەموو رۆژگارو شوێنێك دا ستەمکارانی پێش خۆیان دەبینن، هەواڵو بەسەرهاتو سەرەنجامیان دەخوێننەوە، کەچی پەند ئامێز نابن، ئەوانیش رێبازی ئەو ستەمکارانەی پێش خۆیان دەگرنو چاو لەئەوان دەکەنو بیر لەسەرەنجامیان ناکەنەوە، هەر کاتێکیش یەکێك بەسەرهاتی ئەوانیان بۆ بگێڕێتەوە بیریان بێنێتەوە بەلایانەوە دوورە ئەو ئاکامە تووشی ئەوان بێ!

ئەمجار بوغرا دەبنو لەخۆیان بایی دەبن، ئەگەر خودا ماوەیەك مۆڵەتی دانو ماوەیەك بەسەر کەشی بۆیان سەرچوو ئیتر بوغراییان دەگاتە ئاستێك پەلە لەهاتنی ئەو عەزابە دەکەن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ (الأنفال/٣٢) دەی باباش بزانن: کە ﴿وَلَنْ يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ خودا هەرگیز لەوادەو هەڕەشەی پاشگەز نابێتەوە، ئەو عەزابەی هەڕەشەیان پێ لێ کراوە، هەر دێ گومان لەهاتنیدا نیە، قیامەت رادەبێو حیسابو لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدرێ، خودا تۆڵە لەسەرپێچیکاران دەستێنێو پاداشتی خۆشەویستانی دەداتەوە، ئەوەی وادەی پێداوە،

ئەو هەڕەشانەی کردونی بەبێ شك و گومان دێنەجێ. چەندێك ئەوان پەلە لەهاتنی عەزابەکە بکەن، خودا بڕیاری خۆی تێك ناداو حیکمەتی خۆی چۆنی بوێ ئاوا شتەکان دێنە دی، ئەو حیکمەتەی مەبەستە لەدواخستنەکە هەڵی ناوەشێنێتەوە، ئەندازەی زەمەنیش لای خودا غەیری ئەو ئەندازەیەیەکە لەحیسابی ئادەمیزاددا هەیە. ﴿وَإِنَّ يَوْماً عِنْدَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِمَّا تَعُدُّونَ﴾ واتە: بێگومان پەروەدگار حەلیم و بەصەبرە، پەلەی نیە. نیشانە حیلم و کورت کردنەوەی ماوەی درێژ لەلایەن خودا ئەوەیە، کەتەنها ڕۆژێك لای خودا وەکوو هەزار ساڵ وایە لای ئێوەئەو عەزابەی لەقیامەت دا یەخەی تاوانباران دەگرێ هێندە بەئازارو بەئێشە هێندەی هەزار ساڵی دونیا دەبێ، ئێوە چۆن دوای هاتنی عەزاب دەکەن، ئەندازەی هەزار ساڵ لای ئێوەو بەژمارەی ئێوە وەکوو ڕۆژێك وایە لای خودا!

جاکەئێوە پەلە لەعەزاب دەکەن و دەڵێن: ئەوە ماوەیەکی زۆری پێ چوو عەزابەکە نەهات و کوا بۆچی نەهات؟؟ بێگومان خودا حەلیم و بەصەبرە هەزار ساڵی لای ئێوە ڕۆژێکی لای ئەوە، ئەو وادەی خۆی بەدی دێنێ و هیچ گومانی تێدا نیە، چەند ماوەکە لای ئێوە درێژ بێ، لای خودا کورت و کەمخایەنە، جاکەعەزابی قیامەت ماوەیەکی پێ چووەو نەهاتووە، ئەوە وادە خیلاف نیە چونکە بیست هەزار ساڵ لای ئێوە، لای خودا بیست ڕۆژە بەکورتی سوونەتی خودا هەر دەبێ بەڕێوە بچێ و هەر دەبێ ستەمکاران لەناو بچن و عەزابی سەختی دۆزەخ بچێژن.

خۆ ئەگەر ئەو کافرانە بیانزانیایە عەزابی خودا چەند سەخت و بەئێشە هەرگیزاو هەرگیز زاتیان نەدەکرد پەلە لەهاتنی بکەن!

ئەمجار خودا جەخت لەسەر ئەوە دەکات: کەهەرگیز وادەی خۆی هەڵناوەشێنێتەوە، هەرچەندە ماوەیەکیش عەزابی هەڕەشە پێ لێکراوی خۆی دوا بخا، دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ زۆر لەدانیشتوانی شارو گوند هەبوون مۆڵەتمان دان و عەزابمان لێ دواخستن، هەرچەندە ئەوان لە سەر ستەمکاری بەردەوام بوون، پاشان بەسزا گرتوومن، عەزابی ڕیشە

كێشكه‌رم به‌سه‌ردا داون‌و تێكمه‌وه پێچاون، كه‌وابێ دواخستنی عه‌زاب لێیان هۆكارەكه‌ی مۆڵه‌تدانیان بووه، نه‌ك پاشگۆی خستنیان، ئێمه سته‌مكاران مۆڵه‌ت ده‌ده‌ین پاشگوێیان ناخه‌ین.

له‌فه‌رموده‌ی صه‌حیح دا هاتووه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی ((ان الله ليملى للظالم حتى إذا أخذه لم يفلته)).

## دیاریكردنی ئه‌ركی سه‌رشانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ ﴾

دوای ئه‌وه‌ی په‌روه‌ردگار ئه‌وه‌ی رونكرده‌وه: كه‌موشریكه‌كان به‌مه‌به‌ستی به‌درۆ خستنه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ و گاڵته پێكردنی په‌له‌یان له‌هاتنی عه‌زاب ده‌كرد، چونكه بڕوایان به‌هاتنی قیامه‌ت نه‌بوو، به‌شوێن ئه‌وه‌دا ئه‌ركی سه‌رشانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ رون ده‌كاته‌وه‌و ده‌فه‌رموێ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ر! بڵێ: ئه‌ی خه‌ڵكینه! ئه‌ی ئه‌و كه‌سانه‌ی په‌له‌ی هاتنی عه‌زاب ده‌كه‌ن، باش بزانن: كه‌هێنانی عه‌زاب عائید به‌من نیه، من خودا كردومی به‌پێغه‌مبه‌رو ره‌وانه‌ی كردوم: كه‌له‌عه‌زابی خودا بتانترسێنم، پێتان رابگه‌یه‌نم : كه‌سزایه‌كی سه‌خت‌و سامناك له‌پێشتانه‌وه‌یه، من له‌و باره‌وه هیچم به‌ده‌ست نیه، هه‌موو شتێك عائید به‌خودایه، ئه‌گه‌ر بیه‌وێ خێرا عه‌زابتان بۆ ده‌نێرێ، ئه‌گه‌ر مه‌یلیشی بێ

لێتـانی دوادەخـا، بـەڵکوو ئەگـەر مـەیلی لێ بـێ تۆبـەتان لێ دادەخـا، مـەیلی لێ بـێ تۆبەتان لێ وەردەگرێو توشی عەزابتان ناکا. خودا چی بوێ ئاوادێتە دی!

ئەرکی سەرشانی من ترساندن لەعـەزابی خـوداو موژدەدانـە بەپاداشـی دوایی‌و رەزامەنـدی پـەروەردگار، ئەمـەش نـاوەڕۆکی ئـەو دوو ئەرکەیـە: کەهـەر یەکـەیان لەئایەتێك دا روون کراوەتەوە:

١- ﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ مَغْفِـرَةٌ وَرِزْقٌ كَـرِيمٌ﴾ جائـەو کەسانەی لەدڵ‌و دەروونیان دا ئیمانیان هێناوە، ڕاستی ئیمانەکەشیان بەکردەوە دەچەسپێنن، ئـەوە ئەوانــە لـەتاوانی رابردوویـان خـۆش دەبـین، پاداشـی کـردەوە باشـەکانیان دەدەینەوە، دەیانخەینە ناو بەهەشتێکەوە پانتایی‌یەکەی هێندەی ئەرزو ئاسمانە.

﴿رِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ ئەو بەهەشتەیە: کـەخودا وەصفی کـردوە بـەوە: کەهەرچـی دڵ حەزی لێ بکاو چاودیتنی پێ خۆش بێ‌و بۆ هـەتا هەتایـە تێیـدا رادەبـوێرن. وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَفِيهَـا مَـا تَـشْتَهِيهِ الْـأَنفُسُ وَتَلَـذُّ الْـأَعْيُنُ وَأَنـتُمْ فِيهَـا خَالِـدُونَ﴾ (الزخرف/٧١).

پێغەمبەریش ﷺ وەصفی بەهەشتی بەوە کردوەو فەرمویەتی: ((فیها مالا عـین رات، ولا أذن سمعت، ولاخطر علی قلب بشر)) (رواه احمد والـشیخان والترمـذی وابـن ماجه عن ابی هریرة).

٢- ﴿وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَـاجِزِينَ أُوْلَئِـكَ أَصْـحَابُ الْجَحِـيمِ﴾ واتـە: ئەوانـەی هـەوڵ‌و تێکۆشـانیانەو بـەردەوام خـەریکی پوچـەڵ کردنـەوەی ئایـەتی ئێمـەن‌و بانگەوازی ئاینی ئێمە رەت دەکەنەوە، پێغەمبەران بەدرۆ دەخەنـەوە، هـەوڵ دەدەن خەڵك شوێن پێغەمبەر نەکەون‌و پاڵی لێ بدەنەوە. بەخەیاڵی پوچـی خۆیـان ئـەوان ئێمە دەسەپاچە دەکەن، لەچنگ عەزابی ئێمە قوتاریـان دەبـێ‌و زینـدو ناکرێنـەوە. بائەوانە باش بزانن‌و دڵنیا بن کەئەهلی دۆزەخن‌و شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، بـۆ

هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَاباً فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ﴾ (النحل/٨٨).

## پتەویی نیگای خودا بۆ پێغەمبەرو پاراستنی لەشەیاتینیو چیرۆکی (الغرانيق)

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥٧﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵ بوونی ئەم ئایەتە زوربەی ڕافەکەرانی قورئان دەیگێرنەوە بۆ چیرۆکی (غەرانیق) و دەڵێن: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەیەکێ لەدیوەخانی قورەیشییەکان دا دانیشتبوو، دیوەخان جمەی دەهات لەخەڵك، پێغەمبەر ﷺ ئاواتی خواست لەو ڕۆژەدا نیگایەکی بۆ نازڵ نەبێ قورەیشییەکان پشتی لێ هەڵکەن، ئیتر پەروەردگار سورەتی (النجم) ی بۆ نارده خوارێ، پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بەخوێندنەوەی تاگەییشتە ئایەتی ﴿أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى، وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى﴾ لەکاتێك دا پێغەمبەر ﷺ هەناسەی داو هەڵوێستەیەکی کرد: شەیتان ئەم دوڕستەی خستنە پاڵ خوێندنەوەکەی پێغەمبەر ﷺ وتی: ﴿تلك الغرانيق العلى، وان شفاعتهن لترجى!﴾ پێغەمبەر وتنیو ئیتر بەردەوام بوو تا سورەتەکەی تەواو کرد، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەکۆتایی خوێندنەوەکەیدا سوژدەی بردو هەموو خەڵکەکە لەگەڵیدا سوژدەیان برد! کافرەکان وتیان سەیره! لەوە پێش پێغەمبەر هەرگیز مەدحی خوداکانی ئێمەی نەکردوە؟! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ...... الأية﴾ ی نازڵ کرد.

تەنانەت دەڵێن: وەلیدی کوڕی موغەیره لەبەر پیری نەیتوانی سوژدە بەرێ، هەندێکی خۆڵ بەرز کردەوە بۆلای ناوچەوانیو سوژدەی لەسەر برد!

کەشەو داهات حەزرەتی جوبرائیل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ سورەتەکەی بۆ جوبرائیل خوێندەوە: گەکەییشتە ئەو ڕستەیە، جوبرائیل فەرموی: من ئەم دوو ڕستەیەم بۆ نەهێناوی، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي

أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذاً لاَّتَّخَذُوكَ خَلِيلاً، وَلَوْلاَ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً قَلِيلاً، إِذاً لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لاَ تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيراً﴾ ئیتر پێغەمبەر ﷺ غەمو پەژارە دای گرت هەتا ئایەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ﴾.

ئیبنو لعەرەبیو قاضی عەیاضو قورطوبی دەفەرمون: ئەم ریوایەتانە پوچنو بێ بناغەن. [1]

ئیمامی رازی دەفەرموێ: زانایانی تەفسیرو توێژەرەوەکان فەرمویانە ئەم ریوایەتانە هەڵبەستراوو بێ بناغەن، بەلگەی بەهێزیان بەدەستەوەن لەسەر رای خۆیان لەقورئانو سووننەت بەلگەیان هێناونەوەو رای خۆیان تەرجیح داوە [٢]

**ئەوەتا چەند ئایەت هەیە لەقورئان دا ئەوە دەچەسپێنن: کەنابێ شتی لەجۆری چیرۆکی (غەرانیق) لە پێغەمبەرەوە روو بدەن:**

١- ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِن تِلْقَاء نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ﴾ (یونس/١٥)

٢- ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ﴾ (الحاقة/٤٤-٤٦)

٣- ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم/٣-٤) جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ دوای خوێندنەوەی ئەم ئەم ئایەتانەی سورەتی (النجم) ئەو رستەیەی دەربارەی (غەرانیق) خوێندبێتەوە ئەو یەکسەر مانای ئەوەیە (العیاذ بالله) خودا درۆی کردوە؟ هەڵبەتە هیچ موسوڵمانێك قسەی ئاوا ناکاو رەواجی پێ نادا.

(١) الجامع الاحكام القران (تفسیر القرطبی) ج٦ /٣٤٤٢ و احكام القران لأبن العربی ج١٢٨٨/٣ – ١٢٩٠.

(٢) تەفسیری رازی ج٥٠/٢٣.

بەڵگەی زۆریش دەربارەی ئەوە لەسوننەتەوە وەرگیراون ئەوەتا:

١- ریوایەت کراوە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی خوزەیمە لەبارەی (غەرانیق)ە وەپرسیاری لێ کرا لەوەڵامدا وتی: ئەم چیرۆکە دەست هەڵبەستی زیندیقەکانە.

٢- ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێ: ئەم چیرۆکە لەڕوی ریوایەتو نەقڵەوە نەچەسپاوە.

٣- هەروەها ئیمامی بوخاری لەصەحیحەکەیدا ئەوە ریوایەت دەکا: کەپێغەمبەر ﷺ سورەتی (النجم) ی خوێندۆتەوەو موسوڵمانەکانو موشریکەکانو ئادەمیزادو جندۆکە سوژدەیان بردو، بەڵام بڕای بڕای باسی چیرۆکی غەرانیقی تێدا نیە.

بەڵگەی عەقڵیش هەیە لەسەر بێ بناغەیی چیرۆکی (غەرانیق). چونکە ئەگەر بەڕاستی بزانین: کەپێغەمبەر ﷺ ڕێزی لەبتو صەنەم گرتووە، یەکسەر حوکمی کوفر بەسەر خۆمان دا دەدەین! چونکە شتێکی ئاشکرایە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرو هەوڵو تێکۆشانی بەردەوامی بۆ قەڵاچۆ کردنی بت صەنەم بووە، دەی چۆن دەبێ ڕێزیان لێ بگری؟!.

ئیمامی رازی دەفەرموێ: بەهێزترین بەڵگەی عەقڵی لەسەر بێ بناغەیی چیرۆکی (غەرانیق) ئەوەیە: ئێمە ئەگەر شتی ئاوا بۆ پێغەمبەر ﷺ بەڕەوا بزانین، ئیتر دڵنیاییمان دەربارەی بێ خەوشی ئەو شەریعەتەی بۆی هێناوین نامێنێ، ئەوکاتە گومان بۆ ئەوە دەچێ هەرکامێك لەئەحکامو شەریعەتەکانی بۆی هێناوین زیادەی تێدا بێو لەلایەن شەیتانەوە شتی وەپاڵ درابێ، ئەو ئایەتەش پووچ دەبێتەوە کەدەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾ (المائدة/٦٧) چونکە هیچ جوداوازیی نیە لەنێوان ئەوەدا لەنیگا کەم بکاتەوە یان لێی زیاد بکا. کەوابێ بەکورتی ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێو دەچەسپێ: کەئەم چیرۆکە بێ بناغەیەو پووچو دەست هەڵبەستی زیندقەکانە!

کـەوابوو چـیرۆکی (غـەرانیق) هەڵبەسـتراوو درۆیـەو زینـدیق و بـێ دینـان دایانهێناوە، بۆیە دەبێ هەوڵ بدەین تەفسیری ئایەتەکان وابکەین لەگەڵ نـاوەڕۆکی ئـایین بگونجێ و تەفـسیری قورئـان بـەقورئان بکرێ و گوێ نەدەینـە ئـەو ریوایەتـە جۆراو جۆرە بێ بناغانەی ئیسرائیلیاتیان پێوەیەو زۆر لەموفەسیرین بەسافیلکەیی خستویاننە ناو تەفسیرەکانیانەوەو لەگەڵ بـێ خەوشـی نیگاو شـەریعەتی ئیـسلام و دڵسۆزی و لێ هاتوویی پێغەمبەر ﷺ بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە یەك ناگرنەوە.

هەڵبەتە خیلاف لەوەدا نیە: کە (القای) شـەیتان بـۆ چـەند وشـەیەکی بیـستراو بووەو کێشەو فیتنەکە لەم بیستنەوە سەری هەڵداوە.

ئەمجار زانایان کەوتوونە کێشەوە دەربارەی چۆنیەتی ئەم ئیلقایە.

ئەوەی چەسپاوەو دەبێ ئینسانی موسوڵمان بـڕوای پـێ بـێ ئەوەیـە: پێغەمبـەر ﷺ هەرگیزاو هەرگیز هاوبەشـی شـەیتانی نـەکردوە لـەوتنی ئـەم وشـانەدا، شـەیتان نەیتوانیوە وەسوەسە بخاتە دڵی پێغەمبەرو وابکا ئـەم وشـانە بـەدەمی موبـارەکی دا بێن! چونکە بەدەقی ئایەت پێغەمبەر ﷺچی بڵێ نیگایـە لەخوداوەیـە ﴿وَمَـا يَنطِـقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾ (النجم/٣-٤)

قورطوبی دەفەرموێ: باشترین تەئویل بـۆ ئـەم ئایەتانـە ئەوەیـە: کەپێغەمبـەر ﷺ بـەگوێرەی فـەرمانی پـەروەردگار قورئـانی بەشـێوەی تـەرتیل خوێندۆتـەوە؛ ئایەتـەکانی لێـك جیـا کردونـەوە، هـەموو سـەرە ئایـەتێك هەڵوێـستەیەکی کـردوە، جاوێدەچێ شەیتان فرسەتی لەو سەکتەو هەناسە هەڵێنانەوە هێنـابێ و ئـەو چـەند وشانەی تێهەڵکێشی خوێندنەوەکەی پێغەمبەر ﷺ کردبێ و لاسای نەغمـەو دەنـگ و صـەدای پێغەمبـەری ﷺکردبێتـەوە بـەجۆرێك ئـەو موشـریکانەی لێـی نزیـك بـوون گوێیان لێ بووبێ و وایانزانیبێ خوێندنەوەی پێغەمبەرەو بڵاویان کردبێتەوە!!

ئەمەش لای موسوڵمانان ج زیانێكی تێدا نیە، چونكە پێش ئەو كاتە سورەتەكە بەوشێوەیەی پێی هاتۆتە خوارێ پارێزراو بووە، زانیویانە پێغەمبەر ﷺ هەڵوێستی بەرامبەر بتەكان چۆنەو چەندی رق لێ هەن [1].

**وشەی ( تمنی ) لەئایەتەكەی ئێرە دوو مانای هەیەو بەدوو شێوە تەفسیری دەكەن:-**

١- (تمنی) بەمانا خوێندنەوە بێ. زوربەی راڤەكەرانی قورئان پێیان وایە لێرەدا ئەم مانایە هەڵدەگرێ. بەڵگەیان لەسەر ئەوە (تمنی) بەمانا (قرأ) و(تلا) بێ ئەو شیعرەی حەسانە ﷺ كەدەرهەق بە ئیمامی عثمان ﷺ دەفەرموێ:

**تمنی كتاب الله أول لـيـلـة أخرها لاقي حمـام المقـابـر**

یان شاعیرێكی تر دەڵێ:

**تمنی كتاب الله أخر ليلـة تمنى الداود الزبور على رسول**

لەصەحیحی بوخاریشدا هاتووە دەفەرموێ: ((اذا تمنـى ألقـى الـشيطان في امنيته)) واتە: ((اذا حدث القي الشيطان في حديثه)).

٢- دەڵێن: (تمنێ) بەمانا ئاواتو هیوا خوازییە، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئاواتە خوازی ئەوە بووە: كەنەتەوەكەی موسوڵمان بن‌و ئیمانی پێ بێنن!

جا ئەگەر (تمنی) بەمانا ئومنییەو ئاواتە خوازی بێ (مفعول) ی (ألقی) دەبێ شتێك بێ لەرەگەزو جینسی وەسوەسە بێ: واتە: شەیتان وسوەسەو شوبهەو گومانی خۆی دەهاوێتە ناوەوە بۆ ئەوەی ئاواتەكانی پێغەمبەر ﷺ نەیەتە جێ، خەڵكەكە ئیمانی پێ نەهێنن، ئەوكاتە ئیلقاكە بریتی دەبێ لەمەنع كردنی خەڵك لەئیمان هێنان‌و بەرگری كردن لەهاتنەدی ئاواتەكانی پێغەمبەر ﷺ.

ئەگەر (تمنی) بەمانا (قرأ) و (تلا) بێ ئەوكاتە (مفعول) ی ((ألقی)) بەدوو جۆر مەزندە دەكرێ.

[1] تەفسیری قورطوبي ج٦/٣٤٤٣.

١- (مفعـول) ە کـە لەرەگـەزی وەسوەسـەو گومـان خـستنەوە بـێ؛ واتـە (ألقـى الـشيطان في قـراءة الرسـول أو النبـى الـشبه والوسـاوس) شـەیتان فـڕێ دەداتـە نـاو خوێندنــەوەی پێغەمبــەر ﷺ وەسوەســەو گومــان بــۆ ئــەوەی خــەڵکی بگێڕێتــەوە لەشوێنکەوتنی ئەو نیگاو سروشەی دەیخوێنێتەوە.

٢- (مفعـول) ی (ألقـي)، (قـراءة) بـێ واتـە: (ألقـى الـشيطان في قـراءة الرسـول قرائته) شەیتان خوێندنـەوەی خـۆی فـڕێ دەداتـە نـاو خوێندنـەوەی پێغەمبـەر ﷺ هەرچـەندە خوێندنـەوەی شـەیتان جودایـە لـەهی پێغەمبـەر ﷺ بـەڵام بۆیـە فڕێـی دەداتــە نــاو خوێندنەوەکــەی پێغەمبــەر ﷺ تــا کافرەکــان وابــزانن: کەئــەوە خوێندنەوەی پێغەمبەرە ﷺ.

رستەی ﴿فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ﴾ پشتگیری ئەم مەزندە کردنە دەکا.

ئیتر لەژێر رۆشنایی ئەم بەرکوڵە سەرپێی یـەدا تەفسیری ئایەتـەکان دەکـەین و دەڵێین: دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ﴾ ئێمـە ئـەی موحەممـەد! هـیچ پێغەمبـەرو رەوانـە کراوێکمـان نەناردوە ئیللا کەناردومانن هەرکاتێ یەکێکیان کەلامی خودای خوێندبێتەوە، خێرا شەیتان هەندێ قسەی پڕوپوچ و بێ جێ فڕێ داوەتە نـاو خوێندنـەوەی پێغەمبـەرو تێکەڵاوی کردوە.

یـان هـەرکاتێ پێغەمبەرەکـە ئـەو نیگایـەی بـۆی نـازڵ بـووە بـۆ خەڵکەکـەی خوێندبێتـەوە، شـەیتان وەسوەسـەو شـك و گومـانی خـستوەتە نـاو دڵ و دەروونـی بێـسەرەکانەوەو هـەوڵی داوە لـەئیمانهێنان دووریـان بخاتـەوە، بەڕاسـتی نـەزانن و قبـوڵی نەکـەن، وەکـوو ئـەوە وەسوەسـە وای لەهەنـدێکیان کـردوە بەپـەیامی پێغەمبەرەکە بڵێن: سیحرە، شیعرە، چیرۆکی خەیاڵاوی رابوردوانـە، بـەدەم خـوداوە هەڵی بەستووە، خەڵك فێری کردوەو پاڵ خودای دەدا.

﴿فَيَنْسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ﴾ ئیتر په‌روه‌ردگار ئه‌و پړو پاگه‌نده‌و وه‌سوه‌سه‌و خه‌رافاته‌ی که‌له‌دڵ‌و ده‌روونی هه‌ندێ که‌س دا مه‌کۆیان داوه ده‌سڕێته‌وه‌و لایان ده‌با، به‌م جۆره، که‌سانێك راست ده‌کاته‌وه بۆ پارێزگاری کردن له‌ئایین‌و ره‌تکردنه‌وه‌ی شوبهه‌و خه‌رافاته‌کان. ئه‌مجار ئایه‌ته‌کانی خۆی ده‌چه‌سپێنێ‌و رونیان ده‌کاته‌وه‌و هیچ شك‌و گومانیان تێدا ناهێڵێ: زیندوو که‌م‌و کوڕییان تێدا به‌دی ناکرێ. ده‌یچه‌سپێنێ، که‌نه‌وه نیگاو سروشه له‌خوداوه هاتووه‌و حه‌ق‌و راسته‌و ئیتر هه‌وڵ‌و ته‌قه‌ڵلای شه‌یتان بێ هوده ده‌بێ‌و چ رۆڵێکی نابێ.

بێگومان ئه‌م هه‌وڵ‌و ته‌قه‌ڵلایه‌ی شه‌یتان ده‌ق ده‌شوبهێته هه‌وڵ‌و تێکۆشانی موسته‌شریقه‌کان‌و لیژنه ته‌بشیری‌و رێکخراوه به‌ناو ئینسانی‌و مرۆڤ دۆسته‌کانی بیانی‌و چڵکاو خۆره به‌ره‌ڵلاکانی ناوخۆو چه‌پڕه‌وه توند ڕه‌وه‌کان‌و کلکه له‌ق بۆ که‌ره‌کانیان، ئه‌وانه‌ی لێبڕاون بۆ ناشیرین کردنی ئیسلام‌و به‌رنامه‌که‌ی بۆ گومان خستنه سه‌رو شێواندنی مه‌بادیئه‌کانی ئیسلامی پیرۆزو ته‌عالیمه‌کانی‌و هه‌ڵگێڕانه‌وه‌ی حه‌قائیقه‌کان‌و ته‌زویر کردنی راستییه‌کان‌و ته‌نویل کردنی هه‌ندێ ئایه‌ت‌و ئاراسته کردنیان بۆ مانای ناراست‌و نامه‌به‌ست. به‌ڵام وێڕای چڕو پڕی ئه‌م هه‌وڵ‌و ته‌قه‌ڵلایانه له‌لایه‌ن کافرو به‌چکه موسوڵمانی هه‌ڵگه‌ڕاوه له‌ئایین سوپاس بۆ خودا رابوونی ئیسلامی له‌برەوو گه‌شه‌و نه‌ش‌و نومادایه، ساڵانه‌و رۆژانه یه‌ك به‌دوای یه‌ك دا هێلانه‌ی کوفر ده‌ڕوخێ‌و هه‌وڵ‌و تێکۆشانی چه‌په‌ڵی ئه‌و داخ له‌دڵانه له‌سه‌ر به‌ردی راستی ئیمان‌و باوه‌ڕی پته‌وی هه‌ڵگرانی رابوونی ئیسلامی وردو خاش ده‌کرێ‌و ده‌خرێته گۆڕه‌وه‌و نغرۆی ده‌ریای نه‌مان ده‌بێ. خۆری ئیسلام‌و به‌رنامه پیرۆزه‌که‌ی ته‌نگی به‌تاریکه شه‌وی کوفرو ئیلحاد هه‌ڵچنیوه‌و خه‌وو خواردنی لێ حه‌رام کردون!!

﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ په‌روه‌ردگار زانایه به‌هه‌موو کارو بارێك له‌ناو بوونه‌وه‌ردا، ده‌زانێ چ نیگاو سروشێك ده‌نێرێ بۆ پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی‌و ده‌زانێ ئاکام‌و سه‌رئه‌نجام چی ده‌بێ‌و چۆن ده‌بێ، هیچی لێ گوم نابێ، حه‌کیم‌و دانایه له‌مه‌زنده کردن‌و

دروستكردن‌و كردەوەكانی دا حیكمەتی تەواوی هەیە، بەڵگەو نیشانەی بەهێزو حاشا هەڵنەگری لاهەن، سزای درۆ هەڵبەستان‌و سەرپێچیكاران دەداتەوە، خودا پەرستان زاڵ دەكاو سەركەوتوویان دەكا. تاریكی ناو دڵ‌و دەروون رادەماڵێ‌و حەق دەگێڕێتەوە بۆ خانەی خۆی. حەقیقەت دەر دەخاو سەری دەخا، باطل دەپوچێنێتەوەو ئاسۆی عەقڵ‌و بیرەكان روناك دەكاتەوەو هیدایەتیان دەدا بۆ رێگای سەربەستی‌و ئازادی‌و بەختەوەری دونیاو قیامەت!

﴿لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ رای پەسند ئەوەیە: كە (لام) ی (لیجعل) پەیوەندە بە (ألقى)وە واتە: بۆ ئەوەی پەروەردگار وەسوەسەو شوبهە هاویشتنی شەیتان بۆ ناو قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر بكاتە هۆكاری تاقیكردنەوەو ئیمتیحان بۆ ئەوانەی دڵیان نەخۆشەو دڵیان رەقە. كوفر وشك‌و گومانی تێدایە..

مەبەست بەوانەی كە ﴿فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ دوو رووەكانن ئەوانەی لەناو دڵیان دا شك‌و گومان‌و كوفرو نیفاق هەیە.

مەبەست بە ﴿وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ﴾ موشریكەكانن یان دڵ رەقەكانن. ئەوانەی دڵ خۆش بوون بەتێهەڵكێش كردنی شەیتان بۆ ئەو چەند شتەپرو پووچانەی خستنیە ناو قورئان خوێندنەوەكەی پێغەمبەرەوە ﷺ و وایان زانی راستن‌و لەخوداوە هاتوون.

﴿وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾ بێگومان ستەمكاران ئەوانەی ستەم لەخۆیان دەكەن بەمونافیق‌و موشریك‌و جوولەكەوە لەگومڕایی‌و سەرپێچی كردنی تەواودان، دژایەتی خوداو پێغەمبەر دەكەن‌و دوورن لەحەق‌و راستی.

﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ﴾ هەروەها بۆ ئەوەی ئەوانەی هەڵگری مەشخەڵی زانستی بەسوودن، ئەوانەی حەق‌و بەتاڵ لێك جیادەكەنەوە، بڕوایان بەخوداو بەپێغەمبەرەكەی هێناوە، دڵنیا بن.

کەئەو نیگایەی بۆ تۆمان ناردووە حەق‌و راستە شك‌و گومانی تێدا نیە لەخوداوە بۆت هاتووەو بەزانیاری‌و چاودێری خۆی نازڵی کردووە ناهێڵێ شتی ناهەقی تێکەڵ بێ، ئیتر ئیمانی پێ دەهێنن‌و گەردنکەچی فەرمان‌و جڵەوگیرییەکانی دەبن‌و دڵیان پێی ئارام دەگرێ ترس‌و خۆفی خودای تێدا جێگیر دەبێ، کار بەحوکم‌و داب‌و شەریعەتی خودا پەسند دەکەن وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ، لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ (فصلت/٤١-٤٢) ئەمجار سەرەنجامی باش‌و ناکام پیرۆزی بۆ موسوڵمانان دەچەسپێنێ‌و دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان خودا ئەو کەسانە شارەزای رێگای بەختەوەری دەکا: کەئیمانیان پێ هێناوەو بڕوایان بەپێغەمبەرەکەی کردوە، تۆفیقیان دەدا بۆ رێگای حەق‌و راست، وەسوەسەو شك‌و گومانی شەیتانیان لێ دوور دەخاتەوە.

بەکورتی پەروەردگار هیدایەتی خاوەن بڕوایان دەدا بۆ مانای راستی ئەو ئایەتانەی موتەشابیهن، بەجوانی مانایان دیاری دەکەن‌و سەرگەردانی روویان تێ ناکاو شوبهەو گومانی بەتاڵخوازان کاریان تێ ناکەن، دڵیان دامەزرا لەسەر باوەڕو قاچی چەسپاویان بە تورەهاتی چەپڕەوان وەلەرزە ناکەون! وەسوەسەو شك‌و گومانی شەیتان‌و هەوا خواهانی ناتوانن لەرێبازی راستی خۆیان لایان بدەن.

ئەمجار سەرەنجامی دوو ڕوو موشریك‌و جوولەکەکان دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ﴾ بەردەوام ئەوانەی کافرن لەشك‌و گومان دا دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قورئان، یان دەربارەی ئەو تێهەڵکێشەی : کە شەیتان هاویشتیە ناو قورئانخوێندنەکەی پێغەمبەر ﷺ ناوا لەگومان‌و شوبهەدا دەمێننەوە هەتا بەناگەهان قیامەتیان دێتە سەرو رادەبێ یان نیشانەکانی دێنە دی، یان مردن

یەخەیان پێ دەگرێ، یان سزای ڕۆژێکی تێکشکێنەریان بۆدێو لەگەڵ موسوڵمانان دا دەکەونە جەنگەوەو تێکدەشکێن!

قورئان ڕۆژی قیامەتی کردوە بەکۆتایی کوفرەکەیان چونکە کاتێ نیشانە گەورەکانی قیامەت دەردەکەون قیامەت بۆخۆی رادەبێ، هەموو کەس بەناچاریی ئیمان دەهێنێ، بەڵام ئیمانهێنانی ناچاریو دوا هەڵهاتنی خۆر لەخۆرئاواوە، ج سودێکی تێدا نیە.. قورئان ڕۆژی قیامەتی بەوشەی (عقیم) وەصفدار کراوە چونکە شەوی بەدوادا نایە!!

مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە: کافرەکان بەردەوام دەبن لەسەر کوفر هەتا مەرگ یەخەیان پێ نەگرێ بڕوا ناکەنو ئەوکاتەش بڕواکردنەکەیان بێسوودە.

ئەمجار دوای ڕونکردنەوەی وەزعو حاڵی هەردو تاقم لە دونیادا حاڵی قیامەتیان بەیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ دەسەڵاتو خاوەنداریەتیو تەصەروف لەرۆژی قیامەت دا هەر بۆ خودایە، پاداش دانەوەو لێ خۆشبوونو سزادان بەدەست خۆیەتی، بەحەقو عەداڵەت لەناویاندا حوکم دەکاو هەرکەسە بەگوێرەی ئیمانو کردەوەی خۆی لەدونیادا پاداشو سزای بۆ دیاریی دەکرێو هیچ کەس بەئەندازەی گەردیلەیەكو کەمترو زیاتر ستەم لەکەس ناکا! هەر خودا (مالك يوم الدين)ە ئەو دەسەڵاتە ڕواڵەتیەو خاوەندارییە مەجازەی کەلە دونیادا بۆ ئادەمیزاد هەیە، لەقیامەت دا ئەوەش نامێنێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ لِلرَّحْمَنِ وَكَانَ يَوْماً عَلَى الْكَافِرِينَ عَسِيراً﴾ (الفرقان/٢٦).

ئەمەش ئاکامی بڕیاری پەروەردگارە، دەربارەی هەردوو تاقمو دەفەرموێ: ﴿فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ جا ئەوانەی بەدڵ بڕوایان بە تاكو تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرو پێغەمبەرایەتیو حەقو ڕاستی قورئان کردوە، بەکردەوە ڕاستی ئیمانەکەیان چەسپاندوەو بەگوێرەی قورئان هەڵسو

کـەوتیان کـردوە، ئەوانـە پاداشـیان بەهەشـتی رازاوەو خـانووی خۆشـی هـەتا هەتاییە، هەرگیز لێی دەرناچن‌و تێیدا وەڕز نابن.

﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ﴾ ئەوانـەی بڕوایـان بەحـەق نیـەو کـافرن بـەخوداو بەپێغەمبـەرو بـەقورئان‌و سەرپێـچی پـەیامی پێغەمبەریان کردوەو شوێنی نەکەوتوون‌و لوتبـەرزییان نوانـدوە، ئەوانـە لای خـودا عـەزابی ریـسواکەریان هەیـە، عـەزابی بـەئێش‌و سـامناك‌و ریـسواکەر لەتۆڵـەی خۆبەزلزانی‌و گوێ نەدانیان بەحەق‌و راستی‌و پابەند نەبوونیان بەپەیامی قورئان. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر/٦٠).

## وادەو بەڵێنی خودا بەسەرخستنی کۆچکارانی جەنگاوەرو فیداکار بەبەهەشت

﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوا أَوْ مَاتُوا لَيَرْزُقَنَّهُمُ اللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ (٥٨) لَيُدْخِلَنَّهُمْ مُدْخَلًا يَرْضَوْنَهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ (٥٩) ۞ ذَلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنْصُرَنَّهُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٦٠)﴾

دوای ئـەوەی لەئایەتـەکانی پێـشوودا پـەروەردگار ئـەوەی بـاس کـرد: کـە رۆژی قیامەت موڵك‌و سەڵتەنەت هەر بۆ خودایەو هەر ئەو حوکم لـەنێوان بەنـدەکانی دا

دەكاو موسوڵمانان دەخاتـە نـاو بەهەشـتەوە. بەشـوێن ئـەوەدا وادەی خـوای بـۆ موسـوڵمانە كۆچـكارە جـەنگاوەرەكان رادەگەیـەنێ بۆیـەش بەتایبـەت نـاوی كۆچكارەكانی هێنا بۆ زێدە رێز لێنان و دڵخۆشكردنیان.

دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي سَبِيلِ﴾ ئەوانەی لەپێناو ئایینی خودادا كۆچیان كـردوە، زێـدو نیـشتمانی خۆیـان بـەجێ هێـشتووە، بـۆ رەزامەنـدیی خـودا وازیـان لەماڵ و حاڵی خۆیان هێنـاوە، دەسـتیان لـەمڵك و سامانی خۆیـان بـەرداوە، بـەهیوای پاداشی خودان.

﴿اللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوا أَوْ مَاتُوا﴾ پاشـان لـەو رێبـازەدا كـوژراون یـان بـەمردنی سروشـتی خۆیان گیانیان سپاردوە، ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمْ اللَّهُ رِزْقـاً حَـسَناً﴾ ئـەوە خـودا بەتەئكیـد رزق و رۆزیـی باشـیان دەداتـێ، بەهەشـتیان پـێ دەدا، فـەضـل و بەخششی خـۆی دەڕژێنـێ بەسەریان دا ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ الـرَّازِقِينَ﴾ بێگومـان خـودا باشـترین كەسـێكە رزق و رۆزیـی دەبەخـشێ، بـەبێ حیـساب و ئەنـدازە نـازو نیعمـەتی خـۆی دەدا بەكەسـانێك بیەوێ بیانداتێ. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِـن بَيْتِـهِ مُهَـاجِراً إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلى اللَّهِ﴾ (النساء/١٠٠)

لەئەنەسەوە ریوایەت كراوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((المقتول في سبيل الله والمتوفي في سبيل الله بغير قتل هما فى الأجر شريكان)) كەسێك لەپێناوی ئـایینی خودادا بكوژرێ، یان كۆچ بكاو بەمردنی سروشتی گیانی دەرچێ، ئـەوە هـەردوكیان لەپاداش دا چون یەكن،

ئـەمجار ئـەو ریزقـە حەسـەنە رون دەكاتـەوەو دەفـەرموێ: ﴿لَيُـدْخِلَنَّهُمْ مُـدْخَلاً يَرْضَوْنَهُ﴾ بێگومان خودا ئەو كۆچكارە جەنگاوەرە گیانبەخشانەی لـەرێبازی خـودادا گیانیان بەخشیوە، دەیانخاتە ناو شوێنێكەوە پێی رازین و هیچ رەخنـەیان لێـی نیـە، ئەو شوێنەش بەهەشتی پیرۆزە. چۆن رەخنەیان لێـی دەبـێ؟ خـۆ ئەوەنـدە خـۆش و دڵگیرە تەنانەت هیچ چاوێك لەوەپێش شوێنی ئـاوای نـەبینیوەو هـیچ گوێـچكەیەك شـوێنی ئـاوا خۆشـی نەبیـستوە بەسـەر دڵـی خـەڵكا بەخـەیاڵیش تـێ نەپـەڕیوە.

هـەروەکوو چـۆن تێـدا توشـی ناخۆشـیو تـەنگو چـەڵەمەیەك نـابن! وەکـوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلَا تَأْثِيماً، إِلَّا قِيلاً سَلَاماً سَلَاماً﴾ (الواقعة/٢٥-٢٦).

﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾ بێگومان خـودا زانـاو ئاگاداره بەوانـەی کەلەبـەرخاتری خوداو بۆ ڕەزامەندی ئەو کۆچ دەکـەنو جیهـاد دەکـەنو دەزانـێ شـیاوی چ پـاداشو بەخششێکن، دەزانێ نیازو مەبەستیان چیەو چۆنە، حەلیمو لێ خۆشبووه، لەتاوانی ڕابوردوویـان خـۆش دەبـێ، هـەروا حـەلیمو لێبـووردوه: بـەوه: کـەخێرا بـەدرۆ خەرەوەکان عەزاب ناداو مۆڵەتیان دەدا بۆ ماوەیەك بۆ ئەوەی بەخۆیان دا بچنەوەو تۆبە بکەنو ئیمان بهێنن.

﴿ذَلِكَ﴾ ئەو پاداشو بەهەشتە ڕازاوه خۆشـە بـۆ ئـەو کەسـانەیە: کەلـە ڕێگـای خـودادا دەکـوژرێن، یـان بـەمردنی سروشـتی خۆیـان لەغـەریبی دەمـرن! هـەروا لەدونیادا بەسەر دوژمنانیان دا زاڵیان دەکا؛ چونکە ﴿وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ اللَّهُ﴾ هەرکەسـێ لەموسـوڵمانان تۆڵـە لـەکافرو موشـریکەکان بکاتەوە بەئەندازەی ئەو ستەمەی لێی کراوە، شەڕیان لەگەڵ بکاو بـەرگری لـەخۆی بکا، پاشان ناچار بکرێ بـەوەی زێـدو نیشتمانی خـۆی بـەجێ بهێڵێ، لەسـەر مـاڵو ملکی خۆی هەڵی قەنن، ئەوە بێگومان خودا یارمەتی دەداو تۆڵـەی بـۆ لـەدوژمنانی دەسـێنێ، پـشتگیری لـێ دەکـاو زاڵـی دەکـا بەسـەریان دا شـیعاری (لا الـه الا الله) سەردەخاو شیعاری کافرەکان ژێر دەخا.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ بێگومان خودا لەموسوڵمانان خۆش دەبێ، وچاو پۆشـییان لێ دەکا ئەگەر تۆڵەیان ستاندنەوەو زێدەڕەوییان کرد. هـەروا خـۆش دەبـێ لەوانـەی شـوێن لێخۆشـبوونی خـودا ناکـەون: لـە لێخۆشـبوونەکە دەسـتدرێژی کـارو شـوێن ئارەزۆی خۆیان دەکەون: کەتۆڵە ستاندنەوەیە. چاوپۆشی دەکا لەتۆڵە سێنەرەکانو دەفـەرموێ: مـادام ڕێگـام داون تۆڵـە وەربگرنـەوە صـەرفی نـەظـەرتـان لێ دەکـەم!!

چونکە ئەوان بەتۆڵە ستاندنەوەکە، کاری ڕێگا پێدراوی خۆیان ئەنجام داوەو کاری باشتر: کەخۆڕاگری‌و عەفوو کردنی تاوانبارە پاشگوێیان خستووە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ (الشوری/٤٣) یان دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ (الشوری/٤٠) یان دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَعْفُواْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى﴾ (البقرة/٢٣٧) دەی کەسێك سەرباری ئەوەی کەعەفو کردن‌و لێبوردن لەستەمکار باشترە لەتۆڵ ستاندنەوە لێی، باشترەکەی نەکردو تۆڵەی ستاندنەوە، خودا لێی ناگرێ‌و عەفووی دەکا: چونکە خودا بۆ خۆی ڕێگای تۆڵە ستاندنەوەی داوە.

## برێ بەڵگە لەسەر بەتوانایی خودا

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ

لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ﴿٦٦﴾ ﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار باسـی گـەورەیی‌و بەدەسـەڵاتی خـۆی کـرد لەسـەر رەخساندنی سـەرکەوتن بـۆ موسـوڵمانان، ئـەمجار جۆرەها بەڵگە دێنێتـەوە لەسـەر بـەتوانایی خـۆی بەسـەر هـەموو شـتێك دا، جـا کەسـێك دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێك دا هەبێ‌و ئاگاداری هـەموو شـتێك بـێ، دیـارە دەتـوانێ یارمـەتی موسـوڵمانان بدا، دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئـەو سەرخستن‌و یارمەتیدانـە: کـەخودا بەموسـوڵمانانی دەبەخشێ ﴿بِأَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾ بـەهۆی ئەوەوەیـە: کەخودا شـەو دەخاتـە نـاو رۆژەوە واتـە: لەشـەو کـەم دەکاتـەوە، دەیخاتـە سـەر رۆژ، بەپێچەوانەشەوە رۆژ دەخاتە ناو شەوەوە بەم جۆرە لەشەو کەم دەکاتەوە، دەیخاتـە سەر رۆژ. دەکا ئەو ئەندازەیەیەی لەمیان زیادی دەکا لەوەی تریان کەمی دەکاتەوە. جاری واهەیە شەو درێژ دەکا رۆژ کورتە وەکوو لەپایزدا دەیبینی، وادەبێ رۆژ درێژ دەکا شەو کورتە وەکوو لەبەهاردا دەبیندرێ.

جا کەسێك دەسەڵاتی بەسەر ئـەو شـتانەدا بـشکێ بەتەنکیـد دەتـوانێ یارمـەتی ستەم لێ کراوان بدا، پاداشتی فەرمانبەردار بداتەوەو تۆڵە لەسەرپێچیکاران بسێنێ!

﴿وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە: کەپەروەردگار هەموو دوعـاو پاڕانەوەیـەك دەبیـسێ، هـەموو حـاڵ‌و وەزعێـك دەبینـێ، لـەزەوی‌و لەئاسمانـەکان دا هیچی لێ گوم نابێ.

ئەمــەش نیــشانەی ئەوەیــە: پــەروەردگار بەدیهێنــەری خــاوەن دەســەڵاتو تەصەڕوفە لەبوونەوەردا، چی بوێو چۆنی بوێ دەبێ بێتەدیو کەس نیە فەرمانو بڕیاری هەڵوەشێنێتەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، تُولِجُ اللَّيْلَ فِي الْنَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الَمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (ال عمران/٢٦-٢٧).

هۆی ئەم دەسەڵاتە رەهاو موطلەقە بێ سنوورە ئەوەیە: کەدەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ﴾ ئەو قودرەتو دەسەڵاتە بێ سنوورە، ئەو زانیاریو بیستنو دیتنە بەهۆی ئەوەوەیە: کەخودا حەقو ثابیتو بێ وێنەو بێ شەریکە، (واجب لذاتە) ی‌یەو سەرچاوەی وجودەو هیچ خودایەك نیە شیاوی خودایەتیو عیبادەت بۆکردن بێ جگە لەزاتی پاکی، چونکە هەر خودا خاوەنی دەسەڵاتی رەهایەو هەموو شتێکی بوونەوەر ئاتاجی ئەوەو گەردنکەچی ئەوە، جگە لەزاتی خودا هەموو خودا درۆزنەکانی تر بەتاڵو پووچن، جگە لەخودا هەرچی عیبادەتی بۆ بکرێ بەتاڵەو جگە لەخودا کەس توانای زیان لێ دوور خستنەوەو سوود پێگەیاندنی نیە، هەموو خاوەن دەسەڵاتێکی رواڵەتی زەلیلو بێچارەیەو لای خودا بێ تواناو دەسەڵاتە.

﴿وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ هەموو ئەو شتانەی باسکران هۆیەکەی ئەوەیە خودا بەرزو پیرۆزو شکۆمەندە بەسەر هەموو شتێك دا، هیچ کەس لەخودا شکۆمەند تر نیە، کەس لەو بەدەسەڵات تر نیە، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ (البقرة/٢٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ﴾ (الرعد/٩) ماناو مەبەستە سەرەکی یەکە ئەوەیە: دەفەرموێ: چۆن دەبێ بتپەرستو مادە پەرستان عیبادەت بۆ شتێك بکەن: کەناتوانێ زیان لەخودی خۆی دوور بخاتەوەو

قازانج بۆخۆی کێش بکا؟؟ چۆن ده‌بێ بتپه‌رستی بکه‌ن‌و واز له‌عیباده‌تی که‌سێك بهێنن: که‌هه‌موو کارێکی به‌ده‌سته‌و به‌سه‌ر هه‌موو شتێك دا بالاده‌سته؟!

﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾ ئه‌تۆ نابینی ئه‌ی ئاده‌میزاد! ئه‌ی بیسه‌ر! که‌په‌روه‌ردگار با ده‌نێرێ هه‌وره‌کان هه‌ڵده‌داو کۆیان ده‌کاته‌وه‌و لێکیان ده‌دا، ئه‌مجار بارانیان لێ ده‌بارێنێ، له‌ئاسمانه‌وه باران ده‌بارێنێ به‌سه‌ر زه‌وی وشك‌و تینوودا، ئیتر به‌و بارانه زه‌وی مردوو سوته‌مه‌رۆ زیندو ده‌بێته‌وه‌و به‌گژو گیا سه‌وز هه‌ڵده‌گه‌ڕێ، به‌گوڵ‌و گوڵزار ده‌ڕازێته‌وه، به‌جۆره‌ها ره‌نگ‌و دیمه‌ن زه‌وی خۆی ئارایش ده‌داو خۆی ده‌نوێنێ!

هه‌ڵبه‌ته بارینی باران‌و سه‌وز بوونی زه‌وی‌و رازاندنه‌وه‌ی به‌گوڵ‌و گوڵزار دیارده‌یه‌که‌و وه‌رزانه دووباره ده‌بێته‌وه، دووباره بوونه‌وه‌که‌ی گرنگی له‌به‌رچاوی ئاده‌میزاد که‌م ده‌کاته‌وه‌و چاومان پێوه‌ی راهاتووه‌و زۆر سه‌رنجمان راناکێشی،به‌لام کاتێك شاعیرێك به‌هه‌ستی ناسکی ئه‌و سروشته ده‌پشکنێ‌و سه‌رنجی خۆی ده‌داتێ له‌و دیمه‌نه جۆره‌ها هه‌ست‌و شعوورو ده‌وروژێنێ‌و دڵ‌و ده‌روون راده‌چه‌نێنێ! دڵ هه‌ست ده‌کا ئه‌م رووه‌که بچکۆله‌ی له‌م گڵه ره‌شه رسکاوه‌و ئه‌م ته‌ڕو تازه‌یی‌و گه‌شه‌و نه‌شمه‌یه‌ی پێوه‌یه‌تی، ده‌ڵێی منداڵی ساوایه بۆ سروشت پێ ده‌که‌نێ‌و له‌خۆشی‌و ته‌ڕده‌ماخی خه‌ریکه بفڕێ!!!

جا که‌سێك به‌م هه‌سته شاعیری‌و تێفکرینه سه‌رنج له‌ده‌شت‌و سارای وه‌رزی به‌هار بداو به‌م جۆره له‌گوڵ‌و گوڵزارو دیمه‌نه سروشتیه‌کان ورد بێته‌وه. ئه‌وکاته ده‌زانێ کۆتایی هێنانی ئایه‌ته‌که به‌ڕسته‌ی ﴿إِنَّ اللَّـهَ لَطِيـفٌ خَـبِيرٌ﴾ چه‌ند جوان‌و گونجاوه له‌گه‌ڵ پێشه‌وه‌که‌یدا.

بێگومان خودا به‌لوطف‌و لێزانی خۆی ئه‌و رووه‌که رسکاوه چه‌که‌ره کردوه، له‌ناو سکی زه‌ویدا به‌ده‌ستی قورده‌تی خۆی په‌روه‌رده ده‌کاو زه‌وی شه‌ق ده‌کاو سه‌ری پێ له‌ناو گڵ ده‌ردێنێ‌و پێی ده‌گه‌یه‌نێ، به‌قودره‌ت‌و ده‌سه‌لاتی خۆی له‌کاتی گونجاودا بارانی پێویست ده‌بارێنێ‌و ئاوو گڵ تێکه‌ڵ به‌یه‌ك ده‌کاو غیذای دره‌خت‌و

ڕوەك دابین دەكا! (سبحان الله! چ بەدیهێنەرێكە؟؟) ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ﴾ هەرچی لەئاسمانەكان‌و زەوی‌دا هەیە هەمووی ملكی خودایەو لەژێر دەسەلاتی ئەودایە، لەئاسمانی خۆیەوە بۆ زەوی خۆی بارانی خۆی دەبارێنێ‌و نەش‌و نما لەخاك دا پەید دەكاو بژیوو خۆراكی پێویست بۆ گیانلەبەران و بۆ ڕوەك‌و دارو درەخت بەهۆی بارانەوە لەزەوی پەیدا دەكا!

هەرچی لەئاسمانەكان‌و زەوی‌دا هەیە ملكی خۆیەتی‌و پێویستی بەهیچ شتێكیش نیە، زیندەوەران بەئاوو ڕووەك تێرو تەسەل دەكاو خۆراكیان بۆ دابین دەكا، پێویستی بەگیانلەبەران‌و بژێویشیان نیە! ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ بێگومان خودا موحتاجی هیچ شتێك نیەو هەموو شتێك ئاتاجی ئەوە، ئەمەش نیشانەیەكی ترە لەدەسەلات‌و توانای ڕەهای خودا، نیشانەی ئەوەیە: خودا بەسەر هەموو شتێك دا بالادەستەو لەژوور هەموو شتێكەوەیە. ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ﴾ ئایا نازانی ئەی ئادەمیزاد! كەپەروەردگار هەرچی لەزەوی‌دا هەیەبەگیاندارو بێ گیانیەوە بەكان‌و سەرچاوەو كشت‌و كاڵ‌و بەروو بوومیەوە لەفەضل‌و گەورەیی خۆیەوە. هەمووی بۆ ئێوە ژێر بار كردوە، بۆئەوەی بۆ بەرژەوەندی خۆتان بەكاریان بهێنن سوودیان لێ وەربگرن، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ﴾ (الجاثية/١٣).

﴿وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ﴾ هەروەها كەشتی بۆ ئێوە ڕام كردوە واتە: عەقڵی بەئێوە داوە كەشتی دروست بكەن، ئەمجار بەقودرەتی خۆی وای كردوە ئەم كەشتیە بەناو دەریادا بڕواو نقوم نەبێ، ئێوە بەئارەزۆی خۆتان لەم وڵات بۆ ئەو وڵات كاڵای خۆتانی پێ وەگوێزن، بەكاری بێنن بۆ بازرگانی‌و گەشت‌و گوزارو گەلێ شتی تر، شت‌و مەك‌و كاڵای ئەم وڵات بۆ ئەو وڵات بگوێزنەوە كەپێویستی پێی هەبێت وە بەپێچەوانەشەوە.

﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الأَرْضِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ ئاسمانی راگرتـووه بـه‌و هـه‌موو قه‌باره زه‌به‌للاحانه‌ی؛ كه‌تێیدان به‌خۆرو مانگ‌و باقی ئه‌ستێره‌كانی تره‌وه: كه‌هه‌ر خودا ده‌زانێ چۆن‌و چه‌ندن، هه‌موو ئه‌م قه‌باره قورسانه‌ی له‌حه‌وادا راگرتـووه، بـه‌هۆی هێـزی كێـشنده‌وه (الجاذبيـة) لێـك نـاده‌ن‌و ده‌عـه‌م ناكـه‌ن، هه‌ریه‌كـه‌یان له‌مـه‌دارو بـواری خۆیـدا دێـت‌و ده‌چـێ، هـه‌موویان (ماسـی ئاسـا!) له‌فـه‌ضـادا مه‌له‌ده‌كه‌ن. به ویست‌و توانای خۆی رایگرتوون‌و كۆنترۆڵی كردوون، ئه‌گـه‌ر مـه‌یلی لێ بووایـه رێگـای ده‌دا ئاسمـان به‌هـه‌موو ئـه‌و قه‌بارانـه‌ی تێیـدان به‌سـه‌ر زه‌وی‌دا ده‌كـه‌وت‌و چـی تێدایـه لـه‌ناو ده‌چـوو! وه‌لێ بـه‌لوطـف‌و مه‌رحه‌مـه‌تی خـۆی، ئـه‌و قه‌بارانه‌ی راگرتوون‌و ناهێڵێ به‌سه‌ر زه‌وی‌دا بكه‌ون‌و لێك بـده‌ن، تاكاتی دیـاریكراو كـه‌رۆژی قیامه‌تـه، ئه‌وكاتـه ئاسمانـه‌كان شـه‌ق ده‌بـه‌ن‌و ئه‌سـتێره‌كان هه‌ڵـده‌وه‌رن‌و كۆتایی دونیا دێ!! وه‌كوو ده‌فه‌رموێ: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ، وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ﴾ (الانفطار/١-٢).

ئه‌گه‌ر ئه‌و نیظامه ورده تۆكمه پته‌وه‌ی خودا نه‌بوایـه ئـه‌و قـه‌باره زه‌بـه‌للاح‌و بـێ ژمارانـه‌ی بوونـه‌وه‌ر له‌یـه‌كیان ده‌داو لێـك ده‌خـشان‌و خـاپوور ده‌بـوون هه‌رچـی له‌ناویان دا بوو له‌ناو ده‌چوو!!!

﴿إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ بێگومـان پـه‌روه‌ردگار ده‌ربـاره‌ی ئـاده‌میزادان - هه‌رچه‌نده سپڵه‌و پێنه‌زان‌و سته‌مكارن - به‌ره‌حم‌و به‌زه‌ییه، جوانی بوونـه‌وه‌ری بـۆ ره‌خساندون تا له‌رزه‌تی لێ وه‌ربگـرن، بـه‌تێرامان‌و لێ وورد بوونـه‌وه‌ی كـه‌یف خـۆش ببن، عه‌قڵ‌و هۆشی پێ داون بۆئه‌وه‌ی نیشانه‌كانی بوونه‌وه‌ر بكه‌نه به‌ڵگـه‌و نیـشانه له‌سه‌ر وجوودی خودای مه‌زن.

﴿وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾ پـه‌روه‌ردگار خودایـه‌كی وه‌هایـه ئێوه‌ی له‌نه‌بوونه‌وه دروست كـردوه گیـانی پـێ به‌خـشیون، پـاش ئـه‌وه‌ی ئێـوه هـیچ

نـەبوون بـەدی هێنـاون، پاشـان: کـەکاتی مـەرگتان هـاتو تەمـەنتان تـەواو بـوو دەتانمرێنێ. مردنیش خۆی لەخۆیدا بۆ ئێوە داپۆشەرو نیعمەتە.

﴿ثُـمَّ يُحْيِـيكُمْ﴾ پاشـان رۆژی قیامـەت ئێـوە زینـدو دەکاتـەوە بـۆ حیـسابو لێکۆڵینەوە بۆ پاداش وەرگرتنەوەو تۆڵە لێ ستاندنەوە.

﴿إِنَّ الإِنـسَانَ لَكَفُـورٌ﴾ بێگومـان ئـادەمیزاد سـپڵەو پێنەزانـەو ئینکـاری نیعمەتەکانی خودا دەکا بەسەریەوە، رێـزی ئـەو نیعمەتـە جۆراو جۆرانـە نـاگرێ: کەخودا پێی بەخشیون، واناکا بەهۆی ئەو نیعمەتانـەوە بگاتـە حاڵـەتێك عیبادەتی خـودا بکاو یەکتاپەرست بێ، واز لەبەندایـەتی کردنـی هـەموو شتێك بێنـێ جگـە لەبەندایـەتی کـردن بـۆ خـودا. بێگومـان ئـەو نەفخـە گیانییـەی یەکـەمجار لـەئادەم پەیدا بوو مەعجیزە بوو، لەهەر شتێکی تریش دا کەپەیـدا دەبێ موعجیزەیـە هـەر ئـەو موعجیزەیـە لەهـەموو زینـدوێك دا سـات دوای سـاتو رۆژانـەو شـەوانە تـازە دەبێتەوە، ئائەو نەفخە گیانییە نهێنی‌یەکەو تا ئێستاو لەمەدواش زاناو نەزان تێیدا سـەرگەردانو نـازانن چیەو چۆنە. هەڵـدەگرێ لێـی ورد ببینـەوەو سـەرنجی بـیرو هۆشی خۆمانی تێـدا خـەرج بکـەین مـردنیش نهێنـی‌یـەکی تـرە عـەقڵی ئـادەمیزاد ناتوانێ دەرکی بکا، ناگەهان پەیدا دەبێو یەخەی دەگرێو تێکیەوە دەپێچێ!! نێوان مـردنو گیـانو سروشـتی هـەردوکیان مەسافەیەکی دورو درێـژەو جێگـای سـەرنجو تێفکرینـە. زینـدو بوونـەوەی دوا مـردنیش نهێنـی یـەکی تـری خەزێنـەی غـەیبی پـەروەردگارە، پەیـدابوونی ئـەویش جێگـای سـەرنجدانەو حـەق وایـە بـیری لـێ بکەینـەوە. بـەڵام ئـادەمیزاد کـافرەو گوێ بـەو هـەموو بەڵگـەو نیـشانانە نـاداو بـیر لەپەیدا بوونی خۆیو گیـان پـێ بەخـشینی خـۆی ناکاتـەوەو نایکاتـە بەڵگـە لەسـەر زیندوبوونەوەی دوای مردنو پەند ئامێز نابێ وەکوو لەئایەتێکی تـردا دەفـەرموێ:
﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِـيكُمْ ثُـمَّ إِلَيْـهِ تُرْجَعُـونَ﴾

(البقرة/٢٨) یان ده‌فه‌رمویّ: ﴿قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ (الجاثية/٢٦).

## هه‌موو گه‌ل‌و نه‌ته‌وه‌یه‌ك شه‌ریعه‌ت‌و ڕێبازێكی هه‌یه په‌یڕه‌وی ده‌كه‌ن

﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾

ده‌ڵێن: هۆكاری نازڵ بوونی ئایه‌تی (٦٧) ئه‌وه بووه كافره‌كان كێشه‌و جیدالیان ده‌رباره‌ی گۆشتی مرداره‌وه بوو نایه‌وه، به‌موسوڵمانه‌كانیان گوت: ئێوه كوشتی خۆتان ده‌خۆن، ئاژه‌ڵێك خۆتان سه‌ری ببڕن گۆشته‌ی ده‌خۆن، كه‌چی گۆشتی ئه‌و ئاژه‌ڵه ناخۆن كه‌خودا ده‌یكوژێ! مه‌به‌ستیان مرداره‌وه بوو بووه، یان به موسوڵمانه‌كانیان گوت: ئه‌وه چیتانه ئه‌وه‌ی بۆ خۆتان ده‌یكوژن گۆشته‌كه‌ی ده‌خۆن؟ كه‌چی ئه‌وه‌ی خودا ده‌یكوژێ گۆشته‌كه‌ی ناخۆن؟! حه‌ق وابوو: ئه‌وه‌ی خودا ده‌یكوژێ باشتری بخۆن له‌وه‌ی به‌كێردی خۆتان سه‌ری ده‌برن!! ئیتر ئه‌م ئایه‌ته نازڵ بوو!

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: پەروەردگار لەوە پێش باسی نیعمەتەکانی خۆی کردو ئەوەی راگەیاند: کەبەسۆزو بەبەزەیی یەبۆ بەندەکانی، هەرچەندە هەندێکیان کافرن‌و بڕوایان بەهەبوونی خودای تاك‌و تەنها نیەو سوپاسی نیعمەتەکانی ناکەن. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا نەهی لەوانە دەکا کەهاوچەرخی پێغەمبەرن لەخاوەن نامە ئاسمانییەکان: کەچی دی کێشەو دەمە دەمێ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نەکەن‌و رەخنە لەشەریعەت‌و یاسای ئیسلام نەگرن، ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا: کەبەردەوام بێ لەسەر گەیاندنی پەیامی حەق‌و راستی خۆی.

دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ﴾ ئێمە بۆ هەموو گەل‌و نەتەوەیەك شەریعەت‌و یاساو رێبازی گونجاومان داناوە، یاساو شەریعەتی هەموو گەل‌و نەتەوەیەکمان واداناوە: کەلەگەڵ رۆژگارو ناوچەکەیان دا بگونجێ. لەهەمان کات دا لایەنی (تطور)و کامڵ بوونی عەقڵی ئادەمیزادیشمان بەرچاو گرتووە. هەرکەسێ سەیری ئایینە ئاسمانییەکان بکا بۆی دەردەکەوێ پەروەردگار تەوراتی بۆ سەر موسا ﷺ نازڵ کردوە جۆرە توندو تیژییەکی تێدایە بۆ چارەسەرکردنی مادده پەرستی‌و بۆ راپەراندن‌و ورە بەرزکردنەوەی بەنو ئیسرائیلی دژی ستەم. پاشان ئینجیلی ناردوە بۆ حەزرەتی عیسا ﷺ، گرنگی زۆری داوە بە لایەنی رۆحی‌و گرنگی دان بەکاکڵەی ئایین‌و خودا پەرستی پاشان کەعەقڵی ئادەمیزادیی پێگەیی‌و کامڵ بوو حەزرەتی موحەممەدی ﷺ کردە پێغەمبەرو قورئانی بۆ نارد، بۆ چەسپاندنی بنەمای حەق‌و عەدالەت‌و گرنگی دان بەلایەنی رۆحی‌و ماددی بەیەکەوە، پێ داگرتن لەسەر گرنگی عیلم‌و زانیاری، بەکارهێنانی عەقڵ‌و گرنگی دان بەگەشە کردنی، بەم جۆرە ئیسلام یەکەم ئایینێکی ئاسمانییە بناغەی حەضارەتی بەتێرو تەسەل بۆ ئادەمیزاد داناوە، شەریعەت‌و یاساکانی میانەڕەوەو هەموو لایەنێکی ژیانیان بەرچاو گرتووە.

ئایینەکانی تر بەکەڵکی کۆمەڵگایەکو دێتو بۆ ماوەیەك گونجاوە پەیڕەوییان بکرێ، بەڵام ئایینی ئیسلام ئاینێکی تێرو تەسەڵو گشتگیرو گونجاوەو بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەکە، بەکەڵکی هەموو رۆژگارێك دێ.

دەی کەوابێ ﴿فَلا يُنَازِعُنَّكَ فِي الأَمْرِ﴾ بائەو هاوچەرخانەت دەربارەی ئایین کێشەت لەگەڵ نەکەن، بۆ هەموو گەلو نەتەوەیەك شەریعەتێکی تایبەتی گونجاو بۆ ئەو رۆژگارەی تێ یدا هاتووە هەبووە.

قورئانمان ناردۆتە خوارێ هەموو ئایینەکانی تری نەسخ کردۆتەوە چونکە دەوریان بەسەر چووە بەکەڵکی کارپێکردنو پەیڕەوی کردن نایەن، ستۆك بوون.

کەوابێ ئەتۆش ئەی موحەممەد! دلگران مەبە بە کێشەو دەمە دەمێی ئەوانەی رەخنە لەپەیامەکەت دەگرنو بەربەرەکانیت دەکەن، باهەڵوێستو کێشەو جیدالی ئەوان ئەتۆ لەرێبازی پیرۆزی خۆت لانەدا، لەسەر پەیامی خۆت بەردەوام بەو سووربە لەسەر گەیاندنی بەخەڵك، ﴿وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ﴾ ئەو کێشەکارو هەڵوێست خوارو بیرچەوتانەو کەسانی تریش بانگەوازیی بکە بۆ رێبازی خودا، هەموو ئادەمیزاد بانگ بکە بۆ ئایینی حەقو راست، خۆت بەکێشەو دەمە دەمێ ی ئەوان هەڵەوگیر مەکە. هەلیان بۆ مەرەخسێنە موجادەلەت لەگەڵ دا بکەن. سەرگەرمی بانگەوازی کردنی خۆت بە ﴿إِنَّكَ لَعَلَى هُدًى مُسْتَقِيمٍ﴾ بێگومان تۆ ئەی موحەممەد! لەسەر رێبازێکی راستو حەقی، دڵنیابە لەراستی رێبازو پرۆگرامت، هەرکەسێ شوێنت بکەوێ دەگاتە مەبەستو، کامەرانیو سەربەرزی دونیاو قیامەت بەدەست دێنێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنْ آيَاتِ اللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ وَادْعُ إِلَى رَبِّكَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (القصص/٨٧) ئەمە رێبازی تۆیەو پابەندی بە ﴿وَإِنْ جَادَلُوكَ فَقُلْ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ ئەگەر ئەوانە رویان لەبەڵگەو دەلیلی راست وەرگێراو رویان کردە کێشەو جیدالو دەمە دەمێ، لەگەڵیان پێدا مەچۆ، بەڵکوو بەکورتی بیبڕەوەو کاتی خۆت بەجیدال بەفیڕۆ مەدە. بەشێوەی

هەڕەشەو ترساندنیان بڵێ: خودا دەزانێ چی دەکەن‌و هەڵوێستتان چۆنە، هەروا ئاگاداری کردەوەو هەڵوێستی منیشە، ڕۆژی قیامەت هەرکەس بەگوێرەی کردەوەو هەڵوێستی خۆی پاداش دەدرێتەوەو تۆڵەی لێ دەسێنرێتەوە؛ خۆت بەکێشەو جیدالەوە هەڵەوگێڕ مەکە چونکە جەدەل‌و کێشە کاتێك سوودی هەیە: کەدڵەکان ئامادەباشی هیدایەت وەرگرتن‌و دۆزینەوەی حەقیان تێدا بێ، بەڵام ئەگەر ئەوانە دڵیان ڕەق بوو سوور بوون لەسەر کوفرو گومڕایی، جەدەل‌و کێشە بێ سوودە. پێویست ناکا درێژە بەجیدالەکە بدەی. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (یونس/٤١) چونکە دوای ئاراستە کردنی ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانە جگە لەم جۆرە هەڕەشە کردنە هیچی تر گونجاو نیە پێیان بگوترێ.

بۆیە دوا بەدوای ئەوە فەرموی: ﴿اللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: پەروەردگار ڕۆژی قیامەت حوکم‌و بڕیاری خۆی دەردەکا لەنێوان ئێوەی موسوڵمان‌و کافرەکان دا دەربارەی بیرو باوەڕو کاروبارێ کەئێوە تێیدا کەوتوونە کێشەوە. پاداش‌و سزای هەموو لایەکتان یەکالآدەکاتەوە، پاداشی بەهەشت بۆ خودا پەرستان‌و ئاگری دۆزەخ بۆ بێ باوەڕان. جائەوکاتە دەزانن کێ حەقەو کێ هەڵەیە، کێ ڕاست دەکاو کێ درۆ دەکا!

بەکورتی‌و پوختی فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکا، هەروا بەهەموو بانگخوازانی ڕێگای ئایین‌و خودا پەرستی: کە بەردەوام بن لەسەر بانگەوازی کردن بۆ شەریعەتی پەروەردگارو ئایینی خودا پەسند، هیچ گوێ بەجیدال‌و دەمە دەمێ ی کافرو بێ بڕوایان نەدەن، چونکە بانگخوازانی حەق ڕێگایان ڕۆشن‌و ئاشکرایەو داشیان سوارەو بەڵگەیان بەهێزە، پشتیان بەهێزی خودا قایم‌و پتەوە.. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَقُلْ

﴿آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ (الشورى/١٥).

ئەمجار پەروەردگار هەواڵی کەماڵی زانیاری خۆی دەدا بەرامبەر دروستکراوانی، ئەوە رادەگەیەنێ: کەزانیاری تەواوی هەیە بەبوونەوەر پێش دروستکردنیو دوا دروستکردنی، هەروا زانیاری تەواوی هەیە بەوەی کێ شیاوی تۆڵەو سزایە! دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾ ئایا نەتانزانیوە ئەی پێغەمبەر! ئەی بیسەر!؟

واتە: زانیوتەو دەزانی: کەخودا زانیاری تەواوی هەیە بەوەی لەئاسمانو زەویدا هەیە، بەئەندازەی گەردیلەیەکو کەمترو زیاتریش هیچ شتێکی لەئاسمانەکانو زەویدا لێی گوم نابێو ئاگای لەهەموو شتێکە، تەنانەت پێش ئەوەی بوونەوەریش بێنێتە ئاراوە، هەر ئاگاداری تەواوی دەربارەی هەموو شتێك هەبوە.

﴿إِنَّ ذَلِكَ فِي كِتَابٍ﴾ پەروەردگار هەموو زانیارییەکی لەلەوحولمەفوظ دا نوسیوەو. چی روی داوەو چی رودەدا تارۆژی قیامەت هەمووی لەو کتێبە گەورەیەدا کەناوی لەوحولمەحفوظە نوسیوەو چەسپاندویەتی، ﴿إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ بێگومان زانیاری تەواو و گشتی دەربارەی هەموو شتێك، هەروا یەکالاکردنەوەی ئاکامی بەندەکانی لە رۆژی قیامەت دا لەسەر خودا ئاسانەو هیچ پێیەوە ماندو نابێ.

## برێ کار پووچی موشریکەکانو تەحەددا لێکردنیان بەوە کەبتەکانیان بتوانن مێشێك دروست بکەن

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ

ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ئەوەی روون کردەوە: کە خوای زاناو دانایەو ئاگاداری هەموو شتێکە، ئەمجار ئەوە رون دەکاتەوە: کە عیبادەتکردنی موشریکەکان بۆ غەیری خودا شتێکی بێ بناغەو بێ بەلگەیە، هیچ بەلگەیەکی عەقلّی و نەقلّییان

بەدەستەوە نیە. ئەوانە وێڕای گێلیو نەفامی خۆیان هەرکاتێ ڕێگای ڕاستو حەقیان نیشاندرا، ئایەتی قورئانیان بەسەردا خوێندرایەوە، دەمو چاویان ڕەش هەڵدەگەڕێو ڕقیان هەڵدەستێو فسقەڵ دەبنو خەریکن پەلاماری قورئانخوێنو ئامۆژگاریکەرەکان بدەن. بەڵام باباش بزانن: ئەوەی لەقیامەت دا تووشیان دێ گەورەترو سامناکترە.

ئەمجار دوای ڕونکردنەوەی ئەوە: کە ئەو کافرانە جگە لە خودا شتێك دەپەرستن هیچ بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی نیە لەسەر خودایەتییان، باسی پڕو پووچی بیرو باوەڕو بۆچونیان دەکا، ئەوە دەچەسپێنێ: کەئەوانە نەفامنو نازانن گەورەیی خودا چۆنە. ئەمجار لەباسی ئیلاهییاتەوە دەگوێزێتەوە بۆ باسی پێغەمبەرایەتی، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە: کەپەروەردگار لەئادەمیزادو فریشتە کەسانێك هەڵدەبژێرێ کەشیاو بن بۆ فرستادەییو گەیاندنی پەیامی خۆی وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ (الأنعام/١٢٤).

جا کەلەوە پێش فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کەهەل بۆ موشریکەکان نەڕەخسێنێ جیدالو دەمە دەمێ ی لەگەڵ دا بکەن، ئەمجار پەردە لەسەر مەنهەجی موشریکەکان هەڵدەداتەوە، خواریو پوچیو نەزانیو ستەمکارییان دەخاتە ڕو، ئەوە دەچەسپێنێ.. کە ئەوانە بێ بەشن لەیارمەتی دانی خوداو کەس پاڵپشتیان نیە. دەفەرموێ:

١- ﴿وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَمَا لَيْسَ لَهُمْ بِهِ عِلْمٌ﴾ ئەو موشریکە نەفامانە عیبادەت لەغەیری خودا بۆ شتێك دەکەن، هیچ بەڵگەیەکی عەقڵیو نەقڵییان بەدەستەوە نیە لەسەر ڕاستی عیبادەت بۆ کردنیان، پەروەردگار هیچ نیگاو سروشی نەناردۆتە خوارێ عیبادەت بۆ کردنیان بەڕەوا بزاندرێ. جا وەکوو بەڵگەی نەقڵیو بیستراویان بەدەستەوە نیە بەڵگەی عەقڵیو مەنطیقیشیان بەدەستەوە نیە، کەوابوو ئەوان کوێرانە بتپەرستی دەکەنو لاسایی باوكو باپیرانیان دەکەنەوە، نەفامو نەزانو کەودەنن.

ئه‌وانه عیبادەت بۆ چه‌ند بت‌و صه‌نه‌مێك دەكه‌ن، یان ئاده‌میزاد دەپه‌رستن یان شه‌یتان دەكه‌نه رێ نیشانده‌ری خۆیان، ئه‌مانه هه‌موویان به‌تاڵ‌و پوچن له‌خوداوه یارمه‌تی نادرێن، بێ به‌ڵگه‌و ده‌لیلن، خه‌رافات‌و پوچ‌و بێ بناغه‌ن! ئه‌وانه به‌و هه‌ڵوێست‌و بتپه‌رستییه‌یان سته‌م له‌خودی خۆیان دەكه‌ن. ﴿وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ نَصِيرٍ﴾ ئه‌و كاره سته‌مكارانه، له خوداوه یارمه‌تیده‌ریان نیه، كه‌س نیه بتوانێ ئه‌و عه‌زابه‌ی له‌خوداوه بۆیان بڕیاردراوه لێیان دوور بخاته‌وه، نه‌هێڵێ عه‌زابی خودا بیانگرێته‌وه.

٢- له‌هه‌موو شتێك سه‌یرو سه‌مه‌ره تر ئه‌وه‌یه ئه‌وان عیبادەت بۆ شتێك دەكه‌ن، كه هیچ به‌ڵگه‌یه‌ك نیه له‌سه‌ر عیبادەت بۆ كردنی له‌هه‌مان كات دا گوێ ڕاناگرن بۆ بانگه‌وازیی حه‌ق‌و ڕاستی، هیچ ئامۆژگاریی‌و بانگه‌وازییه‌ك قبووڵ ناكه‌ن، به‌ڵكوو به‌بانگكردن‌و ئامۆژگاری زیاتر شێلگیر دەبن‌و سه‌ركه‌شی ده‌یانگرێ‌و پشت هه‌ڵ دەكه‌ن ئه‌وه‌تا ﴿وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنْكَرَ﴾ هه‌ركاتێ ئایاتی قورئان به‌سه‌ر ئه‌وموشریكانه‌دا بخوێندرێته‌وه، به‌ڵگه‌و ده‌لیلیان بۆ بهێندرێته‌وه له‌سه‌ر تاك‌و ته‌نهایی خوداو ڕاستی پێغه‌مبه‌رایه‌تی، ده‌م‌و چاویان ره‌ش داده‌گیرسێ‌و نیشانه‌ی ڕق‌و فسقه‌ڵییان پێوه دیاره‌و دڵیان پڕ ده‌بێ له‌ڕق‌و كینه‌و چاویان لێ ده‌چێته پشتی سه‌ر، مووی جه‌سته‌یان گرژ ده‌بێ. ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾ نزیكه هه‌ڵمه‌ت بۆ ئه‌وانه به‌رن؛ كه‌له‌قورئانه‌وه به‌ڵگه‌ی ڕاست‌و دروستیان بۆ ده‌خوێننه‌وه، ده‌ستیان بۆ درێژ ده‌كه‌ن‌و خه‌ریكن پركێشیان بكه‌نێ‌و به‌زمانی درێژیان كه‌زافیان لێ ده‌كشێن، ئه‌مه‌ش نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه: كه‌دڵیان به‌كوفرو بێدینی ده‌كوڵێ‌و هه‌ڵده‌چێ‌و به‌ڕق‌و كینه سه‌ر ده‌كا، نه‌فامی‌و سه‌ر ڕه‌قی‌و كوفرو بێدینی به‌سه‌ر دڵ‌و ده‌رونیان دا زاڵه.

هه‌تا وایان لێ هاتووه له‌ئیمانهێنانیان نائومێد بێ! چاره‌سه‌ریان به‌تۆ نه‌كرێ، وایان لێ هاتووه له‌پێغه‌مبه‌رو موسوڵمانان یاخی بن!!!

﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُمْ بِشَرٍّ مِنْ ذَلِكُمْ ؟﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: ئایا گوێ رادەگرن تا هەواڵتان بدەمێ بەخراپتر لەو خەمو خەفەتەی تووشتان دێ بەهۆی خوێندنەوەی قورئان بەسەرتان دا؟ ئەم رقو کینەی ناو دڵتانو ئەو نارەحەتیەی لەئامۆژگاری کردنو خوێندنەوەی قورئان بەسەرتان دا تووشتان دەبێ لەبەرامبەر ئەو عەزابەی رۆژی قیامەت تووشتان دێ هەر بەهیچ دەژمێردرێ، خەبەرتان بدەمێ بەخراپتر لەو ناخۆشیەی لەدونیادا لەئاکامی بانگەوازی کردنتاندا بۆ خودا پەرستی تووشتان دێ؟!

﴿النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئەویش ئاگری دۆزەخە: کە خودا وادەی داوە بەوانەی کافرن بیانخاتەناویو خراپترین شوێنە.. ئاگری دۆزەخ زۆر سامناکترەو کوشندە ترە لەوەی خۆشەویستانی خودای لەدونیادا پێ دەترسێنن، ئەو ئاگرەی خودا وادەی داوە: کەبەنسیبی ئەوانەی بکا: کەکافرو خودا نەناسن، بەراستی دۆزەخ خراپترین سەرەنجامو شوێنی حەوانەوەیە بۆ کافرە موشریکەکان. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً﴾ (الفرقان/٦٦).

ئەمجار پەروەردگار موشریکەکان ئاگادار دەکاتەوە لەسەر هیچو پووچی بتەکانیانو گێلو بێ عەقڵی ئەوانەی دەیانپەرستنو بەخودایان دەزانن، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ﴾ ئەی ئادەمیزادینە! نموونەو مەثەلێك هێنراوەتەوە گوێی بۆ بگرن، نموونەی ئەو بتانەی نەفامو کافرەکان عیبادەتیان بۆ دەکەن لەجیاتی خودا، هێنراوەتەوە لێ ی ورد ببنەوەو حاڵو وەزعی ئەو بتانە تەماشا بکەن، تێیان بفکرن، جا کەلەوان حاڵی بوونو چاك ناسیتانن، ئەوە حاڵی پەرستکارەکانیان خراپترەو ئەوان لەبتەکانیان هیچو پووچ ترن، چونکە ئەوان بەدەستی خۆیان دارو بت دەتاشنو دەیانکەن بەخودای خۆیان!!

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوْ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾ ئەوانەی ئێوە جگە لەخودا، دەیانپەرستن ئەی بتپەرستینە! توانای دروستکردنی مێشێکیان نیە،

تەنانەت ئەگەر هەموو پەرستراوەکانتان کۆببنەوە تێکڕا کۆمەکی یەکتر بکەن‌و بەهەموانیان ناتوانن تاقە یەك مێش دروست بکەن!

بێگومان دروستکرنی مێش بەنیسبەت غەیری خوداوە وەکوو دروستکردنی حوشترو فیل‌و کەرکەدەن مەحاڵە. چونکە مێش وەکوو گیانلەبەرانی تر ئەو نهێنیە سەر سووڕهێنەرەی تێدایە، کەپێی دەگوترێ گیان، گیانیش نهێنیەکە هەموو مەخلوقات لەئاستی دا دەستە پاچەو بێ دەسەڵاتن‌و هیچ کەس جگە لەخودا نازانێ گیان چیەو لەچی پەیدا دەبێ‌و چۆن پەیوەندی بەلاشەوە دەکاو لەکوێوە دێ. کەوابوو دروستکردنی هەموو گیانلەبەرێك بۆ غەیری خودا وەکوو یەك مەحاڵە، وەلێ قورئان کەلەناو گیانلەبەران دا باسی مێشی کردوە، چونکە بچکۆلەو هیچ‌و پووچ‌و ڤێزەون‌و هەمیشە لەبەرچاوە، دەی دەسەوەسانی لەئاستی دروستکردنی ئەو گیانلەبەرە هیچ‌و پووچە، زیاتر سێبەری بێ تونایی دەخاتە زیهنەوەو پتر بێ دەسەڵاتی بتەکان دەخاتە ڕو تائەو گیانلەبەرە گەورانە! ئەگەر ئێمە لەکوردەواری خۆمان دا باسی بێ دەسەڵاتی کابرایەك بکەین، دەڵێین: (فلان کەس مێشی پێ لەئاو ناکرێ) یان مێشێکی پێ ناکوژرێ!

ئەمجار قورئان هەنگاوێکی گرنگتر دەهاوێژێ‌و نموونەیەکی تری بێ دەسەڵاتی دەهێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئاً لا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ﴾ ئەو خودا درۆزنانە هێندە بێ دەسەڵات‌و دەسەوسانن تەنانەت ئەگەر مێش شتێکیان لێ بفڕێنێ ناتوانن فڕێندراوەکە رزگار بکەن، جائەو بەخودا زانراوو پەرستراوانە ئەگەر دارو بەردو مادەی بێ گیان بن، ئەوە ئاشکرایە توانای ئەوەیان نیە ئەگەر مێش شتێکیان لێ بفڕێنێ لێی بسێننەوە، خۆ ئەگەر پەرستراوەکان ئادەمیی‌و گیانلەبەریش بن، دووبارە ناتوانن شتێك مێش لێیان دارنێ لێی بستێننەوە!

تەعبیری قورئان مێشی هەڵبژاردوە بۆ ئەم شوێنەو ئەوی بەنموونە هێناوەتەوە، هەرچەندە ئەو گیان لەبەرێکی ڤێزەون‌و هیچ‌و پووچە، کەچی وێڕای هیچ‌و پووچی‌و کەمبایەخیشی خەتەرترین نەخۆشی هەڵدەگرێ، بەقیمەترین شت

لەئادەمیزاد دەرفێنێ‌و ناتوانێ بەرگری لەخۆی بکا بەرامبەر هەڵمەتی مێش، چاوو بینایی لەئادەمیزاد دەستێنێ، جاری وادەبێ گیانیان لێ دەستێنێ‌و کۆتایی ژیانی زیندەوەر دەهێنێ!

مێش هەڵگری نەخۆشی سیل‌و تیفۆئیدو دوسنتاریایەو چاو ئێشەی پێوەیە، گەلێك میکرۆبی تری سامناکی پێیەو بەهۆی ئەو میکرۆبانەوە چەند شتی گرنگی خۆشەویست لەئادەمیزاد دادەڕنێ‌و تازە ئەوەی بردی لێی ناسەندرێتەوە. بۆنی خۆش دەفڕێنێ، لەشساغی‌و بینایی دەبا ئەوەی فڕاندی تازە ناگەڕێتەوە.

بەڵێ بەهۆی پێشکەوتنی باری تەندروستی‌و داوو دەرمان‌و پزیشکی یەوە، هەندێ لەتەندروستی‌و لەش ساغی پەیدا دەبێتەوە، وەلێ ئەو تەندروستی‌و لەش ساغیەی پەیدا دەبێتەوە شتێکی تازەیەو کۆنە فڕێندراوەکە نیە.

ئەمەش راستییەکی ترە ئوسلووبی قورئان بەکاری هێناوە، ئیختیاری ئەو گیانلەبەرە هیچ‌و پووچەی کردوە، خۆئەگەر بیگوتایە ((وان یسلبهم السباع شیئاً لایستنقذوه منها..)) ئاماژەی هێزو توانای تێدا دەبوو، ئەوکاتە دەسەوەسانی بت‌و صەنەمەکانی بەباشی نەدەگەیاند! ئەمجار لەکۆتایی دیمەنەکەدا ئەم رستەیە دەهێنێ‌و بۆ زێدە دامەزراندنی وێنەکەو دەفەرموێ: ﴿ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ﴾ داواکار کەبت‌و صەنەمەکانن بۆ گەڕاندنەوەی ئەو شتەی لێیان فڕێندراوە داوا لێکراو کەمێشەکەیە، یان داواکار کە پەرستشکارەکەیەو داوالێکراو کەبتەکەیە هەردولایان لاوازو دەسەوەسان‌و هیچیان لەباردا نیە!

ئەمەش ئەوپەڕی نەزانی‌و گێلی بتپەرستەکان نیشان دەدا، چونکە بەڕواڵەت عیبادەتکار تەماعی کێشکردنی سوودو دوورخستنەوەی زیانی بەعیبادەت بۆ کراوەکە هەیە. دەی بتپەرست هیچ سوودێکی لەبتەکەوە پێ ناگا، ئەمەش نیشانەی هیچ‌و پووچی بتەکان‌و گێلی بتپەرستانە!

دەی کەوابێ بەچ عەقڵێك‌و بەچ رویەك ئەو بتانە دەکرێن بەهاوشانی خودا لەعیبادەت بۆ کردن دا. بۆیە پەروەردگار جەخت لەسەر گێلی‌و نەفامی بتپەرستان

دەكاتەوەو دەفەرمووێ: ﴿مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ ئەوانە وەكوو پێویست خودایان نەناسیوە، ڕێزیان بۆ خودا دانەناوە بەجۆرێك كەشایانی ئەو بێ، ئەوەتا ئەو بتە بێ دەستەڵاتانەیان كردون بەهاوشانی خودا؛ ڕێزو تەقدیری شیاویان بۆ خودا دانەناوە، وازیان لەپەرستنی ئەو خودا حەقو خاوەن دەسەڵاتە هێناوە، ڕوویان كردۆتە پەرستنی ئەو دارو بەردە هیچو پووچانە: كەدەسەڵاتی مێشێكیان نیە!

﴿إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ بێگومان خودا بەهێزو تواناو دەسەڵاتە، بەهێزو توانای خۆی بوونەوەری هێناوەتە دی. عەزیزو باڵادەستە، هەموو شتێكی گەردنكەچ كردوە، هەموو شتێك لەژێر دەسەڵاتیدا زەبوون بێ وەجە، زەلیلو كەساسە! كەوابوو هەر ئەو شیاوی عیبادەت بۆ كردنو ڕێز لێنانو پەرستش بۆ كردنە!

بەڵێ ئەوانە وەكوو پێویست خودایان نەناسیوەو ڕێزو تەقدیریان لێ نەناوە، وەلحاڵ ئەوانە هەموو كاتێ ئاثاری دەسەڵاتی خودا دەبینن، دەست ڕەنگینی خودا لەبوونەوەردا هەست پێ دەكەن! كەچی شتێك دەكەن بەهاوەڵو هاوشانی تەنانەت مێشێكیشی بۆ دروست ناكرێ، نەك هەر ئەوە بەڵكوو ئەگەر مێشێك شتێكیان لێ بڕفێنێ بۆیان ناگەڕێنرێتەوەو ناتوانن بەرگری لەخۆیان بكەن!

پاش باسكردنی تاكو تەنهایی خوداو چەسپاندنی صیفاتی كەمالو جەمال بۆ زاتی پاكی، دەگوێزێتەوە بۆ سەرباسی پێغەمبەرایەتیو دەفەرمووێ: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ﴾ واتە: پەروەردگار لەناو فریشتەدا هەندێك هەڵدەبژێرێ بۆئەوەی بیانكاتە فرستادەی خۆیو نیگابەرن بۆ پێغەمبەران، لەناو ئادەمیزادیش دا كەسانێك هەڵدەبژێرێ بۆئەوەی بیانكاتە ڕەوانەكراوی خۆی بۆسەر گەلو نەتەوەكانی ئادەمیزاد، ئەمەش بەویستو ئیرادەی خۆی ئەنجامی دەداو چۆنی بوێو كێ ی بوێ ئەوە هەڵدەبژێرێو ئاوا دەنێرێ، كەس نیە ڕەخنەی لێ بگرێو بەرهەڵستی بكا!

﴿إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ بێگومـان خـودا شـنەوایە بـۆ گوفتـاری بەنـدەکانی، زانـاو بینایە پێیانو دەزانێ کێ شیاوی پێغەمبەرایەتیو بەکەڵکی هەڵگرتنی ئەو ئەرکە پیرۆزە دێ.

﴿يَعْلَـمُ مَـا بَـيْنَ أَيْـدِيهِمْ وَمَـا خَلْفَهُـمْ﴾ زانیـاری تـەواوی بـەحاڵو چـۆنیەتی فریشتەکانو پێغەمبەرەکان بەتایبەتیو ئادەمیزادان بەگشتی، رابووردوویـانی ئاگا لێیەو داهاتوویان دەزانێ، هیچ شتێکی کەمو زۆر پچووكو گەورە دەربـارەی ئـەوانی لێ نهێنی نیە. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفـەرموێ: ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَـى غَيْبِـهِ أَحَداً﴾ (الجن/٢٦) هەموو شتێکی مەزنـدە کردووەو ژماردوویەتی.

﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الأُمُورُ﴾ گەڕانـەوەی هـەموو شـتێك هـەموو حـوکمو بڕیارێـك، هەموو فەرمانو جڵە گیرییەك لەرۆژی قیامەت دا هـەر بـۆلای خودایـەو کەسـی تـر هیچی بەدەست نیە! کەوابوو هەرئەو شیاوی عیبادەت بۆ کردنە، هـەر ئـەو خـودای حەقو راستە!!

## فەرمانو حوکمە شەرعییەکانی پەروەردگار

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَـٰهِدُواْ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَـٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ

﴿وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ (٧٨)﴾

دوای ئـەوەی پـەروەردگار دەربـارەی ئیلاهیـات دوا، ئـەمجار دەربـارەی پێغەمبەرایەتی، بەشوێن ئەوەدا باسی شەریعەت و حوکمەکان دەکا لەچوار رووەوە.

١- دیاری کردنی فەرمان پێکراوەکان؛ واتە موکەلەفەکان.

٢- جۆری ئەرکەکان.

٣- ئـەوەی داخـوازی قبـوڵ کردنـی ئـەو فەرمانانـەیـە: کەهەڵبـژاردنی ئێـوەی موسوڵمانە بۆ ئەو تەکلیفانـەو شـەریعەت و حوکمەکانیـشی هـەر شـەریعەت و یاسای حـەزرەتی ئیـبراهیمن و ئـەو نـاوی موسـوڵمانی لێ نـاون، لـەقورئان و بـاقی نامـە ئیسلامییەکانی تردا ئەو ناوەتان بۆ دانراوە.

٤- جەختکردنەوەی لەسەر تەکلیفەکان و بەوە: کەفەرمانی کرد بەنوێژ کـردن و زەکات دان و پشت بەستن بەخودا!

ئەم ئایەتانـە فـەرمانی تـەکلیفی پـەروەردگارن و مەبەسـت لێیـان بـەهێزکردنی پەیوەندی بەندەکانە بە پەروەردگارەوە پاڵفتە کردنی دڵ و دەروونەو جیهاد کردنە لەگەڵ دوژمن داو بنیاتنانی قەڵای عەدالەتکاری کۆمەڵایـەتی لەشـەریعەت و ئـایینی خودادایە. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتـان بـەتاک و تـەنهایی خـودا هێنـاوەو ئیمانتان بە پێغەمبەری ئیسلام هێناوە، هەروا بڕواتـان بەزینـدوو بوونـەوەی رۆژی قیامەت هەیە، نوێژە فەڕزەکانتان بەجێ بهێنن، رکوع و سـوجدەی نـاو نوێـژەکانتان بـەرێک و پێکـی ئـەنجام بـدەن، بەهـەموو جۆرێـک عیبـادەتی خـودا بکـەن، هەرچـی ئەرکی سەرشانتانەو بە عیبادەت دەژمێردرێ ئەنجامی بـدەن، هـەوڵ بـدەن کـردەوە وابکـەن کـەخودا لـەخۆتان رازیـی بکـەن، زیـاد لەفـەرزەکان زێـدە خـودا پەرسـتی

(نوافل) ئەنجام بدەن، صیلەی رەحم بەجێ بێنن، خۆتان بەرەوشتی بەرز ئارایش بدەن، هەرچی کاری چاکەیە بیکەن، پەیوەندی نێوان خۆتانو خەڵکی تر بەباشی رابگرنو خودا لەخۆتان مەڕەنجێنن! بەڵکوو لەئاکام دا بەمراد بگەنو بەبەهەشتی رازاوە شاد ببن!

لەسەرەتای ئایەتەکەدا فەرمان بەخاوەن باوەڕان دەکا: بەروکوعو سووجود چونکە دوو روکنی گرنگی نوێژن، لەباتی نوێژ بەکینایە روکوعو سووجودی هێناوە، بۆئەوەی وێنەیەکی ئاشکرا بەنوێژ ببەخشێ، نوێژەکە لەدیمەنێکی بەرچاودا دەخاتە ڕوو، تەعبیری لەم جۆرە کاریگەریی زیاترە لەسەر دڵو دەروونەکان.

ئەمجار فەرمانەکە دەکاتە گشتیو بەشێوەیەکی یەکانگیری فەرمانەکە دووبارە دەکاتەوە، ئاشکرایە فەرمان بەعیبادەت کردن لەفەرمان کردن بەنوێژ کردن فراوانترەو هەموو فەرزەکان لەخۆ دەگرێ هەروەها هەموو جمو جووڵێکو کردارو گوفتارێک کەبەندە بۆ خودا ئەنجامی دەدا، دەگرێتەوە هەموو جمو جوڵێکی ئادەمیزاد لەژیانی دونیادا دەتواندرێ بکرێتە عیبادەتو بەخودا پەرستی حلێب بکرێ، بەمەرجێ دڵ لایەنی خودای تێدا بەرچاو بگرێ، تەنانەت لەززەتو خۆشی ژیانیشی بەعیبادەت دەژمێردرێ ئەگەر یادی خودای لەسەر بکاو بەو خواردنو لەززەتە مەبەستی خۆبەهێز کردن بێ بۆ طاعەتو خودا پەرستی!

سەیرە موسوڵمان ئاو دەخواتەوە خواردنی خۆش دەخوا، گەشتو گوزار دەکا، لەگەڵ حەلاڵی خۆی رادەبوێرێ....هتد. مەبەستی رەزامەندی خودایەو لایەنی خودای تێدا بەرچاو دەگیرێو سوپاسی خودای لەسەر دەکا بەچاکەو حەسەنات بۆی دەنووسرێو رۆژی قیامەت پاداشی باشتری لەسەر وەردەگرێتەوە. جا هەرکاتێ تاکو کۆمەڵی موسوڵمان بەم شێوەیە هەڵسو کەتیان کرد، لەهەموو جمو جۆڵێکیان دا مەبەستیان خودا بوو، پەیوەندییان بەخوداوە توندو تۆڵ بوو، رەوتی ژیانیان راست دەبێ، دڵیان دەروونیان بار بەراستاڵیو خودا پەرستیەوە دەگرێو

ئامادەباشی ئەوەیان تێدا دەبێ: کەفەرمان بەجیهادو تێکۆشانو بەرگری لەخۆ کردنیان ئاراستە بکرێ. دەفەرموێ: ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ ئەی موسوڵمانینە! ئەی خاوەن باوەڕان! لەپێناو گەشەکردنو بڵاوکردنەوەی ئایینی خودا دا تێبکۆشنو هەوڵ بدەن ڕەزامەندیی خودا دەستەبەر بکەن، جیهادێکی ڕاستاڵانەو خاص ئەنجام بدەن، جیهادێك ریابازی تێکەڵاو نەبێ، لۆمەی لۆمەکاران ژێوانیان نەکاتەوە.

جیهاد لەپێناو ئایینی خودادا جیهاد لەگەڵ دوژمنو لەگەڵ نەفسو لەگەڵ شەڕو فەساد دا دەگرێتەوە، هەڵبەتە جیهاد دژی دوژمنو بێ بڕوایان بەماڵو بەنەفسو بەزوبان دەبێ.

ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو حەببانو حاکم لەئەنەسەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: ((جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم والسنتكم)) جیهاد بەزوبان بەبەڵگە هێنانەوەو راگەیاندنو بڵاوکردنەوەی ئایین دەستەبەر دەبێ، جیهاد بەنەفس بەهەڵگرتنی چەك دەبێ دژی دوژمنانی خودا!

هەڵبەتە جیهاد فەرزی کیفایەیە لەسەر موسوڵمانان، ئەگەر برێکیان پێی هەڵسان لەسەر ئەوانی تر لادەچێ بەمەرجێ مەبەست بپێکنو کاری پێویست ئەنجام بدەن ئەگینا لەسەر هەموان واجب دەبێو نەفیری عام دەکرێ!

جیهادی نەفسو شەیتان ئەصڵو بناغەیە بۆ جیهاد دژی دوژمنی رواڵەتی. جیهادی نەفسو شەیتان جیهادی گەورەیە، ئەم جۆرە جیهادە فەرزی عەینەو لەسەر هەمووان پێویستە، هەروەها جیهاد دژی ستەمکارو بیدعەچی فەرزی عەینەلەسەر هەموو موسوڵمانێكو هەرکەسە بەگوێرەی توانای خۆی! وەکوو لەو فەرمودەیەدا چەسپاوە: کە ئەحمەدو موسلیمو ئەصحاب السنن لەئەبو سەعدی خودرییەوە ﷺ ریوایەتی دەکەن، دەفەرموێ: ((من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فان لم يستطع فبلسانه، فان لم يستطيع فبقلبه وذلك أضعف الايمان)).

کەدەفەرموێ: (حق جهادە) مانای ئەوە نیە جیهادەکە وائەنجام بدا زیاد لەتواناو هێزی خۆی تێدا خەرج بکا بەڵکوو مەبەست ئەوەیە خالیصانەو دڵسۆزانە تێبکۆشە بۆ بەرز کردنەوەی ئایینی خوداو پێشگیری کردن لەنەخۆشییە دەروونییەکانو خۆ بەرز راگرتن لەبەرامبەر دەستکەوتی ماددی وەکوو غەنیمەتو بڵاوبوونەوەی ناوو شۆرەت. جیهاد خودا پەرستییە هیچ کاتێکیش ئایینی ئیسلام زیاد لەتواناو دەسەڵات داوا لەموسوڵمانان ناکا ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ (البقرة/٢٨٦) یان دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ (التغابن/١٦).

ئەمجار پەروەردگار باسی فەرمان بەجیهاد روندەکاتەوە کەسێ جۆرە:

١- ﴿هُوَ اجْتَبَاكُمْ﴾ واتە: ئەی موسوڵمانینە! پەروەردگار ئێوەی هەڵبژاردوە لەناو هەموو گەلو نەتەوەکان دا ئێوەی بۆ ئەم ئەرکە دەستنیشان کردوەو رێزی لێ ناون، گەورەترین پێغەمبەری بۆ ناردوون، رێكو پێك ترین شەریعەتو یاسای بۆ دیاری کردون، ئەمە رێز لێنانی خودایە بۆ ئێوە نابێ لەبەری رابکەن، دەبێ بەشوکرو سوپاسەوە ئەنجامی بدەن!

جیهاد ئەرکێکە بەرەحمەتی خودا پەرزین کراوە ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ پەروەردگار هیچ کاتێك ئایینی لەسەر ئێوە تەنگ نەکردۆتەوە وای نەکردوە نەتوانن ئەرکەکانی ئەنجام بدەن، بەڵکوو وای داناوە لەهەموو روویەکەوە هێزو توانای ئادەمیزادی تێدا بەرچاو گیراوە زیاد لەتوانای خۆی داوای لێ ناکرێو، ئەنجامدانی ئەرکەکانی قورسایی یەکی وایان تێدا نیە لەتوانادا نەبن..

وەلێ کەدەڵێن: تەکالیفی شەرعی مەشەقەتو ناخۆشی تێدا نیە، ئەرکەکانی هێندە قورس نین لەتوانادا نەبنو ئەنجام نەدرێن. ئەگینا ئەگەر نارەحەتییان تێدا نەبێ بەتەکلیف حیساب ناکرێن، چونکە تەکلیف خۆی لەخۆی دا بەئەرکێك دەگوترێ: نارەحەتی تێدا بێو بەئەنجامدانی ئینسان ماندو ببێ، بەڵام ماندو بونێك لەتوانادا بێ.

دیاردەی ئاسانکاری‌و هەڵگرتنی حەرەج‌و ناخۆشی‌و ئەرکی لەتوانا بەدەر لەهەموو بوارەکانی عیبادەت داو لەمامەڵە کردن‌و خواردن‌و خواردنەوەدا بەئاشکرا دەبینرێ، ئەوەتا لەعیبادەتدا دروستە لەسەفەردا نوێژی چوار رکاتی کورت بکرێتەوەو کۆبکرێنەوە دوا بخرێن‌و پێش بخرێن، لەکاتی ترس دا بەرای هەندێ لەزانایان تەنیا رکاتێك دەکرێ، تەنانەت جاری واهەیە کابرا دەتوانێ بەپیادە بەسواری روی لەروگە بێ یان پشتی لەکەعبە بێ نوێژ بکا، هەروەها نوێژی سوننەت لەسەفەردا دەتوانێ روی لەقیبلە یان پشتی لێ بێ نوێژەکانی بکا. ئەگەر نەخۆش بوو نەیتوانێ نوێژەکانی بەئاسایی بکا دەتوانێ بەدانیشتنەوە بەراکشانەوە لەسەر تەنیشت یان بەئیشارەو ئاماژە نوێژەکانی بکا.

دەربارەی رۆژووی رەمەزان ئەگەر کابرا عوزری هەبوو بەم جۆرە لەسەفەردا بوو، یان نەخۆش بوو، پیر بوو، یان ئافرەتی دوو گیان بوو یان شیردەر بوو دەتوانن رۆژوەکەیان بشکێنن؛ هەندێکیان هەر فیدیە دەدەن‌و بەس، هەندێکیان : کەعوزرەکەی نەما دەیگرێتەوە.

لەکاتی پێویستی‌دا خواردن‌و خواردنەوەی حەرام حەڵاڵ دەبێ. هەروەها لەبواری مامەڵەشدا لەبەر پێویستی‌و ئاتاجی هەندێ هەڵس‌و کەوتی نادروست رەوا دەبن.

هەروا بەو جۆرە لەزۆربەی بوارەکانی ژیان دا لەبەر ناعیلاجی هەندێ روخصەت‌و ئاسانکاری دانراون بۆ سوککردنی ئەرکەکانی ئایین، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((بعثت بالحنفية السمحة)) (رواه احمد عن جابر) هەروەها پێغەمبەر ﷺ کەمەعاذو ئەبوموسای ﷺ ناردن بۆ یەمەن بەفەرمانڕەوایی پێی فەرموون: ((بشرا ولاتنفرا ويسرا ولا تعسرا)) أخرجه البخاري ومسلم.

قورئـانیش لـه‌زۆر ئایه‌تـدا ئـه‌م مانایـه‌ دووبـاره‌ ده‌کاتـه‌وه‌، وه‌کـوو ده‌فـه‌رموێ: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ (البقرة/١٨٥) یان ده‌فه‌رموێ: ﴿رَبَّنَـا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ (البقرة/٢٨٦).

٢- ﴿مِلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ﴾ واته‌: ئه‌ی موسوڵمانینه‌! شوێن شه‌ریعه‌تی پاكو راستی پێغه‌مبه‌ری خۆتان بكه‌ونو پابه‌ندی بن، شه‌ریعه‌تی ئێوه‌ش وه‌كوو شه‌ریعه‌تی بابـه‌ گـه‌ورەتان ئیـبراهیم وه‌هایـه‌ لـه‌میانڕه‌وی‌و پـاكو خـاوێنی‌و سـه‌ماحه‌تو دووریـی له‌شیركو خوارو خێچی‌دا!

مه‌به‌ســت بــه‌ (ملــة) بنــه‌ما ســه‌ره‌كییه‌كانی بـاوه‌ڕن بنــه‌ما ســه‌ره‌كییه‌كانی شه‌ریعه‌تی پێغه‌مبـه‌ری ئیـسلامو حـه‌زره‌تی ئیـبراهیم ﷺ یـه‌ك شـه‌ریعه‌تن، بـه‌ڵكوو هـه‌موو شـه‌ریعه‌ته‌كان له‌بنـه‌ما سـه‌ره‌كییه‌كانیاندا یـه‌كن. وه‌كوو له‌ئایـه‌تێكی تـردا له‌مباره‌وه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَـا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ (الشورى/١٣)

بوخاری‌و موسلیمو ئـه‌بوداودو ئه‌حمـه‌د ریوایـه‌تیان كـردووه‌: كه‌پێغه‌مبـه‌ره‌ ﷺ فه‌رموویـه‌تی: ((الأنبيـاء أولاد عـلات)) پێغه‌مبــه‌ران بیروباوه‌ڕیـان یه‌كـه‌، له‌بنـه‌ما سـه‌ره‌كییه‌كانی بیروبـاوه‌ڕدا یـه‌كن، هـه‌ر چـه‌نده‌ شـه‌ریعه‌ته‌كانیان جوداوازییـان تێدایه‌!

هۆی ناوهێنانی میلله‌تی ئیبراهیم ﷺ به‌تایبه‌تی له‌به‌رئه‌وه‌یه‌: كه‌لێكچوونێكی تـه‌واو هه‌یـه‌ لـه‌نێوان ئـایینی ئیـبراهیمو ئـایینی ئیـسلامدا لـه‌باره‌ی میـانڕه‌وی‌و ئاسانكارییه‌وه‌ هه‌روه‌ها چونكه‌ زۆربه‌ی عه‌ره‌به‌كان له‌نه‌وه‌ی حه‌زره‌تی ئیـبراهیمن‌و زۆریان خۆش ده‌ویست، خۆشویستنیش داخوازیی ئه‌وه‌یه‌: پابه‌نـدی شـه‌ریعه‌ته‌كه‌ی بن‌و شوێن شه‌ریعه‌تی موحه‌ممه‌دیش ﷺ بكه‌ون، چـونكه‌ لـه‌ناوه‌ڕۆك دا شـه‌ریعه‌تی حه‌زره‌تی موحه‌ممه‌د ﷺ و شه‌ریعه‌تی حه‌زره‌تی ئیبراهیمه‌ ﷺ یه‌كه‌. جا چونكه‌

حـەزرەتی ئیـبراهیم ﵇ بابـە گـەورەی حـەزرەتی موحەممـەدە ﷺ، بـەباوکی میللەتەکەشی دانراوە، لەم رووەوە: کەپێغەمبەر باوکی نەتەوەکەیەتی.

٣- ﴿هُوَ سَمَّاكُمْ الْمُسْلِمِينَ مِنْ قَبْلُ وَفِي هَذَا﴾ پەروەردگار نـاوی نـاون موسـوڵمان، واتــە: خـودای مــەزن لەکتێبــە ئاسمانییــەکانی پێــشووداو لــەقورئان دا نــاوی موسوڵمانانی بۆ ئێوەداناوەو ناوی ناون موسوڵمان!

﴿لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ﴾ واتـە: لـەکاتێك دا ئێوەمان کردووە بەئوممەتێکی میانـە ڕەوو عەداڵەتکارو ناسـراو بەعەداڵەتخواز لای هەموو گەلو نەتەوەکان. بۆ ئـەوەی پێغەمبـەر ببێتـە شـایەت بەسـەرتانەوە، ڕۆژی قیامەت شایەتی ئەوەتان لێ بدا: کەپەیامی خۆی پـێ گەیانـدونو ئـەرکی سەرشـانی خـۆی ئـەنجام داوە. هـەروەها بـۆ ئـەوەی ئێـوەش ببنـە شـایەت بەسـەر گـەلو نەتـەوەکانی تـرەوە: کەپێغەمبـەرەکانیان پـەیامی خودایـان پـێ گەیانـدون، ئـەرکی سەرشـانی خۆیـان بـەڕێكو پێکـی ئـەنجام داوە. قبـوڵکردنی شـایەتی پێغەمبـەری ئیسلام ﷺو شایەتی ئوممەتەکەی لەڕۆژی قیامەت دا زێدە ڕێزی پێغەمبەری لـەخۆ گرتووەو شەرەفو ڕێزی تێدایە بۆ گەلو نەتەوەکەشی.

بۆیـەش شـایەتی دانـی ئوممەتەکـەی وەردەگـیرێ چـونکە موسـوڵمانان بڕوایـان بەهەموو پێغەمبەرەکان هەیەو جوداوازی ناخەنە نێوانیانەوە.

ڕیوایەت کراوە: کەگەلو نەتەوە پێـشینەکان دەهێـنن لەگـەڵ پێغەمبـەرەکانیان دا، بەپێغەمبەرەکان دەگوترێ ئایا ئێوە پەیامی خۆتان گەیاندوە؟ دەفەرموون بەڵێ پێمان ڕاگەیاندون، نەتەوەکانی ئینکاری دەکەن، ئۆمەتی پێغەمبەر دەهێنن شایەتی دەدەن لەسەر ئەوە: کە پێغەمبەرەکان پەیامی خۆیان گەیانـدوە. گـەلو نەتـەوەکان دەڵـێن: جـا ئێـوە لـەکوێ ئاگـاداری ئێمـە بـوونو چـووزانن کەئێمـە ئیمانمـان پـێ نەهێناون؟ موسوڵمانەکان دەڵێن: خودا لەکیتابی خۆیدا لەسەر زوبانی پێغەمبـەری خۆی ئەو هەواڵانەی بەئێمە داوە.

جا لەشوکرانە ژمێری ئەو رێزو قەدرەی بەپێغەمبەری ئێوە دراوەو بەخۆتان دراوە: ﴿فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ﴾ نوێژەکانتان بەرێكو پێکی بکەن، زەکاتی ماڵو سامانتان بدەن، پشت بەخودا ببەستن دەست بگرن بەبەرنامەی خودا، پەیرەوی قورئان بکەن. ئاگادری نوێژەکانتان بن چونکە نوێژ پەیوەندیی نێوان بەندەو خودایە، زەکات دەرکەن چوونکە زەکات پاککەرەوەی نەفسو ماڵو سامانە، چاکەیەکە واجبە لەسەرتانو نیشانەی هاریکاری برایەتی نێوان موسوڵمانانە. پشت بەستن بەخودا، داوای کۆمەکی کردنو یارمەتی دان لەخودا نیشانەی متمانە کردنە بەپەروەردگار! ﴿هُوَ مَوْلاكُمْ﴾ خودا سەرپەرشتکاری ئێوەیە ﴿فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ بەڕاستی پەروەردگار باشترین سەرپەرشتکارو چاودێرە، باشترین یارمەتیدەرو خاوەن دەسەڵاتە!

بەیارمەتی خودا رۆژی ٩/٥/٢٠٠٠

لەپاکنووسی جزمی ١٧ کۆتایی سورەتی الحج بوومەوە

(مەلا محمود)

٩/٥/٢٠٠٠

بسم الله الرحمن الرحيم

# سورەتی المؤمنون

ئەم سورەتە ناونراوە (المؤمنون) چونکە بەرستەی ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ دەستی پێکراوە، ئەمجار حەوت رەوشت بۆ موسوڵمانان دیاری دەکا، وێڕای پاداشتی گەورە بۆیان لەقیامەت دا: کەبەهەشتی رازاوەو پانو بەرینە.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذیو نەسائیو حاکم لەعومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: هەرکاتێ سروش بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهات لەلای دەمو چاویەوە ویزەیەك دەبیسترا وەکوو ویزەی هەنگ. جارێك: نیگای بۆ هات، ئێمە سەعاتێك لەخزمەتی دا ماینەوە، دوایی روی کردە قیبلەو هەردوو دەستی بەرز کردەوەو فەرموی: (اللهم زدنا ولا تنقصنا، وأعطنا ولا تحرمنا وآثرنا ولا تؤثر علينا وارض عنا وأرضنا عنك) پاشان فەرمووی بێگومان دە ئایەتم بۆ سەر نازڵ بوون، هەرکەسێ ناوەڕۆکەکەیان ئەنجام بدا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەمجار دەستی کرد بەخوێندنەوەی قورئان لە ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ەوە تا (دە) ئایەتەکەی تەواو کردن.

ئیمامی نەسائی لەتەفسیرەکەی دا لەیەزیدی کوڕی بابنوس ریوایەت دەکا دەڵێ: بەخاتوو عائیشەمان گوت: رەوشتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو؟ فەرمووی رەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئانی بوو، ئەمجار دەستی کرد بەخوێندنەوەی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ تاگەییشتە ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ دوایی فەرموی: رەوشتی پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە بوو.

## پەیوەندی ئەم سورەتە بەهی پێشەوە لەچەند رویەکەوەیە:

١- وەکوو زانیمان سورەتی (الحج) بەکۆمەڵە فەرمانێك کۆتایی پێهێندراوە، یەکێك لەو فەرمانانە ئایەتی ﴿وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ە ئەم فەرمانە موجمەلەو لەسەرەتای ئەم سورەتەدا شی کراوەتەوە، لە (دە) ئایەتی سەرەتای ئەم

سورەتەدا ئـەو ڕەوشـتە باشـانەی: کەدەبنـە هۆکـاری فـەلاح و ڕزگـار بـوون دیـاریی کراون.

٢- لەسەرەتای سورەتی (الحج) دا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْـثِ فَإِنَّـا خَلَقْنَـاكُم مِّـن تُـرَابٍ ثُـمَّ مِـن نُّطْفَـةٍ﴾ ئایەتەکە بـۆ چەسـپاندنی زینـدو بوونەوەو ڕابوونی قیامەتە، لێرەشدا ڕونکردنەوەیـەکی تێـرو تەسـەل دەخاتـە سـەر مانای ئایەتەکەی ئەوێ و دەفـەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِـن سُـلَالَةٍ مِّـن طِـينٍ، ثُـمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ﴾ ئەوەی لەوێ هێنـدراوە لێرە شی کراوەتەوە.

٣- هەردوو سوڕەتەکان بەڵگەی هـەبوونی بەدیهێنـەرو تـاك و تـەنهایی خودایـان لەخۆ گرتوون.

٤- هەردوو سوڕەتەکان چیرۆك و بەسەرهاتی پێشوویان لەخۆ گرتووە.

**سورەتەکە ئەم باسە سەرەکییانەی لەخۆ گرتووە:**

باسی بنەمای ئایین: کە بریتیین: لەهەبوونی خوداو تاك و تەنهایی زاتی پـاکی و ڕاستی پێغەمبەرایـەتی و ڕابـوونی قیامـەت و زینـدوبوونـەوەی ئـادەمیزادی لـەخۆ گرتوون.

سەرەتا ئیشارە بەرەوشتەکانی موسوڵمانی ڕاسـتاڵ دەکـاو وادەی ڕزگـار بوونیـان لە دۆزەخ و بەمراز گەیشتنیان بەبەهەشـتی ڕازاوە پـێڕادەگەیـەنێ. ئـەمجار بەڵـگەی جۆراو جۆر لەسەر هەبوونی خوداو بەتوانایی و دەسەڵاتی فراوانـی و تـاك و تـەنهایی لەبەدیهێنانی ئادەمیزادو پەروەردە کردنـی لەهـەموو قۆناغـەکانی ڕسـکانی و گەشـە کردنـی دا دەهێنێتـەوە. هـەروا بـەدیهێنانی ئاسمانـەکان و نـازڵ بـوونی بـاران لەبەرزاییەوە بۆ ڕسکان و ڕواندنی ڕوەك و دارو درەخت بەبەرداروو بـێ بەریانـەوە: کەهەر یەکەیان سودێکی تایبەتی هەیە بۆ ژیانی ئادەمیزادو ڕازاندنەوەی سروشـت، بەتایبەتی دار خورماو مێوو زەیتون و هەنار کەمیوەو خواردەمەنی جۆراو جۆریـان لێ دەستـەبەر دەبـێ. بەرەحمـەت و توانـای خـۆی ئـاژەڵی بـۆ بەیدەست کـردون زۆر سوودیان لێ وەردەگرن، کەشتی بۆ موسەخەر کردوون کاڵای خۆتانی لێرەو لەوێ پـێ

دەگوێزنەوە. ئەمجار چیرۆكو بەسەرهاتی هەندێ لەپێغەمبەرانی وەكوو حەزرەتی نووحو موساو هاروونو عیساو دایكی رادەنوێنێ بۆ ئەوەی بیانكاتە نموونەو پەند لێ وەرگرتنو دڵدانەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام لەئاكامی ئەو ناڕەحەتیەی تووشی دەبوو لەموشریكەكانەوە ... لەهەمان كات دا هەڕەشەو سەرزەنشتكردنی كافرەكان لەسەر سەررەقیو بێ گوێیو ئیمان نەهێنانیانو پشت هەڵكردنیان لەپەیامی قورئان!! وەصفدار كردنی پێغەمبەر ﷺ بەڕەوشتی شێتیو گەلێ رەوشتی ناشیرینی تر: كەپاڵ پێغەمبەرو پەیامەكەیان دەدا. نەك هەر ئەوەندە بەڵكوو هاوەڵیان بۆ خودا دادەناو كوڕو كچیان وەپاڵ دەدا.

ئەمجار سورەتەكە لەكۆتاییدا دیمەنێكی سامناكی حیسابو لێكۆڵینەوەی رۆژی قیامەتو پێوەرەكانی ئەو حیسابو دادگایی یە رادەنوێنێو ئادەمیزادان تێكڕا دەكاتە دوو تاقمو پێڕ؛ تاقمی كامەرانانو پێڕی بەدبەختەكانو پاداشو سزایان دیاریی دەكا.

## رەوشتی موسوڵمانان

﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ

عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٢) ریوایەت کراوە: پێغەمبەر ﷺ کە نوێژی دەکرد چاوەکانی بۆلای ئاسمان بەرزدەکردنەوە، جا کەئەم ئایەتە نازڵ بوو، ئیتر لەنوێژدا چاوی دەبڕییە جێگای سوژدەکەی.

حاکم لەئەبو هورەیرەوە، ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کابرایەکی بینی لەنوێژدا یاری بەریشی دەکرد چاوی بۆ لای ئاسمان بەرز دەکردەوە، ئیتر ئایەتی ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ نازڵ بوو، جا لەوەدوا سەری نزم دەکردەوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لەئیبنو سیرینەوە بە (مورسەل) ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەنوێژدا چاویان دەبڕیە ئاسمان ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو..

**لەم کۆمەڵە ئایەتەدا پەروەردگار موژدەی رزگار بوون لەدۆزەخ و بەمراز گەیشتن بەبەهەشت دەدا بەو موسوڵمانانەی حەوت رەوشتیان تێدا هەن:**

١- ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ بێگومان موسوڵمانان رزگاریان بووەو بەمراز گەیشتوون ئەوانەی بڕوایان بەتاك و تەنهایی خودا هەیە بڕوایان بەپەیامی پێغەمبەرو هاتنی رۆژی قیامەت هەیە.

٢- ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی لەنوێژەکانیاندا جەستە ئارام و دڵ بەترس و لەرزن لەحوزوری زاتی حەق دا بەدڵی ترساوو جەستەی ئارامەوە دەوەستن، دڵیان ترسی خودای تێدایەو ترس و لەرزەکە سیرایەت دەکا بۆ ئەندامانی جەستەو سەروسیما، شکۆمەندی و جەلالی زاتی (الله) دڵ و گیانیان دادەپۆشێ و لەذیهن و بیرو هۆشیاندا شەواغیل نامێنن، بەدڵی وریاو هەست و هۆشەوە سەرگەرمی وت و وێژو چپەو سرتەن لەگەڵ پەروەردگاریان دا، جگە لەخودا ئاگایان لەهیچ نامێنێ، جگە لەخودا هیچ نابینن، تەنها هەست بەبوونی

ئەو دەکەن‌و بەس. خۆشی‌و لەززەت لەراوەستان لەحوزوری زاتی پاکی‌و روکوع‌و سوژدە بۆ بردن دا وەردەگرن، ویژدانیان پاک‌و خاوێن لەهەموو خەوشێک‌و دڵیان خاڵی لەهەموو شتێک جگە لەزاتی (الله)، فێنکایی چاویان بەنوێژ دێ‌و دڵیان بەو پەرستشە ئۆقرەی دێ. وەکوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (حبب الیَّ الطیب والنساء، وجعلت قرة عینی فی الصلاة) (رواه احمد عن انس) هەر ئیمام ئەحمەد لەپیاوێکی ئەسلەمییەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (یا بلال، أرحنا بالصلاة) ئەی بیلال! گیانمان ئاسوودە بکە بەنوێژ.

جا هەرکاتێ ئەم حاڵەتانە بۆ نوێژکەر هاتنە دی، ئیتر ئەوکات پەیوەندی بەئافەریدەی خۆیەوە توندو تۆڵ دەبێ، گیانی سەر سوورماوی، رێبازی خۆی دەگرێتەبەرو، دڵی سرکی شوێنی خۆی دەدۆزێتەوە، هیچ شتێک لەلای قیمەتی نامێنێ جگە لەو شتانەی پەیوەندی ئەو بەخوداوە توندو تۆڵ دەکا!

٣- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾ ئەو موسوڵمانانەی ڕوو لەهەموو شتێکی حەرام‌و مەکروهو خێر تێدا نەبوو دەهێنن، واز لەهەموو گاڵتەو گەپێکی ناپێویست‌و بێ سوود دەهێنن، هەر گوفتارو کردارێک سوودی تێدا نەبێ توخنی ناکەون‌و روی لێ وەردەگێڕن.

هەڵبەتە زۆر شت ئادەمیزاد هەڵەوگیر دەکەن‌و بێ ئاگای دەکەن لەئەرکی سەرشانی خۆی، بێ ئاگای دەکەن لەیادی خودا، لەبیر کردنەوە لە دروستکراوانی، بێ ئاگای دەکەن لەئەرکی باوەڕ، لەخەریک بوون بەپاڵفتە کردنی دڵ‌و دەروون، بێ ئاگای دەکەن لەجیهادو بانگەوازی، لەشەو بەخەبەری‌و هەوڵ‌و تەقەللادان بۆ خزمەتی ئایین..

ئادەمیزاد ئەو تەمەنە کورتەی هەیەتی دەتوانێ لەگاڵتەو گەپ‌و شتی بێهودەدا خەرجی بکا، یان لەشتی بەسوودو خێرئاوەردا خەرجی بکا. ئەرکی سەرشانی موسوڵمانە کەتەمەنی خۆی لەئاوەدانکردنەوەی وڵات‌و چاکسازی لەگەڵ خەڵک‌و بەندایەتی کردن بۆ خودادا صەرف بکا بەڵکوو هەر کارێکی دەیکا مەبەستی خودا بێ‌و بۆ رەزامەندیی خودا بیکا.

بەداخەوە کەسەرێکی زۆرەوە ئەمرۆ لەهو لەعب لەگوفتارو کرداری زۆرێکی زۆر لەئادەمیزاددا رەنگی داوەتەوەو رەگی داکوتاوە. سەیر کردنی فلیمی تەلەفزیۆن‌و خوێندنەوەی گۆڤارو رۆژنامە: کەجگە لەهەڵەوگیر کردنی موسوڵمانان چ سودێکی تریان تێدا نیە، هەروا دامەو سێ رسکێن‌و نۆ رسکێن‌و شەترنج‌و یاری دۆمینەو یاری کاغەزو پۆکەن‌و مۆکەن‌و خەرج کردنی کات لەشتی بێ سوود دا. هەڵبەتە ئەمە مانای ئەوە نیە، کەموسوڵمانان غەم بەبا نەدەن‌و هەردەم پێش بخۆنەوە. سەیرو صەفا نەکەن، نەخێر وا نیە ئایین وانالێ: فەرمانی ئایین ئەوەیە: ئادەمیزاد خۆ بەشتی بەسوودو خێر ئاوەرەوە خەریك بکاو هەرشتێك دەکا لایەنی خودای تێدا بەرچاو بگیرێ.

٤- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ﴾ ئەوانەی زەکاتی ماڵ‌و سامانی خۆیان دەردەکەن، دوای روکردنە خوداو پەیوەست کردنی دڵ‌و دەروون بەخوداوەو پشت هەڵکردنیان لە لەغوو گاڵتەو گەپ‌و شتی بێ سوود، زەکاتی ماڵی خۆیان دەدەن.

ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: زوربەی زۆری زانایان لەسەر ئەوە کۆکن: کەمەبەست بەزەکات لێرەدا زەکاتی ماڵ‌و سامانە، هەرچەندە ئایەتەکە مەککی یەو زەکات لەمەدینە واجب کراوە.

رای پەسند ئەوەیە: کەئەوەی لەمەدینە واجب کراوە بریتی بووە لەدیاری کردنی بەشەکانی زەکات، ئەگینا ئەصلی زەکات لەمەککە واجب کراوە، ئەوەتا سورەتی (الانعام) مەککی یەو لەوێ دا فەرمانی بەزەکات دانی تێدایە دەفەرموێ: ﴿وَآتُواْ حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ (ئایەتی/١٤١) دەشگونجێ مەبەست بەزەکات لێرەدا زەکاتی دڵ‌و دەروون بێ، مەبەست پاککردنەوەی نەفس بێ لەچڵك‌و پیسی، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا﴾ (الشمس/٩-١٠) دەشگونجێ مەبەست بەزەکات پاککردنەوەی ماڵ‌و سامان‌و دڵ‌و دەروون بێ‌و هەردوکیان بگرێتەوە. دڵ‌و دەروون پاك بکاتەوە لەرژدی‌و بەخیلی، لەفیزو خۆبەزلزانین‌و خۆ ویستی‌و باقی نەخۆشی یە دەروونی یەکانی تر.

ئیمـامی رازیــی دەفــەرموێ رای زوربــەی موفەســیرین ئەوەیــە، کەمەبەســت بــەزەکات لێـرەدا زەکـاتی تایبـەتی مـاڵو سـامان نـیـێ چـونکە ئـەم وشـە لەشـەرع دا تایبەتە بەو ماناوە.

٥ـ ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ واتـە: ئەوانـە عـەورەتی خۆیـان لەحـەرام دەپارێزن، گیانو خێزان بەپاکی رادەگرن، خۆیانو خێزانو کۆمەڵگا دەپارێزن لەبێ رەوشتی؛ شەرمگای خۆیان لەغەیری حەڵاڵدا بەکارناهێنن! شتێك خـودا لێی مـەنع کـردون تـوخنی ناکـەون، خۆیـان لـەزیناو هـەتیوبازیی دەپـارێزن، تـەنها لەگـەڵ خێزانـەکانی خۆیـان کـە: خـودا بـەهۆی مارەکردنـەوە بـۆی حـەڵاڵ کـردون جـووت دەبـنو ئـیشی شـەرعی خۆیـان ئـەنجام دەدەن، یـان لەگـەڵ ئـەو ئافرەتـە کۆیلانـەی کەبەمڵکایـەتی دەسـتیان بەسـەردا رۆیـشتونو کـەنیزەکیانن. رۆژگارێـك بـووە ئـەم جۆرە ئافرەتانەش هەبوونو ئێستا نەماون یـان کـەمن ـ جگـە لـەم دوو جـۆرە ئـیتر توخنی ئافرەتی تر ناکەون. شـەهوەتو ئـارەزۆی خۆیـان بـەرەڵڵا ناکـەن ﴿إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ مەگەر لەگەڵ هاوسەرە مارەکراوەکانی خۆیان دا، یان ئەو ئافرەتانەی کە کۆیلەنو بەمڵکایەتی هی خۆیانن، تەنها لەگەڵ ئـەم دوو جـۆرە ئافرەتانەدا کاری شەرعی ئەنجام دەدەن ﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ ئەوانە لەسەر ئـەوکارە حەڵاڵەی ئەنجامی دەدەن لۆمەکراونین!

﴿فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾ کەسێك جگـە لـەخێزانی خـۆیو ئــافرەتی کۆیلــەی خــۆی بیــەوێ کــاری جنــسی ئــەنجام بــدا ئــەوە ئەوپــەڕی تەجاوەزکارییان ئەنجام داوەو سنووری خودایان بەزاندوە.

ئایەتەکە حوکمی ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە:

نیکاحی موتعەو دەستپەڕی کردن حەرامن. چونکە ئافرەتی موتعە لەگەڵ کراو بەخێزان ناژمێردرێ بەبەڵگەی ئـەوە کـە بـەکۆڕای زانایـان مـیرات لەیـەکتر نـاگرن، دەی ئەگەر بەژن حیساب بکرایە دەبوایە میرات لەیەکتری بگرن.

دەستپەڕی (الاستمتاع)یش حەرامەو خاریجی ئەو دوو جۆرە حەڵاڵەیە: کـەباس کرا.

فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺ هەیە ئیمام حەسەنی کوڕی عەرەفە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (سبعة لاینظر الله الیهم یوم القیامة، ولایزکیهم، ولا یجمعهم مع العاملین ویدخلهم النار أول الداخلین، الا ان یتوبوا، ومن تاب الله علیه، الناکح یده، والفاعل والمفعول به، ومدمن الخمر، والضارب والدیه حتی یستغیثاه، والمؤذی جیرانه حتی یلعنوه والناکح حلیلة جاره).

جەماوەری زانایان دەستپەڕیان بەلاوە حەرامە چونکە ئایەتەکە لەزەت بینینی لە ئافرەت لە دوو جۆردا کۆکردۆتەوەو بەس!

بەلای ئیمام ئەحمەدەوە لەبەر ناعیلاجیو زەرورەت بۆ یەك جار دروستە، واتە ئەگەر کابرا ئەوەندە تەنگەتاو بوو، شەهوەت تینی بۆ هێناو خێزانی حەڵاڵی خۆی نەبوو، نەیدەتوانێ ژن بێنێو ترسی زینای هەبوو بەدەستی خۆی بیکا، نەك بەدەستی ژنێکی بێگانە، یان دەستی کابرایەکی تر..

هەڵبەتە یاسای ژنو مێردایەتی یاسایەکی ئاسایی یە تەمو مژی ناخرێتە سەر. وەلێ باسی کۆیلەو ئەمەتە جێگای سەرنجو لەسەرگوتنە، زۆر جار دوژمنانی ئیسلام بەرەوا زانینی یاسای کۆیلایەتیان لەئیسلام کردۆتە جێگای رەخنە گرتنو ئایینییان پێ تاوانبار کردوە. بەڵام لەراستی دا ئیسلام کۆیلایەتی دانەهێناوە، کاتێك ئیسلام هاتووە یاسای کۆیلایەتی یاسایەکی جیهانی بوو، بەکۆیلە کردنی دیلەکانی جەنگ یاسایەکی نێو دەوڵەتی بوو، دەی نەدەگونجا لەوکاتەدا ئیسلام لەگەڵ دوژمنەکانی دا لەشەڕو جەنگ دا بوو، ئەو یاسایە هەڵوەشێنێتەوە یەکلایەنە ئەو یاسایە رابگرێ، دیلە موسوڵمانەکان لای دوژمن بکرێن بەکۆیلە بەڵام ئەو دیلی کافرەکان مەرەخەس بکا. هەڵبەتە لەئاکامی جەنگو هەرای نێوان موسوڵمانانو دوژمنانی دا ئافرەتی دیلیش لەهەردولا پەیدا دەبوون، ئەوانیش بەگوێرەی ئەو یاسا جیهانی یەی ئەو رۆژگارە مۆرکی کۆیلایەتییان پێوە دانراو دەکرانە ئەمەتە، هەر بەگوێرەی ئەو یاسایە نەدەکرا ئەو ئافرەتە کۆیلانە بێنە رێزی ئافرەتە سەربەستەکانو پلەی هاوسەرێتییان بدرێتێ، بۆیە ئیسلام بەشێوەی موڵکییەت بۆ خاوەنەکانیانی بەرەوا زانیوە لەززەتیان لێ وەربگرن. بەڵام لەهەمان

کات دا ئیسلام هەوڵی داوە لەژمارەی کۆیلە کەم بکاتەوەو ئازاد بکرێن‌و هەوای ئازادی هەڵمژن، هەوڵی دا سەرچاوەی بەکۆیلە کردن تەسک‌و کەم بکاتەوە، بەڵام بوارەکانی ئازادکردنی زۆرو هەمە جۆرو فراوان کردن‌و رۆژ بەرۆژ لەکۆمەڵگای ئیسلامی دا کۆیلە لەکەم بوون دا بوون، ئازادکردنی کۆیلە لەئیسلام دا ببوە قەرەبوکردنەوەی زۆر کەم‌و کوڕی‌و تاوان!!!

بەڵێ ﴿فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ﴾ هەرکەسێك بیەوێ جگە لەخێزانی حەڵاڵی مارەکراوی خۆی‌و مولکولیەمین ئارەزۆی دابین بکا کارێکی ناڕەوا دەکاو دەچێتە جغزی حەرامەوە. دەستدرێژی دەکاتە سەر ناموسی کەسێك بەمارە کردن حەڵاڵی نەکردوە، دڵ‌و دەروونی تووشی فەساد دەبێ، چونکە هەست دەکا لەپاوانی ناڕەوا دەڵەوەڕێ، فەسادی خێزان پەیدا دەبێ، ضەمان‌و ئارامی نامێنێ، کۆمەڵگا تووشی فەساد دەبێ، چونکە گورگەکانی ئەو کۆمەڵگایە لێرەو لەوێ پەلاماری نێچیری خۆیان دەدەن‌و تەعەدا لەم‌و لەو دەکەن! ئایینی ئیسلامیش هەموو هەوڵ‌و تەقەللایەکی بۆ ئەوەیە ئەم جۆرە فەسادانە قەڵاچۆ بکا.

٦- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ ئەوانەی پابەندی وادەو بەڵێنەکانی خۆیانن، عەهدو پەیمانی خۆیان بەلاوە پیرۆزەو پارێزگاری لێ دەکەن. ئەگەر ئەمانەتێکیان لەلا دانراخیانەتی تێدا ناکەن‌و سپاردەی خۆیان دەدەنەوە بەخاوەنەکانیان، ئەگەر وادەو بەڵێنیان دا پابەندی دەبن، گەڕاندنەوەی سپاردەو پابەند بوون بەوادەو بەڵێنەوە رەوشتی سەرەکی‌و بنەڕەتی موسوڵمانانە. خیانەتکردن‌و غەدر کردن‌و بێ وادەیی‌و بەڵێن شکێنی‌و هەڵوەشاندنەوەی عەقدو سەودا، پاشگەز بوونەوە لەشەریکایەتی‌و بەکریگیران‌و کڕین‌و فرۆشتن. رەوشتی مونافیق‌و کافرو ستەمکارانە.

پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە فەرمویەتی (آية المنافق ثلاث: اذا حدث كذب واذا وعد اخلف، واذا أئتمن خان) قورئانیش لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَخُونُواْ اللّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُواْ أَمَانَاتِكُمْ﴾ (الانفال/٢٧) سپاردەو وادەو بەڵێن: هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کەئادەمیزاد لەلایەن خوداوە یان لەلایەن کەسانی

دیکەوە دەخرێتە ئەستۆی و بەرپرسیار دەبێ لێیان، وەکوو تەکالیفی شەرعی و گەڕاندنەوەی سپاردەو پابەند بوون بەسەوداو مامەڵەوە.

٧- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ ئەوانەی بەردەوامن لەسەر ئەنجامدانی نوێژەکانیان، لەکاتی خۆیان دا ئەنجامیان دەدەن! مەرج و روکنەکانیان بەتەواوی دەهێننە جێ و کەم و کوڕییان تێدا ناکەن.

لەصەحیحی موسلیم و بوخاری دا هاتووە لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: پرسیارم لەپێغەمبەر ﷺ کرد وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چ کردەوەیەك لای خودا زۆر خۆشەویستە؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الصلاة على وقتها) نوێژ کردن لەکاتی خۆی دا، وتم: دوای نوێژ چی؟ فەرمووی: (بر الوالدين) چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك دا، وتم دوایی، چی؟ فەرمووی: (الجهاد في سبيل الله) تێکۆشان و جەنگان لەپێناو ئایینی خودادا.

تێبینی ئەوە دەکرێ: پەروەردگار سەرەتای ئەم رەوشتە بەرزانەی بەنوێژ دەست پێ کرد، کۆتاییشی بەنوێژ هێنان، ئەمەش ئاماژەیە بەوە کەنوێژ کردن لەهەموو عیبادەتێك گەورەترە. وەکوو لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (استقيموا ولن تحصوا، واعلموا ان خير اعمالكم الصلاة، ولا يحافظ على الصلاة الا مؤمن) ئیستیقامەتان هەبێ، بەردەوام بن لەسەر خودا پەرستی، پاداشی ئیستیقامە هێندە زۆرە ناتوانن بیژمێرن، بزانن باشترین کردەوەتان نوێژە، هەر موسوڵمان دەتوانێ پارێزگاری نوێژ بکاو بەردەوام بێ لەسەر کردنی، جگە لەموسوڵمان کەس ناتوانێ بەردەوام بێ لەسەری، نوێژ پەیوەندیی نێوان بەندەو پەروەردگارە، کەسێك پابەندی نوێژ کردن نەبێ، پارێزگاری پەیوەندی نێوان خۆی کەسانی دیکەش ناکا!

ئەو رەوشتانەی باس کران کەسایەتی موسوڵمانان دیاریی دەکا، دەبنە هۆکاری رزگار بوون و کاریگەرییان لەتایبەتمەندی کۆمەڵی موسوڵمانان دا دیارو بەرچاوە. ژیانی شیاو بۆ ئادەمیزاد دەرەخسێنن و ئادەمیزاد لەباقی زیندەوەران جیا دەکاتەوەو ناهێڵن ئاژەڵ ئاسا ژیان بەسەر بەرن.

ئـەمجار پـەروەدگار پاداشـی باشـی ئـەو ڕەوشـتانە دیـاریی دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئائەو خـاوەن ڕەوشـتە بەرزو پەسـندانە، ئەوانـەی پلـەی کـەمالاتو پیاوەتییـان تێـدا هەیـە شـیاوی ئـەوەن لەبەهەشتی فیردەوس دا نیشتەجێ بکرێن بەهەشتی ڕازاوەیان دەدرێتـێو بـۆ هـەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. لەصەحیحەین دا هاتووە، پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـەتی: (اذا سألتم الله الجنة فاسألوه الفردوس، فانه أعلى الجنة واوسط الجنة، ومنه تفجر أنهار الجنة، وفوقه عرش الرحمن).

## هەندێ لەبەڵگەکانی وجودی خوداو تواناو دەسەڵاتی دروستکردنی ئادەمیزاد

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

دوای ئەوەی ڕەوشتە پەسندەکانی موسوڵمانانی باس کردن، دەگوێزێتەوە بۆ ڕانواندنی بەڵگەکانی ئیمان لەژیانی خودی ئادەمیزاددا، لەدروستکردنی ئاسمانەکاندا، لەنازڵکردنی باران لەئاسمانەوە، دروستکردنی گیانلەبەران بۆ سوودی ئادەمیزاد.

یەکەمجار دەست دەکا بەڕانواندنی قۆناغەکانی دروستبوونی ئادەمیزادو دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ طِينٍ﴾ بێگومان ئێمە ئادەمیزادمان بەدیهێناوە، لەقۆناغەکانی دروستکردن دا هەڵەوگێڕو تاوو توێمان کردوە. واتە: بابە گەورەی ئادەمیزادمان لەقوڕێکی پاڵفتە کراو دروست کردوە.

هەندێ لەموفەسسیرەکان پێیان وایە: مەبەست بەئینسان نەوەکانی ئادەمە. دەڵێن: نوطفە لەخوێن وەدی دێ، خوێنیش لەخۆراك، خۆراکیش یا حەیوانییە یان روەکییە، حەیوانیش دەچێتەوە سەر نەباتی، خۆراکی نەباتیش لەگڵی پاڵفتە کراوو ئاو پەیدا دەبێ، کەوابێ ئادەمیزاد لەبنەڕەتو حەقیقەت دا لەقوڕی پاڵفتە کراو دروست بووە. پاشان ئەو قوڕە بەچەند قۆناغێك دا تێپەڕیوە تا بوەتە قۆناغی نوطفەیی.

٢- قۆناغی دووەم ئەوەیە: کەدەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ﴾ پاشان گەرای ئادەمیزادمان گێڕاوە بەنوطوفەیەك کەلەپشتی پیاوانی باوك دایەو لەوێوە دەڕژێتە ناو منداڵدانی دیکانەوەو لەوێدا شوێنی خۆی دەگرێو لەیەکەم رۆژی جێگیر بوونی نوطفە لەڕەحمی دایك دا دەمێنێتەوەو لەو جێگایەدا پارێزراو دەبێ. تا رۆژی لەدایك بوون. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِن سُلَالَةٍ مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ﴾ (السجدة/٧-٨).

یان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ، فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، إِلَى قَدَرٍ مَّعْلُومٍ، فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ﴾ (المرسلون/٢٠-٢٣)

دەقە قورئانییەکە ئاماژە دەکا بۆ قۆناغەکانی دروستبوونی ئادەمیزاد. قوڕ یەکەم سەرچاوە یان یەکەم قۆناغی دروست بوونی ئادەمیزادە، دوا قۆناغیش ئەو ئینسانە رێكو پێکەیە. ئەمە حەقیقەتێکەو لەقورئان دا چەسپاوە، ئیتر پێویست ناکا ئێمە راستی ئەم حەقیقەتە عیلمییە لەو تیۆری زانستیانە وەربگرین کەدەربارەی سەرەتای پەیدا بوونی ئادەمیزاد یان پەیدا بوونی لەسەر زەوی دواون.

بێگومان قورئان ئەم حەقیقەتە دەچەسپێنێ، بۆ ئەوەی ئادەمیزادەکان بیکەنە مەیدانی ورد بوونەوەو تێفکرین لەو گۆڕانە سەر لەبەرەو گواستنەوە سەر سوڕهێنەرە لەنێوان قوڕو پێکهاتەی ئادەمیزاد لەشکڵی کۆتایی دا: کەئەو جەستە

گیان تێدا رسکاوەیە، کەبەچەند قۆناغێکی جیا جیادا تێپەڕیوە!! ئیتر بەشوێن ئەم قۆناغانەدا ناچیٚو چۆنیەتی‌و درێژی چۆنیەتی گۆڕانەکە رانانوێنیٚ، چونکە ئەوە لەمەبەستە سەرەکییەکانی قورئان نیە، بەپێچەوانەوە تیۆرە زانستیەکان هەوڵ دەدەن پلیکانەکانی نێوان قورو قۆناغی (نشوء وارتقا) بدۆزنەوە، زنجیرە قۆناغەکانی نێوان‌و قورو ئادەمیزاد بەیەکەوە ببەستنەوە. هەڵبەتە ئەم جۆرە تیۆرانە وادەبیٚ حەقیقەت دەپێکن‌و وادەبیٚ هەڵە دەکەن. تیۆرەکەی ئەمڕۆ بەڕاستی دەزانن، سبەینیٚ هەڵیدەوەشێننەوە. کەوابیٚ نابیٚ بەهیچ جۆرێك رێگا بەخۆمان بدەین حەقیقەتە عیلمیەکانی قورئان خاضعی ئەم تیۆرانە بکەین‌و بەتیۆرە زانستییەکان شییان بکەینەوە، نابیٚ قۆناغەکانی نێوان قورو ژیانەوەو گەشە کردن (نشوء وارتقا): کەقورئان لێی بێدەنگ بووە لەم جۆرە تیۆرانە وەربگرین‌و تەفسیری ئەم جۆرە ئایەتانەی پیٚ بکەین. چونکە قورئان حەقیقەتەو لەحەقەوە هاتووەو حەق دەچەسپێنیٚو حەقیقەت بڵاو دەکاتەوە. بەهیچ هەڵناوەشێتەوە. وەڵیٚ تیۆرە زانستییەکان ئەمڕۆ چەسپاون‌و سبەینیٚ هەڵوەشاونەوە.

بەهەرحاڵ لێك جیا بوونەوەی رێگا لەنێوان تێڕوانینی قورئان بۆ ئادەمیزادو تێڕوانینی ئەو تیۆرە زانستیانە ئەوەیە: قورئان رێز دەدا بەئادەمیزادو ئەوە دەچەسپێنیٚ: کەشوعلەیەك لەڕوحی خودا ئەو قورەی کردووە بەو ئادەمیزادەو ئەو رەوشت‌و تایبەتمەندییانەی پیٚ بەخشیوەو بەو شتە تایبەتمەندییانە ئەو جەستەیە بووە بەئادەمیزادو لەئاژەڵ جیا بۆتەوە، بەمەش تێڕوانینی ئیسلام‌و تێڕوانینی مادییەکان‌و تیۆرەکانیان بەتەواوی لێك جیا دەبنەوە. پەروەردگاریش: کە بۆخۆی بەدیهێنەری ئادەمیزادو هەموو شتێکە لەهەمووکەس باشتر دەزانیٚ، بۆیە ئێمە بڕوامان بە قورئان هەیەو بەس!

٣- قۆناغی سێیەم: ئەوەیە: کەدەفەرمویٚ: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً﴾ پاشان نوطفەمان لەصیفاتەکانی خۆی گۆڕی بۆ شێوەی (عەلەقە) واتە ئەو نوطفەیەی کەبریتی بوو: لە ئاوێکی فیچقە ئاسا کەلەپشتی پیاو دەردەچیٚو لەمنداڵدانی ئافرەت دا لەگەڵ ئاوی ئافرەتەکە کەلەسنگی یەوە دێتە خوار یەك دەگرن‌و پاش

ماوەیەك دەبن بەخوێنێكی سووری توند بوو خۆ بەدیواری منداڵدانەوە هەڵدەواسێو شێوەی (زەرو) وەردەگرێو خۆراك لەخوێنی دایك وەردەگرێ.

٤- قۆناغی چوارەم ئەوەیە، كە دەفەرموێ: ﴿فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾ ئەمجار خوێنی سوورو توندبوومان كرد بەگۆشتپارە بەئەندازەی پارچە گۆشتێك: كە بجوورێ. هیچ شێوەو روخسارێكی تێدا نابیندرێ. ئەم گۆڕانكارییە ناو نراو خەلقو بەدیهێنان، چونكە پەروەردگار هەندێ صیفاتی دەفەوتێنێو هەندێ صیفاتی تری بۆ بەدی دێنێ.

ئەم دروستكراوە بەو رێبازەی خۆیدا تێدەپەڕێو بێ لادانو ئەم لاولا قۆناغەكانی خۆی دەبڕێ. دەستی قودرەتو چاودێری پەروەردگار چركە بەچركە پەروەردەی دەكەن ئەمجار قۆناغێكی تر دێتە كایەوە. ئەویش قۆناغی پێنجەمە.

٥- قۆناغی پێنجەم ئەوەیە: كەدەفەرموێ: ﴿فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً﴾ ئەمجار ئەو گۆشتپارەیە دەكەین بەئێسقانو شكڵی دەستو قاچو شانو ملی تێدا دەرەخسێنن، لێرەدا پێویستە ئادەمیزاد بەسەر سوڕمانەوە لەبەردەم ئەم حەقیقەتە رابوەستێو كڕنووشی تەعظیم بۆ خودا بەرێ ئەویش حەقیقەتی پێكهاتەی (جنین)ە كە تائەم ئاخرو ئۆخرانە بەتەواویی نەدەزاندرا چۆن دروست دەبێ، چونكە ئاشكرایە خانەكانی ئێسقان لەخانەكانی گۆشت جوداوازن، ئەوەش چەسپاوە: كەخانەی ئێسقان لەجنیندا پێش خانەی گۆشت پەیدا دەبن، هەتا خانەكانی ئێسق پەیدا نەبن تاقە خانەیەكی گۆشت دروست نابێ، جارێ پەیكەری جەستەی كۆرپەڵەكە بەتەواوی رێك دەخرێ ئەمجار خانەكانی گۆشت دێنە كایەوە. ئەمەش حەقیقەتێكی عیلمی یەو قورئان پێش هەزارو چوار سەدو ئەوەندە ساڵیە تۆماری كردوە. پاكو بێگەردی بۆ زاتی پاكی..!

٦- قۆناغی شەشەم ئەوەیەك دەفەرموێ: ﴿فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً﴾ دوایی ئەو پەیكەرە ئێسقانەمان بەگۆشت داپۆشیوەو وەكوو پۆشاك بەبەرمان دا كردوە.

٧- قۆناغی حەوتەم ئەوەیە: كەدەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ﴾ پاشان كردمان بەشتێكی تر؛ گیانمان بەبەردا كردو بوو بەگیانلەبەر لەحاڵەتی

جەمادییەوە بوو بەزیندەوەر، دەستی کرد بەجمو جوڵو گوێچکەو چاوو هەستو هۆشی پێ درا.

﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ پەروەردگار پاكو مونەززەهە، بەرزو پیرۆزە لەکارو کردەوەکانی دا، بەدیهێنەرێکی موطلەقە هیچی لێ عاسێ نابێ، هەموو شتێکی حیکمەتەو دانایی تەواوی تێدایە، تاكو تەنهاو بەرزو پیرۆزە ئەو خودایەی؛ کەئەوەی خستۆتە سروشتی ئەو نوطفەیەوە ئاوا بەوشێوەیە ئەم قۆناغانە دەبڕێ، بەگوێرەی ئەو یاسایەی خودا بۆی داناوە، رۆژانە هەزاران نوطفە دەڕژێتە ناو رەحمی ئافرەتەوەو لەگەڵ ئاوی ئەو تێکەڵ دەبێو بەئەم قۆناغانەدا تێدەپەڕنو ئەو یاساو ڕێسایەی خودای بەدیهێنەر بۆی داناون پابەندی دەبنو بەمو لێی لانادەن!

هەر لەحاڵەتی نوطفە یی یەوە قۆناغەکان دەبڕن تادەگەنە حاڵەتی ئینسانیەتو پلەی کەماڵ بەدەست دێنن.

٨- قۆناغی هەشتەم ئەوەیە: دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ﴾ واتە: پاشان ئێوە دوای ئەو بەدیهێنانو قۆناغ بڕینانەو گەشەکردنو پێگەیشتن: کەلەنەبووەوە دروست دەکرێن، دەتانخەینە عالەمی بەرزەخەوە، ژیانی بەرزەخیش قۆناغێکە لەقۆناغەکانی ژیانی ئادەمیزادو دوا قۆناغ نیە.

٩- ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ﴾ پاشان ئێوە لەرۆژی قیامەت دا زیندو دەکرێنەوە بۆ ئەوەی ژیانێکی نوێ دەست پێ بکەن، حیسابو لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دا بکرێ، بگەنە ژیانێکی پڕکامەرانی، یان ئەوپەڕی بەدبەختیو چارە ڕەشی. کەسێك لەجیهان دا رێبازی راست بگرێو رەوشتی پەسندی موسوڵمانانی تێدا بن، ئەو کەسە لەقیامەت دا دەگاتە کەماڵی ژیانو ئەوپەڕی خۆشیو کامەرانی دەست دەکەوێ. کەسێکیش لەژیانی دونیادا دابەزێ بۆ پەستیو هەڵسو کەوتی ئاژەڵی بێ، ئەوە لەژیانی قیامەت دا ئەوپەڕی پلەی پەستی پێ دەدرێو ئادەمیزادیەتی پێشێل دەکرێو دەبێتە سووتەمەنی دۆزەخو لەگەڵ بەردو داردا یەکسانە!

**دروستکردنی ئاسمانەکانو باران بارینو موسەخەرکردنی ئاژەڵ بۆتان**

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

لەبەڵگە جۆراو جۆرەکانی ئیمان لەخودی ئادەمیزاد خۆیدا دەگوێزێتەوە بۆ بەڵگەکانی ئیمان لەئافاق دا، ئەو بەڵگە جۆراو جۆرانە دەخاتەڕو کە ئادەمیزادان ڕۆژانە چاویان پێ دەکەوێو بێ ئاگایانە بەسەری دا تێدەپەڕن. لەبەشی یەکەمی بەڵگەکانی دەسەڵاتی خودا کەبریتی یە لەدروستکردنی ئادەمیزاد خۆی دەگوێزێتەوە بۆ سێ جۆر لەو بەڵگانە: کەبەدیهێنانی ئاسمانەکانو باران باراندنە لەبەرزایی یەوەو کاریگەریی ئەو بارانە لەرسکانو ڕواندنی ڕووەكو دارو درەخت داو سوود بینین لەئاژەڵ لەشیرو لەخوریو لەگۆشت... هتد.

دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائِقَ﴾ سوێند بەخودا ئێمە لەژوور ئێوەوە ئەی ئادەمیزاد! حەوت ئاسمانی چین لەسەر چینمان دروست کردون. حەوت تەبەقەو توێژن یەك لەسەر یەك.

وێ دەچێ مەبەست بە (سبع طرائق) حەوت مەداری فەلەکی بن، یان حەت کۆمەڵەو شارە ئەستێرە بن، وەکوو کۆمەڵەی خۆریی! یان حەوت کیتلەی سەدیمی بن. سەدیم یان (هەیولاو صورەت) ئەو مادە خامەیە کەکۆمەڵە ئەستێرەی لێ پەیدا بووە. هەرچۆنێك بێ قورئان ئاماژە دەکا بەوە: کەحەوت عالەمی ئەستێرە یان حەوت جیهانی فەلەکی لەژوور ئادەمیزادەوە هەیە، واتە: موستەوای ئەوانە لەبۆشایی بەرفراوان دا لەموستەوای زەوی (ژینگەی ئادەمیزاد) بەرزترە.

قورئانی پیرۆز زۆر جار باسی دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو ئادەمیزاد دەخاتە پەنایەکترەوە، وەکوو دەفەرموێ: ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ﴾ (غافر/٥٧) هەروەها قورئان چەند جارێك ئاماژە بەحەوت تەبەقەی ئاسمان دەکا دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الطلاق/١٢)

﴿وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافِلِينَ﴾ ئێمە لەدروستکراوانی خۆمان بێ ئاگانینو پاش گوێیان ناخەین، هەرچی بوونەوەر هەیە بەئاسمانەکانیشەوە لەژێر چاودێری ئێمەدایەو ئێمە پارێزگارییان دەکەینو دەزانین چییان تێدا ڕوو دەدا، تەنانەت پەلکە گەڵایەکیش لەدرەختێك هەڵدەوەرێو شتی لەوەش پچوکتر بەئاگاداریی ئێمەیەو لای ئێمە تۆمارکراوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلاَّ يَعْلَمُهَا وَلاَ حَبَّةٍ فِي ظُلُمَاتِ الأَرْضِ وَلاَ رَطْبٍ وَلاَ يَابِسٍ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ (الانعام/٥٩)

یەکێکی تر لەنیشانەکانی بەتوانایی خودا باران باراندنو ڕوەك ڕواندنە:

دەفەرموێ ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ﴾ ئێمە ناردومانەتە خوارێ لەبەرزاییەوە باران بەئەندازەو بەگوێرەی پێویست بۆ خواردنەوەو ئاودان، نە ئەوەندە دەبارێنن: کەبەشی کشتو کاڵ نەکا، نە ئەوەندەش دەبارێنین کەزیان بەکشتو کاڵتان بگا.

تەنانەت ئەو خاك و ولاتانەی، کەپێویستییان بەئاوی زۆر هەیە بۆ کشتو کاڵ و بارانی کەم لێ دەبارێ، لەولاتی ترەوە ئاوی بۆ دەنێردرێ وەکوو خاکی میصر لەولاتی ترەوە ئاوی بۆ دێ، ئاوەکە لەگەڵ خۆی دا قوڕە سوورێك دەهێنێ لەبو چەوەکەی دادەپۆشێ و دەمێنێتەوە تێ یداو دەبێتە هۆی باشبوونی کشتو کاڵ لەو خاکەدا.

جا کەئاوەکەمان لەئاسمانەوە باراند، لەزەویدا جێگیر دەبێ، زەویمان والێ کردوە ئاوەکە لەخۆ بگرێ و خۆراك بدا بەتۆم رەگو ریشاڵ و زەوی دەڕازێنێتەوە. هەر لەزەوی کارێزو کانیاو هەڵدەقوڵێنن.

تیوری ئەوە: کەئاوی ژێر زەوی (میاه جوفیە) ئاوی بارانەو بەناخی زەویدا ڕۆدەچێ و لەقولایی زەویدا جێگیر دەبێ تیۆرێکی تازە بابەتە، تا پێش ماوەیەکیش واگومان دەبرا کەهیچ پەیوەندییەك لەنێوان ئاوی باران و سەرزەوی لەگەڵ ئاوی ناوەوەی زەویدا نیە، بەلام ئەوە قورئان پێش هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵەیە ئەم حەقیقەتەی چەسپاندوەو رایگەیاندوە.

﴿وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ﴾ ئەگەر بمانەوێ ئەو ئاوەی کەسەرچاوەی ژیانی خۆتان و ئاژەڵ و کشتو کاڵتانە لێتانی بستێنینەوە ژێر خاکی بکەین، ویستی خۆمان دەهێنینەدی و ئاوتان لێ دەشێرینەوە، چۆن توانای باراندنمان هەیە ئاواش دەتوانین لێتانی هون بکەین، بەلکوو دەتوانین بیکەین بەخوێاوکی تاڵ و هیچ سوودی لێ وەرنەگرن نەبۆ خواردنەوە، نەبۆ ئاودێری، خۆ ئەگەر بمانەوێ هەر نایبارێنین و بێ ئاوتان دەکەین، خۆتان و ئاژەڵ و کشتوکاڵتان بەهۆی بێ ئاوی لەناوی دەبەین. ئەگەر بشمانەوێ ئاوەکە لەسەر ڕوی زەوی رایدەگرین ناهێڵین بچێتە ناو زەوییەوە، وەلێ بەلوطف و رەحمەتی خۆمان ئاوی بارانەکە لەزەویدا پەزمەندە دەکەین و لەعەمباراوی سروشتی دا هەڵیدەگرین بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست دا سوودی لێ وەربگرن، کشتو کاڵ و ئاژەڵەکانتانی پێ ئاو بدەن و پێویستیاتی خۆتانی لێ دابین بکەن.

﴿فَأَنشَأْنَا لَكُمْ بِهِ جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ﴾ ئێمە بەو ئاوەی لەئاسمانەوە دەینێرینە خوار چەند باغ و داروەکی جیا جیا، چەند بەرو بووم و میوەهات

وەدی دەهێـنن. نـزارو سـەوزایی جوانو رازاوە پەیـدا دەکـەین: کەهەنـدێ لـەو دارو درەختانە بۆ نموونە داری خورماو داری مێوە: کە دووداری بەرداری گرنگن. ﴿لَكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ بـۆ ئێوە هەیـە لـەو بـاغو دارو درەختانـەدا میـوەی زۆرو زەبەنـدە لەهەموو جۆرێك؛ وێڕای خورماو ترێ، ئێوە لەو درەختانە دەڕوانن‌و سەیری میوەجاتیان دەکەن لێی دەخۆن!

﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلآكِلِينَ﴾ هـەروەها بـۆ ئێوەمان رەخسانـدوە داری زەیتوون: کەلـە کێـوی (طـوور) رواوەو لـەناوی ژێـر زەوی ئاو دەخواتـەوە. لەئـەو درەختانەیـە کـەزۆرترین سـوودی هەیـە، بەرەکـەی رۆنـی لێ دەگێری یان بەشێوەی جیا جیا دەکرێتە خۆراکی ئـادەمیزادو پێخۆر، هـەروا سـوود لە خـودی دارەکـە دەبینـدرێ بـەزۆری لـەوڵاتی عـەرەب دا دەڕوێ بەتایبـەتی لـەلای (وادی موقـەدەس) کەلـە قورئـان دا نـاوی هـاتووە. بۆیـە لێـرەدا بەتایبـەتی نـاوی هێناوە.

ئیمـام ئەحمەدلەئـەبو ئوسـەید: مـالیکی کـوڕی رەبیعـەی (الـساعدی الانـصاری) بەوە ریوایەت دەکا دەفـەرموی پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (کلوا الزیـت وادهنـوا بـە، فانە من شجرة مبارکة) هەروەها تیرمیذی لەئیمامی عومەرەوە ئـەم فەرموودەیـەی ریوایەت کردوە.

نیـشانەیەکی تـر لەڕەحمـەتو بـەزەیی خـودا رام بـوونی ئاژەڵـە بـۆ ئێـوە دەفـەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعَامِ لَعِبْرَةً﴾ بێگومـان هەیـە بـۆ ئێـوەی ئـادەمیزاد لەدروستکردن‌و ڕامکردنی حوشترو رەشە وڵاخو مەڕو بـزن‌و سـوود بەخـشینیان بـۆ ئێوە پەنـدو ئامۆژگـاریی هەیـە، نیعمەتێکـە لەسـەر ئێـوە شـیاوی شـوکرو سوپاسـە، دەشێ بیکەنە بەڵگە لەسەر دەسەڵاتو بەتوانایی خودا بەوە: کـەخوێنی پەیـدا بـوو لەخۆراکیان دەبێتە شیرێکی صاف بـێ غـەش‌و گـواراو تـەغذیـەی جەسـتەتان دەکـا، پەندو ئامۆژگاری تێدایـە بـۆ کەسـێك بـەدڵێکی کـراوەو هەسـتێکی بـەئاگاوە تێیـان بفکـرێ، بـەفامو ژیرییـەوە لێیـان بڕوانـێ‌و لەحیکمـەتو دانـایی پـەروەدگار ورد بێتەوە.

هەڵبەتە سوودو قازانجی ئەو ئاژەڵانە زۆرو زەبەندەن بەڵام لێرەدا چواریانی باس کردن.

١- ﴿نُسقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهَا﴾ واتە: لەو شیرەی ئەوان دەخۆنەوە کەلەنێوان خۆراکی ناو کەرش و خوێندا دێتە دەرەوە ماست و پەنیرو کەرەو شتی تری لێ دروست دەکەن.

٢- ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ﴾ واتە: سوود لەخوری و موو مەرەزو کوڵك و بەرگنیان دەبیندرێ، پۆشاك و راخەرو پێخەفیان لێ دروست دەکەن.

٣- ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ ئەو ئاژەڵانەی بۆ زێربار کردون سەریان دەبڕن و گۆشتەکەیان دەخۆن.

٤- ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾ لەسەر پشتی وڵاخ و کەشتی هەڵدەگیرێن. ئەو وڵاخانە بەکار دێنن بۆ سواریی خۆتان و گواستنەوەی کاڵاتان لەم وڵات بۆ ئەو وڵات وەکوو چۆن گەمیّ بەکار دێنن بۆ ئەو مەبەستانە، سیپاقەکە هەڵگرتنی ئادەمیزادو کاڵاکانیان لەسەر پشتی وڵاغ و گەمیّ لێك دەبەستێ، چونکە هەردووکیان گەردنکەچی یاسای بوونەوەرن، ئەو پێکهاتە تایبەتیەی ئاوو پێکهاتەی گەمیّ و تایبەتمەندی هەوای سەر ئاو هەموو ئەمانە هۆکارن بۆ هاتو چۆی گەمیّ بەسەر ئاوەوە، تەنانەت ئەگەر پێکهاتەی یەکێك لەمانە کەمترین گۆڕانی بەسەردا بێ کەشتیرانی ناکرێ و مەلاحەت لەناو دەریادا دەوەستێ،خودای بەدیهێنەر بەلوطف و رەحمەتی خۆی ئەم هۆکارانەی لێك بەستوون و گەمیّ ی رام کردوە بۆ بەر ژەوەندی ئێوەی ئادەمیزاد، وڵاغی بەهێزو تاقەتی بۆ رام کردون تامەبەستەکانی خۆتان بهێننەجێ!!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ. ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُواْ بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ (النحل/٧) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ، وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ (یس/٧١-٧٣)

ئەمجار لەم وانە پڕو چڕەی پڕ لەبەڵگەی ئیمان لەخودی ئادەمیزاد خۆی داو لەئاسۆی بوونەوەردا، دەگوێزێتەوە بۆ پوختەو کاکڵەی ئەو ئایینەی پێغەمبەران

بەگشتی هێناویانەو بانگەوازییان بۆ کردوە! لەهەمان کات دا چۆنیەتی بەپیرەوە چوونی کۆمەڵانی ئادەمیزاد بەدرێژایی مێژوو بۆ ئەم حەقیقەتەی: کە بەدرێژایی مێژووی ئادەمیزاد نەگۆڕاوە دیاریی دەکا، بەدرێژایی وەرچەرخانی چەرخەکان و تازە بوونەوەی پەیام و سروشی خودا بۆ پێغەمبەران و بەشوێن یەکدی داهاتنی فروستادەکان هەر لەرۆژی حەزرەتی نووحەوە تا سەردەمی دوا پێغەمبەر حەزرەتی موحەممەد ﷺ یەك حەقیقەت بووەو گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

زنجیرەی پێغەمبەران بەردەوام بووەو بانگەوازییان بۆ یەکتاپەرستیو بڕوا بەپەیام و راستی بەردەوام بووە، بانگەوازیو ترساندن و موژدە دانیان بۆ گەلەکانیان دۆبارەوە سێ بارە بۆتەوە. ئەو داوا کارییەی حەزرەتی نووح عليه السلام ئاراستەی گەلەکەی کردوە، هەمان داواکارییە: کە پێغەمبەرانی دوایی بەدرێژایی رۆژگار ئاراستەی گەلەکانیان کردوە وەڵام و هەڵوێستی گەلەکانیش تێکڕا لێك دەچن و دەڵێی لەیەکتریان گێڕاوەتەوە.

ئێستاش بۆ روونکردنەوەی ئەم راستییە پێنج چیرۆکی پێنج پێغەمبەر بۆ نموونە دەهێنێتەوە. بەئاشکرا لێکچوویی پەیامی پێغەمبەرەکان و هەڵوێستی گەلەکانیان لەئاست ئەو پەیامە خوداییە دیاریی دەکا. دەی بابچینە سەر مەبەست و گوێ بۆ چیرۆکە کورتبڕە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم سوورەتە رابگرین و دوایی بەراوردیان بکەین و پەندو عیبرەتیان لێ وەربگرین.

## چیرۆکی حەزرەتی نووح عليه السلام

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ

شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡۖ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ وَإِن كُنَّا لَمُبۡتَلِينَ ﴿٣٠﴾

هەڵبەتە پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەسەر ڕێبازی پەیڕەو کردوی قورئانە؛ کە زۆرجار بەسەرهاتو چیرۆکی پێغەمبەران دوا بەدوای نمایش کردنی بەڵگەی یەکتاپەرستیو زیندوبوونەوە رادەنوێنێو دەیانهێنێ مەبەستیشی دەستنیشان کردنی کوفرانو سپلەیی ئادەمیزادە بەرامبەر نیعمەتەکانی خوداو

سەرەنجام گیرۆدە بوونیان بەعەزابی سەختی پەروەردگار لەتۆڵەی سەرڕەقیو سەرپێچیکردنی پەیامی پیرۆزی فرۆستادەکان.

ئەوەتا دوا ئەوەی بەڵگەی تاكو تەنهایی خودای هێنانەوە دروستکردنی ئادەمیزادو ئاژەڵو روەكو بەدیهێنانی ئاسمانەكانو زەوی كردن بەنیشانەی تاكو تەنهاییو بەدەسەلاتیو دانایی خۆی، ئەمجار چەند هەڵوێستێكی گەلو نەتەوە بێ بڕواكانی رابوردو: كەدەق دەشوبهێنە هەڵوێستی كافرەكانی مەككە نمایش دەكا، پێنج چیرۆكی ئەو پێغەمبەرانە لەگەڵ نەتەوەكانیان دا ریز دەكاو دەیانگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ﴾ بێگومان ئێمە نووحمان ﷺ كردە پێغەمبەرو رەوانەمان كرد بۆسەر گەلەكەی، ئەویش بانگەوازیی كردن بۆئیمانهێنان ﴿فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ پێ ی گوتن: ئەی گەلو نەتەوەكەم! عیبادەتی خودا بكەن، جگە لەئەو كەس خودای ئێوە نیە، پێی گوتن: ﴿أَفَلا تَتَّقُونَ ؟﴾ ئەرێ ئەوە بۆچی لەسەرەنجامی هاوەڵ دانانو بتپەرستی ناترسن، بەچ عەقڵو بیرێك ئێوە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن؟ عیبادەتی خودا بكەنو جگە لەئەو خودای ترتان نیە: وشەیەكی حەقەو بوونەوەر بەو حەقە وەستاوەو هەموو شتێكی ناو ئەم گەردونە گەواهی ئەو راستی یە یە. ئەدی ئێوە چۆن لەئینكاری كردنی ئەو حەقیقەتە ناترسن؟ چۆن هەست ناكەن بەوە: كە ئەو ئینكاری كردنەتان دەستدرێژی كردنە بۆ سەر حەقیقەتێكی ئاشكراو نومایان؟ ئایا نازانن ئینكاری كردنی ئەو حەقە دەتانكاتە شیاوی عەزابێكی بێ ئامان!!

بەڵام پیاو ماقوڵانی گەلەكەی لەناوەڕۆكی ئەم پەیامە ناكۆڵنەوە بیر لەڕاستیو دروستی ئەم وشە حەقە ناكەنەوە، ناڕوانن بۆ بەڵگەو نیشانەكانی لەبوونەوەردا، لەو بیرە تەسكەی خۆیان دەرناچنو نایانەوێ دەرچن، لەجیاتی ئەوەی بیر لەبەدیهێنەری بوونەوەر بكەنەوەو بڕواننە بەڵگەو نیشانەكانی، ئەو حەقیقەتە رەهایە پاشگوێ دەخەنو واز لەلێكۆڵینەوەو لێ وردبوونەوەی بەدیهێنەر دێنن، كەسایەتی حەزرەتی نووح ﷺ دەخەنە بەر باسو لێكۆڵینەوە، قسە لەخودی خۆی دەكەن!!! ئەوەتا: ﴿فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ﴾ ریش سپیو پیاو ماقوڵەكانی گەلەكەی؛ ئەوانەی كافرو موشریك بوون، وتیان: ﴿مَا هَذَا إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ﴾ نووح

ئادەمیزادێکە وەکوو ئێوەو لەوە زیاتر هیچی تر نیە! کابرایەکە خۆسەپێنەرو ﴿يُرِيدُ أَنْ يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ دەیەوێ: خۆی بکاتە گەورەو کاربەدەستی ئێوەو ئاغایەتیتان بەسەرەوە بکا.

بۆ ئەم خۆسەپاندن و ئاغایە تێکردنە لافی پێغەمبەرێتی لێ دەداو دەیەوێ لەم رێگایەوە ئەومەبەستە تایبەتییەی خۆی وەدەست بێنێ! ئەگینا خۆ ئەو چ زێدە زانیاری و رەوشتی تایبەتی و میزەیەکی بەسەر ئێوەوە نیە، دەی کەوابێ چۆن زێدە لەئێوە ئەو دەبێتە پێغەمبەرو پەیامی بۆ دێ؟؟!

سەیرە ئەوان لەم گۆشە نیگا تەنگەبەرەوە دەیانڕوانیە ئەو پەیامە گەورەو ئەو حەقیقەتە موطلەقە. ئامادە باشی ئەوەیان تێدا نەبوو سروشتی پەیامی حەزرەتی نووح ﷺ بناسن و حەقیقەتەکەی بزانن. ئەوان بەهەموو عەقڵ و هۆشی خۆیان بانگەوازیی ئەو پێغەمبەرەیان لەوەدا کورت هەڵێنا بوو: کەدەیەوێ خۆیان بەسەردا بسەپێنێ! بەمەش رێزی ئادەمیزادییەتی خۆیان و هەموو ئادەمیزادانی تریان شکاند، رێز لێنانی خودای بوونەوەر بۆئەم جینسە رەت دەکەنەوە، پێیان سەیرە پێغەمبەری ئادەمیزاد ئادەمیزاد بێ.

وتیان: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾ خۆ ئەگەر خودا بیویستایە پێغەمبەر بنێرێ فریشتەی دەناردنە خوارێ و ئەم ئەرکەی دەخستە سەر شانیان، هەرگیز ناگونجێ ئادەمیزاد ببێتە پێغەمبەرو لەخوداوە پەیام بێنێ ﴿مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە لەباوک و باپیری رابووردووی خۆمان شتی وامان نەبیستووە، ئادەمیزاد بکرێتە پێغەمبەرو ئەرکی بانگەوازیی و هیدایەتدانی کەسانی دیکەی بخرێتە سەرشان!

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ بِهِ جِنَّةٌ﴾ نووح جگە لەوەی: کە پیاوێکی شێتە هیچی تر نیە، شێتە لەوەدا: کەپێی وایەخودا کردوویەتی بەپێغەمبەرو بۆ سەر ئێوەی رەوانە کردوە، ﴿فَتَرَبَّصُوا بِهِ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ چاوەڕوانی مردنی بن، ماوەیێک خۆ بگرن و صەبرتان بێ دەمرێ و لەکۆڵ دەبێتەوە، ئیتر ئیستراحەتی لێ دەکەن، یان چاوەڕوان بن ماوەیەکی تر نائومێد دەبێ و ئیتر دەگەڕێتەوە سەر ئایینی ئێوە، یان لەو نەخۆشی شێتی یە رزگاری دەبێ و دەگەڕێتەوە سەر ئایینی ئێوە. هەڵبەتە ئەمە

خـۆ گێـل كـردن‌و موكابـەرە كردنـە، ئـەگینا ئـەوان حـەزرەتی (نـووح) یـان بـاش دەناسی‌و دەیانزانی مرۆڤێكی خاوەن عەقڵ‌و كەماڵە.

ئیتر پاش ئەوەی حەزرەتی نـووح ﷺ نۆسـەدو پـەنجا ساڵ بانگـەوازی كـردن‌و ئەو ماوە دورودرێژە خۆی گرت‌و هەوڵی لەگەڵ دان‌و نەهاتنـە سـەر رێبـازی راسـت، جگە لەكەمێكیان نەبێ بڕوایان پێ نەكرد. ئیتر لەخودا پاڕایـەوە ﴿قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ وتی: خودایە! یارمەتیم بدەو سەركەوتووم بكە بەسەر ئەم گەلـە سـەر ڕەقە بێ بڕوایەدا، غەزەبیان لێ بگرەو بیانفەوتێنە، عەزابی ڕیشە كێشیان بەسـەردا بدە، چونكە پـەیامی منیـان رەتكـردەوەو بـەدرۆیان خـستەوە. وەكوو لەئایـەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ﴾ (القمر/١٠) یـان دەفـەرموێ: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّـاراً﴾ (نـوح/٢٦) ئـیتر پـەروەردگار دوعاكـەی گـیرا كردو فەرمانی پێ كرد: كەدەست بكا بەگەمێ دروست كـردن، ﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنْ اصْنَعْ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ واتە: فەرمانمان پێكرد، بەوە لەژێر چاودێری ئێمەدا كەشـتی دروست بكا، بەگوێرەی نیگاو سروشی ئێمە هەڵس‌و كەوت بكا.

﴿فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ فَاسْلُكْ فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلاَّ مَـنْ سَـبَقَ عَلَيْهِ الْقَـوْلُ مِـنْهُمْ﴾ جـا كـەكاتێ بڕیـاری ئێمـە بەلـەناوبردنیان هات‌و ئـاو لـەزەوی هەڵقوڵا، یان ئاو لەتەندوری نانكردن ـ كەشوێن ئاگرو بڵێسەیە ـ هـەڵقوڵا؛ ئـەوە تـۆ دەس بەكار بە؛ لەهەموو نێرو مێیەك دوانەیەك بخەرە ناو كەشتیەكەوە، لەهـەموو رەگەزو جۆرێكی گیانلەبەران نێرو مێیەك هەڵبگرە، هەروەها منداڵ‌و كەس‌و كاری خۆشـت بخـەرە نـاوی، یـان هـەموو ئەوانـەی ئیمانیـان پێـت هێنـاوە بیانخـەرە نـاو كەشـــتیەكەوە، جگـــە لەوانـــەی ئیمانیـــان پـــێ نـــەهێناوی‌و بڕیـــاری ئێمـــە بەلەناوچوونیان دەرچووە. وەكوو كەنعانی كوڕی‌و دایكی كـەنعان، ئەوانـە لـەپێڕی لەناو براوەكانن.

پەروەردگار فەرمانی بەحەزرەتی نووح كرد: كەكەشتی دروست بكـا بـەدەستی خۆی، چونكە پێویستە ئـادەمیزاد هۆكـاری مـاددی دەسـتەبەر بكـاو هـەموو توانـای خۆی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی شـیاوی یارمەتیـدانی بـێ، داب‌و نـەرێتی خـودا واهـاتووە

یارمـەتی ئەوانـە نـادا خۆیـان پـاڵی لێ بدەنـەوەو خۆیـان بلێـسنەوەو چـاوەڕوانی یارمەتی خودابن، بۆ خۆیان هیچیان لەدەست نەیەو هیچ نەکەن!

پـەروەردگار وای بڕیـارداوە: کـە حـەزرەتی نـووح ﷺ ببێتـە بـاوکی دووەمـی ئادەمیزاد، هەڵینا کە هۆکارە مادییەکان دەستەبەر بکاو توانای خـۆی بـەکار بێنـێو یارمـەتی خـوداش بەرچـاو بگـرێو داوای کۆمـەکیو یارمـەتی لێ بکـا. نیـشانەی دەستپێکردنی هاتنی تۆفانو پاکسازی کردنی ئەوانەی دڵ ڕەقو سەرپێچی کارو بـێ بڕوان بـەوە بـۆ دانـا؛ کەهـەرکاتێ تەنـدووری نـانکردن: کەبەڕواڵەت شوێنی ئـاگرە ئاوێ لێ هەڵقوڵا، خێرا لەخۆ بکەوێو تۆوی ژیان بخاتە ناو کەشتی ڕزگـار بوونـەوە، لەهـەموو جۆرێـك لەحـەیوانو خـشۆكو باڵنـدەو ڕوەك نێـرو مێیـەك بخاتـە نـاو کەشتیەکەوە چەندێکی بۆ دەکرێو لەبەردەست دان لەوانە ڕزگاریـان بکـا، هـەروەها هەموو ئەوانەی ئیمانیان پێ هێناوە لەتەك خۆی دا هـەڵیان بگـرێ. جگـە لەوانـەی بڕیاری خۆدایان بۆ دەرچووە بەلەناوبردنو فەوتان فەرمانی پێ کرد.

کەبە هیچ جۆرێك هەوڵی ڕزگار کردنی ستـەمکاران نـەدا تەنانـەت بـانزیکترین کەسیش بن بۆی. دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُـونَ﴾ نەکـەی دەربـارەی ئەوانـەی کـافرو سـتەمکارن موجادەلـەم لەگـەڵ بکـەی؛ داوام لێ بکـەی: کەتۆفان نەیانگرێتەوەو ڕزگاریان ببێ. نەکەی ئەو هەوڵو تەقەلایە بدەی! چونکە بێگومان ئەوانە لەپێری خنکاوانن، بڕیارەو دراوە، ئەوانە دەخنکێنین!

ئـەمجار پـەروەردگار فـەرمان بـە حـەزرەتی نـووح ﷺ دەکـا: کـەکاتێ سـواری گەمێکە بوون، خۆیو ئەوانـەی لەگەڵیـدا سـوار بـوون حەمـدو ئـەنـای خـودا بکـەن، دەفـەرموێ: ﴿فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلْ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانَـا مِـنْ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ ئەوکاتەی خۆتو ئەوانەی لەگـەڵت دان لەسـەر کەشـتییەکە جێگیر بوونو دامەزران بڵێن: سـوپاسو سـتایش بـۆ ئـەو خودایـەی ئێمـەی لەدەسـت گـەلی ستەمکار ڕزگار کرد، ئەوانی فەوتاندو ئێمەی بەلوطفو کەرەمی خۆی ڕزگار کرد.

ئیبنوعەبباس ﷺ دەفەرموێ: ئەو ئادەمیزادانەی لەکەشتییەکەدا لەگـەڵ نـووح ﷺ بوون هەشتا کەس بوون: حەزرەتی نووح ﷺ خۆیو خێزانەکەی تری؛ جگـە لەوەی لەگەڵ کوڕەکەیدا بەر خنکان کەوتن. سێ کوڕیشی: سامو حـامو یـافثو سـێ

هاوسەرەكانیانو حەفتاو دوو كەسی تر، هەموو ئادەمیزاد دوایی لەمانە كەوتوونەوە ئەمجار فەرمانی پێ كرد: كەكاتێ لەكەشتییەكە دادەبەزن لەخودا بپارێتەوە زێدو نیشتمانێكی بەنسیب بكا پڕ بەرەكەتو پیرۆز بێ: دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ رَبِّ أَنزِلْنِي مُنْزَلاً مُبَارَكاً وَأَنْتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾ لەوكاتەدا: كەلە كەشتییەكە دادەبەزێ، بڵێ: بەپیرۆزی دامبەزێنەو لەشوێنێكی پڕ پیتو بەرەكەت نیشتە جێم بكە خێرو خۆشی تێدا ببینم، تێ یدا بحەسێمەوە، بێگومان تۆ باشترین دامەزرێنەرو چاودێرو پارێزگاری.

﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ وَإِنْ كُنَّا لَمُبْتَلِينَ﴾ بێگومان لەهەموو كارێكمان بەگشتیو لەم جۆرە ئیشانەمان دا بەتایبەتی (رزگار كردنی خاوەن باوەڕانو لەناوبردنی ستەمكاران) بەڵگەی بەهێزو راست هەن لەسەر راستی پەیامی پێغەمبەران. ئێمە بەرانواندنی ئەم بەڵگانەو بەناردنی پێغەمبەران خەڵكی بەتاقی دەكەینەوە، واتە: مامەڵەی كەسانێك دەكەین لەگەڵتان كە بیانەوێ بەتاقیتان بكەنەوە. چونكە تاقیكردنەوە بۆ كەسێك دەبێ كەمەجهولی بۆ ئاشكرا ببێ، دەی خۆ هیچ شتێك نیە لەخودا نادیار بێ. هەموو شتێك لای خودا ئاشكراو نمایانە.

یان دەگوترێ: مانای بەتاقیكردنەوە ئەوەیە: خودا ئەوەی لەزانیاری خۆیدا چەسپاوە دەری بخاو نیشانی ئادەمیزادی بدا.

## چیرۆكی حەزرەتی (هود)(عليه السلام)

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ

﴿وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَاسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾﴾

ئەمجار قورئان چیرۆكێكی ترمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش چیرۆكی حەزرەتی هودە ﷺ، جا هەرچەندە لێرەدا قورئان ناوی حەزرەتی هودی نەهێناوە، بەڵام بەقسەی ئیبنوعەبباس و زووربەی موفەسسیران مەبەست حەزرەتی هودە، چونكە لەسورەتی (الأعراف) دا: چیرۆكی هود دوای چیرۆكی نووح ﷺ دەهێنێ و دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ هەروەها لەسورەتی هود و(الشعراء)یش دا چیرۆكی هود دوابەدوای چیرۆكی نوح ﷺ دەهێنێ!

هەندێ لەموفەسسیرین پێیان وایە ئەم چیرۆكە چیرۆكی حەزرەتی (صالح و ثەمود)ە چونكە قەومی صالح ﷺ پێغەمبەری خۆیان بەدرۆخستەوەو بەگرمەو صەیحە لەناو بران.

﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْناً آخَرِينَ﴾ دوای لەناوبردنی گەلی نووح ﷺ بەتۆفان، گەل‌و نەتەوەیەکی ترمان دروست کردنەوە کردمانن بەجێنشین‌و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، ﴿فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ﴾ ئەمجار پێغەمبەرێکمان لەخۆیان بۆسەر ناردن ﴿أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ بانگەوازی کردن بۆ ئەوەی عیبادەتی خودا بکەن‌و یەکتاپەرستی ئەنجام بدەن، فەرمانی پێکردن: کەتەنها بەندایەتی بۆ خودا بکەن‌و کەسی ترنیە شیاوی پەرستش بێ، ئەوانیش بانگەوازییەکەیان رەتکردەوە، بەدرۆیان خستەوە، وتیان شوێنت ناکەوین. ئەمجار حەزرەتی هود ﷺ پێ ی گوتن ﴿أَفَلا تَتَّقُونَ﴾ ئەرێ ئەوە بۆچی لەعەزابی خودا ناترسن؟ بۆچی بڕوام پێ ناکەن؟ بۆ واز لەبتپەرستی ناهێنن؟ خۆ عیبادەتکردن هەر بۆ خودا دەکرێ‌و هەرزاتی خودا شیاوی پەرستش‌و عیبادەت بۆ کردنەو کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە.

﴿وَقَالَ الْمَلأُ مِنْ قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الآخِرَةِ﴾ پیاو ماقوڵان‌و ریش سپیانی گەلەکەی: کەئەم سێ رەوشتانەیان تێدا بوون:

١- کافر بوون بەخوداو ئینکاری کردنی تاك‌و تەنهایی زاتی پاکی.

٢- کافر بوون بەرۆژی قیامەت‌و بەدرۆزانینی حیساب‌و لێکۆڵینەوە.

٣- ﴿وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ ژیانخۆشی‌و دەستەبەر بوونی پێداویستی ژیانیان، نازو نیعمەتمان بەسەردا رشتبوون هەتا لەخۆیان بایی بوبوون‌و ئینکاری نیعمەتەکانی خودایان دەکرد.

بەڵێ: ئەو پیاو ماقوڵ‌و ریش سپیانەی گەلەکەی کەئەو سێ رەوشتە ناشیرینانەیان هەبوون، وتیان: ﴿مَا هَذَا إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ﴾ ئەم پیاوە ناوی هودەو لاف پێغەمبەرێتی لێ دەدا هەر ئادەمیزادێکەو وەکوو ئێوەو بەس، هیچی لەئێوە زیاتر نیە، ﴿يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ﴾ لەئەو خواردەمەنییە دەخوا: کەئێوە لێی دەخۆن، ئەویش وەکوو ئێوە پێویستی بەخۆراك هەیە، ﴿مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ﴾ لەئەو ئاوە دەخواتەوە: کەئێوە لێی دەخۆنەوە، ئەویش وەکوو ئێوە بێ ئاو نازێ! دەی ئیتر چ زێدە رێزێکی بەسەر ئێوەوە هەیە، بەچ رویەك ئیدیعای پێغەمبەرێتی دەکا؟!

﴿وَلَئِنْ أَطَعْتُمْ بَشَراً مِثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذاً لَخَاسِرُونَ﴾ سوێندمان وابێ ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئادەمیزادێکی وەکوو خۆتان بن‌و شوێن کەسێکی وابکەون کەهیچی

لەمئێوە زیاتر نیە، بێگومان ئەوکاتە ئێوە عەقڵو هۆشتان لەکیس چووە، بەهەڵە چونو سەرتان لێ شێواوە، ئەو شکۆمەندیو ڕێزەی هەتانە بەهۆی بتەکانتانەوە، بەشوێنکەوتنی ئەم کابرایە: کەناوی هودە لەکیستان دەچێو دەسخەرۆ دەبن!

ئەمجار خۆ لێسەرەوەو لەخۆ بایی بووەکان، گومانێکی تر دەخەنە سەر پەیامی حەزرەتی هودو سەریان سوور دەمێنێ لەوەی: کەپێیان دەفەرموێ: زیندوو بوونەوە هەیە دوای مردنو رزینو پۆڵکان جارێکی تر زیندو دەکرێنەوە بەخەڵکەکە دەڵێن: ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَاباً وَعِظَاماً أَنَّكُمْ مُخْرَجُونَ﴾؟ ئایا هود وادەی ئەوەتان دەداتێ: کەئێوە مردنو پولکانو بوونەوە گڵو ئێسقانە رزیو، جارێکی تر سەرلەنوێ لەگۆڕەکانتان دەردەهێندرێنەوەو زیندو دەکرێنەوە، ﴿هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ﴾ زۆر دوورەو عەقڵ وەری ناگرێ، ئەی خەڵکینە! ئەمەی: کەهود پێتان رادەگەیەنێ لەبارەی زیندو بوونەوەی رۆژی قیامەتو حیسابو لێکۆڵینەوە لەگەڵ دا کردنو پاداشو سزا وەرگرتنەوە لەسەر کردەوەکانتان شتێکی زۆر دوورو نەگونجاوە!

﴿إِنْ هِيَ إِلاَّ حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾ نەوەکوو ژیان هەیە ئیللا: کەهەیە تەنها ژیانی دونیایەو بەس، هەندێکمان دەمرینو هەندێکی ترمان درێژە بەژیان دەدەین، ئەمجار ئەو هەندەمان دەمرینو هەندێکی ترمان دێنە جێگەیان ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾ ئێمە ئیتر دوای مردن هەرگیزاو هەرگیز زیندو نابینەوە. نەزیندووبوونەوە هەیە، نەحەشر هەیەو نەنەشر، نەبەهەشت راستەو نەدۆزەخ!

هەڵبەتە کەسانێك: کەبەم جۆرە بیر بکەنەوە، بەو پێوەرە مادییە ژیان هەڵبسەنگێنن، ناتوانن حیکمەتە گەورەکانی ژیان هەست پێ بکەن، لەکوێ ورد بینی ئەوەیان هەیە بتوانن ئاکامەکانی ژیان بزانن، هەرگیز ناگەنە ئەو ئاستە پێیان وابێ ئاکامی ژیان لەسەر زەوی دەستەبەر نابێ، خێرو چاکە هەرگیز ناتواندرێ لەژیانی دونیادا پاداشتی تەواوی بدرێتەوە. شەڕو خراپەش هەروا، بەڵکوو پاداشی چاکەو سزای خراپ لەو دونیادا بەتەواوی دەدرێتەوە: کەموسوڵمانانی خودا پێداو دەگەنە توپەڵاکی ژیانخۆشیو بەبەهەشتی بەرین شاد دەبنو ترسی لەناو چونو برانەوەی نازو نیعمەتەکانیان نامێنێو کافرو

تاوانبارەکانیش دەخرێنە بنکی دۆزەخەوەو دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ. ئالەو دونیایەداو لەناو ئەو بەهەشتە خۆش‌و دلگیرو رازاوەدا ژیانی کامەرانی دەستەبەر دەبێ‌و لەناو دۆزەخ دا سزای تاوانباران بەتەواوی وەردەگیرێتەوە.. ئەگینا ئەگەر بۆ نموونە ستەمکارو ملهوڕێکی بێ بەزەیی لەدونیادا هەزاران گوندو شارو شارۆچکەی خاپور کردن بەهەزاران ئادەمیزادی بەناحەق کوشت‌و بڕ کردن، ژیانی ئاژەڵ‌و پەلەوەریش تاڵ بکا، ئەگەر بمانەوێ لەژیانی دونیادا تۆڵە لەئەم ستەمکارە بستێنین چۆن تۆڵەی لێ دەستێنرێتەوە؟ ئەوپەڕی ئەوەیە تەعزیبی بدەین، ئیعدامی بکەین. دەی ئیعدام کردنی قەرەبووی تاوانی کوشتنی ئادەمیزادێکە لەو دەیان هەزارەی لەناوی بردون، ئەی تۆڵەی ئەوانەی تری چۆن لێ بکەینەوە، هەردەبێ لەناو ئاگری دۆزەخ دا تۆڵەی ئەو هەزاران هەزار خەڵکە داماوە لەو ستەمکارە ملهوڕە بسێندرێتەوە.. کەسانێك: کەوەك گەلی هود بیر بکەنەوەو ئەوە بیرو باوەڕیان بێ کەی مانای ژیان دەزانن؟ کەی دەتوانن لەقۆناغەکانی سەرەتای ژیانی ئادەمیزادەوە بەڵگە بدۆزنەوە بۆ ئاکامی ژیان،کوا عەقڵیان بەوە دەشکێ بزانن ئەو هێزەی ئادەمیزادی بەو قۆناغانەدا تێپەڕاندوە ناهێڵێ ئەو ژیانە بەمردن کۆتایی بێ!! بەڵکوو دەبێ ئەو ژیانە بگاتە چڵە پۆپە، گەیشتنیش بەو ژیانە تەنهاو تەنها لەقیامەت دا دەستەبەر دەبێ.

ئەوان بەم تانەو رەخنە گرتنەش نەوەستان، بەڵکوو تانەیان لەپێغەمبەرێتیشی داو هودیان بەدرۆ هەڵبەست‌و بوختانکەر دایە قەڵەم‌و پلەو پایەی پێغەمبەرێتییان پێ رەوا نەبینی. وتیان: ﴿إِنْ هُوَ إِلاَّ رَجُلٌ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ﴾ نەوەکوو ئەو پیاوەی ناوی هودەو داوای پێغەمبەرێتی دەکا باسی زیندو بوونەوە دەکا، ئیللا کەهەیە پیاوێکەبەدەم خودا شتی هەڵبەستووەو بەناوی خوداوە درۆ بڵاودەکاتەوە، چی دەڵێ: لەبارەی پێغەمبەرێتی‌و زیندوبوونەوە هیچی راست نیەو ئێمە بڕوای پێ ناکەین!

ئیتر پێغەمبەری خودا لێیان نائومێد بوو، زانی کەبەهیچ جۆرێ بەپیر بانگەوازیی یەکەوە نایەن، هیچی تری بەدەستەوە نەماوە لەوە بەولاوە: کەپەنا بەرێ بۆلای خودای بالادەست‌و داوای کۆمەکی لێ بکا، وەکوو چۆن لەوەپێش

حەزرەتی نووح ﷺ هانای بۆ خودا بردو ئەویش بەهانایەوە هاتو رزگاری کرد.

بەهەمان شێوەو ئوسلووبی نووح ﷺ هاواری لەپەروەردگار کردو ﴿قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ وتی: خودایە! یارمەتیم بدە، بەسەر گەلەکەم دا سەرم بخە، بەهۆی ئەوەوە ئەوان بەدرۆیان خستمەوە، بانگەوازییەکەی منیان رەتکردەوە، ئەوەی ئەرکی سەرشانم بوو ئەنجامم دا، ئیتر هیچم بەدەستەوە نەماوە جگە لەوەی کەهانا بۆ تۆ بێنم رزگارم بکەی!

ئیتر ئالەوکاتەدا: کەماوەی بڕیاردراو بۆ ژیانی ئەو گەلە تەواو بوو، کەسێکیان تێدا نەما هیوای خێری لێ بکرێ، پەروەردگار پاڕانەوەکەی لێ وەرگرتو بەهانایەوە هات، ﴿قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ﴾ پەروەردگار فەمووی پاش ماوەیەکی کورت گەلەکەت لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان دەبنەوە. بەڵام ئەو کات پەشیمان بوونەوەکەیان هیچ سوودێکی نابێ.

ئەو کاتەی نیشانەکانی عەزابی ڕیشەکێشکەر دەبینن ژێوان دەبنەوە، بۆیان ئاشکرادەبێ کەڕەتکردنەوەی پەیامەکەتو ئیمان نەهێنانیان کارێکی هەڵە بووە، بەڵام ژێوانبوونەوەکەیان وەرناگیرێ، کار لەکار ترازاوەو کات بەسەر چووەو هەل لەدەست دراوە.

ئیتر ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً﴾ عەزابی ڕیشەکێشکەری خۆمانمان بەسەردا دانو دوا بڕاومان کردن، بەگرمەو نەڕەو پیا هەڵشاخانێکی جوبرائیل لەناومان بردن، بەدەنگێکی ترسناکو لەوزە بەدەر هەموویانمان خپ کردنو لاڵو پاڵ کەوتنو وەکوو دارو پەردو چیلکەو چەوێڵی لافاو هاوردو پرژو بڵاوو بێ نرخ، چونکە ئەوان وازیان لەتایبەتمەندی خۆیان هێناو، ئەو پیوەندییە گیانی یەی کەدەبوایە بەپەروەردگاریان ببەستێتەوە بەئەنقەست پچڕاندیان، پشتیان لەبەدیهێنەری خۆیان هەڵکرد، ئیتر شیاوی ئەو بەهلاکبردنە بوون بەو شێوە بێ نرخیە لاڵو پاڵی خستن!

﴿فَبُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ دووریی لەڕەحمەتی خودا بۆ قەومی ستەمکار، وێڕای لەناو بردن بەو شێوە سامناکەیە لەرەحمەتی خوداش دوورن، خودا بەزەیی پێدا نایەنەوە، ئادەمیزادیش بۆیان بەپەرۆش نین، خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردو

خۆیان بەو دەردە برد، ئەمەش بەهۆی ستەمکاریو کوفرو بێ بڕوایی خۆیانو یاخی بوونیان لەخوداو پشت هەڵکردنیان لەپەیامی پێغەمبەرەکەیان، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ﴾ (الزخرف/٧٦)

## چیرۆکی حەزرەتی صالحو لوطو شوعەیبو پێغەمبەرانی تریش

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ ۚ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَحَادِيثَ ۚ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی سێیەمە لەم سورەتەدا، لەراستی دا کۆمەڵە چیرۆکێکنو یەك مەبەستییان تێدایە. پەروەردگار جاری واهەیە لەقورئان دا چیرۆکەکان بەدرێژیی دەگێرێتەوە؛ وەکوو ئەو دوو چیرۆکەی پێشەوە جاری وایش هەیە بەکورتی دەیانگێرێتەوە وەکوو ئێرە، مەبەستیش بەم چیرۆکانەی ئێرە چیرۆکی حەزرەتی (لوطو صالحو شوعەیبو ئەییوبو یوسف)ە (درودی خودایان لێ بێ).

دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قُرُوناً آخَرِينَ﴾ واتە: دوای بەهیلاکبردنی گەلی عاد، چەند گەلو نەتەوەیەکمان هێنانە کایەوەو لەسەر زەوی قووتمان کردنەوە، لەوانە: گەلی لوطو گەلی صالحو گەلی یوسفو گەلی ئەییوبو گەلی شوعەیبو هی تریش بۆ ئەوەی لەشوێنی گەلە لەناوبراوەکانی پێش خۆیان جێنشین بنو زەوی ئاوەدان بکەنەوە!

نازو نیعمەتمان بەسەردا رشتن، پێغەمبەرمان بۆ سەر رەوانە کردن، سەرپێچییان کردو فروستادەکانی ئێمەیان بەدرۆ خستەوە، بڕیاری تۆڵە لێ

ستاندنمان دانو هەریەکەیانمان لەکاتی دیاری کراوی خۆی لەناوبرد، ﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَأْخِرُونَ﴾ هیچ کام لەو گەلو نەتەوە لەناو براوانە لەکاتی دیاریکراو بۆ فەوتانیان پێش نەکەوتنو دوایش نەکەوتن، هەر گەلو نەتەوەیەك لەکاتی خۆیدا لەناوچوو. ئەو کاتەی دانرابوو بۆ بەهیلاکچونیان بەمەرجێ ئیمان نەهێنانیان پاشو پێشی تێدا نەکرا!! کەوابێ ئێومیش ئەی گەلو نەتەوەی پێغەمەمبەری ئیسلام! پەلە لەهاتنی عەزاب مەکەن، چونکە هەموو شتێك لای خودا بەئەندازەو رێژەیە، هەموو شتێك کاتی خۆی هەیە، لەگەڵ کاتی هات پاشو پێش ناکا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ﴾ (النحل/٦١).

﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَى﴾ پاشان پێغەمبەرانی خۆمانما یەك بەشوێن یەکدا بۆسەر ناردن، هەر پێغەمبەرێك لەو پێغەمبەرانە کەدەهاتە سەر گەلەکەی بانگەوازیی دەکردن بۆ خودا پەرستیو وازهێنان لەبتپەرستی. جا هەبوە ئیمانی هێناوەو هەبوە بەگومڕایی ماوەتەوە وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ﴾ (النحل/٣٦)

سەیرە بەدرێژایی مێژوو ئەو گەلو نەتەوانە دەڵێی لێکیان گێڕاوەتەوە ﴿كُلَّ مَا جَاءَ أُمَّةً رَسُولُهَا كَذَّبُوهُ﴾ هەرکاتێك پێغەمبەرێك لەپێغەمبەران هاتبێتە سەر گەلەکەیو بانگەوازی کردبن بۆ خودا پەرستیو شەریعەتو یاسای خودای پێ راگەیاندبن، داوای لێ کردبن شوێنی بکەون، زوربەی زۆری ئەو گەلو نەتەوانە پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستۆتەوە، چاویان لەنەتەوەکانی پێش خۆیان کردوەو رێبازی ئەوانیان رەچاو کردوە؛ ئیتر پەروەردگاریش دابو نەرێتی نەگۆڕی تێدا ئەنجام داون، هەر کەبەدرۆ خەرەوەکانیان بەدرۆخستەوە خودا بەپێی دابو سوونەتی خۆی گرتوونیو لەناوی بردون.

دەفەرموێ: ﴿فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُمْ بَعْضاً﴾ هەندێکمان بەشوێن هەندێکی تریان دا لەناو بردن، یەك بەدوای یەك دا قەلاچۆمان کردن، شوێنەوارو پاشماوەیان بووەتە عیبرەت بۆ دوا خۆیان ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ﴾ کردمانن بەچیرۆكو بەسەر بردە بۆ

ئادەمیزادانی دوا خۆیان. خەڵکی دەیانکەنە چیرۆکی بەرئاگردان‌و بۆ کات بەسەر بردن‌و عیبرەت وەرگرتن‌و سەرسوڕمان لەو بەسەرهاتانە!

﴿فَبُعْداً لِقَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ بەهیلاکچوون‌و مـاڵوێرانی‌و دوور لەرەحمـەتی خـودا بـۆ گەل‌و نەتەوەیەك بڕوا بەپێغەمبەرەکەیان نەکەن‌و بەدرۆی بخەنەوە.

هەڵبەتە ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە بۆ هـەموو کافرێك‌و بەڵگەیـە لەسـەر ئەوە: ئەوانە وەکوو بەزویی لەناو چوون عەزابی قیامەتیشیان لـەوەدوا مـسۆگەرەو تووشیان دێ.

## چیرۆکی حەزرەتی موساو هارونە (عليهما السلام)

﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

ئەمە چیرۆکی چوارەمە لە چیرۆکەکانی ئەم سورەتە، بەئاشکرا ئەم چیرۆکەش دەق دەشوبهێتە چیرۆکەکانی پێشوو چ لەبارەی مەوزوع‌و مەبەسـتەوە یـان لـەبارەی شوبهەی ئینکاری کردنی پێغەمبەرایەتی یەوە.

ناوەرۆك‌و باسی هەموو چیرۆکەکان وەصف‌و حـاڵی خۆبـەزلزان‌و پیـاو مـاقوڵ‌و ریـش سـپیانی گـەل‌و نەتـەوەی حـەزرەتی نـووح‌و هـودو صالح‌و لـوطو شـوعەیب‌و ئەیوب‌و یوسفە، هەروا دارو دەستەی فیرعەون، هەموو ئەمانە پێغەمبەری بۆسـەر نێـردراوی خۆیانیـان بـەدرۆ خـستەوە، مـوعجیزەو بەڵگـەکانیان رەتکردنـەوە!

مەبەستی سەرەکیش لەهەموو چیرۆکەکان تێکرا پەند وەرگرتن و تەمێ خواردوو بوونە بۆئەوەی کافرەکان بەبیرو باوەڕو هەڵوێستی خۆیان بایی نەبن و چیدی لەکوفرو سەر ڕەقی دا ڕۆ نەچن، بۆئەوەی شیاوی عەزابی ریشە کێشکەری پێشینان نەبن!

شوبهەو گومانیشیان لەپێغەمبەرایەتی فروستادەکانی خودا هەر لەوەوە سەری هەڵداوە: کەدەیانگوت: ئەوانیش وەکوو ئێمە ئادەمیزادن و چ زێدە ڕێزێکیان بەسەر ئێمەوە نیە. هەڵبەتە ئەم شوبهەیەیان لەهەموو شوبهەکانی تر بێ بنەماو پووچ و نەفامانە تر بوو. چونکە نەفسەکانی ئادەمیزادان هەرچەندە لەبنەمای تواناو هەست کردن دا هاو وێنەو لێکچوون، بەڵام لەڕێژەو چەندییەت و چۆنیەتی ئەو هێزو هەستانەدا جوداوازییان هەیە. ئادەمیزادان لەتواناو بیرو هەست دا، لەبارەی چۆنیەتی ئامادە باشی سروشت وفیطرەتدا بۆ وەرگرتنی ئەرك و ئەنجامدانی کارو کردەوە خوارو ژوریان هەیە. ئەمجار قەضیەی پێغەمبەرایەتی وەهبیو خودا کردە، بەکەسب و شان و شەوکەت نیە، خودا بۆ خۆی دەزانێ کێ شیاوی ئەو پلەو پایە مەزنەیەو بەکێ ی دەبەخشێ! دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَى وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ﴾ پاش ڕەوانەکردنی ئەو پێغەمبەرانەی باسکران و سەرەنجامی خۆیان و گەلەکانیان ڕون کرایەوە، موساو براکەی: کەهاروون بوو کردمانن بەپێغەمبەرو موعجیزەو نیشانەی ڕاستی پەیاممان پێدان و ناردمانن ﴿إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ﴾ بۆ سەر فیرعەون و دارو دەستەو گەلەکەیان، پەیامی ئێمەیان پێ گەیاندن و موعجیزەی خۆیانیان نیشان دان، بەڵام ئەوان لەجیاتی ئەوەی ئیمانیان پێ بهێنن و شوێنیان بکەون، ﴿فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً عَالِينَ﴾ خۆیان بەزل زانیو پشتیان هەڵکردو پەیامەکانیان ڕەتکردەوە ﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾؟ وتیان بەچ عەقڵ و بیرو هۆشێك ئێمە ئیمان بهێنین بەدوو کەس وەکوو ئێمە ئادەمیزادن، گەلەکەشیان گەردنکەچی ئێمەن! ئەو دوو کەسەی هاتوون لافی پێغەمبەرێتی لێ دەدەن، خۆیان لەڕەگەزی نەتەوەیەکن کەخزمەتکارو مسکێنی ئێمەن. دەی چۆن دەبێ ئێمە شوێن کەسانێکی ئاوەها بکەوین؟؟

مەبەست بە (آیات) لە (آیاتنا)دا بەپێی فەرمودەی ئیبنو عەبباس نۆ نیشانەکانن. (عەصا، یەدی بەیضا، کوللە، ئەسپێ، بۆق، خوێن، دوو لەت بوونی دەریا، قاتو قڕیو ساڵانی گرانی).

شایانی باسە ئەو ڕەخنەیەی فیرعەونو دارو دەستەکەی لەموساو هارونیان گرتو وتیان: ﴿أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ؟﴾ دەق دەشوبهێتە ئەو ڕەخنەیەی قورەیشیەکان: کە لەپێغەمبەریان گرتو وتیان: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ (الزخرف/٣١)

نەفیرعەونو دارو دەستەکەی، نە قورەیشیەکان نەیانزانیو بیری ئەومیان نەبوو: کەپێوەری هەڵبژاردن بۆ پێغەمبەرایەتی بەرزیی ئەخلاقوڕەوشتە، ئەو ئەخلاقو ڕەوشتانەی پەروەردگار دەیبەخشێ بەهەندێك لەبەندەکانیو ئامادەباشیان دەکا، بۆ وەرگرتنی نیگاو سروشو گەیاندنی بەخەڵك!!

﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ﴾ فیرعەونو قەومەکەی، حەزرەتی موساو هارونیان بەدرۆخستەوە، ئیتر خودا بەخنکاندن لەناو دەریادا لەناوی بردن، هەموویانی بەیەك ڕۆژ لەناو دەریای سووردا خنکاندنو بوونە پەندو عیبرەت بۆ ئادەمیزادانی دوا خۆیان.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ بێگومان تەوراتمان بۆ سەر موسا نازڵکرد، پاش ئەوەی فیرعەونو داردەستەکەیمان لەناو بردنو نەتەوەی ئیسرائیلمان ڕزگار کرد. تەورات: کەئەحکامو فەرمانو جڵەوگیریو دیاریکردنی حەڵاڵو حەرامی تێدا بوو ناردمان بۆ موسا، بەڵکوو نەتەوەی ئیسرائیل هیدایەت ئامێزبنو ڕێگای حەق بگرنەبەرو پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی بن. زانیارییەکانی فێر ببنو حوکمەکانی وەربگرن! وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَى بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ (القصص/٤٣).

لەمانای ئەم ئایەتەوە ئیبنو کەثیر دەفەرموێ: پاش ئەوەی پەروەردگار تەوراتی نازڵ کرد، ئیتر هیچ گەلو نەتەوەیەکی بنەبڕ نەکردوە، بەڵکوو فەرمانی بەخاوەن باوەڕان کردوە: کەشەڕ لەگەڵ کافراندا بکەن!.

## چیرۆكی حەزرەتی عیساو خاتوو مەریەمی دایكیەتی

﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾ ﴾

چیرۆكی حەزرەتی عیساو دایكی لەوەپێش لەسورەتی (ال عمران)و سورەتی مەریەم دا بەدورو درێژیی تێپەڕی، لێرەدا بەكورتیو سەرپێ یی بەگوێرەی شوێنو جێگا ئاماژەی بۆ دەكا، چونكە لەراستی دا روداوی پەیدا بوونی حەزرەتی عیسا ﷺ لەخاتوو مەریەم بەبێ ئەوەی پیاو توخنی كەوتبێت، بەڵگەیەكی بەهێزە لەسەر بەدەسەڵاتی خوداو نیشانەی ئەوەیە: پەروەردگار چی بوێ دەیكاو هیچی لێ عاسێ نابێ.

پەروەدگار حەزرەتی ئادەمی بەبێ باوكو دایك هێنایە دی. دایە حەوای لەباوە ئادەم دوستكرد بەبێ ئەوەی عونصوری مێینە رۆڵێكی تێدا هەبێ، باقی ئادەمیزادانی تری لەنێرو مێ وەدیهێناون!

ئەو هەموو موعجیزانەی دران بەعیسا ﷺ كاری لەبێ باوەڕەكان نەكرد، وەكوو چۆن موعجیزەكانی حەزرەتی موسا ﷺ كاریگەریيان لەفیرعەونو دارو دەستەكەی دا نەكرد.. دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً﴾ عیسای كوڕی مەریەمو دایكیمان كرد بەبەڵگەیەكی بەهێزو ئاشكرا لەسەر بەتوانایی خۆمان.وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾ (الانبياء/٩١).

هەریەكە لەعیساو دایكی بەڵگەن لەسەر بەتواناییو دانایی خودا؛ عیسا بەڵگەیە لەم بارەیەوە كەبەبێ باوك پەیدا بوو، لەبێشكەدا قسەی كرد. دایكیشی بەڵگەیە لەم بارەیەوە: كەبەبێ ئەوەی پیاو توخنی بكەوێ ئەو كوڕە پیرۆزەی لێ بوو.......

﴿وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ شوێنی حەوانەوەو ژیانمان لەشوێنێكی بەرزایی بۆ دیاریكردن، شوێنێك بوو حەوانەوەی تێدا دەكراو بەكەڵكی مانەوە

دەهات، بەرو بوم‌و میوەی لێ دەست دەکەوت، کانیاوی جوان‌و ئاوی گوارای لێ هەبوو!

ئەمجار موفەسسیرین کەوتوونە راجیایی یەوە دەربارەی دەست نیشان کردنی ئەو بەرزایی یەی کەخودا کردی بەشوێنی حەوانەوەی عیساو دایکی:

قەتادە دەفەرموێ: بەیتولمەقدیسە، هەندێك دەڵێن رەملەی فەلەستینە.

موقاتیل‌و ضەحاك دەفەرموون: غۆطەی دیمشقە، چونکە ئەو وڵاتە شوێنێکی ئاودارو خاوەن بەرو بوم‌و میوەهاتە.. هەندێکیش پێیان وایە: ئەو شوێنە لەوڵاتی میصر بووە. چوونکە خاتوو مەریەم عیسای کوڕی ﷺ بە زارۆکی بۆ ئەو شوێنانە بردوە.

پەروەردگار ویستوویەتی حەزرەتی عیسا ﷺ ئامادە بکا بۆ پێغەمبەرایەتی، پەروەدە کردن بۆ پێغەمبەرایەتی، پەروەردە کردن بۆ پێغەمبەرێتی داخوازی ئەوە بوو: کەپارێزگاری بکاو نازو نیعمەتی خۆیی بەسەردا برێژێ، وای رام بکا بتوانێ ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبگرێ، بەشێکیش لەو نیعمەتانە حەواندنەوەی بوو لەشوێنێکی سازگارو خۆش‌و پڕپیت‌و بەرەکەت‌و خاوەن میوەهات‌و کانیاوی هەڵقوڵاو. بۆ ئەوەی ژیانێکی سەربەرزانە بەسەر بەرێ. هۆی ئەم حەواندنەوەیە ئەوە بوو: خاتوو مەریەم کوڕە پچکۆلەکەی خۆی (عیسا) هەڵگرت‌و روی کردە ئەو شوێنە بەرزە، دوانزە ساڵ لەوێ مایەوە، وەکوو دەڵێن: (یوسف النجار) کە کوڕی مامی خاتوو مەریەم بوو، ئەو لەگەڵیان چوو، پاش ئەو ماوەیەو مردنی پاشای وڵات گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان.

ئەمجار کەزنجیرەی پێغەمبەران دەگاتە ئەم ئاستە، پەروەردگار خیطابی خۆی ئاراستەی هەموو گەل‌و نەتەوەکان دەکا.

بەجۆرێك: کەوا بزانێ گەل‌و نەتەوەکان تێکڕا بەکۆن‌و نوێوە لەسارایەکی کاکی بەکاکی دا کۆ بوونەوەو لەیەك کات‌و شوێن دا خیطابیان ئاراستە دەکا، چونکە جوداوازیی شوێن‌و کات لەبەردەم ئەو حەقیقەتەدا کە هەموویان تێ یدا هاوبەشن‌و پێکیانەوە دەبەستنەوە. نابنە کۆسپ‌و تەگەرە لەبەردەم ئاراستە کردنی خیطابی گشتی، وەکوو لەئایەتەکانی دوایی دا دەفەرموێ.

## بنەما تەشريعييەكانى ژيان

﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَلْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾

پاش رانواندنى چيرۆكى برێ لەپێغەمبەرانى پێشوو، پەروەردگار ئامۆژگارى گەل‌و نەتەوەكان دەكا: بەكۆمەڵێك ياساو بنەماى ژيان؛ وەكوو خواردنى حەڵاڵ‌و كردەوەى باش‌و هەست كردن بەيەكيەتى ئادەميزادو يەكيەتى ئايين‌و بڕوايان.

بەڵام گەل‌و نەتەوەكان ئايينى خۆيان بڕ بڕ كردو، بوونە گرۆ گرۆو سەراسيمەو سەرگەردانن، پێيان وايە؛ ڕژاندنى نازو نيعمەت بەسەريان دا لەبەر ئەوەيە خودا لێيان رازييە، وەلێ لەراستى دا ئەمە ئيستيدراجە بۆيان‌و پەلكێش كردنيانە بۆ گومڕا بوونى زياتر، دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنْ الطَّيِّبَاتِ﴾ ئەى پێغەمبەران! ئەى ئەوانەى ئەركى پێغەمبەرايەتيتان خراوەتە سەرشان! سروشتى ئادەميزادييەتى خۆتان كپ مەكەن، خواردن‌و خواردنەوە: كەديارەدەيەكى ئادەميزادييە ئەو نەفامانە كردويانە بەرەخنە لێتان‌و دەڵێن: پێغەمبەر نابێ خواردن‌و خواردنەوەى هەبێ بەهەندى مەگرن، لەشتى حەڵاڵ بخۆن‌و بخۆنەوەو مومارەسەى سروشتى ئادەميزادييەتى خۆتان بكەن. خواردن‌و خواردنەوە بەگشتى

داخوازییەکی سروشتی گیانلەبەرانە، بزانن کە خواردنو خواردنەوە لەحەڵاڵ ئادەمیزاد پاك دەکاتەوەو پەیوەستی دەکا بەعالەمی باڵاوەو یارمەتی دەدا لەسەر خودا پەرستیو بەندایەتی کردن بەتەواوی.

﴿وَاعْمَلُوا صَالِحًا﴾ کردەوەی باش ئەنجام بدەن، لەپاساوی رەخساندنو حەڵاڵکردنی ئەو هەموو نازو نیعمەتە جۆراو جۆرانەدا، شوکری پەروەدگار بکەن، بەکردەوەی چاك سوپاسگوزاری خودا بن! ﴿إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ دڵنیا بن من ئاگاداری هەموو کارو کردەوەیەکتانم، هیچم لێ هون نابێو پاداشتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەدەمەوە.

هەڵبەتە کارکردنیش پێویستییەکی سروشتی ئادەمیزادە، ئادەمیزاد بەبێ کارکردن ژیانی بۆ بەسەر نابرێ، بەڵام کردەوەی باش ئادەمیزادی راستاڵ لەهی تر جیا دەکاتەوە، یاساو مەبەستێك دێنێتە ئاراوە بۆیان پەیوەستیان دەکا بەعالەمی باڵاوە.

بێگومان هەرگیز پەروەدگار داوای نەکردوە پێغەمبەران واز لەسروشتی ئادەمیزادیی خۆیان بێنن، بەڵکوو فەرمانی پێکردون کەسروشتی ئادەمیزادیی خۆیان بەرەو ئاسۆیەکی روناك بەرز بکەنەوە. داوای لێ کردون ببنە پێشەنگ بۆ بەرزکردنەوەی سروشتی ئادەمیزاد.

حەڵاڵ خواردنو هەوڵ دان بۆ کەسبی حەڵاڵ یەکێکە لەرەوشتە تایبەتییەکانی موسوڵمانان، ئادەمیزاد هەتا لەخوداوە نزیك بێ، دەبێ حەڵاڵ خۆر تربێ. پێغەمبەران لەم بارەوە پێشەوانو دەبێ چاویان لێ بکرێ، حەزرەتی عیسا ﷺ لەبەرووبوومی تەشی رێسی دایکی دەخوارد، حەزرەتی داود ﷺ زرێی دروست دەکردو بژێوی خۆی لەزرێکاری پەیدا دەکرد!

لەصەحیحی موسلیمدا فەرموودەیەك هەیە دەفەرموێ: (وما من نبي الا رعى الغنم) هیچ پێغەمبەرێك نەبووە شوانی نەکردبێ، هاوەڵان وتیان: ئەتۆیش ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامدا فەرمووی: (وأنا كنت أرعاها على قراريط لأهل مكة) منیش شوانیم کردوە، حوشترم دەلەوەڕاند بەچەند پارەیەك بۆ مەککەییەکان.

موسـلیم‌و ئەحمـەدو تـیرمیـذی لەئـەبو هـورەیرەوە ریوایـەت دەکـەن، دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (یـا أیها النـاس! ان الله طیـب لایقبـل الا طیبـاً، وان الله أمـر المؤمنین بما أمر المرسلین) ئەی خەڵکینە! خـودا خاوێنـەو شـتی خـاوێن نـەبێ وەری نـاگرێ، بـزانن خـودا فـەرمانی بەموسـوڵمانان کـردوە وەکـوو چـۆن فـەرمانی بەپێغەمبەران کـردوەو فەرموویـەتی: ﴿یَا أَیُّهَا الَّـذِینَ آمَنُـواْ كُلُـواْ مِـن طَيِّبَـاتِ مَـا رَزَقْنَاكُمْ﴾ (البقرة/١٧٢).

ئـەمجار پێغەمبـەر ﷺ درێـژەی بەفەرمودەکـەی داو فـەرمووی: پیـاو هەیـە خۆراکی حەرامە، ئاوی خواردنەوەی حەرامە، پۆشاکی حەرامە، بەحەرام پـەروەردە بووە، دەسـت بـۆ ئاسمـان بـەرز دەکاتـەوە، هـاوار دەکاتـە خـودا، دەڵـێ: خودایـە! لێم خۆش بە! کوا دوعای لێ وەردەگیرێ؟!!

﴿وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّـةً وَاحِـدَةً وَأَنَـا رَبُّكُـمْ فَـاتَّقُونِ﴾ ئـەی کۆمـەڵی پێغەمبـەران! ئایینی ئێوە یەك ئایینە، یەك شەریعەت‌و یاسایە، هەمووتان بانگەوازیی دەکەن بـۆ یەکتاپەرستی، ئـەمن خـودای هـەمووتانم خۆتـان لەسزاو تۆڵەی سەرپێچی کردنـی فەرمانەکانم بپارێزن.

ئەمـە بەڵگەیــە لەســەر ئـەو حەقیقەتـە: کەهــەموو ئایینـە ئاسمانییـەکان لەبنەماکانیان دا دەچنەوە سەریەك‌و یەك بنەمان! هـەموویان دەربـارەی تەوحیـدو پێغەمبەرایـەتی‌و هـاتنی رۆژی قیامـەت چـون یـەکن! جوداوازییـان لـەفروعییات‌و حوکمە شـەرعی‌و عەمەلییـەکان دا بـەگوێرەی گـۆڕانی رۆژگـارو بـارودۆخی ژیـان چ نەنگی‌و خراپەیەکی تێدا نیەو بەجوداوازیی لەئایین دا حسێب ناکرێ، بەڵکوو ئەوە نیشانەی زیندوویی‌و بەرژەوەندپارێزیی ئەو ئایینانەیەو بەڵگەی گونجانیانـە لەگـەڵ بـەرەو پێشـچوونی ژیـاری ئـادەمیزادو دەسـتەبەر بـوونی ژیـانی بەختـەوەری بـۆ ئادەمیزاد لەدونیاو قیامەت دا.

هەڵبەتە پێڕی پێغەمبەران پابەندی ئەم فەرمان‌و جڵەو گیریانـەبوون‌و بـەموو لایان نەداو بەتەواوی ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دا ﴿فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُـراً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَـدَيْهِمْ فَرِحُـونَ﴾ بـەڵام شوێنکەوتوانی ئـەو پێغەمبەرانـە بەرنامـەی ئایینەکـەی خۆیـان تێـك دا، خـیلاف‌و کێـشەیان تێـدا پەیـدا کـرد، بـیرو بۆچـونی

دژبەیەکیان تێدا هێنانە کایەوە. بوونە گرۆ گرۆو تاقم تاقم. هەر کۆمەڵەو پارچەیەکیان لێ پچڕی، ئەمجار هەر تاقمە بەو پارچە ئایینەی بۆ خۆی پچڕیوە دڵخۆشەو پێ ی وایە: هەر ئەو لەسەر حەقەو هەر ڕێڕەوانی ئەو ئایینەی ئەو پەیڕەوی دەکا هیدایەتدراون‌و ئەوانی دی گومڕان!!

تەعبیرە قورئانییەکە دیمەنی کێشەو نیزاعی نێوان خاوەن ئایینەکانی لەشێوەیەکی حیسسی سامناك دا رانواندوە، ئایینی حەق‌و راستی بەپارچە قوماشێکی جوان‌و بێ عەیب شوبهاندوە، ئیتر حیزب‌و تاقم‌و گرۆهەکان لەئاکامی کێبڕکێ‌و بەگژ یەکدا چوون، هەریەکەیان پەلاماری سوچێکی قوماشەکەیان داوەو بۆلای خۆی تێ ی نووساوەو قوماش پارچە پارچە بووەو هەر تاقمەو تیتۆڵێکی بەدەستەوە هاتووەو پێ ی دڵخۆشە، وادەزانێ هەر ئی ئەو باشەو ئەوەی بەدەست تاقمەکانی ترەوەیە بەکەڵکی هیچ نایە.

ئەمە رەخنەو ذەمکردنی لێك دابڕان‌و پارچە پارچە بوونی کۆمەڵە، سەرزەنشت‌و لۆمە کردنیانە بۆیە دوابەدوای ئەوە: پەروەردگار هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرموێ: ﴿فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّى حِينٍ﴾ ئەی موحەممەد! وازیان لێ بێنە با لەناو گومڕایی خۆیان دابن تامردن یەخەیان پێ دەگرێ، دەمرن یا دەکوژرێن، یان نیشانەو پێشەتای عەزابیان بۆ دێ. وەکوو ئەمئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْداً﴾ (الطارق/١٧) یان دەفەرموێ ﴿ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ (الحجر/٣).

ئەمجار درێژە بەگاڵتە کردن پێیان دەداو دەفەرموێ: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ، نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لا يَشْعُرُونَ ؟﴾ ئایا پێیان وایە: مۆڵەتدانیان بۆ ماوەیەك‌و زۆرکردنی ماڵ‌و سامان بۆیان‌و منداڵ پێدانیان لەماوەی بەتاقیکردنەوەیان دا، هۆی ئەوەیە ڕێزیان هەیە لامان‌و بەخێرایی خێرو فەڕیان بۆ دەستەبەر دەکەین؟! نانا باوانەزانن، ئەو ماڵ‌و منداڵ پێدانە سەرەنجامی بۆ ئەوان شەڕو نەگبەتییە خێرو فەڕ نیە، دوایی زێوان دەبنەوە، بەڵام کاتێك: کە زێوانبوونەوە بێ سوودە.

بێگومان بەهەڵە چوون و بەشێوەی بەر ئاواژو حاڵی بوون! نازانن ئەوەی: کە ئێمە مۆڵەتیان دەدەین و منداڵ و ماڵ و سامانیان بۆ زۆر دەکەین ئیستیدراج و پەلکێشکردنیانە بۆ ناو عەزاب! ئەگەر تۆبە نەکەن و پێش وەخت نەگەڕێنەوە. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلاَ تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلاَ أَوْلاَدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ (التوبة/٥٥) یان دەفەرموێ: ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ، وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ﴾ (القلم/٤٤-٤٥)

ئیمامی ئەحمەد لەعەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە فەرمودەیەك ریوایەت دەکا: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله قسم بینکم أخلاقکم، کما قسم بینکم أرزاقکم، وان الله یعطی الدنیا من یحب ومن لایحب، ولا یعطی الدین الا من أحب فمن اعطاه الله الدین فقد أحبه، والذی نفس محمد بیده لایسلم عبد حتی یسلم قلبه ولسانه، ولایؤمن حتی یأمن جاره بوائقه، قالوا: وما بوائقه یارسول الله؟! قال: غشه وظلمه، ول یکسب عبدأ مالأ من حرام، فینفق منه فیبارك له فیه، ولا یتصدق به فیقبل منه، ولا یترکه خلف ظهره الا کان زاده الی النار، ان الله لایمحوا السيء، ولکن یمحوا بالسیئ بالحسنة، ان الخبیث لایمحوا الخبیث)

تێبینی: ئەو تەفرەقەو پارچە پارچە بوونەی قورئان ئاماژەی پێ کردوەو موسوڵمانانی لێ ترساندوە، ئەو جوداوازی و تەفرەقە پەیدا بوونەیە: کەلەبنەمای ئایین دا ڕوبدا، نەك لەوەی لەفروع و ئەحکامە جوزئییە شەرعییەکان دا پەیدا دەبێ، جوداوازی و راجیایی لەو بووارانەدا نیشانەی پێشکەوتن و گەشە کردنی بیرو بۆچوونە، فرە رایی لەحوکمە عەمەلییە فەرعییەکان دا رەحمەتەو کار ئاسانییە بۆ کۆمەڵگا. قورئان دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً﴾ (المائدة/٤٨) جوداوازیی و راجیایی لەبنەمای ئایین دا هەرەشەی لێ کراوەو بەتاوان دادەنرێ.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی صەحیح و چەسپاوی دا دەفەرموێ: (افترقت أمة الیهود علی احدی وسبعین فرقة کلها في النار الا واحدة، وافترقت أمة عیسی أو النصاری علی اثنین وسبعین فرقة کلها فی النار الا واحدة، وستفترق أمتی علی ثلاث وسبعین فرقة: کلها في النار الا واحدة، قیل من هم یارسول الله: قال: هم ما أنا علیة

وأصحابی) لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (الا إنَّ من قبلکم من أهل الکتاب افترقوا علی ثنتین وسبعین ملة، وان هذه الأمة ستفترق علی ثلاث وسبعین ثنتان وسبعون فی النار وواحدة فی الجنة وهی الجماعة) هەڵبەتە هەرکەسێ سیرەتی پێغەمبەرو هاوەڵانی بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ ئەم ئایینە چۆن دامەزراو گەشەی کردو پەرەی ساند، بۆی دەردەکەوێ موسوڵمانان تا یەك عەقیدەو بیرو باوەڕ بوون چ شانو شەوکەتو شکۆمەندییەکییان هەبوو، چۆن زوربەی جیهانیان رزگار کردو برایەتیو مرۆڤایەتیان تێدا چەسپاند، عەداڵەتکاریو ئازادییان تێدا بڵاوکردەوە. بەڵام وەندەی پێ نەچوو دوژمنانی ئایین کەوتنە خۆ بۆ بەرگرتن لەو نوورو روناکییەی: کەرۆژ بەرۆژ پەرەی دەسەندو زیاتر گەشەی دەکرد، ئیتر تۆوی دووبەرەکیو چەند بەرەکییان لەناو جیهانی ئیسلامی دا چاندو نیزاعو کێشەو دژایەتی کەوتە ریزی موسوڵمانانەوە، چەندە گروپو تاقمو حیزبو تایەفەو رێباز دروست بوون، کۆمەڵگای پتەوی موسوڵمانان لەم رێگاوە زەفەری پێ برا، کنەی لێ کرا، حاڵیان بەم حاڵە گەییشت: کەئەمرۆ جێگای بەزەیی پێدا هاتنەوەمینو حەسوودیمان پێ نابرێ!

شایانی باسە فیرقەو گروپو تاقمەکانی جولەکەو نەصارا جگە لەو تاکە کۆمەڵەیان: کەلەسەر عەقیدە ئەصلییەکەی خۆیان مابوونەوە، فیرقەکانی دی هەموویان کافرنو فڕیان بەسەر ئایینەوە نەماوە، چونکە فیرقەو تاقمەکانی نەتەوەی ئیسرائیل کەبەڕواڵەت شوێنکەوتووی حەزرەتی موسا ﷺ بوون بڕوایان نەبوە بەپێغەمبەرایەتی عیساو حەزرەتی موحەممەد ﷺ درووی خودایان لێ بێ.

تاقمو گروپەکانی سەر بەئایینی عیسا بڕوایان بەپێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەد نەبووە. هەرکەسێکیش بڕوای بەڕاستی پەیامی پێغەمبەرێك نەبێ بەکافر حیسابە. بەڵام فیرقەو حیزبەکانی ئوممەتی ئیسلام بەموعتەزیلەو ماتوریدیو ئەشعەریو وەهابیو سەلەفیو خەلەفییەوە بەسوونیو شیعی یەوە هەموویان بڕوایان بە (خوداو بەفریشتەو نامە ئاسمانییەکانو پێغەمبەرانو رۆژی قیامەتو قەزاو قەدەر) هەیەو ئەهلی قیبلەن، تاوانبارن لەسەر ئەو بیرو بۆچوونو بیدعەتانەی دایانهێناوە.

فیرقەو تاقمە جیاجیاکانی ئوممەتی ئیسلام قورئان پارێزگاری لێ کردونو بەهۆی ئەو نامە پیرۆزەوە بەتەواوی لەرێبازی ئایینی خودالایان نەداوەو لەدین دەرنەچون هەربیرو بۆچونێکیان داهێنا بێ بەتەئویل پینەو پەڕۆیان کردوە، لەگەڵ قورئانەکەدا رێکیان خستووە، بەڵکوو زوربەی حیزبو گروپەکان لەئاکامی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەقورئان بیرو بۆچوونێکیان لەلا گەڵاڵە بووەو بەخەیاڵی خۆیان ئەوە راستەو شوێنی کەوتوون.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین ئەو حیزبو گروپە نائایینیانەی لەرۆژگاری ئەمڕۆدا لەجیهانی ئیسلامی دا سەریان هەڵداوەو بەچکە موسوڵمانان خۆیان تێفرێداون وەکوو حیزبە مارکسیو ماسۆنیو سوشیالەکان.....هتد ئەوانە پەیوەندییان بەئیسلامەوە نیەو هەرکەسێ بەبیرو باوەڕەوە چوبێتە ناویان بەئیسلام داناندرێ، حیسابی موسوڵمانی بۆ ناکرێ.

چونکە ئیسلام بریتییە لەبڕوا بونو پەیڕەوی ئەو بەرنامەیەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ هێناویەتیو ملکەچکردن بۆی لەهەموو بوارەکانی ژیان دا بەسیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو ئاشتیو جەنگییەوە، هەرکەسێك ئەو بڕوایەی لاپەیدا بوو بەکردەوەش سەلماندی ئەوە موسوڵمانەو لەفیرقەی ناجییەیە!

## رەوشتی پەلەکەران بۆ چاکەکاریی

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ

نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار سەرزەنشتی ئەوانەی کرد: کە ئایینی خۆیان پچڕ پچڕ کردوە، بەشێوەی هەڕەشەکردن لێیان فەرمووی: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ (٥٥) نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ ؟﴾ بەشوێن ئەوەدا باسی ڕەوشتی پەلەکاران دەکا بۆ دەستەبەر کردنی خێرو فەڕ، چوار ڕەوشتی سەرەکی ڕیز دەکا بۆیان‌و دەفەرموێ:

١- ﴿إِنَّ الَّذِينَ هُمْ مِنْ خَشْيَةِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی هەمیشە لەترسی عەزابی خودا لەسەر طاعەت‌و عیبادەت بەردەوامن..

ئالێرەدا ئەثەری ئیمان دەردەکەوێ، ئەو هەستە ئیمانییە ئادەمیزاد هەڵدەنێ بەردەوام بێ لەسەر خوداپەرستی‌و ترسی پاشە ڕۆژیشی هەبێ، چەندێك ئەرکی سەرشانی ئەنجام بدا ترسی عەزابی خودا زیاتر لەدڵی دا جێگیر دەبێ.

ئەو موسوڵمانانە لەترسی عەزابی خودا حەجمینیان لێ هەڵدەگیرێ.

٢- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی بڕوایان بەنیشانە کەونییەکان‌و ئایەتە قورئانییەکان هەیە، بڕوایەك شك‌و گومان ڕوی تێ نەکا. ئایەتە کەونییەکان بریتیین لەو بەڵگەو نیشانانەی لەناو بوونەوەردا دەبینەدرێن، بەتێفکرین‌و ورد بوونەوە لەئاسمانەکان‌و زەوی دیاردەکانیان بەدی دەکرێن‌و نیشانەی تاك‌و تەنهایی خودان.

٣- ﴿وَالَّذِينَ هُمْ بِرَبِّهِمْ لا يُشْرِكُونَ﴾ ئەوانەی هەرگیز هاوەڵ بۆ خودا دانانێن‌و لەتەك خودادا کەسی تر ناپەرستن بڕوایان هەیە: کەجگە لەخودا هیچ خودای تر نین، بێ هاوەڵ‌و بێ خێزان‌و بێ منداڵە، پێویستی بەکەس نیە هەموو کەس پێویستیان بەئەوە.

٤- ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ﴾ ئەوانەی ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەن: بەگوێرەی توانای خۆیان خودا پەرستی دەکەن،

لەماڵ‌و سامانی خۆیان دەبەخشن بەڵام وێڕای ئەوە ترسیان هەیە لێیان وەرنەگیرێ، ترسی ئەوەیان هەیە کەمتەرخەمییان کردبێ‌و ئەرکەکانی سەرشانیان وەکوو پێویست ئەنجام نەدابن.

ئیمام ئەحمەدو تیرمیذی‌و ئیبنو ئەبی حاتەم لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن، کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو وتی: ئەی رەوانە کراوی خودا! ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾ مەبەستی ئەوەیە: کابرا دزی بکا زینا بکا عەرەق بخواتەوەو لەخوداش بترسێ؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لا يابنت أبي بكر، يابنت الصديق، ولكنه الذي يصلي ويتصدق وهو يخاف الله عزوجل) [٢٩] نەخەیر وانیە ئەی کچەکەی ئەبو بەکر، بەڵکوو مەبەست کەسێکە نوێژ دەکا رۆژو دەگرێ لەماڵ‌و سامانی خۆی دەبەخشێ‌و لەهەمان کات دا ترسی خودای هەیە. ﴿أَنَّهُمْ إِلَى رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ﴾ لەبەر ئەوەی بۆلای خودای خۆیان دەگەڕێنەوە.

بێگومان دڵی موسوڵمان هەست دەکا: کەدەسەڵاتی خودا بەسەریدا زاڵە، لەگەڵ هەموو هەناسەیەکی‌و لێدانێکی دڵی دا، هەست بەنیعمەتەکانی خودا دەکا، بۆیە هەر طاعەت‌و بەندایەتییەکی بیکا بەکەمی دەزانێ، هەموو تەقواو خوداپەرستی خۆی لەبەرامبەر نیعمەتەکانی خودادا بەهیچ دێنە بەرچاو، هەرچەند دەکا بۆی بەرامبەر ناکرێن، نیعمەتەکانی خودا زۆرو هەمەجۆر، کردەوەکانی ئەویش پڕکەم‌و کورتی، لەهەمان کات دا هەست دەکا: کەدەسەڵاتی خودا لەهەموو گەردیلەیەکی بوونەوەردا رەنگ دەداتەوە، لەبەر ئەوە سام‌و هەیبەت دەیگرێ‌و ترس‌و خۆف دڵ‌و دەروونی داگیر دەکاو ترسی ئەوەی لێ پەیدا دەبێ بەرەوڕووی پەروەردگار بێتەوەو کەمتەرخەمی کردبێ مافی خودایەتی نەدابێتێ، طاعەت‌و کردەوەکانی لەئاست نیعمەتەکانی خودادا نموودیان نەبێ.

ئەوانە ترسێکی زۆریان هەیە، بەهۆی ئەو ترسەوە خۆدەپارێزن لەکردنی ئەوشتانەی پێویست نیە بکرێن. ئیمانیان بەهێزەو تێ یدا قووڵبوونەوە، هەوڵ

---

(٢٩) اخرجه الترمذی فی التفسیر (٣١٧٥) باب (٣٤) سەنەدەکەشی زەعیفە حاکم لەتەفسیردا (٣٤٨٦)دا دەری هێناوە بەلایەوە راستە.

دەدەن ریبابازی لەطاعەت دانەکەن‌و ترسی کەمتەرخەمی‌و پوچەڵبوونەوەی کردەوەکانیشیان هەیە.

﴿أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ﴾ ئەوانە ئەو کەسانەن پەلەدەکەن لەئەنجامدانی کاری خێرو چاکەدا، پێشبڕکێ ی تێدا دەکەن، هەوڵی ئەوە دەدەن کاری باش‌و پەسەند ئەنجام بدەن، پێشەنگ‌و رابەربن لەبواری کردنی کاری چاك دا.

ئەوان بەلێبڕانەوە سەرگەرمی کردەوەی چاکن‌و پێشبڕکێ دەکەن بۆ وەدەستهێنانی پاداشی باش‌و بەمراز گەییشتن لەدونیادا پێش بەمراز گەییشتنی قیامەت!

بەکورتی خۆشبەختی‌و کامەرانی بریتی یە لەکامەرانی قیامەت: کەبەکردەوەی چاك‌و ماڵبەخشین‌و لەخودا ترسان دەستەبەر دەبێ.

**دوای بەیانکردنی کردەوەی موسوڵمانانی دڵسۆزو راستاڵ، دوو حوکم‌و بڕیار دەربارەی کردەوەی بەندەکانی دەردەکاو دەفەرموێ:**

١- ﴿وَلا نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ مینهاج‌و شەریعەتی ئێمە وەهایە زیاد لەتواناو وزە ئەرك ناخەینە سەر کەس، بێگومان خودا ئەرك‌و واجیباتی خستۆتە سەر بەندەکانی بەگوێرەی ئامادەباشییان‌و هێزو توانایان بەسەری دا، حیساب‌و لێکۆڵینەوەشیان لەگەڵ دەکا بەگوێرەی ئەو کردەوانەی لەچوار چێوەی توانایان دا ئەنجامی دەدەن، ستەمیان لێ ناکا بەم جۆرە ئەرکێك بخاتە سەریان لەتواناوایان دا نەبێ، یان لەکارو کردەوەکانیان بەناڕەوا کەم بکاتەوە. عەداڵەتکارە لەشەرع‌و یاسای دا، بەرەحم‌و بەزەیی یە بۆ بەندەکانی.

٢- ﴿وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ﴾ لەلای ئێمە هەیە نامەی ئەعمالی ئەوانە، یان لەوحولەحفوظمان لایە، زۆر بەوردی‌و راستی کردەوەی ئادەمیزادی تێدا چەسپاوەو تۆمار کراوە، هیچی لەبیر نەچووە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الجاثية/٢٩) یان دەفەرموێ: ﴿لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا﴾ (الكهف/٤٩).

﴿وَهُمْ لا يُظْلَمُونَ﴾ ئەوانە بەهیچ جۆرێ ستەمیان لێ ناكرێ لەكردەوەكانیان كەم ناكرێتەوە، بەڵكوو پاداشی كەمو زۆری كردەوەكانیان وەردەگرنەوە، لەهەمان كات دا سزایان لەسەر زیاد ناكرێ.

## كردەوەو هەڵوێستی ناشیرینی كافرو موشریكەكانی قورەیش‌و هۆكاریی گومراییيان

﴿ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم

بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ وَلَوۡ رَحِمۡنَٰهُمۡ وَكَشَفۡنَا مَا بِهِم مِّن ضُرّٖ لَّلَجُّواْ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ لِرَبِّهِمۡ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ﴿٧٧﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٦٧) ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ.....﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم لەسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ڕیوایەت دەکا، دەفەرموێ: قورەیشییەکان لەدەوری کەعبە خەریکی ڕابواردنو پێکەنینو لەهو لەعب دەبوون، تەوافیان نەدەکردو شانازیشیان پێ دەکرد، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ سَامِراً تَهْجُرُونَ﴾ی نازڵ کرد.

دەربارەی هۆکاری نازڵبوونی ئایەتی ژمارە (٧٦) نەسائیو حاکم لەئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەت دەکەن دەفەرموێ: ئەبوسوفیان هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی موحەممەد! بۆ خاتری خوداو بۆ خاتری خزمایەتیمان (کوڵكو خوێن خواردن) بەهیلاکی بردین، برسیایەتی تینی بۆ هێناوین، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ی نازڵ کرد.

پەيوەندىى ئەم كۆمەڵە ئايەتە بەھى پێشەوە، لەم روەوەيە: پەروەردگار لەوە پێش ئەوەى راگەياند: كەئاپين ئاسانەو گرانى تێدا نيە، ئەركەكانى بەگوێرەى توانان و زياد لەوەنين! ئەمجار بەشوێن ئەوەدا نارەزايى خۆى لەھەڵوێستو كردەوەى كافرو موشريكەكانى قورەيش دەردەبڕێو وەصفيان دەكا بەبێ ئاگايى لەقورئان، نازانن بەرژەوەنديى دونياو قيامەتيان لەچى دايە! ھەروەھا ئەوەش رون دەكاتەوە: كەئەو قورەييشيانە وێراى كوفرو ياخى بوونيان ھاوەڵ بۆ خودا دادەنێن و تانەو تەشەر لەقورئان دەدەن و گاڵتە بە پێغەمبەر دەكەن و ئەزيەتى موسوڵمانان دەدەن.

ئەمجار ئەوە روون دەكاتەوە: كە پەروەردگار يارمەتى ئەوكافرانە نادا، چونكە ئەوانە بوغراو لوتبەرزن، ھەركاتێ ئاياتى قورئانيان بەسەردا بخوێنرێتەوە لێى ھەڵدەسڵەمنەوە، روو لەئايەتەكان و خوێنەرەكەى وەردەگێرن، خۆيان بەكابە ھەڵدەنێنەوەو شانازى پێوە دەكەن، دەڵێن: كەس ناتوانێ بەسەر ئێمەدا زاڵ بێ چونكە ئێمە خاوەنى كەعبەين ئەمجار گاڵتە بەقورئان دەكەن و تانەى لێ دەدەن!

ئەمجار استى پەيامى پێغەمبەر دەچەسپێنێو دەفەرموێ: ﴿بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِنْ هَـٰذَا﴾ بەڵكوو ئەو كافرو موشريكانە دڵيان بێ ئاگايە لەم قورئانە: كەشيفا بەخشە بۆ ھەموو دەردێك، بێ ئاگان لەوەى: كەھيدايەتدەرە بۆ راسترين رێگاو خۆشترين و بەختەوەرترين ژيانى دونياو قيامەت.

غافڵ: چونكە دڵيان ئاگاى لەحەق و راستى نيە، نوورى زيندوو بوونەوەو بەئاگا ھێنانەوەيان وێ نەكەوتووە، ئاگايان لەو نوورو روناكييە نيە، وێڵى ساراى گومڕايى بوون. ﴿وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِنْ دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ﴾ ئەوانە جگە لەو ھەڵوێستو كردەوانەيان كارى ناشيرينى تريشيان ھەيە، ھاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، تانەو تەشەر لەقورئان دەدەن! ئەزيەتى پێغەمبەرو موسوڵمانان دەدەن! ئەوان لەداھاتوش دا بەردەوام دەبن و ئەوە كردەوەو ھەڵوێستيان دەبێو لێى پاشگەز نابنەوە.

ئەوانە تا بينەقاقايان لەشيرك و تاوان دا نقوم بوون، قورئانيان كردوە بەھۆكارى گاڵتەو گەپى خۆيان، پێكەنين و سەمەرى خۆيان لەدەورى كابە ئەنجام

دەدەن، دەڵێن: قورئان سیحرو جادو بازییەو هەڵبەستراوە، چیرۆکە کۆنی پێشینانە، قسەی شایەرە، ئەو کەسەی ئەم نامەیەی بۆ هاتووە شێتو خەرەفاوە، یان جولەکەو نەصرانی فێری دەکەن. ئەوانە سەرگەرمی بتپەرستی بوون، هەرکاتێ پێغەمبەر ﷺ بانگەوازییان بکاو داوای وازهێنانیان لەبتپەرستی لێ بکا دەڵێن: ئێمە لەسەر ئایینی باوكو باپیرانمان دەڕۆینو وازی لێ ناهێنین!!

﴿حَتَّى إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِمْ بِالْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ﴾ هەتا ئەو ڕۆژەی بەسزای سەختی خۆمان دەیانگرین، خراپترین عەزاب دەوریان دەدا، بەڵێ بەهۆش خۆ نایەنەوە هەتا خۆڵێسەرەوە بەناز پەرومردە بووەکانیان بەعەزابی بەئێشی خۆمان دەگرینو لەهەموو لایەکەوە ئاگری دۆزەخ دەوریان دەدا، ئەوکاتە هاواریان لێ هەڵدەستێو دەکەونە پاڕانەوە، بەڵام بێ سودە. هاوارو دادو فیغان دادیان نادا! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوْا وَلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ (ص/٣)

لەئاکامی هاوارو فیغانیاندا وەڵامیان دەدرێتەوە، پێیان دەگوترێ: ﴿لا تَجْأَرُوا الْيَوْمَ إِنَّكُمْ مِنَّا لا تُنصَرُونَ﴾ هاوارو زیقە زیق مەکەن، هاوارو پاڕانەوەتان بێ سوودەو ئەو عەزابەی بۆتان بڕیار دراوە لەسەرتان هەڵناگیرێ، عەزاب بەردەوامەو کەس نیە کۆمەکیتان پێ بکا، کەس نیە بتوانێ ببێتە لەمپەڕ لەنێوان ئێوەو عەزابی بەئێش دا!.

**هۆی بەهانا نەهاتنتانو نازلکردنی ئەم عەزابە سەختە بۆ سەرتانو گیرۆدە بوونتان پێی بۆ هەتایە سێ شتە:**

١- ﴿قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ تَنكِصُونَ﴾ بێگومان ئایاتی من دەخوێندرایەوە بەسەرتان دا، لێی هەڵدەسەمینەوە، ڕوتان لێ وەردەگێڕا، پشتتان دەکردە قورئانو خوێنەرەکەشی، چ جایی ئەوەی بڕوای پێ بکەنو شوێنی بکەون، لێی دەکشانەوەو لەبەری هەڵدەهاتن. پاشەو پاش دەگەڕانەوە!

٢- ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ﴾ حاڵو وەزعتان وابوو لوتبەرزیتان دەنواندو خۆتان بەلاوە بەرز بوو لەوەی: کەشوێنی حەق بکەون، حەق هەڵگرانی حەقتان بەلاوە بێ نرخ بوو!

رانـاوی (بـە) دەگەڕێتـەوە بـۆ کەعبـە یـان بـۆ حـەرەم، چـونکە ئـەوان خۆیـان بەکەعبە هەڵدەنایەوەو پێیان وابوو ئەوان خاوەن‌و سەرپەرشتیارینی.

یـان دەگەڕێتـەوە بـۆ قورئـان یـان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ ئـەوە بـوو: دەیـانگووت: پێغەمبەر ساحیرە، شاعیرە، کوڵەوەنانییە.

٣- ﴿سَامِراً تَهْجُرُونَ﴾ حاڵتان وەهایە، رادەبـوێرن لـەدەوری کەعبـەو قورئـان واز لێ دێنن، بەهۆی چەقە چەقی خۆتان‌و تانەدان لـەقورئان کـەیف خـۆش‌و تـەردەماخ دەبن.

زوبانتـان بەقـسەی پـڕو پـوچ‌و ناشـیرین دەگێـڕا، بـەدەوری بتەکانتانـدا هەڵدەسـوڕان‌و حەلقـەتان دەبەسـت، خۆتـان لەشـوێنکەوتنی ئایەتـەکانی قورئـان دەپاراست، ملتان بۆ حەق نەدەدا، وێڕای ئەوەش زوبانی خۆتان لەقسەی ناشـیرین‌و بـێ جـێ نەدەگێڕایـەوە! ئـەمجار دوای بـەیانکردنی وەصـف‌و حاڵیـان، ئـەوە روون دەکاتەوە: کەپڕکێشی کردنیان بۆ ئەم کارە ناشیرینانە دەبێ هۆیەکی هەبێ!

١- ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا الْقَوْلَ﴾ ئایا ئەو موشریکانە لەم قورئانە پیرۆزو بـەرزو بەفـەڕە حاڵی نابن؟ تابزانن چەند فەصیح‌و بەلیغـە؟ خـۆ فەصاحەت‌و رەوانبێـژی قورئـان لای ئـەوان ئاشـکراو نومایانـە، ئەوانـە ئـەهلی رەوانبێـژی‌و زمـانڕەوانین. دەبوایـە لەپێش هەموو کەس دا ئـەوان لـەم کەلامـە حـاڵی بوونایـەو ئیمانیـان پـێ بهێنایـەو بەگوێرەی ناوەڕۆکی قورئان هەڵس‌و کەوتیان بکردایە..!

٢- ﴿أَمْ جَاءَهُمْ مَا لَمْ يَأْتِ آبَاءَهُمُ الأَوَّلِينَ﴾ یـان پێیـان وایـە شـتێکیان بـۆ هـاتووە پێچەوانەی داب‌و نەرێتـەو لـەوە پـێش روی نـەداوە؟ هەرچـەندە ئـەوان بەتـەواتور پێیـان گەیـشتووە: کـە پێغەمبـەران یـەك بـەدوای یـەك دا رەوانـە کـراون بـۆ سـەر گەلەکانیان‌و موعجیزەیان نواندون.

دەی دەبوایە ئەوە ببوایە بەهاندەر بۆ ئیمانهێنانیـان، بڕوایـان بـەو پێغەمبـەرە بکردایە: کەئەم پەیامەی بۆ هێناون!

٣- ﴿أَمْ لَـمْ يَعْرِفُـوا رَسُـولَهُمْ فَهُـمْ لَـهُ مُنكِـرُونَ﴾ یـان لەوانەیـە لـەوەپێش پێغەمبەرەکـەی خۆیـان نەناسـیبێ‌و پـێش پێغەمبەرایـەتی بەڕەوشـتە بـەرزەکانی ئاشـنا نـەبووبن؟ هەرچـەندە لـەناویان دا بەراسـتگۆو دەسـتپاك نـاوی دەرکردبـوو،

دەیانزانی لەدرۆو رەوشتی ناشیرین بەدوورە! دەی چۆن بۆخۆیان نازناوی (صادق الامین) راستگۆو دەستپاکیان بەسەردا بڕیوە. کەچی بەدرۆی دەخەنەوە؟؟

ئەوان بەباشی پێغەمبەریان دەناسیو شارەزای رەوشتە بەرزەکانی بوون! هەر بۆیە جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ﷺ بەنەجاشی پاشای حەبەشەی گوت: ئەی پاشا! بێگومان پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ ناردوین لەرەگەزی خۆمانە، نەسەبو راستگۆیی‌و دەستپاکی شارەزاین چونکە لەرەگەزی خۆمانە، هەروا (المغیرة) ی کوڕی شوعبە بەهەمان شێوە قسەی لەگەڵ پیاوی کیسرا کرد. هەروەها ئەبو سفیانی کوڕی صەخری کوڕی حەرب کاتێك پرسیاری لێ کرا دەربارەی پێغەمبەرو هاوەڵانی هەمان قسەی لەگەڵ هیرەقل (پاشای رۆم) کرد.

٤- ﴿أَمْ يَقُولُونَ بِهِ جِنَّةٌ﴾ بەڵکوو ئەوان دەڵێن: پێغەمبەر جۆرە شێتیەکی پێوەیە نازانێ دەڵێ چی. ئەمە لەکاتێکدا ئەوان دەزانن عەقڵمەندترین ئادەمیزادە.

بێگومان هیچ کامێ لەم شوبهانە بنەمایەکی راستی نیەو لەواقیع دوورە. بۆخۆیان ئەمە دەزانن‌و ددانی پێدا دەنێن.

﴿بَلْ جَاءَهُمْ بِالْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ﴾ بەڵکوو ئەو پێغەمبەرە: کە بۆ خۆیان نازناوی (الصادق الامین) یان پێداوە - بەحەق هاتووە بۆ سەریان، پەیامی حەقی بۆ هێناون، داوایان لێ دەکا واز لەبتپەرستی بهێنن‌و یەکتاپەرستی بکەن، شوێن پەیامەکەی بکەون: کە خۆشبەختی دونیاو قیامەتیان بۆ دەستەبەر دەکا، بەڵام ئەوانە زوربەیان رقیان لەحەقەو مل بەحەق نادەن،چونکە شیرك‌و بێدینی لەناخیان دا رواوەو پابەندی لاسایی کردنەوەی باوك‌و باپیرانیانن‌و دەترسن بەشوێنکەوتنی پەیامی ئیسلام پلەو پایەو بەرژەوەندییە مادديەكانی دونیایان لەدەست بچن ... بۆیە فەرمووی: ﴿وَأَكْثَرُهُمْ﴾ زۆرینەیان چونکە هەندێك لەو قورەیشیانە بۆ نموونە ابوطالب لەترسی لۆمەو سەرزەنشت ئیمانیان نەهێنا، نەك لەبەرئەوەی رقی لەحەق بێ.

﴿وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ﴾ حەق پێچەوانەی بەتاڵە، حەق شتی چەسپاوو راست‌و بەردەوامە، جا ئەگەر حەق شوێن هەواو هەوەسی ئادەمیزاد بکەوێ دەبێتە بەتاڵ‌و حەقیقەتی خۆی لەدەست دەدا،

بوونەوەر تێکدەچێ، شتێك نامێنێ راگری بوونەوەر بێ، هەندێك پێیان وایە: حەق بەمانا ئیسلامە، جائەگەر ئیسلام شوێن هەواو هەوەسی ئەوانە بکەوێ دونیا دەبێتە شیرك‌و بێدینی، قیامەت رادەبێ، بوونەوەر لەناو دەچێ.

قەتادە دەفەرموێ: مەبەست بەحەق پەروەردگارە، واتە: ئەگەر خودا خودایەکی وەها بێ شوێن هەواو هەوەسی ئادەمیزاد بکەوێ‌و فەرمان بەشیرك‌و تاوان بکا، ئەوە بەخودا حیساب ناکرێ‌و خودا نیە.

پوختەی مانا ئەوەیە: حەق شوێن هەواو هەوەسی ئەوان ناکەوێ، بەڵکوو پێویستە ئادەمیزادەکان واز لەهەواو ئارەزۆی خۆیان بهێنن‌و شوێن حەق بکەون! چونکە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزۆ سەردەکێشێ بۆ فەسادی کۆمەڵ‌و لەگرێژنەچونی کۆمەڵگا.

ئەگەر بێت‌و قورئان بهاتایە پشتگیریی لەشیرك‌و تاوان بکردایە، فەوضاو لادان لەحەقی بڵاوبکردایەوە، تالانکردن‌و داگیر کردنی ماڵی خەڵکی بەڕەوا بزانیایە، داوێن پیسی‌و کوشتن‌و بڕینی برەو پێ بدایە، رەوشتی بەرزو بەها بەنرخەکانی پاشگوێ بخستایە، یاسای بوونەوەر تێك دەچوو، ئاشتی‌و خۆشی نەدەما، تەندروستی‌و پیت‌و بەرەکەت هەڵدەگیرا. ئەگەر رێگەی دەست درێژی بدرایە، ئاسایشی ناو کۆمەڵگا نەدەما، ئەگەر ستەم‌و ستەمکاری رەوابوایە شارەستانیەت دەشێوا، ئەگەر زیناو داوێن پیسی رێگای پێ بدرایا خێزان هەڵاچۆ دەبوو، نەسەب‌و گەرا تێکەڵاو دەبوون‌و کەس کەسی نەدەناسی هەرەج‌و مەرەج باو دەبوو ئاژاوەو پشێوی بەرپا دەبوو، ئەمە حەقیقەت‌و راستیەکە بەڵگە نەویستە. حاڵ‌و وەزعی ئەو گەل‌و نەتەوانەی ئەو رەوشتە نزمانەیان تێدا بڵاو بۆتەوە باشترین بەڵگەیە، مێژوو گەواهیدەری داب‌و نەرێتێکە گۆڕانی تێدا نیە، هەر گەل‌و وڵاتێك هەواو ئارەزوو رابەریان بێ، سەرەنجامیان فەوتان‌و تێدا چوونە، ئاکامیان بێ هێزی‌و ریسوا بوونە!!

ئەمجار پەروەردگار سەرزەنشتی کافرەکان دەکا چونکە رو وەردەگێڕن لەشتێك: کەخێری ئەوانی تێدایە، پشت هەڵدەکەن لەپەیامێك: کە شکۆمەندی‌و پیاوەتی بەئەوان دەبەخشێ، ناوو شۆرەتیان پێ دەدا، دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ

عَنْ ذِكْرِهِمْ مُعْرِضُونَ﴾ بەڵكوو ئێمە قورئانێكمان بۆ هێناون جێگای شانازی ئەوانە، ناوو ناوبانگیان دەداتێ، شكۆمەندیو باڵادەستیو بەختەوەرییان بۆ دەستەبەر دەكا ئەگەر شوێنی بكەون!

كەچی ئەوان لەجیاتی ئەوە شوێنی بكەونو پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەكانی بن روی لێ وەردەگێرن، گاڵتەی پێ دەكەن، هەردەمە ناوو ناتۆرەیەكی نەگونجاوی بۆ دەدۆزنەوە، وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێكی ترە: كەدەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ.....﴾ (الزخرف/٤٤)

بێگومان گەلی عەرەب پێش ئەوەی ئیسلام بێو موسوڵمان ببن گەلێكی بێ ناوو عینوان بوون، كەس بەهیچی نەدەزانین، ١ مێژوویەكیان نەبوو ژیارو شارستانیەتیان نەبوو بەڵام كاتێك باوەشیان بەئیسلام دا كردو قورئانیان كردە بەرنامەی خۆیان، شكۆمەندییان بەدەست هێنا، باڵادەستو سەركەوتوو بوون، عەداڵەتكاریو زانیاریو رەوشتی جوانیان بڵاو كردەوە، مێژو بەشانازییەوە لەسەر روپەڕەكانی خۆی تۆمار كردن، بوونە نمونەی فرمانڕەواییو رابەر بۆ گەلو نەتەوەكانی جیهان، دەنگو باسیان گوێچكەی جیهانی پڕ كردبوو، هەتا ئەوان پابەندی ئیسلام بوون، دونیا بۆیان گەردنكەچ بوو، رێزو پیاوەتییان لەدونیادا مەشهوور بوو، بەڵام كاتێك دەستیان لەئیسلام بەرداو رویان كردە ئەملاو ئەولا شكۆمەندییان لەدەست داو چوونە پەراوێزەوە، بوون بەژێر دەستەو كۆیلە، پارچە پارچە بوون، وڵاتو خاكو ناویان داگیر كرا، خەرجو پیتاكیان لێ سەندرا، ئیستیعمار بەسەریان دا زاڵ بوو، تا لەئاكام دا دەوڵەتۆكەی ئیسرائیلیان لەناو جەرگەی وڵاتیاندا بۆ قووت كردنەوە، هەر رۆژە پەلاماری وڵاتێكیان دەداو هەر ساتە گاڵتەو قەشمەری بەلایەكیان دەكا. عوروبەو عەفلەقیەتو شیوعیەتو ناصریەت دادی نەدانو نایدا، بەهەڵگەڕانەوە لەئیسلام چ سوودێكیان دەستگیر نەبوو جگە لە ریسوا بوونو ژێر دەستی! هەتا نەشگەڕێنەوە بۆ ئیسلام شكۆمەندی رابردوویان دەست ناكەوێتەوە.

ئەمجار دڵسۆزیی پێغەمبەر ﷺ رون دەكاتەوە، ئەوە رادەگەنێ: كە پێغەمبەر ﷺ لەبانگەوازییەكەی دا دڵسۆزە، تەماعی دونیاییو بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی

تێیانـدا نیـە، هـەوڵو تێکۆشـانی لەگـەڵیان دا ئەرکێکـە خراوەتـە سەرشـانیو بەرژەوەندیی ئەوانی تێدایە. دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَسْأَلُهُمْ خَرْجاً فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾ یـان داوای کرێـی بانگەوازییەکـەتیان لێ دەکـەی لەپاسـاوی باگەوازیکردنت بۆیان موچەیان لێ دەستێنیٚ؟ بۆیە رقیـان لێتـە! واتـە ئـەم تۆمەتـە لـەتۆ دوورە، دەی بۆچـی ئـەو موشـریکە قورەیشـییە سـەر رەقانـە ئیمانـت پـێ ناهێنن؟ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێ: ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ (سبأ/٤٧) یان دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ (ص/٨٦) یان دەفـەرموێ: ﴿قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْراً إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى﴾ (الـشورى/٢٣) بـەکورتیو پـوختی ئـەو موشـریکانە هـیچ عـوزرو بەهانەیـەکیان بـۆ نەماوەتـەوە کـەئیمانت پـێ نـاهێنن، بێگومـان خـودای مـەزن بەموعجیزەی قورئان پشتگیریی پێغەمبەری کردوە، یاسایەکی بەرزو پیرۆزی ژیـانی بۆ ناردوە، بـۆ ئـەوەی ئادەمیزاد شـوێنی بکەون، کەوابوو هـیچ نیـازو مەبەستێکی ماددیو فرمانڕەوایی بەنێوە نیە.

ئـەمجار پـەروەردگار جـەخت لەسـەر راسـتی پـەیامی پێغەمبـەر ﷺ دەکاتـەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بێگومـان تـۆ ئـەی موحەممەد! بانگەوازیی ئادەمیزادبەگشتیو قورەیشییەکان بەتایبەتی دەکەی بۆ رێگای راستو ئایینی پیرۆز، بانگیان دەکەی بۆ رێبازی شکۆمەندییو کەرامەت، بۆ رێگای خۆشیو بەختـەوەری ئـەویش ئـایینی ئیـسلامی پـیرۆزە: کـەدەرمانی هـەموو دەردێکـە، یەکالاکەرەوەی هەموو موشکیلەو تـەنگو چـەڵەمەیەکە، هەرکەسێ پابەنـدی ئـەم ئایینـە پـیرۆزە بێ، بەسـەر هـەموو کۆسپو تەگەرەیەکدا زاڵ دەبێ، هـەموو نـانو ساتێك ورە بەرزو چاو قایمو دڵ گوشادو گەشبینە، ئەمە راستییەکە عاقڵمەنـدانو رۆشـنبیرانو لێکۆڵـەرەوە بـێ لایەنـەکان چەسـپاندویانەو لەنووسـینەکانییان دا شایەتیان لەسەرداوە.

﴿وَإِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ عَنِ الصِّرَاطِ لَنَاكِبُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی لەرێگەی راستو ئایینی خودا لایان داوە، رێبازی هەڵەتو غەڵەتیان گرتـووە، گومڕا بـوونو سەراسیمەو سەرگەردان!

ئەگەر هیدایەتدراو بوونایە شوێن بیرو باوەڕی سروشتی خۆیان دەکەوتن‌و دەیانزانی: کە ژیان تەنها بریتی نیە لەژیانی کەمخایەنی جیهان، بەڵکوو ژیانی کامڵ‌و خۆشی‌و ناخۆشی تەواو لەژیانی قیامەت دا دەستەبەر دەبێ. ئەوانە ئیمانیان بەرۆژیی دوایی نیە، ئەوانەی لەڕێبازی حەق لایان داوە، چەندێك بەنازو نیعمەت بەتاقییان بکەینەوە بێ سوودە، ئەگەر نازو نیعمەتیان بەسەردا برێژین پێیان وایە ئەو نازو نیعمەتەی پێیان دەبەخشین، ئەو ماڵ‌و سامانەی دەیاندەینێ خێرو فەرە بۆیان‌و شان‌و شەوکەتی خۆیان شیاوی ئەومیە، ئیتر هێندەی تر لەخۆیان بایی دەبن‌و بوغرایی دەیانگرێ.

ئەگەر تووشی بەڵاو ناخۆشیشیان بکەین دڵیان نەرم نابێ‌و لەناخەوە ناهەژێن. دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِمْ مِنْ ضُرٍّ لَلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾.

ئەوانە لەسەرپێچی‌و یاخی بووندا گەییشتوونە ئاستێك هیوای ئیمانیان لێ نەکرێ، تەنانەت ئەگەر نیعمەت‌و رەحمەتی خۆمانیان بەسەردا برێژین، دەردو بەڵاو تەنگ‌و چەڵەمەیان لەسەر هەڵگرین، قورئانیان بەسەردا بخوێندرێتەوە، بەڵگەی جۆراو جۆرو بەهێزیان بۆ بهێندرێتەوە، ئیمان ناهێنن‌و گەردنکەچ نابن‌و شوێن پەیامی قورئان ناکەون، بەڵکوو درێژە بەگومڕایی خۆیان دەدەن‌و بەردەوام دەبن لەسەر کوفرو بێدینی‌و بەسەرگەردانی‌و ڕاڕایی دەمێننەوە تا کۆتایی ژیان. تەنانەت ئەگەر لەقیامەتیش را بیانگێڕینەوە بۆ ژیانی دونیا، دووبارە دەگەڕێنەوە سەر کوفرو بێدینی خۆیان‌و تەمێ خواردو نابن، ئەوانە تابینە قاقایان نغرۆی گومڕایی‌و سەرگەردانین، هیچ خێرو بێرێکیان لێ چاوەڕوان ناکرێ تەنانەت گەییشتوونەتە ئاستێك لەشوێنێکی تردا قورئان دەربارەیان بفەرموێ: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللّهُ فِيهِمْ خَيْراً لَّأسْمَعَهُمْ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ (الانفال/٢٣) ئەمە راستییەکی چەسپاوەو مێژوو گەواهیدەریەتی: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُمْ بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ بێگومان بەبەڵاو ناخۆشی بەتاقیمان کردنەوە، رۆژی بەدر زۆربەی سەرانیان بەدەستی موسوڵمانەکان کوژران‌و بەدیل گیران، تووشی زۆر دەردوو بەڵاو تەنگانەو ناخۆشی ترمان کردن، بەڵام لەهەڵوێستی خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، ئیمانیان نەهێناو بۆلای خودا نەگەڕانەوە. گەردنکەچی‌و

فەرمانبەرداری خۆیان رانەگەیاند! بەڵكوو بەردەوام بوون لەسەر كوفرو گومڕایی خۆیان. وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلا إِذْ جَاءَهُمْ بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ (الانعام/٤٣) بێگومان ئەو جۆرە رەوشتە رەوشتی ئەو تاقمەو پێرە دڵ ڕەقانەیە كەلەخودا غافڵن‌و قیامەت بەدرۆ دەزانن، موشریكەكانی هاوچەرخی پێغەمبەریش بەشێكن لەوانە.

ئەمجار سەرەنجامی هەڵوێست‌و كردەوەكانیان دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَاباً ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ هەتا بەناگەهان قیامەت رادەبێ‌و حیساب‌و لێكۆڵینەوە دەست پێ دەكرێ‌و عەزابی دۆزەخیان بۆ دەستنیشان دەكرێ، عەزاب‌و ناخۆشییەكیان توش دێ كەلەوە پێش بەخەیاڵیاندا نەدەهات، ئیتر ئەو كاتە بەئاگا دێنەوەو بەماڵوێرانی خۆیان دەزانن‌و لەهەموو خێرو خۆشییەك نائومێد دەبن، هیوا بڕاوو دۆڕاوو ڕیسوا بوو؛ هیچ شتێك فریایان ناكەوێ‌و هیچ شتێك دادیان نادا!

## نیعمەتە جۆراو جۆرەكانی پەروەردگار بەسەر بەندەكانیدا

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ٧٨ وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٧٩ وَهُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٨٠ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار پشت هەڵكردن‌و رووەرگێڕانی كافرەكانی لەتێگەیشتنی قورئان‌و بەڵگە جۆراو جۆرەكان لەسەر هەبوونی خودای تاك‌و تەنیا روون كردەوە، ئەمجار دەست دەكا بەجەولەیەكی تری رانواندنی نیعمەتە جۆراو

جۆرەکانی بەسەر بەندەکانی دا، بۆئەوەی ویژدانیان بوروژێنێ‌و دڵیان بەئاگا بێنێ بۆ بیر کردنەوە لەنیشانەکانی تاك‌و تەنهایی‌و بەدەسەلاتی خودا لەخودی خۆیان داو لەدیاردەکانی دەوروبەریان دا. دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە بۆ ئێوەی دروست کردوە: ئامێری بیستن بۆ بیستنی دەنگ‌و صەدا، ئامێری دیتنی بۆ دروست کردون بۆ دیتنی شت، عەقڵ‌و هۆشی بۆ دروست کردون بۆئەوەی هەست بەو حەقیقەتانە بکەن: کەسەر دەکێشێ بۆ دەستەبەر بوونی ئەو شتانەی سودی دونیاو قیامەتی تێدایە بۆتان، بەتایبەتی باسی ئەم سێ ئامێرەی کرد چونکە بەڵگە هێنانەوە لەسەر هەبوونی خوداو بەتوانایی‌و دانایی زاتی پاکی، پێویستی بەهەبوونی ئەو ئامێرانە هەیە.

﴿قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾ سوپاسگوزاری ئێوە زۆر کەمن! چەند سپڵەو پێنەزانن لەبەرامبەر نیعمەتەکانی خودا. واتە: ئەوان هەر هیچ شوکری خودا ناکەن، لەکاتێك دا دەبوایە هەموو کاتێ خەریکی شوکرو سوپاس بوونایە، خۆ ئەگەر ئادەمیزاد لەخودی خۆی ورد بێتەوە، لەشکڵ‌و شێوەو رووخساری، لەئامێرەکانی هەستی، لەشێوەی گونجاوی هەستەکانی لەگەڵ دەوروبەریدا، لەو تواناو دەسەلاتەی خودا پێی داوە، بێگومان زوو خودای خۆی دەدۆزیەوەو دەیزانی: کەبەدیهێنەری ئەو ئامێرو هەستانە خودایەکی داناو زاناو بەتوانایە. بۆی دەردەکەوت: کەجگە لەخودای تاك‌و تەنیاو بالادەست، کەسی تر توانای ئەوەی نیە. ﴿وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ پەروەردگار خودایەکی وەهایە ئێوەی بەدیهێناوەو لەرێگەی زاوو زێوە زۆری کردون‌و بەسەر زەویدا بلاوی کردونەوە، بۆ ئەوەی زەوی ئاوەدان بکەنەوە، ئێوەی کردوە بەچەند رەگەزو گەل‌و نەتەوەیەك، رەنگ‌و رەگەزو زوبان‌و رەوشتتان لێك جودایە، پاشان هەمووتان لەسارای مەحشەر کۆ دەکاتەوە بۆ حیساب‌و لێکۆڵینەوە، بۆ سزا دانەوەو پاداش وەرگرتنەوە. هەمووانتان تێکڕا زیندو دەکاتەوە، لەرۆژێك دا کەس حاکم‌و فرمانڕەوا نیە خۆی نەبێ.

﴿وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ خودایەکی وەهایە دەژیێنێ‌و دەمرێنێ، نیعمەتی ژیانی پێ بەخشیون، بەلام ئەو نیعمەتە بۆ هەتا هەتایە نیە، بەڵکوو مەبەست لەو ژیانە گواستنەوەیە بۆ ژیانی تەواوو هەتا هەتایی، بەم رەنگە دوای دروستکردنتان‌و

گیان پێ بەخشینتان دەتانمرێنیٚو پاشان جارێکی تر لەڕۆژی قیامەت دا زیندوتان دەکاتەوە. بۆ پاداشو سزا وەرگرتنەوەی کردەوەکانی ژیانی دونیاتان.

﴿وَلَهُ اخْتِلافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ خودایەکی وەهایە شەوو ڕۆژی بۆ ئێوە موسەخەر کردوە، وای لێ کردون بەشوێن یەکتردا دێنو هەرکەیان بەشوێن ئەوی تریانەوەیە، هەمیشە ئەم دەرواو ئەو دێتە شوێنی، لێک وەرز نابنو لێک جودا نابنەوە، بەشێوەو یاسایەکی وردو تۆکمە لەکاتو زەمانی دیاری کراودا ئاڵو گۆڕی خۆیان ئەنجام دەدەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (يس/٤٠)

ئەمجار هەڕەشە لەوانە دەکا: کەلەم دیاردەو نیشانانە وردنابنەوە، تێیان نافکرن، دەفەرموێ: ﴿أَفَلا تَعْقِلُونَ ؟﴾ ئەرێ ئەوە بۆچی بیرناکەنەوەو عەقڵو هۆشی خۆتان ناخەنە گەڕو لەم دیاردانە ورد نابنەوە؟ بۆئەوەی بەنیشانەکانی هەبوونی خوداو تاکو تەنهایی زاتی پاکی ئاشنا ببن! ئەمجار واز لەئاڕاستەکردنی خیطاب بۆ کافرەکان دەهێنێو پەردە بەسەر دیمەنی جیدال لەگەڵ کردنیان دا دادەداتەوە، بیرو بۆچونو قسەکانیان دەربارەی زیندو بوونەوەو پاداشدانەوەو سزا وەرگرتنەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە وەکوو لەم کۆمەڵە ئایەتەی دوایی دا دەردەکەوێ.

## موشریکەکان ئینکاری زیندو بوونەوە دەکەنو پەروەردگاریش بەبەڵگە دەیچەسپێنێ

﴿ بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوا أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾

﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾﴾

ویڕای هەبوونی ئەو بەڵگانە لەسەر بەتوانایی خودا، کەچی ئەو موشریکانە پەند ئامێز نابن و ئیمان ناهێنن، ئینکاری زیندووبوونەوەو حەشرو حیساب و لێکۆڵینەوەی قیامەت دەکەن! هیچ بەڵگەیەکیشیان بەدەستەوە نیە جگە لەلاسایی کردنەوەی باوك و باپیرانیان و هەمان قسەو قسەڵۆکی ئەوان دووبارە دەکەنەوە! دەفەرموێ: ﴿بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الأَوَّلُونَ﴾ بەڵکوو ویڕای هەبوونی ئەو بەڵگەو نیشانانەی ئاماژەیان پێکرا کەچی ئەو موشریکانە ئینکاری زیندوو بوونەوە دەکەن قسە پڕو پوچەکانی پێشینانی خۆیان دووبارە کردەوە، کوێرانە لاسایی باوك و باپیرانیان کردەوە، هەر بەوەندە نەوەستان کەهەستیان حیکمەتی خودا دەرك نەکا، بەوەندە وازیان نەهێنا: کەدەیانگوت زیندوو بوونەوە نیە. بەڵکوو گاڵتەشیان پێ دەهات ﴿قَالُوا:﴾ وتیان: ﴿أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً وَعِظَاماً أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ؟﴾ ئایا ئەگەر ئێمە مردین و بووینەوە بەگڵ و ئێسقانە رزیو، جارێکی دی ئێمە زیندوو

دەکرێینەوەو دێینەوە کوڕی ژیانەوە؟ ئەم قسە بەباوك‌و باپیری ئێمە گوتراوەو تائێستا نەهاتۆتە دی!! ئەوان هاتنی قیامەت‌و زیندو بوونەوەیان بەلاوە زۆر دوور بوو، پێیان وابوو شتی وا هەرگیز روونادا، بۆیە لەزۆر شوێن دا قورئان ئەم هەڵوێستەیان لەسەر تۆمار دەکاو دەفەرموێ: ﴿أَئِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِي الْحَافِرَةِ، أَئِذَا كُنَّا عِظَاماً نَّخِرَةً، قَالُوا تِلْكَ إِذاً كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ، فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ، فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾ (النازعات/١٠-١٤) یان دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ، وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (یس/٧٧-٧٨-٧٩).

ئەمجار هەر بۆخۆیان وەڵامی خۆیان دەدایەوەو دەیانگوت: ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَذَا مِنْ قَبْلُ إِنْ هَذَا إِلاَّ أَسَاطِيرُ الأَوَّلِينَ﴾ بێگومان ئەم وادەو هەڕەشەیەی لێمان دەکرێ‌و موحەممەد پێمان رادەگەیەنێ، لەوە پێشیش لەسەر زمانی پێغەمبەرانی دیکە، هەمان وادەو هەڕەشە لەباوك‌و باپیرانمان کراوەو وێڕای تێپەڕ بوونی ئەو هەموو چەرخ‌و رۆژگارە دوورو درێژە هیچ کامێ لەو وادەو هەڕەشانە نەهاتوونە دی.. ئەوەندە نەفام‌و کەوەدەن بوون، پێیان وابوو زیندو بوونەوە لەدونیادا دێتەجێ.

بێگومان موشریکە قوڕەیشییەکان عەقیدەو بڕوایان شێواو بوو، بڕوایان بەهەبوونی خودا هەبوو، دانیان بەوەدا دەنا: کەخاوەنی ئاسمانەکان‌و زەوی (الله) یە، دەیانزانی ئەو هەڵسوڕێنەری بوونەوەرە، بڕوایان بەوە هەبوو: کەخودا بەسەر ئاسمانەکان‌و زەویدا باڵادەستە؛ کەچی لەگەڵ ئەوەش دا بەدەستی خۆیان دارو بەردیان دەتاشین‌و دەیانکردنە هاوەڵی خودا، دەیانگوت: ئێمە ئەم بتانە بۆیە دەپەرستین لەخودامان نزیك بکەنەوە، هەندێکیشیان دەیانگوت: فریشتەکان کچی خودان. جا بۆیە لێرەدا لەو شتانەوە بۆیان دێ: کەخۆیان ددانی پێدا دەنێن‌و بەلایانەوە چەسپاوە، بۆ ئەوەی عەقیدەی شێواویان بۆ راست بکاتەوەو بیانگێڕێتەوە بۆ یەکتاپەرستی‌و ئایینی سروشتی خۆیان! سێ بەلگەیان بۆ دەهێنێتەوە لەسەر بەتوانایی خۆی‌و تاك‌و تەنهایی لەخودایەتی دا.

١- دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِمَنْ الأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەو موشریکانە بڵێ: کێ خاوەنی ئەم زەویەیە کێ دروستی کردوە، کێ ئەو حەمکە ئاژەڵ و درەخت و روەك و بەرو بومەی تێدا رەخساندوە؟ ئەگەر ئێوە ئەهلی عیلم و زانستن، دەپێم بڵێن: کێ خاوەنیانە؟ بەتەئکید بەناچاری ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ دەڵێن: خودایە،خودا بەدیهێنەریانە، خودا خاوەنیانە، دەی: کەئاوا ئیعترافیان کردو دانیان بەواقیع دانا، ﴿قُلْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ ؟﴾ پێیان بڵێ: بۆچی بەخۆتان دا ناچنەوە بۆچی بیر لەوە ناکەنەوە: کەسێك بتوانێ سەرەتا شتێك بێنێتە دی دروستکردنەوەی سەر لەنوێی بەلاوە ئاسانترە؟! کەوابوو نابێ و ناگونجێ عیبادەت بکەن بۆ هیچ کەس جگە لەخودای رزق و رۆزی دەر!

ئەم بەڵگە بەهێزە دەکرێ بکرێتە رەتدانەوەی ئەوانەی ئینکاری زیندوبوونەوە دەکەن، هەروا بتپەرستەکانیش: ئەوانەی لەتەك پەروەردگاردا شتی تر دەپەرستن، دان بەربووبییەتی خودا دادەنێن! کەچی جگە لەخودا پەرستش بۆ شتی تر دەکەن، هەرچەندە دان بەوەدا دەنێن: کەپەرستراوەکانیان هیچ شتێکیان بۆ دروست ناکرێ و دارای هیچ شتێك نین، بەلام پێیان وایە ئەو بتانە لەخودایان نزیك دەکەنەوە، وەکو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ (الزمر/٣)

٢- ﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ؟﴾ ئەمجار ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ: کێ خودای ئاسمانەکان و عەرشی گەورەو بەرینە؟ ئەو عەرشەی لەهەموو بوونەوەر گەورەترەو وەکوو سەقفی بوونەوەر وایە... وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ (البقرة/٢٥٥)

ئەبو داود فەرمودەیەکی پێغەمبەری ریوایەت کردوە: دەفەرموێ: (شأن الله أعظم من ذلك، ان عرشه على سمواته هكذا) بەدەست ئاماژەی بۆ شتێك کرد وەکوو قوببە وابوو!

لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێ: (ما السموات السبع والأرضون السبع وما بينهن وما فيهن فی الكرسي الا كحلقة ملقات بأرض فلاة، وان الكرسي بما فيه بالنسبة الى العرش كتلك الحلقة فی تلك الفلاة) حەوت ئاسمانەکان و حەوت طەبەقەی زەوی ئەوەی لەنێوانیان دایەو ئەوەی تێیان دایە، بەنیسبەت کورسییەوە

وەکوو ئەنگوستیلەیەك وایە لە سارایەك دا، کورسی بەنیسبەت عەرشەوە وەکوو ئەو ئەنگوستیلەیە وایە لەو سارایەدا.

کەدەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ ئاماژەیە بۆ بەرزیو بەرفراوانی ئەو مەخلوقە خودا کردە. لەکۆتایی سورەتەکەش دا، دەفەرموێ: ﴿رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ بەمەش ئاماژە بۆ شکۆمەندییو جوانی عەرش دەکا.

عەرش رەمزی بالآ دەستیو کۆنترۆڵکردنی بوونەوەرە، نیشانەی ئەوەیە: خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایەو هیچی لێ عاسی نابێ!

جا ئەگەر تۆ ئەی موحەممەد! لێیان پرسیار بکەی خاوەنو بەدیهێنەری ئاسمانەکانو عەرشی بەرین کێ یە؟ ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ دەستبەجێ دان بەراستی دا دەنێنو دەڵێن: تەنها بۆ خودایەو بەس! هەر ئەو خاوەنیانەو ئەو بەدیهێناون، وەلآمی تریان نیە، دەی کەوایە ﴿قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ؟﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە ئیعتراف بەوەدەکەن، ئەدی بۆ لەسزای خودا ناترسن؟ بۆ هاوەڵی بۆ دادەنێن؟

جا کەهەردوو عالەم؛ عالەمی پایینو عالەمی بالآ ملکی خودا بنو ئەو بەدیهێنابن، دیارە بەڕێوە بردنو هەڵسوڕانیشیان بەدەست خودایە.

٣- ﴿قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ بڵێ: سەڵتەنەتو دەسەڵاتداری هەموو بوونەوەر بەدەست کێ یە؟ کێ خاوەنو فرمانڕەوایانە؟ کێ دەستەڵاتی هەموو شتێکی بەدەستە؟ ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەو گەورەو پەنادەرە، بەهانا خەڵکییەوە دێو پەنایان دەدا، هەرکەسێکی بوێ لەتەنگانە ڕزگاری بکا، ڕزگاری دەکا. بەڵام کەسێك خودا بیەوێ توشی ناخۆشیو بەڵای بکا کەس نیە بتوانێ بیپارێزێو بەهانایەوە بێو لەدەس خودا ڕزگاری بکا، هەرچی خودا بیەوێ ببێ دەبێ، هەرچی بیەوێ نەبێ نابێ. ئەگەر ئێوە ئەهلی زانستو زانیارین. ئەگەر ئەم پرسیارانەشیان لێ بکەی بەتەئکید ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ دەڵێن: بۆ خودایە، یەکسەر ئیعتراف دەکەن: کەخاوەنو هەڵسوڕێنەرو فرمانڕەوایەتی بوونەوەر تەنیا خودایەو بەس! کەس نیە حوکمی خودا ڕەت بکاتەوە هەڵیوەشێنێتەوە جا کەدانیان بەوەدا نا ﴿قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ ؟﴾ پێیان بڵێ: ئەدی کەوایە بۆچی هەڵخەڵەتاونو لەیەکتاپەرستیو بەندایەتی کردن بۆ خودا دوورە پەرێزن، چۆن هێشتان شەیتان

لەخشتەتان دەبا؟ یان چۆن عەقڵو هۆشتان ڕێگەی ئەوەتان پێ دەدا کەلەتەك خودادا شتی تر بپەرستن؛ ئێوە بۆ خۆتان ددان بەخودایەتیو خاوەنێتی خودادا دەنێنو دەڵێن: ئەو بەدیهێنەرو فرمانڕەوایە بۆ هەموو بوونەوەر، کەچی هاوەڵی بۆ دادەنێین!! ئەمجار دوای ئەم جەدەلو بێنەو بەرەیە، حەقیقەتێك رادەگەیەنێو واقیعەکە دەسەپێنێو دەفەرموێ: ﴿بَلْ أَتَيْنَاهُمْ بِالْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ بەڵکوو ئێمە قسەی حەقمان بۆ هێناون، ئایینی راستو دروستمان بۆ ناردوون، پەیامێکی راستمان پێ راگەیاندون، بەوە: کەهیچ خودای بەحەق نین جگە لە (الله) بەڵگەی صەحیحو حاشا هەڵنەگرمان بۆ هێناونەوە لەسەر تاكو تەنهاییو بێ هاوەڵیو باڵادەستی خودا؛ واز لەکێشەو جەدەل لەگەڵیان دا بێنە، ئەوان ئینکاری حەق دەکەنو لەئینکاری کردنەکەشیان دا راست نین درۆ دەکەنو بەخۆڕایی سواری گای هار بوون، ئینکاری کردنەکەیان بێ بەڵگەو دەلیلە، تەنها لاسایی کردنەوەی باوكو باپیرانیانە.

## پەروەردگار نەمنداڵی هەیەو نە هاوەڵ

﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ (٩١) عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٩٢) ﴾

لەوەپێش بەبەڵگەی بەهێزو پتەو، زیندوو بوونەوەو هاتنی قیامەتی چەسپاند، بەتوندیی رەدی ئەوانەی دایەوە: کەئینکاری زیندو بوونەوە دەکەن، بەدرۆی لەقەڵەم دەدەن. ئەمجار ئەوە روون دەکاتەوە لەچیدا درۆ دەکەن! ﴿مَا اتَّخَذَ

اللَّهُ مِنْ وَلَدٍ﴾ بەهیچ جۆرێ خودا منداڵی بۆ خۆی دانەناوە، هەندێ لەو موشریکانە کەدەڵێن: فریشتە کچی خودان، درۆ دەکەن‌و قسەیەکی بێ بناغەو بێ سەرو بەرە.

﴿وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ﴾ هەرگیز خودایەکی تری لەگەڵ دا نیەو نەبوەو نابێ، هاوەڵێکی نیە لەخودایەتی دا هاوشانی بکاو هاوبەشی بکا وەکوو بتپەرستەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، بتەکانیان بەهاوشانی خودا دەزانن. ئەو بیرو بۆچونەی موشریکەکان بانگەشەی بۆ دەکەن بیرو باوەڕێکی پڕو پووچە، چوونکە ئەگەر جگە لەخودای تاك‌و تەنهاو بالادەست چەند خودایەکی تر هەبوونایە ﴿إِذاً لَذَهَبَ كُلُّ إِلَهٍ بِمَا خَلَقَ﴾ هەر خودایەك بۆ خۆی دروستکراوەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد، هەریەکەیان بەشێکی بوونەوەری بەر دەدا، چوونکە پێکەوە بوونیان‌و هاوبەش کردنیان بۆ بەڕێوە بردنی بوونەوەر بەشەراکەتی محاڵەو بەردەوام نەدەبوو. کەوابوو هەریەکەیان بەشێکی بوونەوەری بۆ خۆی پاوان دەکرد، بۆ هەر کۆمەڵە مەخلوقاتێك یاسایەکی تایبەتی دەبوو نەدەچووە چوار چێوەی یاسا گشتی یەکەی بوونەوەرەوە.

ئەمجار خوداکان لەناو خۆیان دا کێشەیان تێ دەکەوت هەریەکەیان دەیەویست ملکی ئەویتریان داگیر بکا. ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ هەندێکیان بەسەر هەندێکیان دا زاڵ دەبوون‌و دەیەویست خوداکانی دیکە ژێر دەستە بکا، وەکوو پاشاکانی جیهان. هەموو ئەم تەصەووراتانە ووجوودیان نیەو بێ بناغەن، چونکە ئەگەر ئەم کێشەو نیزاعە لەنێوان خوداکان دا روی بدایە، یاسای بوونەوەر تێك دەچوو ئاسمانەکان‌و زەوی‌تێك دەڕوخان‌و هەرچی لەناویان دایە دەفەوتا.

بەلام ئەوەتا ئێمە بەچاوی خۆمان دەبینین ئاسمانەکان‌و زەوی، ئەوەی تێیان دایە لەمانگ‌و خۆرو ئەستێرەو ئاوو هەواو دارو درەخت بەشێوەیەکی بەردەوام‌و ڕێك‌و پێك لەگەڕدان‌و هەریەکەیان لەجەمسەری خۆی دا کار دەکاو لەچوار چێوەی یاسا گشتی یەکەی بوونەوەردا ئەرکی خۆی ئەنجام دەدا.

ئەوەتا بەچاوی خۆمان دەبینین جیهانی پاین‌و جیهانی بالا پێکەوە گونجاون‌و دژایەتی‌و پشێوییان لەنێوان دا نیە، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَّا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِن تَفَاوُتٍ﴾ (الملك/٣)

هەموو دیمەنەکانی بوونەوەر شایەتی دەدەن لەسەر تاكو تەنهایی خودا، یەکیەتی یاسای بوونەوەر نیشانەی تەنهایی هەڵسوڕێنەرەکەیەتی. هەموو بەشێکی بوونەوەر، بەتاكو کۆیەوە، بەگەورەو بچوکیەوە، بەگیانلەبەرو بێ گیانیەوە هەموویان پێکەوە گونجاون‌و بەبێ ئەوەی کێشەو پشێویان تێدا بێ. کەوابوو فرە خودایی محاڵەو عەقڵ نایسەلمێنێ، قسەی موشریکەکانیش پوچو بێ بناغەیە ﴿سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پاكو بەرزو پیرۆزە خودا لەوەی وەپاڵی دەدەن‌و دەڵێن: خودا منداڵی هەن، هاوەڵی هەن، ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ زانایە بەهەموو پەنامەکی‌و ئاشکرایەك، هەر ئەو غەیب دەزانێ، زانینی ئەو شتانەی لەئادەمیزادو فریشتەو جندۆکە پەنامەکین، تایبەتە بەخوداوەو هەر ئەو دەیانزانێ، هەروا شتە ئاشکراکانیش دەزانێ، نهێنی‌و ئاشکرا لای خودا چون یەکن‌و وەکوو یەك دەیانزانێ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تاكو تەنهایی خودا، چونکە غەیری خودا ئەگەر شتە ئاشکراکانیش بزانن پەنامەکییەکان نازانن، نەزانینی شتە پەنامەکییەکان نیشانەی کەم‌و کوڕییە لەزانیاری دا، کەوابوو هەرکەسێ زانیاری پەنامەکی نەزانێ ناقیصەو بەکەڵکی خودایەتی نایە. پەروەردگار هەرچی صیفاتی کەماڵو جەلال هەیە هەیەتی، لەهیچ شتێك دا کەم‌و کوڕی نیە ﴿فَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ پاك بەرزو پیرۆزە لەو شتە ناشرینانەی وەپاڵی دەدەن، هەر شتێك لەگەڵ شکۆمەندیی خودایی دا نەگونجێ نابێ وەپاڵی بدرێ، دوورو بەرزە لەوەی منداڵی هەبن، هاوەڵی هەبن، زاتێکی بێ شەریكو بێ وەزیرە، بێ وێنەو بێ نەظیرە، هەر خۆی خودایەو کەسی تر شیاوی خودایەتی نیە.

زانایانی عیلمی کەلام ئەم بەڵگەیەی قورئانیان هێناوەو ناویان ناوە (برهان التمانع) بەڵگەکەشیان وا ئاراستە کردوە، وتوویانە ئەگەر لەفەرزێك دا دوو بەدیهێنەر، دوو خودا بڕیار بدەین، ئەگەر یەکێکیان ویستی گیانلەبەرێك بمرێنێ ئەوی تریان بیەوێ نەمرێ‌و درێژە بەژیان بدا، ئالەم کاتەدا ئەگەر ویستی هیچیان نەیەتەدی، ئەوە هەردوکیان دەسە وەسانن، خوداش دەبێ بالآدەست بێ‌و ویستەکانی بێنەدی. ناشگونجێ ویستی هەردووکیان بێتە دی لەیەك سات دا چونکە ئەمە دەبێتە کۆکردنەوەی دوو دژ، ئەوەش محاڵە. خۆئەگەر ویستی یەکێکیان بێتەدی

هی ئـەوی تریـان نەیەتـەدی، ئـەوە مانـای ئەوەیـە، ئـەوەی ویـستەکەی هاتۆتـەدی خودای حەقەو (واجب الوجود)ەو شیاوی خودایـەتی یـە. ئـەوی تریـان خـودا نیـە. چونکە خـودا دەبـێ دەسـەڵاتو توانـای ڕەهـا بـێو هـیچ لەمپـەرێك نـەتوانێ ببێتـە کۆسپ لەبەردەم ویستەکانی دا.

## ڕەهنومایی کردنی پێغەمبەر ﷺ

﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ ﴿٩٥﴾ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار ڕەدی موشریکەکانی دایەوەو بیرو بۆچوونیانی پـووچ کردەوە، ئەمجار پەروەردگار ڕەهنومایی پێغەمبەر ﷺ دەکا بـۆ ئـەوی پـشت بـەخودا ببەستێو لێی بپاڕێتەوە کەلەعەزابی کافرەکان ڕزگاری بکا. ئەمجار ڕەهنومایی دەکا کەلەبەرامبەر خراپەی خراپەکارانتدا چاکە بکا، چونکە جاری وادەبێ چـاکە کـردن لەگەڵ خراپەکاری کاریگەر دەبێ، ئەمجار فەرمانی پێ دەکا: کەپـەنا بگـرێ بـەخودا لەوەسوەسەی شەیتان.

دەفەرموێ: ﴿قُلْ رَبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ، رَبِّ فَلا تَجْعَلْنِي فِي الْقَـوْمِ الظَّـالِمِينَ﴾ پـەروەردگار فـەرمان بـە پێغەمبـەر دەکـا: کـە ڕوو بکاتـە ئـەوو پـەنا بـەزاتی پـاکی بگـرێ: کەنەیخاتـە پێـڕی ستەمکارانەوە. بڵـێ: خودایـە! ئەگـەر بڕیـارت داوە ئـەو عەزابەی هەڕەشەت پێ لەکافرەکان کردوە نیشانم بدەی لەدونیادا یان لەقیامـەت دا

گیرۆدەیان بکەی پێی. خودایە! من لەو پێرە حیساب مەکەو مەمخەرە ناویانەوە! لەو عەزابو سزایە من بپارێزە.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ پارێزراوە لەوەی: کەخودا بیخاتە گەڵ ستەمکارانو بەعەزابی نازڵبوو بۆ سەریان سزای بدا، وەڵێ ئەم دوعاو پاڕانەوەیە بۆ زێدە ترسانو تەقوا کارییە، فێر کردنی موسوڵمانانە: کەلەمەکرو عەزابی خودا دڵنیا نەبن هەمیشە ترسو حەزەریان هەبێ، بێ ئاگا نەبنو پشتی لێ نەکەنەوە، هەمیشە پشت بەخودای خۆیان ببەستنو لێی بپاڕێنەوە:کە لەسزای ستەمکارو بێدینان بیانپارێزێ، چونکە عەزابی خودا کاتێ نازڵ بوو وادەبێ غەیری ستەمکارەکانیش دەگرێتەوەو تەڕو وشك بەیەکەوە دەسوتێنێ، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً﴾ (الانفال/٢٥) ئیمامی ئەحمەدو تیرمیذی ریوایەتیان کردوە، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ دەپاڕایەوە دەیفەرموو: پەروەردگارا! (اذا أردت بقوم فتنة، فتوفني اليك غير مفتون) هەرکاتێك ویستت گەلو نەتەوەیەك تووشی فیتنە بکەی من بگرە پەنا خۆتو وام لێ بکە فیتنەکە نەمگرێتەوە.

حەسەن دەفەرموێ: پەروەردگار هەواڵی بە پێغەمبەری خۆی دا کەنەگبەتییەك تووشی گەلەکەی دێو کاتەکەی بۆ دیاری نەکرد، فەرمانی پێ کرد کەئەو دوعاو پاڕانەوەیە بکا.

رەهنومایی کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم دوعایە، بۆ ئەوەیە ئەجرو پاداشی گەورەی دەس بکەوێو بەردەوام لەذیکرو یادی خودا دا بێو فێر کردنی ئێمەیشە بۆ پەیڕەوی کردنی ئەم فەرمانەو هەمیشە خودامان لەیاد بێو ترسی عەزابو سزای پەروەردگارمان لەدڵ دا بێ.

﴿وَإِنَّا عَلَى أَنْ نُرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ﴾ واتە دڵنیابە ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە دەتوانین ئەو عەزابەی نازڵی دەکەین بۆ سەریان نیشانی تۆی بدەین. ئەگەر مەیلمان هەبێ ئەو عەزابەی نازڵی دەکەین بۆ سەر کافرەکان پیشانی تۆی بدەین دەمانکردو دەمانتوانی بیکەین، بەڵام ئێمە ئەو عەزابە دوا دەخەین بۆ کاتێکی تر:

کەحیکمــەتی خۆمــان داخوازییــەتی. چــونکە هێنــدێك لــەو کافرانــەو هەنــدێك لەنەوەکانیان ئیمان دەهێنن!

بێگومان پەروەردگار هەندێکی لەو عەزابەی هەڕەشەی پێ لەکافرەکان کردبوو نیشان دا، ئەوە بوو لەغـەزای بـەدردا ستەمکاران بەشێك لـەو عەزابـەیان چەشـتو پاشانیش لەرزگار کردنی مەککەدا بەشێکی تری لەو عەزابە پێ چەشتن!

ئەو کاتەی ئەم سورەتە نـازڵ بـوو پێغەمبـەر ﷺ هێشتا لەمەککە بـوو، کۆچـی نەکردبوو بۆ مەدینـە، شێوەو جۆری بانگەوازی ئـەو سـەردەمە ئـەوەی دەخواسـت کەبانگخوازانی ئیسلام بەصەبرو پشوو درێژ بن، لەبەرامبەر خراپـەی خراپـەکاران بەچاکە پاساو بدەنەوە، چاوەڕوانی فەرمانی خودا بـن، بۆیـە بـەم شێوەیە شێوازی بانگەوازی فێر دەکاو فەرمانی پێ دەکاو پێی دەفـەرموێ: ﴿ادْفَـعْ بِـالَّتِي هِـيَ أَحْـسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ پاساوی خراپە بەچاکە بدەرەوە، لەبەرامبـەر کەسێك دا خراپـەت لەگـەڵ دەکـا ئـەتۆ چاکەی لەگـەڵ بکـە، پـشوو درێـژ بـە لەسـەر ئـەو ئەزیـەتو نارەحەتیـەی لەکافرەکانـەوە پێت دەگـا. ئێمـە دەزانـین چۆن وەصـفمان دەکـەن؛ دەڵـێن: خـودا هـاوەڵی هەیـە، منـداڵی هەیـە، پێغەمبەرەکـەی بـەدرۆ دەخەنەوە!! وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە دەفەرموێ: ﴿ادْفَـعْ بِـالَّتِي هِـيَ أَحْـسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ (فصلت/٣٤).

ریوایەت کراوە لەئەنەسەوە کەلەمانای ئەم ئایەتـەدا دەفـەرموێ: پیـاو وەصـفی برای خۆی دەکا بەڕەوشتێك کەتێیدا نیە، بـرای غەیبـەت کـراو بـەم جـۆرە وەڵامـی غەیبەتەکە رەت دەکاتەوە: دەڵێ: ئەگەر درۆ بکەی داوا دەکەم خودا لێت خۆش بێ، ئەگەر راستیش بکەی داوا دەکەم خودا لێم خۆش بێ.

ئەمجار پێغەمبەرﷺ فێری دوعاو پاڕانەوەیەك: دەکا کەوەزعی بەردەوام بوونی بداتێ بۆ پابەند بوون لەسەر ئەو رێبازە پەسـەندەو دەفـەرموێ: ﴿وَقُـلْ رَبِّ أَعُـوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَنْ يَحْضُرُونِ﴾ بڵێ: خودایە من پەنا دەگرم بــەتۆ لەوەسوەسـەو دەنەدەنـەو ختۆکـەی شـەیاتینی یـەکان، پـەنا دەگـرم بـەتۆ کەنەتوانن هەڵم بخەڵەتێننو هانم نەدەن بۆ سەرپێچی فـەرمانی تـۆ، خودایـە پـەنا دەگرم بەتۆ لەوەی ئەو شەیاتینانە ئامادەی کارەکانم بن.

هەر کاتێك بەندە خۆی خستە پەنا خوداوەو خۆی تەسلیمی دەسەڵاتی بێ سنووری کردو پاڕایەوە لێی: کەلەختوکەی شەیاتینی بیپارێزێ، دڵی بەئاگادێ، هەموو کاتێ خودای لەیاد دەبێ، حاڵەتێکی بۆ دروست دەبێ، پابەند دەبێ بەطاعەت کردنی خوداو خۆ پاراستن لەسەرپێچیکردنی فەرمانەکانی.

بێگومان پێغەمبەر ﷺ پەنای بەخودا گرتووە لەوەی شەیاتینی ئامادەی کارەکانی بن، بەتایبەتی لەکاتی نوێژ کردنو قورئان خوێندنو مردن دا.

هەروا فەرمانی بەموسوڵمانان کردوە: کەلەسەرەتای کردنی هەر کارێك (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) بکەن. لەکاتی نان خواردنو جیماعو سەربڕینی ئاژەڵو پەلەوەردا.....هتد.

ئەبوداود ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (اللهم انی أعوذ بك من الهرم، وأعوذ بك من الهدم ومن الغرق، وأعوذ بك ان یتخبطنی الشیطان عند الموت) خودایە پەنا دەگرم لەپیریەتیەك بگاتە ئەندازەی پوڵکان، پەنا دەگرم لەوەی خانووم بەسەردا بڕمێ یان بخنکێم، هەروا پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی شەیتان لەکاتی مردن دا دەستم لێ بوەشێنێ. ئیمام ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیذیو نەسائیو بەیهەقی لەعەمری کوڕی شوعەیبەوە لەباپیریەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ چەند رستەو وشەیەکی فێر کردبووین، لەکاتی نوستن دا بۆ ترس دەمانخوێند (بسم الله أعوذ بكلمات الله التامە من غضبە وعقابە ومن شر عبادە ومن همزات الشیاطین، وان یحضرون) عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ عادەتی وابوو هەر منداڵێکی گەورە ببوایە، ئەم دوعایەی فێر دەکرد بۆ ئەوەی لەکاتی نوستن دا بیخوێنێ، ئەو منداڵانەشی: کەهێشتا فامیان نەکردبووەوە نەیاندەتوانی لەبەریان بکەن بۆی دەنووسینەوە لەملی دەکردن. [٣٠]

---

([٣٠]) ئەم ریوایەتە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە: کەنوشتە کاریگەری هەیە..

## کافرو تاوانبار لەکاتی مردندا ئاواتە خوازی ئەوەیە بیگەڕێننەوە بۆ ژیانی دونیا بۆئەوەی کردەوەی چاك بکا

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار حاڵی موشریکەکانی بەیان کرد، ئەمجار باسی حاڵو سەرەمەرگیان دەکا، چونکە لەوکاتەدا ئاواتە خوازی ئەوەن بگەڕێنەوە بۆ ژیانی دونیا، بۆ ئەوەی کردەوەی چاك ئەنجام بدەن، بەڵام ئاواتەکەیان نایەتەدیو دوعاکەیان گیرا نابێ!

ئەمە حاڵی ئەو کەسەیە: کە لەگیانەلآدایەو خەریکە گیانی دەرچێ، جا چ کافر بێ یان موسوڵمانی تاوانبارو کەمتەرخەم. دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ، لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ﴾ کە ئادەمیزادی کافر یان موسوڵمانی لەخودا یاخیو کەمتەرخەم لەمردن نزیك بووەوە، ئەو شوێنو عەزابەی بینی: کەچاوەڕوانیەتی، داوای گەڕانەوە دەکا بۆ دونیا، دەیەوێ کەمێکی تر مردنی بۆ دوا بخرێ، بۆ ئەوەی کردەوەی چاك بکا، کارە خراپەکانی بسڕێتەوە، خودا لەخۆی رازی بکا طاعەتو بەندایەتی بۆ خودا ئەنجام بدا، مافی خەڵك بداتەوە، ئەرکی سەرشانی بەجێ بێنێ، دەڵێ: خودایە بمگێڕەوە بۆ ژیانی دونیا، ئەمن هەڵەکانی خۆم راست دەکەمەوە، کاری چاکە دەکەمو خۆم لەسەرپێچی کردن دوور دەخەمەوە.

بێگومان ئەم هەڵوێستو ژێوان بوونەوەیە، دوعا کردنو پاڕانەوە بۆ ئەوەی بیانگێڕنەوە بۆ ژیانی دونیا، لەکاتی سەرەمەرگو عەزاب بینین داو لەکاتی زیندو بوونەوەو لەوەختی حیسابو لێکۆڵینەوەو لەکاتی رانواندن بۆ سەر ئاگری دۆزەخ

دەبیّ ئـەم واقیـعو روداوە لەقورئانـدا چـەند جار دووبـارە کراوەتـەوە. هـەرجارەو بەئوسلوبیّك ئاماژەی بۆ کراوە. وەکوو دەفەرمویّ: ﴿وَأَنذِرِ النَّاسَ يَوْمَ يَـأْتِيهِمُ الْعَـذَابُ فَيَقُولُ الَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَا أَخِّرْنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ الرُّسُـلَ أَوَلَـمْ تَكُونُـواْ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾ (ابراهيم/٤٤) یـان دەفـەرمویّ: ﴿يَـوْمَ يَـأْتِي تَأْوِيلُـهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاء فَيَـشْفَعُواْ لَنَـا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْـرَ الَّـذِي كُنَّـا نَعْمَـلُ﴾ (الاعـراف/٥٣) یـان دەفـەرمویّ: ﴿وَلَـوْ تَـرَى إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُو رُؤُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْـصَرْنَا وَسَـمِعْنَا فَارْجِعْنَـا نَعْمَـلْ صَـالِحاً إِنَّـا مُوقِنُونَ﴾ (السجدة/١٢) یـان ﴿وَلَوْ تَرَىَ إِذْ وُقِفُواْ عَلَـى النَّـارِ فَقَـالُواْ يَـا لَيْتَنَـا نُـرَدُّ وَلاَ نُكَذِّبَ بِآيَاتِ﴾ (الانعام/٢٧) یان ﴿وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَى مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ (الشوری/٤٤) یـان ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَـلْ صَـالِحاً غَيْـرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ (فاطر/٣٧).

بەڵێ؛ ئەوە دیمـەنی کـاتی گیانەڵایـە، کـاتی روو بـەڕوو بوونـەوەی مردنـە، یـان دیتنـی ئـاگری دۆزەخـە، هەوڵـدانی بـێ هودەیـە بـۆ گەڕانـەوە بـۆ ژیـانی دونیـا، بـۆ ئەوەی بەخۆیدا بچێتەوە، هەڵەکانی ژیـانی دەربـارەی خـودی خـۆیو مـاڵو منـداڵی راست بکاتەوە!

هەڵبەتـە ئـەم داواکارییـە بـۆ گەڕانـەوە بـۆ دونیـا تایبـەت نیـە بـەکافرو موشـریکەکانەوە، بـەڵکوو موسـوڵمانانی کەمتەرخـەمیش دەگرێتـەوە وەکـوو لەئایـەتێکی تـردا ئامـاژە بـەوە دەکـاو فـەرمان بەموسـوڵمانان دەکـاو دەفـەرمویّ: ﴿وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُـولَ رَبِّ لَوْلَـا أَخَّرْتَنِـي إِلَـى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ (المنافقون/١٠) ئـەمجار پـەروەردگار رەدیـان دەداتەوە بەڵام رەددەکە ئاڕاستەی رەجاکارەکان ناکا، بـەڵکوو بەشـێوەیەکی گـشتی بەبەرچاوی مەخلوقاتەکەوە رایدەگەیەنیّو دەفەرمویّ: ﴿كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَـا﴾ نەخەیر بەتەما ئەوەنەبن: کەداوا کارییەکەیان بێتەدی، ئەوە قسەیەکەو دەبیّ ئـەو بیڵیّ: وشـەو رسـتەیەکە هـەموو تاوانبارێـك: کەدەکەوێتـە سـەرەمەگو گیانـەڵاوە ناچارە دەیڵیّ: بەڵام بیّ سوودە. وشەیەکی بیّ مانـاو نامەعقوولە، هـیچ گرنگـی پـیّ

نادرێ، گرنگی بەبێژەرەکەی نادرێ چونکە، قسەی کاتی ترسە، قسەی دڵسۆزو تۆبەکار نیە. تەنانەت لەفەرزی محاڵ دا ئەگەر بشگەڕێندرێنەوە بۆ ژیانی دونیا، چاك نابن‌و عار نانێن وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ (الانعام/٢٨) ئەمجار ئەم جۆرە ئادەمیزادانە لەنێوان تاریکی‌و تەنگانەی‌کاتی گیانەلاوو گەڕانەوە بۆ ژیانی دونیایان، لەبەردەمیان دا کۆسپ‌و تەگەرەی جۆراو جۆر هەن، کار لەکار ترازاوەو ڕێگای گەڕانەوە نەماوە، پەیوەندیی بەژیانی دونیاوە پچڕاوە، ژیانی بەرزەخ بووەتە حاجیزو لەمپەر، هەرکەسێ دەچێتە ژیانی بەرزەخییەوە، تا ڕۆژی قیامەت لەوێدا دەمێنێتەوە، ﴿وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ لەپێشیانەوە ژیانی بەرزەخ هەیە، ئەوان لەو ژیانەدا، بەئەهلی دونیا لەقەڵەم نادرێن‌و ئەهلی قیامەتیش نین، لەو ناوەندە دەمێننەوە تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە.

ئەمە هەڕەشەی بەعەزابی بەرزەخ تێدایە بۆیان‌و لەهەمان کات دا نائومێد کردنیانە لەگەڕانەوە بۆ دونیا، چونکە ئەوان لەوکاتەدا: کەهێشتا هەندێك ژیانیان ماوەو گیانیان تێدا ماوە ڕێگای گەڕانەوەیان نەبێ، دیارە پاش مردن‌و چوونە ناو ژیانی بەرزەخییەوە بەتەئکید ناگەڕێندرێنەوە.

بەڵکوو بەرەو ژیانی قیامەت هەنگاو هەڵدەنێن بەرەو ئەو ڕۆژە سامناکەو عەزابی جۆراو جۆری دەچن، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مِن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ﴾ (الجاثية/١٠) یان ﴿وَمِن وَرَآئِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ (ابراهيم/١٧).

بەکورتی مەبەست بە ﴿إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ ئەوەیە: کەسزادانی ئەوانە لەڕۆژی مردنیانەوە لەگۆڕدا تا ڕۆژی زیندوبوونەوەی قیامەت بەردەوامە، لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە دەفەرموێ: (القبر اما روضة من رياض الجنة، او حفرة من حفر النيران) گۆڕ یان باخێکە لەباخەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لەچاڵەکانی دۆزەخ. لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە دەفەرموێ: (فلا يزال معذباً فيها) واتە: بەردەوام سزا دەدرێ لەزەویدا واتە: لەگۆڕدا.

**تەرازووو پێوەری رزگاربوون لەحیسابو لێکۆڵینەوەی قیامەتدا**

﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم

﴿مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ١١٠ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ١١١﴾

لەوەپێش ئاماژەی بۆ رۆژی قیامەت کرد، ئەمجار حاڵو وەزعی ئەو رۆژە باس دەکاو ئەوە دوپات دەکاتەوە: کەلەو رۆژەدا بنەماڵەو رەگەز چ دەورێکیان نیە، چاکەو خودا پەرستی دەبنە هۆی بەمراز گەیشتنو خراپەکاریو ستەم هۆکاری چوونە ناو دۆزەخو بەدبەختین.

دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلا يَتَسَاءَلُونَ﴾ کەجاری دووەم فوو بەکەرەنای صووردا کرا گیانەکان چوونەوە ناو جەستەکانو ئادەمیزادان لەگۆڕەکانیان رابوونەوە، ئەوکاتە نەسەبو رەگەزو خزمایەتی دادی کەس نادا، ئەو پەیوەندییو قیەمانەی لەدونیادا لەناویان دا باو بوو چ رۆڵێکیان نامێنیٚ! سەرسامیو ترسو لەرز دایان دادەگرێ، کەس کەسی وەبیر نایەتەوە، هەرکەسە بیر لەسەرەنجامی خۆی دەکاتەوەو بەخۆیەوە مەشغوڵە، باوك کوڕی ناناسێتەوەو، برا لەبرا رادەکا، ژنو مێرد لەیەکتر نەبان دەبنو هەموو خزمو کەسو کار لەبەر یەکتر هەڵدێن. وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ، وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ، وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ، لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ﴾ (عبس/٣٤-٣٧) کابرا خزمو کەسو کاری دەبینی پرسیاری لیٚ ناکا، ناپرژیٚ پرسیاری لیٚ بکا. وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەوە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيماً، يُبَصَّرُونَهُمْ﴾ (المعارج/١٠-١١)

ئەمە لەکاتی زیندو بوونەوەو حیسابو لێکۆڵینەوەدایە. ئەگینا پاش لێك جیاکردنەوەی بەهەشتیو دۆزەخییەکانو جێگیر بوونیان، وەسەر خۆ دەکەونەوە، ئەهلی بەهەشت هەندێکیان پرسیار دەکەن، رو دەکەنە یەکتریو وەزعو حاڵی یەکتری دەپرسن. وەکوو لەشوێنێکی تردا ئاماژە بەئەمە دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾ (الصافات/٢٧).

ئەمجار دەست دەکا بە رونکردنەوەی حالّی بەختەوەران‌و بەد بەختەکان، دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ جا کەسێك لەتەرازووی ئەعمالدا چاکەکانی لەخراپەکانی قورستر بن، ئەوانە بەمراز گەییشتوون‌و لەدۆزەخ رزگاریان دەبێ‌و بەبەهەشت شاد دەبن! ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوکەسەیش خراپەکانی لەکردەوە باشەکانی قورستربن، ئەوە ئەوانە خەسارەتمەندن‌و بەفتارە چوون، لەمامەڵەکەیاندا خەساریان کردوە، شوێنی خۆیان لەبەهەشتدا لەدەست داوەو بەموسوڵمانانی تر براوە، ئەوانە خودی خۆیان لەدەست داوە، جا کەسێك خۆی لەکیس چووبێ، مانای وایە هەموو شتێکی لەدەست داوە، هیچی نەماوەتەوە. واتە:

﴿فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾ لەدۆزەخ دا بۆ هەتا هەتایی دەمێننەوە، دەرچوونیان نیە.

﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ﴾ ئاگر دەم‌و چاویان دەسوتێنێ. سووتانەکە هێندە گاریگەرە گۆشت‌و پێستیان هەڵدەقرچێنێ‌و هیچی پێوە ناهێڵێ، بۆیەش بەتایبەتی باسی دەم‌و چاویانی کرد، چونکە دەم‌و چاو رێزدارترین شوێنی ئادەمیزادە. ﴿وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ﴾ ئەوانە بەهۆی سووتان‌و هەڵقرچانیان دەم‌و چاویان دەشێوێ، لێوەکانیان هەڵدەقرچێن دەم‌و ددانیان داناپۆشن، روخسارو دیمەنیان هێندە ناشیرین دەبێ خۆیان لەخۆیان دەترسن.

ئەمجار ئوسلوبەکە لەغائیبەوە دەگۆڕێ بۆ خیطاب‌و ڕوبەڕوو بوونەوە، دەست دەکا بەسەرزەنشتکردنیان بەجۆرێك عەزابە حیسسیەکە وێڕای سامناکی‌و فەظاعەتکاری لەو سەرزەنشت و لۆمە کردن‌و ریسوا بوونە سووکترە بەلایانەوە، لەکاتێك دا ئەوان لەو عەزاب‌و ئەندێشەیەدان، پەروەردگار بەتوڕەیی‌و سەرزەنشکردنەوە پێیان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ ئیستفهامەکە بۆ چەسپاندن‌و تەقریرە، واتە: بێگومان، پێغەمبەرم بۆ ناردون، نامەی ئاسمانیم بۆسەر نازڵ کردون، شەریعەت‌و یاسای پەسندی خۆمم پێ راگەیاندون، شوبهەو گومانم لێ رەواندبوونەوە، بەڵگەو دەلیلتان بەدەستەوە نەمابوو، کەچی وێڕای ئەوەش ئایاتی ئێمەتان رەتکردەوەو پێغەمبەرتان بەدرۆ خستەوە، پشتتان لەپەیامی ئێمە هەڵکرد.. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ:

﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ، قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾ (الملك/٨-٩).

بەشێوەیەکی گشتی دابو نەریتی خودا واهاتووە هەتا پێغەمبەر بۆ گەلو نەتەوەکان نەنێرێو نەیانترسێنێ لەعەزابو مۆژدەی بەهەشتیان پێ نەدا، بەرپرس نابنو عەزابیان نادا وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ (الاسراء/١٥)

پێغەمبەر دەنێرێ شەریعەتو یاسای پێدا رەوانە دەکا، موژدەی بەهەشتیان پێ دەدا ئەگەر پابەندی پەیامەکەی بن، لەئاگری دۆزەخ دەیاترسێنێ ئەگەر سەرپێچی بکەن، بەمەش بیانوویان دەبڕێ وەکوو دەفەرموێ: ﴿لِئَلاَّ يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ (النساء/١٦٥)

لێرەدا وەڵامی پرسیارەکە دەدەنەوە، دان بەتاوانباریی خۆیان دا دەنێن. ﴿قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْماً ضَالِّينَ﴾ دەڵێن: ئەی خودای ئێمە! لەززەتو ئارەزوومان بەسەرمان دا زاڵ بوو، ئامادە باشی وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاریی پێغەمبەرمان تێدا نەبوو، شوێن هیدایەتی فروستادەکانی تۆ نەکەوتین، تاحاڵمان بەم حاڵە گەیشت! ئێمە گەلو نەتەوەیەکی گومڕابووین، ڕێگای حەقو ڕاستیمان گوم کرد. ددان بەتاوانی خۆمان دادەنێین، ئایا ڕێگا چارەیەکمان دەست دەکەوێ بۆ رزگار بوون!؟ وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ؟﴾ (غافر/١١). ئیعتراف بەتاوانباری خۆیان دەکەن ئەمجار دەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ﴾ خودایە! لەم ئاگرە سامناکە سوتماکە رزگارمان بکە، بمانگێڕەوە بۆ دونیا، ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ هەڵوێستو کردەوەی رابردومان، ئەوە بێگومان ئەو کاتە ستەم لەخۆمان دەکەینو شیاوی هەموو سزاو عەزابێکی دۆزەخین. ئەمجار پەروەردگار وەڵامیان دەداتەوە ـ قورطوبی دەڵێ: دوای هەزار ساڵ وەڵامیان دەداتەوە ـ ﴿قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ چەڵتە چەڵت مەکەن! لەدۆزەخ دا بمێننەوە زەلیلو ریسواو مەنتوك، بێدەنگ بنو ئەو داوایە جارێکی تر دووبارە مەکەنەوە، چونکە وەڵامتان نادەینەوە، تازە ناشگەڕێندرێنەوە بۆ جیهانو بەتەما ئەوە مەبن! ئەمجار هۆی عەزابدان روون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ ئەوە بوو كۆمەڵێك لەبەندە موسوڵمانەكانی من لێم دەپاڕانەوە؛ دەیانگوت: خودایە ئیمانمان هێناوە، بڕوامان بەتاكو تەنهایی تۆ هەیە، شوێن پێغەمبەركەت كەوتوین، پابەندی پەیامی تۆ بووین، خودایە! لەتاوانەكانمان خۆشبە، بەزەییت بەزەعیفیو لاوازییو بێ دەرەتانیمان دا بێتەوە، بێگومان تۆ باشترین خاوەن بەزەییت.

﴿فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيّاً حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي﴾ ئێوە ئەوانەتان كردبووە گاڵتەچی خۆتان، قەشمەریتان دەكرد بەدوعاو پاڕانەوەكەیان، هەتا واتان لێ هات یادی منتان لەبیر چووە، هیچ گرنگیتان بەلایەنی خودا نەدا، ترسی عەزابی ئێمەتان نەبوو، ﴿وَكُنتُمْ مِنْهُمْ تَضْحَكُونَ﴾ كە ئەو موسوڵمانانە لەخودا دەپاڕانەوە ئێوە پێكەنینتان پێیان دەهات، گاڵتەتان بەهەڵسو كەوتو عیبادەتیان دەكرد، وەكوو لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُواْ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ، وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ﴾ (المطففين/۲۹-۳۰) ئەمجار پەروەردگار پاداشی ئەو موسوڵمانە گاڵتە پێكراوانە دیاری دەكاو دەفەرموێ: ﴿إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ ئەمن ئەمڕۆ پاداشیان دەدەمەوە بەمراز گەییشتنو لەززەتو خۆشی بەهەشتی رازاوەو رزگار بوونیان لەئاگری دۆزەخ، ئەمجار موسوڵمانەكان قەشمەری بەو كافرو موشریكو گاڵتەكەرانە دەكەن، وەكوو لەئایەتێكی تردا ئاماژە بەوە دەكاو دەفەرموێ: ﴿فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُواْ مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ، على الأرائك ينظرون، هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ﴾ (المطففين/۳٤-۳٦) ئەمجار دوای ئەم ڕەتدانەوە توندو تیژە، پاش ئەم دەمكوت كردنو ریسوا كردنە پاش رونكردنەوەی ئەو هۆیانەی بوونە تووشبونیان بەم عەزابو سزا سامناكە. جەولەیەكی تر لەوتو وێژ دەست پێ دەكا، بەجۆرێكی تر سەركۆنەیان دەكرێ؛ وەكوو لەمەودوا ئاماژەی پێ دەكا.

## تەمەنکورتی ژیانی دونیا، سزادانی موشریکەکانو ڕەحم کردن بەموسوڵمانان

﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾

لەوەپێش ئینکاری کردنی موشریکەکانی بۆ زیندو بوونەوە ڕاگەیاند، ئەمجار لێرەدا باسی ئەوە دەکا: ڕۆژی قیامەت پرسیاری سەرزەنشت ئامێزیان ئاراستە دەکرێ، دەربارەی مانەوەیان لەسەر زەوی!! ئەمجار بەڵگەیەکی تر لەسەر زیندوبوونەوە دەهێنێتەوە، پاشان فەرمان دەکا بەپێغەمبەر کەداوای لێخۆشبوونو ڕەحمو بەزەیی خودا بکا، بەمەبەستی فێرکردنو شارەزا کردنی ئوممەتەکەی! دەفەرموێ: ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ؟﴾ پەروەردگار یان فریشتەی ڕاسپێراو بەپرسیار لێکردنیان لێیان دەپرسێ، ماوەی ژیانی دونیاتان چەند بووە؟

مەبەست بەم پرسیارە سەرزەنشتکردنو دەمکوت کردنو ریسوا کردنیانە، ئاگادار کردنەوەیانە لەسەر ئەوەی؛ کەئەو دونیایەی پێیان وابوو: برانەوەی نییە، چەند تەمەن کورتو چەند بەخێرایی تێپەڕی!! ئیتر ئەوکاتە پەنجەی پەشیمانی دەگەزنو بۆیان دەر دەکەوێ چەند هەڵە بوون. بۆیان ئاشکرا دەبێ کەچییان بە خۆیان کردوە، چۆن ژیانی بەختەوەرانەی هەتا هەتایی و خۆشبەختییان لە کیس خۆیان داوە، دەزانن ژیانی دونیا چەند کورت و پووچو بێ بایەخ بووە، ئەوان نائومێدو تەنگە تاوو بێ دەرەتانن، ماوەو چەندییەتو چۆنیەتی ژیانی دونیایان بەلاوە مەبەست نیەو بەلایانەوە گرنگ نیە بۆیە: ﴿قَالُوا لَبِثْنَا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ دەڵێن: ئێمە لە دونیادا تەنیا ڕۆژێك یان هەندێك لە ڕۆژێك ماوینەوە، عەزابو ناڕەحەتیەکەیان هێندە ئەستەمە ئەندازەی مانەوەی ژیانی دونیایان لە بیر نامێنێ، نازانن چەندماونەوە، بەهەموو هێز و توانای خۆیانەوە ئەوەندەیان بۆ ساغ دەبێتەوە: کەڕۆژێك یان بڕێك لە ڕۆژێك ماونەوە لە دونیادا.

﴿فَاسْأَلْ الْعَادِّينَ﴾ ئەگەر بڕوامان پێ ناکەن دەپرسیار لە ژمێریاران بکەن، پرسیار لەو فریشتانە بکەن: کە سەر ژمێری کردوەو تەمەنی ئادەمیزادیان کردوە!! ئەمجار وەڵامیان دەدرێتەوە بەوە: کەژیانی دونیاتان بەنیسبەت ئەو ژیانەی بەرەو پیری دەچن ماوەیەکی کورتو کەم بووە، دەفەرموێ: ﴿قَالَ إِنْ لَبِثْتُمْ إِلاَّ قَلِيلاً لَوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ فریشتەی تایبەت پێیان دەڵێ: ئێوە جگە لەڕۆژگارێکی کەم لەدونیادا نەماونەوە، ژیانی دونیاتان لەبەرامبەر ئەو ژیانە نەبڕاوەی بەرەو پیری دەچن ماوەیەکی کەم بووە ئەگەر ئێوە بەجوانی مەزندەی شت بکەن!! یان وەڵامی (لو)ە شەرطییەکە مەحذووفە، واتە: ئەگەر ئێوە شتێکتان لەزانیاری بزانیایە ژیانی نەبڕاوەتان هەڵدەبژارد بەسەر ژیانی کورتی بڕاوەی دونیادا، هەروەها هەوڵتان دەدا بۆ ئەوەی کارێك بکەن خودا لەخۆتان رازیی بکەن، بەصەبرو ئارام دەبوون لەسەر طاعەتو خودا پەرستی وەکوو موسوڵمانانی ترو ئێوەش وەکوو ئەوان بەمراز دەگەیشتن.

ئیبنوئەبی حاتەم لەئەیفەعی کوڕی (عبدالکلاعی) یەوە: کەو تاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ان الله اذا دخل أهل

الجنة الجنة وأهل النار النار، قال: يا أهل الجنـة، كـم لبثـتم فـى الأرض عـدد سـنين؟ قالوا: لبثنا يوماً أو بعض يوم قال: لنعم مـا أتجـرتم فـى يـوم او بعـض يـوم، رحمتـى ورضوانى وجنتى، أمكثوا فيها خالدين مخلدين! ثم يقول: يا أهل النار، كم لبثتم فى الأرض عدد سنين؟ قالوا: لبثنا يوماً او بعض يـوم فيقـول بئـسما أتجـرتم فـى يـوم أو بعض يوم، نارى وسخطى، أمكثوا فيها خالدين مخلدين).

ئەمجار جارێکی دی دەگەڕێتەوە سەر سەرزەنشکردنیان‌و دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ﴾ ئـەی بەدبەختینـە! ئایـا گومانتـان وابـوو: کەئێمـە ئێوەمـان دروسـت کـردوە بـەبێ نیـازو بـەبێ هـودە دروسـتمان کـردون؟ واتانزانی ئێمە هەروا (بەلام سەرلایی) ئێوەمان بەدیهێناوە؟ نەخەیر ئێمە ئێوەمان هێناوەتە گورەپانی بوونەوەو ژیانمان پێ بەخشیون، عـەقڵ‌و هۆشمـان پـێ داون بـۆ ئەوەی پاڵفتەتان بکەین، زانست‌و زانیاری فێرببن، بـەرەو ژیـانێکی کامـڵ هـەنگاو هـەڵبێنن، بۆیـە دروسـتکراون خـودا پەرسـتی بکـەن، پابەنـدی فـەرمان‌و جڵـەو گیرییەکانی پەروەردگارتان بن، فەرمانی خودا لەسـەر زەوی جێبـەجێ بکـەن. ئایـا پێتـان وابـوو ئێـوە دوای مردنتـان بـۆلای ئێمـە ناگەڕێنـەوە؟ واتانـدەزانی حیـساب‌و لێکۆڵینـەوەتان لەگـەڵ دا نـاکرێ؟ هـەروا بـەخۆڕایی دروسـت کـراون؟ دەبوایـە بتانزانیبایـە حیکمـەتی زینـدوو بوونـەوە لەحیکمـەتی بـەدیهێنان دایـە، لـەکاتی دروسـت کردنتـان دا حیـسابی مـردن‌و زیندوبوونەوەشـتان کـراوە، پەیـدا بـوونی قیامـەت بەرچـاو گـیراوە، ئاکامەکـەی لای ئێمـە دیـاری کـراوە. زینـدوو بوونـەوە ئەڵقەیەکـە لـەزنجیرەی دروسـت کـردن‌و بـەدیهێنان، بـەو زیندوبوونەوەیـە دروستکردنی یەکەمجار تەواو دەبێ‌و بەئاکام دەگا. کەسێك بێ عەقڵ‌و هۆش نـەبوو بێ لەم حەقیقەتەبێ ئاگا نەدەبوو!

﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ پـاك‌و بـەرزو شکۆمەندە خودای خاوەن‌و فرمانڕەوای ڕەهاو بێ سنوور، ئەو خودایەی هەر هەبوە هـەر دەبـێ، زۆر بـەرزو شـکۆمەندە لـەوەی کـاری بێهـودە بکـا، بـەخۆڕایی ئێـوەی بـەدیهێنا بـێ، چونکە بێگومـان خـودا زۆر لـەوە دوورە بەهەوانتـە ئێـوەی دروسـت

کردبێ! هیچ خودا نین جگە لەئەو، ئەو خاوەنی عەرشی گەورەو پانو بەرینە، ئەو عەرشەی یاسای بوونەوەری تێدا نەخشە کێش دەکرێو بەڕێوە دەچێ.

﴿وَمَنْ يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ﴾ هەرکەسێك لەتەك خودادا عیبادەت بۆ خودایەکی تر بکا، هاوەڵی بۆ دابنێ، خودایەك بپەرستێ کەشیاوی پەرستن نیە، هیچ بەڵگەو دەلیلیشی لەسەر بیرو باوەڕەکەی لانەبێ بەتەئکید لاشی نیە، ئەوە ﴿فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِنْدَ رَبِّهِ﴾ بێگومان سزای کردەوەکانی، تۆڵەی ئەو تاوانەو تاوانەکانی تری لای بەدیهێنەرو خودای خۆیەتی، ئەو دەزانێو دەتوانێ سزای پڕاو پڕی بداتەوە..کەسێك ئیدیعای هەبوونی خودایەکی تر بکا، بەڵگەی کەونیو سروشتیو عەقڵی لەسەر باوەڕەکەی نەبێ بێگومان ئیدیعای شتێکی بەتاڵی کردوە، ناکامەکەشی دیارو ئاشکرایە، سزاکەی مسۆگەرو ئامادە کراوە، بڕیاری خودایەو گۆڕانی بەسەردا نایە، دابو نەریتی پەروەردگارەو جێبەجێ دەبێو دێتەدی ﴿إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾ بێگومان شەئنو حاڵ ئەوەیە: کافرو موشریکەکان بەمراز ناگەنو نازو نیعمەتی بەهەشتیان دەست ناکەوێ، لەسزای دۆزەخ رزگاریان نابێ.

سەیری دارشتنی قورئان بکە چۆن لەسەرەتای سورەتەکەدا فەرموی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ لەکۆتاییشی دا پێچەوانەکەی هێنا ﴿إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ﴾.

ئەمجار فەرمان بەپێغەمبەر ﷺ دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَقُلْ رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ﴾ بڵێ: خودایە! لێم خۆشبەو رەحمم پێ بکە، ئەتۆ باشترین خاوەن رەحمو بەزەییت، لەتاوانەکانم خۆشبە، کەمو کوڕیەکانم داپۆشە، تۆبەو پەشیمان بوونەوەم لێ وەرگرە، لەسزای دۆزەخ بمپارێزە، بێگومان زاتی پاکت خاوەن رەحمو بەزەیی یە بۆ بەندەکانت.

ئیمامی بوخاریو موسلیمو تیرمیذیو ئیبنو حیبان، ریوایەتیان لەئەبو بەکرەوە کردوە دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەرم کرد؛ ئەی پێغەمبەری خودا! دوعایەکم فێر بکە لەنوێژدا پێی بپاڕێمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڵێ: (اللهم انی ظلمت نفسي ظلماً كثيرا، وأنه لايغفر الذنوب الا أنت، فاغفر لي مغفرة من عندك، وارحمني، انك انت الغفور الرحيم).

ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سوورەتەکە بەئایەتی شیفا مەشهورن ئیبنو ئەبی حاتەم لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: بەلای کابرایەکی نەخۆش دا تێپەڕیم ئایەتی ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً.....﴾ تاکۆتایی سورەتەکەم بەسەردا خوێند، چاك بووە، جائیبنو مەسعود ﷺ ئەم رووداوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: چیت بەگوێیدا خوێندەوە؟ ئەویش پێی دەڵێ فلان ئایەتو فلان ئایەت، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر پیاوێك بەبڕواوە بەسەر کێودا بخوێنێتەوە کێوەکە لادەبا. ئاشکراشە ئەمە کاتێك کاریگەر دەبێ کەخوێنەرو نەخۆش هەردوکیان ئیمانیان پتەو بێو بڕوایان پێ بێ. [1]

**بەیارمەتی خودا سورەتی (المؤمنون) کۆتایی هات**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## سورەتی النـور

ئەم سورەتە ناوی سورەتی (النور)ی لێ نراوە چونکە رێگای ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ ئادەمیزاد روندەکاتەوە، هەروەها چونکە ئایەتی (المشرقة) پرشنگداری لەخۆ گرتووە: کەئەویش ئایەتی ژمارە (٣٥) ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ یە بەنووری خودا ئاسمانەکانو زەوی روناکە، بەنووری خودا سەر لێشێواو گومڕایان رێبازی راستی ژیانی دونیاو قیامەت دەدۆزنەوە.

[1] شایانی باسە کۆمەڵێك لەعولەما ئەم فەرموودەیەیان بەزەعیف داناوە (سەیری پەراوێزی تەفسیری قورطوبی . ط/ دار الفكر ج ٣٤٩٧/٦بکە)

**پەيوەندى ئەم سورەتە بەسورەتى (المؤمنون)ەوە لەدوو رووەيە:**

١- پەروەردگار لەسەرەتاى سورەتى (المؤمنون) دا فەرمووى: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ ئەمجار لەم سورەتەدا حوكمو ياسا بۆ ئەوانە ديارى دەكا: كەپارێزگارى عەورەتى خۆيان ناكەنو داوێن پيسى ئەنجام دەدەنو هەرشتێك كەپەيوەنديى بەداوێن پيسى يەوە هەبێ وەكوو بوختانو تەماشا كردنى نامەحرەمو ئيزن وەرگرتن بۆ چوونە ناو مالو فرمان بەژن مارە كردنو جڵەوگيرى لەزەختكردن لەئافرەت بۆ داوێن پيسى......هتد.

٢- لە سورەتى (المؤمنون) دا ئەوەى راگەياند: كەبەهەوانتە ئادەميزادى دروست نەكردوە، بەلكوو بۆيەى دروست كردون عيبادەتى بكەن، پابەنديى فەرمانو جڵەوگيريەكانى بن. ئەمجار لەم سورەتەدا كۆمەڵێك فەرمانو جڵەو گيريى ئاراستەى ئادەميزاد كرد......

لەگەورەيى ئەم سورەتەدا موجاهيد ريوايەت دەكا: دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: (علموا رجالكم سورة المائدة وعلموا نساءكم سورة النور).

حاريثى كوڕى موضەريب دەڵێ: عومەرى كوڕى خەططاب ﷺ فەرمانى پێكردينو بۆى نووسين: كەسورەتى (النساء) و (الاحزاب) و (النور) فێر ببين.

لەخاتوو عائيشەوە ريوايەت كراوە: فەرموويەتى پێويستە ئافرەتان فێرى ئەم سورەتانە ببن.

ئەم سورەتە زۆر ئەحكامى جۆراو جۆرى دەربارەى خێزان لەخۆ گرتوون. بەپەيڕەوى كردنى خێزانو كۆمەڵ لەروخان دەپارێزرێ!

مەبەستە سەرەكييەكانى ئەم سورەتە لەچوار چێوەى داوێنپاكىو خۆ داپۆشينو حيجاب دا دەسووڕێنەوە، لەسەرەتاوە بەباسى حەددى زينا دەست پێ دەكا، ئەمجار دێتە سەرباسى حەددى بوختانو حوكمى ليعانو سوێند خۆريى ژنو مێرد لەيەكترى، جڵەو گيريى لەو تاوانە رەوشتييانە دەكا، بۆئەوەى كۆمەڵگا لەداوەشانو هەڵوەشانو لێك ترازان بپارێزێو رەگەزو گەراكان تێكەڵ نەبن. ئەمجار چيرۆكى بوختان كردن بەدايكى موسوڵمانان (خاتوو عائيشە) دەگێڕێتەوەو بەڕائەتى ئەو خاتوونە لەو بوختانە رادەگەيەنێ، پاشان كۆمەڵێك ئادابو رەوشتى

کۆمەڵایەتی دەربارەی ژیانی تایبەتی‌و گشتی ئادەمیزادەکان رەنگرێژ دەکاو فەرمان دەکا بەموسوڵمانان پێیەوە پابەند بن. وەکوو روخصەت وەرگرتن لەکاتی چوونە ناو ماڵ‌و دیدەنی کردنی دۆست‌و ناسیاوان، چاو داخستن، پاراستنی شەرمگاو خودا پۆشینی ئافرەت لەئاست نامەحرەمان‌و بێگانەو تێکەڵ نەبوونی نێرو مێ ئەگەر مەحرەم نەبن. هەروا ژن هێنان‌و شووکردن لەنێوان پیاوو ئافرەت دا، کەسێکیش پێویستیاتی ژن هێنانی بۆ دابین نەدەکرا باخۆی بەداوێنپاکی رابگری‌و پابەندی شەریعەت‌و یاسای خودا بی‌و خێزانی موسوڵمان لەتێك روخان بپارێزن.

پاشان سەرنجی ئادەمیزادان رادەکێشێ بۆ بەڵگەو نیشانەکانی هەبوون‌و تەنهایی خودا لەعالەمی بالاو عالەمی پایین دا هەر لەگۆڕانی شەوو رۆژو بارینی باران‌و دروستکردنی ئاسمان‌و زەوی‌و گەردنکەچی هەموو گیانلەبەران بۆ خوای بالادەست‌و بەتوانا.

ئەمجار دەگوێزرێتەوە بۆ وەصف کردنی هەڵوێستی دوو ڕوەکان‌و موسوڵمانە راستاڵەکان بەرامبەر حوکم‌و بڕیاری خودا، ئەوان پشتی لێ هەڵدەکەن‌و ئەمان پابەندی دەبن، هەروا خودا وادە دەدا بەموسوڵمانە خاوەن کردارە باشەکان بەوە: کەجێگیریان دەکا لەزەوی‌دا، ئەمجار دێتەوە سەر رونکردنەوەی حوکمی روخصەت وەرگرتنی نۆکەرو مندالْ بۆ چوونە ژورەوەی ماڵ لەسێ کات دا، هەروەها هەلگرتنی حەرەجو لێپرسینەوەلەسەر ئەوانەی بیانووی رەوایان هەیە بۆ نەچوون بۆ جیهاد هەروا هەلگرتنی حەرەج لەسەر خزم‌و دۆست کەبەبێ پرس لەماڵی خزم‌و ناسیاویان بخۆن بەتێرادیوی، هەروا داب‌و نەرێتی کۆبوونەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و رێزگرتنی مەجلیسی بەئەوپەڕی ئەدەب‌و حیشمەتەوە.

## دیاردەو تایبەتمەندییەکانی سورەتی (النور)

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَـٰهَا وَفَرَضْنَـٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ۝١﴾

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا﴾ ئەمە سورەتێکە بەنیگا ناردومانە بۆ سەر تۆ ئەی پێغەمبەر، هەر حوکمو یاسایەکی تێدایە، بەپێویستمان داناوە پابەندی بنو جێبەجێی بکەن، پەیڕەوی کردنی ئەخلاقو ڕەوشتی جوان تێ یدا واجبو پێویستە وەکوو پەیڕەوی کردنی (حدود) سزادان لەسەر تاوان. هەر حوکمو یاسایەکی تێیدایە وەکوو حوکمی زیناو بوختانو نەفرینو سوێند خواردن لەسەر نەکردنی کاری چاکە، یان ئادابو ڕەوشتی وەکوو ئیزن وەرگرتن بۆ چوونە ناو ماڵو دیدەنی، چاو داخستن لەئاستی بینینی نامەحرەم دا، بەدەرنەخستنی شوێنی جوان لەجەستەی ئافرەت، مارەکردنی ئافرەتو ژنهێنانو شوکردنو داوێنپاکی ئەوانەی ئەو هەلەیان بۆ نارەخسێ، ناچار نەکردنی ئافرەت بۆ ئەوەی ناموس فرۆشی بکا، بەگوێ کردنی پێغەمبەر ﷺ لەهەموو فەرمانەکانی دا، هەموو ئەم حوکمو دابو ڕەوشتانەی تێدا شی کراوەتەوە.

﴿وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ لەم سورەتەدا چەند بەڵگەو نیشانەی ئاشکرامان نازڵ کردون لەسەر تاکو تەنهایی خوداو بەتوانایی‌و دانایی، بۆئەوەی ئێوە یادیان بکەنەوەو بڕواتان بەتاکو تەنهایی‌و بەتوانایی خودا بەهێز بێ، پابەندی فەرمانو جڵەو گیرییەکانی بن پەیڕەوی حوکمو یاساکانی بکەن.

## حوکمو بڕیاری یەکەمو دووەم لەم سورەتەدا حەددی زیناو بڕیاردان بەرامبەر زیناکارەکانە

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُوا كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ

مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئایەتی ژمارە (٣) نەسائی لەعەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: ئافرەتێك هەبوو پێیان دەگوت (أم مهزول) یان (أم مهدون) داوێن پیس بوو، یەکێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ویستی مارەی بکا، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ی نازڵ کرد.

ئەبوداودو تیرمیذیو نەسائیو حاکم لەحەدیثی کوڕی شوعەیبەوە لەباوکیەوە لەباپیریەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ: پیاوێك هەبوو ناوی مەرثەد بوو لەئەنبارەوە کاڵای دەبردە مەککە، ئافرەتێك هەبوو لەمەککە ناوی (عەناق) بوو، مەرثەد ویستی روخصەت لەپێغەمبەر ﷺ وەربگرێ مارەی بکا، پێغەمبەر وەڵامی نەدایەوە، هەتا ئایەتی ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً....﴾ نازڵ بوو، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەمەرثەدی فەرموو: ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً...﴾ لەبەر ئەوە (عەناق) مارە مەکە.

راڤەکەرانی قورئان دەفەرموون: ئایەتەکە یان دەربارەی مەرثەدی کوڕی ئەبومەرثەدی ناوبراو نازڵ بووە، یان دەربارەی کۆمەڵێك لەکۆچکاران نازڵ بووە: کەداوای روخصەتیان لە پێغەمبەر ﷺ کرد: رێگەیان پێ بدا ئافرەتی جوولەکەو مەسیحی داوێن پیسو کۆیلە مارە بکەن کەلەناو مەدینەدا هەبوون. ئیتر پەروەردگار لەشانی ئەوان دا ئەو ئایەتەی نازڵ کرد.

دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ حەدی زیناکەر لەسەرەتای ئیسلامدا ئەو حوکمو یاسایە بوو: کەلەسورەتی (النساء) دا دەفەرموێ: ﴿وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمْ فَاسْتَشْهِدُواْ عَلَيْهِنَّ أَرْبَعةً مِّنكُمْ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّىَ يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً﴾ (النساء/١٥)

حەددی ئافرەتی زیناکار ئەوە بوو لەماڵەوە بەند دەکرا سەرزەنشت و لۆمەشی دەکرا حەددی پیاوی زیناکەریش سەرزەنش کردن بوو. پاشان پەروەردگار ئەم ئایەتەی ئێرەی نازڵ کرد: کەحوکم و بڕیاری دەربارەی زیناکەران تێدایە، ئەو حوکم و ڕێگا چارەیەی کەلەسورەتی (النساء) دا ئاماژەی پێ کردوو فەرمووی ﴿أَوْ يَجْعَلَ اللَّـهُ لَهُـنَّ سَبِيلاً﴾ لێرەدا رونی کردەوە: فەرمووی: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِـدُوا كُـلَّ وَاحِـدٍ مِنْهُمَـا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ سزادانی ئافرەتی زیناکارو پیاوی زیناکار ئەگەر ئازادو باڵغ و عاقڵ بوون، ئافرەتەکە شووی نەکردبوو پیاوەکەش ژنی نەهێنا بوو، ئەوە هەریەکەیان سەدجڵدی لێ دەدرێ. شایانی سەرنج لێ دانە، لێرەدا لەباسی زینادا ئافرەتی پێش پیاو خستووە کەچی لەباسی حەدی دزی دا پیاوی پێش خستووە، چونکە ڕێخۆشکەرەو دەواعی زینا زۆربەی کات لەئافرەتەکەوە دەبێ، عەیبدار بوونی ئافرەت بەزینا لە لەککەدار بوونی پیاو کاریگەرترە، بەڵام لەکاری دزی کردن دا زوربەی کات لەپیاوەوە دەبێ و ئافرەت کەمتر پێکیشی دەکا. بۆیە لەباسی دزی دا پیاو پێش ئافرەت خراوە. ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کەحەدی زینا لێدانی سەد دارە. بەڵام بەفەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ جوداوازی خراوەتە نێوان ئافرەتی شوو کردو شوونەکردووەوە، هەروا پیاوێک ژنی هێنابێ یان نەیهێنابێ حەدیان جیاوازە. واتە: (محصن)و (غير محصن) حەدی موحصەن ئەو ژنەی شووی کردبێ و ئەو پیاوەی ژنی هێنا بێ بەگوێرەی حەدیثی پێغەمبەر ﷺ بەردەباران دەکرێن تا گیانیان دەدەچێ.

ئەم حوکمە بەگوفت و بەکردەوە لەپێغەمبەرەوە چەسپاوەو بەموتەواتەر ریوایەت کراوە.

بوخاری و موسلیم لەئیبنو مەسعودەوە ﷺ ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لايحل دم امرىء مسلم الا بأحدى الثلاث: الثيب الزاني، والنفس بالنفس، والتارك لدينه، المفارق للجماعة) خوێنی هیچ موسوڵمانێك حەڵاڵ نیە مەگەر بەسێ شت: بێوەژنی داوێن پیس، کەسێك کەسێك بەناحەق بکوژێ، کەسێك لەئایین هەڵگەڕێتەوە. خاوەنی شەش کتێبە حەدیثەکە جگە لەئیبنو ماجە. هەروا ئیمامی مالیك لە (الموطأ) داو ئیمامی ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا

لەئەبو هورەیرەوە، لە زەیدی کوڕی خالیدی (الجهنی) ریوایەتیان کردوە: کەدوو عارەبی دەشتەکی هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەم کوڕەم کرێکار بوو لای ئەم کابرایە، سواری ژنەکەی بووەو زینای لەگەڵ کردوە دوایی مەسڵەتمان کردوە، لەفیدیەی ئەو تاوانەی کوڕەکەم سەد مەڕو ئەمەتەم داوە. دوایی پرسیارم لەزانایان کردوە وتیان کوڕەکەت دەبێ سەد داری حەدی لێ بدرێو ساڵێکیش دەربەدەر بکرێ، ژنی ئەم پیاوەش دەبێ رەجم بکرێ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (والذي نفسي بيده لأقضين بينكما بكتاب الله تعالى: الوليدة والغنم رد عليك وعلى ابنك مأة جلدة، وتغريب، واغد يا أنيس - پیاوێ بوو لەهۆزی ئەسلەم - الى امرأة هذا، فأن أعترفت فأرجمها) سوێندم بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە بەگوێرەی قورئان بڕیار دەدەم بۆتان ئەمەتەکەو سەد مەڕەکەت بۆ خۆتە کوڕەکەت سەد جلدەی لێ دەدرێو ساڵێکیش دەربەدەر دەکرێ. ئەمجار فەرموی: ئەی ئونەیس هەستە بڕۆ بۆلای خێزانی ئەم کابرایە ئەگەر دانی بەزینا کردن دا نا بەردە بارانی بکە. ئونەیس چوو ژنەکە ئیعتراف کردو ئەویش بەردە بارانی کرد!

هەروا کۆمەڵێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەگێڕانەوەی موتەواتەر لێیانەوە ریوایەتکراوە: کەماعیزی کوڕی مالیکی ئەسلەمی لەپێش دەمی پێغەمبەر ﷺ چوارجار ئیعترافی بەزینا کرد، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بەرەجم کردنی.

ئیمامی موسلیمو ئەحمەدو ئەبوداود لەبورەیدەوە ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ: ئافرەتێکی خێڵی غامید، دانی نا بەزینا کردن دا، پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی سکەکەی دانا بەردەبارانی کرد.

خەواریجەکان: رەجم کردن پەسند ناکەن چونکە ناکرێتەنیوە ناگونجێ بکرێتە حەددی ئافرەتی ئازادی شوکردوو، بەڵگەکەیان بەم جۆرە ئاراستە دەکەن، دەڵێن: قورئان حەددی ئەمەتەی داناوە بەنیوەی حەدی ئافرەتی ئازادو فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ (النساء/٢٥) دەی بەردە باران کردن شتێك نیە بکرێتە نیوە.

لەلایـەکی تـرەوە بـەردە بـارانکردن لەسـەر زینـا لـەقورئان دا نیـە، ئایـەتی جەڵدەش هەموو زیناکارێك دەگرێتەوە بەخەبەری واحد تەخصیص ناکرێ. ئەو حەدیثەی حەددی بەرەجم تێدا هاتووەخەبەری واحیدە.

جەماوەری زانایانی ئیسلام رەدی خەواریجەکانیان داوەتـەوە، فەرموویانـە نیـوە کردنی سزا دەربارەی جەڵدەیەو بەس. بۆ رەجم کردنەکە لەسەر شێوەی گشتی خـۆی ماوەتــەوە. لەلایــەکی تــرەوە حوکمــە شــەرعییەکان بــەگوێرەیی روداوو بەرژەوەنـدیی نـازڵ دەبـوون، دەی وێدەچێ ئـەو بەرژەوەندییـەی داخـوازی رەجـم کردن بووە پاش نازڵبوونی ئایەتی جەڵد پەیدا بووبێ.

لەڕویەکی ترەوە بەلای ئێمەوە تەخصیصی عمومی قورئان بەخەبەری واحید دروستە. هەرچـەندە ئـەو حـەدیثانـەی دەربارەی رەجـم ریوایـەت کـراون لـەماناد موتەواتەرن، لەشێوەو شێوازو روخسارو تایبەتمەندی دا خەبەری واحدن.

**زیناکـەر چ ژن بـێ چ پیـاو. ئەگـەر موحـصەن نـەبن رەجـم نـاکرێن. مـەرجی (ئیحصان) چوار شتە:**

١- باڵغ بون.

٢- عەقڵ و هۆش.

٣- ئازادیی.

٤- ئافرەت شووی کردبێ، پیاو ژنی هێنا بێ لەپاش نیکاحێکی صەحیح دخول بوو بێ.

ئەبو حەنیفەو مالیك مەرجی موسوڵمانیشیان داناوە، بـەلای ئەوانـەوە ئیمـی رەجم ناکرێ، بەڵام قسەکەیان رەت کراوەتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فـەرمانی کـرد بەبەرد بارانکردنی دوجوولەکە: کەزینایان کردبوو.

لەسەرێکی ترەوە حەددی کوڕو کچ کەئەمەو ژنی هێنا بێ ئەمەم شوی کردبێ هەر تـەنها سـەد جەڵـدە نیـەو بـەس! بـەڵکوو ساڵێکیش لـەوڵات دوور دەخرێنـەوە، بەگوێرەی ئەو حەدیثەی دەربارەی کوڕە کرێکارەکە، کەلەوە پێش ئاماژەی بـۆ کـرا، کەپێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وعلى ابنك جلد مئة وتغريب عام).

هەروەها بەپێی ئەو فەرموودەیەی خاوەنی شەش کتێبە حەدیثەکان جگە لەبوخاریو نەسائی ریوایەتیان کردوە.

لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ کەدەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خذوا عنی قد جعل الله لهن سبیلا البکر بالبکر جلد مئة وتغریب عام الثیب بالثیب جلد مئة والرجم) وەلێ جەڵدەدان لەبێوەژن بەعەمەلی جێگیر نەبووە لەسوننەتی پێغەمبەردا، ئەوەی تەطبیق کراو جێگیر بوو تەنیا بەردە باران کردن بوو.

دوور خستنەوە لەولات بۆ ماوەی ساڵێك ئەوە رای جەماوەری زانایانە، ئەبوحەنیفە دەفەرموێ: دوور خستنەوە داخڵی حەد نیە، بەڵکو ئەوە تەمبێ کردنێکە دەدرێتە بەر ڕای ئیمام بەپێویستی زانی دەیکا، بەپێویستی نەزانی رای دەگرێ.

بەڵام زانایانی ظاهیری لەسەر ئەوەن: کەبێوەژن دەبێ جەڵدیشی لێ بدرێو بەردە بارانیش بکرێ. ئەوان حەدیثەکەی عوبادەی کوڕی صامیت دەکەنە بەڵگەی رێبازی خۆیان.

ئەوەشمان لەیاد نەچێ ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي﴾ دوو وشەی گشتینو موسوڵمانو کافر دەگرێتەوە، وەلێ کافری حەربی حەددی زینای لێ نادرێ چونکە ئەو پابەندی ئەحکامی ئیسلام نەبوە، بەڵام کافری ذیممی بەلای جەماوەری شەرع زانەوە حەدی زینایان بەسەردا جێبەجێدەکرێ، ئیمامی مالیك لێوەی ریوایەت کراوە: کە ذیممی جەڵدەی لێ نادرێ لەسەر زینا، ﴿وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ﴾ بابەزەییو شەفەقەت پاڵ بەئێوەوە نەنێ حەد لەسەر زیناکەر لابەرن، جێبەجێکردنی حەد لەسەر زیناکەر حوکمی خودایە، نابێ بەهیچ جۆرێ حوکمی خودا رابگیرێو ماتەڵ بکرێ. ئەوەی لەسەر ئێوە پێویستە پابەندی دەقی بڕیاری خودا بنو دەبێ بەرامبەر حوکمو بڕیاری خودا بەغیرەت بن، هەرکەسێ سنووری خودای شکاند دەبێ ئێوە لێی قبووڵ نەکەن.

ئیمام ئەحمەدو خاوەنی شەش کتێبە حەدیثەکان لەعائیشەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: (والذی نفسي بیده لو ان فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت یدها)

سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە: ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکا دەستی دەبڕم!

﴿إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ﴾ ئەگەر ئێوە ئیمانتان بەخوداو بەرۆژی قیامەت هەیە حەد لەسەر زیناکاران ئەنجام بدەن‌و بەتوندیی تۆڵەیان لێ بستێنن، بۆ ئەوەی ئەوان‌و هی تریش تەمێ خواردو بن‌و پەندو عیبرەت وەربگرن، ئەمە هەڵنان‌و تەرغیبێکی زۆری تێدایە لەسەر جێبەجێکردنی حوکم‌و حەدەکانی خودا لەسەر تاوانباران..

لەناوهێنانی رۆژی قیامەت ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کە پێویستە موسوڵمانان لەعەزاب‌و لێکۆڵینەوەی ئەو رۆژە بترسن لەڕوی عەطف‌و بەزەیی یەوە کەمتەرخەمی نەکەن لە جێبەجێکردنی حەدو حوکمی خودا لەسەر تاوانباران.

لەحەدیثی پێغەمبەردا هاتووە دەفەرموێ: (یؤتی بوالٍ نقص من الحد سوطاً، فیقال له لم فعلت ذلك؟ فیقول: یارب رحمة بعبادك فیقول له: أنت أرحم بهم منی! فیؤمر به فی النار) رۆژی قیامەت فرمانڕەوا دەهێندرێ لەدونیادا شوڕکێکی کەم کردۆتەوە لەحەد لێدان، پێی دەگوترێ بۆ وات کردوە؟ دەڵێ: خودایە بەزەییم پێدا هاتنەوە، رەحمم بەبەندەکانی تۆ کردوە، پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ئەتۆ دەرحەقیان لەمن بەرەحم تری! فەرمانی پێ دەکرێ بیبەن بۆ ناو ئاگر.

کەوابێ بابەهیچ جۆرێ بەزەییتان بەواندا نەیەتەوە: کەتاوان دەکەن‌و شیاوی حەد لێدان دەبن، بەتەواوی حەدی شەرعییان لەسەر ئەنجام بدەن.

﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ پێویستە حەد لێ دەرکردنەکەیان بەئاشکرا بێ‌و بەبەرچاوی خەڵکییەوە بێ، باکۆمەڵێك لەموسوڵمانان ئاگاداری حەد لێ دەرکردنەکەیان بن بۆ ئەوەی زیاتر ئازاری دەروونییان بدرێ‌و پتر کاریگەر بێ لەسەریان‌و سزاکەیان توند تربێ.

## زینا بەسێ جۆر دەچەسپێ:

١- بۆخۆی ددان بەتاوانەکەیدا بنێ‌و بەزوبانی خۆی ئیعتراف بکا، لەسەردەمی پێغەمبەرو جێ نشینەکانی دا بەم شێوەیە چەسپاوە.

٢- شایەتیدان چوار پیاوی عادڵو موسوڵمان بەچاوی خۆیان روداوەکە ببینن. ئەم جۆرە زۆر کەم روو دەدا.

٣- ئافرەتەکە بەبێ ئەوەی مێردی هەبێ سکی پربێ.

حیکمەتی دانانی حەد لەسەر زیناکەرانو بەزەیی نەهاتنەوە پێیان دا بۆ پارێزگاری کردنە لەناموسی ئادەمیزادانو پێشێل نەکردنی مافەکانیانە، بەرگری کردنە لەتێکەڵبوونی گەراو گەرچەکی ئادەمیزادان، بۆ دەستەبەر کردنی داوێنپاکیو پاراستنی کۆمەڵە لەزۆر نەخۆشی ترسناك، بۆ ئەوەیە منداڵی بێ باوكو ناشەرعی لەکۆمەڵگادا بڵاونەبنەوە. نەخۆشییە ترسناكو وێرانکارییەکانی وەکوو ئایدزو سفلس بەناو کۆمەڵ دا بڵاوە نەکەن، هەروەها بۆ رێزنان لەئافرەتو پاراستنی دوا رۆژی.

حوزەیفە ﷺ دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی کۆمەڵی ئادەمیزاد! خۆتان لەزینا بپارێزن، چونکە شەش زیانی تێدان سێیان لەدونیاداو سێیان لەقیامەت دان، لەدونیادا پیاو ئافرەتەکە ریسوا دەکا. هەژاری لێ دەکەوێتەوە. تەمەن کورت دەکا، لەقیامەتیش دا نارەزامەندی خوداو حیسابو کیتابی توندو تیژو عەزابی دۆزەخ.

﴿الزَّانِي لا يَنكِحُ إلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً﴾ شەئنو حاڵ وایەدابو نەرێت وایە: کەپیاوی زیناکەرو فاسیقو بێدین هەر حەزی لەوەیە ئافرەتێکی زیناکەری وەك خۆی مارە بکاوببێتە هاوسەری ئافرەتێکی داوێن پیس، کوردی گوتەنی (تەیری گول عاشق بەداری ژەقنەموتە) ئەو جۆرە پیاوانە نایانەوێ ئافرەتی داوێن پاكو خودا پەرست ببێتە هاوسەریان بەڵکوو هەوڵ دەدا ئافرەتێکی بێ ناموسی داوێن پیسی وابکاتە هاوسەری خۆی: کەناموسو حەیای بەلاوە گرنگ نەبێو گوێ نەداتە حیجابو خۆداپۆشین. تێبینی ئەوە دەکرێ لە ئایەتی پێشوودا ﴿وَالزَّانِيَةُ﴾ ئافرەتی داوین پیسی پێش خستووە، لێرەشدا ﴿الزَّانِي﴾ پیاوی داوێن پیسی پێش خستووە. زانایانی تەفسیر بۆ حیکمەتی ئەم پاشو پێش خستنە فەرموویانە: چونکە ئەم ئایەتەی ئێرە باسی نیکاح کردنو داخوازیی دەکا بەرواڵەتیش پیاو لەم بوارەدا دەست پێشخەرەو زوربەی کات داواکردنو خوازبێنی بۆ نیکاح لەپیاوەوە سەر

هەڵـدەدا. وەلـێ لەباسـی زینـادا چـونکە ڕێخۆشـکردن‌و داخوازییـەکانی زینـا لەئافرەتەوە سەر هەڵدەداو ئافرەت پێش خراوە، لەباسی نیکاحیشدا پیـاو خراوەتـە پێش!

﴿وَالزَّانِيَةُ لا يَنكِحُهَـا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُـشْرِكٌ﴾ ئـافرەتی داوێـن پـیس‌و بێـدین پیـاوی موسوڵمان‌و داوێن پاك حەزی لێ نیـەو هـەوڵ نـادا بیکاتـە هاوسـەری خـۆی، بـەڵکوو پیاوی فاسیق‌و بێدین مەیلیان لێیانە. کەوابوو مانای هـەردوو ڕستەکان ﴿الزَّانِـي لا يَنكِحُ إلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً﴾ ﴿وَالزَّانِيَةُ لا يَنكِحُهَـا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُـشْرِكٌ﴾ یـەك نیـەو لێـك جـوداوازن. چـونکە ڕسـتەی یەکـەم ئـەوە دەگەیـەنێ: کـەپیاوی زیناکـار حـەزی لەهاوسەرێتی ئافرەتی داوێن پاك‌و خودا پەرست نیە، بـەڵکوو مـەیلی لـەئافرەتێکی وەك خۆی داوێن پیس‌و بێ دینە.

ڕسـتەی دووەم ئـەوە دەگەیـەنێ: کـەئافرەتی داوێـن پـیس پیـاوی موسـوڵمان‌و داوێن پاك نایخوازێ‌و حەزی لەهاوسەرێتی ئەو جۆرە ئافرەتانە نیە. بەڵکوو پیـاوی بێدین‌و داوێن پیس داخوازی دەکاو هـەوڵ دەدا بیکاتـە هاوسـەری خـۆی. بـەکورتی ئایەتەکە ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە: کەگونجان‌و لێـك تێگەییشتن لـەنێوان هـەردوولادا هەیە، وەکوو دەڵێن: ﴿الجنس الى الجنس يميل﴾ بۆیە ئـەوەتا ئـەمڕۆ ئـافرەتی گـۆرانی بێژو تەمثیل کەر دەیەوێ شوو بکا بەپیاوێکی هاوەمەسلەك‌و هـاوبیری خـۆی هـەروا پیـاوی گـۆرانی بێـژو فـەننان دەگـەڕێ لـەئافرەتێکی وەك خـۆی گـۆرانی بێـژو تـەمثیلکـەر، چـونکە ئـەوان غـیرەو نـاموس‌و حـەیایان بـەلاوە زۆر گـرنگ نیـەو دەیانـەوێ ئـەو جـۆرە بەهایانـە لـەناودا نـەمێنن، بـۆ ئـەوەی بتـوانن پەرەبـەکارە فەنییەکەی خۆیان بدەن‌و پەیوەندیی خێزانیـشیان بـەردەوام بـێ. ئـەگینا پیاوەکـە قبووڵ ناکا خێزانەکەی ببێتە ئەکتەرو لەسـەر شاشـەی تەلـەفزیۆن‌و سـینەماکان دا لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا دەوری ژن‌و مێردایـەتی یـان دڵ‌و دڵخـوازی بگێـڕن. هـەروا ئـافرەتیش قبـووڵ ناکـا هاوسـەرەکەی لەسـەر شاشـەی تەلـەفزیۆن‌و سینەما لەگـەڵ ئـافرەتێکی بێگانـەدا سـنووری عیففـەت‌و خۆپـارێزیی بـشکێنێ.. بـەڵکوو زۆرجـار وادەبێ ئافرەت بەغیرەت ترەو ناتوانێ ئـەو هـەڵس‌و کەوتـە لەهاوسـەرەکەی قبـووڵ بکاو تەرازوو پێوەرەکە لـەم بوارانـەدا هـەبوونی ئـایین‌و پابەنـد بـوون بەئـەخلاقی

بـەرزی ئیـسلامییەوەو هەسـتی ناسـك‌و غـیرەی ئـایینی‌و رەوشـتپاکی‌و نـاموس پارێزییە.

هـەتا ژن‌و مێردەکـە زیـاتر پابەنـدی ئـەخلاقی ئیـسلامی پـیرۆز بـن‌و بـەها ئاینیەکان لەدڵیان دا بەهێزبن، زیاتر ئەو شتەنەشازانە دەبنـە هـۆی نـاکۆکی نێـوان ژن‌و مێـرد. بەپێـچەوانەی پەیوەنـدی نێـوان ژن‌و مێردێـك کەپەیوەندییەکـەیان لەسـەر بنـەمای مـاددی‌و شـەهوانی دادەبەسـتن‌و گرنگـی بەبـەها رەوشـتیە ئیسلامییەکان نـادەن‌و باسی نـاموس‌و رەوشـتی بـەرزیان لـەقاموس دا سـڕیوەتەوە گوێ بەو بەهایانە نادەن!!

بەکورتی ئەوانەی ئەم تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدەن، پەنا بۆ زیناکردن دەبەن، لەو کاتەدا ئەوکارەیە دەکەن موسوڵمان نین، بەڵکوو لەحاڵەتێکی دەروونـی دوور لـە ئیمـان‌و خـودا ناسـی دا ئەوکارەیـە دەکـەن، هەڵبەتـە دوای ئەنجامـدانی ئـەو کـارە ناشـیرینەو کەسـێك تـاوانی ئـاوای لێ بوەشـێتەوە شـایانی ئـەوە نیـە ئـادەمیزادی موسـوڵمان‌و خـودا پەرسـت پەیوەنـدی هاوسـەریەتی لەگـەڵ دا ببەسـتێ، کەسـێك بەهۆی ئەو کردەوە ناشیرینەوە لەئیمان دەرچوو بێ چۆن دەبێ موسوڵمانی لـەخودا ترس ئەو گرێ بەندییە هاوسـەرێتی یـەی لەگـەڵ دا ببەسـتێ؟ ﴿وَحُـرِّمَ ذَٰلِـكَ عَلَـى الْمُؤْمِنِينَ﴾ حەرامە مارەکردنی زیناکارو لەشفرۆش بۆ موسوڵمان، هـەروەها حەرامـە شوو کردنی ئـافرەتی داوێنپـاك‌و داپۆشـراوو لـەخودا تـرس بـەپیاوی داوێـن پـیس‌و زیناکار.

هەڵبەتــە مەبەســت بەتــەحریم لێــرەدا نەزاهــەت‌و خــۆ پــارێزی‌و خــۆ دوورخستنەوەیە لەهاوسـەریەتی زیناکـەر بـۆ زێـدە رەوی کـردن لـەقێز لێبوونـەوە لێیـان‌و نیـشاندانی پەسـتی‌و نارەسـەنی ئـەو تاوانبارانەیـە، مـارەکردنی ئـەو جـۆرە ئافرەتانە خۆخستنە ناو باس‌و خواسی ناشرینی ئەم‌و ئەوە، خـۆ تۆمـەتبار کردنـە، رێگـا کردنەوەیـە: بۆئـەوەی خـەڵك تانـە لـەناموس‌و نەسـەبت بـدەن، مایـەی دڵـە راوکـێ‌و ئـارام نەگرتنـە، ئـەو مەبەسـتەی کـە لـەژن هێنـان‌و شـوکردنی شـەرعی دابەرچـاو دەگـیرێ: کەبریتییـە لەسوکناو پێکـەوە ژیـان بـەئارامی، لەهاوسـەریەتی

لەگەڵ زیناکاردا نایەتەدی بەڵکوو دەبێتە مایەی دڵە راوکێو بڕوا نەبوون بەیەکترو گومان خستنە سەر یەکترو نەمانی بتمانە بەیەکتری!

بەهەرحاڵ تەحریمی ئێرە بۆ تەنزیهو عیففەتەو تەحریمی قەطعی ناگەیەنێ. ئەمەش رای خەلیفەی یەکەمو دووەم حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرو ﷺ کۆمەڵێکی زۆر لەچینی تابیعینو شەرعزانانی خاوەن ناوو شورەتی شارە گەورەکانی جیهانی ئیسلامین، ئەمانە هەموویان فەرموویانە: مارەکردنی ئافرەتی زیناکەر دروستەو تاوانی زینا نابێتە هۆی ئەوەی مارە کردنی ئافرەتەکە قەدەغە بکا. هەروەکوو چۆن زیناکردن نابێتە هۆی لێك جوودابوونەوەی ژنو مێرد، واتە: ئەگەر یەکێکیان ئەو تاوانەی لێ رودرا گرێ بەندی نێوانیان هەڵناوەشێتەوە، یان پێویست ناکا هەڵبوەشێتەوە.

ئەوەی کەپشتگیریی ئەم رایە دەکا، ئەو فەرمووەدەیە کەطەبەرانی لەحەدیثی خاتوو عائیشە ریوایەتیان کردوە، دەفەرموێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی پیاوێك زینای لەگەڵ ئافرەتێك کردبوو دوایی دەیەویست مارەی بکا، لەوەلام دا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەرەتاکەی تاوانەو کۆتایی یەکەی مارە کردنە، بزانن: حەرام حەلاڵ حەرام ناکا!! هەروەها فەرمودەیەکی تر هەیە، ئەبوداودو نەسائیو هی تریش لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەتیان کردوە: کەپیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد وتی: قوربان! خێزانەکەم دەستی کەس رەت ناکاتەوە! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (غرّبها) دەری بکەو لەخۆتی دوور بخەرەوە، کابرا وتی: قوربان! دەترسم دوایی پەرۆشم بێو دڵم بۆی بێتاقەت بێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (فاستمع بها) دەلەگەڵی رابوێرەو مودارا بکە. ئەم فەرمودانە بەڵگەی ئەوەن، کەدروستە پیاو ئافرەتی زیناکەر مارە بکا، هەروەها ژن ئەگەر زینای لێ ڕودرا نیکاحی نێوانیان فەسخ نابێتەوە.

حوکمی تەحریم لەئایەتەکەدا تایبەتە بەو هۆکارەی ئایەتەکە لەشانی دا نازڵ بووە. دەڵێن: ئایەتەکە بەئایەتی ژمارە (٣٢) سورەتی (النور) ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ﴾ سڕدراوەتەوە. چونکە ﴿الْأَيَامَى﴾ ئافرەتی داوێن پیسو داوێن پاك دەگرێتەوە...

هەنـدێکی تـر لـەزانایانی سـەلەفو (عـەلی کـوڕی ئـەبوطالیـبو (الـبراء)و ئیبنومەسعود) لەڕیوایـەتێك دا، فەرمویانـە کەسێك زینـا لەگـەڵ ئافرەتێـك دا بکا بۆی حەڵاڵ نیە دوایی مارەی بکا.

ئیمـامی عـەلی دەفـەرموێ: ئەگـەر پیـاوێکی خـاوەن ژن تـاوانی زینـای لێ رودرا، یەکسەر ژنەکـەی لێ جـودا دەکرێتـەوە هـەروەها ئەگـەر ژنێکـی خـاوەن مێـرد ئـەو تاوانەی ئەنجام دا دەبێ لەگەڵ مێردەکەی لێك جیا ببنەوە.

بەڵگەشیان ئایەتی ﴿الزَّانِي لا يَنكِحُ إلاَّ زَانِيَةً......الايـة﴾ دەفـەرموون: ظاهـیری ئایەتەکـە تـەحریم دەگەیـەنێو بـۆ نـەهی حـەقیقی یـە، هـەروەها چـەند فەرموودەیەك هەیە پشتگیریی ئەم رایە دەکا، لـەم فەرمودانـە: ئـەو فەرموودەیـەی ئەبوداود لەعەمماری کوڕی یاسرەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ﴿لايدخل الجنة ديّوث﴾ یان ئەو فەرموودەیـەی ئیمـام ئەحمـەد لەعەبـدوڵڵای کـوڕی عومەرەوە ریوایەتی کردوە، دەڵێ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (ثلاثـة لايـدخل الجنـة ولاینظـر الله الـیهم یـوم القیامـة، العـاق لوالدیـە، والـمرأة المترجلـة المتـشبهة بالرجـل، والديوث، وثلاث لاینظر الله اليهم يوم القيامة: العاق لوالديه، ومدمن الخمـر، والمنـان بما أعطى) سێ کەس هـەن ناچـنە بەهەشـتەوە، خـودا بەچاوی رەحمـەت سـەیریان ناکا، کەسێك ئەزیەتی باوكو دایکی بدا، ئافرەتێك خۆی بەپیاو نیشان بدا پۆشـاکی پیاوان لەبەر بکا، ئەو کەسەی داوێن پیسی لەماڵو خێزانی دا دەکرێو دەنـگ ناکـا. سێ کەس هـەن خـودا بەچاوی رەحمـەت سـەیریان ناکـا: کەسێك ئەزیـەتی بـاوكو دایکی بدا، شەرابخۆری مودمین، کەسێك منەت بکا بەبەخشندەیی خۆی شانازی بکا بەسـەر ئەوانـەدا: کـە شـتیان پـێ دەبەخـشێ. تەنانـەت ئیمـام ئەحمـەد پێـی وایـە: کەناگونجێ گرێ بەندیی نیکاح لەنێوان پیاوێکی داوێنپـاکی موسـوڵمانو ئـافرەتێکی زیناکاردا ببەسترێ، مەگەر ئافرەتەکە تۆبە بکاو بەئاشکرا پەشیمان بوونەوەی خۆی رابگەیەنێ. [1]

---

[1] فی ظلال القرآن ج/٦ /٥٩ .

ئافرەتى زيناكار هەركاتێ تۆبەى كرد مارەكردنى دروستە. هەروەها: حەرامە مارەكردنى ئافرەتێكى ئازادى داوێنپاك لەپياوێكى بێدينى زيناكەر، مەگەر پياوەكە تۆبە بكاو پەشيمان بوونەوەى خۆى رابگەيەنێ..

ئيمام ئەحمەد ئايەتەكەى ﴿وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾و ئايەتى ﴿مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلاَ مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ﴾ (النساء/٢٥) ئايەتى ﴿مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلاَ مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ﴾ (المائدة/٥) كردوە بەبەڵگەلەسەر رێبازى خۆى.

زينا بريتييە لەچوونى پياو بۆ لاى ئافرەت لەپێشەوەى را بەبێ ئەوەى نيكاحى صەحيح يان شێوە نيكاحيان لەنێوان دا بێ. ئافرەتەكەش بۆى بەيدەست بێ‌و خۆى بۆ شل بكا، يان بريتييە لەوە پياو هينى خۆى بخاتە ناو بيلامانەى ئافرەتەوە بەحەزو ئارەزۆى خۆيان بەجۆرێك كەشەريعەت بەحەرامى داناوە. هەركاتێ ئەوە روى دا حەد واجب دەبێ.

بەڵام بۆ نێربازى حوكمەكە بەم جۆرەيە. بەلاى ئيمامى شافيعى لەقەولى (الأصح) ى داو بەلاى ئيمامى ماليك‌و ئەحمەدو ئەبو يوسف‌و موحەممەدەوە حوكى نێربازى وەكوو حوكمى زينا وايەو نێرباز بەزيناكەر حيساب دەكرێ مانا گشتييەكەى ئايەتەكە دەيگرێتەوە، بەلاى شافيعى يەوە حەدى زيناكەرى لێ دەردەكرێ، بەڵگەشى ئەو فەرموودەيەيە: كەبەيهەقى لەئەبو موساى (الأشعرى) يەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ريوايەتى كردوە: دەفەرموێ: (اذا أتى الرجل الرجل فهما زانيان) كەنێر سوارى نێر بوو ئەوە هەردووكيان زيناكارن، ديارە حەدەكەشيان حەدى زينايە.

بەلاى ماليكيەكان‌و حەنبەلييەكانەوە حەدەكەى رەجم كردنە، هەندێ لەحەنبەلييەكان پێيان وايە حەدى نێربازى كوشتنە، جا يا بەهەڵداشتنى لەشوێنێكى بەرز، يان بەرِوخاندنى ديوارێك بەسەرى دا، يان بەبەردبارانكردنى تاگيانى دەدەر دەچێ!

ئەبوحەنيفە دەفەرموێ: تەنها تەمبێ دەكرێ‌و حەدى لێ دەرناكرێ، چونكە لەئەنجامدانى نێربازى دا تێكەڵاو بوونى نەسەب نابێ، بەئەغڵەب وادەبێ كێشەى واى لێ ناكەوێتەوە سەربكێشێ بۆ كوشتنى نێربازەكە، بەزيناش حيساب ناكرێ‌و

مارەیی پێ واجب نابێ، کەوابێ حەدی ئایەتە سەر، هەروەها چونکە پێغەمبەر ﷺ کوشتنی موسوڵمانی بەیەکێ لەسێ مەرج حەڵاڵ کردوە:- بێوه بێ‌و زینا بکا، بەناحەق موسوڵمانێك بکوژێ، لەئایین پاشگەز بێتەوه، دەی پێغەمبەر ﷺ لەم شوێنەدا؛ کەشوێنی لێکۆڵینەوەو رونکردنەوەیە باسی نێربازی نەکردوە، هەروەها پێشی ناگوترێ زینا. هیچ شتێکیش لەپێغەمبەرەوە ﷺ نەبیستراوە دەربارەی حوکم کردنی بۆ نێربازی!!

دەربارەی پانپانۆکەو دەستپەڕی کۆڕای فوقەها لەسەر ئەوەیە: کەدەبێ بکەرەکانیان سەرزەنشت بکرێن تەمبێ بکرێن.

دەربارەی چونەلای ئاژەڵ‌و گوێدرێژو ماین، زانایانی هەر چوار مەزهەب لەسەر ئەوەن: دەبێ بکەرەکە تەمبێ بکرێ بەشێوەیەك: کەفرمانڕەوا بەباشی دەزانێ‌و بەتەمبێ کەری دەزانێ.

لەسوننەنی نەسائی دا فەرمودەیەك هەیە لەئیبنو عەبباسەوه ریوایەتی کردوە دەفەرموێ: (لیس علی الذی یأتی البهیمة حد). ئەوەی بچێتە لای حەیوان‌و ئیشی والەگەڵ بێ زوباندا بکا حەدی لەسەر نیە.

چوونەلای مردوو بەم جۆرە کابرا مردوویەك واڵێ بکا بەلای شەرعزانانەوه جگە لەمالیکییەکان تەمبێ کردنی تێدایە، چونکە مردو واڵێکردن، کارێکە سروشت قێزی لێیەتی، پێویست بەحەد لێ دەرکردن ناکا، مالیکیەکان دەڵێن دەبێ حەدی لێدەربکرێ، چونکە وەکو چوونەلای ئافرەتی زیندو وایەو هینەکەی خۆی دەخاتە ناوبیلامانای مردوەکەوه، بەکورتی ئەم کارانە هەموویان حەرام‌و قێز لێکراوو تاوانن‌و پێویستە موسوڵمانان خۆیانی لێ بپارێزن.

ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی تاوانی زیناو رای فوقەهای موسوڵمانان دەربارەی حوکم‌و یاسای حەد لێ دەرکردن. هەرکەسێك دەیەوێ بەشێوەیەکی فراوان لەم باسەدا قوڵ بێتەوه بابگەڕێتەوه بۆ کتێبە شەرعییەکان، بەتایبەتی کتێبی (الفقـة الاسلامی وأدلتـه) دانـراوی د. وهبـه الزحیلـی ج٧/٥٣٤٥ ـ ٥٤٢١.

## حوكمی سێیەم حەددی بوختانە

﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾

دوای ئەوەی لەئایەتەكانی پێشوودامارەكردنی ئافرەتی زیناكارو شوكردن بەپیاوی داوێن پیسی بەشتێكی قێزەون لەقەڵەم دا، دێتە سەر جڵەوگیری كردن لەبوختان كردنو تۆمەتبار كردنی ئافرەتو پیاوی داوێن پاك بەو تاوانە، ئەمجار باسی حەددو تۆڵەی بوختان دەكا؛ لەدونیادا هەشتا جەڵدەیەو لەقیامەت دا عەزابی بەئێشە بەمەرجێ بوختانكەر تۆبە نەكا.

بێگومان ئەگەر كەمتەرخەمی بكرێو ڕێگا بدرێ بەهەوانتە خەڵك تاوانی داوێن پیسی پاڵ ئافرەتی داوێنپاكو پیاوی داوێن پاك بدەنو داوای بەڵگەی حاشا هەڵنەگریان لێ نەكرێو لێیان نەپرسرێتەوە، ڕێگە خۆش بكرێ هەركەسێ ڕاست ببێتەوە بێتاوانێك بەو تاوانە ناشیرینە تۆمەتبارو لەككەداری بكاو بۆخۆی بۆی دەرچێ وەك بەرزەكی بانان ڤیت هەڵپەڕێ، كۆمەڵ تێكڕا دەشێوێ، خێزانەكان كاتێك بەخۆیان دەزانن، ناموسیان بریندار كراوە، سومعەو كەسایەتییان ڕوشێندراوە؛ بەڵێ كاتێك بەخۆیان دەزانن: هەموو تاكێكیان تۆمەتبارو موهەددەدە بەتۆمەتبار كردن، كاتێك بەخۆیان دەزانن هەموو مێردێك گومانی لەژنەكەی هەیەو هەموو ژنێك دڵی لەمێردەكەی كرمێ دەبێ. بەڵكوو هەموو كەسێك دەكەوێتە گومانەوە لەپەیدا بوونو دروستبوونی خۆی، هەمووخێزانێك لەوانەیە تێك ڕووخێو پەرتەوازە ببێ، ئەمەش حاڵەتێك لەدڵەڕاوكێو نائارامی پەیدا دەكا زۆر زەحمەتە تەحەمول بكرێ.

وێـڕای ئـەوەش بیـستنی ئـەو تۆمەتـەو دووبـارە بوونـەوەی لـەناو کۆمـەڵ دا وادەخاتـە زەینـی هەنـدێ دڵ کرمـێ‌و دەروون نەخۆشـەوە: کەکۆمەڵگاکـە هـەمووی پیس بووەو ئەو تاوانـە ناشیرینە بـەربڵاوە تـێ یـدا کـردن‌و ئەنجامـدانی بـەکارێکی ئاسایی دەزانرێ‌و وادەزانێ هەموو کەس یان زۆرینەی دانیشتوان ئەنجامی دەدەن.

ئـیتر ئەوکاتـە حـەدو تۆڵـەی زینـا نابێتـە لەمپـەرو خـەڵکی لـەو تاوانـە سـڵ ناکەنەوە.

لەبـەر ئـەم هۆیانـەو بـۆ پاراسـتنی عـەرزو نـامووس لـەهێرش بۆسـەر کـردن‌و لەککـەدار کردنیـان، بـۆ پاراسـتنی خـاوەن شـەرەف‌و پـاك ڕاگرتنـی سـومعەو کەسایەتییان لـەو ئـازارو تۆمـەتبار کردنـە، قورئـانی پـیرۆز تونـدو تـیژیی نوانـدوە دەربارەی سزای بوختانکەرو وای لێ کـردوە تۆڵـەی بوختـان نزیـك بۆتـەوە لەتۆڵـەی زینا! دەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ﴾ ئەوانـەی بوختـان بـەئافرەتی داوێـن پاك‌و عەفیفە دەکەن، بەتاوانی داوێن پیسی لەکەداریان دەکەن، ﴿ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَـةِ شُـهَدَاءَ﴾ پاشـان نـاتوانن چـوار شـایەد ئامـادە بکـەن لەسـەر راسـتی قـسەکەیان، بوختانەکە دەکەن‌و ناتوانن چوار شایەد بێـنن شایەتی بـدەن: کەئـەو ئافرەتـە یـان ئـەو ئافرەتانـەیان بەچـاوی خۆیـان خـەریکی ئـەو کـارە ناشـیرینە بـوون، ئەگـەر نەیانتوانی راستی قسەکەی خۆیان بچەسپێنن: ئەوە سێ حوکمیان هەیە.

١- ﴿فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْـدَةً﴾ هەشـتا جەڵـدە لـەبوختان کـەرەکان بـدەن، واتـە: هەشتا شوڵکەداری نەتەرو نەوشکیان لێ بدەن.

٢- ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَـداً﴾ ئـیتر بـبڕای بـبڕای بـۆهیچ شـتێك شـایەتیان لێ قبوڵ مەکەن، بەدرێژایی تەمەنیان رێزی ئەومیان مەدەنێ ببنە شایەد بەسەر هـیچ شتێکەوە.

٣- ﴿وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ئەوانە مورکی فاسقی‌و درۆزنییان پێوە دەنرێ پلەو پایەی عەدالەت‌و راستگۆییان لێ دادەڕندرێ، لای ئادەمیزادان‌و لای خودا عەدالەتیان نامێنێ، تەنانەت ئەگەر راستیش بکەن بەمەرجێ نەتوانن چوار شایەد ئامادە بکەن هەر ئەو حوکمانەیەیان بەسەردا دەسەپێ!

قورئـانی پـیرۆز بـە(فاسـق)ی نـاو زەد کـردون، (فاسـیق) یـش واتـە دەرچـوو لەطاعـەتی خـودا، ئەمـەش بەلگەیـە لەسـەر ئـەوە: کـەبوختان تـاوانێکی گەورەیـەو یەکێکە لەتاوانە گەورەکان، چونکە بوختـان نـاو زڕانـدن‌و ئـەتك کردنـی ناموسـی خەلکی لێ پەیدا دەبێ!

بـەلام مەرجـە دەبـێ بوختانکـەر نـەتوانێ چـوار شـایەد ئامـادە بکـا، بۆخۆشـی لەئــەهلی تــەکلیف بــێ، واتــە بــالغ‌و عــاقل‌و ئــازاد بــێ، زۆریــی لێ نــەکرێ بــۆ بوختانکردنەکە، دەبێ بزانێ: کەبوختانکردن حەرامەو تاوانە.

مەرجی بوختان پێکراویش ئەوەیە داوێنپـاك بـێ، لەئـەهلی تـەکلیف بێ، واتـە بالغ‌و عاقل‌و موسولمان‌و عەفیفە بێ، لەوە پێش تاوانی زینـای لەسـەر نەچەسـپابێ کەوابوو، مەرجی ئیحصان پێنـج مەرجـەن بـالغی‌و عـاقلی کەپێویـستیاتی عیفـەت‌و داوێن پاکین. ئازادیی، چونکە بەشێکە لەمانای ئیحصان. ئیسلام چـونکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: (من أشرك بـالله فلیس بمحصن) کەسێك هـاوەل بـۆ خـودا دابنـێ بەموحەصەن ناژمێردرێ.

پێنجەم عیفەت‌و داوێـن پـاکی لـەزینا، کـەوابوو شـێت‌و منـدال‌و کۆیلـەو کـافرو داوێن پیس بەموحـصەن دانـانرێن‌و کەسـێك بوختانیـان پـێ بکـا حـەدی لێ نـادرێ، بـەلکوو سەرزەنـشت دەکـرێ چـونکە زیـانی بـەبوختان لێکـراو گەیانـدوە. ظـاهیری ئایەتەکـە ئــەوە دەگەیــەنێ: کەهــەموو داوێنپاکێــك بەموسـولمان‌و کـافرو ئـازادو کۆیلـەوە لـەو حوکمـەدا هاوبەشــن، وەلێ فوقــەهای ئیـسلام فەرموویانــە: مــەرجی ئیحصان پێـنجن (الاسـلام ـ عقـل ـ بـالغی ـ حورییـەت ـ عیفـەت) ئیـسلام بەمـەرج دانراوە: لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کەتۆزێك لەوە پێش ئاماژەمـان پـێ کرد.

عاقلی‌و بالغی بەمەرج گیراون چونکە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی (رفـع القلـم عن ثلاثة) شێت‌و مندال لەو سێ تاقمەن. ئازادیی بەمـەرج گیراوە: چونکە کۆیلـە کەسایەتی نەقصە، عەیبدار کردنی بەزینا زۆر لەسەری کاریگەر نابێ.

عیفـەتیش بەمـەرج گـیراوە، چـونکە حـەد لەبـەر درۆ کردنـی بوختانکـەرە. جانەگەر بوختان پێکراو عیفـەتی نـەبێ مانـای وایـە زیناکارەو بوختانکـەر راسـت دەکا ئیتر بوختانکەر حەدی لێ نادرێ.

وەکوو وتمان: بوختانکەر ئەگەر نەیتوانی چوار شایەد ئامـادە بکـا سـێ حـوکمی بەسەردا دەدرێن ١- هەشتا جەڵـدەی لێ دەدرێ، ٢- شـایەدی لێ وەرنـاگیرێ، ٣-مـۆرکی فیسقی پێوە دەنرێ.

ئەمجار پەروەردگار حاڵەتی تۆبـە کـردن چـەرت دەکـاو دەفـەرموێ: ﴿إِلاَّ الَّـذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ واتـە: مەگـەر ئـەو بوختانکەرانـەی دوایی تۆبە دەکەن‌و لەبوختانەکەیان پاشگەز دەبنـەوە، حاڵ‌و کردەوەی خۆیان بـاش دەکـەن‌و رودەکەنـە چـاکە کـاری‌و خـودا پەرسـتی‌و ناگەڕێنـەوە بۆسـەر هەڵوێـستی پێشوویان‌و واز لەبوختان کردن دەهێنن. ئەوە خودا لێخۆشبوو خاوەن بـەزەیی یـە، ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: واتە: تۆبەکەیان بەدەر بخەن‌و بەئاشکرا پاشگەز ببنـەوە، ئـیتر خـودا لێخۆشـبوو تـاوان پۆشـە، بـەزەیی‌و لێبوردەیـە تۆبـەیان لێ وەردەگـرێ‌و رەوشتی فیسقیان لێ دەشواتەوە.

ئیمامی شـافیعی دەفـەرموێ: تۆبـەی بوختانکـەر بریتییـە لـەوەی خـۆی بـەدرۆ بخاتەوە، بڵێ: مـن لـەو قسەیەم دا درۆم کـردوە جارێکی تـر ناگەڕێمـەوە سـەر ئـەو کارە. ئەبوئیسحاقی مروزی کەیەکێکە لەهاوەڵانی شـافیعی. دەفـەرموێ: نـابێ: بڵـێ: درۆم کـردوە. چـونکە لەوانەیـە لەبوختانەکـەی دا راسـت بکـا. جانەگـەر بڵـێ: درۆم کردوە دەبێتە درۆو درۆش تاوانـە، دەی تـاوان کـردن نابێتـە تۆبـەکردن لـەتاوانێکی دی، بەڵکوو دەبێ ئەو قسەیەی دەربـارەی فلاّنکـەس وتومـە بەتاڵەو لەقـسەی خـۆم پەشیمانم‌و جارێکی تر نایکەمەوە.

ئەبولحەسـەنی (اللخمـی) ئـەوەی تـەرجیح داوە: کـەبڵێ: درۆم کـردومو خـۆی بەدرۆ بخاتەوە.

هەندێ لەزانیانی ئیسلام فەرموویانە: تۆبەی بوختانکەر وەکوو تۆبەی شتی تـر وایەو لەنێوان خۆی‌و خودای خۆی دا بـەدڵ پەشـیمان بێتـەومو سوور بێ لەسـەر ئەوە: کەجارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانـە، زانایـانی تەفسیر راجیاییـان تێـدا

پەیدا بووە دەربارەی ئەم چەرتکردن (الاستثناء) ەی ئێرە لەوەدا ئایا تەنها دەگەڕێتەوە بۆ رستەی کۆتایی ئایەتی پێشوو تەوبە کردنەکە هەر فیسقەکە لادەباو نیتر شایەتی لێ وەرنەگرتنەکەی بەردەوامە! یا تۆبەش بکاو روبکاتە کاری باش؟؟ یان دەگەڕێتەوە بۆ دوو رستەکانی دوایی. واتە: ئەگەر تۆبەی کرد فیسقەکەی نامێنێ‌و شایەتیشی لێ وەردەگیرێ.؟

ئەبوحەنیفەو قاضی شورەیح‌و سەعدی کوڕی جوبەیر پێیان وایە (استثناء)ەکە دەگەڕێتەوە بۆ رستەی کۆتاییی‌و بەس. کابرای بوختانکەر ئەگەر تەوبەی کرد فیسقەکەی لەسەر لادەچێ، بەڵام شایەتی لێ وەرناگیرێ‌و ئەو سزایەی لەسەر لاناچێ.

دەڵێن: رستەی ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ رستەیەکی (مستأنفه) یەو پەیوەندیی بەپێشەوە نیەو سەربەخۆیە، بەشێوەی هەواڵ (الاخبار) هێنراوە بۆ ئەوەی وانەزاندرێ: کەبوختان کردن نابێتە هۆی فاسق بوون‌و هەتکی ناموسی موسوڵمانان بەناڕەوا نابێتە تاوان.

جا کەرستەی ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ موستەئنەفە بێ ئەوە چەرتکردنەکە رو دەکاتە ئەوو بەس!

جەماوەری زانایان (مالیکییەکان‌و شافیعییەکان‌و حەنبەلییەکان)پێیان وایە چەرتکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ رستەی دووەم‌و سێیەمی ئایەتی پێشوو.

ئەمانیش دەفەرموون: ﴿وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً﴾ رستەیەکی موستەئنەفەیەو پەیوەندی بەپێش خۆیەوە نیە. چونکە لەتەواو کەری حەدەکە نیە، واتە: بەشێك نیە لەحەدو تۆڵەکە. رستەی ﴿وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ رستەیەکی تەعلیلی‌و بایسی یە، نەك موستەئنەفە بێ.

بەکورتی مانای دوو رستەکان (دوو ئایەتەکان) بەم جۆرەیە: (شایەتیان لێ وەرمەگرن چوونکە فاسقن) جا ئەگەر فیسقەکەیان بەتۆبە نەما، ئیتر بۆ دەبێ شاهتییان لێ وەرنەگیرێ.؟؟ خۆ عیللەتی شایەتی لێ وەرنەگرتنیان تێدا نەماوە.

## حوکمی چوارەم حوکمی نەفرین لێکردنی ژن‌و مێردە

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئەم ئایەتانە بوخاریو ئەبوداودو تیرمیذی لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: هیلالی کوڕی نومەییە لای پێغەمبەر ﷺ بوختانی بەخێزانەکەی خۆی کرد: کەلەگەڵ پیاوێك دا بەناوی (شەریکی کوڕی سەحماء) زینای کردوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یان بەڵگە بێنە لەسەر قسەکەت یان داری حەد لەپشتت دەدەم.. هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن دەبێ: یەکێك لەئێمە پیاوێك بەسەر خێزانەکەیەوە ببینێ، بچێ هەوڵی ئەوە بدا شایەت پەیدا بکا، خۆ تادەچێ شایەت بێنێ هەموو شتێك تەواو دەبێ. بەڵام پێغەمبەر ﷺ گوێی بەقسەکەی هیلال نەداو فەرموودەکەی خۆی دووبارە کردەوە، فەرمووی: (البینة اوحد فی صدرك) شایەد بێنە ئەگینا داری حەد لەپشتت دەدرێ!

هیلال وتی ئەی پێغەمبەری خودا! سوێندم بەو کەسەی تۆی بەحەق رەوانە کردوە ئەمن راست دەکەم‌و دڵنیام کەخوداسروش نازڵ دەکاو پشتی من لەداری

حەد رزگاری دەبێ. ئیتر جوبرائیل نازڵ بوو، ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا بوو، بۆی خوێندەوە تاگەییشتە ﴿إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾

ئیمام ئەحمەد بەئیسنادی خۆی لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەتی کردوە: دەفەرموێ: کاتێ ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً..﴾ نازڵ بوو. سەعدی کوڕی عوبادە ـ گەورەی ئەنصارەکانی مەدینە ـ وتی: ئایا ئەم ئایەتە بەو جۆرە نازڵ بووە ئەی پێغەمبەر؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی کۆمەڵی ئەنصار! گوێتان لێ یە پیاو ماقوڵەکەتان دەڵێ چی؟؟ یارمەتیدەران وتیان ئەی پێغەمبەری خودا لێی مەگرە، چونکە ئەو پیاوێکی بەناموس‌و حەیایە خاوەن غیرەتە، سوێند بەخودا تائێستا هیچ ئافرەتێکی مارە نەکردوە جگە لەو مارەی بکاتەوە، لەبەر زێدە رەوی لەغیرەت دا.. سەعد وتی: سوێندم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا من دەزانم ئەوە حەقەو ئەوە شەریعەتەو لەخوداوە هاتووە؛ بەڵام من لەوە سەرم سوڕماوە، ئەگەر من ئافرەتێکی سەڵیتە ببینم پیاوێك سواری بووە، بۆم نەبێ لێی تێك بدەم‌و لێی بێدەنگ بم تادەچم چوار شایەد دێنم، بەخودا تا من دەچم چوار شایەد دێنم ئەوان ئیشی خۆیان تەواو دەکەن‌و لێ دەبنەوە. جائیبنو عەبباس درێژە بەریوایەتەکەی دەداو دەفەرموێ: ئەوەندەی پێ نەچوو هەتا هیلالی کوڕی ئومەییە هات: کەشەو لەملکەکەیەوە گەڕابوەوە پیاوێکی بینیبو بەسەر خێزانەکەیەوە، بەچاوی خۆی بینیبوی بەگوێی خۆی بیستبووی، بەڵام هیچ خۆی تێك نەدابوو بەیانی هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئەمن شەو گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پیاوێکم لەلای ژنەکەم بینی، بەچاوی خۆم کردەوەکەیانم بینی‌و بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو..

پێغەمبەر ﷺ زۆری ئەم روداوە لەسەرشان گران بوو، ئەنصارەکان لێی کۆبوونەوەو ووتیان ئەوا قسەکەی سەعدی کوڕی عوبادە هاتەجێ، مەگەر دەبێ پێغەمبەر ﷺ داری حەدی بوختان لەهیلال بداو شایەتی دانی لێ وەرنەگیرێ‌و لەناو خەڵك دا مەشهور نەبێ کەشایەتی لێ وەرناگیرێ.

هیلال لەوەڵامدا وتی داواکارم خودا رێگا چارەیەکم بۆ بدۆزێتەوە، ئەمجار هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من دەزانم ئەم هەواڵەی منت زۆر لەسەر شان گران بوو، خودا ئاگادارە من راست دەکەمو ئەوەی عەرزم کردی بەچاوی خۆم بینیم.

ئیبنو عەبباس دەفەرمووێ: سوێند بەخودا، پێغەمبەر ﷺ خەریك بوو فەرمان بکا بەجەڵدە لێدان لەهیلال، ئیتر لەو کاتەدا پەروەردگار نیگای بۆسەر پێغەمبەری خۆی نازڵ کرد. پێمان زانی کەنیگای بۆ هات، چونکە هەرکاتێ نیگای بۆ دەهات دەمو چاوی دەگۆڕا. (واتە: وازیان لێ هێنا تاسروشەکە تەواو بوو) ئەوەبوو ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ....الاية﴾ نازڵ بوو ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أبشر یاهلال فقد جعل الله لك فرجا ومخرجا) مزگێنی ئەی هیلال بێگومان پەروەردگار دەروی رەحمەتی لێکردیتەوە.. هیلال وتی: بێگومان من بەهیوا ئەوە بووم هومێدم بەخودا وابوو: کەلەم تەنگانەیە رزگارم بکا.

ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بنێرن بەدوا ژنەکەی دا، ناردیانو هات، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ حوکمی پەروەردگاری بۆ خوێندنەوە ئامۆژگاریی کردنو لەعەزابی خودا ترساندنیو پێی فەرموون: عەزابی قیامەت لەهی دونیا بەئێش ترە. هیلال وتی: دەربارەی خێزانەکەم راستم گوتوە، ئافرەتەکە وتی: درۆ دەکا، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاعنوا بینهما) یاسای نەفرین لەنێوانیان دا ئەنجام بدەن، بەهیلال گوترا شایەتی بدە، ئەویش چوارجار وتی: (أشهد بالله انه لمن الصادقین) جالەجاری پێنجەم دا بەهیلال گوترا: ئەی هیلال! لەخودا بترسە، بێگومان عەزابی دونیا زۆر لەعەزابی قیامەت سوکترە.

بزانە ئەم شایەتیدانو داوایەت - ئەگەر راست نەکەی - دەبێتە هۆی عەزابدانی قیامەتت. هیلال وتی: سوێندم بەخودا، خودا لەسەر ئەم شایەتیدانەم سزام نادا، وەکوو چۆن جەڵدە لێدانی لەسەر هەڵگرتم.

ئەمجار بەژنەکەی گوترا: چوار جار شایەدی بدە، بڵێ: سوێندم بەخودا هیلال درۆ دەکاو بوختانم بۆ دەکا. لەجاری پێنجەم دا بەئافرەتەکە گوترا: ترسی خودات

هەبێ، چونکە عەزابی دونیا زۆر لەهی قیامەت ئاسانترە، ئەم شایەتیدانەت دەبێتە هۆی عەزابی قیامەت، ئافرەتەکە هەڵوێستەیەکی کردو ویستی ئیعتراف بکا، پاشان وتی: سوێندم بەخودا حەیای گەل‌و هوزەکەم نابەم، ئیتر شایەتی جاری پێنجەمی داو وتی: غەزەبی خودام لەسەر بێ ئەگەر هیلال راست بکا. دوای ئەم نەفرین لەیەکتر کردنە پێغەمبەر ﷺ یەکسەر لێکی جیا کردنەوە، بڕیاری ئەوەشی دا: کەئەو منداڵەی لەسکی ئافرەتەکەدا رسکاوە ئەگەر لەدایك بوو پاڵ کابرای مێردی نەدرێ، هەروەها کەسیش نابێ ئەو منداڵە بەزۆڵ بزانێ، هەرکەسێ بەوناوە بانگی بکاو ئەو پەستییەی پاڵ بدا داری حەدی لێ دەدرێ! ئەوەشی بڕیاردا: کەژنەکەی مافی ئەوەی نیە داوای مەسکەن‌و بژێو لەپیاوەکە بکا. چوونکە لێك جیا بوونەوەکەیان بەشێوەی تەلاقدان‌و مێرد مردن نەبوو. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەم ژنە منداڵێکی قژسوری سمت لەڕی هێنا ئەوە دیارە لەهیلالەوە لەسکی کەوتووە. خۆ ئەگەر منداڵەکە گەنم رەنگی قژلولی دەست‌و پەل قەوی سمت گۆشتنی قەڵەو، بوو ئەوە راستگۆیی دەبێ لەبوختانەکەت دا.

وارێکەوت ژنەکە منداڵی بوو گەنم رەنگ‌و شان‌و مل قەوی‌ودەست‌و قاچ ئەستورو کەفەڵ پان‌و گۆشتن بوو..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لولا الأيمان لكان لي ولها شأن) ئاواو بەو جۆرە ئەم شەریعەتی ئیسلامە هاتووە، بەو شێوە رووبەڕوی ڕوداوەکان بۆتەوەو چارەی گونجاوی بۆ دۆزیونەتەوە. چارەسەرکردنی مەوقیفێکی واقورس‌و گران کەلەسەر خاوەنەکەی‌و لەسەر موسوڵمانانیش گران بوو. لەسەرشانی پێغەمبەریش گران بوو. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ هیچ چاری لانەبوو جگە لەوە: کەبەهیلالی فەرموو: (البينة اوحد في ظهرك) (هیلال)یش بەسەر سوڕمانەوە دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خودا چۆن ئەگەر یەکێکمان پیاوێکی بەسەر ژنەکەیەوە بینی لەحیاتی هەموو هەڵوێستێکی بچێ بگەڕێ شایەت پەیدا بکا.؟!

بێگومان کەسانێك هەن بڵێن: بۆچی خودا نەیدەزانی ئەم جۆرە حاڵەتانە بۆ یاسای گشتی بوختانکردن پەیدا دەبن؟ ئەدی بۆچی ئەم چەرتکردن (أستثناء) ەی نەنارده خوارێ تائەم مەوقیفە حەریجە پەیدا بوو.؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: دەڵێن: بەڵێ بێگومان پەروەردگار ئەوەی زانیوە، وەلێ حیکمەتو دانایی پەروەردگار داخوازی ئەوە بووە، شەریعەت کاتێك نازڵ بکا: کە ئادەمیزادەکان هەست بەپێویستییان بۆ ئەو شەریعەتە بکەن! بۆئەوەی بەحەزو ئارەزۆوە پێشوازیی لەو شەریعەتە بکەن‌و بزانن چەند عەداڵەت‌و رەحمەت‌و دانایی تێدایە. بۆیە دوا بەدوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ﴾.

لەریوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێ: کەئایەتی پێشوو ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ....﴾ نازڵ بوو، بەمظاهیری حاڵیش مێردەکان‌و غەیری ئەوانیشی دەگرتەوە، سەعدی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن من ئەگەر پیاوێکم بەسەر ژنەکەمەوە بینی مۆڵەتی بدەم جارێ بچم چوار شایەد پەیدا بکەم!؟ وەڵلاهی بەبست بەقەرزی نادەم‌و چاوپۆشی لێ ناکەم یەکسەر بەشمشێر لەملی دەدەم! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أتعجبون من غيرة سعد؟ لأنا أغير منه، والله أغير مني)؟! دڵنیا بن من لەو بەغیرەت ترم، پەروەردگار لەمن لەوبارەوە توند ترەو ئەو حاڵەی پێ قبوڵ ناکرێ.

موسلیم‌و بوخاری‌و هی تریش لەسەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ ریوایەت دەکەن، دەفەرموێ: عوومیمیر هاتە لای عاصیمی کوڕی عەدی وتی: بچۆ بۆم لەپێغەمبەر ﷺ پرسیار بکە، ئەگەر پیاوێك پیاوێکی بێگانەی بەسەر ژنەکەیەوە بینی‌و کوشتی، ئایا دەکوژرێتەوە یان چی لەگەڵ دەکرێ؟ عاصم پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ رەخنەی لەپرسیارەکە گرت، دوایی عوومیمیر تووشی عاصیم بووەوە وتی: چی بکەم تۆ هیچ وەڵامێکت بۆ نەهێنامەوە، پرسیارم لەپێغەمبەر ﷺ کرد، تەشریفی رەخنەی لەپرسیارکەر گرت. عوومیمیر وتی: سوێندم بەخودا دەچم بۆلای پێغەمبەر ﷺ و لەم بارەوە پرسیاری لێ دەکەم، پرسیاری لێکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:دەربارەی تۆو هاوەڵەکەت ئایەت نازڵ بووە..

ئیبنوحەجەری عەسقەلانی دەفەرموێ: زانایانی ئیسلام لەم شوێنەدا کەوتونە راجیاییەوە، هەندێکیش دەڵێن: دەربارەی هەردووکیان نازڵ بووە، هەشیانە دەڵێ: دەربارەی هیلال نازڵ بووە، دەڵێن: روداوەکە لەسەرەتادا هی هیلال بووە، لەوکاتەدا

عوومیمیریش هاتووە ئەو پرسیارەی کردوە. ئیمامی نەوەویش ئەم رایەی پەسند کردوە.

ئەمجار ئیبنوحەجەر دەفەرموێ: چ مانیعێک نیە لەوەی هۆی نازڵبوونی ئایەتەکە زیاد لەهۆیەك بێ.

قورطوبی دەفەرموێ: روداوی هیلال لەپێش دابووەو ئەویش سەبەب نزولی ئایەتەکەیە.

**ئەوەی گرنگەو زانایان تێیدا کۆکن: سێ شتە:**

١- ئایەتی (لیعان) نەفرین لێکردن دوای ئایەتی بوختانکردن بەداوێنپاکان نازڵ بووەو ئەم دوو ئایەتە لێك جیان.

٢- لەپێش نازڵبوونی ئایەتی لیعاندا موسوڵمانان والەئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ.....الآيـة﴾ حاڵی بووبون: کەئەم ئایەتە ئافرەتی بێگانەو هاوسەر دەگرێتەوە.

٣- ئایەتی لیعان نازڵ بوو بۆ ئەوەی هەندێ ئەرك لەسەر شانی مێرد سوك بکا.

پیوەندیی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە. لەوەپێش پەروەردگار حوکمی بوختانکردنی بەژنی بێگانە: کەخێزانی بوختانکەرەکە نەبێ، دیاری کرد، ئەمجار حوکمی بوختانکردنی پیاو بەخێزانی خۆی دیاریی دەکا، کەلەراستی دا وەکوو (ئیستثناء) جەرتکردن وایە لەئایەتی پێشوو، هەڵبەتە حوکمەکەش کار ئاسانی تێدایە بۆ مێردەکان، چونکە عەیبو عار سواری شانی دەبێو زۆر زەحمەتیشە بتوانێ شایەتی ئەو جۆرە روداوانە دەست بکەوێ، زوربەی کاتیش پیاو ئەو جۆرە بوختانانە بەخێزانی خۆی ناکا، بەدەگمەن رێ دەکەوێ پیاو تۆمەتی داوێن پیسی پاڵ ژنی خۆی بدا، ناخۆشترین شت بەلای پیاوەوە ئەوەیە: ژنەکەی ئەو رەوشتە ناشرینەی وەپاڵ بدرێ، بۆیە پەروەردگار بەم ئایەتە دەروی لەمێردەکان کردەوەو حوکمی ئەوەی بۆ دانان: کەهەرکاتێ پیاوێك ژنەکەی خۆی بەو رەوشتە ناشرینە تۆمەتبار کردو نەیتوانی لای قازیو دادگا داواکەی بچەسپێنێ دەبێ (ملاعنة) بکا، واتە: قازی چوارجار سوێندی دەدا لەجیاتی چوار شایەتەکەو

دوایـی دەڵـێ خـودا ئاگـای لێ یـە، مـن لەوەپاڵـدانی ئـەو رەوشـتـە بـۆ خێزانەکـەم راستگۆمو درۆ ناکەم.

دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ﴾ ئەو مێردانەی تاوانی داوێـن پیـسی پـاڵ ژنـەکانیان دەدەن ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُـسُهُمْ﴾ نـاتوانن چـوار شایەت ئامـادە بکەن لەسەر راستی ئیدیعاکەیان، تەنها روداوەکەیان بینیوەو بەس؛ ئەوە ﴿فَـشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَـهَادَاتٍ بِاللَّـهِ إِنَّـهُ لَمِـنْ الـصَّادِقِينَ﴾ شـایەتی دانـی پێویـست لەسـەریان ئەوەیـە: چـوارجار بڵـێ: ﴿أشـهد بـالله﴾ ئـەو لـەو قـسەیەی پـاڵ خێزانەکـەی دراوە راستگۆیەو چی دەڵێ: راست دەکا. ئەمجار لەجاری پێنجـەم دا بڵـێ: لەعنـەتی خـودا لەسەرمن بێ ئەگەر درۆ بکەمو شتی نـەبوو وەپـاڵ ژنەکـەم بـدەم. ئەگـەر ئەمـەی گوت: ئیتر ژنەکەی لێ جیا دەبێتەوە، گریـی بەنـدیی نێوانیـان نـامێنێو ئـیتر بـبڕای ببڕای جارێکی تر بەهیچ شێوەیەك نابێ ببێتـەوە بەهاوسـەریو لێـی حـەرام دەبێ، پێویستە مارەیی بداتێو داری حەد لەسەربوختان لەسەر پیاوەکە لادەچێو ئەگـەر ئافرەتەکە دوای ئەو لیعانو شایەتی دانە منداڵی بوو بـەهی پیاوەکـە حـسێب نیـەو وەپاڵی ئەو نادرێ. حەددی زینای لەسەر دەچەسپێ! ﴿وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّـهِ عَلَيْـهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێـت ئەگـەر لـە درۆزنانیش بم. ﴿وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِـنْ الْكَـاذِبِينَ﴾ تۆڵەی داوێن پیسی لەسەر خۆی لادەبـا بـەوە کەچوارجار شـایەتی بـدا بڵـێ: (اشـهد بالله) ئەم پیاوە کەمێردی منەو ئەو قسەیەی بـۆ هەڵبەسـتووم درۆ دەکـاو وتەکـەی راستی تێدا نیەو من ئەوکارە ناشرینەم نەکردوە.

﴿وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّـهِ عَلَيْهَـا إِنْ كَـانَ مِـنْ الـصَّادِقِينَ﴾ لـەجاری پێنجـەم دا شـایەدی بـداو بڵـێ: غـەزەبی خـودام لەسـەربێ ئەگـەر ئـەو کابرایـە راسـت بکـاو لەراستگۆیان بێ لـەو بوختانـەی دا. ئـەمجار پـەروەردگار فـەضلو رەحمـەتی خـۆی رون دەکاتـەوە بەسـەر بەنـدەکانی دا: کەئـەم شـەریعەتەی بـۆ دانـاوەو لیعـانی کـردوە بەرێگا چارە بۆ مێردەکەی.. کەلەو تەنگژەیە رزگاری ببێو مەبەسـتەکەی بێتـەدی، هـەروەها رێگـا چـارەیە بـۆ ئافرەتەکـەش: کەبـەهۆی لیعانـەوە سـزای داوێـن پیـسی لەسەر خۆی لادەباو لەدونیادا تۆڵەی لێ ناسەندرێ.

بۆيە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ﴾ ئەگەر فەضلو گەورەیی خودا نەبوایە بەسەر ئێوەوە: کەزێدە فەضلو نیعمەتی خۆی بەسەردا باراندون بەلوطفو بەزەیی خۆی ئەم یاسا جوانەی بۆ داناونو لەو جۆرە تەنگژەو نارەحەتیانە رزگاری کردونو هەلی تۆبە کردنو پەشیمان بوونەوەی بۆ رەخساندون، ئەگەر ئەم یاسایەی بۆ دیاریی نەکردنایە، دەکەوتنە ئەوپەڕی تەنگانەو ناخۆشی یەوەو لەزۆر شت دا دەستە وەستان دەبوونو حەیاو ناموستان نەدەماو سزای بەعەجەلەو دەست لەعاستیشیان دەدرا، بەلأم خودا تاوانی سرپۆش کردنو بەیاسای لیعانو نەفرین لەیەکتر کردن لەو وەرطە ناخۆشە رەهای کردن، چونکە خودا بەفەضلو گەورەیی خۆیو رەحم کردن بەئێوە لەسەر خۆی نووسیوە، رەحمتان پێ دەکا، تۆبە لەبەندە تاوانکارەکانی خۆی وەردەگرێ، هەرچەندە دوای ئەو نەفرین لێك کردنو سوێند لەسەر یەکتر خواردنەش بێ! حەکیمو دانایە لە شەریعەت دانانو فەرمانکردنو جڵەوگیری کردن دا هەرچی فەرمانی پێ دەکاو نەهی پێ دەکا بێ حیکمەت نیە.

ئەوەتا هەرچەندە ئاشکراو نمایانە کەیەکێك لەو ژنو مێردە درۆ دەکەنو سوێندەکەیان بەدرۆیە، کەچی بەو لیعانە سزای دونیاییان لەسەر لادەچێ، بەلأم لەقیامەت دا شیاوی عەزابی توند ترن، ئەگەر خودا تۆبەیان لێ وەرنەگرێ عەزابی بەئێشیان دەدا. بۆیە فەرموی: ﴿حَكِيمٌ﴾ نەیفەرموو: (رحیم) هەرچەندە رەحمەت موناسیبی تۆبە کردنە. واتە: حیکمەتی خودا داخوازێ ئەوەیە: تاوانی بەندەکانی بەم یاسایە سرپۆش بکا.

چۆنیەتی لیعانو راجیایی شەرعزانان تێ یدا، لەکتێبە شەرعیەکان دا رون کراوەتەوە هەرکەسێ دەیەوێ زیاتر لەم بارەو راووبۆچونی زانایانی ئیسلام شارەزا بێ بابگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە تایبەتییەکان، بەتایبەتی کتێبی (المذاهب الاربعة ٥-١) للجزیری و(الفقه الاسلامی وأدلته) للزحیلی (وأحکام المراة والبیت المسلم) لعبدالکریم زیدان.

**حوکمی پێنجەم چیرۆکی بوختان کردن بەدایکی موسوڵمانان خاتوو عائیشە (رضي الله عنها)**

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡۚ لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُم مَّا ٱكۡتَسَبَ مِنَ ٱلۡإِثۡمِۚ وَٱلَّذِي تَوَلَّىٰ كِبۡرَهُۥ مِنۡهُمۡ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١﴾ لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ خَيۡرٗا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفۡكٞ مُّبِينٞ ﴿١٢﴾ لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَۚ فَإِذۡ لَمۡ يَأۡتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ لَمَسَّكُمۡ فِي مَآ أَفَضۡتُمۡ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذۡ تَلَقَّوۡنَهُۥ بِأَلۡسِنَتِكُمۡ وَتَقُولُونَ بِأَفۡوَاهِكُم مَّا لَيۡسَ لَكُم بِهِۦ عِلۡمٞ وَتَحۡسَبُونَهُۥ هَيِّنٗا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ قُلۡتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُواْ لِمِثۡلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم

مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾

زانایانی ئیسلام لەوانە ئیمامی ئەحمەدو بوخاریو موسلیم لەخاتوو عائیشەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: عادەتی پێغەمبەر ﷺ وابوو: هەرکاتێ بیویستایە سەفەر بکا قورعەی دەخستە نێوان خێزانەکانیەوە، کێ پشکەکەی بۆ دەربچویایە،

ئەوی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ سەفەرەکە. وارێ کەوت: کەویستی بچێ بۆ غەزای (بنی المصطلق) پشکی لەنێوانماندا ئەنجامدا، قورعەکە بەناوی منەوە دەرچوو، ئیتر لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوم بۆ سەفەرەکە، ئەمە دوای نازڵبوونی ئایەتی حیجاب بوو. ئەمن لەناو کەژاوەکەدا دەبووم، کەژاوەکە دەخرایە سەر حوشترێك‌و منی تێدا بووم باردەکرام‌و دادەگیرام. رۆیشتین‌و درێژەمان بەسەفەردا تا پێغەمبەر ﷺ لەغەزاکەی بۆوەو گەڕاینەوەو لەشاری مەدینە نزیك بووینەوە، شەو کەسوپا ویستی بکەوێتەگەڕو بارو بارگەنە پێچرانەوە، ئالەوکاتەدا بۆ چوونە سەرئاو تۆزێك لەسوپاکە دوور کەوتمەوە. کەدەستم بەناو گەیاند گەڕامەوە بۆلای کەژاوەکەی خۆم، دەستم لەسینگ‌و بەرۆکی خۆم دا ملونکەکەم لەمیروی ظەفاری یەمەن بوو لێم پچڕا بوو گەڕامەوە بۆ شوێنەکەو هەوڵم دا بیدۆزمەوەو ماوەیەك پێوەی خافڵام، سوپا بەرێ کەوتبوو کەژاوەکەی منیان بار کردبوو وایانزانی بوو من لەوێدام.

چونکە عائیشە ئەوەندە سوك‌و بێ گۆشت بوبوو پێیان نەزانی بوو کەلەناو کەژاوەکەدا نیە.

عائیشە دەفەرموێ: من ئەوکاتە ئافرەتێکی تازە پێگەییشتوو بووم، کەهاتمەوە بۆ شوێنی خۆم سەیرم کرد کەس نەماوەو کاروان باری کردوە، لەشوێنی خۆم خۆم کوشمەڵە کردو خۆم داپۆشی، دەمزانی: کەپێیانزانی دێن بەدوام دا.

حالەکاتێك دا من لەشوێنی خۆم دانیشتبووم چاوم چوونە بیرەخەو (صفوان) ی کوڕی (المعطل السلمی) لەسوپاکە دوا دەکەوێ بۆئەوەی بزانێ چی بەجێماوە، کەدەرپوانێ واتارمایی ئادەمیزادێك دیارە نوستووەو من دەبینێ‌و دەمناسێ، چونکە پێش نازڵبوونی ئایەتی حیجاب منی بینیبوو، لەدەنگی ئەو بەخەبەر هاتم کەدەیگوت: (إنا لله وإنا اليه راجعون) ئیتر خێرا بە ڕوپۆشەکەم دەم‌و چاوی خۆمم داپۆشین، سوێندم بەخودا یەك قسەشی لەگەڵ نەکردم، جگەلەوەی کەگوتی: (إنا لله وإنا اليه راجعون) ورتەم لێ نەبیست. ئیتر حوشترەکەی پیخ داو سواری بووم‌و بەرێ

کەوتین، ئەو ریشمەکەی رادەکێشا، هەتا گەیشتینەوە سوپاکە کەبۆ پشوودانی نیوەڕۆ بارو بارگەنەیان خستبوو.

جا لەڕیوایەتەکەدا هاتووە دەفەرموێ: کەسوپاکە ئەم دیمەنە دەبینن‌و عائیشە دەناسن کۆمەڵی دووڕوو بەسەرۆکایەتی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبی سەلول دەکەونە تەنینی درۆو بوختان بۆ عائیشەو بەناو سوپاو شاردا بڵاوی دەکەنەوە ئەم بوختان‌و تۆمەتە دەست هەڵبەستە دەکەنە رازو قسەی سەر زوبانیان‌و تادەگاتەوە بەپێغەمبەر ﷺ ئەویش زۆری پێناخۆش دەبێ، چونکە هەرچەند دەزانێ (عائیشەو صەفوان) هیچیان لەوانە نین، کەخیانەتی ئاوهایان لێ روبدا، بەڵام شەیتان زیندوەو عائیشەش گەنج‌و تازە پێگەیشتووە، ئەمە دڵە راوکەو ئاژاوەی دەروونی تێدا پەیدا دەکا. دایك‌و باوکی عائیشە (ئەبوبەکرو خێزانی) هەواڵەکەیان بەرگوێ دەکەوێ‌و زۆری پێ دڵگران دەبن، لەعەیبەتا خەریك دەبێ گیانیان دەربچێ، بەڵام نەپێغەمبەرو نەئەبوبەکرو خێزانی‌و کەسانی تریش نایانەوێ ئەو قسەیە بەڕوی عائیشەدا بدەنەوەو لەڕوی بدەن، تەنها ئەوەندە نەبێ عائیشە هەست بەوەدەکا: کەپێغەمبەر ﷺ خۆشەویستی‌و سۆزی جارانی بۆی نەماوە.

جا کەدێنەوە بۆ مەدینە خاتووعائیشە نەخۆش دەکەوێ‌و نارەحەتی‌و ئازار روی تێدەکا، لەهەمان کاتیشدا بێ سۆزی لەپێغەمبەر ﷺ هەست پێدەکا، ئیتر داوا لەپێغەمبەر ﷺ دەکا ئیزنی بدا بچێتەوە ماڵی باوکی. پێغەمبەری خودا زۆر بێ تاقەت‌و غەمبار دەبێ‌و دەکەوێتە راوێژ لەگەڵ هاوەڵانی دا: کەچی بکا! ئایا دەس بەرداری عائیشە ببێ یانا؟؟

لەوانە (أسامة)و (عمر) دەڵێن: وازی لێ مەهێنە بەخودا جگە لەچاکی هیچی تری لێ نابینی. (عەلی) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا، هەرزن زۆرن، تۆ هەرگیز پەکت لەژن ناکەوێ، بەڵام بنێرە بەدوو (بورەیدە)ی کارەکەری داو پرسیاری لێ بکە. بورەیدە دەڵێ: بەو خودایەی تۆی کردوە بەپێغەمبەر من هیچم لێ نەدیوە: کەجێگای تۆمەت‌و گومان بێ‌و بیکەم بەرەخنە لێی. ئەوەندە هەیە ئەم ئافرەتە

تازه پێگەیشتوو منداڵە، زۆرجار کەمتەرخەمی دەکا، وادەبێ هەویر دەشێلم دەڵێم ئاگات لێ بێ، گوێی ناداتێو خەوی لێ دەکەوێو ئاژەڵ هەویرەکه دەخوا.

لەزینەبی خێزانیشی پرسی ئەویش وتی: خودا هەڵناگرێ بەخودا لەچاکە بەولاوە هیچم لێ نەدیوە. لەناو خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ تەنها (زەینەب) هاوشانی عائیشە دەبێ، بەڵام لەخودا ترساو هیچ خراپەیەکی پاڵ نەدا، کەچی (حەمنە)ی خوشکی زەینەب لەبەر (زەینەب) کەوتە بڵاوکردنەوەی بوختانەکەو هاوبەشی دووڕووەکانی کرد.

نەخۆشیەکەی عائیشە نزیکەی مانگێك درێژەی کێشا، پاشان وردە وردە تۆزی باری لەشی سووك بوو، شەوێك لەگەڵ دایکی (مسطح) دا، کەپووری ئەبوبەکر بوو دەچن بۆ دەشت بۆ دەست بەئاو گەیاندن دایکی (مسطح) قاچی هەڵدەخلیسکێ دەڵێ: دەك مسطح خەجاڵەتو داماو بی! عائیشە دەڵێ: چۆن دەربارەی پیاوێکی موسوڵمانی موهاجیر کەهاوبەشی بەدری کردوە شتی وادەڵێ ی. ئەویش دەڵێ: بۆ نەتزانیوە چی گوتووە؟؟ ئیتر لەنووکەوە باسو هەواڵی بۆ دەگێڕێتەوە. ئیتر خاتوو عائیشە واقی وڕدەمێنێو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، گریان خەوو خواردنی لێ هەڵدەگرێ. بەدایکی دەڵێ بۆچی زوو ئەم باسو خواسەت بۆ نەگێڕاومەوە؟؟ دایکی دەڵێ: کچم! لەسەرەخۆبە. بەخودا کەم ڕێ دەکەوێ ئافرەتێکی وەکوو تۆ لای پیاوێکی باش بێو هەوێسار بێ، ناوو ناتۆرەی لێ نەنێن، ئیتر عائیشە بەشەوو بەرۆژ پیشەی بوو بەگریانو شیوەن!

پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوت وتارێك دەداو دەفەرموێ: موسوڵمانینە بۆچیو لەسەرچی دەربارەی خێزانەکانم ئازارم دەدەن؟ بەخودا من بۆخۆم هیچ خراپەیەکم لێ نەدیوون. هەستم بەهیچ نەکردوە، موسوڵمانەکان لەناو خۆیان دا لێیان دەبێتە کێشەو خەریك دەبێ تێك بچن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئارامیان دەکاتەوەو نایەڵێ: پەرەبەدەنگ لێ بەرزبوونەوەکەیان بدەنو بێدەنگیان دەکا.

ئەمجار تەشریفی دەچێ بۆ ماڵی ئەبوبەکرو دەست دەکا بەئامۆژگاریی عائیشەو داوای لێ دەکا تۆبە بکا ئەگەر لەفەرزێکدا شتی واڕوی دابێ. عائیشە دەڵێ:

بەخودا تۆبە ناکەمو هیچیش نالّیم. بەلّکوو خودا بۆخۆی بێ بەهاوارمەوەمو لەم تەنگانە رزگارم بکا(فصبر جمیل) دەکەمە پیشەی خۆمو ئارام دەگرم.

ئەمجار عائیشە دەفەرموێ: من بۆخۆم دلّنیا بووم لەخۆم: کەپاکمو بێ تاوانم، بەلاّم هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبووم ئایەتی قورئان دەربارەم نازلّ بێ، من بەتەما بووم پێغەمبەر ﷺ بەخەو ئەو رووداوەی بۆ رون بێتەوەمو دەربکەوێ: کەمن پاکمو ئەوەی دەربارەم گوتراوە: جگە لەبوختانو هەلّبەست هیچی تر نیە.

مالّو خێزانی ئەبوبەکر ﷺ لەوپەڕی تەنگو چەلّەمەدا بوونو باوەڕ ناکرێ کەس تائێستا تووشی کارەساتی واناخۆشو گران هاتبێ.

هەر لەوکاتەدا نیگا بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتە خوارەوەمو من خۆشیو کامەرانی روی تێکردم، زانیم دەرووم لێ کرایەوە بەلاّم باوکمو دایکم دلّەکوتەیان بوو، دەترسان قورئان باسی خراپی من بکا. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرموی: عائیشە! موژدەبێ پەروەردگار پاکییەتی تۆی ناردە خوارەوە. ئیتر ئایەتەکانی خوێندەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ - تا دەگاتە: وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾.

عائیشە دەفەرموێ: ئیتر خۆشیو شادی کەوتە ناو خێزانەکەمانەوە، لەخۆشیان نەماندەزانی چ بکەینو چ بلّێین: دایکم وتی: هەلّسە بچۆ بۆلای پێغەمبەرو سوپاسی بکە. وتم: بەخودا ناچمو تەنها سوپاسی خودا دەکەم. ئینجا پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چوو بۆ مزگەوتو ئایەتەکانی خوێندەوەمو موسولّمانان دلّشاد بوونو دووڕووەکان لوتیان شکاو شەرمەزار بوونو بەم بۆنەوە ئایەت دەربارەی بوختانکەر هاتە خوارەوە.

پیوەندی موناسەبەی ئەم کۆمەلّە ئایەتانە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: کەلەوە پێش حوکمی بوختانکردنی بەئافرەتی بێگانە رون کردوە، هەروەها حوکمی بوختانکردنی مێرد بەخێزانی خۆی شی کردوە، ئەمجار پەروەردگار لەم دەنایەتەدا بەرائەتی عائیشە (دایکی موسولّمانان) لەو تاوانەی پالّیان دابوو راگەیاند، بوختانکەرو دووڕووەکانی بەدرۆ خستەوە. کۆمەلّێ ئادابو رەوشتی فێرکردن: کەپێویستە پابەندیان بن، جلّەوگیری لێکردن لەهەندێ شت: کەنابێ توخنیان بکەون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ بێگومان

ئەوانەی ئەو بوختانەیان هەڵبەستو هێنایانو بڵاویان کردەوە کۆمەڵێکن لەئێوە، یەكو دوو نەبوون. ئەو بوختانە گەورەیەی بۆ عائیشە هەڵبەسترا بەسەرۆکایەتی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیو لەگەڵ کۆمەڵێکی تردا رێك کەوتنو بەناو خەڵك دا بڵاویان کردەوەو بانگەشەیان بۆ کردو زۆریان گوتو گۆتەوە، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەکار لەدڵو دەروونی هەندێ موسوڵمانیش بکەنو ئەوانیش قسەی تێدا بکەن.

بڵاوبوونەوەی ئەم بوختانو هەواڵە نزیکەی مانگێکی خایاند لەم ماوەیەدا دووڕووەکان هەرچی هێزو توانایان هەبوو خستیانەگەڕ بۆئەوەی باش ئەم هەواڵە بەناو خەڵکی دا بڵاوبکەنەوە.

کەدەفەرموێ: ﴿عُصْبَةٌ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە کەئەو بوختانکەرانە کۆمەڵێکی کەم نەبوون، کەدەفەرموێ ﴿مِنْكُمْ﴾ واتە بەڕواڵەت بەموسوڵمان لەقەڵەم دەدرانو حوکمی ئیسلامیان بەسەردا دەدرا.

﴿لا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَكُمْ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ ئەی خێزانی ئەبوبەکرو هەموو ئەوانەی: کەبەو بوختانە دڵتەنگ بوون! وامەزانن: ئەو رووداوە شەڕو نەگبەتی بوو بۆ ئێوە، بەڵکوو خێرو فەڕ بوو بۆتان لەدونیاو قیامەت دا، لەدونیادا ئەو رێزلێنانو شکۆمەندییەی کەبەعائیشە بەخشراو تارۆژی قیامەت بەڕائەتو داوێنپاکی ئەو لەقورئان دا دەخوێندرێتەوە. لەقیامەتیش دا خێرو پاداشی زۆرو زەبەندە بۆتان. هەروا هەڕەشەی گەورە بۆ ئەوانەی لەوبارەوە قسەیان کردوە.. ﴿لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ مَا اكْتَسَبَ مِنَ الإِثْمِ﴾ بۆ هەریەکێك لەوانەی قسەیان لەو تاوانەدا کردوەو بوختانی بۆ عائیشە هەڵبەستووە بەشێکی لەو عەزابە گەورەیەی قیامەت بەردەکەوێ، ﴿وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەوکەسەی زۆربەی ئەو تاوانەی لەخۆ گرتووەو رۆڵی سەرەکی هەبوو لەهەڵبەستنی دا - کەزۆربەی موفەسسیرین دەڵێن: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە - چوونکە ئەو یەکەم کەس بوو کەئەو بوختانەی هەڵبەست، عەزابی گەورەی بۆ هەیە لەدونیاو قیامەت دا، لەدونیادا بەوە: کەدوو ڕووی یەکەی ئاشکرا بوو لەناو کۆمەڵگادا ریسوا بوو، لەقیامەتیش دا دەخرێتە بنکی دۆزەخەوەو شوێنی هەتا هەتایی ئەو شوێنی پڕ عەزابو مەینەتییە.

هەندێك دەڵێن: مەبەست بەوكەسە حەسسانی كوڕی ثابیتە. بەڵام قسەیەكی دورو وێ نەچوە، چونكە حەسسان یەكێكە لەهاوەڵە بەرێزەكانی پێغەمبەرو بەشیعر داكۆكی لەپێغەمبەر ﷺ كردوە، هەر ئەویش بوو پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: (اهجهم وجبريل معك) یان (وروح القدس معك) ئەمجار پەروەردگار ئەو موسوڵمانانە ئەدەب دادەدا: كەخۆیان لەبوختانەكەدا هاوبەش كردو ڕۆڵی خۆیان لەو تاوانەدا گێڕا بەنۆ شت سەرزەنشتی كردن و فەرمووی:

١- ﴿لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْراً وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُبِينٌ﴾ ئەی موسوڵمانینە! بۆچی: كەقسەی بوختانكەرانتان بیست، بۆچی گومانی باشتان دەربارەی عائیشە نەبردو حوسنی ظەنتان بەكار نەهێناو نەتان گوت: ئەم قسەیە درۆیەكی هەڵبەستراوو بێ بناغەیە! بۆچی بەصەراحەت بەراءەتی عائیشەتان ڕانەگەیاند؟ چونكە بێگومان ئەوەی ڕوی دا جێگای گومان نەبوو، چونكە عائیشە كە گەییشتەوە سوپاكە بەسواری وڵاغەكەی صەفوانی كوڕی (المعطل) كاتی نیوەڕۆ بوو، هەموو سوپاكە بینیان عائیشە بەسواری وڵاغەكەی صەفوانەوە بوو، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیان دا ئەوەدیمەنەی بینی، دەی ئەگەر خوا نەخواستە شتێك ڕوی بدایەو عائیشە خیانەتی بكردایە، بەتەئكید بەشێوەیەكی تر دەبوو، ئاوا بەبەرچاوەوە نەدەگەییشتەوە سوپا، بەڵكوو بەشێوەیەكی شێردراوە دەبوو.

ئەمەش ئەدەب و ڕەوشتێكی گشتیەو ئاماژە بەوە دەكا، كەپێویستە موسوڵمان جگە لەگومانی چاكە هیچ جۆرە گومانێكی تر بەموسوڵمانان نەبا.

﴿لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ بۆچی ئەوانە چوار شایەتیان نەهێنا بۆ چەسپاندنی قسەكەیان؟!

﴿فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِنْدَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾ جا كاتێك ئەوان نەیانتوانی چوار شایەتی بڕوا پێكراو ئامادە بكەن بۆ چەسپاندنی تۆمەتەكەیان، دیارە ئەمانە بەحوكم و بڕیاری خودا بەدرۆزن حسێب كراون و تاوانبارو بەدخون، جێگای بڕوا نین.

٣- ﴿وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِي مَا أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەگەر فەضلو بەخشندەیی خودا نەبوایە بەسەرتانەوە، لەدونیاو قیامەت دا گیرۆدەی سزایەکی گەورە دەبوون، ئەگەر فەضلو گەورەیی خودا نەبوایە: کەلەدونیادا جۆرەها نیعمەتی پێ داونو نیعمەتێکیان ئەوەیە مۆڵەتتان دەدا بۆئەوەی بتوانن تۆبە بکەن، رەحم کردنیشی لەقیامەت دا: کەلێخۆشبوونو تاوانپۆشینتانە، ئەگەر ئەو فەضلو رەحمەتەی خودا نەبوایە پەلە دەکرا لەسزادانتان لەتۆڵەی ئەوەی: کەبوختانەکەتان کردە سەرەباسی سەرەکی گفتوگۆی رۆژانەتان. دەتانگوتو دەتانگوتەوە.

٤- ﴿إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئەگەر فەضلو رەحمەتی خودا نەبوایە عەزابی سەخت توشتان دەهات؛ لەوکاتەدا: کەقسەو باسی بوختانەکەتان قۆزتەوەو هەریەکەتان لەبەر خۆیەوە پرسیاری لەوی تر دەکردو دەچوونە ناو باسەکەوەو هەریەکەتان لەبەر خۆیەوە رەملی دەهاویشتو بەبێ بەلگە قسەی خۆی تێهەلکێش دەکردو پێتان وابوو، ئەوە کارێکی بچوکو ئاسانەو شتێکی ئاسایی یە! بەلام باش بزانن ئەو بوختانو هەلبەستە لەشەریعەتو حوکمی خودادا کارێکی خەتەرناکو تاوانێکی گەورەو سزا ئاوەرە، یەکێکە لەتاوانە گەورەکان چونکە پیسکردنی خانەوادەی پێغەمبەری تێدایە، ناشرینترین رەوشت وەپاڵ خێزانی پێغەمبەرﷺ درا.

لەصەحیحەین دا هاتووە دەفەرموێ: (ان الرجل ليتكلم بالكلمة من سخط الله، لايدرى ماتبلغ يهوى بها فى النار أبعد مما بين السماء والأرض) بێگومان پیاو جاری وادەبێ قسەیەك دەکا لەو قسانەی دەبنە هۆی نارەزامەندیی خودا، نازانێ چەند تاوانێکی گەورەی تێدایە، ئەو قسە بەئەندازەی نێوان ئاسمانو زەوی بەدۆزەخ دا دەیباتە خوارێ.

**بەکورتی پەروەردگار سێ تاوانی وەپاڵ بوختانکەرەکان دانو بەسۆنگەی ئەو تاوانانەشەوە عەزابی گەورەی بۆ داناون:-**

أ- قۆزتنەوەو بلاوکردنەوەی بوختانەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان، ئەوە بوو یەکێك تووشی یەکێك دەبوو دوای سەلامو چاكو چۆنی لەیەکتریان دەپرسی

دەنگو باس چیەو چ هەواڵێکت بیستووە؟ ئەویش یەکسەر باسی بوختانە بۆری دەهێنایە پێشەوە. هەتا باش باش بەناو هەموو خەڵکدا بڵاوبووەوە ماڵو خێزان نەماو دیوەخان نەما ئەم هەواڵەی تێدا باس نەکرێ.

ب- قسەیەك بەزوبان دەگوتراو چ واقعێکی نەبوو، قسەیەك بوو فڕێ دەدراو بێ بەڵگەو نیشانەو شاهیدو ئیثبات.

ج- بەسووك زانینی بوختانەکەو پێیان وابوو شتێکی کەمە بەڵام لەراستی دا لای خودا زۆر گەورەو گرنگەو بوختانکەرو بڵاوکەرەوەی شیاوی عەزابی سەختە.

٥- ﴿وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُمْ مَا يَكُونُ لَنَا أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ بۆچی کەئەو دەنگو باسە نەشیاوەتان بیست خێرا نەتانگوت: ئەمە ناگونجێو راستی تێدا نیەو نابێ قسەی لەو جۆرە بەزوبانی ئێمە بگوترێو بەدەمی ئێمە بکرێ. بۆ نەتان گوت رەوا نیە ئێمە ناموسو عەرضی پێغەمبەر ﷺ بخەینە بەرباسو لێکۆڵینەوە.؟

بۆ نەتان گوت (سبحان الله) چۆن دەبێ قسەی واو بۆختانی لەوجۆرەبۆ خێزانی پێغەمبەر ﷺ هەڵببەسترێ؟ دەبوایە یەکسەر بڵێن: ئێمە سەرمان سوڕماوەو لەگەورەیی ئەم کارەو خودا زۆر بەرزو پیرۆزەو دوورە لەوەی خێزانی پێغەمبەرەکەی رەوشتی وای هەبێ! دەبوایە یەکسەر بڵێن: ئەمە بوختانێکی فرەمەزنەو هەڵبەستراوێکی بێ بناغەیەو تاوانێکی گەورەو گرانەو ئازاردانی پێغەمبەرەو نابێ ئێمە شتی وا رەچاو بکەینو بڵاوی بکەینەوە. دەبوایە بڵێن: خودایە ئێمە لەو تاوانبارانە بەرینو خۆمان ناخەینە پێڕی ئەوانەوە. نامانەوێ بەگوێی خۆمان شتی وابیستینو بەزوبان شتی وابڵێین، بەکورتی دەبوایە بڵێن: خودای ئێمە زۆر لەوەبەرزو پیرۆزترە کەرازی بێ بەستەمی بوختانکەرانو عەزابیان نەدا لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە. زۆر دوورو نەگونجاوە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ تاوانی ئاوەهای لێ ڕوبدرێ، دینو عەقڵ شتی وا بەنەگونجاو دەزانن، ئەمە ئەزیەتدانی پێغەمبەرەو تاوانەو ئەنجامدەرانی لەدونیاو قیامەت دا نەفرین لێکراون، خودا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ﴾ (الاحزاب/٥٧)

٦- ﴿يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَنْ تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَداً إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ پەروەردگار پەندو ئامۆژگاریتان دەکا، جلەو گیریتان لێ دەکا لەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆسەر ئەم جۆرە کارانە، نابێ‌و ناگونجێ جارێکی تر تاوانی ئاوەها ئەنجام بدەن، ئەگەر ئێوە ئەهلی ئیمان‌و باوەڕن‌و بڕواتان بەشەرع‌و یاسای خودا هەیەو ڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەگرن‌و پابەندی فەرمان‌و جلەو گیرییەکانی ئایینن جارێکی تر توخن کاری ئاوا مەکەون!

﴿وَيُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: پەروەردگار ئەحکامی شەرعی‌و ئادابی ئایینی‌و کۆمەڵایەتیتان بۆ ڕون دەکاتەوە، پەروەردگار دەزانێ چی لەبەرژەوەندیی بەندەکانیەتی‌و چی کۆمەڵ‌و ڕیزەکانیان ڕێک دەخا، ئاگادارە بەسەر حاڵ‌و چۆنیەتی بەندەکانی دا، پاداشی هەموو ئادەمیزادێک بەگوێرەی کردەوەکانی دەداتەوە، حەکیم‌و دانایە لەیاسادانان‌و مەزندە کردنی دا، لەبەڕێوە بردنی ئیش‌و کاری دروستکراوانی دا، ئەو ئەرکانەی دەیانخاتە سەر بەندەکانی بەختەوەری دونیاو قیامەتیان دەستەبەر دەکا.

٧- ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ بێگومان ئەوانەی بەمەبەست‌و بەئەنقەست فاحیشە بڵاو دەکەنەوە، ئەوانەی پێیان خۆشە بەدرەوشتی بڵاو ببێتەوە هەواڵی داوێن پیسی‌و زینا لەنێو کۆمەڵی موسوڵمانان دا ببیسترێ‌و باوبێ، ئەوانە لەدونیادا سزای سەخت‌و بەئێشیان هەیە، لەدونیادا داری حەدو درۆزنییان لێ دەدرێ‌و شایەتییان وەرناگیرێ، لەقیامەتیش دا عەزابی دۆزەخ. خودا بۆخۆی حەقائیقی هەموو شتێک دەزانێ‌و هیچی لێ گوم نابێ، دەزانێ ناو دڵەکان چییان تێدایەو چییان تێدا حەشاردراوە. کەوابێ هەموو شتێک بۆلای خودا بگەڕێننەوە بەهەڵە ناچن، ئێوە بۆ خۆتان بەهۆی نەزانی‌و ئاگادار نەبوونتان بەسەر واقیعی ڕوداوەکان دا زۆر لەحەقایقی شتەکان نازانن، شتێک مەڵێن: کەزانیاریتان دەربارەی نیە بەتایبەتی دەربارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ.

ئیمام ئەحمەد لەثەوبانەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێ: (لا تؤذوا عباد الله ولا تعيروهم، ولاتطلبوا عوراتهم، فانه من طلب عورة أخيه المسلم طلب الله عورته

حتى يفضحه في بيته) واته: ئەزیەتی بەندەکانی خودا مەدەن عەیبداریان مەکەن حەیاو ناموسیان مەخەنە بەر لێکۆلینەوەو پرس‌و پرسیار، حەیاو نامووسی موسوڵمانان لەکەدار مەکەن، چونکه بێگومان کەسێك بیەوێ ناموس‌و عەورەتی برای موسوڵمانی لەکەدار بکاو بیخاتە سەر دەم‌و زاران، خودا لەماڵ‌و منداڵی خۆیدا ریسوای دەکا.

ئەم ئەدەبدادانە خودایی یە مانایەکی فرەگرنگی هەیە، چوونکە بڵاوبوونەوەی دەنگ‌و باسی داوێن پیسی لەناو کۆمەڵگادا ئادەمیزادان هەڵدەنێ بۆ ئەنجامدانی، وایان لێ دەکا بەشتێکی ئاسایی بزانن‌و تێ ی بکەون!

ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا: کەتەنها حەزکردن لەبڵاوبوونەوەی فاحیشە دەبێتە هۆی سزای سەختی دۆزەخ. جا کەوابێ ئەوانەی بەفیعلی بڵاوی دەکەنەوە تاوانیان گەورەترو سزایان سەخت ترەو زیاتر خۆیان شیاوی عەزابی خودا دەکەن. ئاشکراشە سەرچاوەی حەزکردن لەناو زڕاندن‌و تۆمەتبارکردنی ئادەمیزادان رق لێبوون‌و دزاندنیانە. خۆبەزلزانی‌و خۆ بەرزگرتنە بەسەر خەڵك دا، حەسوودی بردنە بەخودا پێداوان، پێی ناخۆشە کۆمەڵگا ئارام‌و بەختەوەر بێ. وادەزانێ لەکەدار کردنی نامووسی خەڵك‌و ناو زڕاندیان رێزو شکۆمەندییە بۆخۆی، بەڵام باوانەزانن، ئەوە دەبێتە هۆی ریسوابوونی خۆی!!

٨- ﴿وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ ئەگەر فەضل‌و بەزەیی خودا نەبوایە شتێکی ترتان بەسەر دەهات، وەڵامی ﴿وَلَوْلا﴾ مەزندە کراوە لەدەقەکەدا، واتە: ئەگەر فەضل‌و بەزەیی خودا نەبوایە بەهیلاك دەچوون، یان خودا عەزابی دەدان‌و هەمووتانی قەلاچۆ دەکرد، بەڵام خودا بەلوطف‌و لێ بووردەیە بۆ بەندەکانی‌و رەحمیان پێ دەکا، تۆبەی لەتۆبەکاران وەرگرت، ئەوانەی دەستیان لەم بوختانەیا هەبوو تۆبەیان کرد تۆبەیان لێ وەرگیرا، شارەزایی کردن بۆ رێبازی راست‌و بەرنامەی تۆکمەو خودا پەسند، ترساندنی لەوەی جارێکی تر بگەرێنەوە سەر ئەو رەوشتە دزێوە: کە لەکەدار کردنی خانەوادەی پێغەمبەری ﷺ تێدایە.

بۆی رونکردەوە ئەو بوختانە چەند کردەوەیەکی دزێوو چ تاوانێکی گەورەو سامناکە. بۆیە لەئایەتی دوایی دا موسوڵمانان لەوەسوەسەی شەیتان دەترسێنێو دەفەرموێ:

٩- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَنْ يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕنو خودا بەیەك دەناسنو شوێن پەیامی پێغەمبەری خودا کەوتوون، شوێن هەنگاوی شەیتان مەکەون، ڕێبازی ئەو پەیڕەو مەکەن، گوێ بۆ وەسوەسەو ختوکەی مەگرن، ڕێگا مەدەن کارتان تێ بکاو هەڵتانخەڵەتێنێ، گوێچکەی خۆتان بۆ بوختانو قسەی ناشیرین کلۆر مەکەن، هەوڵ مەدەن فاحیشە ببیسنو بڵاوی بکەنەوە بەناو موسوڵمانان دا، کەسێك شوێن هەنگاوی شەیتان بکەوێ، بادڵنیا بێ کەشەیتان جگەلە فەرمان کردن بەفەحشاو خراپەکاری فەرمان بەشتی تر ناکا، هەر شتێك زۆر ناشرین نەبێ شەیتان فەرمانی پێناکا، هەر شتێك شەریعەتی خودا نەهی لێ نەکردبێو عەقڵو سروش قێزی لێ نەکاتەوە شەیتان فەرمانی پێناکاو خەڵکی بۆ هەڵنانێ.. کەوابوو دروست نیە بۆ موسوڵمان شوێنی بکەوێو بەقسەی بکا!

ئایەتەکە هەرچەندە بەتایبەتی جڵەوگیری لەموسوڵمانان کردوە لەوەی: کەشوێن هەنگاوی شەیتان بکەون، وەلێ لەڕاستی دا گشتی یەو فەرمانەکە هەموو موکەلەفێك دەگرێتەوە، چونکە دوابەدوای خیطاب لەگەڵ موسوڵمانان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ....﴾ ئەمەش ئوسلوبی گشتگیرەو ئەوە دەگەیەنێ: کەهەموو کەس بەمەرجێ تەکلیفیان لەسەر بێ نابێ توخن ئەو تاوانانە بکەون! بۆیەش لەسەرتاوە بەتایبەتی ناوی موسوڵمانانی هێنا بۆئەوەی زیاتر توندو تیژی بکەن لەخۆپاراستن لەتاوان تا نەچنە ڕیزی بوختانکەرانو وەکوو ئەوان شیاوی عەزابی دۆزەخ نەبن.

﴿وَلَوْلا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ﴾ ئەگەر فەضلو نیعمەتی خودا نەبوایە بۆ ئێوە: کەتەوفیقی دان بۆ ئەوەی تۆبە بکەنو لەتاوان پاك ببنەوە، کەس لەتاوان ڕزگاری نەدەبوو، کەس لەنەخۆشی شیركو تاوانو ڕەوشتی ناشیرین قوتاری نەدەبوو، بەڵکوو خێرا سزای ڕیشەکێشکەری بۆ دەناردنو لەناوی دەبردن!

وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ﴾ (النحل/٦١)

﴿أَبَداً وَلَكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بەڵام پەروەردگاری حەکیم‌و دانا بەندەکانی خۆی بەتۆبەکردن لەتاوان پاك دەکاتەوەو تۆفیقیان دەدا بۆ کاری چاك‌و خودا پەسند، کەسێك خودا بیەوێ پاکی بکاتەوە، رەحمی پێ دەکاو رێگای تۆبەکردنی فێردەکا، تاوانەکانی دەشواتەوە وەکوو چۆن دەربارەی بوختان بەعائیشە تۆبەی لەحەسسان‌و میسطەح‌و غەیری ئەوانیش وەرگرت. خودا قسەو رازی بەندەکانی دەبیسێ بەتایبەتی لەحاڵەتی ئەنجامدانی تاوان‌و ئیخلاص بۆ لێ رزگار بوونی‌و سرینەوەو داپۆشینی، زاناو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێك داو دەزانێ کێ بەکردارو گوفتار شیاوی هیدایەتدانەو کێ شیاوی گومڕا بوونە.

دەزانێ کێ سوور بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی فاحیشەو کێ تۆبەی لێکردوەو گەڕاوەتەوە، هەرکەسە بەگوێرەی خۆی سزاو پاداشی خۆی وەردەگرێتەوە.

ئەمجار دوای ئەدەبدادانی ئەهلی بوختان‌و ئەوانەی بڕوایان بەقسەکانیان کردبوو، ئەدەبی ئەبوبەکریش دا دەدا، ئەوە بوو حەزرەتی ئەبوبەکر سوێندی خوارد: کەئیتر یارمەتی میسطەح نەداو لەوە بەولاوە هیچی نەداتێ. ئەم میسطەحە کوڕی پوری حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، هەتیوو بوو لەماڵی ئەبوبەکردا بوو ئەو سەرپەرشتی دەکرد، بەخێوی دەکرد، ئیتر پەروەردگار بەم ئایەتە ئەدەبی ئەبوبەکری داداو فەرمووی: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ﴾ واتە: باخاوەن فەضل‌و رێز لەئایین‌و رەوشت‌و چاکە کردن دا لەهەبووی‌و ساماندارى دا باسوێند نەخوا: کەئیتر ماڵ‌و سامانی خۆی نابەخشێ بەخزمە نزیکە کۆچکارەکانی وەکوو میسطەح کەکوڕی پووری ئەبوبەکر بوو هەژارو نەبوو بوو. کۆچکار بوو، لەمەککەوە کۆچی کردبوو بۆ مەدینە هاوبەشی شەڕی بەدری کردبوو.

﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا﴾ بالێبوردە بن بۆ خراپەکارو چاوپۆشی لەتاوانەکانیان بکەن، سزایان نەدەن‌و لەبەخششی خۆیان بێ بەشیان نەکەن، بائەو خاوەن فەضل‌و رێزدارانە بگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشوویان‌و لەوە پێش چۆنیان

هەڵس و کەوت کردوە لەگەڵ ئەو جۆرە خزمە هەژارانەیان دا، بالەوە دواش هەروا بکەن، چونکە کەسێك جارێك هەڵەی کرد، پێویستە زیاد لەسزای خۆی سزای تر نەدرێ، دەی خۆ میسطەح داری حەدی لێدراو تۆڵەی هاوبەشیکردنی بوختانی لێ سەندرا، تۆبەی کردو گەڕایەوە، خوداش تۆبەی لێ قبووڵ کرد.!

﴿أَلا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئایا ناتانەوێ خودا تاوانەکانتان لەسەر بپۆشێ و لێتان خۆش ببێ؟؟ چونکە پاداش لەمنموونەی کردەومیە، کەئێوە لەتاوانی کەسێك خۆش دەبن. کەخراپەی بەرامبەر ئەنجام داون خوداش ئاوا لەئێوە خۆش دەبێ، وەکوو تۆ چۆن لێبوردنت هەیە بەرامبەر تاوانکار، خوداش بەوجۆرە لێبوردنی بۆ تۆدەبێ.

پێغەمبەر ﷺ لەفەرموودەیەکی دا: کەطەبەرانی لەجەریرەوە ریوایەتی کردوە: دەفەرموێ: (من لایرحم لایرحم، ومن لایغفر لایغفر له، ومن لایتب لایتب له).

ئەمانە هەڵنان و تەشجیع کردنە بۆ لێخۆشبوون و چاوپۆشی کردن لەتاوانباران، وادە دانی خودایە بۆ بەندەکانی بەلێخۆشبوون و چاوپۆشی کردن لەتاوانی تۆبەکاران، حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ کەئەم ئایەتە نازڵبووخێرا فەرمووی: بەڵێ سوێند بەخودا ئێمە پێمان خۆشە خودا لێمان خۆش بێ، پاشان دەستی کردەوە بەیارمەتیدانی میسطەح و بەخشندەیی بۆی.

**تێبینی:**

ئیمامی مالیك لەرستەی ﴿يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَداً﴾ ئەم حوکمانەی دەرهێناوە: دەفەرموێ:

کەسێك جنێو بە حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عومەر بدا تەمبێ خواردوو دەکرێ، کەسێك جنێو بەعائیشە بدا دەکوژرێ. چونکە پەروەردگار لەم بارەوە دەفەرموێ: ﴿يَعِظُكُمُ اللَّهُ أَن تَعُودُوا لِمِثْلِهِ أَبَداً إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾. جا کەسێك جنێو بەعائیشە بداو بوختانی بۆ بکا، بێگومان سەرپێچی فەرمانی قورئانی کردوە، کەسێکیش سەرپێچی فەرمانی قورئان بکا دەکوژرێ!

ئیبنوکەثیر دەفەرموێ: زانایان کۆ رایان هەیە لەسەر ئەوە: کەکەسێك دوای ئەوەی خوا ئەم بەرائەتەی خاتوو عائیشەی راگەیاند، بوختانی بۆ بکا ئەوە

بێگومان کافرەو دژایەتی فەرمانی خودا دەکا. ئەمەش رەتکردنەوەی بۆچوونەکەی ئیبنولعەرەبییە: کە دەڵێ: هاوەڵانی شافیعی گوتویانە: کەسێك جنێو بەعائیشە بدا تەمبێ دەکرێ. وەکوو باقی موسوڵمانانی تر.[1]

بەڵگەی ئیمام مالیك بەم جۆرەیە دەفەرموێ: بوختانکەران بو ختانیان بۆ عائیشە کردو تۆمەتی زینایان وەپاڵ دا، پەروەردگار بەرائەتی ئەو خاتونەی لەو تاوانە راگەیاند، جا کەسێك دوای ئەوە سوور بێ لەسەر بوختان بۆ کردنی مانای ئەوەیە خودا بەدرۆ دەخاتەوە، کەسێکیش خودا بەدرۆبخاتەوە یەکسەر کافر دەبێ.

ئایەتەکەش ئەوە دەگەیەنێ: کە حەزرەتی ئەبوبەکر دوا پێغەمبەر ﷺ گەورەترین ئادەمیزادی ئوممەتی ئیسلامە چونکە پەروەردگار لەم ئایەتەدا بەچەند صیفاتێك وەصفی کردوە، هەموویان نیشانەی گەورەییو شکۆمەندیی ئەو زاتە پیرۆزەن لەئایین دا.

ئیمام فەخری رازی لەم ئایەتە ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ﴾ چوار صیفەتی بەرزی دەرهێناون، یەکێك لەو صیفەتانە ئەوەیە: بەخاوەن وەصفی موطلەقی داناوە، بەبێ قەیدو شەرت فەضلی رەهای وەپاڵ داوە.

هەروەها وەصفداری کردوە بە ﴿أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ﴾ کە بەکۆ هێناویەتی نەك بەتاك نەك بەتایبەتی. هەندێ لەزانایان فەرموویانە: کاتێك حەزرەتی مەریەم تۆمەتی داوێن پیسی وەپاڵ درا پەروەردگار لەسەر زوبانی عیسای کوڕی تەبرئەی کرد. وەڵێ کاتێك خاتوو عائیشە بەداوێن پیس تۆمەتبار کرا پەروەردگار بۆخۆی بەقورئان بەرائەتی عائیشەی راگەیاند.[2]

ریوایەتکراوە لەعەلی کوڕی زەیدی کوڕی جودعانەوە لەئەنەکییەوە لەعائیشەوە دەفەرموێ: نۆ بەهرەو رێز دراون بەمن نەدراون بەهیچ ئافرەتێکی تر، (١) حەزرەتی جوبرائیل وێنەی منی لەئاسمانەوە لەسەر لەپی دەستی خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ هێناو فەرمانی پێکرد: کەمارەم بکا، (٢) تەنها منی بەکچی هێناوە، هاوسەرەکانی تری هەموویان بێوەژن بوون. (٣) کاتێ وەفاتی کرد سەری لەباوەشی

---

[1] تەفسیری قورطوبی ج٦ /٣٥٣٥ طبعة دار الکفر/١٩٩٩.

[2] تەفسیری قورطوبی ج٦ /٣٥٣٩.

من دا بوو، (٤) لەماڵی من دا نێـژراوە، (٥) فریـشتە دەوری ماڵەکـەی منیـان دا. (٦) ئەگـەر لـەلای هاوسـەرەکانی تـری نیگـای بـۆ بهاتایـە لێـی دوور دەکەوتنـەوە. بـەلام هەرکاتێ لەلای من نیگای بۆ بهاتایە لێم جیا نـەدەبووەوە. (٧) مـن کـچی جێنـشینو هـاوڕێو خۆشەویـستەکەمی، (٨) بەڕائـەتی پـاکو خـاوێنی مـن لەئاسمانـەوە نـازڵ بووە. (٩) وادەی لێخۆشبوونو رزقو رۆژیی بەهەشتم پێ دراوە.

## سزای بوختانکەران ئەوانەی بوختانیان بەخاتو عائیشە کرد

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴾

دوای بـەیانکردنی خەبـەری بوختـانو سـزای بوختانکـەرانو تـەمبێ کردنـی ئەوانەی لەبوختانەکەوە گلان، ئـەمجار پـەروەردگار بەئاشکرا بەڕائـەتی عائیـشەی راگەیانـد، لەتـەك ئەوەشـدا حـوکمێکی گـشتی بـەیان کـرد، حوکمـە گـشتییەکەش

ئەوەیە: هەرکەسێك بوختان بەموسوڵمانێکی داوێن پاك بکا، ئەوە لەڕەحمەتی خودا دوورەو سزایەکی گەورەی بۆ دانراوە.

ئەمەش هەڕەشەیەکی توندو تیژە بۆ ئەوانەی بوختان بەئافرەتی داوێن پاکی بێ تاوان دەکەن! ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ بێگومان ئەوانەی پیاوو ئافرەتی داوێن پاکی خاوەن بڕواو موحصەنو موسوڵمانو خودا پەرستو بێ ئاگا لەتاوان، تۆمەتبار دەکەنو بوختانیان بۆ هەڵدەبەستن بەناحەق تاوانی زینایان وەپاڵ دەدەنو ناویان دەزڕێنن، ﴿لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ ئەوانە لەدونیاو قیامەت دا نەفرینیان لێ کراوە، لەڕەحمەتی خودا بێ بەشن، غەزەبو قاری خودایان لەسەرە، لەقیامەت دا عەزابی بەئێشو سامناکیان لەسەرە، تۆڵەی تاوانی بوختانەکەیان لێ دەسەندرێ، ئیمامی ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو هی تریش لەئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اجتنبوا السبع الموبقات، قيل وما هن يارسول الله؟ قال: الشرك، السحر، وقتل النفس التى حرم الله الا بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات) خۆتان بپارێزن لەحەوت تاوانە بەهیلاکبەرەکان، گوترا: ئەو حەوت تاوانە فەوتێنەرە چین ئەی پێغەمبەری خودا! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوەڵدانان بۆ خودا، سیحر کردن کوشتنی ئادەمیزاد بەناحەق، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، هەڵاتن لەڕۆژی هێرش بردن بۆسەر دوژمن، بوختانکردن بەئافرەتی موحصەنو بێ ئاگاو موسوڵمان.

کە دەفەرموێ: ﴿الْغَافِلاتِ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی بێ ئاگان لەپیلانی ناپاکان چونکە داوێن پاکنو تاوانیان نەکردوە، هیچ حەزەرێك وەرناگرن، دڵو دەروونیان پاکەو هیچ ترسیان نیە، کەبوختانەکە دەبیستن وەکوو لەحەوارا بەر بینەوە وایە.

لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿قذف المحصنة يهدم عمل مئة سنة﴾ بوختانکردن بەئافرەتی داوێنپاكو موسوڵمان کردەوی سەد ساڵ قەڵاچۆ دەکا.

﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ عەزابو سزادانی بوختانکەران لەرۆژی قیامەت دایە، ئەو رۆژەی زوبانیانو دەستو قاچیان شایەتیان لێ دەدەن بەو کردەوانەی کردویانن، چ تاوانێکی بەزوبانی کردوە زوبانی خۆی شایەتی لێ دەدا، هەروا چ تاوانێکی بەدەستی ئەنجام داوە دەستەکەی لێی دەبێتە شایەت. هەروا قاچو ئەندامەکانی تریش لێیان دێنە زوبانو شایەتییان لێ دەدەن. چونکە خودا بەقودرەتی خۆی وەزوبانیان دەهێنێ وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾ (فصلت/٢١)

ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریر لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە: فەرموویەتی: (اذا كان يوم القيامة عرف الكافر بعمله، فيجحد ويخاصم، فيقال له: هؤلاء جيرانك يشهدون عليك، فيقول: كذبوا، فيقال أحلفوا فيحلفون، ثم يصمهم الله، فتشهد عليهم أيديهم وألسنتهم ثم يدخلهم النار) کەرۆژی قیامەت هات کافر کردەوەکانی خۆی بەرەو ڕو دەکرێنەوە، ئیتر ئینکاری دەکاو ناچێتە ژێریان، پێ ی دەگوترێ: ئەوە هاوسێیەکانت شایەتیت لێ دەدەن، دەڵێ: درۆ دەکەن، پێ ی دەگوترێ: خاوو خێزانت خزمو کەسو کارت شایەتیت لێ دەدەن، دەڵێ درۆ دەکەن. دەگوترێ: سوێند بخۆن سوێند دەخۆن، پاشان کەڕیان دەکا ئیتر دەستو زوبانیان شایەتیان لێ دەدەنو پاشان دەیانخاتە ناو دۆزەخەوە.

﴿يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾ لەو رۆژەدا پەروەردگار پاداشو سزای کردەوەکانی ئادەمیزاد بەتەواوی‌و بەعەدالەت دەداتەوە، هەموو دەزانن: وادەو هەڕەشەی خودا، حیسابو لێکۆڵینەوەی هەمووی حەقو بەجێ یە، هەمووی عەدالەتو دادوەرییەو ستەمی تێدا نیە. ئەوەی لەدونیادا گومانیان لێی بوو لەو رۆژەدا دەبێتە حەقیقەتو یەقین.

ئەمجار پەروەردگار کۆتایی بەڕوداوی بوختان دەهێنێو پەردەی بەسەردا دادەداتەوە عەدالەتکاری خۆی بەیان دەکا لەوەدا کەسروشتی ئادەمیزادی وادارشتووە: کەهەرکەسە مەیلی هاو وێنەی خۆی بکا، نەفسی پیس وەگری نەفسی

پیس دەبێ، ئادەمیزادی خاوێن‌و داوێنپاك حەزی لەهاوسەری داوێنپاك هەیە. ئەمەش بەڵگەیەکی تری داوێنپاکی مادی یە لەسەر داوێنپاکی عائیشەو دەفەرموێ: ﴿الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ﴾ ئافرەتی داوێن پیسی زیناکار شیاوی پیاوی داوێن پیسی زیناکارە، پیاوی داوێن پیسی زیناکار شیاوی ئەومیە ئافرەتی داوێن پیسی زیناکار بێنێ.

﴿وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ﴾ ئافرەتی داوێنپاکی خاوەن ناموس بۆ پیاوی موسوڵمانی خاوەن ناموسە، پیاوی داوێنپاکی موسوڵمان‌و لەخودا ترس شیاوی ئافرەتی داوێنپاك‌و عەفیفەیە. چونکە وەکوو دەڵێن: (تەیری گول عاشق بەداری ژەقنەمووتە) هەموو خاوەن رەوشتێك چاك یان خراپ، لەگەڵ هاو وێنەی خۆی هەڵدەکاو دەگونجێ، لێکچوون لەئەخلاق‌و رەوشت دا رۆڵێکی گرنگیان هەیە لەبنەماکانی پێکەوە ژیان‌و بەردەوام بوونی هاوسەری. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾ (النور/٣) مەبەست بە (الخبيثات والطيبات) ئافرەتی بەد رەوشت‌و داوێن پیسە. واتە: عادەتی ئافرەتی بەد رەوشت وایە مەیلی لەپیاوی بەد رەوشتە، ئافرەتی رەوشت جوان مەیلی لەپیاو عەفیف‌و خاوەن رەوشتە..

دەشگونجێ مەبەست بە (الخبيثات) ئەو وشانە بن کەبوختانەکەیان لێ پێك دێ، ئەو کاتە ماناکە ئەم شێوەیە دەبێ، وشەی ناشیرین‌و بوختان‌و هەڵبەستراو شیاوی پیاوی خوێڕی‌و دەروون نەخۆش‌و رەوشت ناشیرینە.

بەپێچەوانەشەوە قسەی جوان‌و رێك‌و پێك پیاوی داناو عاقڵ‌و هۆشمەند دەیکا. پیاوی داناو عاقڵ‌و موسوڵمان قسەی بوختانکەران رەت دەکەنەوەو بڕوایان پێ ناکەن! جا چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی کاکڵەو جەوهەری پاکانە، چاکترینی ئادەمیزادە بەگشتی، دەبێ خاتوو عائیشەی خێزانیشی پوختەی پاکان بێ، کەوابێ بوختانکەران ناماقوڵیان کردو بۆخۆیان گوت، ئەوەی بەئەویانەوە گوت: لەگەڵ واقیعی حاڵ دا ناگونجێ‌و دوورە لەپاك‌و خاوێنی عائیشەو پەروەردە بوونی لەماڵی باوکی داو لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ.

﴿أُوْلَئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ ئه‌و پاك‌و بێگه‌ردانه‌ی وه‌كوو صه‌فوان‌و عائیشه ﵁ دوورن‌و به‌رین له‌وه‌ی بوختانكه‌ران پێیانه‌وه ده‌ڵێن. ئه‌و بێ تاوان‌و داوێنپاكانه، لێخۆشبون‌و تاوانپۆشی خودایان بۆ هه‌یه، رزق‌و رۆزیی پاك‌و خاوێنیان له‌به‌هه‌شتی به‌رین دا بۆ دابین كراوه‌و ده‌یاندرێتێ. وه‌كوو له‌ئایه‌تێكی تردا ده‌فه‌رموێ: ﴿وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ (الاحزاب/٣١) به‌م جۆره باسی روداوی بوختان كۆتایی هات، ئه‌و روداوه‌ی: كه‌كۆمه‌ڵی موسوڵمانانی تێدا گیرۆده بوون لێیان بووه به‌ته‌نگانه‌یه‌كی فره‌مه‌زن، ته‌نگانه‌یه‌كی وه‌ها: كه‌روی له ناو خێزانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كردو مه‌به‌ستیان ئه‌وه‌بوو بتمانه‌و ثیقه‌له‌ماڵی پێغه‌مبه‌ر ﷺ دابڕن‌و له‌كه‌داری بكه‌ن.

په‌روه‌ردگار هه‌رگیز قبوڵ ناكاو ناهێڵێ: كه‌له‌خانه‌واده‌ی پێغه‌مبه‌ردا جگه له‌عونصوری پاك‌و خاوێن‌و داوێنپاك هه‌بێ.. په‌روه‌ردگار پێغه‌مبه‌ری ﷺ كردوه به (القدوة الحسنة) بۆ موسوڵمانان، خانه‌واده‌كه‌شی نموونه‌و پێشانگایه بۆ خێزانی موسوڵمانان.

## ئیزن وه‌رگرتن بۆ چوونه ناو ماڵ‌و دیده‌نی كردن

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَاۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا

غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾

دەربارەی سەبەب نـزولی ئایـەتی ژمـارە (٢٧) فـەریابی‌و ئیبنوجـەریر لەعـەدی کـوڕی ثابیتـەوە ریوایـەتیان کـردوە دەڵـێن: ئـافرەتێکی ئەنـصاری هاتـە خزمـەت پێغەمبەروﷺ عەرزی کرد ئەی رەسـوولی خـودا! مـن لـەماڵی خـۆم دا جاری وادەبـێ بەشێوەیەکم پێم ناخۆشە کەس بم بینێ، کەچی زۆرجار پیاوانی خزم‌و کەس‌و کار خۆ بەماڵم دا دەکەن‌و بەو شێوەیە دەمبینن، نازانم چی بکەم؟ ئیتر ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا.....الاية﴾ نازڵ بوو.

دەربارەی ئایەتی ژمارە (٢٩) ئیبنوئـەبی حاتـەم لـەموقاتیلی کـوڕی حەییانـەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: کەئایەتی ئیزن وەرگرتن بۆ چوونە ناو ماڵی خەڵك نـازڵ بـوو، حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبـەری خـودا! بازرگانـەکانی قـورەیش لـەنێوان شـام‌و مەککـەو مەدینـەدا هـامو شـۆدەکەن‌و لـەرێگا هەریەکـەیان خـانی تایبـەتییان هەیـە، ئەوانـە: کەلـەرێگا لادەدەن بـۆ خـانووی خۆیـان چـۆن ئیـزن وەربگرن‌و سەلام بکەن؟؟ خۆ کەسیان تێدا نیشتەجێ نیە.

ئیتر ئایەتی ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ مَسْكُونَةٍ.. الآية﴾. نازڵ بوو.

پەیوەنـدیی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم رووەوەیـە: کەلـەوە پـێش حـوکمی ئەوانـەی دیـاری کـرد: کـەبوختان بـەداوێنپاکان دەکـەن‌و چـیرۆکی بوختانکـەرانی خـاتوو عائیـشەی گێڕایـەوە، ئـەمجار گونجـاو بـوو ئـاداب‌و رەوشـتی چـوونە مـاڵ‌و دیدەنی کردن‌و ئیزن وەرگرتن‌و سڵاو کـردن بـەیان بکـاو یاسـاو رێـسای بـۆ دابنـێ‌و فەرمان بەموسوڵمانان بکا: پەیرەوی بکەن بۆ ئـەوەی دوور بـن لەتۆمـەت‌و گومـان، هەر لەخۆوە هەڵنەکوتنە سەرماڵ‌و حاڵی خەڵکی بەبێ ئیزن‌و روخـصەت وەرگـرتن خۆ بەماڵی کەس دا نەکـەن، هـەروا لەگـەڵ ئـافرەتی نامـەحرەم دا خـەڵوە نەکـەن‌و خۆیـان نەخەنــە بـەر تۆمـەت‌و زوبـانی بوختانکـەران‌و هـەلیان بـۆ نەڕەخـسێنن بوختانیان بۆ هەڵبەستن. لەهـەمان کـات دا حـاڵ‌و وەزعـی خـەڵکی بەرچـاو بگـرن،

موراعاتی ئەو کەسانە بکەن کەنایانەوێ خەڵك لەماڵی خۆیان دا بیان بینێ، چونکە سەیرکردن‌و تێڕوانینی نامەحرەم ڕێخۆشکەرمیە بۆ زینا. بۆیە پەروەردگار بەم کۆمەڵە ئایەتە چەند ئاداب‌و رەوشتێکی کۆمەڵایەتی‌و هەڵس‌و کەوت کردن لەناو ماڵ‌و شوێنی حەوانەوەدا فێری موسوڵمانان دەکا، داب‌و نەرێتی دیدەنی‌و هاموو شۆی نێوان خزم‌و کەس‌و کارو ناسیاوو بێگانە دادەنێ، بۆ ئەوەی پابەندی بن‌و رەچاوی بکەن، تاپەیوەندی‌و خۆشەویستی هاموشۆیان بەشێوەیەك بێ سودی لێ وەربگرن‌و خۆشەویستی زیاتریان لەنێوان دا پەیدا بکا. دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان بەخوداو بە پێغەمبەری خودا هەیە، خۆتان بەشوێنکەوتووی پەیامی ئیسلام دەزانن، بەبێ روخصەت وەرگرتن خۆتان بەماڵی خەڵك دا مەکەن، بەبێ پرس مەچنە ناو ماڵ‌و حەوشەی کەسەوە هەتا ئیزن وەردەگرن‌و سلاو دەکەن‌و خۆتان بەخاوەن ماڵ دەناسێنن، بۆ ئەوەی عەورەتی دانیشتوانی ناو ماڵ نەبینن، چاوتان بەشتێك نەکەوێ کەبینینی بۆ ئێوە حەلاڵ نیە، بۆئەوەی دانیشتوانی ناو ماڵ‌و شوێن حەوانەوەی تایبەتی خێزانەکان بەغافلگیری تووشی حەرەج‌و لەڕودامان نەبن، نەکەونە حاڵەتی شڵەژان‌و روگرژ کردن، لەجیاتی ئەوەی دیدەنیەکە خۆشەویستی‌و کامەرانی لێ پەیدا بێ ببێتە هۆی نارەحەتی‌و پێ ناخۆشبون‌و دزاندن.

بەڵێ پێش چوونە ژوورەوە لەدەرگەدان‌و پرس کردن‌و ئیزن وەرگرتن بۆ چونە ژورەوە پێویستە لەگەڵ سەلام کردن‌و خۆپێ ناساندن لەدەرەوەی دەرگا، بۆئەوەی خاوەن ماڵ بزانێ: کێ دەبێتە میوانی‌و وەژوور دەکەوێ.

سوننەتە سێ جار داوای روخصەتی چوونە ژوورەوە بکرێ، جائەگەر ڕێگەیان پێ دا ئەوە باشە، ئەگینا بابگەڕێتەوە، وەکوو لەریوایەتی صەحیح‌و پەسندی لای ئیمام ئەحمەد مالیك‌و موسلیم‌و بوخاری‌و ئەبوداود دا چەسپاوەو هاتووە: لەئەبوموسای ئەشعەری‌و ئەبوسەعیدەوە کەبەجوتە ریوایەتیان کردوە دەڵێن ئەبو موسای ئەشعەری چووە دیدەنی حەزرەتی عومەرو ﷺ سێ جار داوای چوونە ژوورەوەی لێ کرد، حەزرەتی عومەر ﷺ ڕێگای نەداو ئەبو موسای ئەشعەری

گەڕایەوە!! پاشان عومەر ﷺ فەرموی: ئەرێ ئەوە مـن دەنگی عەبدوڵلای کوڕی قەیس نەبوو بیستم داوای هاتنە ژوورەوەی دەکرد؟؟ ئادەی بچن ئیزنی بدەن، کەچوون دەرگای لێ بکەنەوەو پێشوازیی لێ بکەن رۆیشتبوو، جا کەدوایی لێیان پرسی ئەوە بۆچی ئەو رۆژە گەڕابویتەوەو رانەوەستا بووی تا دەرگات لێ دەکەینەوەو بەپیرتەوە دێین؟ عەبدوڵلا وتی: من سێ جار داوای چوونە ژوورەوەم کرد ئیزنتان نەدام، بۆخۆشم لەپێغەمبەرم ﷺ ژنەوتووە دەیفەرموو: (اذا إستأذن أحدكم ثلاثا، فلم يؤذن فلينصرف) ئەگەر یەکێك لەئێوە سێ جار داوای چوونە ژوورەوەی کردو رێگایان پێ نەدا بابگەڕێتەوە.چوونکە هەڵکوتانە سەرماڵو چوونە ناو خێزانو شوێنی حەوانەوە بەبێ پرس کردنو رێگا پێدان، دەبێتە هۆی ئەوەی کابرای میوان چاوی بەشوێنی وای خێزان بکەوێ ببێتە هۆی فیتنەییو وروژانی شەهوەتو ئارەزۆو رێخۆشکردن بۆ داوێن پیسی کە لەچاوپێکەوتنی لاوەکیو بەیەکگەیشتنی هەرەمەکی پەیدا دەبێ، لەم روەوە کە؛ ئەو دیتنو تێك هەڵنگوتنە سەرەتاییانە بەدووبارە بوونەوەو سێ بارە بوونەوەیان دەبنە چاوپێکەوتنی مەبەستو پیلان بۆ دانراوو وروژاندنی حەزو ئارەزۆی پەیوەندیی ناشەرعیانە دروست دەکاو دەبنە هەنگاونان بەرەو شەهوانیەتو داوێن پیسی، هەروەها دەرگا کردنەوە بۆ دەروون نەخۆشەکان هەتا تۆمەتی خۆیان ئاراستەی ئەمو ئەو بکەن!

بێگومان لەسەردەمی نەزانی دا عەرەبەکان کتو پڕ خۆیان بەماڵی خەڵکی دا دەکردو وەکوو هێرشبەر هەڵیان دەکوتایە سەر خاوو خێزان، کابرای میوان بەبێ پرس خۆی بەماڵی خانە خوێ دا دەکرد، وادەبوو کابرای خانە خوێ ی لەگەڵ خێزانەکەی بەحاڵێك دەبینی کەپێیان ناخۆش بوو کەس بەو شێوە بیان بینێ، وادەبوو ئافرەتی خانە خوێ روتو قووت یان شەرمگای بەدەرەوە بووە، یان پیاوی خانە خوێ لەحاڵێکی وادا بووە بێ خەم خۆی روت کردۆتەوە، ئیتر بەخۆ بەماڵدا کردنی میوانی ناوەختو لەنکاو کابرای خانە خوێو خێزانی کەوتوونە حاڵەتێکی حەرەجو ناخۆشەوە. بۆیە پەروەردگار بەو ئەدەبە بەرزو پیرۆزە، بەو دابو شێوە هەڵسو کەوتە موسوڵمانانی ئەدەب داداوە!

ظاهیری ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کەپێش چوونە ژوورەوە، دەبێ ئیزن وەربگرێو سەلام بکا، بەلام وەکوو زانایانی تەفسیر شییان کردۆتەوە ئیزن وەرگرتنەکە واجبەو سەلامکردنەکە سوننەتە.

بەگوێرەی ئایەتەکە ئیزن وەرگرتن پێش سەلام کردنە، چونکە راست ئەوەیە: تەرتیبی باس کردن بەشێوەی تەرتیبی مال بێ.

بەلام جەماوەری زانایان دەفەرموون. سەلام پێش دەخرێ چوونکە عەطفی سەلام کردن بۆسەر ئیزن وەرگرتن بەپیتی (واو) ئەنجام دراوە، عەطف بە (واو) یش بۆ (مطلق الجمع)ە. ئەمجار فەرمودەیەکی صەحیح هەیە تیرمیذی لەجابیرەوە ریوایەتی کردوە دەفەرموێ (السلام قبل الكلام) سەلام کردن پێش قسە کردنە. هەروەها بوخاری لە (الأدب المفرد) داو ئیبنو ئەبی شەیبە لەئەبی هورەیرەوە فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە، دەربارەی کەسێك پێش ئەوەی سەلام بکا ئیزن وەربگرێ فەرموی نەخەیر تا سەلام نەکا ئیزنی مەدەنێ.

هەروەها فەرموودەیەکی تر هەیە، قاسیمی کوری ئەصبەغو ئیبنو عەبدولبەر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە: دەفەرموێ: حەزرەتی عومەر ﷺ دیدەنی پێغەمبەری ﷺ کردو بەم شێوەیە ئیزنی چونە خزمەتی وەرگرت: فەرموی: (السلام عليك يارسول الله، السلام عليكم أيدخل عمر؟)

هەروەها ئەبوو داودو نەسائی لەئەبو عەمری (الأوزاعی) یەوە لەقەیس کوری عوبادەوە ریوایەتی کردوەو: سەعد دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە دیدەنی کردنمان لەماڵی خۆمان، فەرموی: (السلام عليكم ورحمة الله) سەعدی کوری عوبادە بەهێواشی وەلامی دایەوە، قەیس دەڵێ: وتم: ئەوە پێغەمبەرە ئایا ئیزنی پێغەمبەر ﷺ نادەی بێتە ژوورەوە؟؟ سەعد وتی: وازی لێ بێنە بازۆرمان سەلام لێ بکا، دوبارە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (السلام عليكم ورحمة الله) سەعد بەئەسپایی وەلامی سەلامەکەی پێغەمبەری ﷺ دایەوە، دوایی بۆ جاری سێیەم پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (السلام عليكم ورحمة الله) ئەمجار پێغەمبەر ﷺ گەرایەوەو سەعد دوای کەوت، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمن گوێم لەسەلام کردنەکانت بوو، بەئەسپایی وەلامم دەدایتەوە بۆ ئەوەی زۆر سەلامەمان لێ بکەی. ئەمجار پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ

سەعددا گەڕایەوە بۆ ماڵی سەعد. ئیتر سەعد فەرمانی کرد ئاویان بۆئامادە کرد پێغەمبەر ﷺ دەستو دەمو چاوی شوشتن ئەمجار پارچە قوماشێکی رەنگ کراو بەزەعفەرانو (وەرس) یان هێنایە خزمەتی خۆی پێ وشك بکاتەوەو دەیفەرموو: (اللهم أجعل صلاتك ورحمتك على آل سعد بن عباده).

ئەبوداود ـ بەئیسنادی خۆی ـ لەعەبدوڵڵای کوڕی بیشرەوە ریوایەتی کردوە؛ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کەدەچووە بەردەرگای ماڵێك بۆ دیدەنی، ڕو بەڕوی دەرگاکە رادەوەستا بەڵکوو یان لەلای راستی دەرگاکەوە دەوەستاو دەیفەرموو (السلام عليكم ورحمة الله) ئەمەش بۆیە بوو چوونکە لەو رۆژگارەدا دەرگاکان پەردەیان پێوە نەبوو.

هەروەها ئەبوداود ـ بەئیسنادی خۆی ـ لەهوزەیلەوە دەڵێ: پیاوێك هات: (عوسمان دەفەرموێ: ئەو پیاوە سەعد بوو) لەبەردەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ راوەستا دوای روخصەتی چوونە ژورەوەی کرد، پانەوپان بەڕوی دەرگاکە راوەستا. عوسمان دەڵێ: راست روی کردبوە دەرگاکە. پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: ئەوە ئاوا ئیزن وەردەگری؟! ئیزن وەرگرتن لەبەرخاتری دیتنە، واتە: جاکەتۆ رو بکەیە ناو دەرگاو بڕوانی ئیتر ئیزنی چی؟؟ لەصەحیحی بوخاریو موسلیم دا هاتووە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لو أن أمرأ اطلع عليك بغير إذن، فخذفته بحصاة ففقأت عينه ماكان عليك من جناح) ئەگەر یەکێك بەبێ پرس لەدەرگاوە سەیری کرد بەردو چکەیەکت تێگرتو چاویت کوێر کرد تاوانت ناگاتیو خوێنی نیە.

ئەبوداود ـ بەئیسنادی خۆی ـ لەرەبعی یەوە ریوایەت دەکا، دەڵێ پیاوێکی هۆزی بەنو عامیر هات، دیدەنی پێغەمبەر ﷺ بکا لەماڵەوە، بەبێ ئەوەی سەلام بکا، گوزو گومبەت وتی: بێمە ژورەوە!؟ پێغەمبەر ﷺ بەخزمەتکارەکەی خۆی فەرموو: بچۆ ئەو کابرایە فێری ئیزن وەرگرتن بکە. خزمەتکارە هاتە دەرەوە بەکابرای گوت، جارێ لەپێش دا بڵێ (السلام عليكم) ئەمجار بڵێ ئەرێ رێگا هەیە بێمە ژورەوە؟! پیاوەکە بەگوێ ی خزمەتکارەکەی کردو وتی (السلام عليكم) ئەرێ ببێمە ژورەوە؟! ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئیزنی داو کابرا چووە ژورەوە.

عەطای کوڕی رەباح لەئیبنو عەبباسەوە ﷺ دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرم ﷺ کرد: ئایا پێویستە من ئیزن لەخوشکەکانم وەربگرم ئەوانە چەتیونو خۆم بەخێویان دەکەمو لەگەڵ من دا لەخانویەك دان؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ دەبێ ئیزن وەربگری فەرمووی پێت خۆشە رۆژێك خوشکەکەت بەرِوتی ببینی؟ وتم: نەخەیر! فەرموی دەسا کەوایە: ئیزن وەربگرە، جارێکی تر لەم بارەوە پرسیارم لێ کردوە، فەرموی: تۆ دەتەوێ پابەندی فەرمانی خودا بێ؟ وتم: بەڵێ: فەرموی دەی کەوایە ئیزن وەربگرە.

هەتا ئەم ئەندازەیەو بەم جۆرە وردو ناسکە ئایینی ئیسلام دابو نەریتی هاموو شۆو دیدەنی خزمو کەسو کارو ناسیاوی رون کردۆتەوە، چۆنیەتی بوون بەمیوانو بوون بەخانە خوێ ی دەست نیشان کردوە. پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی زۆر بەوردی پابەندی ئەم ئارایە ئیسلامییانە بونو پەیرەوییان کردون.

خوێنەری هێژا! ئێمە ئەمرۆ خۆمان بەموسوڵمان دەزانین بەڵام هەست کردنمان بەو وردە کارییانە کۆڵ بووە، پیاوی وامان هەیە بەبێ پرس خۆ بەماڵی برای خۆی دا دەکا شەو بێ رۆژ بێ، کاتی نوستن بێ کاتی ئیستیراحەت بێ، گوێ نادا بەئامۆژگاری قورئان! وادەبێ نیوسەعات زیاتر لەدەرگا کوتان ناکەوێ. ناگەڕێتەوە تا بەناچاری دەرگای لێ نەکەنەوەو ئیزعاجیان نەکاو ئیسراحەتیان لێ تێك نەدا کۆڵ نادا. ماڵی برایەتی، ماڵی برادەریەتی، ماڵی ناسیاویەتی، (ئای کاکە! برادەر نەبوایە. خزم نەبوایە کەیفی خۆیەتی!).

لەکاتی نان خواردن دا لەدەرەنگانێکی شەودا، بەبێ پرسو ئیزن وەرگرتن کابرا خۆ بەماڵی خانە خوێ دا دەکاودەبێ خواردەمەنی بۆ پێشکەش بکرێ، ئەگینا گلەیی دەکا، وادەزانێ رێزی لێ نەگیراوە، بەکوردیو بەکورتی هەریەکێکمان بیر لەرابوردوی خۆمان بکەینەوە چاو ورد کەینەوە ئەم جۆرە دیاردانەمان دیونو بەرچاومان دەکەون. ئەمە هۆیەکەی ئەوەیە ئێمە خۆمان بەئەدەبی ئیسلامی ئارایش نەداوە، پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەکانی خوداو پێغەمبەری خودا نینو نەبووین. بەڵکوو شوێن دابو نەریتێکی هەڵە کەوتووین. ئێمە دەبینینو دەبیستین بێگانەکان ئەوانەی موسوڵمان نین دابو نەریتێکیان هەیە بۆ هاموشۆکردنو

دیدەنی یەکتری کردنو پێیەوە پابەندنو بانگەوازی بۆ دەکەن، دەق دەشوبهێتە ئەو ئادابەی قورئان بانگەوازی بۆ کردوەو ئێمەیش کەلەوانەوە دەیبینین جاری واهەیە پێ ی موعجەبین!!! دەی باشە بۆچی هەوڵ نادەین یەکەم بزانین: کەئەو دابو نەرێتە هی قورئانەو ئەوان لەئێمەیان دزیوەو بەرگێکی تریان بەبەردا کردوە، دووەم بەگیانو بەدڵ پابەندی بینو لەخۆمان دا بەرجەستەی بکەینو خۆمانی پێ ئارایشت بدەین؟!

﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ﴾ واتە: سەلام کردنو ئیزن وەرگرتن خێرو فەرە بۆ میوانو خانە خوێ، زۆر باشترە لەوەی سەربەخۆ میوان بەبێ پرس خۆ بەماڵی خانە خوێ دا بکا، هەروەها ئەم جۆرە سەلام کردنەی ئێوە زۆر باشترە لەو شێوە سەلامکردنەی سەردەمی نەزانی، ئەوە بوو کابرای میوان لەسەردەمی جاهیلی دا: کەبچوبایە بۆ ماڵێکی تر بەیانی باشو ئێوارە باشی لێ دەکردنو خۆی پێدا دەکرد، وادەبوو کابرای خانە خوێی دەبینی لەگەڵ خێزانەکەی نوستووەو تووشی بەخودا شکانەوەی دەکردن. ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ خودا ئەم ئامۆژگاریو نیگایەی بۆ سەر نازڵ کردونو شارەزای کردون بەڵکوو بیر بکەنەوەو پەند ئامێز بنو بزانن: چی لەبەرژەوەندیی خۆتان دایە پەیڕەوی بکەن، خۆتانو خەڵکانی تریش تووشی مەوقیفی حەرەجو شەرماوەر نەکەن! ئەمجار پەروەردگار حوکمی حاڵەتێکی تر بەیان دەکا، ئەویش ئەو حاڵەتەیە: کەخانوەکە چۆڵ بێو خاوەن ماڵ لەماڵ نەبێ، دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَداً فَلا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ ئەگەر لەخانووی غەیردا کەستان وەپێرەوە نەهاتو کەسی تێدا نەبوو ئیزنتان بدا چوونە ژوورەوە دروست نیە، چونکە تەصەڕ ڕوفکردنە لەملکی غەیر بەبێ ڕەزامەندی خاوەنی. هەروەها چونکە خانوو مەسکەن حورمەتو پیرۆزیی خۆیان هەیە، لەوانەیە شتی نهێنی تێدا بێو خاوەن ماڵ نایەوێ کەس چاوی پێ بکەوێ، مەنع کردنی خۆ بەماڵ دا کردن بەبێ پرس هەر تەنیا لەبەر ئەوە نیەکابرای میوان چاوی بەعەورەتی ژنو ماڵی خانە خوێ نەکەوێو بەس! بەڵکوو لەبەر ئەوەشە جاری وادەبێ کابرا لەماڵی خۆی دا شتی وای داناوە، ڕەسمی وای هەڵاواسیوە نایەوێ کەس

بیان بینیٚ. بەکوردیو کورتی مەسکەنو شویٚنی حەوانەوە قودسیەتی خۆیان هەیە، نابیٚ بەهیچ شیٚوەیەك بەبیٚ پرس ئەو سنوورە بشکیٚندریٚ.

ئەگەر خاوەن ماڵ لەماڵ نەبوو ئیزن وەرگرتن لەمنداڵەکان یان لەکارەکەرو نۆکەری بەهەند وەرناگیریٚن، ئیعتباری پیٚناکریٚ.

بەڵام چەن حاڵەتیٚك هەن لەو ئەهیە گشتیە چەرت دەکریٚن دەکەونە بەر قاعیدەی (الضرورات تبیح المحظورات) بۆ نموونە ئاگریٚك لەماڵیٚك دەکەویٚتەوە، یان منداڵیٚکی ماڵەکە خەریکە بخنکیٚ، یان بۆ بەرەنگار بوونەوەی شتی ناشەرعیو تاوان، بۆ ئەم جۆرە شتانە دەکریٚ کابرا بەبیٚ پرسو بەپەلە خۆ بەماڵی غەیری خۆی دا بکا.

﴿وَإِنْ قِيلَ لَكُمْ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ﴾ ئەگەر لەلایەن خاوەن ماڵەوە پیٚتان گوترا بگەڕیٚنەوە، بگەڕیٚنەوە، چونکە گەڕانەوە پڕ خیٚرو فەرترە، بۆ دونیاو قیامەتتان باشترە، رەوا نیە بۆ ئیٚوە ئەی موسوڵمانینە! نوزە دریٚژیی بکەنو پیٚ داگرن لەسەر چوونە ژوورەوە ئیلحاح بکەنو لەبەردەرگا بوەستنو دانیشنو چاوەڕوانی چوونە ژوورەوە بکەن، چونکە ئەوە نیشانەی زەلیلیو کەم ڕیٚزی ئیٚوەو ئیحراجکردنی خاوەن ماڵە.

﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ بیٚگومان خودا ئاگاداری رازو نیازو گوفتارو کردارتانەو بەپیٚ ی کردەوەکانتان پاداشو سزاتان دەداتەوە، بیٚگومان ئەمە هەڕەشەیەکە لەوانەی سەرپیٚچی فەرمانی خودا دەکەن.

ئەمجار پەروەردگار حوکمی ئەو ماڵانە دیاریی دەکا: کەچۆڵو خاڵین: دەفەرمویٚ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ﴾ ج خراپەیەکتان لەسەر نیە ئەگەر بەبیٚ پرس بچنە ناو ئەو خانوانەوە: کە بۆ تیٚداحەوانەوەی تایبەتی دانەنراون. وەکوو ئوتیٚلو دوکانی بازرگانیو کاروانسەراو حەمامی گشتیو ئەم جۆرە شویٚنانە، چونکە لەو جۆرە شویٚنانەدا بەرژەوەندیی ئیٚوەی تیٚدایەو کەلو پەلی خۆتانی لیٚ دادەنیٚنو کڕینو فرۆشتنی تیٚدا دەکەن.

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ﴾ بیٚگومان پەروەردگار زاناو ئاگادارە بەوەی کەئیٚوە لەکاتی ئیزن وەرگرتنو سەلامکردن دا دەری دەبڕنو ئەو مەبەستە

پیسانەی دەیانشێرنەوەو ئاشکرایان ناکەن وەکوو ئەوە بتانەوێ عەورەت‌و ناموسی خەڵکیتان چاو پێ بکەوێ! ئەمەش بۆخۆی هەرِشەیەکە وەکوو ئەو هەرِشەیەی ئایەتی پێشووی پێ کۆتا هێنا.

ئەم ئایەتە لەئایەتی پێشوو تایبەت ترەو تەخصیصی ئایەتی رابوردو دەکا: کە بەموطلەقی مەنعی چوونە ژوورەوەی ماڵ‌و هەواری غەیر دەکا. چونکە ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ: کەدروستە پیاو بەبێ ئیزن بچێتە ماڵێکەوە کەسی تیا نەبێ‌و شت‌و مەکی خۆی تێدا بێ، وەکوو ئوتێل کەتایبەتە بۆ میوان، بەمەرجێ یەکەمجار ئیزن وەربگرێ‌و ژوورەکەی تایبەت بێ‌و کەسی تری تێدا لەگەڵ نەبێ.

## روانینی پیاوو ئافرەت بۆ یەکتری‌و باڵاپۆشی ئافرەت

﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ

أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّـٰبِعِينَ غَيْرِ أُوْلِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُواْ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتانە، ئیبنو ئەبو حاتەم لەموقاتیلەوە ریوایەت دەکا، دەفەرموێ: جابیری کوری عەبدوللا بۆیگێڕاینەوە فەرمووی: ئەسمائی کچی مەرثەد لەناو باخە خورمایەك دا بوو، ئافرەتان دەچوونە لای بێ ئەوەی ئیزار (دەرپێیان) لەپێ دا بێ، خلخالی قاچیان دەردەکەوتن، زولفو سینگو بەرۆکیان دەردەکەوت، ئەسماء وتی: ئەم شێوەیە چەند ناشیرینە؟! ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ﴾ ی نازڵ کرد. ئیبنومەردوەیهی لەئیمامی عەلییەوە ریوایەت دەکا دەفەرموێ: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا بەکۆڵانێکی شاری مەدینەدا دەرۆیشت، سەیری ئافرەتێکی کرد ئافرەتەکەش بۆی روانی، شەیتان ختوکەی خستە نێو دڵیانەوەو حەزیان لەیەکتر کردو هەریەکەیان بەوی تریان موعجیب بوو، لەکاتێك دا پیاوەکە بەخەیاڵی ئافرەتەکەوە بەپەنا دیوارێك دا دەرۆیشتو سەیری قەدو باڵای ئافرەتەکەی دەکرد، لەناکاوێك دا لوتی خۆی بەدیوارێك کێشاو لوتی قاش بوو خوێن هاتە خوارەوە، کابرا وتی: وەڵلاهی خوێنەکەی ناشۆمەوە تانە چمە لای پێغەمبەر ﷺ و روداوەکەی بۆ نەگێڕمەوە، هاتە خزمەتیو روداوەکەی لەنوکەوە بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە سزای تاوانەکەتە، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ.....﴾ ی نازڵ کرد، ئیبنو جەریر لەحەضرەمییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: ئافرەتێك دوو

خلخالی زیوی لەقاچ کردبوون زنجیرەیەکی میروشی لەگەڵ خلخالەکان لەقاچ کردبوو بەلای کۆمەڵێك پیاودا تێپەڕی، قاچی لەزەویدا میرو خلخالەکە لێك کەوتن‌و دەنگیان لێوەهات، ئیتر پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ.....الاية﴾ ی نازڵ کرد.

پەیوەندیی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە ئاشکراو نمایانە، چونکە چوونە ناو ماڵی غەیر شوێن گومانی دیتنی ئافرەتی نامەحرەم‌و بینینی شتی وەهایە دیتنی دروست نیە، بۆیە پەروەردگار فەرمانی بەموسوڵمانان کرد بەنێرو مێیانەوە: کەبەشێوەیەکی گشتی لەئاست یەکتری چاو داخەن‌و سەیری یەکتری نەکەن، چاو نەبڕنە یەکتر، هەڵبەتە حوکمەکە عامەو ئەوانەش دەگرێتەوە: کەئیزنی چوونە ژوورەوە وەردەگرن، پێویستە لەسەر ئەوانەی ئیزن دەدرێن بۆ چوونە ناو ماڵ، لەکاتی ئیزن‌و چوونە ژوورەوەدا، چاوی خۆیان داخەن‌و بەئەنقەست بۆ ئافرەتی نامەحرەم نەڕوانن، هەروەکوو لەسەر ئافرەتانیش پێویستە جوانی خۆیان بۆ مێردو مەحرەمی خۆیان نەبێ بۆ کەسی تر دەرنەخەن، چونکە دەرخستنی ئەندامی خۆیان (جگە دەم‌و چاوو دوو دەست تامەچەك) بۆ بێگانە حەرامەو سەر دەکێشێ بۆ کەوتنە ناو فیتنەی‌و حەرامەوە، چونکە گوتراوە: (سەیر کردن‌و بۆ یەکتر روانین پۆستەی زینایە)

بێگومان ئایینی ئیسلام هەوڵ دەدا بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی پاك‌و خاوێن: کە لەهەموو ئان‌و ساتێك دا شەهوەت‌و حەزو ئارەزۆی تێدا نەورۆژێندرێ، تیڕوانینی خائینانەو لارو لەنجەو جەم‌و جوڵی هەست وروژێنەرو دەرخستنی جوانی‌و ئارایش‌و جەستەی روت‌و قوت هەموو ئەمانە دەبنە هۆی وروژاندنی شەهوەت‌و ئارەزۆ حەیوانی یە شێت ئاسایی یەکە.

بوخاری لەئەبو سەعیدی خودرییەوە ریوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین کەلەسەر رێگاوبان دانەنیشین فەرموی: (ان اياكم والجلوس على الطرقات) خۆتان بپارێزن لەدانیشتن لەسەر رێگاو بان. هاوەڵان عەرزیان کرد وتیان ئەی پێغەمبەری خودا! ناتوانین هەردەبێ لەسەر رێگا دانیشین‌و قسەو باسی خۆمانی تێدا بکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (انبيتم فاعطوا الطريق حقه) ئەگەر

هەر ناچارن لەسەر ڕێگا دابنیشن دەماف ڕێگا بدەن، ئەوەی پێویستە لەسەرشانتان ئەنجامی بدەن، هاوەڵان وتیان: ماف ڕێگا چیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (غض البصر، وكف الأذى ورد السلام، والأمر بالمعروف، والنهى عن المنكر) چاو داخەن سەیری شتی حەرام مەکەن، ڕێگا مەگرن کۆسپ مەخەنە بەردەم ڕێبواران، ئەگەر سەلامیان لێ کردن وەڵامی سەلام بدەنەوە، فەرمان بەچاکە بکەن‌و جڵەوگیری لەخراپە..

هۆی فەرمان بەچاو داخستن بەرگری کردنە لەفەساد بەعەرەبی پێ ی دەگوترێ (سد الزرائع) بەربڕکردنی خراپە، چوونکە وەکوو ووتمان سەیر کردن پۆستەی زینایە هەندێ لەزانایانی سەلەف فەرموویانە: سەیر کردنی ئافرەتی نامەحرەم تیری ژەهراویی یە بۆ دڵ.

تیرەکەی ئەو ڕۆژە مەحبوبەم کەلوتفی کرد بەمن

گەر نەبەخشێ مەرهەمی وەصلی برینم کارییە

نالی

هەر بۆیە پەروەردگار لەئایەتەکەدا فەرمان بەعەوڕەت پاراستن‌و چاو پاراستنی پێکەوە هێناوە، چونکە تەماشا کردنی ئافرەتی نامەحرەم سەردەکێشێ بۆ تاوانە گەورەکە (واتە: زینا)

دەفەرموێ: ﴿وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾ ئەی موحەممەد فەرمان بەبەندەکانی من بکە: کەشەرمگای خۆیان بپارێزن، لەزیناو هەتیو بازی‌و نەشهێڵن کەس عەورەتیان ببینێ. ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکان فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: (احفظ عورتك الا من زوجك او ماملكت يمينك ).

ئەمجار پەروەردگار حیکمەتی فەرمانەکەی دیاری دەکاو دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ﴾ بێگومان چاو داخستن‌و عەوڕەت پاراستن بۆ ئەوان باشترە، پڕ خێرو فەرترە بۆ خاوێنی دڵ‌و دەروونیان، بۆ پاراستنی ئاینیان.

لەئاثاردا هاتووە دەڵێ: کەسێك چاوی خۆی بپارێزی لەنەظەری حەرام خودا روناکایی دەخاتە بینینیەوە.

ئیمامی ئەحمەد لەئەبو ئومامەوە ڕیوایەت دەکا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما من مسلم ینظر الی محاسن أمرأة، ثم یغض بصره، الا أختلف الله لە عبادة یجد حلاوتها) هەر موسوڵمانێك بڕوانێ بۆ جوانی ئافرەتێكو پاشان لەترسی خودا چاو داخاو واز لەتەماشا کردنی بێنێ، خودا بۆی دەکاتە عیبادەتو شیرینی ئەو عیبادەتە دەچێژێ.

ئیمامی طەبەرانی لەعەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ان النظر سهم من سهام ابلیس مسموم من ترکه مخافتی أبدلته ایمانا یجد حلاوته فی قلبه) تەماشا کردنی ئافرەتی نامەحرەم تیرێکە لەتیرە ژەهراویەکانی شەیتان، کەسێك لەترسی خودا وازی لێ بێنێ، بۆی دەکەم بەئیمانو بەدڵ هەست بەخۆشیو شیرینی ئەو ئیمانو باوەڕە دەکا!

﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ بێگومان خودا زانیاری تەواوی هەیە، بەهەموو هەڵسو کەوتو کارو کردەوەی بەندەکانی، هیچی لێ گوم نابێو هیچی لێ تێك ناچێ. وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ (غافر/١٩) ئەمەش هەڕەشەو ترساندنێکی ترە: کە هابزانن چی دەکەن خودا ئاگای لێیەو سزاو پاداش هەیە.

بوخاری بەشێوەی (تعلیق)و موسلیم لەئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (کتب علی ابن آدم حظه من الزنی أدرك ذلك لامحالة، فزنی العینین النظر، وزنی اللسان النطق، وزنی الأذنین الاستماع وزنی الیدین البطش، وزنی الرجلین الخطا، والنفس تمنی وتشتهی، والفرج یصدق ذلك او یکذبه).

زانایانی ئوصول دەفەرمون هەموو خیطابیکی شاریع: کەئاراستەی پیاوان دەکرێ ئافرەتیش دەگرێتەوە، وەلێ لێرەدا بۆ زیدە جەختکردنەوە لەسەر چاو پاراستنو عەورەت پاراستن بەتایبەتی ئەو فەرمانەی ئاراستەی پیاوانی کرد، ئاڕاستەی ئافرەتانیشی دەکا، هەم بۆ جەخت کردنەوەی فەرمانەکەو هەم بۆ ڕون کردنەوەی چەند حوکمێکی کەتایبەتی ئافرەتانن! وەکوو باڵا پۆشیو دەرنەخستنی

ئامێری خۆ رازاندنەوەو خشڵ‌و خۆ گرتنەوە لەهەر شتێك کەسەرنجی پیاوان رابکێشێ. دەفەرموێ:

﴿وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ! بەئافرەتانی موسوڵمانیش بڵێ باچاوی خۆیان دابخەن لەو شتانەی خودا دیتنی حەرام کردون، تەماشای غەیری حەڵاڵی خۆتان مەکەن، شەرمگای خۆتان لەزیناو پانپانۆکە بپارێزن، زوربەی زانایان دەفەرمون: دروست نیە بۆ ئافرەت بڕوانێ بۆ پیاوی بێگانە بەشەهوەتەوە بێ یان بێ شەهوەت بێ! بەڵگەیان ئەو فەرمودەیەیە: کەئەبوداودو تیرمیذی لەئومموسەلەمەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: من‌و مەیموونە لای پێغەمبەری خودا بوین، عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم هات‌و دانیشت، ئەمەش کاتێك بوو فەرمان کرابوو بەئافرەتان خۆیان لەپیاوی بێگانە بالآپۆش بکەن، واتە: حیجاب بگرن، ئیتر پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین کەخۆمان داپۆشین. ئوممسەلەمە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خودابۆچی ئێمە حیجاب لەبەر ئەو بکەین چما ئەو کوێر نیە؟ خۆ هیچ نابینێ‌و ناماننناسێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أوعمياوان أنتما، ألستما تبصرانه) ئایا ئێوەش کوێرن؟ بۆ ئێوە ئەو نابینن؟

کۆمەڵێك لەزانایانی ئیسلام، فەرموویانە: دروستە ئافرەت بەبێ مەبەستی شەهوەت بڕوانێتە پیاوی بێگانە، واتە: بڕوانێتە غەیری نێوان ناوك‌و ئەژنۆیان، ئەمەش بەگوێرەی ئەو فەرمودەیەی لەصەحیحی بوخاری‌و موسلیم دا هاتووەو چەسپاوە: کە پێغەمبەر ﷺ سەیری پیاوانی حەبەشەیی دەکرد رۆژی کە جەژن لەمزگەوت دا یارییان دەکرد، خاتوو عائیشە (دایکی موسوڵمانان) لەدوا پێغەمبەرەوە زەق زەق سەیری دەکردن تابێ تاقەت بوو، دوایی هەستا رۆیی. هەروا دەڵێن: فەرمان بەئافرەت کراوە خۆیان داپۆشن تا پیاو نەیان بینن: کەوابوو لێرەدا جیاوازی لەنێوان پیاوو ئافرەت دا هەیە. ئافرەت بۆی هەیە بەبێ شەهوەت بڕوانێتە غەیری نێوان ناوك‌و ئەژنۆی پیاوی بێگانە، بەڵام پیاو بۆی نیە بەبێ شەهوەتیش بڕوانێتە جەستەی ئافرەت..

ئـەو حـەدیـثـەی لـەبارەی عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـوم مەکتومـەوە ریوایـەت کـراوە حەمل دەکرێ بۆ نەدب واتە: واباشە واجب نیە، حـەدیثـەکـەی عائیـشەش کەگوایـە لەئاستی کوێردا خۆی داپۆشیوە حـەمل دەکـرێ بـۆ سـەر زێـدە ومرع و تـەقوا نـەك لەبەر ئەوەی حەرام بووبێ.

بێگومان مەیلی نێوان پیاوو ئافرەت مـەیل و ئارەزۆیـەکی قووڵە، لەناخەوەیـە، لەسروشتیان دایە، چونکە پەروەردگار درێژە پێدانی ژیانی لەسـەر زەوی پەیوەسـت کـردوە بـەو مـەیل و حـەزە. بـەردەوامبوونی رەچـەڵەك و گـەرای ئـادەمیزاد لەسـەر زەوی و جێنشینی کردنی تێیدا پابەندە بەهەبوونی ئەو مەیلە. ئەو حەزو ئارەزۆیە ماوەیەك کپ دەبێ و دوای ماوەیەکی تر سـەر هەڵدەداتـەوە، وروژانـدنی ئـەو حـەزە هـەموو ئـان و سـاتێك دەبێتـە روخێنـەرو قەڵاچـۆکەر، چـونکە ئەگـەر حەزەکـە نەیەتـەدی و کـپ بکرێتـەوە، ئەعـصابە وروژاوەکـان هەسـت بەمانـدو بـون دەکـەن و شێوە سزایەکی بەردەوام تووشی جەستەی دەبێ.

تەماشاکردن مەیل دەوروژێنێ، لارو لەنجە، پێکەنین، سـوحبەت و قـسەی خـۆش ئەمانە هـەموو حـەزوئارەزۆ دەوروژێـنن کـە وروژاشـن کـپ کردنـەوەیان زەحمەتـە، ئەگەر هیچکە نەبێ دەبنە هۆی ماندو بـوونی ئەعـصابە وروژاوەکـان، کـەوابێ رێگـا چـارەی مـەضبوط و ئـەو وروژێنەرانـەیـە، بۆئـەوەی مـەیل و ئارەزۆکـان لەسـنووری سروشتی خۆیان دەرنەچن و یاخی نەبن.

ئــەمجار پــەروەردگار چــەند حــوکمێکی تایبــەت بــەئافرەت دیــاریی دەکــاو دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ باڻافرەتان هیچ لەجوانی خۆیان بـۆ پیاوی بێگانە دەرنەخەن، هەرشتێك: کەدەبێتە هۆی خۆ رازاندنەوەو خۆ ئارایشدان وەکـوو خـشڵ و خەنـەو وسمـەو ئـەو جـۆرە شـتانە دەرنەخـەن،دیارە شـوێنەکەیان لەجەستەی دا زیاتر دەرخستنی حەرامە. مەگەر ئەو شوێنانەی ناکرێ دەرنەکەون، وەکوو دەست و مەچـەك و دەم و چاو، ئـەم شـوێنانە خۆیـان و هەنگوسـتیلەی پەنجە ئەگەر دەربکەون قەیناکا. ئەم رایە لەئیبنو عەبباسەوە نەقڵ کراوە. پشتگیریی ئەم رایە دەکرێ بـەو فەرمودەیـەی ئـەبوداود لەعائیـشەوە ریوایـەتی کـردوە دەفـەرموێ ئـەسمای کـچی ئەبوبـەکر هاتـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ ئـەسماء کراسـێکی تـەنکی

لەبەردا بوو، پێغەمبەر ﷺ روی لێ وەرگێڕا فەرموی: ئەی ئەسماء (ان المرأة اذا بلغت المحيض، لم يصلح أن يرى منها الا هذا) ئافرەت هەرکاتێ گەیشتە بێنوێژی نابێ جگە لەئەمەو ئەوە لێی دەربکەوێ، ئیشارەی بۆ دودەستو دەمو چاوی کرد.

جالەسەر ئەم بنەمایە حەنەفییەکانو شافیعیش لەقسەیەکی دا فەرموویانە: دەستو مەچەكو دەمو چاو بەعەورەت ناژمێردرێن. کەوابێ مەبەست بە ﴿ماظهرمنها﴾ ئەو ئەندامانەیە کەبەعادەت دەردەخرێن.

تەنانەت لەئەبو حەنیفەوە ریوایەت کراوە کەدوو قاچیش تاقولەپێ بەعەورەت دانانرێن واتە: دەرخستنیان دروستە، چونکە داپۆشینی قاچیش وەکوو دەست دەبێتە مایەی حەرەجو بەڵکوو زیاتریش بەتایبەتی بۆ گوند نشینەکان!! ئەبو یوسف (هاوەڵو قوتابی ئەبوحەنیفە) فەرموویەتی: قۆڵو باسك بەعەورەت حسێب ناکرێن چونکە داپۆشینی ئەوانیش حەرەجی تێدایە.

ئیمام ئەحمەدو شافیعی لەقسەیێکی دا فەرمویانە جەستەی ئافرەتی حوڕڕە هەموو عەورەتەو نابێ بەدەری بخا، ئاماژە بەو فەرمودانەی تۆمارمان کردن، هەروا حەرامی چاوتێ بڕینو سەیر کردنی یەك لەدوای یەك حەرامە ئاماژە بەو فەرمودەیەی بوخاری لەئیبنو عەبباس ریوایەتی دەکا، دەڵێ: رۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەر ﷺ (الفضل)ی کوڕی عەبباسی لەدوا خۆیەوە سوارکردبوو، ئیتر (الفضل) ئافرەتێکی جوانی خوئەعەمی بینی، ئافرەتەکە پرسیاری لە (الفضل) کرد ئیتر (الفضل) چاوی تێبڕیبوو چاوی لێ نەدەتروکاندن، پێغەمبەر ﷺ چەناگەی (الفضل)ی گرتو روی پێ لەئافرەتەکە وەرگێڕاو نەیهێشت چی ترسەیری بکا. کەوابێ مەبەست بە ﴿ما ظهرمنها﴾ ئەومیە: کەبۆخۆی بێ مەبەست دەربکەوێ.

هەڵبەتە مەسئەلەکە خیلافییەو پەیرەوی هەر لایەك لەم رێبازانە بکەی قەیناکا. وەلێ وێ دەچێ رای پەسند ئەوەبێ: کەدەستو مەچەكو دەمو چاو بۆ ئافرەت عەورەت نەبن بەمەرجێ دەرخستنەکەیان فیتنەیی لێ نەکەوێتەوە هەرکاتێ ترسی پەیدا بوونی فیتنەیی لێ کراو فاسیقو شەقاوە بەری رێگایان بەئافرەت دەگرت، داپۆشینی دەمو چاو پێویستە..

ئەوەشمان لەیاد نەچێ هەموو حوکمێ چەرتکردنی تێدایە، کەوابوو هەندێ حاڵی واهەیە دروستە پیاو تەماشای ئافرەتی بێگانە بکاو جوان تێ ی رامێنێ، بۆ نموونە حاڵەتی داخوازیی‌و پێش مارە کردن، کابرا بۆی دروستە چەند جارێك بەتەواوی سەیری ئافرەتەکە بکا. یان لەحاڵەتی شایەتی دان‌و حوکم کردن دا ئالەم حاڵەتانەدا دروستە سەیرکردنی دەم‌و چاوو دەست‌و مەچەك‌و دووبارە کردنەوەی تەماشا کردنەکە.

دروستە بۆ پزیشك ـ ئەگەر ئافرەتی پزیشك نەبوو ـ بڕوانێتە شوێنی برینی جەستەی ئافرەتی بێگانەو ئەو شوێنەی پێویستی بەدیتن هەیە تەماشای بکا. ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ﴾ با سەرپۆشەکانیان وا دابدەنەوە سەرو مل‌و سینگ‌و بەرۆکیان داپۆشێ، هیچ کامێ لەسەر زولف‌و لاجانگ‌و مل‌و سینگ‌و بەرۆکیان دەرنەکەوێ..

﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ بائافرەتان جوانی شێردراوەی خۆیان دەرنەخەن نەهێلن کەس شوێنی جوانییان ببینێ، مەگەر بۆ مێردەکانیان، بۆ ئەمان دروستە هەموو جەستەیان ببینن، وەکوو ووتمان ژن‌و مێرد بۆیان حەلاڵە هەموو لەش‌و لاری یەکتری ببینن. ﴿أَوْ آبَائِهِنَّ﴾ هەروەها دروستە بۆ ئافرەتان زینەی جوانی خۆیان بۆ باوکی خۆیان دەربخەن ﴿أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان بۆ باوکی مێردەکانیان، ﴿أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ یان بۆ کوڕی مێردەکانیان ﴿أَوْ إِخْوَانِهِنَّ﴾ یان بۆ برای خۆیان ﴿أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ﴾ یان کوڕی براکانیان ﴿أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ﴾ یان کوڕی خوشکەکانیان ﴿أَوْ نِسَائِهِنَّ﴾ یان ئافرەتانی خۆیان واتە: ئافرەتانی موسوڵمان نەك ئافرەتی کافرو بێدین، هەموو ئەمانە مەحرەمن‌و ئافرەت بۆی هەیە خۆیان بۆ دەربخا واتە خۆیان لێ بالاپۆش نەکاو لەئاستیان خۆ دانەپۆشێ، بەلام بەشێوەیەك نەبێ لەعادەت دەربچێ.

﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ﴾ یان کۆیلەکانیان ﴿أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ﴾ یان ئەو دەست‌و پێوەندانەی لەماڵ دان لەپیاوان وەکوو خزمەتچی‌و چاپەزو نۆکەر، بەمەرجێ ئارەزۆیان نەبێ بۆ ئافرەتان وەکوو خەساوو گێل، یان خونثی یان ئەوانەی ئالەتی پیاوەتییان بڕدرابێ‌و حەزی ئافرەتیان نەبێ ﴿أَوِ الطِّفْلِ

الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ یان ئەومندالانەی حاڵو ومزعی ئافرەتان نازانن، لەبەر بچکۆلەیی‌و منداڵی ئاگایان لەکارو باری جنسی نیەو عەقڵیان پێ ناشکێ..! ئالێرەدا راجیایی لەنێوان زانایان دا پەیدا بووە.

١- جەماوەری زانایان دەفەرمون: مەبەست بە(نسائهن) ئافرەتانی موسوڵمانن، نەك ئەهلی نیمە، دروست نیەو نابێ ئافرەتی موسوڵمان جگەلەدەستو دەمو چاوی هیچ شوێنێکی تری بۆ ئافرەتی ناموسوڵمان دەربخا، چونکە لەوانەیە وەصفی جەستەی بۆ مێردەکەی یان بۆ خەڵکی تر بکا، حوکمی ئافرەتی ناموسوڵمان دەق وەکوو پیاوی بێگانە وایە بۆ ئافرەتی موسوڵمان.بەلام ئافرەتی موسوڵمان دەزانێ وەصف کردنی ئافرەتی تر بۆ مێردەکەی یان بۆ کەسانی تر حەرامە خۆی لێ دەپارێزێو نایکا.

موسلیم‌و بوخاری لەئیبنو مەسعودەوە ریوایەت دەکەن دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لاتباشر المرأة المرأة تنعتها لزوجها كأنه ينظر اليها) باافرەت نەچێ وەصفی ئافرەتێکی تر بۆ مێردەکەی بکا، بەجۆرێك وەکوو بەچاو سەیری بکا وابێ!

هەروا بەیهەقی لەسوونەنەکەیدا دەگێڕێتەوە دەڵێ: عومەری کوڕی خەططاب ﷺ نامەی نووسی بۆ ئەبو عوبەیدەی کوڕی (الجراح) فەرموی: هەواڵم پێ گەییشتووە: کەکۆمەڵێك لەئافرەتانی موسوڵمان لەگەڵ ئافرەتانی ناموسوڵمان دەچنە گەرماوەوە، لەئێستا بەولاوە جڵەوگیرییان لێ بکە، چونکە رەوا نیە بۆ ئافرەتێك بڕوای بەخوداو بەرۆژی قیامەت هەبێ جگە لەهاو ئایینانی خۆی کەسی تر عەورەتی ببینێ!

٢- کۆمەڵێکی تر لەزانایان لەناویان دا حەنبەلییەکان دەڵێن: مەبەست بە (نسائهن) لەئایەتەکە هەموو ئافرەتێکە بەموسوڵمان‌و کافریانەوە، ئیضافە کردنی (نساء) بۆلای راناوی (هن) بۆ موشاکەلەو لێکچونە، واتە لەرەگەزی خۆیان، کەوابوو عەورەتی ئافرەت بەنیسبەت ئافرەتی ترەوە بەگشتی نێوان ناوك‌و ئەژنۆیە.

ئەمجار پەروەردگار جڵەوگریی لەئافرەتان دەکاو فەرمانیان پێ دەکا: کەخۆیان بپارێزن لەهەموو هەڵس‌و کەوتێك: کەدەبێتە هۆی وروژاندنی حەزو مەیلی پیاوی بێگانەو دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ﴾ باافرەتان

کەدەڕۆن قاچی خۆیان والەزەوی ئەدەن دەنگی پاوانەو خڵخاڵیان ببیسترێ، وانەکەن پیاوان لەکاتی ڕۆیشتنی دا قاچ لەزەوی بدا بۆئەوەی خەڵك دەنگی پاوانەی قاچی ببیستن! چونکە ئەوە سەرنج ڕاکێشەو جێگای گومانەو ئارەزۆو شەهوەت دەجوڵێنێو وادەکا خەڵك گومانی داوێن پیسی لێ بکەن، بەکورتی ئەگەر هەڵسو کەوتێك بکا دەنگی پاوانەو خڵخاڵی ببیسترێ وەکوو ئەوە وایە دەری خا، هەروا غرینگە هێنان لەبازنەو بەرو بەرموور، خۆ بۆنخۆشکردنو سپیاوکردنو خۆ ئارایش دانو ئەم جۆرە شتانە حەرامنو پێویستە ئافرەتی موسوڵمان خۆیان لێ بپارێزێ..

﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی موسوڵمانینە! هەمووتان بۆلای خودا بگەڕێنەوەو تۆبە بکەن، پابەندی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی خودابن، هەر ئادابو ڕەوشتێك فەرمانتان پێ دەکا ئەنجامی بدەن ئەوەی نەهیتان لێ دەکا پابەندی بنو خۆتانی لێ بپارێزن، کەچون بۆ دیدەنی سەلام بکەنو ئیزن وەربگرن، ئەگەر ئیزنیان دان ئەمجار بچنە ژوورەوە...هتد. بۆئەوەی خۆشبەختی دونیاو قیامەت دەستەبەر بکەن.

شایانی باسە دەست لەمل کردنو باوەش بەیەکدا کردنی پیاوو بۆ پیاو یەکتر ماچکردن مەکروهە، بەڵام تۆقەکردن سوونەتە، چونکە ئەنەس ڕیوایەتی کردوە دەفەرموێ: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا پیاو هەیە لەئێمە تووشی برای یان دۆستو برادەری خۆی دەبێ ئایا خۆی بۆ کۆم بکاتەوە، سەری خۆی بۆ دانەوێنێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەخەیر، کابرا گوتی: ئایا باوەشی پێدا بکاو ماچی بکا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەخەیر، کابرا وتی: ئایا دەستی بخاتە ناو دەستو تۆقەی لەگەڵ بکا؟ پێغەمبەر فەرموی بەڵێ! هەروادروست نیە بۆ پیاو لەهۆدەیەکی چۆڵ دا بەڕوتی دانیشێ، بەمەرجێ شتێکی لابێ عەورەتی داپۆشێ، چونکە بوخاریو تیرمیذیو ئیبنوماجە فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەڵێ: لەم بارەوە پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کرا پێغەمبەر ﷺ لەوەڵام دا فەرموی: (الله احق ان یستحی منه) خودا لەهەموو کەس شیاوترە بۆئەوەی شەرمی لێ بکا.

**مارەكردنی ئافرەتانی ئازادو قەبالەنوسین لەگەڵ كۆیلەكان، زەخت كردن لەچەتیوەكان بۆ داوێن پیسی**

﴿ وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٣٢﴾ وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ إِنۡ أَرَدۡنَ تَحَصُّنٗا لِّتَبۡتَغُواْ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ...﴾ (ابن السكن) دەڵێ: دەربارەی كوڕێكی كۆیلە ناوی صەبیح بوو، بەندەی حوەیطبی كوڕی (عبدالعزى) بوو، كوڕەكە داوای لەحوەیطیب كرد. كەقەبالەی ئازاد بوون (مكاتبة)ی لەگەڵدا مۆربكا، حوەیطیب رازیی نەبوو، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارێو حوەیطیب لەسەر

سەد دینار قەبالەی ئازاد بوونی بۆ نووسیو بیست دیناری لێ خۆش بوو ئەوی تری لێ وەرگرت، ڕۆژی حونەین لەشەڕدا شەهید کرا..

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئایەتی ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ﴾ موقاتیل دەڵێ ئافرەتە کۆیلەکانی سەردەمی نەزانی دەکرانە هۆکاری ماڵ پەیدا کردن، دەڵێن: عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەلول سەرۆکی دووڕوەکان، شەش چەتیوی هەبوون (معاذة، مسيكة، أميمة، عەمرە، أروى، قتيلە) بەزۆر داوێن پیسی پێ دەکردن بۆ پارە پەیدا کردن، ڕۆژێك یەکێکیان دینارێکی بۆ هێنایەوە، یەکێکی تریان هیچی دەست نەکەوتبوو، عەبدوڵلا پێی گوتن بڕۆن داوێن پیسی بکەن، پارە پەیدا بکەن، چەتیوەکان وتیان سوێندمان بەخودا چیدی شتی واناکەین، خودا ئایینی ئیسلامی بۆ ناردوینو زینای حەرام کردوە، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و شکاتیان کرد، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

لەئایەتەکانی پێشوودا پەروەردگار نەهی لەو شتانە کرد: کەسەردەکێشن بۆ داوێن پیسیو گەرا تێکەڵ بوون، فەرمانی کرد بەچاو داخستنو عەورەت پاراستن، لەپێش هەموو شتێکیش دا پێویستە ئەوە بزانین: کە پەروەردگار چارەسەری واقیعیو عەمەلی هەیە، باشترین چارەسەری عەمەلیش ئاسانکاری ژنو ژن خوازییە، یارمەتیدانی ئەوانەیە: کەتوانای ژنهێنانیان نیە، چونکە ژن مارە کردنو دروستکردنی خێزان باشترین ڕێگا چارەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو واقیعەو درێژەدانی ئادەمیزاد بەژیان لەسەر زەوی بەشێوەی سروشتیو پەیوەندی نێوان خێزانەکانو بەردەوام بوونی خۆشەویستی نێوانو خێزانو کۆمەڵگاو پەروەردە کردنی منداڵ!!

بۆیە فەرمان بەموسوڵمانان دەکاو دەفەرموێ: ﴿وَأَنكِحُوا الْأَيَامَى مِنكُمْ وَالصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَائِكُمْ﴾ ئەی کاربەدەستو وەلیو قسە ڕۆیشتووەکان! ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان! کچو کوڕەکانتان لێك مارە ببڕن، ئەوی مێردی نیە مێردی بۆ بدۆزنەوەو لێی مارە ببڕن، ئەوەی ژنی نیە ئافرەتی بۆ بدۆزنەوە لێی مارە بکەن، ئاسانکاری بکەن بۆ ئافرەت بەشوودانو ژنهێنان، ژن بۆ بەندەو کۆیلە صالحەکانتان بێنن، کەنیزەكو کارەکەرتان بەشوو بدەن، کوڕ کەوەختی ژن هێنانی هات ژنی بۆ

بێنن، کچ کەکاتی شوکردنی هات بەشوی بدەن کۆسپو تەگەرە مەخەنە بەر ئەم کارە پیرۆزە، یارمەتی ماڵی پێویستیان بدەن، وابکەن ژنهێنانو شوکردن بەئاسانیو سادەیی پەیڕەوی بکرێو بەشێوەیەکی سروشتیو سادەیی ئەنجام بدرێ، کوڕە گەنجەکانتان هەڵنێن بۆ ئەوەی زوو ژن بهێنن، کچەکانتان واڵێ بکەن بڕو بیانوی وانەگرن کوڕەکان نەوێرن داخوازییان بکەن.

هەرگیز لایەنی هەژاری مەکەن بەکۆسپو تەگەرەی ئافرەت بەشوودانو ژن هێنان، قەت هەژاریو دەوڵەمەندیی مەکەن بەپێوەری ژنهێنانو کچ بەشودان، بڵێن: لەبەرئەوەی کوڕەکە هەژارە کچی پێ نادەین، یان ئەو ماڵە هەژارە ئافرەتی لێ ناخوازین. چونکە ﴿إِنْ يَكُونُوا فُقَرَاءَ يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەگەر ئەوانە هەژار بن خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی دەوڵەمەندیان دەکا، ئەوانەی هەژارن نێر بن یامێ، ئازاد بن یان کۆیلە، خودا دەیانژێنێ رزقو رۆژییان لەسەر خودایە، خودا بەلوطفی خۆی بێ ئاتاجیان دەکا.

کۆمەڵێك لەزانایان ـ ئیمامی رازیشیان لەگەڵ دایە، دەفەرموون: فەرمانەکە بۆ وجوبە، هەرکەسێك بتوانێ ژن بهێنێ یان شوبکا، دەبێ پەلە لەئەنجامدانی بکا، دەبێ بەپەلە ئەنجامی بدا، چونکە لەصەحیحەین دافەرموودەیەك هەیە ئیبنومەسعود ریوایەتی کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (یامعشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج، فانه أغض للبصر وأحصن للفرج ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فانه وجاء) ئەی کۆمەڵی گەنجەکان هەرکەسێ لەئێوە دارای پێداویستی ژنهێنانی هەیە بازن بێنێ، چونکە ژنهێنان والەپیاو دەکا سەیری ئافرەتی نامەحرەمو بێگانە نەکا، داوێن پاك بێو تووشی تاوانی زینا نەبێ، ئەگەر داراییشتان نەبوو بەرۆژو گرتن حەزو ئارەزوی خۆتان بشکێنن. چونکە رۆژەگرتن بنبڕکەری حەزو ئارەزۆیە.

هەروەها لەسونەنی ئەبوداود نەسائیدا هاتووە ریوایەت لەمەعقیلی کوڕی یەسار دەکرێ دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (تزوجوا الودود الولود فانی مکاثریکم الأمم) ئافرەتی خۆشەویستو بەسكو سزا مارەبکەن، چونکە من رۆژی قیامەت شانازی بەزۆری ئێوە دەکەم پێم خۆشە ئوممەتەکەم زۆر بێ.

کەدەفـەرموێ: (والـصالحین) مەبەسـت بەصـەلاح مـەعنای شـەرعیە واتـە: موراعاتی فەرمانی ئایینو جلەوگیرییەکانی بکەن.

ئیمامی شافیعی لەظاهیری رستەی (وأنکحوا الایامی منکم) حوکمی ئەوەی دەرهێناوە کەوەلی (باوك و باپیر....هتد) بۆیان هەیە کچی رەسیدەی بالغ بەبێ رەزامەندی خۆی ماربکەن، چونکە خیطابی ئایەتەکە بۆ (وەلیەکانە) ئەوان فەرمانیان پێ کراوە بەمارەکردنی ئەو کچانەی ویلایەتیان بەدەست ئەوانە.

بەلام حوکمی ئایەتەکە بەفەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: کەموسلیمو ئەبوداودو نەسائی لەئیبنوعەبباسەوە ریوایەتیان کردوە: دەفەرموێ: (البکر تستأمر فی نفسها، وإذنها صماتها) تەخصیص کراوە، چونکە فەرمودەکە ئەوە دەگەیەنێ: کەپێویستە کچ ئیزن بداو رازی بێ باوکی یان باپیری مارەی بکا.

شافیعی لەئایەتەکە حوکمی ئەوەی دەرهێناوە: کەئافرەت مافی ئەوەی نیە سەروکاری مارەکردن بکا! واتە: ناتوانێ خۆی مارە بکا، یان ئافرەتی تر مارە بکا، ئەمجار دوای فەرمان بەژنهێنانو شوکردنی ئادەمیزادان ئەوانەی پێویستیان بەئەنجامدانی ئەو کارە پیرۆزە هەیە بەدەولەمەندو هەژاریانەوە، رێگا چارەیەکی گونجاو دادەنێ بۆ ئەوانەی پێویستیاتی ژنهێنانو شوکردنیان بۆ دەستەبەر نابێو دەفەرموێ: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِينَ لا يَجِدُونَ نِكَاحاً حَتَّى يُغْنِيَهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ بائەوانەی پێداویستی ژنهێنانو شوکردنیان بۆ دەستەبەر نابێ، ئەوپەڕی داوێنپاکی رەچاو بکەنو ناموسی خۆیانو خەلکی بپارێزنو توخن فاحیشەو فەساد نەکەون، تا خودا بەفەضلو گەورەیی خۆی دەولەمەندیان دەکاو دەگەنە حالێك دارای ژنهێنانو شوکردن دەبنو پێداویستیەکانی هاوسەر پەیدا کردنیان بۆ دەستەبەر دەبێ:

ئەمجار دێتە سەر بەیانکردنی حوکمی نۆیەم: کەئەویش قەبالە نوسینە لەگەل کۆیلەکان بۆئەوەی خۆیان ئازاد بکەن، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً﴾ ئەو بەندانەی داوا لەئاغاکانیان دەکەن بۆ ئەوەی لەسەر مالێکی دیاریکراوو لەماوەیەکی دیاری کراودا ئازادیان بکەن. باگەورەکانیان داواکەیان وەربگرنو قەبالە نامەکەیان لەگەل بنووسن، ئەگەر

زانیتان کەسایەتی ئەوەیان هەیەو شایانی ئازاد بوونو خاوەن تەقواو صەلاحن، دەستپاكو كاسبو تێكۆشەرن، دەتوانن ئیش بكەنو ماڵی دیاریكراو لەماوەی دیاریكراودا دەدەن بەئاغاكانیان.

﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ ئەی خاوەن كۆیلەكان! ئەی ئاغاو قەڕاڵەكان، بەشێك لەو ماڵو دارایی یەی خودا پێی داون بدەن بەو كۆیلانەو بار بوویان بكەن، چواریەك سێیەك حەوت یەك دەیەكی ئەو ماڵەی لەسەری رێ كەوتوونو قەباڵەتان بۆ نوسیون لێیان خۆش ببنو بۆیان داشكێنن.

حوكمی دەیەم زۆر كردن لەچەتیووئافرەتە كۆیلەكان بۆ زیناكردن. بێگومان خەتەرترین دیاردەی كۆیلایەتی لەكۆمەڵگادا بەكارهێنانی چەتیوە كۆیلەكانە بۆ لەشفرۆشی، ئەوە دیاردەیەكی سەردەمی نەزانی بوو، ئەگەر یەكێك لەو سەردەمەدا چەتیوێكی هەبووایە دەینارد بۆ لەشفرۆشیو پارەی لێ وەردەگرت، زۆری لێ دەكرد بچێ زینا بكاو پارە وەربگرێ بیخاتە دەستی جەنابیەوە. ئەمە خۆی لەخۆی دائەو دیاردە بەغایەیە كەتا ئەمرۆش بەردەوامە.

جا كەئایینی ئیسلام ویستی كۆمەڵگای ئیسلام پاك بكاتەوە، بەشێوەیەكی گشتی زینای یاساغ كردو هەوڵی قەلاچۆكردنی دیاردەی داوێن پیسی دا، ئەم حاڵەتە تایبەتیەشی بەدەقێكی تایبەتی یاساغ كردو فەرمووی: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ زۆرە ملی لەچەتیوەكانتان مەكەن بۆ لەشفرۆشی حەرامەو كارێكی پیسە، بەرەوای مەزانن‌و رێگای بۆ خۆش مەكەن، بتانەوێ كاڵایەكی دونیاییتان لەئەنجام دانو رێپێدان بۆ ئەو تاوانە دەست بكەوێ.

بێگومان رستەی ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً﴾ مەرجی زۆر لێكردنەو بەیانی ئەو واقیعەیە: كەئایەتەكە بەهۆیەوە نازڵ بووە، نەك مانای وابێ ئەگەر چەتیوو كەنیزەكەكان زۆریان لێ نەكریو بەئارەزۆی خۆیان بێ قەیناكە!

نەخەیر قەیدار كردنی حوكمەكە كەبەقەیدی ئیرادەی (تحصن)و مەبەستی ماڵ پەیداكردن بەوكارە مەفهوومی موخالەفەیان نیەو قەیدی بەیانی واقیعن! ئاماژە بەو فەرمودەیەی كەئیبنو مەردەویەی لەئیمامی عەلی یەوە ریوایەتی كردوە دەفەرموێ: عەرەبەكان لەسەردەمی نەزانی دا زۆرە ملێیان لەچەتیوەكانیان دەكرد

بۆ زیناکردن‌و لەشفرۆشی‌و پارەیان لێ وەردەگرت، ئیتر ئایین جڵەوگیریی لێکردن‌و ئەم ئایەتە لەوبارەوە نازڵ بوو، یان وەکوو ئاماژەمان پێکرد، سەرۆکی دووڕووەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول شەش کەنیزەکی هەبوون بەزۆر دەیدان بەخەڵکی زینایان لەگەڵ بکەن‌و پارەیان لێ وەرگرێ.

قەیدی ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً﴾ بەیانی وقیعەو بۆ بێزاری دەربڕینە لەوکەسانەی ئەو کارە ناشرینە دەکەن‌و داوێن پیسی ڕەواج پێ دەدەن، واتە: ئافرەت بەسروشت ئارەزۆی کاری جنسی لەپیاو بەهێزترە، بەتایبەتی ئەو کەنیزەك‌و چەتیوانەی لەشەڕدا گیراون، لەناو گەل‌و نەتەوەی بێ بڕوادا پەروەردە بوون‌و پەروەردەیەکی بێدینانە کراون، جاکەنەوانە بەو حاڵەش حەزیان لەداوێنپاکی بێ‌و نەیانەوێ زینا بکەن، ئەوە ئەوپەڕی بێ ناموسی‌و گەوادیی یە بۆ خاوەنەکانیان: کەبەزۆر بیانەوێ ئەو کارە ناشرینەیان پێ بکەن‌و کاڵایەکی دونیایی لێ وەربگرن!

جا ﴿وَمَنْ يُكْرِهُنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ کەسێك زۆرەملێ لەچەتیوەکان بکا، بەجەخت زینایان پێ بکا، ناچاریان بکا لەشفرۆشی بکەن، ئەوە خودا بۆ ئەوان ـ پاش ئەو زۆر لێکردنە ـ لێبوردەیەو لێیان خۆش دەبێ، لەسەر ئەو تاوانە سزایان نادا.

ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکا: کەزینا کردن، ئەگەر بەزۆریش پێی بکەن هەر تاوانەو گوناهە بۆیە لێخۆشبون دەیگرێتەوە، چونکە ئەو جۆرە تاوانە ئەگەر بەزۆریش بێ جۆرە خۆ بەدەستەوەدانێکی تێدایە.

١ـ ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ﴾ ئێمە نازڵمان کردوە بۆ ئێوە لەم قورئانەدا (یان لەم سورەتەدا) چەند ئەحکام‌و یاسایەکی ڕون‌و ئاشکرا، باری ژیانی ئێوە ڕون دەکاتەوەو پێویستان پێیانە بۆ بەختەوەری ژیانی دونیاو قیامەت.

٢ـ ﴿وَمَثَلاً مِنَ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ﴾ هەروەها بۆمان نازڵ کردون چیرۆکی ڕوداوێکی سەیرو سەمەرە کەچیرۆکی بوختان کردن بوو بەدایکی موسوڵمانان خاتو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ: کەدەق دەشوبهێتە ڕوداوو چیرۆکی حەزرەتی یوسف عليه السلام‌و خاتو مەریەمی دایکی عیسا عليه السلام. بوختانکردن بەعائیشە وێنەو

نموونەیە بۆ ئەو بوختانەی کەبەحەزرەتی یوسف ﷺ کرا هەروەها ئەو بوختانەی پاڵ مەریەم درا.

٣- ﴿وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ هەروەها نازڵمان کردوە بۆ سەرتان، چەند پەندو ئامۆژگارییەك بۆ ئەوەی لەخودا ترس و پارێزەرەکان بیکەنە رێ رۆشنکەرەوەی ژیانیانو پابەندی ئەو ئاموژگاریانە بن.

تێبینی: حوکمی ژنهێنانو شوکردن بەگوێرەی حاڵی ئادەمیزادەکە دەگۆڕێ: کەسێك بترسێ لەزینا کردنو خۆی پێ زەوت نەکرێ ئەوە هاوسەر پەیداکردن بۆ ئەو واجبە.

ئەگەر ترسی زینای نەبوو، حاڵو وەزعی مام ناوەندیی بوو، ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: هەوڵدان بۆ هاوسەر پەیدا کردن موباحە بۆی. ئەبوحەنیفەو مالیكو ئەحمەد دەفەرموون سوننەتە. بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کەدەفەرموێ: (من رغب عن سنتي فليس مني) فەرمودەکەبوخاریو موسلیمو ئەحمەد هێناویانەو لەئەنەسەوە ریوایەتیان کردوە.

شافیعی دەفەرموێ زیواج وەرگرتنی لەززەتو خۆشی یە وەکوو خواردنی خۆشو خواردنەوەی ئاوی ساردو شیرین وایە چۆن ئەمانە موباحن ئەویش موباحە.

## پەروەردگار روناککەرەوەی ئاسمانەکانو زەوییە، بەوە: کەبەڵگەی جۆراو جۆری باوەڕی تێدا داناون

﴿ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا

يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾

دوای بەیانکردنی شەریعەتو یاسای عەمەلی، واتە: حوکمە شەرعییەکانو رونکردنەوەی ئەخلاقو رەوشت، دێتە سەر بەیانکردنی لایەنێکی بنەمای بیروباوەڕ: کەباسی خودایە: واتە: لەتەوەرەی (الهيات) دا دەسورێتەوە.

دەفەرموێ: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ پەروەردگار روناککەرەوەی بوونەوەرە، هیدایەتدەری مەخلوقاتە، بەهۆی ئەوەوە کە: لەبوونەوەردا چەندەها بەڵگەو نیشانەی داناون، هەموویان بەڵگەن لەسەر هەبوونی خودای تاکو تەنها، هەروەها بەهۆی ئەم نیگاو سروشەوە: کەناردویەتی بۆسەر پێغەمبەرانو ئەوانیش بەئادەمیزادیان گەیاندوە. جاکەسێك دڵو دەروونی بەو نورە روناك بوبێتەوە، خۆشبەختیو کامەرانی دونیاو قیامەتی دەستەبەر کردوە! ئەمە لەلایەن نورو روناکی مەعنەوییەوە، نورو روناکی (حیسسی) ش ئەوە ئاشکراو نومایانە خودا سەرچاوەی روناکی یە، بەدیهێنەری روناکی یە، تاریك رەوێنەرەومیە، بەڕێوەبەری بوونەوەرە، بالآدەستی رەهاو تەواوی هەیە بەسەر بوونەوەرداو ساتەوەختێك لێی بێ ئاگا نیە. ﴿مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ﴾ صیفەتو حاڵی نوری خودا لەئاسمانەکانو زەوی‌دا لەهەبوونو روناکیو جیلوەو پرتەودا وەکوو روناکاییو پرتەوی چراێك وایە لەناو جامێکی مینایی بێگەرد دا.ئەو جامە بلورینە لەناو تاقێکی بێ کونو کەلەبەردا بێو روناکایی چراکە کۆبکاتەوەو نەیەڵێ بەملاو بەولادا بلآوبێتەوە، ئەو چرا پرتەو بەخشە هەردەڵێی ئەستێرەیەکی پرتەو بەخشە لەئەستێرە گەڕۆکەکان بەهەر چوارلای خۆیدا روناکی بلآوبکاتەوە.

﴿يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ﴾ ئەو دارە دابگیرسێ لەرۆنی دارێکی پیرۆزو خاوەن بەرەکەت: کەداری زەیتونە، ﴿زَيْتُونَةٍ لا شَرْقِيَّةٍ وَلا غَرْبِيَّةٍ﴾ ئەو درەختە نەزۆر خۆرهەڵاتیو نەزۆر خۆرنشینی بێ، بەڵکوو لەباخێکی دەشتو سارادا بێ یان لەبەرزایی تەپۆڵکەیەکدا بێ لەنسێو لاپاڵدا نەبێ، هەموو کاتێ لەرۆژدا هەتاو لێی بدا هەتا بەرەکەی باش پێ بگەیەنێ، رۆنی زەیتونەکە هێندە صافو بێ خەوش بێ ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ﴾ لەوانەیە زەیتەکەی لەخۆیەوە بێ یان لەبەرزایی تەپۆڵکەیەکدا بێ بائاگریشی نەگاتێ دابگیرسێو روناکایی هەڵگیرسانەکەی سەرباری روناکایی خودی خۆی بێ. چونکە زەیت ئەگەر صافو بێخەوش بێ، لەدوورەوە ببینرێ، پرتەوێکی لێ دەبینرێ دەڵێی شوعاعی خۆرە، جاکەئاگری وێکەوت رووناکی دەکەوێتە پاڵ روناکی!

دڵو دەروونی موسوڵمانیش بەوجۆرەیە پێش ئەوەی نووری زانیاری بۆ بێ بەهۆی هیدایەتەوە رووناکە، کەڕوناکی زانیاری تێکەوت، روناکایی دەچێتە پاڵ روناکاییو هیدایەت دەکەوێتە سەر هیدایەت. بۆیە یەحیای کوڕی سەلام دەڵێ: دڵی موسوڵمان پێش ئەوەی حەقی بۆبەیان بکرێ، حەق دەناسێ، چونکە حەق موافیقی دڵی ئەوە، هەر لەم رەوەیە: کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أتقوا فراسة المؤمن فانه ینظر بنور الله) [٣٥] خۆتان بپارێزن لەفیراسەتو دیقەتی موسوڵمان، چونکە ئەو بەهۆی نوری خوداوە دەڕوانێ.

﴿يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ پەروەردگار بۆ هەرکەسێ مەیلی لێ بێ هیدایەتی دەداو شارەزای دەکا بۆ تێگەیشتن لەنووری وجوودی بوونەوەر کەخودا (واجب الوجود) بەدی هێناوەو شارەزای دەکا بۆئەوەی فکری خۆی بخاتەگەڕ بۆ تێگەییشتن لەبوونەوەرو کردنی بەنیشانەو بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خودا، وەکوو چۆن خۆر: کەهەڵدێ، لەبەرزایی یەوە پرتەوی خۆی دەخاتە سەر زەویو روناکی دەکا.

(٣٥) رواه البخاری فی التاریخ وابوداود عن ابی سعید الخدری.

شارەزای دەکا بۆ نوری عیلمو عیرفانو ئیمان: کەدەیبەخشێ بەدانیشتوانی سەر زەویو ئاسمانەکان بۆ ئەوەی باوەڕ بەخودایەتی خوداو پێغەمبەرایەتی ڕەھبەرەکانو قودسییەتی فریشتەکان بکەن.

﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ﴾ پەروەردگار نموونە دەھێنێتەوە بۆ ئادەمیزادو، شتی مەعقولو غەیرە ماددی دەخاتە ڕو، بۆئەوەی مەعانییە نهێنییەکان لەتێگەیشتن نزیك بکاتەوە، ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار زانایە بەھەموو شتێك هیچ شتێکی لێ هون نابێ. دەزانێ کێ شیاوی هیدایەتو کێ شیاوی گومڕایی یە.

هەندێ پێیان وایە: کەئایەتەکە نموونەی قورئانی هێناوەتەوە لەدڵی موسوڵمان دا، بەم مانایە: کەچۆن ئەم چرایە روناکی دەبەخشێو کەم ناکا، هەروا قورئانیش هیدایەتی پێ دەستەبەر دەبێو فەڕو بەرەکەتی کەم ناکا. مەبەست بە (المصباح) قورئانی پیرۆزە، مەبەست بە (الزجاجة) دڵی موسوڵمانە مەبەست بە (المشكاة) زوبانی موسوڵمانو تێگەیشتنیەتی. مەبەست بە (الشجرة المباركة) درەختی وەحیو سروشە، مانای ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ﴾ واتە: بەڵگەکانی قورئان هێندە ئاشکراو نومایانن لەوانەیە بێ ئەوەی بخوێندرێنەوە بەسەر خەڵك دا هەستیان پێ بکرێ. مانای ﴿نُورٌ عَلَى نُورٍ﴾ واتە: قورئان نووری خودایە بۆ بەندەکانی، سەرباری ئەو بەڵگەو نیشانانەیە کەلەبوونەوەردا بڵاوکرانەوەو پێش نازڵبوونی قورئان کەوابی بەنازڵبوونی قورئان نورێکی تریان بۆ زیاد بوو. ئەم نوورە کەسێك پێی دەگا: کەخودا بیەوێهیدایەتی بدا.

بەکورتی: ئەمە نموونەی نووری خوداو هیدایەتی خودایە لەدڵی موسوڵمان دا، هەر وەکوو چۆن زەیتی صافو بێ خەوش لەوانەیە بێ ئەوەی ئاگری وێ بکەوێ، روناکی بدا جائەگەر ئاگری وێ کەوت روناکی دەکەوێتە سەر روناکی، هەر بەوجۆرە دڵی موسوڵمان بەهیدایەت بەختەوەر دەبێ پێش ئەوەی زانیاری بۆ بێ جاکەزانیاری بۆهات هیدایەتی تری بۆ پەیدا دەبێو دەبێتە خاوەنی هیدایەت لەسەر هیدایەتو نوور لەسەر نوور، پێویستە ئاماژە بۆئەوە بکەین: کە وشەی (نور) چەند مانایەکی هەیە:

١- بـەمانا شیکەرەوەو بەیانکەرو بەدیهێنـەر بـێ، بـەم پێیـە وشـەی نـور دەبـێ (صفة مشبهة) بێ ئـەو کاتـە ماناکـەی حەقیقەتـەو مـەجازی تێـدا نیـە، بـەم جـۆرە دەتوانین بڵێین مانای ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ خودای پەروەردگار دروستکەرو بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوییە، لەنەبووەوە هێناونیە وجوود.

٢- (نور) بەمان پرتەو بێ، ئەوکاتە بەحەقیقەت حەمل ناکرێ بـۆ سـەر وشـەی (الله) بـەڵکوو دەبـێ تـەئویل بکـرێ (نـور) بـەمانا (منـور) مانـا بکـەین جائەوکاتـە رستەی ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەگـەر مەبەسـت بەنورەکـە نـوری مەعنـەوی بێ، ماناکـەی بـەم جـۆرە دەبـێ، خـودا عـیلمو عیرفـانی داوە بەئـەهلی ئاسمانـەکانو زەوی، واتــە بەفریــشتەکانی ئاسمــانو بەرەهبــەرانی ئــادەمیزاد لەپێغەمبــەرانو پیاوچاکان.

ئەگـەر مەبەسـتیش نـوری حیسـسی بـێ ئەوکاتـە ماناکـە بـەم جـۆرە دەبـێ: پــەروەردگار ئاسمانــەکانو زەوی رونــاك کردۆتــەوە بــەڕوناکی خــۆرو مــانگ ئەستێرەکان.

٣- موجاهیـد دەفـەرموێ: (نـور) بـەمان (مـدبر)ە واتـە کاروبـاری ئاسمانـەکانو زەوی هەڵدەسوڕێنێ.

٤- ئوبەی کوڕی کەعبو (الحسن)و (ابوالعالیه) دەڵێن: (نور) بەمەعنا (مـزین)ە واتە: خودا رازێنـەرەوەی ئاسمانەکانـە بـەخۆرو مـانگو ئەسـتێرەکان، رازێنـەرەوەی زەوییە بە پێغەمبەرانو زانایانو خودا پەرستانی راستاڵ.

بەڵام ئەگەر بەوردی سەیری تەفسیرەکان بکەینو رای زانایان لەسـەر تەفـسیری ئەم ئایەتە بەراورد بکەین، بۆمان دەردەکەوێ: کەتەفسیری (نور) بە (منـور) بکـرێ راستو ڕەوانە.

بەتایبــەتی ئەگــەر قیرائــەتی زەیــدی کــوڕی عــەلی ئەبوجەعفــەری (المکــی) بەرچــاوبگرین: کەلەوقیرائەتــەدا وشــەی (نــور) بەشــێوەی فیعلــی (مــاضــی) خوێندراوەتەوە: واتـە ئـەم قیرائەتـە بـەم جۆرەیـە ﴿اللَّـهُ نُـورُ الـسَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ فاعیلی (نور) رانـاوەو دەگەڕێتـەوە بـۆ (الله) واتـە: خـودا ئاسمانـەکانو زەوی رونـاك

کردونەوە، لەم رووەوە ڕێكو پێك بەدی هێناون، یاساو نیظامی تۆکمەی بۆ داناون، کەمو کوڕییان تێدا نیە، هەموو شتێکیان بەئەندازەو نەخشەو پلانە [١].

## موسوڵمانانی سوودمەند لەنووری خودا

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَـٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ۙ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار ئەوەی ڕونکردەوە: کەنوورەکەی هۆی هیدایەتی بەندەکانیەتی، ئەمجار لێرەدا حاڵو وەزعی ئەوانە بەیان دەکا: کەبەو نورە سوودمەند دەبن.

دەفەرموێ: ﴿فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ (فی بیوت) جارو مەجروره پەیوەندە بەپێشەوە واتە: (کمشکاة کائنة فی بیوت).

کەوابێ ماناکە بەم جۆرە دەبێ: ئەو نووره ڕەهاو موطلەقە، ئەو نووره پڕتەو بەخشە لەئاسمانەکانو زەوی‌دا دەردەکەوێو جیلوەبەخش دەبێ لەچەند خانوویەك دا: کەتێیاندا دڵەکان بەخودا پەیوەست دەبن بیری لێ دەکەنەوەو لێی دەترسنو

---

[١] تفسیر فتح القدیر للشوکانی ج٤/٣٢-٣٥ طبعة دار أحیاء.

ئیخلاصی بۆ دەنوێنن، لەبەرخاتری خودا واز لەهەموو خۆشی یەکی ڕواڵەتی ژیان دەهێنن، خۆشیو لەززەتی ڕاستی لەو پەیوەندییەدا بەرجەستە دەکەن!

ئەو نوورو روناکییە ﴿أَذِنَ اللَّهُ أَنْ تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾ لەچەند مزگەوتێك دایە خودا ئیجازەی داوە بەرز بکرێنەوە ڕێزیان لێ بگیرێ، لەبتپەرستیو پیسی تر پاك بکرێنەوە، تەنها عیبادەتی خودایان تێدا بکرێ، لەقسەو لەغوەی پڕوپوچ بپارێزرێن. تایبەت بکرێن بۆ خودا پەرستیو چەسپاندنی یەکتاپەرستی!

قەتادە دەفەرموێ: (فی بیوت) مەبەستی ئەم مزگەوتانەیە. خودا فەرمانی کردوە بنیات بنرێن، ئاوەدان بکرێنەوە لەبتپەرستی جۆراو جۆرو قسەو باسی پڕو پووچ بپارێزرێن، رەبازییان تێدا نەکرێو وابزانرێ خودا پەرستییە!! ژنو پیاوی تێدا تێکەڵاو نەبنو وابزانرێ عیبادەتە. وەکوو لەهەندێ مزگەوت دا ئێستا بەرچاو دەکەوێ.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: مزگەوتەکان خانەی خودان لەسەر زەوی رووناکی دەدەن بەئەهلی ئاسمانەکان، وەکوو چۆن ئەستێرەکان رووناکی دەدەن بەزەوی.

عەمری کوڕی مەیمون دەفەرموێ: بەخزمەت چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم دەیانگوت: مزگەوتەکان خانەی خودان، خودا لەسەر خۆی پێویست کردوە: کەرێز لەوانە بگرێ دیدەنی ماڵەکانی دەکەن.

موسلیمو بوخاری فەرمودەیەکیان ریوایەت کردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (من بنی مسجدا لله یبتغی به وجه الله بنی له مثله فی الجنة) واتە: کەسێك لەبەرخاتری خودا مزگەوتێك دروست بکا خودا خانویەکی لەوجۆرە لەبەهەشتا بۆ بنیات دەنێ!

﴿يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالآصَالِ، رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ﴾ تەسبیحاتی خودا لەو مزگەوتانەدا بکا چەند پیاوێك بەیانیانو ئێواران: کەهیچ کڕینو فرۆشتنێك، هیچ مامەڵەو بازرگانییەك لەیادیخوداو نوێژ کردن لەکاتی خۆی داو زەکاتدان بەوانەی شیاوی زەکات پێدانن غافڵیان ناکا. گرنگترین شت بەلایانەوە خودا پەرستییە:

کەدەفەرموێ: (رجال) ئاماژەیە بۆ ورەبەرزیو خۆراگری پیاوان، بۆ عەزیمەتو سووربوونیان لەسەر خودا پەرستی، کەبەهۆی ئەو رەوشتانەیانەوە بوون بەدروستکەرو بنیاتنەری ئەو مزگەوتانەی: کەماڵی خودان لەسەر زەوی، پابەندی شوکری خودان، راستاڵانە طاعەتی بۆ دەکەن! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ﴾ (ألأحزاب/٢٣)

وێنەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کەدەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ﴾ (المنافقون/٩)

هەر لەوشەی (رجال) لەئایەتەکەدا هەندێ لەزانایانی شەرعزان ئەوەیان دەرهێناوە: کەنوێژی جەماعەت لەسەر پیاوان فەرزەو دەبێ بەجەماعەت نوێژ بکەن، بەڵام بۆ ئافرەت نوێژ لەماڵەوە بکا خێری زیاترە، لەبەر ئەو فەرمودەیەی ئەبوداود: کە لەعەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ریوایەتی کردوە، دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (صلاة المرأة في بيتها أفضل من صلاتها في حجرتها، وصلاتها من مخدعها أفضل في صلاتها في بيتها)

ئیمام ئەحمەدیش فەرمودەیەکی لەئوموموسەلەمەوە ریوایەت کردوە: دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (خير مساجد النساء قعر بيوتهن) واتە: باشترین مزگەوت بۆ ئافرەتان ناو ماڵی خۆیانە.!

هۆی ئەوەی کەئەو پیاوانە وەگری مزگەوت دەبنو سەرگەرمی نوێژ کردنو ذیکری خودا دەبن ﴿يَخَافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالأَبْصَارُ﴾ ترسی عەزابی رۆژی قیامەتیان هەیە، عەزابی رۆژێك کەدڵەکان تێ یدا لەترسان دەکەونە کوتە کوتو چاو بەملۆق دەوەستنو هەموو کەس ترس دایدەگرێو کەس وەسەرکەسی ناپرژێ رۆژێکی گرژو سامناکی وەها: کەهەرکەسە دەیەوێ خۆی رزگار بێ، لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ ﴿إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْماً عَبُوساً قَمْطَرِيراً﴾ (الإنسان/١٠)

بۆیەش ئەوەندە تەقواکارو لەخودا ترسن ﴿لِيَجْزِيَهُمْ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ﴾ بۆئەوەی خودا پاداشیان بداتەوەو زیاتریش! وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ (الانعام/١٦٠) یان دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ (یونس/٢٦).

لەفەرمووودەیەکی قودسیدا هاتووە: ئەحمەدو موسلیمو بوخاریو تیرمیذیو ئیبنوماجە لەئەبوهورەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت، ولاأذن سمعت، ولاخطر على قلب بشر) خودا دەفەرموێ: ئەمن بۆ بەندە صالیحەکانم پاداشێکم ئامادە کردوە، هیچ کەس بەچاو نەیبینیوە، بەسەر دڵی هیچ ئادەمیزادێکدا تێنەپەڕیوە.

﴿وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ بێگومان پەروەردگار فەضلو چاکەی بەرفراوانە بەویستی خۆی بۆهەرکەسێکی بوێ فەضلو چاکەی خۆی بەبێ ژمارە پێدەبەخشێو هیچی لێ عاسێ نابێ.

## زانایانی ئیسلام چەند حوکمێکیان لەم ئایەتانە وەرگرتووە:

١- پەروەردگار فەرمان دەکا بەئاوەدان کردنەوەی مزگەوت لەروی مادییەوە بەبەرز کردنەوەو بنیاتنانی، لەڕوی مەعنەویشەوە بەنوێژ تێدا کردنو قورئان تێدا خوێندنو دەرس تێدا گوتنەوەو ئامۆژگاریی تێدا کردنی موسوڵمانان.

٢- زەخرەفە کردنو رازاندنەوەی مزگەوت: بەلای هەندێ لەزانایانەوە دروستە، چونکە نیشانەی رێزگرتنی ماڵی خودایە، پەروەردگاریش فەرمانی بەرێز گرتن لەماڵی خۆی کردوە، لەسەر ئەو مانایە کەوشەی (ترفع) لە (في بيوت أذن الله ان ترفع) بەمانا (تعظم) بێ واتە رێزی لێ بگیرێ.

هەروا ریوایەت کراوە: کەئیمامی عوسمان ﷺ مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ بەداری ساج رازاندەوە!

تەنانەت ئەبوحەنیفە دەفەرموێ: چ خراپییەك لەوەدا نیە مزگەوت بەئاوی زێڕ بنەخشێندرێ.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەو سەدەمەدا: کەوالی مەدینە بوو مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ رازاندەوە، زۆری جوان کردو کەسیش رەخنەی لێ نەگرت.

٣- کۆمەڵێکیش لەزانایانی ئیسلام بەلایانەوە مەکروهە مزگەوت زەخرەفەی تێدا بکرێو برازێندرێتەوە، بەلگەشیان ئەو فەرموودەیە: کەئەبوداود

لەئەنەسەوە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتقوم الساعة حتى يتباهى الناس فى المساجد)

٤- پێویستە مزگەوت لەشتی پیس‌و بۆنی ناخۆش بپارێزرێ قسەی ناشیرین‌و پڕو پووچی تێدا نەکرێ. ئاماژە بەو فەرمودەیەی: کەموسلیم‌و بوخاری لەجابیرەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: (من اكل ثوما اوبصلاً فلا يغشانا فى مسجدنا) یان فەرموی: (فليعتزلنا وليعتزل مسجدنا وليقعد فى بيته) کەسێك سیری خوارد یان پیازی خوارد، بانەیە لەمزگەوت دا سەرو دڵمان بگرێ. یان بالێمان جیا بێتەوەو نەیەتە مزگەوتمان‌و لەماڵی خۆی دابنیشێ.

٥- هەروەها نابێ لەمزگەوت دا مامەڵەو کڕین‌و فرۆشتن ئەنجام بدرێ، نابێ بانگ بۆ شتی هونبوو رابهێڵدرێ، هەروەها هەموو کارو بارێکی دونیایی لەوجۆرەی نابێ تێدا ئەنجام بدرێ. چونکە موسلیم لەبورەیدەوە فەرموودەیەکی ریوایەت کردوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەو کابرایەی فەرموو: کەبانگی ڕادەهێشت بۆدۆزینەوەی وشترە سورەکەی: فەرموی: (لاوجدت، انما بنيت المساجد لما بنيت له) یاخوا نەیدۆزییەوە، کەی شوێنی جاڕدانی دۆزینەوەی وشتر مزگەوتە؟ مزگەوت بنیات نراوە بۆ ئەوشتەی بۆی بنیات نراوە.

٦- بەلای مالیکیەکانەوە بۆبێ ئەنوایان‌و غەریبان دروستە لەمزگەوت دا بنون. چونکە پێغەمبەر ﷺ رێگای دا کۆمەڵێك لەبێ ئەنوایان لەمزگەوت دا بنوون..

لەصەحیحەینیشدا هاتووە: کەعەبدوڵلای کوڕی عومەر لەسەردەمی زوگوردی دا لەمزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ نووستووە.

٧- بەلای شافیعیەکانەوە نووستن لەمزگەوت دا مەکروهە.

٨- کەسێك چووە ناو مزگەوتەوە بائەم دوعایە بخوێنێ‌و بڵێ: (اللهم أفتح لى ابواب رحمتك) خودایە! دەرگای رەحمەتی خۆتم لێ بکەیەوە. ئەمجار سوننەتە دووڕکاتی (تحية المسجد) بکا. کەهاتەدەر لەمزگەوت بائەم دوعایە بکا (اللهم انى أسألك من فضلك) خودایە! داوای خێرو بەرەکەتت لێ دەکەم لەفەضل‌و بەخششی خۆت بێ بەشم نەکەی!

## حاڵی کافران لەدونیاداو خەسارەتمەندییان لەقیامەتدا

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ ۗ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ ﴾

ریوایەت کراوە: کەئایەتی ژمارە (٣٩) ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا﴾ دەربارەی عوتبەی کوڕی رەبیعەی کوڕی ئومەییە نازڵ بووە، ئەمماڵوێرانە لەسەردەمی نەزانیدا لیباسی خودا ناسی لەبەرکردبوو، خۆی بەئاییندار دەزانی، کەئیسلام هات، ئیمانی نەهێناو خۆی بەکافری هێشتەوە، هەندێکیش دەڵێن: دەربارەی شەیبەی کوڕی رەبیعە نازڵ بوو، هەردووکیشیان بەکافری مردن!!

پەیوەندیی ئەم کۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە لەم روەوەیە: پەروەردگار لەوەپێش حاڵو وەزعی موسوڵمانانی باس کرد ئەوەی شی کردەوە: کەئەوان لەدونیادا لەنوری خودادان، دڵیان بەونووره روناکە، بەهۆی ئەوەوە کردەوەی چاك دەکەن، لەقیامەتیش دا پاداشی کردەوەکانیان بەباشی وەردەگرنەوە. ئەمجار بەشوێن ئەوەدا وەزعو حاڵی کافرەکان بەیان دەکا: لەدونیادا لەناو تاریکی دانو لەقیامەتدا عەزابی بەئێشیان دەدرێ، بۆ هەردوو حاڵەکەشیان نموونە دەهێنێتەوە:

جا نموونـەکان دەگـونجیٚ بـۆ حـاڵی دونیـاو حـاڵی قیامـەتیان بیٚ، یـان بـۆ دووجـۆر لەکافران بیٚ ئەوانەی لەناخەوە کافرن، ئەوانەی بەلاسایی کردنەوە کافرن.

دەفـەرمویٚ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئاً﴾ ئەوانەی کافرو بیٚ بڕوان، ئینکاری تاكو تەنهایی خودا دەکەن، پەیامی پێغەمبەر ڕەت دەکەنەوە، قورئان بەکەلامی خودا نـازانن. لەهـەمان کـات دا کردەوەی باشی دونـیـایی ئـەنجام دەدەنو پێیـان وایـە: ئـەو کردەوانـەیان لەقیامـەت سـوودبەخش دەبــن بۆیــانو لەســزای ســەختی قیامــەت ڕزگاریــان دەکــا، ئائــەو کردەوانــەیان دەق دەشـوبهێتە تراویلکـە کـەئادەمیزادی تینـوو لەسـارادا چـاوی لیٚ دەبیٚو واگومان دەبا ئاوە، خۆی بۆ دەکوتیٚ، کاتیٚ دێتەلای هیچ نیـە، حـاڵو وەزعـی کافرەکـانیش بەوشـێوەیە، پێیـان وایـە: کـردەوە باشـەکانیان (وەکـوو بـەجێهێنانی صیلەی ڕەحمو یارمەتیدانی هەژارانو چاککردنی ڕێگاو بانو بنیاتنانی قوتابخانەو خەستەخانە...هتد) سوودبەخش دەبن بۆیان لەقیامەت دا، لەسزای سـەختی دۆزەخ دەیانپارێزن، جاکەڕۆژی قیامـەت دیٚو بـەرەو ڕوی سـزای سـەختی دۆزەخ دەبنـەوە، دەزانـن کـردەوە باشـەکانی دونیایـان هـیچ دادیـان نـادەنو هـیچیان لیٚ شـین نـەبووە ﴿وَوَجَدَ اللَّهَ عِنْدَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ لەویٚ ئەو خودایەی بـڕوای پـیٚ نـەبوو دژایـەتی دەکـرد ئـەو دەبینـی، ئـەو چاوەڕوانی دەکا؛ بەڕاسـتی مـەوقیفێکی سەختو چەموشە، ئەگەر دوژمنێکی هاوشانی خۆی بدیبایا لەوانە بوو شـتەکە زۆر زەحمـەت نـەبیٚ، بـەڵام ئـەو بـەغافڵیو لـەنکاو خـودای خـاوەن توانـاو تۆڵەسـتێن دەبینیٚ، توشی دەبیٚ بەتوشی کارمەندانی دۆزەخەوە، تـیٚ ی ڕۆدێـنو کێـشی دەکـەن بـۆ دۆزەخ، بـەئاگر دەیـسوتێنن، ئـاوی کوڵاتـوی دەدەنـیٚ، کـێمو زوخـاوی بەگـەرودا دەکەن!.

بەڵیٚ لەو شوێنەی بەتەمایە کردەوەکانی دونیـای فریـای بکـەون لەسـزای خـودا ڕزگاری بیٚ، عەزابی سەختی دۆزەخی تووش دیٚ، سزای بیٚ باوەڕیو هاوەڵ دانان بۆ خوداو بەدرۆخستنەوەی قورئـانو پـەیامی پێغەمبـەر ﷺ وەردەگرێتـەوە، بـەکورتی کافرەکان ڕۆژی قیامـەت تووشـی نائومێـدی دێـن، لەگـەڵ واقیعێکـی تـاڵ دا ڕووبـەڕو دەبنەوە، شتێکیان چنگ ناکەویٚ سوودیان پیٚ بگەیەنیٚ!

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ مَوْجٌ مِنْ فَوْقِهِ سَحَابٌ﴾ نموونەی دووەم بۆ حاڵو وەزعی کافرە چاوڵ کەرەکان، ئەوانەی بەنەفامی شوێن پێشەوا کافرەکان دەکەون، وەکوو تاریکایی یەك وایە لەناو دەریایەکی قووڵی فرەئاودا، شەپۆل لەسەر شەپۆل بهاوێ، ئەمجار هەورێکی رەشی پڕ، روناکی خۆرو مانگو ئەستێرەکان دایپۆشێ، سێ جۆر تاریکی سواری یەکتر ببن؛ تاریکی دەریا، تاریکی شەپۆلەکان، تاریکی هەورەکان! ئەم تاریکیانە دەق دەشوبهێنە سێ جۆر تاریکی: کەلەکافردا هەن، تاریکایی بیرو باوەڕ، تاریکایی قسەی ناشرینو پوچ، تاریکی کردەوە، ئەم سێ تاریکیانەی لێ دەبنە لەمپەڕو ناهێڵن حەقو راستی ببینن، هەست بەبەڵگەو دەلیلی ناو بوونەوەر بکەن، سوود لەو نیشانانە ببینن کە نیشانەی تاكو تەنهایی خودان.

بەڵێ: کوفر خاوەنەکەی دادەبڕێ لەنووری خودا: کەبوونەوەری پڕ کردوە، بەڵام ئەو لێی بێ بەشە!

کوفر گومڕایی یەکە والە ئادەمیزاد دەکا: دیاریترینو نزیکترین نیشانەی هیدایەت نەبینێ..

کوفر ترسناکێکە ئاسایشو ئارامی تێدا نیە، کەسێك خودا نووری نەداتێ نووری نیە، نووری خودا هیدایەت لەدڵ دا پەیدا دەکا، چاوی دڵ دەکاتەوە، سروشتی ئادەمیزاد بەیاسای کەونەوە پەیوەست دەکا، کەسێك بەو نوورەوە پەیوەست نەبێ لەتاریکیو گومڕایی دایە، هەرگیز بەرچاوی رون نابێ، لەترس دا دەژیو ئاسایشی توش نایە، لەگومڕایی دایەو ناگەڕێتەوە، سەرەتاو ئاکامی کردەوەکانیشی وەکوو تراویلکە وایە. کردەوەکانی کێشی دەکەن بۆ تێداچوونو فەوتان. چونکە کردەوە بەبێ بیرو باوەڕی راست بێ سوودە، بەبێ ئیمان صەلاحەت دەستەبەر نابێ، هیدایەت هەر هیدایەتی خودایەو بەس!

مەبەست لەم نموونە هێنانەوەو رونکردنەوەیە ئەوەیە: کەکافر چەندەها گومڕایی تێدا کۆبۆتەوە دڵو چاوو گوێچکەی لەتاریکی ئەنگوستە چاودان، بەو حاڵەیەوە بەهیچ جۆرێ رێگای راستو چەوت لێك جیاناکاتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾ ئەو تاریکیانە چەند تاریکیەکن، هەندێکیان سواری

هەندێکیان بوون‌و کەوتوونە سەریەك، بەجۆرێك ﴿إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَنْ لَمْ يَجْعَلْ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِنْ نُورٍ﴾ تەنانەت ئەگەر ئادەمیزاد دەستی خۆی: کەلەهەموو شتێك زیاتر لێیەوە نزیکە، ئەگەر دەری بێنێ‌و رایدێرێ نزیك نیە بیبینێ چ جایی بیبینێ. واتە: نایبینێ!!

ئەمەش شتێکی واقیعی‌و بەڵگە نەویستە، کەسێك خودا هیدایەتی نەداو تەوفیقی نەدا بۆ هیدایەت ئەوە نووری نیەو بەهیلاك چووە، خەسارەتمەندە، لەتاریکی دایەو روناکی نابینێ!!

ئەمەش شتێکی واقعی بەڵگە نەویستە، کەسێك خودا هیدایەتی نەداو تۆفیقی نەدا بۆ هیدایەت ئەوە نووری نیەو بەهیلاکچووە، خەسارەتمەندە، لەتاریکی دایەو روناکی نابینێ!

## بەڵگەو نیشانەکانی بوونەوەر لەسەر هەبوونی خوداو تاك‌و تەنهایی زاتی پاکی

﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِي سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ

يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِأُولِي الْأَبْصَارِ ﴿٤٤﴾ وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَىٰ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾ لَقَدْ أَنْزَلْنَا آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴿٤٦﴾

دوای ئەوەی پەروەردگار وەصفی دڵ روناکیو دڵ نوورانی بوونی موسوڵمانانی کرد، بەهۆی هیدایەتەوە، هەروا باسی ئەوشتانەی کرد: کەدڵی ئادەمیزاد تاریك دەکا، بەشوێن ئەوەدا بەڵگەو نیشانەکانی تاكو تەنهایی خوداو بەتوانایی‌و کاردروستی پەروەردگار نمایش دەکا، لەو بەڵگەو نیشانە هەمەجۆرو زۆرانە چوار بەڵگەی بەرچاوو هەمیشە بینراو دەخاتە ڕو:-

١- تەسبیحات کردنی مەخلوقات بۆ خوداو بەتاكو تەنها ناسینی. دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەوە نازانێ ئەی پێغەمبەر ﷺ! هەروا هەموو موخاطەبێك کەشیاوی خیطاب ئاراستە کردنە، ئێوە بەبەڵگەو دەلیل بۆتان مەعلوم نەبوەو نازانن: کەهەموو مەخلوقات، هەموو بوونەوەر تەسبیحاتو تەقدیسی خودا دەکا؟؟

بۆتان ئاشکرا نەبووە: کەهەرچی لەئاسمانەکانو زەوی‌دا هەیە بەعاقڵمەندو بێ زوبانیەوە، بەئادەمیزادو فریشتەو جندۆکەیەوە، بەباڵندەو خشۆكو پێڕۆیەوە، هەموویان هەریەکەیان بەشێوەی خۆی خەریکی تەسبیحاتو تەقدیسو تەنزیهی

خودایـە، نیـشانەی تـاكو تـەنهایی خـودان، بەڵگـەن لەسـەر هـەبوونی خودایـەکی باڵادەستی بەتواناو بەدیهێنەر واتە: ئەی ئادەمیزاد: کەتۆ تەسبیحاتی خودا دەکەی بەتـەنهانیت، هـەموو بوونـەوەر لەگەڵت دایـە، هـەمووده‌ورو بـەرت هاوکاریـت دەکا لەخودا پەرستی دا، لەوانـە ﴿وَالطَّيْـرُ صَـافَّاتٍ﴾ دەبینـی پەلـەوەر (باڵنـدە) لـەکاتی فڕینی دا باڵەکانی لێك دەداو راستیان دەکا: بۆئەوەی لەو بـەرزایی یـەوە نەکەوێتـە خوار، هەرکەسێك بەوردی سەیری باڵندە بکاو عەقڵی ڕێكو پێـك بـێ، دەزانـێ کـە بەدیهێنەرێکی دانا ئەو باڵندەیەی دروست کـردوە، دەزانـێ هـەڵسو کـەوتو شـێوەو رەفتـاری ئـەو باڵندەیـە نیـشانەی ئەوەیـە: کەبەدیهێنەرەکـەی خـاوەنی هـەموو صیفاتێکی کەماڵە، کەوابوو قسەی کافرو موشریکەکان بەتاڵو پوچـە: هاوەڵیـان بـۆ خودا داناوە، هەندێ لەبێ گیانیان کردون بەشەریکی خودای داناو زانـا! لـەکاتێك دا ئـەو شـتانە هـەموویان دروسـتکراوی خـودان جاچۆن دەگـونجێ دروسـتکراو ببێتـە هاوەڵی بەدیهێنەر؟!

ناوهێنانی باڵندە بەتایبەتی ـ هەرچەندە لەچوارچێوە گشتی یەکـەش دا ئـەوی تێدایـە ـ لەبـەر ئەوەیـە: چـونکە باڵنـدە نیـشانەیەکی تایبـەتی تێدایـەو نیـشانەی کارسازیی پەروەردگارو کەماڵی قودرەتو کاردروستی خودای زاناو دانایە.

کەلەسـەرەتای ئایەتەکـەدا فـەرموی: ﴿أَلَـمْ تَـرَى ؟﴾ ئامـاژە بـەوە دەکـا: کەتەسبیحات کردنی مەخلوقات بۆ خودا شتێکی ئاشکراو نمایانەوبۆتە حەقیقـەتو گومانی تێدا نیە، گەیشتۆتە پلەی زانستو هەموو کەسێك دەیزانێ.

قورئان رێنمونی ئادەمیزاد دەکا بۆ تێفکرین لەدروستکراوانی خودا، هەڵیـدەنێ بۆئەوەی سەیری دەوروبەری خۆی بکا لەئاسمانو زەویدا، کەحاڵیان وایـە خـەریکی تەسـبیحاتی پـەروەردگارن، سـەرنجیان رادەکێـشێ بۆئـەو دیمەنانـەی هـەموو رۆژێ دەیان بینن، بـەڵام لەبـەر تیکـرار بوونـەوەیانو زۆر دیتنیـان سـەرنجیان ڕاناکێـشێ، ئـەوە دیمـەنی تـەیرو توولـە، باڵیـان راسـت دەکـەنو قاچیـان لێـك دەگـرنو دەفـڕن بەحەواوەو تەسبیحاتی خودا دەکەن ﴿كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلاتَهُ وَتَسْبِيحَهُ وَاللَّـهُ عَلِـيمٌ بِمَـا يَفْعَلُونَ﴾ هەریەکێ لەو مەخلوقاتانەی باسمان کـردن هـەموویان نوێـژو تەسـبیحاتی خۆیـان دەزانـن، واتـە: خـودا شـارەزایان دەکـا بـۆ ڕێبـازو یاسـای خـودا پەرسـتی،

هەریەکـەیان بـەجۆرێك خوداپەرسـتی خـۆی ئـەنجام دەداو بەندایـەتی خـۆی رادەگەیەنێ، پەروەردگاریش زاناو ئاگادارە بەهەموو کارو کردەوەیـەکیان هیـچی لێ گوم نابێ، چاکە بکەن یان خراپە، پابەندی فەرمانی خودابن یان یـاخی‌و سـەرکەش بن خـودا ئاگای لێیانـەو پاداشیان دەداتـەوە چاکە بەچاکەو خراپـە بەخراپـە لـەم تەسبیحات‌و تەقدیسەدا تەنها ئادەمیزاد غافڵ‌و بێ ئاگایە، لەکاتێك دا ئـەو دەبوایـە لەهـەموو مەخلوقاتـەکانی تـر زیـاتر خـەریکی خوداپەرسـتی ببوایـەو لەهـەموان شیاوترە بەگوێڕایەڵی‌و فەرمانبەرداریی.

بێگومان لەم دیمەنە قورئانی یـەدا بوونـەوەر هـەمووی تێکـڕا بـەخودا پەرسـت نیشان دەدرێ، هەمووی سەرگەرمی تەسبیحات‌و تەنزیهی پەروەردگارە.

هەرکاتێ ئادەمیزاد صەفای گیانی بۆ پەیدا ببێ، هەست بەتەسـبیحات‌و ذیکـری بوونـەوەر دەکـاو هاوکاریـیـان دەکـا، گـوێی لەتەسـبیح‌و تەقدیـسیانە، پێغەمبـەر ﷺ کەبـەرێگادا دەرۆییـشت گـوێی لەتەسـبیحات‌و ذیکـری بـەردە وردەی ژێرقاچـیـەوە دەبـوو، هـەروا حـەزرەتی داود ﷺ: کـەمیزمارەکانی دەخوێنـدەوە کێوەکـان‌و پەلەوەرەکان لەگەڵیا دەیانگوتەوە بۆیان دەستاندەوە.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَإِلَى اللَّـهِ الْمَـصِيرُ﴾ هـەر بـۆ خودایـە مڵکایـەتی ئاسمانەکان‌و زەوی، هەرچی لەئاسمانـەکان‌و زەویدا هەیـە هـەمووی مڵکـی خودایـە، فـەرمانڕەوای مـوطلـەقـە تێیـان دا؛ بـەدییان دەهێنـێ دەیانفـەوتێنێ، ژیانیـان پـێ دەبەخـشێ‌و دەیـانمرێنێ. هـەر خـودا پەرسـتراوی حـەق‌و راسـتەو هـەر ئـەو شـیاوی خودایەتی یە، کەسی تر شـیاوی پەرسـتش بـۆ کـردن نیـە، کـەس مـافی ئـەوەی نیـە حـوکم‌و بڕیـاری خـودا هەڵوەشـێنێتەوە یـان رایـان بگـرێ، گەڕانـەوەی هـەموو مەخلوقات هەر بۆلای خودایە، رۆژی قیامەت هەمووتان ئەی ئادەمیزادینـە! زینـدو دەکرێنەوە دەچنەوە بەرقاپی خودا، ئەویش بەویستی خۆی چۆنی بوێ ئـاوا بڕیـار دەربارەتان دەردەکاو هەرکەسە بەگوێرەی کردەوەکانی پاداشی خـۆی وەردەگرێتـەوە وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاؤُوا بِمَا عَمِلُـوا وَيَجْـزِيَ الَّـذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى﴾ (النجم/٣١)

بەکورتیو بەکوردی: گەورەییو بەرفراوانی بوونەوەر کارسازییو دەستڕەنگینی خودا لەبەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەویدا، دروستکردنو بلاوکردنەوەی ئەو هەموو کائیناتە زیندوو بێ گیانانە تیایان دا، ئەو جوانکاریو کارسازی یەی لەبەدیهێنانی ئادەمیزاددا رەچاوکراوە، هەبوونی ئەو هەموو جۆرە ئادەمیزادو ئاژەڵو پەلەوەرو خشۆكو پیڕۆیانەی ناو وشکانیو دەریاو هەواو بەرزایی، ئەو هەڵسو کەوتەی گەورەترین گیانلەبەر هەتا وردترینیانو بچوکترینیان: کە ئەنجامی دەدەن، هەندەسەکاری هەنگ لەدروستکردنی شانەهەنگوین دا، فیلو فرتی عەنکەبووت لەنیچیرکردنی حەشەرات دا، کارە سەر سوڕهێنەرەکانی تەیرو تولەکان، تەصەروفاتی پەروەردگار تیایان دا لەڕوی بەدیهێنانو لەناو بردنیان، سەرەتای دروست کردنیانو ئاکامی تەمەنیانو دروستکردنەوەی سەر لەنوێیان! ئەمانە هەموویانو هی تریش نیشانەی هەبوونی خودایەکی تاكو تەنهای بەدیهێنەرو کاردروستو زاناو داناو بەتوانان.

ئەمە یەکەم بەلگەیەکی کەونییە لەسەر هەبوونی خوداو بەتواناییو تاكو تەنهایی، بەلگەکە خۆی لەخۆی دا چەند بەلگەی لەخۆ گرتوون، هەرکامێ لەو بەلگانە بەتەنیا بەسە بۆ قەناعەت کردنو بڕواهێنان.

دەشتوانرێ بەلگەی نێو ئەم دوو ئایەتە بکەینە دوو بەلگەی سەرەکیو ئیجمالی: بەلگەی بەندایەتی کردن بۆ خودا لەجیهانی بالاو پایین دا، بەلگەی پاشایەتیو خاوەنیەتی رەهاو موطلەقو گەڕانەوەی هەموو شتێك بۆلای خودا.

٢- بەلگەی دووهەم باراندنی بارانە.

ئەمەش دیمەنێکی ترە لەدیمەنەکانی بوونەوەر، خەلکی بەسەری دا تێپەڕ دەبنو لێ ی بێ ئاگانو سەرنجی نادەنێ، هەرچەندە بارانو بەفرو تەرزە تێڕوانینیان لەززەتی تێدایە بۆ چاو، دلّ پەندی لێ وەردەگرێ، مەجالێکی بەرفراوانە بۆ لێوردبوونەوە لەمەخلوقاتی خوداو نیشانەو ئایەتەکانی.

دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَى أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً﴾ ئەوە تۆ ئەی پێغەمبەر ! یان ئەی موخاطەب! نازانی باران چۆن دروست دەبێو دەبارێ؟؟ بێگومان پەروەردگار بەتواناو دەسەلاتی رەهای خۆی لەسەرەتاوە، ئەو

هەورانەی پێك دێن لەهەڵمی بەرزەوە بووی دەریاكان، لێكیان دەداو دەیانخاتە پاڵ یەك‌و دەیانكاتە پارچە هەورێكی تۆكمەو تێكچڕژاو، ئەمجار هەندێكی دەخاتە سەر هەندێكی‌و هەورێكی بەرزی لێ پەیدا دەبێ لەطەبەقەیەكی ساردی هەوادا، ئەمجار باهەڵدەكا ئەو هەورە رادەماڵێ بۆ ئەو شوێنەی دەیەوێ بارانی لێ ببارێنێ، ئەمجار تۆ دەبینی باران لەهەورەوە لەدرزو چاڵ‌و چۆڵیەوە دەبارێتەسەر زەوی ﴿فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنْ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ﴾ ئاوا بەو جۆرە پەروەردگار لەطەبەق‌و توێی ئەو ئەو هەورانەوە كەدەشوبهێنە كێوی بەرزو گەورە باران دەبارێنێ وەكوو چۆن جاری واهەیە بەفرو تەرزە دەبارێنێ، ئەمەش بەهۆی ساردیی ئەو هەڵمە بەرزەوە بووەی لەدەریاكانەوە هەڵدەستێ‌و بەرز دەبێتەوە. مەبەست بە (السماء) بەرزایی یە، ئەوەی لەژورتەوەیە. (جبال) یش لێرەدا كینایەو دەركەیە لەو هەورانەی: كەئێستا ئەوانەی سواری فڕۆكە دەبن‌و سەر هەورەكان دەكەون‌و سێهەزار پێ یەك لەزەوی حەوا دەكەون هەورە سپیەكان دەبینن وەكوو كێوی گەورە وەهان، بێگومان دەستی قودرەت پاڵ بەهەورە پەرتەوازەو بڵاوەكانەوە دەنێ لەشوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، پاشان لێكیان دەداو كۆیان دەكاتەوەو دەیانخاتە سەر یەك، ئەمجار: كەقورس بوون، ئاویان لێ دێتەخوار، ئەو هەورانە لەبەرزایی یەوە دەق دەشوبهێنە كێوی سەركەش‌و بەرزو بڵند.

هەندێ لەموفەسسیرین دەڵێن: بەواقیعی لەئاسمان دا كێوە تەرزە هەن‌و تەرزە لەو كێوانەوە دەبارێ. هەندێ تیۆری تازەش پشتگیری ئەوە دەكەن كەلەطەبەقەكانی هەوادا شتی واهەیە، دەق دەشوبهێتە كێوی پێكهاتوو لەتەرزە.

هەڵبەتە قودرەت‌و ئیرادەی خودا رۆڵی خۆی دەگێڕێ لەبوونەوەرداو بەگوێرەی ویست‌و ئیرادەی خودا كارەكان جێبەجێدەكرێن. هەر لەم رووەوەیە: كەباران‌و تەرزەو بەفر دەبارێ ﴿فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ ئەو باران‌و تەرزەو بەفرە دەبارێتە سەر ولاتێك خودا رەحمیان پێ بكاو بیەوێ لێ ی ببارێ ﴿وَيَصْرِفُهُ عَنْ مَنْ يَشَاءُ﴾ ئەو باران‌و بەفرو تەرزەیە دەگرێتەوە لەولاتێك خودا بیەوێ لێی نەبارێ. جایان نیعمەت‌و تۆڵە لێ ستاندنە لەدانیشتوانی ئەو ولات‌و هەرێمە. یان رەحمەتە بۆیان‌و بۆ پارێزگاری‌و پاراستنی بەرو بوم‌و كشت‌و كاڵیان.

لەو بەڵگەو دەلیلە سەرسوڕهێنەر تـر بـەدیهێنانی دژە لـەدژ، دەرهێنـانی ئـاگرە لەئاو، پەیـدا کردنـی گەرمـە لەساردی، تەنانـەت لـەو هـەورە تاریکە ساردە پڕئـاوە بریـسکەو چـەخماخەی وابـەدی دێنـێ ﴿يَكَـادُ سَـنَا بَرْقِـهِ يَـذْهَبُ بِالأَبْـصَارِ﴾ نزیکـە روناکـایی بروسـکە: کـە لەچـڕبوونەوەو پاڵـە پەسـتۆی هەورەکانــەوە پەیـدا دەبـێ هێندە بەتـەوژمو خێرایـە، هێنـد شوعلەو پرتـەوی بـەهێزە لەوانەیـە بینـایی چـاو بەرێ!!

٣- بەڵگــەی ســێهەممان گۆڕانکــاریی شــەوو رۆژە، ئەمــەش دیمــەنێکی سەرسوڕهێنەرە دیمـەنێکی کـەونی یـەو رۆژانـە دووبـارە دەبێتـەوە، شـەو دەڕوا رۆژ دێو رۆژ دەڕوا شەو دادێ. ﴿يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ پـەروەردگار شـەوو رۆژ بـەدی دێنێ، رۆڵی خۆی دەگێڕێ تێیان دا، لەم زیاد دەکاو لەو کەم دەکا، گۆڕانکارییان تێدا دەکـا لـەبارەی گـەرماو سـەرماوە، وەرزەکـان دەگـۆڕێ، بـەدوو یـەك دا دەیـانهێنێو دەیانبا، یاسایەکی بۆ داناون نەگۆڕو تۆکمە. ﴿إِنَّ فِـي ذَلِـكَ لَعِبْـرَةً لأُوْلِـي الأَبْـصَارِ﴾ بێگومان لەبەدیهێنانی شەوو رۆژدا، لـەگۆڕانکاریی کـردن تیایـان دا، بەڵگـەو دەلیلـی زۆرو جۆراو جۆر هەن لەسەر گەورەیی خودا، پەندو ئامۆژگاریی هەیـە بـۆ کەسـێك خاوەن عەقڵ بێو وردبێتەوە. وەکوو لەئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ فِـي خَلْـقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ﴾ (ال عمران/١٩٠).

پـەروەردگار بـەوجۆرە جـار دوای جـار ئاگادارمـان دەکاتـەوە، هەسـتو گیانمـان دەبزوێنــێ، ســەرنجمان رادەکێــشێ بــۆ جۆرەهــا دیمــەنی بوونــەوەر، بــۆ ئــەوەی بەلامسەرلایی بەسـەریان دا تێپەڕنـەبین، چاومان لەئاسـتیان نەقوچێنین، گەشـتی ژیانمـان سـوودبەخش بـێ، بـێ دەسمایـەو قـانزانج لـەژیان دەرنەچـین، وەختێـك دەگـەڕێ ینـەوە بـۆلای خـودا بەختـەوەر بـین، سودمان لـەم ژیانـە کورتـەی جیهـان وەرگرتبێو کامەرانی قیامەتمان پێ دەستەبەر کردبێ!

ئەندامـەکانی لـەشمان بـۆ ئـەو شـتانە بـەکارهێنابێ کـەبۆی دروسـت کـراون، سەربەرزیو قانزانجی خۆمان لەخودا پەرسـتیو بەندایـەتی کـردن بـۆ پـەروەردگار دەستەبەر کەین.

٤- دەلیلی چوارەم؛ حاڵو وەزعی گیانلەبەران بەهەموو جۆرەکانیەوە.

پــەروەردگار بەڵگــەی لەســەر تــاكو تــەنهایی خــۆی هێنایــەوە بــەدیاردەو دیمەنــەكانی ئاســمــانو زەوی، بەچــۆنیەتی پێكهێنــانی هــەورو بــاران بــارین، بەگۆڕانكاریی شەوو ڕۆژ، ئەمجار بەڵگەیەكی تر دێنێتە كایەوەو دەیكاتە نیشانەی كار دروستی خودایەتی خۆی؛ حاڵو وەزعی گیانلەبەران وێڕای جوداوازیی دیمەنو هەڵسو كەوتیان دەكاتە نیشانەی خودایەتیو بەتواناییو دانایی خۆی. دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ﴾ خودا هەموو پیرۆیەكی لەئاو دروست كردوە، بناغەی هەموو درووست كراوێكی گیانلەبەران ئاوە، ئاو مادەی ئەساسی زیندەوەرە. یان هەموو زیندەوەرێك لەو دڵۆپە مەنی یە دروست دەبێ: كە لەمنداڵدانی مێینەدا لەگەڵ هێلكەی تێكەڵاو دەبنو كۆرپەڵە پێك دەهێنن!

لێرەدا قورئان بەشێوەیەكی ئاسانو ڕەوان حەقیقەتێكی زانستی ڕادەنوێنێ، حەقیقەتێك شیكردنەوەی پێویستی بەچەندەها كتێبی قەبارە گەورە هەیە. حەقیقەتی ئەوە: كەهەموو پیرۆیەك لەئاو دروست بووە، واتە: ئاو عونصوری سەرەكی پێكهاتەی هەموو گیانلەبەرێكە. یان دەگونجێ بەم حەقیقەتە ئاماژە بۆئەو تیۆرەبكا: كەئێستا زانیاری تازە سەرگەرمی لێكۆڵینەوەو چەسپاندنیەتی، ئەویش ئەوەیە: كەسەرەتای ژیان لەدەریادا پەیدا بووە. واتە: پاشان لقو پۆپی لێ بۆتەوەو گەرا گەراو جۆر جۆر بووە. واتە: یەكەم لانەی ژیان سەری تێیدا هەڵداوە، یەكەم شوعلەی ژیان لەناو ئاودا بەدی هێنراوە، ئەمە حەقیقەتێكەو قورئان ئاماژەی بۆ دەكاو چەسپاندۆیەتی، ئیتر چ كارمان بەسەر تیۆرە زانستی یەكانی ئەم بوارەوە نیەو نامانەوێ تیۆرە زانستی یەكانی: كەئەمرۆ یان سبەینێ دێنە گۆڕێ بیانكەینە پێوەری ئەم حەقیقەتە عیلمی یەی قورئان ئاماژەی بۆ دەكا، چونكە وەكوو چەند جاری تریش گوتومانە: تیۆرە زانستی یەكان ئەگەری گۆڕانو هەڵوەشانەوەیان هەیە، بۆیە ئێمە بەوەندە قنیات دەكەینو حەقیقەتە قورئانیەكە دەخەینە ڕو بڕواشمان وایە سەد دەر سەد ڕاستەو هەڵوەشانەوەی نیەو ئەگەری گۆڕانی تێدا نیە، بەدڵنیایی یەوە دەڵێین پەروەردگار گیانلەبەری لەئاو دروستی كردوە یان لەناو ئاودا دروستی كردوە، هەموو گیانلەبەرەكان بنەماكەیان یەك شتە ئەویش ئاوە، بەبێ ئاو گیانلەبەر پەیدا نابێو ناژی ئەمجار گیانلەبەران جۆراو جۆرن ﴿فَمِنْهُمْ مَنْ

﴿يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ﴾ لەوگیانلەبەرانە هی وایان هەیە خشۆکەو لەسەر سکی دەخشێ، وەکوو مارو باقی خشۆکەکانی تر.. ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ﴾ هی وایان هەیە لەسەر دووقاچ دەڕوا وەکوو ئادەمیزادو پەلەوەر.

﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ﴾ هی واشیان هەیە لەسەر چوارقاچ دەڕوا وەکوو ئاژەڵو باقی حەیوانە دڕندەکانی تر.

﴿يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ﴾ پەروەردگار بەویستو ئیرادەی خۆی بەتواناو دەسەڵاتی خۆی هەرچی بوێ دروستی بکا دروستی دەکا، دەسەڵاتو قودرەتی سنووردار نیە. گیانلەبەری وای دروست کردوە زیاد لەچوار قاچی هەیە ئەمانەش چەند جۆرو گەراو رەچەڵەکن، شێوەو سروشتو هەڵسو کەوتیان لەیەك جوداوازە ﴿إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ بێگومان خودا بەسەر هەموو شتێك دا بەتواناو دەسەڵاتە، هیچ شتێکی لەبوونەوەردا لێ عاسی نابێ!

ئەمجار دوابەدوای ئەو بەڵگانەی هێنانیەوە بۆ چەسپاندنی تاكو تەنهایی خودا، دوا بەدوای وەصف کردنی موسوڵمانانی لەخودا ترسو مزگەوت خۆشەویست، هەروا رانواندنی وەزعو حاڵی ئەو کافرانەی کردەوەی چاك دەکەنو لەقیامەتدا سوودی لێ نابینن، باسی تاقمی دوو ڕوەکا، ئەو مونافیقانەی لەئایاتو نیشانەکانی خودا بەهرەمەند نابن بەقورئان هیدایەت وەرناگرن، بەڕواڵەت خۆیان بەموسوڵمان نیشان دەدەن بەڵام لەناخەوە بڕوایان بەئیسلام نیە، ئادابو رەوشتی موسوڵمانانیان نیە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ﴾ بێگومان ئێمە نازڵمان کردوە لەم قورئانەدا چەند ئایەتێکی رونکەرەوەو ئاشکرا، ئاماژە بەهەبوونی خودایەکی بەدیهێنەرو کار دروست دەکەن، رێ نیشاندەرن بۆ حەقو راستی، حوکمو ئامۆژگارییان تێدایە، پەندو مەثەلیان لەخۆ گرتوون، بەڵگەو نیشانەی تۆکمەن لەسەر خودایەتی خوداو تاكو تەنهایی زاتی پاکی.

﴿وَاللَّهُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾ پەروەردگار بەویستی خۆی بەهۆی ئەو هەموو بەڵگەونیشانانە کەسانێك شارەزای رێگای راستو دروست دەکاو تۆفیقیان دەدا بەردەوام بن لەسەر ئەو جادە ڕێیە، ناهێڵێ لابدەنو تووشی

هیلاکەت بن! کەسێکی بۆی فێری حیکمەت و تێگەیشتنی قورئانی دەکا، عەقڵ و هۆشی دەداتێ بیر بکاتەوە لەئایەتەکانی قورئان حاڵی ببێ.

ئایاتی قورئان رونکەرەوەو بەیانکەرن، نووری خودا دەردەخەن سەرچاوەی هیدایەت ئاشکرا دەکەن، خێرو شەڕ لێك جیادەکەنەوە، پاك و پیس، حەق و بەتاڵ لێك هەڵدەهاوێرن. بەرنامەی ئیسلام روون دەکەنەوە، داب و نەریتی خودا لەبوونەوەردا دەست نیشان دەکەن.

هەرکاتێ ئادەمیزادەکان یەکالاکردنەوەی کێشەکانیان حەواڵەی حوکمی قورئان کرد، ئەوە پەنایان بردۆتەبەر شەریعەت و پاسایەکی تۆکمەو پاك و خاوێن، خاوەن حەق ناترسێ لەفەوتانی حەقەکەی، حەق و بەتاڵ تێکەڵاو نابن، حەڵاڵ و حەرام لێك ناگۆڕێن! بەراستی بەشێوەیەکی جوان و سەرنج راکێش کۆتایی بەڕانواندنی بەڵگەکانی ئولوهیەت و ربوبییەت هێنا، فەرموی: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ..﴾ هەموو بەڵگەو ئایەتێك دەگرێتەوە، ئەوەش دەگەیەنێ: کەقورئانی پیرۆز پڕە لەبەڵگەو نیشانە بۆ ئیمان هێنان، پڕە لەئەحکامی عیبادەت و تەشریع، پڕە لەڕێنمووی ئەخلاقی و رەوشت بەرزی.

## هەرچەندە قورئان هیدایەت دەرەو بەیانی شافی و کافییە کەچی هەندێ کەس پێی پەند ئامێز نابن و لەسەر گومرایی و دوو رووپی دەمێننەوە

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ

﴿يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾﴾

زۆربـەی زۆری موفەسـسیرین دەفـەرموون: ئـەم ئایەتانـە دەربـارەی بیـشری دووڕوو کابرای جوولەکە هاتوونە خوارێ: کاتێك لەسـەر پارچـە زەویـەك کێشەیان کەوتە ناو، کابرای جوولەکە دەیەویست بچنەلای پێغەمبـەر ﷺ بۆیەکالاکردنـەوەی کێـشەکەیان‌و حـوکم دەرکـردن، بیـشریش دەیگـوت: بابـچینەلای کـەعبی کـوڕی ئەشـرەف ئـەو نێوانمـان بکا، بـەکابرای جوولەکەکـەی گوت: موحەممـەد فێڵمـان لێ دەکاو بڕیاری راست‌و عەداڵەتمان بۆ دەرناکا.

موقاتیل دەفەرموێ: ئایەتی ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّـهِ﴾ دەربـارەی بیـشری مونـافیق نازڵ بووە: کە لەگەڵ کابرایەکی جوولەکـە لەکێـشەدا بـوون، کـابرای جولەکـە وتـی: بابچینە لای پێغەمبەر حوکم‌و بڕیارمان بدا، بیشریش وتی: بابچین بـۆلای کـەعبی کوڕی ئەشـرەف بائـەو حـوکم‌و بڕیارمـان بـۆ بـدا دوایـی چـوونەلای پێغەمبـەر ﷺ کێـشەکەیان بـۆ بـاس کـرد: حـوکمی بۆکـابرای جولەکـەدا، چـونکە حـەق بـەلای ئـەوەوەبوو، بیـشر بەحوکمەکـەی پێغەمبـەر ﷺ رازی نـەبوو، وتـی: بابـچین بـۆلای عومەری کوڕی خەتتاب ئەو حوکم‌و بڕیارمان بۆ بدا: جا کەچوونە لای حـەزرەتی عومەر ﷺ کابرای جولەکە پێی گوت: وتی پێغەمبەر حوکمی بۆمن کردوەو حـەقی داوە بـەمن بـەڵام بیـشر رازی نـابێ‌و حـوکم‌و بڕیـاری پێغەمبـەری رەت کـردەوە. عومەر ﷺ بەبیشری گوت مەوزوعەکە ئاوایە؟؟ وتی: بەڵێ: ئەمجار وتـی: لەشـوێنی خۆتـان بـن ئێـستا دێمـەوە حوکمتـان دەکـەم! عومـەر ﷺ چـووەوە مـاڵی خۆیـان شمـشێرێکی هێنـا لـەملی کـابرای مونـافیقی داو سـلاری کـردەوە، وتـی: ئـاوا حـوکم دەکەم بۆ کەسێك بەحوکمی پێغەمبەر ﷺ رازی نەبێ!!

ئەم کۆمەڵە ئایەتـە صیفاتی مونافیقـەکان بـەیان دەکـەن، ئەوانـەی ڕواڵـەتیان لەگـەڵ ناوەڕۆکیـان جـوداوازە، ئـەوەی بـەدەم دەیڵـێن بـەدڵ بڕوایـان پێـی نیـە، دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَـا﴾ ئـەو مونـافیق دوو ڕوانـە لەبـەر

چاوی موسوڵمانان دەڵێن: ئێمە بڕوامان بەخوداو بەپێغەمبەری خودا هەیە، (الله) بە پەروەردگاری بوونەوەر دەزانین و موحەممەد ﷺ بەپێغەمبەرو رەوانە کراوی خودا دەزانین، فەرمانبەرداری خوداین لەهەموو حوکم و بڕیارێکی دا، گوێ بیسی پێغەمبەرین لەهەر حوکم و بڕیارێك دەیدا ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ﴾ کەچی لەواقیع دا کۆمەڵێکیان پشت لەحوکمی پێغەمبەر ﷺ هەڵدەکەن، پابەندی حوکمەکانی نابن، بەکردەوە پێچەوانەی گوفتارەکانیانن، شتێك دەڵێن: نایکەن، شتێك دەکەن نایلێن.

ئەمجار دەچنەوە پاڵ ئەوانی دیکەیان و لەقسەکانیان پەشیمان دەبنەوە، واتە لەرچاوی موسوڵمانان ئیعلانی ئیمانداری خۆیان دەکەن بەکردەوەش پێچەوانە دەجووڵێنەوە، کەدەچن بۆلای هاوەڵانی دوو ڕویان لەو قسەش ژێوان دەبنەوە. ﴿وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ﴾ لەراستی دا ئەو مونافیقانە موسوڵمان نین، بەخاوەن باوەڕ ناژمێردرێن، بەڵکوو ئەوان لەنیفاق و دووڕوویی دا چوختی بوون، فێڵ و فرتی زەبەندە دەزانن.

ئایەتەکە صەریحە لەوەدا: کەئیمان فرت و فێڵی تێدا نیە، ئیمان مەبدەئەو موساوەمە قبوول ناکا، دەبێ مرۆڤ قسەو کردەوەو بیرو باوەڕی یەك بێ، ئەمجار بەموسوڵمانی شەرعی حسێب دەکرێ. کەوابێ ئەو دوو ڕووانەی سەردەمی ئیسلام و هەموو چەرخ و زەمانێك: کەئەوەی بەزوبان دەیبێژن بەکردەوە نایکەن، ئەوی لەدڵیان دایە بەزمانیان دانایە، ئەوە کافرو ترسنۆك و ریسوان، لەدواوە خەنجەر لەئیسلام دەدەن و دیانەوێ لەناوەوە بیڕوخێنن و لەحوکمەکانی رزگاریان بێ!

دیاردەی دوو ڕویی و ڕاڕاییان ئاشکراو نمایانە، ئەوەتا ﴿وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ مُعْرِضُونَ﴾ ئەگەر بانگ بکرێن بۆئەوەی حوکمی خودایان تێدا بخرێتە کارو شوێن هیدایەتی خودا بکەون و پەیڕەوی پەیامی پێغەمبەر ﷺ بکەن پێیان بگوترێ: باکێشەو نیزاعتان بەگوێرەی شەریعەتی خودا یەکالابکرێتەوە، دەبینی کۆمەڵێکیان پشت لەحەق هەڵدەکەن، لەئاست حوکمی خودا لوتبەرزی دەنوێنن، رازی نین بەحوکمی پێغەمبەر وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ

يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً، وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُوداً﴾ (النساء/٦٠-٦١)

ئەو دوو ڕووانە دەیانزانی: کەحوکمو بڕیاری خوداو پێغەمبەری خودا لەسنووری حەق دەرناچێو لەگەڵ ڕاستیو عەدالەت دایە، بۆخۆشیان حەقخواز نینو توانای عەدالەتکارییان نیە، بۆیە هەرکاتێ بزانن داواکەیان ناحەقە، مل نادەن بۆلای پێغەمبەر ﷺ حوکم بکا لەنێوانیان دا ﴿وَإِنْ يَكُنْ لَهُمُ الْحَقُّ يَأْتُوا إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ﴾ ئەگەر داواکەیان لەبەرژەوەندی خۆیان بێ، بزانن حەق بەدەستی ئەوانە، پەلە دەکەن لەهاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی حوکم بدا لەنێوانیان دا، گوێ بیسو فرمانبەردارن چونکە دڵنیان لەوەی پێغەمبەر ﷺ بەحەق نەبێ حوکم نادا.

ئەمەش نیشانەی خۆویستیو ئینتیهازیانە، هەرکاتێ بزانن حەق لەبەرژەوەندی غەیری خۆیانە ڕازی نین بچن بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ حوکم کردن بەڵام ئەگەر زانییان حەقیان بەدەستە پەلە دەکەن بۆ چونو ڕازی بوون بەحوکمی پێغەمبەر.

ئەم کۆمەڵە موونافیقانەی: کەبەدەم لاف ئیمانداریان لێ دەداو بەکردەوەش پێچەوانەی قسەکانیان دەجووڵانەوە نموونەن بۆ هەموو موونافیقێك کەلەهەموو کاتو سەردەمو شوێنێك دا، نموونەن بۆ ئەو کەسانەی‌ترسنۆكو هیچو پووچن ناوێرن خۆیان یەکلا بکەنەوە، دڵیان پڕە لەکوفرو لاف موسوڵمانێتی لێ دەدەن، دەڵێن: موسوڵمانین بەڵام بەشەریعەتی خودا ڕازی نین، بەتایبەتی کاتێ لەبەرژەوەندییان نەبێ، ئەگەر زانی حوکمەکە لەبەرژەوەندییەتی پێ ی ڕازییە، دەڵێ ملم لەموو باریکترە بۆ شەرعو ئەمە سەری منو ئامادەم بۆ تیغی شەرع، بەڵام ئەگەر حوکمەکە لەصالیحی ئەو نەبوو، دەست بەملەجڕێ دەکاو هەوڵ دەدا خۆی لێ قوتار بکا، جۆرەها فەندو فێڵ دەدۆزێتەوەبۆ خۆڕزگار کردنو تەطبیق نەکردنی ئەو حوکمە شەرعییە بەسەری دا!!

بێگومان ڕازی بوون بەحوکمی خوداو پێغەمبەری خودا نیشانەی ئیمانو باوەڕە، ڕاستی ئیمانی ناو دڵ دەردەخا، نیشانەی ئەدەبو حیشمەتە لەگەڵ خوداو

پێغەمبەر، کەسێك حوکمی خوداو پێغەمبەر ﷺ رەت بکاتەوە، بێ ئەدەب و بێ باوەڕە، نووری ئیمان نەچۆتە نێو دڵ و دەروونی و ناکەس بەچەیە.

ئەمجار قورئان نەفسیەتیان شی دەکاتەوە نەخۆشی دەروونییان رادەگەیەنێ و هەڵس و کەوتیان رەت دەکاتەوە، بێزاری خۆی لەبیرو بۆچوون و کردەومیان دەردەبڕێ و دەفەرموێ: ﴿أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ أَمْ ارْتَابُوا ؟﴾ وشەی (أم) بۆ ئیستفهامە، ئیستفهامەکەش بۆ تەقریرو ئیثباتە: واتە: دڵە راوکێ و بەرقەرار نەبوون و رارایان لەنێوان ئەوەدا ئایا قبووڵی بڕیاری پێغەمبەر ﷺ بکەن یان نەیکەن، دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەم هۆیانە، یان دڵیان نەخۆشەو دووچاری کوفرو نیفاق بووە، هەمیشە نەخۆشن، یان گومانیان لەئایین و پێغەمبەرایەتی موحەممەد دا هەیە، ﴿أَمْ يَخَافُونَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ﴾ یان ترسی ئەوەیان هەیەخوداو پێغەمبەر لەحوکم و بڕیار دەرکردن دەربارەیان ستەمیان لێ بکەن.

لەبەر هەر هۆیەکیان بێ، تاوانبارن، کارەکەیان کوفرێکی ڕوتە، خودا باش دەزانێ چی دەکەن و باوەڕیان چۆنەو رەوشتیان چیە، خودا باشیان دەناسێ!

پرسیاری یەکەم ﴿أَفِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ﴾ ئیثبات دەگەیەنێ، واتە: دڵیان نەخۆشە ئەو کوفرو نیفاقە هۆی دڵ نەخۆشییە ئەگەر ئادەمیزاد دڵی نەخۆش نەبێ ئاوا لەڕێبازی حەق لانادا، ئەوە نەخۆشی دڵە ئاوا سروشتی تێك داون و تامی شیرینی ئیمان ناکەن!

پرسیاری دووەم ﴿أَمْ ارْتَابُوا﴾ بۆ تەعەجوبە، واتە: ئایا ئەوان گومانیان لەحوکمی خودادا هەیەو خۆشیان بەموسوڵمان دەزانن و لاف ئیمانداری لێ دەدەن؟ ئایا ئەوان گومانیان وایە قورئان لەخوداوە نەهاتووە؟ یان گومانیان لەوەدا هەیە: کەحوکمی خودا بەکەڵکی عەدالەتکاری دێ یان نا؟ هەرکامێکیان بێ ئەوە هەڵوێستی ئادەمیزادی موسوڵمان نیە. پرسیاری سێیەم ﴿أَمْ يَخَافُونَ أَنْ يَحِيفَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُ﴾ بۆ دەربڕینی ئینکاری و سەرسوڕمانە، واتە: یان دەترسن، کەخوداو پێغەمبەری خودا ستەمیان لێ بکەن، بەڕاستی ئەم هەڵوێستەیان لەهەموو شتێك زیاتر جێگای سەرسوڕمانە، جێگای تەعەجوبە ئادەمیزاد بگاتە ئەو ئاستە

لەنەفامی دا ترسی ئەوەی هەبێ خودا ستەمی لێ بکا! خودا بەدیهێنەری هەموو کەسە، ئەدی چۆن لەحوکمو بڕیاری دا ستەم لەئەو دەکا لەسەر حیسابی ئەم؟؟

بێگومان حوکمی خوداو حوکمی پێغەمبەر ﷺ زۆر دوورن لەوەی گومانی ستەمیان لێ بکرێ. چونکە خودا عادڵو بێ باکە، ستەم لەکەس ناکا، هەموو کەس لەبەردەم حوکمی خودا یەکسانن، خودا ستەم لەکەس ناکا بۆ بەرژەوەندی کەسێکی تر!

﴿بَلْ أُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ بەڵکوو ئەوان بۆخۆیان ستەمکارو تاوانبارن، دەیانەوێ ستەم لەوانە بکەن: کەمافیان لەسەریانە، ئەوان دەزانن: پێغەمبەر ﷺ لەحوکمو بڕیاردان لەنێوانیان دا ستەمیان لێ ناکا، دڵیان لەعەدالەتکاریی پێغەمبەر ﷺ بەگومان نیە.

## موسوڵمانان پابەندو فەرمانبەرداریی حوکمی خوداو پێغەمبەرن

﴿ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (٥١) وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ (٥٢) ۞ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّۖ قُل لَّا تُقْسِمُواْۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ (٥٣) قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ

وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٥٤﴾

وەكوو چەند جارى تر گوتراوە: ئوسلوبى قورئان وايە: هەركاتێ باسى شتێكى كرد، باسى دژەكەشى دەكا، كەباسى دونياى كرد باسى قيامەتيش دەكا، باسى موسوڵمانانى كرد باسى كافرو مونافيقيش دەكا. جا كەلەوەپێش باسى هەڵس‌و كەوتى مونافيقانى كرد، ئەمجار دێتە سەرباسى خاوەن باوەڕان‌و پابەند بوون‌و فەرمانبەرداربيان.

دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ بێگومان هەڵس‌و كەوتى موسوڵمانانى راستاڵ‌و بڕوا پتەو جوداوازە لەهى كافرو مونافيقەكان ئەدەب‌و رەوشتى موسوڵمانان لەگەڵ خوداو پێغەمبەردا ﷺ جۆرێكى ترە، هەركاتێك بانگ بكرێن بۆلاى خوداو پێغەمبەرى خودابۆئەوەى حوكم‌و بڕياريان بۆ بدەن‌و كێشەكانيان بۆ يەكالا بكەنەوە دەڵێن: گوێ بيست‌و پابەندى فەرمان‌و گەردنكەچى حوكم‌و بڕيارى خوداو پێغەمبەرى خوداين، ﴿وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانە، هەر ئەوانە رزگار بوو بەمراز گەيشتوون، ترسى تەنگانەيان نيەو كاريان مەيسەرە. چونكە خودا ئيشەكانيان بۆ هەڵدەسوڕێنێ كەسێكيش خودا كارى بۆ هەڵسوڕێنێ رزگار بوو سەركەوتوو بەمراز گەيشتووە. چونكە ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ﴾ هەركەسێ پابەندى فەمان‌و نەهى خوداو پێغەمبەرى خودا بێ، گوێ بيسى حوكم‌و بڕياريان بێ لەهەموو شتێك دا، هاوكات لەگەڵ ئەم پابەند بوون‌و ملكەچى يەى دا ترسى خوداشى هەبێ لەسەر ئەو تاوانانەى لەوەپێش ئەنجامى داون، تۆبەشى كردبێ‌و ترسى سزاو تۆڵەى هەبێ.

﴿وَيَتَّقِهِ﴾ لەداهاتوودا خۆ بپارێزێ لەتاوان‌و عەزمى جەزم كردبێ: كەئيتر لەداهاتوودا بيرى بەرى توخنى تاوان ناكەوێ ﴿فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ ئائەوانە بەمراز گەيشتون‌و هەموو خێرو بێرێكيان چنگ دەكەوێ‌و لەهەموو شەڕو

بەلایەكی دونیاو قیامەت پارێزراون! بەئەدەبن لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودا، گوێ بیسی فەرمانو جڵەوگیرییەكانی پەروەردگارن، لەگەڵ ترسان لەعەزابو خۆپاراستن لەهەر شتێك ببێتە جێگای نارەزامەندی خودا، ئەدەبەكەیان ئەدەبێكی بەرزو پیرۆزە، نیشانەی دڵ روناك بوونە بەنووری خوداو پەیوەست بوونە بەو نوورەوە، هەست كردنە بەهەیبەتو جەلالی پەروەردگار، هەروا نیشانەی عیززەتی نەفسی موسوڵمانە؛ كە بۆ غەیری خودا سەر دانانەوێنێ، پێ ی وایە: هەر تاعەتو فەرمانبەردارییەك لەتاعەت بۆ خوداوە سەرچاوە نەگرێ زەلیلیو سەرشۆڕییەو نابێ موسوڵمان پەیڕەوی بكا. چونكە موسوڵمانی بەڕاستیو بڕوا پتەو بۆ غەیری خودا سەر شۆڕ ناكا، هەموو هێزو توانایەكی لەخودا وەردەگرێو هەر بۆ فەرمانو نەهی ئەوو پێغەمبەرەكەی ملكەچو گوێ بیستە.

ئەمجار دوای ئەم بەرامبەری كردنەی نێوان جوانی ئەدەبی موسوڵمانو ناشیرینی ئەدەبی دووڕو بێ بڕواكان، دەگەڕێتەوە بۆ تەواو كردنی باسی ئەو مونافیقانەی لەوەپێش باسی كردن. دەفەرموێ: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ﴾ مونافیقەكان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سوێندیان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەخوارد، زێدە رەویان لەسوێند خواردنەكەدا دەكردو دەیانگوت: ئەگەر تۆ فەرمانمان پێ بكەی بۆ چون بۆ جیهادو شەڕ كردن دژی كافران، ئێمە بێ چەندو چون دەچین بۆ جیهادو شەڕ كردن دژی كافران، ئێمە بێ چەند چون دەچین بۆ جیهادو ساتە وەختێك ماتەڵ نابین، چۆن فەرمانمان پێ بكەی بەدەرچونو بۆ كوێمان بنێری، یەكسەر پابەندی فەرمانەكەت دەبینو ماڵو منداڵو خێزانمان جێ دێڵین، پەروەردگار بۆخۆی دەزانێ: كەدرۆ دەكەن، بۆیە بەگاڵتە پێكردنەوە رەدیان دەداتەوە، لافرتێ بەبیرو باوەڕەكەیان دەكاو بەدرۆیان دەخاتەوە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ لَا تُقْسِمُوا طَاعَةٌ مَعْرُوفَةٌ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: سوێند مەخۆن پێویست بەو سوێند خواردنەتان ناكا، ئەوەی لەئێوە داوا كراوەو پێویستە ئەنجامی بدەن: فەرمانبەرداریو گوێ بیسی یە ئەویش ئاشكراو نمایانە؛ ئەوەی بەزوبان دەیڵێن: بەدڵ باوەڕتان پێ بێو بەكردەوە بیچەسپێنن، ئەوە پێویستە لەسەرتان.

یان مانای وایە: فەرمانبەرداریی ئێوە لەلای ئێمە ئاشکرایە پێویست بەسوێند خواردن ناکا، ئێمە دەزانین تاعەت کردنەکەتان هەر بەقسەیەو بڕوای دڵی تێدا نیە، قسەی بێ کردەوەیە. کەوابێ هەرچی سوێند بخۆن درۆ دەکەن‌و ئێمە پێیان بڕوا ناکەین‌و سوێند خواردنەکەیان دادیان نادا. وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ اللّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ﴾ (التوبة/٩٦) یان دەفەرموێ: ﴿اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ فَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ (المجادلة/١٦)

پێویست بەسوێند خواردنتان ناکا ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ بێگومان خودا ئاگاداری کردەوەی نهێنی‌و ئاشکراتانە، دەزانێ کێ فەرمانبەردارەو کێ یاخی‌و سەرپێچیکارە، دەزانێ سوێندەکانتان بەدرۆیەو ئاگاداری ناو دڵ‌و دەروونی بەندەکانیەتی دەزانێ چ نیفاق‌و کوفرو فرت‌و فێڵێکی تێدایە. رۆژی خۆی پاداش‌و سزاتان بەگوێرەی کردەوەکانتان دەداتەوە، ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ ئەی موحەممەد! پێیان بڵێ بابەڕاستی تاعەتی خودا بکەن، پابەندی فەرمانی خودا بن، شوێن قورئانی خودا بکەون. جا ﴿فَإِنْ تَوَلَّوا﴾ ئەگەر پشتتان هەڵکردو لەسەر دوو ڕوویی خۆتان بەردەوام بوون ئەوە ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ﴾ ئەوەی لەسەر پێغەمبەرە، گەیاندنی پەیامەو ئەنجامیشی داوە ﴿وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ﴾ ئەوەی لەسەر ئێوەیە قبوڵکردنی پەیامەکەیەتی‌و بەگوێکردنیەتی لەوەی فەرمانتان پێ دەکا بەدڵسۆزی پابەندی فەرمانەکانی بن، وەلحاڵ پشتتان هەڵکردوەو بەگوێتان نەکردوە.

﴿وَإِنْ تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلاَّ الْبَلاغُ الْمُبِينُ﴾ ئەگەر ئیطاعەی جڵەوگیرییەکانی بکەن هیدایەت دەدرێن بۆ حەق‌و ڕاستی بۆ ڕێبازی سەربەستی‌و بەرچاو ڕۆشنی‌و دڵ ڕوناکی. چونکە پێغەمبەر بانگەوازیی دەکا بۆ ڕێبازی ڕاست‌و بەختەوەر. پێغەمبەریش هەر ڕاگەیاندنی لەسەرەو بەس وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾ (الرعد/٤٠)

پێغەمبەر هەر گەیاندنی لەسەرە جا ئەگەر ئێوە بەگوێی نەکەن ئەوە ئەو بەرپرسیار نیە، ئێوە بەرپرسیارن لەسەر بێ گوێی خۆتان سزا دەدرێن، تۆڵەی سەرپێچیکردنی فەرمانی پێغەمبەرتان لێ دەسەندرێ.

## بنەماکانی حوکمەتی ئیسلامی

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًاۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْـًٔاۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعْجِزِينَ فِي ٱلْأَرْضِۚ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ ﴾

حاکم ریوایەتی کردوە بەصەحیحیشی داناوە، هەروا طەبەرانی هەردوکیان لەئوبەی کوڕی کەعبەوە ریوایەتیان کردوە: دەڵێ: کاتێک پێغەمبەرو هاوەڵانی ﷺ هاتنە مەدینە ئەنصارەکان لەخۆیان گرتن، عەرەبە موشریکەکان بەیەکچاو سەیریان دەکرن و هەموویانیان بەدوژمنی خۆیان دەزانین، هاوەڵانیش لەوپەڕی حەزەرو وریایی دا کاتیان بەسەر دەبرد، شەوو ڕۆژ دەست بەسیلاح بوون، ساتە وەختێکیش چەکیان دانەدەنا، بۆخۆیان لەناو خۆیان دا بەیەکتریان دەگوت: دەبێ وەندە بژین تادەگەینە ڕۆژگارێک بەئارامی پشتی لێ بکەینەوەو لەخودا نەبێ

لەکەسی تر نەترسین؟ ئیتر ئایەتی ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ .....الاية﴾ نازڵ بوو.

پەیوەندی ئەم کۆمەڵە ئایەتەش بەهی پێشەوە لەو ڕووەوەیە. کەلەوەپێش باسی تاعەتو بەروبوومی تاعەتی کرد؛ ئەوەی ڕاگەیاند: کەهەرکەسێك پەیڕەوی پێغەمبەر بکا، ئەوە هیدایەتی دراوەو بەمراز گەیشتوە، ئەمجار ئەوە ڕادەگەیەنێ: کەخودا وادەی داوە بەجێگیر کردنی موسوڵمانانی پابەند بە فەرمانی خوداوە بەوەی: کەلەسەرزەوی جێگیریان دەکاو یارمەتییان دەدا، ئایینەکەیان بەسەر هەموو ئایینو بەرنامەو تیۆرێك دا باڵادەست دەکا، ترسیان بۆ دەگێڕێ بەئارامی، وایان لێ دەکا تەنها عیبادەتی خودا بکەنو هاوەڵی بۆ بەڕەوا نەزانن، ئەمجار لەپاساوی ئەو نیعمەتەدا فەرمانیان پێ دەکا بەئەنجامدانی نوێژەکانیان لەکاتی خۆی داو زەکاتدان بەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ، ئەوەشی بۆ دووبارە کردنەوە کەدوژمنانیان لەناو دەباو دەیانخزێنێتە ناو دۆزەخەوە. دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ﴾ پەروەردگار وادەی داوە بەوانەی ئیمانی پتەوو ڕاستیان هەیەو کردەوەی باشیش ئەنجام دەدەن، وادەی ئەوەی پێداون: کەلەسەر زەوی جێگیریان بکاو بیانکاتە خاوەنی زەویو ئاوەدانکەرەوەی، بیانکاتە فەرمانڕەواو کاربەدەستی خەڵك لەزەویداو وڵات ئاوەدان بکەنەوەو ژیانی تێدا خۆش ببێ، دەیانکاتە جێنشین لەسەر زەوی وەکوو لەپێش ئەوان دا داودو سلێمانی کردنە کاربەدەستو فرمانڕەوای سەرزەوی، وەکوو چۆن وڵاتی میصرو شامی دا بەنەتەوەی ئیسرائیل لەشوێنی جەبابیرەو فیرعەون دا جێگیری کردن!!

پێویستە ئەوە بزانین: کەجێگیر کردن لەزەویدا بریتی نیە لەوە موسوڵمانان باڵادەست بنو فرمانڕەوایی بکەن. بەڵکوو کاتێك جێگیر بوونو خەلیفایەتی دەستەبەر دەبێ: کەئەو باڵادەستیو فەرمانڕەوایی خۆیان بەکار بێنن لەبنیاتنانی وڵاتو ئاوەدانکردنەوەدا، ئەو مەنهەجە بچەسپێنن کە خودا بۆ ئادەمیزادی داناوەو فەرمانی پێ کردون پەیڕەوی بکەنو پابەندی بن.

بـوون بەجێنـشین لەسـەر زەوی بریتییـە لـەوە کـابرا بتـوانێ بنیـات بنـێو چاکسازی بکا، نـەك روخێنـەرو ئاشوبگێڕی، بتـوانێ عەداڵـەتکاریو ئـارامی لەسـەر زەوی بـڵاو بکاتـەوە، نـەك سـتەمکارو چەوسـێنەرەوە بـێ، بتـوانێ نەفـسی ئادەمیزادەکان بەرز بکاتەوە یاساو قانون پێش بخا، نەك تاكو کۆمەڵ نـزم بکاتـەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ.

ئـەم جێنـشینیەیە: کـەخودا وادەی داوە بەموسـوڵمانانی بـاوەڕ پتـەوی کـارو کردەوە بـاش، وادەی پێـداون: کەلەسـەر زەوی جێگیریـان بکـاو بیانکاتـە فرمـانڕەوا! وەکوو چۆن لەوە پێش خاوەن باوەڕە راستەقینەکانی باڵادەست کـردونو زەوی پـێ ئاوەدان کردنەوەو عەداڵەتو ئاسایشی پێ چەسپاندن.

جا چونکە وادەی خودا راستـەو پاشـگەزبوونەوەی تێدانیـە وەکوو دەفـەرموێ: ﴿وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَـادَ﴾ (الزمـر/٢٠) بێگومـان خـودا وادەی خـۆی بـەجێ هێنـا، موسـوڵمانانی لـەنیوە دورگـەی عـەرەبی دا باڵادەسـت کـردنو، وایـان لێ هـات روبەری خـۆر هـەڵاتو خۆرئاوایـان کـۆنترۆڵ کـرد، ئیمپراتوریـەتی فـارسو رۆمیـان لەبەر یەك هەڵوەشاند، گەنجو خەزینـەیان کەوتـە ژێـر دەسـت، دەوڵـەتی ئیـسلامی رۆژ بەرۆژ لەگەشەو نما کردن دا بوو، بەتایبەتی لەسەردەمی جێنشینە بەڕێزەکانی پێغەمبـەر ﷺ و سـەردەمی فرمانڕەوایـەتی ئەمەوییـەکان لەشـامو ئەنـدەلوس دا پاشان خەلافەی عەبباسییەکان بەتایبەتی لەسەردەمە زێڕینەکانی ئەو خەلافەتەدا، ئەمجار خەلافەتی عوسمانی لەرۆژگارە زێڕینەکانی دا.

لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شاری مەککە؛ (مەڵبەنـدی بتپەرسـتی) رزگـار کـرا، وڵاتی خەیبەر؛ مەڵبەندی جوولەکەو وڵاتی بەحرەینو باقی نیوەدورگەی عەرەبو وڵاتـی یەمـەن هـەمووی رزگـار کـران، سـەرانە وەرگـیرا لەمەجووسـەکانی هەجـەرو هەندێ وڵاتی شام، پاشای میصرو مەلیکی حەبەشەو مەلیکی عوممـان دیارییـان بـۆ پێغەمبەر ﷺ نارد.

لەسەردەمی خەلافەی راشدیندا زۆر شـوێن لەخۆرهـەڵاتو خۆرئـاوا رزگـار کـرا، وڵاتـی فـارسو رۆم واتـە عێـراقو شـامو میـصرو هەنـدێ لەشـیمالی ئـەفریقیاو خۆراسانو ئەهواز رزگار کران.

لەسەردەمی ئەمەوییەکان دا فتووحاتی ئیسلامی بەردەوام بوو، هەتا ولاتی ئەندەلوس‌و ولاتی هیندیشی گرتەوە، حوکمی ئیسلامی لەسەردەمی عەبباسییەکان دا لەزۆربەی ولاتە ئیسلامیەکان دا چەسپاو پەیرەو کرا.

لەسەردەمی خەلافەتی عوسمانی دا ولاتی ئیسلام زیاتر پان پۆرو بەرفراوان بوو، ولاتی مەغریب‌و ئەوپەری ولاتی ئەندەلووس، قوبروص‌و قوستەنتەنییەو ولاتی قەیرەوان‌و سیبتە کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی موسوڵمانانەوە لەلایەکی ترەوە فتووحاتی ئیسلامی گەیشتە ئەوپەری ولاتی چین.

فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتە جێ کەلەصەحیحی بوخاری‌و صەحیحی موسلیم‌و موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە دەفەرموێ: (ان الله زوى لي الأرض، فرأيت مشارقها ومغاربها، وسيبلغ ملك أمتي مازوى لي منها).

﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى﴾ ئایینی ئیسلام جێگیر دەکا بۆیان لەسەر زەوی، لەناو دڵەکان دەیڕسکێنێ‌و لەولات دا پایەداری دەکا، خۆیان دەبنە فەرمانڕەواو کاربەدەستی جیهان‌و ئاینەکەشیان دەبێتە بەرنامەی ژیان، چاکسازیی‌و عەداڵەتکاریی پەیدا دەبێ، زەوی ئاوەدان دەکرێتەوەو سوود لەبەرو بوومەکانی وەردەگیرێ، چونکە ئاینەکەیان فەرمان بەچاکسازی‌و عەداڵەتکاری‌و ئاوەدانکردنەوەی ولات‌و پشکنینی کون‌و قوژبنی زەوی دەکا؛ بۆئەوەی سوودی ماددی‌و زانستی لێ وەربگرن!

﴿لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا﴾ حاڵ‌و وەزعیان دەگۆڕێ لەترسەوە بۆ ئارامی‌و ئاسایش، بەدڵنیاییی پشتێن دەکەنەوەو لەکەس ناترسن.

ریوایەت کراوە: کاتێ عەدی کوڕی حاتەم هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەمیوانی، پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: دەزانی (الحيرة) لەکوێ یەو کوێ کەوتووە؟ عەدی دەڵێ: نەخەیر نازانم‌و نەمدیوە بەڵام بیستوومە، ئەمجار پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە خودا ئەم دینە تەواو دەکاو بالادەستی دەکا هەتا وای لێ دێ ئافرەت بەتەنیا لەکەژاوەدا بەسواریی حوشتر لە (الحيرة) وە دێ بۆ تەواف‌و تەواف دەکا ترسی کەسی نیەو دەگەڕێتەوە بۆ ولاتی خۆی. وەڵلاهی گەنج‌و خەزێنەی کیسرای کوڕی هورمز دەکەوێتە ژێر دەستی ئێوە!

عەدی دەڵێ: وتم: کیسرای کوڕی هورمز؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ: هی کیسرای کوڕی هورمز.

نەك هەر ئەوە وەڵلاهی واتان لێ دێ ماڵو سامان دەبەخشن کەس لێتان وەرناگرێ.

جا عەدی دوایی دەیگوت: ئەوەتا ئێستا ئافرەت لەوڵاتی (الحیرە) وە بەسواری کەژاوە دێ بۆ تەواف کردنو کەسی لەگەڵ دا نیەو لەهیچ ناترسێ. لەلایەکی ترەوە من بۆخۆم یەکێك بووم لەوانەی گەنجو خەزێنەی کیسرامان کۆنترۆڵ کردو دەستمان بەسەردا گرت. سوێندم بەو کەسەی ژیانی منی بەدەستە، سێیەمیش دێتە دی چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ئەوەی فەرموو.

بەڵێ ئەوە مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە: کەلەسەردەمی خەلیفەی خواناس دا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خودا لێ ی رازی بێ فەرمانبەرانی بەرپرسی زەکات دەگەڕان کەسانێك بدۆزنەوە زەکاتیان پێ بشێو بیاندەنێ کەسێك نەدەبوو زەکاتەکەیان لێ وەربگرێ!

بەڵێ خودا ترسو خۆف بۆ گۆڕین بەئەمنو ئاسایش، دەساڵ لەمەککەدا موسوڵمانان بەترسو لەرزەوە ژیانیان بەسەر برد، دوایی کۆچیان کرد بۆ مەدینەو حکومەتی ئیسلامییان پێك هێنا، ترسی دوژمنیان هەبوو شەوو رۆژ چەکیان بەدەستەوە بوو، بەچەکەوە دەنووستن، ماوەیەك بەو حاڵو وەزعەوە خۆیان راگرت، تەنانەت یەکێ لەهاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە دەبێ ئێمە تادونیا دونیایە ئاوا لەترسو نائارامیدا بین، رۆژێك نایە چەکەکانمان دابنێینو پشتێنی لێ بکەینەوە؟؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ماوەیەکی زۆری پێ ناچێ واتان لێ دێ پیاو لەناو کۆڕو کۆمەڵێکی زۆردا دادەنیشێ پارچە ئاسنێکی پێ نابێو ترسی هیچی نابێ.

ئەوە بوو دوایی بۆ مزگێنی، خودا ئەم ئایەتەی نازڵ کردو پاش ماوەیەکیش مزگێنی یەکە هاتەدی، خودا پێغەمبەرو موسوڵمانانی بەسەر نیوە دورگەی عەرەبی دا باڵادەست کرد، هەموو ئیمانیان هێنا، ئاسایشو ئارامی کەوتە وڵاتەوە پێغەمبەر ﷺ لەدونیا دەرچوو موسوڵمانان لەوپەڕی ئارامیو دڵنیایی دا بوون،

لەولاتی خۆیـان دا ئەوپـەڕی ئـارامیو هێمنـی بـەرپا بـوو بـوو. هـەروا لەسـەردەمی خەلافەتی حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانیش دا ﷺ خەڵکی زۆر بەدڵنیاییو ئارامیەوە ژیانیان بەسەر دەبرد. تاکەوتنە ناو فیتنەو ئاشوبو ئـەو هـەموو رووداوە ترسناکانەی لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عەلیو دواتردا هاتنە کایەوەو تـرسو خۆف بلاوبـۆوەو ئـارامی نـەما. خـەڵکی کـەبۆخۆیان حالّو وەزعـی خۆیـان گـۆڕیو خوداش لێی گۆڕین.

بـەڵێ: وادەی خـودا هاتــەجێ، مزگێنیەکـەی پێغەمبــەر ﷺ هاتــەدی، هــەتا موسوڵمانان پابەندی فەرمانو نەهی قورئان بوونو پەیڕەوی بەرنامەی ئیسلامیان دەکـرد، خۆیـان بالادەسـت بـوونو جیهـان لـەژێر کـۆنترۆڵی خۆیـان دا بـوو، بـەلام کەئـــەوان مەرجـــەکانی فرمانڕەواییـــان پێـــشێل کـــرد، خـــوداش بالادەســـتی لێ وەرگرتنەوە، هەرکاتێکیش موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆلای خوداو بەڕاستی پابەندی فەرمانو نەهی پەروەردگار بنو بەدڵسۆزیی تێبکۆشن بۆ ئایینی خـودا، خـودا سـەر لــەنوێ شــکۆمەندیو بالادەســتیان پــێ دەبەخــشێتەوەو دەیانکاتــەوە بــەحاکمو فەرمانڕەوای جیهان.

ئــەمجار پــەروەردگار حــالّو وەزعــی گــەلی موســوڵمان بــەیان دەکــا لــەکاتی بالادەستیو فەرمانڕەواییـدا، یـان بـاییسو هـۆی بەرقـەرار بـوونی فـەرمانڕەواییان دیاریی دەکا. دەفەرموێ: ﴿يَعْبُدُونَنِي لا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً﴾ تـەنیا عیبـادەت بـۆ خـودا دەکـەنو بـەس، کەسـی تـر ناکەنـە هـاوەڵو هاوشـانی یـان ئەوانـە بالادەسـت دەبـن چونکە تەنیا خودا دەپەرستنو کەسی تر ناکەنە هاوشانی.

ئیمـام ئەحمـەدو موسـلیمو بوخـاری لەمـەعازی کـوڕی جەبەلـەوە ریوایـەتیان کــردوە: کــە پێغەمبــەر ﷺ پــێ ی فــەرموو: (حـق الله علـى العبـاد: ان یعبـدوه ولا یشرکون به شیئاً، وحق العباد على الله الا یعذبهم) حـەقی خـودا لەسـەر بەنـدەکانی ئەوەیـە عیبـادەتی بـۆ بکـەنو کـەس نەکـەن بـەهاوەڵو هاوشـانی، پـەروەردگاریش بڕیاری داوەو لەسەر خۆی پێویست کردوە کەسزایان نـەدا. ﴿وَمَـنْ كَفَـرَ بَعْـدَ ذَلِـكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ﴾ کەسێك دوای ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی پێمـان بەخـشیون لەئایین هەڵبگەڕێنـەوە یـان کـوفرانی نیعمەتـەکانی بکـەن وەکـوو لەشـوێنێکی تـردا

دەفەرموێ: ﴿فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللَّهِ﴾ (النحل/١١٢) یان لەفەرمانی خودا دەرچێو یاخی ببێ ئەوە ئەوانە بەتەواوی فاسقن لەم روەوە سپڵەیی دەکەن لەبەرامبەر نیعمەتەکانی پەروەردگار، فەضلو نیعمەتی خودایان لەبیر خۆ بردۆتەوە، هەڵبەتە ئەم کوفرانو سپڵەیی یە لەهەندێ لەگەلو نەتەوەکان دەردەکەوێو هەموو ئادەمیزادەکان تێکرا ئەو حاڵەیان بەسەردا نایە، چونکە لەحەدیثی صەحیحیندا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (لاتزال طائفة من امتی ظاهرین علی الحق، لایضرهم من خذلهم ولا من خالفهم الی یوم القیامة)

ئەمجار پەروەردگار دوا بەدوای وادەو بەڵێنەکانی، فەرمان بەموسوڵمانان دەکا بەئەنجامدانی نوێژو زەکات دانو فەرمانبەرداریی فەرمانی پێغەمبەرو هیچ حیسابێك بۆ کۆمەڵی کافران نەکەن. دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ نوێژەکانتان لەکاتی خۆیان بەرێكو پێکی ئەنجام بدەن، ﴿وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ زەکاتیماڵو سامانی خۆتان دەربکەن، چوونکە زەکات دان باربوویی کردنی ئاتاجانە، دەستگیری کردنی هەژارو بێ نەوایانە، ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ پابەندی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بن، چیتان پێ دەڵێ گوێ بیستی فەرمانو جڵەو گیرییەکانی بن، ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بۆ ئەوەی خودا رەحمتان پێ بکا، لەسزای توندی دۆزەخ بتانپارێزێ، چونکە هەرکەسێ ئەوە کردارو هەڵوێستی بێ خودا رەحمی پێ دەکا وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ﴾ (التوبة/٧١)

﴿لا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الأَرْضِ﴾ ئەی پێغەمبەر! وامەزانە ئەوانەی سەرپێچی پەیامی تۆ دەکەن، بەدرۆت دەخەنەوە، بڕوا بەپێغەمبەرێتی خۆتو راستی پەیامەکەت ناکەن، وامەزانە ئەوانە لەژێر دەسەڵاتی خودا دەردەچنو خودا ناتوانێ تۆڵەیان لێ بستێنێ ئەگەر بیەوێ لەناویان بەرێ، بەڵکوو خودا بەتواناو دەسەڵاتە، لەسەر ئەو بێ گوێیو لاسارییەیان، لەسەر ئەو سپڵەییو کوفرەیان سزایان دەدا، سزای توندیان دەدا، جۆرەها نەخۆشیو خەمو خەفەتو دڵەڕاوکێو خۆ کوژیی بەشێوەی تاك یان بەکۆمەڵ تووشی کوشتنو لەناو چونیان دەکا.. وەکوو ئەوە بەجەنگو بومەلەرزەو لافاوو ئاگر کەوتنەوە لەناویان بەرێ.

﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ شوێنی حەوانـەوەو سـەرەنجامیان ئـاگری دۆزەخـە ﴿وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ دۆزەخ خراپتیرن ئاکامو شوێنو جێگای حەوانەوەیە. هەرکەسێ لەقیامەت دا دۆزەخ بکرێتە شوێنی حەوانەوەی ماڵوێرانو خەسارەتمەندە!

بـەکورتی ئەگـەر موسـوڵمانان پابەنـدی بەرنامـەی ئـایین بـن، ئـیتر خـودا لەپشتیانەو چ باکیان لەهێزو توانای کافرو بێ بڕوایان نەبێ..

## حوکمی یانزەهەمو دوانزەهەمو سیانزەهەم ئەو حاڵەتانەی پێویستە لەناو خێزاندا منداڵو خزمەتکاریش بێ ئیزن وەژوور نەکەون

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ۚ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٥٨) وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٥٩)

وَٱلۡقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا يَرۡجُونَ نِكَاحٗا فَلَيۡسَ عَلَيۡهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعۡنَ ثِيَابَهُنَّ غَيۡرَ مُتَبَرِّجَٰتِۢ بِزِينَةٖۖ وَأَن يَسۡتَعۡفِفۡنَ خَيۡرٞ لَّهُنَّۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٦٠﴾

دەربارەی هۆی نازڵبوونی ئەم ئایەتانە ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ خزمەتکارێکی هەبوو ناوی (مدلج) بوو، نیوەڕۆیەك پێغەمبەر ناردی بۆ ماڵی عومەری کوڕی خەتتاب، خزمەتکارەکە بەبێ ئیزن وەرگرتن وەژوور کەوتوو عومەری لەحاڵەتێکی وادا بینی عومەر پێی ناخۆش بوو بەوحاڵە ببیندرێ، دوایی حەزرەتی عومەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم خۆش بوو پەروەردگار جڵەوگیری لێ بکردینایە لەو حاڵەتانە.

موقاتیل دەفەرموێ: ئایەتەکان دەربارەی ئەسمائی کچی مەرثەد نازڵ بوون، خزمەتکارێکی هەبوو رۆژێك لەکاتێکی وادا چووە ژوورەکەی پێی ناخۆش بوو، ئیتر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد وتی: خزمەتکارو غوڵامەکانمان لەکاتی وادا دێنە ژوورەکانمان پێمان ناخۆشە، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

ریوایاتی تریش لەم بارەوە ریوایەت کراون بەپێویستم نەزانی راگوێزیان بکەم.

بێگومان ئیسلام بەرنامەی ژیانێکی تەواوو کاملە، بەرنامەیەکە ژیانی ئادەمیزاد لەهەموو قۆناغەکانی دا رێك دەخا، لەهەموو پەیوەندیو هەڵس‌و کەوتێکی دا لەهەموو جم‌و جوڵێکی دا رۆڵی خۆی دەگێڕێ، بۆیە تەنانەت ئادابی رۆژانەی ناو خێزانیش دەست نیشان دەکا، هەر وەکوو چۆن ئەرکە گەورەکانی تاك‌و کۆمەڵ رون دەکاتەوە، چ لەبەرامبەر پەروەردگارداو چ لەناو کۆمەڵ خۆی دا، هەموو ئاداب‌و رەوشتێك هەرچەندە بچووك‌و تایبەتی بن، هەرچەندە گەورەو گشتی بن، لێکیان دەبەستێ‌و رایاندەنوێنێ‌و دەیانکاتە رێبازو پەیرەوو پرۆگرام بۆ خودا پەرستی‌و دەبنە بەشێك لەعیبادەت‌و خوداپەرستی. ئەم سورەتە واتە: سورەتی (النور) نموونەیەکی ئەو تەنسیق‌و بەرنامە داڕێژییەیە. ئەوەتا هەندێ

حەدو تۆڵەو تـەمبێ کردنـی لـەخۆ گرتـوون، لەتـەك ئـەوەدا ئیـزن وەرگـرتن یاسای دیـدەنیو هاموشۆی نێـوان کـەسو کـارو ناسـیاوان دیـاری دەکـا، وێـڕای ئەوانـەش جەولەیـەکی چـڕو پـڕ لـەبواری وجـود دا ئـەنجام دەدا. ئـەمجار دەگەڕێتـەوە سـەر ئـەدەبی موسـوڵمان لەگـەڵ خـوداو پێغەمبـەری خـودا دا لـەبواری یەکاڵاکردنـەوەی کێـشەو نیـزاعو دادگـایی کـردن. ئـەمجار لەتـەك وادەو بـەڵێنی پـەروەردگار بـۆ موسـوڵمانان کەدەیانکاتـە جێگـرو ئاوەدانکـەرەوەی زەوی، دەگەڕێتـەوە بـۆ رونکردنەوەی ئادابی ئیزن وەرگرتن تەنانەت لەناو خێزانـەکان خۆشیان دا، هـەروا ئادابی ئیزن وەرگرتن لەمەجلیسی پێغەمبـەردا ﷺ. هـەروا پەیوەنـدیو داوەتکـردن بۆ نانخواردن لەنێوان خزمو دۆستو ناسیاودا، ئەمانـە هـەموویان ئـادابو رەوشـتن دابو نـەرێتی کۆمەڵایـەتین، پێویـستە موسـوڵمانان پـەیڕەوییان بکـەنو پەیوەنـدی نێوان خۆیان لەبەر رۆشنایی ئەم دابو یاساو رێسایەدا رێك بخـەنو پابەنـدیان بـن! ئیتر دەست دەکا بەڕونکردنـەوەی حـوکمی یانزەهـەمو دەفـەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ﴾ ئەی ئەوکەسـانەی ئیمانتـان هێنـاوە، بڕواتـان بەخودایـەتی خـوداو پێغەمبـەرێتی موحەممـەد هەیـە، بـەئافرەتو پیاوانتانـەوە، داوا لەکۆیلـە خزمـەتکارو کارەکـەرو بەندەکانتان بکەن، هەروا داوا لەو منداڵانەتان بکەن: کەهێشتا باڵغ نەبوون. داوایان لێ بکـەن کەلەسـێ کـات دا بـەبێ ئیـزن نەیەنـە ژوورەکانتـانو بـەبێ پـرس خۆیـان بەشوێنی تایبەتی نووستنتان دا نەکەن ئەو سێکاتە قەدەغە کراوانەش ئەمانەن:-

١- ﴿مِنْ قَبْلِ صَلاةِ الْفَجْرِ﴾ لـەپێش نوێـژی بـەیانی دا، چـونکە ئـەو کاتـە کـاتی ئیـستیراحەتو نووسـتنە لـەناو جێگـادا کـاتی بەخەبـەر هـاتنو هەسـتان لەخـەوو خۆگۆڕینە، لەوانەیە عەورەتی ئادەمیزاد بەدەر بکەوێو ئـەو خزمـەتکارو منداڵانـە چاویان پێ بکەوێ.

٢- ﴿وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ﴾ ئەوکاتـەی پۆشـاکی کـارو کاسـبی دادەکەننو خۆتان ڕوت دەکەنەوە بۆ پشوودانو مانـدو حەسانەوەو نووسـتنی نیـوە رۆژ.

٣- ﴿وَمِنْ بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ﴾ دوای نوێژی (خەوتنان) چونکە ئەوکاتەش کاتی خۆ روتکردنەوەو پۆشاك گۆڕینە، پۆشاکی ئیش دادەکەندرێو پۆشاکی نووستن لەبەر دەکرێ. ﴿ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ﴾ سێ کاتی وەهان مەزندەی ئەوەیان لێ دەکرێ عەورەتی ئادەمیزادیان تێدا دەربکەوێ. دەبێ فەرمان بەخزمەتکارو کارەکەرو منداڵ بکرێ لەم سێ کاتەدا خۆبەسەری سەر بەژووری تایبەتی نووستنو حەسانەوەدا نەکەن، چونکە ترسی ئەوە هەیە لەم کاتانەدا عەورەت بەدەر بکەوێ، ئەوکاتانە کاتی خۆ روتکردنەوەو پۆشاك گۆڕینن، کۆیلەو بەندەو خزمەتچیو کارەکەرەکانتانو منداڵ دەتوانن بەبێ پرس خۆبەماڵ دا بکەن مەگەر لەم سێ کاتانەدا نەبێ؛ کەبەعادەت کاتی خۆگۆڕینو پاڵدانەوەیە. دەبێ لەم سێکاتانەدا ئیزنو پرسی چوونە ژوورەوەی ژوورە تایبەتیەکانی ماندوو حەسانەوەو نووستن وەربگرن.

وشەی ﴿لِيَسْتَأْذِنْكُمْ﴾ بەرواڵەت بۆ وجوبە، وەلێ جەماوەری زانایان پێیان وایە فەرمانەکە بۆ نەدبەو سوونەت دەگەیەنێ، فێرکردنو ئەدەب دادانی رەوشتی جوان نیشان دانە. ئەگەر وارێکەوت یەکێك بەبێ پرس چووە ژوورەوە تاوان نیە، بەڵکوو کارێکە پێچەوانەی ئەدەبو رەوشتی جوانە. خۆئەگەر خزمەتکار یان کارەکەر دەیزانی کەبچێتە ژووری تایبەتی ئاغای یان ئاغا ژنی چاوی بەعەورەتی بکەوێ، ئەوە چوونە ژوورەوەکەی حەرامەو کارێکی ناپەسند ئەنجام دەدا.

هەندێ لەزانایان پێیان وایە حوکمی پرس کردن بۆ چوونە ژوورەوەی ژووری نوستنو پشوودان لەو سێ کاتانەدا نەسخ بۆتەوە، چوونکە هاوەڵانی پێغەمبەرو ﷺ چینی دوا ئەوانیش ئەم فەرمانەیان پەیرەو نەکردوە، دەتوانین بڵێین: کە ئەم فەرمانە بۆ کاتێك بووە کەدەرگاو پەردە بۆ ژوورەکان نەبوون.

بەڵام قسەی راست ئەوەیە: کەحوکمی ئیزن وەرگرتن نەسڕاوەتەوەو پێویستە پەیرەو بکرێ.

ئەبو حەنیفە دەفەرموێ: کەس پێکیشی ئەوەی نەکردوە کەفەرمان بەئیزن وەرگرتن نەسخ بووبێتەوە..

جەماوەری زانایان پێیان وایە: کەخیطابی ئایەتەکە گشتی یە ئافرەتو پیاو دەگرێتەوە.

کەدەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ﴾ مەبەست منداڵە چ نێرینە چ مێینە، منداڵی خۆیش بن یان هی بێگانە بن، ئەو منداڵانەن کەرسیدە بوونو هێشتا فامیان نەکردۆتەوە. وەکوو دەفەرموێ: ﴿أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ (النور/٣١)

ئەوەشمان لەیاد نەچێ: کەکاتی نێوان نوێژی خەوتنانو نوێژی بەیانی هەمووی کاتی یاساغ کراوەو رستەی ﴿مِنْ قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ﴾ دەیگرێتەوە.

﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ﴾ چ خراپەیەکتان لەسەر نیە ئەگەر لەغەیری ئەو سێ کاتانەدا منداڵو کۆیلە نۆکەرو خزمەتچیو کارە کەرەکانتان بەبێ ئیزن بێنە ژوورەوە بۆلاتان، واتە شتێکی موباحو رەوایەو بەیاساغ دانانرێ. چونکە ئەوانە ﴿طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ﴾ واتە ئەو منداڵو کۆیلەو خزمەتچیو کارە کەرانەتان لەناو ماڵ دانو دێنو دەچن، هەریەکە بۆ کاری خۆی، خزمەتچیو کارەکەرەکانتان خەریکی ماڵماڵێنو ئەنجامدانی ئیشو کاری ناوماڵن، منداڵەکانیش بۆئەنجامدانی کاری تایبەتی خۆیان ژوراو ژوور دەکەنو پێیان خۆشە لەگەڵ ئێوەش کات بەسەر بەرن، ئەگەر هەموو کاتێك دەقولبابو ئیزن وەرگرتن بەپێویست دابنرایە دەبوە حەرەجو ناخۆشی بۆ هەموو ئەندامێکی خێزانەکە، بۆیە تەنها لەوسێ کاتەدا کەمەزندەی دەرکەوتنی عەورەتی تێدا دەکرێ، ئیزن وەرگرتنی چوونەژوورەوەی بەپێویست دانا.

ئاواو بەو شێوە پەروەردگار ئەدەبی موسوڵمانان دادەدا، فێری هەڵسو کەوتی ناو خێزانیان دەکا، دەیەوێ کۆمەڵی موسوڵمانان کۆمەڵێکی وابن دڵپاكو هەست بەرزو سینەخاوێنو ئەعصاب لەسەرە خۆو بەرچاو رون بن، کۆمەڵ لەخێزانەوە دەست پێ دەکا، چونکە خێزان بناغەی کۆمەڵە. هەرکاتێ خێزانەکان بەو شێوە پەروەردە بوونو بەوئادابو رەوشتانە گۆش کران، ئەو کۆمەڵگایەیەی لەوان پێك دێ هەمان رەوشتی جوانی تێدا جێگیر دەبنو گەشە دەکەن.

هەڵبەتە ئەم ئەدەب دادانەو فێر کردنو شەریعەت بەیانکرنە فەچڵو نیعمەتی پەروەردگارە بۆیە دوابەدوای رونکردنەوەی ئەو ئادابو رەوشتانە فەرموی: ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئاواو بەو جۆرە پەروەردگار شەریعەتو یاسا بۆ ئێوە رون دەکاتەوە، فێری ئادابو رەوشتی جوانو رازاوەتان دەکا، پەروەردگار ئاگاداری وەزعو حاڵی بەندەکانیەتی، دەزانێ چ سوودبەخشە بۆیان چی بەکەڵکیان نایە، داناو حەکیمە لەداڕشتنی یاسای ژیانی ناو خێزانو ناو کۆمەڵ، دەزانێ چ دابو رەوشتێك بەکەڵکە بۆیان، ئەمجار دەگوێزێتەوە بۆ بەیانکردنی حوکمی دوانزەهەمو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ هەرکاتێ منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی باڵغ بوون کەلەوەپێش تەنها لەسێ کات دا ئیزنی هاتنە ژوورەوەی شوێنی نووستنو پشودانی ئێوەیان وەردەگرت، ئەگەر باڵغ بوون پێویستە هەموو کاتێ ئیزن وەربگرن وەکوو چۆن لەوەپێش فەرمانتان پێ کرا: کەئادەمیزادی گەورە دەبێ ئیزنی هاتنە ژورەوە وەربگرێ جاکوڕی ئەو ماڵە بێ یان خزمو کەسوکار بێ، کەوابێ ئەم ئایەتانە شیکەرەوەی ئایەتی ﴿أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾ (النور/٣١) واتە ئەو منداڵانەی بینینی عەورەتی ئافرەتان سەرنجیان راناکێشێو هەست بەخوڕپەی جنسی ناکەن، ئەوانە لەحوکمی ئیزن وەرگرتن چەرت کراون، بەڵام کەباڵغ بوون بینینی عەورەتی ئافرەتان سەرنجی رادەکێشان ئەوە دەبێ ئەوانیش وەکوو خەڵکی تر ئیزنی هاتنە ژوورەوە وەربگرنو لەم بارەوە حوکمی بێگانەیان هەیە: کەپێویستە بۆ هەموو دیدەنیو هاتنە ژوورەوەیەك ئیزن وەربگرن، باڵغ بوون بەلای زوربەی زانایانی ئیسلامەوە یان ئیحتلام بوونە، یان تەمەنی بگاتە پانزەساڵ.

ئاماژە بەو فەرمودەیەی لەئیبنو عومەرەوە ریوایەت کراوە دەفەرموێ: رۆژی جەنگی ئوحود تەمەنم چواردە ساڵ بوو نیشانی پێغەمبەر ﷺ درام رێگەی نەدام بچم بۆ غەزا، رۆژی خەندەق تەمەنم پانزە ساڵ بوو کەنیشانی پێغەمبەریان دام رێگای دام هاوبەشی غەزا بکەم.

ئەبوحەنیفە دەفەرموێ: کوڕی گەنج بەباڵغ دادەنرێ هەتا هەژدە ساڵ تەواو نەکا. ئافرەتیش تانەگاتە حەقدەساڵ بەباڵغ حسێب ناکرێ.

هەندێ لەزانایان شافیعیشیان لەناودایە دەڵێن: دەرهاتنی موو لەبەرو ریش نیشانەی باڵغ بوونە.

بەڵگەشیان ئەو حەدیثەیە: کە (عطیة القرظی) ریوایەتی کردوە. دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بەکوشتنی ئەوانە کرد کەمویان لێ هاتبوو لەهۆزی قورەیظەو بەمەرەخەس کردنی ئەوانەی مویان لێ نەهاتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بەمەرەخەس کردنم!

﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ ئاواو بەو جۆرە وەکوو چۆن حوکمو یاساتان بۆ رون دەکەینەوە بەجۆرێك دڵ ئارامیو خۆشبەختی دونیاو قیامەتتان بۆ دەستەبەر ببێ، پەروەردگار ئاگاداری وەزعی بەندەکانی یەتیو دانایە بەچارەسەر کردنی کێشەو رێکخستنی کاروباریان.

حوکمی سیانزەهەم ئەوەیە دەفەرموێ: ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللاَّتِي لا يَرْجُونَ نِكَاحاً فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ﴾ وەکوو زانیمان لەوەپێش فەرمانی کرد بەوەی ئافرەتان زینەتی خۆیان بشارنەوە بۆ ئەوەی فیتنەو شەهەوات نەوروژێن. ئەمجار لێرەدا دەگەڕێتەوە سەر بەیانکردنی حوکمی ئەوە: کەئەو ئافرەتانەی پیرو پەلۆ بوونو چ حەزو ئارەزۆی پیاوانیان نەماوە، لەشو لاریان چرچو لۆچ بووەو چ جوانییەکیان پێوە دیار نیە، ئەو جۆرە پیرەژنانە چ خراپەیەکیان لەسەر نیە: کەلەناو ماڵ دا کەمێ لەپۆشاکی خۆیان کەم بکەنەوە واتە: پۆشاکی دەرەوەیان دا بکەنن، بەمەرجێ عەورەتیان بەدەر نەکەوێو کەشفی زینەتی خۆیان نەکەن. بەلام ﴿وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ﴾ ئەگەر پۆشاکی دەرەوەیان بەسەر خۆیانەوە بێڵنو داینەکەننو بەو پۆشاکە پانو پۆڕە داپۆشەرەوە لەماڵ دابنیشن باشترە بۆیان. ﴿وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ پەروەردگار شنەوایە بەقسەو گفتوگۆی ئەو پیرەژنانە لەگەڵ پیاوان دا، زاناو ئاگادارە بەگوفتو گۆی ئەو پیرێژنانە لەگەڵ ئەوان دا، زاناو ئاگاداری مەبەستو نیازیانە، هیچی لێ گوم نابێ، خۆتان

لەوەسوەسەی شەیتانو داوو فێڵەکانی بپارێزن، ئاگاتان لەخۆتان بێ نەکەونە تەڵەی ئەو دوژمنەتانەوە.

## دروستە بۆ ئادەمیزاد لەماڵی هەندێ کەس بخوا بەبێ پرس

﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتە گەلێ ریوایەت هەن:

١- سەعیدی کوڕی (المسیب) دەفەرموێ: ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك نازڵ بووە: کەلەماڵ دەردەچوون کلیلی دەرگای ماڵەکانیان لای کوێرو شەلو نەخۆش خزمو خوێش دادەنا.

پێشیان دەگوتن: ئەگەر برسیتان بوو، یان پێویستتان بەشتێك بوو، ئەوە بەگەردن ئازادی لەماڵی ئێمە بخۆن، جا ئەو کلیل لادانراوانە خۆپارێزییان دەکرد لەوەی لەماڵەکانیان بخۆن، دەیانگوت: لەوانەیە بەدڵ پێیان خۆش نەبێ ئیتر ئایەتی ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ.....﴾ نازڵ بوو.

ئایەتەکە: هەرچەندە دەربارەی ئیحراج بوونی ئەو جۆرە کەسانەی کەبەو شێوەو کلیلیان لادانرا، هاتۆتە خوارێ، وەلێ وەکوو دەگوترێ: (عیبرەت بەگشتی وشەکانە نەك بەتایبەتمەندیی هۆی نازڵبوونە) بۆیە حوکمێکی گشتی بۆ هەموو کەس باس کردوەو پێی راگەیاندون: کەخواردن لەماڵی خزمو دۆستو ئەو کەسەی دەتکاتە وەکیلی خۆی بەسەر شتێکەوە رەوایەو موباحە.

٢- حەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئایەتەکە دەربارەی عەبدوڵلای کوڕی مەکتوم نازڵ بوو تەکلیفی جیهادی لەسەر لاچووە. چونکە کوێر بوو.

ئەبوحەییان دەڵێ: ئایەتەکە حەرەجو بەخۆدا شکانەوە لادەبا لەسەر کوێرو شەلو نەخۆشو ئەرکی جیهادیان لەسەرشان لادەبا، لەهەمان کات دا ئەوە رادەگەیەنێ کەچ خراپەو حەرەجێك لەوەدا نیە کەئەوانە لەماڵی ئەو جۆرە کەسانە بخۆن: کەخودا لەئایەتەکەدا ناوی هێناون. ئەوکاتە پەیوەندیی ئایەتەکە بەپێشەوە لەم رووەوە دەبێ: کە پەروەردگار دوای باسکردنی حوکمی ئیزن وەرگرتن، ئەوەش رون دەکاتەوە: کەخۆپاشدانی ئەو جۆرە خاوەن عوزرانە لەچون بۆ غەزا پێویست بەرێگەپێدانی پێغەمبەر ﷺ ناکا!

٣- ئیبنوعەبباس دەفەرموێ: کە پەروەردگار ئایەتی ﴿وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ﴾ نازڵ کرد، موسوڵمانان تووشی جۆرە حەرەجێك بوون دەربارەی نان خواردن لەگەڵ نەخۆشو کوێرو کەم ئەندامەکانو دەیانگوت: خۆراك رێزدارترین ماڵە، پەروەردگاریش جڵەوگیریی لێ کردوین، کەماڵی یەکتری بە(باطل) بخۆین. دەی خۆ کوێر کەنانی لەگەڵ دەخۆین، خواردنە باشەکە نابینێ، وێدەچێ لەکاتی

نـان لەگـەڵ خـواردنی دا غـەدری لێ بکـەین، یـان نـەخۆش بەتـەواوی خـواردنی بـۆ ناخورێ، بۆیە ترسان کەلەکاتی نان لەگـەڵ خـواردنی ئـەم جۆرە کەسـانەدا تووشـی شـتێك بـن: کـەخودا جڵەوگیریی لێکـردوە. لەبـەر زێـدە ئیحتیـات کردنیـان تووشـی جۆرە حەرەجێك بوبون، ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی نازڵ کرد.

هۆی نازڵبوونی ئایەتەکە هەرشتێك بـێ، خـواردنی لـەماڵی ئـەو جۆرە کەسـانە حەڵاڵ کردوە، بەمەرجێ بزانێ خاوەن ماڵ رازییە، بۆیـەش بەتایبـەتی ئـەم چـەند ماڵەی هێناوە بۆ ئەوەی خەڵکی لەگەڵ یەکتری بکرێنەوەو بەراشکاوی کابرا لـەماڵی ئەو کەسەی دەیکاتە وەکیل بەسەر ماڵەکەیەوە، یـان لـەماڵی خـزم‌و ناسـیاوی بخـواو ئیحراج نەبێ!

هۆی نازڵبوونی بەشێکی تری ئایەتەکە: کەدەفـەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَأْكُلُوا........﴾ قەتادەو ضەحاك دەفەرمون: دەربارەی بنـەماڵەیەکی هـۆزی کەنانـە نازڵ بووە: کەبنەماڵەی (بنولیث) ی کوڕی عەمر بوون. ئەم بنەماڵە پێیان ناخۆش بـوو پیاوەکانیـان بەتـەنیا نـان بخـۆن، وادەبـوو کـابرا لەبەیانییـەوە تـا ئێـوارە دادەنیشت‌و خواردنی لەبەردەم بوو، دەستی بۆ نەدەبرد چاوەڕێی ئەوە بـوو یـەکێك نانی لەگەڵ بخوا، جا کەلەبەیانیەوە چاوەڕوان دەبوو، کەسی دەست نەدەکەوت نانی لەگەڵ بخواو شەو دادەهات ئەمجار نانەکەی دەخوارد ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتـەی نازڵ کرد.

عەکرەمە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی تاقمێك لەیاریـدەدەران نـازڵ بـووە، داب‌و نەرێتیان وابوو کەمیوانیان دەهات لەگـەڵ میوانەکـەدا نەبوایـە نانیـان نـەدەخوارد. ئیتر بەم ئایەتە خودا بۆی رونکردنەوە: کەبۆیان رەوایە چۆن نـان دەخـۆن بیخـۆن بەتەنیا یان بەکۆمەڵ!

هەڵبەتە پەیوەندیی ئایەتەکە بەشێوەیەکی گشتی لەگـەڵ ئایەتـەکانی پێـشەوە لەم رووەیە کەلەوەپێش پەروەردگار حوکمی وەزوور کەوتنی بەندەو منـداڵ بـەبێ پرس کردن جگە لەوسێ کاتەی رون کردەوە. ئەمجار لێـرەش دا حـوکمی نـەچوونی ئەوانەی بیانوویان هەیە بۆ غەزا بەبێ ئیزنی پێغەمبەر ﷺ هەروا حوکمی خواردن لەماڵی ئەو کەسانەی لەئایەتەکەدا ناویان هـاتووە بـەبێ ئیزنـی صـەریح بەمـەرجی

زانینی ڕەزامەندیی ڕون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ﴾ لەسەر کوێرو شەلو گۆجو نەخۆش ج گوناهێ نیە: کەنەتوانن بچن بۆ جیهاد، بەبیانووی بێ توانایی‌و لاوازییان خۆیان پاش بدەن، وەکوو لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ.....﴾ (التوبة/٩١)

یان ج خراپەو حەرەجێکتان لەسەر نیە ئەگەر لەوماڵانەدا ئێوە خواردن لەگەڵ کوێرو شەلو پەککەوتەو نەخۆش دا بخۆن ﴿وَلا عَلَى أَنفُسِكُمْ أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ﴾ هەروا لەسەر ئێوەش ج تاوانێ نیە کەلەماڵەکانی خۆتان دا نان بخۆن. کەدەفەرموێ: ماڵی خۆتان. ماڵی کوڕ بەنیسبەت دایك‌و باوکەوە، هەروا ماڵی مێرد بۆ ژن، دەگرێتەوە. چونکە ماڵی کوڕ هی باوکیەتی، ماڵی مێرد ماڵی ژنەکەیەتی.

ئیمام ئەحمەد لەموسنەدەکەی داو خاوەنانی کتێبە سوونەنەکان ریوایەتیان کردوە دەفەرمون: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أنت ومالك لأبيك) خۆت‌و ماڵ‌و سامانەکەشت هی باوکتە، هەروا بوخاری‌و موسلیم‌و نەسائی تیرمیزی‌و ئیبنوماجە لەعائیشەوە ریوایەتیان کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (أن أطيب ماأكلتم من كسبكم وان أولادكم من كسبكم)

کەدەفەرموێ: ﴿عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ ئاماژە بەوەدەکا: کەنانخواردن لەگەڵ ئەو کوێرو شەل‌و نەخۆشانە کارێکی پەسندەو هیچ ڕێزو نرخێك لەلەشساغەکان ناشکێ‌و دەبێتە هۆی ئەوەی کەئەو کەمئەندامانە بەخۆیاندا نەشکێنەوەو دڵیان بەخۆ نەمێنێ، ئەوە نیشانەی تەواضوع‌و خۆبەکەم زانینە، تەواضوعیش ڕەوشتی بەرزی موسوڵمانانە.

﴿أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَالِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَالاتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُمْ مَفَاتِحَهُ أَوْ صَدِيقِكُمْ﴾ واتە پەروەردگار لەیانزە شوێن دا بۆ ئێمەی حەڵاڵ کردوە کەبەبێ ئیزنی صەریح‌و بەمەرجی ئەوەی بزانین پێخۆشبون‌و ڕەزامەندیی هەیە بخۆین‌و بخۆینەوە ئەو یانزە شوێنەش ئەمانەن: ماڵی خۆمان، ماڵی کوڕیش بەردەکەوێ.

ماڵی باوك‌و باپیرانمان، ماڵی دایك‌و نەنكمان، ماڵی براكانمان، ماڵی خوشكانمان، ماڵی مامەكانمان، ماڵی خوشكی باوكمان، ماڵی خاڵەكانمان ماڵی خوشكی دایكمان، یان ئەو ماڵانەی كەكلیلیان بەدەستی ئێوەوەیە، یان ماڵی برادەرو هاوڕێكانتان. جا: كەبەیەكەوە ناوی ئەو ماڵانەی هێنا: كەبەبێ ئیزنی صەریح خواردن‌و خواردنەوەیان تێدا ڕەوایە، ئەو حاڵ‌و چۆنیەتەش بەیان دەكا: كەخواردنەكەی لەسەر دەخورێ: دەفەموێ: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَأْكُلُوا جَمِيعاً أَوْ أَشْتَاتاً﴾ چ خراپەو حەرەجێكتان لەسەر نیە بەكۆڕو كۆمەڵ نان بخۆن یان بەتەنیا نان بخۆن.

هەڵبەتە ئەمە روخصەت‌و ڕێگە پێدانە لەخوداوە بۆ بەندەكانی كەهەركەسە بەتەنیا نان بخوا یان لەگەڵ كۆڕو كۆمەڵ دا. ئەگینا نان خواردن لەگەڵ كۆڕو كۆمەڵ بەرەكەتدار ترە.

ئیمام ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبنوماجە لەوەحشی كوڕی حەربەوە ریوایەتیان كردوە ئەویش لەباوكیەوە ئەویش لەباپیریەوە، دەڵێ: پیاوێك، عەرزی پێغەمبەری كرد وتی: قوربان ئێمە هەردەخۆین‌و تێر ناخۆین! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لعلكم تأكلون متفرقين، اجتمعوا على طعامكم واذكروا إسم الله يبارك لكم فيه) وێدەچێ ئێوە جیاجیا نان بخۆن، خواردنەكە دابنێن‌و لەسەری گرد ببنەوە ناوی خودای لەسەر بهێنن بەرەكەتی تێ دەكەوێ.

ئیبنوماجە لەئیمامی عومەرەوە ریوایەتی كردوە دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (كلوا جميعا لاتفرقوا، فان البركه مع الجماعه) بەكۆمەڵ نان بخۆن، بەپەرتەوازەیی‌و جیاجیا نان مەخۆن، چونكە بەرەكەت لەگەڵ كۆمەڵ دایە.

ئەمجار كەشێوەی نان خواردنی رونكردەوە، ئادابی چوونە ژوورەوەی بۆ ناو ئەو خانوانەی نانیان تێدا خواردون رون دەكاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتاً فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ هەركاتێك چوونە ماڵێك لەم ماڵانە بۆ نانخواردن، سەرەتا سەلام لەدانیشتوانی ماڵە خانە خوێ كەتان بكەن، چونكە ئەوان لەخۆتانن چ لەڕووی ئاینەوە، یان لەڕوی خزمایەتی‌و دۆستایەتیەوە. بۆیە فەرمووی ﴿عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ هەتا ئامارە بێ بۆئەوە كەئەهلی ئەو ماڵە وەكوو خودی خۆتان وان. كەئێوە سلاو لەئەوان دەكەن وەكوو ئەوە وایە: كەسلاو لەخۆتان بكەن.

﴿تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّـهِ مُبَارَكَـةً طَيِّبَـةً﴾ واتـە: سلاوبکەن بەسلاوێك کەبەفەرمانی خودا چەسپاوەو لەشەریعەتو یاسای خۆی دا دایناوە، ئەو سلاو کردنە پیرۆزو خێرو بەرەکەت ئاوەرە، پاداشی باشی لێ وەردەگرنەوە. دڵو دەروونی سلاو لێکراوی پێ خۆش دەبێ، چونکە ﴿تحیة وتسلیم﴾ بەمانا داخوازی کردنی ژیانی خۆشو بێوەیی‌و دڵنیا بوون لەبەلایە بۆ سەلاولێکراوەکان، دوعای موسوڵمانە بۆ برای موسوڵمانی بەزێدە خێرو رزقو رۆژیی پاكو خاوێن. هەڵبەتە ئەمەش خۆشەویستی دەخاتە نێوان سلاوکەرو سلاولێکراوەوە.. بوخاری لەجابیری کوڕی عەبدوڵلاوە ریوایەتی کردوە فەرمویەتی هەرکاتێ چویتەوە بۆ ماڵی خۆت سلاو لەخاوو خێزانی خۆت بکە، سلاوکردن لەخوداوە هاتووە، خێرو بەرەکەتی پێوەیە.

قەتادەو موجاهیدو ئیبنوعەبباس فەرموویانە: هەرکاتێ چوویتەوە ماڵی خۆت سلاو لەخاوو خێزانت بکە، ئەگەر چوویتە ماڵێك کەسی تێدا نەبوو، بڵێ: (السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین)

حوکمی سلاوکردن لەسەر دانیشتوانی خانوو هەرچەندە لەوەپێش چەسپاوەو لەئایەتی ﴿حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ وەرگیراوە، وەلێ لێرە بۆیە دوبارەی کردەوە نەوەکوو واگومان ببرێ: کەسلاو لەخزمو کەس‌و کار پێویست نیە، بەڵکوو سلاوکردن داب‌و رەوشتی ئیسلامی یەو مافێکی کۆمەلایەتی‌و گشتی‌یەو نابێ پاشگوێ بخرێ.

﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئاوا بەوجۆرە خودا یاساو رێسای ئاینتان بۆ شی دەکاتەوە، وەکوو چۆن لەم ئایەتەدا ئەوەی بۆ رونکردنەوە کەحەلاڵە بۆتان دیدەنی یەکتر بکەن‌و بەنێزن‌و تێرادیوی لەماڵی یەکتری بخۆن. هەروەکوو لەسورەتەکەدا گەلێك حوکم‌و شەریعەتی جۆراو جۆری بۆ شی کردنەوە، بۆئەوەی ئێوە تێیان بفکرن‌و سەرنجیان بدەنێ، فەرمان‌و جڵەوگیریەکانی خودا شارەزابن‌و خۆشبەختی دونیاو قیامەت دەستەبەر بکەن.

## روخصەت خواستن لەکاتی چوونە دەرەوەو دابو نەریتی ئاخاوتن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾ ﴾

دوای ئەوەی یاسای پەیوەندیی نێوان خزم‌و کەس‌و کارو خێزانە تایبەتیەکانی ڕون کردەوە، ئەمجار دەست دەکا بەتەنظیم کردن‌و ڕێکخستنی کۆمەڵی موسوڵمانان بەگشتی، کۆکردنەوی بنەماڵە موسوڵمانەکان لەژێر سەرکردایەتی پێغەمبەردا ﷺ.
ئیبنوئیسحاق دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتانە ریوایەتی کردوە دەڵێ: کاتێك قورەیشیەکان‌و ئەحزاب لەغەزای خەندەق دا کۆبونەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵەی بیست، فەرمانی کرد بەچواردەوری مەدینەدا خەندەق لێ بدەن، بۆ زێدە هەڵنانی موسوڵمانان بۆخۆشی هاوکاری هەڵکەندنی خەندەقەکەی دەکرد، کۆمەڵێك لەدووڕومەکان خۆیان لەهاوکاری کردن‌و هەڵکەندنی خەندەق دزییەوە چوونەوە ماڵی خۆیان. موسوڵمانەکان ئەگەر کاری زۆر گرنگیشیان بوایە دەهاتنە خزمەت پێغەمبەرو پێویستیەکەیان عەرز دەکردو داوای ئیزنیان دەکرد، پێغەمبەریش ئیزنی دەدان، دوایی کەکارەکەیان ئەنجام دەدا یەکسەر دەگەڕانەوە بۆسەر کاری خەندەق هەڵکەندنەکەیان، چونکە بەدڵ حەزیان لەهاوکاری کردنی ئەو خێرە هەبوو هیوای پاداشی دوارۆژ پاڵی پێوەدەنان بۆکارکردن، ئیتر پەروەردگار دەربارەی ئەوان ئایەتی ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ.....الاية﴾ ی نازڵ کرد.

**ئایەتەکان کۆمەڵێك ئادابی کۆمەڵایەتی‌و ئایینی یان لەخۆگرتوون:**

١- ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ موسوڵمانانی خاوەن باوەڕو ئیمان کامڵ‌و پتەو ئەوانەن لەناخەوە بڕوایان بەهەبوونی خودای تاك‌و تەنیاو بەدیهێنەرو هەڵسوڕێنەر هەیە، هەروا بڕوایان بەڕاستی پێغەمبەرایەتی‌و هاتنی ڕۆژی قیامەت هەیە.

﴿وَإِذَا كَانُوا مَعَهُ عَلَى أَمْرٍ جَامِعٍ لَمْ يَذْهَبُوا حَتَّى يَسْتَأْذِنُوهُ﴾ ئەگەر هاتوو موسوڵمانان لەتەك پێغەمبەردا بون‌و بۆ کارێکی گرنگ کۆبوونەوە وەکوو نوێژی جومعە یان نوێژی جەژن، یان ڕەگەڵ کەوتن‌و هاوکاری کردن بۆ جەنگان لەدژی دوژمن، یان پلان دانان‌و نەخشە کێشان بۆ کارێکی گرنگ جائەگەر لەوکاتانەدا پێویستیان بەوەبوو ئیزن وەربگرن‌و پێغەمبەر خۆی ڕوخصەتیان بدا تا ئیزن وەرنەگرن ناڕۆن.

ئەمە ئەدەبێکی ئایینیو سیاسییە تەواوکەری ئادابو رەوشتە پێشوەکانی پێشوون. جاکەلەپێشەوە فەرمانی کرد بەپرس کردنو ئیزن وەرگرتن بۆچوونەژوورەوەو دیدەنی کردن، ئەمجار فەرمانیان پێ دەکا بەئیزن وەرگرتن بۆ چوونە دەرەوەو بەجێ هێشتنی ئەو کۆڕو مەجلیسە بەتایبەتی ئەگەرکۆبوونەوەکە لەبەر ڕوداوێکی گرنگ بوو. ئیمام ئەحمەد لەموسنەدەکەی داو ئەبو داودو تیرمیذیو ئیبنو حیبان لەئەبو هورەیرەوە فەرمووەیەکیان ریوایەت کردوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اذا انتهی أحدکم من المجلس فلیسلم، فان بدا له أن یجلس فلیجلس، ثم اذا قام فلیسلم فلیست الأولی بأحق من الاخرة) ئەگەر یەکێك لەئێوە ڕێی لەمەجلیسو کۆبوونەوەیەك کەوت بالەسەرەتاوە سڵاو بکا، ئەمجار ئەگەر دەیزانی شوێنی دانیشتنی هەیە بادابنیشێ، پاشان کەویستی بڕوا بادووبارە سڵاو بکا چونکە سڵاوی یەکەم لەهی دووەم پێویست تر نیە.

ئەمجار جارێکی تر جەخت لەسەر پرس وەرگرتنو ئیزن وەرگرتن دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَأْذِنُونَكَ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بێگومان ئەوانەی ئیزن لەپێغەمبەر وەردەگرنو بۆ چوونە دەرەوەو ئەنجامدانی کارەکانیان روخصەت وەردەگرنو راوێژ لەگەڵ پێغەمبەردا دەکەن، ئەوانە لەپێڕی موسوڵمانانی خاوەن باوەڕو راستگۆو راستاڵن، بڕوایان بەتاكو تەنیایی خوداو پێغەمبەرێتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ هەیە، بەگوێرەی ئیمانەکەیان هەڵسو کەوت دەکەن.

﴿فَإِذَا اسْتَأْذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ﴾ ئەگەر هاتوو یەکێك لەو موسوڵمانە راستاڵانە داوای روخصەتی لێ کردی بۆئەوەی کارێکی گرنگو پێویستی خۆی ئەنجام بدا ئەتۆ بەئارەزۆی خۆتو بەگوێرەی بەرژەوەندی روخصەتیان بدە.

ئایەتەکە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ: کە پەروەردگار صەلاحیەتی داوە بەپێغەمبەر ﷺ بۆخۆی ئیجتهاد بکا، ئەوی بەباشی زانی ئەوە بکا، ئیزن بەهەندێك بداو بەهەندێکیان نا.

ئەوە بوو لەوەپێش پەروەردگار سەرزەنشتی پێغەمبەری کرد لەسەر ئەوە کەئیزنی مونافیقەکانی دابوو فەرمووی: ﴿عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ

الَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ!﴾ ئیتر ئەم ئایەتەی ئێرە حەرەجی ئیزن نەدانی قەتعی لابرد، چونکە وادەبێ کارێکی زۆر پێویستو گرنگ دێتە پێشەوە، داخوازی ئەوە دەبێ کابرا بچێ بۆ جێبەجێ کردنی، ئیتر پەروەردگار روخصەتدانەکەی هەواڵەی گەورەی کۆمەڵ کرد بۆئەوەی بەبیرو ئیجتهادی خۆی لەم بارەوە حوکم بکا.

ئەوە بوو عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەغەزای تەبووك ئیزنی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە خواست، پێغەمبەر ﷺ ئیزنی داو پێ ی فەرموو: ﴿إنطلق فوالله ماأنت بمنافق﴾ بگەڕێوە بۆ ماڵی خۆت، بەخودا دەزانم تۆ دووڕوونی، مەبەستی ئەوە بوو مونافیقەکان گوێیان لەم وتەیە بێ، جا کەدووڕوەکان ئەمەیان بیست وتیان: ئەوە چیە موحەممەد هاوەڵانی داوای گەڕانەوەی لێ دەکەن رێگەیان دەدا، کەچی بۆ ئێمە رێگانادا، بەخودا دادپەروەرانە لەگەڵمان ناجووڵێتەوە.

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: عومەر بۆ ئەنجامدانی عەمرە ئیزنی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرت، ئەویش ئیزنی داو فەرمووی: ئەی (أبوحفص) لەدوعای چاکەی خۆت بێ بەشمان مەکە. وێڕای ئەوەش قورئان ئاماژە بەوە دەکا: کەباش وایە بەپرسو ئیزنیش هەر نەگەڕێتەوەو خۆ بگرێو گوێ بەداخوازییەکانی خۆی نەدا دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لَهُمُ اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ ئەی موحەممەد داوای لێخۆشبوون لەتاوانیان بۆ بکە، لەخودا بپاڕێرەوە: کەلەهەڵەو کەمتەرخەمییان خۆش ببێ، بێگومان خودا لێخۆشبوو لێبوردوە بۆئەوانەی تۆبە دەکەنو لەهەڵەو تاوانی خۆیان پەشیمانن.

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ: کەئیزن وەرگرتن هەرچەندە بەبیانووی رەواشەوە بێ، کەمتەرخەمیو تەقصیرە پێویستی بەوە هەیە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوونیان لەتاوانیان بۆ بکا، چونکە بەرژەوەندیی دونیایی خۆیان پێش بەرژەوەندیی قیامەتیان خستووە.

ئەمجار فەرمان بەموسوڵمانان دەکا کەبەچاوی رێزەوە بڕواننە پێغەمبەرو بەشکۆمەندی بزانن، بەناوی شەخصی خۆیەوە یان بەشێوەی (کنیە) بانگی نەکەن: ئەی موحەممەد! یان ئەی (أبوالقاسم) بەڵکوو بانگی بکەن (یارسول الله) یان (یانبی

الله!) واتــه بــەو نــاوه بــانگی بکــەن: کەنیــشانەی ڕێــزداری‌و شــکۆمەندیی تێدایــە.

دەفــەرموێ: ﴿لا تَجْعَلُــوا دُعَــاءَ الرَّسُــولِ بَيْــنَكُمْ كَــدُعَاءِ بَعْــضِكُمْ بَعْــضاً﴾ ئــەی موســوڵمانینە! بــەناوی شەخــصی خــۆی بــانگی پێغەمبــەر مەکــەن! مــەڵێن: ئــەی موحەممــەد، یــان ئــەی کوڕی عەبــدوڵلا. یــان ـ بــاوکی قاســم ـ بــەڵکوو بەشــێوەیەك بــانگی بکــەن ڕێــزو حورمــەت بگەیــەنێ، بــەدەنگی نزمــەوەو بەشــێوەی ئــەدەب‌و حیشمەتەوه بانگی بکەن (یارسول الله) (یانبی الله) دەبێ بەوپەڕی ڕێزەوه بــانگی بکەن، لــەبانگ کردنەکــەتان دا دیــاربێ کــەدڵ‌و دەروونــی داگیــر کــردون‌و خۆشــتان دەوێ‌و بەویقاره لاتان.

یان دەگونجێ مانای ئایەتەکە بــەم جۆره بێ: (ئــەی موســوڵمانینە! ئێــوه بــانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ کەبانگتان دەکا وەکوو بانگکردنی خەڵکی تر سەیری مەکــەن‌و وابزانن: وەکوو بانگ کردنــی هەنــدێکتان وایــەو دەتــوانن نەچــن‌و ڕوی لێ هەڵکــەن‌و گوێ ی پێ نەدەن. نەخەیر وانیە بەڵکوو بەپیرەوه چوونی بانگ کردنــی پێغەمبــەر واجبەو بەجێ هێشتنی کۆڕو مەجلیسی ئەو بەبێ ئیزنی خۆی تاوانە!)

ئەمجار پەروەردگار هەڕەشە لەمونافیقەکان دەکاو دەفــەرموێ: ﴿قَــدْ يَعْلَــمُ اللَّــهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِــوَاذاً﴾ وشــەی (قــد) لێــرەدا بــۆ تــەحقیق‌و چەسپاندنە. واتــە: خــودا زانــاو ئاگــاداره بــەو دووڕوانــەی کــەخۆیان لــەکۆڕو مەجلیــسی پێغەمبــەر ﷺ دەدزنەوەو یەکەیەکە خۆیان باریك دەکەنەوه، بەبێ ئیزنــی پێغەمبــەرو ڕوخــصەت لێ وەرگــرتن لەمزگــەوت‌و کــۆڕو کۆبوونــەوەی دزه دەکــەن‌و یەکتردەکەنــە مــەتاڵ‌و پەردەو هەندێکیان خۆ دەخەنە پەنا هەندێکیانەوه (قەلفڕی لێ دەکەن!).

ئــەبوداود ڕیوایــەتی کــردوه دەڵــێ: مونافیقــەکان پێیــان نــاخۆش بــوو گوێیــان لەوتاری پێغەمبەر ﷺ بێ، یان لەکۆڕو کۆبوونەوەیدا ئامادە بــن، هــەر: کە یــەکێك ئیزنــی چــونەدەرەوەی لێ وەردەگــرت خێــرا کابرایــەکی مونــافیق خــۆی دەخــستە تەنیشتیەوه بۆی دەردەچوو.

﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بابترسن ئەوانەی سەرپێچی فــەرمانی پێغەمبــەر دەکــەن، بــەنهێنی یــان بەئاشکرا دەیانــەوێ ســنور شــکێنی بکــەن، هــەوڵ دەدەن پابەنــدی فــەرمان‌و جڵەوگیریــەکانی نــەبن،

پـەیڕەوی شـەریعەتو ئامۆژگاریـیـەکانی نەکـەن، بابترسن لـەوەی: کەتووشـی بـەڵاو فیتنەو ناخۆشی ببن، یان لەقیامەت دا دوچاری عەزابی بەئێشی دۆزەخ ببن.

بائەوانەی لەڕیزی کۆمەڵی پێغەمبەر خۆیان دەدزنەوە، بۆ دەسکەوتنی سودی دونیایی، یان بۆ ئەوەی لەزەرەرو زیانێك خۆیـان بپارێزن، بابترسـن لـەوەی تووشـی فیتنەو ئاشوبێك ببن پێوەرەکان بشێوێنن، سەنتەر تێك بچێو حەقو بەتاڵ تێکەڵ بەیـەکتر بـبنو تـەڕو وشـك پێکـەوە بـسووتێنو ژیـانی کۆمـەڵ تێـك بچێو ئـەمنو ئاسایش نەمێنێو ژیان ئەستەم بێ، هەموو کەس بکەوێتە تەنگو چەڵەمەوە. یـان سزایەکی توندو تیژ لـەدونیاو قیامـەت دا لەتۆڵـەی ئـەو موخالەفـەو سەرپێچی یـە یەخەیان پێ بگرێ.

کۆتایی هەڕەشەکەو کۆتایی سورەتەکەش بەوە دێنێ: کەخودا ئاگاداری دڵە بڕوا دارەکانو دڵە پڕلەکوفرو نیفاقەکانە، دەزانێ چییان تێدایەو چییان لەناو خۆیان دا حەشارداوە دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ قَدْ يَعْلَمُ مَـا أَنـتُمْ عَلَيْـهِ﴾ دوبارە وشەی (قد) بۆ تەحقیقو چەسپاندنە. واتە: ئاگادار ببنەوە، بـزانن هەرچی لەئاسمانـەکانو زەوی‌ـدا هەیـە، بـەدیهێنراوو ملکـی خـودان، تـاوو تـوێ کـردنو هەڵسوڕانو فەوتانو دروست کردنیان، کەم بوونو زۆر بونیان.... هەمووی بەدەست خودایە، هەرچی نهێنیو ئاشکرایەك هەیـە هـەموو لای خـودا نمایانـە، دەی کـەوابێ چۆن بەهەڵسو کەوتی دووڕووەکان نـازانێ!؟ بائـەو مونافیقانـە بـاش بـزانن ئـەوان چـەندێك هـەوڵ بـدەن تاوانـەکانیان پـەردە پـۆش بکـەنو زێـدەڕەوی بکـەن لەشـاردنەوەی کـردەوە ناشـرینەکانیان خـودا پێیـان دەزانـێو بەئەنـدازەی گەردیلەیـەکی لێ گوم نـابێ. بێگومـان ئاگادارە بـەو بیروبـاوەڕەی ئێـوەی لەسـەرن، وەکوو لەئایەتێکی تردا ئاماژەی پێ دەکاو دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا يَعْـزُبُ عَـن رَّبِّـكَ مِـن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَـابٍ مُّـبِينٍ﴾ (یونس/٦١)

﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُـونَ إِلَيْـهِ فَيُنَبِّـئُهُمْ بِمَـا عَمِلُـوا﴾ ئـەو ڕۆژەی دەگەڕێندرێنـەوە بـۆلای خودا: کەڕۆژی قیامەتە، هـەواڵیان دەداتـێ بـەوەی لـەدونیادا کردویانـە بـەو کـوفرو

نیفاقــەی لــەناو دڵــی خۆیــان دا حەشــاریان داوە. پــڕاو پــڕ ســزایان دەداتــەوە. ئادەمیزادەکان چیيان کردەوە دێتەوە پێشیانو پاداشو سزای لەسەر وەردەگرنەوە.

کــەس ستــەمی لێ نــاکرێ، هەرکەســە بــەگوێرەی کــردەوەو گوفتــاری، بــەپێ ی هەڵسو کەوتو بیرو باوەڕی سزاو پاداش وەردەگرێتەوە ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ خودا بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە، ڕۆژی قیامەت بەنـدەکان بـەرەو ڕوی زانیـاری خـودا دەبنـەوەو هیـچیان بـۆ ناشـێردرێتەوە. لـەو ڕۆژەدا دادگـایی کـردن تـەنها بـۆ خودایەو خۆی سەرەنجامی ئادەمیزاد بەچاكو خراپیانەوە یەكالا دەكاتەوەو لێکیان هەڵدەوێرێ.

## کۆتایی سورەتی (النور)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سورەتی (الفرقان)

ئەم سورەتە نـاونراوە (الفرقـان ) چونکە بەسوپاسو ستایـشی ئـەو خودایـەی قورئانی ناردۆتە خوارێ بۆ سـەر ڕەوانـەکراوی خۆی؛ حـەزرەتی محمـد ﷺ دەست پێ دەكا. قورئانی پـیرۆز گـەورەترین نیعمـەتی خودایـە بـۆ ئـادەمیزاد، پـەروەردگار بــەو قورئانــە حــەقو بــەتاڵی لێــك جیاکردۆتــەوە، کردویــەتی بــە بەرنامــەو پرۆگرامی بونەوەر، كەتەلۆكی جیهانەو بەرنامەی ژیانە.

**موناسەبەو پەیوەندی ئەم سورەتە بەسورەتی ( النور )ەوە لەچـەند رویەکەوەیـە : هەرەگرنگەکان ئەمانەن:**

١- سـورەتی (النـور) بـەوە کۆتـایی هـات : کـەخودا خـاوەنی هـەموو بونـەوەرە، سورەتی (الفرقان)یش بەتەعظیم گرتنو تەقدیس کردنـی ئـەو خودایـەی خـاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە، بێ هاوەڵ منداڵو خێزانە دەست پێدەكا.

٢- لەکۆتایی سورەتی (النور) دا پەروەردگار ئەوەی راگەیاند : کە بەگوێکردنی فەرمان‌و جڵەو گیریەکانی پێغەمبەر ﷺ شتێکی واجبەو پێویستە موسوڵمانەکان پابەندی بن‌و بەموو خۆی لێ لانەدەن. لەسەرەتای سورەتی (الفرقان) یشدا وەصفی ئەو قورئانە دەکا: کەدەستورو بەرنامەی پەیامی پێغەمبەرە.

٣- سورەتی (النور) باسی ئیلاهیات دەکاو سێ بەڵگە لەسەر تاك‌و تەنهایی خودا دێنێتەوە، حاڵ‌و وەزعی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و دیاردە جۆراو جۆرەکانی بەرزایی وەکوو باران بارین‌و چۆنیەتی دروست بوونی بەفرو تەرزە، هەروا حاڵ‌و وەزعی گیانلەبەران، دەکاتە بەڵگە لەسەر بەتوانایی‌و دانایی خودا.

لەسورەتی(الفرقان )یش دا: کۆمەڵێك مەخلوقات دەکاتەنیشانەو بەڵگەی تاك‌و تەنهایی خودا، بۆ نمونە درێژ بوونەوەی سێبەرو گۆڕانی شەوو رۆژو چۆنیەتی هەواو ئاوو جۆرەکانی ئاژەڵ‌و لێکدانی دەریاکان‌و دروست کردنی ئادەمیزادو نژادو دروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەوی لەماوەی شەش رۆژدا و کۆنترۆڵکردنی عەرش لەلایەن پەروەردگارەوە، هەروا بورجەکانی ئاسمان، روناکی خۆرو مانگ.. هەموو ئەمانەشیکردنەوەو تەفسیرکردن‌و درێژە پێدانی ئایەتی ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ی یە.

٤- لەهەردوو سورەتەکەش دا وەصف و چۆنیەتی کردەوەی کافرەکان‌و مونافیقەکان دیاری دەکا. لەسورەتی (النور)دا دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ﴾. لەسورەتی (الفرقان )یش دا دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُوراً﴾ (الفرقان/٢٣).

ناوەرۆکی سورەتەکە بەشێوەیەکی گشتی، وەکوو باقی سورەتە مەککیەکانی‌تر، گرنگی دەدا بەبنەماکانی عەقیدەو جەخت دەکاتەوە لەسەر یەکتاپەرستی‌و راستی پێغەمبەرایەتی‌و چۆنیەتی رۆژی قیامەت.

سەرەتا تاك‌و تەنهایی خودا دەسەلمێنی‌و راستی قورئان‌و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد ﷺ تەئکید دەکاتەوە. زیندوبونەوەو حیساب‌و کیتابی رۆژی قیامەت شیدەکاتەوە، قەشمەری بەبیرو بۆچونی موشریك‌و بت پەرستەکان دەکاو، نەفامی ئەوانە رادەنوێنێ کەدەڵێن: خودا منداڵی هەیە، بڕوایان بەقیامەت‌و زیندوبونەوە نیە، هەڕەشەیان لێدەکا بەوەی توشی جۆرەها سزای توندو تیژیان دەکا.

ئەمجار هەندێ چیرۆکی پێغەمبەرانی پێشومان بۆ دەگێڕێتەوەو هەڵوێست‌و بەدرۆ خستنەوەی ئەو گەل‌و نەتەوانە بۆ پێغەمبەرەکانیان‌و سەرەنجامی پێغەمبەرو نەتەوەکان رون دەکاتەوە.

شێوەی لەناوچونی نەتەوە سەرپێچیکارو بەدرۆخەرەوەکان‌و جۆرەکانی سزای ریشەکێش کاریان رادەنوێنی‌و دەیانکاتە پەندو عیبرەت بۆ گەل‌ونەتەوەکانی دوایی، بۆ ئەوەی بەخۆیاندا بچنەوەو ئەو هەڵەو هەڵوێستە ناشیرینەی ئەوان تێی کەوتون‌و نواندیان ئەمان تێی نەکەون‌و بەمەرەدی ئەوان نەچن.

هەروەها چەند بەڵگەی جیا جیا دێنێتەوە لەسەر بەتوانایی خوداو تاك‌و تەنهایی زاتی پاکی، بونەوەری سەیرو سەرنج راکێش دەکاتە نیشانەی کارسازی پەروەردگار، دیاردەکانی بونەوەرو قەبارە جۆراو جۆرەکانی ناوی، بەمانگ‌و خۆرو زەوی‌و ئاسمانەکان‌و دەریاو چۆنیەتی باران بارین‌و هەڵکردنی (با) پێش باران بارین، هەروەها بورجەکانی ئاسمان‌و هاتو چۆی شەوو رۆژ یەك بەدوی یەك دا هەموو ئەمانەو شتی تریش دەکاتە بەڵگە لەسەر هەبوونی خودای باڵادەستی کارسازی کار دروستی بێ هاوەڵ‌و منداڵ‌و خێزان.

کۆتایی سورەتەکەش بەرانواندنی هەندێ رەوشتی پەسەندی بەندەراستاڵەکانی خودا دەهێنێ‌و ئەوە رادەگەیەنێ کەئەوانە شیاوی رێزو پاداشتی پەروەردگارن.

## نازڵكردنی قورئانو تاكو تەنهایی پەروەردگار

﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ ﴾

پەروەردگار كردنەوەی ئەم سورەتە بەباسی سەلماندنی خودای بەدیهێنەر دەست پێكردوە، وەصفی پەروەردگاری بەصیفاتی جەلالوكەمال كردوە.

دەستپێكردنی سورەتەكە بەوشێوەیە ئاماژەیە بۆ باسی سەرەكیو گرنگی سورەتەكە. ئەوە دەگەیەنێ كەنازڵكردنی قورئان لەلایەن خوداوەیەو پێغەمبەری ئیسلام پێغەمبەری هەموو ئادەمیزادە بەگشتی، پەروەردگاری بونەوەر تاكو تەنهاو بێ منداڵو خێزانە، بێ هاوەڵو وەزیرە.

دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً﴾ بەرزو پیرۆزو خاوەن خێرو فەرە، ئەو خودایەی قورئانی نازڵ كردوە بۆ سەربەندەی خۆی: كەرەوانە كراوە بۆ سەر هەموو ئادەمیزادو خاتەمی پێغەمبەرانە. بۆئەوەی بەو قورئانە پڕ فەڕو بەرەكەتە عالەمی ئادەمیزادو عالەمی جندۆكە بترسێنێ،

ترسێنەرو موژدەدەربێ، سەرپێچیکاران لەسزای خودا بترسێنێ موژدەی بەهەشت بدا بەوانەی پابەندی پەیامەکەی دەبن.

مەبەست بە(عبده) حەزرەتی محمەدە ﷺ ئەمەش رێزلێنانە لەپێغەمبەر، چونکە ئەوپەڕی پلەوپایەی ئادەمیزاد ئەوەیە: عەبدی خودابێ بۆیە پەروەردگار لەهەر شوێنێکدا شوێنەکە شوێنی رێزلێنان بێ لەپێغەمبەر بەوشەی (عبده) ئاماژەی بۆ کردوە.

ئەوەتا لەسورەتی (الكهف) یشدا: کە باسی رێزلێنانە لەپێغەمبەر ﷺ بەوە: کەقورئانی بۆ ناردوە بەوشەی (عبده) ئاماژەی بۆ کردوە، دەفەرموێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا﴾ (الكهف /١) لەباسی ئیسراو شەوڕەوی کردن بە پێغەمبەر ﷺ هەر بە(عبده) ناوی هێناوە .﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ......﴾ کە لەمەقامی دوعاو پارانەوەش دا ناوی پێغەمبەر ﷺ دێنێ بە (عبده) ناوی دێنێ دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ......﴾ (الجن/١٩).

قورئانی ناو ناوە (الفرقان)چونکە حەق و بەتاڵ لێك جیادەکاتەوە، هیدایەت و گومڕایی دیاری دەکا، جوداوازی دەخاتە نێوان، رێبازی ژیانی بەختەوەری و ژیانی بەدبەختی، سەردەمەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە لەم روەوە کە قورئان مەنهەجی ژیان نەخشە کێش دەکا، مەنهەجێکی جێگیر لەدڵ و ویژداندا، گونجاو لەگەڵ واقیعی ئادەمیزاد دا.

مەنهەجێك: کە لەهیچ مەنهەجێکی لەوە پێشی ئادەمیزاد ناکا، مەنهەجێك: کەنیشانەی سەردەمێکی تازەیە بۆ ئادەمیزاد، لەوە پێش پێی ئاشنا نەبوون، کەوابوو قورئان (فورقان)ە بەم مانا قوڵ و گەورەیە، کۆتایی بەسەردەمی ژیانی منداڵی ئادەمیزاد هێناوەو خستویەتیە سەردەمی ژیری و هۆشیاریەوە، کۆتایی بەدیاردەی پێغەمبەرایەتی کاتی و ناوچەیی و نەتەوەیی هێناوە، سەردەمی پێغەمبەرێکی رەوانەکراو بۆ سەرهەموو ئادەمیزادو جندۆکەو دوا پێغەمبەرو

سەروەری هەموو پێغەمبەرانە، کەوابوو جێی خۆیەتی بە قورئان بوترێ: (فورقان)، فورقانی نێوان سەردەمەکانی تەمەنی ئادەمیزاد، جوداکەرەوەی نێوان حەق‌و بەتاڵ، هیدایەت‌و گومڕایی‌و حەلاڵ‌و حەرام.

**ئەمجار چوار وەصفی شکۆمەندی کیبریاء بۆ خودا رادەنوێنی‌و دەفەرموێ:**

١- ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەو خودایەی کە لەراستیدا موڵکایەتی‌و خاوەنیەتی ئاسمانەکان‌و زەوی هەرهی ئەوە، دەسەلاتی بەدیهێنان‌و فەوتاندن‌و رەدام هێنان هەرهی خۆیەتی، بەویستی خۆی چۆنی بوێ ئاوا هەڵیان دەسوڕێنێ، ژیان بەخشین‌و مراندن، تەحلیل‌وتەحریم...تەنها بەدەست خۆیەتی‌و بەس هەموو بونەوەر ئاتاجی پەروەردگارە، هەموو مەخلوقات موحتاجی خودان، ئەو بەدی هێناون ئەوکات‌و شوێنی پەیدابوون‌و تەمەنی مانەوەو کات‌و شوێنی لەناو چونیان دیاری دەکا.

٢- ﴿وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً﴾ هەرگیزاو هەرگیز بەهیچ شێوەیەك مندالی بۆ خۆی بڕیار نەداوە، هەبوونی منداڵ لەگەڵ پلەو پایەی خودایەتی ناگونجێ، پێویستی بە منداڵ نیە، چونکە پێویستی بەمنداڵ نیشانەی کەم‌و کوڕییە، خودا بۆ خۆی کەمالی موتڵەقی هەیە، پێویستی بەهیچ شتێك نیەو هەموو شتێکیش ئاتاجی ئەوە. ئەمە رەتدانەوەی جولەکەو مەسیحی و عەرەبە موشریکەکانە، کەدەیانگوت: خودا منداڵی هەیە. جولەکە دەیانگوت: عوزەیر کوڕی خودایە، فەلە دەیانگوت: عیسا کوڕی خودایە، عەرەبەکان دەیانگوت: فریشتە کچی خودان.

وەکوو قورئان لەشوێنێکی تردا لێیانەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللَّهِ﴾ (التوبة/٣٠) یان دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ، أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثاً وَهُمْ شَاهِدُونَ، أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ، وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ، أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ ؟﴾ (الصافات/١٤٩-١٥٣).

٣- ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ﴾ شەریكو هاوبەشی نیە لەخاومنیەتیو دمسەلاتداریو فەرمانڕەوایی دا. تاكو تەنهایی لەخودایەتی دا، هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ کردنو بەندایەتی بۆکردنە، هەرکاتێ بەندەکانی بڕوایان بەخودا گەیشتە ئەو ئاستەو لە(ئولوهیەتو ربوبیەت)دا بەبێ هاوەڵو بێهاوشانیان زانی، هەموو پاڕانەوەو داوایەکیان ئاڕاستەی خودا دەکەنو هەر لەو دەترسن دڵیان بەیادو زیکرو ترس لەو مەشغوڵ دەبێ، چاوەڕوانی ڕەحمەتو بەخششی خودا دەبن، هەرخودا بەشیاوی لێ ترسانو بەندایەتی بۆ کردن دەزانن.

بەم رستەیە رەددی ئەوانە دەداتەوە: کە بڕوایان بەهەبوونی دووخودا هەیە بۆ بونەوەرو لەعیلمی کەلام دا پێیان دەگوترێ: (ثنویة)و خودای روناکیو خودای تاریکی بڕیاردەدەن، هەروا ڕەددی ئەستێرە پەرستانو بتپەرستەکان دەداتەوە: کە پێیانوابوو: بتو صەنەمو ئەستێرەکان شیاوی پەرستش بۆ کردنن. تەنانەت عەرەبەکان کە بەدەوری کابەدا تەوافیان دەکرد ئەم شیعارەیان دەگوتەوە (لبيك لاشريك لك، الا شريكا هو لك تملكهم ومامالك ).

ئیتر پەروەردگار بەم دوورستەیەی پێشوو پاكو خاوێنی خۆیو بەرزو پیرۆزی خۆی لەوەی کە منداڵی هەبێ، یان شەریکی هەبێ راگەیاند.

٤- ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾ هەموو شتێك -جگە لەخۆی- هەمووی لەنەبوونەوە بەدی هێناوە، قەبارەو شێوەی مەزندەکردون، گونجانی هەموو شتێکی لەگەڵ شتەکانی تر بەرچاو گرتوە، هەموو مەخلوقاتی بەیەکەوە گونجاندوە.

بۆنمونە ئادەمیزادی بەو شێوەو شکڵو شێوازە دروست کردوە، هەستو هێزو توانای جیا جیای تێدا خولقاندوە، هێزی بیرو بۆچونو تێگەیشتنو شت بەیەك گرتنو بەرامبەری کردنی تێدا داناوە، هەروا گیانلەبەری ترو قەبارە بێ گیانەکان، هەریەکەیان بەشێوەیەکی مەزندەکراوو حیکمەت ئامێز هێنراوەتە گۆڕەپانی بونەوەر!

پێکهێنانی بونەوەرو پێکهاتەی هەموو شتێکی ناو بونەوەر سەرسوڕهێنەرو جێگای سەرنجدانن‌و بیرۆکەی (موصادەفە) ڕەت دەکەنەوە، فیکرەی صودفە دەپوچێننەوە، هەتا زانیاری پێش بکەوێ‌و زانایان بتوانن بونەوەر بپشکنن، زیاتر تەناسوق‌و پێکەوە گونجانی مەخلوقاتی ناوبونەوەر دەردەکەوێ، پتر مەزمەندەو نەخشەی یەزدانی تێیان دا هەست پێدەکرێ. دەردەکەوێ ئەم بونەوەرە چەندە بەدیققەت بەدی هێنراوەو چەندە شتەکانی پێکەوە گونجاون.

خۆئەگەر توێکڵی زەوی چەند پێیەکی تر لەم ئەندازەیەی؛ کە هەیە ئەستورتر بوایە، (ثاني أكسيد الكاربون)و ئۆکسجینی هەڵدەمژی، ژیانی زیندەوەرو روەك‌و درەخت دەفەوتا، ژیان نەدەبوو.

ئەگەر (هەوا) تۆزێك بەرزتر بوایە لەو ئەندازەیەی ئێستای، هەندێ لەو تیر ئەستێرانەی: کە بەملیۆنەها لەهەوای خارجیدا دەسوتێن رێی گۆی زەوی دەکەوتن‌و لێی دەخشان، خێرا رۆیشتنی ئەم تیر ئەستێرانە لەچرکەیەکدا (٤٦) ملیۆن میلە، ئیتر ئەوکاتەبەسەر هەرشتێکدا بڕۆشتنایە: کە قابیلی گرگرتن بوایە گری تێ بەردەبوو، خۆئەگەر بەخێرایی گوللەی تفەنگێك بڕۆشتنایە ئەوە لەگەڵ زەوی لێکیان دەداو سەرەنجام ترسناك دەبوو.

قەبارەی هەوا بەدەوری زەوییدا ئەوەندەی پێویست ئەستورە، واتە ئەوەندە ئەستورە: کە تیشکە خاوەن کاریگەرە کیمیاویەکان پێویست بۆ بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ بەناوی دابێن‌و بچن، ئەوتیشکانە بەکتریاکان دەکوژن‌و ڤیتامینات بەرهەم دەهێنن بەبێ ئەوەی ئەو تیشکانە هیچ زیانێك بەئادەمیزاد بگەیەنن مەگەر زیاد لەپێویست خۆیان بەربدا.

سەیرە بەدرێژایی رۆژگار ئەوهەموو جۆرە گازانە لەزەوی بەرزدەبنەوەو زۆربەشیان ژەهراوین، کەچی هەوا پیس ناکەن‌و گۆڕانکاری لەرێژەی ئەوهەوایەدا کە پێویستە بۆ ژیانی ئادەمیزاد پەیدانابێ، ئامێری ئەو لەنگەر راگریەی نێوان رێژەی گازەکان‌و پیس نەبونی هەوا، هەبونی ئەو مەساحە گەورەوپان‌و پۆڕمیە کە

لەهەبوونی ئۆقیانوسەکانو دەریاکان دا خوێ دەنوێنێ، بەهۆی ئاوی ئەو ئۆقیانوسو دەریایانە ژیانو بژێوو هەوای موعتەدیل بۆ دارو درەختو روەكو گیانلەبەران دەستە بەر دەبێو دەتوانن درێژە بەژیانو گەشەکردن بدەن.

ئەگەر رێژەی ئۆکسجین لەجیاتی ٢١٪ پەنجا لەسەد یان زیاتر بوایە ئەوکاتە هەموو ئەو مادانەی قابیلی سوتانن، لەوانەبوو یەکسەر گڕبگرن بەجۆرێك نزیك دەبوو یەکەم چەخماخەی بروسکە: کە لەدرەختێك دەدا یەکسەر بێشەڵانەکان گڕبگرن، خۆئەگەر رێژەی ئۆکسجین لەسەدا١٠٪ بوایە، لەوانەبوو ژیان خۆی لەگەڵ بگونجاندایە، بەڵام لەوانەبوو ئاگرو گەرما؛ کەهۆی شارستانیو ئاوەدانین کەم دەست بکەوتنایە!!

مامۆستا سەیید لەم بارەوە نمونەیەك دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: پێش چەند سالێکی دورو درێژ لەوڵاتی ئوستورالیا درەختی (صبار)یان رواند بۆ پەرژینو سیاجی هەندێ باخ و زەوی، بەڵام ئەم درەختە بۆخۆی پێوە دەچوو بەسەرزەمینی ئوستورالیا دا بڵاودەبوەوەو رۆژ بەرۆژ پەرەی دەساند، هێندەی پێنەچوو پانتاییەکی بەئەندازەی پانتایی ئینگلتەرەی داپۆشی و تینی بۆ کشتوکاڵی دانیشتوان هێنا، کشتو کاڵی داپۆشینو هەندێ زەویو زاریوالێکرد بەکەڵکی کشتوکاڵ نەدەهات.

کشتیارەکان هەرچیەکیان دەکرد دەرەقەتی نەدەهاتن، وای لێهات ئوستورالیای پانو پۆرو بەرفراوان کەوتەبەر خەتەری هێرشی بێدەنگی ئەودرەختە تەشەنەکەرە، رۆژ بەرۆژ بەسەرزەمینی ئەو وڵاتەدا بڵاودەبوەوە هیچ شتێك نەبوو بەرگری بکاو ببێتە لەمپەڕ لەبەردەم بڵاوبونەوەی دا.

زانایانی زانیاری حەشەراتناسی کەوتنەخۆ بەجیهاندا بڵاوبونەوە تا لەئاکام دا حەشەرەیەکیان دۆزیەوە: کە تەنیا بژێوی لەسەر ئەودرەختەبوو، جگە لەو درەختە هیچی تری نەدەخوارد ئەوباڵە فرۆکەش بەزوویی گەرای دەکردو خێرا بەوڵاتدا بڵاودەبوەوە.

ولآتــی ئوســتورالیاش  وارێکــەوتبوو حەشــەرەیەکی تێــدا نــەبوو دژی ئــەو حەشەرەیەبێ، ئەو حەشەرەیان هێنایە نـاو ولآتـی ئوستورالیاو پـەروەردەیان کـرد، زۆری پێنەچوو قەلآچۆی ئەو درەختە ناهەموارەی کردو پاشان گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان، ئەندازەیەکی کەم نەبێ لەئوستورالیا مانەوە ئەویش بۆ پاراستنیولآت لـەو درەختەو بەربەست کردنی بلآوبونەوەی.(١)

هەروا رۆژ لەدوای رۆژ زانستی ئادەمیزاد بەشێك لەو نەخشەو پلانـەی خودا؛ مەزندەی کردوە لە بونـەوەرداو دایڕشتـوە دەردەکەوێو خـەڵکی کـەمێك لـەمانای فەرموودەی پەروەردگار کە لەفورقانی خۆی دا تۆمـاری کـردوە ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾ حاڵی دەبنو پەی بەلایەنێکی ئەو مانایە دەبەن!

بەلآم وێڕای ئەم راستیانە ئەو موشریکانە هیچ بەخۆیان دا نەچونەوەو پەندو عیبرەتیـــانوەرنەگرت. هـەرچـــەندە پەروەردگـــار خـــاوەنـــی صــیفاتی جەلالوکەمالــە، ئەوپــەڕی شــکۆمەندیو بــەرزی هەیــە، عیــززەتو باڵادەســتی بەرفراوانو بێ سنورە.

کەچی ئەونەفامانە ﴿وَاتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً﴾ چەند خودایـەکیان بڕیـارداوە جگەلەخودا بەندایەتیان بۆ دەکەن، هەرچی نیشانەی خودایەتی هەن لەوان دانیە،

**واتە ئەو خودا درۆزنانە شیاوی خودایەتی نین چونکە لەچوار لاوە کەمو کورتیـان تێدایە:**

١- ﴿لا يَخْلُقُونَ شَيْئاً﴾ هیچیان پێدروست ناکرێ، دەی خـودای حـەقو راسـت دەبێ توانای دروستکردنو بەدیهێنانی هەبێ.

٢- ﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ ئەوانـە بۆخۆیـان دروسـتکراون، دروسـتکراویش ئاتـاجی دروستکەرە، دەی خودای حەقو راست دەبێ ئاتاجی بەکەس نەبێ.

٣- ﴿وَلا يَمْلِكُونَ لأَنفُسِهِمْ ضَرّاً وَلا نَفْعاً﴾ ئەوانە بۆ خودی خۆیـان دارای قـازانج و زیان نین، ناتوانن زیان لەخۆیان دور بخەنـەوەو، قـازانج بـۆ خۆیـان کێش بکـەن،

جاكە بۆ خۆیان دورخستنەوەی زیانو كێشكردنی قازانجیان بۆ دەستەبەر نەبێ، دیارە بۆ غەیری خۆیان هەرنا! هەرشتێكیش بۆ خۆیو بۆ غەیری خۆی دارای زیانو قازانج نەبێ هیچ فائیدەیەك لەعیبادەت كردنی دانیە.

٤- ﴿ وَلا يَمْلِكُونَ مَوْتاً وَلا حَيَاةً وَلا نُشُوراً﴾ توانای مراندنو ژیان بەخشینو دروستكردنەوەی مردوانیان نیە، جاشتێك ئەوە سیفەتو رەوشتی بێ چۆن دەشێ پێی بگوترێ خودا؟

بەكورتی ئەو خودا درۆزنانە، ئەو بەخودا زانراوانە، لەهەموو سیفەتێكی خودایی روتن، هیچ رەوشتێكی وایان تێدا نیە لەرەوشتی خودابچێ، هیچیان بۆ دروست ناكرێ بەڵكوو بۆ خۆیان دروستكراون، دارای زیانو قازانجیش نین نەبۆ خۆیان نەبۆ غەیری خۆیان.

بەكورتی پەروەردگار خودایەكی تاكو تەنهایە، لەهەموو كەس بێ ئاتاجە، هەموو كەس ئاتاجی ئەوە لەكەس نەبووەو كەسی لێ نەبووە، كەس هاوكوف نیە، هیچ خودانین جگە لەئەو، هەر ئەو شیاوی پەرستش بۆ كردنە هەرئەو بەدیهێنەرە، هەرچی ئەو بیەوێ ببێ دەبێ، هەرچی نەیەوێ ببێ نابێ، خاوەنی صیفاتی جەمالوكەماڵە كەسێك ئەو بناسێ بەندایەتی بۆ بكا پابەندی فەرمانو جڵەوگیریەكانی بێ بەختەوەری دونیاو قیامەتە!!

بتپەرستو موشریكەكان گومڕابوونو سورن لەسەر گومڕایی، عیبادەت بۆ غەیری بەدیهێنەر دەكەن، عیبادەت بۆ شتیوادەكەن دارای زیانەو قازانجی نیە بۆ خودی خۆی! بەڵكوو لەعیبادەت كەرەكان بێ دەسەڵات ترن!!

## هەڵوێستو رەخنەی موشریكەكان لەقورئان

﴿وقال الذين كفروا إن هذا إلا إفك افتراه وأعانه عليه قوم آخرون فقد جاءو ظلما وزورا ﴿٤﴾ وقالوا أساطير الأولين اكتتبها فهي تملى عليه بكرة وأصيلا ﴿٥﴾ قل أنزله الذي يعلم السر في السموات والأرض إنه كان غفورا رحيما ﴿٦﴾﴾

دەربارەی نازڵبوونی ئەم ئایەتە كولەبی "موقاتیل" دەڵێت: مەبەست (النضر)ی كوڕی (الحارث)ە، ئەوەبوو؛ پڕماندی: كە قورئان دەست هەڵبەستە، مەبەستیش بە ﴿وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ﴾ (عەداس‌و یەسارو جەبر )ە ئەم سێكەسە ئەهلی كیتاب بوون، تەوراتیان دەخوێندەوە هەواڵ‌و ئەحكامیان لێوە نەقڵ دەكرد. جا كە موسوڵمان بوون پێغەمبەرﷺ زۆر لەگەڵیان ئاخاوتنی دەكردو لەگەڵیان كۆدەبوەوە. ئیتر (النضر) ئەوبوختانەی پڕماند.

پەیوەندی ئەم كۆمەڵە ئایەتە بەهی پێشەوە ئەوەیە: پەروەردگار لەئایەتەكانی پێشودا باسی یەكتا پەرستی كرد. بیرو بۆچونی بت پەرستەكانی رەتكردەوە، ئەمجار دێتە سەرباسی پێغەمبەرایەتی‌و رەخنەو تانەی موشریكەكان: كەئاڕاستەی قورئان‌و پێغەمبەرایەتی حەزرەتی موحەممەدیان دەكرد ئەو واقیعە رادەنوێنی‌واتە دوای دەستدرێژی كردنیان بۆ سەرمەقامی خودا دەستدرێژی دەكەنە سەر مەقامی پێغەمبەرﷺ.

دوایی بەشێوەیەکی گاڵتە پێکردن ڕەددیان دەداتەوە، نەفامیو کەودەنییان دەخاتە روو: دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلاَّ إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ﴾ ئەو کافرو موشریكو نەفامانە دەڵێن: ئەم قورئانە جگە لەدرۆیەکی هەڵبەستراو هیچی ترنیە، موحەممەد خۆی هەڵی بەستومو کۆمەڵێکی تریش یارمەتی دەدەن، ئەوانەی ئەهلی کیتاب بوونو ئێستا ئیمانیان بەموحەممەد هێناوە شتی فێردەکەنو یارمەتی دەدەن بۆ کۆکردنەوەو هەڵبەستنی ئەم قورئانە!

ئەمجار خودا بیرو بۆچونەکەیان ڕەددەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ جَاءُوا ظُلْماً وَزُوراً﴾ بەراستی قسەیەکی پوچ و بێبناغەیان هێناوە، بۆ خۆیان دەزانن کە درۆ دەکەنو ئەوەی دەیڵێن درۆو ستەمە، هیچی بەسەر هیچەوە نیە، بێگومان درۆترین شت ئەوەیە: کافرەکانی قورەیش ئەو قسەیە بکەن، لەکاتێکدا ئەوان بۆ خۆیان لەناخی دڵیانەوە دەزانن قسەکەیان بێ بناغەیە.

ئەوان: بەتایبەتی هەستیارو پیاوماقوڵو ریش سپیەکانیان دەیانزانی ئەم قورئانەی موحەممەد بەسەریاندا دەخوێنێتەوە کەلامێکە جودایە لەکەلامی ئادەمیزاد، ئەوان بەهەستو چێژی خۆیان دەیانزانی ئەم کەلامە لەئاخاوتنی ئادەمیزاد ناچێ. نەیاندەتوانی پێی موتەئەثر نەبن، ئەوان شارەزای پێغەمبەر بوونو پێش پێغەمبەرایەتی دەیانناسیو لێیان رون بوو کە درۆ ناکاو خیانەتی لێ روونادا، ئەدی چۆن بەدەم خوداوە درۆ هەڵدەبەستێ، چۆن لەخۆیەوە شت پاڵ خودا دەدا ؟؟ وەلێ ترسی لەدەستدانی مەرکەزی کۆمەڵایەتییان پاڵی پێوە دەنان ئەم چاوڕاوو درۆو دەلەسانە لەناو جەماوەری عەرەبدا بڵاوبکەنەوە. هەوڵیان دەدا ئەم چاووڕاوە لەناو کەسانێیوادا بڵاوبکەنەوە: کە جیاوازی لەنێوان ئاخاوتنی موعجیزو قسەی ئاسایی دا ناکەن.

بەراستی ئەم قسەیان کە دەیانگوت: قورئان درۆیەکی دەست هەڵبەستەو کۆمەڵێکی تریش هاوکاری موحەممەد دەکەن بۆ دانانی، قسەیەکی هیچو پوچو

بێبناغەیە، شیاوی ئەوە نیە بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە! چونکە ئەگەر ئادەمیزادێکی وەکوو موحوممەد ﷺ بەهاوکاری کەسانێکی دیکە بتوانن ئەو قورئانە هەڵبەستن! ئەی چی ئەوانی مەنع کردوە: کەوێنەی ئەو قورئانە بخەنەروو. بائەوانیش بەکۆمەکی خەڵکی تر قورئانێکی ئاوا دابنێن و بەڵگەی پێغەمبەر پوچ بکەنەوە، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ تەحەددایان دەکاو ئەوانیش بۆریان خواردوەو جۆش داماون و دەستەوسان بوون!

هەربۆیەشە کە پەروەردگار لەم بارەوە موناقەشەیان ناکاو قسەپوچەکەشیان بەشیاوی ئەوە نازانێ ڕەددی بداتەوە، بەڵکوو بەم ڕستەیە لەدەمیان دەداو دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ جَاءُوا ظُلْماً وَزُوراً﴾ بێگومان ستەم و بوختانیان ئەنجام داوە، ستەمیان لەپێغەمبەر کردوە لەخۆیان کردوە، بوختانەکەیان ئاشکراو نمایانە پێویستی بەرەتدانەوەو بەڵگە بۆهێنانەوە نیە! بوختانەکەیان کوفرو ستەمێکی ئاشکرایەو درۆیەکی هەڵبەستراوە.

شوبهەو بوختانێکی تریان دەربارەی قورئان و پێغەمبەر ئەوەبوو: کە قورئان تۆماری کردوەو دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً﴾ کافرو موشریکەکان گوتیان: ئەم قورئانە چیرۆکە کۆنی پێشینانە درۆو دەلەسەی گەلونەتەوە پێشینەکانە کە لەچیرۆکە خەیاڵاوی و دەست هەڵبەستەکانیان دا تۆماریان کردوە، دەشوبهێتە چیرۆکی شانامەو حیکایەتی ئەسفەندیار.....موحەممەد بەهۆی ئەهلی کیتابەوە نوسیویەتەوەو بەیانی و ئێوارە بەدزیەوە بەسەریدا دەخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی لەبەری بکا، چونکە بۆ خۆی نەخوێندەوارە خوێندنەوەو نووسین نازانێ.

ئەوان گوێیان لەو چیرۆکانە دەبوو: کە قورئان بۆ پەندو عیبرەت و پەروەردەکردن و ڕێنومایی دەیانهێنی و هەموویان چیرۆکی ڕاست و واقعین لەحیاتی ئەوەی پێیان پەند ئامێزبن دەیانگوت: ئەم قورئانەی: کە ئەم چیرۆکانەی

لەخۆگرتون (أساطير الأولين)ە چیرۆكی خەیاڵپڵاوی پێشینانەو موحەممەد پاڵ خودایان دەدا! لەراستی دا ئەم بیروبۆچونەی موشریكەكان درۆو بوختانێكی تریانە، گومڕاییو موكابەرەو لادانە لەحەق.

بێگومان ئەوان راستگۆییو ئەمانەتپارێزی پێغەمبەریان لانمایان بوو، لەوەپێش دەیانناسی، چل ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەناویان دا ژیاوەو شارەزای ئاكارو رەوشتی بوون، تەنانەت لەبەر راستگۆییو راستاڵی نازناوی (محمد الأمين ) یان لێنابوو، دەیانزانی نەخوێندەوارەو نووسین نازانێ، كەچی كە پەروەردگار پلەو پایەی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیو سروشو نیگای بۆ نارد، دژایەتیان كرد و تۆمەتباریان كرد بەو شتانەی كەلێیان بێبەری بوو، بەدرۆزنیو بوختان كەر لەقەڵەمیان دا، سیحرو جادو بازییان پاڵ دا.

ئەو قورئانە كەیاسای بونەوەرەو بەرنامەی ژیانە بەچیرۆكە كۆنو خەیاڵپڵاویان حسێب دەكرد! كەدەیانگوت چیرۆكە كۆنینەی پێشینانە، ئاماژەی ئەوەیان دەكرد كە ئەو چیرۆكانە لەبەر زۆر كۆنیو تێپەڕبوونی رۆژگار بەسەریاندا ، موحەممەد نایانزانێ مەگەر حیكایەتخوان بۆی بخوێننەوەو پێی لەبەر بكەن!

ئەمجار پەروەردگار وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ﴿أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ئەو قورئانەی كە هەواڵو سەرگوزەشتەی رابوردوانی تێدایە خودایەك بۆ منی ناردوە، كە هەموو نهێنی ئاسمانەكانو زەوی دەزانێ، هیچ هەواڵو بەسەرهاتێكی پێشینانو دوایینانی لێ ون نابێ. هەواڵی نهێنیو ئاشكرای لەلا چون یەكن، ئەو قورئانە لەلایەن خودای زاناو داناوەیە، لەلایەن خودای ئاگادار بەسەر نهێنی ئاسمانو زەویەوەیە.

خودا لەكوێو حیكایەتخوان لەكوێ؟! حیكایەتخوان لەكوێو غەیبزانی ئاسمانەكانو زەوی لەكوێ؟! زانیاری حیكایەتخوان لەبەرامبەر زانیاری خودا وەكوو رێژەی دڵۆپە ئاوێكوایە لەبەرامبەر دەریای بێكەنار.

﴿إِنَّهُ كَانَ غَفُوراً رَحِيماً﴾ بێگومان خودا لێخۆشبوو خاوەن بەزەییە، لەروی ڕەحمەتی بەرفراوانی خۆیەوە قورئانی نازڵ کردوە، قورئان دیاردەی ڕەحمەتی خودایە، نابێتە هۆی خێرا هاتنی عەزاب بۆ سەرتان، هەربۆیەشە بەپەلە عیقابتان نادا و مۆڵەتی داون، خودا مۆڵەتی داون بۆ ئەوەی تۆبە بکەنو لەتاوانو کوفر پەشیمان ببنەوە. چونکەوێڕای ئەو هەموو تاوانو کوفر و ستەمەی کردوتانە ئەگەر تۆبە بکەنو بەدڵ پەشیمان ببنەوە بۆ لای خودا بگەڕێنەوە خودا لێخۆشبوو لێبوردوە، لێتان خۆش دەبێ.

وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ ثَالِثُ ثَلاَثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَـهٍ إِلاَّ إِلَـهٌ وَاحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، أَفَلاَ يَتُوبُونَ إِلَى اللّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (المائدة/٧٣-٧٤) یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ فَتَنُوا الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ الْحَرِيقِ﴾.(البروج/١٠).

حەسەنی بەصری دەفەرموێ: سەیری لوتف و کەرەمو سەخاوەتی خودا بکەن. ئەوان بەندە خۆشەویستەکانی دەکوژن، کەچی ئەو بانگیان دەکا بۆ تۆبە کردن بۆئەوەی ڕەحمیان پێبکا. ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوە: کە تۆبەی ڕاست تاوان هەڵدەوەرێنیو تاوانی لەوە پێش دەشواتەوە، ئەمەش بەشێکە لەکەرەمو فەزڵو بەخششی خودا.

## تانەو تەشەرو ڕەخنەی موشریکەکان لەپێغەمبەر ﷺ

﴿ وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ

يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَـٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا ﴿١٠﴾

دەربارەی سەبەب نزولی ئەم ئایەتانە ئیبنوئیسحاق‌و ئیبنوجەریر و ئیبنو لونزیر لەئیبنو عەبباسەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: عوتبەی کوڕی رەبیعە لەئەبو سوفیانی کوڕی حەربو (النضر)کوڕی (الحارث) و ئەبولبوحتوری کوڕی هیشام‌و (الأسود) کوڕی (المطلب ) و زەحمەی کوڕی (الأسود) و(الولید ) کوڕی (المغیرة) و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، وعەبدوڵڵای کوڕی ئومەییەو ئومەییەی کوڕی خەلەف‌و عاصی کوڕی وائیل‌و مونەبیهی کوڕی (الحجاج) کۆبونەوە، لەناوخۆیاندا هەندێکیان بەهەندێکیان گوت: چەند کەسێکی عاقڵ‌و زوبانلوس بنێرن بۆ لای موحەممەد قسەی لەگەڵ بکەن‌و دەمە دەمێ‌و دانوسانی لەگەڵ دا ئەنجام بدەن لێی بگەیەننە تین تائەوپەڕی قسەو موناقەشە لەگەڵی دابدوێن، ئەوانیش شاندێکیان پێکەوەناو ناردیان بۆ خزمەتی‌و وتیان: ئەوە پیاو ماقوڵانی گەلەکەت کۆبونەوەو هاتونە لات بۆ ئەوەی قسەت لەگەڵ دا بکەن.

ئیتر پێغەمبەر هات بۆلایان، وتیان: ئەی موحەممەد! ئێمەهاتین بزانین تۆ چیت دەوێ؟ ئەگەر ئەم داوایەت بۆ ئەوەیە دەوڵەمەندبییت ئەوە ئێمە لەماڵی خۆمان ماڵ‌و سامانت بۆ کۆدەکەینەوە، ئەگەر دەتەوێ ببیە گەورەو پیاو ماقوڵ

ئـه‌وه له‌ئێـستاوه ده‌تكـه‌ین به‌گـه‌وره‌و ریـش سـپی خۆمـان، ئه‌گـه‌ر ده‌ته‌وێببیـه فـه‌رمانڕه‌وا، ئـه‌وه ئێمـه ئامـاده‌ین پابه‌نـدی فـه‌رمان‌و نه‌هیـه‌كانت ببـین‌و تۆمـان به‌پاشای خۆمان قبوڵه!

پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: نه‌خێر ئه‌وه‌ی ئێوه ده‌یڵێن هیچیان له‌من دانین، ئه‌و په‌یامه‌ی بۆم هێناون بۆیـه بـۆم نـه‌هێناون سـامانی پێكۆبكه‌مـه‌وه، یـان ببمـه پیـاو ماقوڵ‌و ریش سپی، یان پاشایه‌تی پێده‌سته‌به‌ر بكه‌م به‌ڵكوو خـودا منـی نـاردوه بـۆ سه‌ر ئێوه به‌سیفه‌تی پێغه‌مبـه‌ری، نیگـاو سروشـی بـۆ نـاردوم، فـه‌رمانی پـێكردوم ببمه مژده‌ده‌رو ترسێنه‌ر بۆتان، په‌یامی خوداتان پێ بگه‌یه‌نم! جائه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی بۆم هێناون په‌سه‌ندی بكه‌ن‌و لێمی وه‌ربگرن ئـه‌وه ده‌بێتـه مایـه‌ی خۆشبه‌ختی دونیـاو قیامـه‌تتان، خـۆ ئه‌گـه‌ر په‌یامه‌كه‌شـم ره‌ت بكه‌نـه‌وه ئـه‌وه مـن ئه‌وه‌نـده‌م له‌سـه‌ره چاوه‌ڕوان بم تاكو خودا نێوانی من‌و ئێوه یه‌كالاً ده‌كاته‌وه.

ئه‌مجار وتیان: ئه‌ی موحه‌ممه‌د: ئه‌گه‌ر تـۆ هـیچ كـامێ لـه‌م پێـشنیارانه‌مان لـێ وه‌رنـه‌گری، ئـه‌وه داوابكـه بـاخوا فریـشته‌یه‌كت له‌گـه‌ڵ بنێـرێ، راسـتی په‌یامه‌كـه‌ت بچه‌سپێنێ‌و ده‌رباره‌ی تۆ ئاخاوتنمان له‌گه‌ڵ بكا، هه‌روا داوابكه خـودا چـه‌ند بـاخ و باخـات‌و قه‌صرو باڵه‌خانـه‌ی لـه‌زێڕو زیـو دروسـتكراوت بـداتێ، له‌وشـتانه‌ی ئێمـه پێشنـیارمان بۆ كردی بێ ئاتاج بی‌و پێویستت به‌كاسپی كردن‌و هه‌وڵـدان بـۆ بـژێو په‌یدا كردن نه‌مێنێ، بۆئه‌وه‌ی بزانین: كه تۆ لای خودا رێزو فه‌زڵت هه‌یـه‌و خـاوه‌ن پلـه‌و پایـه‌ی. ئـه‌گینا ئـه‌وه‌تا ئێمـه تـۆ ده‌بیـنین لـه‌بازاڕدا دێ‌و ده‌چـی، هـه‌وڵی په‌یداكردنی بژێوته! هیچ زێده رێزو قه‌درێكت له‌ئێمه زیاتر نیه!

پێغه‌مبـه‌ر ﷺ فـه‌رمووی: نـه‌خێر مـن شتی واناكـه‌م، مـن هـه‌رگیز له‌وانـه‌نیم داوای ئاوا له‌خودا بكه‌م، وه‌من بـۆ ئـه‌وه ره‌وانـه نـه‌كراوم داوای ئـاوا لـه‌خودا بكـه‌م‌و ئێوه په‌لپی له‌و جۆره‌م لێبگرن. به‌ڵكوو خودا منی ناردوه به موژده‌ده‌رو ترسێنه‌ر: ئه‌وانه‌ی شوێنم ده‌كه‌ون موژده‌ی به‌هه‌شتیان ده‌ده‌مێ، ئه‌وانـه‌ی بـه‌درۆم ده‌خه‌نـه‌وه له‌ئاگری دۆزه‌خ ده‌یانترسێنم. ئیتر په‌روه‌ردگار ئه‌م ئایه‌ته‌ی نازڵ كرد.

پەیوەندی ئەم ئایەتانە بەهی پێشەوە لەم رووەیە:

دوای ئـەوەی پـەروەردگار دووشـوبهەو رەخنـەی کافرەکـانی دەربـارەی قورئـان راگەیاند، ئەمجا شوبهەو رەخنەیەکی تریان دەربارەی پێغەمبەری قورئان بۆ هاتوو کەحەزرەتی موحەممەدە باس دەکا. پاشان ئـەو شوبهەو رەخنانـە رەت دەکاتـەوە، پوچـیو بێبایـەخیان رون دەکاتـەوە، ئـەوە رادەگەیـەنێ کـە ئـەو شـتانەی ئـەوان دەیکەنە رەخنـە لەپێغەمبـەر ﷺ لەوپـەڕی سـەخافەتو بێبناغـەیی دان، بەکەڵکی رەخنـە نایـەن، ئەوانـە بیـانوی بێپێـزن، نیـشانەی سـەرڕەقی و ئینکـاریکردنی ئـەو کافرانەیە. هیچیان بەدەستەوە نیە ناچارن پەنا بۆ شتی ناوابەرن.

کافرەکـانی قـورەیش پێـنج رەوشـتیان بـۆ پێغەمبـەر بـاس دەکـردن بەخـەیاڵی خۆیان ئەو رەوشتانە لەگەڵ پێغەمبەرێتی دا ناگونجێن.

**ئەو پێنج رەوشتە ئەمانە بوون:**

١-﴿ وَقَالُوا مَالِ هَٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ کافرەکـانی قـورەیش دەیـانگوت: ئـەم کابرایـە کـە خـۆی لەئێمـە کـردوە بـە پێغەمبـەر، هیـچی لەئێمە جیا نیەو چ زێدە فەزڵو رێزێکی بەسەر ئێمەوە نیە، وەکوو ئێمـە خـواردن دەخـوا، وەکـوو ئێمـە ئـاوو شـلەمەنی دەخواتـەوە، وەکـوو ئێمـە پێویـستی بەخواردنوخواردەمەنی هەیە، ئەگەر ئەو راست دەکا پێغەمبەرە دەبـوو پێویـستی بەو جۆرە شتانە نەبوایایە.

ئـەدی ئـەوەتا هەڵـسوکەوتی هەڵـسوکەوتی ئادەمیزادانەیـەو کەچـی لافی پێغەمبەرێتی لێدەدا! چۆن دەبێ ئەو وەکوو ئێمە ئادەمیزاد بێ و لـەخوداوە نیگـای بۆ بێ؟ چۆن دەبێ هەڵسوکەوتیوەکوو ئێمەوابێ و پەیوەنـدی بەعالـەمێکی تـرەوە هەبێو نیگاو سروشی لێ وەربگرێ؟ ئەدی ئێمە بۆچی نیگاو سـروشمان بۆنایـەو هیچ لەو عالەمە نازانین: کە موحەممەد پەیوەندی پێوە هەیە!

٢- ﴿وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ بـەناو بـازاڕدا دێ ودەچێ، هـەوڵی پەیـداکردنی بژێویەتیو مامەڵەوبازرگانی دەکا، ئیتر چی لەئێمە زیاترەو بـە چ فەزڵێکـەوە لافـی

پێغەمبـەرێتی لـێ دەدا؟ بێگومـان ئەمـە بـیرو بۆچـونێکی ماددیانـەی روتـەو بەرامبـەری‌و پێکگرتنێکـی نەفامانەیـە.. چـونکە پێغەمبـەران لەرەوشـتە ماددیـە حیسیەکانیاندا چ جودا وازیەکیان لەگەڵ ئادەمیزادی تردا نیە، بەڵکوو جوداوازیـان لەقیمەتە مەعنەویەکان‌و ئەخلاق‌و پاکی دەرون دا هەبووە، خـودا ڕێـزو نرخـی لـێ ناون‌و نیگاو سروشی بۆ کردون، وەکوو لەشوێنێکی تردا دەفەرموێ: ﴿قُـلْ إِنَّمَـا أَنَـا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ (الكهف/١١٠)

٣- سێیەم رەخنەیان ئەوەبوو: کە دەیـانگوت: ﴿لَوْلَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَـكٌ فَيَكُـونَ مَعَـهُ نَذِيراً﴾ ئەرێ ئەوە بۆچی لەخوداوە فریشتەیەك نایەت بۆ لای موحەممەدو شایەتی بدا لەسەر ڕاستی داواکەی‌و قسەی بەرهەڵستکارانی رەت بکاتـەوە، ئـەم رەخنـەیان دەق دەشوبهێتە قسەکەی فیرعەون: کەدەربارەی حەزرەتی موسا ﷺ گوتی: ﴿فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَاء مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ (الزخرف/٥٣).

٤- چوارەم رەخنەیان ئـەوەبوو: کـە دەیـانگوت: ﴿أَوْ يُلْقَـى إِلَيْـهِ كَنـزٌ﴾ ئـەوە بـۆ لەئاسمانەوە گەنـج وخەزێنەیەکی بۆ ناخرێتە خوارەوە مەسرەفی خاوو خێزانـی لـێ بکاو پێویستی بەکاسبی کردن‌و مامەڵەو بازرگانی نەبێ؟

٥- ﴿أَوْ تَكُونُ لَهُ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَـا﴾ خۆ ئەگەر گەنـج و خەزێنـەی بـۆ نەخرێتـە خـوار، دەبـا ئەگـەر هیـچکە نـەبێ وەکـوو سـاماندارێك باغـاخ و باخـاتێکی هـەبێ لەبەروبوومی بخواو مەسرەفی خاوو خێزانی لێ دەستەبەر بکا.

وەکوو تێبینی دەکرا قورەیشیەکان سەرەتا دەیانگوت: دەبێ پێغەمبەر فریشتە بێ‌و پێویستی بەخواردن‌و خواردنەوەو خەوو پشودان نەبێ، دوایی وتیـان: قـەیناکا با پێغەمبەر هەر ئادەمیزادبێ بـەڵام بـا فریـشتەیەکی لەگەڵ دابـێ پـشتگیری بکـا، دوایی لەوەش هاتنە خوارێ وتیان: باپـشتگیری بـەوە بکـرێ گـەنج و خەزێنـەیەکی بۆ بخرێتە خوار، دوایی لـەوەش دابەزیـن‌وتیـان: با پیـاوێکی وابـێ خـاوەن بـاخ و زەوی‌و زاربێ.

ئەوان لەهەموو بیرو بۆچونەکانیاندا ماددیانە هەڵسوکەوتیان دەکردو هەردەمە بیانویەك‌و هەردەمە پەڵپێکیان لێدەگرت‌و لەبازنەی بوارە ماددیەکان نەدەچونەدەر، نەدەهاتن ژیرانە بیر بکەنەوە، عەقڵ‌و هۆشیان بخەنە کار پێیان‌وابوو: پێغەمبەرایەتی لەژور هێزو توانای ئادەمیزاد دایە، هەرگیز ئەوەیان بۆ نەدەسەلما: کە پێغەمبەر ئادەمیزادەو لەخوداوە نیگای بۆ دێ!

ئەمجار کە بەخەیاڵی خۆیان پێغەمبەریان لەکەکەدار کرد بەو شتانەو چەسپاندیان کە موحەممەد بەکەڵکی پێغەمبەرێتی نایە، لەعەقڵ‌و هۆشیش روتیان کردەوەو بەپیاوێکی خەرەفاویان لەقەڵەم دا.

بێگومان رەوانە کردنی پێغەمبەر لەئادەمیزاد بۆ سەر ئادەمیزاد حیکمەتێکی یەزدانییە، هەست‌و شعوری ئەوانەو تەجروبەو ئەزمونی ئەوانی هەیە، هەست بە ئێش‌و ئازاری ئەوان دەکا، حەزو ئارەزوی ئەوانی هەیە، بەزەیی بەزەبونی‌و لاوازیاندا دێتەوە، بەسەرکەوتن‌و کامەرانیان بەهرەمەند دەبێ، هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵیان دەڕواو دەزانێ بەچی دەوروژێن‌و بەچی رام دەبن‌و بەچی دێنە ژێر فەرمانی خوداوە.

لەلایەکی ترەوە خەڵکەکە دەتوانن شوێنی بکەون‌و چاوی لێ بکەن، چونکە ئەویش ئادەمیزادێکە وەکوو ئەوان‌وردەوردە بەرەو بەرزی دەیانبا بەئەخلاق‌و کردەوەو بەجێهێنانی ئەو ئەرکانەی پێیان رادەگەیەنێ: کە خودا لەسەری پێویست کردون، کەوابێ ئەو پێغەمبەرە ئادەمی سروشت‌و جوان رەوشتە، بۆخۆی دەبێتە تەرجەمەیەکی زیندوو بۆ ئەو بیروباوەڕەی بانگەوازی ئەوانی بۆ لا دەکا! ئەوکاتە ژیان‌و جەم‌و جوڵ‌و گوفتارو کرداری دەبێتە روپەڕێکی رانواندراو بۆیان‌و دێربەدێر لێیەوە ئەقڵ دەکەن‌و ماناکانی دەچەسپێنن‌و شوێنی دەکەون، ئەوان بەچاوی خۆیان رابەری خۆیان دەبینن، حەزیان لێ دەبێ پەیڕەوی بکەن، چونکە ئەو رابەرە ئادەمیزادێکە وەکوو خۆیان‌و لەقەبارەی ئادەمیزادێك دا دەیبینن!

ئەگـەر پێغەمبـەر فریـشتە بوایـە هـەرگیزاو هـەرگیز بیریـان لـەکردار و هەڵوێستەکانی نەدەکردەوە، هەوڵی ئەوەیان نەدەدا لاسایی بکەنەوە، چونکە ئەوان هـەر لەسـەرەتاوە هەسـت دەکـەن کـە سروشـتی ئـەو لەسروشـتی ئـەوان جیـاوازە، کـەوابوو هـیچ دورنیـە هەڵسوکەوتی ئـەو جیـابێ لەهەڵسوکەوتی ئـەوان، ئەوکاتـە حەزی ئەوەیان نابێ هەڵسوکەوتی ئەو لەخۆیاندا بهێننە دی.

کەوابوو ڕەوانە کردنی پێغەمبەر لەڕەگەزی ئادەمیزاد حیکمـەتێکی یەزدانییـە، حیکمـەتی ئـەو خودایەیـە کەهـەموو شـتێکی بەئەنـدازە دروسـت کـردوەو هـەموو پارچەکانی بوونەوەری پێکەوە گونجاندوە.

حیکمـەتی خودایـە کـە پێغەمبـەری لەڕەگـەزی ئـادەمیزاد نـاردوە بـۆ سـەر ئادەمیزاد بۆ ئەوەی ڕۆڵی خـۆی بگێـڕێ لەرابەرایـەتیکردنی ئـادەمیزاددا؛ کـەوابوو ڕەخنە گرتن لەئادەمیزادیەتی پێغەمبەر هەست نەکردنەبەو حیکمەتە یەزدانیەو نیشانەی نەزانییە بەرێز گرتنی خودا بۆ ئادەمیزاد.

پەروەردگار نەیویستوە پێغەمبەرەکەی گەنج و خەزێنەی هەبێ، خـاوەن بـاخ و ڤیللا بێ، ساماندارو دەوڵەمەندبێ، چونکە خودا ویستویەتی پێغەمبەرەکەی رابەرو پێـشەوای گەل‌ونەتەوەکـەی بـێ، ئـەرکی پێغەمبەرایـەتی قـورس‌و گرانـی خـۆی ئەنجام بدا، لەهەمان کاتدا هەوڵی دابین کردنـی بـژێوی خـۆی‌و مـاڵ‌و منداڵـیشی بـدا وەکوو هـەر تـاکێکی کۆمەڵەکـەی کەخـەریکی دابینکردنـی پێداویـستی ژیـانی مـاڵ‌و منداڵـەتی. بـۆ ئـەوەی یـەکێك لەنەتەوەکـەی کـە خـەریکی دەسـتەبەرکردنی پێداویستی ژیانیەتی نەڵێ: پێغەمبەر ژیانی مسۆگەر بووە خەمی دەسـتەبەرکردنی پێداویستی ژیانی نەبووە وەکوو من، بۆیە لێبڕاوە بۆ عەقیـدەو گەیانـدنی پـەیام‌و ئـەرکی سەرشـانی، وەکـوو مـن کۆسـپ‌و تەگـەرەی ژیـانی نەهاتووەتـە پـێش! بۆیـە توانی ئەو ڕۆڵە بگێڕێ کە گێڕای!

ئەوەتا پێغەمبەرەو وێڕای ئەنجامدانی ئەرکی پێغەمبەرایـەتی خـەریکی دابـین کردنی پێداویستی ژیانیشە!

ئەوەتا لەلایەك مامەڵەو بازرگانی دەكا بۆ ئەوەی پێداویستی ژیانی دابین بكا، لەلایەكی ترەوە لێبڕاوە بۆ ئەنجام دانی ئەركی پێغەمبەرایەتی دەی با گەل‌و نوممەت‌و پەیڕەوكارانیشی چاو لەوزاتە رابەرە بكەن، بیكەنە مامۆستاو قودوەو، ئەركی سەرشانیان لەخودا پەرستی دڵسۆزانە لەگەڵ هەوڵدان بۆ دەستەبەركردنی پێداویستی ژیان پێكەوە جۆش بدەن‌و ناوێتەی یەكیان بكەن (لیس الرجل رجل الدنیا ولا الرجل رجل الآخره، بل الرجل رجلهما) پیاو ئەوپیاوەنیە پیاوی دونیا بێ، هەروا پیاو ئەو پیاوەنیە پیاوی قیامەت بێ. بەڵكوو پیاو ئەو پیاوەیە پیاوی دونیاو قیامەت بێ.

بێگومان لەدوایی دا ماڵ‌وسامان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ رژا دەستكەوتی جەنگ و غەنیمەت زۆر بوو، لەم كاتەش دا پێغەمبەرﷺبوو بەقودوەی حەسەنەو ماڵ‌و سامان نەیتوانی لەخوداپەرستی رابەرایەتی غافڵی بكا، یان كۆڵی بكا.. بەڵكوو لەم تاقیكردنەوەش دا سەركەوتووبوو، بەخشندەیی‌و سەخاوەتی نمونەیی بوو، قیمەتی ماڵ‌و سامانی لەدڵدا نەبوو، بەڵكوو لەدەستی دا بوو، فیتنەی ماڵ تۆزقاڵێك كاری تێ نەكرد!

بەمەش رێگای لەوانە بڕییەوە: كە بڵێن: پێغەمبەر بۆیە توانی ئەركی بانگەوازی لەئەستۆ بگری‌و بەو پەڕی لێهاتوییەوە ئەنجامی بدا، چونكە بەهەژاری ژیاوە ماڵ‌و سامان دەستی نەگرتووەو مەشغوڵی نەكردوە، ئەوەتا ئەو زاتە ماڵ‌و دارایی دەرژێ بەسەریدا، كەچی تۆزقاڵێك لەبانگەوازیكردنی خۆی بێئاگانابێ‌و وەكوو سەردەمی هەژاری هەڵسوكەوت دەكا.

بەلام‌وێڕای ئەم راستیانەو سەرباری هەبوونی ئەو رەوشتانەو چەندەها رەوشتی جوان‌و بەرزی تر لەپێغەمبەردا ﷺ، كافرەكان هەڵوێستی خۆیان نەگۆڕی‌و بەخۆیاندا نەچونەوە بەڵكوو..

﴿وَقَالَ الظَّالِمُونَ إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلاَّ رَجُلاً مَسْحُوراً﴾ كافرەكان‌وتیان: ئێوە ئەگەر شوێن ئەم پیاوە بكەون‌و ئیمانی پێبێنن، بێگومان شوێن پیاوێكی دەست لێوەشاوو

سیحر لێکراو کەوتوون، شوێن کەسێك کەوتون عـەقڵی تێك چووەو نـازانێ دەڵێ چیو چی دەکا! ئەدی چۆن ئێوە پەیڕەوی فەرمانو جڵەوگیرییەکانی دەکەن؟!

ئەمجار پەروەردگار وەڵامی ئەم شوبهەیان دەداتەوەو دەفـەرموێ: ﴿انظُرْ كَيْـفَ ضَرَبُوا لَكَ الأَمْثَالَ﴾ ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بـە سەرسوڕمانەوە تـێ بفکرە، بڕوانە چیت پێ دەڵێن؟ : چۆن لەخۆیانەوە صیفاتی جیاجیات بـۆ دادەتاشـن. نـاوو ناتۆرەی سەیروسەمەرەت لێ دەنێن، بوختانت پێ دەکەنو شتت بۆ هەڵدەبەسـتن؟ جارێـك دەڵـێن: سـاحیرو جادوبـازی، چـەلێك دەڵـێن: بـۆ خـۆی سـیحری لێکـراوە، چاخێك دەڵێن: درۆزنە، جارێکیش دەڵێن: شـاعیرە یـان دەڵێن: قوتابیـە لای فـلانو فلان دەخوێنێ و ئەوان ئەم قورئانەی فێر دەکەن!

هـەموو ئـەم قـسانەیان پـوچ و بێبناغـەنو بوختـانو دەسـت هەڵبەسـتن، هەرکەسێك تۆزقاڵێـك عـەقڵو فـامی هـەبێ ئـەم جـۆرە قـسانەی بـەگوی داناچـێ، ﴿فَضَلُّوا فَلا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً﴾ رێگایـان لـێ گـوم بـووەو سـەرگەردانو گـومڕا بـوون، رێگای هیدایەتو حەق نادۆزنەوە!

ئـەمجا کۆتـاییی بەجەدەلەکـە دەهـێنێ بەبـەیانکردنی ئـەوە: کەئـەو پێـشنیارو داواکاریـەیان یـان ئـەو بیروبۆچـونەیان دەربـارەی کـالاً و پڕوپیتـاڵی دونیـایی ج نرخێکیان نیەو ئەوەی: کەئـەوان بەلایانـەوە گرنگـە پێیانوایـە ئەگـەر موحەممـەد پێغەمبەربێ، دەبێ گەنج و خەزێنەی هەبێ، یان باخ و زەویو زاری هەبێ لەراستی دا بیروبۆچـونی نەفامانـەو کـورت بیـنن، چـونکە ئەگـەر خـودا مـەیلی هەبوایـە لەوشتانە باشتری پێ دەبەخشی:

دەفـەرموێ: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي إِنْ شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْراً مِنْ ذَلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَـا الأَنْهَارُ وَيَجْعَلْ لَكَ قُصُوراً﴾ پـاكو مونەززەهـە، بـەرزوپیرۆزە ئـەو خودایـەی ئـەوتۆ ئەگـەر بیویـستایە لـەدونیادا زۆر باشـتری لـەوەی ئـەوان پێـشنیاری دەکـەن پێـی دەبەخشی، ئەونازو نیعمەتـەی لەقیامەتـدا وادەی پێـداوی بـۆی پـێش دەخـستی بـۆ

دونیاو باخ و باخاتی‌وای پێدەبەخشی بەژێر درەختەکانی دا جۆگاوجۆبار بکشانایە، قەصرو باڵەخانەی ناوازەو دڵگیری بۆ دەستەبەر بکردیتایە! زۆر باشترو بەنرختری لەوەی ئەوان پێشنیاری دەکەن پێ ببەخشیتایە.

بەڵام پەروەردگار ئەو عەتاو بەخششانەی بۆ قیامەت بۆ پەزمەندە کردوی، لەژیانی نەبڕاوەی قیامەت دا ئەو نازو نیعمەتانەت دەداتێ، نەك لەژیانی دونیای بێ بەقادا! بۆ ئەوەی بەهۆی دونیاوە لەقیامەت غافڵ نەبی، بەماڵو سامانەوە هەڵوگیر نەبی، ئەرکی ڕاگەیاندن‌و بانگەوازیت لەبیر بچێتەوە، بێگومان ئەوەی لای خودا بۆت پەزمەندەکراوە بۆژیانی قیامەت زۆر باشترو بەنرخترو بەردوام ترە!!

ویستی خودا وایە: کە باشتر لە باخ و قەصرو باڵەخانەت لەدونیادا بداتێ، ئەویش پەیوەندیە بەو کەسەی: کە باخ و قەصرو باڵەخانە دەبەخشێ، هەست کردن بەوەی کەتۆ لەژێر چاودێری ئەودای بەگوێرەی تەوجیهو تەوفیقی ئەو هەڵسوکەوت دەکەی، لەزەت‌و خۆشی ئەو پەیوەندییە دەچێژی؛ کە هیچ نازو نیعمەتێکی ناگاتێ.

خەیثەمە دەفەرموێ: بە پێغەمبەر گوترا: ئەگەر دەتەوێ هەرچی گەنج و خەزێنەی زەوی هەیە دەتدەینێ، ئەوەندەت ماڵو سامان‌و نازو نیعمەت دەدەینێ، بەجۆرێك کە لەوەپێش‌و لەوەدواش بەکەس نەدرابێ و نەدرێ، بەمەرجێکیش هیچ لەوە کەم نەبێتەوە کەلای خودا بۆت پەزمەندەکراوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەز دەکەم بۆ قیامەت بۆم پەزمەندە بکەن !

## بڕوانەکردنی موشریکەکان بەرۆژی قیامەتو وەزعو حاڵیان لەو رۆژەداو بەرامبەری کردنیان بە بەهەشتیەکان

﴿ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾ ﴾

جا کەکار گەیشتە ئەو حەددەو هەندێ لەشوبهەو قسە ناڕەواکانیانی دەربارەی خوداو پێغەمبەری خودا رانواند، ئەمجار پەردە لەسەر لایەنێك لەلایەنەکانی کوفرو گومڕاییان هەڵدەداتەوە: ئەویش ئەوەیە بڕوایان بە قیامەت نیە بۆیە هیچ کۆ لەستەمکاریو بوختانو قسە هەڵبەستن ناکەن، ترسی رۆژی قیامەتیان نیە، ترسی رۆژێکیان نیە کە تێیدا بەرەوڕوی خودا دەبنەوەو لەسەر ستەمو بوختان حیسابیان لەگەڵ بکاو تۆڵەی تاوانەکانیان لێ بستێنێ!

دەفەرموێ: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ﴾ بەڵکوو ئەوان بڕوایان بەهاتنی رۆژی قیامەت نیە، ئەو بێ بڕواییەیانە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو قسە پڕوپوچانە بکەن، وئەو

هەموو درۆو دەلەسانە هەڵڕێژن! چونکە کەسێك بەتەمای قیامەت نەبێ، بەتەمای حیساب و لێکۆڵینەوە نەبێ، خێرا دەکەوێتە هەڵەی بوختان و تۆمەتبار کردنی کەسانی دیکەوەو بیر لەئاکام ناکاتەوە، سود لەو بەڵگانە وەرناگرێ کە سەر دەکێشن بۆ تێفکرین و بیر کردنەوە..

﴿وَأَعْتَدْنَا لِمَنْ كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيراً﴾ ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ کەسێك بڕوای بەقیامەت نەبێ، ئاگری زۆر گەرمی وا کە خێرا بڵێسە دەسێنێ، سوتێنەرو داپڵۆخێنەرە.

ئەمجار وێنەی دیمەنێکی سامناکی قیامەت دەکێشێ؛ دیمەنەکە هێندە سامناکە دڵی ڕەق دەکا بەئاو، هەست و شعوری مردوو وەلەرزە دێنێ.

کافران ئاگاداردەکا لەو عەزابەی کە لەو ڕۆژەدا چاوەڕوانیان دەکا هەروەها مژدە بە موسوڵمانانیش دەدا بەنازو نیعمەتی بەهەشتی ڕازاوە لەو ڕۆژەدا.

دەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِنْ مَكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظاً وَزَفِيراً﴾ ئێستا ئێمە لەبەردەم دیمەنی ئاگرێکی بڵێسەداری پڕیشك هاوێژداین ئاگرەکە گیانی بە بەردا کراوە، دەڕوانی و دەبینێ، قیامەت بە درۆزانەکان دەبینێ، لەدورەوە دەیانبینێ دەکەوێتە لرفەلرف و ناڵەناڵ، دەنگی کڵەوو کوڵانی دەبیستن، نێڵەنێڵەو چەپۆکانیەتی، نیشانەی ڕق و قینی زۆریەتی لێیان، لێیان بەداخەو بۆیان دەسوتێ فیشکەو نرکەوناڵەی دەبیستن هێندەی رق لێیانە خەریکە لێك جیابێتەوە، تاوانبارانیش بەرەو ئەوێ کێش دەکرێن!

جاتۆ وەرە بەوردی بیر لەو دیمەنە بکەرەوەو بەزیندویی بیهێنە پێش چاوی خۆت! بەڕاستی دیمەنەکە تابڵێی سامناك و دڵ داچڵەکێنەرە!

(عبد الرزاق ) و ئیبنولونزیر و ئیبنو جەریر لەعوبەیدی کوڕی عومەیرەوە ریوایەتیان کردوە دەڵێ: (ان جهنم لتزفر زفرة، لایبقی ملك مقرب ولانبي مرسل الا خرّ لوجهه ترتعد فرائصه، حتی إن ابراهیم علیه السلام لیجثوا علی رکبتیه، ویقول : ربّ ! لاأسألك الیوم الانفسي).

وەرە ژیرانە بیر بکەرەوە، ئەو روو رەشانە بێنەرە بەر چاوی خۆت، ئەو چارە رەشانە بەزنجیر کراوی بەرەو رو دەخرێنە بەرو کێش دەکرێن بەرەو کوێ؟ بەرەو دۆزەخ دۆزەخیش خودا وای لێکردوە لەرقان خۆی دەخواتەوە، هەرلەدوورەوە ترس و لەرز دەخاتە دڵو دەرونیانەوە، ئێستا وا گەیشتۆنە نزیکیو شالاویان بۆ دێنێ، ئەمانیش بێدەسەلات دەستو قاچ بەستراو! جا بەم حاڵە دەگەنە لای بەکۆتو زنجیر کراوی بەدەستو قاچ بەستراوی تورِ دەدرێنە ناو دۆزەخەوە، فرێ دەدرێنە ناو ئەو ئاگرە داخ لەدڵە سوتێنەرە سامناکە.

﴿وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَاناً ضَيِّقاً مُقَرَّنِينَ﴾ جاکەتورِدەدرێنە ناو دۆزەخەوە ناخرێنە شوێنێکی پانو پۆرو بەرفراوان بەڵکوو تورِدەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەر بۆ ئەوەی سزاو ئازارەکەیان بەمێش ترو سەخت تر بێ، دەستو قاچیان بەزنجیر بەستراوە هیوای رزگاربوونو قوتار بوونیان براوە.

﴿دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُوراً﴾ هاواریان لێ هەڵدەستێ و تەمەنناى مردن دەکەن بۆ ئەوەی لەم سزا سەختە رزگاریان بێ، مردن دەبێتە هیوای سەرەکیو ئاواتی رزگار بوونیان، خوا خوایانە بۆ مردن بەلام سەرباری ئەوەی کەئاواتەکەیان جێبەجێ ناکریو ویستەکەیان نایەتە دی، گاڵتەو لاقرتێشیان پێدەکرێ!

ئەوان هاوار دەکەن ئەی مردن لەکوێیو ژیان کوشتینی فریامان بکەوەو رزگارمان بکە! پێیان دەگوترێ : ﴿لا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُوراً وَاحِداً وَادْعُوا ثُبُوراً كَثِيراً﴾ ئانا ئەمرۆ داوای مردنێك مەکەن داوای زۆر جۆر لەمردن بکەن، مردنێك بەتەنیا بەکەڵکی هیچ نایەو دادتان نادا، مەبەست گاڵتە پێکردنو نائومێدکردنیانە لەرزگاربوون، بەڵکوو سزایان نەبراوەو هەتا هەتاییە!!

جا لەم کاتەناسكو ترسناکەدا پاش رانواندنی ئەم دیمەنە سامناکە، قورئانی پیرۆز هەروەکوو ئوسلوبە هەمە کاتیەکەی خۆی، کەباسی دۆزەخ دەکا باسی بەهەشتیش رادەنوێنێ، باسی هەرشتێ بکا زۆربەی کات دژەکەشی دێنێتە گۆرِێ.

بۆیە لەم کاتەدا بەرامبەریەك لەنێوان سزای کافـران و پاداشـتی مـوسوڵمـانانـدا ئەنجام دەداودەفـەرموێ:

﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد پێیان بڵێ: ﴿أَذَلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيراً﴾ ئایا ئەوسزاو تۆڵە باشە کەباسی کرا بۆتان یـان بەهەشـتی رازاوەی ئەبڕاوە؟! ئایا ئەو دۆزەخـە باشترە یان بەهەشـتی ئەبـەدی و شـوێنی ژیـان بەسەربردنی هەتا هەتایی؟ ئەوبـەهەشتەی بەڵێن دراوە بـدرێ بەخۆپـارێزان! بـە لـەخودا ترسـەکان؟ ئـەو بەهەشـتەی کەدەبەخـشرێ بەوتـەقواکارە خۆپارێزانـەی لـەدونیادا فەرمانبـەرداری فـەرمانی خـودا بـوون، خـودا کردویـەتی بەپاداشـتی چاکەکاران.

﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ خَالِدِينَ﴾ هەیـە بـۆ ئـەو خوداپەرستانە لـە بەهـەشتدا هەرچـی ئـارەزو بکـەن لـەخواردن و خـواردنــەوەو پــۆشاك و شـوێنی حەوانــەوە، لـەئامێری سـواری و دیمـەنی جـوان و هـەموو جـۆرە شـتێکی جوانـی وا کـە بەچـاو نەبینرابێ و بەخەیاڵیش پەی پێ نەبرابێ، ئەوان لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتـەدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوەو برانەوەی نیەو لێشی وەڕەز نابن.

ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوە کە بەهەشتیەکان هەموو داخوازیەکیان دابین دەبێ، هەرچی بیانەوێ بۆیان دێتەجی و وادەو بەڵێنی خودایە پاشگەزبوونەوەی تێدانیە ، بۆیە فەرمووی:

﴿كَانَ عَلَى رَبِّكَ وَعْداً مَسْئُولاً﴾ ئەمە هـەردەبێ بێتـەجی و شیاوی ئەوەیـە کـە لەخـودا داوابکـری و ئەنجـام بـدرێ، وەکـوو لـەشوێنـێـکی تـردا لەسـەر زوبـانی خوداپەرستان دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلاَ تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لاَ تُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ ( آل عمران /١٩٤).

## حاڵو وەزعی کافرەکان لەرۆژی قیامەتدا لەگەڵ پەرستراوەکانیاندا

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾

لەوەپێش پەروەردگار باسی ئەو عەزابەی کرد کە لەقیامەت دا: بۆ کافرەکانی داناوە، لەهەمان کاتدا لەگەڵ نازونیعمەتی ئامادەکراو بۆ موسوڵمانان بەرامبەری کرد.

ئەمجار لێرەدا دیمەنێکی تر لەدیمەنەکانی قیامەت بەیان دەکا: ئەویش حاڵو وەزعی عیبادەت کەرەکانە لەگەڵ عیبادەت بۆ کراوەکان دا، ئەوانەی جگە لەخودا عیبادەتیان بۆ کراوە؛ خودا گردیان دەکاتەوەو پرسیاریان لێ دەکا ئایا ئەوان عیبادەت کەرەکانیان گومڕاکردووەو لەڕێبازی حەق لایان داون؟ یان بۆ خۆیان خۆیان گومڕا کردوە: دەفەرموێ:

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَقُولُ أَأَنْتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِي هَؤُلَاءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبِيلَ﴾ ئەی موحەممەد! بیرلەو رۆژە بکەرەوە، یان ئەو رۆژە بۆ موشریکەکان باس بکە: کە خودا، ئەوان لەگەڵ خودا درۆزنەکانیاندا کۆیان دەکاتەوە، خودا فریشتە پەرستو فریشتەکان، عیسی پەرستو عیسی خۆی، عوزەیر پەرستو عوزەیر خۆی، بتو صەنەم پەرستو بتەکان، ئەستێرەپەرستو ئەستێرەکان، هەروا هەموو پەرستراوێك جگە لەخودا لەگەڵ پەرستکارەکان دا کۆیان دەکاتەوە.

ئەوانەشیان کەبێ گیانن خودا ومزوبانیان دێنێو پرسیاریان ئاراستە دەکاو دەفەرموێ: ئەی پەرستراوینە! ئەی ئەوانەی بە خودا زانراونو عیبادەتتان بۆ کراوە! ئەوە ئێوە بەندەکانی منتان لەرێبازی حەق لادانو گومراتان کردن؟ ئایا ئێوە بانگەوازیتان کردن بۆ ئەوەی لەجیاتی من بتانپەرستن یان بۆ خۆیان خۆیان گومراکردوە یان بەبێ ئەوەی بانگەوازیان بکەن لەخۆیانەوە عیبادەتی ئێوەیان کردوە ؟؟

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ﴾ (المائدة /١١٦).

هەڵبەتە پرسیارەکە بۆ ئەوەنیە خودا بەوەڵامەکەی شتێکی نەزانراو بزانێ، نەخێر پەروەردگار پێش ئەوە ئاگاداری هەموو شتێکەو واقیعەکە دەزانێ، بەڵکوو پرسیارەکە بۆ ئەوەیەوەڵام بدەنەوە بەوەڵامەکەی کەدەیدەنەوە سەرزەنشتی عیبادەتکەرەکان بکاو ریسوابن، بەوەی کە عیبادەت بۆ کراوەکان بەدرۆیان دەخەنەوە.

خودا بۆ خۆی پێویستی بەو پرسیارە نیەو زانیاری تەواوی هەیە، وەلێ پرسیارو وەڵام لەدەشتێکی ئاوەها گەورەو سامناك دا، هەموو ئەوحەشاماتە کۆکراوەتەوەو ئەو پرسیارەیان ئاراستە دەکرێ ریسواکردنو ئەزیەتدانی موشریکەکانی تێدایە هەرپرسیارەکە خۆی عەزابو سزایە، عەزابێکی ترسناکیشە.

ئەمجار پەروەردگار وەڵامی مەعبودەکان باس دەکا کە لەوەڵامی ئەو پرسیارەو لەو رۆژەدا عەرزی پەروەردگاری دەکەن ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَتَّخِذَ مِنْ دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ دەڵێن: پاكو مونەزەهی بۆتۆیە خودایە، شیاونیە بۆ ئێمەو راست نیە: کە جگە لەتۆ هیچ پەرستراوێکی تر بە رەوابزانینو بڕیاری بدەین! کەوابێ چۆن بەندەکانی تۆ گومڕادەکەین، لەرێبازی پەرستش کردن بۆ زاتی پاکت لایان دەدەین! نەخێر ئێمە شتیوامان نەکردوە، بەڵکوو ئەوان بۆ خۆیان لەرێبازی تۆ لایان داوەو بۆخۆیان خۆیان گومڕا کردوە، تاوانی خۆیان لەئەستۆی خۆیان!

﴿وَلَكِنْ مَتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ حَتَّى نَسُوا الذِّكْرَ﴾ بەڵکوو تۆ ئەوانت هەرلەبابو باپیریانەوە لە نازونیعمەت دا پەروەردە کردو بەنازونیعمەتەوە تەمەنت درێژکردنو سەرگەرمی رابواردنو عەیشونۆشو شوێنکەوتنی حەزو ئارەزوی نەفسی خۆیان بوون، لەنازو نیعمەتی هەمە جۆردا نقوم بوونو پەیامی تۆیان لەبیرچۆوە، ئەو ئەحکامو ئامۆژگاریانەی لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانت پێیان راگەیەندرابوو لەبیریان ئەماو بێئاگابوون لەیادی تۆو بڕوابەتاكو تەنهایی تۆو تێفکرین لەبەڵگەکانی بونەوەرکە نیشانەی خودایەتی تۆن.

﴿وَكَانُوا قَوْماً بُوراً﴾ بەراستی ئەوانە گەلو نەتەوەیەك بوون بێخێرو لەئاکاما بەهیلاك چوون.

نمونەی ئەم ئایەتە ئایەتێکی ترە: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ؟ قَالُوا سُبْحَانَكَ ...﴾ (سبأ/٤٠-٤١).

ئەمجار بەعيبادەتكەرەكان دەگوترێ: ﴿فَقَدْ كَذَّبُوكُمْ بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفاً وَلَا نَصْراً﴾ ئەوە ئەوشتانەى ئێوە بەخوداتان دەزانين جگە لەخودا دەتانپەرستن، پێتان وابوو يارمەتيدەرو شەفاعەتكار دەبن بۆتان دەتانگوت لەخودامان نزيك دەكەنەوە، ئەوەتا بەدرۆيان خستنەوەو ئەوەى وتتانەوا دەرنەچوو. ئەوخودا درۆزنانە تواناى يارمەتيدانى ئێوەيان نيە، ناتوانن سزاو تۆڵەى خوداتان لێ لادەن، هيچ بەرگريان لەئێوە بۆناكرێ، تەنانەت يارمەتيدانى خودى خۆشيان بۆ ئەنجام نادرێ، وەكوو لەئايەتێكى تردا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ، وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاء وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾ (الأحقاف/٥-٦).

ئەمجار لەكاتێكدا كە ديمەنەكە ديمەنى رۆژى قيامەتەو رووداوەكانى رادەنوێنىو چاوو دڵو هەستو شعور بەو رووداوانەوە بەستراونەتەوە، وانيشان دەدا: كەئێستا ئەو رۆژەيەو قيامەت رابووەو مەخلوقات لەسارای مەحشەردا وەستاوونو موشريكەكان خراونەتە قەفەسى تۆمەتەوە، چاوەڕوانى ئاكامى دادگايى كردنەكەيانن.

ئالەم كاتەداو كتوپڕسياقەكە دەگوێزرێتەوە بۆ دونياى ئێستاو هەڕەشەى توندوتيژ ئاڕاستەى بێبڕواكان دەكاو دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَاباً كَبِيراً﴾ هەركەس لەئێوە لەم جيهانەدا هاوەڵ بۆ خودا بەڕەوا بزانىو كافرو فاسق بێ، ئەوە رۆژى قيامەت عەزابى بەئێشى پێ دەچێژين، عەزابێكى گەورەو بێ ئامانى دەدەين، عەزابێكى بێ سەروبن.

## پێغەمبەران هەردەبێ ئادەمیزادبن

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾

دەربارەی نازڵ بوونی ئەم ئایەتەواحیدیو ئیبنوجەریر لەئیبنو عەباسەوە ریوایەتیان کردوە دەفەرموێ: کاتی موشریکەکان رەخنەیان لەپێغەمبەر ﷺ گرت : وتیان : ئەوە چیە ئەم پێغەمبەرە خواردن دەخواو بەبازاڕدا دێودەچێ بۆ وەدەستهێنانی بژێو؟ پێغەمبەر ﷺ غەمبار بوو ئیتر ئەم ئایەتە نازڵ بوو!

ئێستا کە ئەوپەڕی بوختانو بەدرۆخستنەوەو گاڵتەپێکردن نیشاندرا، رەخنەیان لەپێغەمبەر ﷺ گەیشتە چڵەپۆپەو ئیعترازیان لە ئادەمیزادیەتی پێغەمبەر گرت: سیاقەکە دەگەڕێتەوە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو چەسپاندنی ئەو حەقیقەتە: کە موحەممەد ﷺ لە پێغەمبەرانی تر جوداواز نیەو هەموو پێغەمبەران ئادەمیزاد بوونو، دیاردە سروشتیەکانی ئادەمیزادیان تێدابووە، هەمویان خواردنیان خواردوەو شلەمەنیان خواردۆتەوە، جمو جوڵو هاتوچۆیان کردووە نوستنو پشودانیان بووە.

بەم ئایەتەوەڵامی رەخنەی موشریکەکان: کەوتیان: ﴿مَالِ هَـٰذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ دەداتەوە. ئەوە رون دەکاتەوە: کە رەوانە کردنی ئادەمیزاد بەصیفەتی پێغەمبەری دابو نەریتێکی یەزدانییەو هەموو پێغەمبەران

ئادەمیزاد بوونو رخنەگرتنیان لەپێغەمبەر لەم بارەیەوە جگە لەنەفامیو نەزانی هیچی ترنیە.

دەفەرموێ: ﴿وَما أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الأَسْوَاقِ﴾ ئێمە لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە ئیللا کە ناردومانن خواردنیان خواردوەو بەبازاڕدا هاتوچۆیان کردوە، واتە: هەموو پێغەمبەرانی پێش تۆ ئادەمیزادبوون خواردنیان خواردوە، بۆ ئەوەی درێژە بەژیان بدەنو بەناو بازاڕدا هاتوونو چوون بۆ کاسپی کردنومامەڵەوبازرگانی، خواردنو خواردنەوەو هەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستی ژیان دژایەتی نیە لەگەڵ حاڵو وەزعی ئەوانو لەپلەوپایەی ئەوان دانابەزێنێ.

رەسەنیو بەرزیو بڵندیی ئەوان راستی پێغەمبەرایەتیان بەئەخلاقو رەوشتی جوانو کردنی کاری چاكو دەرکەوتنی موعجیزەو نیشانەی سەرنج راکێش لێیان دەردەکەوێ: بەجۆرێك هەموو خاوەن عەقڵو هۆشێك راستی پێغەمبەرایەتی ئەوانی بۆ دەردەکەوێ، دەزانێ کە لەخوداوە نێردراون، حەزرەتی موحەممەدیشوەکوو پێغەمبەرەکانی تر وایە، کەوابێ پێغەمبەر دەبێ لەرەگەزی پێغەمبەربۆسەرنێردراوەکان بێ، هەژاریو کارکردنو هاتوچۆی ناوبازاڕ بۆ مامەڵەکردنو بازرگانی نابێتە شوێنی رەخنەو لەپلەو پایەی پێغەمبەر داناشکێنێ.

کەوابێ کە ئەو قورەیشیانە رەخنە لەپێغەمبەردەگرن رەخنە لەخودی پێغەمبەر ناگرن، بەڵکوو لەراستیدا رەخنە لەدابو نەریتی خودا دەگرن، رەخنە لەدابو نەریتێکی مەزەندەکراو نەخشە بۆکێشراو دەگرن، لەدابو نەریتێك بێهودە نەخراوەتەگەڕو بێ مەبەستو بێ نیاز نیە.

﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً﴾ هەمەندێکتان بەهەندێکتان تاقی دەکەینەوە، پێغەمبەری ئادەمیزاد دەنێرین بۆ ئەوەی ئەوانەی دەرکی حیکمەتی خودا ناکەن بڕوایان بەنەخشەو مەزەندەکردنی خودا نیە ئیعتیراض بگرن، ئەوانەی متمانەیان

بەخودا هەیەو بڕوا بە حیکمەتو دانایی خودا دەکەن، خاوەن صەبرو ئارام بن خۆیان بدەنە دەست خوداو پشتی پێببەستن.

هەروەها بۆ ئەوەی بانگەوازی ئیسلامی بکەوێتە تێکۆشانو کێبڕکێو ڕۆژێك سەربکەوێو ڕۆژێك تێك بشکێ صیراعەکە بەردەوام بێ! هۆکارە ئادەمیزادیەکانو توانا بەشەرییەکان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن، دەربکەوێ کێ خۆڕاگرەو کێ بێصەبرە، کێ لەو تاقیکردنەوە دەردەچێو کێ فاشیل دەبێ!

ئادەمیزادان چینو توێژن لەزانیاریو نەفامی دا لە ساماندارێو هەژاری دا لەزیرەکیو کەودەنی دا، لە لەش ساغیو نەخۆشی دا، پەروەردگار دەیتوانی هەموو گەنج و خەزێنەی دونیا بخاتە ژێردەستیانو ئاتاجی هیچ نەبن، وەلێ خودا ویستیوابووە پێغەمبەران بەکاڵای دونیاوە هەڵەو گیرنەکا، هەموو هێزوتواناو کردەوەیان بۆ قیامەت بخەنە گەڕ، بۆ ئەوەی چاویان لێبکرێو ببنە قودوە بۆ گەلەکانیان.

هەروا ویستی خودا وابووە ئەوان بەگەلەکانیان تاقی بکاتەوەو گەلەکانیشیان بەوان تاقی بکاتەوە، تابۆیان دەربکەوێ فەرمانبەردار کییە یاخی چەس! کێ ئاشتیخوازەو کێ زیانەخرۆیە.

﴿أَتَصْبِرُونَ﴾ ئایا خۆگردەبن، واتە خۆگرو پشو درێژبن لەسەر ئەو ڕێبازەی خودا بۆی دیاری کردون.

﴿وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيراً﴾ خودای تۆ ئەی موحەممەد! بینایە دەزانێ کێ خاوەن صەبرەو کێ بەهاتو هاوارە، کێ لەسەر ڕێبازی حەق بەردەوام دەبێو کێ لێی لادەدا، هەریەکەیان سزاو پاداشتی خۆی بەگوێرەی هەڵوێستو کردەوەیوەردەگرێتەوە.

ئەبو دەرداء لەپێغەمبەرەوە ریوایەت دەکا: دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ویل للعالم من الجاهل، و ویل للسلطان من الرعیة، و ویل للرعیة من السلطان، و ویل للمالك من المملوك، و ویل للشدید من الضعیف و للضعیف من الشدید بعضهم

فتنة ) هاوار بۆ زانا لەچنگ نەزان ئەگەر هەوڵ نەدات شارەزای بکا، هاوار بۆ فەرمانڕەوا لەچنگ رەعییەتەکەی ئەگەر بەدڵسۆزیو عەدالەت فەرمانڕەواییان نەکا، هاوار بۆ رەعیەت لەچنگ فەرمانڕەوا ئەگەر بەقسەی نەکەن، هاوار بۆ خاوەن لەچنگ کۆیلەکانی ئەگەر ستەمیان لێ بکا، هاوار بۆ بەهێز لەچنگ بێ هێز، هاوار بۆ بێ هێز لەچنگ خاوەن هێز، هەندێکیان بۆ هەندێکیان فیتنەو تاقیکردنەوەن.. ئەمجار ئەم ئایەتەی ﴿وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً﴾ی خوێندەوە.

**کۆتایی جزمی (١٨)**

**بەپشتیوانی خودا رۆژی ٦/٧/٢٠٠٠ لەپاکنووسی ئەم جزمە بوومەوە.**

**سلێمانی / مامۆستایان/ مەلا محمود احمد**